

# تەفسیری قورئان بە شەرح و بەیان

دانەر: مەلا عومەری مودەڕڕسی

بەرگی ١:

سووڕەی فاتحە و سووڕەی بەقەرە

## ناوەرۆک

## تەفسیری قورئان بە شەرح و بەیان.

## سەرەتا: سوورەی حەمد و بەقەرە

مەلاعومەر: خودایە ئەوەم داوایە: وەک هانت دام و یاریدەت دام سوورەی حەمد و بەقەرە تەفسیر و تەرجەمە کەم، ئاواشم یاریدە دە تاکوو کەلامت کە قورئانە بە تەواوی تەفسیر و تەرجەمە کەم. کەم نابێ لە خودایەتیت بەڵام لە عەبدایەتی من زیاد دەبێ.

خودایە یاریدەت دام هەموو قورئان بە نەزمی کوردی تەفسیر کەم دە ماوەی سی (٣٠) مانگاندا، ئەوجارەش ڕێم پێ بدە تاکوو بگەم بەو ئارەزووییەم کە شەرح و بەیانی هەموو قورئانە.

خودایە دەزانم دەزانی چم لێ دەوێی و چم ئاواتە، جا نازانم بەجێی دێنی یان نا.

مەلاعومەر مودەڕڕسی

١٣٩٥/٢/٣

## گازەگاز

ئەی خوایە ونی لە بەر دوو چاوم — یادی لە وزەی دڵ و هەناوم

شارەوەیی ناو دڵ و دەروونی — یادت لە دڵا هەیە بە ڕوونی

بێ ناو و نیشانی، نادیاری — نەقشت لە هەچی هەیە دیاری

باست لە هەموو دەما لە سەر زار — یادت لە هەموو دەما دەکا یار

دڵ گەرچی ونە لە بن تەمی لەش — ڕۆژێ دەڕەوێ لەوی تەمی ڕەش

دڵ ڕووت و ڕەجاڵ دەمێنێ بێ لەش — داماو بە تەنێ لە ژێر گڵی ڕەش

ئەو ڕۆژەیە دێتەوە حزوورت — دەڕوانێ لە ڕەحمی تۆی غەفوورت

دڵ دیارە بە گازەگازە بۆ لات — گیرۆدەیە لێرە گیرە هەیهات

بەر نابێ دڵە لە ئەو جیهانە — ئەم ڕازە لە من ونە و نیهانە

سا لێرەوەڕا «عومەر» بە ناوم — بۆ لات بە گوناهەوە لە قاوم

## هاوارێک لە خودا

خانەخوێی دڵ گەرچی دڵ لێت بێخەبەر
بوونەوەر گشتی لە تۆڕایە و کەچی لێت بێخەبەر

دڵ هەچی بێ خانەخوێی تۆی بێگومان
شەمعی ڕووناکی شەوی تاریکی دڵ، تۆی بێگومان

شەمعی هەست و ئەقڵ و بیر تۆی خاوەنی گشت هەست و خوست
شەمعی ئیلهامت نەدا لێیان شەون بێ هەست و خوست

شەمعی ڕووناکی دڵم ڕووناکی شەمعی تۆی بەسە
ئەی کەسم ڕووم لێ نەگۆڕی، با نەڵێن پێم بێکەسە

هەرچی بم، عەبدم لە مەعبوود ناکەوم
ڕۆژی ڕووناک بێ دڵم یا کوفری ڕەش بێ وەک شەوم

بۆ عومەر بەسە ئەوەندە یادی تۆ
زیکری تۆ ئارامی گیانە، حَيُّ قَيُّوم سەربەخۆ

## پێشوازی تەفسیر و تەرجەمەی قورئان بە شەرح و بەیان

خودایە بمـدە هیـدایە، بـۆ هەرچـی پێـت ڕەوایە، غەنـی بێـتـۆ گەدایە، بێهەسـتت هەڵوەدایە، ئیلهامت دا بە نەفسا، حەق و ناحەق بزانێ، سەر دانەخا و هەڕاکـا، لە بەرپێـی خۆی نەڕوانێ، ڕاماڵ بەرێتە ناحەق، چی حەقە بۆی وەلانێ.

خودایە لە سەرووی هەموو ئەقڵ و بیر و خەیاڵاتی، تیری بیری هیچ ئەقـڵ و خەیـاڵ ناتگاتێ، هێندەش نێزیکی دە هەمـوو لەش و گیـان و ئەجـزای لەشـدا خـزاوی، دە نـاو هەستی دەروونـدا بڵاوی، لە تەکتەکی ئەجزای لەشدا ئاسـارت هەسـت دەکـرێ و چـاو دەکرێ، کەچی هەچەندی چاوی ئەقڵ و خەیاڵ و بیر جاسووسێت لێ گرن جاسووسـی چۆنی نادەی، بەڵام لە هەچی بوونەوەرە سیلە و جاسووس بگیردرێ جاسووسی بوونـت دەدەی، هەست لە ڕاست بوونت لە هەستانە، هەست لە ڕاست چۆنیت لە وەستانە.

وەک هیچ ناچی تا بتناسم، لەمەڕ چۆنیـت هـوڕ و کاسـم، هەچـی نەیـدەی بە دڵ و دەروون، نەیدەیتە دم ئەقڵی زەبوون، نایزانێ خانەخوێی دەروون، دار و دەوەن، گیـاوگۆڵ و گژ، تەمتوومان و هەور و مژ، دەشت و تەلان، ڕژد و هەڵدێر، چیمەن، گـوڵزار، هەوای زەنوێر، بۆن و بەرام، چەشن و دیمەن، مێرگ و مەزرا و گوڵ و چیمەن؛ گشـتی هـاواری تۆیانە، شاهیدی بوونی تۆیانە، هەتا حاشا حاشات ناکا، هاواریەتی لە تۆی تـاکە، ئـای لە

ئینسان چەن ناپاکە، چەن دوور لە ئەقڵی چالاکە، حاشایەتی لە تۆی تاکە.

هەر ئینسانە ئەسڕاڕاوی، ڕازدار ڕازاو خەیاڵاوی، بۆ دنیا هەوت و داماوە، گیرۆدە و ئەستۆ بە داوە، هەر ئینسانە ڕێز گیراوە، لە لایەن خوا هەڵبژێراوە، ئیکرام و ڕێز لێ گیراوە، چون هەر ئەوە بە زیبک و هێز، هەر ئەو دیارە بە تێز و پێز، هەر ئەو شایانە سا بە ڕێز، کەچی هەر ئەو لە حەق بەبێز.

لە حەق بێزار هەر ئینسانە، موشیرکڕانەر هەر ئینسانە، دۆڕاو تۆراو هەر ئینسانە، لە خۆ گۆڕاو هەر ئینسانە، فاسد خوێنڕێژ هەر ئینسانە، سپڵە و ناشکور هەر ئینسانە، خەلیفەی خواش هەر ئینسانە، سوڕ و ڕازە ئەو نیهانە، ئەو ئینسانە بەو ئیهانە، چۆن شایانە بۆ خەلیفە، بۆ ئەو خوایەی چەن لەتیفە.

ئەی هەستدەمێن و هەستبزوێن، ئەی کەڕ و لاڵ و کوێر بدوێن، ئەی دانەوێڵە و ڕیشەڕوێن، پەنا هەر تۆی دەس بە داوێن، حەزکە دڵم پاک بێ و خاوێن، تا زیکری تۆی پێ بکەم کەریم، تا وەسفی تۆی پێ بکەم ڕەحیم، شەرحی کەلامی تۆی پێ بکەم، غەڵەت نەڕۆم غەڵەت نەکەم، غەڕڕە نەبم فەخر نەکەم، بۆ تۆی بڵێم، بۆ تۆی بکەم. یەقینە لێم گەر بۆ تۆ بێ، ئەو خزمەتەم لە بەر تۆ بێ، هەدەر نادەی ئەجری چاکان، وەلانانێی خاس و پاکان، نیازمەندم داوا دەکەم، هەڵەباشم ڕجا دەکەم، ئاگات لێم بێ لەو دنیایە، دنیای شەڕ و بەزم و کایە، کاتێ مەلەک دێ بۆ گیانم، ژان دادەگرێ هەموو ژیانم، هێرش دێ بۆ سەر ئیمانم، ئاگات لێم بێ لەو کاتەدا، ئەقڵ و شعوور لێم لا نەدا، هۆش نامێنێ لەو کاتەدا، گیان سەخڵەتە لەو ساتەدا، ماڵاوایی گیانە لە لەش، بۆ لای تۆ دێ گیان بە پەلەش، بە ئاسانی بیبەوە لات، وەک داتە لەش لە هەوەڵ کات.

دیارە خوایە من لاوازم، داوات بۆیە لێ دەخوازم، بێنیاز و بێباکی لە مـن، هەرچـی حەز کەی دەیکەی لە من، زیاتر نادوێم لەو هەوایە، زانام زانای چـم داوایە، عەزابـم دەی هەر بەندەتم، بمبەخشی نیازی ڕەحمەتم.

إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ. «مائیدە: ١١٨»

# تەفسیری سوورەی فاتیحە

پێشەکی مانای ئایەتەکان بە کورتی بەیان دەکەین، پاشان شەرح و بەیانی هەستی دەروونی ئایەتەکـان ڕادەنێـین. پاشـان تایبەتمەنـدییەکانی سـوورەی فـاتیحە بە پێـی پێداویسـت لەسـەر ئەساسی نەزەری زانایان ڕادەنێین.

﴿١﴾ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ
**بە نێوی ئەو خودایەی کە خاوەنی بەخشش و بەزەیە.**

ڕازێک لە سەر بەخشندەگی خودا، بەخشینی خودا وەک بەخشینی ئینسان نـاچێ و نیـیە، چونکە ئینسان هەچی بەخشی، لە ژێر خاوەنی و ملکایەتی ئەودا نامێنێ و تازە هیچ حەقێکی لە سەر ئەو بەخشـراوە نییە، جگە لەوەش ئەو شتە بەخشـراوە لە خەزنە و دارایی ئەو ئینسـانە کەم دەبێتەوە. بەڵام بەخشینی خودای تەعالا هەرگیز لە ژێر خاوەنی و ملکایەتی خودا ناشتە دەرێ. بەڵـکە هەر ئـی خـودایە و لە خەزنە و خەزانەی باریتەعـالا کەم نـابێ و هـیچ مـنەت و چاوەڕوانیەکی خودای تێدا چاو ناکرێ بەغەیرەز ئەوە، ئەو عەبدە لە سـەر ئەسـاس و وەزیـفەی عەبدایەتی پێویستە شوکری ئەو نیعمەتە بکا.

﴿٢﴾ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ
**ستایش و پێهەڵاکوتن هەر شایانی خودایە کە پەروەرندە و ڕاهێنەری جیهان و جیهانیانە.**

ئاوڕدانەوەیەک وەسەر ئەو ڕاز و مەبەستانەی لەو ئایەتە پیرۆزەدا هەستیان پێ دەکرێ.

زەمانێکی دڵ لە ئایەتی هەوەڵدا ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەو یەقینە گەیی کە سەرچاوە و مەزهەری هەچـی بەزە و ڕەحـم و بەخشـش و میهرەبـانییە، زاتێکـی پـاک و تـاق و تەنیـا و بێهاوتایە، بێوەسیلە و واسیتە خاوەنی سیفاتی کەماڵ و جەمـاڵ و جەلالە، خودبەخـود دڵ و

دەروونی هەستیار زمانی مەدح و سەنا و ستایشی بـۆ وەکـار دەخـا و پێـی هەڵـدەڵێ و دەڵـێ: خودایە هەست و نیستم لە تۆڕایە، سەراپای نیعمەتەکانم لە تـۆڕایە، لە شـان و بـاهۆی ئەقـڵ و شعووری منڕا نییە، هیچ هەست و خوستێک بێ ئیزن و ئیرادە و مەشییەتی تۆ نییە؛ جا کاتێکی دڵ بەو قەنـاعەتە گەیـی و ئەو ڕاسـتییەی بە تەواوی دەرک کـرد کە وەدیهێـنەر و حـاملێنەر و ڕاهێـنەری گـش بـوونەوەر هەر خـودایە و دامەزرێـنەری تەواوی نیزامـی هەسـتی هەر ئەوە دە سەراپای ئەو بوونەوەرەدا، بگرە لە نەباتات، لە حەیواناتی بەڕی و بەحـری و هەوایـی، هەسـتی خۆ ئیدارە کردنی لە ناخی هەسـتیاندا نـاژتووە و چانـدووە، بەتـایبەت دە ئینسـاندا، بەراوەرد و بەرجەوەندی هەمووشتێکی پێ بەخشیوە، جا لە سەر ئەو دەرک وفەهمەی ئینسـانی، و لە سـەر ئەساسی ئەو ڕاستی و واقیعیەتەی کە هەیە، شایانی ئینسانە خۆ حازر کـا بـۆ حەمـد و سـەنا و ستایشی ئەو زاتە بێوێنە و تەنیایە، بە ئەلفاز و کەلیماتـی بـێوێنە، ئەدێـرەدایە خـودای خـاوەن حیکمەت و حەکیم ئەلفاز و کەلیماتی بابەت و تایبەتی خۆی ﴿بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ﴾ ئیلهام و ئیلقای هەست و دەروونی ئینسانی دەکا و فێری دەکا بیڵێ و بەو ئەلفـازانە حەمـد و سـەنای خودا بکا.

هەروا لە سەر ئەو ڕەوەندە، ئینسانی هەستیار و ئەقڵاوی هەستی ئەوەی دەکـا: خـودایەکی کە وەدیهێنەر و ڕاهێنەری عالەم بێ، دەشبێ لەمەڕ ژیان و حەسانەوە و حاوانەوەی گشتی ئەو بوونەوەرە رَحمان و رَحیم بێ، واتا بەخشندەی ڕزق و ڕۆزی و ئاو و هەوا و حەسانەوەیان بـێ و بۆ حیفزی گیان و ژیانیان سـرشتیان بکاتە نیگەهبان و ڕاهێنەر و حاوێنەریان.

هەروا دووبارە دڵی هەستیار و ئەقڵی هۆشیار هەست بەو واقیعـیەتەش دەکەن کە عـالەمی ئینسانی مەسئول و موکەللەف و خاوەنی نەفسی سەرکەش و بزۆز دە دنیـای ئـاوا ڕازاوە و پـڕ لەززەت و زینەت و زەنبەر بێگومان تووشـی هەڵە و تـاوان و خەتـا دەبـێ و لە ڕۆژی تـۆڵە و سزادا بە داماوی و سەرشۆڕی دەمێنێتەوە. خۆ دیارە خودای ئیکرامگـری ئینسـان غافـڵ نیـیە لە هیدایەت و ئیرشادی ئینسان چونکە دەیهەوێ عەبـد بە سـەربەرزی بـژی و بە چـاک و پـاکیش بێتەوە دیوانی خالیقی خۆی؛ جا لە سەر ئەو ئەساسە پاکە ئیلهامی بە ڕوحی عەبدی خۆی دەدا جگە لە بەرەو پیروەچوونی تۆبە و تۆبەکاری، پاش ﴿اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ العالَمِين﴾ ئەو لەفزانەی خۆی

فێر دەکا بیانڵێ: الرّحْمٰنِ الرَّحیم: بەخشندەی ژین و حەسانەوە و ڕزق و ڕۆزی لە دنیادا بە گشتی گیانلەبەر و بەخشندەی تاوان و خەتای ئەوانەی لە پتەیان دەرچووە بەڵام خاوەنی هەستی ئیمان و بڕوا بوون بێ.

پاش بەیانی ناوی خودا و بسم الله و حەمد و سەنای خودا و الحمد لله دەچینە خزمەت ئایەتی سێ کە عەبد فێر دەکرێ لە لایەن خودای خاوەن ڕەحم و بەزە کە ئەو دوو سیفەتە بەرز و پڕ لە هیوا و هومێدە بڵێن تاوانبارەکان:

> ﴿٣﴾ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ
> **بەخشندەیە و بەبەزەیە.**

## ئاوڕدانەوەیەک لە سەر دووپات کردنەوەی الرحمن الرحیم

دڵ هەست بە سوڕ و ڕاز دەکا، جارێک دە ئایەتی بسم اللهدا و جارێکیش پاش الحمد لله رب العالمین دەبێ ئەو سوڕ و ڕازە پەیسەری بگیردرێ بەڵکوو دەس بدا و بکرێ بەشی ئیقناعی دڵیان شتێک دەس کەوێ.

لە سەر ئەساسی بەراوەرد و ئەقڵ و ڕاوێژ، و بە گوێرەی نەزم و تەرتیبی ئایەتەکان، دەبێ سوڕەکە ئەوە بێ: بەسیەتی نەزەری ئەو قورئانزانانەی کە پێیان وایە بسم الله ئایەتێک نییە لە سوورەی فاتیحە بەڵکە ئایەتێکە لە سوورەی «نەمل» و لە باقی سوورەکانی قورئان، هەر بۆ سنووردار کردنی سوورەکانە، بەو پێیە دوو سیفەتی الرحمن الرحیم دە سوورەی فاتیحەدا دووپات نەکراوەتەوە بەڵکە هەر یەکپاتە، ئەویش لە پاشی الحمد لله رب العالمین.

وە بە نیسبەتی نەزەری ئەو کەسانەی کە دەڵێن بسم الله... ئایەتێکە لە حەوت ئایەتی سوورەی فاتیحە، دەبێ ڕازی دووپات بوونەوەی الرحمن الرحیم دە سوورەی فاتیحەدا هەر ئەوە بێ: لە سەر ئەساسی عورف و عادەت تا ئاشنایەتی و تێکەڵاوی و لێکنزیکی لە سەرەوەران و خۆشەویستان بێ، تام و لەززەت و ئەویننداری زیاتر ڕۆدەچێ لە ناو دڵ و دەروون و هەروا ڕەحمەت و بەرەکەت و بەزە و بەخششی خوداش تا زیاتری بێنی و بەری دە ناو دڵدا بیجووی و کاوێژی کەیەوە، زیاتر ڕیشە دادەکوتێ و پەرە دەستێنێ لە ناو هەستەی لەش و گیاندا، حەتا

حازره دڵ وەک پەروانە خۆی هێندە لە گڕی شەمعی وە نیزیک خا تا دەسووتێ.

ئێستاش دڵ لە سەر ئەساسی تێگەیشتن و بەرجەوەندی لە مانا و هەستی ئەو دوو سیفەتی پڕ خێر و هیوا و هومێدی دنیا و ئاخرەت وەک الرحمن الرحیم بن، دەیهەوێ ئەو مزگێنییە ڕاستییە بکاتە ویردی دڵ و زمانی، جا خودای ڕێزگری ئینسانی کە ئاگاداری هەستی دڵ و دەروونە، حەزی ئەوەی کردووە ئەو ئاوات و ئەو هەستەیەی دڵ و دەروونی بۆ بکاتە ئەرکێکی عیبادەتی، هاتووە ئیلهامی ڕوحی ئینسانی خاوەن ئیمانی کردووە و فێری کردووە کە ئەو لەفزە پڕ خێر و بێرانەی الرحمن الرحیم پاش ئایەتی ﴿الحمد لله رب العالمین﴾ وەرد داتەوە هەتا وەک بۆنی میسک و عەنبەر هەستەی دڵ و دەروون و هومێدی بۆن خۆش کا.

**ڕازێک هەیە** لە دووپات بوونەوەی ئەو دوو سیفەتانە، ئەویش ئەوەیە: کەسێک دەتوانێ بە بەربوو و بەهرەی ئەو دوو سیفەتانە بگا کە بە بەخشش و بەزەیە، کە دە ئەخلاق و دڵ و دەروونی خۆیدا سیفەتی بەخشین و ڕەحم و بەزە و ئینساف پێکبێنێ، خودای تەعالا بۆیەی ئەو دوو سیفەتانە فێری ئینسانی کردوون و پێی ڕاگەیاندوون کە ئەوانیش نیسبەت بە ژێردەستانی خۆیان بەخشین و بەزە و ڕەحمیان بێ، دەنا خۆ فریو نەدەن و خەڵکیش فریو نەدەن، و خوداش دیارە فریو نادرێ، و وشەی بێ عەمەل لە کن خودای خاوەن عەدڵ و داد بەتاڵە، بێڕەونەق و بێبازاڕە. ئەوە بوو ڕەمزی دووپات بوونەوەی الرحمن الرحیم دە سووڕەی فاتیحەدا، ڕەحمەت لە باشتر و ڕاستتری.

هێندێک لە قورئانزانەکان کوتوویانە رحمان عامە، شامیلی حاڵی هەچی گیانداره لەمەڕ ژیان و حەسانەوە و حاوانەوە، رحیم خاسە، واتا تایبەتی ڕۆژی ئاخرەتە بۆ گونەحبارانی خاوەن ئیمان.

ئاوڕێک و هەڵوێستێک و ڕامانێک: کاتێکی دڵ بەو یەقین و قەناعەتەی گەیی رحیم مزگێنی بۆ ڕۆژی قیامەتییە دەبێ یەقینیشی لە سەر هاتنی ڕۆژی قیامەت پتەو بێ و دەشبێ ئەوەشی باوەڕ بێ کەسێک دەتوانێ لەو ڕۆژە سەختەدا تاوانبار ببەخشێ کە حاکمی موتڵەق بێ واتا هەم زاڵم ببەخشێ هەم مەزڵووم ڕازی کا و قانیعی کا، کەسیش ڕێگای ئەوەی نەبێ بتوانێ ڕەخنەی لێ بگرێ، چونکە قەزاوەت و حاکمیەتەکەی هێندە بەجێوڕێیە، جا خودای ئاگاداری

هەستی دەروون لە سەر ئەو نییەت و باوەڕ و بۆچوونەی دڵی ئینسانی خـاوەن بـاوەڕ، ڕەحمـی بـزووت بەرەو ئینسـان هـات ئیلهـامی دا بە دڵ و دەروونـی کە بـۆ ئیسـباتی بـاوەڕی بە ڕۆژی ئاخرەت، ئەو لەفزانە فێر بێ و بیانکاتە بەشێک لە ئەجزای عیبادەتی بڵێ:

﴿٤﴾ **مالِكِ يَومِ الدّين**
**پادشای ڕۆژی پاداش و تۆڵەی.**

## تێوەڕامانێک و سـرنجێکی هەستیارانە لەو ئایەتە ﴿مالك يوم الدين﴾:

باوەڕ بوون بە ڕۆژی پاداش و تۆڵە ئەساسی ئیمان و ئەخلاق و ڕەفتاری چاکە، وەسـیلەی گەڕانەوەیە لە بەدڕەفتـاری و فەسـادکاری، و دەشـبێ لە بـاغەڵ ئەو بـاوەڕەدا ئەوەش بکەیـنە تێشووی باوەڕ و ئیمان و قەناعەتی دەروونی: کەسێک دەتوانێ مالکی ئەو ڕۆژەی بێ کە جـگە لەوەی ئاگاداری هەمـوو ئاکـار و ڕەفتـاری ئینسـانی بـێ، بشـتوانێ زوڵـم لێکـراو لە خەزانەی ڕەحمەتـی خـۆی ڕازی کـا و دابینـی کـا تـاکوو دەس هەڵگـرێ لە تـۆڵە سـتاندن لە زاڵــم و زۆردارانێکی کە لە کاتی خۆیدا عەزابیان داوە، ئەودەم ڕێگا بۆ خودا دەبێتەوە هەم بەشی خـۆی ببەخشێ هەم بەشی ئەو مەزڵوومەی. دیارە ئەوەش لە دەس خـودایەک دێ کە ئەو سـیفەتانەی بێ: اَرحَمُ الراحمين، عَلّـام الغيوب، مالکی مطلق، حاکمی مطلق، **بێشەریک، بێوەزیر، بێنەزیر، بەتوانا و دەستەڵات، خاوەنی بەهەشت و دۆزەخ**، دیارە خـاوەنی ئەو سـیفەتانەش هەر خـودای **ربّ العالمین** دەبێ و بەس.

جا لە سەر ئەساسی ئەو بەراوەرد و بەرجەوەندییەی ئینسانی، خودای خاوەن ڕەحـم و بەزە و عەداڵەت و ئاگادار لە هەستی دڵان بەرەو پیری بەزەی عەبدی هات کە فێری کا و تێی گەیێنێ پاش باوەڕی بەو دوو سیفەتە بەرزانەی رحمان ورحـیم خـۆ بـاوێتە بـازی چـوار کە مالـك یـوم الدینـە واتا ئایەتی چوار. بە زمان ئیقراری پێ بکـا و بە دڵـیش بـاوەڕەی پـێ بکـا و بە ئاکـار و عەمەلیش سابیتی کا چونکە زەمانێکی دڵ هەستی بەڕاستی و واقیعی بە مالکی ڕۆژی ئاخرەت کرد و زانیی ڕۆژێکی ڕووبەڕووی مالک ڕایدەگرن، نـاتوانێ لە ترسـی ئەو ڕۆژەی بە ئەنـدازەی

سەرە هەودایەک خیلافی ئەمر و دەستووری ئەو پادشایە بکا. ئەگەر بیکا، بە عەمـد مانـای وایە باوەڕی دەڵەمەیە، نەمەییوە، ئاوی باوەڕ و ئیمان نەگەیوەتە ڕەگ و ڕیشەی دڵی.

دڵی هەستیار دەناو دەروونی ئایەتی مالك یوم الدین‌دا هەست بە ڕازێکی دەکـا، دەیـهەوێ حاشاری نەدا، ئەویش ئەوەیە: خودا فەرمووی مالك یوم الدین نەیفەرموو: مالکی بەهەشت، یـا مالکی دۆزەخ. ئەئەوە ئەگەر سەرنجێ بەئینسافەوە بگرین، ئەوەمان پێ دەڵێ و فێرمان دەکـا کە ئێمەی خاوەن باوەڕ و ئیمان بە خاتری لەززەت و خۆشیی بەهەشت یا لە ترسی ئاگری گڕداری دۆزەخ، بەندەگی خودا بکەین، بەڵکە دەبـێ ئەساسـی بەنـدەگین لە سـەر ئەساسـی وەزیـفەی عەبدایەتی بۆ مەعبوودی بەحەق بێ، دەگەڵ عەلاقە و خۆشەویستی کامڵ بە خودا و ڕەسووڵ، و هەروا لەو ڕوانگەوە بـڕوانین کە بەهەشـت مەزهەری ڕەحـمەتە بـۆ خـاوەن ئیمانـان و دۆزەخ مەزهەری غەزەبە بۆ بێ‌ئیمانان.

زەمانێکی ئەقڵ و دڵ باوەڕیـان کـرد بە قەنـاعەتی تەواو کە دەبـێ دڵ ئـیمان و بـاوەڕی بە خودای تاق و تەنیا بکاتە کڵی دڵ و ئەو ئـیمان و بـاوەڕەش بە ئەعـمال ڕەنێـو بێنـێ و هەروا بە حەمـد و سـتایش وەیڕازێنـێ، و ئەوەش بـاوەڕ کـا ئەو خـودای ڕانەر و ڕاهێـنەری جیهـان و جیهانیان، **ڕەحمانە، ڕەحیمە، مالکی ڕۆژی پاداش و تۆڵەیە،** جـا کـاتێکی هەسـتی دڵ هەسـتی ئەوانەی دە ناخی خۆیدا ناشـت و چانـد، خـودای خـاوەن حـیکمەت و حەکـیم و ئاگـاداری هەستی دڵان، لە سەر ئەساسی ئیکرام بۆ ئینسان ئەو کەلیمانەی خـۆی إِيّاكَ نَعْبُدُ و إِيّاكَ نَسْتَعينُ ئیلهامی قەلبی دەکا بیانڵێ بۆ ئیسباتی عەبدایەتی. بڕوانە و هۆشی دەیە ئەو دوو ئایەتە عەبـدی دە باوەش دەگرێ:

**﴿٥﴾ إِيّاكَ نَعْبُدُ و إِيّاكَ نَسْتَعينُ**

**هەر تۆ دەپەرەستین خودایە، هەر لە تۆ کۆمەگ و پشتیوانی دەخوازین، خودایە.**

## ئاوڕدانەوەیەک و ڕامانێک لە سەر ئایەتی (٥):

ئەوە کە خودای ئیکرام و ڕێزگری ئینسانی، عەبدی خۆی فێر دەکا بۆ ئیسباتی بەندەگی ئەو لەفزانەی خودای خۆی بڵێ: إِيّاكَ نَعْبُدُ و إِيّاكَ نَسْتَعينُ دڵی هەستیار و نوورانی بە نووری ئیمان، بە ڕەحم و بەزەی خودا ئـاوەدان دەبێـتەوە و هەسـت بە عەزەمەت و قەداسـەتی خـودا دەکـا و

دەکەوێتە ئەو باوەڕ و قەناعەتەی خودا ئینسانی خۆش دەوێ بۆیە بە کەلیماتی خۆی فێری دەکا عەبدایەتی خۆی ڕاگەیێنێ، و حەتا ڕوحی پاک و خاوێنی ئینسان دەگاتە ئەو باوەڕ و قەناعەتەی خودا بۆ ئینسانی هەموو ڕەحم و بەزە و ئیکرامە و لەو لایەشەوە هەست دەکا کە ئینسان بە دەس نەفس و هەواوە گرفتار و زەلیلە، ئەگەر هاتبا و خودا ئاوای فریا نەکەوتبایە و نەیقۆزباوە بە ڕەحم و کەرەمی سەراپا دۆڕاو و دزراو دەبو، جا لە سەر ئەساسی ئەو بەراوەردە دڵ ئاوەدان دەبێتەوە و بە تاو و تینێکی تایبەتی دەروونی، ئەویش ئەوەیە: بە یەقینەوە دەزانێ دەبێ دنیا بەجێ بێڵێ و بڕوا پاڵ وە لیقای خودا بدا. بە هەموو ئاکار و ئەعمالی، لەسەر ئەو باوەڕە یەقینەی، گورج و توندوتۆڵ پێش ئەوەی کار لە کار بترازێ، دەیهەوێ فریای خۆی کەوێ، پەیمان دەگەڵ خودای خۆی نوێ کاتەوە، بەو کەلیماتە مبارەکانەی إِيّاكَ نَعْبُدُ وإِيّاكَ نَسْتَعِينُ ئیقرار بە تەوحیدی عیبادی بکا و لەو پەیماننامەیەیدا ئەوەی ڕاگەیێنێ: خودایە تەنیا تۆ دەپەرەستم و هەر بە تۆ پشت دەبەستم، و هەر لە تۆ هیمدادی مەعنەوی دەخوازم، بۆ دەفعی موشکلاتم هەر تۆی وەسیلەی مەعنەوی، یانی ئیستیعانە بە هۆی ئەسبابی تایبەتی بە شەرتێکی هەر خودای بە موئەسیری موتڵەق بزانی، دژایەتی دەگەڵ ئیستیعانەی موتڵەق کە هەر لە خودایە نابێ، واتا تەئسیری موتڵەق بۆ ئەسباب قایل نەبێ، بەڵکە وا بزانێ موئەسیری موتڵەق هەر خودایە.

پاش بەیانی حەمد و سەنای خودا بە الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ و ئیقرار بە ڕبووبیەت و سیفەتە ڕەحمەکانی: الرَّحْمـنِ الرَّحِيمِ و ئیقرار و باوەڕی بە مالیکییەتی ڕۆژی ئاخر: مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ و دابەستنی عەهد و پەیمان لە سەر پەرستنی: إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ دەگەینە دەراوی ئەو باوەڕ و قەناعەتەی کە بۆ مانەوە و بەردەوامین لەسەر ئەو ڕێباز و ڕێگە ڕاست و بەحەقە، هیدایەت لە خودای خاوەن هیدایەت بخوازین، کە بە بەردەوامی لە سەر ئەو ئەقیدەیە وەنهێڵێ، و لە هیدایەت و شارەزایین بێمەیلی نەنوێنێ.

بڕوانە و ئینساف وەکار خە، خودا لە سەر ئەساسی وەعد و بەڵێنی خۆی بە عەبدی کە فەرموویەتی داوام لێ بخوازن داواو بەجێدێنم: وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ «غافر: ٦٠» (پەروەردگارتان فەرموویە: لە بەرم وەپاڕێن، جا بە دەنگتانەوە دێم) بە هاواری عەبدی وەهاتووە خودا و ئاوڕی بە ڕەحمەوەی وەسەر داوە کە ئیلهامی کردۆتە حەیاتی پاکی و فێری کردووە ئەو

کەلیماتانەی بڵێ لە کاتی عیبادەتی و وێستانی ڕوو بە خودا واتا نوێژ، بڵێ: اهدِنَـــا الصـــراطَ المُستَقِيمَ .

۞ اهْدِنَـا الصِّـراطَ المُستَقِيمَ
«ئەی خوای خاوەن هیدایەت» شارەزای ڕێگای ڕاستمان کە.

## ڕێگەی ڕاست کامەیە؟

ئاوڕێک و ڕامانێک وەسەر ئەو ئیلهامە بەزەییانەی ڕەببی جەلیل وەسەر فێر کردنی عەبـدی بەو کەلیماتە مبارەکانە: اهدِنَـا الصِّـراطَ المُستَقِيمَ.

ئەگەر ئینسان ئاقڵانە و ئینسافانە بڕوانێتە خۆی و خودای خۆی بە ئاسانی تێدەگا و چـاوی دەکا کە خودا دەگەڵی بەکەڕەم و میهرەبانە، بەو دەلیلانە: بەرتەری و ڕێزی وە سەرووی هەمـوو گیانلەبەرێک خسـتووە بە هـۆی نوتـق و بەیـان، و بە هـۆی تەفەککـور و ئەندیشـە و بەراوەرد، سەرەڕای ئەوانەش چاکە و خراپەی دادۆشیوەتە ناخی هەسـتەی مێشـک و دەروونـی بە هـۆی ئیلهامی باتینی ﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ۞٨﴾ «شمس» خودا هەموو تاوانباری و پارێزگـاری دە ناو هەستی دەروونی ویژدانی ئاخنیوە.

دەبێ ئینسان ئەوە بسەلمێنێ ئەگەر خودا ئینسانی کردۆتە خەلیفەی خۆی و ئەمانەتی خۆی پێ سپاردووە، زوڵم و زۆری لێ نەکردووە، چونکە ئینسان روحـی پـاکی و ئەقڵـی چـالاکی لە ڕۆژی ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾دا بۆخۆی بە خاهانی خۆی لە سەر ویستی خۆی کوتـوویەتی ﴿قَـالُواْ بَلَىٰ﴾ واتا بە ئینسانی کوتووە: ئەمن پەروەرندەی وەم، دەمپەرەسـتن؟ کوتوویـانە: بەڵـێ، ڕەببـی مەی، ئیتاعەت دەکەین. دە ئێستاش هەر هەمان ئەقڵ و ڕوحە دەبـێ لە سـەر پەیـمان و بەڵێنـی ڕۆژی ئەزەل وەمێـنن و بەردەوام بـن، سـەرەڕای ئەوەش خـودای خـاوەن کەڕەم، بە ڕەحـم و کەڕەمی خۆی ئینسانی بۆ هەڵگرتنی ئەو کۆڵ و بارە ئەمانەتە و بۆ دەستەوەکەری دەگەڵ نەفـس و هەوای شەڕی زینەت و لەززەتی دنیا بە هەموو کەرەسـە و ئەسـبابی ئامـادە و تێـر و تەسـەل کردووە، وەک: **ئەقـڵ، دەرک و بەراوەرد، نیزامـی کائینـات.**واتـا نیزامـی تەکـوین و تەشـریعی پێغەمـبەران، قورئـان، ئـاڵوگۆڕی وەرزان، پیـری، مـردن. سـەراپای ئەوانە هـاوارن لە ئەقڵـی ئینسانی، دەبێ بزانێ هاتنی بۆ سەر زەوی یەکجاری نییە، کـاتییە، تـاقیکردنەوەیە، دەگەڕێـتەوە

لای ئەو خودایەی پەیمانی دەگەڵ بەستووە دە ڕۆژی ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾دا واتا ڕۆژی بەرێ (ئەزەل) یانی ئینسان لە هیچ بارێکەوە ناتەواوی ئەسباب و کەرەسەی شەڕ وەهرای دنیایەی تێدا چاو ناکرێ بەڵام خۆ وە دەمدانی نەفسی چڵێس و ئەممارە و خۆ مڕ کردنی بە ئارەزوو و هەوا و زینەت و لەززەتی دنیای ڕازاوە، دەستەجڵەوی ئیختیاری سەربەخۆیی لە دەس ئەقڵ و شعوور دەردێنن و هەچی چەک و سیلاحی شەڕ دەگەڵ دنیای نەفس و ئارەزوویە، کە خودا پێی بەخشیوە لەشکری شەیتانی لێی دەستێنن، ئەسیری دەکەن تا ڕۆژی خۆی، بە ڕووت و ڕەجاڵ و بێ دەسمایە و بێ سەرمایە وە ڕووی خودای دەخەن، یانی وای دەشارنەوە ناهێڵن بە خۆ بزانێ تا دە پاڵ خودای داوێژرێ.

جا ئینسان بۆ بەرگری لەو فیتنە گەورەیە و بۆ دەستەوەکەری ئەو شەڕە دەستەویەخەیەی نەفس و هەوا دەگەڵ ئەقڵ و ئیمان، نیازی بە تەواوی بە هیمداد و یاریی خودای خاوەن هیمداد هەیە، دەبێ داوای هیدایەتی لێ بکا و یاریدەی لێ بخوازێ کە دوژمن نەتوانێ لە ڕێی ڕاستی تلاسا کا و بیخزێنێ، دیارە ئەگەر ئینسان داوای لە سەر ئەساسی ئیمان و باوەڕی پاک و خاوێنی بێ، خودا دێ بە هاواری، هەروەک ئەوەتانێ فێری دکا بەو ئەلفازە پیرۆزانە ﴿اهدِنَا الصراطَ المُستَقِيمَ﴾ دە کاتی عیبادەتی ڕووبەڕوویی واتا نوێژ، لە بەر خودا وەپاڕێ تاکوو بەدوور بێ لە هێرشی لەشکری شەیتانی وەک دنیاپەرەستی و خافڵان بە زینەت و لەززەت و زێڕ و زەنبەر بێ.

دێرەدا واتا دە وشەی «اهْدِنَا»دا هەست بە ڕازێک دەکرێ وا چاکە پاش گوێ نەدرێ، ئەویش ئەوەیە: خودا کە فێری ئینسانی دەکا بە جەمع داوای هیدایەت بکا نەک بەتەنێ، دەیهەوێ دە عەبدی بگەیەنێ سەعادەت و خۆشبەختی لە کۆمەڵەوەیە، یانی فەرد بە تەنێ ناتوانێ خۆشبەخت بێ و وەحەسێ حەتا گەل و کۆمەڵی خۆشبەخت و حەساوە نەبێ. چونکە تەک‌تەکی فەرد مەسئوولە لە بەرابەر جامیعە. لەسەر ئەو ئەساسە خودای تەعالا ئینسانی فێر دەکا بۆخۆی و بۆ کۆمەڵ بە لەفزی ﴿اهْدِنَا﴾ داوای هیدایەت بکا.

### ئاوڕێک و تێبینییەکی وردتر لە سەر هیدایەت

دیارە خودای مەزن بە هۆی ئیلهام دایدۆشیوەتە ناو هەستی دەروون چاکە و خراپە

﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ و ڕێگای ڕاست و خواریشی هەر وا لێ حاڵی کردووە، و تەنانەت ئەوەش چاک دەزانێ: چاک و چاکتر، ڕاست وڕاستتر یانی ئەقڵ ئەگەر هاڵۆز نەکرێ و سەری لێ نەشێوێنێ دنیا، کەم شت هەیە لێکی هەڵناوێرێ.

جا خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم، دەیهەوێ یاریدەی ئینسانی بدا و فێری کا، کە داوای ڕێگای ڕاستی پڕ لە نیعمەت بکا واتا ئەو ڕێگایەی کە بە عینوانی نیعمەت بەخشیوەتی بە خاسان و پاکان وەک: **پێغەمبەران، شەهیدان، ساڵحان و...** بڕوانە بۆ باوەڕی لە ئایەتی ۶۹ سوورەی نیساء: ﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَـئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقًا﴾ کەسانێکی ئیتاعەی خودا و ڕەسووڵ بکەن، ئەوانە وان دەگەڵ ئەو کەسانە کە خودا ناز و نیعمەتی خۆی ڕژاندۆتە سەریان، وەک ڕەسوولان، شەهیدان، ڕاستگۆیان، چاکەکاران، ئای ئەوانە چەندە هاواڵێکی چاکن!

پوختەی مەبەست لە سەر ڕێگای ڕاست: لە سەر ﴿صِرَاطَ مُسْتَقِيمَ﴾ زانایان ڕا و بۆچوونیان زۆر لە سەر دەربڕیوە، هەمووشی هەر بۆ لای خودای بێشەریک دەچن و لە مەسیری خوداناسیدان. ئەمنیش هەست و نەزەرم وایە، بۆ لای خوداچوون و خوداناسی بەبێ سینە و دڵی پاک و ساف هەر هەرا و هاواری بێبەهرەیە، بۆ باوەڕی بڕوانە لە سوورەی شوعەرا: ﴿٨٨﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٩﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ئەو ڕۆژەی کە سەروەت و حەولاد سوود نادەن، بەڵکە تەنیا ئەو کەسەی کە بە دڵی ساف و پاک ژیاوە و دەشتە بارەگای خودای، ڕزگارە.

دڵی پڕ هەست و هەستیار کاتێ بەرجەوەندی ئەو هەموو نیعمەت و ڕەحمەت و بەخشش و کەرەمەی خودا بوو، بە ئارامی دەڕوانێتە دەرووی هیدایەتی خودا و بەزەی تەواوی، هەموو گیان و لەشی بە تەواوی دەکەوێتە ئەمنیەت و خۆشی و حەسانەوە لە ژێر سایەی ئەو نیعمەت و لەززەتە بەردەوامەی، بەڵام کە دەڕوانێتە کلکەی ئایەتی ﴿٧﴾ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ. ڕادەچەنێ و دادەچڵەکێ و دەتاسێ و سام دەیگرێ و دادەمێنێ، دەکەوێتە سەر ئەو خەیاڵ و بیرەی: کە لە پاشی هیدایەت و نیعمەتی بەزەی خودا، تووش بوون بە زیللەت و جەهل و گومڕایی وەبەر قەهری خودا کەوتن هەیە، بە شەرتێ لە جوغزی سپاس و شوکری نیعمەت

بچیە دەرێ.

جا بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارەی ئەو مەترسییە دەبێ ئەقڵ و سەلیقە و شعوور وەخۆ کەون، سەرنج بدەنە وەعدە و بەڵێنییەکانی خودای تەعالا، کە ئایا خودا ئیشارەی وەلای ئەوەی کردووە پاشی هیدایەت گومڕاهی هەیە، بۆ بەرگریشی چارە هەیە؟ بەڵێ؛ بڕوانە لە ئایەتی رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا... ﴿٨﴾ «آل عمران» زانایان و دڵزیندووان دەڵێن: پەروەرندەمان! دڵمان لە ڕێی ڕاست پاش هیدایەت ئاوەژوو مەکەوە.

ئەو ئاگادارییە ئەوە بە ئینسان دەڵێ لە زۆری نیعمەت و خۆشیدا غروور و لەخۆبایی هەیە، دەبێ وریا بێ ئینسان لە خودا وەپاڕێ بیپارێزێ و هەروا بۆ باوەڕی زیاد لەو بارەوە بڕوانە: وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾ «ابراهيم» ئینسان ئاوڕ دەوە سەر هاواری خودا کە پێت ڕادەگەیێنێ و دەڵێ: ئەگەر شوکری نیعمەتەکانی من بکەن بۆو زیاد دەکەم، ئەگەر ناشکوریش بکەن و پێی غەڕرە بن، ئەوە عەزاب و جەزرەبەم توند و تیژە بۆتان.

هەروا بۆ زیادە باوەڕی بڕوانە: ﴿٦﴾ كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى ﴿٧﴾ أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى «علق» بە زۆری ئینسانی لە خۆبایی و غروور دەکەوێتە بێ ئەمری خودا، ئەگەر خۆی بە ساماندار دی.

تیوتیوەی پوختەی مەبەست لە سەر ئاوەژوو بوونەوەی پاش هیدایەت: ئەو قۆڵ و تاقمەی کە بە نیعمەتی هیدایەت ڕازاونەوە و شارەزای ڕێی ڕاست کراون، دڵیان بە تێر و تەسەلی پاراو کراوە بە ئاوی تەقوا و خزمەتی سادقانەی دین و ئینسان.

بەڵام ئارەزووی نەفس و هەوای چڵێس و لەززەت پەرەست و فریوخۆر بەری چاوی دڵ و ئەقڵ و شعووری گرتوون و پەردە و تارمایی بە سەر کێشاون لە صراطَ مُستَقِيمَ تلاسای کردوون، خستوونیە دەرووی تەنگی جەهلی نەفامی و کەوتوونەتە ژێر یاسای ئایەتی ۱۰۴ی سوورەی کەهف کە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا﴾ ڕەنج بەخەسارترین کەسێکن: ئەوانەی کە حەول و تێکۆشانی دنیایان بێهوودە دەڕوا و بە هەدەر دەچێ و بۆ خۆشیان وا حاڵین کە بە چاک و پاکترین دەستوور عەمەل دەکەن.

وەک جوولەکەکانی دەورانی حەزرەتی ڕەسووڵ هێندە ڕۆچووبوون لە عیشقی هەوا و

هەوەس پەرەستی و ڕەگەز پەرەستی، چاو و دڵیان ﴿صـراط مستقیم﴾یان نەدەدی و دڵی تاریک و وێرانیان بە تەم و تومانی هەوا و ئارەزووی دنیا ڕەش هەڵگەڕابوو، و حەتا لایان قاڕ و نەنگ بوو ئیتاعەی پێغەمبەری بکەن، دەگەڵ ئەوەی لە ئەسەری دیتنی موعجیزەکانی حەزرەت هەستی ئەوەیان دەکرد کە حەقە، ڕەسووڵە، بەڵام چونکە شەیتانی لەخۆبایی چاوەی دڵی داگیر کردبوون، دەرەتانی ئەوەی لێ بڕیبوون ڕوو بەرەو حەق وەرگەڕێن. هەربۆیە کەوتبوونە بەر شەپۆلی قەهری توورەیی خودا، قەباڵەی ﴿مَغضُوبِ عَلَيهِمْ﴾یان پێ درا و بە سەردا بڕا.

جا لە سەر ئەساسی ئەو هەڵوێستە ناڕەوایانە و تێبینی بۆ بەرگری لەو چەشنە هەڵوێستانە خودای خاوەن حیکمەت و بەزەیی، ڕێزگر و ئیکرامگری ئینسان و ئاگا بە خووخدەی ئینسان دە هاواریانەوە دێ و پێیان دەڵێ: ئینسان نەکا بە ڕەحم و نیعمەتەکانی خودا خۆت لە بیر کەی و غەڕڕە بی و فریو بخۆی و لادەی و لاچی؛ ها، وەپاڕێ بەو کەلیماتانەی من: ﴿غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ﴾ واتا خودایە پاش شارەزا کردنم و نیعمەت پێ بەخشینم، ڕێم پێ نەدەی لەخۆبایی بم و غەڕڕە بم تۆم و خۆم لە بیر بچێ، و غەیری ئەو کەسانەم کەی کەوتوونە ژێر قەهر و غەزەبت بە هۆی غرووری، و غەیری ئەو کەسانەشم کەی کە هەر گەوج و نەفامن لەبەر کەللەشەقیانیان ﴿وَلاَ الضَّالِّينَ﴾ خوایە بەردەوام ڕاگرم بە لە سەر صراطَ مُستَقِيم «ئامین».

هات گەیشتینە قۆناغی ۷ واتا ئایەتی ۷ سوورەی فاتیحە:

> **﴿۷﴾ صِراطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ**
> **ڕێگای ئەوانەی چاکەت دەگەڵ کردوون. نە ڕێگای ئەوانەی کە وەبەر قەهر و غەزەب و توورەییت کەوتوون، نە ئەوانەش کە لاڕێ بوون.**

تێڕوانینێکی ورد و بەرجەوەندانە لە ناو دەروونی ئایەتی ۷ وەک هەستێکی ئەقڵی و زانست هەستی پێ دەکا. سێ ڕێگا دێنە بەرچاو و دڵ: ۱. ڕێگایەک ڕێی ئەو کەسانەی کە خودایان بە حەق ناسیوە و ئیتاعەشیان کردووە پڕاوپڕی ئاداب و ئوسوولی خۆی، هیچ زینەت و لەززەت و فەخرێکی دنیایی و هیچ جەور و جەفایەکی دەوران، نەیانتوانیوە لە ڕێی ئەو ئیمان و باوەڕەیان لار کا و ئاوەژوویان کاتەوە. ئەو دەستەیە وەبەر أَنعَمتَ عَلَيهِمْ کەوتوون. بۆ باوەڕی سەرێک بەم ئایەتەدا داگرە: وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَـئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ

وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ «نساء»

دواکەوتووانی خودا و ڕەسووڵ ئەوانەن: پێغەمبەران، ڕاستان، شەهیدان، ساڵحان. ئەوانە لەسەر ئەساسی ئیمان و باوەڕیان لە ڕێگای خودادا چالاکی وفیداکارییان نیشان داوە بێ کەموکووڕی.

٢. ڕێگایەکی دیکەش ڕێگای ئەو کەسانەن کە بە تەواوی دەرک وفەهمی ڕێگای ڕاستیان کردووە. هەستیان بەوەی کردووە ئەو ڕێگایە دواڕۆژێکی گەش و ڕوون و بەختەوەری تێدایە و چاو دەکرێ، بەڵام نەفسی چڵێس و ئارەزوو و ئاواتی لەززەت و زینەتی دنیا بەری ئەقڵ و شعوور و هەستی خوداپەرەستییان لێ گرتوون. ئەوانیش خۆیان وەدم داون بە ڕادەیەک دەرەتانی ئەوەیان بۆ نەماوەتەوە ئاوڕ دەنەوە سەر دڵی هەستیاری خوداناسی. دزراون و شورت و گوم کراون. لە سەر ئەو ئاکارە نارەوایە کەوتوونە بەر ڕەهێڵەی قەهر و غەزەب و تووڕەیی خودا، وەبەر الْمَغضُوبِ عَلَيهِمْ کەوتوون وەک جوولەکەکانی دەورانی پێغەمبەری. دانزانی محەممەدﷺ پێغەمبەرە، بەڵام ڕەگەزپەرەستی و خۆ بە زل‌گری، ڕێی پێ نەدەدان بچنە خزمەتی و ئیتاعەی بکەن.

٣. دەستەیەکیشیان کە هەر لە هەوەڵەوە شووشەی شەرەف و کەرامەتیان بە سەنگی هەوا و هەوەس و نەفسی چڵێس و غەفڵەت و غرووری ورد و هاژ و هاڕیوە، نووری مەعریفەت و کەرامەتیان ترووسکایی نەماوە تاکوو بەرپێی خۆیان چاو کەن و ڕێگای ڕاست و خوار لێک جیا کەنەوە. ئە ئەو چەوت و چەتوونی حاڵیان بۆتە هۆی ئەوەی وە بن لافاوی ضالِّينَ بکەون، وەک یەهوود و نەساراکان بەرد و دار بپەرەستن.

دڵ دێرەدا هەست بە شتێک دەکا ناتوانێ بە سەریەوە هەڵێ و باز دا. ئەویش ئەوەیە: کەسێک دەرکی حەق و ناحەق نەکا و ڕاست و چەپ لێکەوە نەکا وەک منداڵ و شێت و هەوتی دێتە حیساب کردەوە و ئاکاری لە ڕوانگەی ئایینەوە بێ‌ئیعتبارە، چۆن دەکرێ خودای خاوەن عەدڵ و داد هەڵە و چەوتی ئەو چەشنە کەسانە بە تاوان و خەتا دانێ؟ دەبێ دێرەدا قەناعەت بە دڵ بکرێ و دابین کرێ پێش هەموو شت دەبێ ئەقڵ و هەستی شعوور ئەوە بزانن و بیسەلمێنن، خودای تاق و تەنیا زوڵم و زۆری لە هیچ کەس ناکا و خەتا و تاوان دە ئەستۆی کەس ناپەستێوێ، بەڵکە هەچی بێ بە سەر ئینسانی، لە خۆیڕایە و ئەوانەی شووشەی شەرەف

و ئیمانی خۆشیان شکاندووە، باعیس بۆ خۆیانن و قسوور لە خۆیانەوەیە، نە منداڵن نە شێتن نە هەوتن، چونکە منداڵ ئەقڵ و دەرکی ناکامڵە بۆیە تەکلیفی لێ ناکرێ، و شێت و هەوت و هار بە هۆی لە دەس‌دانی ئەسبابی هەست و شعوور لە ئەسەری نەخۆشی لە ژێر باری تەکلیف دەشتە دەرێ، لە بازاڕی شەرعدا داوای ئەمر و نەهی لێ ناکرێ تا دێتەوە هۆش و ڕەها دەبێ لەو گێژاوە. بەڵام کەسێک تەواوی ئەقڵ و سەلیقە و ئیمانی دە دنیا هاڵێنێ و کۆڵی کا بە دنیا کۆڵی، ئەوە نە شێتە نە هەوتە نە ماخولیایە، بەڵکە گورگی هارە کەوتۆتە ناو مێگەلی شەڕەف و کەرامەتی بەشەری، ئەوە هەم خەیانەتی بە ئەقڵ کردووە هەم بە عەداڵەت هەم بە سرشتی ئینسانی، چونکە ئەوانە لە ئەزەلدا بەرەو خوداناسی هەڵخراون، هەر بۆیە خودای تەعالا ئینسان فێر دەکا وەپاڕێ کە نەیخاتە ڕیزی وان: غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ.

## تیوتیوەی صراط مُستَقِیم

ڕێی ڕاست ئەو ڕێگایەیە کە ڕێڕەوانی لە سەر ئەساسی دەلیل و بورهان هەڵیانبژاردبێ و قبووڵیان کردبێ و دواڕۆژێکی گەش و ڕوونی بەختەوەری تێرا دیار بێ و لە هیچ دەور و زەمانێکدا پەشیمانی تێدا چاو نەکرێ و ئازار و ئەزیەت و زیانی بۆ ڕێڕەوانی تێدا نەبیندرێ و مافی هیچ گیانلەبەرێکی تێدا پێشێل نەکرێ.

ئەو ڕێگایەش بەو سیفاتانەوە زەمانێک دەس دەکەوێ کە لە سەر بنەما و ڕێنومای کتێبەکانی ئاسمانی بێ کە بە وەسیلەی پێغەمبەران ڕاگەیێندراون، چونکە ئەوەی دەتوانێ نیازەکانی ئینسان بێنێتە جێ بێ‌وەی پێش بە نیازی غەیر بگرێ، کتێبەکان واتا یاسای خودایە. دەنا ڕێگاکانی دیکەی هەڵقوڵاوی هەوا و بەراوەردی ئینسانی، کاتی و زەمانین ناتوانن ئاسایش و حەسانەوەی تا سەری گشتی لە خۆ بگرێ. چونکە یاسای خودای لە سەر ئەساسی ئاگاداری هەوەڵ و ئاخری هەموو شت داڕژاوە، بەڵام یاسای داڕژاوی ئەندیشە و تێبینی و بەراورد و بەرجەوەندی ئینسانی لە سەر ئەساسی زاهیری و ڕووکاری دامەزراوە، بەراوەرد و تێبینی دواڕۆژی دەکەوێتە تەسادوف و ئیتیفاق و هەڵکەوت، جا بۆیە غەیری یاسای خودای ناتوانێ بە ئیتمینانەوە زامنی سەعادەت و خۆشبەختی کۆمەڵ بێ تا سەر.

ڕەنگە ئەو پرسیارەن لێ بکرێ و دەشبێ بکرێ چون حەقە: ئەگەر یاسای ئاسمانی حەقە و

حەقترە لە یاسای ئەرزی، هەر ئەو حەسانەوە و ئەمن و ئاسایشی تێدایە زامنی سەر و ماڵ و نامووس و خوێنی ئینسانە، ئەدی بۆ ئەورۆ لەو وڵاتانەی بە ڕواڵەت ئاڵای ئیسلامیان هەڵداوە و لافی یاسای ئاسمانی لێدەدەن، شیعاری ئیسلامی دەدەن، چۆنی بێلەززەتی و بێبەزەییانەیە، خوێن دەڕژێ و کەس خاوەنی سەر و ماڵ و ناموسی خۆی نییە، تەنانەت ئاسایش و ئەمنیەت بۆ ئەو وڵاتانە لە سەر ئەرز و هەوا و دەریاشدا چاو ناکرێ، هەموو عالەم بێزار و داماو و بێزراوە لە ئایین و چاوەڕوانی هیمدادی غەیرە ئایینەکانە؟

وڵام بە کورتی: ئەوانە بە ڕواڵەت ئایینین، گورگن و دە کەوڵی مەڕدان، بۆ باوەڕی سەرێک داگرە بە ماڵە ئایەتی ٢٣ سوورەی جاثیە، وەبەر تیشکی ئەقڵ و ئینسافی دە: أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِن بَعْدِ اللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ «جاثیە»

ئایا تۆ ئەی محەممەدﷺ، ئەو کەسەت دیوە کە هەوا و هەوەسی خۆی کردووە بە خودای خۆی؟ (واتا دوای ئارەزوو و هەوای خۆی دەکەوێ، وەک چۆن موئمین ئیتاعە لە خودا دەکا و پێی حەقە، ئەوانەش ئاوا ئیتاعە لە هەوا و هەوەسی خۆیان دەکەن) هەلیان ڕەخساندووە بۆ وەی خودا بیانخاتە ژێر ڕەهێڵەی غەزەبی خۆی، بۆیە خوداش لە سەر ڕێی هەڵەی خۆیانی هێشتوونەتەوە، دەگەڵ ئەوەی زانا و ئاگاداریشە، مۆریشی ناوەتە سەر گوێچکە و دڵیان و پەردەشی بە سەر چاوەکانیاندا کێشاوە، ئایا کێ هەیە بتوانێ شارەزای کا، پاش خودا ئایا ئەو ماڵ وێران و دڵ تاریکانە بیر ناکەنەوە؟

## هێندێک لە تایبەتمەندییەکانی بسم الله و سوورەی فاتیحە

بسم‌الله سنووردارکەری هەموو سوورەکانی قورئانە بەغەیرەز سوورەی تەوبە، فاتیحەش پوختە و پاڵاوتەی ناوەرۆکی قورئانە.

سوورەی فاتیحە بە الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ داگیرساوە. ئەئەوە ئاماژەیە وەلای ئەوەی خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم دەیهەوێ عەبدی خۆی فێر کا هەموو کارەکانی بە نێوی خودا و حەمد و سەنای خودا داگیرسێنێ، بۆیە لە باتی عەبدی خۆی کەلامی خۆی بە نێوی زات و سیفاتی خۆی دەس پێدەکا و دەفەرمێ: الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

سوورەی فاتیحە بۆیە ناودێر کراوە بەو ناوە (فاتیحە)، قورئان بەوی داگیرساوە و دەس پێکراوە واتا لە حاند نەزم و تەرتیبەوە هەوەڵی قورئانە، نەک لە حاند هاتنە خوارەوە.

سوورەی فاتیحە ئەگەر بە وردی سرنجی درێتێ، دەتوانین بڵێین هەناوی قورئانە بە هۆی چەن بابەتێکی تایبەتی وەک: باوەڕی بە رَبِّ الْعَـالَمِينَ کە ئەساسی ئیمانە و مەغزی قورئانە، هەروەها بە مَـالِكِ يَوْمِ الدِّينِ کە ڕوکنێکی گەورەی ئیمانە، باوەڕی بە ڕۆژی ئاخیرەت و باوەڕی بە مالکییەتی موتڵەقی خودا، هەروەها لەمەڕ عیبادەتی تەوحیدی إِيَّـاكَ نَعْبُـدُ و هەروا لەمەڕ تەوحیدی وەسیلە: وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ. ئەئەوانە کە شاڕەگی قورئانن و دەناو سوورەی فاتیحەشدا ناژراون ئیشارە وەلای بەرز و پیرۆزی سوورەی فاتیحەیە.

سوورەی فاتیحە بە بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَـنِ الرَّحِيمِەوە ٧ ئایەتە، ئەوەش ئاماژە وەلای ئەوە دەکا تا نوێژخوێن خەستە و وەڕەز نەبێ لە کاتی بەجێ‌هێنانی نوێژەکەیدا و لەمەڕ پاڕانەوە و مناجاتیش کەم و کورتی تێدا چاو نەکرێ.

سوورەی فاتیحە لە بەر ئەو ڕێزدار و پیرۆزییەی، خوێندنی دە نوێژدا گونجاوە لە لایەن زۆربەی زاناکانی ئایینی لەسەر ئەساسی پاڵدانەوە بە فەرموودەی پێغەمبەر: لا صَلاةَ لِمَن لَم يَقْرَأْ بِفاتِحَةِ الكتابِ هەروەها كُلُّ صَلاةٍ لَم يَقْرَءْ فيها أُمُّ الْقُرآنِ فَهِيَ خداجٌ. واتا ناقیس.

گونجاندنی خوێندنی سوورەی فاتیحە دە نوێژدا ئیشارە وەلای دوو مەتڵەبی بەرز و پیرۆز دەکا: ١. پڕبەرەکەتیی سوورەی فاتیحە ٢. پایەبەرزترین پایەی نوێژ دەناو پێنج ڕوکنەکانی ئیسلامدا بەرزی مەقامی نوێژ، لە ئادەم تا خاتەم، و هەتا ئینسان هەبێ ئەو وەزیفە پڕ خێر و بێرەی بە عینوانی ئەرکێکی ئایینی و پایەیەکی ئەساسی دینی دە ئەستۆ خراوە و دەبێ دە شەو و ڕۆژێدا پێنج جاران ئەو وەزیفەیە بەڕێوە بەرێ. ئەوەش خۆی هاوارە لە تۆی ئینسان: کە خاوەنی دڵی ڕەوەک و سرک و تۆڕی، ئەگەر دە شەو و ڕۆژێدا پێنج جارانت وەپاڵ خودا نەدەن، ون دەبی و لە خۆت و لە خودا غافڵ دەبی، بەڵام ڕۆژوو جگە لەوەی کە تایبەتی کەسانێکە کە خاوەنی شەرایتی تایبەتن ساڵێ جارێکە، و هەروا زەکات، تایبەتی ساماندارانە، یانی ئەو دوو ڕوکنانە دەگەڵ ڕوکنی شادە ناگەنە پایە و مەقامی نوێژ بۆیە نوێژ بە قەدەر بەژن و باڵای ئینسان و دنیا درێژە، هەشن ئی وا هێندە کوێر و نەفامن ئەو دوور و درێژە چاو ناکەن.

سوورەی فاتیحە (سَبْعُ الْمَثاني)شی لە لایەن قورئانەوە بە لەقەب دراوەتێ، ئەوە ئاماژە وەلای ئەوەی دەکا کە ٧ ئایەتن، «بسم اللە»ش ڕەگەڵ کەوێ، و هەروا ئەوەش دەگەیەنێ کە دووپات دەکرێنەوە دە نوێژاندا ١٧ جار دە شەو و ڕۆژدا.

سوورەی فاتیحە (أُمُّ الْقُرآن)یشی پێ دەکوترێ، وا دیارە لە بەر دوو شت ئەو لەقەبەی پێ درابێ: ١. سوورەی فاتیحە چونکە الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ بەشی هەرەزۆری سەرەتایەتی، خۆ دیارە الله ربيّ زات و سیفات مەزهەر و سەرچاوەی هەچی هەست و نیستی بوونەوەرن، بگرە لە قورئانڕا تا هەچی هەیە، کەوایە زۆر بەجێ و شایانە، هەم دایکی قورئان بێ چونکە قورئانی لێ بە وەلەد بووە، هەم دایکی بوونەوەر بێ، چونکە باسی هەموو بوونەوەری لێڕایە.

ناودار کردنی سوورەی فاتیحە بەو ناوانەی باسمان کردن، هاوارن وەلای ئەوەی فاتیحەخوێن دەبێ زۆر بە ورد و سرنجەوە بڕوانێتە ناو جەرگ و هەناوی سوورەی فاتیحە، تاکوو ئەو دیاریانەی تێدا ڕازاوە و دەس‌نیشان کراون لێڕا دەرکەون و چاویان کا وەک ئەوانە: الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ تا مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ. ئیسباتی زاتی خودای تەنیا و پەروەرندەی سیفەتی دەکا کە بنچینەی خانووی ئیمان و باوەڕن. ئەو زات و سیفەتە. لەو لایەشەوە ئیسباتی ڕۆژی تۆڵە و سزا دەکا دەگەڵ مالیکییەتی موتڵەقی خودا بۆ ئەو ڕۆژە سەخت و بەسامە.

وە دە دوو جوملەی إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُدا ئیسباتی تەوحیدی عیبادی و تەوحیدی وەسیلە دەکا، واتا عیبادەت هەر بۆ ئەو دەبێ و پشت بەستن هەر بەو دەبێ.

وە دە جوملەی اهْدِنَا الصراطَ المُستَقِيمَدا ئیسباتی ئەوەی دەکا: هیدایەت تەنیا خاسی خودایە و بە دەس ئەوە، ئەوەی ئەو هیدایەتی دا بە کەس گومڕا نابێ، ئەوەی ئەو گومڕای کا بە کەس هیدایەت نادرێ، و ڕێی ڕاستیش هەر بەوە و ئەو دەیزانێ.

وە دە جومەلات و ڕستەی ئەو ئایەتەدا صراطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ جگە لە تەعین و بەیانی چاترین ڕێگا بۆ داواکاران دەس‌نیشانی خراپترین و پیسترین تاقم و دەستەش دەکا.

بە کورتی و بە کوردی: سوورەی فاتیحە بۆ ڕێنومایی و ملاقات دەگەڵ خودا بەسە و کافییە، بەڵام داخی گرانم کاکەی ئینسان بەیتی لاس و خەزاڵ و دمدم ڕەوان دەکا و فێری دەبێ،

ئەو ٧ ئایەتە ڕەوان ناکا و فێری نابێ.

## ٢٢ ناوی فاتحە و ٧ ئایەتی فاتحە

زانایانی قورئان حەتا ٢٢ ناوی پیرۆزیان لە سوورەی فاتیحە ناوە، بە هێندێکی زەق و بەرچاویان، واز لەوانی دی دێنین: **فاتِحَةُ الْكِتاب، حَمْد، أُمُّ الْقُرآن، سَبعُ الْمثاني، سورةُ الشُّكْر، سورة الدُّعا، سورة الأساس، سورة الكافية، سورة الوافية، سورة الشافية.**

ئەو ئایەتەی الْحَمْدُ للّٰه رَبِّ الْعَالَمِينَ لە بەر مبارەکیان لە سەر ٥ سوورەتان داندراوە: فاتحە، أنعام، کهف، سبأ، فاطر.

سوورەی فاتیحە مەککییە، جیاوازی لە نێوان سوورەکانی مەککی و مەدەنی ڕەنگە بە زۆری ئەوانەبن: ئایەتەکانی مەککی بە زۆری لە سەر ئەقیدە دواون، و هەروا بە زۆری هەچی وشەی (کَلّا)، یا (بنی آدم) یا (یا ایّها النّاس)ی لەسەر بێ بۆنی مەککی لێ دێ، هەروا سوژدەی تیلاوەت وەیا باسی ئادەم و شەیتان و گەلانی ڕابردوو لە هەر ئایەتێک چاو کرا بۆنی مەککی لێ دەکرێ.

**ئاوڕێک بە دوو چاو و دڵی واقیعبینانە وەسەر پوختە و بەرهەمی جەوهەری سوورەی فاتیحە:**

دەتوانین و دەکرێ بە قەناعەتەوە بڵێین سیما و نومایشی ٧ ئایەتی سوورەی پیرۆز و مبارەکی فاتیحە ئەگەر بە وردی سەرنجی بدرێتێ، وەک سیما و نومایشی دار و دەوەن و گیاوگۆڵ و دانەوێڵە وایە، واتا ئەرزش و لیاقەت و جوانیی سیمای هەر گوڵ و دار و دەوەن و گیاوگۆڵێک، و شۆخوشەنگ و ڕازاوەیی ئەو دەڕوانێتە لیاقەت و قەداسەت و جەوهەری ئەو توخم و تۆوەی ئەوی لێ ڕواوە و ئەوی لێ وەدی هاتووە. یانی هەر چاو و دڵێک بە سەرنجەوە بڕوانێ لە سیمای ئەو ڕواوە، دەزانێ ئەو تۆو و دانەوێڵەیە تا چ ڕادەیەک خاوەن بەهرە و بەئەرزشە. سوورەی فاتیحەش کە ڕواو و پشکووتووی جەوهەر و دانەی قورئانە، نومایشی ماهییەت و واقیعییەتی قورئان دەدا، و بەیانی ئیعجازی قورئان دەکا. و هەروا قورئانیش لە پەلک و گەڵا و لق و پۆپی ٧ ئایەتی فاتیحەیە ئیعجاز و ماهییەتی خۆی نومایش پێ دەدا.

## فاتحە بۆ کراوەتە ستوونی نوێژ؟

**ئاوڕدانەوەیەک وەسەر فاتیحە لەو بابەتەوە کە کراوەتە ستوونی نوێژ و هەوێنی دوعا و پاڕانەوە:**

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم و ئاگا بە هەست و سرشتی ئینسانی لە سەر ئەساسی ڕێز و حورمەتی ئینسانی، ڕووی ڕەحم و بەزەی خۆی دە ئینسانی کرد کە فێری کا بەو کەلیمات و ئەلفازانەی خۆی کە ٧ ئایەتی فاتیحەن، ڕۆژێ ٥ جاران ڕووبەڕوو دەگەڵ خودای خۆی بدوێ و ملاقات کا، تاکوو بە هۆی ئەو ملاقات و نیزیکیەی لە خودای خۆی ئاشنایەتی دەگەڵ پەیدا کا و خووی پێ بگرێ و بیناسێ و لێی غافڵ و وەدوور نەکەوێ. چونکە ئینسان خاوەنی سرشتێکی جوانی پەرست و لەززەتپەرستە دەگەڵ دڵێکی سرک و سڵ و ڕەوەک و تۆڕ، و نەفس و هەوایەکی سەرەڕۆ و غروور، دە ناو دنیایەکی ڕازاوە بە حوببی شەهەوات و زینەتێکی وا هەر ئەوەندە مێژۆک و چێژە لە شیرنایی و لەززەتی ئەو دنیایە کراو خرایە سەر زمان و ناو دەروون، تازە زەوت نابێ بە هەچی قفڵ و قەڕازە و کۆت و زنجیری ئایینی وەیبەستن دانامەزرێ، و بە هەزاران هاوار و هەرای جاڕچییان ئاوڕ وەنادا و ڕووی لێ وەرناگێڕێ و لێی ناتۆرێ، تا حوببی شەهەوات و ئازەروو بە هۆی تەمەن درێژی لێی نەتۆرێ و دە کەندالی مەرگت ناوێ هەدا نادا و لای لێ نادا.

جا لە سەر ئەساسی ئەو یاسا سرشتییە و تێبینی بۆ نەجاتی ئینسانی، خودای میهرەبان و ئینسان دۆست، ڕۆژێ پێنج جاران دە سەر ئینسانی دەکا و بانگی دەکاتە لای خۆی ملاقاتی پێ دەکا و فێری دەکا بەو ئەلفاز و کەلیماتە پیرۆزانەی خۆی لە بەری وەپارێ و داوای هیدایەتی الصراطَ المُستَقِیمَی لێ بکا تاکوو نەکەوێتە داو و تەڵەی نەفس و هەوای دنیاپەرەستی و بەڵکوو بە هۆی ئەو ٥ جار ملاقاتەی باری، کەماڵ و جەماڵی خودای لایەزال و بێزەواڵ تەئسیری تێکا و ڕامی کا و بیحامڵێنێ تا وەدوای ئارەزووی نەفس و هەوا نەکەوێ.

هەر ئەوەشە حیکمەتی باریتەعالا کە لە سەرەتای بوون و هاتنی ئینسانی بۆ ئەو سەر زەوییە ڕازاوە بە زینەت و لەززەت و خۆشی، ئەو ئەرکە (نوێژ) ملاقاتەی دەگەڵ خودای خۆی، دە ئەستۆ پەستاوت، تاکوو بە دوور کرێ لەوەی شەیتان وەیقۆزێ، چونکە نوێژە واتا ملاقات و دوان لەگەڵ خودایە بەرگریت دەکا لەوەی شەیتان وەتقۆزێ و تووشی فەحشا و فەسادت کا، بۆ باوەڕی زەین دەیە ئایەتی: إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾ «عنكبوت» ئەی پێغەمبەر بیخوێنە ئەوەی وەحی کراوە بۆ تۆ لە کتێبی ئاسمانی، نوێژ ئەو جۆرەی شایانە ئەنجامی دە، نوێژ بە یەقینی ئینسانی لە فەحشا و فەساد دەپرینگێنێتەوە، و

یادی خودا لە هەرچی هەیە باشتر و بەرزترە. خودا دەزانێ ئەتۆ چ بەڕێوە دەبەی.

خودایە بیکە بە خاتر و حورمەتی زات و سیفاتی بێوبێنەت و بیکە بە خاتری ئـــەو هێـز و تێز و پێز و توانایەی کە بەیانات و نوتقت پێ بەخشیوە بە ئینسان و هەستێکی وات ڕاخستووە و ناژتووە لە پانایە هەستی دەروونی، هەچی هەستە هەستی پێ دەکـا و دەیقـۆزێتەوە، لە هەسـتی هەســت پێکردنــت وەدوورم نەخەی و بێهەســتم نەکەی، و لە خـۆڕاگریم لە حانـد تۆفـانی ئارەزوو و ئاواتی دنیایی زیادی کەی، و لە هێـرش و شـاڵاوی گیـر و گرفتەکـانی دنیـای ژیـان بمپارێزی و لە تەمەندرێژیم بۆ نووسین و ڕانانی «تەفسیری قورئان بە شەرح و بەیان» بەهرەمەند کەی، یا ئەجری نیەتی ڕانانەکەم دەیەی و پێم ببەخشی، ئامین. شوکری ئەو نیعمەتەت دەکەم کە هەستی دڵ و دەروونمت وەخۆ خستووە کە زۆربەی کات و ساتەکانی ژیـانم میـوانی دڵمـی و دەدوێم لێت.

ئاخرین داوام: اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

۱۳۹۳/۲/۲ (۲۲ جمادی الثانی ۱۴۳۵)

# تەفسیری سوورەی بەقەرە

## سەرەتای سوورەی بەقەرە

بسم الله الرحمن الرحیم بە ناوی خودای بەخشندەی دڵۆوان

**(١) الم**
**ئەلف لام میم**

## حروفی مقطعه چەن پیتن و دە چەن سوورەدان؟

مەبەست لەم پیتانە: بۆ یەکەمجار لە دنیای عیلم و ئەدەب و فەرهەنگی قورئاندا ئەو شێوە ئەدەبیاتە، واتا پیتی پسپس نیشان دەدا و دەخوێندرێتەوە لە سەرەتا و دەروازەی ٢٩ سوورەی قورئاندا.

ئەو پیتانەش چەن جۆرن: یەک پیتیان هەیە، وەک: ص، ق، ن لە سەر سوورەکانی ص، ق، قلم.

دوو پیتیان هەیە وەک: طه، یس، طس، حم کە حەوت دانەن لە سەر سوورەکانی: طه، یس، نمل، غافر، فصّلت، شوری، زخرف، دخان، جاثیة، احقاف.

سێ پیتیشیان هەیە، وەک: «الم» لە سەر سوورەکانی: بقرة، آل عمران، عنکبوت، روم، لقمان، سجدة، «الر» لە سەر سوورەکانی یونس، هود، یوسف، ابراهیم، حجر؛ «طس» لە سەر سوورەکانی شعراء، قصص.

چوار پیتیشیان هەیە وەک «المص» لە سەر سوورەی اعراف، «المر» لە سەر سوورەی رعد.

هەروەها پێنج پیتیشیان هەیە وەک «کهیعص» لە سەر سوورەی مریم.

## بۆچوون لە سەر حروفی مقطعە واتە پس‌پس (دانەدانە)

زانایانی ئایینی بە تایبەتی قورئان‌ناسەکان لەمەڕ ئەو پیتە پس‌پسانە واتا «حروف مقطـعە» ڕا و بۆچوون و نەزەری جۆراوجۆریان هەیە، ڕەشاوێژانە ڕا و بۆچـوونی خۆیـان لە سـەر ڕانـاون. مەسەلەن هێندێکیان کوتوویانە: ئەوانە ڕابیتەیەکی تایبەتی نێوان خودا و ڕەسوولن کەس ناتوانێ ئەو ڕابیتەیە بزانێ، جگە لەوەش زانینی ئەوانە پێویست نییە لە باری دینەوە چونکە نە ئەحکـامی شەرعن و نە ڕوکنی دینن.

هەروەها هێندێکی دیکەش هەن مەسەلەن وەک ئیمامی **غەزالی** بۆچوونیان وایە ئەو پیتـانە بۆ ئاگاداریی ئەوانەن کە هەست و ویست و ئارەزوویان حاڵی‌بوون و تێگەیشتن لە دیـن بـووە. کاتێ کە خودا وەحی بۆ حەزرەت ڕەوانە دەکرد و حەزرەتیش بۆ یارانی بەیان دەکـرد، یـاران بـۆ لێ‌حاڵی‌بوون خۆیان بە هەستەوە ئامادە دەکرد چاوەڕوانی وەحیەکەیان دەکرد، جـا لە سـەر ئەو ئەساسە بۆ زێدە چێ‌بوونی گوێگرانی وەحی وەک واژەی **ئەلۆی تەلەفونی**، یەکێک لەو حرووفە موقەتتەعانەی لە پێشدا بەیان دەکەی لە پاشان مەتڵەبەکە باس دەکرێ.

بۆ تەئیدی ئەو نەزەرە لەسەر زاری هێندێک لە قورئان‌زانان بڵاو کراوەتەوە گۆیا بێ‌بـاوەڕان لە کاتێ کە حەزرەت وەحی بۆ دەهات واق و وڕ دادەمان و لە کاتی بەیانی وەحیەکە بـۆ عـالەم لە لایەن حەزرەتەوە بێ‌باوەڕەکان خوازیـاری بیسـتنی نەبـوون و هەروا دەشیانویسـت خەڵکـی دەوروبەری حەزرەت نەیبیسن، پیاوماقووڵەکان خەڵکیان وادار دەکرد بـۆ هەراهەرا و گوڕەگـوڕ تاکوو وەحیەکە نەبیسن. بۆ ڕاستیی ئەو هەڵوێستە ناحەزەی ناحەزان دەچیـنە خـزمەت ئـایەتی: وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ «فصلت» بێ‌بـاوەڕان بە یەکتریان دەکوت گوێ بۆ ئەو قورئانەی ڕامەگرن و لە کاتی خوێندنەوەی قورئـان هەراهەرا دەس پـێ‌بکەن تاکوو عالەم نەیبیسن و بەراوەردی نەکەن، بەڵکە هەراتان زاڵ بێ بە سەر وەحیەکەدا.

ئەگەر بە ئەقڵ و زانستەوە لەو ٢٩ سوورەی ئەو پیتە پس‌پسانەیان لە سەرە سـرنج بگیـردرێ و بەراوەرد بکرێ، بابەتی زۆر گرینگ و ڕمووزاتی زۆر بەوەجیان لێ هەست دەکرێ، بۆ نموونە خودای حەکیم و خاوەن حیکمەت بۆ ڕاتڵەکاندن و ڕاکێشانی دڵی گوێـدێران بـۆ لای خـۆی، دێ لە هەوەڵەوە بۆ لاواندنەوەی دڵی پاش ڕاتڵەکاندنیان هێـدی و هێـواش دەیانخـاتە حـاڵەتی ئینتیزاری و چـاوەڕوانی بە هـۆی ئەو پیتـانەوە، وەک هـاوار و هەرایەکـی نەرم و هێـدی پـێش لێدوان، پاشان مەتڵەبەکە ڕادەگەیێنێ. مەسەلەن دەفەرموێ: «طـه» مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَى

**﴿٢﴾ ئەی پێغەمبەر ئێمە ئەو قورئانەمان بۆ لای تۆ نەناردووە تاکوو لە سەر ئیمان نەهێنانی کـافران خـۆت بخەیە گێژاوی دەرد و خەفەت.**

ئەقڵی بەهەست و چالاک و پسپۆڕ ئەو ئایەتە سەر بە پیتەی خاوەن حیکمەت و ڕاز چـۆن هەڵدەسەنگێنێ و بەراوەرد دەکا؟ ئاوای هەڵدەسەنگێنێ: بۆ وەی بتواندرێ دڵـی سـرک و تـۆڕ ڕام کرێ و هێدی هێدی ڕاکێشـرێتە ژێر بـاری مەبەسـت و مەتـڵەب، دەبـێ پێشـەکی بە هـۆی هاوارێکی نەرم هەستی هەستێنی وەک دابێ ئەوڕۆکە کە دەکـوترێ: گـوێگرانی ئـازیز، یـا ئەی خوشک و برایان، و هەروا بۆ ئامادە کردنی بیر و هۆشـیان و ڕوو پـێ دە مەتـڵەب کردنیـان ئەو ڕاوێژە دەکار کرێ: واتا پێش بەیانی مەتڵەب بە هۆی ئەلۆیەکی، هەستی هەستێن.

وە هەروا یەکێکی دیش لەو ڕازانەی کە دە ناو ئەو پیتانەدا ڕازاون و هەسـتیان پـێ دەکـرێ ئەوانەن و ئیعجازی قورئانیش لەوڕا دەردەکەوێ. تەماشا دەکەین قورئان بە تەواوی لەو پیتـانەڕا تەنزیم کراوە و لەوانڕا هۆندراوەتەوە ئینسانیش بەیانی مەتڵەبی خۆیان و قسە و باسـیان هەر بە هۆی ئەو پیت و حەرفانەن کەچی ناتوانن تەنانەت یەک جـوملەش وەک قورئـانێ وەڕازێـنن و بیهێننە ڕوو.

وە هەروا ئەگەر بە ئینساف و شعووری تەواو سـرنج بدرێتە ئەو ٢٤ سوورەی کە بەو پیتـانە داگیرساون چـاو دەکـرێ و دێـتە بەر هەسـت بە تەواوی کە بە دووی پیتـی سـەری سـوورەکە ئـایەتێکی وا دێ کە ئیشـاڕاتی بەتـایبەتی وەلای عەزەمەت و ئیعجـازی قورئـانە، بـۆ نمـوونە سوورەی بەقەرە کە بە پیتی «الم» داگیرساوە، لە دوای ئەو پیتە ئایەتی ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيـهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ هاتووە کە تیشکی ئەو ئایەتە شۆقدارە هەموو دەر و دۆڵ و قوژبنێکی چیای دڵی پڕ لە تەموومژی ڕووناک کردووە، سـرشتی دڵی ڕازاوە بە هەستی خوداناسـی «تقـوی» بە هـۆی قورئان ڕێبازی سـرشتی ون ناکا و لێی لانادا.

وەهەروا هێنـدێکی دیـش بۆچوونیـان وایە: حرووفـی مـوقەتتەعە نـاون بـۆ قورئـان؛ و هێندێکیش دەڵێن خـودا سـوێندیان پـێ دەخـوا و هێنـدێکیش پێیـان وایە ئەو پیتـانە وەسـیلەی ئاگاداری ئەو کەسەیە وەحیەکەی بۆ دەکرێ. هێندێکی دیـش هەن بۆچوونیـان وایە: یەکـایەکی ئەو پیتانە ئیشارەن وەلای زاتی پاکی خودا و سیفاتی بەرزی.

وەک دیارە و حاشای لـێ نـاکرێ ئەو هەمـوو ڕا و بۆچـوونەی زانایـان لەسـەر حرووفـی موقەتتەعە ئاماژەی تەواوە لە سەر ئەوەی: حەقیقەت و دروستیی وان نەدۆزراوەتەوە، هەر زەینە

کوتەیە و دەستەکوتەی کوێرانە بە دەوری واقیعییەتی واندا.

سەرەڕای ئەوەش دەبێ ئەوە بزانین زانینی مانای بە واقعی ئەو پیتانە بەشێک لە ئەحکـامی دین و ڕوکنی ئیمان نین تاکوو واجب بێ لە سەر حەول وتێکۆشان بۆ زانینیـان بەڵـکە حەولـی زانینیان لە دەوری حرووفی موقەتتەعە تێگەیشتنە لە ئەسـرار و ڕمـووزی ئیعجـازی قورئـان کە ئەوەش بە کەمی لە ئینسانڕا دیـارە بەڵـکە هەر لە خـودا و ڕەسـوولڕا دیـارە. جـا لە سـەر ئەو ئەساسە لێکۆڵینەوە لە حرووفی موقەتتەعە لە دوودڵی و سەرسووڕمان زیاتر بەرهەمی لێ وەدی نایە.

ئەمنیش نەزەری خۆم بەو لیزگە هەڵبەستە لە سەر حرووفی موقەتتەعە ڕادەنێم:

بە نـــــاوی تـــــۆ خوداوەنـــــدا کەریمـــــی
بە ئەوســـــافت کە ڕەحـــــمان و ڕەحیمـــــی
بە حەرفـــــی ئەلـــــف و لام و ڕێ دیـــــارە
کە قورئـــــان مـــــوعجیزێکی ئاشـــــکارە
بە ئەو حەڕفـــــانە عـــــالەم دێـــــنە دوانـــــدن
بەوان هەســـــتی دەروون دێـــــنە نوانـــــدن
هەمـــــان ئەو پیـــــت و حەڕفـــــانەن دیـــــارن
لە بیســـــت هەوراز، لە ســـــی کەمـــــتر ژمـــــارن
بە ئەو حەڕفـــــانەیە یەکـــــتر دوانـــــدن
هەمـــــوو هەســـــت و مەبەســـــت دێـــــنە نوانـــــدن
بەبـــــێ ئەوهـــــانە عـــــالەم لاڵ و پـــــاڵە
وەکـــــوو منـــــداڵی ســـــاوا و شـــــلک و کـــــاڵە
کەلامـــــی خـــــوا بەوان تەنـــــزیم کـــــراوە
بە ئەو حەڕفـــــانەیە تەرتیـــــب دراوە
کەچـــــی دنیـــــا هەمـــــوو بێتـــــوو وەکـــــۆ بـــــن
ئەوەنـــــدەی دیـــــش دەگەڵیـــــان هـــــۆ بە هـــــۆ بـــــن
تەواو ئەو پیـــــت و حەرفـــــانە بـــــوێژن
ســـــەلیقە و ئەقڵـــــی خـــــۆی تێـــــدا بنێـــــژن

بە نـــــووکی خـــــامە جـــــوملان دابڕێـــــژن
بە چین چـــــین جـــــوملە جـــــوملە دابنێـــــژن
ئەوێســـــتا عـــــاجزن دوورن بـــــوێژن
کەلامێـــــک وەک کەلامـــــی خـــــوا بنێـــــژن
دەوەیـــــدا خەوتـــــووە ڕازێ دیـــــارە
ســـــرنج بگـــــری بە وردی، ئاشـــــکارە
هەمـــــوو تەنیـــــا بەتەنیـــــا نـــــاتەواوە
بە تەنیـــــا هەر خـــــودا تەنیـــــا و تەواوە
هەوەڵ دانەر دەبـــــێ خـــــوا بـــــێ لە دانـــــان
بە یەک ئیشـــــارە حەز کـــــا دان و ڕانـــــان
لە پاشـــــان یەک بە یەک جـــــووت کـــــا دەگەڵ یەک
نیزامـــــی بـــــوونەوەر بخـــــرێتە پـــــاڵ یەک
دەبـــێ جـــووت بـــێ هەمـــوو شـــت غەیـــری ئەڵـــڵا
لە دانـــــان و لە ڕانـــــان خـــــوا بـــــێ مەڵـــــڵا
ســـــەرئاغازی هەمـــــوو شـــــت هەر خـــــودایە
کە تەنیـــــاش تـــــایبەتی تەنیـــــا خـــــودایە



(٢) ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ
ئەو کتێبە (قورئان) هیچ گومانی تێدا نییە، ڕێنیشاندەری خۆپارێزانە.

## متّقین، دۆزینەوەی متّقین

**ئاوڕێـک وەلای ئەوەی قورئـان چۆنـاوچۆن ڕێنیشـاندەری پـارێزەرانە.** قورئـان پەیـامە و ئاگادارییە لە لایەن خوداوە بە وەسیلەی پێغەمبەران بە ئینسان ڕادەگا، ئەو ئینسانەی ئەو پەیامەی دەکاتە وەسیلەی شارەزایی و گەیشتن بە قۆناغی سەعادەت و بەختەوەری، دەبێ ئینسانێک بـێ جگە لە باوەڕی بە ڕاگەیێنەکەی کە پێغەمبەرە و بـاوەڕی بە پەیـامەکەی کە ئـی خـودایە دەرکـی ڕاست و خواریش بکا جا ئەودەم دەتوانێ قورئان بکاتە ڕێنومای خۆی. جا بۆیە خودای خاوەن حیکمەت و حەکـیم فەرمـوویەتی: هُـدًى لِّلْمُتَّقِـينَ واتـا قورئـان ڕێنومـای موتتەقییـانە. یـانی

کەسانێک دە زاتی خۆیاندا خاوەنی سیفەتی «متّقین» نەبن ناتوانن شارەزایی لە قورئـان وەدەس بێنن.

**تێڕوانین و سـرنجێکی ورد لەو بارەوە:** خودای خـاوەنی سـیفەتی «أَحْسَـنُ الْخَـالِقِين» بـۆ گشت بوونەوەری ئەو کائیناتە و ئەو کائیناتانە، ڕێ وشوێن و یاسای حـاوانەوە و حەسـانەوە و ڕێدەرکردنی بۆ لە سان داوە بۆ هەر نەوع و سینفێک بە ئەندازەی شەئن و لێهاتوویی خۆی ئەو تێشووە سـرشتییەی دەپـاڵ هاویشـتووە: «فَأَلْهَمَهَـا فُجُورَهَـا وَتَقْوَاهَـا» دیـارە عەمەل کـردن بە پێچەوانەی ئەو سـرشتە ڕازاوە خەیانەت و ئیهانەتە بە ئەقڵ و سـرشت و نیزامی ئیلاهی.

هەڵوێستێک و ئاوڕێک وەسـەر «متّقـین و سـیفاتی» کە لە نـاو ئایەتەکـانی ٣ و ٤دا بەیـان کراون: لەسەر ئەساسی مانـای «متّقـین» بەو سـیفاتانەی بـۆی دیـاری کـراوە لە لایەن خـودا، «متّقین» شارەزایە و حاڵییە و بەڵەدە بەر لەوەی قورئان ڕێنومایی کا و بـێجگە لەوەش لە مانـای ئەو ئایەتەدا ئەوە دێتە ماڵی هەستەوە قوڕئان ڕێنومای غەیـرە موتتەقییـان نەبـێ دەگەڵ ئەوەی لە ئەساسدا نەزان دەبێ زانا کرێ، نابەڵەد بەڵەد کرێ، ناحـاڵی حـاڵی کـرێ و هەروا قوڕئـانیش لە سەر ئەساسی خۆی ڕێنومای ئەجیننە و ئینسانە، دیارە ڕێنوما بـۆ وانەیە ڕێ بەڵەد نـین. لە سـەر ئەو ئەساسە دەبێ مانای ئایەتی ذَلِكَ الْكتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ چـۆن بەراوەرد کەیـن و هەڵیسەنگێنین تووشی کەند و کۆسپ و هەڵە نەبین.

بۆ دەرکی واقیعی و دۆزینەوەی ڕێی ڕاست دەبێ حەکیمانە بچینە پـێش. بـڕوانە هەروەک خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم چەن دەزگای پێویستی دە زاهیری لەشدا دامەزرانـدووە بـۆ پێکهێنانی نیازی گیاندار بەتایبەتی ئینسان، چەن دەزگـای واشـی دە نهێنیـدا دامەزرانـدووە بـۆ پێکهێنانی نیازە نهێنییەکان.

دەزگا زاهیرەکانی لەش: **چاو، گوێ، زمان، لووت، دەرکی لەش.** هەرکام لەو دەزگا بەهەسـت و زیت و وریایانە بۆ بەراوەردی نیازە و هەریەک لەو دەزگایانە بە هەر هۆیەک خاسییەتی تـایبەتی خۆی لە دەسدا، ئەوە لە پێکهێنانی نیـازی خـاوەنی دەکەوێ و دوور دەکەوێـتەوە. بـۆ نمـوونە: گوێ ئەگەر لە بیستن کەوت، واتا کەڕ بوو، ئەوە ناتوانێ نیازی بیسـتن بـۆ خـاوەنی پێـکبێنێ. چاویش هەر ئاوا، ئەگەر لە دیتن کەوت، واتا کوێر بوو، ناتوانێ نیازی دیتن بێنێتە جێ.

جا لە سەر ئەو یاسا و ئەساسە سـرشتییە و ئەزەلییە هەر دەزگـایەک لە دەزگـا نهێنییەکـانی لەش وەک: **ئەقڵ و شعوور و هەستی ئینساف و عەداڵەت و بەزە**، بە هەر هۆیەک وەک خۆشەویسـتیی

دنیا و لەززەت یا چڵێسی نەفس و هەوا و ئارەزوو، خاسییەتی خۆی لە دەس دا، ئەوە بێ گومان خاسییەتی پێ سپێردراوی لە دەس دەدا. بۆ نموونە ئەگەر ئەقڵ خاسیەتی خۆی کە دەرکی حەق و ناحەقە لە دەس دا، ئەوە ڕێگای دۆزینەوەی تەقواشی لە دەس دەچێ. وە هەروا ئەگەر هەستەی ئینساف و عەداڵەت و بەزە لە نێو چوون، بێ گومان زوڵم و فەساد و فەحشا دێنە ڕوو و خۆ دەنوێنن. بەو پێیە لە سەر ئەو ئەساسە سرشتی خوداناسی و تەقوا کە لە ئەزەلدا داچناوەتە ناو لەشی حەیاتەوە، لە ناو دەچێ و دەفەوتێ.

ئەگەر بە وردی لە وشەی هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ بڕوانین و بیر و زەینێکی تیژ لە أُوْلَـئِكَ عَلَى هُـدًى مِّن رَّبِّهِمْ ئایەتی ٥ دەکار کەین، بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێ کە سرشتی حەیاتی ئینسان بە سیفەتی حەقناس و عەداڵەت و ئینساف و تەقوا داپۆشراوە و دامەزراوە هەر بۆیەشە خودای خاوەن عەدڵ و بەزە لە ئایەتی ٢دا دەفەرموێ: ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ واتا حەیاتی ڕازاوە بە سیفەتی ئایەتەکانی ٣، ٤ و ٥ بە یەقینی قورئانی خاڵی لە شک و گومان هیدایەتدەریەتی و ڕێنومایەتی.

پێداگەڕان لێر و لەوێ بۆ چاوکردن و دۆزینەوەی دەلیل و بەڵگە و نیشانانێک بۆ ئیسباتی ئەوەی قورئان هُدًى لِّلناس-ەبە شێوەی گشتی چ کافر چ موسوڵمان و ئینسانیش بە شێوەی گشتی دە سرشتدا شارەزای تەقوا و فجوورە، فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا. وڵام و چارەسەری ئەو گرێیەی کە چاو دەکرێت لە ناو ئەو ئایەتە پیرۆزەدا ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ کە بۆچی قورئان دێرەدا وا ناسێندرا کە هەر هیدایەتدەری موتتەقییانە، دەگەڵ ئەوەی هەر قورئان بۆخۆی دە ئایەتەکانی ٣، ٤ و ٥دا موتتەقینی وا ناساند کە دە زاتی خۆیدا خوداناسە و خاوەنی باوەڕی ڕاستە و هیدایەتدراوی لای خوایە، جا خۆ ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە هیدایەتدراوی لای باری لە ئەزەلدا نیازی بە هیدایەتی دووبارە نییە. کەوابێ چارە چییە و دەبێ چۆن هەڵوێست بگرین لەمەڕ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ.

ئینسان دە زات و سرشتیدا بە خاوەنی دەرکی تەقوا و فجوور ڕازاوەتەوە. پاش ئەوەی کە مەودا و مەیدانی پاکی واتا منداڵی تێپەڕ کرد و گەیشتە مەیدانی ئارەزوو و ئیشتیها و لەززەتی دنیایی، بۆ زینەتی حەیاتی پڕ لەززەت و خۆشڕابواردن دەکەوێتە مەیدانی ملبەملە و گێرە و کێشەی ژیان بۆ وەدەسهێنانی هەموو ئاوات و ئارەزووەکانی حەیاتی دنیایی، هەچی وەبەری بێ دایدەپاچێ. **قابیل هابیلی** داپاچی لە سەر ئارەزووی لەززەت و هەوای نەفسانی، جا

ئەدێرەدایە سـرشتی تەقوا ئەگەر دەستگیر و هـادی و مورشـیدێکی نەبـێ تەقـوای نـامێنێ، ئەو دەزگا سـرشتە نهێنیانەی ئەزەلی لە ناو لەش لە کـار دەخـرێن، هێـزی هەوا و هەوەس زاهیـری هێزی نهێنی تەقوا و هەستی بە حەقناسی حەق تێک دەشکێنن بە تەواوی هێزی فجوور، هێزی تەقوا ڕامالْ دەدا، دەکەوێتە قۆناغی فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَى عَلَى الْهُدَى ﴿١٧﴾ «فصّلت»

ئەدێرەدایە کە دەبێ ڕاگەیێنەر و ڕێنوماکانی بە واقعی و پسپۆڕ و حەکیم و سـەلیم بە هـۆی کەلامی وەحی ئیلاهی لە سەر ئەساسی أُدْعُ إِلى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَـادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴿١٢٥﴾ «النحل» ئامۆژگاری ئەو سـرشتی پـاکی بە تەقـوای ئەزەلـی بکـا و ڕێگـا نەدرێ بە چەتەی هەوا و هەوەسی دنیـای پـڕ لەززەت و کەیـف و خۆشـی، وەیقـۆزن و بەرەو دنیای غەفڵەت بیحاملێنن و حەمایەتی کەن.

**تیوتیوەی مەبەست و پوختەی واقیعە**

ئینسان لە سەر ئەساس و بنچینەیەکـی خـاوێن و خـاوەن هەسـت و شـعوور دامەزراوە و ڕازاوەتەوە: فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾ «شمس» یـا الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى ﴿٢﴾ وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى ﴿٣﴾ «اعلی» یا إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كفُورًا ﴿٣﴾ «الانسان» ئەو ئایەتە پیرۆزانە شـاهیدن لەسـەر ئەو ڕاستییەی کە ئینسان لە سەر سـرشتێکی پاک و شارەزا دامەزراوە.

بەڵام ئەو سـرشتە پاکە ئەزەلییە لە کات و دەوران و قۆناغی گەیشـتنی بە مەیـدان و دنیـای ژینی پڕ لە تەنگ و چەڵەمە دەبێ بە گـورجی غەوواسـان و شـارەزایان و پسـپۆڕانی حەکـیم و حەلیم و سەلیم دە هاواری کەون تاکوو ڕێ نەدرێ ئەو سـرشتە پاکە ئینسانییە ئاڵوگۆڕی کـرێ بە سـرشتێکی حەیوانی وەحشی و بکەوێتە سەر خەتی: فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَى عَلَى الْهُدَى ﴿١٧﴾ «فصّلت» ئەودەم پێی دەکوترێ: أُوْلَئِكَ هُمْ شـرُ الْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ «بیّنة» یا ناوی دەبـرێ: إِنَّ شَـرَّ الدَّوَابِّ عِنـدَ اللَّهِ الصُّمُّ الْبُكْمُ الَّذِينَ لاَ يَعْقِلُونَ ﴿٢٢﴾ «نمل» بێشک خرابترین ئینسان لە لای باری کەڕ و لاڵی ئەقڵین.

بە کورتی و بە کوردی، ئینسان دە زاتی خۆیدا خـاوەنی هەسـت و شـعوورێکی سـرشتی تەکوینی ئامادە بۆ پەیڕەوی لە هیدایەتێکی تەشـریعییە، بەڵگە لە سەر ئەو ئیدیعایە ئەم ئـایەتەیە: فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ﴿٣٠﴾ «الرّوم»

دەشبێ ئەوەش باوەڕ کەین و بیسەلمێنین: ئاڵوگۆڕ بە سەر ئەو سـرشتە پاکە ئەزەلییەدا دێ بە هۆی تێکەڵاوی دەگەڵ ئارەزوو و ئاوات و هەوای لەزەت و چڵێسی دنیایی، ئەوکات شعوور و هەستی کەڕامەتی بەشەری دەخەوێ و دەکەوێتە قۆناغی يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُـنْعًا ﴿١٠٤﴾

«کهف» **بە خەیاڵی خۆیان لە سەر ڕێبازی چاک و جوان و باشن.**

کاتێ ئەوەی گەیشتێ بچینە خزمەت ئایەتی سێ:

**﴿٣﴾ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ**
**ئەوانەی باوەڕیان هەیە بە نادیارەکان (وەک ئەو شتانەی کە لە حیس و هەستی زاهیری بەدوورن، وەک خودا، ڕوح، ئەقڵ، فریشتە، پەری، ئێشی لەش، قیامەت.) (جگە لەوەش) نوێژ دەکەن و هەروا لە سامانی خودا پێداویان بەشی بێنەوا و نەداران دەدەن.**

## سیفەتی موتتەقین

لە وەپاڵدانی ئەو سیفەتە بەرز و پیرۆزەی ئایەتی سێ بە موتتەقین دڵ و هەستی سرک و سڵ هەست بە ڕازێکی ناسک و لەتیف دەکەن. ڕازەکەش ئەوەیە: هەرکەس ئەوەی کڵ و بنچینەی باوەڕ نەبێ، کە خودا هەیە و نادیاریشە، ناتوانێ بەهرە لە کەلامی ئەو کە قورئانە وەرگرێ. چونکە ئەگەر بە سبووتی نەگەیێنێ خودا هەیە، بۆی بە سبووت ناگا کە قورئان کەلامی ئەوە و هاتن و بوونی ڕۆژی قیامەتیشی بۆ بە یەقین ناگا و سابیت نابێ. ئەودەم دەکەوێتە شیوی کەس‌بەکەسی، هەرچی وەبەری بێ پێی ڕەوایە و دایدەپاچێ و لێی ناپرینگێتەوە، چونکە هیچ هۆیەک شک نابا بۆ پرینگانەوەی لە دادگای دواڕۆژ. جا لە سەر ئەو یاسا و ئەساسە دەردەکەوێ کە ئیمان و باوەڕی بە خودا و ڕۆژی ئاخیرەت هەوێنی هەموو سەعادەتێکی دنیا و ئاخیرەتە و هەوێنی کەماڵی ئینسانە و هەوێنی نەزم و نیزام و حەسانەوەی بەشەر و غەیرە بەشەرە.

**بەرجەوەندی و تێڕامانێک لە مانای ئەو ئیمانەی کە لە ناو ئایەتی سێدا خودا ناوی بردووە:**

لە لایەن زانایانی قورئان بۆچوونی جۆراوجۆر لە سەر مانای ئیمان هەیە و دەربڕاوە، هێندێک پێیان وایە ئیمان واتا باوەڕی بە دڵ بە لا اِلٰهَ الّا اللّٰهُ ـ محمدٌ رَسولُ اللّٰهِ. هێندێکیش لایان وایە ئەو باوەڕیە دڵە دەبێ عەمەلی دەگەڵ بێ دەنا بەتاڵە لە سەر ئیشاراتی قورئانی، وەک ئایەتی إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ﴿٣﴾ «عصر» هەروەها ئایەتی: قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ وَإِن تُطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَالِكُمْ شَيْئًا إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ «حجرات» **عەرەبە سەحرانشینەکان کوتیان ئیمانن هێناوە (واتا ئەوەن باوەڕە) خودا فەرمووی بڵێ ئەی محەممەدﷺ، ئیمانوو نەهێناوە بە ئیمانی ڕاستی، بەڵکە بڵێن لە ترسی کوشتن و بڕین، یا بۆ خاتری زەکات و خێر و بەهرە بردن تەسلیم بووین و مل دەدەین، دەنا وێستا**

**ئیمانی بەڕاستی واریدی دڵتان نەبووە. ئەگەر ئیتاعەی خودا و ڕەسووڵ بکەن هیچ لە کردەوەتان کەم ناکرێ و پاشقول نادرێ، بێ گومان خودا بەبەزە و بەبەخششە.**

بۆ قەناعەتدان بە دڵ لەمەڕ ئیمان کە بە عەمەلەوەیە و ئیمانی خاڵی لە عەمەل ئیمان نییە، دەچینە خزمەت ئایەتی: إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ ﴿١٥﴾ «حجرات» **دە ڕاستیدا موئمین کەسانێکن کە باوەڕیان بە خودا و ڕەسووڵی خودا هەیە، پاشان هیچ شک و گومانێکیان دە دڵدا لەمەڕ ئەو ئیمانە جێ‌وڕێ پێ نەداوە و هەروا بە گیان و ماڵ لە ڕێی خودادا تێکۆشاون، ئەئەوانە ڕاست کردار و گوفتارن.**

وەهەروا هێندێکیش لە زانایانی دڵ بزۆز دەڵێن ئیمان واتا باوەڕی بە دڵ و ئیقرار بە زمان. منیش باوەڕم وایە ئەو ڕاوڕاوێنە نە تەنیا واقعیەتی ئیمان نادۆزێتەوە بەڵکە دوورکەوتنەوە لە ئیمانی واقعی دێنێتە ڕوو، چونکە عەمەل شاهید لە سەر دەروونە.

## لەنگەرگرتنێک لە سەر سیمای «متّقین»

سرشتی خاوەن هەست خۆی بە خاوەن نیاز دەزانێ بە خودایەکی بێ‌نیاز و ئەوەشی باوەڕە هەستی عالەمی هەستی لەو خودایەڕایە، هەستی موتتەقین پاڵی بەوەوە داوە کە دەبێ لە عالەمی زاهیر و بەرچاو سەرکەوێ بخزێتە ناو عالەمی نهێنی. واتا لە سەر ئەساسی باوەڕی یەقین پاڵ وەدا بە خودای نادیار و بە ڕۆژی قیامەت، بە فریشتە، بە عەرش و کورسی، بە بەهەشت و دۆزەخ. بەو پێیە موتتەقین بەشێکە لە سیمای مبارەکی کە دوور نەکەوێتەوە لە هەستی بە تەواوی لە خودای بێ‌نیاز، بە هۆی ئیتاعە و ئەنجامدانی وەسیلەی هۆیەکانی پێویستی تەقوا. بۆ پشتڕاست کردنەوەی ئەو مەتڵەبە دەبێ بڕوانینە ئەو ئایەتە کە بە موتتەقین هەڵدەڵێ: الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ «بقرة» هەروا خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم بۆ چاکناسینی موتتەقین پێی هەڵدەڵێ و سیفەتانی ڕادەنێ. وەک ئایەتی چوار زەین دەیە:

> ﴿٤﴾ **وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ**
> **(کێن موتتەقین؟): ئەوانەن کە بڕوا دێنن بەوەی وەحی کراوەتە تۆ (قورئان) و هەروا بەوانەش کە ناردراونە لای پێغەمبەرانی پێش تۆ لە پێش تۆدا وەک (تەوراتو ئینجیل و زەبوور و ...) هەروەها بڕواشیان هەیە بە ڕۆژی ئاخیرەت بە یەقینی.**

## سیفەتی موتتەقین

تێهەڵڕوانینێک لە سیمای ئەو ئایەتە چوارە کە بە سیفەت هێندراوە بۆ موتتەقین. لەو تێڕامانە هەست بەوە دەکرێ دەبێ بۆچی لە باتی جوملەی **ئیمان بە ئاخیرەت، وشەی «یوقنون» هاتبێ و هێندرابێ؟** بێشک ئەو ئاڵوگۆڕە بەنەزمە سوڕ و ڕازێکی دە بندا هەیە و هەروا ئەو هەستە هەستیارەش لە ئەسەری بەراوەرد و تێوەڕامانی مانای «یوقنون» و ئیمان و تایبەتمەندی ئەو دوو وشانە، دەکەوێتە سەر ئەو قەناعەتە سوڕ و ڕازەکە دەبێ ئەوە بێ: یەقین، هیچ کەلێن و قوژبن و قوڕنەیەک وەخۆ ناگرێ تاکوو وەسوەسە و دڵەڕاوکە و ڕاوێچکە و ڕاوڕاوێنی تێدا بکەن، بەڵکە هێندە بە باوەڕە یەقین لە سەر شتەکە وەک بە چاوی زاهیری چاوی کا لای وایە، بەڵام وشەی ئیمانی بەتەنێ خاڵی لە سیفەتی یەقین، کەلێن و کون و کاژێری وەسوەسەی لێ چاو دەکرێ.

بە کوردی و بە کورتی، موتتەقینی ڕازاوە بەو پێنج سیفەتانەی وەک: **١. ئیمان بە غەیب ٢. نوێژ ٣. بەخشینی ماڵ ٤. باوەڕی بە کتێبە ئاسمانییەکان ٥. باوەڕی بە ڕۆژی ئاخیرەت** کە وەک هەستێکی سرشتی ئەزەلی دادۆشراونەتە ناو کاس و تاسی دڵی خاوێنی ئینسانی، ئەگەر بە تیخی تیژی نەفس و هەوا دانەتاشرێن لە ڕوخسار و سیمای دڵ دەس بەر نادەن لە دامێن و بەندی خودا بە توند خۆ هەڵدەواسن: وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ ... ﴿١٠٣﴾ «آل عمران» **هەمووتان دەس بگرن بە تەنافی لە پسان نەهاتووی خودا (وەک قورئان بێ)، بێ دەس لێک بەردان.**

**تیوتیوە:** دوو هیدایەت هەیە بۆ ئینسانی، ١. سرشتی و ئەزەلییە وەک لە ئیشاڕاتی قورئانیڕا چاو دەکرێ: فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾ «شمس» **(بە هۆی ئەقڵ و شعوور و هەست) بە نەفس زانێندراوە تاوان و تەقوا.**

ئەو تێگەیاندنە سرشتی و ئەزەلییە نیازی بە هیچ موڕشید و ڕێنومایەک نییە، هەروەک زمان بۆ دەرکی سوێر و شیرین و ترشی و تامان نیازی بە هیچ ڕێنومایەک نییە، نەفسیش بۆ دەرکی تاوان و تەقوا نیازی بە هیچ ڕێنومایەک نییە، ئەو هیدایەتە پێی دەکوترێ: **تەکوینی**. واتا سرشتی و ئەزەلی و وا سازاو.

٢. **هیدایەتی تەشریعی**. وەک قورئان کە بە هۆی پێغەمبەران و ڕاگەیێنەران دە ڕووح و نەفس دەگەیێنێ.باری تاوان و تەقوا بۆ وەی نەفس بە هۆی وەگەڕ خستنی ئەقڵ و هەست و شعوور ئەو سرشتە ئەزەلییەی کە دەرکی تاوان و تەقوایە، لێی نەستێندرێ بە هۆی هەوا و ئارەزووی دنیایە.

بۆ سەرقەباغ لێدان و داکوژاندنی نەخش و نیگـاری سـیفاتی مـوتتەقین دەچیـنە خـزمەت ئایەتی ٥:

﴿٥﴾ **أُوْلَـئِك عَلَى هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُوْلَـئِك هُمُ الْمُفْلِحُونَ**

**ئەو کەسـانەی کە خـاوەنی ئەو سـیفەتە بەرزانەن لە سـەر ڕێـی ڕاسـت و ڕەوان لە لایەن پەروەردگاریان هیدایەت دراون و ئەوانەن ڕزگاری ڕۆژگاری ئاخیرەت.**

## ئەوانەی موتتەقین

لە تێهەڵڕوانین و بەراوەردێکی ورد لەو ئایەتە پیرۆزە چەن ڕازێک لە ناو وشەکان هەست پێ دەکرێ کە بازدان بە سەریاندا بە حەیف و خەسارەت دێتە بەرچاو.

ڕازەکان ئەوانەن: وشەی ﴿عَلَى هُـدًى﴾ کە بە مانـای بەرزیـیە ئیشـاڕەیە وەلای بەردەوامـی خاوەنی تەقوا لە سەر ڕێی هیدایەت.

وەهەروا دووپـات کـردنەوەی ﴿أُوْلَـئِك﴾ ئامـاژەیە وەلای ئەوەی هەروەک هیـدایەتی موتتەقین سابیت و بەردەوامە، ڕزگاریشیان یەقینە سابیتە.

دیسان بە هـۆی ئەو دوو سـیفەتی هیـدایەت و فەلاح، مـوتتەقین هەڵاواردراوە لە غەیـری خۆی.

سـەرەڕای ئەوەش واژەی ﴿مُفْلِحُـونَ﴾ کە مـوتتەقینی پـێ ڕازاوەتەوە و هەروا ﴿مُفْلِحُونَ﴾یش بە ئەلـف و لام ڕازاوەتەوە: ﴿الْمُفْلِحُـونَ﴾، ئامـاژەیە وەلای ئەوەی مـوتتەقین پیرۆزی و خۆشی ڕۆژی قیامەتیان حەتمییە و مۆر کراوە و ڕاگەیێندراوە.

جگە لەوانەش وشەی ﴿هُدًى﴾ کە بە نەکیرە هاتووە واتا سنووردار نەکراوە ئامـاژەیە وەلای ئەوەی هیدایەتی موتتەقین کە لە لایەن خوداوە ڕازاوەتەوە بەو پێنج سیفەتە پیرۆزانەی: بـاوەڕی بە **غەیب، نوێژ کردن، بەخشینی ماڵ، باوڕەی بە قورئـان و کتێبەکـانی دیکەی ئاسـمانی، هەروا بـاوەڕی بە ڕۆژی قیامەت،** مزگێنی و پێشخەبەرێکی زۆر هیوادار و حەتمییە بۆ موتتەقینان.

سـەرەڕای هەمـوو ئەو زیـنەت و جـوانی بەخشـینە بە دەسـتەی مـوتتەقین، بەکارهێنـانی واژەکانی (مضارع) دە ئایەتی چـواردا واتـا ﴿يُؤْمِنُـونَ﴾ و ﴿يُوقِنُـونَ﴾ ئیشـاڕە وەلای ئەوەیە کە موسوڵمانی بە واقیعـی کەسـانێکن و بە کەسـانێک دەکـوترێ کە لە سـەر ئـیمان و بڕوایـان بە جۆرێکی وا سابیتن کە هێرش و پەلاماری زینەتی دنیا ناتوانێ تلاسایان کا لەسەر ئیرادەیان.

هەروەک لە بەرجەوەندی ئاداب و خەسڵەتی دڵ و دەروون بۆمان ڕوون بۆتەوە کە بـزۆز و بەپرسیارە، ئەوەمان بۆ دێتە پێش کە موتتەقین ئاوا عەزیز و تەمیز و پیرۆزن، دەبێ ناموتتەقین واتا خودانەناس و بێشەرم و بێحەیا چۆن بن، هەم لە دنیا هەم لە قیامەت. جا بۆ ئەو وڵام و جوابە دەچینە خزمەت ئایەتەکانی: ٦ تا ١٦. دەگەڵـمان بـن دەو مەیـدانە بەرفـراوانەدا تـا بە تەواوی لە ئاکـار و ڕەوشـتی بێشـەرمان و بێحەیایـان و بێکەڕامەتـانی ئینسـانانی چەپەڵ و بـێئیمان و بێتەقوا حاڵی و شارەزا بین.

**﴿٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ**
**بێشک کافران یەکسانە لە لایان چ ترسیان وەبەر نێن چ بەریان نەنێن، ئیمانێ ناهێنن.**

**ئاوڕێک و تێڕوانینێکی بەهەست وەسەر کەیفیەتی سـرشتی ئینسانی:**

هەروەک لە ئاکـار و ڕەفتـاری ئینسـانیدا دەردەکەوێ و هەسـتی پـێ دەکـرێ، ئینسـان دە ساختاری سـرشتیدا، بە خـاوەنی دەرک و شـعوور و هەسـت سـازاوە و دەبەریەک نـراوە، بـۆ نموونە: بێچوو هەرکە هاتە دەر لە ناو زگی دایکی، ئاماژە وەلای نیازی ـ کە بژیویەتی ـ دەکـا، یا بە گریان و هاوار وەک بێچووی ئینسان و هێندێک لە حەیوان، یا بە ئیشاڕاتی دیـکە، بە پێـی نیازی لە سەر ئەساسی سـرشتی عەلامەت دەنوێنێ. ئەئەوە ئیسباتی ﴿فَأَلْهَمَهَـا﴾ دەکـا و هەروا ئیسباتی ﴿الَّذي خَلَقَ فَسَوَّى ﴿٢﴾ وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى ﴿٣﴾﴾«اعلی» دەکا، دەڵێ خودای پەروەرێـنەر خودایەکە هەچـی دەیهێنێـتە دی و دەیخـاتە ڕوو، پێداویسـتی نیازیشـی دەپـاڵ دەخـا بە تێـر و تەسەلی، لەسـەر ئەو یاسـا ئەزەلیـیە قەنـاعەت بەوە دەکەیـن کە دەسـتەی مـوتتەقین سـرشتی ئەزەلییان کە هەستی هیدایەت و حەقناسییە لە دەس نەداوە.

## بێباوەڕ (کافر)

بەڵام دەستەی ناموتتەقین کە کـافر و گومڕاکـانن، هەرکە کەوتـوونە نـاو مەیـدانی ژیـان و فاماندنی دنیای ژیان، ئەو هەستە سـرشتەیان کە تەقوا و حەقناسییە بە هەوا و هەوەس و ژینـی دنیا داوە و فرۆشتووە، تازە ئەوە لە بەرەگە چـۆتە دەرێ چهـا داوای لـێ بـکەی و بیترسـێنی یـا نەیترسێنی، ناگەڕێتەوە، خـۆی وا ڕۆ هێشـتۆتە نـاو چـاڵاوی دنیاپەرەسـتی هەڵناکشـێتەوە لای سەرێ بۆ حەقپەرەستی و دین دۆستی.

## هەست و سـرشت و تەقوا

**پوختەکـارییەک لە سـەر سـرشت:** هەسـتی تەقـوا و پـارازتنی وەیـا خەوتـن و خسـتن و فەوتاندنی هەستی تەقوا لە ناخی دەروونـدا دیارە وەک ڕوونە و حاشا هەڵگر نییە، هەموو شـت لە سەر ئەساسی نەزم و یاسـا سـازاوە و دەبەریەک نـراوە بە پێـی ئیشـاراتی کەلامـی ئیلاهـی: وَالسَّمَاء رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ ﴿٧﴾ أَلَّا تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ ﴿٨﴾ وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلَا تُخْسِـروا الْمِيزَانَ ﴿٩﴾ «الرحمن» **چەتری ئاسمان هەڵدرا نەزم و نیزامی تێدا بەرقەرار کرا. (فایدە لە بەرقەراری نەزم و نیزام لە عالەمی هەستیدا بۆوەیە) کە (تۆی ئینسان بە هۆی دەرک و شعوور دەرکی ئەوەی بکەی کە ژیانی فەردی و کۆمەڵایەتی بەبـێ یاسـای نەزم و نیـزام، خـاوەنی ژیـانێکی حەسـانەوە و ئـارام و بەنەفـع نیـیە) کەوایە ئەی ئینسـان لە نەزم و نیـزام و یاسـا تێـپەڕ مەبە و لامەدە. نەزم و نیـزام بە نەزم بەردەوام و ڕاوەستاوە، هەڵکێش و داکێشی پێ مەکە بە میزان و تەرازووی یاسا و عەداڵەت و ئینساف.**

ئەگەر بێتوو ئینسان لە سەر ئەساسی فەرموودەی قورئان: يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَكُونُواْ مَعَ الصَّادِقِينَ ﴿١١٩﴾ «توبة» **(ئەی ئیماندارانی بترسـن لە خـودا و بـۆ تەقـوا لە خـودا دوای ڕاسـتان کەون و دەگەڵیان بن)**، وەجووڵێ و عەمەل بکا و بەردەوام بێ، بێ گومان حاڵەتی تەقوا و پەرهیزگاری کە ئەساسی سـرشتە دە خۆدا جێ گیر دەکا و وردەوردە ئەو حاڵەتە پیرۆز و بەنرخە دەکاتە بەشێک لە حەیاتی پاکی لەش و دەروونی، داری حەیاتی پاکی دەروونی دێـتە بەر گـرتن بە بەروبـووی حەیا و شەرم و تەقوا و ئینساف و بەزە و عەداڵەت، کە تازە ئەو بەروبوومە غیرەت نـاکەن و ڕێ نادەن لەشکری ناڕەوای ناپەسەند خۆ بخاتە ناو باغ و بێستانی تەقوا و کەڕامەتی.

## چڵێسی نەفس و هەوا

وەهەروا ئینسان ئەگەر بێتوو بە هۆی چڵێسی نەفس و هەوا و خۆشـی لەززەت و کەیـفەی ژیانی دنیا لە سـرشتی بەشەرییەت لادا و کەڕامەت و حەیا و شەڕەفی خوداپێـداوی دە پێنـاوی بێ حەیـا و بێ شـەرمی دنیـا بنـێ، ئەوە پەردەی ڕەش و تـاریکی کـوفری بە سـەر چـاو و دڵـی دادەدرێ، ئیتر نە چـاوی حەق بینـی دەمێنـێ و کـارێ دەکـا، نە دڵ و دەروونـی حەق وەرگـر و حەق سەلمێنی دەمێنێ، جا ئەدێرەدایە: سَوَاء عَلَيْهِمْ أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لاَ يُؤْمِنُـونَ ﴿١٠﴾ «یس» یەکسانە لای ئەوان ترساندن و نەترساندن.

وێدەچێ دێرەدا ئەوانەی کە بە تێروتەسەلی بەرجەوەندی مانای هیدایەت نەبوون، هیـدایەت

و زەلالەت بخەنە ئەستۆی خودا و وەپاڵ مەشییەتی خودای دەن لە سەر ئەساسی تێڕوانین لە: وَمَا تَشَاؤُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٢٩﴾ «تكوير» خودا لە هەوەڵەوە دەفەرموێ: إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٢٧﴾ ئەو قورئانە بەجوز یاد و یادئاوەری عالەم نەبێ نییە. پاشان دەفەرموێ خودا: ئەو پەند و یادئاوەرییەش بۆ کەسانێکن کە خاهانی ڕاستی و حەقپەرەستین. مشتەری و خریداری ڕێی ڕاستن. جا ئەوجار خودا دەفەرموێ: وَمَا تَشَاؤُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٢٩﴾ ئەو ئیشتیا لێبوون و داوایان بۆ وەرگرتنی پەند و ئامۆژگاری لە قورئان، دەڕوانێتە ئیشتیا لێبوونی باریتەعالا واتا ئیرادە و قەستی ئینسانی هەڵاوەسراوە بە ئیرادە و مەشییەتی خودا.

دێرەدا ئەگەر بە ئەقڵ و ئینسافەوە هەڵوێست بگرین خودای تەعالا ئیرادە و مەشییەتی داوەتە ئینسانی کە دەفەرموێ: لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ بەڵام بەرهەم و وەبەرهاتنی داچناوی ئیرادە و مەشییەتی ئینسانی دەکەوێتە ژێر ئیرادە و مەشییەتی خودا، بە کورتی ئینسان داچێنی تۆوە، خوداش ڕوێن و وەبەرهێنە. وەهەروا دەبێ ئەوەشن باوەڕ بێ: خودا بە زایع نادا بەرهەم و ئەجری چاکان: إِنَّ اللَّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾ «توبة»

بۆ پشتڕاست کردنەوەی ئەو مەتڵەبە سێلەیەکی بگرین لە ناوزگی ئایەتی ٢٣ سوورەی کەهف: وَلَا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا. لەمەڕ پێکهێنانی هیچ کاروبارێک بەبێ یادی خودا و هیمداد خواستن لە خودا مەڵێن سبەینێ ئەو کارە دەکەین.

ئەو ئاگاداری پێدانەی خودا دەڕوانێتە ئەوەی: جگە لەوەی خودا توانای هەموو کاروبار و شتێکی هەیە، یادیش لە سەر ئەو توانایە، هێز و هیوا و هومێد دەبەخشێ بەو دڵانەی لە سەر هەموو هەڵوێست و کاروباران، بە یاد و هیوای ئەو تێڕادەچن.

بۆ زێدە باوەڕی پێویستە ڕوو بکەینە ئەو دوو ماڵی ١٩ و ٢٠ سوورەی ئەسرا: وَمَنْ أَرَادَ الآخِرَةَ وَسَعَى لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ كلاًّ نُّمِدُّ هَـؤُلاء وَهَـؤُلاء مِنْ عَطَاء رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَاء رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ . کەسێک نیازی ئاخرەت بێ و تێکۆشێ بۆ ئاخرەت، بەو تێکۆشانەی کە شایانی ئاخرەتە، ئەو کەسانە تێکۆشانیان لە لای خودا پەسندە و قبووڵە بە زیادەوە. ﴿١٩﴾ ئێمە هەرکام لە ئاخرەتخوازان و دنیاخوازان لەو دنیایەدا بەهرەمەند و یاریدە و مەدەد دەدەین، واتا کافر و موسوڵمان لە سەر ئەو دنیا سفرە و کەوڵەیە دادەمەزرێنین، بەخشین و عەتای خوداش هەرگیز مەنع نەکراوە لە کەس و ناکرێ. ﴿٢٠﴾

ئیشاڕاتی ئەو دوو ئایەتە پیرۆزە ئەوەمان پێ دەڵێن: دە کار کردنی ئامراز و وەسیلە بۆ هەر

لایەکی دە کار دەکرێ خودا بەرگری ناکا و ڕێی پێ ناگرێ. چونکە خودا ئەوەی بەخشیویەتی بە ئینسان لەمەڕ بەراوەردی نیاز پێشی پێ ناگرێ و لێی مەنع ناکا، زمان و چاو و گوێ و دڵ بۆ هەر لایەکیان دەکار کەی خاوەن ئیختیاری خودا لێت وەرناگرێتەوە لە سەر ئەوەی بۆ لای حەقت دەکار نەکردوون و یا بڵێین لە جێی خۆت ڕەعەمەل نەهێناون.

بە کوردی و بە کورتی، شمشێر بۆ بڕین ساز کراوە، هەروەک کافران دەبڕێ پێغەمبەرانیش دەبڕێ، چاو بۆ دیتن دانراوە، هەروەک جوانان دەبینێ ناحەزانیش دەبینێ، زمان بۆ کوتن و بەیانات سازاوە، قورئانیشی پێ دەخوێندرێ، جنێویشی پێ دەکوترێ، ئەوانە دە ئیختیاری ئینسانی نراون بۆ هەر لایەکیان دە کار کەی خودا بەرگریت لێ ناکا و هیچت لێ ناکا تا ڕۆژی خۆی.

بۆ توندوتۆڵ کردنی باوەڕ لە سەر ئیرادە و ئیختیاری ئینسان سوێگەیەک دەدەینە ئایەتی: يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إَن تَتَّقُواْ اللّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَاناً وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ «انفال» **ئەی خاوەن باوەڕان، ئەگەر لە خودا بترسن و باکوو بێ، خوداش هێز و شعووری تایبەتوو پێ دەبەخشێ بۆ گەیشتن بە ئامانجوو لە ژێر سایەی ئەو هێز و شعوورە.**

سووکەئاوڕێک وەسەر پوختەی مەتڵەب: خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم، ئینسانی بۆ لێک هەڵاواردنی تاوان و تەقوا بە وەسیلەی ئامرازی تایبەت تەیار و ئامادە کردووە و کەس بە کوێرانە دە ڕێیە ناکا و هیچ داوایەکیش لە نەزان ناکا، کەوایە ئینسان تاوان و تەقوای لە ئیختیاری خۆیدا، بۆ باوەڕ کردن زەین دە ئایەتی: إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ (١١) «رعد» **خودای تاق و تەنیا حاڵوباڵی هیچ نەتەوە و کەسێک ناگۆڕێ واتا لە خۆشبەختی بۆ لای بەدبەختی، لە نەزانی بۆ لای زانیاری، لە عیزەت بۆ لای زیللەت، بە پێچەوانەش، هەتاکوو بۆخۆیان لە سەر ئیرادە و ویستی خۆیان نەیگۆڕن.**

دڵی بەهەست و سرک و ڕەوەک و بەپرسیار لەوەی کە کافر بیترسێنی یا نەیترسێنی ئیمانێ ناهێنێ، ترس تەئسیری لێ ناکا چونکە لای ئەو یەکسانە ترسان و نەترسان، هەست بە سوڕێک دەکا، ئەو سوڕەش دەبێ ئەوە بێ: دڵ کە کانگا و مەزهەری خۆشی و ناخۆشی و ترسە، دە هەموو لەشێکی گیانلەبەردا هەیە بەتایبەت دە ئینساندا زیاد چاو دەکرێ، ئەو حاڵەتە سرشتە، ئینسانی کافر کە هەستی پێ ناکا و لای یەکسانە دەرکی دڵی لە هیوا و ئومێدی هەموو پەناگایەکی هیوا و ئومێد داخراوە، لە هەستی ڕۆژی هیوا و ئومێد کەوتووە و خراوە. و بۆ باوەڕ

و پشت ڕاست کردنەوەی ئەو ڕاستییە کە کافر لە هەست کەوتووە، دەچینە خزمەت ئایەتی ٧:

﴿٧﴾ خَتَمَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَعَلَى سَمْعِهِمْ وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ عظِيمٌ
**خودا دڵ و گوێیانی مۆر لێ داون و بە سەر چاویاندا تۆڕ و پەردەی کێشاوە و هەروا عەزابێکی گەورە چاوەڕێیانە.**

## دڵی داخراو و مۆرکراو

تێڕوانینێکی بەهەست وەلای ئەو دڵ و دەروون و مێشکەی کە چاوەی دەرک و شعوور و هەستە، کە چۆناوچۆن ئەو هەستەی لێ دەسێندرێتەوە و لە هەست کردن بە تاوان و حەق و ناحەق دەکەوێ وفەرقی ڕاست و خوار ناکا، ناتوانین و غیرەت ناکەین بڵێین خودا وای بە سەر دێنێ چونکە خودا زوڵمی لە کەس ناکا، خۆی فەرموویەتی: إِنَّ اللَّهَ لاَ يَظْلِمُ النَّاسَ شَيْئًا وَلَـكِنَّ النَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٤﴾ «یونس» **خودا هیچ زوڵمێکی لە ئینسان ناکا، بەڵکە ئەوە ئینسانە کە بە ئیختیاری خۆی زوڵم لە خۆی دەکا.**

دەبێ بڵێین و باوەڕیش بکەین کە کاتێ دڵ و هەست و شعوور دایە باری چڵێسی و لەززەت پەرەستی دنیا و سواری ئەسپی تۆڕی هەوا و هەوەس بوو، هەڵدەدێرێ و دەکەوێ، شووشەی ویژدان و کەڕامەتی ئینسانی کە وەسیلەی دەرک و شعوورن دەشکێن و ورد و هاژ دەبن کە تازە لە دەرکی حەق و ناحەق دەکەون، جا ئەو دەمە سرشتی ئینسانی دەگۆڕێ بە سرشتی حەیوانی هەچی بۆی بگونجێ و پێکبێ دەیکا و بە زوڵمیشی نازانێ، بۆخۆی خۆی هەڵدەخا بۆ مۆر لە سەر دڵ دانان، ئەو چاوە دڵەی حەقناس و حەقبین کوێر دەکاتەوە، خوداش بە هۆی ئەو ئیختیارەی لە هەوەڵەوە داویەتێ، لەو کارە قەبیح و ناڕەوایەی بەرگری ناکا. كلاًّ نُّمِدُّ هَـؤُلاء ﴿٢٠﴾ «اسراء» بۆ هەر لایەک ئامراز و ئەسبابی پێ بەخشراوی ڕێی هیدایەتی دەکار کا، خودا مەنعی ناکا و پێشی پێ ناگرێ تا ڕۆژی حیساب. وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ «فاطر» واتا داب و باوی ئەزەلی خودا ناگۆڕێ. یانی ئاور هەر سووتێنەرە مەگەر بە موعجیزە وەک کارەساتی ئیبراهیم؛ تاڵ هەر تاڵە، شیرن هەر شیرنە، ترش هەر ترشە، سوێر هەر سوێرە.

دڵی سرک و سڵ و خاوەن هەست و بەپرسیار ئەدێرەدا هەست بە شتێک دەکا ناتوانێ بە سەریدا باز دا و حاشای لێ بکا، ئەو شتەش ئەوەیە: ئەو مۆرەی کە خودا ناویەتە سەر دڵی ڕەشی کافران هەتا هەتایەی لە سەر داناون و قفڵی کردوون و یا دەرگای هێشتۆتەوە بۆ لابردنی

ئەو مۆرە قفڵە؟ دیارە دەبێ ئەوەن باوەڕ بێ کاروباری باری لە سەر ئەساسی زانستی تەواوی هەوەڵ و ئاخرە نەک بە هەڵکەوت و تەسادوف و بێبەرجەوەندییە، کەواتا ئەو مۆردار کردنی دڵی کافرانی ڕەش لە سەر ئەو ئەساسەیە کە خودا زانایە بەوەی کافر لە ئیرادە و باوەڕی خۆی دانابەزێ و پەشیمان نابێتەوە. ئەگینا خودا دەرگای ئاواڵەیە بۆ تاوانباران کە وەگەڕێن بۆ لای تەقوا هەتا گیان دەگەڕێتەوە.

بە کوردی و بە کورتی، کافر واتا خودانەناس لە هەوەڵەوە بە خودانەناس نەسازاوە، بەڵام کاتێ واریدی دنیای هەست و شعوور بوو چاوی بە زینەتی دنیا کەوتوو، خۆویستی و دنیاویستی ئاشنایەتی دەگەڵ پێکهێنا ئەقڵ و هەست و شعووری حەقناسی و دنیاناسی و خۆناسی لێ فڕاندووە تازە ناتوانێ بە هۆی لاوازی و بێئیرادەیی دڵ و دەروونی وەگەڕێ. چونکە کەوتۆتە نێوان دوو تەلەسمان: ١. خۆشەویستی دنیا، ٢.لە دەسدانی ئیرادە و بەرجەوەندی لە خۆی و دنیا.

پاش ئەوەی خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم موسوڵمانی ناساند بە ئاکارەوە، و کافریشی ناساند بە ئاکارەوە، بۆ ئیقناعی دڵ ویستوویەتی نە موسوڵمان نە کافریش واتا منافق کە فێڵێ لە هەرکان دەکا و بەدفەڕترە لە کافر، بناسێنێ، جا بۆ ئەو مەتڵەبە هەستیارە دەچینە خزمەت ئایەتی ٨:

﴿٨﴾ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ

**هێندێک هەن لە ئینسانان دەڵێن ئێمە بە خودا و ڕۆژی ئاخرەت باوەڕمان هەیە، دەگەڵ ئەوەی باوەڕیان نییە و بە خاوەن ئیمان حیساب ناکرێن.**

## منافق (دووڕوو)

ئینسان بوو بە سێ دەستە: ١. موسوڵمان ٢. کافر ٣. مونافق

دڵ ڕادەمێنێ و دادەمێنێ دێر و دەوێ دەفکرێ تاکوو ئەوە بزانێ ئایا ئەو کەسانەی خودا شاهیدی بێ ئیمانیان لە سەر دەدا، هەست و شعووریان هەست بەوەی ناکا کە لە سەر ڕێگای ناپەسەند و ناڕەوان؟

دەبێ لە وڵامدا بکوترێ نەخێر. چونکە ئەو هەست و ئەقڵ و شعوورەی حەق و ناحەق لێک هەڵداوێرێ، بە ژەنگ و ژار و چڵک و چەپەری خەرافات و هەوا و ئارەزووی دنیای

خودبەسەری و سەرسەری لە فڕ کەوتوون وەک مەلی بێ باڵ ناتوانن بفڕن، واتا هەستی لە هەست کەوتووە و ناتوانێ هەستێ و حەق چاو کا ، ئەو کارەسات و بەسەرهاتەی هەست و شعووری لە کارکەوتوو ئی ئەوەیە ڕێگای نەداوە بە ئەقڵ و شعووری سرشتی تاکوو سرشتی ئەزەلی خودا پێداوی خۆی وەگەڕ خا و دەکار کا، بەڵکە هەر لە سەرەتای وەخۆکەوتنی بۆ ژیان پەیمانی بێ پسانەوەی دەگەڵ دنیای پڕ گێرە و کێشەدا بەستووە، سرنج دە و شعوور وەگەڕ خە لە سەر سێ ئایەتی: فَأَمَّا مَن طَغَى ﴿٣٧﴾ وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى ﴿٣٩﴾
«نازعات» **ئەو کەسەی سەرەڕۆیی و یاغیگەری کردووە و هەروا ژینی دنیای پەسند کردووە بەڕاستی دۆزەخ جێیەتی.**

ئەو ئایەتانە هاوارن لەو کەسانەی سرشت و ئەقڵ و شعوور دەفرۆشن بە هەوا و ئارەزوو و نەفسی چڵێس.

## تێڕوانینێک لە سیمای ناحەز و ناقۆڵای «مونافق» (دووڕوو).

منافق کەسانێکن ترساو لە حەق و خۆبوێر لە واقعیەت، پەردەی ڕەش و تاریکی بێباوەڕییان دەخەنە سەر ڕووی حەق و حەقانییەتی ئیمان باوەڕی، هەر بۆیەشە خودای عەلیم و حەکیم شاهیدی بێ ئیمانی و درۆزنییان لێ دەدا، چونکە ئەوان بۆ بە تەفرە بردنی ئیمانداران دەڵێن ئیمانن بە خودا و ڕەسوولی خودا هەیە، بۆوەی بتوانن خۆیان دەگەڵ خاوەن ئیمانان ڕێکخەن و بە تەفرەیان بەرن، هەروەک ئەگەر دەگەنەوە لای یارانیان دەڵێن: ئێمە هەر دەگەڵ ئێوەین بۆ ئیهانە و بە تەفرە بردنی ئیمانداران دەچینە لایان.

دڵی زیت و بەپرسیار دەڵێ: دەبێ منافق هێندە بێهەست و شعوور بێ، نەزانێ ئەگەر خودا زانایە و فریو نادرێ و فێڵی لێ ناکرێ؟ ئەمەش دەڵێین: بەڵێ دڵ و چاوی حەقبین ئەگەر کوێر کران و پەردەی ڕەشیان بە سەر کشا، هیچ چاو ناکەن، چونکە دڵی زیندوو چاوی ئاواڵە حەق دەناسێ و حەق چاو دەکا نەک دڵی مردوو چاوی کوێربوو. بۆ ڕاستی ئەو مەتڵەبەی دەچینە خزمەت ئایەتی ٩:

﴿٩﴾ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُم وَمَا يَشْعُرُونَ
**«ئەوان بە نەزەری خۆیان» خودا و ئەو کەسانەی کە خاوەن ئیمانن فریو دەدەن و بە تەفرە دەبەن، دەگەڵ ئەوەی خۆیان بە فریو دەبەن و ناشفامن.**

## بەراوەرد و تێڕوانینێکی حەکیمانە لەو هەڵوێستە ناڕەوا و ناحەزەی منافقان:

دەبێ ئێمەی خاوەن باوەڕ و ئیمان ئەوەن بنچینە و کڵی دڵ و شعوور بێ کە خودای حەکیم کەس بە نەزان و نەفام و دڵکوێر وەڕێ ناخاتە دنیای تەکلیف، بەڵام کەسیش بەرگری ناکا لەوەی سرشتی بەهەستی زانست و شعووری خودا پێداوی لە کار خا و بە هەوا و هەوەسی دنیایەی بفرۆشێ. **منافق** یەکێکە لەو کەسانەی هەر لە سەرەتای هاتنی بۆ مەیدانی کار و تێکۆشان بارەگای ئەقڵ و دەرک و شعووری سرشتی کردە بنکە و بارەگای چەتەکانی هەوا و هەوەسی دژمنانی دین و ئایین و ویژدان و کەرامەتی بەشەری، کە ئەو منافقە دووڕووە ئاوڕ وەنادا بۆ لای حەق و هەستی بەشەری «جا مەگەر خودا بە حیکمەت و ڕەحمەت»

منافق هەر ئەوەیە کە ناوێرێ نیەتی خۆی بە ڕاشکاوی و ئاشکرایی بنوێنێ و ڕایگەیێنێ، بەڵکە لە کن خاوەن ئیمانان دەڵێ: ئیمانم هەیە بە خودا و ڕەسوولی خودا، لە لای شەیتانەکانی هاواڵی دەڵێ: دەگەڵ وەم؛ هەر ئەئەو ڕاوڕاوێنە و بازبازێنەی، نیشانەی ئەوەیە ماڵی دڵ و ویژدانی لە دەس داوە و کاول و کەڵێس بووە کە تازە جێی بەرقەراری و وەقرە و حەسانەوەی لێ نەماوە. هەربۆیەشە لە بەر هەوتی و پەرێشانی و دۆڕاوی، دە گژ خودا ڕاچووە کە فێڵی لێ بکا و فریوی دا. (نعوذ بالله).

### سیمای منافق

لە چوار لاوە منافق ناحەزی و ناقۆڵایی دیارە:

١. لە لایەکەوە دەیهەوێ فێڵ لە خودایەک بکا و خۆی لێ وەشارێ کە زانا بە زاهیر و باتین و هەوەڵ و ئاخری هەچی هەیە و نییە. جا ئەئەوە دڵێک سەرلێشێواو نەبێ چۆن غیرەت دەکا درۆی لە لای خودا بکا و خۆی لێ بگۆڕێ.

٢. لە لایەکی دیکەش منافق ئەگەر بیهەوێ فێڵ لە پێغەمبەری خودا بکا ناتوانێ، ئەگەر دڵ پەرێشان و سەرلێشێواو نەبێ، چۆن دەزانێ پێغەمبەرە و نازانێ پێغەمبەران فێڵیان لێ ناکرێ چونکە خودا حاڵییان دەکا لە هەر بارێکەوە.

٣. لەو لایەشەوە ئەگەر منافق بیهەوێ فێڵ لە موئمینان بکەن چ بەهرەیەک بۆ خۆ دەستێنن و چ زەرەرێک بە موئمینان دەگەیێنن؟ زەرەر و قازانج ئەگەر کاسەی ئەقڵ نەشکابێ، دەزانێ لە خوداوەیە.

٤. کاسەی دڵی خاوەن هەستی ئاگادار بە شعوور و ویژدانی بە کـوتکی هەوا و هەوەسـی چڵێسی شەرم و حەیای شکاندووە و هاڕیویەتی بۆیە بە خۆ فریودانی بە گژ خودا و ڕەسـوولی خودا و ویژدانی حەقناسیدا هاتووە ﴿وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُم وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ ناتوانن فێـڵ لە خـودا بکەن، دەتوانن فێڵ لە ویژدان و هەستی شعووریان بکەن بێ فەهم و هەستی شعوورن.

بە کورتی و بە کوردی، منافق چونکە چاوەی چاوی دڵـی بە تـۆز و خـۆڵی نەفـس و هەوا کوێر کردۆتەوە، ناتوانێ حەق چاو کا هەربۆیە وای خەیاڵە: پێغەمبەران بۆ پیادە کردنـی ویسـت وهەستی خۆیان هاتوون، کەسانی ساوا و کاڵ و ناپوختە لە دەوری خۆ وەکۆکەن، بەڵکە بتوانن بە فێڵ و فوت عالەمێک وەشوێن خۆ خەن و لە خۆ کۆ وەکەن، ئەوانیش واتا منافق بۆ بەرگـری لەو هەڵوێستە دە گژیان ڕاچوون بەڵام بـێخەبەر لەوەی خـودای خـاوەن زانسـت و حەکـیم و پشتیوانی پێغەمبەران جگە لەوەی یاریدەیان دەدا لە هەر بارێکەوە هەموو هەسـت و مەرامێکـی منافقان و زاڵمانیان خەبەر پێ دەدا و تێیان دەگەیێنێ.

دەو هەڵوێستە ناپاکەی منافقان دڵ تووشی سوڕێک دەبێ، ئەویش ئەوەیە: هەموو نەفسێک بە گشتی چ بەدین و چ بێدین، بە پێی فەرموودەی خۆی خودا، تەقوا و تاوانی لێ حاڵی کراوە، چۆن دەکرێ منافق لەو بەخششە بەشدار نەبێ: ﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ۝٨﴾ «شمس» واتا خودای تەوانا تەقوا و تاوانی دادۆشیوەتە نەفس و هەستی ئینسانەوە بە هۆی ئەقڵ و هەستی شعوورەوە.

دڵ دەڵێ دەکرێ لەو سوڕە ئاوا خۆ دەرباز و ڕەها کەین؟ خـودای تـاق و تەنیـا بـۆ نەزم و نیزامی کائینات و بوونەوەری گیاندار و بێگیان وەک نەباتات و حەیوانات بەتایبەتی ئەسباب و وەسیلە و ئامرازی بۆ بەراوەردی هەر نیازێک ڕێک خستووە و داناوە، جا هەرکام لەو ئەسباب و وەسیلانە فەوتێندرا و نەما ئەوەی پێشـی دەکـرا و دەهـاتە جـێ، نـامێنێ؛ ئێسـتاش لەسـەر ئەو ئەساس و یاسایە منافق سـرشتی حەقناسی وەک ئەقڵی سەلیم و هەست و شعووری پاک بێ، لە دەستی داوە بە هۆی نەفس و هەوای سـەرکێش، قفڵـی دەرکـی دڵـی داخـراوە کلـیلەی پـێ هەڵگرتنیشـی بە نەفسـی دزی چڵێسـی فرۆشـتووە و نایـدرێتەوە. بـۆیە بە دامـاوی کەوتـۆتە دڵنەخۆشی تا ڕادەبرێ لە دنیا، بۆ ڕاستی ئەو مەتڵەبە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٠:

﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضاً وَلَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكذِبُونَ ۝١٠﴾

**«بۆ لە هەست و شعوور کەوتوون؟» لە نـاو دڵیانـا نەخۆشـی و دەغەز هەیە، «ئەو نەخۆشـییەیان بە ڕادەیەک توندە بۆتە هۆی ئەوەی» خودا زیاتری کا لە ناخی دڵیان، بەو هۆیە هەیانە عەزابی بەژان.**

## دووڕوو سەرناکەوێ دە فێڵیدا

دڵی هەستیار دێرەدا بەتایبەت لە جوملەی «فَزَادَهُمُ اللّٰهُ مَرَضاً» هەست بە شتێک دەکا هەچەن دەکا وەپاڵدانی ئەو شتەی بۆ لای خودای پێ هەزم نابێ و ناقۆزرێتەوە. شتەکەش ئەوەیە: کوا ڕەوایە بۆ خودا ئینسانی نەخۆش و نەزان و نەفام نەخۆشتر و نەزانتر و لاڕێتری کا. چونکە خودا بۆخۆی فەرموویەتی: ئەمن هادیم و ناجیم بە هۆی پێغەمبەران و کتێبەکان. دەبێ بۆ دەفعی ئەو شتە ڕوو دە گوێ کرێ و دڵی لێ وەحەسێ کە خودای تەعالا کەس نەزان و نەفام ناکا.

دەبێ هەست و ئەقڵ و شعوور لەو جێگا خلیسکانە خلیسکێ نەبەن، لیزگە و ڕستەکانی: خَتَمَ اللّٰهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ ـ فَزَادَهُمُ اللّٰهُ مَرَضاً دەبێ لە سەر زاهیری خۆیان حیساب دانەندرێ بەڵکە لە سەر باتین و دەروونیان نەزەر بدرێ ئەویش ئەوەیە: منافق ڕەش و برشی تاوانی هەم بۆتە مۆری سەر دڵی، هەم بۆتە هۆی گرانتری دەردی نەخۆشییەکی کە ئەویش نەزانی و نەفامییە. ئەگینا خودا سەربەخۆ لە سەر ئەساسی ئیرادە و مەشیەتی خۆی نە دڵی منافقی مۆر هاویشتۆتە سەر نە دەردی نەزانی لێ زیاد کردووە.

لە ڕاوێژ و بەراوەردی ئایەتەکانی قورئان دەردەکەوێ کە منافق دۆڕاوترە لە کافر. چونکە دەبیندرێ کافر بۆخۆی و بە سیفەتی دوو ئایەتی ۶ و ۷ ڕێ وەشاوە، بەڵام منافق لە ئایەتی ۸ڕا تا ئایەتی ۱۶، واتا ۹ ئایەتی بۆ هاتووە. ئەو یاسایە ئیشارەیە وەلای ئەوەی منافق کاروباری سەختترە لە کافر. جگە لەوەش کافر خۆی نیشان داوە بە ڕوونی بەڵام منافق لە موسوڵمان خۆی دە بۆسە ناوە بۆ خاتری ئەوەی نەیناسێ و چاوی نەکا تا پێوە دەدا و سەرەنگرێی دەکا. وەهروا ئەوەش هەیە منافق دووڕوویە هەر جارەی بە ڕوویەک خۆ دەنوێنێ. بەڵام کافر یەکڕوویە.

دڵ دەیهەوێ نیشانەکانی ئاکاری منافق بە جوانی بزانێ، بیناسێ و خۆی لێ دوور بگرێ. بۆ ئەو مەبەستە دەچینە خزمەت ئایەتەکانی ۱۱ تا ۱۶، دە هەموو ئەو ئایەتانەدا ئاکار و ڕەفتاری منافق نیشان دراوە لە لایەن خوداوە لە حاشا کردن بەدوورن تازە.

**﴿۱۱﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ قَالُواْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ**
**کاتێ (لە ڕووی ئامۆژگاری) بەوان بکوترێ: لە سەر زەوی فەساد مەنێنەوە، لە وڵامدا دەڵێن: ئێمە ئاشتی و سوڵحچێنین.**

## وڵامی منافقان

ئەو هەڵوێست و وڵامەی منافقان ئەوە نیشان دەدا کە منافق گوێ بۆ حەق شل ناکـا و مـل نادا، بەڵکە نیەت و باوەڕی خۆی پێ حەقە.

**بەراوەرد و تێڕوانینێک لە قەوارە و سیمای منافق:**

دڵ دەڵێ خۆ منافق خاوەنی هەست و حیسسە، دەبێ ئەو دڵ و هەست و حیسسە لە دەرک کردنی حەق و باتڵ خرابێ؟ و ئەگەر دەو سـرشتە خراپە کەوتبـێ، کـێ وای بە سـەر هێنـاوە و هۆیەکەی چ بێ و کێ بێ؟

خۆ ناکرێ و ناشبێ لە ڕوانگەی ئەقڵ و ئینساف و ویژدانەوە بگوترێ خودایە، چـونکە ئەو خودایەی ئیلهامی بە دڵ دابێ بۆ دەرک و هەستی تاوان و تەقوا، حەق و باتڵ: فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَـا وَتَقْوَاهَا نـاکرێ بۆخـۆی بە ئیـرادە و مەشـییەتی سـەر لە هەسـتی دڵ بشـێوێنێ لەو بەخششـە بەنرخەی بەری کا و نەزانێ حەق کامەیە و ناحەق کامەیە و لە باتی حەق، باتڵ هەڵگرێ.

بەڵکە دەبێ بە قەناعەتەوە بڵێین: ئەو وەسیلە و ئامرازەی کە دەناو هەسـتی دڵـدا نێـژراوە لە کار دەخرێ و دەنـاو ئـاوی گەرمـی هەوا و نەفسـی چڵێسـدا دەکوڵێنـدرێ تـا دەبێـتە نەفسـی سەرەڕۆی ئامیری خـراپە. ئەودەم هەر ئەو ڕێـیە چـاو دەکـا کە بە نەفسـی پـیس و فاسـیدی دە خراپەدا کوڵاوی هەڵبیژارتوە و بە یەکجاری دەکەوێتە ژێر حوکمی ئەو ئـایەتە پیـرۆزە: قُـلْ هَـلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَـرِينَ أَعْمَالًا ﴿١٠٣﴾ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُـنْعًا ﴿١٠٤﴾ «کهـف» **«ئەی پێغەمـبەر بێـژە بە کـافران» ئەرێ دەخـوازن پێتـان بڵـێم کـێن ئەوانەی خەسارەتمەندترین کەسن لە کردەوەکانیاندا؟ ئەوە ئەو کەسانەن کە تێکۆشـان و تەقـالای ژیـانی دنیایانـدا تێشکاون و حەول و تەقالایان بەفیڕۆ چووە، پێشیان وایە کاری چاکیان کردووە.**

بە کوردی و بە کورتی، خودا کەس وەسەر تەڵە ناپەڕێنێ و پاڵیش بە کەسەوە نـانێ. بەڵـکە ئەوە نەفسی چڵێسە بۆ ئامانجی نارەوای خۆی ئینسانی پاڵەوپانی دەدا و پاڵی پێوە دەنێ.

ئەو هەستە دەکرێ و بە دڵدا دێ نزوولی ئەو ئایەتە لە مەدینە بووبێ چـونکە ئەوزەمـانی لە مەدینە بەولاوە منافق بەدی نەدەکران. جا بە پێی ئەو هەستە دەبـێ بکـوترێ واژەی فی الارض‌ی ناو ئایەتەکە هەچەن عامە، بەڵام هەر ئەرز و وڵاتی مەدیـنە لە خـۆ دەگـرێ. بەڵام لەبەر ئەوەی قورئان موعجیزەیەکی ئەبەدییە بۆ هەموو دەور و زەمانی داهاتوویە بێ بڕانەوە و بـێ پسـانەوە و شامیلی حاڵی هەموو گەلانـی داهاتووشـە، کەوایە لە سـەر ئەو ئەساسـە واژەی فی الارض بـۆ

هەموو ئەرز و وڵاتێکە کە ئینسانی لە سەر نیشتەجێیە.

بۆوەی ئینسان بە باوەڕەوە بزانێ کە منافق درۆزن و دووڕوویە، خودا ڕایدەگەیێنێ بە دنیای ئینسانی کە منافق هەم فاسدە، واتا دە جەوهەری خۆیدا داتوڵاوە و بۆگەن و ڕزیوە، بێدەرک و شعووریشە، واتا شعووری ئەوەی نییە گوێ بداتە حەق، جا بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٢:

﴿١٢﴾ أَلا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَـكِن لاَّ يَشْعُرُونَ
**ها تێبگەن ئەوانە بێ شک فەسادکارن، بەڵام بە هۆی سەرەڕۆیی و غرووری و فریو خواردووییان پەی بە فەسادکارییان نابەن**

## تێڕوانینێک لە سیمای ئەو ئایەتە پیرۆزە (١٢):

هێنانی (هُمْ)ی دوو کە بۆ تەئکیدی (هُم)ی اِنَّهُمْ ئەو تەئکیدە ئیسباتی فەسادکاری منافقان دەگەیێنێ بە کوردی واژەکانی: أَلا، إِنَّ، هُمْ ئیسباتی فەسادکاری منافقانە، چونکە ئینسان تا لە خوداوە دوور کەوێ، لە فەسادکاری نزیک دەکەوێ.

هەروا وشەی (وَلٰكِنْ لايَشْعُرُونَ) دڵ دەڵێ دەبێ ئاماژە بێ وەلای ئەوەی منافق بە هۆی هاڵاوی گڵاوی دەروونی لە کاری چارە کەوتووە و ئیسلاح نابێ و گۆیا حەزرەتیش فەرموویەتی دڵ وەک شووشەی ساف و بێگەردە ئەگەر هاتوو چرزێک و پەڵەیەکی تێکەوت چارەی ناکرێ، مەگەر خودا بە حیکمەت چارەی کا.

دڵی هەستیار هەست وەگەڕ دەخا و سرنج دەگرێ بۆوەی بزانێ ئایا منافق لە سەر ئەو حاڵە ناحاڵیەی خۆی بۆ دەگەڵ دووان دەبن و گوێ شل دەکەن بۆ بەڵگە و دەلیل و بورهان، ئایا هەر فڕهاوێژ و پلارهاوێژن؟ بۆ ئیسباتی ئەو مەتڵەبە هەستیارە دەبێ پەنا بەرینە بەر لیقای باریتەعالا چونکە ئەو لە سەر و بنی دیزەی دڵی عەبدی خۆی حاڵیە و دەزانێ چۆنە و چۆن دەبێ. جا کەوایە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٣ بۆ ئەو مەتڵەبە:

﴿١٣﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُواْ كَمَا آمَنَ النَّاسُ قَالُواْ أَنُؤْمِنُ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاء أَلا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاء وَلَـكِن لاَّ يَعْلَمُونَ.
**هەرکاتێ بەوان بکوترێ: ئیمانێ بێنن «هەروەک بە زۆری عالەم ئیمانی هێناوە» لە وڵامدا دەڵێن: ئایا هەروەک ئەو عالەمە بێ شعوورانە ئیمانێ بێنین؟ ها، بزانن ئەوانە نەزانن، بەڵام نازانن کە نازانن.**

## دەگەڵ دوانی منافق

دڵـی هەسـتیار ئەوەی بـۆ دێـتە پێشـێ بە سـوئال، منـافق کە ئـاوا دژایەتـی هەیە دەگەڵ موسوڵمانان، ئەدی چۆن دەتوانێ دەگەڵی وەحاوێ لە سەرزەمین و وڵاتێکدا؟ دەبێ بـۆ وڵام و ئیقناعی دڵ ئاوا بچینە پێشێ: منافق بۆ دەسکەوتی بەهرەی ئامانجی کە زەربە وەشاندنە لە ڕیشە و سیمای ئایینی ئیسلام، بە دووڕوویی خۆی خنیوەتە ناو کۆزی موسوڵمانان، ئاوا نەبێ ناتوانێ ئاگاداری هەست و خوستی ئۆمەتی ئیسلام بێ. بەو پێیە منـافق قبـووڵی ئاومـاڵی و جیرانەتـی گەلی ئیسلام دەکا و خۆی دەگەڵ ڕێک دەخا، بانگـاواز و بانگێشـتنی ئـایینی ئیسـلام لە لایەن حەزرەتی ڕەسوول زەربەیەکی گورچووبڕە لە منافق، ئەوانـیش بـۆ تـۆڵە و زەربە وەشـاندنەوە لە ئایینی پاکی ئیسلام لە نیزیکەوە ئاوا نەبێ واتا دەپاڵیانـدا نەبـێ نـاتوانن، بەڵام بـێخەبەر لەوەی باریتەعالا جار دەگەڵ جار نوێنەری خۆی (پێغەمبەران) لە مەکر و حیلەی دژمنـانی دیـنەکەی باخەبەر دەکا.

### تێهەڵڕوانینێک لە قەد و باڵای ئایەتی ١٣

لەو تێڕوانینەدا ئەوە هەست دەکەین: بە وشەی آمنوا لە جوملەی ﴿كَمَا آمَنَ النَّاسُ﴾ بێنیـاز بین بە لای خۆمانەوە، خۆ دیارە کەلامی خوداش واتا قورئان، لە هەچـی عەیـبە بەریـیە واتـا نە زیادی تێدایە و نە کەم. بەو پێیە دەبێ هەست وەکار خەیـن تـا ئەو ڕازە وەدۆزیـن: بـۆ لە دوای «آمِنُواْ»، ﴿كَمَا آمَنَ النَّاسُ﴾ هاتووە. پاش نەختە خۆ هەڵسووڕانێکی زانست و هەست لە وڵاتی ئادابی عیلمی عەڕەبی (نحو) بەو ئاکامە گەیشـت دڵ: کە ئیمانـی پـاک و بێخەوشـی ئیسـلام دەبێ بە ئاکار و بە ئەعمال وەڕازێ و وێنە و نموونەی لە سەر بەیان کرێ، نە تەنیـا هەر بە قسـە بێ. جا لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ بۆ تەئکیدی آمنوا نموونەی ڕاستی و واقیعی بـۆ بهێنـدرێ بە جوملەی ﴿كَمَا آمَنَ النَّاسُ﴾.

ئاوڕێک وەسەر ئایەتەکـانی ٩، ١٢، ١٣ وەدەیـن لەو بـارەوە کە لە ئـایەتی ٩ وَمَـا يَشْـعُرُونَ هاتووە بەڵام لە ئایەتی ١٢دا لاَّ يَشْعُرُونَ هاتووە ولە ئایەتی ١٣دا لاَّ يَعْلَمُـونَ هـاتووە. هەر سـێ لاش لە سەر منافق ڕانراون لەو نیزامە جۆراوجۆرەدا لە سەر منـافق هەسـت بە سـوڕ و ڕازێـک دەکرێ، لازمە بۆ حەسانەوەی دڵ ئەو سوڕ و ڕازە بزاندرێ.

هەستی ئەقڵ و شعوور بۆچوونی خۆیان لەو بارەوە ئاوا نیشان دەدەن: دە ئـایەتی ٩ و ١٢دا

باس لە فێڵ و فەسادی سەر زەوی دەکرێ، خۆ دیارە هەم ئەسەری فێڵ و هەم فەسادی سەر ئەرز دەزاندرێ و دەرک دەکرێ بە شعوور، جا ئەو شعوورەی ئەو فێڵ و فەسادەی هەست پێ دەکا و دەزانێ لە لای منافق نەماوە و دۆڕاوە بە هەوا و هەوەس و سەرەڕۆیی، بۆیە دە حەق ناچن و تێناگەن و شعووریان پێی ناشکێ.

دە ئایەتی ١٣دا باس لە سەفاهەت و گەوجییە، خۆ دیارە سەفاهەتیش حاڵەتێکی نهێنییە بە چاو دەرک ناکرێ و نازاندرێ. بۆیە خودای تەعالا دەو حاڵەتەیاندا لا یَعْلَمُونَیان وەپاڵ دەدا، واتا هێندە سەفیهن، سەفاهەت بەری چاوی هەست و زانستی گرتوون و حەق ناناسن و نایزانن.

## تێڕوانین لە منافق

دڵ دەڵێ لە سەر ئەو یاسا و ئەساسە دروستەی قورئان دەکرێ هەر ئینسانێک خاوەنی ئەو سیفاتە ڕەزیلانە بێ، ناوی منافقی بۆ دەکار دەکرێ بێ لە بوختان، هەچەن ئەوڕۆ دەرگای وەحی داخراوە تاکوو منافقمان بۆ باس کا بەڵام قورئانێکی کە هەمیشە هەیە و تازەیە، سیفات و نیشانەی منافقی بە ڕوون و ئاشکرایی بۆ دەس‌نیشان کردووین، ئەو سیفات و نیشانانەی منافق محەکن لە هەر کەسی منافقی دەی، ئاشکرای دەکا. منافقێک واتا بە ڕواڵەت موئمین و لە باتیندا کافر و بێ‌باوەڕ، و لە کردار و ئاکاری ئیماندار بەری، واتا گورگ باتین و زاهیر مەڕ، زەندیق و مولحید سیفەت.

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم بە ڕادەیەکی ڕوون و ئاشکرا منافق دەناسێنێ بە دنیا هەر خۆی خۆی نەناسێ، دەنا هەچی ئینسانە دەیناسێ. لە باری کۆمەڵایەتی، لە باری ئەخلاقی، لە باری ڕەفاقەتی، لە هەموو بوار و باران خودا دان‌ناسێنێ. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٤:

﴿١٤﴾ وَإِذَا لَقُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ قَالُواْ آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُواْ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِؤُونَ

**هەرکات دەگەیشتنە خاوەن ئیمانان دەڵێن: وەک وە ئێمەش خاوەن باوەڕین. وەختایەک دەچوونە لای شەیتانەکانیان ئێژن: ئێمە لە خۆتانین و دەگەڵ خۆتانین. «ئەگەر دەچینە لای ئەوانە» گەمەیان پێ دەکەین.**

بە پێی ڕوانین و بەرجەوەندی لە ئاکار و هەڵوێستی منافقان ئەو هەستەیان لێ دەکرێ: کاتێ دەگەنە لای خاوەن باوەڕان، دەڵێن: ئێمە وەک ئێوە خاوەن باوەڕین و دەگەڵتانین. بۆ بەرجەوەندی ئامانج و نیەتی ناپاکیان؛ وەختایەک دێنەوە لای تاقمە شەیتانەکانیان ئێژن پێیان لێمان دوودڵ مەبن کە دەچینە لای خاوەن باوەڕان، چونکە ئەگەر دەچینە لایان جگە لە تێبینی ئامانجمان، گاڵتە و گەمەیان پێ دەکەین. ئەو حاڵەتە دووڕوویە ئیشارەیە وەلای ئەوەی کە منافق لە سەر هیچ باوەڕێک نییە و هیچ خەتێکی ویژدان و کەرامەتی تێدا چاو ناکرێ. بازبازێن و ڕاوڕاوێنیان هاوارە وەلای بێخوداییان. دەبێ ئینسان بە تەئکید ئەوە بزانێ و باوەڕ کا کە منافق زەرەری زیاترە بۆ ئینسانی لە کافر، بەتایبەت بۆ ئیمانداران. چونکە منافق خۆی دە بۆسە ناوە لە موسوڵمانان، ناناسرێن، زوو بە زوو دەتوانن ڕێگای فێڵ و فوت بۆ موسوڵمانان دامەزرێنن و دە تەڵە و داویان خەن. بەڵام کافر ئەوەی لە دەس نایە، چونکە خۆی ئاشکرا کردووە، زۆر بە ئاسانی دەکرێ لە خەت و ڕێبازیان دوور وەکەوی. و هەروا زانست و شعووریشیان بەوە ناشکێ کە موسوڵمانان بە هۆی ئاکاری نارەوایان دەیانناسن. بۆیە خودا مَا يَشْعُرُونَ و لاَ يَشْعُرُونَیان وەپاڵ دەدا.

## لادان لە بەر جاڵەیەک

جاڵەکەش ئەوەیە: لە هێندێک شوێن واژەی **ئیستیهزاء** وەپاڵ خودا چاو دەکرێ وەک: اللُّه يَسْتَهْزِىءُ بِهِمْ. خۆ ئەوە حاشاهەڵنەگرە: کە خودا موبەڕڕا لە هەموو عەیب و شتی ناحەزە، خۆ ئەوەش دیارە ئیهانە و ئیستیهزاء ناحەزن. دەبێ ئەو ناحەزە وەپاڵ خودای جوان لە زات و سیفاتدا نەدرێ، چونکە سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ خودای وەدوور دەخا لە هەرچی ناحەزە. جا لە سەر ئەو یاسا دروست و ڕەوانە، دەبێ مانای ئیستیهزاء ئاوا بناسین کە بە مانای تۆڵەیە. ئەو وەخت مانای ئایەتەکە ئاوا دێتە ڕوو: خودای تەعالا منافقان لە سەر ئیهانە بە موسوڵمانان و گاڵتە پێکردنیان تۆڵە و سزا دەکات، هەم لە دنیا هەم لە ئاخیرەت. بۆ باوەڕی دەچینە خزمەت ئایەتی ١٥ دەوێدا بە ڕوونی واقیعیەت چاو دەکرێ:

**﴿١٥﴾ اللَّه يَسْتَهْزِىءُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ**

**«خودای خاوەن حیکەمت و حەکیم» گاڵتە بەوان دەکا، و چەن زەمانێکیان ماوە دەداتێ پێشیان بەرهەڵدا دەکا تاکوو لە ناو یاغیگەری و سەرەڕۆیی خۆیاندا بە سەرگەردانی وەمێنن.**

## تێڕامانێک لەمەڕ گاڵتەی منافقان بە خاوەن ئیمانان و گاڵتەی خودا بەوان

بە پێی هەڵسەنگاندنی فەهم و شعووری ئیمانـاوی، خـاوەن بـاوەڕ و ئـیمان زۆر بەرزتـرە لەوەی بتواندرێ گاڵتەی پێ بکرێ لە لایەن هەرکەسێکەوە بێ، چونکە مـوئمین یـار و دۆسـتی خودایە و خوداش یاوەریەتی لە هەر گاڵتە و گەپێکی ئینسان باڵاترە، تیری پیسانیان ناگاتێ.

بەڵام گاڵتەی خودا بە ئینسانی، واتا زەجـر و تـۆڵە و سـزا، لەسـەر بێئەدەبـی و نـاڕەوایی ئینسانە، واتا ئەو ئینسانە هێندەی خۆ نزم و نەوی کردووە لە بەرز و بەڕێزایەتی ئینسان کەوتوو و دابەزیوە، جا بەو هۆیە خۆی بۆ هەموو تیر و تانەیەکی کردۆتە نیشـانە. بەو پێـیە خـودایەکی کە ئیکرام و ڕێزی لە ئینسان گرتووە ئەویش لە مقابیلدا خۆی بێڕێز دەکا، زۆر شایانیەتی خـودا بە چەپۆکان بە سەریدا دا.

### پوختەی نەتیجە

ڕووڕەشی و دووڕوویی منافق زۆر لە سەرووی ڕووڕەشی کافرە، چـونکە کـافر ئاشـکرای کردووە، بەڵام منافق گورگە و دە کەوڵـی مەڕدایە. دەگەڵ ئەوەش لە دەورانـی حەزرەتـدا کـافر جگە لەوەی ماڵ و ملـک و سامانیشـیان بە تـاڵان دەکەوتە دەسـت موسـوڵمانان، بۆخۆشـیان دەکوژران و بە دیل دەچوون، کەچی ئەو منافقـانی دووڕوو زۆر بە کەمـی دە گیـر دەکەوتـن و تووشی شاڵاوی یارانی ئیسلام دەکەوتن. ئەوەش هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بـۆ ئەوە منـافق بە پێـی کات و زەمان ڕەنگ لە خۆ دەدا تا دەناسـرێ زۆری پێ دەچێ. گەرچی خـودای مەزن سـیمای منافق و دەروونی گڵاوی لە ڕەسوولان حاڵی کردووە بەڵام ڕەسوولان لە سەر ئەساسـی بـاوی پێغەمبەرایەتییان زۆر مەیدان دەدەن بە ئینسانی نابار و ناتەواو بۆوەی بەڵکـوو وەگەڕێ بـۆ لای چاکەی، جا لەو ڕوانگەوە زوو بە زوو بە جامیعەیان ناناسێنن.

جگە لەوەش ئایینی ئیسلام ڕێی قەزاوەتی لە سەر زاهیری پێ دراوە خۆ دیـارە منـافقیش بە زاهیر دەڵێ موسوڵمانم، باتینیشی هەر خودا دەزانێ. دەیجا خۆ ئەگەر ئایینی ئیسلام خەڵکی بە هۆی تاوانی زاهیری منـافقی گوشـتبا، بە زۆری دەبـا خەڵـک کوژرابـا. ئەودەم هاواریـان بەرز دەکردەوە دەیانگوت ئایینی محەممەدﷺ عالەمکوژە، سەربەخۆ بێ لێکۆڵینەوە.

بە کــوردی و بە کــورتی، مــانەوەی منــافق دە نــاو عــالەمی ئیســلامی دەوری حەزرەت دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئایینی ئیسلام قەزاوەتی لە سەر زاهیرە و ئیسباتی شتیشی لە سەر بەڵگە و

شاهیدە، منافقیش دەڵێن موسوڵمانین بە زاهیری.

دڵی بەپرسیار، پرسیار لە خۆی و لە شعووری دەکا، دەڵێ ئایا هەست و شعووری منافق هەست ناکا بەوەی: یەکڕوویی بەکەڵکترە لە دووڕوویی بۆ گەل؟ و ڕووناکی چاکترە لە تاریکی بۆ گەل؟ ئەی بۆ دەکوترێ و کوتراوە: ئەقڵ و شعوور ئەگەر دە پاڵ حەیوانیشی کەی، تاریکایی و ڕووناکایی فەرق پێ دەکا و قازانج و زەرەر بۆ گیانی لێک هەڵداوێرێ؟ جا بۆ مەگەر منافق لە ئەقڵ و شعوور بەرییە؟ ئەدی ئەگەر بەرییە لە ئەقڵ و شعوور، چۆن موکەللەفە و ئەو منافقەی بۆ بە تاوان حیساب دەکرێ؟ دەبێ لە وەڵامی ئەو ئەگەرانەدا بکوترێ: بەڵێ، بێگومان منافق دەفامێ و دەزانێ بەڵام ئەو فاماندن و هەست و شعوورەی دە خراپەدا دەکار دەکا، چونکە جاهیلە بە عاقیبەتی کار، بەرجەوەندی ئەوەی نەبووە: دڕوو چاندن هەر دڕووی لێ دەڕوێ، ئەو بێبەرجەوەندییەش ناشی لە سەرەڕۆیی و هەواپەرەستییە. بۆ ئیقناع و دامەزراندنی دڵ دەچینە خزمەت ئایەتی ١٦ و دەڕوانینە ناو دەروونی بە هەستەوە:

﴿١٦﴾ أُوْلَـئِكَ الَّذِينَ اشْتَرُوُاْ الضَّلاَلَةَ بِالْهُدَى فَمَا رَبِحَت تِّجَارَتُهُمْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ

**ئەوانە ڕێی «ڕاستی خودایان» دا بە کوێرەڕێ و گومڕایی لەو سەودایەدا تێشکان و بەهرەیان لێ نەبرد، و ڕێگای ڕاست و دروستیان بەدی نەکرد.**

## ئینسان سێ بەشە: موسڵمان، کافر، منافق

خودای مەزن لە سەر حیکمەتی خۆی هەرسێکی بە بەڵگە و نیشانەی ئەخلاق و سیفەتەوە ناساندن و دەشبێ باوەڕیش وابێ کە هەرسێکیشیان لە سرشتی ئەزەلیدا کە فیترەتەڵڵایە بەشدارن: فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ﴿٣٠﴾ «روم» دینێکی ئەساسییە و لە سرشتی ئەزەلیدا خودا ئەو خەڵکەی تەنیا بۆ تەنیاناسی خودای تەنیا وەدی هێناوە و بەڕاستی دینی پایەدار و پتەویش هەر ئەو دینەیە کە لە لای خوداڕایە.

دەشبێ ئەقڵ و زانست و شعوور وەگەڕ خەین و وەکار خەین کە بە کوێدا و لە کوێڕا ئەو دوو دەستەی کافر و منافق لە سرشتی ئەزەلی هەڵبڕاون و لایانداوە بۆ لای بێڕێیی، ئەو لادانە دڵ بە عەجایبی دەزانێ لە بەر لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ﴿٣٠﴾ «روم» و دەسکردی خوداش گۆڕانی بە سەردا نایە، واتا سرشتی ئەزەلی نابێ بگۆڕێ، ئەدی کافر و منالق چۆن گۆڕاون؟

پێش ئەوەی بچینە سەر وڵام دەبێ ئەوەش قەناعەت کەین ئەوێکی نەنزانی و تێی نەچووین

پێمان وا نەبێ غەڵەتە و نییە، و نابێ واش حاڵی بین: دەبێ هەمووشت بزانین؛ جا لە سەر ئەو ئەساسە ئینسان ڕەنگە ئەقڵ جورئەت بە خۆ بدا و بڵێ: مەسەلەی ئیمان و کوفر واتا ئەو هەرای حەق و باتڵ، ڕاز و تەلەسمێکی نیزامی نەزمی دنیایە لە بورد و تیرڕەسی زانست و ئەقڵی ئێمەی ئینسان بەدوورە. و ئەوەی ڕێ دراوە بە مەی ئینسان ئەوەیە ئیمان و باوەڕی بە جوان تەماشا کەین و خۆی بۆ بکوتین و کفریش بە ناجەز سەیر کەین و خۆی لێ وەدوور خەین.

ڕاز و ڕەمز و سوڕێکی سەرداپۆشراویش دێرەدا: ئەقڵ و زانست و شعوور ڕێی وێنابن ئەویش ئەوەیە: وەک خاوەن باوەڕ و ئیمان ڕێی خۆی پێ حەقە و چاکە و هیوای دواڕۆژی پێیەتی، خۆ کافریش ڕێی خۆی پێ حەقە و باشە و هیوای پێیەتی. بەڵام ئەو تەفاوەتەمان هەیە: ئی خاوەن ئیمانان ڕەسوولانی خودا تەئیید و پەسندیانە، ئی کافران ڕەد دەکەنەوە، کەوایە دەبێ بڵێین ئیماندار شاهیدی هەیە لە سەر ڕاستی ڕێگاکەی، بەڵام کافر شاهیدی لە سەر ڕاستی ڕێگاکەی نییە هیچ، بەڵکە شاهیدی لە سەر لاڕێیی و ناڕاستی ڕێگاکەی هەیە کە خودا و ڕەسوولن.

بە کوردی و بە کورتی، هەردوو ـ موئمین و کافر ـ ڕێگاکانیان پێ حەقن، و هیواشیان پێن، چونکە ناتواندرێ بکوترێ کافر دینی ئیسلامی پێ حەقە و بەڵام بە عەمدەن ئەو حەقەی وەلا ناوە و دینی نابەحەقی قەبوول کردووە. پەنا بەر خودا و ڕەحمی. لەوە بەولاوە باتڵاغە، ڕۆدەچین بۆ لای بچین.

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم، نموونەی ئەخلاقی منافق و ناپاکان دێنێتەوە و دەیخاتە ڕوو تاکوو بناسرێن بۆ عالەم، بە هۆی ئەو ئاکارانەوە. جا بۆ تەماشا کردنی ئاکاری ناڕەوایان دەچینە خزمەت ئایەتی ١٧:

**﴿١٧﴾ مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً فَلَمَّا أَضَاءتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَاتٍ لاَّ يُبْصِرُونَ**

**داستان و هەڵوێستی ئەوانە هەروەک داستانی کەسێکە کە بە حەول و تێکۆشانێکی زۆر ئاورێک هەڵکا و دایگیرسێنێ «تاکوو خۆی و هاواڵانی بەهرەی لێ وەرگرن» ئەو کاتەی کە ئاورەکە هەڵگیرسا و دەوروبەری بە شۆقی گڕی ڕووناک کرد، خودای خاوەن حیکمەت ئاورەکەیان دەکووژێنێ و خامۆشی کا، و ئەوان دە ناو تاریکایەتی تاریکدا وەهێڵێ «بە سەرگەردانی»، بە شێوەیەکی وا کە چاویان هیچ نەبینێ و هیچ هەتەرێک نەکا.**

## بەراوردێکی سـرنجاوی لەو کافر بوونەی ئینسانی

وەک لە سێلەگرتن و هەڵسەنگاندنی ئایەتی ۲۱۳ی بەقەرە بۆمان دەردەکەوێ، دەبێ کافر لە هەوەڵەوە نەبووبێ پاش دامەزرانـدنی نەزم و نیزامـی ئـایینی ئیلاهـی بە وەسـیلەی ڕەسـوولان هاتبێتە ڕوو. دەچینە خزمەت ئایەتەکە پاشان ڕوو دە مەتڵەبەکە دەکەین: كَانَ النَّاسُ أُمَّـةً وَاحِـدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّـرِينَ وَمُنذِرِينَ ... ئینسان لە سەرەتای هاتنی بـۆ ژیـانی سـەر زەوی، تـا زەمانێکی یەکدین و ئاین بووە و پاش حەزرەتی ئادەم. پاشان کە پێغەمـبەران هـاتن بە یاسـای ئاسمانی بۆ ناو عالەم، خودبەخود لە سەر ئەساسی فیترەت بەشەر بـوو بە دەسـتە دەسـە. واتـا ڕێگـای چەپ و ڕاسـتیان گـرتە بەر خـۆ، یەک بتپەرەسـت، یەک خوداپەرەسـت، ئەوکـات پێغەمبەران مزگێنییان دا بەوانەی ڕێی ڕاستیان داوەتە بەر خـۆ و هەڕەشـە و ترسـیان دا بەوانەی ڕێگای خواریان گرتۆتە بەر.

دڵ ئەوەی دەکاتە هۆی لادانی ئینسانی لە سـرشتی ئەزەلی یەکتاپەرەستی، زینەت و لەزەت و زێڕ و زەنبەری دنیا چڵێسی نەفس و هەوا و تێنەگەیشتن لە هات و چوونی دنیا، ئەو کارەسات و هەڵوێستەیان بوو بە هۆی کەڕ بوونیان لە بیستنی حەق و بوو بە هۆی کوێر بوونیان لە دیتنـی حەق. کە ئیتر تازە هەچەن هاواریان لێ کرێ ناگەڕێنەوە بەرەو حەق. بۆ تەئکیـدی ئەو ڕاسـتییە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۸:

﴿١٨﴾ صُمٌّ بُكۡمٌ عُمۡيٌ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ

**«ئەوانە بە هۆی لاسارییان کەوتوونەتە دەرد و یەک لە حانـد بیسـتن و دیـتن و کـوتن» کەڕن، کوێرن، لالوپاڵن، ناتوانن وەگەڕێن. چونکە گەڕانەوە بـۆ هەر لایەک بە هـۆی هـاوار و هەرا و بانگێشتنە، جا خۆ ئەوانە هیچ هاوار و هەرایەک نابیسن تا وەگەڕێن.**

**ئاوڕێـک**: ئەو کەڕ و لاڵ و کـوێرانە لە ئەسـباب و وەسـیلەدا بـێحەلەمن بەڵام بە هـۆی دنیاپەرەستی و هەواپەرەستی بوونە سواری ئەسپی تۆڕ و سەرکەش ناگەڕێنەوە تا هەڵنەدێـرێن و نەکەونە کەندالی چارەڕەشی.

خودای خاوەن بەزە بە تەمسیلێکی واز لە منافق و کافر ناهێنێ بەڵکە چەن تەمسـیلێکیان لە سەر لاڕێیان بەیان دەکا تـاکوو ئینسـان بە یەقیـنەوە بـاوەڕ بکـا کە ئـاوا نەزان و لاسـارن. وەک تەمسیلەکانی ئایەتەکانی ۱۹ و ۲۰.

﴿١٩﴾ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ السَّمَاء فِيهِ ظُلُمَاتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصْابِعَهُمْ فِي آذَانِهِم مِّنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ واللّهُ مُحِيطٌ بِالْكافِرِينَ

**یا ئەوەتا بەسەرەهات و داستانی ئەوانە هەر وەکوو داستانی کەسانێک وایە بارانی بەغوڕەم و بە لووزەویان هێرش کاتە سەرێ لە ئاسمانەوە و لە هەمان تاریکیشدا هەور و چەخماخە دان ئاڕاستەیان بێ لە ترسی هەورە تریشقە قامکیان بخەنە گوێیان، نەکا تریشقە لێیان دا و بمرن «بێخەبەر لەوەی» خودا دەورەی لەو خودانەناسانە داوە.**

**پوختەیەک لە سەر ئەو حاڵەتە:**

حاڵەتی ئەو منافق و کافرانە لەمەڕ پەرێشانی و سەرگەردانییان، وەک کەسانێک وان کە لە شەوی تاریک و تنۆک و ئەنگوستەچاودا لە چۆڵ وبیابانێکی قاقڕ، بارانێکی بەغوڕەم لە هەورێکی ڕەش و تاریک بە گرمەگرم شریق و هۆڕی چەخماخەدار دایانگژێتێ هیچ کوێ نەبێ خۆی تێ ڕاکەن، لە ترسی ئەوەی بریسکە لێیان نەدا و بۆ وەی دەنکی شریقە و نەعرەتەی هەور گوێیان کەڕ نەکا و پەردەی گوێیان نەتەقێنێ و زراویان نەچێ، سەری قامیکان بخەنە ناو گوێیان.

ئەگەر دڵی بەپرسیاریش پرسیار کا و بڵێ خودا بۆ لە ناویان نابا و بە گڕی هەورە تریشقە نایانسووتێنێ، دڵ هەر بۆخۆی دەڵێ ئەوانە بۆ چاژتنی عەزابی زۆر شایانن بۆ مانەوە.

سەیر کە لە سەرگەردانی و پەرێشانی حاڵی ئەوانە چ دەکەن لەو کاتە سەخت و بەسامەی تووشیان هاتووە، بڕوانە لە سیمای ئایەتی ٢٠:

﴿٢٠﴾ يَكادُ الْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَارَهُمْ كلَّمَا أَضَاء لَهُم مَّشَوْاْ فِيهِ وَإِذَا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُواْ وَلَوْ شَاء اللّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ إِنَّ اللَّه عَلَى كلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ

**لەو کاتەدا لەوانەیە نووری چەخماخەی هەور نووری چاوانیان بەرێ و کوێریان کا، تەماشا هەرکات شریخەی هەور دەهات و ڕووناکایی دەدا و بەر پێی خۆیان دەدی دەکەونە ڕێ، و هەرکات تاریکایان لێ دادەهات هەڵوێستیان دەگرت و ڕادەوەستان، «لەبەر گەوج و نەفامییان نانەزانی» ئەگەر خودا بیویستایە و حەزی بکردایە گوێ و چاویانی بە یەکجاری لە کار دەخستن، چونکە خودا هەموو شتێکی لە توانادایە و پێی دەکرێ.**

## تێڕوانینێکی هەستیارانە لە منافق

منافق ئەوەی ڕایدەنێ و بەڕێوەی دەبا باوەڕی ناو هەستی دەروونیەتی، هەڵوێستی ویستی

ئەقڵ و زانست و شعووریەتی، بۆیە بە هیچ پەند و بەڵگە و دەلیلێک لێی ناستێندرێ و نەستێندراوە و بە هیچ دەروویەکدا ڕێگای لێ دزین نادا. ئەوە نابێ زۆر بە سەیر و عەجایب بزانین، چونکە دڵ ئەگەر ڕەش هەڵگەڕا و تاریک بوو و هەستەی ئەقڵ و شعووری بە هۆی تەمتوومانی هەوای سەرەڕۆیی لە هەست و خوستی واقیعی کەوت، ئەوکات بە پێی ئەساسی نیزامی عیللەت و مەعلوول دەکەوێتە دایرەی منافق و کافرێ، واتا حەق لاچوو باتڵ هات، شەو هات و ڕۆژ ئاوا بوو، دنیا شەو و ڕۆژە، پێکەوە نابن یانی زەمان یا شەوە یا ڕۆژە، ئەگەر شەو داهات، بێ گومان چۆنیەتی خۆی کە تاریکاییە دەنوێنێ، ناکرێ کەیفییەتی ڕۆژ لە خۆ نیشان بدا و هەروا ئەگەر ڕۆژ هەڵات، ڕووناکایی سرشتی خۆی دەنوێنێ، ناکرێ تاریکایی شەو لە خۆ نیشان دا. بۆ ئیقناعی دڵ و ڕاستی ئەو مەبەستە سلاوێک لە ئایەتی ١٢ سوورەی «ئیسراء» دەکەین:

وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً ﴿١٢﴾ «اسراء» شەو و **ڕۆژمان نیشان دان بە دوو نیشانە: شەومان تاریک هەڵگێڕا، ڕۆژیشمان ڕووناک کرد تاکوو هۆ بێ بۆ دیتن.**

سابیت بوو کە زەمان دوو وەرزە: یا شەو یا ڕۆژ. دین و ئایینیش دوون: یا ڕەحمانی یا شەیتانی. ڕەحمانی ڕووناکە، شەیتانی تاریکە. لەسەر ئەو یاسایە دوو دەستە کافر و منافق تاریکن و شۆق نادەن و نایەنە سەر سیفەتی ئایندارانی خودا کە چاک و پاکییە. هەروەک ئیماندار دڵ ڕووناکن قەت نایەنە سەر سیفەتی بێئیمانان کە بێڕەحم و دڵڕەقییە و خوار و خێچ.

دڵ دەیهەوێ ڕەفعی ئەو گومانەی بکا کە لەو بابەتەدا بەرۆکمان دەگرێ، ئەویش ئەوەیە: ڕووناکی و تاریکی شەو و ڕۆژ دەسکاری خودان و دەسکاری ناکرێن، چۆن هاتوون هەر وا دەبن. دەبێ کوفر و ئیمانیش دەسکاری خودا بن؟ نا نا، کوفر و ئیمان دەسکار و هەڵبژاردەی ئینسانن، ڕێگای دەسکارییان هەیە و ڕەوایە، ڕۆژ و شەون بۆ تەمسیل و نموونە هێناونەوە.

لەوەوبەر ڕامانگەیاند خوار و خێچی و ڕەشدڵی منافق و کافر عەجایب و سەیر نییە چونکە نیزامی عیللەت و مەعلوولی ئاوایە کە عیللەت هاتە جێ، مەعلوول دێتە جێ، واتا دڵ ئەگەر تاریک بوو و ڕەش داگیرسا، حەق چاو ناکا.

بەڵام دەبێ ئەوە بە سەیر و عەجایب چاو کرێ کە چۆن ئەو سرشت و فیترەتی پاکی

ئەزەلی ئاڵوگۆڕ کرا بە ئاکار و خەسڵەتێکی دووڕوویی منافقی. دیسان ئەگەر بە وردی ئەو بازاڕەی دنیای کوفر و ئیمان سەیر کرێ هەست بەو ڕاستیەی دەکەین و لە دنیای بە سەیر و عەجایب زانی ئاوەژوو بوونەوەی سرشتی ئەزەلی دەچینە دەرێ. ڕاستییەکەش ئەوەیە: خودا هاوارمان دەکاتێ بەوەی: ژینی دنیا گاڵتە و گەمە و بادی هەوایە، ژینی دنیا هۆی خەڵەتاندنی بادیهەوایانە. بۆ ڕاستی ئەو بابەتە سەیری ئایەتی ۲۰ی «حەدید» بکە و زۆر بە چاوێکی وردبینانە لێی بڕوانە:

اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَامًا وَفِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٌ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ ﴿٢٠﴾ «حدید» **«ئەی ئینسان» تێبگەن و بەرجەوەند بن ژینی دنیا گەمەیە و لەخۆبایی و خۆڕانانی شایی بەخۆیی و جوانی و فرە عەولادی «ئەوەش ئەگەر بەرجەوەند بی» وەک داچناوێکە کە بە هۆی بارانە سەوز بووە، خاوەنی خۆی وە عەجایب و خەنی گێڕاوە، بەڵام «سەیر کە ژیرانە» بەرە بەرە «ئەو جەنەتە خەمڵاوە» ویشک دەبێ و بە زەرد هەڵگەڕاوی چاوی دەکەن و لە پاشان «بە کاوکۆتی بەربا دەیبینی» لەو سەریشی بێ گومان عەزاب و بەخشین و ڕەزایەتی خودا هەیە «نەتیجە» ژینی دنیا مایەی خەڵەتان و فریوە «بۆ گەوج و نەزانان».**

ئەو هاوار و بانگەوازەی باریتەعالا ئەوەمان پێ دەڵێ و ڕادەسپێرێتێ، وریا بن زێڕ و زەمبەر و زینەتی دنیا ئاوەژووتان نەکا لە سرشتی ئەزەلی و بەرەو خۆتان نەکا، و هەڵوونەخەڵەتێنێ و وازوو پێ لە حەق بێنێ. ئەگەر خلیسکوو برد و هەڵدێران، ناگەڕێنەوە. ئەوە بوو هۆی ڕوو وەرگێڕان لە ئایینی بەحەقی خودا و گەڕان بە فاسق و منافق و کوفر.

لە هەڵسەنگاندن و هەڵگێڕ و وەرگێڕی ئایەتەکانی ۱۹ و ۲۰ وا هەست پێ دەکرێ هێندێک لە وشەکانی ئایەتەکان ڕازیان دە ژێردا هەبێ کە پێویست بەوەی دەکەن ئەو ڕازانە باز نەدرێ بە سەریاندا.

بۆ نموونە وشەی «أَصْابِعَهُمْ» دە ئایەتی ۱۹دا هەروەک بە یاسا کراو دە ئادابی عیلمی نەحو «أَصْابِعَهُمْ» جەمعە، واتا قامکەکان بە تەواوی، نەک سەریان. خۆ ئەوەش یەقینە قامک هەمووی دە کونی گوێ ڕاناکرێ چونکە جێی نابێتەوە، کەوایە دەبێ مانای ئایەتەکە لەو بارەوە ئاوا بێ: لە ترسی هەورە تریشقە سەری قامکیان دەخستە کونی گوێیان تاکوو لە بیستنی ناڕەتە و شریقە و هۆڕی هەوران بەدوور بن. جا با حەول دەین ڕازی ئەوەی وەدۆزین خودای تەعالا بۆ وشەی

«أَصْابِع»ی دەکار کردووە، پێشەکی دەبێ خۆ لە ئەسـراری کەلامی ئیلاهی نەدەین، بەڵام وڵامی دڵ و هەستی بزۆزیش لە بیـر نەکەیـن، دەبـێ لەو بـارەوە ئـاوای بـۆ بچـین: منـافق دڵڕەش و سەرلێشێواوە، بۆ وەی دەبێ لە تاوی دەردی بێدەرمانی و بێهیـوا و بێورەیـی خـۆی نەزانـانە تێکۆشێ هەموو قامکی ڕۆبەرێتە ناو گوێی، هەروەک سەرلێشێواو لە تاو دەرد و سەخڵەتی زۆر وا هەیە بە قامکیدا دەنووسێ دەیبڕێ و قەڵتی دەکا، ئەگەر وا نەبێ دەبێ بکوترێ: نەزانراوە.

**ئاوڕدانەوەیەک لە دواوە:**

پاش ئەوەی خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم، ئینسانی لە هەڵوێستەکانی ئینسـانی واتـا موئمین و کافر و منافق بە باشی تێگەیاند، کە ئی وایە لە سـرشتی ئەزەلی لانادا وەک مـوئمین، ئی واش هەیە ڕاستەوخۆ بێ پێچوپەنا لادەدا و دەدۆڕێ وەک کافر، ئی واش هەیە دێڵە دێڵانە و حیزە حیزانە بۆ بەرجەوەندی کـاری دنیـای هەر جـارەی ڕوو دە لایەکـی دەکـا، ئەگەر دەگـاتە موئمینان دەڵێ دەگەڵ وەم و وەک وە موسوڵمانم، ئەگەر دەشگاتە هـاواڵە شـەیتانەکانی دەڵـێ دەگەڵ وەم، گورگە و دە کەوڵی مەڕدایە، بە پێی ئەو یاسایە ئینسان بوو بە سێ دەستە: مـوئمین، کافر، منافق.

ئەدێرەدا ئەگەر سـرنج دەینێ دەرکی ئەو ڕاستییەی دەکەیـن کە خـودا ارحـم الـراحمینە تـا دەروازەی گۆڕ و تا خوداحافیزی ئەقڵ و شعوور و هەست لە لەشـی واتـا مـردن دەسبەرداری عەبدی نابێ بەڵـکە هەر هەرای دەکـا و دەیلاوێنێـتەوە بەڵـکە وەگەڕێ بـۆ لای خـودایەکی کە ئینسانی کردۆتە خەلیفەی خۆی و هەروا دە ڕۆژی حیسابیشـدا بەهـانە نەگـرێ پـیلە نەکـا بڵـێ خودایە دەرگات زوو لێ پێوەدام، دەنا دەگەڕامەوە.

بۆ بە ئیسبات گەیاندنی ئەوەی کە خودا بە بەزەترین خاوەنبەزەیە، و دەسبەرداری ئینسـان نابێ، تا ماڵاوایی یەکجاری لە دنیا دەچینە خزمەت ئایەتی ٢١:

﴿٢١﴾ **يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ**

**ئەی ئینسان، هەر ئەو خودایەی بپەرستن کە ئێوە و خەڵکی پـێش ئێوەشـی دروسـت کـردووە، لێتان داوایە خۆتان بپارێزن، لە بێ ئیتاعەتی ئەو خودایە.**

## تێڕوانینێکی هەستیارانە وەلای پوختەی مەبەستی ئەو ئایەتە:

دیارە وەک لێی حاڵی بووین و تێی گەیشتین لە پێشدا، خودای خـاوەن بەزە پـاش ئاشـکرا

کردنی خەسڵەتی ئینسانی لە ئینسانی کە موئمنیش دەبن و کـافریش دەبـن و منـافقیش دەبـن و کافر بوون و منافق بوونەکەشیان لە ڕووی خۆ دۆڕاندن و خۆ فرۆشـتنیانە بە دنیـا، حەکـیمانە و میهرەبانانە ڕوویان تێدەکا و پێیان دەڵـێ: «ئەی ئینسـان «دابەزە لە کەری شـەیتان و فیـل سـوار مەبە، ئەقـڵ و شـعوور کە چەکـی ڕۆژی هـاوار و هەرای شـەڕە دەگەڵ لەشـکری جەهـل و سەرەڕۆیی، دەکار کە و وەگەڕ خە وەرە ڕوو بکە خودایەکی کە ئەتۆش و خەڵکی پـێش تۆشـی وەدی هێناوە لە نەبوو، وە ناشتوانن لە دایرە و جوغزی حەوزەی دەستەڵات و قودرەتی هەڵێن و بچنە دەرێ.

دیارە ئەگەر نەختێک سەرنج دەینێ و ئینسافیشی ڕەپاڵ خەین، دەزانین ئەو دواندنەی خودا بەو شێوە، هەڕەشەی بەزەییانەیە، واتا هەم جووڵانەوەی ڕەحمە، هەم هەڕەشەیە.

ڕەنگە پرسیار بکرێ دێرەدا خودا بۆ زیاد لە سیفەتەکانی، سیفەتی ﴿ربّـی﴾ دێـرەدا هێنـاوە، دەبێ دڵ ئاوا وڵام داتەوە و بڵێ: ئەو جێگایە باسی خوڵقاندنە و وەدیهێنانە و تەربیەتە، جـا خـۆ دیارە سیفەتی «ربّ» شایانی خوڵقانە و وەدیهێنانە.

ئاوڕدانەوەیەکی بەهەستەوە: خودای پاک و بێهاوتا پـاش ناسـاندنی زاتـی پـاکی تەنیـای خۆی جا ئەمر دەکا بە ئینسانی: بمپەرەستن. ئەوەش نیشانەی نەزمـی هەمـوو نیـزامێکە واتـا تـا شت نەناسـرێ، پەرستن و ئیتاعەی لێ ناوەشێتەوە و نایەتەوە و ناگاتە حەددی کەماڵ.

جا لە سەر ئەو ئەساس و یاسا دروستە، خودای تەعالا بۆ ئیسباتی زاتی خۆی و دەعـوەتی عەبدی بۆ پەرستنی بە دوو بەڵگە و دەلیلی قـانیعکەر واتـا: ئەنفـوس و ئافـاق، یـانی نهێنـی و ئاشکرا، ئینسان بانگ دەکا و دەیدوێنێ.

بۆ گەیشتن بە ڕاستی و دروستی ئەو مەبەست و مەتـڵەبە دەبـێ بە نـووکی تیـژی ئەقـڵ و شعوور و زانستی عیلمی عەڕەبی وشە بەو شەی ئایەتەکانی ٢١ و ٢٢ بپشکنین تاکوو ڕاسـتی و دروستی هەموو لایەکمان بۆ دەرکەوێ.

## بە چەن دەلیل خودا دەناسین؟

سەرەنجام بە ٥ دەلیل وجوودی زاتی خودای بەتەنێ تەحویلی بنچینەی خـانووی ئەقـڵ و ئیمان دەدەین و دایدەمەزرێنین. ئەو ٥ دەلیلانەش دوویان «ئەنفوسی»ن واتـا نهێنـین، سێشـیان «ئافاقی»ن واتا ئاشکرا و زاهیرین. دوو دەلیلە نهێنییەکان «ئەنفوسی» دە ئایەتی ٢١دا هەست پێ دەکرێن، و سێ دەلیلەکەی دیکەش دە ئایەتی ٢٢دا چاو دەکرێن. ئایەتی ٢١ تێی بـڕوانە و لێـی

وەکۆڵە: الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ خودا عەبد بانگ دەکا و پێی دەڵێ: هەر ئەو خودایە بپەرەستن کە ئێوە و ئی پێش ئێوەشی وەدیهێناوە. دێرەدا دەوروبەر چاو کە، تا ئەوە بزانی ئێمە نەبووین، وەدیهاتووین، خۆ هەموو وەدیهاتوویەک وەدیهێنەرێکی دەبێ هەبێ لە ژێر ناوی خالق و مەخلووق، خۆ ئەوەش یەقینە: لە هەموو بارێکەوە وەدیهاتوو دەبێ لە وەدیهێنەر جودا بێ، چونکە وەک یەک بوونیان خیلافی ئەقڵ و عیلم و نیزامە، واتا خالق لە مەخلووق دەبێ جودا بێ لە هەموو بوارانی: بوون، ئیرادە، توانایی، تەنیایی، جووتی. لە ئاکامدا دەگەینە ئەو بەرهەمە کە ئەو وەدیهێنەرە واتا خالق خودایەکی ئەزەلی و ئەبەدی و بەتوانا و بەتەنیا یانی ئەزەلی بوون پێشی نەکەوتبێ. ئەبەدی، دوایی نەبێ. ئە ئەو دەلیل و بەڵگە ڕازاوە بە عیللەت و مەعلوول پێی دەکوترێ دەلیلی ئەنفوسی. دوو دەلیلیشن: ١. ئیسباتی خالق: وەدیهێنەر ٢. ئیسباتی وەدیهاتوو: مەخلووق. دیارە پێکهاتنی ئەو عیللەت و مەعلوولە بە زانست و ئەقڵ و شعوور دێتە ڕوو کە لێرا بەو نەتیجە دەگەی خالق هەیە و دەبێ هەشبێ بەو کەیفیەتەی باس کرا.

دەچینە سەر باسی ٣ دەلیلە ئافاقییەکە، واتا زاهیرییەکە کە لە سەر ئیسباتی وجوودی خودا خۆ نیشان دەدەن.

دیارە دڵی هەستیاری خاوەن ئەقڵ و شعوور بە یەقینەوە ئەوەی سەلماند کە هەچی وەدیهاتووە واتا مەخلووقە، دەبێ وەدیهێنەر واتا خالقی هەبێ و وەک ویش نەچێ لە هیچ بوار و بارێکەوە، واتا لە بووندا، لە تواناادا، لە ئیرادە و مەشییەتدا، لە زانست و دەستەڵاتدا و ... لە هەچی دەیکا و دەیهەوێ بیکا تەنیا بۆ خۆی بێ و نیازی بە غەیری خۆی نەبێ یاریدەی بدا، جا لە سەر ئەو ئەساسە پێی دەکوترێ خەللاقی موتڵەق، واتا وەدیهێنەری سەربەخۆ و بێنیاز. کە بەڕاستی هەر ئەوەش دەبێ خودا بێ. بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٢ ئەگەر بە وردی و زانستەوە زەین بکرێتە ناو دەروونی وشەکانی، بەڵگە و دەلیلی ئافاقی واتا ئاشکرا چاو دەکرێن لە سەر وجوودی خالقی بەتوانا و بەنەزم و نیزام:

**﴿٢٢﴾ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاء بِنَاء وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَّكُمْ فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَاداً وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ**

**«خودای ئێوە ئەو خودایەیە» زەوی بۆ کردوون بە ڕایەخ و بۆی ڕاخستوون «بە هەموو کەرەسەی ژیانەوە» و ئاسمانی بۆ هەڵداون لە سەرتان «وەک چەتر» و لەو بنا بەرزەوە ئاو دەڕژێنێتە خوار تاکوو هەموو بەروبووی ژیانتان بە هۆی ئەو ئاوە بۆ بڕوێنێ «و بۆشی**

ڕواندوون» دەیجا کە ئەوەو چاو کرد و زانیتان و هەستوو بە ڕاستی کرد» چۆن هاوتا «شەریک» بۆ ئەو خودایە پەیدا دەکەن.

**تێڕوانینێکی هەستیارانە** لە بەراوەرد و هەڵوێستی ئەو ئایەتە پیرۆزە و بەراوردێکی وردیش لە وشە جوانەکانی کە ئەو ئایەتەی پێ ڕازاوەتەوە:

خودا بە ڕاشکاوی و بە ئاشکرایی هەرا دەکا لە سرشت و فیترەتی ئینسانی کە هەست و شعوور و ئەقڵە، دەڵێ: ئەی ئینسان ئەو خودایەی کە ئەو کائیناتەی وا بە نەزم و نیزام و ڕێکوپێک و پڕ لە نیعمەت بۆ ژیان و حەسانەوە و حاوانەوەی ئێوە و باقی گیانلەبەران هێناوەتە ڕوو وەگەڕی خستووە و ڕامی کردووە، شایانی پەرستن و ئیتاعە کردنە، بێ لەوی کەس بۆ پەرستن نابێ، چونکە بەغەیرەز ئەو کەس لە دەستی نایە حەتا خۆشی بەخێو کا چ جای ئەوەی بتوانێ چڵە کایەک بڕوێنێ. ئینسان، ئەقڵ، شعوور، ویژدان، ئینساف، دە سەیر کەن لەو ئاسمانە بێ کۆڵەکەیە چۆنی لەنگەر پێ گرتووە، دە تێفکرن لەو دوو چرا گرشەدار و بەشۆقانەی وەک مانگ و ڕۆژ، چۆنیان هەڵدەخولێنێ بۆ هەڵخولانی دنیا و حیسابگەری، دە بڕوانن لەو زەوییە خڕەی چۆنی ئەستێور دەکا و چۆنی ئاوس دەکا و چۆنی دەزێنێ بۆ بەردەوامی حەیات و ژین، دە بڕوانن لەو هەموو جۆرجۆرە ڕەنگ و دەنگ و شکڵ و دیمەنەی دە حەیوان و ئینسان و میوە و گیاوگوڵ و دانەوێڵەدا هەیە و چاو دەکرێ، ئەگەر بەو هەموو بەڵگە و نیشانانەی کە دایمە هاواریانە لە سەر بوونی خودایەکی تاق و هەربوو و هەر دەبێ، نەتوانی بە خۆتی بسەلمێنی و باوەڕ بکەی کە خودا هەیە و هەر ئەویش بۆ پەرستن و هاوار و داد دەبێ. ئەوە بێگومان لە هەرچی بوونەوەرە نزمتری، نەبوونت باشترە لە بوونت چونکە هیچ ئەرزشێکت نییە.

هەر گیانێکی خاوەن هەست و شعوور ئەگەر تێڕوانین بکا لە نەزم و نیزامی ئەو کائیناتە بەنەزمە، بێڕامان و دامان سەر نەوی دەکا و کڕنۆش دەبا بۆ ڕانەر و دانەری کە خودای بێ شەریک و زانایە، بۆ نموونە ئاسمانی بە دوو چرای گرشەدار بۆ حاوانەوە و حەسانەوەی گیانلەبەرانی سەر زەوی بە گشتی و ئینسان بەتایبەتی لەنگەر پێ گرتووە، لێیڕا دەبارێنێ، ڕووناکایی لێڕا دەنوێنێ، تاریکایی لێڕا دادێنێ، بای لێڕا هەڵدەگیرسێنێ، کەسێک ئاوا بۆ حاوانەوە و حەسانەوەت دنیات بۆ وەڕازێنێ ئەتۆ سپاس و ملکەچی و فەرمانبەرداری ناکەی؟ ئەدی هەر ئی نەفس و هەوای بێبنەما و بێحەیا دەکەی؟! ئەوە ئیهانە بە ئەقڵە، بە ویژدانە، بە شعوورە.

## (فراشاً)، (بساطاً) سەیر کە

ئاوڕێک وەسەر هێندێک لەو واژانەی لە ناو ئایەتەکەدا هاتوون وەک «فراشا» کە بە هـاتنی ئەو سیفەتە زەوی لە هێندێک شوێنی دی بە جودا لەو فراشەنە هاتوون دڵ بە لایەکـدا دەبەن کە دەگەڵ نەزەری زەوی‌ناسان نایەتەوە، مەسەلەن: فِرَاشاً (۲۲) «بقره»، بِسَـاطاً (۱۹) «نـوح»، مـدّ الارض (۳) «رعـد»، لە مانـای ئەو وشـانەڕا زەوی وا هەسـت پـێ دەکـرێ، پـان‌وپۆڕ بـێ وەک ڕاخەری فەرشی، دەگەڵ ئەوەی زانایان و پسپۆڕانی زەوی‌ناس نەزەریان وا داوە: زەوی خڕە وەک شووتی وایە.

جا بۆ وەی بتوانین هیچکـام لەو دوو نەزەر و بەرداشـتانە: هەم مانـای واژەکـانی (فراشـا، بساطا، مدّ الارض)، هەم نەزەری زەوی‌ناسان بە زیاد دەرنەچن، ڕێگایەکی ئەقڵ و زانست‌پەسند و واقعـی بگـرینە بەر. ڕێگـاکەش دەبـێ ئەوە بـێ: بەو هـۆیە کە زەوی زۆر گەورەیە، هەمـوو گیانلەبەرێکی بە هەموو کەرەسەی ژیانی لە سەر دامەزراوە و دابین کراوە، وەک ڕاخەرێکی پان و سفرەیەکی بەربڵاو دێتە زەینەوە بـۆ حـاوانەوە و لەسـەر دانیشـتن، دیـارە خـودای تەعـالاش عەبدەکانی بەچی زۆر ئاشنا بن و حاڵی بن، بەوێدا بۆ لایان دێ، جـا بـۆیە بە (فراشـا، بسـاطا) زەوی پێ ناساندوون.

لەو لایەشەوە کە زەوی مەرکەزی ژیانی گیانلەبەرانە و دەشبێ بژیوی گیاندارانی تێدا دابین بکرێ، ئاو کە مایەی حەیاتی هەموو شتێکە دەبێ دە تەواوی ئەجزای لەشی زەویدا هەبـێ دەنـا ناتوانێ و ناکرێ زەوی ژینی گیاندارانی تێدا بێتە جێ، جا لە سەر ئەو ئەساس و یاسایە بـۆوەی زەوی ئاو بە هەموو ئەجزای لەشی ڕابگا دەبێ خڕ بێ وەک گۆ، دە ناو دەریای ئاودا وەجـووڵێ و بخولێتەوە بە پێی نەزەری زەوی‌ناسان. بۆ ئەو ڕاستییە بـۆ لای ئـیمام فەخـری ڕازی بچـین لە کاتی نەزەردانی لە سەر مانای (فراشا) لە ئایەتی ۲۲دا، بە قۆناغی ئیقناع و باوەڕ دەگەی.

پاش ئەوەی کە بە ئیسبات گەیی و دڵ باوەڕی کرد کە خودای حەکـیم و عەلـیم خـۆی بە ئەقڵ و شعوور و حیس ناساند و دەنا و هەستی واندا جێی خۆی کردۆتەوە، دەیـهەوێ بـۆوەی ئەو ئامرازە ژیر و چالاک و زیتانەی ئەقڵ و شـعوور و هەسـتی حیسسـاوی بە یەقیـنەوە بـاوەڕ بکەن کە خودایەکی وا بەتوانا و بەزانست و بێ‌هاوتا هەیە و دەشبێ هەبێ بۆ ڕاگرتنی بـوونەوەر و نیزامی حەیات، بەرنامە و یاسایەکی هەمیشەیی بێ عەیب و هەڵە و پەڵە کە دەگەڵ سـرشتی

حەیات دژایەتی نەبێ، بە ناوی قورئان بخاتە ژێر دەستی وان و ڕاینێ لە بەر ڕووناکـایی شـۆقی هەسـتیان و ئەو ئـامرازانەش: هەسـت و زانسـت و ئەقـڵ و شـعوور، بە هـۆی تێـڕوانین و بەرجەوەندی تەواو و واقعیەت و ڕاستی هەموو ڕاستییەکی لـێ وەدەس خەن تـا بەو قەنـاعەتە بگەن خودا خۆی حاشار نەداوە لە هـیچ حەیـات و گیانێـک. ئەوە حەیـات و گیـانی دۆڕاو و گۆڕاوە بە هۆی هەوا و هەوەس و ئەویِنداری دنیایە، ئەوی وەلا ناوە و بە فەرامۆشی سپاردووە، سەرەنجام وەبیر دێندرێتەوە ئەو لە بیر برنەوە و فەرامۆشکارییە.

دەچینە ناو ئەو باسەی کە خودای تەعالا کەلامی هەمیشەیی خۆی (قورئان) کە بە عینوانی یاسا ڕەوانەی سەر ئینسانی دەکا، لە شک و گومانیشی تەبرەئە دەکـا، هەروەک لە سـەرەتای ئەو سوورەیەدا فەرموویەتی: ﴿ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ ئەو قورئـانە گومـانی تێـدا نییە، ڕێنیشاندەرە بۆ پارێزگاران.

وهەروا ئینسانی لەمەڕ باوەڕ و ئیمان بە سێ دەستە ڕادەنێ و دەناسێنێ: مـوئمین و کـافر و منافق. بەڵام خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم هەر وەک نیزامی کائینـاتی لە سـەر ئەساسـی عیللەت و مەعلوول ڕاناوە و دایناوە و لە سەر هەموو هەڵسوکەوتـی ئینسـانیش واتـا لە سـەر هەموو ئیـدیعای داوا و مەبەسـتێکی کە هەیەتـی و بـیهەوێ، بەڵـگە و دەلیلـی لـێ دەخـوازێ هەروەک ئینسانیش بۆ ئیقناعی دەروونی لە سـەر بـاوەڕ و ئـیمان بورهـان و بەڵـگەی لە خـودا دەوێ، چـونکە ئەوە یاسـایەکی سـرشتییە دڵ و ئەقـڵ و دەروون بە دەلیـل دادەمەزرێ و دادەسەکنێ و وەقرە دەگرێ و ڕێگای جووڵەجووڵی لێ دەبڕێ.

بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٣ کە دەوێدا خودای تەعالا لە ئینسـانی داوا دەکـا: ئەگەر لەو قورئانە دە شک و گوماندای کە ئی خودایە بەڵکە ئی غەیری خودایە، دەلیل ڕانـێ، و یا سوورەیەک لانی کەم لەوانی کەم وەک ئەو ڕانێ.

**﴿٢٣﴾ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ**

**«ئەی گەلی بێباوەڕان» ئەگەر ئێوە لەوەی ناردوومانەتە سەر عەبدی خۆمان «وەک قورئان بێ بۆ محەممەدﷺ» دە گومـان و دڵەڕاوکەدان» و پێشـتان وایە بە گومانتـان وایە، دەیجـا ئێـوە بە هەموو هاوباوەڕانتان بە تێکڕایی و هاوکاریتان، بـێ لە خـودا، سـوورەیەک وەک سـوورەکانی ئەو نازڵ کراوە بێنن.**

## ئەگەر دە شکدان

## تێڕوانینێکی باش و بەرجەوەندانە لە ناو دەروون و سیمای ئەو ئایەتە:

ئەو ئـایەتە پـاش ئەوەی خـودای بە حەق و تەنیـا خـۆی هاویشـتە نـاو جەرگ و دڵان، شاڵاوێکی پێ دەباتە سەر هێزی بێهێز و لاوازی بێباوەڕان و موشـریکان، پێیـان دەڵـێ: ئەو کەلامە مـوعجیزەیە جـگە لەوەی ئیسـباتی ڕاسـتیی پێغەمـبەر دەگەیێنـێ خـۆی و سـیمای بە ڕاشکاوی هاوار دەکا لە بێباوەڕان: دە وەرن بۆ مقابەلە ئەگەر ڕاستن وڕاست دەکەن، وەک من وەیا بە چەشنی من شتێک بێنن و بڵێن، و داواش لە هەمـوو هـاوبیرانی خـاوەن ئەقـڵ و بیـر و شعووری خۆشتان بکەن بۆ هاوکاری یاریدەتان، دیارە ئەو قورئانەش کە هەتا هەتـایە دەروازەی ئەو مقابەلە و داوایەش بۆ هەموو بێباوەڕانی دەور و زەمان ئاواڵەیە کە ئەگەر ڕاسـتن و ڕاسـت دەکەن وەک ئەو نموونەیەک بێنن و ڕانێن.

قورئان ئەگەر بە سـرنجەوە سەیری بەژن و بـاڵا و کەشـم و نەشـمی بکـرێ جوانناـس و جوانپەرسـت و کەشمناسـی دەزانـێ و تێـدەگەن کە هەمـوو ئەجـزای لەشـی مـوعجیزەیە، مەسەلەن:

١. لە بابەت عیلمەوە: ئاڵوگۆڕ ناتوانێ توخنی بێ.

٢. لە بابەت تێر و تەسەلی: تەکامول و تەواوی ناتوانێ خۆی لە قەرە دەن

٣. لەو بارەوە کە نازڵ بۆتە سەر ئینسانێکی نەخوێندەوار، دەشیزانێ، هەچی خوێندەوار و زانایە جگە لەوەی وای نازانن بە داماوی و کڕنۆشەوە بۆ ئاوا زانینی بەرەو پیری دەچن. سەراپای ئەو هەموو ڕاستییانە هاوارن بەگوڕ بۆ وەی کە قورئان موعجیزەیە.

٤. وە لەو ڕوانگەوە کە نهێنییەکان و واقیعەکانی ڕابوردووەکان دەنوێنێ و ڕادەگەیێنێ بێ لە کەم و کووڕی، نیشانە و هاوارە دووبارە لە سەر موعجیزەیی ئەو کەلامە.

٥. وەهەروا لەو بارەوە کە بە درێژایە ٢٣ ساڵ دەناو دنیای پڕ لە زانسـت و شـعوورەو، خـۆ دەنوێنێ و ڕادەنێ، نەتواندرا ویشە چکۆڵەترین ناتەواوی لێ چاو کەن و بیکەنە ڕەخـنە، ئەوەش نیشانەیەکی حاشا هەڵنەگرە لە سەر موعجیزەیی قورئان.

٦. وە لەمەڕ بەلاغەت و فەساحەتەوە بێوێنەیە کە دەبێ بلیمەت و پسپۆڕ و بەلاغەزانەکانی دنیا بیکەنە ئاوێنەی بەلاغەت و فەساحەت خۆی لە بەر چاک و جـوان کەن، ئەوانە بە تێکڕایـی

شاهیدن لە سەر ئەوەی قورئان جگە لە خودای ڕەببەلعالەمین ناکرێ و ناتواندرێ کەلامی کەس بێ.

وەهەروا دووبارە وەک کاروبار و ئەمری عادی لە هەموو بار و بوارەوە بۆ ئیقناع پێ بوونیان نیازی بە بورهان وبەڵگە و عیللەت هەیە، موعجیزە بوونی قورئانیش نیازی بە عیللەت هەیە بەڵام عیللەتی ئیعجازی قورئان جگە لەو چەن نیشانانەی کوتمان، عیللەتی تایبەتی خۆی هەیە کە هەستی زانستی مەی ئینسان ناتوانێ هەستی پێبکا، بۆ نموونە بڕوانە و سەرنج دە لە ئایەتی: وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ﴿٥٢﴾ «شووڕا» **هەروا ئێمە گیانێکمان لە ئەمری خۆمان وەحی کردە لای تۆ.**

واتا هەر وەک بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ وەحین کردووە بۆ تۆشمان ڕوحی قورئان کە لە ئەمری خۆنە وەحی کرد. دێرەدا دڵی هەستیار دەیهەوێ و حەقیەتی بزانێ قورئان بۆ ڕووحە؟ خۆ ڕووحێکی کە ئێمە پێی ئاشناین و دە بەرماندا خاوەنی هەست و ڕاپەڕینە، بەڵام قورئانێکی کە دە بەر دەستماندا و پێی ئاشناین، نووسراوە و کاغەزی بێ هەست و خوستە، کەوایە دەبێ لەمەر ڕوح بوونی قورئان چ بڵێین و چۆن بیر وەکەین و خۆ قانیع کەین.

بۆ ئیقناع لەو ڕێیە زیاتر ڕێی مناسب نییە: دەبێ بڵێین هەر وەک ڕوحی بە واقیعی هەست و حیس و شعوور و ڕاپەڕین دەداتە لەش و ڕە حەوای دەخا، قورئانیش هەست و شعووری شارەزایی و ڕاپەڕین لە بەر خراپە و داپەڕین بەرەو چاکە دەبەخشێ بە ئینسانی و لە مەرگی کوفراوی و کوفری مەرگاوی وە دوورت دەخا؛ حەیات و گیان لە قورئانڕا حەیات و گیانی واقیعین، نەزان و نەفام و بێشعوور گیانی حەیوانیان دە بەردانە، گیانێکی ئەمانەتدار و هەڵگری فەرمانی خالق و ڕەببی خۆی. ئە ئەو ڕوح بوونەی قورئان موعجیزەیەکی پڕ ڕازداری نهێنییە، وردی دەبێ لێ بڕواندرێ.

## خودا لەمەڕ پێغەمبەر (عبدنا) ناو دەبا، نەک نەبی و ڕەسوول

زانست و بەرجەوەندی لە ناوەرۆکی ئایەتی ٢٣ هەست بە شتانێک دەکا کە بازدان بە سەریاندا و حاشار دانیان بە ڕەوا نازاندرێ. ئەوانەن شتەکان:

١. لە زۆربەی ئایەتەکانی قورئاندا کە بە وردی سەیریان دەکەین لە باسی پێغەمبەراندا خودای تەعالا بە ئەلقابی مبارەکی نەبی یا ڕەسوول بانگیان دەکا و دەیاندوێنێ بەڵام دە سووڕەی ئەسرادا هەر لە سەرەتای سووڕەتەکەدا بە عەبدی ناو دەبا و ڕووت لە تەشریفات.

دڵ دەیهەوێ بزانێ بۆچی وایە و ڕازەکەی چییە؟

دڵ دەڵێ زۆری دواکەوتم و لـێم ڕوانـی و تێـی فکـریم لەوەم زیـاد گیـر نەهـات و دەس نەکەوت: وشەی نەبی و ڕەسوول ئەگەرچـی پـڕ لە قەداسـەت و پیـرۆزی و بەرەکەتـن، ئەمـما قەداسەت و کەماڵ دە کەماڵی عەبدایەتیدایە، واتا عەبد تا پاڵ وە پـاڵی خـودا نەدا نـاتوانێ خـۆ بگەیێنێتە مەقامی نبووەت و ڕیسالەت. بەو پێیە دەبـێ بـوێرین بڵێـین بـۆیە خـودا دەو سـەفەرە شەوڕەوەیەدا کە بەرەو کەماڵی نبوەت و ڕیسالەتی دەبا واتا میعراج، ناوی بە عەبد دەبا ﴿أَسـرى بِعَبْدِهِ﴾

دڵی بزۆز و بەپرسیار دانامەزرێ چاوی دڵ و خەیاڵی بە هەرچی کەوت دەڵێ: ئەوە چییە و بۆ وایە، دە ئایەتی ٢٣شدا ﴿مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا ...﴾ مەسەلەن دەڵێ ﴿مِّمَّا نَزَّلْنَا﴾ واتـا قوڕئـان. جا خۆ ئەوەش ئاشکرا و حاشەهەڵنەگرە کە قوڕئان بەشێکی بەیانی حـاڵ و ئەحـواڵی گەلانـی ڕابردوویە و نەقڵی قەولیان و عەقایدیان ڕادەگەیێنێ. بۆ نموونە زەین دە ئـایەتی: وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا ﴿٤٠﴾ «نبأ» بێباوەڕان دەڵێن ئەی خۆزگا هەر خاک بامایە. ئە دێرەدا گرێیەک دێـتە بەر دڵ ئەویش ئەوەیە: ئایا هەر هەمان ئەو قەولە نەقـڵ کـراوەیە دەبێـتە قوڕئـانی قەدیمـی خـودای قەدیم؟ وەیا قەولی ئەزەلی خودای عـالەم بە ئەزەل و ئـاخر؟ ئەگەر قەولـی نەقـڵ کـراو هەمـان قەولی کافران بێ، لەتمە بە قەدیمیەتی قوڕئان دەگا چونکە قەولی کافران قەدیم نییە. بۆ لابردنی ئەو تەمومژە گوێرە، دەبێ بکوترێ ئەو قەولە عیلمی ئەزەلی خودایە بە حاڵ و ئەحـواڵی کـافران دە ڕۆژی گیرۆدە بەو حاڵە تاڵە.

لە دیدگای عیلمـی نەحـو ئاوڕێـک وەسـەر مانـای ﴿وَإِن كُنـتُمْ﴾ وەدەیـن: إنْ دە ئـادابی نەحوییان دەکەوێتە سەر جومەلاتێک کە ڕاستی و ناڕاسـتی دە شـکدا بـی. بەو حیسـابە دەبـێ مانای ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ﴾ ئاوا بێتە ڕوو: ئەگەر ئێوە دەو قوڕئانە دە شکدان ئـی خـودا بـێ، دە وەک ئەو بێنن. هەچەن شک بوون حەتمی نییە. دەگەڵ ئەوەی شکبوونیان حەتمییە. جا ئەگەر لە باتی (إنْ)، (إذا) هێندرابا، لە ڕەخنەی نەحوییان بەدوور دەبوون. ئێستاش بە یەقینەوە دەزانین کەلامی خودا هیچ ڕەخنەیەک بەتایبەتی ڕەخنەی عیلمی وەخۆ ناگرێ، دەبێ بڵێین و بکـوترێ: ڕوون و ئاشکرای قوڕئان ل ههەر بارێکەوە چ زانستی، فەساحەتی، بەلاغەتی، بێ گرێ‌گـوڵی، بە ئەنـدازەیەک ڕووک و بەرچـاوە کـوێریش چـاوی دەکـا و تەنـانەت دڵ و چـاوی کـوێران و حەسوودانیش لێی بەحاشا نین کەوایە ڕەخنەی نەحوییان وەسەر خۆیان دەبێتەوە.

دەچینە سەر جوملەی ﴿فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ﴾. دڵ دە داوای خودای حەکیم لە کافران کە دەفەرموێ پێیان: «ئەگەر دەو کەلامەدا دە شکدان ئی خودا بێ، دە بێنن بە وێنەی ئەو کەلامە، سوورەیەک» هەست بەوەی دەکا کافر موددەعی بن لە بابەت قورئانەوە بڵێن ئی خودا نییە، خۆ دە یاسای دە شکدابوون موددەعی بوون نایەتە ڕوو چونکە ئیدیعا لە سەر یەقین دێتە ڕوو. خۆ دێرەدا کافر لە سەر ئەساسی ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ﴾ ئەوەیان لێ چاو دەکرێ دە شکدا بن، نەک موددەعی. جا لەو ڕووەوە کە کافرەکان بۆ موددەعی نابن لە سەر ئەساسی یاسای موددەعی بوون و داوای خوداش لە کافران بۆ دەلیل و بەڵگە لە شکیان ئاماژە وەلای موددەعی بوونی کافران دەکات. دەبێ لەمەڕ مانای ئەو ئایەتە چۆن هەڵوێست بگیردرێ؟ بۆ خۆ پاراستن لە ڕەخنە لەو بارەوە دەبێ ئاوا بڕۆین: کافر بە ڕواڵەت وا خۆ نیشان دەدەن کە مونکیرن لە سەر ئەوەی قورئان کەلامی خودا بێ و محەممەدﷺ ڕەسوولی ئەو بێ. لایان وایە ئەو قورئانە کەلامی بەشەرانە، خوداش هەر لە سەر باوەڕ و بەراوەردیانە بۆیە دەفەرموێ جا ئەگەر پێتان وایە قورئان کەلامی بەشەرانە، دە ئێوەی بەشەر فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ و حەتا بۆ ئەنجامی کارتان بانگی هاوخەیاڵ و هاوباوەڕانی خۆشتان بکەن: وَادْعُواْ شُهَدَاءَكُم بانگی شاهیدەکانوو بکەن.

خودای خاوەن بەزە و عەداڵەت دەگەڵ ئەو هەموو کەللەشەقی و سەرەڕۆیی و لاسارییەی ئینسان، لێی هەر ناتۆرێ و وازی لێ ناهێنێ، بە دەلیل و بورهان هاواری گەڕانەوەی بۆ لای حەق هەر لێ دەکا، پێی دەفەرموێ: ئەگەر نەشووتوانی ئەو کارە بکەن ـ کە ناشتوانن ـ لانیکەم بە تۆبە و پەشیمانی لە نیەت و باوەڕتان، خۆتان وەدوور خەن و بپارێزن لە ئاورێک کە دەسەچیلەی ئەو ئاورە ئینسان و بەردە لە بەر بەشیددەتانی، بۆ ئەو ڕاستیە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٤ تا لە هەر بارێکەوە دە هەڵوێستی خودا و بێباوەڕان بگەین.

**﴿٢٤﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ**

**ئەگەر نەوکرد و نەوتوانی ـ کە دیاریشە هەرگیز بۆو ناکرێ و ناشتوانن ـ «وەک ئەو قورئانە سوورەیەکیش بێنن» دەیجا بترسێن لەو ئاورەی کە دەستەچیلەی بەرد و ئینسانە و هەر بۆ بێباوەڕانیش ساز کراوە و ڕاگیراوە.**

## تێڕوانینێک

ئەو ئایەتە زۆر بە ڕوون و ڕاشکاوی خیرەسەری و سەرەڕۆیی کافران لە ژێر ئاشکرا کردنی ناتەوانی و ناتەواوی وان لەمەڕ ئەنجام دانی هێنانی سوورەیەک لە قورئان ڕادەگەیێنێ و ڕادەنێ و هەر هەمان خیرەسەرییە دەبێتە ئاگرێکی گرفەداری بڵێسەداری بەسۆز و ئێش کاتی خۆی تێیان هەڵدەگەڕێ و تێیان بەردەبێ.

لێکۆڵینەوەیەک لە هێندێک جوملە بۆ نموونە ﴿وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾. ئایا دەبێ مەنزووری خودای لە «ناس» «ناس»ی بێ باوەڕ بێ؟ وەیا هەچی «ناس»ە؟ دەگەڵ ئەوەی زانراوە «ناس»ی خاوەن باوەڕ ئاور نایسووتێنێ؟ بە هەر حاڵ وەک هەست دەکرێ نەختە دڕدۆنگییەک هەیە لەمەڕ «ناس». وهەروا لە سووتانی بەرد وەک دەستەچیلە. بۆ ڕامالدانی ئەو دڕدۆنگییە دەبێ ئاوا هەڵوێست بگیردرێ: هەچی «ناس»ە مادام بخرێتە ناو ئاوری دۆزەخ، ئەو ئاورە مەئمووری سووتانە و دەیسووتێنێ، کاری بە خاوەن باوەڕ و بێباوەڕ نییە، جا خۆ دیاریشە خاوەن ئیمان ناخرێتە ناو دۆزەخ و سووتانی بەردیش لە ژێر ناوی دەستەچیلەی ئاوری دۆزەخ ئاماژەیە وەلای دوو شت: ١. شیددەتی ئاوری دۆزەخ زۆرە بەردیشی بەرناگرێ ٢. ئینسانی دڵڕەق وەک بەردە لە ڕەقیدا و کەڕیدا و بێوەلامیدا، بۆیە بەرگەی ئاوری دۆزەخ دەگرێ وەک بەرد.

یا ئەوەتا لە بابەت «حجار»ی ناو ئایەتەکە دەچینە سەر نەزەری ئەوانەی کە فەرموویانە ئەو بەردانە ئەو بەردە بتانەن کە خودای بێباوەڕان بوون، وەیا بەردە گۆگردن. بە هەر حاڵ ئاوری دۆزەخ بۆ عەزابە، خودا چۆنی دەستوور پێ بدا بەڕێوەی دەبا و دەیسووتێنێ، بەرد بێ، هەچی بێ.

دڵ ئەدێرەدا دەکەوێتە ڕامان و هەڵوێست دەوەیدا کە دەستەچیلەی ئاوری دۆزەخ ئینسان و بەردن، بەلام باسێک لە جینن و شەیاتین نییە دەگەڵ ئەوەی ئەوانیش هەیانە لە ئینسان لاسارتر و ڕەقتر. دەبێ هۆیەکەی چ بێ؟ زۆر چاو و دڵ گەڕان بۆ دۆزینەوەی هۆی ئەو ئێشە، بەلام لەوە بابەتتر نەدۆزراوە: چونکە قورئان نازڵ بۆتە سەر ئینسان و موخاتەبی ئەسڵیش هەر دەبێ ئینسان بێ، و هەروا لەو لایەشەوە وەک چاو دەکرێ، هەڕەشە و مزگێنیش هەر لە ئینسانە، بۆیە ڕوو کراوەتە ئینسان کە دەبێ دەستەچیلەی دۆزەخ لەوان بێ؛ جۆرێکی دیش دەکرێ بەراوەرد کرێ: بڵێین هەوێن و ماکەی ئینسان لە خاکە، خاکیش ڕوون و ئاشکرایە دەگەڵ ئاور لێک

دوورن. ئەو نووری سۆزانە و ئەو هەوێنی شت ڕوانە، جـا ئینسـان لە سـەر ئەو حـاڵە گڵێـنەی هۆی بڵێسە و گرفەی دۆزەخ بێ، جگە لەوەی جێگەی زۆر لێ ترسانە جێگەی زۆر سوڕمانیشـە لە ئینسانی کەللەشەق بۆ ناتۆقێ لێی. چونکە جینن و شەیاتین لە ئـاگرن، ئەگەر ئـاگری دۆزەخ بەوان گرشەداریش بێ هیچ عەجایب نایەتە ڕوو.

خودای خاوەن حیکمەت دەیهەێ و ویستوویەتی لەو بە دەسـتەچیلە کردنـی ئینسـانی بـۆ ئاگری دۆزەخ، دە ئینسانی گەیێنێ: ئەگەرچی ڕەگەزت لە خاکە و لە ئاگر نی، وەک جین، بەڵام لە بەر لاساریت و سەرەڕۆیی و کەللەشەقیت دەبێ دەسـتەچیلەی ئاورێـک بـی کە لەوڕا نـی و نەهاتووی و کاتی خۆی نەیویسـتووە ئیتـاعەت کـا و کڕنۆشـت بەرێتـێ چـونکە بە بـێئەرزش هاتوویە بەرچاوی دەگەڵ ئەوەی ئەمری باریشی لە سەر بووە کڕنۆشت بەرێتـێ بەڵام واش هەر نەیبردووە، جا چونکە ئەو بێ ئەرزشییەی جین بۆی دانابووی بە خەیاڵی وەڕاستت گێڕا ئەتـۆی ناچیز و بێباوەڕ هەر دەبێ بکرێیە دەستەچیلەی ئاگری ئەو.

لە تێڕوانینێکی ئاخری ئایەتەکە کە دەفەرموێ: ﴿أُعِدَّتْ لِلْكافِرِينَ﴾ موشـریک و منافق بۆ بە دەراوێژراو و هەڵاواردراوی دێنە ڕوو، و بە بەراوەردی «ئەلف لام»ی سەر «النـاس» کە هەچـی «نـاس»ی بێبـاوەڕە لە خـۆ دەگـرێ موشـــریک و منـافق دەرنـاوێژرێن، هـاڵاو و شـاڵاوی هاڵۆزییەک سەر و دڵ دەگرێ، دەبێ خۆی لێ ڕزگار کرێ.

بۆ ڕزگاری لەو ئیشکالە دەبێ ڕوو دە یاسای «نەحویان» بکرێ، کە فەرموویانە: دوو شـتی مەعریفە واتا ناسـراو و ئاشنا ئەگەر دە یەک ماڵدا واتا دە یەک جوملە و ڕستەدا قەراریان گرت، وەک: «الناس» و «الكافرين» کە دە ناو ئایەتەکەدا قەراریان گرتـووە، ئـی دووهەمینیـان مانـای هەوەڵیان لە خۆ دەگرێ بە تەواوی، جا لە سەر ئەو یاسا و ئەساسە، مانای ﴿أُعِدَّتْ لِلْكافِـرِينَ﴾ کافری موشـریک و منافقیش لە خۆ دەگرێ.

وهەروا ڕازێکی دیش هەیە بۆ بە سەردا بازدان نـابێ، ئەویـش ئەوەیە: واژەی ﴿أُعِـدَّتْ﴾ بە مانای ساز کراو و هەڵکراوە، بەو پێیە دەبێ باوەڕ بە بۆچـوونی ئەهلـی سـوننەت و جەمـاعەت بکەیـن کە فەرموویـانە: بەهەشـت و دۆزەخ سـاز کـراون، بە خیلافـی زانایـانی مـوعتەزیلە و خەواریجەکان کە دەڵێن: بەهەشت و دۆزەخ پاش تەواوبوونی حیسابی ڕۆژی قیامەت دێنە دی و ئامادە دەکرێ. دەلیلی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەو ئایەتەیە: ﴿فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّـتِي وَقُودُهَـا النَّـاسُ وَالْحِجَـارَةُ أُعِـدَّتْ لِلْكافِـرِينَ﴾ وهەروا ئـایەتی ١٣٣ «آل عمـران» ﴿أُعِـدَّتْ لِلْمُتَّقِـينَ﴾

بەهەشت ساز کراوە بۆ وانەی لەخواترسن. وهەروا ئایەتی ٢١ی حەدید: ﴿أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ﴾ وهەروا ئایەتی ١٦٩ «آل عمران» ﴿عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ لە لای خـودا بژیویـان دەدرێتێ.

بە پێی ڕاوێژی ئەو ئایەتانە بۆچوونی ئەهلی سوننەت دەبێ ڕاست بێ و باوەڕی پێ بکرێ. لە ڕاست بۆچوونی موعتەزیلە نەزانم لە کوێوە سەرچاوە دەگرێ.

لە بەراوەرد و ڕامان و تێهەڵڕوانین لە پاش و پـێش و ئەولا و ئەملای ئایەتەکـان بە تەواوی هەست دەکرێ بەوەی: خودای حەکیم پـاش بـاس و بەیـانی چـۆنیەتی تەوحیـد و ڕیسـالەت دەیهەوێ باسی پاشەڕۆژ و تۆڵە و سزا بکا، بە دەلیلی ئەوەی: سوننەتی ئیلاهی وا خۆ دەنوێنێ: کاتێکی باسی هەڕەشەی هاتە ڕوو بە دوویدا وەعدە و وەعید و مزگێنـی سـەرهەڵدەدا، جـا بـۆ ڕاستی ئەو مەتڵەبە دەڕوانین لە سیمای ئایەتی ٢٥ دەوێدا چاو دەکەین: پاکان و چاکان پاداشیان هەر وەک چاو دەکەین تۆڵە و سزای ناپاکان و سەرەڕۆییان چاو دەکەین.

﴿٢٥﴾ **وَبَشِّرِ الَّذِين آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقاً قَالُواْ هَـذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ وَأُتُواْ بِهِ مُتَشَابِهاً وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ**

**«ئەی ڕەسوول» موژدە بدە بەو کەسانە کە خاوەن باوەڕ و ئیمانی پاک و چاکن، بـۆ وان دەبـێ و هەیە باغ و باغاتێکی وا کە جۆگە و جۆباریان بە بەردا دەڕوا و لە هەر میـوەیەک لەوێ بخـۆن و بچێـژن دەڵـێن: ئەو میـوەیە لە پێشـدامان درابـوویە و هەمـانبوو، وێسـتاش هەمـان هەوە و هێناویـانە «و هەروا» لەوێ ژنەکانیـان زۆر لـووس و پـاک و تەمیـزن، و تـا هەتـایەش هەر لە بەهەشتا دەمێننەوە.**

## مزگێنی چاکەکاران

دێرەدا ئەو باوەڕ و یەقینە خۆ لوور دەکـاتە نـاو دڵ و دەروونـی پـڕ لە ئەقـڵ و هەسـت کە عەمەلی پاک و چاک و ساڵح بۆ ئیمان، وەک دار و باغ و ڕەگ و ڕیشـە وایە، واتـا هـیچ دار و باغێک بە بێڕەگ و ڕیشـە و ئـاوخۆرەوە بەر نـاگرێ و شـین نـابێ. دەسـا هەر ئـاواش، هـیچ ئیمانێک بەبێ عەمەلی چاک و پاک و ساڵح بەر ناگرێ و نەفعی نابێ. ئیمانی بێ تەقـوا هەرای بە درۆیە، باغی بێئاو پووش و پەڵاشـی بـێ مـایەیە، هەر ئەوەشـە هـۆ کە خـودای تەعـالا لە زۆربەی شوێنەکانی کە ئیمانیان لێ باس دەکرێ عەمەلی ساڵحیشیان دەگەڵ باس دەکا.

دەو ڕەپ و ڕوویەی خودای تەعالا کە بە کافران دەڵێ: ﴿فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾ و هەروا مزگێنیش دەداتە موئمینان و دەفەرموێ: ﴿وَبَشِّرِ الَّذِين آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ ...﴾ دڵ هەست دەکا بەوەی شتێکی دە بندا ڕازابێ، ڕازەکەش بە پێی بەراوەرد و تێڕوانین لە ئاکار و هەڵوێستی کافران هەر ئەوە بێ: خودا بە لاساری و سەرەڕۆیی کافران غەزەبی جۆشابێ هەڕەشە و ئیهانەی بۆ کافران هاتبێتە کار تاکوو کافر تێبگەن لە ڕەزیلی و زیللەتی خۆیان.

بەڵام لە بەرابەر چاکی و پاکی خاوەن باوەڕان بەزە و کەڕەمی هاتبێتە جۆش و خرۆش بۆیە ڕووی بە مزگێنیان تێدەکا و خەبەری ڕەحمەتی خۆیان پێ دەگەیێنێ.

وهەروا مزگێنییەکەشی بۆ موئمینان کە بە ئاداتی مەوسوولە ڕازاوەتەوە ﴿الَّذِين آمَنُواْ﴾ لە سەر ئەساسی ئادابی عیلمی نەحو ئاماژەیە وەلای ئەوەی: ئەو موژدە خۆشە بەئەرزشە بەهای ئەعمالی چاک و پاک و ساڵحی دەبێ دەگەڵ بێ. وهەروا موژدەکەش کە بە جوملەی فیعلییە ڕاندراوە ﴿وَبَشِّرِ﴾ ئاماژەیە وەلای بەردەوامی مزگێنیدراوەکە دەکا کە بەهەشتی ڕازاوەیە.

هێدی هێدی و بە دڵ و چاو لەوەڕان و گێڕان لە مەزرای ڕازاوە بە هەموو جۆر و چەشنە دیمەنی جوان و ناحەز واتا هەڕەشە و مزگێنی، وەنیزیک کەوتین لە ئایەتی ٢٦ تاکوو زیاتر و چاتر لە هەڵوێستی پیسی کافران بگەین:

**﴿٢٦﴾ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَحْيِي أَن يَضْرِبَ مَثَلاً مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَـذَا مَثَلاً يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً وَيَهْدِي بِهِ كَثِيراً وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلاَّ الْفَاسِقِينَ**

**خودا لەوە شەرم ناکا لەوەی «بۆ تێگەیاندتان» بە مێشوولە نموونەی بۆ بێنێتەوە، لەوەش کەمتر «چونکە هەموو گیانلەبەر و بوونەوەر دەسکردی خودان و هەر یەکەی حیکمەتێکیشی دە بەردایە، هیچ لۆمە و لەقەبێک ڕێگای نییە بگیردرێ لە خالقیان، لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە خوڵقانە دەرس و هاوارن لە ئینسان بۆوەی سوژدە بەرێتە بەر ئەو نەققاشە بەتوانایە» جا ئەوانەی خاوەن باوەڕ و ژیرن، بە ڕوونی دەزانن ئەوە وایە و ڕاستە لە خودایانڕایە، و ئەوانەی بێباوەڕیشن «بە بەهانە» دەڵێن: خودا لەو نموونە ڕانان و هێنانەوەدا چی دەخوازێ و چی گەرەکە. بۆو زۆرانی پێ گومڕا دەکا و زۆریشیان پێ شارەزا، هەر ئەوانەشی پێ گومڕا دەبن کە «لاسارانە و سەرەڕۆیانە» لە ڕێگای ڕاست و حەق لادەدەن.**

## خودا بۆ حاڵی‌بوونی ئینسان نموونە دێنێتەوە

تێهەڵڕوانینێکی بە هەستەوە لە بەژن و باڵا و دەروونی ئەو ئایەتە پیرۆزە کە هـاوارێکی زۆر بەگوڕ و تینە لە ئینسانی بۆ وەی سەرپێچی نەکا لە پەروەرندەی.

دیارە وەک هەموو هەست و ئەقڵێک هەست بەوەی دەکا و حاشای لـێ ناکـا، کە خـودای خاوەن بەزە و عەداڵەت بۆ تاقی کردنەوەی ئینسانی لە هەمـوو نمـوونە و وێـنە میسـاڵ و پەنـد دێنێتەوە. سەیری ئەو نەزم و نیزامە جـوان وبـێ‌هەڵە و پەڵەیە، ئەوەمـان پـێ دەڵـێ: نەققـاش و خالقی وا بەتوانا بەجوز خودای یەکتـا و بێ‌هاوتـا کێـی دی دەبـێ؟ ئەو هەمـوو ورد و درشـتە گیانلەبەرانەی جۆراوجۆر، ڕانێ و بیهێنێتە دی هەریەک بە جۆرێک باری ژیان و حاوانەوەی بـۆ دانابێ و پێشی ئاشنا کربێ.

و ئینسانی کە بەوپەڕی هۆش و شعوور و حیس و هەست و ئەقڵەوە ڕاناوە و ڕازانـدۆتەوە بۆ وەیە بڕوانێتە ئەو کر و کرگارە خو لە دەس نەدا و سوژدە بەرێ بـۆ ئەو «أَحْسَـنُ الْخَـالِقِينَ»ە، واز بێنێ لەوەی بڵێ: بە ئیهانە جا چۆن خـودا نمـوونە بە مێشـوولە و مۆریـانە و جاڵجـاڵووکە دێنێتەوە؟ یا جا چۆن خودا دەتوانێ ئێسکی ڕزیوی خاک و خۆڵ بکاتەوە زیندوو قَالَ مَنْ يُحْـيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ «یس» واتا ئێسقان لە پاش ڕزینی و بە خـاک بـوونەوەی کـێ زینـدوویان دەکاتەوە؟ چونکە ئەو جۆرە بەراوەردە بۆ ئینسانی جگە لەوەی ئیهانە بە ئەقڵ و شعوور و عـیلم و زانستە، ئیهانە بە توانایی خودایە، بەو دەلیلە کەسێک بتوانێ شت لە نەبوونڕا وەدی بێنێ و دە بەر یەکی نێ، جا چۆن ناتوانێ دووبارە وەک خۆی لێ بکاتەوە و بیهێنێتەوە ڕوو؟ دەبێ بکوترێ و بڵێین: بەڵێ دەتوانێ.

بە کورتی، هەروەک بەرهەمی هیدایەت کرداری جوان و ڕەفتاری چاک و پاکە، گومڕاهیش بەرهەمی ناپاک و ناڕەوا و ناپەسەندە و هەروا سەلمێندراوە: هەر ئەندازە ئینسان لە سەر لێـواری کەنداڵی خزۆک و ڕووخەک بێ، لە هەڵدێران نیـزیکە و دەڕوا و نـاگەڕێتەوە و هەر ئەنـدازەش لێی دوورتر بێ، لە پێدا چوون و هەڵدێران دوورترە.

دەبێ قەناعەتن بەوە هەبێ: نموونە ڕانان لە پووچەڵ کردنەوەی مونکیران و بێ‌دەلیلان زۆر چالاکترە لەوەی بێ‌نمـوونە بەرپەرچ بـدرێتەوە. چـونکە نمـوونە ڕانـان گـورزی گورچـووبڕە، ڕێگەی حاشا کردن دەگرێ.

وێنە و نموونەیەک: مێشوولە و بـاقی هاوچەشـنانی لە پەڕەنـدەیێ و دڕندەییـدا دایـمە بـۆ

ژیانیان دە هەوادا گازەگاز و وزەوزیانە، هەچی بیگەنێ لە تـاو ژیانیـان پێیـدا ڕادەنووسـێن و دە بەرابەر هیچ کزەبایەکیشدا خـۆ ڕانـاگرن. وهەروا ئینسـانی مێشـوولە سـیفەتیش واتـا هەوت و هەوایی بۆ ژیانی دنیایی هەر دەگازێنێ و دەهاژێنێ بگاتە هەر کەس دەیـگەزێ و پێـیەوەی دەدا تاکوو ژیانی لێ پێک بێنێ، و هەروا مێشوولە لە هەرچی پیس و پۆخڵییەوە دەنیشێ بـۆ ژیـانی، ئینسانی مێشوولە سیفەتیش واتا زگپەرەست لە هەچی کەسافەت و پیسییە دەنیشێ بـۆ ژیـانی، وەک مێشوولە مردووی ژینە و گازگرە بۆ ژین، ئینسانی ژین پەرەستیش مردووی ژینە و مردووی دینە و گازگرە.

## حەیا وەپاڵ خودا چۆن دەدرێ؟

ئاوڕدانەوەیەک وەلای ئەوەی حەیا چۆناوچۆن وەپاڵ خودا دراوە؟ چـونکە حەیـا دە زاتـی خۆی و مانای واقیعی عارز و حادیسە، واتا سیفەتێکە دێت و دەچێ، خۆ ئەوەش یەقیـنە زاتـی باری بەری لە سیفەتی هات و چوونە، و هەروا حەیا کە بە قەولی زانایان بێزاری لە قەباحـات و ناڕەوا و نیزیک لە زەڕافەت و ڕەوا، یانی بەو پێیە حەیا تێکەڵاو لە شەرم و پاکی، ئەوەش دەگەڵ شەئنی زاتی باری کە هەمووی هەر پاکییە، حەیایە، نایەتەوە؛ و هەروا دووبارە حەیا کە بەشـێکە و لکێکە لە داری ئیمان ئەو ئیمانەی کە باوەڕە بە زاتـی پـاکی خـودای بێهاوتـا، نـاکرێ هەروا ڕاستەوخۆ وەپاڵ خودا درێ، وەپاڵ خودایەک کە ئـیمان بەوی بـوون مەرجە، و هەروا حەیـا لە دایکبــووی حەیــاتە، یــانی ژیــانێکی ئابڕوومەنــدانە و شــەڕافەتمەندانەی خــاوەن کەڕامەت هەڵاوەسـراو بە ئەعمالی پاک و چاک و ساڵح.

هەچەن باریتەعالا دە ئایەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَحْيِي﴾دا حەیای وەپـاڵ خـۆ داوە، ناتوانـدرێ حاشای لێ بکرێ و خۆ لێ دزینەوە و خۆ لێ بواردنی، خۆ فریودانە لە دەرکی واقعیەتەکە، جـا کەوایە دەبێ لە شوێن چارە هەڵوەدا بین تاکوو وەدۆزرێ چارەی ئەوەی: خـودا حەیـای دە پـاڵ خۆ خزاندووە، فەرموویەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَحْيِي﴾.

بۆ چارە هەر ئەوە چـاو دەکـرێ کە بڵێـین: حەیـا لە «حـي» واتـا زینـدوو، خـۆ خـوداش فەرموویەتی «إنّ الله حيّ كريم» خودا زیندووی کەریمە، واتا خاوەنی حەیاتی خـاوەن کەریمـی هەمیشەییە، و خۆش با وێنە ئەو یاسا سەنگەرەی کە تێدا کوتراوە: هەرکات خودا وەسفدار کـرا بەو سیفەتانەی کە تایبەتمەندی ئەجسامن، دەبێ هەدەف لەوێدا نیهایەتی وەسفەکە بـێ، ئەودەم

دەکرێ و دوور لە ڕەخنە بێ بڵێین: هەدەف لە ﴿حيّ كريم﴾ حەیاتی موتڵەقە بێ و هەدەف لە ﴿لاَ يَسْتَحْيِي﴾ واتا خودای خاوەن حەیاتی هەمیشە بێزار نییە لە هێنانەوەی نموونە بۆ ئینسان ـ کافر ـ بە مێشوولە، بۆ باوەڕی و زێدە زانین بڕۆ خزمەت ئیمام فەخری ڕازی ج٢، لاپەڕەی ١٣٢ ئایەتی ٢٦.

دە جوملەی ﴿يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً وَيَهْدِي بِهِ كَثِيراً﴾ دڵ ئەو هەستە دەکا: هێنانەوەی ئەو نموونە لە لایەن خوداوە بۆتە هۆی گومڕایی ئەو ئینسانانە. خۆ ئەوەش ڕوون و ئاشکرا و سەلمێندراوە: خودا ڕێ خۆشکەر نییە بۆ گومڕایی عەبدانی خۆی. جا بۆ خۆ دوور گرتن لەو وەهمە دەبێ خۆ باوێنە پاڵ جوملەی ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلاَّ الْفَاسِقِينَ﴾ گومڕا نابن لەو ڕێگایە بەغەیرەز لاڕێ و تاوان لە مل.

## گێژاوی هیدایەت و ڵەلالەت

دڵی هەستیار دەیهەوێ لە گێژاوەی ﴿يُضِلُّ يَهْدِي﴾ واتا هیدایەت و زەلالەت حاڵی بێ، لەبەر ئەوەی کە جێگاکەش جێگای هیدایەت و زەلالەتە، ناکرێ گوێ نەدرێتە دڵ و ئاوڕی وەسەر نەدرێ.

جا بۆ وەی بەباشی تێبگەین لە حەقیقەتی مانای هیدایەت و زەلالەت پێویستە بنچینەیەکی ئەساسی بۆ باسەکە هەبێ، بۆیە دەچینە خزمەت ئایەتی: وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ فَيُضِلُّ اللَّهُ مَن يَشَاء وَيَهْدِي مَن يَشَاء وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٤﴾ «ابراهيم» نەماننارد‌ووە هیچ پێغەمبەرێک ئەگەر ناردوومانە لە سەر زمانی گەلەکەی خۆیان ناردووە، تاکوو هەق و حەقیقەتیان بۆ ڕوون کاتەوە «ئەو گەلەی کە گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکە دەبێ یا بە قسەی دەکا یا ناکا» ئەدێرەدا ئەوە دەردەکەوێ «بە ڕواڵەت»: هەر کەسێک خودا حەز کا و بیهەوێ گومڕای دەکا و کێشی بوێ و حەز کا ڕاستەڕێ و شارەزای دەکا، چونکە هەر خۆی خاوەن دەستەڵات و لەکارزانە.

ئەگەر بێتوو شارەزایی و گومڕایی ئینسانی هەر دە حەز و وازی خودادا بێ و هیچ بەشێکی ئینسانی تێدا نەبێ، گێژاوە و گێژەڵووکەیەک ڕادەبێ بەرەو ڕووی عەقیدە و باوەڕی ئینسانی ڕێگا و دەرووی سەرە دەرکردن نامێنێ و بەردی بنچینەی دینێکی کە بە ئینسان ئاشکرا کراوە و ناسێندراوە دێتە دەرێ. بەو دەلیلە دێرەدا ئیختیاری سەربەخۆیی بۆ ئینسان نامێنێ، کە بکرێتە هۆی چاکبوون و خراپبوون، وەهەروا لەو لایەشەوە هاتنی پێغەمبەران کە بۆ هیدایەت و شارەزاییە و هاتنی کەلامانی ئاسمانی بۆ ڕێی هیداەت ئەوانیش هەروا بە زیاد دەردەچن، چونکە

ئەوانە: پێغەمبەران و کتێبەکانی ئاسمانی ـ بۆ نشاندانی ڕێی ڕاست ودروستن جا ئەودەم: فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾ «كهف» وازت لێیە ئیماندار بە، وازت لێیە کافر بە؛ ئەئەوە ئیختیار وەدەس دانی ئینسانە بۆ هیدایەت و زەلالەت. واتا بۆ ڕێگای ڕاست و چەپت شارەزا دەکا خودا بە هۆی ئەقڵ و سرشت و پێغەمبەران و کەلامەکانی. لەوەش بەولاوە ئیختیار بە ئینسان دراوە، جا ئە دەوەیدا پیاوەتی وڕاستی و هونەر دێتە ڕوو وە مەیدانی پاداشی چاکان و خاوەن ڕاستان دێتە ڕوو و بازاڕی تۆڵە و سزای ناپاکان دەڕازێتەوە.

داری تەکلیفات لە سەر زەوی ئیختیار و سەربەخۆییدا شین دەبێ و دەچێندرێ، چونکە ئەگەر ئیختیاری کردنی چاکە و خراپە م نەبێ بە هۆی ئەقڵ و شعوور و هێزی لەش وەک منداڵ و شێت، داوا لێکردن و تەکلیف لە سەر دانانم بێهوودە دەبێ، خۆ ئەوەش یەقینە و باوەڕ پێ کراوە خودا داوا ناکا لەوەی ئیختیار و توانا و سەربەخۆیی نەبێ لە بەڕێوەبردنی داوای کاروبار.

دەبێ بە تەواوی ئەقڵ و زانست و شعوور تێکۆشین مانای ئەو ئایەتە: ﴿يُضِلُّ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾ وا بەراوەرد کەین نە سەلبی ئیختیار و سەربەخۆیی لە ئینسان لێ وەکاڵێ و نە تۆبزیگەری خودای لێ دەرک و فەهم بکرێ.

بەر لە هەموو شت دەبێ ئەوە بکەینە کلّی دڵ و باوەڕ کە خودا ئینسانی سەربەخۆ و خاوەن ئیختیار ڕاناوە و هێناویەتە دی، هەر ئەوەشە هۆ کە ئینسان ڕەسەر دەکەوێ بەرەو پلەی بەرزایەتی لە هیممەت و ڕێزداریدا، و یا دەکەوێتە پلەی نزمایەتی لە حەیوان نزمتر، تەماشا کە و زەین دەیە: كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ «مدثر» واتا هەموو نەفسێک بارمتەی کرداریەتی.

سرنج بگرە: ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٠﴾ «حج» بە کورتی چوونە دۆزەخی دۆزەخیان لە کردەوەی خۆیانڕایە.

دەبێ حاشا لەوەی نەکرێ: هێندێک لە ئایەتەکانی قورئان هاوار دەکەن وەلای ئەوەی کە خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم لە سەر ئەساسی حیکمەت و ئیرادە و ئیشتیای خۆی قۆڵێک لە ئینسان گومڕا دەکا و قۆڵێکیش شارەزا. دڵ دەیە و حاشا مەکە: يُضِلُّ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ مانای ئەوەیە: کێ بخوازێ گومڕای دەکا، کێش بیهەوێ و حەز کا شارەزای دەکا. وهەروا ئایات و ئیشاڕاتی دیش هەن ئەو حاڵەتە دەنوێنن.

ها دەبێ هەڵنەفریوێین و بە غەڵەت نەچین دێرەدا، کەڵەزەڕی و تۆبزیگەری وەپاڵ خودای خاوەن عەدڵ و بەزە دەین بە تەماشا کردنی زاهیری ئەو ئایەتە، بەڵکە زۆر بە وردی دەبێ سەیری

ئەسـرار و ڕازی ناو دەروونی ئایەتەکە بکرێ و بکەین، ئاواش بەراوەرد بکەین و هەڵیسەنگێنین: خودا بەبێ ئیرادە و مەیلی ئینسانی هەروا بە زۆری لە سەر ویستی خۆی سواری سەری عەبدی بێخەبەر و بێتاوان نابێ، گومڕای کا یا شارەزا؛ چونکە ئەگەر یاسا و نیزامی ئیلاهی ئـاوا بـێ، تیشـکی عەداڵەت و ڕەحـم و بەزەی باریتەعـالا دەکەوێـتە ژێـر سـوئال «پەنـا بە خـودا» و لە خودایەتی خودا ناوەشێتەوە بە زۆر وەسەر تەڵەم پەڕێنێ و سزای وەسەر پەڕینیشم لێ بسـتێنێ، وەیا بەبێ ئیتاعە و خزمەتگوزاری میداڵ و عەبای عەتام پێ هەڵاوەسێ.

دەبێ بۆوەی لەو گێژە و خوڕێنە وەپەڕین و پێدا نەچین، بە قەناعەتەوە ئەوەمان بـاوەڕ بـێ: خودای تەعـالا جـگە لە ئیلهـامی سـرشتی کە ئەقـڵ و هەسـت و شـعوورە، کە فەرمـوویەتی ﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ بە وەسیلەی پێغەمبەران چاکە و خراپە و ڕێی هیدایەت و گـومڕایی و هەروا دەرکی قازانج و زەرەری پێ نیشان داوین بەبێ کەموکووڕی. جا لە سەر ئەو ڕێنوێنییە و شـارەزاییەی خـودا داویەتە ئینسـان ئەگەر ئینسـان بیـت و بە پێـی چڵێسـی نەفـس و هەوا و هەوەسی دنیاپەرەستی و سەرەڕۆیی خـۆی لـێ نیشـێ و نەگەڕێـتەوە ئەوکـات ئیـرادەی بـاری وەشوێن ئەو هەڵوێستە ناڕەوا و ناحەزەی دەکەوێ، بۆ باوەڕی سەیری ئایەتی ١١ «رعد» کەیـن: لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَـا بِقَـوْمٍ حَـتَّى يُغَـيِّرُواْ مَـا بِأَنْفُسِهِمْ وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلاَ مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَالٍ. ئینسان خاوەنی فریشـتانێکە لە پێشەوە و لە پشتەوە، بێ ماوەڵ ئاگاداری دەکەن بە فەرمانی باری و دەیپـارێزن. خـودا ئەوزاع و حاڵوباڵی هیچ گەلێک نگۆڕێ و ئاڵوگۆڕی پێ ناکا «سەربەخۆ لە ڕووی تۆبزی» تاکوو ئەوان لە سەر ویست و خواست و ئیرادەی خۆیان دڵی خۆیان نەگـۆڕن، بەڵام خـودا ئەگەر بـیهەوێ گەلێکی تووشی بەڵا بێ هیچ بەرگرێک بۆی نییە بەرگری بێ، و بەجـوز خوداشـی کەس نیـیە مەدەدکار و یاریکاریان بێ.

بەڵێ کەلێنی ئەوە درا کە دڵی خاوەن هەست و شعوور تێبگا، خـودا کەس بە زۆر وەسـەر تەڵە ناپەڕێنێ و عەزابیشی دا لە سەر وەسـەر تەڵە پەڕیـن، بەڵام بـا ئەوەش بە یەقـین کەیـن: کە خودا هەر لە هەوەڵەوە دەزانێ کێ بەرەو تاوان دەچێ و کێ بەرەو چاکە لێ دەنیشـی. جـا خـۆ ئەو زانینەی خوداش نابێتە وەسیلە و هۆ بۆ وەی ئەو ئینسانە خراپ بێ یا چاک بـێ. مەسـەلەن وەک زانستی ئەستێرەناسەکان بە گیرانی مانگ دە کاتی دیاریکراوە، ئەو زانستەی ئەستێرەناسی کە ناشییە و دەماوە لە تێکچوونی نیزامی گەڕانی زەوی و ئەستێرە نـابێتە وەسـیلە و هـۆ بـۆوەی

مانگ بگیرێ، چونکە گیرانی مانگ هۆیەکەی لە گەڕانی خۆی و زەویڕا هەڵستاوە، نە لە زانستی ئەستێرەناسی، عیلمی خوداش وایە کە وەسیلە و هۆی وەسەر تەڵە پەڕینی ئینسان نییە، چونکە وەسەر تەڵە پەڕینی ئینسان هۆیەکەی لاساری و سەرەڕۆیی و دواکەوتنی نەفس و هەوایە نە عیلم و زانستی باری.

لە سەر ئەو ئەساس و بەراوەرد و بۆچوونە دەبێ بڵێین: ئەو ئایەتانەی کە هیدایەت و زەلالەتیان بەرەو خودا ڕادەنا جگە لەوەی ئیسباتی توانایی خودا ڕادەنێن لە سەر هەچی حەز کا و بیهەوێ، ئەوەش ڕادەنێن و دەنوێنن: خودا تۆبزیگەر و ڕەپێچەکدەر نییە لە سەر کەس ﴿لَا تَبْدِيلَ لِسُنَّةِ اللَّهِ﴾ بۆخۆی فەرموویەتی بەڵکە ئەو ئایەتانە سەراپایان ئامۆژگارین وەک خودا بۆخۆی فەرموویەتی: وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴿٣١﴾ «مدثر» **نین ئەو ئایەتانە ئیللا کە هەن پەند و ئامۆژگاری و بیرهێنانەوەن.**

بە کورتی و بە کوردی، كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ئەگەر بە باشی لە تەتەڵە و کەو و هێڵەکی ئەقڵ و شعوور و زانست درێ، بەرهەمەکەی ئەوە دەبێ بێگومان: خودا زوڵم و زۆری لە هیچ نەفسێک ناکا بەڵکە نەفسە دەیکا بۆ باوەڕی و دامرکانی زانست و ئەقڵ چاوێک بگێڕە لە دەروونی ئایەتەکانی ٤٠ نیساء، ٤٤ یونس، ٧٠ توبە، ٤٠ عنکبوت، ٩ روم، ٥٧ بقرة، ١١٧ آل عمران. بۆ زێدە زانین بڕۆ خزمەت ئیمام فەخری ڕازی، ئایەتەکانی ٢٦ی بقرة و ٣١ی مدثر.

ئەوجار دڵ بە هەستەوە هەست ڕادەگرێ و چاو دەگێڕێ بۆ وەی بزانێ، لە پاش ئەوەی کافر و منافق و فاسقان گوێیان نەدایە نموونە هێنانەوەی خودا و بەهرەیان لێ نەگرت، بەڵکە زۆر خیرەسەرانەتر و لاسارتر بەرەو تاریکستانی بێدینی و گێرەشێوێنی و ئاژاوەگەری سەریان هەڵگرت و ملیان لێ نا. خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم لە ڕاستیان چۆن هەڵوێست دەگرێ؟

دیارە وەک چاو دەکرێ خودای تەعالا ٣ سیفەتی زۆر کەسیف و ناحەزی بێباوەڕان هەیانە ڕایدەگەیێنێ بە ئینسان:

١. پەیمان شکاندن پاش دابەستنی دەگەڵ خودا

٢. ئەوەی خودا دەستووری لە سەر داوە دەپیسێنن.

٣. فەسادکاری دەچێنن لە سەر زەوی.

بۆ وەڕاست گێڕانی ئەو مەتڵەبانە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٧ کە دەوێدا ئەگەر سرنجی

درێتیێ، تەسدیق و تەئیدی ئەو سیفەتە ناحەزەیان دەکرێ و دەکەین:

﴿۲۷﴾ الَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ اللَّهِ مِن بَعْدِ مِيثَاقِهِ وَ يَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَن يُوصَلَ وَ يُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ أُولَـئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ

**ئەوانەی پەیمان دادەبەستن دەگەڵ خودا «یا ڕۆژی بەری مەبەستە یا لە هەست و شعوور و ئەقڵەوەی مەبەستە» پاشان «بە هۆی دنیاپەرەستی» دەیشکێنن «و هەروا ئەو شتەی خودا ویستوویەتی وەمێنێ و بە ساغی بیهێڵنەوە دەیپسێنن و تووڕی دەدەن ـ «سەرەڕای ئەوانەش» فەسادکاری و بەدڕەفتاری لە سەر زەوی دادەڕێژن و دەچێنن «دیارە» هەر بۆخۆیان زیانبار دەبن و زەرەری خەڵکیش هەر لەوان دەهاڵێ.**

## پەیمان شکاندن

تێڕوانینێکی وردبینانە لە سیما و دەروونی ئەو ئایەتە پیرۆزە، بەڵکە دەروویەک وەدۆزرێ بۆوەی تێیدا بڕوانین و ببینین، ئەو عەهد و پەیمانەی کە خودا و ئینسان گرێیان داوە پێکەوە و بەستیان، و هەر لە لایەن ئینسانیشەوە شکێندرا و هەڵوەشا، کامە پەیمانەیە، ئایا هەر هەمان پەیمانی ئەقڵ و زانست و شعووری سرشتییە کە خودا هەر لە هێنانەدی ئینسانی ڕەپاڵی خستووە هەستی خوداناسی و دەرکی تاوان و تەقوا ـ و یا بەر لە ڕانان و هێنانە دی ئینسانی ـ خودای خاوەن عیلم و زانست دەگەڵ ڕوح و حەیاتی ڕازاوە بە هەستی حەق و باتڵ بەشەری دوواوە و پەیمانی دەگەڵ بەستووە کە بە ڕەببی خۆی قبووڵ کەن و بیناسن و ئەوانیش قەبووڵیان کردووە ـ وەک ئایەتی ۱۷۲ «اعراف» شاهیدی لە سەر ئەو پەیمانە دەدا: وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـذَا غَافِلِينَ «ئەی پێغەمبەر بەیانی کە بۆ ئینسانی» **ئەو کاتەی پەروەرەندەت لە پشتی ئادەمیزادی عەولادانی ئادەمی بەرهەم هێنا کە هەر بۆ خۆیان لە سەر خۆیان شاهیدییان دا ـ لە وڵامی خودادا ـ کە خودا فەرمووی پێیان: ئەمن پەروەرێنتان نیم؟ کوتیان: بەڵێ «ئەتۆ خالقمانی» ئێمە لەوە ئاگادارین کە تۆ پەروەرێنمانی «خوداش بوونەوەر و نیزامی کردە شاهید و دەلیل و بورهان هەم لە سەر ئیقراریان هەم وەسیلەی ئیقراریان» تاکوو ذۆژی قیامەت نەڵێن ئێمە لەمەڕ خوداناسی و بە یەک زانینی بێخەبەر بووین.**

بۆ وەی توانیبێتمان نەختێک خۆ دوور خەینەوە لە بەر پلاری پلارهاوێژان، ئەو پەیمان شکاندنەی ئینسانی دەگەڵ خودا حەواڵە کەین وەلای «قەتعی سیلەی ڕەحم» واتا پساندن و

هەڵبڕینی تەنافی بەزە و ڕەحمێکی کە خودای مەزن بە هۆی ئەو هەمـوو موسـوڵمان و غەیـری لێک بەستوون، بەتایبەت خزموکەس.

ئەگەرچی هێندێک لە زانایانی ئایینی نەزەر و ڕا و بۆچوونیان وایە لەو بارەوە کە ئەو عەهـد و پەیـمانەی ئینسـان شـکاندوویەتی هەمـان ئەو سـرشتەی ئەقـڵ و شـعوور و هەسـتێکە کە وەسیلەی دەرکی هەموو حەق و ناحەق و تاوان و تەقوایەکە خودا لە ڕۆژی بەرێدا بەخشیویەتی بە ئینسانی، لە سەر ئەساسی بەراوەردی ئایەتی ٣٠ ڕوم: فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا واتا لـە سـرشتدا خودا ئینسانی هەر بۆ یەکتاپەرەستی وەدی هێناوە. بۆ بـاوەڕی ئاوڕێـک وەدە بـۆ لای ئایەتی ٥٦ی ذاریات: وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ **ئەمن جندۆکە و ئینسانم خەلق نەکردووە ئیللا بۆ پەرستنم نەبێ.**

وەهەروا هێندێکی دیش هەن لە زانایان کوتوویانە ئەو پەیمانەی ئینسان تێکی شـکاندووە و خۆی لە بەر دەراویشتووە، هەمان ئەقڵێکە کە خودا و حەق و ناحەقی پێ دەناسـرێ. خـودای تەعالا لە سەرەتای خوڵقانی ئینسان و ڕوح دە پـاڵ هاویشـتن ئەو ئەقـڵ و شعوورەشـی ڕەپـاڵ خستووە کە بەرە بەرە بە پێی پـتەو بـوون و وەخـۆ هـاتنی قەوارەی لەش و ڕووح ئەو ئەقـڵەش هەڵدەستێ بەرەو نیازەکانی بۆی خوڵقاوە. ئەدێرەدایە کە کافر ئەو ئەقڵە چالاکەی لە حەقناسـی لاداوە بەڵکە بەرەو دنیاداری داویەتە دەستی نەفس و هەوای سەرەڕۆ و یاغی.

هێندێکی دیکەش دەڵێن ئەو عەهد و پەیمانەی خودا بەستی دەگەڵ ئینسانی ئاگاداری ئەو ئەمانەتە دین و تەکلیفەیە کە خودا داویەتە ئینسان و پێی سپاردووە. بۆ وەڕاست گەڕانی ئەو ڕایە ئاوڕ دراوەتەوە سەر ئایەتی ٧٢ احزاب: إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا. **ئێمە ئەو ئەمانەتەمان «واتـا ئیختیـار و ئیـرادە و سـەربەخۆیەمان» ڕانـا لە بەرابەر ئاسـمانەکان و زەوی و کێوەکـان، هیچیـان وەخۆیـان نەگـرت «چونکە دە خۆیان ڕانەدی لە ژێری بێنە دەرێ و ترسان» «ئیجباریان بە سەر ئیختیاردا پەسند کـرد» ئینسـان «بێ بەراوەرد و بیری دواڕۆژ» چۆ ژێری و وەئەستۆی خۆی گرت «هەچەن ئینسان ئەو وەخۆ گرتنەی بوو بە هۆی بەرز و بەڕێز و ڕێزدارتری بە سـەر غەیـری خۆیـدا» ئەمـا بە زۆری ئەوانەی کە ئەرزشـی ئەو پـلە و پایەیە نازانن» غەدریان لە خۆیان کرد کە ئەو ئەمانەتەیان وەئەستۆی خۆ گرت.**

ئەوەی بە یەقین گەیشت و حاشا هەڵناگرێ ئەوەیە وەسەر تەڵە پەڕین و پەیمان شـکاندن و پەرژین بەزاندن لە کووژانەوەی چرای ئەقڵ و شعووررایە، هەروەک ڕاستەڕێ داگـرتن و خـوار نەڕۆیشتن و لانەدان لە «صـراط مستقیم» لە بەر ڕووناکی تیشکی ئەقڵ و شعووردا دێتە جـێ و

دەکرێ.

دڵ هەست ڕادەگرێ و چاوەڕوانە بۆ وەی بزانێ: ئایا خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم پاش ئەوەی یەک بە یەک تاوانی تاوانکەرانی ڕانا و بە چاویدا دانەوە و بۆنی تووڕەییشی لێ دەهات؟ هیچ پلار و گورزی دیکەی لۆمەیان ڕێ دەهاڵێنێ و لە بنان‌گوێیان دەدات؟ جا بۆ وەی بزانین و لەو بارەوە حاڵی بین دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٢٨، بێ‌شک لەوێدا پێ دەگەین:

**﴿٢٨﴾ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتاً فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ**

**چۆن حاشایە دەکەن لەو خودایەی کە لە نەبووەوە ژیانی پێ داون «وەهەروا پاش ئەو ژیانەوە» دەتانباتەوە و دەتانمرێنێ و هەر دیسانیش پاش مردن بەرەو ژیانێکی دی» زیندووتان دەکاتەوە «پاش ئەو هەموو بێنە و بەرەیە» هەمووتان بۆ لای دەگەڕێنەوە.**

## تێوەڕامانێکی هەستیارانە لەمەڕ ئەو بێنە و بەرەی گیان:

لە هەوەڵدا نەبووە و دێندرێتە بوون، دووبارە دەبردرێتەوە شوێنی خۆی واتا نەمان و مردن، هەمیسان لەوێش‌ڕا هەڵدەستێندرێتەوە بەرەو مەیدانی مەحشەر واتا بە یەکجاری و بە تێکڕایی بۆ لای خودا، بێ‌گومان ئەقڵ و ئیمان بە قەناعەتەوە دەزانێ نیزامی باری‌تەعالایە و لە لای ئەو زۆر ئاسانە و بەبێ ئامراز و کەرەسە و وەسیلە بەڵکە بە ئەمری «كُنْ فَيَكُونُ» سەر دەگرێ و دێتە ڕوو، بەڵام ئەوەی جێی ڕامان و دامان و سەرسوڕمانە ئەوەیە تەئیدی ئەو نیزامە ئەقڵ و شعوور و هەستی خدادادی، لێی بەحاشا نین، ئەدی بۆچی هەر لەو ئینسانانەی کە خاوەنی ئەو ئەقڵ و شعوور و هەستەن لێی بە حاشان و ئینکاری دەکەن؟ بۆ مەگەر خودا لە هەوەڵ ساختاری وان ئەو دەرک و شعوورەی نەداونێ؟ یا بەڵکوو کەسی بێ ئەقڵ و شعوور نەخستۆتە ڕووی زەوی خودا، ئەدی بۆ لێی بەحاشان؟ دەبێ بۆ دەرچوون لە ژێر ئەو مەتەڵە و گەیشتن بە واقیعیەتی ئەو لاسارییەی ئینسان، ئەوە بڵێین و باوەڕیشی پێ بکەین ئەو ئینسانە مونکیر و بەحاشایانە، بەردی ڕەق و سەختی دنیاپەرەستی و هەوەس‌ڕانی دەدەن لە شووشەی ساف و ڕوونی ئەقڵ و شعوور و هەستی حەق‌ناسی دەیشکێنن و دەیهاڕن کە تازە لە کاری لێ تێڕوانین و شت تێدا بینین دەکەون، ئەگینا هەر ئەقڵ و زانستێ ئەوە دەزانێ و حاشای لێ ناکا، کە ئینسان سەردەمێک نەبووە و بۆ باس لێ کردن ڕێی نەداوە. بۆ باوەڕی زەین دە ئایەتی ۱ سوورەی «انسان»: هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا بێ‌گومان دەوران و

ماوەیەک بە سەر مرۆدا تێپەڕیوە کە ئەو شتێ نەبووە باسی لێوە بکرێ. واتا دەورانێک مرۆ بەشێک لە مادەی تەبیعەت و بێ‌گیان بووە دوور لە ناوی ئینسان. لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ «مؤمنون» دە زەویدا بووە، دە ناو گیاوگۆڵ و میوە و دانەوێڵە، وەیا هەر دە عیلمی باری‌تەعالادا بووە، پاشان لە سەر ئەساسی حیکمەت و ئیرادە و مەشییەتی خۆی خودای حەیی موتڵەق و حەیات‌بەخش بەشێکی لە حەیاتی ڕازاوە بە هەستی ئەقڵ و شعوور تێ چکاندووە و پێی بەخشی، وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي ﴿٧٢﴾ «ص»

جا کەوایە دەبێ لەمەڕ ئەو کەسانەی کە لە حەق بەحاشان و مونکیری خودا و هێز و تەوانای خودان، دەبێ بڵێین ئەقڵی خودا پێداوی خۆیان شکاندووە بە بەردی دنیاپەرەستی، کەڕ و کاس و بێ‌شعوور کەوتوونە دەستی هەوا و هەوەس و شەیتانی مەلعوون، تازە مەگەر ڕەحم و بەزەی تایبەتی خودا وەیانقۆزێ و لە دم شەیتانیان وەستێنێ، دەنا تا مردن خەلاسییان لە دەس شەیتان نایە.

ئاوڕێک وەسەر قۆناغ و پلەکانی کارەساتی پێکهاتنی ئینسان لە ڕوانگەی ئیاەتی ٢٨ی بەقەرەدا.

## عالەمی بوون و نەبوون

وا دێتە بەرهەم و بەرچاو عالەمی ئینسان دە چوار عالەمدا جێ کرابێ، مەسەلەن:

١. عالەمی نەبوون بووبێ بە پێی ئایەتی ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَاتاً﴾ ئێوە نەبوون.

٢. عالەمی بوون واتا هاتنە ڕوو بە پێی ئایەتی ﴿فَأَحْيَاكُمْ﴾ واتا وەدیم‌هێنان. یانی پاش تێپەڕبوون لە عالەمی خاک و خۆڵ و ئاو تنۆکەی «مەنی» لە ناو کارگای زەوی و گۆشتی ناو زگی دایکان هێنامنە عالەمی بەشەر.

٣. عالەمی نەمان بە پێی ئیشاڕاتی ئایەتی ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ﴾ واتا دەومرێنم، یانی بەرەو عالەمی بەرزەخ ڕادەدرێن، واتا عالەمی نێوان دنیا و قیامەت.

٤. عالەمی هەستانەوە و چوون بۆ مەیدانی حیساب کە تازە دنیاکان لە خول و گەڕ دەکەون دنیای دیکەیان بە شوێندا نایە.

بە کورتی ئەو چوار عالەمە: ١. عالەمی نەبوون = عەدەم ٢. عالەمی بوون = بەشەر ٣. عالەمی مەرگ و نەمان = بەرزەخ ٤. عالەمی زیندوو بوونەوە = عالەمی قیامەت.

لە تێڕوانینێکی بەرجەوەندانە تووشی گیر و گرفتێکی دێن لە مەڕ داب‌ونەریتی «عیلمی نەحو» دەبێ هەر لە سەر ئادابی عیلمی نەحو وڵامیان بدرێتەوە. گیر و گرفتەکانیش ئەوانەن:

ئیشکالی ١. جوملەی وَكنتُمْ أَمْوَاتاً جوملەیەکی حاڵییەیە و مازیشە. خۆ دیاریشە لە یاسای عیلمی نەحودا جوملەی مازی کە واقیع بوو، بە حاڵ دەبێ حەرفی «قد»ی بچێتە سەر، خۆ ئەگەر «قد»یشی بچێتە سەر بە ڕواڵەت و بە زاهیری دەبێ لە نیەتدا هەبێ، خۆ دیارە دێرەشدا نە بە زاهیری هەیە نە بە نیەت، چونکە دێرەدا مازی بەعیدە، «قد»یش ناچێتە سەر مازی بەعید. بەڵکە دەچێتە سەر مازی قەریب.

ئیشکالی ٢. جوملەی ﴿وَكنتُمْ أَمْوَاتاً﴾ کە جوملەیەکی حاڵییەیە، ئەگەر عەتفی ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ بکرێتە سەر، ئەو ئیشکالە ڕوو دەدا: عەتفی موستەقبەلی مەحز بۆ سەر حاڵ کە ﴿وَكنتُمْ أَمْوَاتاً﴾ە، ناڕەوایە.

وەڵام: «قد» دەچێتە سەر مازی بەعیدێکی قەریبی لێ مەبەست بێ. لە وڵامی ئەو ئیشکالەدا دەبێ بکوترێ: جوملەی حاڵیەیەکی کە عەتفی دەکرێتەوە سەر بە موستەقبەل بە زاهیری وەک ﴿وَكنتُمْ أَمْوَاتاً﴾بێ، پێت وانەبێ وایە، بەڵکە ئەو عەتفە بۆ تەواوی ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ﴾ ئەوانەش حاڵن. بە کورتی جوملەکانی ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ موستەقبەلن و هەروا جوملەکانی ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ﴾ موستەقبەلن. بۆ زێدە زانین بڕوانە «کشاف، ج ١، ل ١٢٦».

کاتێ خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم سپاس کردنی بە ئینسانی ڕاگەیاند لە بەرابەر نیعمەتی گیان پێدانی لە بێ‌گیانی‌ڕا، وەک دەفەرموێ: ﴿وَكنتُمْ أَمْوَاتاً فَأَحْيَاكُمْ﴾ کە بەو نیعمەتەی دەکوترێ نیعمەتی ئەنفوس. هەروا دووبارە دەیهەوێ خودای تەعالا دە ئینسانی گەیێنێ کە دەبێ سپاسی لە سەر نیعمەتی ئافاقیش بکا کە دنیای ڕازاوە بە نەزم و نیزامی دروست و ڕێک‌وپێکە. بۆ باوەڕیت بە نیعمەتی ئافاقی کە دانیشگایەکە بۆ ئەقڵ و شعوور و هەستی پێیدا سەرکەوێ، لەوێڕا بڕوانێ لە توانا و بەهێزی نەققاشی لێزانی خودای یەکتا و کارجوان دەبێ بڕوانی لە ئایەتی ٢٩، ڕوانینێکی ژیرانە و پسپۆڕانە:

﴿٢٩﴾ **هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ**

**خودا هەر ئەو خودایەیە هەرچی هەیە لە ناو زەویدا لە سەر زەویش، هەر بۆ ئێوەی داناوە و بەرهەم هێناوە. ئەوسا پاش ڕازانەوەی زەوی بەو هەموو بەرهەمەی تێیدا ڕانا، وێکەوت و پەرژایە سەر دروست کردن و ڕازانەوەی بەرزایی حەوت نهۆمی «ئاسمان» «بە مانگ و ڕۆژ و ئەستێرە ڕووناک و گرشەدارەکان» هەر خودا بۆخۆشیەتی لە هەموو شت ئاگادارە و هەیەتی.**

تێوەڕامان و تێڕوانینێکی زۆر هەستیارانە لە سیما و دەروونی ئەو ئایەتی ٢٩: کە خەبەر و هەواڵێکی زۆر گرینگ و بەرچاوی لێ وەدەر دەکەوێ. ئەویش ئەوەیە، بەتایبەتی لە جوملەی ﴿خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً﴾دا دەردەکەوێ: کە ئینسان ڕێزی لە سەرووی هەموو بوونەوەرێک بێ، و ڕێز و ڕێزداری ئینسان لە فرشتە و پەری و باقی گیانلەبەران پێش کەوتبێ بەو پێیە دەشبێ فەرمانڕەوای سەرزەویش بێ، هەروەک لە زۆربەی ئایەتەکانی بابەت لە قورئانا ئەوهەستە هەست دەکرێ: کە ئینسان فەرمانڕەوای سەر زەوی بێ.

## هەرا لە سەر (اِسْتَوَىٰ)

ئاوڕێک وەسەر واژەی ﴿اسْتَوَى﴾ دە ئادابی عەرەبدا واتا بڵیند بوو، یا بە پا وێستا. دیارە هەر دووی ئەو مانایە لە شەئنی باری بەدوورن چونکە باریتەعالا سەرەوە و بەرەوە و وێستانی نییە، ئەوانە بۆ شەئنی نابن. وهەروا ناشکرێ و ناشتوانین مانای ئایەتی ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء﴾ ئاوا بەیان کەین: واتا خودا پاش بەدیهێنانی زەوی و ئەوەی تێیدا، بۆ لای ئاسمانڕا خزی و پرژایە بەرزایی حەوت نهۆمی. کەوابێ بۆ خۆلادان لە تووشبوونی ڕەخنە لە دیدگای عیلمی دەبێ چارە وەدۆزرێ.

هەچەن ڕاوڕاوێن لەو بارەوە لە لایەن عیلمزانان زۆرە و هیچیشیان خاڵی لە گیر و گرفت و ڕەخنە نین، بۆ نموونە ئەوەی پێی وایە ﴿اسْتَوَى﴾ بە مانای (استقرّ)ە، ئەوە ڕەخنەی تەعین شوێن و مەکانی بۆ خودای دێتە سەرێ. ئەگەر ﴿اسْتَوَى﴾ بە مانای (قَصَدَ) بەراوەرد بکەین ئەودەم ئەوە دێتە خەیاڵەوە: خودا پێش قەستی ئاسمان بە کارێکی دی خەریک بووە، پاشان ئەو کارەی وێڵ کردووە و قەستی کارێکی دی کردووە. ئەوەش لە خودا ناوەشێتەوە.

ئەگەر ﴿اسْتَوَى﴾ بە مانای (عَلَى) واتا سەرێ بەراوەرد کەین ئەوکات لازم دێ حدووس هەبێ دووبارە ئەوەش لە خودا ناوەشێتەوە. کەوایە لە سەر ئەو ئەساسە بە هەر لایەک لەو لایانەی کوتمان مانای ﴿اسْتَوَى﴾ هەڵسەنگێنین تووشی ئیشکال دەبین.

له سەر ئەساسی ئەو بەراوەرد و بۆچوونەی سەر ﴿اسْـتَوَى﴾ دەبـێ بڵێـین ﴿اسْـتَوَى﴾ بەو جۆرە مانایانەی کە بۆی داندراوە ناکرێ و ناتواندرێ سیفەتی زاتی خودا یەک بێ کە دەگەڵ ئەو مانایانە ناگونجێ بەڵکە دەبێ بڵێین ﴿اسْتَوَى﴾ یەکێکە لە سیفەتە ئیرادەکانی زاتی خودا، ئەودەم دەکوترێ ئیرادە کە سـیفەتی بـارییە بە هەر لایەکـدا کە حەزکـا دەتـوانێ دەکـاری کـا واتـا هەر کارێکی خودا بیهەوێ توانایە بیهێنێتە ڕوو. بەو پێیە مانای ﴿اسْتَوَى﴾ واتا ڕوو کردنـی ئیـرادەی خودا دە وەدیهێنانی هەرچی بیهەوێ. ئەوکات یانی لە سەر ئەو تەعبیـرانەی ﴿اسْـتَوَى﴾ خـودا وەدوور دەخرێ لە ئیحتیمالی وەپاڵدانی مەکان و زەمان و باقی سیفاتی حادیسە.

دڵ هەروا دە نیزامی ئایەتی ۲۹دا هەسـت بەوەی دەکـا کە دروسـت کـردن و هـاتنە ڕووی زەوی پێش خەڵقی ئاسمان بووبێ بە پێچەوانەی چاو پێکەوتنـی نیزامـی ئـایەتی ۴ی سـوورەی سەجدە: اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْـتَوَى عَلَى الْعَـرْشِ... ئەو خـوایەی کە ئاسـمان و زەوی و هەچـی دە ناویانـدا بە شـەش ڕۆژ خسـتیە ڕوو. وهەروا ئـایەتی ۳۸ی دوخان: وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ئێمە ئاسمان و زەوی و هەچی لە ناویاندا، بۆ گەمە و گاڵتەمان سـاز نەداوە. وهەروا ۲۲ جـاثیە: وَخَلَـقَ اللَّهُ السَّـمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِـالْحَقِّ... خـودا بەڕاستی ئەو عاسمانانە و زەوییەی وەدی هێنا.

دەبێ بۆ ڕاماڵی ئەو ئیشکالە بڵێین: لە نیزامی قورئانـدا لە هەر کـوێ چـاو کـرا: کە باسـی زەوی لە پێش ئاسمانەوە هاتووە، دەبێ ئەو یادە کەین کە ئێرە باس لە نیعمەتەکانی خـودایە، ئەو نیعمەتانەی خودا بەرهەمی هێناون دە زەوی و غەیری زەویدا. وهەروا ئەوەش بخرێتە یادەوە: کە ئینسان بە زۆری لە نیعمەتەکانی زەویدا خاوەن بەهرەیە.

بەڵام لەو شوێنانەی کە پێش‌کەوتنی ئاسمان لە سەر زەوی چـاو دەکـرێ و واقـیعە، دەبـێ واهەست کەین ئەوە بەیانی گەورەیی و قودرەتی خودای تێدایە و ئیسباتی تاق و تەنیایی خودا. چونکە حاشا هەڵنەگرە لە سیمای ئاسمانڕا زیاتر و بەرچاوتر عەزەمەت و جەلالی خـودا چـاو دەکرێ و هەستی پێ دەکرێ.

وەک دەیبینین و چاوی دەکەیـن لەمەڕ خەڵقـی ئاسـمان و زەوی، ئایـاتی زۆر هەن. بەڵام لەمەڕ ئەوەی کامیان لە خەڵق کردندا لە پێش کامیاندایە، دە نیزامی تەرتیبی ئایەتەکاندا ناکۆکی و بەربەرەکانی چاو دەکرێ. ئەو ناکۆکییەش هاڵۆزی دەخـاتە نـاو زەیـن و شـعوور و سـەلیقەوە. پێویستە حەول و تێکۆشان بۆ چارەی بدرێ مەسەلەن لە ئایەتی ۹، ۱۰، ۱۱ سوورەی «فصلت»دا

هەست بەوە دەکرێ زەوی بەوەی دە ناویشیدا، لە پێش ئاسماندا هـاتبێتە ڕوو و خەڵـق کرابـێ. بەڵام لە ئایەتی ٢٧، ٢٨، ٢٩ و ٣٠ سووڕەی «نازعات»دا وا دێتە ڕوو و چاو دەکـرێ کە خەڵقـی ئاسمان لە پێش خەڵقی زەویدایە. دیـارە ئەوە ئیشـکالێکە بـۆوەی نـابێ حاشـای لـێ بکـرێ و بۆوەش نابێ بە سەریدا باز درێ.

دڵ دەڵێ ئەگەر ئەقڵ و زانستی عیلمی دەگەڵم دەس دەنێ و مەیدانم دەنێ، دەڵـێم: زەوی بەو پێیەی کە مادەیە، دەبێ هاتنە ڕوو و دروست کردنی لە پێش ئاسـماندا بـووبێ، هەروەک لە «ابن عباس» و هێندێک لە یارانی ڕەسوول بیسـراوە: دەبێ خـودا لە هەوەڵ هەوەڵەوە نەقشـە و چـۆنیەتی زەوی دە عیلمـی خۆیـدا کە ئامـادە بـووە هێنـاویەتە ڕوو، پاشـان لە گـاز و هەوا و دووکەڵی ئەو مادە خاکینەیە ئەو ئاسمانەی لێ پێـک هێنـاوە. بە کـورتی: هەوەڵ مـادەی زەوی هاتۆتە ڕوو، پاشان مادەی ئاسمان لەو گازەدا. پاشان چۆنیەتی زەوی بە گـرد و دۆڵ و شـاخ و دەشت و ئاو و تەلانەوە ڕاخراوە و ڕانراوە لە بن چەتری ئاسمانەوە. ئەو شێوە بۆچوونە بەرگری دەکا لە ناکۆکی ناو ئایەتەکان، هەروەک ڕای پەسـەندی زانایـان ئامـاژەی وەلا دەکـا. بـۆ زێـدە زانست لەو بارەوە بڕوانە: تەفسیری «تبیین الفرقان»، ج٢، ص ٢٢٦.

دڵی هەستیار بە ڕاشکاوی دەڵێ: جێی سـرنجە کە لە پاش ڕاگەیاندنی خەڵقی بـوونەوەری سەر زەوی، وی پڕژا بۆ خەڵقی حەوت نهۆمی ئاسـمان. چـونکە زەوی بـێ سـایەبان لە نەزم و یاسای نیشتەجێ بوون لە سەری بۆ ژیان دوور دەکەوتەوە. وهەروا بۆ حەیـات پێـدانی زەوی بە هۆی باران و تیشکی هەتاو و نووری مانگ دەبێ حەوایەکی پڕ لە هەوا و ئاو و نووری هەبێ.

وهەروا ئەگەر بە وردی هاتنی ئایەتی ٢٩ بە شوێن ئایەتی ٢٨دا بەراوەرد کرێ ئەوە دێتە ڕوو کە دە ئایەتی ٢٨دا باس باسی حەیاتە، جا خۆ ئەوەش سـەلمێندراوە کە مـایەی حەیـات و ژیـن ئاوەکانی ئاسمان و زەوین، کەوایە دەتـوانین بڵێـین: هـاتنی خەڵقـی ئاسـمان و زەوی لە پـاش خەڵقی حەیات، ئاماژە و هاوارە وەلای نیزام و تەرتیبی ئەساس لە هەموو کارێکدا.

لە عەتف کردنەوەی ئایەتی ٢٩ بۆ سەر ئایەتی ٢٨ بێوەسیلە واتا بێ ئامرازی عەتفـێ چـاو دەکرێ ئەوەش دە ئادابی عیلمی نەحودا بە ناپەسـەند دانـراوە. کەوایە بـۆ ڕەفعـی ئەو ئیشـکالە دەبێ بڵێین: ئایەتی ٢٩ تەواوکەری ئایەتی ٢٨ە، پێویستی بە ئەداتی عەتف نیـیە و ناکـا. چـونکە یەک مەتڵەب و مەبەست ڕادەنێن و ڕادەگەیێنن. ئەویش تەوحیدە واتا خودا بە یەک زانین.

سووکەئاوڕێک: پێش خستنی باسی حەیات دە ئایەتی ٢٨دا لە سەر باسی زەوی و ئاسمان

دە ئایەتی ٢٩دا ئاماژەیە وەلای ڕێزداری حەیاتی ئینسانی لە سەر سایری گیانداران. بە کورتی حەیات خرایە بەر چاو و کایە، پاشان شوێنی لێحاوانی حەیات کە زەوی و ئاسمانن بەوەی دە ناویشیاندا.

وهەروا بۆ هەموو ئەقڵ و شعوور و هەست و سەلیقەش دەرخرا و ڕوون و ئاشکرا کرا، ڕانانی ئینسان بۆ بەندەگی یەزدان، و ڕانانی ئەرز و ئاسمان بۆ خزمەت بە ئینسان و گیانان، هاوارن لە ئینسان کە ئەو خزمەت و ڕێز لێگرتنە، لێپرسینەوەی هەیە.

بۆ بەقا بە ڕێز لێگرتن و ڕێزداری ئینسان دەچینە خزمەت ئایەتی ٣٠، دەوێدا هەم ڕێزداری ئینسان چاو دەکرێ هەم فاسید و بێڕێز خۆ نواندنی:

**﴿٣٠﴾ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ**

**«بیخەوە بیر خۆت ئەی نەبی یا ئەی ئینسان» ئەو کاتەی پەروەردگارت بە فرشتانی ڕاگەیاند: ئەمن وا بە نیازم و دەمهەوێ جێنشین و بریکارێک لە سەر زەوی دامەزرێنم و دیاری کەم «وڵات ئاوەدان کا و یاسا و نەزمی حاوانەوەی تێدا بەرقەرار کا و هەچی لە ناو زگی زەویشدا نێژراوە دەریخا و وەیدۆزێ» «لەوەدا ئەو هەستە هەڵدەستێ: ئینسان شایانی ئەوەی هەبێ بە هۆی زانست و ئەقڵ و شعوور بتوانێ دنیا بۆ ژیان و حاوانەوە و حەسانەوە وەڕازێنێ، بۆیە ئەو مەسئوولیەتەی دەخرێتە ئەستۆ و پێی دەسپێردرێ». وا هەست دەکرێ لە ڕاوێژڕا: فرشتەکان هەستی ئەوەی بکەن: ئینسانی لە خاک سازاو، خاکی وا بزۆز و تۆڕ و تووڕە و بێ سەبر، چۆن دەتوانێ ئەو ئەرکە وەئەستۆ بگرێ، ناچار دێنە جواب» و دەڵێن»: ڕەببەنا وا دیارە ئەتۆ کەسێ وا دێنی لە وێدا خراپە بکا و خوێنیش بڕێژێ، و بە هۆی ئەو بەدئەخلاقی و بەدکردارییەی لە تۆ بێخەبەر و دوور دەکەوێ» ئێمە دایمە لە شوکر و ستایشی تۆداین و حەمد و سەنا و پیرۆزی تۆ ڕادەگەیێنین. «نامانکەن بە بریکاری زەوی» «خودا لە وەڵامدا بە فرشتەکان دەفەرموێ:» ئەوەی من دەیزانم ئێوە ئاگاداری نین.**

### فرشتە چن و لە چن؟

کاتێ باسی مەلائیکە بە گوێی دڵ دەگا دەکەوێتە خەیاڵ و فکری ئەوەی دەبێ مەلائیکە چ بێ؟ دەیهەوێ وەک دەزانێ مرۆ چییە و لە چی سازاوە، پەری چییە و لە چی سازاوە، بشزانێ فرشتە (مەلائیکە) چییە و لە چی سازاوە؟ چونکە ناسینی مەلائیکە ئەساسی و پێویستە لە بەر ئەوەی پایەیێکە لە ئیمان پێبوون، یانی ئیمان ڕوکنێکی باوەڕ بە مەلائیکەیە.

مەلائـیکە (فرشـتە) زانایـانی ئیسـلام بەشـی زۆریـان لە سـەر ئەو بـاوەڕەن کە مەلائـیکە قەوارەیەکی نوورانین و لە نوورن، دەتوانن هەر شکڵێک وازیان لـێ بـێ خـۆی تێـدا بنـوێنن و نیشان دەن. لە ئەنجامدانی وەزیفەی پێ سـپێراویان، سـابیت و بەردەوامـن بێکەموکـووڕی، و لانەدان لەوەی دەستووریان پێ دراوە، وەک باریتەعالا ڕایگەیاندووە لە ئایەتی: غِـلَاظٌ شِـدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَـا يُـؤْمَرُونَ ﴿٦﴾ «تحریم» **مەلائـیکەی تونـدوتیژ و بەزەبـرن» خـودا چۆنیان دەستوور پێ بدا لەو دەستوورە دەرناکەون و هەرچی پێیان بسپێردرێ بەجێی دێنن.**

وەک دەڵێن و کوتراوە و جێی باوەڕیشە، ئەوانەی وەحیان هێناوەتە لای ڕەسوولان، چاوی کردوون ڕەسوول لە سەر شکڵی ئینسانی، ڕا و بۆچوونی زۆر هەیە لە سەر مەلائـیکە کە چـن و چۆنن لە لایەن عالەمی مەسیح و یەهوود و موسوڵمان و بتپەرەستەکان و فەلاسـیفەکان. هەر یەکەی جۆرێکیان نەزەر داوە، بەڵام ڕاستی و جێی باوەڕتر ئەوەیە کە زانایانی ئیسلام کوتوویانە: مەلائیکە لە نوورن.

## فرشتە چەن دەستەن؟

ژمارەی مەلائیکە زۆر زیـاتر لە مـرۆ و پەریـن. دەبـێ هەر واش بـێ، چـونکە بە پێـی ئەو بیستنەی بیستراوە لە ئایینەوە دەبێ تەکتەکی مرۆ و پەری، مەلائیکەی حافیزیان لە سەر بێ.

بەو پێـیە بە ئەنـدازەی مـرۆ و پەری، مەلائـیکە دەبـێ هەبـێ، خـۆ هەڵگرانـی عەرش و مەئموورانی با و باران و هەور و ئاو و وەحیش هەن و ئـی ڕوح کێشـانیش ئەگەر بـوێرم نـاوی بەرم هەیە، کەوایە دەبێ باوەڕ بە زیادەی مەلائیکە لە مرۆ و پەری دەبێ ببێ.

وهەروا لە مەڕ پلە و پایە بە هەشت بەش دابەش کراون ئەگەرچی لە زانایانی ئیسـلام هەیە فەرمـوویەتی ٢٥ دەسـتەن، بەڵام چـونکە بـێ دەلیلـی نەزەر دراوە بە دڵەوە نانووسـێ. ئیمامـی فەخری ڕازی لە سەر هەشت دەستەی مەلائیکە نەزەری داوە و لە سەر هەر دەستەیەکیشیان ناو و بەڵگە و نیشانەی ڕاناوە. بڕوانە و ئەقڵ و شعوور و ئینساف وەگەڕ خە:

١. دەستەیەکیان هەڵگری عەرشن، خوداش ئاماژەی وەلا فەرمـوون: وَالْمَلَـكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَـا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ ﴿١٧﴾ «حاقە» **فرشتەکان دەچـنە قەراغـان و تەختـی خـودای تـۆ هەڵدەگرن لە سەر سەری خۆیان لەو ڕۆژەدا بە هەشت فرشتە.**

٢. کەڕووبـین: کە ڕێزدارتـرین و نـاودارترینی ئەو دەسـتەن، چـوارن: ١. جبرائیـل: کە مەئمووری گەیاندنی وەحیە لە لایەن خوداوە بە پێغەمبەران. ٢. میکائیل کە مەئمووری بـارانە و

ئاوەدانی زەوی و زار و باغاتە لە لایەن خودای تەعالا. ٣. عیزرائیل کە مەئمووری گیان کێشانە لە لایەن خودای مەزن. ٤. ئیسـرافیل کە مەئمـووری فـووکردن و دەمانـدنی شـەیپووری دنیـا تێکدانە بە ئەمری باری بۆ ئامادە کردنی قیامەت.

٣. دەستەیەکیشـیان فرشـتەکانی بەهەشـتین وەک خـودای مەزن ئامـاژەی وەلا فەرمـوون: جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا وَمَنْ صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ وَالمَلاَئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلاَمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ ﴿٢٤﴾ «رعد» «سەرەنجامی پاک و چاکەکاران بەهەشتی بێ بڕانەوەیە» ئەوانە خۆیان و باب و کاڵیان و ژنان و تۆرەمەیان دەچـنە نـاو بەهەشـت، ئەوانەی خودا پەسەندیشن، دەچنە ژووری باغ و باغاتی بەهەشتی دوور لە نەمان «لە دەوری یەک دەگەڵ یەک بـۆ هەمیشە بە خۆشی و بێ تـرس لە هەر بـارێکەوە بە سـەر دەبەن» فرشـتەکانی بەهەشـتی لە هەر لایەکەوە دەچنە لایان. ﴿٢٣﴾ «فرشتەکانی بەهەشتی بەو بەهەشتیانە دەڵێن:» سڵاوتان لێ بـێ. واتـا هەر لە سـانی ئەمینی و هێمنیدا بن. بە هۆی ئەو خـۆڕاگرییەی لە دنیـادا لە خۆتـان نیشـان دا، هەر پیرۆزتـان بـێ ئەو پاداشە کە دوارۆژی ڕوون و بێ بڕانەوەیە.

٤. دەستەی چوارەمینیان فرشتەکانی دۆزەخن وەک خودای مەزن بە وەسـیلەی ئـایەتی ٣٠ سوورەی «مدثر» ئاماژەی وەلا فەرمووە: عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَـر نۆزدە فرشتەی لە سەرن.

٥. دەستەی پێنجەم فرشتەکانی سەر ئینسانن بە پێی ئیشاڕاتی باریتەعالا لە ئـایەتی: وَهُـوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُم حَفَظَةً حَتَّىَ إِذَا جَـاء أَحَـدَكُمُ الْمَـوْتُ تَوَفَّتْـهُ رُسُـلُنَا وَهُـمْ لاَ يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ «انعام» خودا هەر بۆخۆیەتی دەستەڵاتدار بە سەر عەبدانیـدا، پاسەوانانیشـتان بـۆ سـەرتان بەڕێ دەکا «وەک فرشتە بن» کـاتێ کـاتی مردنیشـتان هـات «فرشـتەی گیـان کێشـانتان» لە ئەنجـامدانی دەستووری خودا درێغی ناکەن و لانادەن.

٦. دەستەی شەشەمین لە فرشتە ئەوانەن کرداری ئینسان دەنووسن. وەک خودا بە هۆی ئەم ئایەتانە ئیشارەی وەلا فەرمووە: وَإِنَّ عَلَـيْكُمْ لَحَـافِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًـا كَاتِبِـينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُـونَ مَـا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ «انفطار» بە تەئکید قەرەوڵ و پاسەوانوو بە سەرەوە دانراوە ﴿١٠﴾ ئەو پاسـەوانانە لای خـودا خاوەن ڕێزن، نووسەری ئاکار و کرداری وەن ﴿١١﴾ هەر کارێکی دەیکەن لێی ئاگادارن ﴿١٢﴾

٧. دەستەی حەوتەمین لە فرشتە، بەڕێوەبەرانی نەزمی دنیان، بە پێی ئیشـاڕاتی فەرمـوودەی باریتەعالا، ئایەتی: وَالصَّافَّاتِ صَفًّا ﴿١﴾ «صافات» سوێند بەوانەی کە بۆ ئەنجـامدانی فەرمـانی بـاری، بە ڕێز و بە ڕیز، پاڵ بەیەک ڕادەوەستن.

٨. هەشتەمین دەستە لە فرشتەکان ئەوانەن: جبرائیل، ئیسـرافیل، میکائیـل، عیزرائیـل. بـۆ

زێدە زانین بچۆ خزمەت ئیمام فەخری ڕازی، ج٢، لاپەڕەی ١٦٢-١٦٣.

**تێڕوانین و لێکۆڵینەوەیەک لە سەر ئەوەی ڕاز و سوڕی ئەوەی:** خودای تەعالا بۆ بە خەلیفە کردنی ئینسان لە سەر زەوی، دەگەڵ فرشتە کەوتە دوان. ئایا مەبەستی مەشوەرەت بوو؟ کە دەگەڵ شەئنی خودا نایەتەوە!؟ یا خەبەر پێدان بوو بۆ وەی خۆ ئامادە کەن بۆ کڕنۆش بردنی ئینسان؟ یان پێیان ڕاگەیێنێ کە ڕادەنێم گیانلەبەرێکی وەک ئینسان بێ لە سەر زەوی، دەشیکەمە خاوەن ئیختیاری ئیرادە واتا جڵەوی کاروباری خۆی دەدەمە دەس خۆی؟

دەبێ بکوترێ لەو بارەوە: ئەگەر خودا لەو دواندنەی مەلائیکە نەزەری پرس و ئاڵوگۆڕی بیروڕا بووبێ، ئەوە بێ گومان وا نییە و ئەقڵ و عیلم وشعوور ڕەدی دەکەنەوە، چونکە ئەقڵ ئەوەی سەلماندووە و باوەڕیەتی، ئەگەر خودا ئیرادە و مەشییەتی خۆی تەنیا نەبێ بەڵکە نیازی بە ڕا و تەگبیری غەیر ببێ، ئەوە بۆ خودا نابێ و ناتەواوە، خۆ دیارە بە یەقینی هەموو هەست و شعوور و ئەقڵ و زانستیش تێگەیشتووە و سەلمێندراوە کە خودا تەواوە و بێ نیازە لە هەموو شت بۆ هەموو شتێکی کە بیهەوێ بیکا و بیهێنێتە دی. جا لە سەر ئەو ئەساسە بۆچوونە: ئەو دواندنەی فرشتە لە لایەن خوداوە لەمەڕ خەلافەتی ئینسان، بۆ پرس و ئاڵوگۆڕی بیروڕا نەبووە. وەهەروا بۆخۆشی خودا فەرموویەتی: فَعَّالٌ لِّمَا يشاءُ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ.

بۆ نەزەری دووهەم و سێهەم: کە ئاگاداری و خەبەردانە بە فرشتە، یا بۆ سوژدە بردنیان بۆ ئینسان پاش ڕوح وەبەرنان، وەیا بۆ وەی بزانن و تێبگەن کە دەخوڵقێنم بوونەوەرێک بە ناوی ئینسان، ئیختیاری خۆی وە خۆی دەدەم، وەک ئێوەی ناخەمە ژێر جەبر، بەڵکە جڵەوی کاروباری دنیای خۆی وەخۆی دەدەم؛ دڵی هەستیار و ئەقڵاوی کە بە هەست و سەلیقەی خۆیدا دەچێتەوە و سەر بە ژووری زانستی خۆی و عەداڵەت و حیکمەتی باریدا دەکا، ئەو نەزەر و بۆچوونەی دوو و سێ کە تێوەخوڕین و ئامادەباشییە بە فرشتە هەم بۆ کڕنۆش بردن بۆ ڕوحی ئینسانی پڕ لە ڕاز و حیکمەت و زانست و بەراوەرد و بە ڕاپەڕ و شایان بۆ ئیختیار و سەربەخۆیی: قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ «بقرة» **فەرمووی خودا: ئەوی من دەیزانم ئێوە ئاگاتان لێ نییە.**

ئەگەر ئێرە بەراوەرد کرێ و هۆشی تێدۆشرێ، مێژۆک دەکرێ لە ژەکی زانین و دەرکی، ڕازی ئینسانی پڕ لە ڕمووز و ئەسرار.

أُوْلَئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ ﴿٧﴾ «بينة» خوداناسانی ئاکارچاک و پاک، باشترین کەس هەر ئەوانن.

أُوْلَئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ «بينة» خودانەناسانی ئاکار ناحەز و ناپاک، خرابترین کەسن.

هۆشت بێ و زەین وەگەڕ خە، ئەو دوو سیفەتە دە شەئنی چیدان بەجوز ئینسان؟ ئەگەر هاتە باز و دەراو، سایەی خودای بێسایەیە، ئەگەر مانی گرت و لاقیشی چەقاند ئەوە سایەی شەیتانە، سایە بە نیسبەتی خودا ڕەحمە و بە نیسبەتی شەیتان، غەزەبە.

## شاهیدی فرشتە لە سەر فەسادکاری ئینسان

لەوەیدا کە فرشتە بەبێ ئەوەی خودا لێیان پرسیار کا: ئایا ئینسانی چۆن دەناسن و بە کاری خەلافەت دێ یا نایە؟ سەربەخۆ لە موقابیل ئاگادارییەکی خودا بەوانی دا لەمەڕ خەلافەتی ئینسانی، کوتیان: ئینسان فەسادچێنی سەر زەوین جگە لەوەش خوێنڕێژن، بە ناحەق؛ دڵ و ئەقڵ هەست بە شتێک دەکەن کە زۆر دوور لە شەئنی فرشتەیە. شتەکەش ئەوەیە: ١. خودا پرسیاری چاکە و خراپەی ئینسانی لێ نەکردوون، کەچی بە خراپ ئینسانی دەناسێنن ٢. ئەوان بێ ئەوەی ئینسان بووبێ لە پێشدا تاکوو بیناسن، چۆن ئەو شناسایان بووە و زانیویانە و وێراویانە بێ بەڵگە و دەلیل لە حزووری خودای خاوەن عیلم و دەستەڵات بیلێن لە دوارۆژی نەترسێن؟ دەگەڵ ئەوەی باریتەعالا شاهیدی لە سەر بێ گوناهی فرشتە داوە. وەک ئەو ئایەتە پیرۆزەی: يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾ «تحريم»؛ واتا: ؟؟؟؟

یا وەک ئایەتی: وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ «انبياء»

واتا: بێباوەڕەکان کوتیان خودا وەلەدی هەیە (کە فرشتەن) نەخێر، خودا بێڕۆڵەیە، و فرشتەش عەبدانی ڕێز گیراون. خودا لەو تۆهمەتانەی کە وەپاڵی دەدەن (خاوەن ڕۆڵەیە) پاکە ﴿٢٦﴾ فرشتە سەربەخۆ شت ناڵێن لە قسە کردنا پێش ناکەون «چونکە» هەر بە پێی فەرمانی خودا دەجوولێنەوە. ﴿٢٧﴾

ورد بڕوانە لە وشەی «لَا يَسْبِقُونَهُ»واتا پێش ناکەون لە قسە کردن و نەزەردان، بەڵکە ئەوەی خودا پێیان نەڵێ و ئەمریان پێ نەدا، نایڵێن و نایکەن. کەوایە دڵ لۆمە ناکرێ لەوەیدا بڵێ: ئەو ڕاپۆرتەی فرشتە دای لە سەر ئینسان، بە خوێنڕێژ و فەسادچێن، خودا دە دڵی هاویشتوون بیلێن، دەنا ئەوان نەیانزانیوە ئینسان خاوەنی ئەو ئاکارە ناڕەوایەیە. بە ﴿لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ﴾ واز

دێنین لە وەدوا کەوتنی ئەو باسە حەواڵە بە ئەقڵی ئیماندارانی دەکەین ئەو قەزاوەتە.

زۆریش لە زانایانی ئایینی نەزەریان وا داوە: فرشتە لە گوفتـار و هەڵوێسـتیاندا ویسـتوویانە ئامادەگی خۆیان ڕانێن بۆ ئیتاعە و فەرمانبەری باری. بۆ زێـدە زانـین و ئیقنـاع بـوون بچـۆ بـۆ خزمەتی ئیمام فەخری ڕازی: تەفسیری کەبیر، ج٢، لاپەڕەی ١٣٦.

## ئینسان خەلیفەی خودایە یا ئی شەیتانە؟

دڵی هەستیار و بەپرسیار دەیهەوێ ئەوە بزانێ و هۆیەکەی: کە بـۆچی ئینسـان لە سـەر ئەو هەموو ئاکار و ڕەوشتە ناحەزانەی خودا لێی هەڵدەدا وەک: عَجـولاً، هَلـوعاً، جـذوعاً، ظَلومـاً، جَهولاً، کەچی خەلافەتی سەر زەوی لە لایەن خودای زانا بە هەوەڵ و ئاخری هەموو شت پـێ بەخشـراوە و هەچی هەشە لەو سەر زەوییە، بەرهەمیەتی بۆ وی خەلق کراوە، وەک لە ئیشاراتی ئایەتی ١٠ ئەعراف و ئـایەتی ١٣ جـاثیە و هەروا جێـی دیـش دەردەکەوێ: وَلَقَـدْ مَكَنَّـاكُمْ فِي الأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ قَلِـيلاً مَّـا تَشْـكُرُونَ ﴿١٠﴾ «اعـراف» **بە تەئکیـد ئـێمە ئێوەمـان لەو زەویەدا نشتەجێ کردەوە، حاوانەوە و بژیویشـمان هەر لەو زەویەدا بـۆ پێـک هێنـاون و بڕیـوەتەوە، کەچـی کەمیشیان شوکرانەی ئەو نیعمەتە دەبژێرن.**

وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّـرُونَ ﴿١٣﴾ «جاثية» **هەچی لە ناو ئاسمان و زەویەکاندا هەن، سەراپا بەرهەمـن بـۆ ئێـوە سـازاون، خـودا بـۆ ئێـوەی ڕام و حەمایەت کردوون، لەوەدا بۆ ئەوانەی خاوەنی ڕامان و بەراوەرد و شعوورن نیشانەی ناسینی خودا زۆرن.**

لەو بارەوە ئەقڵی چالاک و زانسـتی بەزیـبـک و زیـت و پسـپۆڕ زۆر لێـر و لەوێ گەڕان و سەریان بە زۆر کون و کەلێن و کۆلاناندا کرد بەڵـکە بتـوانن بزگوڕێـک و یـا سـەرە هەودایەک وەدۆزن لەو بـارەوە: بـۆ ئینسـان لە سـەر ئەو زەلـووم و جەهـوولیەی کـرایە خەلـیفە لە لایەن خودایەکی عادڵ و عالم و لەکارزان؟ وڵام، سەرەنجام لەوە باشتر نەهاتە دەست: «حیکمەت و ڕازی نهێنی خودا با لەوێ بێ، بۆ بیر تێوەردان نابێ» وەک هەسـت دەکـرێ و ئەقـڵ و زانسـت دەیقۆزێتەوە: هێز و تین و تاوی، بەراوەرد و لێکۆڵینەوە و هەڵسـەنگاندن و مـودیریەتێکی کە دە ناخی ئینسـاندا ئەزەل نـاژتوویەتی و بەیانـات و ڕاگەیانـدنێکی کە دە ئینسـاندا نێـژراوە، ئەوانە هاواری بەگوڕن وەلای ئەوەی هەر ئینسانە دەتوانێ دنیا ئاوەدان کا و ئیدارەی کا و هەر ئینسـانە دەتوانێ بە هۆی ئەو ئەقڵ و زانست و شعوورەی هەیەتی، نهێنییەکانی زەوی و ئاسمان وەدۆزێ و وەدەرنێ، هەر ئینسانە دەتوانێ بە هۆی بەیانـات دنیـای ئینسـان لێـک وەنیزیـک خـا و لێـک

تێگەیێنێ. هەر ئینسانە ڕازاوەتەوە بە نیعمەتی وا کە دە فرشتە و پەری و باقی گیانلەبەراندا چاو ناکرێن. وەک ئەوە: ١. دە ئینساندا نیعمەتی زانست و شعوور سنووردار نییە و نەکراوە، بۆ هەموو دەور و زەمان و مەکان دەبێ، بە پێی نیازی دەتوانێ بە کاری بەرێ و نەفعی لێ وەرگرێ، بەڵام فرشتە زانستی سنوورداره، ئەوەی خودا پێی نەڵێ، نایزانێ و نایکا. زانستەکەی تایبەتی وەخت و زەمانە، بۆ باوەڕی ورد بڕوانە لە ئایەتی: وَمَا مِنَّا إِلَّا لَهُ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ ﴿١٦٤﴾ «صافات» هەریەک لە ئێمە شوێن و جێگەی تایبەتمان بۆ دیاری کراوە. کە لەو پۆستە دیاری کراوە بەولاوە نە دەتوانین نە دەیزانین وەزیفەی تێدا بەڕێوە بەرین. وَإِنَّا لَنَحْنُ الصَّافُّونَ ﴿١٦٥﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ الْمُسَبِّحُونَ ﴿١٦٦﴾ «صافات» ئێمەین «لەو شوێنە دیاری کراوانەدا» بۆ خوداپەرەستی ڕیز دەبەستین، و ئێمەین «لەو شوێنە دیاری کراوانەماندا» قەت لە تاریف و سەنای خودامان ڕاناوەستین.

لەو دوو ئایەتە پیرۆزەدا ئەوە هاتە ڕوو کە فرشتە سەربەخۆ نییە و لەوەی پێی دەکوترێ زیاتر ناتوانێ و نایزانێ.

٢. خەلافەتی ئینسانی دەکرێ جگە لەو هۆیانەی باس کران، ئەوە بێ: ئینسان لەبەر ئەوەی ڕەگەزی لە خاکە، ئەویینداری زۆری دگەڵ خاکە، لە تەوانیدا دەکرێ هەبێ و هەیە، باش بتوانێ ئیدارەی کا و وەیڕازێنێ بۆ حاوانەوە و ژیان بەڵام فرشتە لەبەر ئەوەی لە نووره، زەوقی زۆر دەگەڵ عیبادەت دێ نە دەگەڵ خاکی ڕەش. قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ کافییە بۆ ئیقناع و داسەکنانی ئەقڵ و شعوور و هەست.

دڵ لەو سێ شوێنانەی کە باسی خەلافەتی ئینسانیان تێدا ڕاندراوە هەست بە شتێک دەکا کە وەپشت گوێدان و بازدان بە سەر ئەو شتەدا بۆ دڵ تەحەمول ناکرێ و ناتوانێ خۆی لێ ببوێرێ. سێ شوێنەکانی کە باسی خەلافەتی ئینسانیان تێدایە بریتین لە:

١. ئایەتی ٣٠ بەقەرە: وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً

٢. ئایەتی ٢٦ صاد: يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاك خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ

٣. ئایەتی ٥٥ نور: وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ

ئەو شتەی کە وە پشت گوێدان و خۆ لێ بواردنی بۆ دڵ دەس نادا ئەوەیە: دەبێ ئینسان بۆ بەڕێوەبردنی پۆستی خەلافەتێکی خودا پێی بەخشی سێ ڕەوشت بە تەئکید و بە حەتمی دە خۆدا جێ بکات و بگونجێنێ و سابیتیان کا دەنا هەر ناوی خەلیفەیە ئەگینا خەڵیفی بێ هەنگوینە. سێ سیفەتەکان: ١. دەبێ خۆ لەو سیفەتانەی فرشتە وەپاڵی داوە ودەوور خا:

خوێنڕێژی و فەسادکاری. هەروەک لە ئایەتی ٣٠ بەقەرەدا هەستی پێ دەکرێ ٢. دەبێ سیفەتی عەدالەت و دادوەری دە خۆیدا بگونجێنێ بە عەمەل، هەروەک لە ئایەتی ٢٦ صاددا هەستی پێ دەکرێ. ٣. دەبێ خاوەنی ئیمان و باوەڕی بێ وێڕای عەمەلی سالح و پاک. ئەگەر بێتوو ئەو سیفەتانەی نەبێ هەر خەلیفەیە ئەمما بەبێ شک و گومان خەلیفەی شەیتانە نەک ڕەحمان.

کاتی ئەوەیە کە بچینە خزمەت ئایەتی ٣١ کە وەک تەواوکەری ئایەتی ٣٠ دێتە بەرچاو:

**﴿٣١﴾ وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاء هَـؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ**

**«خودای تەعالا بۆ کەماڵی خەلافەتی ئینسانی» ئامراز و کەرەسەی زانست و «بەراوەرد و بەیاناتی» پێ بەخشی، هەموو ناوێکی فێری حەزرەتی ئادەم کرد پاشان هەموو شتەکانی کە فێری ئادەمی کردن، لە بەرچاوی فرشتەکانی ڕانا و ڕووی تێکردن و پێی فەرموون: ئەگەر ئەوەی ڕاونا، ڕاستی بۆچوون، دە ناوی ئەوانەم بۆ هەڵدەن.**

## مەبەست لە (اسماء) چییە؟

تێڕوانینێکی هەستیارانە لەو ئایەتە پیرۆزەدا: پێشەکی پێویستە ئەوە بزاندرێ کە مەبەست لە (أسماء) چییە؟ ئایا (أسماء) واتا نێوی شت وەک دار و بەرد و شاخ و .. وەیا هەموو شتێک؟ دیارە زانایان ڕا و نەزەری جۆراوجۆریان هەیە لەو بارەوە، هەروەک ئیبنی عەباس دەڵێ: مەبەست لە «أسماء» ئەو ئەلفاز و ناوەن کە بۆ مەبەست و مەتڵەب دانراون و هەر نەتەوە و تیرە و هۆزێک بە زمان و ئادابی خۆی دەیڵێ و ڕایدەگەیێنێ خەڵکی پێ حاڵی دەکا، مەسەلەن «وەرە» واتا وەرە بە کوردی، «بیا» بە فارسی، «تعال» بە عەرەبی، «گێ» بە تورکی. زانینی ئەو نێوانە دە شەئنی ئینساندا کە ئادەمیزادە هەیە و ناژراوە.

ئیمام فەخری ڕازی نەزەری لە سەر «أسماء» ئاوایە: ناو و سیفاتی تایبەتی شتانێکی کە هەن و دێن و دەبن، بە پێی خولی دەور و زەمان. ئینسان نیاز و مەبەستی خۆی بە غەیری خۆی پێ بەیان دەکا، خودا بە ئادەمیزادی بە هۆی پێ بەخشینی هێز و توانای بەیان هەموو ئەو ئاکارەی دایە کە بتوانن لە یەکتر حاڵی کەن لە مەبەست و مەتڵەبێکی هەیانبێ. بۆ زێدە زانین بڕوانە لە تەفسیری کەبیر، ج٢، لاپەڕەی ١٧٦.

دڵی هەستیار دانامەزرێ و وەقرە ناگرێ لە ڕاست شتانێک بۆی دێنە پێشێ و نایانزانێ،

بەڵکە دەیهەوێ ئەوەی نایزانێ بیزانێ بە دەلیلەوە، مەسەلەن نازانێ خودا حەزرەتی ئادەمی چۆن تەعلیم داوە و ڕایهێناوە و ئەو شتانەی فێر کردوون؟ ئایا دەبێ بە هۆی فرشتەی وەک جبرەئیل فێری کردبێ و وەحی بۆ هێنابێ؟ یا بە هۆی هێزی سرشت و فیترەت؛ وەک مێش‌هەنگوین؟ یا هەروەک باقی گیانلەبەران کە بە هۆی هێزی سرشت هەموو مەبەست و ویست و خواستی خۆیان ڕادەنێن و ڕادەگەیێنن؟ یا هەروەک گیاوگۆڵ و دار و دەوەن بە هۆی هێزی سرشت خۆ ڕادەنێن و خۆ دەڕازێننەوە؟ مەسەلەن حەیواناتی ئاوی و ویشکایی و هەوایی بەجوز ئیلهامی سرشتی کێ فێری کردوون لەززەت لێک وەرگرن؟

هەست و شعوور و زانست و ئەقڵی چالاک بە قەناعەتەوە دەڵێن: خودا زانست و دەرک و شعووری شتناسی و شتزانینی دە حەیاتی خاوەن ئەرواحدا ناژتووە و چاندووە، زانین هەوێنی ڕوحە، بەڵام شتانێک هەن کە لە حەوزەی زانستی ڕوح و ئەقڵ و زانستی بەشەری بەدوورە، خودا بە هۆی وەحی وەک پێغەمبەرانی لێ حاڵی کردوون و پێی ڕاگەیاندوون.

دووبارە دڵ و هەستی بزۆز لە جوملەی ﴿إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾دا دەکەونە سەر ئەو هەستەی فرشتە لە ڕووی باریتەعالادا شتێکیان کوتبێ کە ئاماژە وەلای زانست و لیاقەت و شایستەگی خۆیان بێ لە بەشەر باڵاتر، بۆیە باریتەعالا دەفەرموێ لە ڕووی فرشتان: دە پێم ڕاگەیێنن ناوی ئەو شتانە، ئەگەر ڕاست دەکەن و ڕاستن لە داواتاندا.

بەڵێ هێندێک لە زانایان ئەو قەولەیان داوەتە پاڵ فرشتان: مَا اللّٰهُ خالِقٌ أَكْرَمَ عَلَيْهِ مِنّا ولا عِلْمَ: واتا خودای تەعالا مەخلووقی لێهاتووتر و زاناتر لە ئێمەی نەخوڵقاندووە.

وێدەچێ بۆ ڕەفعی ئەو داوایە ﴿إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ بکرێتە مەتاڵ واتا خودای حەکیم پێیان بڵێ دەسا ئەگەر ڕاستن لە داواتاندا، خەبەر لەو شتانە بدەن

دووبارە لە تێهەڵڕوانینی جوملەی ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا﴾ و دەس‌لەجێ بە دوویدا کوتیان ﴿قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا﴾ هەستی ئەوە دەکرێ کە فرشتە بە خەتاچوونی خۆیان هەست پێ کردبێ بۆیە بە زوویی پەنایان بردۆتە بەر ئەو کوتە زێڕینەی: ﴿قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا﴾ واتا خودایە ئەتۆ پاک و بەدووری لە هەر عەیب و هەڵە و ناتەواوییەک، ئێمە هیچ لە هیچ نازانین ئیللا ئەوە نەبێ کە تۆ پێمان دەڵێی و فەرمووتە، هەر ئەتۆی زانا و حەکیم.

کاتی ئەوەی هات کە بچینە خزمەت ئایەتی ۳۲ کە وەک پەنابردن و پاڕانەوەی فرشتەکان

دەچێ لە خودای خاوەن بەزە و ببوور.

**﴿٣٢﴾ قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ**

**فرشتەکان کوتیان ئەی خالقی ئێمە، هەر تۆی لە کەم‌وکووڕی و کەمایەسی بەری و بەدووری، و هەر ئێمەین لەوەی بەدەر کە تۆ پێت کوتووین و فێرت کردووین نایزانین، هەر ئەتۆ بۆخۆت زانا و لەکارزانی.**

## زانا و نەزان

لە تێڕوانین و دۆزین و بەرجەوەندی جوملەی ﴿قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا﴾ ئەو هەستە دەکرێ: خودا فرشتەی وادار کردبێ لە فەسادکاری و خوێنڕێژی ئینسان، بۆیە وێراویانە بلێن: ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء﴾ وهەروا پشتیوانی لەو هەستەش دەکا جوملەی لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾ «تحريم» **خودا چۆنیان پێ ڕاگەیێنێ لێی لانادەن و لێی دەرناچن و هەرچی بەوانی بسپێرێ بەجێی دێنن.**

زۆرێک لە زانایانی قورئان ئەو ئایەتە (٣٢)وەی دەکەنە بەڵگە لە سەر ئەوەی عیلمی غەیب تایبەتی خودایە و خودا ئەگەر بۆخۆی بیهەوێ بە پێی نیازی ڕەسوولان، لە غەیبیان ئاگادار دەکا وەک خودا بۆخۆی فەرموویەتی: عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ارْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ «جن» **خودا زانا بە نادیارانە و نهێنییەکانی خۆی بۆ کەس ئاشکرا ناکا (٢٦) مەگین بۆ ڕەسوولێکی کە پێی ڕازی بێ، ئەوکات لە پێش و پاشیەوە پاسەوانان وەڕێ دەخا بۆ حاڵی‌بوونی.**

کاتێ ناتەوانی و عاجزی فرشتە هاتەوو و قەبووڵیان کرد و لێهاتوویی و شایستەگی ئینسانی بە سبووت گەیی، کاتی ئەوەش هات کە ئینسان بە عەمەل ئەو لێهاتووییەی خۆی بنوێنێ و ڕاینێ، بۆ ئەو خۆنواندنەی ئینسانی دەچینە خزمەت ئایەتی ٣٣ کە دەوەیدا مەتڵەب و ڕاستی بە تەواوی ڕانراون:

**﴿٣٣﴾ قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُمْ بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ**

**«خودای زانا و لەکارزان» فەرمووی: ئەی ئادەم! دەیجا ئەتۆ نێوی هەموو ئەوانەیان بۆ هەڵدە کە پێیان کوتووی. جا وەختێ ئادەم ئەو ناوانەی بۆ هەڵدان و ئەوانیش (فرشتەکان) «بیستیان و**

**سەلماندیان» خودا ڕووی کردە فرشتە و فەرمووی: ئەمن نەمکوت بە ئێوە «لە هەوەڵەوە» هەر ئەمنم نهێنییەکانی ئاسمان وزەوی بە تەواوی هەچی هەبن دەیانزانم وهەرچی ئێوەش دە نا وهەست و ناخی دەروونتاندا وەیشێرن و بیدرکێنن و ئاشکرای کەن دەزانم.**

دڵی پڕ هەستی ئەقڵ و شعوور ئەدێرەدا ڕادەمێنێ و دادەمێنێ، نازانێ و ناوێرێ ڕوو دە کوێ کا و چ بڵێ و چ ڕادێرێ، لەوەی ئادەم ئی خۆی نەبوو ئەو ئاگادارییە و ئەو هێزە سرشتییە، بەڵکە ئی خودای زانا و لەکارزان بوو، دەیجا خودا دەشیتوانی ئەو زانست و لێهاتووییەی بشداتە فرشتە و پەریش وەک دای بە ئینسانی ڕەگەز گڵ، دەشیتوانی بیداتە فرشتە وپەری ڕەگەز نوور و ئاگر. ئەوە تەلەسم و ڕاز و ڕمووزی نهێنی و حەستەم و دوور لە بوردی زانست و ئەقڵ و شعووری ئینسانە. هەر ئەوە بۆ ئینسان ماوەتەوە لەو بوار و بارەدا بڵێ: ئەی پەروەردگارا ڕێت نەداوەتە ئینسانی هەموو شت بزانێ، نەبادا غروور بێ لە جوغزی خوداناسیدا بڕواتە دەر و بڵێ ئەمن خودام. کە واشی کوتووە دەگەڵ کەمزانیش، جا بۆیە دەبێ بڵێ ئینسان: ئەی خودای زانا بە هەوەڵ و ئاخری هەموو شت، هەر شایانی تۆی خودایە، هەموو شت زانین، و هەموو قودرەت و توانین و ڕانان و ڕاگرتنی هەموو کەون و کائینات بە نەزم و نیزام و حاوانەوە و دابین کردنیان ولە سەر ئەو هەموو دەستەڵاتەشت ڕوو لە گاوان و هەژارێک وەرناگێڕی و دەرووی تۆبەت لە گاور و بتپەرەست و نەمردوو و فیرعەونێکیش نابەستی، چۆن ڕۆزی پێغەمبەرێکی دەدەی، ئاواش ڕۆزی کافر و منافقێک دەدەی.

دەبێ ئەوە باوەڕ کەین: ئینسان چەن وردە بە قەوارە و لاوازە، هەزار هێندە بەرزە دە جێدا؛ ڕاستی فەرموو وێژەر:

وَ تَزْعَمُ إِنَّکَ جِرمٌ صَغیرٌ   وَ فیکَ أَنْطَوىٰ الْعالَمِ الأَکْبَرَ

واتە: تۆ وات خەیاڵە بوونەوەرێکی وردی، دە حاڵێکدا عالەمێکی بەرزی.

دڵی بە پرسیار و بزۆز دەیهەوێ بزانێ غەیبی ئاسمانی و زەوی بریتین لە چی؟ دیارە وەک بیسراوە، بەڵگەی قورئانی نییە نهێنییەکانی ئاسمان و زەوی بە ژمارە دیاری کرابن و نهێنی ئاسمان و زەویش زۆر هەن. جا ئێمە لەو بارەوە ئەگەر بڵێین نهێنییەکان ئەوانەن دەبێتە دەستەکوتە و تیری شەوێ واتە ڕەشاوێژ.

هەچەن هێندێک لە زانایان کوتوویانە غەیبی ئاسمان و زەوی ئەوانەن: غەیبی ئاسمان خواردنی ئەو دارەیە کە لە حەوا و ئادەم مەنع کرابوو، خواردیان لە مەقام دەرکران؛ غەیبی

زەویش، کوشتنی هابیلی برای قابیل بوو بە دەستی قابیل.

هێندێکی دیش هەن لە زانایان دەڵێن نهێنی ئاسمان چارەنووسی ئینسانە، خودا لە ئەزەلدا دیاری کردووە. ئی زەویش ئاکار و کرداری ئینسانە. ئەو نەزەرە لەو ئایەتەدا دەرکێشراوە: يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ ﴿٥﴾ «سجده» **«خودای کارزان» هەچی کاروبارە لەو ئاسمان و زەمیندا پێکی دێنێ و لە ماوەی ڕۆژێکدا هەڵیدەکێشێتەوە لای سەروو لای خودا «بێ ئەوەی کەس بزانێ ئەو کارانە چین» کە بە پێی ژمارە ئەو ڕۆژە هەزار ساڵ دەبێ لەو ساڵانەی ئەتۆ دانژمێری. یا نێوانی ئاسمان و زەوی هەزار ساڵە.**

هێندێکی دیش لە زانایان نەزەریان وا داوە: غەیبی ئاسمان واتا ئوموراتی ئاسمانان کە تەنانەت فرشتە کەڕووبەکانیش هەستی پێ ناکەن. غەیبی ئەرزیش چەرخوخولی زەوی بە کەیفیەتێکی وا فرشتەکانیش ڕێی وێ نابەن.

وەک هەموو خاوەن هەست و شعوورێک هەستی بەوەی کردووە، ئەقڵ و شعوور لە دەوری نهێنی چەرخان دەدەن و بە دەوریدا هەڵدەخولێن کە بیزانن، هەموو ئەقڵ و زانستێک بە گوێرەی بەراوەرد و بۆچوونی خۆی هەڵیدەسەنگێنێ، وا هەیە دەیپێکێ وا هەیە لێی بەدوورە. بەرگریش لە ڕاوڕاوێنی غەیری ئەحکامی شەرعی نەکراوە، بەڵام ئەحکاماتی شەرعی چۆنی شاریع ڕاینابێ، وایە. ڕێگای ڕاوڕاوێن نەدراوە، مەسەلەن بۆ تەڵاق بە دەس نێرانە؟ بۆ دە میراتدا نێرێک بەشی دوو مێ دەبا؟ بۆچی تا چوار ژن ڕێ دراوە بۆ نێرێک، بەڵام چوار نێر ڕێ نەدراوە بۆ ژنێک؟ لەوانەشدا گەرچی ڕاز و سوود و حیکمەت جاسووسی داوە، بەڵام ڕاوڕاوێن واتا ئاوا چاتر بوو یا وا خراپە، ڕێ نەدراوە.

ئەقڵ و هەست و شعوور کە لە سەرچاوەی عیلمی سرشتیڕا سەرچاوە دەگرن و دە ئایەتی ٣٣دا باس لە عیلم هاتۆتە گۆڕ، دڵ دەیهەوێ بزانێ ئەو عیلمە کە هۆی ڕێز و ڕێزداری و بەرزایی خاوەنیەتی بە سەر غەیریدا، چییە و پایە و پلەی بەرزایەتی تا چ ڕادەیەکە و تا کوێیە؟ تا ٥ پلە زانست توانیویەتی بژمێرێ:

١. بەرتەری ئینسانی بە سەر غەیری خۆیدا زانستە = عیلم.

٢. زانا توانیویەتی پاپۆڕی ئینسانی لە دەریای جەهالەتدا نەهێڵێ غەرق بێ.

٣. عالم (زانا) خودا شاهیدی لە سەر تەقوا و ترسی داوە وە لە ئایەتی ٢٨ی «فاطر» دەردەکەوێ: وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاء

**إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ. لە ئینسان و جانەوەر و ڕەشەوڵاغیشدا هەروەها تەرز و ڕەنگیان لێک جودایە، و هەروا لە ناو ئینسانانیشدا ئەوانەی زانان (عولەما)، لە خودای خالیقیان دەترسێن، خودا خاوەنی دەستەڵاتە و خەتاپۆشیشە.**

بە ڕوونی لە ئیشاڕاتی ئەو ئایە پیرۆزەدا دەردەکەوێ بەرتەری حەیوانی بە سەر یەکدا بە شکڵ و ڕەنگ و قەوارەیە، بەڵام بەرتەری ئینسانی بە سەر یەکدا بە ئەقڵ و زانست و شعوورە.

٤. هاونشینی و تێکەڵاوی زانایان (عولەما) خاوەنی بەهرەیە، تەوسیەی پێ کراوە وەک چوونی دووکانی عەترفرۆشی وایە، با نەشکڕی، بۆندار دەبی.

٥. زانا (عالم) ڕۆژی ئاسمانی تاریکی جەهالەتە، ئینسان بەرتەری بە سەر فرشتە و پەریدا ئی عیلم و بەیاناتە.

## قورئان شیفای هەموو نەخۆشییەکی دڵی موئمینانە

**ئاوڕێک وەسەر بەڵگەی ئەقڵی لە سەر بەرزی مەقامی عولەما:** زانین بۆ پشتیوانی لە ئەقڵ لە سەر ڕانانی بەرزی مەقامی زانست

دەچینە سەر قورئان کە شیفای هەموو نەخۆشییەکی دڵی موئمینانە: بۆ بەرزی و بەرزایی زانا بە سەر نەزاندا دەچینە خزمەت ئایەتی ٩ «زمر» هێدی هێدی دەیدۆزین: قُلْ هَلْ يَسْتَوِي ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٩﴾ «زمر» ئەی ڕەسووڵ بڵێ ئاخۆ زانا و نەزان وەک یەک و بەرانبەرن؟ ئەو پرسیارە هاوارە وەلای ئەوەی کە زانا و نەزان بۆ خزمەت بە ئینسان و نەجاتی حەق لە دەس ناحەق، و بۆ دۆزینەوەی ڕێگای بەختەوەری، زانا و نەزان وەک یەک نین. زانا تاریکایی جەهل دەقەڵشێ و حەقی لێ وەدەر دەخا، نەزان ڕووناکایی بە چارشێوی ڕەشی نەزانی دادەپۆشێ و حەقێ تێدا ون دەکا.

وهەروا بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە: زانا و نەزان بەرانبەر نین، و بۆ ئیقناع و دامرکانی وەسوەسەی دڵ لەو بارەوە دەچینە خزمەت ئایەتی ٥٩ «نیساء» کە دەوێدا زانا وەدواکەوتنی سفارش کراوە: يَا أَيُّهَا ٱلَّذِينَ آمَنُوا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَأُو۟لِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ «خودا بانگ دەکا **لە خاوەن باوەڕان و دەفەرموێ»: ئەی گەلی خاوەن ئیمان، بە فەرمانی خودا و پێغەمبەری خودا و زانایان و ئەهلی ئیجماعی خۆتان (هاودینتان) بکەن.**

بۆوەی لێم تووڕە نەبن و ڕووم لێ وەرنەگێڕن، لەسەر تەعبیر کردنی (أولی الأمر) بچنە لای ئیمام فەخری ڕازی، ج٩، لە تەفسیرەکەی لاپەڕەی ١٤٤، لە سەر ئایەتی ٥٩ نیساء تووڕەییت

دەگەڵ ئەو بڕێژە.

عیلم = زانست، یەکێکە لە سیفەتەکانی باریتەعالا، بەشی ئینسانیشی لێ داوە، بۆوەی کە بەرز و ڕێزداری ئینسان دەرکەوێ لە هەموو گیانلەبەران، و هەمووشیان بە هۆی ئەو عیلم و زانستە وەحاوێنێ بیخاتە ژێر دەستی خۆی و حەمایەتی کا. بڕوانە ئایەتی ١١ «مجادلە» بۆ ڕاستی ئەو مەتڵەبە: يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ **خودا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ئێوە، و ئەوانەی خاوەنی زانیارین، پلە وپایەیان بەرزتر دەکاتەوە «هەم لە دنیا هەم لە قیامەت» و هەر کارێکی ئێوە بیکەن خودا پێی زانایە.**

ئەدێرەدا چاو دەکرێ ٤ تیرە مەقامیان پێ درابێ لە لایەن خودای تەعالا، پێ بەخشینی ئەو پایە و مەقامەش هۆدارن، بڕوانە و هەست و شعوور وەگەڕ خە، چوار تیرەکان: ١. موئمنین ٢. مجاهدین ٣. ساڵحین ٤. عولەما.

١. بۆ موئمنین بڕوانە لە ئایەتی: أُولَـٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ «انفال» **خاوەن ئیمانی بێ کەموکووڕی ئەوانەن کە لە لایەن پەروەردگاریانەوە پلە و پایە و لێخۆشبوون و بژیوی شایانیان هەیە.**

٢. بۆ موجاهیدین دەچینە خزمەت ئایەتی: فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ دَرَجَاتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾ «نساء» **خودای عادڵ ئەوانەی خەزاچین و دەچنە خەزایە، بەرابەر بەوانەی ناچن لە ماڵێدا خانەنشینن، بە پایە و پلە ڕەسەری خستوون. خودا بە هەموو لایەکیان بەڵێنی داوە کە چاکەیان دەگەڵ کا، بەڵام ئەوانەی لە مەیدانی خەزادا بن بجەنگن دەگەڵ دوژمن، پاداشی گەورەتریان دەداتێ لە چاو خانەنشینەکان. (٩٥) پلە وپایەیێکی زۆر بەرچاو لە لایەن خوداوە دەگەڵ لێخۆشبوون و میهرەبانی «دەگا بە خەزاکاران» خودا بە بەخشش و دڵۆڤانە (٩٦)**

٣. بۆ ساڵحان دەچینە خزمەت ئایەتی: وَمَنْ يَأْتِهِ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ الصَّالِحَاتِ فَأُولَـٰئِكَ لَهُمُ الدَّرَجَاتُ الْعُلَىٰ ﴿٧٥﴾ «طه» **هەرکەس بە ئیمان و ئاکارچاکی بچێتە لای باری، ئەوانە وا هەن دە پلە و پایە بەرزیدا.**

٤. بۆ عولەما (زانایان) دەچینە خزمەت ئایەتی: وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١﴾ «مجادلە» **ئەوانەی کە خاوەنی زانست و زانیارین «بۆ خزمەت بە ئینسان» بەرزتریان دەکاتەوە خودا، بە چەن پلە بە سەر غەیردا، هەرچی ئێوە بیکەن خودا پێی زانایە.**

هەروەها ئایەتی: إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ «فاطر» هەر

**ئەوانەی زانان (عولەما)، لە ناو عەبدانی خودادا لە خودا ترسیان هەیە.**

ئەگەر بە ئینسافەوە سەیری ئەو ئایەتانە بکرێ و هەروا دە عەمەلکەرد و بەهرەی زانایان (عولەما) بە وردی ورد بوونەوە بکرێ جگە لەوەی شاهیدی لە سەربەرزی و بەرزایی زانست دەدرێ بە ئیحتیرامەوە کڕنۆشی بۆ دەبرێ چونکە پلە و پایەی ساڵحیش و موجاهیدیش و موئمنیش هەر لە زانست و زانیارییایە.

وهەروا ئەگەر ئاوڕ وەسەر قورئان بدرێ بە وردی کە سەرچاوەی هەموو زانینێکە، چاو دەکەی کە بە تایبەتی لە ٥ جێدا بەرزی مەقامی عولەمای ڕاناوە: ١. لەمەڕ ئیمان، ٢. لەمەڕ تەوحید ٣. لەمەڕ حوزن و گریان ٤. لەمەڕ خشووع ٥. لەمەڕ تەقوا و ترس. ئاوڕ دە سەر ئایەتەکان:

١. ئیمان: وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُواْ الأَلْبَابِ ﴿٧﴾ «آل عمران» **ئەوانەش کە زۆر زانان دەڵێن: بڕوامان پێی هەیە ...**

٢. تەوحید: شَهِدَ اللّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُواْ الْعِلْمِ قَآئِمَاً بِالْقِسْطِ ﴿١٨﴾ «آل عمران» **خودا خۆی باخەبەرە و فرشتەکانیش و ئەوانەی زانا و بەئینسافن باش دەزانن کە غەیری خودا هیچ کەس شایانی پەرەستن نییە.**

٣. دامان و گریان: إِنَّ الَّذِينَ أُوتُواْ الْعِلْمَ مِن قَبْلِهِ إِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ «اسری» **ئەی ڕەسوول بێژە پێیان: ئێوە بڕواو پێ بێ یا نەبێ، ئەو کەسانەی لە پێشوودا ئاگادار کرابوون لەمە، هەرکات بۆیان دەخوێننەوە ئانیشکیان دەخەنە سەر زەوی و سوژدە دەبەن.**

٤. خشووع: وَيَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ﴿١٠٩﴾ «اسری» **خۆ تخێڵ دەکەن دەمەوڕوو دەگرین، ئەو حاڵەتەیان خۆ بە کەم گریان پتر دەکا و ڕادەنێ.**

٥. ترسان لە خودا: إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ «فاطر» **لە ناو عەبدانی خودا هەر ئەوانەی زۆرتر زانان لێی دەترسن. خودا خۆی خاوەن دەستەڵاتە و خەتاپۆشە.**

ئەگەر بە چاوانی حەقبین و دڵ و ئەقڵی ڕوون و بە ئینسافەوە سەیری ئەو ئایەتە پیرۆزانە بکرێ، دەشسەلمێندرێ و شاهیدیش دەدرێ لە سەر بەرزی و ڕێزداری عولەما لە ناو عالەمی بەشەردا.

دە ئایەتی ٣٣دا خودای تەعالا بە هۆی عیلم، ڕێز و ڕێزداری ئینسانی بە سەر فرشتە و پەری و ... ڕانا و بەیان کرد و دە ئایەتی ٣٤یشدا فرشتە دێنە بواری تەسدیق و قبووڵ کردنی فەرموودەی باریتەعالا، ئیتاعە لە خۆ نیشان دەدە ن وسوژدە بۆ ئادەم دەبەن، نەفس و هەوا و

کوفری شەیتانی وەلادەنێن. بۆ ڕاستی ئەو مەبەستەی و تەئیدی ئەو واقیعیەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ٣٤:

﴿٣٤﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ

**وەبیر خۆتان خەنەوە ئەو کاتەی کە دەستوورمان دایە فرشتە، سوژدە بەرنە بەر ئادەم، سوژدەیان بردە بەر ئادەم بەغەیرەز ئیبلیس، ئیبلیس کە خۆی بە زلتر زانی سەژدەی نەبردە بەر و بەڵکە حەسادەتی نواند.**

**تێڕوانینێک بە وردی:**

## ڕێزی ئینسان بە سەر فرشتە بە هۆی زانستەوە

خوداناسی و عیبادەتی ئینسانی بە هۆی ئەوەی کە لە سەر ئەساسی ئیختیار و بەراوەرد و شعوورە و خاڵی لە جەبر و تۆبزی‌گەرییە، زۆر بەئەرزشترە و پلە و پایەی لە پلە و پایەی خوداناسی فریشتە بەرزترە چونکە عیبادەت و فەرمانبەری فریشتە جەبر و خوداکردە ڕێگای ئیختیار و سەربەخۆیی تێدا نییە.

ئیختیاری ئینسانی بۆ هەڵبژارتنی ڕێگای خوداناسی و عیبادەت ئیمتیازێکی زۆر بەرزە لەمەڕ ئینسانی، و دەڕوانێتە بەرزایی کەڕامەت و شەئنی ئینسانی. خۆ ئەگەر بێتوو بە وەسیلەی ئەو ئیختیارە لانی خوداناسی هەڵگرێ و پەسند کا، بێ‌شک ئەودەم دەکوترێ بەو ئینسانە پێگەیشت و بە قوللەی کەڕامەتی ئینسانی و پێگەیشتوو بە مەقامی عارف و خوداناسی بە واقیعی، چونکە ئەو ئینسانە ٢ میداڵی پڕ بایەخی خوداناسی ستاندووە: ١. ئیمانی ڕووت لە تەقلید واتە دواکەوتنی کوێرکوێرانە ٢. خوداناسی لە سەر ئەساسی ئەقڵ و شعوور و دەلیل و بورهان. جا ئەدێرەدایە کاتێ فرشتە هەستی بەو هەستە پاکەی ئینسانی کرد کەوتە سوژدە و کڕنۆش بۆ ئینسان. وەهەروا ئیبلیسیش کەوتە حەسادەت نواندن سوژدەی نەبرد کەوایە ڕەوایە بڵێین ئایەتی ٣٤ بۆ ڕاست کردنەوە و تەئیدی ئەو ڕاستییەیە: واتە ئینسان بەرزە و خاوەن کەڕامەتە هەر ئەویش دەتوانێ خەلیفەی خودا بێ.

دڵی هەستیار و بەپرسیار لە خۆی پرسیار دەکا و دەڵێ: دەبێ هۆی ئەوەی کە شەیتان سەرپێچی لە ئەمری باری کرد و کڕنۆشی نەبردە بەر ئادم چ بێ و چ بووبێ؟ زانست و شعوور هەست بە چی دەکەن و چ شتێک دەکەنە هۆیەکەی؟ هەر دڵ و ڕاوێژ و هەستی ئەقڵ و شعوور

دەڵێن: ئەو سەرپێچییە و بێ‌ئیتاعەییە بەغەیرەز سەرەڕۆیی و لەخۆبایی و شوێن کەوتنـی هەوا و هەوەس و حەسادەت نەبـێ هیچـی دی نەبـوو. چـونکە بـای هەوا و هەوەس هەڵی‌مسـاندن، ئەوەی دادۆشیە ناو دەروونیان: جا چۆن ئەمنی خوڵقاو لە نووری پاکی ئـاور سـوژدە بەرمە بەر ئادەمێکی خوڵقاو لە خاک و خۆڵ و قوڕێکی بۆگەنی ڕەش؟! ئەو خەیاڵە باتڵ و پووچە بوو بە باعیسی ئەوەی خۆ بە زل بگرێ و سەرپێچی بکا لە فەرمانی باری‌تەعالا و ڕابردووی پڕ خێـر و بێری وەگۆڕێ بە داهاتوویەکی پڕ شەڕ و شۆڕ و ڕووڕەشی.

دڵی هەستیار دەیهەوێ بزانێ شێوەی سوژدە بردنی فرشتە بۆ حەزرەتی ئادەم چـۆن بـووە؟ وەک سوژدە بردنی ئینسان بۆ خودا بووە یا بە شـێوەی ئیتـاعە کـردن و ڕێـز لـێ گرتنـی بـووە؟ وهەروا دڵ دەیهەوێ ئەوەش بزانێ ئەو ئەمـر و فەرمـانی خـودا لەمەڕ سـوژدە بـردن بـۆ ئـادەم شامیلی حاڵی سەراپای فرشتەیە؟ وەیا مەبەستی ژمـارەیەکی تـایبەتییە؟ دیـارە وەک زانـدراوە و چاو کراوە لە قورئان، خودای تەعالا لە زۆر ئایات و سـوورەکانی قورئـان ئامـاژەی وەلای ئەو سوژدەیە کردووە، بۆ نموونە دە سوورەی بەقەرەدا، ئەعرافدا، بەنی ئیسـرائیلدا، کەهف و تاهـا و سـاد. وهەروا وەک هەسـتی پـێ دەکـرێ و دێـتە بەرچـاو لە ئایەتەکـانی قورئـان، ئەو ئەمـرەی باری‌تەعالا لەمەڕ سوژدە بردن بۆ ئادەم، دەبێ پێش سازانی حەزرەتی ئادەم و پێش دەمانی ڕوح لە بەدەنی بووبێ. بڕوانی بە وردی لە ئایەتەکـانی ٧١ و ٧٢ی سـوورەی سـاد، هەسـت دەکـرێ دەواندا، دەستووری خودا بە فرشتە بۆ سوژدە بردن بۆ ئادەم، پێش خەلقی ئادەم بـووبێ، سـەیر کە و دڵ دەیە: إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ ﴿٧٢﴾ **کاتێ خودای تۆ ڕایگەیاند بە فریشتەکان کوتی: خەریکم مـرۆی لە قـوڕ ساز کەم (٧١) کاتێ کەلەشم ساز کرد و بەر یەکم نا، لە ڕوحی خۆم تێ چکاند و تێمدا دەماند، سەژدەی بـۆ بەرن. (٧٢) واتە ئیتاعەی لێ بکەن.**

## تێوەڕامان: سژدەی فرشتە بۆ ئینسان پێش سازانی ئینسان بووە یا پاش سازانی؟

بە پێـی بەراوەرد و هەڵسـەنگاندنی ئەو ئایەتـانە و وێـنەی وان وا هەسـت پـێ دەکـرێ دەستووری سەژدە بردن بۆ ئادەم پێش دەماندنی ڕوح دە لەشدا بێ و حەتتا پێش خوڵقانی ئادەم بووبێ بەو پێیە دەبێ بکوترێ دەستووری خودا بە فرشتە بۆ سەژدە بردنی بەر ئادەم پێش سازانی ئادەم و ڕوح وەبەرنانی بووە، بەڵام لە بەرجەوەندی و هەڵسـەنگاندنی ئـایەتی ٣٤ی بەقەڕە وەک دەردەکەوێ لە ئایەتەکانی ٧١ و ٧٢ی سوورەی साददا ئاوا دەرناکەوێ، بەڵـکە بە پـێچەوانە، واتە

دە ئایەتی ٣٤دا ئاوا دەرک دەکرێ: خودای تەعالا ئادەمی دروست کرد و ڕوحی خستە بەری و ڕاینا لە بەرچاوی فریشتە، ئامازیش کرد و لێهاتوویی و بەرزی ئادەمی نواند، جا ئەوجار دەستووری دا بە فرشتەکان سوژدەی بۆ بەرن، ئەو مانایە لە سیما و دەروونی ئایەتی ٣٤دا ڕوون و ئاشکرایە. بەو پێیە لە نێوان ئایەتەکانی ٧١ و ٧٢ی سووڕەی ساد و لە نێوان ئایەتی ٣٤ی سووڕەی بەقەرەدا ناکۆکی و دژایەتی مانا هەیە و هەست دەکرێ. خۆ دیارە و حاشاش ناکرێ کە لە نێوان ئایەتەکانی قوڕئان دژایەتی نییە و نابێ هەبێ، چونکە دژایەتی ئایەتەکانی قورئان دەگەڵ شەئنی قورئان و بەلاغەت و ئیعجازی قورئان نایەتەوە.

کەوایە بۆ نەجات لەو گومان و وەهمە واتا بەرائەتی ئایەتەکانی قورئان لە دژایەتی دەگەڵ یەکتر دەبێ تێکۆشین مانای ئایەتەکان بەو جۆرەی کە هەیە بیزانین، جا بۆیە دەبێ مانای ئایەتەکانی ٧١ و ٧٢ی سووڕەی ساد ئاوا بەراوەرد کەین: کاتێ خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم ئیرادەی کرد و ویستی مرۆ دروس کا و بیهێنێتە دی، ئەو ئیرادە و ویستەی خۆی بە فرشتەکان ڕاگەیاند و خستیە ڕوو، لەبەر ئەوەی ناپرسییان پێ بکا، بیکەم یا نەیکەم. وەیا نەزەروو چییە لەو بارەوە؟ بەڵکە بۆ وەی ئاگادار بن فرشتە لەو هەڵوێستەی خودا و ئیتاعەش بکەن لە دەستوور. لەسەر ئەو ئەساسە خودا فەرمووی بە فرشتە: کاتێ ئادەمم خولْقاند و ڕوحی خۆم تێ دەماند و خستمە ناوی، ئەودەم سەژدەی بەرنێ، واتە ئیتاعەی بکەن. شعوور وەگەڕ خە و زەین دەیە ئایەتی ٧٢ی ساد هەمان ئەو مانایە بە دروستی هەستی لێ دەکرێ و خۆی دەنوێنێ.

لەو بارەوە: ئایا فرشتە سەراپایان شامیلی ئەو ئەمر و دەستوورەن یان نا، مشتومڕی زانایان هەست پێ دەکرێ. بەڵام ئەوەی ڕاستە و دڵ بە ڕەوای دەزانێ و پەسەندی دەکا ئەوەیە: هەموو فرشتە وەبەر ئەو دەستووره کەوتوون واتە سەژدە بەرنە بەر ئادەم بە پێی فەرموودەی ئایەتی ٧٣ «ص»: فَسَجَدَ الْمَلَائِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ **گشت فرشتە سەجدەیان برد.**

## شەیتان فرشتەیە یان پەری؟

دڵی پڕ لە هەست و بەپرسیار دەیهەوێ بزانێ: شەیتان فرشتەیە؟ یا پەرییە؟ چییە؟ لەو بارەوە ڕا و بۆچوونی زانایان زۆرە، هەروەک لە سەر زۆر شتان زانایان ڕا و بۆچوونیان جۆراوجۆر دەردەبڕن.

قورئان ڕاستەوخۆ و بە ڕەوانی نەیفەرمووە: ئیبلیس فریشتەیە، یا پەرییە وەیا چییە؟ و ئەوەی پشتی پێ دەبەسترێ و دڵ بایخی پێ دەدا، هەڵسەنگاندنی ئایەتەکانە. مەسەلەن لە سەر

ئەساسی ئاماژەی قورئان، زۆربەی تەفسیرزانەکان دەڵێن: ئیبلیس لە فرشتەیە، بەڵام بە هۆی سەرپێچی لە ئەمری باری دەرکراوە و جیا کراوەتەوە لە چینی فرشتە. بۆ ڕاستی ئەو نەزەرە بڕوانە لە تەفسیری «قرطبی» ج١، لاپەڕەی ٢٩٤.

هێندێکیش نەزەریان وا داوە ئیبلیس واتە شەیتان لە ڕەگەزی پەریانە، بۆ ڕاستی ئەو نەزەرەش بڕوانە لە تەفسیری کەبیر، ج٢، لاپەڕەی ٢١٢.

هەروا پشت ئەستووری خاوەنی ئەو نەزەرە واتە شەیتان لە ڕەگەزی پەریانە، ئایەتی ٥٠ سوورەی کەهف: فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ واتە ئەوکات بە **فرشتەکانمان کوت: سەژدە بەرنە بەر ئادەم، سەژدەیان برد بێ لە ئیبلیس. چونکە ئەو لە پەریان بوو سەرپێچی کرد لە دەستووری باری.**

قۆڵێکی دیکەش لە زانایان دەڵێن: ئیبلیس لە گیاندارانی لای سەروون لە ڕەگەزی فرشتەشن، بەو تەفاوەتەوە فرشتە چاو ناکرێن. دیارە ئەو جۆرە فرشتەش پێیان دەکوترێ مەلەک، هەروا پێشیان دەکوترێ جن، چونکە ونن لە بەرچاوان. گەرچی ئیبنی ئیسحاق بەوەی ڕازییە کە شەیتان لە ڕەگەزی فرشتە بێ.

با ئەوەش حاشار نەدەین و نەیخەینە پاش گوێ: ئەگەر شەیتان لە چینی فرشتە بێ، فرشتە بە پێی ئایاتی قورئان گوناە ناکەن، ئەدی چۆن دەکرێ شەیتان لە فرشتەش بێ و گوناهیشی کردبێ؛ ئەوە ڕاستەوخۆ دەبێتە خیلافی ئایەت. دەبێ بۆ وەڵامی ئەو شتە بڕوانینە نەزەری «ابن معین» کە یەکێکە لە زانایانی ئاینی کە فەرموویەتی: فرشتە هەن گوناە بکەن، هەچەن ئەقڵ و ئیمان ئەو نەزەرە ناقۆزنەوە و بە ڕەوای نازانن. لە بەر فەرموودەی سەریحی قورئان: لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ ﴿٦﴾ «تحریم» **واتە فرشتە لە ئەمری باری لانادەن.**

دڵ بە پێویستی دەزانێ ئاوڕێکی وەسەر «پەری» وەدا چونکە ئەویش بەشێکە لە عالەمی نهێنی.

«پەری»ش دروست کراوی خودای تەعالان هەروەک هەچی هەیە سازاوی دەستی خودایە. بەڵام پەری چاو ناکرێن مەگەر بە هەڵکەوت، هەروەک فرشتە چاو ناکرێن مەگەر بە هەڵکەوت بۆ پێغەمبەران.

بە پێی ئیشاراتی قورئانی، پەری چاکیشیان هەیە، خراپیشیان هەیە. زەین دە ئایەتی ١١ سوورەی جن: وَأَنَّا مِنَّا الصَّالِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ كُنَّا طَرَائِقَ قِدَدًا. **لە ناو مەشدا چاک هەن و خراپ و**

**ناساڵحیش هەن. ئێمە ڕێگەمان زۆر وەبەر خۆ داون.** دیارە لە ئیشاڕاتی ئەو ئایەتە ئەوە هەست پێ دەکرێ کە خراپەکانی پەری واتە جن، پێیان بکوترێ شەیتان.

فرشتە: هێندێک لە قورئانزانەکان وەک شێخ محەمەد عەبدە نەزەریان وا داوە: هەریەک لە فرشتە تەرخان کراوە بۆ کارێکی تایبەتی. نەک ئەوە بڵێی فرشتە هەموو کارێکی لە دەس دێ. بۆ نموونە هێندێک لە فرشتە تەنیا مەئموریەتی ڕواندنی گژ و گیاوگۆڵ و دار و دەوەنی پێ سپێردراوە. وهەروا هێندێکیش چاوەدێری ئینسان و منداڵ و پاڵی پێ سپێدراوە. بە کوردی و بە کورتی، ڕوان و شینبوونی گژوگیا و دار و دەوەن بە هۆی تین و هێزێکی تایبەتی واتە حەیاتێکی هەست و حیسی، پێی دەکوترێ سرشت فرشتە ـ وەیا فرشتە سرشت ـ یانی ئەزەل چۆنی دە بەر یەک نابێ، وا دێتە ڕوو ئەو جەریاناتە پێی دەکوترێ: فرشتەئاسایی. ڕوون و ئاشکراتر بڵێین: دانەوێڵە بۆخۆی لە ئەزەلدا ئەو هێزەی دراوەتێ کاتی خۆی زەوی بقەڵشێ و بڕوێ. گوڵی سوور و زەرد و کەسک و جوان و بۆندار، تەرز و بۆن و ڕەنگی تایبەتی خۆیان لە ئەزەلدا پێ بەخشراوە و بۆخۆی لە ناو هەستی خۆیدا ئەو کەیفیەتە پێکبێنێ بەبێ دەسکاری غەیر؛ بەو هێز و گوڕ و تینە دەکوترێ سرشت ـ فرشتە یا هێزی سرشت. کورت بڵێین: ڕەبی خاوەن حیکمەت هەچی ڕایناوە و ڕۆیناوە هێزی حەیاتی خۆ ئیدارە کردنی دەپاڵ ناوە. ئەمما ئەو هێزە دە ئینساندا لە سەرووی هەموو هێزانە، هەر بۆیەشە سەروەری و سەرداری بوونەوەری پێ بەخشراوە و کائیناتی زەوی داگیر کردووە.

دڵ دەیهەوێ بزانێ پاشی سەژدە بردنی فرشتە بۆ ئادم، ئادەم ئەوکاتە لە کوێ بووە، لە سەر زەوی بووە یا لە شوێنی دی؟ بە زاهیری خودا لەو بارەوە واتە ئەو کاتە ئادەم لە کوێ بووە نەدواوە، جا خۆ ئەوەش ڕوونە ئەگەر خودا ئینسانی زانا نەکا لەو بەسەرهاتانە، نازاندرێن چونکە ئەو سەردەمی ئەگەرچی ئینسان بەو ڕادەیەی نەبووە بتوانێ ژیان و چۆنیەتی خۆی زەخیرە کا و بینووسێ و دەست و قەڵەمیش نەیهێناوەتێ بەسەرهاتی خۆی پێ تۆمار کا، کەوابێ دەبێ لەو بارەوە ورد بڕواندرێتە ئایەتەکانی قورئان ئاخۆ هیچ ئاماژەیەکیان لەوبارەوە خستۆتە ڕوو؟ ئێستاش دەچینە خزمەتی ئایەتی ٣٥، بێگومان خودای تەعالا ڕوونی کردۆتەوە ئادەم پاشی سەژدە بۆ بردنی، چی بە سەر دێ و لە کوێ بووە؟

﴿٣٥﴾ وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلاَ مِنْهَا رَغَداً حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَـذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الْظَّالِمِينَ

**کوتمان ئەی ئادەم خۆت و حەوای ژنت دانیشن لەو بەهەشتەدا و لە هەمـوو خـواردەمەنییەکی ئەو بەهەشتە بخـۆن بە تێروتەسـەلی، لە هەمـوو شـوێنێک کە خۆتـان حەز دەکەن، و نیزیکـی مەکەن لەو دارە کە خودا بۆی دەس نیشان کردوون تا لە ستەمکاران نەژمێردرێن.**

ئەوجار شەیتان هەڵیکەندن لە بەهەشت بە هۆی ئەو دارەوە کە لێیان خوارد و فەرمـانەکەی خودایان شکاند. خوداش بە تۆڵەی ئەو نافەرمانەتییەیان وەدەری هێنان لەو خۆش گـوزەرانییەی کە تێیدا بوون.

ئاوڕێک وەسەر ئاداب و باوی عیلمی نەحو: دیارە لە سەر ئادابی عیلمی نەحو، ئەو ئایەتە دەگەڕێتەوە سەر ئـایەتی ٣٤ واتە ﴿وَإِذْ قُلْنَـا لِلْمَلاَئِكَـةِ﴾ و واژەی (إذ) دەوێـدا شـاردراوەتەوە. ئەودەم ماناکەی ئـاوا تەعبیـر دەکـرێ: ئەی محەمـمەدﷺ، وەیـادت خەوە ئەوکـات و سـاتەی کوتمان بە ئادەم، خۆت و ژنەکەت لەو بەهەشتەدا نیشتەجێ بن و بشخۆن چی واز دێـنن بەڵام تخوونی ئەو دارە مەبن.

دڵی هەستیار ئارەزوویەتی و دەیهەوێ لەو بەهەشـتە حـاڵی بـێ کە ئـادەم و حەوای تێیـدا نیشتەجێ کرابوون و هەروا دەشیهەوێ بزانێ لە کوێیە و تا چ زەمانێک دەوێدا دەبن؟ ئایا ئادەم و حەووا تازە نامرن و لێی ناچنە دەرێ؟

بۆ وەڵامـی ئەو پرسـیارە پـڕ لە هەسـتانە دەبـێ ڕوو دە دەرگـای قورئانزنـانن و حەکـیم و عاریفان کەین.

«ابومنصـور ماتریـدی» فەرمـوویەتی: مەبەس لەو بەهەشـتە بـاخ و باخـاتێکی پـڕ دار و میوەجاتی سەرزەوییە کە ئادەم و حەووا لەوێ یـا لە نزیکـی وێـوە هـاتوونەتە دنیـاوە. نەک ئەو بەهەشتەیە کە جێی پاداش و تۆڵەی پاکان و ناپاکانە لە ڕۆژی دواییدا.

وەهەروا «ابوالقاسم بەلخی» و «ابومسلم اصفهانی» نەزەریان وایە ئەو بەهەشتەی کە ئـادەم و حەووای تێ خراون لە سەر زەوی بووە و بە ئیشارەی ﴿إهْبطوا﴾ واتە دابەزن، لە شوێنێک بـۆ شوێنێک، بۆ سەر زەوی دەگونجێ و دەبێ. کەوایە دەتوانین بڵێین ئەو بەهەشتە لە زەویدا بـووە، سەرزەوییەش جێی تاقی کردنەوە بووە، چونکە ئەگەر بەهەشتی واقعی بایە واتە بەهەشتی تـۆڵە و پاداشی عەمەل بوایە، دەبا ئادەم و حەووا بۆ هەمیشە دەوێدا بان و هیچ شتێکیشیان لـێ مەنـع نەکرابا و دەریش‌نەکرابان وەک قورئان فەرمـوویەتی: وَمَا هُـم مِّنْهَـا بِمُخْـرَجِينَ ﴿٤٨﴾ «حجر» واتـا **خاریج‌بوونیان نییە لە بەهەشتیدا.**

جگە لەوەش شەیتان کە بە هۆی سەرپێچی لە فەرمانی خودا لە چوونە ناو بەهەشت مەنع کرا، پاشان چۆن توانیویەتی بچێتە ناو بەهەشت و ئادەم هەڵخەڵەتێنێ و فریوی دا، چونکە لە بەهەشتدا ئەو شتانە نین لە بەر ئەوەی بەهەشت شوێنێکی ئەمن و ئەمان و لێ حەسانەوەیە و هەروا جگە لەوەش ئەنعامی بەهەشتی واقعی دوایی نییە بە پێی ئاماژەی قورئان: ﴿تُـؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا﴾ ﴿٢٥﴾ «ابراهیم» **واتا دەخۆن لە ئەنعامی بەهەشت هەموو کات و سات بە ئیزنی باری.** گشتی ئەوانە هاوارن وەلای ئەوەی ئەو بەهەشتەی ئادەم و حەووای تێ خراون بەهەشتی واقعی نەبووە.

وهەروا ئایەتی ١٠٨ی هود، تەئیدی ئەوەی دەکا ئەو بەهەشتی ئادەم و حەووا بەهەشتی دایمی نەبووە: ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِي الْجَنَّـةِ خَـالِدِينَ فِيهَـا﴾ **ئەوانەی کە چوونە ناو بەهەشت بە یەکجاری لە ناو ئەو بەهەشتە یەکجارییە دەمێننەوە.**

بێجگە لەوانەش بە تەئکید دەتواندرێ بکوترێ: ئەو بەهەشتەی ئادەم و حەووای تێ هاوێژرا، بەهەشتی ئازمایشی بووە ولەو سەرزەویشە بووە، بەو دەلیلە: ئادەم لە خاک سازاوە لەو سەرزەوییە و هەر وا لە قورئانیشدا ئاماژە وەلای ئەوەی نەکراوە: ئادەمیان پاش سازان و دەبەر یەکنان بەرز کردۆتەوە وەلای ئاسمان، تاکوو بتواندرێ بکوترێ بەهەشتی ئادەم لە ئاسمانان بووە. دەگەڵ ئەوەی خودا بە سەراحەت و ڕاستەوخۆ دەفەرموێ: ﴿اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾ **واتە نیشتەجێ بە ئەتۆ و خێزانت لەو جەننەتەدا.** دیارە ئەگەر بێتوو بە ئینسافەوە سرنج بدرێ هەستی ئەوەی دەکرێ: ئیشاراتی ئەو ئایەتانە تەئیدی نەزەری «ابو القاسم بەلخی» و «ابومسلم اصفهانی» دەکەن کە فەرموویانە: بەهەشتی ئادەم و حەووا کە جێی تاقی کردنەوەی ئادەم بووە لەو سەرزەوییە بووە.

جا لەبەر ئەوەی خودای تەعالا مەوزووعەکەی هەڵنەبڕیوە بە لایەکدا ڕێگای نەزەر و بۆچوونی زانایان ئاواڵەیە، بۆیە ئاغای «جبّایی» کە یەکێکە لە زانایانی ئایینی فەرموویەتی ئەو بەهەشتەی ئادەم و حەووای تێ خرا و تاقی کراوە لە ئاسمانانە، بەو دەلیلە کە خودای تەعالا پاش ئەوەی ئادەم خلیسکی برد و بێ ئەمری خودای لێ دەرکەوت لە تۆڵەدا خودا پێی کوت: ﴿اهْبِطُواْ منها﴾ واتە دابەزە وەرە خوار لەو پلە و پایە. دیارە ئەو دەستوورە ئەوە نیشان دەدا کە دابەزین لە بەرزایی کە ئاسمانە بۆ نزمایی کە زەوییە.

بەهەر حاڵ هەرکام لەو نەزەرانە قبووڵ کرێ خەتا و تاوان ناگەیێنێ، چونکە ئەوە ئەحکامی

شەرعی نین بەڵکە ڕاپۆرتێکی مێژوویین.

بە کوردی و بە کورتی، بە پێی ئیشاراتی قورئان و هەڵسەنگندنی چۆنیەتی جەریان، ئەقڵ و شعوور دەکەونە ئەو بوارە، ئەو بەهەشتە بۆ تاقی کردنەوەیە لە سەر زەوی بووە. بڕوانە تەفسیری کەبیر، ج ٣ و ٤، لاپەڕەی ٣ـ٤، ئەگەر حەزت لێیە و حەوسەلەت هەیە.

دڵ حەزی لەوەیە بزانێ شەیتانی حەسوود دە بەرابەر ئەو نیعمەتەی خودا بەخشی بە ئادەم و حەووا، واتە نیشتەجێ بوونیان لە بەهەشتی ڕازاوە بە نیعمەت، چ هەڵوێستێک دەگرێ جگە لەوەی سەژدەی ناباتە بەرێ تووشی داو و تەڵەی دەکا یا نا؟ ئەو حەسادەتێ دەکا یا ناکا؟ جا بۆ ئەو مەبەستە پڕ لە هەستە دەچینە خزمەت ئایەتی ٣٦:

﴿٣٦﴾ **فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا اهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ**

**شەیتان زەلەلەی کرد بە ئادەم و حەووا، واتە هەڵیخەڵەتاندن و «بە هۆی ئەو دارەوە کە دەرخواردی دان و فەرمانی خودای پێ شکاندن» وەدەری هێنان لەو خۆش گوزەرانییەی کە تێیدا بوون و «خودا دەفەرموێ» کوتمان بە ئادەم و حەووا و شەیتان بچنە خوارەوە بۆ سەر زەوی، ئیش کردن و هەوڵدان و بۆ دوژمنایەتی دەگەڵ شەیتان و نەوەکانی. واتە هێندێکتان دوژمن دەبن دەگەڵ هێندێکتان. هەروا ئێوە لە سەرزەوی دەمێننەوە و بەهرەمەند دەبن تا ماوەیەک کە ماوەی ژیانی هەموو ئادەمییێکە.**

## دابەزینی ئادەم بۆ سەر زەوی خەتایە یان ڕاز و سوڕە؟

تێڕوانینێکی ورد و بەرجەوەندانە لەو بەسەرهاتە تاڵ و پڕ نەدامەتی ڕازدارە:

دڵی پڕ لە هەست و سڵ ئاوا هەست دەکا: خودا بۆ یەکەم جار ئادەمی لە سەر زەوی دروست کرد تاکوو ئادەم و نەوە و نەتیجەکانی ببن بە جێنشین تێیدا، جا ئەدێرەدایە کە دەبێ تێبگەین و قەبووڵی کەین جێنشینی ئادەم و تۆرەمەی لە سەر زەوی مەبەستێکی تایبەتی و ڕازێکی گەورەی دە بندایە نابێ وا بیر بکرێتەوە ئەو دابەزینە بۆ ئەو سەر زەوییە بە تۆڵەی گوناە و خەتایانە.

و دەشبێ ئەوە بزانین بەهەشتی ڕاستە، چاکان وپاکان نەبێ کەسی دی ڕێگای نییە بچێتە ناوی، کەوایە چۆن دەبێ باوەڕ بەوەی بکەین: شەیتانی تاوان لە مل بۆ لە خشتە بردنی ئادەم چۆتە ناو بەهەشت.

وهەروا جگە لەوەش بەهەشتی ڕاستەقینە جێگای خۆشـی و ڕابـواردنە، جێگـای تەکلیـف نییە، کەوایە خودا چۆن تەکلیفمان لێ دەکات بە نەخواردنی داری تایبەتی؟

وەهەروا ئەو بەهەشتەی کە پاداشی چاکان و پاکـانە، بەرگـری کردنـی لە هـیچ خۆشـی و لەززەتێکی تێدا ڕوو نادا کەواتە چۆن ئادەم و حەووای تێدا جڵەوگیری دەکرێ لە خواردن!؟

دڵ ڕادەمێنێ و دادەمێنێ بۆ وەی بزانێ دژمنایەتی شەیتانی دەگەڵ ئینسانی لە سـەر چیـیە؟ ئەگەر لە سەر حەسادەتی شەیتانە لەمەڕ ڕێزگرتنی ئادەم لە لایەن خوداوە شەیتان دەینوێنێ، ئەو هەموو ئینسانە بە ئادەم چی؟ و هەروا دژمنایەتی ئینسان دەگەڵ ئینسان لە سەر چی؟

دڵ هەر بۆخۆی بۆ تەسکینی خۆی ئاوا خۆ قانیع دەکا: ئەو شەیتانەی ئادەمی بە تەفرە بـرد و خلیسکاندی، ئەوە دوژمنی ئینسانی نییە و ئینسانی بە گژ ئینسانیدا ناکا، بەڵکە ئەوەی دژمنـی ئینسانە و ئینسانی بە گژ یەکدا دەکا، ئارەزوو و نەفس و هەوا و دنیا پەرەستییە، خۆ دیارە ئارەزوو و نەفس و هەواش دە هەموو ئینسانێکدا هەیە و نێژراوە.

و دەشتوانین بۆ خۆ پارازتنمان لە لۆمە و تانە و پلاری پلارهاوێژان خۆ بەدوور بگرین یانی پێمان نەکوترێ: ئەو شەیتانەی کە دوژمنی ئینسانە بە گشتی، هەر هەمان شـەیتانە کە ئـادەمی بە تەفرە برد. دەکرێ بڵێین ئەوەی ئادەم و حەوای هەڵخلیسکاند هەمان نەفس و هەوا و جەهلی بە عاقیبەتی کار بوو کە بە شەیتان ناوی برا. ئەو نەفس و هەوایەش دەگەڵ هەچـی ئینسـانە هەیە، چونکە بەشێک لە ئینسان نەفس و هەوایە، هۆی مل‌بەملەش هەر هەمان نەفس و هەوایە.

وهەروا بە پێی ئاماژەی ئایەتەکە ئەوە هەست پێ دەکرێ: ناکۆکی نێوان ئینسان تـا کـاتێ لە سەر زەوییە ﴿الی حین﴾ ئاخری ئایەتەکە ئاماژەیە وەلای ئەو مەبەستە. بۆ زێدە زانین بچۆ بۆ لای تەفسیری کەبیر، ج٣-۴، لاپەڕەی ١۶-١٨.

لە تێڕوانین و هەڵسەنگاندنی ﴿فَأَزَلَّهُمَا﴾ هەست بەوەی دەکرێ: تـاوان و خەتـای ئـادەم و حەووا عەمدەن نەبووبێ. بەڵکە لە ڕووی سـەهو بـێ، ئاگـایی بە عـاقیبەتی نەبـووبێ، چـونکە ئەگەر عەمـدەن بوویـا، خـودا لە بـاتی ﴿فَأَزَلَّهُمَـا﴾ دەیفەرمـوو (ارتکبهمـا) خـۆ دیاریشـە و سەلمێندراوە بۆ حاشا نابێ هەموو کارێکی چاک یا خراپ کە سـەواب بگـرێ یـا سـزا بگـرێ، دەبێ لە سەر ئەساسی نیەت و باوەڕ و زانست بە عاقیبەتی بێ و بکرێ. دەنا هەوا و هەوتی پـێ دەکوترێ هیچ وەخۆ ناگرێ. بەڵام ئەوەندە هەیە کاتێ هاتیەوە سەر حـاڵ و زانیـت ئەو کـارە بە پێچەوانەی ئەمری خودا و شەرعی خودایە، دەستەولەجێ تۆبەی دەبێ بکرێ و بـادانەوەی وەلا

نەکرێ. بێ هەڵەی ئادەم و حەوواش ئەو حاڵەتە دەبەر دەگرێ.

دڵی ژیر و هەستیار وا هەست پێ دەکا: ئەو ناکۆکی و ملبەملەی لە نێوان ئینساندا هەیە و هەر دەشبێ، لە سەر ژیان و سامان بێ، نەک لە سەر کوفر و ئیمان واتە حەق و باتڵ. بەو دەلیلە ئایەتی : ﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ﴾ و هەروا ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ﴾ ئەوەی پشتڕاست دەکەنەوە: هەرا و هاوار لە سەر ژیان و سامانە، نەک لە سەر کوفر و ئیمان.

حەزرەتی ئادەم و حەووا بە پێی شعوور و هەستێکی کە بوویان، دەوەی گەیشتبوون کە دڵ ئارامی و حەسانەوە بە ئیمان و پاڵدانەوە وە خوداوە، بەڵام ئەگەر بە توندی لە هەموو بار و بواری ژیانەوە پاڵ وە خودا نەدرێ، هەوا و هەوەس و خۆشەویستی دنیا لە خودا و ئیمانت دەکا.

دڵی هەستیار و بە بەراوەرد ڕادەمێنێ و دادەمێنێ لە سەر ئەو سوڕ و ڕازەی: خودا بۆ دەبێ شەیتانی بە گژ ئینسانی خەلیفەی خۆی وەنابێ، خۆ ئەوە یەقینە و حاشایلێ ناکرێ: خودای زانا بە هەوەڵ و ئاخری هەموو شت و زانا بە زاهیر و نهێنی هەموو کاروبارێک، زانیویەتی ئینسانی وا لاواز و بێهێز و نەزان و سەرەڕۆ بەرگەی شەیتانی بەهێز و تەڕدەست و کەڵەکباز ناگرێ، کەوابێ دەبێ چۆنی هەڵسەنگێنێ ئەو جەریانە: هەتا ئینسان هەبێ، دەبێ ئەو شەیتانە دوژمنەشی هەبێ؟

ئەگەر بوێرم بڵێم و خۆ باوێمە بن پەناهی بەزەی خودا، دەڵێم: ئەو تاقی کردنەوەی ئینسانی، سەرەڕای ئەو هەموو جەهل و سەرەڕۆییەی ئینسانی هەیەتی، دەگەڵ ئەو هەموو دنیا خۆشەویستییە و نەزانی بە عاقیبەتی کار، داو و تەڵەیە بۆی داندراوە. مەگەر زۆر لێهاتوو و چالاک و پتەو و توندوتۆڵ و لێبڕدوو بێ دەنا بێگومان دە داوی شەیتانی واتە هەوا و هەواس دەکەوێ و دەرناچێ و قوتاری نابێ.

با ئەوەش بڵێین و بیزانین ئەو شەیتانەی مەشهوورە و ناو دەبرێ بە شەیتان، ئەوە ناوێرێتە ئینسانی ژیر و ئاقڵ و خاوەن هەستی ئیمان، بەڵکە دەبێ بڵێین ئەوەی ئینسان لە حەق وەدوور دەخا و تلاسای دەکا، نەزانی و لاساری و دواکەوتنی نەفس و هەوا و ئارەزوویە، هەرکاتێ ئینسان هەستی بە هەڵەی خۆی کرد، دەگەڕێتەوە بەرەو تۆبە و پەشیمان بوونەوە، بێگومان ئەو گەڕانەوە و تۆبە کردنە دەلیل و نیشانەیە لە سەر ئەوەی تا ئەوڕۆ هەچی کردوویەتی هەڵە و خەتا بووە لە ڕووی عەمد و عیلم و زانست نەبووە بە پێی ئەو بەراوەرد و هەڵسەنگاندنەی شەیتان و

نەفس و هەوا، دەتوانین بەو حەقیقەت و ڕاستیەی بگەین: دنیای ژیان و ئیعتیقاد و حەقشناسی دوژمنێکی وەک شەیتان و نەفس و هەوای دەوێ چونکە ئەگەر باتڵ نەبێ چۆن دەناسرێ و دەدۆزرێتەوە حەق.

دڵی سڵ و هەستیار دەیهەوێ بزانێ ئایا حەزرەتی ئادەم و حەووا پاش تێکشکاندنی وەعد و پەیمانێکی کە دەگەڵ خودا بەستبوویان، چییان بە سەر دێ و چ هەڵوێستێک دەگرن و خودای تەعالاش چییان دەربارە دەنوێنێ؟

دیارە دەبێ بۆ ئەو پرسیار و وڵامانە بچینە خزمەت ئایەتی ٣٧: بێگومان دەوێدا هەموو شت ڕوون کراوەتەوە:

**﴿٣٧﴾ فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ**

**ئەوجار خودا چەن وتەیەکی پاڕانەوەی خستە ناو دڵی ئادەمەوە و بە دڵ ڕووی نا لە خودا و دەرگای خودای گرت و کوتی:**

رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٢٣﴾ «اعراف» **واتە ئەی پەروەردگارمان ئێمە زوڵمان کرد لە خۆمان، ئەگەر ئەتۆ لێمان نەبووری و خۆش نەبی، بەڕاستی دەبین بە یەکێک لە زەرەرمەندان.**

دڵ دەیهەوێ بزانێ ئەو کەلیماتانەی خودای تەعالا خستنیە ناو دەروونی ئادەم بۆوەی پێیان وەپاڕێ لە بەر خودا و خوداش بیبەخشێ چ بوون؟ و مەبەست چییە؟ ئەقڵ و شعوور وا دەزانێ: مەبەستی خودا دێرەدا ئاگادار کردنەوەی ئادەمە بۆ تۆبە و پەشیمان بوونەوە و دەرس وەرگرتن. لە هەڵە و تاوانێکی کە لێی ڕوو دەدا و هەروا پەنا بردنە بۆ لای خودا لە هەموو کات و ساتدا بە تایبەتی لە کاتی لێقەومان و گیر و گرفتی دین و دنیا. ئیلهامی کەلیمات بۆ ڕوحی ئادەم ڕێنمونی ئادەمە بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارە کە ئەویش پەنایە بە خودا.

دڵ ڕادەمێنێ لەوەدا حەزرەتی ئادەم تاوانی لێ ڕوو داوە بۆچی ئەو تاوانە بەرەی ئادەمی دەبەر خۆ گرتووە؟ خۆ دیارە لە ئایینی خودادا کەس تاوانی کەس وەئەستۆ ناگرێ؟ ئەمەش دەڵێین بە ئەقڵ و شعوور و دڵ: بە وردی ورد بەوە تاوانی ئادەم ناچێتە سەر ئەستۆی بەرەی ئادەم. بەڵکە ئاگاداری بەرەی ئادەمە بۆ وەی دەرسی لێ وەرگرێ کە نەفس و هەوا وەسەر تەڵەت نەپەڕێنێ وەک ئادەمی وەسەر تەڵە پەڕاند.

خوێندەوارەکانی کنیسەکان دەڵێن لە ڕووی هەڵەوە: گوناهی ئادەم چۆتە سەر ئەستۆی

هەموو ئادەمی یەکەوە تا ڕۆژی دوایی. واتە بەرەی ئـادەم پـێش لە دایـکبوونی، گوناهبـارە بەو گوناهەی کە باوەگەورەی کردوویەتی. تاکوو عیسا پێغەمبەر کە بە لایانەوە کوڕی خودایە دێـت و خۆی دەکا بە قوربانی بۆ ئادەمی بە هەڵاوەسینی خۆی ئەو گوناهە دەسڕێتەوە لە سەر نـامەی کردەوەی هەموو ئادەمییەک و سەراپایان ڕزگار دەکات.

یەقینە ئەو بیر و باوەڕە یەکجار دوورە لە ئەقڵ و ویژدان و ئـیمان و عەداڵەتـی بـاری، ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾ واتە هەمـوو نەفسـێک دە گـرەوی ئاکـار و کـرداری خـۆیەتی. کەوایە کەس تاوانی کەسی ناخرێتە ئەستۆ. بیری کەنیسایەکان بەتاڵە. چونکە قورئان ڕاستەوخۆ قسە و بیری وان بەرپەرچ دەداتەوە: ﴿وَلاَ تَـزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْـرَى﴾ ﴿١٦٤﴾ «انعام» واتە هـیچ هەڵگرێـک گونـاهی یەکێکی تر هەڵناگرێ. بەڵام دەرگای تۆبە بۆ هەموو کەس لە سـەر پشـتە و ئـاواڵەیە، وەک خـودا فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾

لە سەر ئەو کەلیماتانەی کە خودای تەعـالا دایڕژتـوونە دەروونـی حەزرەتـی ئـادەم، ڕا و بۆچوونی زۆر هەیە لە لایەن زانایانەوە. بۆ نموونە سەعیدی کـوڕی جبیـر لە عەبـدوڵڵا کـوڕی عەبباس نەقڵ دەکا و دەڵێ: حەزرەتی ئادەم ڕوو بە خودای حەکیم ئەو کەلیماتانەی کوتوون: ١. يا رَبِّ، أَلَمْ تَخْلُقْني بِيَدِكَ بِلا واسِطَةٍ، قالَ بَلَى * ٢. قالَ يا رَبِّ أَلَمْ تَنْفَخْ فِيَّ مِن روحِـكَ؟ قـالَ بَـلَى. * ٣. قالَ أَلَمْ تَسْكُنّى جَنَّتَكَ؟ قالَ بَلى * ٤. قال أَلَمْ تَسْبَقْ رَحْمَتَكَ؟ قالَ بَلَى * ٥. قالَ يا ربِّ إِنْ تُبْتُ أَصْلَحْتُ تَرْدُني إِلى الجنّة؟ قالَ بَلَى * فَهُوَ قَولُهُ: فَـتَلَقَّى آدَم مِـن ربِّـهِ كلمـاتٍ. واتـا: ١. ئـادەم کـوتی مەگەر ئەتـۆ بێواسیتە بە دەستی خۆت دروستت نەکردووم؟ خودا فەرمووی: بەڵێ ٢. ئادەم کوتی: مەگەر ئەتۆ گیانـت وەبەر من نەخست؟ خودا فەرمووی بەڵێ. ٣. ئادەم کوتی: خودایە مەگەر ئەتۆ ئەمنت نیشتەجێی بەهەشـت نەکرد؟ خودا فەرمووی: بەڵێ ٤. ئادەم کوتی: مەگەر ئەتۆ بەزەت لە پێش غەزەبتدا نیـیە؟ خـودا فەرمـووی با. ٥. ئادەم کوتی خودایە مەگەر تۆبە بکەم و خۆش ئیسلاح کەم، دەمنێریەوە بەهەشـت؟ خـودا فەرمـووی: بەڵێ. ئادەم گۆیا ئەو کەلیماتانەی ڕوو بە خودا کوتوون.

هەروا یەکێک لە زانایان بە ناوی «نخعی» گۆیا چۆتە خـزمەت عەبـدوڵڵا کـوڕی عەببـاس پرسیاری لێ کردووە لە بـابەت ئەو کەلیماتـانەی کە خـودای تەعـالا فێـری ئـادەمی کـردوون، عەبدوڵڵا کوڕی عەبباس گۆیا لە وڵامدا کوتوویەتی: خودای تەعالا ئادەم و حەووای ڕێنـوێنی کردن بچنە حەج، هەرکیان لە سەر ئەو ڕێنومایە چوون بـۆ حەج و لەوێـدا ئەو کەلیماتانەیـان بە شێوەی داد و پاڕانەوە کوتوون. کاتێ لە حەج تەواو بوون، خودای تەعالا وەحی بـۆ کـردوون:

ئەوە تۆبەم لێ قبووڵ کردن.

هێندێکیش هەن وەک «مجاهد» و «قتادە» زانایانی ئایینی فەرموویانە ئەو کەلیماتانەی خودا ئیلهامی هەستی دەروونی کردوون ئەوانەن: رَبَّنا ظَلَمْنا أنفُسَنا وإنْ لَم تَغْفِرْ لَنا وتَرْحَمْنا لَنَكونَنَّ مِنَ الخاسرين. واتا: **خودای ئێمە، ئێمە زوڵمان لە نەفسی خۆمان کرد، ئەگەر ئەتۆ لێمان نەبووری و نەمانبەخشی، ئێمە لە خەسارەتمەندانین.**

هەروا بەو جۆرە زانایان لەمەڕ ئەو جەریانە واتە کەلیماتێکی خودا خستیە دڵی ئادەمەوە، ڕا و بۆچوونی جۆراوجۆریان ڕاناوە و هەروا هەمووشیان کۆکن لە سەر ئەوەی کەلیماتەکانی، بەیانی پەشیمانی و تۆبەکاری بووە.

دڵی پڕ لە هەست و ئیمان لە سەرئەو باوەڕەیە: دەبێ لە ئینسان خەتا و هەڵە و تاوان ڕوو بدا، بەڵام کاتێ پێی زانی، ئەوەی ئەو کردی تاوان و ناڕەوایە، بە پێی ئیمان و باوەڕی دەبێ وەگەڕێ و نەشتەوە سەر ئەو ڕێیە. تاکوو خودا بیبەخشێ ئەوەش دەڕوانێتە ئەو واقیعیەتەی: تاکوو بەخشین و کەڕەمی خودا جێی خۆی وەکا و هەروا ئینسانیش بگا بە حەقناسی لە سەر ئەساسی زانست و تەجرەبە. بۆ زێدە زانین بڕوانە لە تەفسیری کەبیر، ج ٣-٤، لاپەڕەی ١٨-١٧.

دڵ ڕادەمێنێ و سیلە و قانجێ دەگرێ بۆوەی بزانێ ڕاز و سوڕی ئەوەی چییە: ئادەم خەتای کرد بەڵام دە بەرابەریدا خودا عەتای کرد. دڵ دەڵێ بۆ تەسکین: ئادەم کاتێ هاتەوە ماڵی شعوور تێگەیی چاری نەماوە و بەغەیرەز خودا کەس ناتوانێ چاری چارە کا گورج خۆی خستە دەرگای خودا بە نیەتی پاک، خوداش ئەو نیەتە پاکیەی لێ قبووڵ کرد و شارەزای کرد چ بڵێ و چ بکا. لە سەر ئەساسی وەعدی خۆی خودا: هەرکەس بە نیەتی ڕاست و پاک خۆی بخاتە ماڵی خودا، خودا دەری ناکا بەڵکە بە ڕێزەوە وەریدەگرێ.

ئەگەر ئەو پرسیارەش بکرێ لە ئەقڵ و شعوور و دڵ: ئەدی بۆچی خودای تەعالا دە بەرابەر خەتای شەیتانی عەتای نەنواند بەڵکە غەزەبی نواند؟ دەبێ بێ گومان لە وڵامدا بکوترێ شەیتان نە ئیقراری بە تاوانی خۆی کرد و نە داوای عەفو و بەخشینی لە خودای کرد. دووبارە ئەگەر بکوترێ: بۆچی خودای تەعالا هیدایەتی ئادەمی دا و شارەزای کرد چ بڵێ و چ بکا، و بۆچی شەیتانی هیدایەت نەدا؛ خۆ پێش هەڵە و خەتای ئادەم و حەوا و شەیتان هیچ کامیان نە چاکەکار بوون نە خەتاکار بوون؟ ئەو سوڕ و ڕازە دەبێ چۆن بەراوەرد کرێ؟ دڵی خاوەن ئیمان و ژیر و پڕ هەست دەبێ بە ئەندازەی بەڕە، لاقان درێژ کا لە خۆی زیاد لاقان ڕانەکێشێ، هەر

دەبێ مەیدانی سەرەڕۆیی لێ بگیردرێ لە دڵ، دەنا تا بەرەو پشت هەڵدەدێرێ هەر دەڕوا و دەڵێ: (اگر ریگی به کفش خود نداری/ چرا بایستی شیطان آفریدن؟)

بە هەر حاڵ خودای تەعالا ئینسانی سەربەست و بەربەست کردووە بە فەرموودەی خۆی چونکە زانیویەتی بەو کەم زانستییەی خۆشی هەدا نادا و ڕاناوەستێ تا خۆ هەڵنەدێرێ. خودا هۆشداری داوەتێ: لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ واتە پرسیار ناکرێ لەوەی خودا دەیکا، بەڵام پرسیار دەکرێ لەوەی ئینسان دەیکا. بەکوردی لە سەری مەڕۆ.

وەک دڵ هەستی پێ دەکا لە ڕاوێژی ئایەتی ٣٧، خودای تەعالا جاری هەوەڵ بە ئادەم و حەووا دەڵێ: لەو مەقام و پایە بەرزە دابەزنە خوارەوە بۆ سەر زەوی کە پلە و پایەیەکی نزمە چونکە دنیا بەو هۆیەی ڕایەڵەی ژیان بە زۆری کەرامەت و ئەرزش ئینسانی دە پێناو دەخرێ. دنیاش دیارە خانووی ژیان و ملبەملەیە.

جارێکی دیکە بە ئادەم و حەووا دەڵێ خودا: بڕۆنە خوارەوە، کاتێ پێغەمبەرێکوو بۆ هیدایەت بۆ ڕێنوێنی ئاینی خودایی هات، ئیتاعەی لێ بکەن و شوێنی کەون. بۆ باوەڕی بەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٣٨ی بەقەرە:

**(٣٨) قُلْنَا اهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعاً فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ**

**پێیان کوتن: هەموو داگەڕێنە خوارەوە لە بەهەشت. ئەمجار ئەگەر ڕێنوێنییەکتان بۆ هات لە منەوە، بە هۆی پێغەمبەرێکی خاوەن نامەوە، ئیتر هەر کەسێک دوای ڕێنوێنی من کەوت و ڕێی منی گرت، نە ترستان لە سەرە و نە خەم و خەفەت.**

## ترسان لە ڕۆژی ئاخرەت

واتە ئەوانەی کە ڕێی شەرع و ئایینی خودا دەگرنە بەر نە لە پاشەڕۆژ دەترسن و نە خەفەت بۆ ڕابوردوو دەخۆن. چونکە سەرچاوەی دڵیان بە میهرەبانی خودا ڕووناکە.

دڵی هەستیار لە هەڵسەنگاندن و بەرجەوەندی ئایەتی ٣٨ بەتایبەت لە هەڵگێڕ و وەرگێڕی وشەکانی ﴿فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ دەکەوێتە دامان و ڕامانێکی تەواو لەو بوارەدا: ئەو ئایەتە پڕ لە موژدەیە دەگەڵ ئایەتی ١ و ٢ی سوورەی حەج کە خاوەنی زەلزەلە و ترسی تەواون، یەک ناکەون. چونکە ئەو دوو ئایەتی سوورەی حەج زەندەقبەر و زراوتۆقێنن و ئەو ئایەتی

۳۸ی بەقەرە خۆشی و هیوا و شـادیهێنەرن. جـگە لەوەش دەگەڵ ئایەتەکـانی: ۳۴، ۳۵، ۳۶ی سوورەی «عَبَسَ»یش هەر یەک ناگرن و ناکۆک و نالێکن.

دڵ دەبێ زۆر بە وریایی و حەکیمانە ڕێچارەیەک وەدۆزێ کە دژایەتی و ناکۆکی نێوان ئەو ئایەتانە هەست پێ نەکرێ چونکە قورئان کەلامی باری، دوورە بە پێی شەئنی لە نـاکۆکی نێـوان ئایەتەکانی.

پێشەکی دەبێ ئەوە قبووڵ کەین و بیسەلمێنین: ترس و حوزن لە هەر بارێکەوە بۆی بچین، بۆ دنیاش دەبێ و بۆ ئاخرەتیش دەبێ. بە پێی ئیشاراتی قورئان واتە کەسێکی لە سـەر ئەساسـی ئیتاعە لە پێغەمبەرانی خودا بگا بە قۆناغی ئـیمان بە خـودا و ڕۆژی پـاداش و تـۆڵە، دەشـگاتە باوەڕی بە هەموو وەعدە و قەولەکانی خودا؛ مەسەلەن ئیتمینانی دەبێ بەوەی خاوەن ترس نابێ لە کەموکووڕی دە حیسابی ڕۆژی سزا و تۆڵە بە پێی ئیشاراتی ئایەتی ۱۳ سوورەی جـن: ﴿فَمَن يُؤْمِن بِرَبِّهِ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا﴾ **واتا هەر کەس بڕوای بە پەروەرەندەی بـێ، بەو جـۆرەی کە هەیە، نە لە کەمبوونی پاداشی دەترسێ و نە لە غەدر لێ کردن دەترسێ.**

جا لە سەر ئەو بۆچوون و هەڵسەنگاندنە لە ڕاست ئیشاڕاتی ﴿فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ دەبێ ئاوا هەڵوێست بگیـردرێ: نە لە بەڵای دنیـا دەترسـێ و نە دادەمێنـێ لە سـەر لە دەس چوونی ملّکی دنیا، چونکە دەزانێ هیچ شـت بەبـێ ئیـزن و ئیـرادەی خـودا نـابێ بەڵـکە هەچی دەبێ بە ئاگاداری و ئیزن و ئیرادەی ئەو دەبێ. دە دیارە خاوەن ئیمان تەسلیمی ئیـرادە و ویستی خودایە: وَلا رادَّ لِما قَضَيْتَ ولا مانِعَ لِما أعْطَيْتَ. ئەو لەمەڕ دنیـا و لەمەڕ ئـاخیرەت دەبـێ بەوپەڕی باوەڕ و ئیتمینانەوە پاڵ وەو فەرموودانەی خودا بـدا و بـدرێ: ئایەتەکـانی ۳۷ تـا ۴۱ی نازعـات: ﴿فَأَمَّا مَن طَغَى ﴿٣٧﴾ وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى ﴿٤١﴾﴾ ئەو ئایەتانە ئیتمینان دەدەن بە دڵی خاوەن ئیمان ئیتمینانێکی وا جێگای دوودڵی و دڵەڕاوکێ ناهێڵێتەوە. نە ترسـی بێپاداشـی دەبێ نە ترسی تۆڵەی زیاد و نە هیچ ترسێک، ئەگەر ببێ، بۆ بێئیمانان دەبێ.

ئەگەر ترس ببێ لە ڕۆژی ئاخیرەت وەک ئایەتەکانی ۱ و ۲ی سوورەی حەج ئیشارەی وەلا کردوون. بۆ هەموو ئینسان ـ کافر یا موسوڵمان ـ ئەوە یەقینە ئەو ئاڵوگۆڕە بێوێنەیە بەشێکە لە واقیعەی گەورە و بەسامی ڕۆژی قیامەت دەبێ چاو بکرێ و دەستەڵات و توانـایی خـوداش بە سبووت بگا. جا بـۆ موسـوڵمان ئەو جەریـانە تەئکیـدی ئـیمان و باوەڕیـانە و بـۆ کـافران پـێ

سەلماندنیانە.

دڵ لە سەر ئەو بەراوەردە گەیشتە ئەو قۆناغە: هەچی دەس دە خودا گری، ترسی ئەوەی نابێ سەرەوخوون بێ، نە لە دنیا نە لە ئاخیرەت. و هەچی دەس لە خودا بەردا، جگە لەوەی سەرەوخوون کەوتووە، کەسیش نییە وەیگری. با ڕوو بکەینە ئایەتی ٣٩ی بەقەرە تاکوو دڵ داسەکنێ و دامەزرێ بە تەواوی:

﴿٣٩﴾ وَالَّذِينَ كفَرواْ وَكَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا أُولَـئِك أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ

**کەسانێکی کە بێباوەڕ بوون و ئایاتی قورئانی ئێمەیان بە درۆ خستەوە، ئەوانە هاوڕێی ئاگرن هەتا هەتایە دەمێننەوە دەوێدا.**

## تێڕوانینێک لە سیمای ئایەتی ٣٨ و ٣٩:

وەک ئەقڵ و زانست هەڵیاندەسەنگێنێ و دڵ بەرجەوەند دەبێ، ئینسان دەبێ دوو دەستە بێ، دەستەیەکیان ئەوانەن کە بە تەواوی دەستیان دە خودا گرتووە و بەری نادەن، وەک ئەوانەی ئایەتی ٣٨ ئیشارەی وەلا کردن؛ دەستەیەکیشیان وەک ئەوانەی ئایەتی ٣٩ ئاماژەی وەلا کردوون.

وهەروا ئەو هەستەش دەکرێ لە ناو دەروونی ئایەتی ٣٩دا کە ئەوە ئاخرین نیشانە و بەڵگە بێ لە سەر نیعمەتەکانی خودا دایڕژتبێتە سەر ئینسان و شارەزایی تەواو بێ لەسەر تاق و تەنیایی خودا. چونکە ئەو شتانەی لێرەوە پێش باسیان لێوە کرا وەک: ئاسمان و زەوی و با و باران و دانەوێڵە و دار و دەوەن و گیاوگوڵ، ئەوانە شتانێکن نەبوون و هاتوونە ڕوو، خۆ ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە و حاشای لێ ناکرێ هیچ بوون و بوونەوەرێک سەربەخۆ بەبێ دانەر و ڕانەر و داهێنەر نابێ، بەغەیرەز خودا، بوونە و هەیە بەبێ داهێنەر.

وهەروا ئەو ئایەتانە ئەو ڕاستیەی نیشان دەدەن کە محەمەدﷺ ڕاستە لە گوفتاری خۆیدا، کە بەبێ خوێندەواری ئەو شتانەی ڕاگەیاندوون و واشن و وان وەک دە تەورات و ئینجیلدا هاتوون.

وهەروا دووبارە ئەو ئایەتانە دەلیل و بەڵگەن لە سەر هاتنی دوایی بەو نیزامەی دنیایە و داهاتنی نیزامێکی بێ دوایی، بەو دەلیلە کەسێک بتوانێ لە نەبوو بوون پێکبێنێ دەشتوانێ ئەو وەدیهاتووە وەلابەرێ و بە جۆرێکی دیکەی وەدی بێنێتەوە. بۆ زێدە زانین ڕوو بکە دەرگای تەفسیری کەبیر، سوورەی بەقەرە، ئایەتی ٣٩.

دڵ بە هەستەوە تێوەڕامانێکی دێتە سەر لەو بارەوە کە خودای تەعالا دەگەڵ بەنی‌ئیسرائیل واتە نەوە و وەچەکانی یەعقووبی پێغەمبەر، کە لە ١٢ کوڕەکانی‌ڕا پەرەیان ستاندووە، دەدوێ. ئەوە جێی سرنجە کە خودا پاش ڕانانی بەڵگە و دەلیل لە سەر تاق و تەوانای خۆی و حەقانیەتی ڕیساڵەتی پێغەمبەران و هاتنی ڕۆژی قیامەت، ڕووی کردە بەیانی ئەو نیعمەتە زۆر و زەوەندانەی کە بەخشیویەتی بە بەرەی ئادەم، پاشان بەتایبەتی بەیانی نیعمەتە تایبەتییەکانی گەلی یەهوود دەکا با وجوودی ئەو هەموو لاساری و بەدئاکارییەی هەیانە لە ڕاست خودا و ڕەسووڵی خودا.

وەک دڵ هەستی پێ دەکا ئەو لوتف و عەتایەی خودا دە بەرابەر ئەو لاساریەی یەهوود، هۆشدارە بە یەهوود کە نەکەن وەک ئادەم لە سەر ئەو ئەنعامەی کە پێی بەخشرابوو، بێ‌ئیتاعەیی خودا بکەن ئەگینا تووشی عەزاب دەبن، بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٤٠ی بەقەڕە:

**﴿٤٠﴾ يَا بَنِي إِسرائِيلَ اذْكرُواْ نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكمْ وَأَوْفُواْ بِعَهْدِي أُوفِ بِعَهْدِكمْ وَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ**

**ئەی نەوەی یەعقووبی پێغەمبەر، بیری ئەو چاکانە بکەونەوە کە بە سەرتانا ڕشتوومن، وە هەروا ئەو عەهد و پەیمانەی کە بەستووتانە دەگەڵما لە کاتی باوەگەورەتان ـ واتە ئادەم ـ کە بڕوا بێنن بە پێغەمبەرانی من و ڕێنموونی من، تاکوو ئەمنیش پەیمانی ئێوە ببەمە سەر «واتا لە خاکی فەلەستین جێگیرتان بکەم و پایەتان بەرز بکەم گوزەرانتان خۆش کەم زاڵتان کەم بە سەر دوژمنە بێ بڕواکانتانا» و هەر لە من بترسن.**

## سەیرێک لە نیعمەتەکانی یەهوود

زانایان کۆکن لە سەر ئەوەی «بەنی‌ئیسرائیل» واتە یەعقووب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم.

دڵ دەیهەوێ نەختێک لەو نیعمەتانەی خودا بەخشیونی بە گەلی یەهوود واتە بەنی‌ئیسرائیل، بدوێ وباسی کا. پێش ئەوەی باسی سەرەڕۆیی و لاساری وان بکا. نیعمەتەکان: يَا بَنِي إِسرائِيلَ اذْكرُواْ نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكمْ وَأَنِّي فَضَّلْتُكمْ عَلَى الْعَالَمِينَ ﴿٤٧﴾ «بقرة» واتا: **ئەی نەوەی یەعقووبی پێغەمبەر، یادی ئەو چاکانە بکەنەوە کە دە وەختی خۆی ڕشتوومەتە سەرتان و بە سەر باو و باب و باپیرەکانی ئێوەمدا لە کاتی مووسا و دوای ئەودا.**

وهەروا بۆ ئاشنایی و شارەزایی بە سەر نیعمەتەکانی بەنیئیسرائیل زەین دە ئایەتی: ﴿يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُواْ نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ ﴿١٢٢﴾ «بقره» **ئەی تیرە و بەرەی ئیسرائیل لە بیر خۆی مەبەنەوە بەڵکە وەیادی خۆی خەن: چاکەم چەن دەگەڵ کردن زیاد لە عالەمی دنیا، زیاتر و پترم ڕێز لێ گرتوون.** هەروەک ئەو بابەتە دە ئایەتی ٤٧ی بەقەرەدا دووبارە چاو دەکرێ.

دەکرێ بۆ چاوکردنی زۆری ئەو چاکانەی خودا دەگەڵ بەنیئیسرائیلی کردوون ئاوڕێک وەسەر ئایەتی ١٠ی «اعراف» دەی: ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّاكُمْ فِي الأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ قَلِيلاً مَّا تَشْكُرُونَ﴾ **هۆزی بەنیئیسرائیل بە تەئکید ئێمە ئێوەمان جێ کردەوە لەو سەرزەوییە پان و بەرینە، کە هەر دەوێشدا حەیات و حەسانەوە و بژیوی ژیانتانمان دابین کردووە، دەگەڵ ئەو ئەنعام و میهرەبانییەی خودا زۆر بە کەمی دەبیندرێن شوکرانە بژێر بن.**

ئەگەر بێتوو بە وردی سەیری ئەو چاکانە بکرێ کە خودا دەگەڵ هۆزی بەنیئیسرائیلی کردووە و دانەدانەیان بژمێردرێن دەو کتێبەدا جێگایان نابێتەوە. هەروا خراپەکاری و بەدکردارییەکانیشیان دە ئەژمارنایە. بەڵام نەختێکیشیان هەر دێنینە ڕوو. وەک باسی هاتنی حەزرەتی محەممەدﷺ کە دە تەورات و ئینجیلدا باسی لێ کراوە و مزگێنی پێ داون. ئەوە نەزەری بەشێک لە زانایانە و هەروا بەشێکیش هەن لە زانایانی قورئان دەڵێن ئەو نیعمەتانەی لە لایەن خوداوە بەخشراوە بە هۆزی یەهوود هەمان ئەو ئایەتانەن کە لە مەڕ وان دواون.

لە سەر ئەساسی بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئایەتی ٤٠ دڵ دێتە سەر ئەو قەناعەت و باوەڕەی: ئەگەر خودا مەبەستی لەو نیعمەتانە ئەنعامەکانی دەورانی محەممەد المصطفیﷺ بێ، ئەوە نیعمەتەکانی بریتی دەبن لە حەزرەتی محەممەدﷺ و قورئان کە هەردوو ڕەحمەتن بۆ دنیای بەشەر کە دیارە یەهوودیش بەشێکن لەو دنیایە.

ئەگەریش مەبەستی خودا لەو نیعمەتانە، یادئاوەری و هۆشداری یەهوود بێ بە گشتی، ئەوە نیعمەتەکان بریتی دەبن لەو چاکانەی کە لە پێش هاتنی محەممەدﷺ واتە لە دەورانی حەزرەتی مووسادا و تا دەگاتە زهووری محەممەدﷺ دەگەڵیان کراوە.

نەزەری حەزرەتی عومەر ئاوایە: بەنیئیسرائیل دوو بەشن: بەشێکیان ڕابردوون و نەماون، چاویان بە حەزرەتی محەممەدﷺ نەکەوتووە، بەشێکیشیان لە دەوری حەزرەتدا بوون. دیارە قورئانیش بۆ محەممەدﷺ وەحیە لە ڕابیتە دەگەڵ ئەو ئۆمەتەی لە دەوری ئەودا. کەوابێ دەبێ

ئاوا تەعبیر کرێ ئەو ئایەتە: خیتابی خودای مەزن هەر تەنیا هۆزی یەهوود نییە بەڵکە هەر هۆز و نەتەوەیەک کە شوکری ئەنعامی خودا نەکەن و یادی خـودا نەکەن، دەکەونە بەر ڕق و تـووڕەیی خودا، ئۆمەتی هەر پێغەمبەرێک بن. کەوایە دەبێ هیچ ئۆمەتێـک بە پێغەمـبەری نەنـازێ بەڵـکە دەبێ بە ئیتاعە لە خودا و پێغەمبەری بنازێ. بۆ زێدە زانین بڕوانە لە تەفسـیری «تبیـین القـرآن»، ج٢، لاپەڕە ٣٦٠.

دڵ دەیهەوێ بزانێ ئەو عەهدەی خودا بە تەئکید ئەمری وەفا پێ کردنی داوە کام عەهـدەیە و چییە؟ بۆ تەسکینی دڵ دەبێ ئاوڕ وەسەر قورئان و قورئانزانان دەین. قورئانزانەکانیش ئاوای بۆ چوون: ئەو عەهدە، ئیمان و باوەڕییە بە تەنیـایی خـودا و ڕۆژی دوایـی و دەگەڵ ئیخلاسـی عەمەل. ئەوە عەهدی ئینسانە دەگەڵ خودا و عەهدی خوداش پاداشی چاکان و پاکان و ڕاستان بە زیادەوە بێ کەموکووڕی. بۆ زێدەزانین بڕوانە لە تەفسیری کەبیر، هەمان ئایەتی ٤٠.

بە کورتی و بە کوردی هاواری ئایەتی ٤٠ بەقەرە دەبێ ئەوە بێ: ١. یادی نیعمەتەکانی خودا و شوکرانەیان ٢. وەفـا بە عەهـد و پەیـمانە دابەسـتراوەکان ٣. تەقـوا و حەیـا لەمەڕ خـودا. ٤. بەردەوامی لە سەر ئیتاعە. بێگومان ئەو مەرجانە ئەساس و بنچینەی ئیمان و باوەڕییە بە خودا.

لە ئایەتەکانی قورئان ئەوە لەمەڕ هۆزی جـوو هەسـت پـێ دەکـرێ زانایـان و سـەردارانی یەهوود پاش دەرکی واقیعـیەت و ڕاسـتی لە تەوڕات و ئینجیـل و دەسـتوور و ڕەوشـی ئـاینی ئیسلام، حەسادەت گرتنی و وەرسووڕان بەرەو ئینکاری و لاساری، واتە پاش ئەوەی کە زانییان ئـاینێکی کە محەمـمەدﷺ لە سـەری دەدوێ و هێنـاویەتی، حەقە و کتێبەکـانی تەوڕات و ئینجلیش تەسدیقی دەکەن حەسادەت و سەرەڕۆیی و هەواپەرەستی ڕێی پـێ نەدان ئەو حەق و ڕاستییە ئیتاعە بکەن و بیپەرستن. بۆ تەئکیدی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئـایەتی ٤١ی بەقەرە، کە هاواریان دەکا کە لەو لاساری و سەرەڕۆییەی وەکەون، ڕوو کەنە حەق:

**﴿٤١﴾ وَآمِنُواْ بِمَا أَنزَلْتُ مُصَدِّقاً لِّمَا مَعَكُمْ وَلاَ تَكُونُواْ أَوَّلَ كَافِرٍ بِهِ وَلاَ تَشْتَرُواْ بِآيَاتِي ثَمَناً قَلِيلاً وَإِيَّايَ فَاتَّقُونِ**

**«ئەی هۆزی یەهوود بەتایبەتی، بەرەی ئـادەم بە گشـتی» بـاوەڕوو بـێ و بەقـایە بـکەن بەوەی ناردوونەتە خوار بۆ سەر ئینسان کە تەسدیقی ئەوەی دەکا وا ئێستێ لە ناوتانە، وەک تەوڕات و ئینجیل بـن، و ببـنە پێشـەنگی ئەو کەسـانەی حاشـایانە لەو کتێبـانە و خۆیـانی لـێ بەدوور دەگرن، و نابێ نیشانەکانی من بە نرخێکی کەم بفرۆشن بە خاتری لەزەتی نەفس و هەوا. دەیجا**

**هەر لە خۆم ترسوو بێ.**

## نازڵکراو چییە؟

دڵ دەیهەوێ بزانێ ئەوەی خودا نازڵی کردووە چییە؟ بۆ تەسکینی دڵ دەبێ بکوترێ: لە سیمای ئایەتەکان و کات و زەمان، مەبەستی خودا بە «ما أنْزله» دەبێ هەر قورئان بێ، چونکە خودا دەستووری بە گەل دا: باوەڕ بە قورئانی بێنن. و ئەگەر پرسیاریش بکرێ خۆ لە جوملەی ﴿أَوْفُواْ بِعَهْدِي﴾ ئایەتی پێشێ وا دەردەکەوێ کە (ما أنزله) ئەعمال و ئیمان و قورئان بێ، چونکە ئیمان و ئەعمال و قورئان بنچینەی عەهد و پەیمانن، جا بەو پێیە ئەگەر دە ئایەتی ٤١دا مەبەست لە (ما اَنزَلْتُ) قورئان بێ، تیکرار دێتە ڕوو کە ئەوەش لە شەئنی قورئان دوورە. دەبێ بۆ نەجات لەو گومانە ئەوە بڵێین: ئەو باسە زۆر خاوەن ئەرزشە و بنچینەی ئیمانە. لە هەوەڵدا بە گشتی باسی لێ کراوە، لێرەشدا بەتایبەتی.

دڵی هەستیار دەخوازێ بزانێ خودا لەوەی کە دەفەرموێ (.... مَعَكُمْ) چییە، (معكم) واتە ئەوەی لە کن یەهوودانە و قورئان تەسدیقی دەکا چییە؟

ئەوەی تا ئەوڕۆ زانراوە و بیسراوە ئەوەیە: قورئان تەسدیقکەری تەورات و ئینجیلە، ئەوانە کتێبی ئاسمانین، خودا ناردوونیە سەرحەزرەتی مووسا و عیسا، تەورات بۆ یەهوودیان، ئینجیل بۆ هۆزی نەسارا. هۆزی یەهوود و نەسارا زانا و ئاشنا بەو کتێبانەن چونکە ئی خۆیانن. دە دیارە هەر دوو ئەو کتێبانە بە ڕوونی و تەواوی باسی محەممەدیان تێدا کراوە بە پێی فەرموودەی قورئان. جا بۆیە ئەگەر یەهوود و نەسارا ئینکاری پێغەمبەرایەتی محەممەدﷺ بکەن ئینکاری تەورات و ئینجیل دەکەن، ئەو ئینکاریەش بە تاوانێکی زۆر گەورە دەژمێردرێ.

هەر بابەت و مەتڵەبێکی تایبەت بە حەزرەتی محەممەدﷺ بێ و بە دەورانی ئەو بێ لە تەورات و ئینجلدا ئاماژەی وەلا کراوە. هەروەک قورئان تەسدیقکوندەی وانە ئەوانیش ئیشارە کوندەی قورئانن کە حەقە.

دووبارە دڵ دەیهەوێ تێبگا لەوەی خودا کە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَشْتَرُواْ بِآيَاتِي ثَمَناً قَلِيلاً﴾ مەبەستی لە چییە لەوەیدا خودا کە دەفەرموێ: ئەو ئایەتانە مەدەن بە کالای کەم. کام ئایەت و نیشانانەن دەدرێن بە کالای کەم و ناچیز؟ بۆوەی تووشی هەڵە نەیێین و لە گیرۆدەییش بەدوور بین دەبێ بڵێین: ئەوانە حەقیقەتی قورئان و مەقامی والای ئەحکامی قورئانن. بە کوردی و بە

کورتی مەقامی بەرزی قورئان نەدرێ بە مەقامی نزمی هەوا و هەوەسی دنیا، و دنیای بێبڕانەوە نەدرێ بە دنیای لەبڕانەوە. کەوابێ (ثَمَناً قَلِيلاً) دنیای نزم و بەزم و بێدەوامە، ئایات و نیشانەی خوداش قورئانە. هۆزی یەهوود و نەسارا ئەو ئایەتانەی کە باسیان لە سەر ئیسلام و پێغەمبەرایەتی محەممەدﷺ بوایە دەیانگۆڕی یا لایاندەبرد. چونکە دەترسان لە ئایینی ئیسلام و محەممەدﷺ کە پایە و مەقامیان لێ وەستێنێ و هەروا بە خەیاڵی خاو و پیسیان وا بوو ئەگەر ئاوا نەکەن مەقام و مەنزڵەتیان لە دەس دەچێ، جا خودای خاوەن بەزە و حیکمەت بۆیە هەرایان لێ دەکات بە: ﴿وَلاَ تَشْتَرُواْ بِآيَاتِي ثَمَناً قَلِيلاً﴾. بۆ زێدە زانین بچینە خزمەت تەفسیری کەبیر لە شەرحی هەمان ئایەتی ٤١.

وەک دەردەکەوێ لە سیمای ئایەتی ٤١، زانایانی هۆزی یەهوود بۆ گومڕایی خەڵکی زەمان زۆر بێئینسافانە بە دوو جۆر بۆ عالەم دەهاتن: ١. دەهاتن حەقیان تێکەڵاوی ناحەق دەکرد تاکوو خەڵک حەق نەدۆزنەوە و لە پەنا ئەو فێڵەشدا بە ناحەقیان هەڵدەکوت دە قالبی حەقدا.

٢. وهەروا دەهاتن حەقیان دەشاردەوە و حاشاریان دەدا، لە جێگای حەق ناحەقییان قوت دەکردەوە، هەروەک ئێستاش لە ناو عالەمی دوژمن بە حەق و ئازادی ئەو جۆرە جووڵانەوە زۆرە بەتایبەت لە ناو عالەمی یەهوودا. جا لە سەر ئەو ئەساسە خودای حەکیم و خاوەن حیکمەت هۆشدارییان دەداتێ کە لەو جۆرە ئاکارانە وەکەون، بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٤٢:

﴿٤٢﴾ وَلاَ تَلْبِسُواْ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُواْ الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ

**ڕاست دامەپۆشن بە درۆ، تا ڕاستەکە بشارنەوە لە کاتێکا کە بۆخۆتان دەزانن: کە ئەو پێغەمبەرە هەمان ئەو کەسەیە کە تەورات ناو و نیشانی هەڵداوە. ئێوە خۆتان ڕاستێتی پێغەمبەر (محەمەد) بە چاکی دەزانن کەوابێ ئەو ڕاستییە مەشارنەوە و ڕێگا ون مەکەن.**

## دووزمانی، زمانلووسی، دڵپیسی

ئەوجار خودا بانگیان دەکات کە بێن تێکەڵ موسوڵمانان بن ئاداب و ڕەسمی ئایینی ئیسلام بەجێ بێنن. نوێژێ بەڕاستی بکەن و زەکاتێ بدەن. بۆ تەئیدی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی: ٤٣:

﴿٤٣﴾ وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ وَارْكَعُواْ مَعَ الرَّاكِعِينَ

**نوێژی بەڕاستی بکەن و زەکاتێ بدەن و ڕکووع بەرن دەگەڵ ڕکووعبەران.**

**ئاوڕ دانەوە وەسەر یەهوود**

دڵ لە تێفکرین و هەڵسەنگاندنی سیمای ئەو دوو ئایەتی ٤١ و ٤٢ هەست دەکا کە ئـایەتی ٤١ ئەمر بە تەرکی کوفر و گومڕایی بێ کە ئەو پیشە پیسە پێشـەی هـۆزی یەهـود بـووە بەڵام دە ئایەتی ٤٢دا ئەمر بە مەنعی خۆ بەهەڵە بردنی گومڕایی و شکاندنی عەهد و پەیمانی ئیمانی بێ. بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەڕوانین لە ئـایەتی ٤٢: ﴿وَلاَ تَلْبِسُواْ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ﴾ کە ئیشـارەی تەواوە وەلای ئەوەی حەق لە عالەم حاشار نەدەی و داینەپۆشی بە ناحەق. هەروا دووبـارە ﴿وَتَكْتُمُواْ الْحَـقَّ وَأَنـتُمْ تَعْلَمُـونَ﴾ ئامـاژەی تەواوە وەلای ئەوەی حەق قـووت مەدە و دەزانـی حەق بـۆ قووتدان نابێ.

**ئاوڕدانەوەیەک وەلای ئەو هۆشدارەی باری کە دەیدا بە هۆزی یەهوود:**

لە بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەوە دێـتە دەسـت و هەسـت پـێ دەکـرێ: شتانێک بە تاوان دەژمێردرێ زانا بی پێی کە گونـاه و دیـن مەنعـی کـردووە و ئەو تاوانەشـی بە تاوانێکی زل دێتە حیساب.

وهەروا لەمەڕ ئەو ئایەتی ﴿وَلاَ تَشْتَرُواْ بِآيَـاتِي ثَمَنـاً قَلِـيلاً﴾ دڵ دەڵـێ و پرسـیار دەکـا لەو بارەوە: ئایا خودا دەگەڵ زانایانی یەهوود و نەسـارایەتی چـونکە ئەوان ئایەتەکـان دەزانـن نەک نەخوێندەوارەکان؟ وەیا دەگەڵ سەراپای ئینسانیەتی، چ زانا چ نەخوێندەوار؟ جا بۆ تێگەیشتن و زانایەتی لەو بارەوە ڕوو دەکەینە فەرموودەیەکی حەزرەتی عـومەر (ر) کە فەرمـوویەتی: هـۆزی بەنیئیسرائیل ئەوڕۆ نەماون و لاچوون بە ڕواڵەت، ئەوەی ماون لە گۆڕێن بە زانا و خوێنـدەوار و نەخوێندەوار بە ئۆمەتی حەزرەتی محەممەدﷺ دێنە ژمار. جا لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ بڵێین و بکوترێ: ئەو ئایەتە واتە «ئایەتی قورئان بە ماڵی دنیای ناچیز مەفرۆشـن» ڕووی دە سـەراپای خاوەن ئیمانانە، عام لە خوێندەوار و نەخوێندەوار.

و دەشتوانین و دەشکرێ بڵێین ٥ تـاقم و دەسـتە لەو فرۆشـتنە زۆر نیـزیکن، دەبـێ زۆرتـر وشیاری خۆیان بن، ئەوانیش ئەوانەن: ١. عولەمای دەرباری فریوخـواردوو ٢. قـازی و مـوفتی بەرتیل خۆر ٣. شاهان و حاکمان و زۆرداران ٤. کاربەدەستانی حاکم ٥. واعیزانی دنیاپەرەست.

حاشاردانی حەق یا بڵێین حەق داپۆشین بە ناحەق، یا بە گوفتە یا بە کردەیە، بە گوفتە وەک ئەوە لە ترسی دەستەڵات دەیکەی و حەق حاشـار دەدەی، و هەروا بە عەمەل شـاهیدی بە درۆ دەدەی.

وردبوونەوەیەک: خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم پاش ئەوەی ئینسانی بە گشتی بانگ کرد بۆوەی حەق بە ناحەق دامەپۆشن، و حەق حاشار مەدەن و حاشای لێ مەکەن، ئەو دەعوەتە لە دەورانی محەممەدﷺ بەتایبەتی ڕوو دە هۆزی یەهوود و نەسارا دەکا، ئەوجار خودای تەعالا بۆ وەی ئینسان ئەو بانگاوازە ئەساسییە فەرامۆش نەکا وەسیلەیەکی زۆر ئاسانی حەواڵە کردە ئینسانی کە ببێتە ڕابیتەیەکی تایبەتی بەینی خودا و ئینسان تاکوو ئەو دەعوەتەی هەمیشە لە بەرچاو بێ واتە حەق حاشار نەدا. ئەو وەسیلەش پێنج فەڕزەی نوێژن دە شەو و ڕۆژدا. تاکوو ئینسان دڵی ڕام بێ بە یادی خودا و دەستووراتی خودا و هەروا وەسیلەی یادی خودا وەک زەکات بۆ پەرەپێدانی سیلەی ڕەحم کە دەفەرموێ: وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ «زاریات» واتە: دە ماڵ و سامانتاندا بەشی بێنەوا و نەداران دیاری کراوە و هەیە، وەک زەکات، سەدەقە؛ وهەروا ئایەتی: وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ ﴿٢٤﴾ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ ﴿٢٥﴾ «معارج» واتە: هەمان ئەو کەسانەی کە دە ماڵ و داراییاندا بەشێکی دیاریکراو هەیە بۆ بێنەوا و نەداران. بۆ پشتڕاست کردنەوەی ئەو بابەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ٤٣:

﴿٤٣﴾ وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ وَارْكَعُواْ مَعَ الرَّاكِعِينَ
بەجێ بێنن نوێژێ، و ئەدا بکەن و بدەن زەکاتێ، و دەگەڵ نوێژکەران نوێژ بخوێنن واتە جەماعەت بکەن.

بە گەلەکۆمەکەوە ڕوو دە خودا دەکەن چونکە داوای گەل پێکەوە بۆ قبووڵ بوون نزیکترە لە تەنیایی. و جگە لەوەش گەل بە کۆمەڵ یەکپارچەگی و میهرەبانی لێ دێتە ڕوو.

## ئاوڕێک وەسەر کەڵک و قازانجی نوێژ و زەکات بۆ دنیایە:

نوێژ جگە لەوەی دڵ هەست بە پەناگایەکی گەورە دەکا، هیوا و ئومێدی گەورەش بۆ دڵ پێکدێنێ، و هەروا سەرمایەیەکی گەورەی ئاخرەتی لە زەوی دڵدا دەچێنێ. نوێژ کە ٨٦ جار لە قورئاندا ئاماژەی پێ کراوە و لە هەر شوێنێک بە جۆرێک باسی لە سەر کراوە نیشانەی بەرزی مەقامیەتی بۆیە پێغەمبەر کوتوویەتی نێوانی کافر و ئیسلام نوێژە.

بە پێویست دەبیندرێ نەختێک ئاماژە وەلای مەقامەکانی نوێژ بکرێ:

١. ئایەتی ٤٣ بەقەرە: وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ وَارْكَعُواْ مَعَ الرَّاكِعِينَ

٢. ئایەتی ٢٣ معارج: الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ

٣. ئایەتی ٣٤ معارج: وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ
٤. ئایەتی ١٠٤ نیساء: إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَّوْقُوتًا
٥. ئایەتی ٢ مؤمنون: الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ
٦. ئایەتی ٤٣ بەقەرە: وَارْكَعُواْ مَعَ الرَّاكِعِينَ

بۆ بەرز و ڕێزداری نوێژ کە عیبادەتێکی هەمیشەیی هەموو نەتەوەکانی سەر زەوییە لە ئادەم تا خاتەم، بەسە، ئەو ٨٦ جارە شاهیدن لە سەر بەرچاوی مەقامی.

پرسیار دەکرێ لەوەی: بۆچی زیاد لە ڕوکنەکانی دیکەی ئیسلام، خودا بە ئەهلـی کیتـاب، واتە یەهوود و نەسارا دەستووری نوێژ کردن و زەکات دانێ دەدا؟ دەبێ لە وڵامدا بکوترێ: پێش زهووری ئایینی ئیسلام واتە هاتنی محەممەدﷺ بەڵکە لە دەورانی مووسـا و عیساشـدا نـوێژ و زەکات هەر بووە و باو بووە. بەو پێیە دەبێ دەو ئایینەشدا کە ئایینێکی هەمیشەیە و تا تایە دەبـێ ببێ، چونکە ئەوە ئاماژە وەلای ئەوەیە ئایینی خودا بـۆ هەمـوو پێغەمبەرەکـانی هەر یەک ئـایینە ﴿اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ﴾ بەڵام بۆ هەر پێغەمبەرێک لە سـەر ئەساسـی هەڵگرتنـی دەور و زەمـان و ئۆمەتی وەخت بووە ڕوکنەکانی.

ئاوڕێک: نیشانە و ئاساری ئایینی ئیلاهی دوو بەشە:

١. بەشێکیان زاهیر و ئاشکران وەک نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج ...
٢. بەشێکیان ون و نادیاری وەک هەستی خودا و پاڵ وێدانی.

ئەو بەشەی کە ئاشکرایە، شاهیدە لە سەر بەشی نهێنی. بە کورتی ئەوەی بە بیـر و هەسـتی دڵ و دەروونە ئەساسی ئیمانە وەک باوەڕی بە خودا و ئاخیرەت و ... ئەوەی بە ئەجـزای لەشـە وەک نوێژ و ڕۆژوو و حەج و خێرات شاهیدە لە سەر بوونی ئیمان.

لە سەر ئەو ئەساس و پایەیە ئایەتی ٤٣ دوو بەشی لەش و سامانی ل ەسەر ئەساسی بەشی نهێنی کە ئیمانە دە خۆ گرتووە. واتە ﴿أَقِيمُواْ الصَّلاَةَ﴾ . بەشی لەش و ﴿آتُواْ الزَّكَاةَ﴾بەشی ماڵ. دیارە بەڕێوە بردنی ئەو دوو بەشەش لە سەر ئەساسی ئیتاعەی بە خودا و باوەڕی بە خودا نەبـێ نابێ.

دڵی هەستیار پاش هەڵسەنگاندنێکی زۆر ئەو هەستە دەکا: خودا بۆچی دە ئـایەتی ٤٣دا بە دوای دەستووری ڕاوەسـتانی نـوێژ دەسـتووری ڕکـووع دەدا، بەڵام دە بـاقی شـوێنەکانی نـوێژ دەستووری ئیقامە و سەژدە دەدا زیاتر نا، دەبێ ئێمەش بـۆ ئەو عـیللەتە بچـین: نـوێژ لە ئـایینی

یەهووددا ڕکووعی نەبووە، و لە ئایینی تازەی ئیسلامدا دەبێ بە کەماڵ بگـا بە هـۆی ڕکـووع. و هەروا ئەوەش بڵێین نوێژی بە کۆمەڵ واتە جەماعەت لە ئایینی یەهووددا نەبووە.

## سەیری عەجایبێک لە زانایانی یەهوود

زاناکانی یەهوود کە تەوڕاتیان باش دەزانی حاشایان پـێ نەدەکـرا لەوەی کە محەمـمەدﷺ حەقە بە پێی ئیشاڕاتی تەوڕات، چونکە تەوڕات نیشانەکانی زۆر بە ڕوونی بەیان و باس لە سەر کردووە ڕێگای حاشا لێ کردنی بڕیوە. بە ناچاری لە لای دۆستان و کەسانی خۆیان دەیانکوت محەمـمەد پێغەمبەرێکـی حەقە بە پێـی ئامـاژەی تەوڕات، حاشـا کـردن لەو ڕاسـتییە ناڕاسـتی دەگەیێنێ، کەچی دەگەڵ ئەو حاڵەش زاناکان بۆخۆیان نەدەهاتنە بواری ڕاستی و عەمەل کـردن بەو ڕاستیەی. هۆیەکەشی بە زاهیری هەر ئەوە دەبیندرا و چاو دەکرا لێیـان: مەقـامی دنیایـان لە دەس دەدا ئەگەر هاتبانە بوارێ لە ناو عالەم، ئەو جۆرە ئاکار و ڕەفتارە ناڕەوایە لە ناو زۆر چیندا هەیە کە بـۆ مەقـامی دنیـا حەق حاشـار دەدا و حاشـای لـێ دەکـا. ئەوەش چـاو دەکـرێ لەو جەرەیانەدا: ئەو ئاکار و سیفەتە ناڕەوایە بە زۆری لە زانایانی ئـایینی و حـاکمانی وەختـدا چـاو دەکرێ! وای لەو ئافەتە: خۆی بۆگەن بـێ، واتە ڕێبەرانـی بـۆگەن چـۆن گەلـی لە بـۆگەن پـێ نەجات دەبێ!! بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٤٤ی بەقەڕە:

﴿٤٤﴾ أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ

**ئایافەرمان ئەدەن بە مەردوم بە چاکە و کەچـی خۆشـتان فەرامـۆش دەکەن و هەروا خۆتـان بە دایم تەوڕات دەور دەکەنەوە ئاگاداریشن بە ناو و نیشانەکانی پێغەمـبەری «یـانی ئەگەر ئێـوە بە تەوڕاتەکەی خۆتـان بـڕواو هەیە و هەروا فەرموودەکـانی بەڕاسـت دەزانـن، و ئامۆژگـاری عالەمیشی پێ دەکەن، ئەدی بۆچی بۆخۆتان عەمەلی پێ ناکەن؟» ئایا هێشتاش تێناگەن؟**

### تێوەڕامانێک لە ناوەرۆکی ئەو ئایەتە:

ئەو ئامۆژگارییە ئەگەرچی بۆ یەکەم جارە ڕووی دە جوولەکەیە بەڵام دە واقیعدا بۆ هەمـوو کەسێکە بە تێکڕایی بۆ هەموو چین و توێژێکە، و لە هەموو دەور و چەرخێکە. وا گومان نەکرێ هەر بەرۆکی پیاوانی ئایینی و زانایانی دینی دەگرێ، بەڵام شتێک هەیە گرینگە نـابێ حاشـاری دەین ئەویش ئەوەیە: ئەو حەق قووتدانە بۆ هەموو چین و توێژێـک بەڵایە نـاحەزە، نـاڕەوایە؛ بەڵام ناحەزتر و بەڵاتر و زەرەرتـر ئەوەیە لە زانایـانی ئـایینی ڕوو بـدا، چـونکە زانایـانی ئـایینی

بڵیندگۆی خودا و ڕەسووڵی خودان، ناحەق لە بڵیندگۆیانڕا بێتە ڕوو، ئایین بێ ئەرزش دەبێ و بـازاڕی حەق و خوداناسـی لە بـرەو و ڕەواج دەکەوێ. ئەوکـات زانایـان دەکەونە ئەو بـوارە: گوفتاری جوان، کردار نـاحەز؛ و هەر ئامۆژگـارییەک بـدەن بە ئاکاریـان وەدرۆ دەخـرێتەوە. و هەروا ئایین بە پیشەی نان پەیدا کردن دەناو عالەمدا.

## ئاوڕێک بە وردی بۆ سەر جوملەی ﴿ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ﴾

ئەو جوملە بۆ عەجایبە؟! و هۆی عەجایبەکەشی ئەوەیە: عـالەم کە دەبیسـێ لە واعیـز، لە مەلا: ئەوەی دەکوترێ پەیامی خودایە، ئەدی ئەگەر وایە بۆچی مەلای واعیز کردار و ئاکاریـان وەک گوفتارەکە نییە. بێگومان مەلا فێڵمان لێ دەکا، ئەوانەی دەیڵێ وا نین ئی خودا نین. وەیـا مەلا فێڵ لە خۆی دەکا بۆخۆی بە ئامۆژگاری خودا گوێ نادا، بەمەش دەڵێ گوێ بدەنێ. ئـای وای لەو ڕۆژی ڕەش و تاریک پێشەنگ منافق بێ! داوای پاکیش بکا لە عالەم!!

بۆ تێگەیشتنی زیاتر بڕوانە لە تەفسیری کەبیر، ئایەتی ۴۴ لاپەڕەی ۴۷-۴۶.

ئایەتی ۴۴ی بەقەرە دەگەڵ ئایەتی ۳ی سوورەی سەف بە تێکڕایی هێـرش دەکەنە سـەر ئەو منافقانە: گوفتار جۆرێک، کردار جۆرێک: ﴿كَبُرَ مَقْتًا عِنـدَ اللَّهِ أَن تَقُولُـوا مَـا لَا تَفْعَلُـونَ﴾ ﴿٣﴾ «صف» **واتە: ئەگەر قسێک بکەی و بڵێی و بەرابەری ئەو قسەیە عەمەل نەکەی دەبـێ بە نیشـانەی تیـری ڕق و تووڕەیی خودا.**

خودای خاوەن بەزە ئەگەرچی سەرەڕۆیی ئینسان بەتایبەت زانایان لە سـۆنگەی جـوولەکە نیشان دەدا، و زاناشە بەوەی لادانیان لە لاسـاری و بەدکـرداری هەر نـابێ و دەرگـای ڕەحمـی خۆشیان لە سەر پێوە نادا، بەڵکە هەتا هەن بانگیان دەکا بۆ کاری چاک و گەڕانەوەیـان بـۆ لای حەق، بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ۴۵:

﴿٤٥﴾ وَاسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلاَّ عَلَى الْخَاشِعِينَ

**ئەی ئینسان، داوای یارمەتی لە خودا بکەن لە هەموو کارێکا، بە خۆڕاگرتن و نوێژ کردن**

## ئاوڕدانەوە

خۆڕاگرتن لە هەرچی کاروباری ژیان و بـاری کـۆمەڵایەتییە تێشـوویە بەتـایبەت لە کـاتی تەنگانە و سەخڵەتی، بۆیە قورئانی پیرۆز لە ۱۰۲ شوێندا ئەمری پێ کـردووە و دەسـتووری پـێ داوە و هەروا بە پێی بەراوەرد و لێکدانەوە، دان بەخۆ گرتن و خۆڕاگری لە سەر خراپە نەکـردن

و چاکە کردن بە هۆی دوو شت دێتە دەست:

١. بە یاد کردنی خودا و پاداشی دواڕۆژ لە سەر چاکە کردن و دووری لە خراپە

٢. بە نوێژ کردنی بەهۆش و گۆش چونکە نوێژی وا هەستی خودا دەچێنێ لە مڵکی دڵـدا. نوێژی ئاواش ئێجگار سەخت و گرانە بۆیە خودا فەرموویەتی دە ناو ئایەتەکەدا: وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلاَّ عَلَى الْخَاشِعِينَ. **نـوێژی بەهـۆش و گـۆش زۆر قـورس و سـەختە، مەگەر لای ئەوانە نەبـێ کە لە خـودا دەترسێن.**

دڵ ئەوە دەسەلمێنێ: دڵی تاریک و ڕەش چونکە بێنـوورە، نـووری حەق چـاو ناکـا، ئەو ڕەش و تـاریکییەش ئەزەل ڕەپـاڵی نەخسـتووە، بەڵـکە تەپوتـۆزی ژیـانی گەردوون و هەوا و مژەکوێرەی هەوەس ڕەپاڵی خستووە. هەربۆیە خودای مەزن لۆمەی دەکا و ئامۆژگاری دەداتـێ و پێی دەڵێ: ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ﴾ **واتە ئایا بە خەڵک دەڵێن چاک بـن بەڵام بە خۆو ناڵێن؟ واتا خۆو لە بیر دەچێ؟**

دە دیارە لە مانای ئایەتەکە کە خودا دەفەرموێ خۆو لە بیر دەچێ یانی دە ئەزەڵدا دڵی ڕوون و خاوەن دەرک و بەهەستوو هەیە و دراوتانێ بەڵام لە بیری خۆی دەبەنەوە.

تێڕوانینێک: گەرچی «صبر» بە کوردی واتە خۆڕاگری، بەڵام زانا عەڕەبەکان دەڵێن «صـبر» واتە ڕۆژووگرتن، ڕۆژوو گرتن ئاوری توند و تیژ و تووڕەیی و تاڵووکەیی دادەمرکێنـێ دەتخـاتە وڵاتی خۆڕاگری و دان بەخۆدا گـرتن. بـۆ بـاوەڕی بـڕوانە تەفسـیری کەبیـر، ج٤، لاپەڕەی ٤٩ ئایەتی ٤٥.

لە ئاخری ئایەتەکەدا «خاشع» نیشان دراوە کە بە مانای ترسە. واژەی «خضوع»یش هەر بەو مانایە. هەردووکیشیان کاری دڵن، دەبێ دڵ بزانێ و قەناعەتی پێ بـدرێ، تەفـاوەتی ئەو دووانە چییە: خشووع بە مانای ترس واتە هەستی ترس لە نـاو دڵـدا. «خضـوع» واتـا ڕاگرتنـی نەزم و نیزامی ئەندامی لەش کە دڵ ئاغایەتی، بەو پێیە دەبێ دە کاتی نوێژدا هەم تـرس و تەقـوات بـێ، هەم ویقار و نەزم و حەیا.

دڵ بگاتە قۆناغی ﴿الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَاقُو رَبِّهِمْ﴾ بە کـوردی وا بزانـدرێ دەگەڵ خـودا دەدوێ، نوێژ لای وانە گران نییە.

﴿٤٦﴾ **الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلاَقُو رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَاجِعُونَ**

**ئەو کەسانەی سوور دەزانن پەروەردگاریان ملاقات دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ لای خۆی.**

## گەڕانەوەی هەمووان بۆ لای خودایە

دڵی خاوەن ئیمان و بەهەست هەڵدەبەزێتەوە لەوەی: گومانی هەبێ لە ملاقات و گەیشتن بە خودای، پێویستە ئەو گومانە بڕەوێندرێ و لە ناو دڵ ڕاماڵ درێ.

دەبێ بۆ ئەو تەم ڕەواندنە بکوترێ «ظن» ئایەتی ٤٥ی بەقەرە بە مانای گومان نییە، وەک «ظن» لە ئایەتی ٢٨ سوورەی نەجمدا: ﴿إِنَّ الظَّنَّ لاَ يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا﴾ واتە گومان هیچ حەقێک چارە ناکا. وەهەروا دووبارە بۆ وەی دڵ بە قەناعەت بگا کە «ظن» بە مانای یەقین هاتووە، وەک دە ئایەتی ٢٨ سوورەی قیامەتدا چاو دەکرێ: ﴿وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ﴾ واتە یەقینیەتی کاتی لێک هەڵبڕانە.

وەهەروا لەبەرئەوەی باوەڕی بە ڕۆژی ئاخرەت، ئەساسی پرینگاندنەوەیە لە خراپە، و چوونە پێشە لە چاکە، دەبێ دڵ زۆر هەستیارانە بۆ باوەڕ پێ بوونی خۆ توند و تۆڵ کا، جا لە سەر ئەو ئەساسە واتە توندوتۆڵیەی ئەگەر ئەو باوەڕیە بە دەرگا و دەروازەی گومانیشیدا ڕاببرێ هەر بە حەق و یەقین دێتە حیساب و خودا وەریدەگرێ. بە کوردی و بە کورتی، باوەڕی بە ڕۆژی قیامەت و بە ملاقاتی خودا بە شەرتی عەمەل و تەقوا دەگەڵ ئەو باوەڕیەی ئەگەر گومانیش لەو بارەوە بە دڵدا بێت و بڕوا، وێستا خودا لێی قبووڵ دەکا ئیمانی. بۆ زێدە زانین بڕۆ بۆ خزمەتی تەفسیری کەبیر، ماڵە ئایەتی ٤٦.



دووپات کردنەوەی ئامۆژگاری خودا بۆ هۆزی یەهوود، هاواری بە گوڕە وەلای ئەوەی یەهوود لە سەرەڕۆیی لادا، وەکەوێ و هەروا ئامۆژگارییە بۆوەی نەسلی داهاتووی وان دەرسی لێ وەرگرن. بۆ تێگەیشتن لەو بارەوە دەچینە خزمەت ئایەتی ٤٧ی بەقەرە:

**﴿٤٧﴾ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُواْ نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ**

**ئەی نەوەکانی یەعقووبی پێغەمبەر، یادی ئەو چاکانە وەکەن وەختی خۆی ڕژاندوومەتە سەرتان، وەهەروا باوی باب و باپیرەکانی ئێوەمدا لە کاتی مووسا و دوای ئەویش تا ماوەیەکی زۆر بە سەر هەمووانا، بە هۆی ڕەوانە کردنی پێغەمبەرانی زۆر لە ناوتانا، وەهەروا ناردنی نامەی ئاسمانی بۆتان و هەڵخستنی پاشا لێتان.**

## وەبیرهێنانەوەی نیعمەتەکانی خودا لە سەر بەنیئیسرائیل

تێڕوانینێک لە ڕێز گرتنی یەهوود، دە بەرابەر لاساری و بەدئەخلاقی وان، مەسەلەن ڕێزدار

کران دەورانێکی بە هۆی هەڵخستنی پێغەمبەری زۆر لێیان، ڕێزیان گیرا بە هۆی ناردنی کتێبی ئاسمانی بۆیان وەک تەورات بێ، ڕێزیان بۆ داندرا بە هۆی هەڵخستنی پاشا لێیان وەک سولەیمان پێغەمبەر بێ؛ بەڵام دیارە بە هۆی دڵی ڕەش و سەختیان نە ئاوڕیان داوە سەر ئەنعامی باری و نە شوکرانەی ئەو نیعمەتانەیان کرد تا سەرەنجام کەوتنە بەر شاڵاو و هێرشی ڕق و قەهری باری پرژ و بڵاو بوون دێر و دەوێدا. ئەگەر لە مێژووی دەورانی جوولەکە بڕوانی باوەڕ دەکەی کە وەک دەڵێن وان.

دەبێ ئەو پرسیارە بکرێ خودا کە فەرموویەتی ﴿وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ ئایا عالەمی هەموو دەور و زەمانی مەبەستە خودا؟ یا عالەمی دەورانی خۆیان؟ بێ گومان بە پێی هەڵسەنگاندن و ئاشنایی بە سەر ئۆمەتانی پێش و پاشی خۆیان، بەو یەقینە گەیشتوون کە مەبەست عالەمی دەوری خۆیانە، چونکە ئەگەر گەورەتر و ڕێزدارترین ئۆمەتی دەوران بان نەدەبا ببانە مەیموون و بەراز. وەک خودای تەعالا دە ئایەتەکانی ٦٥ی بەقەرە، ٦٠ی مائیدە و ١٦٦ی ئەعرافدا ئاماژەی وەلا کردوون. بۆ باوەڕ و یەقین سەیری ئایەتەکان کە:

فَلَمَّا عَتَوْاْ عَن مَّا نُهُواْ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كونُواْ قِرَدَةً خَاسِئِينَ ﴿٦٦﴾ «اعراف» **کاتێ کۆڵیان نەدا و دەستیان هەڵنەگرت لەو ئەمرانەی کرابووە سەریان، خودا دەفەرموێ کوتمان: دە بڕۆن ئەوجار ببنە ئەو مەیموونانەی ترۆ کراون.**

قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَلِكَ مَثُوبَةً عِندَ اللّهِ مَن لَّعَنَهُ اللّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ أُوْلَـئِكَ شَرٌّ مَّكَاناً وَأَضَلُّ عَن سَوَاء السَّبِيلِ ﴿٦٠﴾ «مائده» **ئەی محەممەدﷺ بێژە بەو یەهوودە خاوەن کتێبانە، ئایا خوازیارن ئاگادارو کەم لەو کەسانەی کە سزای تاوانیان لە لای خودا لە سزای وان خراپتر بێ؟ ئەوانە کەسانێکن وەبەر لەعنەت و تووڕەیی خودا کەوتوون، و خوداش غەزەبی لێ گرتوون، و هێندێکیشیان بە هۆی زەلامی تاوانیان کراونە مەیموون و بەراز کە عەبدایەتی بتیان دەکرد، شوێنی وان لە هەچی شوێنی عەزابە خراپترە، چونکە لە هەچی ڕێ لادەرە، لادەرتر و لاسارترن.**

وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ الَّذِينَ اعْتَدَواْ مِنكُمْ فِي السَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كونُواْ قِرَدَةً خَاسِئِينَ ﴿٦٥﴾ «بقرة» **بەڕاستی خەبەرداری حاڵی ئەو کەسانەشتان بوون کە لە ڕۆژی شەممەدا لە ڕادە بەدەر چووبوون دەر لە خراپەدا، ئەمەش بۆیە پێیان کوتن دە بڕۆن ببنە مەیموون و بەرازی دەرکراو «بە هۆی ئەو تەجاوز و سەرەڕۆیەی نیشانوو دا.»**

ئەگەرچی سەرەڕۆیی و لاساری یەهوود لە ڕادە بەدەرە بەڵام بەزەی خوداش فراوانترە بۆوەی تووشی سزای ڕۆژی قیامەت نەبن، بە ئایەتی ٤٨ی بەقەرە ئامۆژگارییان دەداتێ و

بانگیان دەکا و دەفەرموێ:

﴿٤٨﴾ وَاتَّقُواْ يَوْماً لاَّ تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْئاً وَلاَ يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَاعَةٌ وَلاَ يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلاَ هُمْ يُنصَرُونَ

**خۆتان بپارێزن لە سزای ڕۆژی دوایی کە کەس لە جیاتی کەس تۆڵە یا پاداش نادرێتەوە و تکای هیچ تکاکارێکی بۆ گیرا ناکرێ و هەروا بارمتەی لێ وەرناگیرێ و یارمەتیش نادرێ تاکوو سزایان لێ دوور بخرێتەوە.**

## شەفاعەت چییە و بۆ کێیە؟

دڵی سڵ و پڕ لە هەست دەیهەوێ بزانێ ئەو شفاعەتەی کە خودا فەرموویەتی هەیە بەڵام بێ ئیزنی ئەو نابێ و نایەتە ڕوو، چییە ئەو شەفاعەتە؟ و کام گوناە و تاوانە بەر شەفاعەت دەکەوێ و کام تاوانە وەبەر شەفاعەت ناکەوێ؟

دیارە لای زانایانی قورئان مشتومڕ و بیروڕا لە سەر شەفاعەتی پێغەمبەران بۆ گوناهباران لە ڕۆژی قیامەت زۆرە و هەیە، هێندێک سوورن لە سەر ئەوەی شەفاعەت بۆ گوناحانێک کە غەیری «حق الناس» بێ هەیە، هێندێکیش دەڵێن نییە، هەرکام لەو دوو نەزەرانە بۆ ئیسباتی داوایان دەلیل لەولاولایان دێننەوە ئەگەرچی هیچ دەلیلێکی سەریحی قورئانی لەو بارەوە چاو ناکرێ.

ئەگەرچی ئێمە لە جێی خۆی لە کتێبی «ئەقڵکاری دە تەرازووی نەقڵکاری»دا بە تێروتەسەلی لەو بارەوە دواوین، بەڵام دێرەشدا بە پێویستی دەزانم ئاماژەیەکی کورتی وەلا هەر بکەم: شەفاعەت بە پێی ئاماژەی ئایەتەکانی ٣ سوورەی یونس خاسی خودایە کە دەفەرموێ: ﴿مَا مِن شَفِيعٍ إِلاَّ مِن بَعْدِ إِذْنِهِ﴾ واتە: کێ دەتوانێ تکاکار بێ بەبێ ئیجازەی خودا. وهەروا ئایەتی ٤٤ی «زمر»: ﴿قُل لِّلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعًا﴾ **واتە بڵێ ئەی محەممەدﷺ شفاعەت خاسی خودایە، واتە کەس بێ ئیزنی ئەو ناتوانێ تکاکار بێ.**

وردبوونەوەیەک لەو بارەوە: لە سەر ئەساسی ئەقڵ وئینساف و عەداڵەت، زۆری لێکراو حەقی هەیە لە سەر زۆردار، ئەو حەقە حەقی زۆرلێکراوە ببەخشێ یا نەیبەخشێ، و ئەوەش ئاشکرایە ڕۆژی قیامەت هەچی نەفسە نیازی هەیە بۆوەی ڕزگای بێ لە ناڕەحەتی و عەزاب، جا ئەگەر بێتوو حەقی لە سەر کەسێک بێ، دەیهەوێ ئەو حەقەی بکاتە وەسیلەی نەجات، بەو پێیە

پێغەمـبەران نـاتوانن بـێ نەجـاتی ئەو ئینسـانە ئەو حەقەی ئەو ببەخشـن. وەهەروا ئەو خـاوەن حەقەش حەقی یەکی دی بە سەرەوە هەیە، کەوابـێ دەبـێ بە یەقیـنەوە باوەڕمـان وا بـێ هەر بە خودا دەکرێ ڕازی کردنی زۆرلێکراوان بۆ بەخشـینی حەقیـان لە زۆرداران. ئەدێـرەدایە ئەقـڵ و ئینساف و عەداڵەت تەسلیم دەبێ بۆ وەی «شفاعەت» تایبەتی خـودایە، واتە خـودایە دەتـوانێ حەقی خۆی لە زۆرلێکراوان نەسـتێنێ و بیانبەخشـێ و ئەوانـیش لە سـەر داوای خـودا حەقـی خۆیان لە زۆرداران خۆش بن. جا ئەو بێنە و بەرەیە دەکرێ خودای مەزن حەواڵە بە پێغەمبەرانی کا لەبەر کەڕامەتی پێغەمبەران.

دەلیل و بەڵگەی ئەوەی کە شفاعەت هەیە ڕۆژی قیامەت بۆ تاوانباران، سیمای ئایەتەکانی ٢٣ «سبأ»، ١٠٩ «طه» واتە لە سیما و دەروونی وانڕا دەردەکەوێ کە شـەفاعەت هەیە جـا بـا بە ئیزنی خوداش بێ:

**﴿يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَنُ وَرَضِيَ لَهُ قَوْلًا﴾ (١٠٩) «طه» ڕۆژی ئاخرەت تکـای کەس بۆ کەس بەهرە نادا مەگین خودا ئیزن بدا ...**

**﴿وَلَا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِندَهُ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُ﴾ (٢٣) «سبا» نەفع نادا تکای کەس بۆ کەس مەگەر خودا ئیزن بدا.**

بە پێی وردبـوونەوە و هەڵسـەنگادنی ئەو دوو ئـایەتە، دەبـێ شـەفاعەت هەبـێ و ئیـزن و ئیجازەی خوداش دەروازەیەتی.

بۆوەی بتوانین دڵ دامەزرێنین و لە کەند و کۆسـپیش بەدوور بـین، لەمەڕ بـوونی تکـا واتە شەفاعەت، دەبێ مانای ئایەتی ٤٨ ئاوا تەعبیر کەین: شەفاعەت ئەگەر نییە، بۆ کافران نییە؛ واتە بۆوانەی لە ئەساسدا پەیمانیان دەگەڵ خودا نییە و دانەبەستووە و ترووسکایی نـووری ئیمانیـان لە دەروونیدا چاو ناکرێ. بەڵام بۆ ئەو کەسانەی پەیمانیان دەگەڵ خودا بەستووە ئەمما بە هـۆی بێمبالاتی نەیانتوانیوە شەرتی پەیمان بێننە جێ، بۆ وانە تکا هەیە بە شەرتی ئیزنی بـاری، دیـارە خـوداش ئیـزن دەدا چـونکە ئەسـاس و بنچیـنەی پەیـمان نەشـکاوە، بەڵـکە هەر زیـنەت و جوانییەکەی لێ کەم کراوە واتە ئەو پەیمانە بە چاکە و تەقوا نەڕازاوەتەوە.

بە پێی بەراوەرد و لێکدانەوەی ئـایەتی ٤٨ هەسـت بەوەی دەکـرێ هـاتنە خـوارەوەی ئەو ئایەتە هەسدانەوە و لە دەمدانی یەهوودییەکـان بـێ کە دەیـانکوت چـونکە پێغەمبەرانـی زۆر لە مەن، دەکرێ ڕۆژی حیساب تکامان بۆ بکەن و هەروا بەرتـیلمان لـێ وەرگـرن وەک دنیـا، جـا

خودای خاوەن حیکمەت وحەکیم هات بەو ئایەتە خەیاڵی پووچەڵ کردنەوە، ئامۆژگـاری پـێ دان کە بەرتیل نییە لەو ڕۆژیدا و بەبێ ئیزنی خواش تکا نەفع نادا.

**هەستێکی ناسک:**

هەچەن هیوای شـەفاعەت لەوانەیە وە غیرەتـت خـا بـۆ تـاوان کـردن، بەڵام نائومێـدی لە شەفاعەت وڕەحمەتی باری بە یەکجاری بتخاتە چاڵی ڕەشی کـافرەتی، کەوابـێ دەبـێ خـاوەن ئیمان هەچەن تاوانی زلیش بێ هەر بە هیوای تکاکار بێ وەک خودا بێ.

دەشکرێ وای بەروارەد کەین: نیشانەکانی باری وەک ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە و ئاڵوگۆڕی وەرزان بەو نزامی وا ڕێکوپێک و جوان شافیع و هاوار و بانگاواز بن بۆ ئینسـانی چـاک، واتە نیزامی کائینات شیفاعەتی تەکوینی بن، شیفاعەتی تەشـریعیش تکای تکاکاران.

خودا بە پێی بەزە و عەداڵەتی دەگەڵ بەرەی ئینسان تا ئاخرین ژیانی ئینسـان دەسبەرداری نابێ و هەر بانگی دەکا بە نیشانەی ئەوەی ئینسانی خۆش دەوێ وازی لێ ناهێنێ. ئامۆژگـاری دەدا بە کردارەکانی ڕابردوو بەڵکە دەرسی لێ وەرگرن بـۆ ئیسـباتی ئەو داوایە دەچیـنە خـزمەت ئایەتی ٤٩ی بەقەرە:

﴿٤٩﴾ وَإِذْ نَجَّيْنَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ

**وەبیر خۆی خەنەوە کاتێک کە ڕزگارم کردن لە دەست وپێوەنـدەکانی فیرعەونـی، کە پێتـانی دەچاشتن سزای سەخت، بەم ڕەنگە کوڕیان سەر دەبڕین و کچیان دەهێشتەوە تا دواتان ببڕنەوە، و لەو سزا سەختەی کە بە سەرتانا بڕا و درا، و لە ڕزگار کردنتان لێی، تاقی کردنەوەیەکی زۆر گەورە و گرانـی تێـدایە بـۆ ئێـوە لە لایەن پەروەردگارتـانەوە، کە لە لایەکەوە فیـرعەون و دەستوپێوەندەکەی بە سەرتانا زاڵ کردن لە پاشان مووسای بۆ ناردن تا ڕزگاری کردن.**

**تێوەڕامان و هەڵسەنگاندنێکی ورد و تەواو**

دیارە چاژتنی هەموو تاڵی و سەختییەک تاقی کردنەوەیەکە لە لای خوداوە بـۆ ئینسـان جـا هەر کەسێک بڕوای بەو یاسـا و نیـزامە بـێ جـگە لەوەی لێـی بەهرەمەنـد دەبـێ دە تەنگـانە و سەختیشدا خۆڕاگر و بەتوانا دەبێ.

مێژووناسان دەڵێن: لە نەوەی ئیسـرائیل یەکەم کەس کە چـووە میسـر، یۆسـفی پێغەمـبەر بووە، لە پاشان یازدە براکانیشی چوون بـۆ لای و لە مـاوەی ٤٣٠ سـاڵاندا بـوون بە ٦٠٠ هەزار

کەس. کاتێ فیرعەون سەیری ئەو پێهەڵچوون و زیادبوونەی کرد کە جوولەکە ڕۆژ بە ڕۆژ پەرە دەستێنن و زیاد دەبن، و پشتی یەکتریش دەگرن، ترسی ڕێ نیشت کە بەو هەوایە پاڵ بە میسرییەکانەوە دەنێن دە ڕۆژی خۆیدا هات فیرعەون بۆ ئیحتیات و تێبینی دواڕۆژ لاوازیان بکا و پاشەکشەیان پێ بکا لەو پەرە ستاندنە. بەو شێوەیە فەرمانی دەرکرد بیانکێشنە ژێر باری بێگار و ڕەنجەوە. فیرعەونییەکان ئەو فەرمانەیان ئیجرا کرد بەڵام دەگەڵ ئەوەش زیاتریان پەرە دەستاند دەچوونە پێشەوە. باو و ئادابی خۆیان دەپاراست، خۆیان لە تێکەڵاوی میسرییەکان بەدوور دەگرت، چونکە پێیان وابوو ئەوان هەڵبژاردەی خودان و نەوەی پێغەمبەرانن. دووبارە فیرعەون و فیرعەونییەکان هاتن توندتر پێشیان پێ بگرن بەو شێوەیە: بڕیاریان دەرکرد کە نێرینەکانیان بکوژن و مێیینەکانیان وەهێڵن، و بە مامانیان دەستوور دا هەر ژنێک کە زا، ئەگەر منداڵەکە کوڕ بوو بیکوژن. بەڵام ئیرادە و ویستی باری کە لە پشتی پەردە چاوەدێری هەموو کاروبارێکە ڕێ نادا فێڵ و حیلەی مەکربازان سەرکەوێ بە سەر حەق و حەقانییەتی ئەوزاع. بیندرا چۆن حەزرەتی مووسا هات و سیحر و فێڵ و فووتی فیرعەون و ساحیرانی دەورانی ڕامالْ دا و حەقی وەسەر ناحەق خست. ئەو کارەساتە و هەموو کارەساتەکانی ئۆمەتانی ڕابردوو دەرسن بۆ ئۆمەتانی داهاتوو.

## فێڵی فیرعەون لە بەرەی بەنیئیسرائیل

ئاوڕدنەوەیەک وەسەر ڕازی ئەو کارەساتەی فیرعەون و تێکشکانی هێزی فیرعەون بە قودرەتی حەق:

فیرعەون بە خەیاڵی خۆی هات جێگا ژیانی خۆی ئەمن کا و خۆش کا بە لە ناو بردنی نەتەوەیەک، نەسل‌کوژی نەسلێک هەر ئەوڕۆ فیرعەون سیفەتەکان ئەو نەقشە بازی دەکەن بەڵام ڕێدانی خودا بۆ چوونە پێشی ئەوانە تا ماوەیەکی ئاشکرا بوونی مەڕامیان لە دنیا و تێک‌شکاندنیان لە پاشان هاوارێکی زۆر بەگوڕ و تینە بۆ گەلانی دەوران کە زۆردار بێ بنەما و بێ ڕیشەیە. با وبارانی حەقی دەوران ڕامالْیان دەدا و ڕەپێچەکیان دەدا وەک پووش و پەڵاش بۆ کەندەڵانی نابوودی، ئەوە ئاشکرایە و حاشا هەڵنەگرە بەڵام چ دەکرێ دەگەڵ کوێر و کەڕ و کاس، نە دەبینێ و نە دەبیسێ.

پێویستە بزاندرێ فیرعەون کێ بووە؟ و ناوی ئەسڵی چ بووە؟ مێژووناسان لەو بارەوە نەزەری جۆراوجۆریان دەربڕیوە، کوتوویانە فیرعەون ئەهلی تەورات و ئینجیل بووە و لە مەڕ

ناوی کۆکن لە سەر ئەوەی ناوی قابووس بووە. کۆنیەشی ئەبو مودرە بووە. لەقەبیشی فیرعەون لە قیبتیەکان بووە. بۆ زێدە زانین ڕووکە لە تەفسیری کەبیر، ج٤، لاپەڕە ٦٧.

ئاسارناسان باوەڕیان وایە ئەو فیرعەونەی خنکا لە دەریادا، منفتاح کوڕی ڕامسیس بووە، مێژووناسانی ڕۆژئاوا و یۆنانییەکان و میسرییەکان تەئکید دەکەن نەزەری ئاسارناسان و هەروا مێژووناسەکان کوتوویانە: لە بەرەی فیرعەونەکانی میسر دوو پادشا هەڵکەوتوون بە ناوی ڕامسیس، ڕامسیسێکیان بابی منفتاح بووە، ڕامسیسی دووهەمیشیان بە ناوی فیرعەون کە لە دەورانی ئەو ڕامسیسە دووهەمە بووە قیبتی میسری کوشتووە، مووسا لە دەورانی پێش پێغەمبەرایەتیدا و هەر ئەو ڕامسیسە دووهەمەی بە ناوی فیرعەون بووە خنکاوە، پێش ئەوەی فیرعەون ببێ بە پاشا، بەڵکە یاریدەدەری بابی بووە. و هەر ئەو فیرعەونە چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد ڕۆژێک مووسای دەس کەوێ بە تۆڵەی قیبتی سزای بدا. کاتێ مووسا بە پلەی پێغەمبەری گەیشت و هاتە میسر، ڕامسیسی هەوەڵ نەمابوو بەڵکە منفتاح واتە بە ناوی فیرعەونی مەنشوور مابوو کە داوای خودایەتی دەکرد، سەرەنجام خودا خنکاندی دە دەریای میسردا. بۆ زێدە زانین ڕوو کەنە تەفسیری «تبيين القرآن»، ج ٢، لاپەڕەی ٤١١.

**ئاوڕدانەوەیەک**

خودا ڕووی دە یەهوودیەکانی دەورانی حەزرەتی محەممەدﷺ دەکا و بۆ وانی باس دەکا بەسەرهاتی کەسانیان، تا دەرسێ وەرگرن. ئەو شێوە دواندنە واتە بە چاودا دانەوەی خراپەی ڕابوردووان، هاوارە وەلای ئەوەی: ڕابردوو ئاوێنەی داهاتوویە، دەبێ خۆی تێدا چاو کەی، ئەگەر چاکەت تێدا چاو کرد جگە لە شانازی و سەربەرزیت دەبێ ئەو ئاسارە پڕ بایخە لە دەس نەدەی و بیگری و بکەویە شوێنی. و ئەگەر خراپەت تێدا چاو کرد جگە لەوەی لۆمەتە و شەرمەزاری لێ دەتکێ دەبێ ونی کەی و بە ئاکاری چاک بیسڕیەوە.

کاتی ئەوەی هاتووە بچینە خزمەت ئایەتی ٥٠ تاکوو لە ئەنعامی باری، چاک تێبگەین کە دەگەڵ یەهوودی سەرەڕۆ و لاساری کردووە.

﴿٥٠﴾ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ الْبَحْرَ فَأَنجَيْنَاكُمْ وَأَغْرَقْنَا آلَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ

**وەیاد خەنەوە ئەو کاتەی کە دەریام بۆ قەڵاشتن لە وەختێکا کە لە دەس فیرعەون ڕایان دەکرد، وە دەریا لە پێشتانەوە و لەشکری دوژمن لە دواتانەوە بوو، ئنجا ئێوەم ڕزگار کرد و دەست وپێوەندی فیرعەونم خنکاند لە دەریادا، و ئێوە تەماشاتان دەکرد.**

## ئاوڕێک وەسەر خنکانی فیرعەون و دار و دەستەکەی

دە خنکانی فیرعەون و هەواداڕانی بە ئاوی دەریا ڕازێک هەست پێ دەکرێ ناڕەوا نییە بدرکێندرێ ئەو ڕازە. ئەویش ئەوەیە: فیرعەون لە کاتی خۆیدا بە دار و دەستەکەی ڕاگەیاندبوو کە دەریا و ویشکانی لە ژێر ئیختیاری خۆمدان وەک قورئان دە ئایەتی ٥١ی «زخرف» ئاماژەی وەلا دەکا: وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِ قَالَ يَا قَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ الْأَنْهَارُ تَجْرِي مِن تَحْتِي أَفَلَا تُبْصِرُونَ واتە: **فیرعەون بە دەست وپێوەندەکەی ڕادەگەیاند و دەیکوت: گەلم گەلۆ! ئایا مەگەر ملکی من نین: ئەو هەموو ئەرز و وڵاتی میسر و ئەو ئاو و ڕووبار و ئاوانەی کە بە پێشماندا دێن و دەڕۆن و لووزەو دەبەستن؟ ئایا ئێوە نەتانزانیوە و نەتانبیستووە؟**

لە تێهەڵڕوانینی تەواو لە سیما و دەروونی ئایەتی ٥٠ نیعمەتی زۆر بەرچاو چاو دەکرێن کە خودای تەعالا ڕەوای یەهوودیان کردووە، هەم دنیایی هەم ئاخیرەتی:

١. دە فریا کەوتنی مووسا و یارانی لە ناو دەریادا، واتە ئەگەر دەریا قووتی نەدابان فیرعەون و دار و دەستەکەی دەگەیشنە مووسا و یارانی.

٢. قەڵاشتنی دەریا بە عینوانی موعجیزە و قووتدانی فیرعەون و هەواداڕانی لە بەرچاوی ئۆمەتی مووسا بۆ ئیسباتی پێغەمبەرایەتی.

٣. خنکاندن و تارومار کردنی دوژمنی وا گەورە لە کاتی ئاوا سەخت و چارەنووسساز کە بە درێژایە مێژووی زەمان هەر سەیر بکرێ لەوە نیعمەتتر نیعمەت نابێ.

٤. سەراپای ماڵ و ملک و سامانیان کەوتە دەستی مووسا و ئۆمەتی لەوە گەورەتر نیعمەت نابێ.

٥. لەناوچوونی فیرعەون و دار و دەستەکەی بۆ هەتاهەتایە گەورەترین نیعمەتی دنیا و ئاخرەتە.

﴿وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾ **شاهیدی سەرکەوتن و ئەمنیەتە بە ئیتمینانەوە.**

## ئاوڕێک وەسەر ﴿وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾

قورئانزانەکان ئاوا دەڵێن: مووسا کە بە پێی ئیلهام ١٢ وەکازی داهێنا دەریا، ١٢ داڵانی تێ خست کە یارانی مووسا یەکتریان چاو دەکرد دەو داڵانانەدا بۆ وەی سامی دەریا نەیانگرێ.

پاش بەیانی ڕزگاری مووسا و یارانی لە دەس فیرعەون، باسی ڕەحم و لوتفێکی دیکە دەکا خودا کە دەگەڵ یەهوودی بەجێ هێناوە هەروەک ئایەتی ٥١ی بەقەرە ئیشارە وەلای ئەو مەتڵەبە

دەکا:

﴿٥١﴾ وَإِذْ وَاعَدْنَا مُوسَى أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ اتَّخَذْتُمُ الْعِجْلَ مِن بَعْدِهِ وَأَنتُمْ ظَالِمُونَ
**وەیادی خۆ خەنەوە ئەو کاتەی کە بەڵێنمان دا بە مووسا کە پاش چل شەو خواپەرەستی لە کێوی توور تەوراتی بە سرووش بۆ بنێرین، کەچی دوای چوونی مووسا بۆ کێوی توور هاتن گوێرەکەیەکیان لە زێڕ دروست کرد و دەستیان کرد بە پەرەستنی. واتە پاش چوونی مووسا بۆ کێوەکە گوێرەکەیەکتان کردە خودای خۆتان و دەستان کردە پەرەستنی ـ وە ئێوە ستەمتان کرد لە خۆتان.**

لە سوورەکانی «اعراف» و «طه» بە درێژی باسی گوێرەکەکە کراوە دێرەدا ئەوەندە باشە بیر خستنەوەیە، تاکوو تێبگەین کە جوولەکە هەر لە بنەڕەتڕا لاسار و سەرەڕۆ بووە دەگەڵ پێغەمبەری خۆشان، چ جای پێغەمبەری ئیسلام واتە محەممەد مصطفیﷺ. بەڵام دەبێ بە دڵ زەین بکرێتە بەزە و حیکمەتی خودا، کە لە سەر ئەو حاڵەتەشڕا هەر دەیانبەخشێ و لێیان خۆش دەبێ، تەوراتیان بە مووسادا بۆ دەنێرێ، بەڵکوو بێنە سەر ڕێگای ڕاست، بۆ ئەو مەبەستە بچۆ خزمەت ئایەتی ٥٢.

## مووسا بۆ ناوی مووسایە؟

پێویستە پێش ئەوەی ئایەتی ٥٢ دەس پێبکەین بزانین ئەو ناوەی مووسا بە چ هۆیەک کراوەتە ناو بۆ حەزرەتی مووسا. کوتراوە: کاتێ مووسا لە شاری مەدیەن دەگەڕێتەوە هەر لە هەمان گەڕانەوەدا شەو بە مەقامی پێغەمبەرایەتی دەگا و چوونیشی بۆ کێوی توور کە بۆ وەرگرتنی تەوراتی پیرۆز بووە دەگەڵ تاقمێک لە گەلەکەی دووهەمین کەرەتی دەبێ، ئە دەو سەفەرەیدا تەوراتی دەدرێتێ. واژەی مووساش کە پێکهاتووە لە «موو ـ سا» دەڵێن عەبرانین. دە فەرهەنگی عەبرانیش «موو» واتە ئاو، «سا» واتە دار، بەو پێیە دەبێ بکوترێ: دایکی کە لە ترسی فیرعەونی دە کۆلکەداری نا و خستیە ناو نیلی میسر، پاشان ئاسییەی فیرعەون کە دەیگرێتەوە لە ناو ئاوەکە، ناوی دەنێ کوڕی ئاو و دار، واتە مووسا بە زمانی وان. هێندێکیش کوتوویانە کەلیمەی مووسا ڕاستەوخۆ کراوەتە عەلەم بۆ مووسا بێ ئەولاولا. بۆ زێدە زانین تەماشای تەفسیری کەبیر کە، ج ٤-٣، لاپەڕەی ٧٤-٧٣.

## مووسا بناسین

مووسا لە پێغەمبەرە ئولولعەزمەکانە واتە خاوەنی کتێب و ئۆمەت و ئایینی سەربەخۆ. تەنانەت بە نەزەری هێندێک لە ئایینزانەکان مووسا لە ڕوتبەی دوودا پاش بەرزی مەقامی محەممەدﷺ مەقامی ئەوە. ئەگەرچی هەن دەڵێن: ئیبراهیمە لە ڕوتبەی دوودا. هەشن دەڵێن: عیسا دە ڕوتبەی دوودا. بەڵام هەن دەڵێن: تەوڕات لە تێروتەسەلیدا لەمەڕ کۆمەڵایەتی چەشنی قورئانە. و موعجیزەکانی مووساش وەک موعجیزەکانی محەممەدﷺ زۆر زیاتر لە پێغەمبەرەکانی دی. بەو پێیە دەبێ لە ڕوتبەی دوودا بێ.

مووسا وەک مێژوونووس و ناسان کوتوویانە دەبێ ٢٥٠ ساڵ پاش وەفاتی ئیبراهیم بووبێ و تەمەنیشی ١٢٠ ساڵ بووە، لە مەیدانی «تیە» وەفاتی فەرمووە لە نیزیکی «تپەریگی سوور» نێژراوە. مووسا زیاد لە پێغەمبەرەکانی دیکە ناوی لە قورئاندا هاتووە دەگەڵ هاڕوونی برای دە ناو ٣٨ سووڕەی قورئاندا ناویان هاتووە. و هەر دە ناو ٥١٤ ئایەتدا باسیان کراوە و یادی هاڕوونی برای بەتایبەتی ١٤ جار باس کراوە و ناوی مووسا و هاڕوون پێکەوە دە ١٣٠ ئایەدا هاتووە. هەشن کوتوویانە ناوی ئەو دوو برایە بە یەکەوە دە ١٢١ ئایەدا هاتووە. حەزرەتی مووسا بنچینەی ئەو پێغەمبەرانەیە: عیمرانی کوڕی یصهر، یصهر کوڕی قاهث، قاهث کوڕی لاوی کوڕی یەعقووب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم. بۆ زێدە زانین زەین کە تەفسیری کەبیر، ج٤، لاپەڕەی ٧٤.

## چل شەوەی مووسا

ئاوڕێک وەسەر ﴿أَرْبَعِينَ لَيْلَةً﴾: دەبێ ئەو پرسیارە بکرێ: ئەو چل شەوە مووسا دە عیبادەتی ڕۆژوو گرتندا بووە، خۆ دیارە ڕۆژووش دە ڕۆژدا دەگیرێ و بەدی دێ، نەک دە شەودا. ئەی بۆچی خودا ئەو چلە بە شەو ناو دەبا و ڕۆژی ڕەگەڵ ناخا؟ هۆیەکەی دەبێ چ بێ؟ دەبێ ئاوا وڵام بدرێتەوە: شەو کە تاریکاییە لە سەر ڕۆژ کە ڕووناکاییە، پێش کەوتووە. چونکە ڕووناکایی هەر لە پاش تاریکاییدا دەبێ کە وابێ دەبێ لە سەر ئەو ئەساسە شەو ناو ببرێ دە حیسابی عیبادەتدا. چونکە ئەسڵە و بناخەیە. و یا دەتواندرێ بکوترێ لەو بارەوە کە (لیلة) ناو براوە: حیسابی هۆزی عەڕەب بە زۆری هەر بە شەو بووە، لە سەر حیسابی مانگی قەمەری.

بۆ باش تێگەیشتن لە حیسابی ئەو چل شەوە عیبادەتە وا چاکە ڕوو بکرێتە ئایەتی ١٤٢ی ئەعراف: ﴿وَوَاعَدْنَا مُوسَى ثَلاَثِينَ لَيْلَةً وَأَتْمَمْنَاهَا بِعَشْرٍ فَتَمَّ مِيقَاتُ رَبِّهِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً...﴾ ئێمە **دەگەڵ مووسا قەرارمان دامەزراند «کە بۆ خۆ ئامادە کردن و وەرگرتنی کتێبی ئاسمانی» سی شەو دە عیبادەتی خودا ڕاچێ پاشان «بۆ ئیتمینان و پتەو بوونی» دە شەوی دیکەشی وەسەر خرا.** بەو پێیە ڕاز و نیازی مووسا ساز و سۆزی دەگەڵ خودا دەبێتە چل شەوی تەواو.

پێویسە ئەو گوێرەکە پەرستییەی قەومی مووسا بزاندرێ هۆیەکەی چ بووە و لە کوێڕا هات و سەری گرت؟ وەک دە ناو ئایەتەکەدا ئاماژەی وەلا کراوە: ﴿ثُمَّ اتَّخَذْتُمُ الْعِجْلَ مِن بَعْدِهِ﴾ دەبێ بڵێین: سامری کە یەکێکە لە گەلی مووسا وەک دە ئایەتی ٨٥ی «طه»دا ئاماژەی وەلا کراوە ﴿وَأَضَلَّهُمُ السَّامِرِيُّ﴾ **سامری قەومی مووسای بەرەو گوێرەکە پەرستن هان دا و ڕای دا.**

هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە مووسا لە بەحرەکە دەپەڕێتەوە چەن زەمانێک مووسا پاش نەجات بوونی لە دەریا کە لە مەیدانی «نیە» کە زۆر دوور نییە لە دەریا کە ژیان بە سەر دەبا دەگەڵ یارانی، و هەروا لەوێش قەومێکی لێ دەبێ گوێرەکەپەرەست، قەومی مووساش کە پتەو و قایم نەبوون لە ئیمان و باوەڕی بەڵکە سادە و ساوا، داوا لە مووسا دەکەن ڕێیان پێ بدا وەک ئەو قەومەی گوێرەکە بپەرەستن تاکوو بگەنە خۆش گوزەرانی، ئەو داوایە دەبێتە هۆی دڵڕەنجی مووسا. مووساش بۆوەی حەکیمانە بە دابی پێغەمبەرایەتی، ئەو هەوایەیان لە مێشکیدا بەرێتە دەرێ، زۆربەی نیعمەتەکانی خودایان دەخاتەوە بیر تاکوو لەو فکرە وەدوور کەون، بەڵام هەروەک دیارە ساختاری ئینسان هەر بەرەو هەوا و هەوەسە و حەقیشی بۆ وەلا دەنێ و گوێیانیش داخنێ لە بیستنی حەق. وایان لێ بە سەر دێ گەلی مووسا دوای سامری دەکەن بۆ گوێرەکە پەرەستی. بۆ پشت ڕاست کردنەوەی ئەو باسە سەرێک هەڵدێنین لە ئایەتی: ﴿وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَآئِيلَ الْبَحْرَ فَأَتَوْاْ عَلَى قَوْمٍ يَعْكُفُونَ عَلَى أَصْنَامٍ لَّهُمْ قَالُواْ يَا مُوسَى اجْعَل لَّنَا إِلَـهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ ﴿١٣٨﴾ «اعراف» **گەلی بەنی ئیسرائیلمان لە دەس فیرعەون و فیرعەونیان نەجات دا و قوتارمان کردن لە ناو دەریا «واتە دەریای سوور لە کن خەلیجی فارس» تووشی هۆزێک هاتن لەوێ کە خەریکی گوێرەکە پەرەستن بوون لە جیات خودا. ئەو قەومەی مووساش داوایان لە مووسا کرد: خودایەکمان بۆ دەست نیشان کە وەک خودای ئەو قەومە. مووساش لە وەڵامیاندا کوتی پێیان وا دیارە ئێوە گەلێکی ناحاڵین و هیچ لە هیچ نازانن.**

## ئاوڕێک وەسەر ئەو گوێرەکەی سامڕی دروستی کرد

کاتێ مووسا چوو بۆ کێوی توور، ئەو خشڵ و خاڵاتەی کە بە ئەمانەت لە قیبتییەکان وەرگیرابوو، هاڕوون بە قەومەکەی کوت ئەو زێڕ و زەمبەرە حەرامە بۆ ئێوە چونکە داگراوە دەبێ بسووتێندرێ، بەڵێ سووتێندرا. سامڕیش کە یەکێک بووە لەو کەسانەی دەگەڵ مووسا لە دەریا نەجاتیان ببوو لە کاتێ جبرەئیل بە سواری وڵاغ شارەزایی دەدا بە مووسا و یاران، سامری هەستی بەوەی کردبوو ئەوە لە ئینسان ناچێ. لەو ئانەی کە دە بەینی فیرعەون و مووسادا بوو، واتە مووسا و یارانی مووسای پەڕاندەوە و فیرعەون و دار و دەستەکەی هێنایە ناو دەریا، سامری نەختێک گڵ و قووڕی بەر پێی وڵاغەکەی هەڵگرتەوە و هەڵیگرت بۆ جادووگەری. سامری هات ئەو گڵەی دەگەڵ زێڕ و زێو لێک دا و شتێکی بە چەشنی گوێرەکە لێ ساز کرد و دەستێکی پێدا هێنا وە هۆڕەهۆڕ کەوت. قەومەکە کوتیان ئەوە چییە؟ سامری کوتی: ﴿هَـٰذَا إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ﴾ ئەوە خودای وە و مووسایە. قەومەکەش باوەڕیان کرد و قبووڵیان کرد بە خودا. ئەوە بۆچوونی هێندێک لە مێژووناسانی دەوران. بۆ زێدە زانین بڕوانن لە تەفسیری کەبیر، ج ٤، لاپەڕەی ٧٥-٧٤.

دەبێ بزاندرێ کاتێ مووسا دەگەڕێتەوە لە ملاقاتی خودا و قەومی ئاوا دەبینێ، چ هەڵوێستێک دەگرێ؟

کاتێ مووسا ئەو حاڵەتەی چاو کرد یەکسەرە ڕووی دە هاڕوونی برای کرد و ئەنگژای بوو کە بۆچی ڕێی داوە ئەوە بێتە ڕوو، مەگەر ئەمن ئەو گەلەم بە تۆ نەسپاردبوو؟ کاتێ هاڕوون بەسەرهاتی بەڕاستی بۆ بەیان کرد کە خەتا لەلایەن منەوە نەبووە بەڵکە لە لایەن سامرییەوە بووە و ئەمنیش چەنەبەریان نەهاتووم، باوەڕی کرد مووسا و ئاوری ڕق و تووڕەیی دامرکا و نیشتەوە. ئەوجار پەلاماری گوێرەکەی دا و بە ئاور گڕی دا تا بوو بە خاک و خۆڵەمێش و بە دەریایدا هەڵپڕژاند تاکوو هیچ ئەسەرێکی نەمێنێ. بەڵام با ئەوەش حاشار نەدەین عیشقی گوێرەکە پەرەستی وا نیشتبووە ناو دەروونیان لە تاوان ئاوی ئەو دەریایەیان دەخواردەوە کە خۆڵی سووتاوی گوێرەکەی پێوە کرابوو. بۆ تەئیدی ئەو ڕاستییە زەین دە ئایەتی: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ خُذُواْ مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاسْمَعُواْ قَالُواْ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَأُشْرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ الْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُمْ بِهِ إِيمَانُكُمْ إِن كُنتُمْ مُّؤْمِنِينَ﴾ ﴿٩٣﴾ «بقرة» **وەیاد خەوە ئەو کاتەی کە پەیمانمان لێ وەرگرتن و کێوی توورمان لە ژووری سەرتان بەرز کردەوە و پێیان کوتن: ئەوەی**

**پێیان داون لە نامەی ئاسمانی کاری چاکی پێ بکەن و فەرموودەکانی بە دڵ وەرگرن و بیبەن دە گوێی گرن «ئەوانیش» کوتیان: بیستمان و، نافەرمانییان دەربارەی دەربڕی. واتە بەرامان کوتمان بیستمان و ، بە کردەوەش کوتیان: نافەرمانییان کرد. وە بە هۆی بێ بڕواییانەوە دڵیان ئاودار بوو بە خۆشەویستی گوێرەکەکە. واتە عیشقی ئەو گوێرەکەیە تێکەڵاوی ڕەگ و دەمار و جەرگ و هەناویان بووبوو.**

ئەو کارەساتە ئەوە دەڵێ: بەرگری لە ئەوینداری ناکرێ بە زۆر وەک ئەوڕۆ زۆرداران بەرگری دەکەن لە عیشقی وەتەن پەرەستی، کاریان هەڵەیە.

چلەی عارفان لە چلەی مووساڕا سەرچاوەی گرتووە: ﴿أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةً﴾ بۆ قەناعەت بچۆرە خزمەت ئایەتی ١٤٢ی ئەعراف.

وەرددانەوەیەک: لە سەر ئەساس و یاسای نەزم و نیزام دەبا ئایەتی ٥٢ لە دوای ئایەتی ٥٤ هاتبا چونکە عەفو و بەخشینی هۆزی یەهوود دە دوو ئایەتی دوایەدا هاتوون. و لەو لایەشەوە واقیعەی تور وێستا تەواو نەبووە. بە کورتی دەبوایە ئایەتی ٥٢ بە دووی ئایەتی ٥٤دا هاتبایە بەو هۆیە عەفو و بەخشینی پێیە خۆ دیاریشە پاش ئایەتی ٥٤ دەروازەی عەفو و بەخشین دەبێتەوە.

بە هەر حاڵ ئەوە یاسای نەزم و تەرتیبە ئەوەمان پێ دەڵێ، دەنا دەبێ دڵ ئەوە قبووڵ کا: قورئان لەوپەڕی نەزم و تەرتیبدایە ناکرێ ڕەخنەری لێ بگیردرێ لە هیچ بارێکەوە.

کاتی ئەوەی هات بچینە خزمەت ئایەتی ٥٢ی بەقەرە کە ڕووی دە بەخشین و لێبوردنە:

**﴿٥٢﴾ ثُمَّ عَفَوۡنَا عَنكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ**

**پاشان لێتان خۆش بووین، واتە دوای پەشیمان بوونەوە و گەڕانەوەتان بەڵکوو ڕوو دە خودا کەن ئەوجار سەرپێچی نەکەن لە ڕاست فەرمانی باری.**

**تێڕوانینێک لە ناو دەروون و سیمای ئەو ئایەتە:**

خودا ئەنعامەکانی کە بەخشیونی بە هۆزی یەهوود دەیانخاتە بیریانەوە بەڵکە وەگەڕێن بۆ لای خودا و نەچنەوە سەر خراپەکاری وخۆیان بگەیێنە دەروازەی شوکرانەی نیعمەت. ئەو شوکرانەی کە بە سێ جۆر دێتە جێ: ١. شوکر بە دڵ واتە یادی نیعمەت ٢. شوکر بە زمان واتە بەجێ هێنانی حەمد و سەنای خودا ٣. بەخشین لە قەدەر توانا بە بێنەوایان لە سایەی لەشی ساغ و نیعمەتەکانی دی.

ئەوجار کاتی ئەوەی هاتووە چاوەڕوانی وەعدە و بەڵێنی خودا بکەین لەمەڕ ناردنی کتێبی تەوڕات بۆ مووسا، بەو پێیە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٥٣ کە دەوێدا وەعدەی خودا سەر دەکا

و چاو دەکرێ:

﴿٥٣﴾ وَإِذْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَالْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ
**وەبیر خۆ خەنەوە کاتێک کە کتێبی تەوڕاتی جیاکەرەوەی حەق و باتڵمان دا بە مووسا، تاکوو بە هۆی ئەو ئێوە ڕێنوێنی کەین و ئێوەش پاشی دۆزینەوەی ڕێی حەق، ڕێی حەق بگرن.**

وەک ئەوەی دەچێ فەرق هەبێ لە نێوان کتێب و فورقان، بۆیە دە ئایەتەکەدا بە دووی یەکدا هێندراون. کەوایە دەبێ ئەگەر فەرقیان هەبێ فەرقەکەیان نیشان بدرێ و ئەگەر فەرقیشیان نەبێ دەبێ وڵامی ئەو بە دوودا هاتنەیان وەدرێ!

وڵام: بە پێی بۆچوونی قورئانزانان فەرقیان نییە، فورقان هەر تەوڕاتە، تەوڕات هەر فورقانە. دەشکرێ بکوترێ فورقان واتە فاریقی حەق و باتڵ. ئەودەم هەم تەورات بەردەکەوێ هەم کتێبەکانی ئاسمانی. بۆ ئەو مەتڵەبە بڕۆ بۆ خزمەت تەفسیری کەبیر، ج۴، لاپەڕەی ۷۷.

## فەرقی کیتاب و فورقان

ئاوڕدانەوەیەک بۆ سەر زێدە زانینی ئەو دوو ناوانە واتە «کتاب» و «فرقان» ئەساسییە. لەو بارەوە نەزەر هەن: هێندێک کوتوویانە فورقان واتە تەوڕات، عەتفەکەشی عەتفە تەفسیرە یا عەتفی سیفەتە بۆ سەر سیفەت. هێندێکی دیش کوتوویانە مەبەست لە فورقان شەریعەتی تایبەتی مووسایە. هێندێکیش مەنزوور لە فورقان موعجیزاتی مووسایە. هێندێکیش کوتوویانە فورقان واتە قورئان چونکە خودای تەعالا جگە لە تەورات مووسای لە قورئانیش تێ گەیاند.

دەبێ بکوترێ ڕاوڕاوێن جگە لەوەی کە خزمەت نییە بە شعوور، شعووریش هاڵۆز دەکا. ئەوەی ڕاستە لێرەدا: سەراپای کتێبە ئاسمانییەکان ڕێنومان و فاریقی حەق و باتڵن.

هەروەک زاندرا خوای تەعالا بە وەسیلەی ئایەتی ۵۲ عەفو و بەخشینی هۆزی یەهوودی ڕاگەیاند پاش گوێرەکە پەرستن و پەشیمان بوونەوەیان و هەروا بە هۆی ئایەتی ۵۴یش باسی شێوەی عەفو و بەخشینەکەش دەکا، واتە دەیهەوێ خودا حاڵییان کا چها تاوانیان خستە ئەستۆوە و چۆنیش دەبێ دایماڵن لە ئەستۆ.

ئاوڕ وەدەنە ئایەتی ۵۴ و لێی ورد بنەوە:

﴿٥٤﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُمْ بِاتِّخَاذِكُمُ الْعِجْلَ فَتُوبُواْ إِلَى بَارِئِكُمْ فَاقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ

**الرَّحِيمُ**
**مووسا بۆ وەرگرتنی فەرمانی خودا چل ڕۆژ لە قەومەکەی هەڵبڕا بەرەو کێوی تـوور ڕۆیشـت. قەومەکەی لە دوای ئەو دەستیان کرد بە گـوێرەکە پەرەسـتن. کاتێـک مووسـا پـاش چـل ڕۆژ هاتەوە و بەوەی زانی، زۆر گرژ و تووڕە بوو لێیان دەستی کرد بە سەرزەنشتیان و پێی کـوتن: ئێوە بەو گوێرەکە پەرەستییەتان ستەمێکی زۆرتان لە خۆتـان کـردووە. جـا تەوبە بـکەن داوای لێخۆشبوونی گوناهتان لە خودا بکەن. تەماشا بکەن و بیر بکەنەوە کە چۆن خودا لەو ژیانە پڕ لە سووکایەتییەتان لە میسـردا ڕزگاری کـردن و سـەرفراز، خۆتـان بکـوژن لای خـودا باشـترە بۆتان لەوەی کردووتانە، هەچەن خودا لێتان خۆش بووە چونکە بێگومان خودا زۆر لێبوردەیە و خاوەن بەزەیە.**

زۆربەی تەفسیرزانەکان کوتوویانە: مووسا پێی کوتن خۆتـان بکـوژن، ئەوانـیش دەسـتیان کردە خۆ کوشتن. تا ژمارەی کوژراویان پاڵی وە حەفتاهەزار دا وەیـا چـوار هەزار. ئەو ڕووداوە ڕووتە لە بەڵگەی قورئانی و حەدیس بەڵکە هەر قسەیە لە زاری ئەم و ئەو.

## ئاوڕێک وەسەر ڕووداوی خۆکوشتن:

وا دەردەکەوێ دەسـتوور درابـێ بەوانەی گوێرەکەیـان نەپەرەسـتووە بکـوژن ئەوانەی گوێرەکەیان پەرەستووە. خۆ دیارە دە یاسـا و ئـایینی باریشـدا براکوشـتن وەک خۆکوشـتن وایە چـونکە بـرا وەک نەفسـی خـۆت بـێ وایە. بۆیەشـە خـودا فەرمـوویەتی (أنفسـكم) وهەروا براکوشتنیش لە لای خودا دەبێ چاتر بێ لە شەریک گرتن بۆ خـودا. ئامـاژە وەلای ئەوە کـراوە خاوەن ئیمانان برای یەکن ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ ﴿١٠﴾ «حجرات» **خاوەن باوەڕان بە خودا بران.**

## تێوەڕامانێک دە ڕووداوی خۆکوشتن:

دێرەدا وەک چاو دەکرێ خۆکوشتن پاش تۆبە بێ، خۆ ئەوەش بە سبووت گەییوە کە تـۆبە ڕاماڵدەری هەچی تـاوانە بە شـەرتی نەگەڕانەوە بـۆ سـەر تـاوانەکە. هەروا ئەوەش ڕاسـتە خـۆ کوشتن ئەمرێکی زۆر گەورەیە لە سەرووی ئەو ناخۆشتر نابینـدرێ. کەوایە چـۆن خـودا پـاش تۆبە تووشی ئەو سزا بەرزەیان دەکا و دە یەکتریان بەردەدا و بە یەکتریان بە کوشت دەدا؟

دەبێ بۆ نەجات لەو لۆمە و بۆ تەسکینی دڵ ئاوا بیر وەکەین: ئەو دەسـتوورە ئازمایشـە بـۆ ئەو گەلە کە ئایا پابەندی تۆبەن دەتوانن لە بن باری تۆبەدا بێـنە دەر؟ دیـارە ئەگەر پابەنـد بـن بە

تۆبە، دەشتوانن خۆی لە سەر بە کوشت دەن، هەروەک حەزرەتی ئیبراهیم بۆ ئازمایشی پتەوی ئیمانی ڕاماڵی دا سەربڕینی ئیسماعیل. پاشان خودا بە هۆی ئیمانی قایم بەخشی، ئەوەش دەبێ ئاوای بۆ بچین ئەگینا ئەوەی لە لای خودا ناحەزترین کارە، کوشتن و تێکبەربوونە، جا چۆن دەستووری لە سەر لێدەدا؟ بۆ زێدە زانین تەماشای تەفسیری کەبیر، ج٤، و تەفسیری «تبیین القرآن» بکەن.

پاش ئەوەی مووسا گەلەکەی خاوێن کردەوە لە گوێرەکە پەرەستی، بە پێی ڕیوایەت ٧٠ کەسی لێ هەڵبژاردن کە دەگەڵ خۆی بیانباتە کێوی توور لەوێ پەشیمانی خۆیان دەربڕن تاکوو خودای مەزن ئەو پەشیمانییەیان لێ قبووڵ کا. کاتێ ئەو نەفەرانە دەگەڵ مووسا ڕۆیشتن لەوێ واتە کێوی توور بە مووسایان کوت دەبێ خودامان نیشان دەی جا باوەڕت پێ دەکەین کە پێغەمبەری، دەگەڵ خودات ملاقات کردووە و تەوراتی پێ داوی. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٥٥:

**﴿٥٥﴾ وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَى لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّى نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ الصَّاعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ**

**ئەی یەهوود بیر خۆتانی خەنەوە ئەو کاتەی کە بە مووساتان کوت: ئێمە باوەڕت پێ ناکەین تا خودامان بە ئاشکرایی نیشان نەدەی. ئەودەم خودا پێیان بڵێ باوەڕوو بە مووسا بێ، جا لە بەرابەر ئەو بێئەدەبییەی وان هەورە تریشقە دانی بەر هەڵمەتی خۆی، ئەوانی ویان نەکوتبوو سەیری بەلاداهاتنی ئەو بێشەرمانەیان دەکردن و دەیانڕوانییە کارەساتەکەی.**

## ئاوڕێک وەسەر ڕووداوەکە

خودای مەزن لەو ئایەتەدا باسی لاساری جوولەکە دەکات تاکوو پێغەمبەر واتە محەممەدﷺ بەبێ باوڕی یەهوودیان و یاخیبوونیان دڵتەنگ و سەخڵەت نەبێ، چونکە ئەو ڕەفتارەی وان پێشەی لەمێژینەیانە دەگەڵ مووسا و پێغەمبەرەکانی دوای ویش.

بە پێی ڕاوێژی ئایەتەکە و پاش و پێشی جەریان حەزرەتی مووسا کاتێ کە چاوی کردن سەراپا کەوتنە زەوی مووسا بەرەو خودا هاواری برد و کوتی: یا ڕەببەنا، ئەو حەفتا نەفەرە هاتبوون کە ئێمە شاهیدی تۆبەیان بین، خۆ دیارە وێستا کەسیان نەماوە تاکوو ئەمن شاهیدی تۆبەیان بم و هەروا ئەوانیش تەسدیقی پێغەمبەرایەتیم کەن. و ئەگەر چووشمەوە ناو قەومەکەم، چییان پێ بڵێم لەوانەیە ئەوانیش لە باوەڕی خۆیان با دەنەوە. ئەدێرەدا بوو خودای تەعالا

وەگیانی هێنانەوە. بۆ زێدە زانین ڕوو کەنە تەفسیری کەبیر، ج۴، هەمان ئایەت.

تیوتیوەیەک: دە ئایەتی ۱۵۵ی ئەعرافدا ئاماژە وەلای ئەو ڕووداوە کراوە: ﴿وَاخْتَارَ مُوسَى قَوْمَهُ سَبْعِينَ رَجُلاً لِّمِيقَاتِنَا فَلَمَّا أَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّايَ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ السُّفَهَاء مِنَّا إِنْ هِيَ إِلاَّ فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَاء وَتَهْدِي مَن تَشَاء أَنتَ وَلِيُّنَا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الْغَافِرِينَ﴾ **مووسا حەفتا نەفەری هەڵبـژارد لە قەومەکەی بـۆ ئەو مـاوەیەی دیـاریان کرد (واتە چل ڕۆژ) ئەوجار کاتێ هەورە تریشقە خستینە لەرزین دە خۆ گەوزان بەبێ هۆشی کەوتنە سـەر زەوی. مووسا کوتی خوایە ئەگەر بتویستایە لەوە پـێش منـیش و ئەوانیشـت لە نـاو دەبـردن هـیچ نیـازت نەدەبوو بێرە و ئاوا ڕوو بدا.**

**ئاوڕدانەوەیەک**

دیارە ئەوانە کەوتنە بەر گڕی بریسکە و سووتان. و پاشان بە ئەمری باری هـاتنەوە هـۆش، ئازار و ئێشی برووسکەیان بە لەشەوە مابوو. جا بۆوەی ئەو ئـازار و ئـێش و برینەیـان لاچـێ و ساڕێژ بێتەوە، خودای تەعالا شوێنی فێنک و ئارام و سێبەراوی بـۆ دانـان. و لەمەڕ خـۆراکیش تەعامی بابەت و بەهێزی بۆ دابین کردن لە وڵاتی قاقڕ و ویشکارۆی سینادا. ئەو پەزیراییە و ئەو کارسازییە هەر لە خودا دەوەشێتەوە. بۆ تەئیدی ئەو ڕاستییە بڕوانە لە ئایەتی ۵۷ی بەقەرە:

دڵ هەر چاوەڕوانە بزانێ پاش وەهۆش هاتنەوەیان چ دەبێ. دەچینە خزمەت ئایەتی ۵۶ تـا تێبگەین لە کاروبار:

﴿۵۶﴾ ثُمَّ بَعَثْنَاكُم مِّن بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ

**لە پاشان ئاگادارمان کردنەوە دوای مردنتان، (واتە پاش ئەو بێهۆشییەی کە لە ئەسەری هەورە تریشقە تووشی بوون) هێنامانەوە هۆش تاکوو سپاسی خودا بکەن.**

## ئاوڕێک وەسەر هۆش هاتنەوەیان پاش مردن

خودای خـاوەن حـیکمەت و حەکـیم بـۆ لەشـی زامـار و تێکڕووخـاوی پـاش هـاتنەوە هۆشیان، ئارامگا و حەسانەوەیان بۆ دابین دەکا، بەو شێوەیە دەیانخاتە ژێر سایەی هێمنی تا تاو کاریان تێ نەکا و خۆراکی پاک و بابەتیان دەداتێ بۆ خاتری گوڕ و تینیان بێـتەوە لەش و هەروا چها خزمەتی دیش. بۆ تەئیدی ئەو واقیعەیە دەچینە خزمەت ئایەتی ۵۷:

﴿۵۷﴾ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ الْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ

وَمَا ظَلَمُونَا وَلَـٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ
**بە هەور سێبەرمان لێ کردن لە گەرمای دەشتی سینادا تا هەتاو نەتانسووتێنێ و دامانڕشتە سەرتان گەزۆ و شێلاقە. بخۆن لەو خواردنە پاکانەی کرمانە ڕۆزیتان. ئەوان ستەمیان لە ئێمە نەکرد چونکە ناتوانن، زیان بە ئێمە بگەیەنن. بەڵکوو ستەمیان لە خۆیان کرد (چونکە یەخەگیری خۆیانە زیانی گوناهەکەیان)**

لێرەدا ئەوە بە سبووت دەگا و گەیی کە خودای بە تەقی تەنێ نە قازانجی پێ دەگا لە چاکەکاریمان و نە زەرەری پێ دەگا لە خراپەکاریمان.

## ئاوڕدانەوەیەک وەسەر لاساری و بەدئەخلاقی بەنی ئیسرائیل

نەجاتبوونیان لە درێژایی ٤٠ ساڵ مانەوەیان لە مەیدانی «تیه» و چۆڵ و قاقڕی سینادا و ڕزگار بوونیان لە جەور و بێ ئیحترامی فیرعەون و دار و دەستەکەی، و هێز پێ دانیان بۆ بەرەنگار بوونی هۆزی «عمالیقەی یەمەن» سەرکەش و شەڕ و وڕ لە وڵاتی شامدا، ڕەپاڵیان نان و دەستیان بە سەر وڵات و سامانیاندا گرت. کەچی لە سەر ئەو هەموو ڕێزگرتنەیان بە مووسایان دەکوت: ئەتۆ بڕۆ بۆ خۆت و خودات دەگەڵ ئەو هۆزە بە شەڕ وەرە. ئەگەر سەر کەوتن بە سەریاندا ئێمە لێرەوە سپاسوو دەکەین و ئەگەر ئەوان بە سەر وەدا سەرکەوتن، ئەوە ئەوان لەوێ و ئەمەش لێرە. جا ئەوە بوو هۆی ئەوەی خودا بە درێژایە ٤٠ ساڵ لە بیابانی چۆڵ و قاقڕی وەک سینادا هێشتنیەوە ژمارەیان گۆیا ٦٠٠ هەزار نەفەر بوون. بۆ ئیسباتی لاساری ئەو هۆزە دەچینە خزمەت ئایەتی: ﴿قَالُواْ يَا مُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُواْ فِيهَا فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَآ إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ﴾ ﴿٢٤﴾ «مائدة» **کوتیان: ئەی مووسا! ئێمە تا ئەوان لەو شوێنە بن ناچین، ئەتۆ بۆ خۆت و خودات بڕۆن دەگەڵیان شەڕ بکەن. ئێمەش وا لێرە ڕۆدەنیشین چاوەڕوانی شەڕوو دەکەین.**

دڵ و ئەقڵ و شعوور دادەمێنن و ڕادەمێنن لە سەر بەدکرداری جوولەکەکان و بەزە و کەرەمی خوداش دە بەرابەریاندا. ٤٠ ساڵ زیندانی کردنیان لە بیابانی سینا کەچی ئەوپەڕی پەزیرایی و حەسانەوەیان لەو شوێنەدا بە هەموو جۆرە نیعمەت. ئەوە جێی ڕامانە، سزادانی یاغی و سەرەڕۆ بە نیعمەت و خۆشی و حەسانەوە؟! ئەوە دەبێ قبووڵی کەین ئەلتافی خودا ون و نادیارە لێمان، و ئەو جۆرەی دەبێ بناسرێ ناناسرێ. ئێمە لە دەلاقەی دڵمانەوە سەیری دەکەین و دەلاقەی هیچ دڵێکیش ناتوانێ بەرز و زەلامی ئەو چاو کا.

دڵ بە پێویستی دەزانێ چینەی مێژوو حاشار نەدرێ، لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ نیشتمان و

جێی پەیدا بوونی ئابا و ئەژدادی هۆزی بەنیئیسرائیل بناسرێ. سەرزەمینی پیرۆز یان «بیت المقدس» بووە کە بە زمانی پێشینەکانیان «ئیلیا» بووە دیارە ئیلیاش بە بەشێک لە وڵاتی شام ژمێردراوە کە شامیش بریتیە لە سووریە، لوبنان، فەلەستین. کە ئەو وڵاتە پان و بەرین و پیرۆزەیە بە هۆی نائەهلی هۆزی یەهوود و زۆرداری زاڵمانی وەخت کرایە چوار کەرت: «شام»، «ئەریحا»، «بحری»، «غوطة». لەوەڕا دەردەکەوێ زۆرداران هەمیشە ویستوویانە دنیا لەتلەت کەن بۆ خاتری ئەوەی بێ هێز بن و هێزی خۆیانیان لە سەر دەکار کەن.

دیارە خودای تەعالا لە سەر ئەساسی حیکمەتی خۆی، دەسبەرداری خراپەکاران نابێ و جار دەگەڵ جار بە چاویاندا دەداتەوە و خۆیان بیر دەخاتەوە. وەک هۆزی جوو بە هۆی ئایەتی ۵۸ ئاگاداریان دەکاتەوە کە چها چاکەم داونێ بۆ چاک نابن و شوکر ناکەن:

﴿٥٨﴾ وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُواْ هَـذِهِ الْقَرْيَةَ فَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَداً وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّداً وَقُولُواْ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ وَسَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ

**وەبیر خۆو خەنەوە ئەو کاتەی کە پێمان کوتن: بچنە ناو ئەو دێیە کە ناوی «بیت المقدس»ە، و خۆو ڕزگار بکەن لە وڵاتی بیابانی قاقڕ «کە سینایە» و لەوێ هەموو خواردەمەنییەک وەگیر دەکەوێ بە تێر و تەسەلی لە هەر میوەیەکی حەزی دەکەن بخۆن و هەروا بچنە ناو شارەکەوە لەو دەرگا و دەروازانەی بۆتان دیاری کراوە، بە مل کەچی و کڕنۆش بۆ خودا بڵێن خودایە داواکارین لێت تاوانەکانمان لێ داماڵە، ئەوجار ئێمەش لە گوناهەکانوو خۆش دەبین و پاداشی چاکەکاران زۆرتر و زیاتر دەکەین.**

### سووکەئاوڕێک: سەرزەمینی جوولەکە و دابەش کردنی

هۆزی جوولەکە چونکە پێش ئەوەی بچنە «بیت المقدس» بە ئازادانە و دابی دێهاتی ژیاون سەربەستانە بیابانگەرد و بەر بەڕەڵا، خۆ دیارە ژیانی شارستانیەتیش خاوەنی نیزامێکی تایبەتیە، هەرکەس ئەو نیزامە نەپارێزێ بە شارستانی ناژمێردرێ، لە سەر ئەو یاسایە مانای «حطة» واتە تەسلیم دە بەرابەر یاسا و دابی شارستانی، و مانای ئایەتەکەش دەبێ ئاوا بکرێ: ئەی هۆزی یەهوود وەبیر خۆو خەنەوە کاتێک پێم کوتن: بچنە ئەو شارە و تێیدا نیشتەجێ بن و لە نیعمەتەکانی زۆر و زەوەند و خاوێن چی وازتان هێنا بخۆن، بەڵام کاتێ وارید بوونتان بۆ ناو شاری ئەوپەڕی حەیا و ئەدەب لە بەر چاو گرن و یاسای شارستانیش بپارێزن، ئەگەر ئاوا بکەن گوناهەکانتان دەبەخشرێ و چاکەکارانیش پاداشی زیاتریان دەدرێتێ.

## ئاوڕێک وەسەر ناز و گڕوو گرتنی هۆزی یەهوود لە سەر حەزرەتی مووسا:

بەنیئیسرائیل لەبەر ئەوەی کە زەمانێکی زۆر دوور و درێژ لە بیابـانی «تـیە» واتە سـەحرای سینا لە خواردنی گەزۆ و شێلاقە وەڕەز و بێزار ببوون لە مووسایان داوای گـۆڕانی ئەو خـۆراکە کرد چونکە پێش ئەوەی دەرکرێن لە میسـر و ڕەوانەی سینایان کەن، عادەتیان بە خواردنی پیـواز و ماش و نیسک و خەیار و لوبیا گرتبوو، کاتێ هاتنە سـینا بۆیـان گـۆڕدرا بە گەزۆ و شـێلاقە. لەوەیڕا بۆیان کرا بە عادەت بەین بەین و ناوناوە خۆراکیان بۆ بگۆڕن. ئەوەشیان بۆ دەرکەوتبوو لە مووسای چی داوا کەن بۆیان دەچێـتە سـەر وەک منـداڵی گڕووگـر، جـا لەو ڕووەوە داوای گۆڕینی خواردنی پیواز و نیسک و لووبیا بە گەزۆ و شـێلاقە و ... خـودای تەعـالاش بـۆوەی تێبگەن کە نیعمەت شوکری دەوێ هات ئاڵوگۆڕی نیعمەتەکانیانی مەشـرووت کرد بەو مەرجە ئامادەبن بۆ شەڕ و بەرەنگاری کافرانی شـام واتە «عمالـقە». ئەوە دووهەمـین جـار بـوو خـودا هۆزی یەهوودی بۆ شەڕ دەگەڵ کافرانی عەمـالیقەی شـام دەسـتوور پـێ دەدان وەک کـوتراوە جـاری هەوەڵ ئیتـاعەی خودایـان نەکـرد واتە نەچـوون بـۆ شـەڕ. بەڵام جـاری دووهەم کە بە فەرماندەیی یوشع کوڕی نوون بوو، سەرپێچییان نەکرد بە ناچاری دەگەڵ فەرماندەکەیان یوشـع بۆ شەڕ دەگەڵ کافرانی شام (عەمالیقە) واریدی شار بـوون. پـاش تێـکهەڵچوون و شـەڕێکی دەستەویەخەیی سەرکەوتنێکی بەرچاویان وەدەس هێنا و بەیتولموقەدەسیان داگیر کـرد. بە پێـی ڕیوایەت ئەو شەڕە سەرکەوتنەیە ٣ مانگ پاش وەفاتی حەزرەتی مووسا بووە، چونکە حەزرەتـی مووسا دە ئاوارەیی هۆزەکەی (یەهوود) لە بیابانی سینا وەفاتی فەرمووە. ئەگەرچی هێنـدێک لە مێژووزانان نەزەریان وا داوە کە داگیر کردنی قودس بە وەسیلەی حەزرەتی مووسا بووە و ئـیمام فەخری ڕازیش خاوەنی تەفسیری کەبیر نەزەری هەر وایە، لە سـەر ئەسـاس و ئامـاژەی ئـایەتی ٥٨ی بەقەرە کە دەفەرموێ ﴿ادْخُلُواْ هَـذِهِ الْقَرْيَةَ﴾ کە تەکلیفی تەواو بووە لە سەر جوولەکە. ئەو ئەمـر و دەسـتوورە وەحـی و نێرابـوو بـۆ مووسـا، وەک دەسـتووری هەوەڵ ﴿ادْخُلُـوا الأَرْضَ المُقَدَّسَةَ﴾ ﴿٢١﴾ «مائدة» بڕۆن بۆ شاری قـودس، کە سەرپێچییان تێدا بەجێ هێنا و خـوداش بە تـۆڵە ڕایدان بۆ بیابانی سینا بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ. بەو پێیە دوایین ئەمر پێ کردنیان بۆ چـوونە نـاو شـار دەبێ هەر لە دەوری حەزرەتی مووسادا بووبێ. بۆ زێدە زانین: تەفسیری کەبیر و «تبیین القرآن».

**بۆ ئاگاداری:**

ئیمام فەخری ڕازی پێی وایە ﴿ادْخُلُواْ هَـذِهِ الْقَرْيَةَ﴾ تەکلیفە و ئەمرێکی واجـبە. هەروەک

هێندێک پێیان وایە مباحە. وەهەروا لەمەڕ سوژدە بردنی لە کاتی داخڵ بوونی ناو شار ﴿وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّدًا﴾ ئەویش هەر واجبە چونکە داخڵ بوونەکە هەڵاوەسـراوە بە سوژدەکە.

بۆوەی بزانین ئایا جوولەکە ئەمری خودایان ئیتاعە کرد یا نەکرد، لەمەڕ چـوونە نـاو شـاری قودس، سوژدەیان برد، یا ئەوجارەش سەرپێچییان کرد. دەچینە لای ئایەتی ٥٩:

﴿٥٩﴾ فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُواْ قَوْلاً غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ رِجْزاً مِّنَ السَّمَاء بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ

**واتە: ئیتر لە ڕێ لادەرەکـان – هەرچـی بەوان سـپێرابوو – بەراوەژوو ڕەفتاریـان کـرد؛ ئەوسا ئێمەش لە تۆڵەی ئەو بەدفەڕیەدا، بەڵایەکمان لە عاسمانەوە بۆ ناردن.**

لە ئایەتی پێشوودا خودا فەرمانی بە جوولەکە دا بچنە ئەو شوێنەی بۆی دیـاری کـردوون و بڵێن «حطة» واتە گوناهمان لە سەر لابەرە و لێمان خۆش بە. بەڵام هەموو جوولەکەکان بە پێـی ئەو فەرمانە نەجـووڵانەوە و وایـان نەکـرد. ئەوانەیـان کە لەو فەرمـانەی خـودا یـاخی بـوون و ستەمیان لە خۆیـان کـرد، خـودا لە ئاسـمانەوە ئـازار و عەزابـی ڕژانـدە سـەریان بە هـۆی ئەو سەرپێچییەیان، چۆنیەتی جۆری عەزابەکە خودا بەیانی کردووە.

## لێکۆڵینەوەیەک لە سەر بەدئەخلاقی هۆزی بەنی ئیسرائیل

هەروەک لە سیمای ئـایەتی ٥٩دا هەسـت پـێ دەکـرێ ئەو گەلە بە پـێچەوانەی دەسـتوور عەمەلیان کرد، چونکە دەبایە کاتێ بگەیبانە دەروازەی شار، داوای بەخشـینی گونـاهی خۆیـان بکردایە، و بە واژەی «حطة» وەپاڕابان، بەڵام سەرەڕای ئەوەی کە وایان نەکرد، ئیهانەشیان دەکرد واتە لە باتی «حطة» دەیـانکوت «حینطـة» واتە گەنـم و جۆمـان دەیە. (صـحیح بخـاری، ج۲، احادیث الانبیاء، باب ۲۸) ئەوە تەئید دەکا. دیـارە ئەو تەرزە جووڵانەوەیـان سـەراپا ئیهـانەیە بە مەقامی باری. دە بەرابەری ئەو بێشەرم و ئەدەبەیان خودا سەبر دەنوێنێ.

## تێوەڕامانێکی هەستیارانە لە ڕاوێژ و ئیشاڕاتی ئەو دوو ئایەتی ٥٨ و ٥٩ی بەقەرە و دوو ئایەتی ١٦١ و ١٦٢ی ئەعراف:

بە ڕواڵەت دوو ئایەتەکانی بەقەرە و ئایەتەکانی ئەعراف دە مانادا هەر یەکن بەو پێیە نیـازی دووپات کردنەوەیان دەبێ ڕازێکیان دە بندا ڕازابێ ئەگینا قورئان لە دووپات کـردنەوەی بـێ ڕاز

بەدووورە. کەوایە دەبێ بۆ دۆزینەوەی ڕازی تیکراری ئەو ئایەتانە چاو و دڵ وهەست ڕاگرین تا ڕاز و فەلسەفەکەیان دەرخەین. هەر چوار ئایەتەکان دەخەینە ڕوو بۆ دۆزینەوەی فەرقی زاهیریان دەخەفتین. جا پاشان مانایان بە پێی حروف و جوملە سەیر دەکەین:

**بقرة**: وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُواْ هَـذِهِ الْقَرْيَةَ فَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَداً وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّداً وَقُولُواْ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ وَسَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُواْ قَوْلاً غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ رِجْزاً مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾

**اعراف**: وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ اسْكُنُواْ هَـذِهِ الْقَرْيَةَ وَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ وَقُولُواْ حِطَّةٌ وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّدًا نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطِيئَاتِكُمْ سَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٦١﴾ فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْهُمْ قَوْلاً غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُواْ يَظْلِمُونَ ﴿١٦٢﴾

ماناکانیان بە تەرتیب:

**بقرة**: وەبیر خۆ خەنەوە ئەو کاتەی پێمان ڕاگەیاندن: بچنە ناو شاری قودس و بە وازی خۆشتان بێ هەچی دەخۆن و دەخۆنەوە، بەڵام هەر ئەگەر لە دەرگاوە چوونە ژوور سوژدە بەرن وبڵێن: ئەی پەروەرەندەن! باری گران مەخە سەرمان، ئەوجار ئێمە لە گوناهتان خۆش دەبین و دەوبەخشین. دیارە بۆ چاکەکاران پاداشی زیاتر هەیە و دەبێ. (٥٨) جوولەکەکان بە پێی فەرمانی خودا نەجوولانەوە بەڵکە بە پێچەوانە عەمەلیان کرد و ئەوانەی کە لە فەرمان لایان دا ستەمیان لە خۆ کرد، خوداش لە ئاسمانەوە ئازار و ئەزیەتی بە سەردا باراندن بە هۆی ئەو سەرکەشییەی کە کردیان، شێوەی ئازارەکەش خودا بەیانی نەکرد.

**اعراف**: ئەی پێغەمبەر، تۆ بیخەوە بیری ئەو جوولەکانە کە چۆن کاتی خۆی بە پێغەمبەرەکەیاندا فەرمانمان کرد بە باب و باپیرانی پێشینیان کە بچن بۆ ئەو شارەی کە خودا بۆی دیاری کردبوون و لەوێ نیشتەجێ بن و حەزیشتان لە هەرچی هەیە و چیتان دەوێ بیخۆن و هەروا داوای لێخۆشبوون لە گوناە و کردەوە خراپەکانتان بکەن و بە سوژدە بردن لە دەرگای شارەکەوە بچنە ژوورەوە، ئەو کات منیش لە گوناهەکانتان دەبوورم. ئەوانیش بەردەوام چاکەکارن کەرەم و بەخششی خۆمیان زیاتر بە سەردا دەڕێژم. (١٦١) بەڵام ئەوانەیان کە ستەمیان لە خۆیان کردووە و ئەو فەرمانەی پێیان درابوو گۆڕییان و بە شێوەیەکی دی و بە دڵنیایی لە دەرگاکەوە نەچوونە ژوورەوە، جا لە بەر ئەوەی بەو شێوەیە ستەمکار و یاخی بوون بە هۆی ستەمکاری خۆیانەوە لە ئاسمانەوە سزا و بەڵایەکمان بۆ ناردن. (هێندێک کوتوویانە ئەو بەڵایە تاعوون بووە) (١٦٢)

ئەوە مانای ئایەتەکان؛ ئەوجار دەڕوانینە فەرقی ماناکان، دەگەڵمان بن و یارین دەن. لە ١٠ شوێندا فەرق چاو دەکرێ:

١. دە ئایەتی ٥٨ی بەقەرەدا (وإذ قُلنا) هاتووە بەڵام دە ئایەتی ١٦١ی ئەعرافدا (وإذا قیلَ) هاتووە.

٢. دە ئایەتی ٥٨ی بەقەرەدا (أُدخُلُوا) هاتووە بەڵام دە ئایەتی ١٦١ی ئەعرافـدا (أُسْـكُنُوا) هاتووە.

٣. دە ئایەتی ٥٨ی بەقەرەدا (حَیثُ شِئْتُم رَغَداً) هـاتووە بەڵام دە ئـایەتی ١٦١ی ئەعرافـدا (حَیْثُ شِئْتُم) بێ لە (رَغَداً) هاتووە.

٤. دیسان دە ئایەتی ٥٨ی بەقەرەدا (وَادْخُلوا البابَ سُجَّداً وقُولُوا حِطَّـةٌ) هـاتووە بەڵام دە ئایەتی ١٦١ی ئەعرافدا بە پێچەوانە (وقُولُوا حِطَّةٌ وَادْخُلوا البابَ سُجَّداً) هاتووە.

٥. دیسان دە ئایەتی ٥٨ی بەقەرەدا (خطایاكُم) هاتووە بەڵام دە ئایەتی ١٦١ی ئەعرافـدا (خَطیئاتِكُمْ) هاتووە بە سیغەی «جمع القلة»

٦. دیسان دە ئایەتی ٥٨ی بەقەرەدا (وَسَنَزیدُ المُحسنینَ) هـاتووە بەڵام دە ئـایەتی ١٦١ی ئەعرافدا (سَنَزیدُ المُحسنینَ) «بەبێ واو» هاتووە.

٧. دە ئایەتی ٥٩ی بەقەرەدا (الّذینَ ظَلَمُوا) هاتووە بەڵام دە ئایەتی ١٦٢ی ئەعرافدا (الّذینَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ) هاتووە

٨. دیســان دە ئـایەتی ٥٩ی بەقەرەدا (فَأَنْزَلْنـا) هـاتووە بەڵام دە ئـایەتی ١٦٢ی ئەعرافـدا (فَأَرْسَلْنا) هاتووە.

٩. دیسان دە ئایەتی ٥٩ی بەقەرەدا (فَكُلُـوا) هـاتووە بەڵام دە ئـایەتی ١٦٢ی ئەعرافـدا (وَ كُلُوا) هاتووە.

١٠. دیسان دە ئـایەتی ٥٩ی بەقەرەدا (بِما كانُوا یَفْسُقونَ) هـاتووە بەڵام دە ئـایەتی ١٦٢ی ئەعرافدا (بِما كانوا یَظْلِمونَ) هاتووە.

ئـیمام فەخـری ڕازی لەو بـارەوە دەڵـێ: هەریەک لەو ئـاڵوگۆڕانە خـاوەن ڕازێکـن و ئەو ڕازانەش باسی لە سەر کردوون لە جێی خۆی بەڵام بۆ ئێرە ناگونجێن چـونکە زۆر درێـژن. بـۆ زێدە زانین بڕوانە تەفسیری کەبیر، ج٣، لاپەڕەی ٩٢ تا ٩٤.

جوولەکەکان لە چۆڵ و بیابانی سینای گەرم و بێ ئاو و قاقڕ لە مووسـا کەوتـنە بۆڵەبـۆڵ، ئەوەی ئەتۆ ئەمەت لە وڵاتی میسـری ئاوا خۆش هێنایە وڵاتـی وا نـاخۆش، ئێسـتێ ئـێمە ئـاوا

تاقەت ناهێنین دەبێ چارەیەکمان بکەی. حەزرەتی مووساش هەستی بە خەتەری نەحاوانەوەی ئەو گەلە کرد و ڕووی کردە بارەگاهی باری کە لەو تەنگانەش نەجاتیان دات. خودای تەعالاش بۆ ئیسباتی پێغەمبەرایەتـی مووسـا داوای بەجـێ دێنـێ و لە ئـایەتی ٦٠دا چـاو دەکـرێ. بەڵام ئەدێرەدا هەست بەوە دەکرێ: خۆ ئەگەرچی خودا لە هەموو ئەوزاع ئاگادارە نیـازی بە هـاوار و ڕاگەیاندنی ئینسان نییە، ئەمما هاوار و پاڕانەوەی ئینسان بە لازم دانەوە وەک دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَا يَعْبَأُ بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَاؤُكُمْ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا﴾ ﴿٧٧﴾ «فرقان» بڵـێ ئەی پێغەمـبەر: پەروەرەندەم هیچ حاڵ و حەواڵتان ناپرسێ و ئاوڕتان وێ نادا. مادام لە بەری نەپاڕێنەوە. ئەوە ئێوە وا دیـارە باوەڕیتان بەو نەهێناوە. بەو زووانە تووشی سزا دەبن و لێشتان وەلا ناکەوێ ئەو سزایە.

ئەوجار کاتی ئەوەی هات بچینە سەر وڵامی خودا بۆ مووسا دە ئایەتی ٦٠دا:

﴿٦٠﴾ **وَإِذِ اسْتَسْقَى مُوسَى لِقَوْمِهِ فَقُلْنَا اضْرِبْ بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْناً قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ كُلُواْ وَاشْرَبُواْ مِن رِّزْقِ اللَّهِ وَلاَ تَعْثَوْاْ فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ**

**ئەو کەڕەتەش کە وا مووسا ئاوی بۆ پەیڕەوانی خواست. گوتمـان بـە دارعاسـاکەی خـۆت لەو بەردە دە! دوازدە کـانی لـێ هەڵقـوڵی؛ هەر تیـرەیەک جێـی خـواردنەوەی خـۆی بزانـی. سـا لەوبەشەی خودا داویە بخۆن، وەخۆن، لە عەرزا بەدفەڕی مەکەن.**

«دیارە ئەو ئایەتەش باسی نیعمەتێکی دیکەیان بە ڕوودا دەکێشێ» وەکـوو پێشـتر باسـمان کرد جوولەکەکان کە میسـریان بەجێ هێشت کەوتنە دەشتی سینای قاقڕ و گەرم، ئینجا ئەوە بوو خودا پەڵە هەورێکی بە سەریانەوە بـۆ کـردن بە سـێبەر و خـواردنی گەزۆ و گۆشـتی باڵنـدەی «سەلوا»ی بۆ ڕەخساندن. هەرکە تینوویان بوو شاڵاویان بۆ مووسا برد لێرەدا خودا فەرمانی دا بە مووسا کە بە وەکازەکەی لە بەردێکی دیاریکراو بدات، ئەویش وای کرد بە فەرمانی خـودا دای لەو بەردە دوانزە کانی هەڵقوڵا و هەر بەرە بابێکیان ڕووی کردە یەکێک لەو کانیـانە کە تەنهـا بـۆ ئەوان تەرخان کرابوو، جا لەو ئایەتەدا خودا فەرمانیان پێ دەدات و دەفەرموێ: لە ڕزق و ڕۆزی خودا بخۆن و بخۆنەوە بەڵام مەبنە هۆکاری بڵاوبوونەوەی خراپەکاری و ئاشووب لە زەویدا.

## ئاوڕدانەوەیەک وەسەر ڕەحم و بەزەی بەرفراوانی خودا

٤٣٠ساڵ بێ شەرم و حەیایی جـوولەکە کە لە وڵاتـی میسـر خـودا لە خۆشـی و ڕزق و ڕۆزی بێبەشی نەکردن، جگە لەوەش لە دەستی فیرعەونیشـی نەجـات دان، هێنـانیە سـەحرای

سینا بۆوەی شەرم بیانگرێ و چاک بن و بتوانن قودس وەرگرن موساشیان بۆ یاریـدەدان هەر لە لا بوو لە بیابانی قاقڕی سینا و لەوێش خودا لەمەڕ ژیان فەرامۆشی نەکردن گەزۆ و شێلاقەی بۆ باراندن، هەر چا نەبوون؛ هەر ڕۆژەی بەهانەیەکیان بە مووسا دەگـرت کە بیـانگێڕێتەوە میســر. ئەدێرەدایە دڵ کە ڕەش بوو هەستی نامێنێ کەوایە دەبێ ڕێ نەدرێ ڕەش بێ وەک جوولەکە، بـۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٦١:

﴿٦١﴾ وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَى لَن نَّصْبِرَ عَلَىَ طَعَامٍ وَاحِدٍ فَادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنبِتُ الأَرْضُ مِن بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ الَّذِي هُوَ أَدْنَى بِالَّذِي هُوَ خَيْرٌ اهْبِطُواْ مِصْراً فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ وَالْمَسْكَنَةُ وَبَآؤُوْاْ بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُواْ يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ بِغَيْرِ الْحَقِّ ذَلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ

لێرەشدا ئیشارە وەلای لاڕە و شتێکی خراپی جوولەکەکان دەکـات، ئەوە بـوو خـودا لە دەشـتی سینادا گەزۆ و باڵندەی سەلوای بۆ ڕەخساندن کەچی پاش ماوەیەک بە مووسایان کـوت ئـێمە خۆمان پێ ڕاناگیرێت لەو خواردنانە بێزار بووین، توانای یەک چەشنە خواردنمـان نیـیە داوا لە خـوداکەت بـکە بـا لەوەی لە زەوی دەڕوێـت بۆمـان فەراهەم بهێنێـت. وەکـوو خەیـار، گەنـم، نیسک، سیر و پیواز. مووساش پێی کوتن ئێـوە دەزانـن کە ئـێمە لە شـوێنێکداین قـاقڕە هـیچ سەوزایی و شینایییەکی لـێ شـین نابێـت ئایـا دەتانەوێـت ئەو خـواردنە چاکـانە کە شـیرینی و چەوری و گۆشــتی بەلەزەتە، بە خــواردنێکی دی بگــۆڕنەوە کە هەرگیــز ئەو تــام و چێــژەی ئەمانەی نییە؟! جا کەوایە بـڕۆن بـۆ شـارێک کە ئەوانەی لـێ دەس دەکەوێ. بەڵام چـونکە لە نیشانەکانی خـودا حاشـایان دەکـرد، هەر لە نـاهەق پێغەمبەرەکانیـان یـاغی بـوون و ملیـان لە دەسدرێژی دەنا، وەبەر غەزەبی خودا کەوتن و چارەڕەشی و زەبوونییان بۆ بڕیار درا.

## ئاوڕدانەوەیەک

وەنەبێت مانەوەی ئەو جوولەکـانە لەو بیابـان و قـاقڕەی دەشـتی سـینا بە فەرمـانی خـودا بووبێت. نەخێر، بەڵکوو مووسا زۆر جاران هانی دەدان بـۆ ئەوەی غیـرەت لە خـۆ نیشـان دەن خۆیان بۆ ڕووکردن لە ئاوەدانییەکی دیکە و داگیری کەن بـۆ خۆیـان. کەچـی لە ترسـان و بـێ ئیمانییان گوێیـان نەدەدا بە قسـەکانی مووسـا، جـا لەبەر ئەوانە و ناشـکوری و بـایەخ نەدان بە موعجیزەکان کە هەر یەکیان گەورەترین بەڵگە بوون لە سـەر ڕاسـتی پێغەمبەرایەتـی مووسـا و

شایستەگی ئەو، لەبەر هەموو ئەوانە خـودا دوچـاری زەلیلـی و سەرشـۆڕی کـردن کەوتـنە بەر هێرشی ڕق و تووڕەیی خودا لە هەر دوو دنیا.

بەدئەخلاقی جوولەکە سەبتە لە قورئاندا چەن پێغەمبەرێکی خۆیان کە لە پاش عیسا بۆیـان نێردرابـوو کوشـتیانن وەک: ئەشـعیا، زەکەریـا، یەحیـا. جـوولەکەی سەرسـەخت و دڵڕەش نموونەی بێشەرمی و یاغیگەری بوون.

جوولەکە بۆوەی خەڵک گوێی لە گوفتاری بەحەقی پێغەمبەران نەبێ، هـاتن گەیشـتنە ئەو خەیاڵە کاڵ و خاوە بیانکوژن، بێ خەبەر لەوەی دەنگی حەق کە لە سەرووی هەمـوو دەنگـانە، خەفە نابێ. ئەوانەی کوشتیانن: ئەشعیا، یەحیا، زەکەریا، هەروەک ئەوڕۆش جوولەکە سـیفەتان سـەرانی گەلان دەکـوژن بـۆ وەی دەنگـی بەحەقـی گەلان خەفە کەن بەڵام بـێ خەبەر لەوەی دەنگی حەق خەفە نابێ.

پرسیارێک دێتە پێشێ دەو باسەدا، ئەویش ئەوەیە: خودا دە ئایەتی ٥١ی غافردا دەفەرمـوێ نەسـرەتی ڕەسوولان دەدەین. کەچی جوولەکەش بە کوشتنیان وەربوون. ئایـا ئەو نەسـرەتە لە کوێیە و بۆ کەنگێیە و چییە؟ ئایەتەکە، پاشان وەڵامەکە: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ﴾ ﴿٥١﴾ «غافر» **واتە ئێمە پێغەمبەران و خاوەن باوەڕان نەسـرەت دەدەیـن هەم لە دنیادا هەم لە ڕۆژی ئاخیرەتدا.**

وڵام: هەچەن لەو بـارەوە وڵام زۆرن، بەڵام ئـێمە بە یەک دوو وڵام ئیکتیفـا دەکەیـن: سەرکەوتن و نەسـرەت بەرز بوونەوەی دەنگی حەقە، مـانەوەی ئەو دەنـگەیە دەنـاو عالەمـدا بە حەق، دنیـا شـاهیدی بەحەقـی ئەو دەنـگە بـدا و ویـژدانیش تەئیـدی بکـا. ئەوە سـەرکەوتنە؛ عەکسەکەی ڕەبن‌کەوتنە، نیدای پێغەمبەران لە هەر دو دنیادا بەرزە و پەسەندە. با ئەوەش قووت نەدەین، دە ئایەتی ﴿وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ﴾یە بەڵام دە ئایەتی ﴿لَنَنصُرُ رُسُلَنَا﴾یە ئەوەش ئامـاژەیە وەلای فەرقی نێوان نەبی و ڕەسوول.

فەرقێکی نێوان نەبی و ڕەسوول پێویستە بکەین. ئیبنی عەباس دەڵێ: ڕەسوول تۆڵەستێنن لە ڕۆژی خۆیدا لەوانەی ئیهانەیان دەکەن و دەیانکووژن. بیسـراوە دە موقابیل کوشتنی یەک نەبی، هەزاران نەفەر کوژراوە. (تەفسیری روح المعانی، ج١، ل ٢٧٧) یا دەڵێن ڕەسـوول واتە ئەوانەی بەرەنگاری دوژمن دەبن و خۆڕاگری دەکەن تا سەر کەون. (بحر المحیط، ج١، ل ٢٣٧)

## تیوتیوەیەک

جوولەکە لای وایە تەنیا ئایینی وان حەقە و هەڵبژێردراوە لە لای خودا و بەهەشت بۆ وان تەرخان کراوە؛ خوداش وە درۆیان دەخاتەوە، بە ودەلیلە ئاینی بەحەق ئاینی خودایە بۆ ئەو کەسەشە دەگەڵ خودایە؛ جا هەر ناوێکی هەبێ وەک یەهوود، موسوڵمان، نەسارا، سائیبین و... دەچینە خزمەت ئایەتی ۶۲، ورد تێی دەفکرین و تێی هەڵدەڕوانین تاکوو بزانین وایە یا وا نییە.

**﴿٦٢﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ هَادُواْ وَالنَّصَارَى وَالصَّابِئِينَ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحاً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ**

**بێ گومان ئەوانەی باوەڕیان بە محەمەد هێناوە، و هەروا ئەو جوولەکە و مەسیحی و گاوریش کە باوەڕیان بە خودا و ڕۆژی دوایی هێناوە، کردەوەی چاکیشیان کردووە و خۆیان لە خراپە پارازتووە، ئەوانە پاداشتی چاکیان بۆ بڕیار دراوە و لە دواڕۆژیشدا هیچ ترس و خەمێک ڕوویان تێ ناکات.**

بێ گومان لێرەدا کە باسی ئەو ئایینانە دەکات مەبەست ئەوانەن کە لە پێش هاتنی ئیسلامدا ژیاون.

## ئاوڕێک وەسەر نەزەری ئیمامی غەزالی لە سەر باوەڕهێنان بە ئایینی ئیسلام

۳ نەزەری داوە کە خاوەن باوەڕ سێ دەستەن: ۱. ئەوانەی کە ئیسلامیان پێ نەگەیشتووە و نازانن ئاینی خودایە، ئەوانە لە سەر موسوڵمان نەبوونیان سزا نادرێن ۲. ئەوانەی کە ئاینی ئیسلامیان پێ گەیشتووە بەڵام لەبەر لە دەس‌نەدانی بەرژەوەندی دنیا لێی ناکۆڵنەوە و ڕووی تێناکەن، ئەوانە سزایان هەیە ڕۆژی خۆی، ۳. ئەوانەی کە بەشێوەی نادروست ئاینی ئیسلامیان پێ گەیشتووە و بەو شێوەیە دروست حاڵی نەکراون، ئەوانەش هەروەک دەستەی هەوەڵ سزایان نییە. تاوانیان لە ئەستۆی نیزام و دەستەڵاتی وەختە کە ڕێگایان خۆش نەکردووە و نەداوە ئەوانە لە دین حاڵی بن.

## صابئین بناسین

کەسانێک بوون یەکتاپەرەست، بەڵام هێندێکیان لە ئەسەری ئەفکاری هاڵۆز و ناڕەوا کە تووشیان هاتبوو لە لایەن لە دین بێ‌خەبەران ببوونە موشریک و ئەستێرەپەرەستی بە ئاشکرایی

وەک هێندێک لە عالەمی ساوا و کاڵ کە ئەورۆ بە دەست عالمی ساوا و کاڵ و دین‌نەناسی پێوە بوون. ئەو صابئینانەش بە زۆری لە دەورانی حەزرەتی نووح و یەحیا و زەکەریادا بوون.

## پرسیاری سەلمانی فارسی لە پێغەمبەر لەمەڕ گاور و جوو و نەسارا

گۆیا سەلمانی فارسی لەمەڕ گاور و جوولەکە و ئەرمەنی و نەسارا پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ کردووە کە ئەوانەش بەشی زۆری ژیانیان لە ئەشکەوت و بیابانەکاندا بردۆتە سەر. دەبێ حاڵی ئەوان چۆن بکەوێ. دیارە سەلمانیش پاش هەڵسەنگاندنی هەموو ئایینەکانی ئاسمانی، ئایینی ئیسلامی قبووڵ کردووە. کاتی خۆی سەلمان واتە پێش ئەوەی موسوڵمان بێ، مامۆستای زۆربەی (احباریەکان) و (ڕاهیبەکان) بووە، ویستوویەتی لەو ئایینانە باش تێبگا، حەزرەتی ڕەسوول لە وڵامی سەلماندا فەرموویەتی: ئەوانەی نەگەیشتوونە ئایینی من و ڕابردوون، ڕزگارن. ئەوانەی ئایینی منیشیان پێ گەیشتووە و بێ دەلیل ڕوویان لێ وەرگێڕاوە، ئەوانە ڕزگاریان نابێ. سەلمان پەرۆشی و پەرێشانی لە خۆ نیشان دەدا بۆ ئەوانەی بە ئایینی ئیسلام نەگەیشتوون. ئەدەوەیدا دڵی پێغەمبەر کە هەست بە پەرۆشی دڵی سەلمان دەکا بە دڵیدا دێ کە خودای تەعالا ئارامش و سوکنایی بداتە دڵانی گوماناوی. ئینجا ئەو ئایەتە (٦٢) نازڵ دەبێ کە بە دڵان ڕادەگەیێنێ ئیمانی بە واقیعی و پەسندی لای خودا ناو و شۆرەت نییە وەک ئیسلام، یەهوود، نەسارا و ... بەڵکە عەمەل و ئیخلاس لە سەر ئەساسی باوەڕی بە خودا و ئاخیرەت و ... بە دەلیلی ئایەتی ١٤٨ی بەقەرە: ﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا فَاسْتَبِقُواْ الْخَيْرَاتِ أَيْنَ مَا تَكُونُواْ يَأْتِ بِكُمُ اللَّهُ جَمِيعًا إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ **هەر خاوەن ئایینێک جێگەیەکی تایبەتی خۆی هەیە کە ڕووی تێ دەکات ... ئەی موسوڵمانینە شەرت پێشبڕکەیە لە چاکە و چاکەکاری واتە تەقوا و ئیخلاس، لە هەر کوێش بن واتە جەنازەتان، لە سەر هەر ئایینێکیش بن خودا کۆو دەکاتەوە کاتی خۆی. ئەو کارە بۆ خودا قورس نییە، چونکە خودا تەوانایە بە سەر هەموو شتدا.**

دڵ دەیهەوێ بزانێ یەهوود یانی چی و لە چی‌ڕایە. ئەمەش بە پێی بیستن دەڵێن: یەهوود لە «هاد ـ یهود»ڕایە واتە تۆبە و گەڕاوە و شارەزا بوو. کەوابێ یەهوود کاتێ لە گوێرەکە پەرەستی وازی هێنا بەرەو خوداپەرەستی، ناوی یەهوودی تایبەتی خۆ کرد. با زەین دەینە ئایەتی: ﴿إِنَّا هُدْنَا إِلَيْكَ﴾ ﴿١٥٦﴾ «اعراف» **واتە ئێمە تەوبەمان کردووە و گەڕاوینەتەوە بۆ لای تۆ.** بۆ زێدە زانین بڕوانە تەفسیری قرطبی، ج ١، ص ٤٣٣ـ ٤٣٢.

نەسارا بەو کەسانە کوتراوە شوێن حەزرەتی عیسا کەوتوون هەم نەساراشیان پێ کوتراوە

مەسیحیشیان پێ کوتراوە، بۆ ئەو ڕاستییە بچۆ دە خزمەت ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا أَنصَارَ اللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّينَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللَّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللَّهِ فَآمَنَت طَّائِفَةٌ مِّن بَنِي إِسْرَائِيلَ وَكَفَرَت طَّائِفَةٌ فَأَيَّدْنَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَى عَدُوِّهِمْ فَأَصْبَحُوا ظَاهِرِينَ﴾ ﴿١٤﴾ «صف» **ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، ببنە یارمەتیدەرانی ئایینی ئیسلام واتە خودا، هەروەک عیسای کوڕی مریەم کوتی بە هاوڕێکانی خۆی: کێ یارمەتیدەری منە بەرەو لای خودا؟ هاوڕێ پاڵافتە کراوەکان کوتیان: ئێمە یارمەتیدەرانی خوداین لە ئەنجامدا دەستەیەک لە بەرەی یەعقووب ئیمان و بڕوایان هێنا دەستەیەکیشیان کافر بوون، ئەو کەسانەی کە بڕوایان هێنابوو سەرمان خستن بە سەر دوژمنەکانیاندا لە ئەنجامیشدا هەر زاڵ بوون.**

صابئین کێن و بە کێ دەڵێن؟ هۆزی عەرەب هەر لە کۆنەوە بەو کەسانەی لە ئایینی کەسانی خۆیان وەلا کەوتوون و ئایینێکی دیکەیان گرتۆتە بەر، پێیان کوتوون «صابئین»، هەروەک موشریکەکانی مەدینە بە پێغەمبەریان دەکوت «صابی». صابئین کە دەستەیەکی سەربەخۆن نەزەری جۆراوجۆریان لە سەرە. عەللامە ئالووسی کوتوویەتی ئەوانە هەر لە کۆنەوە ویستیان شوێن کەوتنی ڕوحانیون بووە بە ئەندازەیەک لە سەر ئەو باوەڕە بوون لایان وا بووە هەچی شوێن ڕوحانی نەکەوێ ناتوانێ خودا بناسێ بە چاکی. جا لە سەر ئەو توندڕەویەی گەیشتوونە شکڵسازی شکڵ ڕوحانیون لەوەش‌ڕا گەیشتوونە بت پەرەستی وەک هێندێک لە عالەمی ئێستێ.

هێندێکی دیش کوتوویانە صابئین ئەهلی تەوحید بوون لە خاوەن باوەڕانی یەحیا بوون بەڵام لە قەزا و قەدەردا ئەستێرەیان بە موئەسیر زانیوە. (روح المعانی، ج١، ل ٢٧٩). هێندێکی دیش کوتوویانە صابئین باوەڕیان بە زەبووری داود پێغەمبەر بووە بۆ عیبادەت ڕوویان دە قیبلەیەکی دی کردووە. فرشتەشیان پەرەستوون. هێندێکی دیش کوتوویانە صابئین لە مەجووس و هەرمەنی بوون، نە دەسکوژیان حەڵاڵ بووە، نە ژن لێ هێنانیان. گەرچی حەزرەتی عومەر فەرموویەتی هەموو شتێکیان دروستە، هەم دەسکوژیان، هەم ژن لێ خواستنیان، چونکە ئەهلی کتێب بوون. (تەفسیری کەبیر، تبيين القرآن، هەمان ئایەتی ٦٢)

ئەوجار کاتی ئەوەی هات بچینە خزمەت ئایەتی ٦٣:

﴿٦٣﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ خُذُواْ مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ

**یادیش لەو کات و ساتە بکەنەوە کە پەیمانمان دەگەڵ بەستن و کێوی توورمان لە سەر ڕاگرتن ئەوەی کە پـێمان داون بە تونـدی بیگـرن ئەو شـتانەی کە تێیـدایە بـاس بـکەن بەو هیـوایە لە خوداترس و پارێزگار بن.**

## تێڕوانینێک لە لاساری قەومی یەهوود

ئەو جوولەکانەی کە لە داوێنی کێـوی تـووردا بـوون، و کێـوەکەش بە ژووری سـەریانەوە وێستابوو بە ئەمری باری، دەترسان لەوەی کێوەکەیان بە سەردا بڕووخـێ بەڵام مووسـا دڵنیـای کردبوون لەوەی ناکەوێ بە سەریاندا، وەک ئاماژە وەلای ئەو واقیعە دەکا، ئـایەتی: ﴿وَإِذ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّواْ أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ خُذُواْ مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ ﴿١٧١﴾ «اعراف» **ئەی پێغەمبەر تۆ بە جوولەکان بڵێ کە چۆن خودا کێـوی تـووری وەکـوو سـێبەرێک بەرز کردەوە بە سەر پێشینیانیاندا و وایان زانی دەڕووخێت بە سەریاندا بـۆیە زۆر دەترسـان. لەو کـاتەدا پێیـان دەکوترا: بە هەموو تواناتانەوە پەیمان بدەن کە بە پێی تەوڕات بڕۆن بە ڕێـدا و لێـی لانەدەن. بەڵکـوو ئەوە ببێتە مایەی ئەوەی پارێزگار بن و خوداپەرەست بن و خۆشتان بپارێزن لە خراپە.**

**بۆچوونێک**

دەکرێ بڵێین لەنگەر گرتنی کێوی توور بە سەریانەوە ئەوە بێ: ئەوان بە داوێنـی کێـوەکەوە خۆیان مەڵۆس کردبوو، دەو کاتەدا بوولەرزەیەک لە کێوەکەی دابێـت، ئەوانـیش تراسـن لەوەی کێوەکە هەرەس بێنێ بە سەریاندا. بەڵام دەبێ باوەڕمان وابێ خودا توانایە دنیا بە حەواوە ڕاگرێ چ جای کێو!

**بۆچوونی ئیمام فەخری ڕازی:**

جوولەکەکان دەترسان لەوەی کێوەکە بە سەریانددا بێ، بەڵام کاتێ دیتیان زەمانێکی درێـژە ئەو کێوە وەک خۆی بە سەریانەوە وەستاوە و ناکەوێ، ترسیان لە سەر ڕەوی بەوەیان غیـرەت دا خۆیان بە درێژایی دەوران ئاسمان بەو هەموو زەلامیەی ڕاگرتـووە لە حەوا و نـاهێڵێ بڕووخـێ چۆن ناتوانێ کێوێک ڕاگرێ بە حەواوە! جا کاتێ ترسیان ڕەوی، ملیان نـا لە بێئەمـری بـاری، وەک خەڵکی بێبـاوەڕ ترسـیان نیـیە لە خـودا و دەکەونە فەسـادکاری؛ بـۆ ئەو ڕاسـتییە بـڕوانە تەفسیری کەبیر، ج ٣، ل ١٠٨.

لەوەیدا کە یەهوود لە سەر ئەو هەموو ئەنعامەی پێیان دەبەخشێ خودا هەر خراپە دەکەن و ناشکوری نیشان دەدەن خوداش هەر کەرەمیان دەگەڵ دەکا، دڵ وەخۆ دەکەوێ بێ ترس بـێ و

لە تاوان نەپرینگێتەوە چونکە خۆ دەڵێ لە جوو هەر خراپتر نابم، بە هەر حاڵ دەچینە خزمەت ئایەتی ٦٤ی بەقەرە، دەوێدا دڵڕەشی و دڵڕەقی یەهوود و ڕەحم و بەزەی باری بە چاوی دڵ چاو دەکرێ:

﴿٦٤﴾ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّن بَعْدِ ذَلِكَ فَلَوْلاَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لَكُنتُم مِّنَ الْخَاسِرِينَ
**پاشان پشتتان کردە ئەو بڕیار و فەرمانانەی خودا و پەیمانەکانوو شکاند خۆ ئەگەر ڕەحمەتی خودا فریاتان نەکەوتایە ئەوە بە هیلاک دەچوون و خەسارەتمەند دەبوون.**

## تێوەڕامانێک لە ئاکاری ناحەزی یەهوود

پاش ئەوەی قبووڵی ئەوەیان کرد عەمەل بە تەورات بکەن و لێی لانەدەن کەچی وایان نەکرد، دەگەڵ ئەوەی لە کاتێ کە کێوی توور لەنگەری لە سەر گرتبوون بڕیاریان دا عەمەل بە تەوڕات بکەن، کەچی هاتن بۆ شوێنەونکە واتە نەزاندرێ، تەورات چی تێدا بەیان کراوە، ئەوەی بەرچاو و زەق بوو تێیدا، گۆڕییان و لایانبردن. پاشان ملیان لە پێغەمبەر کوشتن و ئازاردانیان و وێران کردنی بەیتەلموقەدەس و کوشتنی عیسا و لە ناو بردنی کەلامی باری، قورئان و ئینجیل. بڕوانە تەفسیری کەبیر، لەو بارەوە.

## ئاوڕێک

خودای تەعالا بۆ ئەو جوولەکانەی دانا دە حەوتەدا شەش ڕۆژ کار بکەن، ڕۆژێکیش هیچ نەکەن وەک شەممە بێ. هاتن لەو ڕۆژەشدا فێڵ دانێنەوە شارێک هەبوو لە سەر لێوی دەریا کە کاسبی خەڵکی ئەو شارەی بە زۆری خرید و فرۆشی ماسی بوو و ماسی دەریاکە هەستیان بەوەی کردبوو ڕۆژی شەممان خەڵک نایەتە زگیان بە ئەمینی دەهاتنە ڕووی دەریاکە. یەهوودییەکانیش هاتن بۆ چاوبەستی خەڵک ئەو ڕۆژەیان ڕێز لێ دەگرت و هیچیان تێدا نەدەکرد و بەڵام لە نیزیک و لێواری دەریاکە چاڵ و قووڵیان دادەبڕی تاکوو ماسییەکان بە ئاوەکەدا بێن و تێکەون دە چاڵەکە و ڕێی گەڕانەوەیان نەمێنێ. ئەوانیش وەک چۆن ڕۆژی شەممە دەیانکەنە چاڵەکە وڕۆژی یەکشەممەش بیانهێننە دەر و بیانفرۆشن. ماسیەکان کە ڕۆژی شەممان بە ڕاحەت و ئەمینی دەهاتنە ڕا و لە سەر ئاوەکە و ڕۆژانی دیش دەچوون بن دەریاکە بۆ نەجاتی گیانیان، ئاوایان دە داو خستن کە ڕۆژی شەممان بکەونە ناو چاڵەکە و یەکشەممانەش بیانگرن. دیارە وەک بەشی گەورەی باوەڕمانە، خودا زاناتر و ڕێگرتر و فێڵبڕترە

لە عالەم، بە سزایان دەگەیێنیێ، بۆ ئەو باسە دەچینە خزمەت ئایەتی ٦٥:

﴿٦٥﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ الَّذِينَ اعْتَدَواْ مِنكُمْ فِي السَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَاسِئِينَ
**«دیارە وەک زانـدراوە مووسـا پەیمانـی لە جوولەکەکـان وەرگرتبـوو کە ڕۆژانـی شـەممە کـار نەکەن، بەڵام هێندێکیان ئەو پەیمانەیان شکاند، خوداش دێرەدا پێیان دەڵێت» ئێـوە زانیوتـانە کە کۆمەڵێک لە پێشینانتان پەیمانی ئیش نەکردنی شەموانیان شکاند، بۆیە ئێمەش پێمان کوتن: دە بڕۆن ببنە مەیموونی دوور لە ڕەحمەتی خودا.**

ئاوڕێک وەسەر نەزەری هێندێک لەو کەسانەی لە سـەراحەتی قورئـان بێـزارن ڕوو دەکەنە ئەولاولا ﴿فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ﴾، ئەو تاقمە دەڵێن ئەوانە نەبوونە مەیموون بەڕاستی، بەڵکە لە بـێ ئەرزشی و بێقیمەتیدا وەک مەیموونیان بە سەر هاتووە، واتە لە ئەرزش و کەڕامەت و کەمـاڵی ئینسانی دابەزیون هاتوونە خوار پلە و پایەی حەیوانی وەک مەیموون.

دڵی هەستیار لە ڕاوێژ و سیمای ئایەتی ٦٥ وا هەست پێ دەکـا کە خـودای تەعـالا ڕووی خیتابی دە یەهوودییەکانی دەورانی محەممەد المصـطفیﷺ بـێ و هەروا وەبیریشـیان خـاتەوە کردار و ئاکاری بەدئەخلاقی کەس‌وکاری پێشینیان کە بە هـۆی ناحەزیـان بـوونە مەیمـوون، بە کـورتی بیـری یەهوودییەکـانی دەوری محەمـمەدﷺ دەخـاتەوە کە ڕابوردووەکانیـان بە هـۆی شکاندنی پەیمان دەگەڵ خودا ڕوخساریان هاتۆتە سەر شکڵی مەیموون و بەراز. واتە لاوەکـان بوونە مەیموون، پیرەکان بوونە بەراز. بۆ باوەڕ و زێدە زانین بڕوانە تەفسـیری «قرطبـی»، ج١، ل ٤٤٠.

بائەوەش زەخیرەی زەین و شـعوور کەیـن: فێـڵ کردنـی جـوولەکە دە ڕۆژی شـەممەدا لە ماسییان کە بوو بە هۆی شکاندنی ئەمـری بـاری، لە دەورانـی مووسـادا تـا دەورانـی داود هەر بەردەوام بووە. تەفسیری کەبیر، ج ٣، ل ١١٣-١١٢.

سزا و تۆڵەی ئەو ئاکارە ناحەزەی جوولەکان، هەم بۆ دەروانی مووسا هەم بۆ دەروانی پاش مووساش بووە، بۆ ڕاستی ئەو داوایە دەچیـنە خـزمەت ئـایەتی ٦٦، دەوێـدا بە پـانەوە هەسـت دەکرێ:

﴿٦٦﴾ فَجَعَلْنَاهَا نَكَالاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ
**ئەوانەمان کردنە مەیموونی دوورخراو لە ڕەحمەتی خودا، تا ببـنە پەنـد و عیـبرەت بـۆ خەڵکـی**

**سەردەمی خۆیان و سەردەمەکانی دواتریش، (هەر کردمانە مایەی پەند و ئامۆژگاری بۆ لە خودا ترساوان و پارێزگاران، و هەروا ئایەتەکانی دێن لەوە بەدوا ملهوڕی جوولەکەکان نیشان دەدا وەک کارەساتی مانگاکە.)**

## تێوەڕامان و پێداچوونێک لە خۆبەزلزانین و دنیاپەرەستی

یەکێک لە تەوراتزانەکان واتە کەعی ئەحبار کە مەرجەعی عالەمی یەهوود بوو لە کاتی خۆیدا، کاتێ خەبەری زهووری محەمەدﷺ دێ و دەیبیسێ، دەکەوێتە ئەو باوەڕەی ڕاستە چونکە مووسا بە هۆی تەورات موژدەی هاتنی ئەوی داوە لە ئاخری هەموو پێغەمبەرەکاندا، سەرەڕای ئەوەش ئەگەر گوفتارەکانی محەمەدیشی پێ دەگا ئەوەندەی دیش بەقایە دەکا کە ڕاستە و هاتووە. دەیهەوێ بچێتە لای و ئیمانی پێ بێنێ، بەڵام داخەکەم هەروەک خۆشەویستی دنیا ئاخرەت و باوەڕ و ئیمان تاڵان دەکا، کەعب خۆ وە دەم دنیا دەدا، دنیاش پێی دەڵێ ئەگەر دەتەوێ ئەمن و شۆرەت و ناو و ڕێ و ڕێبازی باب و باپیرانتان لە دەس بدەی ئەوە بچۆ، وهەروا (ارحم الراحمین) خوداش لەوێ لە سەر ئەو خەیاڵاتە خاوە شەیتانییە، زیارەتی پێغەمبەری لە دەس دەچێ، پێغەمبەر وەفات دەفەرموێ و لە دەورانی حەزرەتی ئەبووبەکریشدا هەر هەمان خەیاڵ، بەڵام کەم هێزتر بەو هۆیە کە دەڕوانێتە سیمای ئایەتی ٤٧ی نیساء، ترس دایدەگرێ بە خەیاڵی ئەوە تووشی سزای یارانی شەممە بێ واتە مەیموون، بە کورتی دەگاتە ئەو قۆناغەی لە کلکەی تەمەنیدا ئیمان دێنێ بە محەممەدﷺ و قورئان کە حەقن، با ئایەتەکە نیشان دەین پاشان دێیە سەر کەعب: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ آمِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَى أَدْبَارِهَا أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّا أَصْحَابَ السَّبْتِ وَكَانَ أَمْرُ اللّهِ مَفْعُولاً﴾ ﴿٤٧﴾ «نساء» **ئەی ئەوانەی خاوەن کتێبن، (مەبەست جوولەکان و دیانەکانن) باوەڕ بێنن بە قورئان کە ناردوومانە بۆ هیدایەتی هەموو جیهان، ئەو قورئانەی کە تاریفی تەورات و ئینجیلیش دەکا، باوەڕی پێ بێنن پێش ئەوەی مەرگ یەخەتان بگرێ و ڕووتان ڕەش بێت و شێوە و ڕوخسارتان بگۆڕێ وە دوورتان وەخەین لە ڕەحمەت وەکوو پێشینانی خۆتان (واتە هاوەڵانی شەممە) بزانن بڕیاری خودا کوتوپڕ و بێدواکەوتن دێتە دی.**

کارەساتی کەعبی ئەحبار دەڵێ چی؟ دەڵێ تۆوی هەر شتێک داچنابێ لە هەر لایەک بە شەرتێ نەڕزابێ ڕۆژێ شین دەبێ، کەعب تۆوی باوەڕی بە حەق واتە پێغەمبەر و قورئان، دە ناو دەروونیدا هەبوو چنابوو فاسیدیش نەبوو سەرەنجام شین بوو با لە پاش دەورانێکی دوور و

درێژیش بێ.

## شتێکی مێژوویی

لە دەورانی حەزرەتی مووسادا تا کۆتایی دەورانی حەزرەتی عیسا، هەفتە واتە ئەو حەوت ڕۆژانە بەو ناوانە بوون: (شیار اول ـ اهون ـ جیار ـ دبار ـ موسی ـ عروبه ـ جمعه) ماوەیەکیش پاش عیسا بەو ناوانە کوتراون، پاشان عەڕەبەکان ئەو ناوەیان بە شێوەی زمانی خۆیان دەس پێکرد واتە هێنانیانە سەر زمانی خۆیان. بەو ناوانە (سبت ـ احد ـ اثنین ـ ثلاثاء ـ اربعاء ـ خمیس ـ جمعه یا عروبه) ناوی ڕۆژی جومعە لە دەورانی عەرەبی جاهیلیدا (عروبه) بووە پاشان خودای مەزن دە قورئاندا بە (جمعه)ی ناودێر و سەبت کرد.

پاش ئاشکرا و بەیانی عەیبەکانی جوولەکەکان دڵ پێی وابوو خودا وازیان لێ دێنێ بەڵام دیارە هەچەن سەرپێچی لە ئەمری باری بکەن بۆ دەرس و عیبرەتی گەلانی داهاتوو خودا باس دەکا و نیشانی دەدا. بۆ نموونە کارەساتی سەربڕینی مانگا، کاتێ مووسا بە ئەمری باری دەستووریان پێ دەدا کە مانگایەک بەو شکڵ و شێوە سەربڕن تاکوو قاتڵ ئاشکرا بێ، کەچی دەکەونە بەهانە و خۆدزینەوە لە ئەمر وفەرمانەکە لە ڕووی مووسا دەڵێن: مووسا لە باتی کارمان بۆ ڕاست کا و ڕاستیمان پێ بڵێ، گاڵتەمان پێ دەکا، کارمان لێ وە سەخت دەخا، ئەوە چی بە سەر چییەوە؟ ئینجا بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٦٧ی بەقەرە، کە دەوێدا بێگومان گومان نامێنێ:

**﴿٦٧﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ إِنَّ اللَّه يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُواْ بَقَرَةً قَالُواْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُواً قَالَ أَعُوذُ بِاللّه أَنْ أَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ**

**مووسای پێغەمبەریان پێی کوتن: خودا دەفەرمووێت با مانگایەک سەر ببڕن، کەچی ئەوان لەباتی بەجێهێنانی فەرمانەکەی باری، دەستیان دایە بە دەمەدەمە و بێشەرمی و بێئەدەبییەوە و کوتیان: گاڵتەمان پێ دەکەیت؟ خۆیان لەو حەقیقەتە بەدوور دەگرت کە مووسا پێغەمبەری خودایە و لە گاڵتەبازی بەدوورە، بۆیە مووساش فەرمووی: پەنا دەگرم بەوەی کە تێنەگەیشتوو و نەفام بم و گەمەتان پێ بکەم.**

## تێڕوانینێکی وردبینانە

ئەو کارەساتەی خاوەن ڕاز و ڕمووزی مانگا سەربڕینی هۆزی یەهوود کە قورئان سەبتی

کردووە گەورەترین واقیعەیە بۆ هەرچی گەل و هۆزە نە تەنیا هەر گەلی یەهوود، چونکە ئەو کارەساتە ئەوە بە ئینسانی دەڵێ: سەربڕین و خوێن ڕشتنی بەناحەق دەخرێتە پێناو خۆشەویستی ماڵ و سامانی دنیا. وەهەروا حەق فرۆشتنی بە ناجەق ڕووڕەشی و بێئابڕووی دەخاتە ئەستۆ بۆ هەتا هەتایە و دەشکرێتە دەرس و عیبرەت بۆ گەلانی دنیا.

دڵ بە پێویستی دەزانێ: ئەوە بزاندرێ و بە عالەم ڕاگەیێندرێ: سەرچاوەی ئەو ماجەرایە و ئەو کارەساتەی مانگا سەربڕینە لە چیڕا پەیدا بووە، و ڕیشەی لە چیدایە؟ بۆ ئەو وڵامە دەبێ ڕوو بکرێتە قورئان و قورئانزانەکان، تەفسیری کەبیر و «تبيين القـرآن» هەچەن چیرۆکزانەکان بۆچوونی جۆراوجۆریان هەیە لەو بارەوە، بەڵام ئێمە ئاماژە بە دەلیلانێک دەکەین ئەقڵ لێی هەڵنەبەزێتەوە. بۆ نموونە: دوو برا دەبن ئامۆزایەکی سامانداریان دەبێ ئەو ئامۆزایەش هیچ میراتگرێکی نابێ بەغەیرەز ئەو دوو برازایە. دیارە ئەو دوو برازایەش کە بێ سامان دەبن دەزانن ئەگەر ئەو مامەیان نەمێنێ ئەو سامانەی ئەو بۆ وان دەبێ، جا لەوەیڕا بۆ سامان و دارایییەکەی دەیکوژن و لاشەکەی دەخەنە ناو زبڵ و زاڵ، لە بەرەبەیانیشدا هات و هاوار بەرپا دەکەن، دەڵێن: هەرکەس مامی مەی کوشتبێ بە سزای خۆی دەگەیێنین. ئەو دوو برازایە بە خەیاڵیان هەم خوێنی مامیان وەردەگرن، هەم دارایییەکەی ئەو بخۆن، بەڵام بێخەبەر لە عەداڵەتی خودا، واتە ناحەق ناتوانێ سەرکەوێ لە حەق.

هێندێکیش دەڵێن: دوو برا دەبن و بابێکی سامانداریان دەبێ. کاتێ بابیان دەمرێ، ئەو دوو برایە کە دەبنە میراتگری بابیان، لە سەر کەم و زۆری میرات بە کێشە دێن، یەکیان یەکیان دەکووژێ تاکوو ماڵەکە داگیر کا.

هێندێکیش پێیانوایە کابرایە دەبێ برازایەکی دەبێ، میراتی زۆری گیر دەکەوێ لە بابیڕا، ئەو پیاوە تەماعی ماڵی دنیا دەیگرێ و ئەو برازایەی دەکووژێ تاکوو ماڵەکەی بە میرات بەرێ.

بە هەر حاڵ، هەر جۆر بووبێ کارەساتەکە سەرچاوەی لە تەماعی ماڵی دنیایەڕا گرتووە. هێندێکیش هەن دەڵێن پیاوێکی هەوەسباز ئارەزووی دەچێتە کچێکی ئامۆزای، مامیش ساماندار دەبێ و پیاوەکەش بێسامان. ئەو پیاوە کە دەبێتە برازای مامی ساماندار، دوو تەماع یەخسیری دەکەن: ١. ئارەزووی شەهوەت ٢. ئارەزووی ماڵی زۆر. هەر دوو ئارەزوو مامی پێ دەکوژن بە هیوای کچە و ماڵ تووشی ئەو کارەساتە دەبێ. دە موقابیلدا بۆخۆی پێوە دەبێ، هەم بۆخۆی دەچێ. هەم کچی مامی هەم ماڵی مامی، ئەو کارەساتە بە ئینسان دەڵێ تەماع سەری

نەبڕی، سەرت دەبڕێ. بۆ زێدە زانین ڕووکە تەفسیری ئیبنی کەسیر، ج ۱، ل ۱۰۹.

## چیرۆکی مانگا سەربڕین

دڵ دێتە سەر ئەو باوەڕەی خودای مەزن بێ سەربڕینی مانگای بێ‌گوناە و تاوان دەیتوانی قاتڵی کارەسات بە مووسا و عالەم بناسێنێ، چ نیازێکی بەو مانگا سەربڕینە نەبێ، دە وڵامدا دەبێ چ بکوترێ دڵی پێ قانیع بێ؟ دەبێ ئاوڕ وەسەر مێژوونووسان و قوژبن و کەلێنی ئایەت و حەدیس وەدەرێ ئەوانیش نەزەر ئاوا دەدەن لەسەر ئەو کارەساتە واتە مانگا سەربڕین: خودای تەعالا دە پاڵ ئەو کارەدا واتە سەربڕینی مانگا جگە لە ئیسباتی پێغەمبەرایەتی مووسا بە هۆی ئەو موعجیزە گەورەیە (وەگیان هاتنەوەی مردوو بە خوێنی مردوو) ئەوەشی بە چاوی یەهوودیاندا داوە کە لە بیابانی قاقڕی سینا گایان لە باتی خودا دەپەرەست و بە خودایان دەزانی، خودای واحید و بەحەقیش هات خودای ناخودای وانی سەر بڕی لە سەر قەباحەت و کارەساتی نابەجێیان. بێ لەوەش، یەهوودیان هێندێکیان باوەڕیان وا بوو حەیوانی شیردەری وەک مانگا سەربڕین دروست نییە خوداش هات بۆ ئیبتاڵی باوەڕیان مانگای پێ سەربڕین.

ئەگەر نەختێک ڕامان و بەرجەوەندی دەکار کرێ لەو کارەساتە شتانێک دێنە دەست باوەڕی بە خودا توندوتۆڵ دەکەن، وەک ئەوە خودا ڕاستە و خۆ ڕەپ و ڕوو نەیویست قاتڵ دەرخا، بەڵکە بە شێوەی تەدبیر و تەعلیم و موعجیزە دەریخست تاکوو دەرکەوێ (ستار العیوب)ی کە سیفەتی خۆیەتی دەحوبێنێ. وهەروا توانایی خۆی خودا بە عەبدی بسەلمێنێ، وەک ئەوە: بە خوێنی حەیوانی مردووی بێ‌زمان، ئینسانی مردووی خاوەن زمان، وەگیان و زمان بێنێ. ئەئەوە تەنیا لە دەس خودا دێ و بە ئەقڵ دەسەلمێنێ: هەر یەکتایە «خودا» تاقانەیە، شایانی حەمد و سەنایە و کاروباریش دەبێ لە سەر ئەساسی عیللەت و مەعلوول و ئەسباب و وەسیلە بێ. وهەروا ئەوەشی بە عالەم سەلماند پێغەمبەران دەتوانن شتانێک ئەنجام دەن بە یارمەتی خودا کە لە دەس غەیری پێغەمبەران نایە وەک موعجیزە بێ.

دەپاڵ ئەو کارەساتەدا واتە کوشتنی یەکێک بە دەستی یەکێک، کوژەر واتە قاتڵ، دەبێ بکرێ و بتوانێ و شەرع ڕێی پێ بدا میراتبەری، یا ڕێی پێ نەدا، بە پێی بۆچوونی حەزرەتی شافعی قاتل لە مەقتوول میرات نابا و ناگرێ. جا ئەو قەتڵە هەڵە بێ یا عەمد بێ. بەڵام حەزرەتی حەنەفی دە قەتڵی هەڵە و عەمددا قاتڵ میرات ناگرێ ئەمما عادڵێک یاغییەکی بکوژێ میراتی لێ دەگرێ. بۆ زێدە زانین، تەفسیری کەبیر، ج ۳، ل ۱۲۷.

ئەو موعجیزەیە واتە ئاشکراکردنی قاتڵ بە خوێنی مانگا، وەیا بڵێین بە خوێنی حەیوانێک بە هۆی پرینگانەوەی نەتەوی ئەو سەردەمی پێغەمبەرایەتی مووسا لە کوشتنی خەڵک. ئەوە بۆ ئەوڕۆش کە بێ پێغەمبەرییە قورئان لە جێی وان عەمەل دەکا ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ﴾ دە تۆڵەدا پرینگاندنەوە لە کوشتن کە مایەی حەیاتە هەیە.

هۆزی یەهوود عادەتی بێ باوەڕی خۆیان وەلا نانێن، هەتا بۆیان بکرێ دە ئەمر و فەرمانی باری کە بە وەسیلەی مووسا پێیان ڕادەگا، کەندەوە و کۆژەوەی لە سەر ئەساسی بێ باوەڕییان هەر تێدەخەن و لێ دەکەن، بۆ ئەو ڕاستییەی دەچینە خزمەت ئایەتی ٦٨:

﴿٦٨﴾ قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لاَّ فَارِضٌ وَلاَ بِكْرٌ عَوَانٌ بَيْنَ ذَلِكَ فَافْعَلُواْ مَا تُؤْمَرونَ

ئینجا کوتیان کەواتە داوا لە خودای پەروەردگارت بکە بزانە شێوەی مانگاکە چۆن بێت؟ مووساش کوتی خودا دەفەرموێت: مانگاکە یەکێک بێت نە پیر بێت و نە گەنج، (عوان) واتە تەمەنی لە نێوان ئەو دوو قۆناغەدا بێت. ئینجا کوتی دەی فەرمانەکە بەجێ بێنن.

## سەیریان بە وردی

هەروەک دیارە لە ڕاوێژیان و لە زۆر وەدواکەوتنیان، دەس‌بەرداری بەهانە گرتن نەبن، بەرەو قوونەدزە لە ئاشکرا بوونی واقیعەکە و ئیسباتی پێغەمبەرایەتی مووسا بە هۆی نواندنی موعجیزە دەچن، بێ‌خەبەر لەوەی خودا سوڕی ناحەزان بە وەسیلەی موعجیزەی پێغەمبەران ئاشکرا دەکا، ئەوجار جوولەکەکان دێن پرسیاری دیمەن و ڕەنگی مانگاکە دەکەن لە مووسا بەو خەیاڵە مووسای گیر دەن و حاسیەی کەن، بێ خەبەر لەوەی وڵامدەرەوەی پێغەمبەران خودایانە لەمەڕ کاری سەخت و گران، جا بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٦٩:

﴿٦٩﴾ قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَاء فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ النَّاظِرِينَ

لەجیاتی بەجێ هێنانی فەرمان کوتیان: دەی پرسیار لە خودای پەروەردگارت بکە کە ڕەنگی چۆن بێت؟ مووسا کوتی: خودا دەفەرموێت: ڕەنگی زەردێکی تەواو بێت. هێندە جوان بێت چاوی بینەرانی پێ گەش بێتەوە.

بە پێی یاسای خاوەن شعوور و دەرکان، دەبا چیدی دوا نەکەوتبان چونکە بەشی تێگەیشتن

و ڕەفعـی نیـاز هـاتبووە دەسـت، بەڵام دیـارە ئەوانەی کە دەیـانهەوێ خـۆ لە حەق وەشـێرن، سەرەنجام تێدەکەون دە چاڵاو و حەق لە سەرەوەیان خـۆ دەنـوێنێ. جـا بـۆ ڕاسـتی ئەو داوایە دەچینە خزمەت ئایەتی ٧٠ کە دووبارە پرسیاری جووەکان دەخاتە ڕوو:

﴿٧٠﴾ قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ البَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ إِن شَاء اللَّهُ لَمُهْتَدُونَ
**ئەوجار کوتیان یا مووسا، داوا لە پەروەردگـارت بـکە بـزانە مانگـاکە چۆنچـۆنی بێـت؟ ئـێمە سەرمان لێ شێواوە، بە یارمەتی خودا دەیدۆزینەوە.**

دەبێ دڵ چاوەڕوانی خودا و مووسا بێ کە هەڵوێست چۆن دەگـرن لەمەڕ ئەو پرسـیارەش چونکە بە تەواوی شارەزایی هاتۆتە ڕوو، بەڵام دیارە خـودای بەسـەبر و حەکـیم وەڵامـی هـیچ پرسیارکەرێک ون ناکا و وڵامی دەداتەوە تاکوو بەهانەی نەمێنێ. جا بۆ وەڵامی ئەو پرسـیارەش دەچینە خزمەت ئایەتی ٧١:

﴿٧١﴾ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لاَّ ذَلُولٌ تُثِيرُ الأَرْضَ وَلاَ تَسْقِي الْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لاَّ شِيَةَ فِيهَا قَـالُواْ الآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ
**مووساش پێـی کـوتن: خـودا دەفەرموێـت: مانگـایەک بێـت ئیشـی پـێ نەکرابێـت، زەوی پـێ نەکێڵرابێت، ئاوی دەغڵودانی پێ نەدێرابێت، ڕەنگێکی دیکەی لە ڕەنگـی خـۆی زیـاتری تێـدا نەبێت. ئەوجار کوتیان ئێسـتا چـۆنیەتی مانگـاکەت ڕوون کـردەوە، ئەوجـار دەسـتیان کـرد بە گەڕان و دۆزییانەوە و هێنایان سەریان بڕی.**

ئەو جوولەکانە نیزیک بوو لەوانە سەری نەبـڕن. دەنـا هەر لە هەوەڵەوە مانگایەکیـان سـەر بڕیبا کاریان جوور دەهات هیچ ئەو هەموو پرسیارەی نەدەویست. چونکە خـودا فەرمـانی پـێ دابوون مانگایەک سەر بڕن، واتە هەر مانگایەک با ـ پیـر نەبـا و یـا گەنـج نەبـا و یـا چـی ـ دە دەستووری خودادا نەبوو، تەنانەت زەرد و بۆریشی تێدا نەبوو، ئەوانە بۆخۆیان لە سـەر خۆیـان قورس کرد.

## تێڕوانینێک لەو ﴿قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا﴾ داوای جوولەکە لە مووسا

دیارە دەبێ ئەوە بزاندرێ یاسای سوئال و جەواب ئەوەیە: سوئال دەبێ بۆ ڕەفعی گومان و ئیشکال بێ و نـابێ بە شـێوەی ئیهـانە و گـاڵتە و گەمە بـێ. وەهەروا وڵامـیش دەبـێ پڕاوپـڕ و بەرابەری سوئالەکە بێ، نابێ بۆ غەیری ئەو بێ و ناشبێ لە سوئال زیاد بێ تاکوو سەربشـێوی و

گومان زیاد بکا و ناشبێ کورتتر بێ، نەگاتە بەژن وباڵای پرسیار و نەزاندرێ سوئالەکە.

پرسیارەکانی جوولەکەکان لە حەزرەتی مووسا وەک ئیهانە و گاڵتە دەچێ چونکە وا دەردەکەوێ هەر لە ﴿أَنْ تَذْبَحُواْ بَقَرَةً﴾ ئایەتی ۶۷دا ئەوە دەردەکەوێ کە خودا دەستوور دەفەرموێ مانگایەک سەربڕن، نیاز دێتە جێ، ئیدی خودای تەعالا مانگای وەسفدار نەکردووە بە زەرد و بۆر و لاو و پیر و ... جوولەکەکان لە سەر ئەساسی ئیهانە دەکەونە کەندەوە و کۆژەوە لە مووسا ئەو سیفەتانە دێننە ڕوو. هەر ئەوەش کە دەڵێن ﴿قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ﴾ واتە داوا لە خودات بکە، ناڵێن داوا لە خودا بکە، بۆنی ئیهانەی لێ دەکرێ چونکە ئەو شێوە کوتنە، واتە خودای خۆت ئەو خودایەی پێی دەنازی ئەو تەرزە گوفتارە ئەوە دەردەخا: خودا ئی تۆیە و ئی ئێمە نییە.

وهەروا ڕوون و ئاشکرا هەدەف لەو جەریانەدا دۆزینەوەی قاتڵە، خوداش بۆ ئەو هەدەفە واتە ئاشکرا کردنی سوڕەکە دەفەرموێ مانگایەک سەر بڕن، دەیجا ئەوان دەیاتوانی سووک و ئاسان ئەو ئەمرە ئیجرا کەن تاکوو قاتڵ ئاشکرا بێ. ئەگەر ئەو مانگایە شەرت و شروتی نیاز با، خودا دەیفەرموو: دەبێ ئەو مانگایە ئاوا بێ. بە کوردی و بە کورتی، لە سەر ڕۆیشتنی جوولەکەکان لە بەر ئەوە نەبووە کە لێی حاڵی نەبوون دەبێ ئەو مانگایە چۆن بێ؛ بەڵکوو هەدەفیان ئازاری حەزرەتی مووسا بووە، بەڵام کاتێ کە زانییان مووسا ناوەستێ لە موقابیل پرسیاریان هەچی ئەوان بڵێن وڵامیان دەدرێتەوە، حەکیمانە تەسلیم بوون و بە ناچاری کوتیان: ﴿الآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ﴾.

ئەگەر ورد و وریایانە دەو جەریان و کارەساتە بفکرین، بە سێ شتی ئەساسی و خاوەن بەهرە دەگەین. ئەو سێ شتەش ئەوانەن:

۱. کار و کەسبی حەڵاڵی پاک لە ئاخریەکەدا بەهرەی زۆر و بەرچاو دەدا، وەک ئەوە: گۆیا ژن و پیاوێکی باش کوڕێکیان دەبێ زۆریان بۆ باش دەبێ ئەوانیش ئەو مانگایەی بە گوێلکی بۆ تەرخان دەکەن لە وڵاتی بەیتولموقەدەس کاتێ پیاوە دەمرێ کوڕ بە فەقیری دەمێنێتەوە، دایکەکەی دەڵێ ڕۆڵە بابت گوێلکێکی بۆ تەرخان کردووی، بزانە نایدۆزییەوە؛ بیهێنە بیفرۆشە تاکوو لە فەقیری ڕزگارت بێ. سەرەنجام کوڕە دەیێ دەیدۆزێتەوە کە تەماشا دەکا گوێرەکە گەورە بووە و ڕەنگیشی هەمان ئەو ڕەنگەیە کە خودا بۆ مانگای بەنیئیسرائیلیان دیاری کردووە. ئەوانیش دێن لێی بکڕن کوڕەش بێ پرسی دایکی نایدا. سەرەنجام بە قیمەتێکی وایان دەداتێ کە

کوڕە لە فەقیری نەجاتی بێ. ئەدێرەدایە خزمەت بە دای و باب جگە لە ئەجری ئاخرەتی لە دنیاشدا پێی خەنی دەبێ.

٢. گوێرە زەردینە کە هەدیەی باب بوو بۆ کوڕی چاک و باش، بوو بە هۆی موعجیزەی گەورەی پێغەمبەر مووسا و ناوبانگی دەرکرد و سەبت کرا لە یەکێک لە کتێبەکانی ئاسمانی وەک قورئان بێ، و هەروا بۆ دەرس بۆ نەسلی داهاتوو تا هەتایە.

٣. وهەروا دە واقیعەی ئەو مانگایەدا ئەو ڕازە پیرۆزە دەردەکەوێ و دێتە ڕوو بۆ ئینسان، کە گورج جێبەجێ کردنی ئەمری باری ڕەوایە و لازمە بۆ بەرگری لە سەختی کاروبار. و هەروا پرسیار زۆر لە سەر ئەمری باری بڵێی ئەوە بۆ وایە و یا دەبێ چۆن بێ، ناڕەوایە و نەهی لێ کراوە وەک پرسیاری جوولەکەکان لە مووسا لە چۆنیەتی مانگاکە. ئەو مەتڵەبە ئیشارەی وەلا کراوە لە ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْأَلُواْ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ الْقُرْآنُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا اللّهُ عَنْهَا وَاللّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ ﴿١٠١﴾ «مائدة» ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، ئەوەندە لە شت مەکۆڵنەوە و پرسیار مەکەن. بەتایبەتی شتێک کە سوودی تێدا نەبێ. نەبادا دەرخستنەکەی ببێتە مایەی ئازار و بارگرانی بۆتان. خۆ ئەگەر لە کاتی هاتنە خوارەوەی قورئاندا پرسیار بکەن، خودا بۆتان ڕوون دەکاتەوە و دەریدەخات. ئەوکاتە تووشی بارگرانی دەبن لە کاتێکدا خودا خۆی لێی بێدەنگ بووە، خودا زۆر لێبوردەیە و خاوەنی حیلمێکی زۆرە.

## کارەساتی گوێرەکە

دەچینە سەر بەسەرهاتی چیرۆکێکی دیکە کە هەر لەو چەشنە چیرۆکەی سەربڕینی مانگایە بەڵام پێوەندییان پێکەوە نییە. بەڵام خودای مەزن دەیهەوێ بەو چیرۆکەی، ڕەحمەتی خۆی باس بکا بە سەر جوولەکەکان و گرێکوێرەیەکیان بۆ بکاتەوە کە تا ئەوڕۆ چەن ساڵی دوایش بەسەرهاتی ئاوا مانگا نەبیسراوە، ئەویش ئەوەیە: گۆیا یەکێک دەکوژرێ دەماڵێکدا یا لە کووچە و گەڕەکێکدا، بکووژەکەی دیاری نادا و دەرناکەوێ. هەچی ڕووی تێدەکرێ دەڵێ ئەمن نیم، و لە خۆی وەدوور دەخا و بە سەر یەکی دیکەیدا دەبڕێ. دە ماڵێکدا قاتڵ هەر لەو چەن کەسانە دەبێ کە دەگەڵ خەڵکەکە پرسیار لە قاتڵ دەکەن، ئەوجار خودای تەعالا بۆوەی حەق ون نەبێ و کەسیش نەکەوێتە تەڵە و داو، دەفەرموێ: ئەوەی شکتان لێیەتی لاشەی کوژراوەکە بێنن بەشێکی لە لەشی دە گومانلێکراو هەڵسوون، قاتڵ دەردەکەوێ و حاشای پێ ناکرێ. جا بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٧٢ی بەقەرە دەوێدا بە مراد دەگەین:

﴿٧٢﴾ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْساً فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنْتُمْ تَكْتُمُونَ
(دێرەدا باسی ڕووداوێکی سەردەمی مووسا دەگێڕێتەوە و دەیخاتە ڕوو بۆ جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەرمان و پێیان دەفەرموێت): ئەی جوولەکەکان بیر بکەنەوە کە یەکێکتان کوشت و لە نێو خۆتاندا کرتانە مشتومڕ و دمەقاڵێ لە سەر ئەوەی کێ کوشتوویەتی؟ خودای تەعالاش ئەو نهێنییەی کە دەتانشاردەوە و ئاشکراو نەدەکرد، ئاشکرای دەکات و دەیخاتە ڕوو.

دیارە مووسا خۆی داوەر و سەرپەرستی ئەو ڕووداوە دەبێ بە پێی ڕێنوێنی خودا بەشێک لە لەشی مانگای کوژراوە دەماڵێ بە لەشی کوژراو، بکوژ ئاشکرا دەبێ. بۆ ڕاستی ئەو مەبەستە دەچینە خزمەت ئایەتی ٧٣:

﴿٧٣﴾ فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَى وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ
بۆ ئاشکرا کردنی بکووژەکە بە پارچەیەک لە گۆشتی ئەو مانگەیە کە سەرتان بڕیوە لە کوژراوەکە بدەن، زیندوو دەبێتەوە و بکووژانی خۆی ئاشکرا دەکات جا بزانن خودا هەروەک ئەو مردووەی زیندوو کردەوە لە ڕۆژی خۆشیدا ئاوا مردووان زیندوو دەکاتەوە، خودا شتە سەرسوڕهێنەرەکانی خۆتان نیشان دەدات تاکوو هۆشیار ببنەوە و ئەقڵتان ببێ.

## ڕووداوێکی گرینگ

ئەو کارەساتە واتە زیندوو کردنەوەی ئەو کوژراوە موعجیزەیەک بوو خودا بۆ مووسای نواند، ئەو زیندوو بوونەوەیە بەو لێدانە هۆیەک بوو نیشاندانی توانا و دەستەڵاتی خودا کە ئێمەی ئینسان نازانین چۆنە و کەی دەکەوێتە کار و ڕێ، بەڵکوو هێندە دەزانین ئەوەی خودا بیهەوێ کوتوپڕ دەیهێنێتە دی و هیچ شتێک لە بەر دەستەڵاتی ئەو قوتاری نابێ.

جێگای لێ وردبوونەوەیە: دەو ئایەتەدا خودا بە جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر دەفەرموێت ﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ﴾ کاتێک ئێوە کوشتتان، لە حاڵێکدا خۆ ئەوان نەیانکوشتبوو، بەڵکە ڕووداوەکە زۆر لە کۆنەوە بوو. مەبەست لەو ئاراستە کردنەدا ئەوەیە کە ئەو جوولەکانەش هەر لە نەوەی جوولەکەکانی سەردەمی مووسا بوون، ئاکار و ڕەوشتیان هەر وەکوو ئی وان وا بوو.

ئاوڕێک وەسەر ئەو دوو چیرۆکەی قورئان کە بەشی زۆری قورئانزانەکان پێیانوایە هەر یەکن بەڵام نەزەری دوو زانای ئایینی واتە شێخ محەمەد عەبدە و شێخ عەبدولوەهاب نەججار

بە جۆرێکی دیکەیە. چیرۆکەکان:

١. ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُوا بَقَرَةً﴾ ﴿٦٧﴾ «بقرة» ئەوە چیرۆکی یەکەمە.

٢. ﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْساً فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا﴾ ﴿٧٢﴾ «بقرة» ئەوەش چیرۆکی دووهەمە.

شێخ محەمەد عەبدە نەزەری وایە ئایەتی ٦٧ لە سەر کارەساتی بەنیئیسرائیل نازڵ بووە کە دەبێ مانگایەک سەربڕن خاوەنی ئەو سیفەتانە بێ کە خودا ناوی بردوون. شێخ عەبدولوەهاب نەججارِیش نەزەری وایە ئایەتی ٧٢ لە سەر ڕووداوێکی دیکەیە هەر لە چەشنی کارەساتی هەوەڵ.

ئەوانەی کە دەڵێن هەرکیان هەر یەکن، بەڵام ئەو تەفاوەتەیان هەیە: ئایەتی ٧٢ هەچەن دە مانادا هەر یەکە دەگەڵ ئایەتی ٦٧، ئەمما زۆر لە دوا ئایەتی ٦٧ هاتووە، لەبەر کێش پێدانی سیفاتی مانگاکە بووە، کەوابێ دەبێ بڵێین: ئایەتی ٧٢ دە نازڵبووندا لە پاش ئایەتی ٦٧دایە بەڵام دە مانادا لە پێشەوەیە. بەو دەلیلە: کوشتنی زەلامەکە و نادیاری قاتڵەکە بۆتە هۆی سەربڕینی مانگاکە. ئەو عیبارەتە ئەوە دەردەخا و دەنوێنێ هەرکات یەکتان لێ کوژرا و بکووژ نەناسرا، خوێنی مانگایەکی سەربڕاو بدەن لە کوژراو، وەزمان دێ و قاتڵ ناو دەبا.

وێدەچێ بڵێین دە شەریعەتی مووسادا بۆیە مانگا دەسنیشان کرا بۆ سەربڕین، گوێرەکەپەرەستی لە ناو قەومی مووسادا کاری تەواوی لە سەر بیر و باوەڕ دانابوو هەروەک ئایەتی ٩٣ی بەقەرە قسە لە سەر خۆشەویستی گا دەکا دە ناو قەومی گوێرەکەپەرەستدا: ﴿وَأُشْرِبُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ...﴾ ئەوانەی بە هۆی بێباوەڕییانەوە حەزی گوێرەکەپەرەستی تێکەڵ بە دڵ و دەروونیان ببوو، ئە لەو کاتەدا بوو کە لە میسردا دەژیان.

دووبارە ئەوەشی لێ هەست دەکرێ ئەو واقیعەیە: بیسەلمێنێ بە ئینسانی بێباوەڕ بە زیندوو بوونەوە، کە زیندوو کردنەوەی مردووان لە کن خودا ئاسانە.

دانی ئەو هەموو نیعمەتە بە جوولەکە وەک نیعمەتەکانی: نەجات لە دەس فیرعەون، هەڵقوڵینی کانیاو لە تاشە بەردی ڕەق، باراندنی گەزۆ و شێلاقە لە بیابانی قاقڕی سینا، ئاوڕ نەدانەوەیان بۆ لای خودا و مووسا ئەوەمان پێ دەڵێ: نابێ ڕێ بدرێ دڵ ڕەش بێ، ئەگەر هاتوو ڕەش بوو نە قسەی خودای دەبیسێ نە دەلیل و بورهان وەردەگرێ. بۆ ئیسباتی ئەو ئیدیعایە دەچینە خزمەت ئایەتی ٧٤ی بەقەرە:

﴿٧٤﴾ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا

**يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الأَنْهَارُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاء وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللّه وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ**

**پاش چاو کردنی ئەو هەموو شتانە لە جیاتی ئەوەی دڵتان نەرم بێت کەچی دڵتان وەکوو بەردی ڕەق و ویشک بوو، هەچەن بەرد شاخی ڕەق هەن ئاوی ڕووباری لێ هەڵدەقوڵێت و هێندێک بەردی ڕەقیش هەن ئاویان لێ دێتە دەرەوە و هێندێک بەردیش هەن لە ترس و هەیبەتی خودا دەقەڵشن و لەتوپەت دەبن و بە زەویدا ڕۆدەچن. بەڵام ئێوەی یاخی و سەرکێش هیچ هەستوو بە لەشدا نایە، هەر بۆیەشە پەند و ئامۆژگاری هیچ سوودێکتان پێ نادا. وەنەبێت خودا ئاگاداری ئاکارتان نەبێت، هیچ کردەوەیەکتان لە خودا شاراوە نییە.**

## بەرد نەرم دەبێ؛ دڵی ڕەش نا!

تێوەڕامانێک لە سەر دڵڕەقی هۆزی یەهوود: لاساری و سەرەڕۆیی و دڵڕەقی وان حاشای لێ ناکرێ، جا لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ بکوترێ: جێی ڕامان و دامانە بۆ ئینسانی گۆشتین، کە بەردی ڕەق ورد و هاژ دەبێ لە ترسی ئەحکاماتی قورئان، واتە هەیبەتی خودا، بەڵام ئینسان ورد نابێ و حەیا نایگرێ هیچ، موچڕکیشی پێدا نایە بەو هەموو ئامۆژگاریانەی خودا دەیانکاتێ. بڕوانە لە قورئان و ورد بەوە لێی: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (٢١) «حشر» **ئەگەر ئێمە بمانناردایە ئەو قورئانە سەر کەژ و کۆ، دەتدی ئەتۆی ئینسان ئەو کەژ و کۆیە دەبوونە وردە بەرد و هەڵدەوەرین لە ترس و هەیبەتی ﷲ ئەو میسالانە بۆ ئینسان دەرسی عیبرەتن دەیانهێنێتەوە، دەبێ ئینسان بیر بکاتەوە.**

**هەڵسەنگاندن و بەراوەردێکی ورد و پتەوی دەوێ ئەو نموونە و میسالە.** واتە بەردی ڕەقی بێ هەست و شعوور و گیان، بتوێتەوە و قاڵ بێ و حەیا بیگرێ و ورد و هاژ بێ لە بەرابەر هەڕەشەکانی خودا، بەڵام ئینسانی خاوەن هەست و شعوور و دەرک بێباکانە پەلاماری هەچی ئارەزوویەتی بدا و ئاوڕ وەسەر هاوار و بانگەوازەکانی خودا نەدا. دەبێ بە ڕاشکاوی بکوترێ: کەڕ نییە بەردی ڕەق لە حاند ئەمەری باری، بەڵام کەڕە ئینسانی گۆشتی نەرم لە حاند ئەمری باری. ئەو ڕازە سەر داپۆشراوە. بڕوانە تەفسیری کەبیر، ج ٣ـ٤، ل ١٣١.

بۆ ئێرە دەگونجێ و دەبێ، فەرموودەی حەزرەتی ڕەسوولﷺ کە فەرموویەتی: أَلَا فِي الجَسَدِ لَمُضغَةً إذا صَلُحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، و إذا فَسَدَتْ فَسَدَ الجسدُ كُلُّه، ألا وَ هِيَ الْقَلْبُ: ئاگادار بە، دە لەشدا پارچە گۆشتێک هەیە ئەگەر ساغ و سەلامەت بێ ئەو کوتە گۆشتە، ئەوە

هەموو لەش ساغە و خاوەن هەستە، ئەگەریش فاسید بێ ئەو کوتە گۆشتە، ئەوە لەش فاسیدە و بێ هەستە. ئەو کوتە گۆشتەش دڵە.

**تێوەڕامان و لێکدانەوەیەک:**

دیارە خودای تەعالا پێبەپێ لاساری جوولەکەکانی دەورانی مووسای ڕاگەیانـد و بەیـانی کرد، بۆ دەرس و عیبرەت و ئامۆژگاری و پەنـد وەرگرتنـی جوولەکەکـانی دەورانـی محەمـمەد المصـطفیﷺ کەچـی جوولەکەکـانی مەدیـنە و دەوروبەری مەدیـنە ئیمانیـان نەهێنـا هـیچ، ڕاشنەدەوەسـتان لە ئـاژاوە و ئـازار و ئەزیەتـی موسـوڵمانان، دەشـیانزانی ئەو دیـنە حەقە، محەمەدﷺ حەقە، بەڵام دڵی ڕەش و حەسادەتی دەروونیان ڕێی پێ نەدەدان بێنە سەر شـەقامی حەق و حەق بڵێن؛ بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٧٥ی بەقەرە:

﴿٧٥﴾ أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُواْ لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلاَمَ اللّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ

پێغەمبەر هاوەڵەکانی هەوەڵیان زۆر دەدا بۆ موسوڵمان بوونی جوولەکەکـان، لەو ئـایەتەدا خودا دەفەرموێت:

ئێوە هیواتان وایە کە ئەو جوولەکانە ببنە موسوڵمان، چۆن چـاوەڕوانی ئەوە بـن لە حاڵێکـدا کە ئەوانە دڵیان ڕەقە و بە شوێن ڕاستیدا نـاگەڕێن. هێنـدێک لە سـەرانیان هەرچەنـدە تەوراتیـان دەخوێنـدەوە و دەیانبیسـت و لێـی تێدەگەیشـتن، کەچـی پاشـان ئەوەی بەڵـگە بـوو لە سـەر پێغەمبەرایەتی محەمەدﷺ بە دەست ئەنقسەت دەیانگۆڕی، بە ئارەزووی خۆیـان دەسـکارییان دەکرد.

## تێوەڕامانێک لە سیما و دەروونی ئەو ئایەتە

کە باس لە گۆڕانی بەشێک لە ئایەتەکانی تەوڕات دەکـا بەتـایبەت ئەو ئایەتـانە کە لە سـەر وەسفی محەمەد المصطفیﷺ نازڵ بوون: دەبێ ئێمە چـۆن بـزانین هەمـوو جوولەکەکـان ئەو گۆڕینەیان کردبێ؟ وەیـا هەر ئەو ٧٠ نەفەرانەی دەگەڵ مووسـا چووبـوونە کێـوی تـوور، وەک دەڵێن: بەشی زۆری زاناکانی یەهوود بەوەی ڕازی نەبوون کە لە مەدحی محەمەدﷺ تەسـدیقی ئەو ئایەتانێـک هـاتبن و گۆڕییـانن، چـونکە غەیـری جـوولەکە بە سـەراحەت پێغەمبەرایەتـی محەمەدﷺ بەو ئەوسافانەی خودا پێی داوە تەدسـیق دەکەن و کردوویـانە و دە کتێبەکانیشـیاندا هەیە، کەوایە چۆن یەهوود بەتایبەت زاناکانیان دەتوانن شتی ئاوا ئاشکرا ئینکار بکەن.

بەڵام دەبێ ئەو منافیقە زانایانی جوولەکە نەشاردرێنەوە و بهێندرێنە ڕوو: کاتێکی زاناکـانی جوولەکان دەگەیشتنە خاوەن باوەڕانی ئیسلام پێیان دەکوتن: ئێـوە لە سـەر ئـایینێکی ڕاسـت و دروستن، چونکە تەورات موژدەی بە هاتنی محەمەد داوە. بەڵام لەو لایەشەوە کە دەگەیشتنە ئی خۆیان، پێیان دەکوتن: هـا ئەو شـتانەی کە خـودا دە تەوراتێـدا لەمەڕ پێغەمبەرایەتـی مـحەمەد کوتوویەتی، نەچن بیڵێن بە عالەم و بەوانەی هەواداری محەمەدن، نەکا دەگەڵتان بکەونە کێشـە و بۆڕتان دەن بە قسەی خۆتان و تەوراتی خۆتان. بۆ ئیسباتی ئەو داوایە دەچینە خزمەت ئایەتی ٧٦ی بەقەرە:

﴿٧٦﴾ وَإِذَا لَقُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ قَالُواْ آمَنَّا وَإِذَا خَلاَ بَعْضُهُمْ إِلَىَ بَعْضٍ قَالُواْ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَـا فَـتَحَ اللّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَآجُّوكُم بِهِ عِندَ رَبِّكُمْ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ

**ئەوانەی کـاتێ بە موسـوڵمانەکان دەگەیشـتن، دەیـانکوت: ئـێمە ئیمـانمـان هێنـاوە و موسـوڵمان بـووین. بەڵام کاتێـک کە لە نـاو خۆیانـدا هەنـدێکیان لەگەڵ هێنـدێکی تریـان بگەیشـتنایە بە یەکتری، دەیانکوت: ئایا ئێوە ئەوەی خودا سـەبارەت بە پێغەمبەرایەتـی مـحەمەد لە تەوراتـدا بۆی باس کـردوون باسـی دەکەن بـۆ ئەوان، بـۆ ئەوەی لە ڕۆژی دواییـدا لای خـودا بـیکەن بە شایەتی بە سەرتانەوە؟! چۆن دەبێت شتی وا بکەن؟ ئەی نابێـت هۆشـتان هەبێـت بیرێـک لەوە بکەنەوە کە ئەوە لە زەرەرتانە؟!**

## تێڕوانینێکی هەستیارانە

دڵ دەڵـێ خـۆ نەخوێنـدەواری جـوولەکە نەیزانیـوە تەورات چـی تێـدا لە مەڕ حەزرەتـی محەمەدﷺ و چی بەیان کردووە، بەڵکە ئەوەی زانیویەتی خوێنـدەوارەکانی بـوون. هەرووەک بە درێژایی مێژوو پێشەنگی گەلان لەمەڕ دین و ئایین زانا بە کێبەکانی ئاسـمانی بـوون، هەر بـۆیە دەبێ حاشا نەکرێ ئەوەی شێخی دروسـت کـردووە هەر مەلا بـوون واتە پێشـەوای ئـایینی، و ئەوەی تەکیە و خانەقای دروست کـردووە هەر مەلا بـوون، و ئەوانەی دینیشـیان فێـری عـالەم کردووە هەر پێشەوا ئایینیەکان بوون. دەبێ بـوێرانە بکـوترێ وەبـاڵی نەخوێنـدەوار وە ئەسـتۆی خوێندەوار. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٧٧ی بەقەرە:

﴿٧٧﴾ أَوَلاَ يَعْلَمُونَ أَنَّ اللّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِـرونَ وَمَا يُعْلِنُونَ

**ئایا ئەوانە نازانن کە هەر شتێک بشارنەوە یا خود دەریخەن و ئاشـکرای کەن بێ گومـان خـودا**

**دەزانێت و ئاگاداریەتی!؟**

## ئاوڕێک وەسەر مانای ئایەتەکە بە وردی

بە ڕاشکاوی دەبێ بکوترێ ئەو ئایەتە دە زانایان دەخوڕێ چونکە ئەوانــن دەزانــن ئەگەر لە خۆ نەگۆڕن خودا ئاگاداری زاهیر و باتینە، و هەر کەسیش ئاوا نەزانێ کە خودا ئاشکرا و نهێنی دەزانێ، ئەو کەسە دۆڕاوە و تێشکاوە.

دەبێ ئەو ڕاستییە نەخرێتە بن لیچ: بە درێژایــی بــوونی ئینســان لە ســەر زەوی دەســتەیەک پیتۆڵ و چاوبەست بۆ بەهرەیەکی کەمی دنیا چاوی دەستەیەکەیان بەستووە لەمەڕ ئایین حەقیان لێ حاشار داون، مەسەلەن کاتی خۆی یەهوودی خوێندەواری تەوڕات نەزانیان چاو بەســتوون ناوی محەمەد و وەســفی محەمەدیــان لــێ حاشــار داون و کوتوویــانە دە تەوراتــدا نیــیە باســی محەمەد، هەروەک ئێستێ زۆر شت دە قورئاندا نییە و دەڵێن هەیە و زۆر شــتی تێــدایە و دەڵــێن نییە. نموونە زۆرن. ئەگەر زانا بی دەزانی، و ئەگەر نەزانیش بی، بەقــا نــاکەی. بــڕوانن لە بــابی متشابهات، و بابی حایو حوو، لە خۆدان و ... بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئــایەتی ٧٨ی بەقەرە:

**﴿٧٨﴾ وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لاَ يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلاَّ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَظُنُّونَ**

**هێنــدێک لەوانە نەخوێنــدەوارن، جــگە لە ڕەشخوێنــدنەوەیەکی تەوڕات هیچــی تــر نــازانن، و ڕاست و درۆ لێک ناکەنەوە. وا دەزانن تەوڕات تەنیا چەن ئاوات و خواستێکە بۆ ڕزگار بوون لە سزای خودا، بۆیە هەموو تێگەیشتنیان هەر وەهم و خەیاڵە.**

## ئاوڕدانەوەیەک

دەبێ بکوترێ و بڵێین: لە سیمای ئەو دوو ئایەتی ٧٧ و ٧٨ ئەوە بە ڕوونــی دێــتە بەرچــاو و دڵ: یەهـــوود دوو دەســـتە بـــوون ١. دەســـتەیەکیان نەخوێنـــدەوار هەر چاویـــان لە زاری خوێندەوارەکان بووە و گوێیان ڕاداشــتۆتە وان، وەک ئەوڕۆ، ٢. دەستەیەکیشــیان خوێنــدەوار و زانا و حەقنەویست و دنیاپەرەست، ئەحکاماتی تەوڕاتیان بە وازی خۆیان تەعبیــر کــردووە ولە بابەت محەممەدﷺ و ئەوسافی ئەو کە بە زبانی خۆیان زانیــون و حاشــاریان داون لە عــالەمی وەیا گۆڕیویانن. ئەوانە چاوی نەخوێندەوارەکانیان بەستووە هەر ئەوەشە بۆتە هۆی ئەوڕۆ دنیای ئــایین چەن قــوتبە. واتە چەن مەزەب، چەن تیــرە، ئامــاژەی ئــایەتی ١٥٩ی «انعــام» بە ڕوونــی

ئەوەمان پێ دەڵێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ إِنَّمَا أَمْرُهُمْ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ﴿١٥٩﴾﴾ «انعام» **بەڕاستی ئەو کەسانەی کە ئایینەکەی خۆیانیان کردووە بە چەن بەش و خۆشیان بوونەتە چەند قۆڵ و تاقم و کۆمەڵێک جیاواز لە یەکتر، وەکوو جوولەکەکان و دیانەکان، وایان لێ قەومابوو؛ دەگەڵ ئەوەش هەر لایەکیان لایەکەی دی بە لە ئایین دوور و وێڵ دەزانی. جا خودا بە پێغەمبەری فەرموو بە هیچ شێوەیەک ئەتۆ لەوانە نی، ئایینی تۆ ڕاستە، ئەوانەش بێگومان کە ئایینسازن دەکەونە دەس خودا.**

دەچینە خزمەت ئایەتی ٧٩ی بەقەرە بۆ ڕاستی ئەو مەبەستە:

﴿٧٩﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَذَا مِنْ عِندِ اللّهِ لِيَشْتَرُواْ بِهِ ثَمَناً قَلِيلاً فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُمْ مِّمَّا يَكْسِبُونَ

**ئەوانەی دەستکاری تەوارت دەکەن و لە پێناو دەستەبەر کردنی قازانجێکی ماددی کەمدا قسە هەڵبەستراوەکانیان بە قسەی خودا لە قەڵەم دەدەن، وەیل بۆ ئەوانەیە. ئەوانە بە هۆی ئەوە کە نووسیویانەتەوە و دەڵێن ئەمە قسەی خودایە و لە لایەن ئەوەوە نێردراوە، هەروەها بەو بڕە سامانە کەم نرخ و بێبەهایە کە بەو کارە دەستیان دەکەوێت، بە هۆی ئەو تاوانەیانەوە وەیلیان بۆ هەیە.**

(وەیل واتە فەوتان و بەهیلاکچوون).

ئەو دووپاتە کردنەوەی «ویل» سێ جاران دەو ئایەتەدا ئاماژە وەلای ئەوەیە: ئەو تاوانبارانە ئەو سێ گوناهە خراپانەیان کردووە.

## ئاوڕدانەوە و تێوەڕامانێک لە سیمای ئایەتی ٧٩

زەمانێ جوولەکە بتوانن و غیرەت بکەن تەوڕات بگۆڕن سەبارەت بە نەناسینی پێغەمبەر محەمەد المصطفیﷺ دەبێ دەگەڵ غەیری چۆن بن؟

ئەوانەی کە قازانج و بەهرەی بێ بنەمای دنیایان پێ چاتر بێ لە قازانج و بەهرەی تاهەتایی ڕۆژی ئاخرەت، نەزانن بە عاقیبەتی کار. بێگومان ئەو جۆرە کەسانەش وەک دیارە و بەرچاون لە زانایانن بە زۆری، وەک زاناکانی هۆزی جوولەکە ئایاتی تەوڕاتیان دەگۆڕین بۆ قازانجی دنیایان تاکوو عالەمی نەخوێندەواریان دوا کەوێ، ئایینی ئیسلامیش پەرە نەستێنێ. بەڵام بێخەبەر لەوەی حەق ناشاردرێتەوە و وەبن لیتە و لێزماوی قوڕاو و چڵکاوی کەسافەت بازاڕی ناکەوێ. هەچی دە مڵکی حەقیقەتدا چنابێ، سەر هەڵدەدا و دەڕوێ کاتی خۆی. ئەگەرچی بە

ڕواڵەت خودا ڕووی باسەکەی لە زانایانی یەهوودە، بەڵام دە واقیعـدا دەگەڵ هەمـوو پێشـەوا و پێش‌قەتارانی دنیای بەشەریەتیەتی بەتایبەت زانا ئایینییەکان.

جوولەکەکـان بە پێـی ئـایەتی پێشـوو هەسـتیان و باوەڕیـان ئەوە بـوو کە ئـاوری دۆزەخ نامانسووتێنێ و ئەگەر بشمانسووتێنێ هەرچەن ڕۆژێک دەبێ ئەو سـووتانە واتە ئەوەنـدە ڕۆژانە بێ گوێرەکەمان پەرست، پاشان عەزاب لادەچێ لە سەرمان. دەبێ ئەوەمان باوەڕ بێ سزا بە پێی کردارە هەروەک پاداشیش بە پێی کردار و ئاکارە. بۆ ڕاستی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئـایەتی ۸۰ی بەقەرە:

**﴿٨٠﴾ وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلاَّ أَيَّاماً مَّعْدُودَةً قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ اللّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ اللّهُ عَهْدَهُ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ**

**دەشڵێن: ئاگر تووشمان نابێ؛ مەگین چەند ڕۆژێ، ئەویـش کەم. بێـژە: ئـاخۆ خـودا بەڵێنـی پـێ داون – کە خودا لە بەڵێنی خۆی پاشگەز نـابێ – یـان هەر لـە نەزانیـیەوە قسـە لە سـەر خـودا دەکەن؟**

(سـەیر لەوەدایە ئەو جوولەکـانە وێـڕای ئەو هەمـوو خراپەکـاری و نافەرمـانیەی خـودا و پێغەمبەرەکانیان، کەچی) دەیانکوت: ئـێمە گەلـی هەڵبـژاردەی خـوداین و چەن ڕۆژێکـی کەم نەبێت ئاگرمان بەرناکەوێت. ئینجا خودا بە پێغەمبەر دەفەرموێت: ئەی محەمەدﷺ پێیان بڵێ ئایا ئێوە پەیمانتان لە خودا وەرگرتووە کە چەن ڕۆژێکی کەم نەبێت ئاگر ناتانسووتێنێت؟ خۆ ئەگەر وابێت ئەوە یەقیـنە خـودا پەیمانـی خـۆ ناگۆڕێـت و دەیبـاتە سـەر. یـا ئەوە هەر قسـەیەکە ولە خۆیانەوە و بەبێ زانین بە دم خوداوە هەڵیدەبەستن. چونکە شتی وا دەبێت بە «وەحی» لە لایەن خوداوە ڕابگەیێندرێت، جا کە لە وەحیدا ئەوە نەبێت، ئیتر ئەوە مانای وایە دمهەڵبەستی خۆیـانە و لە خەیاڵی پووچەڵی خۆیان زیاتر نییە.

## ئاوڕێک وەسەر چۆنیەتی نازڵبوونی ئایەتی ۸۰

گۆیا تاقمێک لە زانا و دانا ئایینیەکانی جوولەکە بە عینوانی گاڵتە و گەپ دەچـنە خـزمەت حەزرەتی ڕەسوول ڕووبەڕوو بەبێ ئەوە شەرم و حەیا بکەن، بەزمی دەگەڵ دادەبەستن و دەڵێن: ئێمە ناچینە دۆزەخ و ئەگەر بشخرێینە دۆزەخ لەوەندە ڕۆژانەی کە گوێرەکەمـان تێـدا پەرەسـتوە زیاتر ناخرێینە تێ، پاش ئێمە ئەتۆ دەخـرێیە نـاو دۆزەخ. حەزرەتـی ڕەسـوولﷺ دە موقابیلـدا

دەفەرموێ خوار و خراب حاڵی بوون، وا نییە. بەڵکە ئێوەی بێباوەڕ بۆ هەمیشە دە دۆزەخدا دەمێننەوە، قەڵاتەی دۆزەخوو دەخرێتە ئەستۆ و کەسیش بەجێی ئێوە ناخرێتە دۆزەخ. دەشڵێن حەزرەت پێی کوتوون: خەفە بن، واتە بێدەنگ. بڕوانە تەفسیری ئیبنی کەسیر، ج ١، ل ١١٨.

ئایەتی ٨٠ گورزێکی قورس و توندە لە لمبۆز و لەوسی جوولەکەکان دەدرێ.

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم دەیهەوێ دووبارە بە ئایەتی ٨١ توندتر و ڕاشکاوانەتر تێیانسرەوێنێ و هەسیان داتەوە کە هەچی دڵی خاوەن هەستە قەناعەتی پێ بکا. ئەوەش ئایەتەکە:

**﴿٨١﴾ بَلَى مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِيـئَتُهُ فَأُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ**

**نەخێر، وا نییە کە ئەوان دەیڵێن. بەڵکوو هەرکەسێک خراپە بکات و خراپەکانی لە بەر زۆرییان دەورەی بدەن، ئەو کەسانە هاوەڵی ئاگری دۆزەخن و هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە، چونکە کۆبوونەوەی گوناهە بە شێوەیەکی وا کە لە هەر چوار لاوە دەوری لێ دابێ ئەوە وا دەکات ئەو کەسە لە ئیمان دەرکات و ئیتر هەتاهەتایە دەبێتە هاوڕێی ئاگری دۆزەخ.**

دەبێ ئینسافەن ئەوە بسەلمێندرێ چاکە بە خراپە وەگۆڕدرێ و ئەوەش بزاندرێ کە چاکە چاترە لە خراپە، دەبێ سزای ئەو کەسانە هەر ئەوە بێ کە خودای مەزن لە ئایەتی ٨١دا دیاری کردووە: ﴿فَأُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئەو کەسانە هاوەڵی ئاگری دۆزەخن تا هەتایە.

ئاوڕدانەوەیەک وەسەر ئەو یاسا گشتیەی باری تەعالا کە دەفەرموێ ﴿بَلَى مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِيـئَتُهُ...﴾ واتە هەرکەس بە بەردەوامی لە سەر تاوان کردن دامەزرێ، بە تەئکید ئەو کەسانە بۆ هەمیشە جێگایان دۆزەخە. دەشبێ ئەو تاوانانە عەمد بن.

دڵ بە هەستەوە ئەو هەستە دەکا: مادام حاڵ و ئەحواڵی خراپەکاران لە ڕۆژی ئاخرەتدا ئاوا عەزاب و دەرد و ئازار و ڕەنج بێ، دەبێ حاڵ و ئەحواڵی چاکەکارانی خاوەن ئیمان و باوەڕ چۆن بێ؟ بۆ وڵامی ئەو هەستە دەبێ ڕوو بکرێتە بارەگای باری چونکە ئەو غەیبە لە زانستی ئەودایە. ئایەتی ٨٢ وڵامی ئەو بابەتەی تێدایە:

**﴿٨٢﴾ وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ أُولَـئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ**

**ئەوانەی خاوەن ئیمانن و کرداری چاک و پاکیشیان هەیە ئەوانە هاودەمی بەهەشتن و تێشیدا بە یەکجاری دەمێننەوە، (پاداش بە پێی کردەوەیە)**

## ڕامان لە ئایەتی ٨٢

لە سیمای ئایەتەکانی تایبەت بە نەتەوەی یەهوود، وا دێتە بەرچاو و دەردەکەوێ، نائەهل‌ترین و نەبیس‌ترین و بێ‌شعوورترین گەلی دەوران بن، بێ‌بەش لە هەست و خوست و سرشت دوڕاو، چونکە ئەو نیعمەتانەی خودا بەوانی بەخشیوە سەرەڕای لاسارییان، دە ژمار نایەن و لە بەرابەر هەر نیعمەتێکدا ناشکوری و سەرپێچییان ئەنجام داوە لە سەر ئەو حاڵەش‌ڕا خودا جارجار نیشانەی داونی بۆ وەی چاک بن. کەچی هەر خرابتر و لاسار جووڵاونەوە. مەسەلەن پاش ئەو هەموو لاسەری و خیرەسەرییەی وان خودا دێنێ پەیمانێکی دیکەیان دەگەڵ پێک‌دێنێ کەچی زۆر بێ‌شەرمانە و بێ‌ئەدەبانە دەیشکێنن. جا بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٨٣:

﴿٨٣﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرائِيلَ لاَ تَعْبُدُونَ إِلاَّ اللّهَ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً وَذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْناً وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنكُمْ وَأَنتُم مِّعْرِضُونَ

**ئەی پێغەمبەر وەیادی جوولەکەکان خەوە کە ئێمە لە ڕێگای مووسا و پێغەمبەرانی دی پەیمانمان لێ وەرگرتن کە جگە لە خودا هیچ کەس و هیچ شتێکی دی نەپەرەستن و بە چاک دەگەڵ دایک و بابیان ڕەفتار بکەن و هەروا دەگەڵ خزمان و هەتیوان و هەژاران، و دەگەڵ خەڵکدا خۆش گوفتار و پاک کردار بن و هەروا نوێژان بکەن و زەکاتی بدەن. بەڵام ئەوان هاتن بە زۆری پشتیان کردە ئەو پەیمانەی خودا و شکاندیان و ڕێگای سەرکەشی و یاخیگەرییان گرتە بەر.**

## مافی هەژاران

شێخ محەممەد عەبدە دەڵێ کەسێک چاکەی بۆ دای و بابی نەبێ، چاوەڕوانی چاکەی لێ ناکرێ، و هەرکەسێکیش ئیتاعەی خودای خۆی نەکا، چاوەڕوانی چاکە و ئەمینی و ڕاستی لێ ناکرێ.

ئەوجار خودای تەعالا مافی هەقی هەژاران دە ئایەتەکەدا باس دەکا کە دەبێ بپارێزرێن، چونکە هەتیو سایەی فێنکی بابی لە سەر نامێنێ وەزیفەی موسوڵمانانە لە جێی سایەی بابیان ببنە سایە بۆیان و هەر بە ئاداب و تەربیەتی ئیسلامی دەبێ تەربیەت بکرێن. دەنا بێ بەند و بار و بێ‌ئەدەب دێنە ناو کۆمەڵگای بەشەر.

ئەوجار خودا دێنێ باسی داماو و هەژاران دەکا کە دەبێ چاوەدێرییان بکرێ، ئەوجار ئەمر دەکا بە نوێژ کردن و زەکاتدان چونکە نوێژ وەسیلەی لە خودا غافڵ نەبوونە، هەروەک زەکاتدان وەسیلەی وەحدەت و هاوکاری کۆمەڵە دەگەڵ یەک، و تەنانەت زەکاتدان لە ئایینی یەهوودیشدا بووە بە شێوەی ئاینی خۆیان. چونکە زەکات هەوێنی برایەتییە دەگەڵ یەک کە ئەوەش بۆ یەکپارچەگی کۆمەڵ شەرتێکی ئەساسییە، ئەوەندە هەیە گۆیا لە ئایینی یەهوودا زەکات دەبایە بدرایە بە نەوەکانی هارٖوون پێشەکی، جا پاشان بدرایە بە هەژاران و داماوان و هەر لە توولی حەوت ساڵاندا پارچە زەوییەک تەرخان کرابا بۆ هەژاران هەچی لێی پەیدا ببا بۆ هەژاران دەبوو. دەبێ بڵێین دە هەموو ئایینەکانی ئاسمانی حەول دراوە بۆ یەکپارچەگی کۆمەڵی ئینسان و بۆ هاوکاری و دەگەڵ یەکبوون زۆر ڕێگا و شوێن دامەزراوە.

## ئاوڕدانەوەیەک

وەک دیارە و هەستی پێ دەکرێ ئایەتەکانی ۸۳ و ۸۴ بە شێوەیەکی بەربڵاو قسە لە عەهد و پەیمان دەگەڵ قەومی بەنیئیسرائیل دەکەن. ئەو دوو ئایەتە پایەکانی ئایینی ئیسلام هەچی هەیە لە خۆ دەگرن. مەسەلەن ۱. لە سەرەتاوە ئایەتەکە دەڵێ بە یەهوود غەیرەز خودای بێشەریک کەس مەپەرەستن وپاڵ وە قودرەتی ئەو دەن. ۲. ئەو ئایەتە پاشان ئەمر دەکا بە چاکبوون دەگەڵ دای و بابان، چونکە دای و باب کارخانەی ئینسانسازین دەبێ ئەو کارخانەیە بپارێزرێن و ڕێزیان بگیردرێ. ۳. ئەو ئایەتانە دەڵێن دەبێ ئاوڕی بەخێر و بەچاک وەدرێ بۆ لای خزموکەس و هەتیو و هەژار و بێنەوا. کە ئەوانە ئەعزای لەشی کۆمەڵن. ۴. ئەو ئایەتە دەڵێ نوێژ بخوێنن، چونکە نوێژ وەسیلەی پێوەندی دەگەڵ خودایە، دیارە یادی خودا و ملاقاتی خودا بەرەو سەعادەتت دەبا. ۵. ئەو ئایەتە دەڵێ: زەکات بدە چونکە زەکات هەوێنی یەکپارچەیی و یەکگرتوویی کۆمەڵی لێ دەکەوێتەوە.

هێندێک لە جومەلاتی ناو ئایەتی ۸۳ بەرەو هەستێکمان دەگێڕنەوە کە دەبێ ئەو هەستە لە پێشدا هەبووبێ. خودای مەزنیش ئەو هەستە کە بە ناڕەوا دادەنێ و خیلافی خودایەتی خودایە، ئەمر بە لێ دوورکەوتنەوەی دەکا. میسال: جوملەی ﴿لاَ تَعْبُدُونَ إِلاَّ اللَّهَ﴾ ئەوەمان پێ دەڵێ کە لە پێشدا بوون کەسانێک غەیری خودایان لە جیاتی خودا پەرەستووە، وەک هێندێک لە یەهوود و نەسارا کە خودای تەعالا بەیانی حاڵیان دەکا و دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ

﴿وَقَالَتْ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّهِ﴾ ﴿۳۰﴾ «تەوبە» **جووله‌كه‌كان كوتوويانه عوزەیر كوڕی خودایه، وهەروا فەلەكانیش واته نەسارا كوتوويانه مەسیح ڕۆڵەی خودایه.**

خودای تەعالاش بۆ پووچەڵ كردنەوەی ئەو عەقیدە و باوەڕەی یەهوود و نەسارا و بەرگری لە پەرە ستاندنی ئەو فكرە هات فەرمووی: ﴿لاَ تَعْبُدُونَ إِلاَّ اللَّه﴾ **عەبدایەتی بۆ خودا نەبێ نەیكەن.**

هەروا لە جوملەی ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً﴾ **واتە دەگەڵ دایک و بابوو چاكە بكەن و چاک بن.** ئەو جوملەش ئەوەمان پێ دەڵێ هێندێک هەبوون ڕێزیان لە دای و باب وەلاناوە ئەو جۆرەی كە دەبێ ڕێزیان لێ بگیردرێ نەیانگرتووە، جا بۆیە فەرمووی: دەبێ چاكەیان دەگەڵ بكرێ و ڕێزیان بۆ داندرێ.

## یادێک لە ڕێزگرتنی دای و باب

## حەزرەتی عومەر و ژن

دەگێڕنەوە حەزرەتی عومەر دە حاڵی تەوافدا دەبێ چاوی دەكەوێ بە ئافرەتێک كە پیرەپیاوێكی لە قەڵاندۆشی خۆی بە چارشێوی خۆی بەستۆتەوە و قایم كردووە و تەوافی كەعبەی پێ دەكا. حەزرەتی عومەر كە ئەوەی ئاوا چاو دەكا، دەخەفتێ هەلێک بڕەخسێنێ لەو شوێنەدا ئەو جەریانەی پرسیار كا لەو ئافرەتەی، كە ئەو پیاوە پیرە كێیە و چی تۆیە وا ئەو ڕێزەی لێ دەگری. و هەروا ئەتۆ خەڵكی كام وڵاتی كە ئەو تەربیەتە جوانەت لێ وەدەس هێناوە. سەرەنجام حەزرەتی عومەر ئەو ژنە ون ناكا و دەیقۆزێتەوە و خۆی دەگەیێنێتێ. پاش تەواو بوونی تەواف لێی دەپرسێ: ئەو پیاوە پیرە دەبێتە چی تۆ؟ وا ڕێزی لێ دەگری و ڕەحمی بۆ بەكار دێنی؟ ژنە دە وەڵامیدا پێی دەڵێ: ئەتۆ زیاد لەو هەموو عالەمە كێی وا پرسیاری ئەو جەریانەی لە من دەكەی؟ حەزرەتی عومەر دەفەرموێ: ئەمن ناوم عومەرە خەلیفەی ئیسلام، جا ئەوجار ژنە بە هەستەوە پێی دەڵێ: ئەوە بابمە بە منداڵی جارێكی بە كۆڵی خۆی هێناومیە ئەو ماڵە پیرۆزە و تەوافی پێ كردووم و داوای تەمەن درێژی بۆ كردووم. ئەمنیش ئێستێ كە ئەو لە تاقەت كەوتووە، وا من بەهێزم دەمهەوێ ئەو قەرزەی بدەمەوە، جگە لەوەی كە لە لایەن خوداوە دەستوورم پێ دراوە چاكەی دەگەڵ بكەم و هەروا ئەساسی ئەو كارەساتەش ئەوە بوو: بارەها دەمبیست لێی دەیفەرموو خۆزگە جارێكی دیش تەوافی ماڵی خودام بە نسیب بایە، ئەمنیش هاتەوە یادم كە لە كاتی خۆیدا ئەو ئەمنی بە كۆڵ و شان هێناوەتە ئێرە. دەبێ ئەمنیش ئەوی بە

کۆڵ بێنمەوە ئێرە. جا چونکە نیەتەکە خێـر بـوو خـوداش هیـدایەتی دام و هێنـام. دەشـمتوانی وڵاخی بۆ بەکرێ بگرم بەڵام دەمزانی لە سەر وڵاغ خـۆ ڕانـاگرێ. هەر دەبـێ بە کـۆڵ بـێ. دە مقابیل ئەو بەیانات و بەسەرهاتە حەزرەتی عومەر زۆر بە سۆزەوە فەرمووی: (جَزاكِ اللـهُ خَيـراً لَقَدْ وَفيتِ حَقَّهُ) واتە خودا جەزای چاکەت داتەوە، بێ‌گومان حەقت بەجـێ هێنـاوە. ژنەش لە وڵامدا دەڵێ: (ما وَفيتُهُ و ما اَنْفَقْتُهُ لأنَّهُ كان يَحْمِلَني و يَودُّ حياتي و أنا اَحْمِلَهُ و أوُدَّ مَوتَهُ) ژنە لە وڵامی حەزرەتی عومەردا دەڵێ: ئەی خەلیفەی ئیسلام، وەک دەفەرمووی حەقی خۆت بە جـێ هێناوە وا نییە، چونکە ئەمن حەقی ئەو بابەم بەجێ نەهێناوە و تەنانەت نیوەشم بەجێ نەهێنـاوە. چونکە ئەو بابەم بە منداڵی کە بە کۆڵی خۆی هێناومی بۆ ئێرە، ئەو دوعایەی بۆ من کـردووە کە تەمەنم درێژ بێ، ئەمما ئێستێ دوعای بۆ دەکەم کە تەمەنی تەواو بێ. دووبارە حەزرەتی عـومەر بەو بەیاناتە بەجێیە داما و فرمێسکی ڕژاند و ڕووی کردە ژنە و فەرمووی: یاڕەبی چـۆنی بـۆ تـۆ باشە و چاکە، خودا ئاوات دەگەڵ بکا، و دەرسیشـم لـێ وەرگرتـی. بـۆ زێـدە زانـین بـڕوانە لە تەفسیری «تبيين القرآن»، تەفسیری ڕازی، مەوزووعی ئەو ئایەتە.

کۆدەنگی زانایان لە سەر ئەوەیە: دای و باب کافر بن یا موسوڵمان، ڕێزگرتنیـان پێویسـتە. (تەفسیری کەبیر، ج ٣ـ۴)

لە سیمای ئایەتەکانی قورئان دەردەکەوێ و هەست پێ دەکـرێ بە تەواوی کە جـوولەکە لە ئەندازە بە دەر یاخی و سەرەڕۆ بن، نەبیسەر و لاسـار، کەچـی دەکەڵ ئەو حـاڵەتە ناحەزەشـیان خودا ئاگاداری کردوون، لە نیعمەت و بەخششی بێبەش هەر نەکردوون.

لە ئایەتی ٨٣دا هەشت شتی بابەتی کۆمەڵایەتی، ئایینی، ئەخلاقـی وەیـادی جوولەکەکـان دەخاتەوە کەچی هیچیان بایخێکیان پێ نەدان و هەروا لە دوو ئایەتی پاش ئایەتی ٨٣، چها شتی دیکەیان خودا دەگەڵ گرێبەست دەکا کەچـی زۆر بەبـێ شـەرمانە پێشـێلی دەکەن. دیـارە ئەو جۆرە ئاکارانەی جوولەکە وا نیشان دەدا کە بە هیچ جۆر جوولەکە قابیلی ئیسلاح نین، بۆ ڕاستی ئەو ئیدیعایە دەچینە خزمەت ئایەتەکانی ٨۴ و ٨٥ی بەقەرە خـودای تەعـالا دەوانـدا هەنگـاو بە هەنگاو لاسارییەکانیان ڕادەنێ و نیشان دەدا:

﴿٨۴﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ لاَ تَسْفِكُونَ دِمَاءكُمْ وَلاَ تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَارِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ

بیر بکەنەوە لەوەی لە تەوڕاتدا پەیمانم لێ وەرگرتن کە خوێنی یەکتری نەڕێژن و هیچ کەسێک

**لە خۆتـان مـاڵبەدەر نەکەن، ئەی جـوولەکینە! ئێـوە بۆخۆتـان ئەو پەیمانەتـان پەسـند کـرد و شاهیدیتان دا لە سەر چاکی پەیمانەکە.**

## ئاوڕێک وەسەر کارەساتی ناڕەوای دوو هـۆزی عەڕەبـی بتپەرەسـت: ئەوس و خەزرەج

پێش ئیسلام لە شاری مەدینە ئەوانە دوژمن بە یەکـتر بـوون و هەمیشـەش لە شـەڕدا بـوون دەگەڵ یەکتر وسێ تیرەی دیکەشی جوولەکە تێدا بوو وەک تایفەی «بنو نضیر»، «بنو قریظـة» و «بنو قینقاع». تیرەی یەک و دوو واتە «بنو نضیر» و «بنی قریظة» دەگەڵ تیرەی ئەوس هاودەست و هاویاری یەکتر بوون. تیرەی سێ واتە قینقاع دەگەڵ تیرەی خەزرەج هاویـار بـوون بە سـوێند ببوونە هاویاری یەکتر. جا لە سەر ئەو ئەساسە هەر کات ئەوس و خەزرەج بکەوتانایە شـەڕ وبە گژ یەکدا هاتبان، ئەوە ئە وسێ تیرە جوولەکانەشیان ڕەگەڵ دەکەوتن، دەکەوتنە گیـانی یەکـتر و دەبوونە پشتیوانی عەڕەبە بتپەرەستەکان بۆ بە گژداچوونی جوولەکەکان و تـاڵان و کوشـتنیان. دیارە بە پێی ئەو پەیمانەی کە دەگەڵ خودایان بەستبوو، نەدەبا ئەو شەڕ و هەڵا و بگرەیان بەرپـا کردبایە دەگەڵ یەک و ئەو کوشت و کوشتارەیان لە یەک کردبایە. (تەفسیری خاڵ، زەین دەیە بۆ باوەڕی)

بۆ تەئکیدی ئەو جەریانات و کارەساتانەی ئەو هۆز و قەبیلانە دەچینە خزمەت ئایەتی ٨٥ی بەقەرە:

**﴿٨٥﴾ ثُمَّ أَنتُمْ هَـؤُلاء تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقاً مِّنكُم مِّن دِيَارِهِمْ تَظَاهَرُونَ عَلَـيْهِم بِالإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَإِن يَأتُوكُمْ أُسَارَى تُفَادُوهُمْ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْـرَاجُهُمْ أَفَتُؤْمِنُـونَ بِـبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاء مَن يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنكُمْ إِلاَّ خِـزْيٌ فِي الْحَيَـاةِ الدُّنْيَـا وَيَـوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ**

لە پاشـان ئێـوە بە پـێچەوانەی ئەو پەیـمانە جـووڵانەوە، یەکـتری دەکـووژن و هێندێکیشـتان هێندێکی دیتان ماڵوێران و ماڵبەدەر دەکەن، و یاریدەی دوژمنەکانتان دەدەن ل ەسەر یەکتری و دژ بە یەک دەوەسـتنەوە، بەڵام ئەگەر بە دیـل بگیـردرێن، دەچـن دەیـانکڕنەوە، ئەئەوە لە حاڵێکدایە کە لە تەوڕات دەربەدەر کردن و ئاوارە کردنی یەکتریتان لێ قەدەغە کراوە. ئایـا بـۆ مەگەر ئێوە باوەڕتان بە هەندێک لە تەوڕات هەیە و کەچی باوەڕتان بە هەندێکی نییە و کاری پێ ناکەن؟ ئایا دەبێ سزای ئەو کردەوە ناڕەوا و ناشایستەیەی کە هەندێکتان دەیکەن چی بێت؟

**جگە لە سەرشۆڕی و ڕووڕەشی لە ژیانی دنیادا و لە ڕۆژی دواییشدا خراپترین و پڕئازارترین سزای خودا، وەنەبێ خودا لە کار و کردەوەکانتان بێئاگا بێ. بەڵکوو زانا و ئاگادارە بە هەمووی.**

دەبێ بکوترێ دێرەدا: ئەی خاوەن باوەڕان، ئەو جوولەکانە کەسانێکن کە قیامەتیان خستۆتە پێناو ژینی دنیا، واتە بەقایان داوە بە فەنا، ئەوانە سزای هەمیشەیان دە ئەستۆی خۆ خست، بەو خەیاڵە خاو و باتڵەیان کە دەڵێن سزامان ئەگەر بشبێ لە قیامەتا، هەرچەن ڕۆژێکی دیاریکراو دەبێ. دە بڕوانە لە ئایەتی ٨٠ی بەقەرە، ﴿وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلاَّ أَيَّاماً مَّعْدُودَةً﴾ ئێمە گەلی **هەڵبژاردەی خوداین، چەن ڕۆژێکی کەم نەبێت ئاگرمان بەر ناکەوێت.**

بۆ بەدەس هێنانی کاکڵی ئەو ئایەتە مـوژدە و هەڕەشاویانەی خودای بەحەق و حەقوێژ دەچینە خزمەت ئایەتی ٨٦ی بەقەرە کە تەواوکەری ئایەتی ٨٥ە:

﴿٨٦﴾ أُولَـئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُاْ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالآَخِرَةِ فَلاَ يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلاَ هُمْ يُنصَرُونَ

**ئەوانەی ئەو کارە خراپ و ناشایستانە دەکەن، ئەوە ژیانی پڕ لە خۆشی و هەتاهەتایی بەهەشتیان بە دنیایەکی کەم نرخ گۆڕیوەتەوە. بۆیە لە ڕۆژی قیامەتدا نە سزایان لە سەر سووک دەکرێت و نە یارمەتیش دەدرێن.**

کورتەی ئەو باسە ببیستە: پێش هاتنی پێغەمبەری ئیسلامﷺ دوو هۆزی عەرەب لە مەدینەدا بوون: هۆزی ئەوس و هۆزی خەزرەج. ئەو دوو هۆزە زۆر دوژمن بە یەک بوون. هەروەها لە مەدینە و دەوروبەریشدا سێ هۆزی دیکەی جوولەکە هەبوون، واتە هۆزی «بەرەی قەینوقاع» و هۆزی «بەرەی نەزیر» ئەو دوو هۆزەیان دەگەڵ هۆزی خەزرەج هاوپەیمان بوون. هۆزی سێیەمی جوولەکەکان واتە هۆزی «بەرەی قورەیزە» بوو کە دەگەڵ هۆزی ئەوسدا هاوپەیمان بوون. ئینجا کە هۆزەکانی ئەوس و خەزرەج دەکەوتنە شەڕ دەگەڵ یەک، هۆزە جوولەکەکانیش بە پێی ئەوەی هاوپەیمانیان بوون ئەوانیش لە دژی یەکتری بەشداری شەڕەکەیان دەکرد و هەر لایەکیان یارمەتی یەکێک لە هۆزە عەرەبەکانیان دەدا کە هاوپەیمانی یەکتری بوون. بێگومان ئەو شەڕانەش دەبوو بە هۆی ئەوەی جوولەکەکان لە یەکتری بکوژن و یەکتری دەربەدەر بکەن و ماڵی یەکتری وێران کەن.

**ئاوڕدانەوەیەک وەسەر ناوەرۆکی ئەو ئایەتە پیرۆزە:**

ڕازی ئەو هۆزە ناقۆزە لە بەڕێوەبردنی ئەمری باری بەو شێوەیە. بێگومان ئەوەی لێ

دەوەشێتەوە: ئەوانە ژینی ئاخرەتیان دە پێناو ژینی ئێرە نا. لەبەر ئەوەی لێرەدا ئەوەیان بە قازانج دەزانی کە هاوئاینەکانیان دەربەدەر کەن و بیانکوژن، بێخەبەر لەوەی ئەو کارەیان سەرپێچییە لە ئەمری باری. ئەمما لەو لایەشەوە ئەوەیان بە شەرت دانا کە دیلەکان وەگۆڕن کە ئەو شەرتەیان چەشنە پەیرەویەک بوو لە ئەمری باری. بە خەیاڵی خۆیان کاریان ئیتاعەی خودایە، ئەگەرچی کاریان خیلافی دەستووری خودایە جا بۆیە دەبێ بیسەلمێنین لە کاروبار و دەستووری باریدا نابێ بە هەوا و هەوەسی دنیای خۆمان ئاوێتە کەین. ئەوانە هاتن ئەوەی بە قازانجیان زانی کردیان و ئەوەی بە زەرەریان زانی وەلایان نا، جا بۆیە ڕۆژی خۆی تەخفیف لە عەزابیاندا نییە و کەسیش ناتوانێ ئاوڕیان وەسەر دا، سەرەنجام هێزێکی بەهێزتر لە هێزیان دەکەوێتە گیانیان بێبەزەییانە قەڵتوبڕیان دەکا لە دنیادا و لە ئاخرەتیشدا عەزابی سەخت دەکەوێتە گیانیان.

دڵ بە هەستەوە ئەو هەستە دەکا: ئەو جوولەکانەی دەورانی مووسا کە ئاوا لاسار و یاخی بوون، ئایا دەبێ پاش مووسا کە چها پێغەمبەری دی هاتوون، دەگەڵ وانیش هەر ئاوا سەرەڕۆ و نافەرمان بووبن، وەیا چاک بوون دەگەڵ وان؟

بۆ ئەو وەڵامە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ۸۷ی بەقەرە، چونکە ئەوە بێگومان بەسەرهاتی ئۆمەتانی ڕابردوو دەگەڵ پێغەمبەرانیان هەر خودا دەیزانێ و هەر دەبێ ڕاستیش لە خودا بزانین.

﴿۸۷﴾ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَقَفَّيْنَا مِن بَعْدِهِ بِالرُّسُلِ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ أَفَكُلَّمَا جَاءكُمْ رَسُولٌ بِمَا لاَ تَهْوَى أَنفُسُكُمُ اسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقاً كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقاً تَقْتُلُونَ

جوولەکەکان کە ئیمانیان نەدەهێنا، پاساویان بەوە دەهێناوە کە ئەوان کتێبی خودا و فەرمانی پێغەمبەرەکانی خودایان لە لایە، ئیتر ئەوەیان بەسە، لە بارەی ئایینەوە پێویستیان بە ئیسلام نییە. بەڵام لێرەدا قورئانی پیرۆز وەدرۆیان دەخاتەوە چونکە ئەوان هەمیشە بە پێچەوانەی فەرمانی خوداوە ڕەفتاریان دەکرد و فەرمانی پێغەمبەرەکانیان پیادە نەدەکرد کە دواهەمینیان عیسا بوو کە خودا بە وەسیلەی جبرائیل تەئیدی کردووە. ئینجا قورئان دەفەرموێت:

هەرکاتێک پێغەمبەرێکتان بۆ هاتبێت و ڕێنمایی و فەرمانەکانی دەگەڵ ئارەزووی ئێوە نەگونجابێ، خۆو بادەدا و سەرپێچیو دەکرد. کۆمەڵێکتان پێغەمبەرەکانتان بە درۆ دەخستەوە و باوەڕتان پێ نەدەکردن (وەک عیسا و محەمەد المصطفی). وەهەروا کۆمەڵێکی دیشتان بە ناحەق دەستتان دەچویە خوێنیان و دەتانکوشتن (وەک ئەشعیا، زەکەریا و یەحیا)

ئاوڕدانەوەیەک وەسەر لاساری هـۆزی یەهـوود کە بەدئەخلاقییـان بڕسـتی بیـر و ئەقـڵ و شعووری بڕیبوون، چونکە ئەساس و یاسای سـرشت وا تەنزیم کراوە، لە مەسیری حەقناسـی لانادا مەگەر بە زۆر و خیرەسەری لایدەی. مەسەلەن ئینسان سـرشتی وا تەنزیم کـراوە و دە بەر یەک نراوە حەقناس بێ ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّـتِي فَطَـرَ النَّـاسَ عَلَيْهَـا﴾ ﴿٣٠﴾ «روم» ئەمـما ئەگەر هەوا و هەوەسی دنیای بە گژدا کرێ، لە سـرشت و فیترەتـی لادەدرێ و وەدوور دەخـرێ وەک هـۆز و قەبیلە یاخییەکانی جوولەکە و ... بە گژ حەقدا دێن و بەرەنگاری یاسای باریتەعـالا دەبـن، تـا سەرەنگرێشی نەبن ناگەڕێنەوە.

## ئاوڕدانەوەیەک وەسەر ناوەرۆکی مانای ﴿وَقَفَّيْنَا مِن بَعْدِهِ بِالرُّسُلِ﴾

دەمانەوێ بزاندرێ پاش مووسا چەن پێغەمبەری دی هاتوون و ئەگەر هاتووشـن خـاوەنی دەستووراتی تایبەتی خۆیان بوون، بەرنامەی تازەیان پێ بووە یا هەر لە سەر دەستووراتی مووسا بوون و ئایینی مووسایان پەرە پێ داوە؟

لە مووسا تا عیسا و لە عیسا تا مـحەمەد المصـطفیﷺ ئەوە بە ئیسـبات گەیشـتووە پـاش مووسا تا دەگاتە عیسای پێغەمبەر، پێغەمبەرانی زۆر هاتوون بەرنامەشیان هەر پەرەپێدانی ئایینی مووسا بووە، بۆخۆیان خاوەنی دەسـتووراتی تـازە و جـودا نەبـوون، گۆیـا ٧٠ هەزار بـوون لە مووسا تا عیسا، هێندێکیش کوتوویانە ۴ هەزار. ئەو ژمارانە هەر کوتەن، دەلیل و بورهانێکیان لە سەر نییە. ناودارەکانیشیان ئەوانەن: (یوشع، شمویل، شمعون، داود، سلیمان، اشـعیاء، ارمیـاء. عزیر، خرقیل، الیاس، یسع، یونس، زکریا، یحیی)

تا عیسا وەک دەڵێن ئەوانە هەر تەورات کتێبیان بووە بەڵام حەزرەتی عیسا خاوەنی ئینجیل بـووە و ئـایینی سـەربەخۆ و خـاوەن ئـۆمەت بـووە لە پێغەمـبەرە ئولولعەزمەکـان واتە خـاوەن شەریعەتی سەربەخۆ، بەڵام ئەوەش با بزانین ئینجیل بەشـێکی کەمـی ئەحکـام و دەسـتووراتی تایبەتی عیسا بووە وەئیللا هەر ئەحکامی تەوراتی بەیان کردووە و هەر تەورات بووە.

ئەوەش با بزاندرێ: عیسا بۆ دە قورئاندا بە ناوی دایکی ناو دەبـرێ؟ زانایـان کوتوویـانە لە بەر چەند شت عیسا وەپاڵ دایکی دراوە. شتەکان ئەوانەن:

١. هێندێک لە یەهوودی ناحـاڵی ئەو تەوهیـنە دەکەن: عیسـا حەڵاڵزادە نیـیە بـۆیە بـابی نادیارە. خوداش بۆ لە دمدانی وان دەیداتە پاڵ دایکی پاکی و جبریلی پاک.

٢. هێندێکیش لە نەساراکان باوەڕیان وا بووە عیسا کوڕی خودایە، دووبارە خودای تەعـالا

بۆ لابردنی ئەو گومانە فەرموویەتی عیسا کوڕی مریەمەی پاکە نەک کوڕی خودای تاکە. بۆ زێدە زانین لەو بارەوە: تبیین القرآن، ج ۲، تفسیر کبیر، ج ۳ـ۴.

**تێوەڕامان و تێبینی**

ئەوە یەقینە و حاشا هڵنەگرە کە قورئان ڕێنومای ئینسانە. ڕانانی بەسەرهات و کارەساتی گەلانی ڕابردوو هەمووی دەرس و پەند و ئامۆژگاری گەلانی داهاتوون. دەبێ دەرسی لێ وەربگیردرێ، بەسەرهاتی پڕ لە کارەساتی ناڕەوا و بێشەرمانەی جوولەکەکان ئیشارەیە و ئەوەمان پێ دەڵێ: کەسێ داوای ئیمان و خوداناسی بکا بە قەتعی دەبێ خۆی بەدوور بگرێ لەو ئاکارانەی لەمەڕ جوولەکەکان بەیان کران و ڕاگەیێندران، تا بەدوور بن لەو سەرنویشتەی ئەوان تێی کەوتن. بەڵام دەبێ بکوترێ: دڵی ڕەش و هەڵقرچاو شعووری پووچەڵ و ژەنگاوی نەچیری دواڕۆژی چاو ناکا و نایقۆزێتەوە. وەک ئێستێ چاو دەکرێ، زۆر لە جوو خراپتر دەکرێ، چونکە هەر بە کوشتن و دەربەدەر کردنی گەلانی بندەست واز ناهێندرێ. بەڵکە جگە لە هەتکی نامووس و حەولی بنەبڕ کردنی گەلان دەکرێ. بۆ پڕ کردنەوەی بۆشاییەکی کاخی دەستەڵاتی بێدادی، سەری هەزاران بێتاوان دەبڕدرێ کەوابێ جێیەتی بکوترێ: ئەوانە ڕووڕەشن ڕووی ڕەشی جوولەکەیان داپۆشی. تەماشا ئیسلام واتە ئەوانەی دەڵێن ئیسلامین، دەگەڵ ئەوەی یاسا و ئەساسنامەی وەک قورئانیان بە دەستەوەیە، کەچی بۆ حیفزی نیزامی نامیزانیان دەس بە دامێنی نیزامی کوفری بێ ئەساسنامە دەگرن، بێخەبەر لەو ئامۆژگارییەی باری کە بە وەسیلەی ئایەتی ۲۲ی موجادلە ڕایگەیاندووە: ﴿لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَٰئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ دەسناکەوێ ئەو کەسانەی کە خاوەنی ئیمانن بە خودا و ڕۆژی ئاخرەت بن، ببنە دۆستی ئەوانەی ئینکاری یاسای خودا و ڕەسوولی خودا دەکەن، ئەگەر بابیشیان بن یا کوڕیشیان بن یا برایان بن ئەو مونکیرانە یا لە هۆزی خۆیان بن. خاوەن باوەڕ بە خودا و ڕۆژی ئاخرەت خودا ئیمانی وا دەناو دڵیدا ناژتووە و داڕژتووە. کە هیچ هێزێکی هەوا و هەوەسی دنیاپەرەستی ناتوانێ زەفەری پێ بەرێ. لە ئاخرەتدا خودا ئەوانە دەخاتە باغاتێک ئاوی جۆبار ڕەوانە بە ناویدا، و هەتا هەتاییش لەو جێگا خۆشەدا دەبن، خوداشیان لێ ڕازییە و ئەوانیش لە خودا ڕازین، ئەوانەن حیزبوڵڵا، هەر حیزبوڵڵاش ڕزگارن.

ئاوڕ دەوە و تێفکرە و دڵ و ئەقڵ و هەست و شعووریش وەگەڕ خە و دەکار کە، ئەو

جوولەکانەی بێ دەلیل و بەڵگە و بورهان کە بە گژ ئـاییني خـاوەن بەڵـگە و دەلیـل و بورهانـدا هاتبوون، لە مووسا تا عیسا و لە عیسا تا محەمەد المصطفى بۆوەی دەبـێ نەتەوەی داهـاتووی ئینسان تا دەبڕێتەوە بیکاتە دەسحێب و ملوانکە دە ئەستۆی خۆی کا و هەمیشە لە بەرچاوی بێ. بەڵام بە داخەوە ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضاً﴾ ئینسانی دڵنەخۆش قورئـانی شـیفای دڵە ئەویشی ناوێ کاتێ پێغەمبەر بۆ ئیمان و باوەڕی دەعـوەتی دەکـردن دەیـانکوت دەعـوەتەکەت ناچێتە ناو دڵمانەوە لەبەر دڵڕەشیانیان؛ بۆ ڕاسـتی ئەو مەتـڵەبە دەچیـنە خـزمەت ئـایەتی ٨٨ی بەقەرە:

**﴿٨٨﴾ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا غُلْفٌ بَل لَّعَنَهُمُ اللَّه بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلاً مَّا يُؤْمِنُونَ**
**«ئەوانە ئەگەر داوای موسوڵمان بوونیان لێ بکـردایە» دەیـانکوت: دڵـمان پەردەی بە سـەرەوەیە قسە وەرناگرێت و لەو قسە وباسانەش تێناگەین. نەخێر مەسەلەکە ئەوە نییە بەڵکـوو بە هـۆی بێباوەڕییانەوە خودا لە ڕەحمەتی خۆی وەدووری خستوونەتەوە و نەفرەتی لێ کـردوون، بـۆیە زۆر بە کەمی ئیمان دێنن و موسوڵمان دەبن.**

ئاوڕێک وەسەر ناوەرۆکی مانای ئایەتی ٨٨ی بەقەرە: ئایا ئێمە دەبێ مانای ئایەتەکەی چۆن وەرگرین، واتە خودا دەرگای دەرکی لێ داخستوون، وەیا بۆخۆیان دەرگای دەرک و شعووریان لە خۆ پێوەداوە؟ بۆ وڵامەکەی دەچینە خزمەت ئایەتەکانی ٥٧ی کەهف و ١٤٦ی بەقەرە و ٤٦ی ئەسـرا: کە هەرسێکیان مانای یەک لە خۆ دەگرن کە بریتییە لە دڵ داخراوی ومۆرکراوی:

إِنَّا جَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ ﴿٥٧﴾ «کهف» **ئێمە بە هۆی تاوان و کوفریان پەردەمـان داوەتە سەر دڵیان.**

وَجَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ ﴿٤٦﴾ «اسری» **ئـێمە بە هـۆی ئەوەی لاسـاری دەکەن لە بەرابەر حەقدا پەردەمان داوەتە سەر دڵیان بۆوەی دەرکی حەق نەکەن.**

الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءهُمْ وَإِنَّ فَرِيقاً مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ «بقره» **ئەوانەی کە کتێبی ئاسمانییان پێ داون محەممەدی پێغەمبەر وەک ئەولادی خۆیـان دەناسن کە پێغەمبەرە بەڵام هێندێکیان لە سەر ئەو حاڵەش ڕا حەق (واتە پێغەمبەرایەتی) دەشارنەوە.**

مانای هەر سێ ئایەتەکـان ئەوە سـابیت دەکەن: ئەوانە بۆخۆیـان بـوونەتە باعیسـی ئەوەی خودا پەردە بخاتە سەر دڵیان بۆوەی حەق نەبیستن و دەرکـی نەکەن. جـا لە سـەر ئەو ئەساسـە دەبێ ئەوە بسەلمێنین: خودا کەس کوێر و کەڕ ناکا بۆوەی نەبیـنن و نەبیسـن، چـونکە شـایانی

خودا نییە زوڵم.

بە کوردی و بە کورتی، کوردە کوتەنی: مریشک بۆخۆی خۆڵێ وەسەر خۆ نەکا، کەس بە سەریدا ناکا.

## ئاوڕێک وەسەر لاساری جوولەکەکانی دەورانی حەزرەتی محەممەدﷺ

پێش هاتنی حەزرەتﷺ زۆر بە ئاب و تابەوە جوولەکەکان بە پێی ئەو مـزگێنییەی تەورات و ئینجیل لەمەڕ محەممەد دابوویان، چاوەڕوانی هاتنی محەممەدیان دەکرد بۆوەی بە هۆی ئـایینی بەحەق و پاکی ئەو بتوانن زاڵ بن بە سەر بتپەرەستەکان، کەچی هەمینکـی هـات پێغەمـبەر و زانییان هەوە و حەقە، ڕوویان لێ وەرگێڕا. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٨٩ی بەقەرە:

**﴿٨٩﴾ وَلَمَّا جَاءهُمْ كِتَابٌ مِّنْ عِندِ اللّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَاءهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِ فَلَعْنَةُ اللَّه عَلَى الْكَافِرِينَ**

**پێش ئەوەی ئایینی ئیسلام بێ، ئەگەر جوولەکەکان ناکۆکییەکیان دەگەڵ بتپەرەستەکان بـۆ هاتبا پێش، پێیان دەکوتن: بەو زووانە پێغەمبەرێک دێ ئـێمە زۆرمـان ئیمانـی پـێ دێنـین، ئەو کاتە بە سەرتانا سەر دەکەوین. کەچی کاتێـک خـودا قورئـانی ڕەوانە کـرد بـۆ پێغەمـبەر، ئەو قورئانەی کە ڕاستی تەوڕات وانی پێش دەستکاری کردن دەسەلماند و تەسدیقی دەکرد، کەچـی ئەوان باوەڕیان پێ نەدێنا و پێشی کافر دەبوون، جا بۆیە شایانی نەفرەت و لەعنەتن.**

## ئاوڕدانەوەیەک وەسەر دڵڕەقی و لاساری یەهوود

گەلی یەهوود بەتایبەت زانا بە تەوڕاتەکان دانزانی و یەقینیان بوو کە محەممەدﷺ پێغەمـبەرە و حەقە بە هـۆی مـوژدەیەکی کە تەوڕات پێـی دابـوون. جـگە لەوەش ئەو مـوعجیزانەی کە محەممەدﷺ دەینواندن ئەوەندەی دیش یەقینیان لە سەر پێغەمبەرایەتی محەممەدﷺ ساغ دەبۆوە و ئەگەر یەهوودییەکان لە ترسی لۆمەی ئێر و ئەوێ بێن بڵێن: بەیانی مـحەممەد و سـیفەتەکانی کە دەڵـێن هـاتوون لە تەوڕاتـدا، دڵ قەناعەتیـان پـێ پەیـدا ناکـا و کـافی نـین، هەر بـۆیە ئـێمەی یەهوودیش مل نادەین و ناچینە ژێر دەستووراتیەوە. ئەیجا خۆ موعجیزەکـانی هەمـوو ئەقـڵ و هەست و شـعوورێک سـەری تەسـلیمیان بـۆ نەوی دەکەن. خـۆ ئەوە حاشـای لـێ نـاکرێ و ناشاردرێتەوە.

لەسەر ئەو ئەساسە دەبێ بڵێین و بشکوترێ: لە یەهوود لاسارتر و بێ دەلیل و بەڵگەتر نییە،

شـایانی لـۆمەن و ڕەوای زەمـن، چـونکە مـونکیری حەقـن، لەعنەتـی خـوداش لە سـەر وان. هۆیەکەی ئەوە بووە: زانا بوون بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محەمەدﷺ و ئینکارییەکەیان بە عەمد بووە لە ڕووی زانستەوە بووە، نەک لە ڕووی نەزانی؛ ئەو ئینکارییەشیان لە ترسـی لە دەس‌دانـی مەقام بووە. بۆ زێدە زانین بڕوانە لە تەفسیری کەبیر، ئیمام فەخری ڕازی، ج ٤ـ٣، ل ١٨١.

بۆ تام و مەزە پێویسـتە ئاوڕێـک وەسـەر یاسـای عیلمـی نەحـو بـدەینەوە، لەمەڕ ئەو دوو (لمّا)ی ناو ئایەتەکە. وشەی «لمّا» لە کـوێ بـێ، وەڵامـی دەوێ، بەو پێـیە ئەو دوو «لمّـا»یـانە جارێکیان لە سەرەتای ئایەتەکە ﴿وَلَمَّا جَاءَهُمْ كِتَابٌ...﴾ جارێکی دیکەشیان لە ئاخری ئـایەتەکە ﴿فَلَمَّا جَاءَهُم مَّا عَرَفُـواْ...﴾ جـاری دووهەمیـان وڵامـی بە ﴿كَفَـرُواْ بِـهِ﴾ دراوەتەوە، جـوانە و حاشای لێ ناکرێ. بەڵام جاری هەوەڵ بە زاهیری وڵامی دیار نیـیە، واتە جـاری هەوەڵ ﴿وَلَمَّـا جَاءَهُمْ كِتَابٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ﴾ وەک بێ وەڵام دەچێ، جا بـۆ ڕەفعـی ئیشـکال هەر دەبـێ دەس دە دامێنی یاسای عیلمی نەحو بگیردرێ، چونکە ئیشکالی خۆیەتی:

١. زانای عیلمی نەحو، ئیمامی «مبرّد» فەرموویەتی: (لمّا)ی دووهەم بۆ تەئکیدی (لمّـا)ی ئەوەڵە، چونکە هەردوو (لمّا) یەک شەرت پێک‌دێنن، جا بۆیە بە ڕاشکاوی دەتواندرێ بکـوترێ (كَفَرُواْ بِهِ) وڵامی هەر دوو (لمّا) شەرتییەکانە. لەسەر ئەو ئەساسە (لمّا)ی هەوەڵ ڕاسـتەوخۆ وڵامی تایبەتی ناوێ.

٢. ئیمامی «فرّا» نەحوزان فەرموویەتی وڵامی (لمّا)ی دوو، وڵامـی (لمّـا)ی هەوەڵیشـە و موشتەرەکن.

٣. نەحوزانەکانی وەک «اخفش» و «زەجـاج» فەرموویـانە: وڵامـی (لمـا)ی هەوەڵ قـوت دراوە، جـا یـا (كَفَـرُواْ بِـهِ) یـا (كَـذَبُواْ بِـهِ)یە، ئەو لایەشـیان پەسـند کـردووە هێنـدێک لە نەحوزانەکان. بۆ ئاشنایی زیاتر لەو بارەوە تەفسیری تبیین القرآن، ج ٣، ل ٤٠ تەماشا کە.

**وەردانەوەیەک لە سەر مانای ئایەتەکان**

هەچەندی بڵێین خودا دەگەڵ گیـانلەبەرانی بەتـایبەت ئینسـان بە بەزە و کەڕەمە، ئەمـما بە بارتەقای ئەو هەموو عەتا و بەخششە، ئینسان سپڵە و ناسپاسە، ئەگەر تێری خـوارد هەڵـداوێ، ئەگەر برسیش بوو فـڕ داوێ، خـوداش لە سـەر ئەساسـی عەداڵەت و حیکمەتـی بـۆ دەرسـی عیبرەتی ئینسان، بەسەرهاتی گەلانی بەسەرچوو بەیان دەکا بۆ ئینسان، تا چاکەکان ڕەچـاو کەن و خراپەکانیش وەلانێن.

بۆ پاڵاوتەیەک لە بەسەرهاتی گەلی یەهوود بڕوانە لە ئایەتی ٩٠:

﴿٩٠﴾ بِئْسَمَا اشْتَرَوْاْ بِهِ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُواْ بِمَا أَنزَلَ اللّهُ بَغْياً أَن يُنَزِّلُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ عَلَى مَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ فَبَآؤُواْ بِغَضَبٍ عَلَى غَضَبٍ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ

**ئەو جوولەکانە بەوەی کە باوەڕیان بە پێغەمبەر و قورئان نەهێنا خۆیان بە خراپترین شت گۆڕیەوە، چونکە حەسادەتیان برد بەوەی خودا بە لوتفی خۆی قورئان بۆ یەکێک لە بەندەکانی خۆی بنێرێتە خوارەوە، کە خۆی دەس‌نیشانی دەکات و دەیەوێت، ئەوانە لە دوو چەندانەی تووڕەیی خودا زیاتر، هیچی دیکەیان پێ نابڕێت، و بێ باوەڕان سزایەکی ڕیسواکەر و مایەی سەرشۆڕییان بۆ تەرخان کراوە.**

## ئاوڕدانەوەیەک

جوولەکەکان پێش هاتنی نەوەی ئیسحاقی پێغەمبەر واتە محەمەدﷺ، بە ئاب و تابێکەوە چاوەڕوانی هاتنیان دەکرد، بۆوەی بتوانن بە پشتیوانی ئەو، بت‌پەرەستان ڕاماڵن و گومڕایی وان پاک کەنەوە. کەچی بە هاتنی ئەو، بەرەی حەزرەتی ئیسماعیل واتە محەمەدﷺ، تۆقی حەسادەت کەوتە ئەستۆیان و گرتنی، لێک پرژ و بڵاو بوون، هەرکەس لە ڕاستی خۆی بێ دەلیل کەوتە دژایەتی خودا و قورئان و محەمەدﷺ تەنانەت کەوتنە سەر ئەو باوەڕەی ئەو پێغەمبەرە ڕەحمەتەی لە ناو بەرن. لە سەر ئەو ئەساسە زۆر شایانە بگوترێ: جوولەکە بە پێچەوانەی سێ پێغەمبەری بەرزی خاوەن کتێب و ئۆمەت و شەرعی سەربەخۆ جووڵانەوە کە ئێستاش ئەو جووڵانەوە شوومەیان دنیای بە سێ کوتی دژ بە یەک هێشتۆتەوە. سێ پێغەمبەرەکان: مووسا، عیسا و محەمەد المصطفیﷺ. لە سەر ئەو سەرەڕۆییەیان خودا تاپۆی کرد لە سەریان: ﴿وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾

تیوتیوە: ئیهانە و تەوهینەکانی جوولەکان بە ئایینی پاکی ئاسمان:

١. بێ ئیتاعەییان لە مووسا بە هۆی بێ باوەڕییان بە تەوڕات.

٢. بێ ئیتاعەییان لە عیسا بە هۆی بێ باوەڕییان بە ئینجیل.

٣. بێ ئیتاعەییان لە محەمەد المصطفی بە هۆی بێ باوەڕییان بە قوڕئان.

٤. باوەڕیان بەوەی عوزەیر کوڕی خودایە

٥. (يدُ اللهِ مَغلولَةٌ) دەستی خودا تێشکاوە.

٦. (إنَّ اللهَ فقيرٌ و نحنُ غنيٌّ) خودا فەقیرە و ئێمە دەوڵەمەندین.

٧. گوێرەکە پەرەستی.

٨. حاشاردانی ئەوسافی محەمەد المصطفیﷺ لە تەوراتدا.

هەروا زۆری دیش لە نارەواکانیان، هەچەن کافر هەر کافرە، بەڵام ئەو شێوە خۆ کافر کردنە لە رادە بەدەر دوور لە ئەقڵ و شعوور و هەستە. واتە لە دایرەی سوور زۆر بەو لاوە چوون، جا بۆیە غەزەب لە سەر غەزەب سواری ئەستۆیان بووە. بۆ زێدە زانین تەفسیری کەبیر، ج ٤ـ٣، ل ١٨٤ زەین دەیە.

## سەیرێک لە ئینسان

حەسادەت و خۆ بە زۆرزانی لە لووتکەی کەرامەتی بەشەری کە ئەقڵ و هەست و شعوورە، توورت دەداتە ناو دەریای جەهل و نەزانی دەتخاتە خوارەوەی حەیوانی، لەوەش ناحەزتر نییە بۆ ئینسانی بە شکڵ و دیمەن ئینسان بێ، بەڵام بە هەست و شعوور لە حەیوانیش کەمتر بێ.

یەهوودی دڵرەقی حەسوود و کینە لە دڵ، هەم پێغەمبەرایەتی مووسایان قبووڵ نەکرد، هەم پێغەمبەرایەتی محەمەد المصطفی، بەڵام ئەوەش دەبێ بزانین بە هەرچی فێڵ و فووت و حیلە و جادووگەری کردیان و دەکاریان کرد بۆوەی ئایینی باریتەعالا بە هۆی ئەو پێغەمبەرانە نەیەتە روو و پەرە نەستێنێ، هەر نەیانتوانی و دەروەست و باشاری حەق نەهاتن و تێکشکان. ئەوانیش لە حەیف و داخ وحەسرەتان بوونە منافق و مورتەد و کافر، سەرەنجام کەوتنە بەر رەهێڵەی غەزەب و قەهری خودا لە هەر دوو دنیا.

## تەوەسول (توسّل)

واتە: دەس دە غەیری خودا گرتن بۆ گەیشتن بە خودا؛ بابەتێکی زۆر ئەساسییە و جەنجاڵاوی و مشتومڕی زانایانی لە سەرە. بازدان بە سەریدا و خۆ لە قەرە نەدانم بە رەوا نەزانی دێرەدا. بۆیە ئاورم دایە سەری.

دەبێ ئێمەی خاوەن ئیمان و باوەڕ بۆ هەموو کاروبارێکی ئایینی و کۆمەڵایەتیمان بڕوانینە سەرچاوە و ئەساسنامەی ئیمان و باوەڕمان کە قورئانە. قورئانە لە ئایەتی ٣٥ی مائیدەدا ئیشارەیەکی وەلای تەوەسول کردووە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَابْتَغُواْ إِلَيهِ الْوَسِيلَةَ وَجَاهِدُواْ فِي سَبِيلِهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ **ئەی کەسانێک کە ئیمانتان هێناوە، خۆتان بپارێزن لە توورەیی و نارەزایەتی**

**خودا، ئەویش بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی؛ وەهەروا ڕووو تێکردنی ئەو شتانەی کە دەبنە هۆی نیزیک بوونەوەتان لە خودا، تێکۆشان (واتە جیهاد) بکەن لە پێناو ڕێگای خودادا دەگەڵ ئەو دوژمنانەدا کە شکستی ئێوە و ئایینەکەتان بە ئاوات دەخوازن. بەشکوو ڕزگاری و سەرفرازی دنیا و ڕۆژی دواییتان دەس کەوێ.**

## وەسیلە

هەر کارێکە کە بۆ گەیشتن بە مەبەستێک ئەنجام دەدرێت، دێرەدا واتە دەو ئایەتەدا مەبەست لە کاری چاکە ملکەچییە لە پێناو دەسخستنی ڕەزامەندی خودادا. نەک پەنا بردن بۆ ئینسان کەوا بزانیت ئەو دەتوانێت خەڵکی لە خودا نزیک بکاتەوە، وەیا توانای قازانج پێ گەیاندنی بە ئینسان هەیە وەیا زەرە پێدانی بە دەستە؛ هەروەک هێندێک لە ساوا و کاڵ و لاو هەن بە داخەوە وا دەزانن قازانج و زەرەر لە دەس ئینسان دێ! لە ڕۆژی قیامەتا هیچ کەس ناتوانێ بە هانای کەسەوە بێ و یارمەتی بدا. تەنیا ئەوەی بتوانێ دە هاوارەوە بێ، کردەوەی چاک و خواپەسەندانەیە، ئەویش لە سەر ئەساسی ئیمان و باوەڕی بە خودایە.

تا ئێرە نەقڵکاری بوو، واتە مانای ئایەتەکە بە تێر و تەسەلی. ئەوجار بەجێیە ئاوڕێک وەسەر ئەقڵ وەدرێ لەو بارەوە چونکە ئەقڵیش بەشێکە لە دەلیل و بورهانی عیلم و زانست.

ئەقڵ: ئایا ئەقڵ بە ڕەوای دەزانێ دەستەو داوێنی زیندووان یان مردووان بۆ پێگەیشتن بە قازانج یان لابردنی زەرەر لە سەر شان لە دنیا یا قیامەت؟ قازانج یان زەرەر لە مردوو چاوەڕوان ناکرێ لە هیچ لاوە، ئەوە بێگومانە، چونکە مردوو بێ هەست و خوستە، نە دەبینێ و نە دەبیسێ.

زیندوو: کە مەرکەزی خێر و شەڕە، دەتوانێ بە شێوەی عورف و عادەت، هەم قازانج بدا بە غەیر، هەم زەرەر بگەیێنێ بە غەیر، ئەمما سەربەخۆ نییە لەو بارەوە؛ واتە عامیل موئەسیری با ئیستقلال نییە، ئەوە بۆ دنیا؛ ئەگەینا بۆ قیامەت هیچ کەس خاوەنی هیچ نییە جوز خودا و عەمەل.

ئەو وەسیلەی کە دە ناو ئایەتی ۳۵ی مائیدەدا دەس نیشان کراوە بۆ گەیشتن بە تەقوا یا بڵێین بە خودا، کە تەقواش هەر گەیشتن بە خودایە، بێگومان عیبادەتە واتە ئەنجامدانی ئەحکامەکانی باری و چاکە و چاکەکاری یانی ئەعمالی سالح: عەداڵەت، ئینساف، بەزە، بەخشش، لێبوردن، ڕازداری، ئەمانەتداری، پارازتنی مافی خاوەن مافان.

وهەروا بە پاڵدانەوە بە ئایەتی ۱۱۹ی تەوبە دەتواندرێ بە ڕەفاقەتی ڕاستان ڕاستی وەدەس بێندرێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ الصَّادِقِينَ﴾ **ئەی خاوەن ئیمانان! خۆفوو هەبێ لە خودا و دەگەڵ ڕاستانیش بن.** ئەو دەستووره واتە بوونتان دەگەڵ ڕاستان، ئامـاژە وەلای ئەوەی دەکـا ڕاستی ڕاستیان تەئسیری هەیە بۆ ڕاستبوون، یانی خاوەنی ڕاستی ناتوانێ ڕاستەوخۆ ڕاستت کا، بەڵکە دەگەڵبوونی ڕاستیەکەی دەتوانێ هەستت هەستێنێ بەرەو ڕاستیت بەرێ. خـۆ دیـارە ئەو دەگەڵبوونەش لە تۆوە سەرچاوە دەگرێ. بە کوردی و بە کورتی، کەس نـاتوانێ کەس چـا کا، دەبێ هەر کەس بۆخۆی خۆی چا کا لە ڕێی بەراوەرد و ئەقـڵ و شـعوور. هەروەک ئـایەتی ۱۱ی ڕەعد تەئیدی ئەو بابەتەی دەکا: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾ **خودا حاڵ و ئەحواڵ و وەزعی هیچ گەل و هۆزێک ناگۆڕێ (لە خۆشبەختی بۆ لای بەدبەختی، یان لە نەزانی بـۆ لای زانیاری، یان لە زیللەت بۆ لای عیززەت، یا لە نۆکەری بۆ لای سەروەری، و پێچەوانەشی) مەگین بۆخۆی ئینسان بیگۆڕێ،** ئەزەل ئەو نیزامەی تەنزیم کردووە، هۆیەکەشی ئیختیارە کە داویەتە ئینسان.

## لە سەر تەوەسول

زانایانی سەلەفی و زانایانی نەجدی دەگەڵ زاناکانی ئێمە دەمەقاڵێ و مشتومڕیانە لەسـەر تەوەسول بە مردوو. سەلەفییەکان تەوەسول بە مردوو بە شیرک دادەنێن، بەڵام ئەهلی سوننەت و جەماعەت تەوەسول بە مردوو بە شیرک نازانن، پێشیان وایە ئەوانەی بە شـیرکی دەزانـن زانـای دێوبەندن، زانا دێوبەندەکان تەوەسول بە سێ جۆر چاو لێ دەکەن:

## سێ جۆر تەوەسول

۱. هێندێک پێیان وایە تەوەسول بە مردوو هێز دەخاتە ناو دەروونەوە، ئەو هێزە دەتـوانێ تـا ڕادەیەک نیـازی هـاوارکەر بەرەو ئەنجـام بێنـێ. دیـارە ئەو تەرزە بۆچـوونە بـۆ زانایـانی ژێـری خوداناسی شیرکە چونکە دەزانن موئەسیری سـەربەخۆ خـودایە و بەس، هێـز و تـیندەر تەنیـا خودایە.

۲. هێنـدێک پێیـان وایە مردوویەکـی کـاتی خـۆی زۆر دە خزمەتـی باریـدا بـووبێ و ئەو خزمەتکارییەش پەسندی خودا و خەڵقی خـودا بـووبێ، بە هـۆی ڕۆحـی پـاک و خـاوێنی کە ڕۆحیشی بەخەبەرە لە خودا وەپاڕێ نیازی نیـازخوازی بێنێـتە جـێ. ئەو هێنـدەش دە هەڵەدایە، چونکە مردوو نابیسێ و نابینێ و ڕوحیشی ئەگەر دەکوترێ نامرێ بەو مانایە نییە دەتوانێ کاری

زیندووان بێنێتە جێ. بەڵکە بەو مانایەیە ڕوح پـاش جیـابوونەوەی لە لەش وەک لەش نـاکەوێتە عالەمی فەنا. بەڵکە هەر هەیە کەیفیەتی ئەو بوونەش خودا دەیزانێ.

٣. هێندێکیش هەن حەکیمانە بەرەو قەزیەی تەوەسـول ڕۆیشـتوون ئەگەرچـی سـوورن لە سەر ئەوەی، ئەوەی دەتوانێ زەرەر یا قازانج بێنێتە جێ تەنیا و تەنیا خودایە و ئەوەی ئاڵوگۆڕی بە دەستە، تەنیا و تەنیا هەر خودایە. ئەمما بۆ بەرگری لە پرژ و بڵاو بوونی ئینسـانی، بەڵـکە بـۆ یەکپارچەیی و پێکەوە بوون هێندێکی لە عەبدان کردۆتە مەرکەز بۆ پاڵ وێدان وەک پێغەمـبەران و چاکان و خاسان کە ڕەهبەریەتی ئینسانیان وەئەسـتۆ گرتـووە. تەوەسـول بەو جـۆرە کەسـانە لەمەڕ توند و تۆڵی و پتەوکردنی ئەقیدە، بە شیرک نەژمێردراوە چونکە تەوەسول بەوانە بەو مانایە نییە ئەوانە دەتوانن ڕاستەوخۆ نیازی ئینسانی بێننە جێ، بەڵکە تەوەسول بەوانە بۆ کەسـبی ورە و هیممەت و شەجاعەتە چونکە هەمیشە یاری ئازا و چاک و پاکان بەری هیممەت و شەجاعەت و کەرامەت دەڕوێنێ لە ناو دەروون. دیارە دەروونیش سەرچاوەی مرادانە.

زانای پایەبەرز ئەشـرەف عەلـی تەهـاونی لە سـەر ئـایەتی ٨٩ی بەقەرە ئـاوای نەزەر داوە: ﴿وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُواْ ...﴾ پێش ئەوەی ئایینی ئیسلام بێت، جوولەکەکـان کاتێ ناکۆکییان دەگەڵ بتپەرەستەکان بۆ دەهاتە پێش، بە بتپەرەستەکانیان دەکوت بەو زووانە پێغەمبەرێک دێ ئێمەش زوو دەچینە ژێر ئیتاعەی و ئیمانی پێ دێنین، ئەوکاتە بە سەرتاندا سـەر دەکەوین. ئەو گوفتارە ئەوە دەنوێنێ و ئەوە نیشان دەدا چاکان و پاکانی ناودار ڕێبەری هەست و ورە و غیرەت دەکەن بۆ ڕاپەڕین بەرەو ئامانج و نیـاز. دیـارە حەزرەتـی مـحەمەدﷺ لە گۆڕێـدا نەبووە کە ئەوان ئەوەیان کردۆتە گورز و داویانە لە دوژمن و ئەو لە گـۆڕێ نەبـوونەی مـحەمەد وەک مردوو وا بووە، بەڵام نە ناوداری دەمرێ نە چاک و پاک و خاسی مرۆ دەمـردن، هەمیشـە زیندوون و دە ڕەهبەرییەتدان. (تفسیر تبیین القرآن، ج ٣، ل ٤٧)

سووکەئاوڕێک وەسەر ﴿يُنَزِّلُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ عَلَى مَن يَشَاءُ﴾ ناو ئـایەتی ٩٠: دێـرەدا هەسـت دەکرێ بە تەواوی، بەخشینی فەزڵ و کەماڵات بە ئینسانی لە لایەن خـوداوە لە فەزڵـی تـایبەتی خودا نە لە بەر تێکۆشان و زێدە عیبادەتی عەبدە.

پێش ئەوەی بچینە خزمەت ئایەتی ٩١ی بەقەرە، دەچینە لای بابەتی نازڵبـوونی ئـایەتەکە، گۆیا چەند نەفەر لە هۆزی ئەنسار، ڕۆژێکی دەگەڵ چەن نەفەر لە هۆزی یەهوود، کە زانـایەکی ئایینیان «واڵە مەلا» دەگەڵ دەبێ ئەنسارییەکان لە سـەر ئەساسـی ئیسـلامەتی خۆیـان دەکەونە

پەنددانی یەهوودییەکان بەو شێوەیە: دەڵێن پێیان ئێستێ وا دیارە ئیسلام پەرەی ساندووە، بەشێکی بەرچاوی لە عالەم وەشوێن خۆ خستووە، ئێوە بۆچی هەر دووری لێ دەکەن؟ دەگەڵ ئەوەی ئێوە زۆر زیاتر لە خەڵکی لەو دینە حاڵی‌ترن و دەزانن کە حەقە چونکە لە کتێبەکەی خۆتان واتە تەورات باسی لێوە کراوە. جا بەو پێیە لەوە ناوە شێتەوە تێنەگەن بەڵکە ئەوەی لێ دەکاڵێتەوە کە بە توندی پاڵی وێدەن و دەستی تێ بگرن وەک ئێمە. زانا یەهوودیەکە لە وڵامدا دەڵێ: وتار و گوفتاری تۆ دەگەڵ ئەقڵ و بۆچوونی مە نایگرێتەوە چونکە ئێمە خاوەنی پێغەمبەرێکی ساحیب ئۆمەت و شەرعین وەک حەزرەتی مووسا بێ و ئایینەکەش هەتا هەتایە بۆ مە، جا کەوایە چۆن لە سەر ئەو پێغەمبەرەماندا وەرگەڕێین و ئیمان بە کەسێکی بێنین، ئەو کارە ناڕەوایە قەبووڵ کردنی لە لایەن ئێمەوە بە دوورە. جا لە سەر ئەو نیەتە ناچاک و نادروستەی یەهوودییان، خودای مەزن هەروەک لە ڕابردوودا سەرکۆنەی سەروەری یەهوودییانی کردووە، دێرەشدا واتە ئایەتی ۹۱ی بەقەرە دووبارە بە تەواوی لاساری یەهوودیان دەخاتە ڕوو.

**﴿٩١﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُواْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُواْ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرونَ بِمَا وَرَاءهُ وَهُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقاً لِّمَا مَعَهُمْ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنبِيَاء اللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنْتُم مُّؤْمِنِينَ**

**ئەگەر بەوانە بکوترایە: باوەڕ بە قورئان بێنن دەیانکوت: باوەڕ بە ئی خۆمانە کە تەوراتە و بۆخۆمان هاتووە، ئیتر جگە لە تەورات باوەڕمان بە هیچی دی نییە و نابێ (وەک قورئان بێ)، کە دەڵێن حەقە و ڕاستە و تەسدیقی تەوراتیش دەکا، هەروەک تەورات ڕاستی ئەوی نیشان داوە. ئینجا خودای بەحەق و بێ‌هاوتا بۆ وەدرۆ خستنیان دەفەرموێ بە پێغەمبەر، پێیان بڵێ: جا کەوایە هێندە ڕاستن و بەئیمانن؟ بۆچی لە ڕابردوودا پێغەمبەرەکانتان دەکوشتن؟**

دەبێ ئەوە قبووڵ کەین ئەو وڵامەی خودا واتە ﴿قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنبِيَاء اللَّهِ مِن قَبْلُ﴾ دەمکوت کردن و هەس‌دانەوەیەکی تەواویانە، چونکە ئەوان داوای ئەوەی دەکەن کە لە پێشدا بە پێغەمبەرەکان باوەڕمان هێناوە و شوێنیان کەوتووین، کتێبەکانیشمان تەسدیق کردووە، جا بۆیە خودا بۆ لە دمدانیان بە پێغەمبەرەکان دەفەرموێ: «لێیان پرسیار کەن ئەگەر بەڕاستی ئاوا شوێن‌کەوتووی پێغەمبەرانن، ئەدی بۆچی لە پێشدا دەوکوشتن و دووریو لێ دەکردن؟ دە حاڵێکدا دە ناو کتێبەکانتاندا وەک تەورات بێ و ئینجیل و سوحوفیش کوشتنی بە ناحەق نەهی کراوە بەتایبەت کوشتنی پێغەمبەران، ئەدی بۆچی دەوکوشتن؟

ئەو گوفتارە ناڕەوایەی جوولەکەکان ئاماژە بەوەیە کە بەنی‌ئیسرائیل ئێستێش واتە دەورانی

حەزرەتی محەمەدﷺ هەر هەمـان هەڵوێسـتیان هەیە و لایـان نەداوە لە شـوێنی ڕابردووانیـان. بۆیەشە بە شوێن کوشتنی حەزرەتی محەمەددا دەگەڕێن.

## ئاوڕدانەوەیەک

وا هەست دەکرێ لە سیمای ئەو ئایەتە (٩١) کە بە شێوەی لۆمە و سەرزەنشت ئاوڕ وەسەر ئایەتی هەوەڵیش دراوەتەوە چونکە لە ئـایەتی هەوەڵ کـرداری یەهوودییـانی مـونکری قورئـان خرایە بەر باس، کە دووری کردنیان بوو لە قورئان و محەمەد و ئیسلام؛ جـا هەر بـۆیە لێرەشـدا واتە ئایەی ٩١ بە توندی شەرمەزار دەکرێن کە خودا دەفەرموێ بە پێغەمبەران: پێیان بڵـێن ئەگەر ڕاست دەکەن خاوەن ئیمانن. بۆچیو پێغەمبەر دەکوشتن و هەتکی حورمەتوو دەکردن؟

کاتی ئەوەی هاتووە بچینە خزمەت ئایەتی ٩٢ کە خودای تەعالا تونـدتر و ڕوونـتر کـردارە ناحەزەکانی یەهوود دەخاتە بەر باس و درۆکانیان بە چاودا دەداتەوە.

**﴿٩٢﴾ وَلَقَدْ جَاءكُم مُّوسَى بِالْبَيِّنَاتِ ثُمَّ اتَّخَذْتُمُ الْعِجْلَ مِن بَعْدِهِ وَأَنتُمْ ظَالِمُونَ**

**«ئێوەی جوولەکە پیشەتان هەر لاساری و خراپەکاری بووە» ئەوە بـووە کە ئـێمە مووسـامان بە چەن موعجیزەیەکی ڕوون و ئاشکرا ناردە لاتان، ئەویش دەستووری دانێ: کە لە خـودا بەولاوە کەسی دی نەپەرەستن و دوای نەکەون، کەچی پاش ئەوەی مووسا لێتان دوور کەوتەوە، ئێـوە وەرگەڕان و ڕووتان کردە گوێرەکە پەرەستی و ستەمتان لە خۆ کرد.**

## تێڕوانینێک لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ٩٢

پێشەکی پێویستە بزاندرێ خودا مەبەستی لە «بیّنات» چییە؟ ئایا دەبـێ مەبەسـت دەلیـل و بورهان بێ لە سەر بە یەکزانینی خودا (واتە تەوحیـد)، یـا مەبەسـت لە «بیّنـات» مـوعجیزاتی نۆگانەی حەزرەتی مووسا بێ کە خودا دە ئایەتی ١٠١ی ئیسـرادا ئاماژەی وەلا فەرمووە: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ﴾ واتە دامان بە مووسا ٩ نیشانە و دەلیلی ڕوون و ئاشکرا، نۆ نیشانەکان: عەسا، مەنن و سەلوا، تۆفان، سایەبان، کولۆ، قەڵشـینی بەحـر، ئـاو هەڵقـوڵین لە شـاخ، یەد و هەروا ...

دەشکرێ هەر دوو مەبەستەکان واتە تەوحید و نۆ موعجیزەکانی مووسا دە نەزەر بگیردرێن لە وشەی «بیّنات»، چونکە هەر کامێکیان قەست بکرێ، زەرەر بە مانای ئایەتەکە ناگا.

دووبارە ئاوڕ وەسەر لۆمەی خودا لە سەر یەهوود لەمەڕ شکاندنی پەیمان و سەرپێچییان لە

ئەمر و دەستووری باری کە ئەو خۆ بادانەیان لە دەستوور هۆی سابیت بوونی بێباوەڕی و بێئیمانییانە. جا بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٩٣ی بەقەرە، دەگەڵمان بن.

**﴿٩٣﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ خُذُواْ مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاسْمَعُواْ قَالُواْ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَأُشْرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ الْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُمْ بِهِ إِيمَانُكُمْ إِن كُنْتُمْ مُّؤْمِنِينَ**

**بیرەکەن لەو کاتەی کە پەیمانی خوداپەرەستی و شوێنکەوتنی تەوڕاتمان لێ وەرگرتن، بۆ ئەوەش بە موعجیزەیەک کێوی توورمان بە سەرتاندا بەرز ڕاگرت و دەستوورمان پێ دان کە بەوپەڕی هێز و توانایی ئەوەی بۆمان ناردوون وەریبگرن و گوێی بدەنێ کەچێ ئێوە بە زمانی حاڵ کوتتان: بیستمان، بەڵام بە کردەوەکانتان یاخی بوون و پەیمانەکەی خوداتان تێکشکاند. ئەوانە بە هۆی بێباوەڕییانەوە و ئارەزووی گوێرەکە پەرەستی کە تێکەڵ بە ناو دڵ و دەروونیان بوو «نایەنە ڕێدایە» ئەو جەریانەش لەو کات و دەورانەدا بووە کە لە میسردا ژیاون.**

چەن بەراوەرد و بۆچوونێک لە سەر هێندێک واژە و جومەلات لە ناو ئایەتەکە، مەسەلەن: واژەی (بِقُوَّةٍ وَاسْمَعُواْ) واتە بەوپەڕی هێزی ئیمانەوە دوور لە بێمبالاتی و سستی (وَاسْمَعُواْ) یانی بەهەستێکی قبووڵ کردن و ئیتاعەوە. هەروا جوملەی (قَالُواْ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا) یانی بیستن بەڵام ئیتاعەمان لێ نەکرد. ئەو جۆرە وڵامانە ئەوە نیشان دەدەن: ئەوانەی کاتێ کێوی تووریان بە سەرە خۆوە دەدی لە ترسان دەیانکوت: بەڵێ بیستمان و قبووڵیشی دەکەین بەڵام کاتێ کێوی توور لە سەریان لادەچوو، ترسیشیان لە سەر لادەچوو و ئەودەم بەوپەڕی بێشەرمی و بێئەدەبی بە مووسایان دەکوت: دەستووراتی تەوڕات هێندێکیان زۆر سەختن بۆمان جێبەجێ ناکرێن. چونکە لە تواناماندا نییە. جا ئەو جۆرە ڕەفتارانە ئەوەی لێ دەوەشێتەوە: یانی بە گوێی سەر بیستمان سادە و سەرسەری، بەڵام بە دڵ وەرماننەگرت بۆیە سەرپێچییان لێ کرد بە عەمەل و کردار.

و هەروا جوملەی (وَأُشْرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ الْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ) دیارە (أُشْرِبُواْ) بە مانای ئاو خواردنەوە و پاراوبوون لە ئاوە،بەڵام مشتومڕ لەو بارەوە هەیە لە مابەینی زانایانی قورئان و بەو نەتیجەش گەیشتوون کە ئەو بە مەجازە واتە عیشقی گوێرەکە پەرەستی دڵی پاراو کردوون بە جۆرێکی وا کەڕیشەی بێ باوەڕی دە ناو دڵیاندا شین کردووە، چونکە ڕیوایەت هەیە لەو بارەوە:

کاتێ گوێرەکەکە بە دەستووری حەزرەتی مووسا سووتێندرا و خۆڵەکەی بە ئاوی دەریـادا درا و وەرکرا، ئەوانەی باوەڕیان پێ هێنابوو لە عیشقی گوێرەکە لە ئاوەکەیان دەخواردەوە. لە خۆشیان ڕوخساریان زەرد و سوور دادەگیرسا. دەشکوترێ گۆیا دەبێ مووسا پێی کوتبن لەو ئاوە وەخۆن تـاکوو دەرکەوێ ئەوانەی کە باوەڕیـان بـووە بەو گـوێرەکەیە، دەشـکوترێ ئەوانەی کە ئـاوی دەریاکەیان دەخواردەوە وردە مـرواری و زێـڕ لە زاریـان هەڵـدەوەری. بـۆ زێـدە زانـین ڕوو کە تەفسیری ئیبنی کەسیر، ج ١، لاپەڕەی ١٢٦. ئیمام قورتوبی ئەوە ڕەد دەکـاتەوە و مانـای ئـایەتی (وَأُشْـرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ الْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ) ڕووی پێ دە مەجاز دەکا، وەک ئامـاژەی وەلا کـراوە لە جێی خۆیدا.

وشەی (إنْ) کە دە جوملەی (إِن كُنْتُمْ مُّؤْمِنِينَ)دا هاتووە دە یاسای عیلمی نەحودا (إنْ) بـۆ مەقامی گومان و شک دابەزێنـدراوە وەک خـاوەنی کەششـاف ئیشـاڕەی وەلا کـردووە. دیـارە ئەودەم مانای ئایەتەکە ئاوای لێ بەسـەر دێ: ئەگەر ئێـوە بەڕاسـتی خـاوەنی ئـیمان و بـاوەڕن بێگومـان ڕەدی ئەو ئیـدیعایە دەکـاتەوە، ئەو کارانەتـان کە بە پـێچەوانەی یاسـا و دەسـتووری بارین، دەشیانکەن. هێندێکیش لە سەر (إنْ) ئاوایان نەزەر داوە کە (إنْ) بۆ نەفیە، ئەوکات مانای ئایەتەکە ئاوای لێ بە سەر دێ: (ما كُنْتُمْ مُّؤْمِنِينَ) واتە ئێوە کە داوای ئیمانتـانە، درۆیە؛ خـاوەن ئیمان نین.

دەمهەوێ ئەوە ڕاگەیێنم کە لە سیمای ئایەتەکـانی تـایبەت بە یەهوودییەکـانی بـێئیمان و باوەڕ، ئەو هەستە دەکـرێ بە ڕوونـی کە خـودای تەعـالا بـۆ ڕاسـت و درۆی هـۆزی یەهـوود مەیـدانێکی تـاقی کـردنەوەی ڕەوان و سـادە دەخـاتە ڕوو، بـۆ نمـوونە خـودا دەفەرمـوێ بە پێغەمبەری: ئەتۆ بەوانەی کە دەڵێن دنیای ئاخرەت بۆ ئـێمەیە تەنیـا بـۆ کەسـی دی نیـیە، ئەگەر ڕاست دەکەن و ڕاستن دە گوفتاریاندا، دەبـا داوای مەرگ بـکەن لە خـودا تـاکوو زۆر زوو بەو ئاواتە ڕاستیەی خۆیان بگەن و لە دنیای بێ بەقـادا نەجـات و ڕزگاریـان ببـێ، بچـنە بارەگـای ڕەحمەتـی بـاری. جـا خـۆ دیـارە و حاشـای لـێ نـاکرێ چـاک دەزانـن درۆیە دەکەن بەشـی ئاخرەتیشیان ڕووڕەشی و سەرشۆڕی دیوانی خودایە. هەرگیز داوای مەرگ نـاکەن، و خـوداش بێگومان ئاگایە بە نیەت و هەستی ناو دەروونیان. کە بەڕاسـتی بێـزار لە مەرگـن و حەزیـان لە دنیایە. ئەوانە دەیانهەوێ بە زمانێکی ئاڵتاغ و ڕوخسارێکی جـادووگەرانە خەڵـک هەڵخەڵەتێـنن بەڵام بێگومان خەیاڵ خاون و خۆیان فریـو داوە کە دەڵـێن: ﴿نَحْـنُ أَبْنَـاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّـاؤُهُ﴾ ﴿١٨﴾

«مائدة» واتە جوولەکەکان و دیانەکان دەیانکوت ئێمە کوڕی خوداین و خۆشەویستی ئەو. یا دەڵێن ﴿وَقَالُواْ لَن يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلاَّ مَن كَانَ هُوداً أَوْ نَصَارَى﴾ ﴿١١١﴾ «بقرة» هەروا جوولەکەکانی بە خەیاڵ خاوەن ئیمان دەیانکوت: لە ئێمە زیاتر کەسی دی ناچێتە بەهەشت، خۆ دیارە ئەو خەیاڵاتە زڕە خەون و ئاواتی بێ ئەساسن چونکە هەڵقولاوی دەروونی خۆیانن.

جا ئەوەیە هۆ کە خودا دەمکوتیان دەکا بە وەسیلەی کەلامی خۆی بە زمانی پێغەمبەر کە دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ، کوڕی نین خودا، تا ئێوە کوڕی بن؛ وەهەروا خۆشەویستی خوداش کەسانێکن کە خودای بە تاک و تەنیا دەناسن و سەرپێچیش لە فەرمانی ناکەن.

کاتی ئەوەی هاتووە کە بچینە خزمەت ئایەتی ۹۴ی بەقەرە کە لاساری و بێئیمانی و باوەڕی گەلی بەنیئیسرائیل نیشان دەدا:

﴿٩٤﴾ قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ الدَّارُ الآخِرَةُ عِندَ اللّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ النَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ

**ئەی محەممەد! هەروەها پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن کە دەڵێن مەنزڵگەی خۆشی و کامەرانی دوارۆژ هەر بۆ ئێمەیە و بۆ کەسی دی نییە، دەی مادام وایە وەرن مردن داوا بکەن تاکوو زووتر بگەنە ئاواتتان کە ئەو جێگە پڕ لە ناز و نیعمەتەیە.**

## ئاوڕێک وەسەر ناوەرۆکی جوملەی (فَتَمَنَّوُاْ الْمَوْتَ)

دیارە کەسێک دەتوانێ لە مەرگ نەترسێ و داوای بکا کە مزگێنی ڕەحمەت و بەهەشتی پێ درابێ پێش مردن و جانتاشی پڕ لە تێشووی ڕۆژی دوایی بێ. ئەگەرچی داوای مەرگیش نەهی لێ کراوە لە لایەن پێغەمبەرەوە. تەنانەت لە ڕۆژی سەختی و تەنگانەشدا، بەڵکە دەبێ بڵێ: اَللّٰهُمَّ أَحْيِني ما كانَتِ الْحَياةُ خَيْراً لي، وتَوَفَّني إذا كانَتِ الْوَفاةُ خَيْراً لي: واتە خودایە با ئەو کاتەی ژیان بۆ من خێرترە وەمهێڵە بەڵام کاتێ مەرگ و نەمان بۆ من خێرترە بممرێنە. ئەگەر هەڵسەنگاندن و بەراوەردێک بێتە جێ لە نێوان ئەو ئایەتە و ئەو حەدیسە، ئەوە هەست پێ دەکرێ: ئایەتەکە دەڵێ داوای مەرگ بکەن ئەگەر ڕاست دەکەن، دەگەن بە ناز و نیعمەت. وەهەروا حەدیسەکە نەهی لە داوا کردنی مەرگ دەکا لە تەنگانەشدا بێ. ئەو دوو قسەیە دژایەتییان دە نێواندا چاو دەکرێ کە دەبێ واش نەبێ واتە حەدیس بە دژی ئایەت نەوەستێ.

**وڵام:** بۆ لابردنی ئەو ئیشکالە دەبێ بکوترێ: داوای مەرگ لە سێ ڕێگاوە دەکرێ هەبێ:

١. دیارە لە کاتی تەنگانەدا و بێچارەییدا ئێش و ئازار وا هێرش دەکەنە سەر گیان، نەمان بە سەر ماندا تەرجیح دەدرێ، ئەوەش نیشانەی ئیمانی لاواز و بێهێزە.

٢. هێرشی بێشەرمی و بێحەیایی ملّکی حەیا و ئیمان تالّان دەکەن ئەوکات چارە بۆ ئیماندار نامێنێ بەجوز ئەوە بڕوا و نەمێنێ تا بێعیزەتی و زیللەت چاو نەکا.

ئەوەش چاوەڕوان دەکرێ: ئەو جوولەکانە یاخی و سەرەڕۆ داوای مەرگ دەکەن تاکوو زوو بگەن بە خۆشی و حەسانەوە بە خەیاڵی خاوی خۆیان؟ وەیا لە بەر سەرلێشێواوییان نازانن چ بڵێن و چ بکەن؟ بۆ وڵامی ئەو داوایە دەچینە خزمەت ئایەتی ٩٥:

﴿٩٥﴾ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ

**ئەوانە هەرگیز داوای مەرگ ناکەن و بە ئاواتی ناخوازن، چونکە باش دەزانن چییان دە جانتایدا نییە، بێ تێشووش هیچ ڕەحمەتێک بەرناکەوێ، و خودا زانا و ئاگایە بە حاڵی ستەمکاران.**

**ئاوڕدانەوەیەک:** ئەو جوولەکانەی داوای مردن ناکەن ئایا ئی دەور و زەمانی حەزرەتی مووسا و عیسان؟ یا ئی دەورانی حەزرەتی محەمەد المصطفان؟ لە سیمای ئایەتەکان و ڕاوێژی نازڵ بوونیان وا دەردەکەوێ ئەو جوولەکانەی خودا وەدرۆیان دەخاتەوە، دەکرێ ئی هەر دوو دەوران بن واتە دەوری مووسا و عیسا و دەوری محەمەدیش.

وەک دیارە و چاو دەکرێ: تێمان و دامانی یەهوودییەکان لەمەڕ داوا نەکردنی مەرگ دەکرێ ئەوە بێ کە نازانن پاش مەرگ چییان بە سەر دێ، دەشترسن لەوەی کە یاخی و سەرەڕۆن، جێگایان لە ڕۆژی ئاخرەتدا هەر جێگای یاخی و لاساران بێ کە ئەویش دۆزەخە. بەڵام شتێک هەیە بە سەر داپۆشراوی، دەبێ پەردەی لە سەر لادەین، ئەویش ئەوەیە: یەهوود بێ باوەڕ و ئیمانن بۆیە ناتوانن ئیتمینانیان بێ لە حەسانەوەی دواڕۆژ. بۆیە داوای مەرگ ناکەن، کەوابێ دەبێ خاوەن ئیمان و باوەڕ بە ئیتمینانەوە حەسانەوەی پاش مەرگی هیوا بێ و بەش بێ. جا کەوایە ئەگەر یەهوودییەکان بە خاوەن ئیمانەکان بڵێن دە ئێوە داوای مردن بکەن تاکوو زوو بگەن بە خۆشی و حەسانەوە، داوا دەکەن یان ناکەن؟

دە وڵامدا دەبێ ئەوە بکوترێ: خاوەن ئیمان ڕێی پێ نەدراوە داوای مردن بکا تەنانەت لە کاتی سەختیشدا، چونکە دەشزانێ بەهەشت بۆ وی ڕازاوەتەوە و وەعدەی خودایە، لە بە نەسیب بوونێدا خاترجەمە چونکە وەعدەی خودا بێگومانە، کەوابێ دەبێ مانەوەی زۆری لە دنیادا بۆ بەرهەمی چاکە و چاکەکاری کە ئەویش بۆ کەماڵی پاداشی بەهەشتە، ئاوات بێ.

دەبێ ئەوە بزاندرێ: دز و درۆزن لە دادگا دەترسێن چونکە دیفاعیـان پـێ نیـیە. یەهـوودی ناپاک و بێباوەڕ بۆیە پێیان خۆشە زۆر لە دنیادا وەمێنن، ئەولایان دۆڕاندووە و نیـانە، نایـانەوێ لە دنیاش ببن، ئەوەیە خودای تەعالا لێیان لە هەڵلا دەدا و ئەوەی دەناو دڵیاندا حاشاریان داوە و نایڵێن، خودا ئاشکرای دەکا لێیان.

دەچینە خزمەت ئایەتی ٩٦ بۆ ئەو ڕاستییە:

**﴿٩٦﴾ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَى حَيَاةٍ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ**

**ئەو جوولەکانە لە هەموو کەس زیاتر دڵیان بە ژینی دنیا خۆشە و هەڵـپەی بـۆ دەکەن، بگـرە لە بتپەرەستەکانیش زیاتر؛ چونکە باوەڕیـان بە زینـدووبوونەوەی نیـیە، هەربۆیەشـە هەرکـام لە جوولەکەکـان بە ئـاوات دەخـوازن کە هەزار سـاڵ تەمەن کەن و بـژین، بەڵام دەبـێ ئەوەش بزاندرێ زۆر ژیان و تەمەندرێژییان لە سزای ڕۆژی ئاخرەتیان نەجـات نـادا، خـودا زۆر بینـا و ئاگایە لە هەموو کاریاندا.**

ئاگادارییەک لە سەر و سیمای ئایەتی ٩٤ی بەقەرە ﴿قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ الدَّارُ الآخِرَةُ عِندَ اللَّهِ خَالِصَةً﴾ وا هەست پێ دەکرێ: ئارەزووی مردن واتە گەیشتن بە لیقای باری نیشـانەی ولایەت بێ. (بیان القرآن، ج ١، ل ٥٦.)

## بۆ ئاگاداری

گۆیا لە «ابن ابی شیبه» و «ابن ابی حاتم» نەقڵ دەکەن لە شـەعبی، کە ڕۆژێـک حەزرەتـی عومەر لە شاری مەدینە دەچێـتە یەکێـک لە زانسـتگاکانی یەهوودییـان لەوێ دەگەڵ یەکێـک لە زاناکانی یەهوود دەکەوێتە باس لەمەڕ حەزرەتی جبرەئیل و میکائیل کە تەوڕات لەبـارەی وانـدا چی کوتووە و ڕایناوە؛ یەهوودییەکان و زاناکەشیان دە جوابی عومەردا دەڵێن: ئێمە لە جبرەئیـل بێزارین لەبەر ئەوەی بە کارەکانمان هەڵدەوێسـتێ و ڕاپۆڕتمـان لـێ دەدا بە مـحەمەدﷺ، بەڵام میکائیل کە وڵات ئاوەدان دەکاتەوە خۆشمان دەوێ. حەزرەتی عومەر لەو جەریـانە نـاڕەحەت دەبێ و دەڵێ: پێیان تەوهین بە تەوڕات دەکەن کە شتی وای بۆ هەڵدەبەستن. چونکە شـتی وای تێدا نییە. ئایا ئێوە مەقام و مەنزڵەتی جبرەئیل و میکائیل دەزانن، خودا چۆنیان وەسـف دەکـا لە تەوڕاتدا؟ یەهوودییەکان کوتیان: جبرەئیل وەزیری لای ڕاستی خودایە و میکائیل وەزیـری لای

چەپیەتی. لەو ڕووەوە ناکۆکییان دەگەڵ یەک هەیە. حەزرەت لەو گوفتارە تەوهینە خۆشی نایە و دێتە جواب: پێیان دەڵێ جا چۆن ئەو دووانە دەکرێ ناکۆکییان پێکەوە هەبێ دە حاڵێکدا کە ئێوە بۆ خۆی بە وەزیر بوونی هەرکان ئیقرار دەکەن. مَن کانَ عَدُوًّا لِأَحَدِهِما فَهُوَ عَدُوٌّ لِلّه: واتە هەرکەس بە یەکێک لەو دووانە دوژمن بێ، ئەوە دوژمنی خودایە.

حەزرەت هەڵدەستێ و لە ناویان دەڕوا بەرەو حەزرەتی محەمەدﷺ. وێستا عومەر ناگاتە حەزرەتی ڕەسوول، خودا بە وەسیلەی جوبرەئیل ئاگاداری لەو بارەوە دەداتێ. کاتێ عومەر دەگاتە خزمەت ڕەسوولی پێغەمبەر، پێی دەڵێ: یا عُمَر، وافَقَکَ اللهُ، خودا موافەقەتی قسەکەی کردی. ئەودەم حەزرەتی ڕەسوول ئایەتی ٩٧ی بەقەرەی بۆ دەخوێنێتەوە کە وەحی ڕەسوولی کردووە. عومەر ئەوەندەی پێی خۆشحاڵ دەبێ لە خۆشیان دەڵێ: لَقَدْ رَأَیْتَنی بَعْدَ ذٰلِکَ أَصْلَبُ مِنَ الْحَجَرِ: واتە لەوە بەدوا لە سەر ئیمان توندوتۆڵتر دەبم واتە لە بەرد سەختتر.

ئەوەش سیمای ئایەتی ٩٧ی بەقەرە:

**﴿٩٧﴾ قُلْ مَن كانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللّهِ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ**

جوولەکەکان جبرائیلیان بە دوژمنی خۆ دەزانی، چونکە وەحی بۆ پێغەمبەر دەهێنا. ئینجا خودا لێرەدا بە پێغەمبەر دەفەرموێت:

**پێیان بڵێ هەرکەسێک دوژمنی جبرەئیل بێت لەبەر ئەوەی وەحیت بۆ دێنێت، خۆ جبرەئیل هیچی بە دەست نییە، ئەوەی ئەو دەیهێنێت دەیخاتە نێو دڵتەوە، ئەوە بە ئیزنی خودایە و وەحیە؛ ئەو وەحیەش باوەڕی بە تەوڕات هەیە و مایەی ڕێنومایی و موژدەیە بە ئیمانداران، موژدەی دوارۆژە.**

## واتای جبرەئیل

دڵ دەیهەوێ بزانێ جبرەئیل واتە چی؟ بەشی زۆر لە زانایان جبرەئیل کە ناوێکی غەیرە عەرەبییە بە مانای عەبدی خودا دەزانن، (جبر = عەبد، ئیل = خودا)؛ کوتووشیانە ئەو بۆچوونە لە ڕاستی نزیکە. (روح المعانی، ج ١، ل ٤٥٢)

دەکرێ لەسەر ئەو بۆچوون و بەراوەردە لە مانای جبرەئیل، باقی فریشتەکانی وەک ئیسرافیل، عیزرائیل، حەموئیل هەر ئاوا هەڵسەنگێندرێن و بەراوەرد کرێن. (تبیین القرآن، ج ٣،

ل ٧٤)

هەروا دووبارە چونکە ناوی فریشتە هاتۆتە گۆڕێ، دڵ دەیهەوێ بزانێ فرشتە واتە چی؟ هێندێک لە فەلاسەفەی ڕۆژهەڵات و هەروا تاقمێکیش لە سۆفییەکان پێیان وایە فرشتە بوونەوەرێکی خاوەن زانست و هەستی سەربەخۆ نین، بەڵکە هەر نیشانە و ئیشاراتێکی واقعین، واتە جبرەئیل ئەقڵ و دەرکی تیژ، میکائیل، حەیاتێکی تیژی ئاسمانی شەش؛ ئیسرافیل ڕوحی ئاسمانی ٤؛ عیزرائیل ڕوحی ئاسمانی ٧.

بەڵام عولەمای شەرعزان بۆچوونیان لەمەڕ فرشتە ئاوایە: فرشتە بوونەوەرێکی خاوەن هەستن و خاوەنی کەیفیەتێکی تایبەتی خۆیانن، دەشتوانن بە پێی نیازیان بە هەموو شکڵێک خۆ نیشان دەن. هەڵبژێردراوی بارەگای بارین، بۆ بەڕێوە بردنی کاروباری پێ سپێردراویان چ عیبادەتی چ تەکوینی. ناودارترینیان چوارن: جبرەئیل، میکائیل، ئیسرافیل، عیزرائیل. بۆ زێدە زانین: تفسیر تبیین القرآن، ج ٣، ل ٨١.

## ئاوڕدانەوە وەسەر ڕووداوێک

وەک دەڵێن جارێک حەزرەتی ڕەسوول. عەبدوڵڵای کوڕی سوریا کە یەکێک بووە لە زانایانی یەهوود لە وڵاتی حیجاز، بۆ ئایینی ئیسلام دەعوەت دەکا. عەبدوڵڵاش هەڵوێستی خۆی لەمەڕ ئەو دەعوەتە بەرزە ئاوا نیشان دەدا: گۆیا دەڵێ: تا ئەوڕۆ ئەی محەمەد، ئەوەی چاوەڕوانی دەکەین و دەمانهەوێ تابیعی بین. نەتهێناوە و بۆت ڕەوانە نەکراوە و ئەو ئایەتانەی قورئان کە وا دە لەوحولمەحفووزدان، هەروا لەوێن و نەهاتوونە سەر وەرەق و نەدراون بە کەس تا وەخوێندرێن.

ئینجا خودای مەزن کە دەیهەوێ هەم نوقورچکێکی توند و هەم گورزێکی گران دە تەنیشت و سەر و گوێلاکی عەبدوڵڵای سەرەوێنێ، ئاوڕ دەداتەوە سەر پێغەمبەر بە ناردنی ئایەتەکانی ٩٨ و ٩٩، زەین دەیە بە تەرتیب:

﴿٩٨﴾ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَافِرِينَ

﴿٩٩﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ وَمَا يَكْفُرُ بِهَا إِلاَّ الْفَاسِقُونَ

**هەرکەس بە نیەتی خۆی دوژمنایەتی خودا و ڕەسوول و فریشتەکان وەک جبرەئیل و میکائیل بن بکات با چاک بزانن ئەوانە لە بێباوەڕان دێنە حیساب. خۆ دیارە خوداش دوژمنی**

بێباوەڕانە.

قورئانمان بۆ نازڵ کردووی کە پەڕاوێکی زۆر ڕاست و ڕەوانە و جگە لەوانەی کە لایان داوە لە ڕێی قورئان و یاخی بوون، کەسی دی نییە باوەڕی بە ڕێنومایی و فەرمانەکانی قورئان نەبێت و لادا لێیان، بەڵکە هەر یاخی و لاسارن.

## ئاوڕێک وەسەر (آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ)

دەبێ بزاندرێ ئایا مەبەست لە (آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ) قورئان و موعجیزەکانی پێغەمبەرن یان شتێکی دیکەن؟ دەکرێ بڵێین مەبەست لە (آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ) هەم قورئان بێ هەم موعجیزەکانی پێغەمبەر بێ. وەهروا مەبەستیش لە (فاسقون) کەسانی بێباوەڕ و لاسار و یاخی و بێئیتاعەن.

کاتی ئەوەیە بچینە خزمەت ئایەتەکانی ١٠٠ و ١٠١ی بەقەرە کە هۆی نازڵبوونیان وەک دیارە و هەست دەکرێ دووبارە ناحەزی و ناحاڵی بوونی جوولەکە نیشان دەدەن. گۆیا یەک نەفەر لە یەهوودییەکان بە ناوی «مالک بن صیف» پرسیاری لێ دەکرێ: ئەتۆ بۆچی لەمەڕ ئیمان و باوەڕی بە قورئان و محەمەدﷺ خوار دەڕۆی و خۆت هەڵە دەکەی، دەحاڵێکدا دە تەوڕاتدا بە پێغەمبەرایەتی محەمەد خەبەر دراوە و قەراریشت وا بووە کاتێ محەمەد زهووری بکا ئیمانی پێ بێنی؟ لە وڵامدا دەڵێ: محەمەد هیچ وەعد و پەیمانێکی دەگەڵ من نییە و ئەمنیش هیچ وەعدێکم بەو نەداوە و چەندیش درۆی دی دادەتاشێ. خودای تەعالاش بۆ وەدرۆ خستنەوە و ئەو هەسدانەوە و لە دمدانی درۆزنان، ئەو ئایەتانە حەواڵەی پێغەمبەری دەکا، بە تەرتیب سەیریان کە:

﴿١٠٠﴾ أَوَكُلَّمَا عَاهَدُواْ عَهْداً نَّبَذَهُ فَرِيقٌ مِّنْهُم بَلْ أَكْثَرُهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ

(پاش ئەوەی خودا فەرموودەکانی خۆی ئاراستەی موسوڵمانان دەکات دەفەرموێ:) ئەو جوولەکانە مەگەر هەر ئەوانە نین کە هەر پەیمانێک بدەن ڕووی لێ وەردەگێڕن و پشتی تێدەکەن. بەشی زۆریان باوەڕیان نییە و نایهێنن، پەیمانی دم چیای تووریان نەبردە سەر و شکاندیان، بە زۆری بێئیمانن.

﴿١٠١﴾ وَلَمَّا جَاءهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ اللّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ كِتَابَ اللّهِ وَرَاء ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ

کاتێک کە پێغەمبەرێکمان بۆ ناردن کە باوەڕی بوو بەوەی لە کن وان بوو (وەک تەوڕات بێ)

**بەشێکی زۆر لە گەورە و ماقووڵ و ناودارانیان پشتیان تێدەکرد و دەیانخستە پشت گوێیان. هەروەک ئەوەی ئاگاداری ئەوە نەبن کە تەورات مزگێنی هاتنی ئەو پێغەمبەرەی داوە و تێیدایە کە باوەڕ کردن و شوێن کەوتنی ئەو پێغەمبەرە فەرزە لە سەریان.**

## تێڕوانینی بە وردی لە جوملەی (كِتَابَ اللّٰه وَرَاء ظُهُورِهِمْ)

هێندێک بۆچوونیان ئاوایە: ئەو کتێبەی کە یەهوودییەکان خستیانە پاش گوێیان و ڕوویان لێ وەرگێڕا و تەحویلیان نەگرت، تەورات بوو، چونکە وەعدەیان وا دابوو کاتێ حەزرەتی محەمەدﷺ بێ، ئیمانی پێ دێنن و شوێنی دەکەون؛ کەچی کاتێ زهووری کرد و بوو بە پێغەمبەر لە لایەن خوداوە و پێغەمبەرایەتیەکەی سابیت کرا بە دەلیل و بەڵگەی تەواو، پشتیان تێ کرد و ڕووی باوەڕیان تێ نەکرد، ئەو حاشا کردنی وان دەلیل و بەڵگە بوو کە قورئان حەقە و محەمەدیش حەقە و پێغەمبەرە؛ چونکە قەومی جوولەکە هەرچی حەق نەبا ڕوویان لێ وەرنەدەگێڕا.

هێندێکیش هەر لە یەهوودییەکان پێیان وایە: مەبەست لەو کتێبەی کە خرایە پشت گوێ، قورئانە کە حەزرەتی محەمەدﷺ بۆی هێنان؛ جا دەبایە بەنیئیسرائیلی لە بەر ئەوەی ئەو قورئانە تەوراتی کتێبی وان تەدسیق دەکا باوەڕیان پێی بێ. چونکە تەورات موژدەی هاتنی پێغەمبەری داوە، کەوایە دەبایە زۆر زوو بێ گیر و گرفت بیقۆزنەوە و باوەڕی پێ بکەن. بەڵام دڵڕەش چاوەی دڵی کوێرە، حەق چاو ناکا. حەسادەت و غەرەزیش وەک چڵکە هەور بەری ڕۆژ و مانگ دەگرێ و چاو ناکرێن. ئەوا حەسادەت و غەرەزەش بەری حەق دەگرن چاو ناکرێن. یەهوودیش ئاوان دەگەڵ ئەوەی تەوراتەکەی خۆیان شاهیدی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرە و مزگێنیدەری هاتنیەتی، وێستاش باوەڕ ناکەن، هەر دەڵێی هیچ خەبەرێکیان لە تەورات و ئینجیلەوە پێ نەدراوە.

بەرەو پیری ئایەتی ١٠٢ دەچین کە نازڵ بوونی لە سەر ئیدیعایەکی پووچ و بێبنەمای یەهوودیانە. بە نەقڵ لە «ابن جریر»ەوە گۆیا کاتێ قورئان باسی داود و سلێمان دێنێتە گۆڕێ، یەهودییەکان لەسەر ئەساسی ئیهانە دەڵێن: وەرن ئەی گەل، محەمەد باس لە سلێمانی ساحیر و جادووگەر و دێو و درنج و غوول و با و باران پەرەست دەکا! جا چۆن ئەوە دەڵێ من پێغەمبەرم! سلێمانی جادووگەر ئەوانەی هەموو خستۆتە ژێر فەرمانی خۆی بە هۆی جادووگەری، کەچی ئەو محەمەدە دەڵێ: قورئان باسی پێغەمبەرایەتییان دەکا، ئەوە بۆ وەی نابێ

باوەڕی پێ بکرێ کە دەڵێ پێغەمبەرم.

جا خودای تەعالا لە سەر ئەو تەوهین و هەڵبەستەیان ئـایەتی ۱۰۲ی نـازڵ دەکـا بـۆ سـەر حەزرەتی محەمەدﷺ:

﴿۱۰۲﴾ وَاتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَـكِنَّ الشَّيْاطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولاَ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلاَ تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ

کەوتـــوونەتە شـــوێن ئەو شـــتانە و شـــایەتینی لە زەمـــانی پاشـــایەتی ســـولەیماندا بە ورتە دیانخوێندەوە، سولەیمان خوانەناس نەبووە، شایەتینی خوانەناس بـوون خەڵکیـان فێـری جـادوو دەکـرد، ئەو زانسـتەش کە هـاتبووە سـەر هـارووت و مـارووتی جـووتە فرشـتە لە بابلـدا هەر کەسێکیان فێری جاوو بکـردایە پێشـەکی تێیـان دەگەیانـد ئـێمە هەر بـۆ جەڕبانـدنین نەکەی خودات لە بیر بچێ، هەر هێندەشیان لێ فێر دەبوون ژن و شـوو لێـک جیـا وەکەن، کە توانـای ئەوەیان نەبوو بێ ئیزنی خودا زیان لە هیچ کەس بدەن، فێر دەبوون کە زیان لە خەڵک بدا و بـۆ خۆیان سوودێک نەبێ، دەشیانزانی کرداری یارانی جادووگەری لەو دنیا هیچ بەشیان نییە. ئای ئەگەر تێگەیشتبان دەیانزانی چۆن خۆیان خراپ دەفرۆشن.

## هارووت و مارووت

ئەو جوولەکانەی کە پشتیان دە تەوڕات کردووە و دەستیان کرد بە دوژمنایەتی پێغەمـبەرﷺ و ئیمان و باوەڕیان بەبێ ئیمان و باوەڕی ئاڵوگۆڕ پێ کرد، کەوتنە شوێن فێڵ و فووت و درۆ و دەلەسەی شەیتانی، شەیتانی ئینسان بووە یا شەیتانی پەری بێ، ئەو فڕوفێڵ و چەواشەکاریانەی کە لە سـەردەمی سـولەیمانی پێغەمـبەردا دەکـوتران کە گۆیـا دەسـتەڵات و توانـایی پاشـایەتی سلێمان لەسەر ئەساسی سـیحر و جـادووگەری دامەزراوە و هەر ئاواشـیان دە گـوێی خەڵـک ئاخنیبوو کە سلێمان جـادوویەکی گەورە و بێـڕای دە ژێـر کورسـی دەسـتەڵاتیدا شـاردۆتەوە و ئەنگوستیلەی پاشایەتیەکەی لێ ون بووە و کەوتۆتە دەستی کەسێکی دی، ئەو کەسـەش خـۆی گەیاندۆتە جێگای ئومووراتی سلێمان حوکمڕانی کـردووە. وەهەروا دەڵـێن سـلێمان لە کۆتـایی ژیانیدا بە خاتری خێزانەکانی کە بتپەرەست بوون ئەویش کەوتۆتە خەتی بتپەرەسـتی؛ و زۆر

لەو جۆر و بابەتە درۆ و هەڵبەستە ئیسرائیلیانەی داوەتە پاڵ سلێمان. جا خودای ئاگادار بە سەر هەموو کاروباراندا بە پێی حیکمەتی خۆی بە هۆی ئەو ئایەتەوە ئەو جوولەکە تەوهین‌بازانە وەدرۆ دەخاتەوە و دەفەرموێ: (وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ...) سلێمان خاوەنی ئیمان و باوەڕێکی تەواو بوو، هەرگیز بێ باوەڕ نەبووە و دوور بووە لە جادووگەری. بەڵام ئەوە شەیتانەکان بوون بە ئادەمیزاد و جنۆکەیانەوە، کافر و بێ باوەڕ بوون و خەڵکیان فێرە جادووگەری دەکرد و هەروا فێری ئەو زانستەیان دەکردن کە کاتی خۆی لە شاری بابل کە لە خوارووی عێراقدایە لە نیزیک شاری حلەی ئێستایە، درابوو بە هارووت و مارووت کە ئەو دووانە بە فرشتە ناو دەبرێن، خەڵکیان فێری ئەو زانینە کردووە.

هێندێک لە تەفسیر نووسەکان دەڵێن: پیتی «ما» لە جوملەی (وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ)دا ئیمسی مەوسوولە، واتە: ئەو شتە، جا داخوٚ ئەو شتە زانینە چی بووە بۆ ئەو دوو کەسە دەرخراوە و پێیان دراوە؟ ڕەنگە شتێک بووبێت لە وێنەی سیحردا، وەکوو فاڵ، کە خەڵکی پێ هەڵدەخەڵەتێت، خودا ئەو شتانە بە (أُنزِلَ) واتە ناردنە خوارەوە ناو دەبات، دەشگونجێت لە بەر ئەوە بێت کە شێوە ئیلهامێک بووبێت، یا خۆ ڕێ پێ بردنێک بووبێت کە بۆیان دەرکەوتبێ.

ئەو دوو کەسە بە پێی ئەو جۆرە زانینەیان، خۆیان بە پیاوچاک و لەخودانیزیک پیشان دەدات، خەڵکیش پێیان هەڵخەڵەتابوون و بە فریشتەیان دەزانین و بە ناوی فرشتەوە دەناسران و ناو دەبران. جا لە بەر ئەوە بە فرشتە ناسران و ناو دەرکردنەیان خوداش هەر بە دوو فرشتە ناویان دەبات تاکوو بزاندرێت مەبەست ئەو دوو کەسەیە، ئەوە ڕێک وەک ئەوە وایە کەسێکی بێ قابیلی گەدا لە بەر هەر هۆیەک بووبێت ناوی (پاشا)ی بە سەردا ببڕن، لەو حاڵەتەدا بە ناوی پاشایەتی بانگی نەکەیت کەس نازانێت مەبەستت ئەو کەسە بێ ڕێز و بێ قابیلەیە ... وەک چۆن: ئێستا ئەگەر بگوترێت محەمەدبەهائەدین، پیاوێکی گەورە بووە، ڕەنگە نەزانرێت مەبەست کێیە؟ بەڵام ئەگەر بکوترێت: شای نەقشبەند، پیاوێکی گەورە بووە، ئیتر دەزانرێت باسی چ خوداناسێک دەکرێت.

لە پێشدا کوتمان هێندێک لە تەفسیرنووسەکان (ما)ی (وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ) بە ئیسمی مەوسوول دادەنێن، بەڵام زۆربەی موفەسرین دەڵێن ئەو «ما»یە مای (نافیە)یە و ئیسمی مەوسوول نییە. ئەو دوو کەسە لە شاری بابلدا خەڵکیان فێری سیحر دەکرد، ئەو باسە وا چووبووە ناو مێشکی خەڵکی ئەو دوو کەسە فرشتەی خودان و جوولەکەکانیش باوەڕیان وابوو

کە بەڕاستی فریشتەن و لە لایەن خوداوە نێردراون تاکوو خەڵکی فێری سێحر بکەن.

ئینجا خودا دەفەرموێت: (وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ) واتە لە لایەن خوداوە هیچ شتێک بـۆ ئەو دوو کەسە کە بە فرشتە ناسـراون نەنێردراوەتە خوارەوە. ئەوانە حیلەبازی درۆزن بـوون و لە بەر فێڵبازیی خۆیان هەر کەسێکیان فێری جادوو بکردایە، دەیانکوت: ئێمە تاقی‌کەرەوەین و ئەوەی فێرت دەکەین بۆ خـراپە بە کـاری مەهێـنە و بێ‌بـاوەڕ مەبە. ئەوە دە حاڵێکـدا بـوو هەمـوو ئەو شتانەی کە خەڵکیان پێ بە فریو دەبرد خۆیـان هەر بـۆ خراپەیـان بە کـار دەهێنـان، وە بـۆ جیـا کردنەوە و تێکدانی نێوان ژن و مێرد بوو، بەڵام خـۆ ئەوانە خۆیـان نەیانـدەتوانی زیـان بە هـیچ کەسێک بگەیەنن مەگەر خودا خۆی بیویستایە.

پاش ئەوە خودا دەفەرموێـت: (وَيَتَعَلَّمُـونَ مَـا يَضُرُّـهُمْ وَلاَ يَـنفَعُهُمْ) واتە ئەوانە هەر فێـری شتێک دەبوون کە هیچ قازانجێکی نەبوو بۆیان، بەڵکوو هەر مایەی زەرەر و زیان بـوون (وَلَقَـدْ عَلِمُواْ...) واتە جا ئەو جوولەکانە کە هەمیشە پیشەیان درۆ و سیحربازی بوو، دەیـانزانی ئەوەی ئیمان و ڕێگای ڕاست بەبێ باوەڕی و خراپەکاری وەگـۆڕێ هـیچ بەشـێکی خێـر و خۆشـی و بەختەوەری لە دواڕۆژدا دەس ناکەوێ، ئەوانە بەو کردەوانەیان خـراپترین کـار و کردەوەیـان بـۆ خۆیان کڕیوە.

تەفسیرنووسان دەربارەی (هارووت و مارووت) و ئەنگوستیلەی سـولەیمان هەنـدێک لەو ئیسـرائیلیاتانەیان خستۆتە ناو تەفسیرەکانیانەوە، کە سەراپای درۆ و خورافـات و دەمهەڵبەسـتی جوولەکەکانە. یەکێک لەو درۆیانە کە جوولەکەکان هەڵیانبەسـتووە ئەوەیە دەڵـێن: مەلائیکەتـان ڕەخنەیان لە حوکمدانی نەوەی ئادەم گرت و کوتیان: ئەگەر لە جیاتی ئادەمیزاد ئـێمە لە زەویـدا بووینایە، بەپێـی فەرمـانی بـاری دەجـووڵاینەوە حـوکممان دەکـرد. خـوداش لە وەڵامـدا پێـی فەرموون: ئادەی دوو کەستان هەڵبژێرن تا بچنە زەوی لەوێ حوکم بـکەن. ئینجـا فرشـتەکان لە ناو خۆیاندا هارووت و مارووتیان هەڵبژراد. جا کە هاتنە سەر زەوی و دەستیان کـرد بە حـوکم کردن، ئافرەتێک هاتە لایان و سکاڵایەکی لە لا کردن، کاتێـک سـەیری ئافرەتەکەیـان کـرد زۆر جوان بوو، داوای داوێن‌پیسییان لێ کرد؛ **ئەگەر مەلائیکە بووبن ئەوە بوختانە؛** ئافرەتەکەش پێـی کوتن: شتی وا نابێت، تا عارەق نەخۆنەوە و کەسێکیش نەکووژن. ئینجا هارووت و مارووتیش ئارەقیان خواردەوە و کەسێکی بێ تاوانیشیان کوشت! پاشان ئافرەتەکە لێی پرسـین: باشـە ئێـوە کاتێک دەتانەوێت بەرز ببنەوە و بچنەوە بۆ ئاسمان، چی دەڵێن؟! ئەوانیش ئافرەتەکەیـان فێـری

ئەو قسەیە کرد. ئیتر ئافرەتەکە ئەو قسەیەی کرد و یەکسەرە بەرەو ئاسمان بەرز بۆوە و لەوێ بوو بە **ئەستێرەی زوهرە!**

هەروەها دەڵێن گۆیا ئەو دوو فرشتەیە سزا دانی دنیایان هەڵبژارد بە سەر ئەوەدا کە لە ڕۆژی دواییدا سزا بدرێن. بۆیە ئێستاکە لە ژێرزەمینێکی قووڵی ئەو زەوییەدا هەڵاوەسراون و لە تاو ئێش و ئازار باڵەفڕکەیانە!!

بەڵام زۆر لە زانایانی ئایینی و قورئانزانەکان ـ ئێستا و ڕابردووش ـ ئەوە بە درۆ و هەڵبەست دەزانن و بە گژیدا چوون، تەفسیرەکانیان لەو درۆیە زەلامە خاوێن ڕاگرتوون، وەکوو ئیمامی فەخری ڕازی و ئیبنی کەسیر و قاسمی و شێخ محەمەد عەبدە و سەید ڕەشید ڕەزا و سەید قوتب و هەروا زۆری دیش.

**قاچی عەیاچ** دەڵێ: ئەو قسانەی دەربارەی هارووت و مارووت کوتراون هیچیان ڕاست نین ئەوەش کە لە ئیمام عەلی و ئیبنی عەباسەوە ـ خودایان لێ ڕازی بێ ـ دەگێڕدرێتەوە قسەی ئەوان نییە و نە زۆر و نە کەم ئەو باسە لە پێغەمبەرەوەﷺ نەبیستراوە، ئەو جەریانە لە جوولەکەکانەوە سەرچاوەی گرتووە و خستوویانەتە ناو کتێبەکان. خاوەنی تەفسیری (ئەلمنار) دەڵێ: ئەو درۆیانە لەمەڕ سلێمانی پێغەمبەریشەوە کوتراوە. هێندێک لە بەنیئیسرائیلەکان لە کاتی خۆیدا ڕێکیان خستوون داویانە بە گوێی موسوڵمانی بێئاگا، ئەوانیش باوەڕیان کردووە دوایە خزێنراوەتە ناو تەفسیرەکان.

لێرەدا کەوا درێژەم بە باسەکە دا ئەوەم بە لازم زانی تاکوو خاوەن هەستەکان زوو بزانن ئەو جەریانە درۆن وەک درۆکانی دی دە بەرنامەی ئایینی خراون.

## ئاوڕدانەوەیەک وەسەر چیرۆکی هارووت و مارووت

وەک دەڵێن: هۆی ناردرانی ئەو دوو فرشتانە (واتە هارووت و مارووت) دەبێ ئەوە بووبێ: جادووگەری لەو دەور و زەمانەدا زۆر باو بووە. خەڵک پێی هەڵخەڵەتابوون و فریویان خواردبوو. لەو ڕووەوە باوەڕیان هاتبووە سەر ئەو قەناعەتەی کە ڕیسالەت سەرچاوەی گرتووە لە جادوو. جا بۆ وەی خودای تەعالا عەبدی خۆی لە گومڕایی نەجات دا، هات ئەو دوو فرشتانەی ناردن و فەنن و دەستووراتی سیحر و جادووگەری فێری خەڵک کەن واتە ڕێوشوێن و فەنن و فنوونی سیحر بزانن. بۆوەی کەس نەتوانێ بە سیحر و جادوو فریویان دا. و هەتا باشی بزانن پێغەمبەرایەتی بەخشش و ئەنعامی خودایە و هیچ پەیوەندێکی بە خوێندن و

خوێندنەوە نییە، بەڵام جادووگەری فەنـنە، هەرکەسـێ بیخـوێنێ فێـری دەبـێ دووره لە فەیـز و بەرەکاتی باریتەعالا. دەبێ موسوڵمان باوەڕی لە سەر ئەو ئەساسە بێ دەنا گومڕا دەبێ.

وهەروا ئەو دەنگۆیەش کە دەڵێن: ئەو دوو فرشتانە واتە (هارووت و مـارووت) گیـرۆدەی گوناه و تاوانی زینا و قەتڵ بوون و خودای تەعالاش کردوونیە سەرپشک لە مابەینی سزای دنیا و ئاخیرەت، ئەوانیش سزای دنیایان هەڵگرتووە، کە هەڵاوەسـرانە، وا ئێستێ لە چاڵاوێکی بابل تـا قیـامەت بەو جـۆرە، تەواوی درۆ و هەڵبەسـتن ئاخنیویـانەتە نـاو تەفسـیرەکانی قورئـان و دەرخواردی کەسانی ئەقڵ لاواز و کەم شـعوور و فرشـتەنەناس و دیننەناسـی دەدەن، چـونکە خودا دەفەرموێ: (لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ) (تەحریم:٦) **واتە فرشتە لەوەی خـودا دەستووری پێ داون لانادەن، هەر ئەوەی دەکەن خودا ئەمری پێ داون.**

ئایەتی ١٠٢ چونکە باسـی سـیحر و دوو فرشـتەی نـاردراوی وەک هـارووت و مـارووت لەخۆدا جێ کردۆتەوە، لێکۆڵینەوەی تایبەت و لێدوانی کافی دەوێ.

## سیحر واتە چی؟

دڵ دەیهەوێ بزانێ سیحر واتە چـی؟! بەو هـۆیەی کە بنەمـایەکی ئەساسـی و تـایبەتی دە قورئاندا نییە، بە ئەقڵکاری نەبـێ ناتوانـدرێ بـۆ لای بچـین و نەتـیجەی یەقـین و قـانیعی لـێ وەرگرین.

دەکرێ بکوترێ: سیحر تین و گوڕ و هێزێکی نهێنی و مەعنەوی ڕووحییە، نیهایەتەن وزە و هەستێکی دە ئینساندا دەخولقێنێ. بە هۆی کەڵک وەرگرتن لە ڕاز و ڕمووزاتی تایبەتی ئەو هێزە دەکــرێ ئــاڵوگۆڕێکی تــایبەتی لە حەرەکــات و جــووڵانەوەی ئەنــدامی لەش و قەوارە و چوارچێوەی بەدەن پێک بێندرێ. بێ گومان ئەو ئاڵوگۆڕە پێکهاتووە سوڕێکی لە ناکاو بە ئەقڵ و هەست و حەواسی خەڵک دەدا و ئەسەرات و سەیرێک لە ناومالّی شعووردا دێنێتە دی و زۆر جار وا دەبێ لەو ڕێگایەوە ئیسباتی تەماشاچی بە بێخودی بێ ئیختیار بکەوێتە ژێر ئیرادەی ئەو حەرەکەیە واتە سیحر. وەک زەرگ لە خۆ دان و سەربڕین و ئاور خـواردن و سـیخ لە خـۆ دان، بێ ئازار و ئێش و خوێن هاتن.

وەک عەرەب کوتوویانە لەو بارەوە: (السِّحرُ امرٌ غريبٌ يَشبَهُ الخارِقَ و لَيسَ بِهِ) واتە سیحر ڕووداوێکی نائاشنا و غەریبە کە شـەباهەتی بە ئەمـری «خـارق العـادە» هەیە بەڵام دە واقیعـدا ئەمری خارقولعادە نییە. (تەفسیری ڕوح‌المعانی، ج١، لاپەڕەی ٤٦٨).

## فەرقی سیحر دەگەڵ کەرامەت و موعجیزە

فەرقی سیحر دەگەڵ کەرامەت و موعجیزە ئەوەیە: کەرامەت و موعجیزە نیزیکی لە خودا پێک دێنن و لە ئەساسدا نیشانەی یاری خودایە و لە خوداوە بۆ ئیسباتی پێغەمبەرایەتی و نەجابەتی دێتە ڕوو و سەر دەگرێ، بەڵام سیحر وە نیزیک کەوتنە لە شەیتان و نیشانەی پەیوەندی دەگەڵ شەیتانە واتە جنن و شەیاتینی سەرەڕۆ و توندڕەو هەر ئەندازە پێوەندی زیاد بێ لەو بارەوە، ساحیر لە پێکهێنانی سیحردا تەواوتر و ماهیرتر و چالاکتر دەبێ، ساحیر بە هۆی ئەستێرە و ڕۆژ و مانگ پەرستن دەکەونە ژێر ڕکێفی جنۆکەی شەیاتینیان و دەتوانن بە هێز و هیمداد وەرگرتن لەوان لە سیحربازی خۆیاندا ماهیرانەتر بچنە پێشێ.

سیحر زانست و هەستێکی زۆر نازک و نهێنییە، ناتواندرێ هەروا بە ئاسانی بە هۆی ئەسبابی زاهیری بناسرێ، ئەو تەعریفە لە (قامووس)ەوەیە. (قرطبی، ج٢، ل ٤٤).

(السِّحرُ خارقٌ للعادةِ يَظهَرُ مِن نفسٍ شريرةٍ بمُباشَرَةِ أعمالٍ مخصوصةٍ) (روح‌المعانی) واتە سیحر ئەمرێکی خارقولعادەیە لە یەک ئینسانی شەروور و بە هۆی کرداری تایبەتی خۆی دێتە ڕوو. ئەو تاریفە لە کۆمەڵی زانایانەوەڕا هاتووە.

## بیروڕای زانایان لە بابەت سیحرەوە

ئیمام فەخری ڕازی (ج٢، ل ٢٠٥): سێحر کارێکە هۆیەکەی نهێنییە، شتهایەک دەخزێنێتە ناو خەیاڵەوە بێ ئەوەی ئەساس و بنەمایەکی هەبێ، ئەوە بەو کارە دەکوترێ کەڵەک و فریو.

ئەگەر خوازیاری زۆر زانینی لەمەڕ چیرۆکی هارووت و مارووت وسلێمانی پێغەمبەر، بڕوانە لە تەفسیرەکانی قورئان بەتایبەت تەفسیری کەبیری ئیمام فەخری ڕازی و تەفسیری (تبیین القرآن).

ڕا و بۆچوونی هێندێک لە سەر شەیاتین ئاوایە دەڵێن: جنۆکەن و زۆربەشیان دەڵێن ئینسانن. هەروەها کوتووشیانە جینن و بەشەرن. تەفسیری کەبیر بە وردی ئەگەر دەتوانی سەیر و چاو دەکەی.

پوختەی مەبەستی ئایەتی ١٠٢: بە عەقیدەی یەهوود پاشایەتی سلێمان و ڕامکردنی پەری و مرۆ واتە جنۆکە و ئینسان و حەیواناتی وەحشی و پەڕەندە هەمووی هۆی سیحر و جادووگەری سلێمان بووە. تەناەت دەست هەڵگرتنی هێندێک لە بوت لە تەورات هۆیەکەی دڵ پێ بەستنیان

بوو بە سیحربازی، دیارە وەک دەزاندرێ و ئاشکراشــە قورئــان ســێحر وەپــاڵدانی ســلێمان ڕەد دەکاتەوە، چونکە سیحر حەق شاردنەوەیە و هەروا هارووت و ماروووت لە لایەن خوداوە کراونە مەئمووری ئەوەی بەرنامەی سیحر بە خەڵک بناسێنن تاکوو خەڵک فریوی ســاحیران نەخــۆن. بەڵام وەک دیارە خەڵکی کەم شعوور تەوەجوهی تەواویان بە ڕەهنومایی هــارووت و مــارووت نەکرد بەڵکە بە هۆی ئیستیفادەی خراپ لە ڕێنوێنی ئەو دوو فرشتانە ناکۆکییەکی تەواویان خستە مابەینی ژن و مێردانەوە.

قەومی یەهوود لە باتی دەس‌کێشانەوەیان لە بەشی زۆری یاســا و دەســتووراتی تەورات بە هۆی عەلاقە و هۆگری زۆر بە سیحر و جادووگەری بووە، باوەڕیــان بە هەمــوو تەوڕات ئەگەر بکردایە و دەستیان لێ نەکێشابایەوە و لە خودا بترسابایان، زۆر قازانجیان بە نەسیبی خۆ دەکــرد و خۆشیان بە زانا ناودار دەکرد، بەڵام ئێستێ هەم بۆخۆیان هەم دنیا شاهیدی لە ســەر دۆڕانیــان دەدەن و داویانە. بۆ ئیسباتی ئەو داوایە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٠٣ بەقەرە:

﴿١٠٣﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ آمَنُواْ واتَّقَوْا لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ اللَّه خَيْرٌ لَّوْ كانُواْ يَعْلَمُونَ

**ئەگەر ئەوانە باوەڕیــان بە تەورات ببــوایە کە مــوژدەی هــاتنی پێغەمــبەری تێــدایە و هەروا خۆشیان لە خراپەکاری بپاراســتایە و پارێزکــار بوونــایە، ئەودەم دەســتیان دەکەوت لە لایەنــی خــوداوە، پاداشــتی بــێ بــڕانەوە، و ئەوەش گەلێــک باشــتر دەبــوو بۆیــان لەو بەدئەخلاقــی و ڕەفتاریەی کە باعیسی ڕووسیایی دنیا و ئاخرەتیانە، ئەگەر بیانزانیایە.**

## سەبارەت بە وشەی «راعنا»

تا ئێرە بەزم و هەرا هەر لە سەر بەدئەخلاقی جوولەکە بوو. ئەوجار باس لە شتێک دەکرێ و دێتە پێش کە هەم جوولەکە دەگرێتەوە هەم موسوڵمان. ئەو شتەش ئەوەیە: کاتێکی پێغەمــبەرﷺ دەرسی قورئانی بە موسوڵمانەکان دەکوت بە پێغەمبەریان دەکوت (راعنا) واتە پەلەمان لێ مەکە و موراعاتمــان بــکە. جــا ئە لەوەڕا لە ژێــرپەردەی ئیهــانە بە مەقــامی پێغەمــبەر، جوولەکەکــان دەیانکوت (راعینوا) کە ئەوەش بە زمانی عیبری جنێوە و ئیهــانەیە. واتە موســوڵمانەکانیش هەر وەک جوولەکەکان ئەو وشەیان دەکوت بەڵام زاری خۆیان بۆ خــوار دەکــردەوە بە جــۆرێکی وا کەوەک وشە عیبرییەکە بچێ.

ئەوجار خودای تەعالا لە سەر ئەساسی حیکمەتی خۆی کە بۆ بەرپەرچدانەوەی نــاحەق و

تەوهینبازان و هەروا جارێکی دیکە دم درێژ نەکەن بۆ ئیهانە کردن، بۆ پێغەمبەر، ئـایەتی ۱۰۴ی بەقەرەی ناردە خوارەوە. ئەوەش ئایەتەکە بە وردی دایتەقێنە:

﴿۱۰۴﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقُولُواْ رَاعِنَا وَقُولُواْ انظُرْنَا وَاسْمَعُوا۟ وَلِلكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ

**واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بە پێغەمبەر مەڵێن (راعنـا)، واتە گـوێمان بـۆ بگـرە، بـزانە ئێمە پرسیارێکمان هەیە. با لە پەنای ئێوەدا جوولەکەکانیش وا بە پێغەمبەر نەڵێن. بە مانایەکی نـاحەز و ناشـیرین. بەڵـکە لە بـاتی وشـەی (راعنـا) بڵـێن (انظرنـا) واتە پەلەمـان لـێ مەکە و چاوەڕمانیمان لێ بکە. واتە ئەو وەڵامەی کە وەریدەگرن باش گـوێی دەنـێ. ئەوانەی کە بەبـێ شەرم و ئەدەبەوە ڕوو دەکەنە پێغەمبەر ئەوانە کافرن و سزایەکی ئازاردانیان بۆ تەرخان کراوە.**

### ئاوڕدانەوەیەک وەسەر مەبەستی ئایەتی ۱۰۴ بە کورتی:

ئەو ئایەتە ئەوە دەڵێ: ئێوە ئەی خـاوەنی ئـیمان و بـاوەڕ، وەک یەهوودەکـان بە پێغەمـبەر مەڵێن: (راعنا)، بەڵکە بە شێوەیەکی ئەدەب و حەیا و شەرمەوە بڵێن بە پێغەمبەر: مۆڵەتمان بدە، حاڵی بین و ئەتۆش چاوەدێریمان بکە. واتە لە پێغەمبەران دەبێ حەق ببیسـرێ و دەبێ لەوانیش ئیتاعە بکرێ. هۆزی یەهوود بە هۆی بێشەرمی و بێحەیایی و بێئەدەبی خۆیان کاری خۆیان یەکسەرە کرد، واتە کوفریان قبووڵ کرد و جلکی عەزابیان کردە بەر خۆ. وا دەردەکەوێ: ئەهلـی کتێب واتە یەهوود نایانهەوێ و خوازیار نین وەحییان لە لایەن خوداوە بۆ بێ. بەڵکە دەیانهەوێ بتکێشنە بێڕاهەی ئایین و سەعادەت، بەڵام بـێ خەبەر لەوەی خـودای خـاوەن ڕەحـم و عەدڵ، ڕازاندنەوەی عەبدێک یا نەتەوەیەک بە زینەتی فەزل و ویقار و ئەدەب و حەیا و ئیمان بە خاتری حیکمەت و وازی خۆیەتی، کەسیش ناتوانێ پێش بە مەشییەت و ئیرادەی خودا بگرێ. جـا بـا حەسوود و بەخیـل هەر وەجـووڵێن و حەسـادەت و بوخـل و لەچەری خۆیـان بێـر و بەوێـدا لێکدەن.

لە ئایەتەکـانی پێشـوودا بێئەدەبـی بەنیئیسـرائیلەکان نیشـان درا، واتە ڕوو وەرگێڕانـی یەهوودیـان لە تەوڕات و ڕووکردنیـان لە سـیحر و جـادوو و هەروا ئیهـانە بە مەقـامی بەرزی حەزرەتی سلێمان. بەڵام دێرەدا واتە ئایەتی ۱۰۴ی بەقەرە، نیشاندانی بێئەدەبی بە مەقامی پاک و بەرزی حەزرەتی محەمەدەلمستەفاﷺ دێنێتە ڕوو.

یەهوودییەکانی دانیشتووی مەدینە و دەوروبەری مەدینە، بە پێـی ویسـتی گـڵاوی خۆیـان نیەتی ناپاکی پڕ لە کینە و حەسادەتیان نیسبەت بە پێغەمـبەرﷺ زۆر جـاران بە شـێوەی ئیهـانە و

مەسخەرە لە حزووری پێغەمبەردا بە ڕەمز و کینایە دەدوان و بە پێکەنینەوە دەیانکوت: (هذا الرجل راعنا). بە گوفتارە ئیهاناویەکەیان دەیانویست پێغەمبەری ڕوو پێ دە خۆ کەن. موسوڵمانە ساوا و سادەکانیش کە لە مانای ئەو جوملە ناحەزە حاڵی نەبوون، بە پەیڕەوی لە یەهوودیەکان دەیانکوت و وەردیان دەداوە بە خەیاڵی خۆیان شتێکی مەبارەک و پیرۆزە، تەنانەت کار گەیشتە ئەو جێگایە ئەگەر موسوڵمانە حاڵییەکان دەیانکوت بە یەهوودییان: ئەو گوفتارە بێ ئەدەبیانە نابێ بڵێن نیسبەت بە مەقامی پێغەمبەر و ئەگەر بیڵێن سزا دەدرێن، ئەوانیش لە وەڵامدا دەیانکوت: ئەوە نییە موسوڵمانەکانی خۆشتان دەیڵێن، بۆچی لۆمەی مە دەکەن، ئەی بۆ بەوان ناڵێن: نەیڵێن. زانا موسوڵمانەکان دە وڵامدا دەیانکوت: ئاخر ئەوان حاڵی نین. جا لە ئەسەری ئەو ماجەرایە خودای تەعالا بۆ بەرگری لە ئیهانە کردن بە پێغەمبەر و ڕوون کردنەوەی باری ڕاستی ئەو ئایەتی ١٠٤ ڕەوانەی سەر محەمەدﷺ کرد.

دڵ دەیهەوێ بزانێ (راعنا) واتە چی؟

١. وشەی (راعنا) دە زمانی عیبرانیدا بە مانای (اِسْمَعْ لاسَمِعْتَ) یانی گوێ گرە و ببیسە کە خودا نەبیسێ.

٢. وهەروا دووبارە کوتراوە (راعنا) کە لە (رعن)ەوە هاتووە بە مانای جەهل و نەزانینە. قەومی یەهوود کە ڕووبەڕووی حەزرەتی پێغەمبەر ئەوەیان کوتووە مەنزووریان وەپاڵدانی جەهل بە پێغەمبەر بووە. (تەفسیری بغوی، ج١، ل ١٠٢).

٣. یەهوود مەبەستیان لە وشەی (راعنا) شوانی بووە. واتە حەزرەتی محەمەدﷺ یەک شوانەوێڵە بووە. (بحر المحیط، ج١، ل٣٣٩).

ئەگەرچی موسوڵمانان هیچکام لەو مانایان نەزانیوە بە وشەی (راعنا)یان وە نەناوە، بەڵکە هەر بە مبارەک و پیرۆزیان زانیوە وشەی (راعنا) بۆیە حەزرەتی ڕەسووڵیان پێ دواندووە و کوتوویانە (راعنا سمعک) یانی ڕەسووڵ گوێمان دەیە و بە تەواوی موتەوەجیهی ئێمە بە. یا دەڵێن موسوڵمانان کوتوویانە: (راقِبْنا و تَأنَّ بِنا فیما تَلَقَّیْنا حَتی نَفهَمَهُ) واتە ئێمە دەرک کە و مۆڵەتمان دە تاکوو ئەوەی دەیڵێی بە باشی تێیبگەین. (تفسیر بغوی، ج١، ل ١٠٢ ـ تەفسیر مظهری، ج١، ل ١٠٣). و سەراپای مەبەستی جوولەکەکان لە کوتنی ئەو (راعنا)یەدا ئیهانە و مەسخەرە بە پێغەمبەر و موسوڵمانان بووە.

جوولەکەی بێشەرم و بێئەدەب لە ئەسەری حەسادەت و کینەتووزییان دەگەڵ پێغەمبەر

هەتا دەگەیشتنە حەزرەتی ڕەسووڵ، لە باتی سڵاو دەیانکوت (سـام علیـک) لە جیـاتی (سـلام علیک). واتە مەرگـت بـێ. چـونکە وشـەی (سـام) واتە مەرگ. حەزرەتـیش پێـی دەکـوتنەوە (علیک). ئەوجار خودای تەعالا ئاگـاداری موسـوڵمانەکان دەکـات لە سـەر ئەوەی جـوولەکە ناپاکەکان چەندەیان حەسوودی پێ دەبەن. لە سەر ئەو ئایینە پاک و پیرۆزەی ئیسلامی و ناردنی قورئان بۆ پێغەمبەر. تاکوو موسـوڵمان فریـوی فێـڵ و فـووتی جـوولەکە نەخـۆن و دە داویـان نەکەون و زۆر سپاس و شوکری خودا بکەن لە سەر ئەو ئایینە پـاکە ئیسـلامە. بـۆ تەئییـدی ئەو ڕاستیە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۰۵ی بەقەرە:

﴿۱۰۵﴾ مَّا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَلاَ الْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَاللّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَن يَشَاء وَاللّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ

**ئەوانەی کە بێ باوەڕن لە خاوەن کتێبەکـان ـ وەکـوو جوولەکەکـان دەگەڵ بتپەرسـتەکان ـ هەرگیزاوهەرگیز نایانەوێ و حەز ناکەن خێـر ڕووتـان تـێ کـات. ئەدەو ناخوازیارەیـان هـاتنی قورئانی پیرۆزە کە گەورەترین هیدایەت و خێری خودایە بۆ بەرەی مرۆ. بەڵام دەشبێ ئەو حاشا هەڵنەگرەش پشتی گوێ نەخرێت: خودا هەرکەسێکی بیهەوێ هەڵیدەبژێرێت بۆ پێغەمبەرایەتی و دەیکاتە وەسیلەی ڕەحمەت، خودا خۆی خاوەنی فەزڵ و بەخششی یەکجار گەورەیە.**

سـرنجێکی تایبەتی لە جوملەی ﴿وَاللّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَن يَشَاء﴾ خودای تەعـالا بە عەبـدی ڕادەگەیێنێ: کە هەچی فەزڵ و نیعمەتە لە ئیـرادە و مەشـیەتی مـنەوەیە، هـیچ کەس لەو بـارەوە مافی حەسادەت و بەخیلی نییە و ئەگەر بیشیکا بە خـۆڕایی بـاری گرانـی حەسـوودی لە خـۆ دەنێ.

## ئاوڕدانەوەیەک وەسەر (راعنا)ی ئایەتی ۱۰۴

لە سیمای ئەو ئایەتە پیرۆزە وا هەست پێ دەکرێ: هەر عیبادەت و دوعا و پاڕانەوەیەک کە لە لەفزەکان بۆنی کوفر و شیرک بێ (وەک یا ڕەسوولەڵڵا کە نەزان بۆنی شیرکی لێ دەکا چونکە پێی وایە ئیستغاسەیە نەک ئەویندـارانەیە) بـاش ئەوەیە ئەو لەفـزانە نەکـوترێن، مەسـەلەن: خـۆ وشەی (راعنا) یەک لەفز و کەلیمەیەکی باش و پیرۆزە، بەڵام چونکە یەهوودەکـان بە مانـایەکی خراپ و ئیهانە دەیڵێن، خودای تەعالا قەدەغەی کرد کە موسوڵمان نەیڵێن.

وەک لە ڕابردوودا ڕامانگەیاند جوولەکەکانی مەدینە لە دەورانـی پێغەمـبەرا بـۆیە ئیتـاعەی

پێغەمبەریان نەدەکرد و هەر خەریکـی فـڕ و فێـڵ بـوون، بـۆ سـارد کـردنەوەی دڵ و دەروونـی موسوڵمانان، چونکە پێیان وابووە کە دەبێ پێغەمبەرایەتی هەر لەوان بێ. لەوان بەدەر نابێ ببێ، ئەو باوەڕە ناڕەوایەیان بوو ڕێی پێ نەدان وەشوێن پێغەمبەران بو، چونکە هەر خەریکی چاندنی دڕ و داڵ بوون لە بەر پێی خەڵکـی ئیسـلام و شـاڕێی ئـیمان. هەر بـۆیە خـودای تەعـالاش دە بەرابەر هەر فیتـنە و ئـاژاوە و دەسیسـەیەکیان ئـایەتێکی دەنـاردە خـوارەوەوە وەک ئـایەتی ٤٨ی قصص نیشانی دەدا ئەو جەریانە: ﴿فَلَمَّا جَاءَهُمُ الْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا لَوْلَا أُوتِيَ مِثْلَ مَا أُوتِيَ مُـوسَى أَوَلَمْ يَكْفُرُوا بِمَا أُوتِيَ مُوسَى مِن قَبْلُ قَالُوا سِحْرَانِ تَظَاهَرَا وَقَالُوا إِنَّا بِكُلٍّ كَافِرُونَ﴾ مانـا: کـاتێ لە لایەن ئێمەوە قورئان نێردرایە لایان کوتیان: چەن چاک دەبوو ئەوەی بە مووسا درابوو کە عەسا بـوو، بـوو بە هەژدیها و هەروا یەدی بەیزا نازڵبوونی کتێب یەکجێ، هەر ئەوانەیان ناردبان، سەیر کەن مەگەر ئەوانە ئینکاری ئەوەیان لە پێشدا نەدەکرد کە دەدرا بە مووسا؟ ئەو تەوهینباز و بەهانەگرانە دانکـوت: تەوڕات و قورئان هەردوو سیحر و جادوون یەکتر تەئیید دەکەن. کوتیان ئێمە هیچ کـامیان قبـووڵ نـین و بە هەرکـان مونکیرین.

بە کوردی دەیانکوت بۆچی وەک ئەو موعجیزانەی دراون بە مووسا، نەدراون بە پێغەمبەر؟ جا بۆیە خودا دەدا لە دم و لەوسیان بە جوملەی (أَوَلَمْ يَكْفُرُوا بِمَا أُوتِيَ مُوسَى مِن قَبْلُ) واتە ئایـا بێ بڕوا نەبوون بەو موعجیزانەی کە لەوە پـێش بە مووسـا درابـوون؟ ئەوجـار خـودای تەعـالا وڵامێکی دیشیان بە ئایەتی ١٠٦ی بەقەرە دەداتەوە:

﴿١٠٦﴾ مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ
هیچ مـوعجیزەیەک لەو مـوعجیزانەی کە بیـدەین بە پێغەمبەرێـک، نایشـۆرینەوە بەو ڕەنـگە نەیدەن بە پێغەمبەرێکی دی، و یا لە بیـری بەریـنەوە بە هـۆی دوور کەوتـنەوە و کـۆن بـوونی بەوە. (وەک ئەو پێغەمبەرانەی ناو و نیشانیان نەمـاوە) مـوعجیزەیەکی دیـکەی باشـتر لەو یـا وەک ئەوی دەیدەینێ. ئایا نازانیت خـودا بە سـەر هەمـوو شـتێکا بەدەسـتەڵاتە (و دەتـوانێ بە هەمـوو پێغەمبەرێـک مـوعجیزەیەکی تـایبەتی وای بـداتێ کە بـۆ کـات و دەمـی خـۆی دەس بدات)!؟

## ئاوڕدانەوەیەک وەسەر نەسخ

وا دیارە لە زمانی عەرەبیدا نەسخ بە مانای لابـردنە و هەروا لە شـەرعدا بە مانـای لابردنـی حوکمی ئایەتێکە بە حوکمی ئایەتێکی دی. وەیا لابردنی حوکمێکە بـێ ئەوەی حـوکمێکی بێـتە

جێ.

ئەگەر بەرجەوەندی ئایەتەکانی مەنسووخ بی چاو دەکەی کە بەشی زۆری عولەمایانی ئاینی لە سەر ئەو باوەڕەن کە خودای تەعالا لە بەر هێندێک مەبەست و حیکمەتی خۆی حوکمی هەندێک ئایاتی لە قورئاندا بە حوکمی هەندێک ئایاتی دی لابردووە و نەسخی کردوونەتەوە و ئایەتەکە دەکەنە شاهید لە سەر ئەو ڕایانەیاندا. هێندێک لە زانایان دەڵێن ئەو ئایەتانەی نەسخ کراون زۆرن، هێندێکیش دەڵێن کەمن، ڕەنگە هەر بیست ئایەت بن. هێندێکیش لە زانایانی کۆن و نوێ بۆچوونیان وایە کە هیچ ئایەتێک لە قورئاندا نەسخی بە سەرا نەهاتووە و نایە و ئەو ئایەتانەی کە دەشڵێن نەسخ کراون، ئەوە هێندە بە شێوەیەکی وای ڕوون دەکەنەوە و دەیخەنە بەرچاو کە نەسخی بە سەریا نەهاتبێت. ئینجا ئەگەر وا بێت دەگونجێ بکوترێت ئەو ئایەتە شاهید نییە لە سەر لابردنی نەسخ لە قورئانا، چونکە هەر وەک بە ئایەتێکی قورئان دەکوترێ ئایەت، بە هەموو ئەو ئایەتانەی دێن لە باتی ئایەت دەکوترێ ئایەت. کەوایە دەبێ بکوترێ مەبەست لە نەسخی ئایەتی ١٠٦ی بەقەرە قورئان و شەریعەتی ئیسلامە، دەلیل و بەڵگەش ئایەتی ١٠٥ە کە موسوڵمانەکان دەڵێن کافرەکان و بتپەرستەکان حەز ناکەن خودا هیچ خێرێکمان بۆ بنێرێتە خوارەوە: کە قورئان و شەریعەتی ئیسلامە. ئەو قورئانە شەریعەتە، شەریعەت و کتێبەکانی پێشووی نەسخ کردوون و لابردوون.

## نەسخ چوار بەشە

دڵ بە پێویستی دەزانێ کە بزانێ نەسخ یەک بەشە؟ یان چەن بەشە؟ جا ئێمە بۆ وڵامی دڵ و دابین کردنی ئەو لێر و لەوێ حەولن داوە تاکوو بەشی جواب دانەوەی دڵمان دەس خستووە بەو شێوەیە:

نەسخ وا دیارە دەبێ چوار بەش بێ:

١. نەسخی قورئان بە قورئان

٢. نەسخی قورئان بە حەدیس

٣. نەسخی حەدیس بە حەدیس

٤. نەسخی حەدیس بە قورئان

بۆ هەر یەک لەو بەشانە بۆ بەقای دڵ دەبێ نموونەیەک نیشان بدرێ، ئەوەش نموونەیان:

## ۱. نەسخی قورئان بە قورئان

خودای تەعالا لە هەوەڵەوە بە ئینسانی ڕاگەیاند بە واسیتەی ئـایەتی ۱۵ی نیسـاء کە ژنـانی زیناکەر دە ماڵێدا زیندانی و دەس‌بەسەر بکرێن تـاکوو دەمـرن: (وَالـلاَّتِي يَـأْتِينَ الْفَاحِشَـةَ مِـن نِّسَآئِكـمْ فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعةً مِّنكـمْ فَإِن شَـهِدُواْ فَأَمْسِـكوهُنَّ فِي الْبُيُـوتِ حَـتَّىَ يَتَوَفَّـاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً) واتە: ئەو ئافرەتانەی داوێن پیسی دەکەن چوار شاهیدی پیاویان لە سەر بگرن جا ئەگەر چوار کەسەکە شاهیدیان دا، ئیتر دەستیان بە سەردا بگرن و زیندانییان بکەن لە ماڵانـدا تـا خودا گیانیان لێ دەستێنێتەوە. یا خود لە تۆڵەی ئەو تاوانەدا خودا ڕێگایەکیان بۆ دەسنیشان دەکات.

هەروەک بەشی زۆری تەفسـیر نووسـەکان دەڵـێن: ئەو زینـدانی‌کردنە سـزایەک بـووە بـۆ کاتێکی تایبەتی، تا خودا دواتر جەزای داوێن پیسیی بۆ هەمیشە دیاری دەکا. وەکوو سـزادانیان بە لێدانی ۱۰۰ دار شەللاق. بڕوانە ئایەتی ۲ سوورەی نوور بۆ لێدانی ۱۰۰ دار شەللاق.

الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَـةَ جَـلْدَةٍ واتە هەریەک لە ژن و پیـاوی داوێـن پیسـی زیناکەر سەت شەللاقیان لێ بدەن.

لە سەر ئەو یاسا و ئەساسە حوکمی ئایەتی ۱۵ی سوورەی نیساء لەمەڕ زینـای ئـافرەت کە زیندانی کردن بوو تا مردن، نەسخ کرایە بە حوکمی ئایەتی ۲ی سوورەی نـوور کە لێـدانی ۱۰۰ شەللاق بوو. ئەوە پێی دەکوترێ نەسخی ئایەت بە ئایەت.

## ۲. نەسخی قورئان بە حەدیس

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم دە ئایەتی ۱۱ی نیساءدا ئاماژە وەلای وەسـیەتی ئەولاد دەکا: (يُوصِيكـمُ اللَّهُ فِي أَوْلاَدِكـمْ) واتە خـودا سـەبارەت بە منـداڵەکانتان وەسـیەتتان بـۆ دەکـات و ڕێنوێنیتـان دەکـات. بەڵام ئەو حـوکمە کە وەسـیەت بـۆ ئەولادە نەسـخ دەکـرێتەوە بە حەدیسـی پێغەمبەر کە لە کتێبی (ابن ماجە) لە بابی وەسیتەدا حەدیسی ۶۶۵ و ۲۲۵۴ نەقڵ کراوە. (لا وصيّة للوارث) واریس وەسیەتی بۆ نییە.

نەسخی ئایەت بە حەدیس ئەگەرچی متواتر و مەنشوورە و دەلیلشـی هەر هەمـان میسـالە بوو کە کوترا بەڵام هەن لە زانایانی ئایینی ئەو ڕێگایان (واتە نەسخی ئایەت بە حەدیس) نەداوە.

## ۳. نەسخی حەدیس بە حەدیس

وەک کوتراوە حەزرەتی ڕەسووڵ لە سەرەتاوە ژن و پیاوی لە چوونە سەر قەبر واتە زیارەتی

قەبران مەنع کردبوو، بەڵام پاش دەورانێک ئیجازەی پـێ دان و فەرمـووی: (كُنـتُ نَهِيـتُكُم مِـن زيارةِ القُبورِ فَزُوروها فإنَّها تَزهَدُ في الدنيا و تَذَكُّرُ الآخرةِ) واتە ئەمـن ئێـوەم لە زیـارەت کردنـی قەبران مەنع کردبوو، ئەوجار زیارەتی بکەن، چوونتان بۆ زیارەتی قەبران لە ئیمان و باوەڕو زیاد دەکا، ئەگەر یادی مردن بکەن و یادی ڕۆژی ئاخرەت.

## ٤. نەسخی حەدیس بە قورئان

ڕوو تێکردن دە بەیتولموقەدەس لە کاتی عیبادەتدا لە سەر ئەساسـی شـەرعیەتی سـوننەتی حەزرەتی ڕەسووڵ بوو، نەک نەسسی قورئان و ئەمری باری، بەڵام لە ساڵی دووهەمی هیجـری ئەو ڕوو تێکردنە سوننەتە بە وەحی قورئان نەسخ کرا و لە بـاتی ڕوو کـردن دە بەیتولمـوقەدەس روو تێکردن دە کەعبەی مبارەک گەڕا بە شەرعی.

بە کوردی و بە کورتی: لە لایەن سێ سەرمەزەب واتە حەنەفی و مالکی و ئەحـمەدی هەر چوار سوورەتی نەسخ ڕەوایە و دروستە بەڵام لە لایەن شـافعی نەسـخی قورئـان بە حەدیـس و نەسخی حەدیس بە قورئان دروست نییە. ئەو ئیختلافە نەزەرانە چمان پـێ دەڵـێ؟ ئەومـان پـێ دەڵێ: دین واتە قورئان و حەدیس.

بۆ زێدەزانین ئاوڕ وەدە سـەر تەفسـیرەکانی ئـیمام ڕازی و تەفسـیر تبیـین القـرآن لە باسـی نەسخدا.

لە ئایەتی ١٠٦ نەسخدا ئەوە هەستە دەکرێ: بە پێی وەخت و زەمـان و کـات ئەحکـام دێ بگۆڕێ، چونکە کات و سات و زەمان ئەساسن بۆ ڕەوڕەوەی ژیان.

لە ڕاوێژی ئایەتی ١٠٦ و ١٠٧ ئەوە هەست پێ دەکا ئەقڵ و شعوور: خودای تەعـالا ڕووی خیتابی دە یەهوودی و موشـریکەکانە کە ئیحتیرازیان لە سەر دەستەڵات و توانایی خـودایە بەو دەلیلە کە خودای تەعالا بەو شێوە دەدوێ: ئایا مەگەر ئێوە نازانن خودا توانایی هەیە بۆ هەمـوو شتێک و بە سەر هەموو شتێکدا زاڵە؟! ئەو خیتـابە دە واقیعـدا بـۆ گشـت بەرە و نەتەوەیەکە لە ئینسان، بەڵام تایبەتییە بۆ جوولەکە و موشـریکەکان. بۆ تەئکیدی ئەو ڕاستییە دەچیـنە خـزمەت ئایەتی ١٠٧ی بەقەرە:

**﴿١٠٧﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلاَ نَصِيرٍ**

**ئایا ئێوە نازانن خودا خاوەنی ئەو کائیناتەیە، ئێوە لەو زیاتر هیچ پەنادەرێکی دیکەتان بۆ نییە!؟**

وەک دەبینرێ و بە ڕوونی هەستی پێ دەکرێ خودای تەعالا پاش ڕانان و ئاشکرا کردن و لە قاو دانی زۆر لە ئاداب و عادەتی ناحەز و قەبیحی بەنیئیسـرائیلیەکان لە گوفتار و لە کردار، هۆشدار و ئاگاداری توند بە ئۆمەتی ئیسلام دەدا کە لە بەرابەر خودا و ڕەسووڵ و قورئان و باقی ئەحکاماتی ئیسلامی بێ ئەدەبی و بێ ئیحترامی نیشان نەدەن وەک جـوولەکە بـۆ ئیسـباتی ئەو ئاگاداریەی خودا بە موسوڵمانان دەچینە خزمەت ئایەتی ١٠٨ی بەقەرە:

**﴿١٠٨﴾ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْأَلُواْ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَى مِن قَبْلُ وَمَن يَتَبَدَّلِ الْكُفْرَ بِالإِيمَـانِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاء السَّبِيلِ**

**ئایا ئێوەش (ئەی موسوڵمانەکان) وەکوو جوولەکەکانی لەمەو پێش کە هەر ڕۆژەی داوایەکیان لە مووسا دەکرد، ئێوەش دەتانەوێت داوای بەدیهێنانی هەر شتێک لە پێغەمبەرەکەتان بکەن؟! هـیچ گومانێکتـان نەبێـت لەوەی هەر کەسـێک ئـیمانەکەی بە بـێ بـاوەڕی بگـۆڕێتەوە، ئەوە ڕێگای ڕاستی لێ ون بووە و وێڵ و ماڵوێران دەبێت.**

## تێوەڕوانینی ناوەرۆک

خـودا دەسـتوور دەدا بە موسـوڵمانەکان کە گـوێ شـل نەکەن و نەدەن بە جوولەکەکـان وەشوێن ئاکار و ڕەفتاری وان نەکەون، وەک تەوهین و گاڵتە بێ بە بەرنامەی خودا و ڕەسـووڵی خودا و قورئان. نەزەری هێندێک لە قورئانزانان: هۆی هاتنە خوار و دابەزینـی ئەو ئـایەتە ئـاوا دەزانن: گۆیا کاتێ حەزرەتی ڕەسووڵ لە غەزای خەیبەر دەگەڕێتەوە لە ساڵی شەشی هیجـری، دەگاتە شیوێکی کە لە زەمانی جـاهیلیەوە تـا زەمـانی موشـــریکایەتی، دارێـک بە نـاوی (ذات انواط) کە لەو شیوە دەبێ دەیپەرستن و زیارەتی دەکەن خەڵکـی موشـــریک و نەزان و هەروا لە نــاو لەشــکری ئیسلامیشــدا تــازە موســوڵمانێک دەبــن زۆر لە ئایینــدا قــایم نــابن، ئەوان کە موشـریکەکان دەبینن زیارەتی ئەو دارە دەکەن و ڕێزی زۆر لێ دەگـردن و دەیپەرسـن، ئەو تـازە موسوڵمانانە داوا لە پێغەمبەر دەکەن کە دارێکی ئاواش (ذات انواط) بۆ وان دەسنیشان و ڕەچاو کات تاکوو ئەوانـیش بە عینـوانی بەرەکەت و مـتفەڕک ڕێـزی لـێ بگـرن و دە دەوری هـاڵێن. حەزرەتی ڕەسووڵ لەو داوایە ناڕەحەت دەبێ بە تـووڕەیی دەفەرمـوێ پێیـان: سـوبحانەڵڵا، ئەو داوایەی ئێوە هەر هەمان داوای قەومی مووسایە لە مووسا کە کوتیان (قَالُواْ يَا مُـوسَى اجْعَـل لَّنَـا إِلَـهًا كَمَا لَهُـمْ آلِهَـةٌ قَـالَ إِنَّكُـمْ قَـوْمٌ تَجْهَلُـونَ) (اعراف: ١٣٨) **مانـای هەمـوو ئـایەتەکە: ئـێمە نەوەی ئیسـرائیلمان لە دەریای سوور پەڕاندەوە لەو کاتەدا بە لای گەلێکـدا تێـپەڕین کە خەریکـی بـت پەرسـتن**

**بوون. هەرکە نەوەی ئیسرائیل ئەو دیمەنەیان دی، سەردەمی پەرستنی خوداکانی میسریان کەوتەوە بیر کە وەکوو ئەوان دەیانپەرستن بۆیە بە حەزرەتی مووسایان کوت: ئەتۆش وەکوو ئەو قەومە بتێکمان بۆ دیاری بکە تا بیپەرستین تاکوو لە خودامان وەنیزیک خاتەوە!!**

هێندێک لە تەفسیرنووسەکان دەڵێن: هۆی نازڵبوونی ئەو ئایەتە و زۆر لە ئایەتەکانید یکەی ئاوا ئەوە بووە کە موسوڵمانانی ئەو سەردەمی تازە موسوڵمان بوونیان پرسیاری زۆر بێ‌جێ و بێ‌وەختیان لە پێغەمبەر دەکرد. مەسەلەن یەکێک دەیکوت: پێغەمبەر بابی من کێ بوو؟ ئایا بابی من ئێستێ لە بەهەشتدایە یا لە ناو دۆزەخدایە؟ هەروا پرسیاریان دەکرد: مانگ بۆچی جاری وا هەیە پڕ و تەواوە جاری هەیە ناتەواوە؟ یا بۆچی حەج یەک جار واجبە لە تەواوی ژیاندا؟ ئاوا لەو پرسیارە بێ جێ‌وڕێیانە. خودای تەعالاش بۆ بەرگری لەو هەڵوێستە نارەوایەی موسوڵمان دەرحەق بە پێغەمبەر ئەو ئایەتی ١٠١ی مائیدەی ناردە خوارەوە و هەر وا ئایەی دیکەی هاوچەشنی.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْأَلُواْ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ الْقُرْآنُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا اللّهُ عَنْهَا وَاللّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ (مائیدە: ١٠١) **ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئەوەندە لە شت مەکۆڵنەوە و پرسیار مەکەن، بەتایبەتی شتێک کە سوودی تێدا نەبێت. نەبادا دەرخستنەکەی ببێتە مایەی عەزاب و بارگرانی بۆتان، خۆ ئەگەر لە کاتی هاتنە خوارەوەی قورئاندا پرسیار بکەن، خودا بۆتان ڕوون دەکاتەوە و دەریدەخات و ئەوکاتە تووشی بارگرانی دەبن لە کاتێکدا خودا خۆی لێی بێدەنگ کردووە، خودا زۆر لێبوردەیە و خاوەن سەبرێکی زۆرە.**

هەروا بۆ تەواو کردن و تەئکیدی جەریانی ئایتەکە وا باشە ئایەتی ١٠٢ی مائیدەش چاو کەین و بیخەینە ڕوو:

قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُواْ بِهَا كَافِرِينَ **واتە هێندێک لە قەومەکانی پێش ئێوە پرسیاریان لە هەندێک شت کرد، بەڵام کە بۆیان ڕوون کرایەوە دوایی پشتیان تێ کرد و پێی کافر بوون.**

## ئاوڕدانەوەیەک

پرسیار دەبێ لە شتێک بکرێ کە ناسینی ئەو شتە قازانجێکی دنیایی یا ئاخرەتی هەبێ، ئەگەر قازانجی ئایینی و ئەخلاقی نەبێ، ئەو شتە پرسیار لێ کردنی دروست نییە واتە بێ کەڵک و بێ ئەرزشە، وەک ئەوە پرسیار بکرێ: خودا لاقی هەیە؟ ئەگەر نیەتی چۆن دەڕوا؟ خودا زمانی هەیە؟ ئەگەر نییەتی، چۆن دەدوێ؟

پاش ئەوەی خودای تەعالا دەستووری دا بە خاوەن باوەڕان کە گوێ نەدەنە چاووڕاوی

جوولەکەکان، ئەوجار ئاگاداریان دەکاتەوە لەوەی گاور و جوولەکە خوازیاری ئەوەن کە پاش ئەوەی موسوڵمان بوون بتانکەنەوە بە بێباوەڕ و بێئیمان، لە ڕووی حەسادەت و کینەیەکی دەگەڵ موسوڵمانان هەیانە لە ئەساسی سرشتی ناپاکیان. بۆ تەئکیدی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٠٩ی بەقەرە:

﴿١٠٩﴾ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّاراً حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ فَاعْفُواْ وَاصْفَحُواْ حَتَّى يَأْتِيَ اللّهُ بِأَمْرِهِ إِنَّ اللّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ

**زۆر لەوانەی خاوەن کتێبن ـ کە جوولەکەکان و دیانەکانن ـ پاشی ئەوەی کە ڕاستیەتی ئاینی ئیسلامیان بۆ ئاشکرا بووە و لێ دەرکەوتووە، کەچی لە بەر دڵڕەشی و حەسادەتیان دەیانەوێت بتانگێڕنەوە بەرەو بێباوەڕی. ئێوە لەوانە ببوورن و وازیان لێ بێنن تا یارمەتی خوداتان بۆ دێت و سەرتان دەخات، بێگومان خودا توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.**

## تێڕوانینێک

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم کە ئەو ئاینە ئیسلامەی پێ بەخشیوین و ڕێی ڕاستی داونێ، دەشتوانێ وایان بەهێز بکات کە هەموو دنیا و دەوڵەتێک هەر شەرمیان لێ بکات و هەم ئیتاعە. ئەگەر نەختێک سرنج بگرین و تێهەڵڕوانین لە نیزامی ئێستێ، بە ڕوونی دەبینن کە دەوڵەتی ئیسلام تیشکی حوکمڕانی خۆی گەیاندە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.

## ورده سرنج و بەراورد لە سیمای ئەو ئایەتە پیرۆزە (١٠٩):

جوولەکەکانی سەردەمی ئایینی ئیسلام لە بەر حەسادەت و کینەیان، دەیانەویست ئێوەی ئیسلام ئاوەژوو کەنەوە. ئەو حەسوودییەشیان ئێ ئەوەی نەبوو کە ئێوەی ئیسلام هەڵوو بۆ ڕەخساندبێ بەڵکە ناشی لە سرشتی حەیوانی وان بوو کە زاتەن خوویان پێ گرتبوو. بۆیە خودا دەفەرموێ (حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم) و هەروا ڕوونتر لە سەر حەسادەتی جوولەکەکان کە لە دەوری کینەگەری و دڵ ڕەشیانەوەیە، پاش ئەوەی حەقانیەتی خودا و ڕەسووڵ و ئایینی ئیسلامیان بۆ دەردەکەوێ، پاشان دەکەونە باری حەسوودی بە دەلیلی ئەوەی خودا دەفەرموێ: (مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ).

بە کورتی و بە کوردی: حەسوودی کە هاڵاوی دەروونی پڕ لە جەهل و نەفامیە، بێ دەلیل

و بەڵگە بە گژ ئینسانی خودا پێداوداو دەچێ، بێخەبەر لەوەی خوداپێداو بەرگری لە پێداراوی ناکرێ. حەسوودی دەردێکە دوو شت نەبێ چاری ناکەن. ئەو دوو شتەش: عیلم و عەمەلن؛ واتا زانست و تێکۆشان. زانست پاش بڕینی قۆناغی جەهل دەگاتە قۆناغی ئیرادە و مەشیەتی باری کە هەموو شت لەوێڕا سەرچاوە دەگرێ و کەسیش ناتوانێ پێش بە ئیرادە و مەشیەتی خودا بگرێ و ئەوەش دەزانێ زانا: حەسوودی تەنیا زەرەر بە خۆی دەگەیەنێ نەک بەو کەسەی حەسوودی پێ دەبا. جا ئەوەش یەقینە ئاقڵ و زانا کارێکی وا ناکەن زەرەر بە خۆ بگەیەنن. قازانج بەو کەسەی ناخۆشیان بوێ. وەهروا دووبارە زانا دارێک ناچەقێنێ کە ئەگەر ڕوا، دڕوویەکەی دە چاوی خۆی بچەقێ و ئاوریش دە خەلەوخەرمانی خۆی بەردا.

پاش ئەوەی خودای تەعالا کە بەڵێنی دا بە خاوەن باوەڕان بە ئامۆژگاری و کۆمەک و یاریدەدان بەو شەرتەی پشت بە خودا ببەستن و ئومێد و هیوایان هەر لەو بێ، خودا هات بۆ وەی ڕابیتەی نێوان خودا و عەبد دوور نەکەوێ و شل نەبێتەوە وەسیلەی ئەوەی دانا کە هەمیشە ئینسان خودای لە بەر چاو و دڵ بێ. ئەو وەسیلەش **نوێژ** و **زەکاتە**. بەتایبەتی جگە لە حوکمەکانی دیکە. بۆ پشت ڕاست کردنەوەی ئەو باسە واتە (پشت بەستن بە خودا و دەس گرتن دە خودا) دەچینە خزمەت ئایەتی ١١٠ی بەقەرە:

> **﴿١١٠﴾ وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ وَمَا تُقَدِّمُواْ لأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللّهِ إِنَّ اللّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ**
>
> **نوێژ ئەنجام بدەن «بە ئاگاداری و هۆشیاری دڵەوە» زەکاتی ماڵتان بە تەواوی بدەن. هەر چاکەیەک کە وەپێش خۆتانی دەخەن، هیچی ون نابێت و لە ڕۆژی دواییدا هەمووی دەبیننەوە. بێ گومان خودا بە هەموو کار و کردەوەیەکتان بینا و ئاگایە.**

## تێڕوانینێکی بەجێ

پاش ئەوەی کە خودای مەزن پێی کوتن نوێژ و زەکات مایەی سەرکەوتن و زاڵ بوونە بە سەر ئارەزوو و ئاواتی هەر دوو دنیا، ئەو عەمەلە چاک و پاکە دەکاتە مایەی خۆشی و خۆشبەختی ڕۆژی دواییش، بەتایبەتی بۆیە دەفەرموێ خودا: (وَمَا تُقَدِّمُواْ لأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللّهِ...) واتە هەرچی پێشی خەن بۆ خۆتان لە چاکە، وە دەستتان دێتەوە لە لای خودا، چونکە خودا بینا و ئاگایە بەوەی دەیکەن، هیچی لێ ون نابێ.

چونکە دە ناو باسەکەدا باسی ناحەزترین سیفەتی ئەخلاقی ئینسـان کـرا وەک **حەسـوودی** بێ، پێویستە ئەو سیفەتە ناحەز و ناڕەوایە ڕوونتر کرێتەوە بۆ ئینسان بەڵکە بتواندرێ دووری لـێ بێتە جێ.

حەسوودی خاوەنی دوو بەرهەمی بۆگەن و فاسیدە کە دوچاری ئینسانی دەبێ:

١. حەسادەت بەڕێوە بردن. ئاماژەیە وەلای ئەوەی کە ئەو ئینسـانە حەسـوودە، بە حـوکمی خودای حەکیم ڕازی نەبێ دەڵێ: بۆچی خودا ئەو نیعمەت و فەزڵەی داوەتە ئەو ئینسانە نالایقە. دیارە ئەو شێوە بۆچوونە ئینکاری دەروونی دەگەیێنێ بە ئیرادە و مەشیەتی باریتەعالا. بەرهەمی ئەو حاڵەتەش بێ باوەڕی بە خودا و یاسای خودایە.

٢. دە ناو دەروونی ڕوحی ناپاکی حەسوودا ئەوەش شین بـۆتەوە: نـاڕازی بـوون بە قەزای باریتەعالا. چونکە سیمای باوەڕ و ئیسـلامبوون بەرهەمـی ڕازی بـوونی بە هەمـوو کارەکـانی خودا پێوە دیارە. کەسێک حاشای لە یەکێک لە سیفەتەکانی خودا بێ، ئەوە باوەڕی ناتەواوە.

## عیسا و شەیتان و چوار گوێدرێژ

بۆ مەزە و بزە ئەو داستانە لە سەر حەسادەت دەگێڕینەوە:

گۆیا جارێک حەزرەتی عیسا تووشی شەیتان دەبێ واتە ئیبلـیس. کە چـوار گوێـدرێژی بە بارەوە پێ دەبێ. عیسا لێی دەپرسێ: ئەو بارانە چـن بەو کەرانەوەن؟ شـەیتان لە وەڵامـدا دەڵـێ ماڵی تیجارەتن. بۆ مەگەر خوازیاری کڕینی؟ عیسا دەڵێ: با بزانم چن! بەڵکە بابەتی منیان تێدا بێ؟ شەیتان دەڵێ: باری هەوەڵیان زوڵم و زۆرداربیە. عیسا فەرمووی: کێ خاهـانە و بـۆ کێـی دەبەی؟ شەیتان کوتی: بۆ حاکمان. دووبارە عیسا کوتی باری دووهەم چیـیە؟ شـەیتان کـوتی: حەسوودی. عیسا کوتی: کێی خوازیارە و بۆ کێی دەبەی؟ شەیتان کوتی: عولەما. دووبارە عیسا کوتی: باری سێ چییە؟ بۆ کێی دەبەی؟ شەیتان کوتی: خەیانەت. عیسا کوتی کێی خاهانە و بۆ کێی دەبەی؟ شەیتان کوتی: بۆ تاجران. دووبارە عیسا کوتی باری چوار چییە؟ شـەیتان کـوتی: مەکر و حیلە. عیسا کوتی: کێی خوازیارە و بۆ کێی دەبەی؟ شەیتان کوتی: بۆ ژنان. حەزرەتـی عیسا کوتی ئەمن کڕیاری هیچیەک لەو ماڵە تیجاڕەی تۆ نیم و ئەوە لە مێژە ئەو شوغڵە دەکەی، بەهرەی هەیە بۆ تۆ؟ شەیتان کوتی: لەوەتا هەم ئەوەم شوغڵە و هەتـا بشـبم هەر ئەوەم شـوغڵ دەبێ، چونکە بەهرەی من دەوەیدایە.

بۆ زێدەزانین بڕوانە لە تەفسیری کەبیر ئیمام ڕازی، ج٣، ل ٢٣٨-٢٣٧ بۆ باسی حەسادەت.

وەک دەڵێن گاور و جوولەکەکان: بەهەشت هەر بۆ مەیە و ئێمە دەچینە تێی و کەسی دی ناچێ. ئینجا خودای تەعالاش بۆ پووچەڵ کردنەوەی قسە و باوەڕەکەیان ئایەتی ۱۱۱ی بەقەرە دەنێرێتە خوارەوە بۆ حەزرەتی ڕەسووڵ:

**﴿۱۱۱﴾ وَقَالُواْ لَن يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلاَّ مَن كَانَ هُوداً أَوْ نَصَارَى تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنْتُمْ صَادِقِينَ**

**خاوەن ئایینەکان ـ واتە جوولەکەکان و دیانەکان ـ دەیانکوت لە ئێمە زیاتر هیچ کەس ناچێتە بەهەشتەوە. ئەوە زەڕە خەون و خەیاڵاتی پووچی خۆیانە. ئەوجار خودا بە پێغەمبەر دەفەرموێت: پێیان بڵێ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن، دە وەرن شاهید و بەڵگە لە سەر ئەو داوەتان بێننەوە.**

## تێڕوانین لە سیمای دەروونی ئایەتی ۱۱۱

که ڕازاوەتەوە بە ڕاز و ڕمووزاتی جوان:

لە سیمای ئەو ئایەتەڕا ئەوە دەردەکەوێ: لە نیزامی داوا و داواکاریدا هیچ شت تەئسیر ناکا بێ لە دەلیل و بورهان لە سەر داوا، یانی دەبێ بۆ ئیسباتی داوا دەلیل هەبێ، هەربۆیەشە خودای تەعالا دەفەرموێ (قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنْتُمْ صَادِقِينَ) واتە دە پێیان بڵێ ئەگەر ڕاست دەکەن کە هەر ئێوە دەچنە ناو بەهەشت و کەسی دی ناچێ، دە دەلیلو بورهان نیشان دەن!

هەروەها ئەوەش دەردەکەوێ لە ناو دەروونی ئایەتەکە: حەسادەت و کینەبەری چاوی دڵ دەگرێ ڕێ نادا نووری دڵ حەق چاو کا و ڕێگاش نادا پاش و پێشی ئەو قسەی دەیکا ببینی تاکوو بزانێ دوایەکەی دەبێتە چی؟

دیارە جوولەکەی نەسارا بێ خەبەر لەوەی خودا لە سەر ئەو ئیدیعایەی دەیکەن واتە (بەهەشت هەر بۆ مەیە) داوای دەلیل و بورهانیان لێ دەکا، ئەوانیش دیارە بێ دەلیلن لەو بارەوە. ناچار بێ دەلیل و جواب دادەمێنن. دنیا دەزانێ کە درۆیە دەکەن ئابڕوویان زۆر پتر دەچێ لەوەی کە هەر کافر بن.

پاش ئەوەی کە خودای تەعالا داوای بێ بنەما و بێ دەلیلی جوولەکە و گاورەکان ڕەد دەکاتەوە، ئەوجار بە وەسیلەی ئایەتی ۱۱۲ی بەقەرە دەستووراتێکی گشتی واتە بە تێکڕایی بێ دەس نیشان کردنی گەل و هۆز و نەتەوەیەک، بەڵکە بە تێکڕایی دەفەرموێ: وا نییە وەک

جـوولەکە و گـاور دەڵـێن، هەر ئـێمە ئەهلـی بەهەشـتین کەسـی دی ، بەڵـکە نەتەوەی غەیـرە جوولەکە و گاوریش دەچنە بەهەشت، یانی هەرکەسێک خۆی بـداتە دەسـت خـودا واتە بە دڵ ڕووی تێ بکات و بیپەرستێ.

بۆ ئیسباتی ئەو داوایە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۱۲ی بەقەرە کە لەو بارەوە دواوە:

﴿۱۱۲﴾ بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِندَ رَبِّهِ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ

**نەخێر وانییە کە جوولەکەکان دەیڵێن گوایە هەر ئەوان دەچنە بەهەشـت، بەڵـکە هەر کەسـێک کە ڕووی کردبێتە خودا و لەو زیاتر کەسێکی دی نەپەرستێت و چاکە کردنی پیشـە بـێ، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا دەچێتە بەهەشت و لە لای خودای خـۆی پاداشـی چاکەکـان وەردەگـرێتەوە و موژدەی خۆشی پێ دەدرێت و تووشی هیچ جۆرە غەم و ترسێکیش نابێت.**

## تێڕوانینێک

بـا ئـێمە ئەو شـتە حاشـا هەڵنەگـرەی قبـووڵ کەیـن و خـۆی لـێ نەشـارینەوە: هەرکەس خواپەرستی بەڕاستی بێ، دەزانێ کە بێ لە خودا هەموو شت هیچە و بۆ خۆ تەسلیم کردن نابێ و هەرکەس بە ئەمر و دەستووری باری وەجووڵێ، جگە لەوەی دە بەرابەر هەموو گیر و گرفتـی ژیانی دنیا خۆ ڕاگرە و نەبەزە، لە ڕاست هەموو تەنگ و چەڵەمەیەکی دەوران بەتوانـا و سـەبر و خـۆڕاگرە. دڵیشـی پـڕ لە هیـوا و هومێـدی هەر دوو دنیـایە و ئەگەر تووشـی بە تووشـی ناخۆشـییەکی بـوو و خێـرا بـۆ چـارەی ئەگەڕێ هـۆیەکەی وەدۆزێ تـاکوو جـارێکی دی لەو دەروویەوە تووشی بە تووشی ئەو ناخۆشیەوە نەبێتەوە. ئەگەر هـاتوو تووشبـوونی بە تووشـی دەردی بێ چارە بوو، فەورەن بە پێی ئیمان و باوەڕی بە قەزای باری خۆی حەواڵەی خودا دەکا. خۆ وە خودا دانی بە چارە دەزانێ و دادەنێ. ئەودەم خەم و خەفەت سوودی نـابێ. کەوایە ئەی خاون نامەکان شوێن هیوا و ئاواتی بێ بنەما و هیچ و پووچ مەکەون و واز لەو درۆیانە بێـنن کە دەڵێن ئێمە لە سەر ڕێی فڵان پێغەمبەر و فیسـار پێغەمـبەرین. چـونکە بە تەئکیـد ڕێـی چـوونە بەهەشت بەڕاست ڕو دە خودا کردنە، خۆ تەسلیم بە خودا کـردنە، ئەوەش خـزمەت بە ئینسـان کردنە و پارازتنی مافی هەچی گیانە.

**ئـاوڕدانەوەیەک:** خودای تەعالا بۆ زێدە ئاگاداری موسوڵمانان لە سـەر ئاکـار و ئەخلاقـی گـاور و جوولەکـان، زیـاتر بەیانـات نیشـان دەدا کە ئەویـش ئەوەیە: ئەوانە واتە گـاور و

جوولەکەکان دوو جۆرە ئیدیعایان هەیە و دەڵێن: ١. ئێمە بەهەشتین و بێ لە مە کەس بەهەشتی نییە! ئەوەش کە داوایەکی باتڵ و بێ بنەمایە ٢. جـوولەکە دەڵـێن: گـاور لە سـەر هـیچ دیـن و ئایینێک نییە، و هەروا گاورەکانیش دەڵێن: جوولەکەکان لە سەر هیچ ئایینێ نین. بە کورتی و بە کوردی چونکە خوارن دەگەڵ خودا، دەگەڵ خۆشیان کەوتوونە خواری و بەگژداچوون. بـاری هەوەڵ بە شێوەی ئیجابی دەڵێن: هەر ئێمە بەهەشتین و بـاری دووهەم بە شـێوەی نەفـی یەکـتر دەڵێن: ئاینی ئەو هیچ نییە و ئەوی دیش هەروا. واتە هەر یەکەی دینی یەکتر بە بەتـاڵ دادەنـێن. بۆ شاهیدی لە سەر ئەو داوایە دەچینە خزمەت ئایەتی ١١٣ی بەقەرە:

﴿١١٣﴾ وَقَالَتِ الْيَهُودُ لَيْسَتِ النَّصَارَى عَلَىَ شَيْءٍ وَقَالَتِ النَّصَارَى لَيْسَتِ الْيَهُـودُ عَلَى شَيْءٍ وَهُـمْ يَتْلُونَ الْكِتَاب كَذَلِك قَالَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ فَاللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَـةِ فِيمَـا كَانُواْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ

جوولەکەکان دەیانکوت: نەسارا واتە دیانەکان لە سەر ڕێگای ڕاست نین، چـونکە باوەڕیـان بە پێغەمبەرایەتی عیسا نییە و نەبووە. بەڵکە دەیانکوت: هێشتا عیسا نەنێردراوەتە خوار. هەرئاوا دیانەکـانیش دەیـانکوت جوولەکەکـان لە سـەر ڕێگـای ڕاسـت نـین. ئەوە لە حاڵێکـدایە ئەو پێکـدادانەیان دەگەڵ یەک دەکـرد کە هەر دوو لایـان کتێبەکـانی خۆیانیـان دەخوێنـدەوە کە تەورات و ئینجیلن، کەچـی هیچ کـام لەو جـۆرە قسـانەیان لە کتێبەکانیانـدا نەبـوو و نەدەدی. چونکە ئەو قسـانەی ئەوان دەیـانکرد لە نـاو کتێبەکانـدا نەبـوو، پـێش هـاتنی ئـایینی ئیسـلام بتپەرستەکانیش بەرانبەر جوولەکە و دیانەکـان هەمـان شـتیان دەکـوت چـونکە باوەڕیـان بە ئایین و دواڕۆژ نەبو. جا ئەوانە کە هەر یەکەیان خۆی بە ڕاست دەزانێ، لە ڕۆژی دواییـدا ئەو ڕاستیەی کە لەوان ئاڵۆسکاوە و جیاوازی کەوتۆتە نێوانیان لە سەری، خودا ئەو ڕاستیەیان بۆ دەردەخات. جا ئەوەی لە سەر ڕێگای ڕاست بێ سەرئەنجامی بەهەشـتە و هەر کەسـیش کە لە سەر ڕێگای چەوت و چەوێڕ و پووچەڵ بێ، ئەوە بەرەو دۆزەخ ڕادەپێچرێت.

## دەمەقاڵێی جوولەکە و گاور

**تێڕوانینێک:** سەیرکە و ئینسافانە قەزاوەت کە، ئەو کارەساتە دە ناو خەڵکـی ئێسـتای بە نـاو موسوڵماندا بە ڕوونی چاو دەکرێ. هەر دەستەیەک خۆی بە موسوڵمان دەزانـێ و دەسـتەکەی دیکە بە پووچ و باتڵ لە قەڵەم دەدا. دەگەڵ ئەوەی کە هەر دوو لاشیان قورئان دەور دەکەنەوە و مانای لێ دەدەنەوە. خۆ دیارە قورئانیش ئەو حەرەکەی وان بە باتڵ دادەنـێ، چـونکە قورئـان لە

سەر ئەساسی مانای ئایەتی ١٠٣ی ئالیعیمران ئەمر بە یەکەتی و برایەتـی و یەکپـارچەیی دەدا: (وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ...) واتە: **هەمووتـان پشـت بە هێـز و توانـای خـودا ببەسـتن و دەسـت بە قورئـانەوە بگـرن و لە نـاو خۆتانـدا نـاکۆک مەبـن، هـۆزایەتی و ڕەگەزایەتـی لە یەکـترو جیـا نەکاتەوە.**

خاوەن کتێبەکان دەمارفرۆشی دەکەن دەگەڵ یەکا و هەر بە هەوا و هەوەس و ئارەزوو و بێ بەڵگە، جوولەکە و گاور بە ناڕاست و بێ باوەڕ دەزانن هەروەک گاوریش بێ دەلیـل و بورهـان جوولەکە بە ناڕاست و بێبـاوەڕ دەزانـێ. دەگەڵ ئەوەش کە تەوڕات و ئینجیـل هەردووکـان وە درۆ دەخاتەوە. هەروەک بتپەرستەکانی عەرەب و پێش وانـیش ئەو شـێوە لاسـاریانەیان بـوو، هیچ خـاوەن نامەیەکیـان بە خـاوەنی ئـایین نەزانیـوە. بتپەرسـتەکانی مەکـکە کە پێغەمـبەر و موسوڵمانەکانیان لە مەککە پاڵ پێوە ناوە و دەریانپەڕاندن و نەیانهێشت خوداپەرسـتی بـکەن لە کـابەدا، پاشـان لە سـاڵی حـودەیبیەدا کە پێغەمـبەر دەگەڵ هێنـدێک لە موسـوڵمانەکان بـێ چەکوچۆڵ چوونە مەککە بۆ عەمرە و زیارەتی کەعبە، بێباوەڕان نەیانهێشت بچنە ناو شـارەوە و لە قەراغ شاری مەککە گێڕانیانەوە. ئەوە قیطسن ڕوومانی کە بتپەرست بووە، دوای عیسـا بە ٧٠ ساڵ چوو بۆ سـەر بەیتولمـوقەدەس و وێرانـی کـرد و هەرچـی نوسـخەی تەوڕات بـوو لە بەیتولموقەدەسدا هەمووی سـووتاند هەروەک ئامـاژە وەلای ئەو باسـە دەکـا دە ئـایەتی ١١٤ی بەقەرەدا:

**﴿١١٤﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَاجِدَ اللّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَى فِي خَرَابِهَا أُوْلَـئِكَ مَـا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَا إِلاَّ خَآئِفِينَ لهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ**

کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە ڕێ دەگرێ لە خەڵک بۆ ئەو جێگایـانەی خوداپەرسـتییان تێـدا دەکرێ و نـاوی خودایـان تێـدا دەبرێـت و هەروا تێبکۆشـێ و هەوڵ بـدات بـۆ وێـران کـردن و تێکدانیان. ئەو کەسانە مافی ناوچوونە ئەو شـوێنە پیرۆزانەیـان نیـیە و لە ڕۆژی قیامەتیشـدا سزایەکی گەورە و گرانیان بۆ هەیە.

## کێ زۆردارترە لەوەی مزگەوتان دادەخا

وەک دیارە دەبێ ئەو تاوانە گەورەی کە ئەو ئایەتە باسی دەکات پێش هاتنی ئیسلام و پـاش هاتنیشی زۆر جار ڕووی داوە، ئێسـتاش ئەگەر بەرجەوەنـد بـی، دەبینـی لێـرە و لەوێ و وڵاتە ئیسـلامیەکان و وڵاتـی دیـکەی نائیسـلامی هەیە و ڕوو دەدات. هەن دەسـتەڵاتداران و

کاربەدەستانی سەرەڕۆ بەرگری دەکەن لەو کەسانەی کە دەیانهەوێ تێکۆشن بۆ پەرە پێدانی ئیسلام و ئاوەدانکردنی شوێنە ئایینییەکان، دەستەڵاتداران ئەو کەسانە و ئەو خەتە پاکە بە دوژمنی خۆیان دەزانن و هەموو جۆرە ناوی ناحەز و پڕوپاگەندەیەکیان بۆ ڕێک دەخەن و دەیانخەنە ژێر چاوەدێری و بوختانەوە و دەیانهەوێ بە وەدواخستنی ناوی ناحەز لە بەر چاوی خەڵک ناشیرین و عەیبداری کەن. بێ گومان ئەو جۆرە کەسانە دەکەونە بەر هەڕەشەی ئەو ئایەتە.

## تێهەڵڕوانینێک لە سیمای ئەو ئایەتە پیرۆزەی ١١٤ی بەقەرە:

ئەوەی بە واقیعی ناهێڵێ خەڵک لە سنووری عەداڵەت و ئینساف و کەرامەتی بەشەری تێپەڕێ، خوداپەرستی و خوداناسی و خۆناسییە، کە ڕێ نادا دەستدرێژی بۆ مافی کەس بکرێ. دەستی زۆردار و دەس‌درێژان دەبەستێ لە ڕاست ماف و نیزامی پێکەوە ژیان. هەر لە بەر ئەو یاسا جوان و پاکەی ئیسلامە کە فەرمان دراوە ڕێز و ئیحترام بۆ کەنیس و کلیسا و کەنیشت وشوێنە خواپەرستییەکان دابندرێ.

ئەو پێک هەڵقڕانەی جوولەکە و گاور بوو هۆی کوشتنی یەحیا و زەکەریا بە دەستی یەهوودییەکان لە وڵاتی شام واتە ئیلیاء. ئەو کارەساتە کینەی لە ناو دڵ و دەروونی گەلی مەسیحیەکاندا ناشت بەو هۆیە ئەوانیش کەوتنە سەر خەتی تۆڵە و هەل بۆ تۆڵە. جا لەو ڕووەوە خۆیان دەستەو داوێنی یەکێک لە پاشایانی ڕووم بوون کە ناوی طنطلوس بوو. ئایینیشی مەسیحی بوو. داوایان لێ کرد کە هێز واریدی شام کا بۆ لە ناو بردنی یەهوودییەکان. شاش بێ ڕەحمانە هێرشی کردە سەریان و تاڵان کردن و تاروماری کردن بێر و بەوێدا. هەموو کتێبەکانی تەوراتیشیان پرژ و بڵاو و نابوود کردن. تاکوو خۆیان گەیاندە ناو جەرگەی بەیتولموقەدەس و داگیریان کرد و یەهوودییەکانیشیان پەرت و بڵاو کردن بێر و بەوێدا. ئەو شوێنە پیرۆزەیان (قدس) وێران کرد خەڵکیشان لە ڕوو تێکردنی ئەو شوێنە پرینگاندەوە و حەتا کەلاکە بۆگەن و تۆپیویان دەخستە ناوی قودسەوە تا خەڵک بە تەواوی لەو شوێنە بێزار بێ. بەڵام بێ خەبەر لەوەی دڵی ڕەشی بێ‌باوەڕان ڕێ بەرەو حەق دەرناکا، ئەویش ئەوەیە: ئەو ماڵە پاکەی قودس کە شوێنی دایکی پاکی وەک حەزرەتی مەریەمە و ڕۆڵەی پاکی ناوداری حەزرەتی عیسایە، شوێنی وا پاک نە گڵاو دەبێ بە ناپاکان، و نە بە کوشت و کوشتار و وێران کردنی دار و بەردی لە ناو دەچێ و لە ناز دەکەوێ. سەرەنجام ئەو ماڵە پاکە (قودس) تا زهووری ئیسلام مەیدانی شەڕ و

کوشت و کوشتاری جـووله‌کە و گـاوران بـوو، بەڵام لە سـەرەتای سـیوادی ئـایینی ئیسـلام بە دەستی ڕۆڵەی پاکی ئیسلام حەزرەتی عومەر فەتح کرا و هاتەوە دەستی پاک‌ناسـان و پاکـان و ئاوەدانیان کردەوە. مێژووی ئیسلام شاهیدی ئەو ماجەرا و کارەساتانەیە. بۆ زێدە زانین بڕوانە لە تەفسیری کەبیر و تەفسیری تبیین القرآن هەر لە سەر ئەو ئایەتی ١١٤ەیە.

## بەخت‌نەسـر و وێران کردنی بەیتولموقەدەس

هێندێک دەڵێن ئەو شایە ططلوس بووە و هێندێکش ڕا و بۆچوونیان وایە بەخت‌نەسـر بووە و هۆزی نەساراش یاریـدەیان داوە. هنێـدێکیش هەن ئەو نەزەرەی دوایە واتە بەخت‌نەســر ڕەد دەکەنەوە بەو دەلیلە: بەخت‌نەسـر پێش لە دایک بوونی حەزرەتی مەسیح بووە زۆر. نەسـاراش پاش حەزرەتی مەسیح بوون و باوەڕیشیان بە حورمەت و ڕێـزداری بەیتولمـوقەدەس زۆر بـووە جا چۆن دەکرێ لە سەر ئەو حاڵەتە بۆ ڕووخـان و وێـران کردنـی ئەو شـوێنە پـاکە تێکۆشــن و یاریدەی زاڵمانی وەک شا ططلوس بدەن. تەفسیری کەبیر بۆ باسی مزگەوت ئەگەر دەخوازێ.

نەتەوەکـانی پـێش ئیسـلام بۆچوونیـان وا بـوو کە خوداپەرسـتی هەر دەبـێ لە پەرسـتگە (مەعبەد)دا بێ دەنا دروست نییە. جا بۆ وەی خەڵک بە تەواوی ئەوە بزانێ کە ئایینی ئیسلام زۆر گوشاد و بەفراوانە بە دروستی داناوە، بۆ هەموو کەس لە هەموو شوێنێک خوداپەرسـتی لە هەر شوێنێک بۆی دەکرێ بیکا و ڕاینەگرێ و هەر لایەک بە ڕووگە بزانێ با ڕووی تێکا. بۆ تەئییـدی ئەو داوایە دەچینە خزمەت ئایەتی ١١٥ی بەقەرە:

**﴿١١٥﴾ وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ إِنَّ اللّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ**

**هەموو لایەکی دنیا، چ ڕۆژهەڵات و چ ڕۆژئاوا هەموو ئی خـودایە، کەوایە ڕوو دە هەر لایەک بکرێ بە نیەتی خوداپەرستی، هەر ڕووی دە خـودایە. تەجەلای خـودا دنیـای دەخـۆوە پێچـاوە، مرۆڤ ڕوو بکاتە هەر لایەک خودا ئاگاداریەتی، خـودا عـیلم و زانیـاری بەربـڵاوە بە هەمـوو کائیناتدا.**

بەشی زۆری قورئان‌زانەکان نەزەریان وایە ئەو ئایەتە لە بابەت نوێژ خوێنـدن هـاتۆتە خـوار واتە دە کاتی بەجێ‌هێنانی نوێژ ڕوو دە کوێ کرێ. بەشێکی دیکەش لە قورئان‌زانان دەڵـێن: ئەو ئایەتە تایبەتی نوێژ نییە بەڵکە بۆ ئیسباتی بـوونی خـودایە لە هەمـوو شـوێن. واتە داوا لە خـودا نیازی بە تەعینی شوێن نییە. لە هەر جێیەک بتهەوێ خودا لەوێیە. ئەمما تەعینی قیبلە بـۆ کـاتی

عیبادەت بۆ نەزم و نیزامە و تەعینی سنووری ئۆمەت.

بۆچوون زۆرن لە سەر هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە. مەسەلەن:

یەهوود دەڵێن هەر ئێمە ڕاستین و لە سەر حەقین. ئی دی گومڕان. چونکە قیبلەی مە بەیتولموقەدەسە. خاوەنی ڕێزی تەواوە، چونکە خودای تەعالا لە سەر ئەو بەردە (صخره)دا بۆ ئاسمانەکان چووە. (معاذالله!) ئەهلی نەسارا دەڵێن: هەر ئێمە ڕاستین کەسی دی نا، چونکە قیبلەی مە شوێنی لە دایکبوونی حەزرەتی عیسا مەسیحە واتە (بەیتاللحم) بە کوردی و بە کورتی هەرکەس بۆ ئیسباتی داوای خۆی دەسی داوێتە دەلیلێک.

خودای تەعالاش بۆ ڕوون کردنەوەیان و حەق پێ ناساندنیان ئەو پەیامە پیرۆزەیان بۆ دەنێرێ و تێیان دەگەیێنێ نە قودس دە زاتی خۆیدا سەربەخۆ خاوەن ڕێزە نە بەیتاللحم. و ئەوانەش بۆ فەخر پێ کردن و بە خۆ نازین نابێ بەڵکە حەق و ئەهلی حەق بۆ بە خۆنازین بە ئیتاعە کردن و فەرمانبەری خودا و ڕەسووڵی خودا دەبێ. کەوابێ دەبێ ئەهلی حەق موسوڵمان بن. بۆ زێدە زانین تەماشای تەفسیری تبیين القرآن کەن هەمان ئایە.

جوملەی (فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّه) ئاماژەیە وەلای ئەوەی کاتێ وا هەڵکەوت نەتزانی قیبلە لە کوێوەیە، ڕوو دە هەر کوێ کەی، قیبلەیە و خودا هەیە و ئاگادارتە. چونکە خودا خاوەنی ڕەحم و عەداڵەتی بەرفراوانە، بەهانەگر نییە بۆ عەبدانی پاکی خۆی. مەسەلەی (فَثَمَّ وَجْهُ اللّه) واتە هەر کوێ حەز کەی خودای لێیە، بۆ وێنە (إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ...)، (إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللّهِ)، (كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ)، (فَثَمَّ وَجْهُ اللّه) سەراپای ئەوانە دەڵێن خودا لە هەموو شوێنێکە و هەروا چەن بابەتی دیش ...

لەوە پێش گاور و جوولەکەکان ئیحتیرازی خۆیان گرت و چاکی خۆشیان ڕاگەیاند وەک ئایەتی ١١١ی فەرمووی و هەروەک ئایەتی ١١٣ی بەقەرە دووبارە فەرمووی و دووبارە هاتنەوە سەر ڕێگای هەڵە و خەتا و تاوان. ئەویش ئەوەیە شەریک بۆ خودا دادەنێن وەک ئایەتی ١١٦ی بەقەرە تەئکیدی ئەو ڕاستیەی دەکا. کەوابێ دەچینە خزمەت ئایەتی:

﴿١١٦﴾ وَقَالُواْ اتَّخَذَ اللّهُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَل لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ

**جوولەکەکان دەیانکوت عوزەیر کوڕی خودایە، دیانەکانیش دەیانکوت عیسا کوڕی خودایە، بتپەرستەکانیش دەیانکوت مەلائیکەکان کچی خودان. نەخێر؛ هیچکام لەوانە وا نییە و خودا دوورە لە هەموو شێوەیەکی ئادەمیزادی، بەڵکو ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هەمووی ئی**

خودایە و گشتیان بە ملکەچی و بەندایەتی لە ژێر فەرمانی خودادان.

## ڕوو لە کوێ کرێ، خودا لەوێیە

**تێڕوانین**: وشەی (قـانتون) واتە ئیتـاعە بە دەوامـی. دیـارە ئیتـاعەش لە خـاوەن هەسـت و شعوورەوە دەبێ و (ما)ی (ما فی السموات) بۆ خاوەن شعوور و بێشعووریش دەبێ. کەوابـێ ئیشکال دێتە ڕوو لەو دەروەڕا کە بێشعوور ئیتاعەی لە دەست نـایە. کەوابـوو یـا دەبـا لە بـاتی (قانتون: جەمعی موزەککەر) (قانتات: جەمعی مێ) هاتبایە و یا دەبـێ بڵێـێن (مـا) چـونکە بـۆ عاقڵان و بێئاقڵانیش دەبێ، باری ئاقڵەکان دە نەزەر بگیردرێ. هەر ئاوەشە خـودای تەعـالا کە وشەی (قانتون: جەمعی موزەککەر)ی هێنـاوە. چـونکە ئیتـاعە هەر لەوانڕا دەبـێ. دەشـکرێ بکوترێ (ما) واتە گشت بوونەر. بوونەوەریش ئەساسەن فەرمانبەری بارین.

## ئاگادارییەک لە سەر بێنە و بەرەیەک لە نێوان عەلی و مەسیحییەک

ئەو نەسارایە بە حەزرەتی عەلی دەڵێ: بۆ باوەڕو وایە عیسا کوڕی خودا نییە، دەگەڵ ئەوەی باوەڕتانە عیسا بابی نییە لە فووی جبرەئیـلڕا بەدی هـاتووە، لە نـاو زگـی حەزرەتـی مەریەمە و هەروا لە ئینجلییشدا هەر بە (ابن الله) ناو براوە؟

حەزرەتی عەلی لە وەڵامدا دەڵێ: ئەگەر بۆو سـابیت ببـایە عیسـا لاڕێ نەبـایە و ئیتـاعەی خودای وەلا نەنایە، دەهاتمە سەر عەقیدەی ئێوە کە عیسا کوڕی خودایە!

ئەو پیاوی مەسیحی لەو وڵامەی عەلی گرژ دەبێ و دەڵێ: چۆن ئەتـۆ دەڵێـی عیسـا لاڕێ ڕۆیشتووە و ئیتاعەی خودای نەکردووە دەگەڵ ئەوەی تەواوی ژیانی دە عەبـدایەتی و ئیتـاعەی خودادا بە سەر بردووە.

حەزرەتی عەلیش دەڵێ: دەیجا ئەگەر وا دەزانن عیسا ئەوا ئیتاعەی خودای کردووە و خۆی بە عەبدی خودا زانیوە، چۆن دەتوانن بڵێن خودایە یا کوڕی خودایە؟! چـوونکە کەسـێک عابـد بێ، ناکرێ مەعبوودیش بێ.

بۆ زێدەزانین سەیری تەفسیری کەبیر کە، ج۴، ل ۲۷.

بۆ قایم و قۆڵ کردنی ئەوەی کە خودا تەنیایە و بێ وەلەدە و ڕەبی موتڵەقە، دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۱۷ی بەقەرە:

﴿۱۱۷﴾ بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَإِذَا قَضَى أَمْراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ

**ئەو خودایە کە ئاسمانەکان و زەوی بە شێوەیەکی وای ڕازاندۆتەوە و ڕاینـاوە کە ئینسـان لێـی سەرسـام دەمێنـێ، تەماشـای ئەو گـومبەزی وا شـین و بـێ کـۆڵەکە بـکە، چـۆن ئەو هەمـوو ئەستێرانە و مانگ و ڕۆژی تێدا سازاندووون کە بە هیچ حیسـابێک دە حیسـاب نـایە. شـەوانە ئەستێرەکان زەوی و نێوان ئاسمان و ئەرز ڕووناک دەکەن. بڕوانە و ڕامێـنە لەو گیـا و گـوڵ و دار و دەوەنەی لە زەویـدا هەمـووی بە جۆرێـک و بە لەونێـک سـازاندووە کە هەچـی ئەقـڵ وشعوورە لێی سەرسام دەمێنێ و دەتاسێ. خودا خاوەنی دەستەڵاتێکی وایە بە هەرچی بڵێ بـبە کتوپڕ دەبێ و دێتە دی.**

## قەزا و قەدەر

وشەی (قضیٰ) دە قورئاندا بە زۆر مانا هاتوە. سەیرکە بۆ نموونە:

١. وەدیهێنان واتە خەلق: (فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ) (فصلت: ١٢)

٢. ئەمر کردن: (وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ) (اسراء: ٢٣)

٣. حوکم کردن: (إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) (یونس: ٩٣)

٤. خەبەر پێدان: (وَقَضَيْنَا إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ فِي الْكِتَابِ) (اسراء: ٤)

٥. لێبوونەوە لە کار: (فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ) (احقاف: ٢٩)

٦. قەزاوەت: (إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) (یونس: ٩٣)

و هەروا مانای دیکەش.

لێرەدا زۆر ئەساسییە و پێویسـتە بە کـورتی باسـێک لە قەزا و قەدەر بکـرێ چـونکە لە نـاو ئایەتەکەدا ئیشارە وەلای قەزا کراوە بە وەسیلەی وشەی (قضی).

قەزا واتە وەدیهێنـانی شـت. قەدەر: واتە ئامـادەکردن و ئەنـدازەگرتنی شـت. لە سـەر ئەو ئەساسە دەکرێ خۆپاراستن لە قەدەر، بەڵام خۆلادان و خۆ پاراستن لە قەزا ناکرێ و ناگونجێ.

نەقڵێکی دڵگر: دەگێڕنەوە کە جارێکی حەزرەتی ڕەسووڵ لە بەر ئەشکەوتێکا ڕادەوێستێ. ئەو ئەشکەوتەش بە هۆی ئەوەی کە ورگی دابوو ڕووخانی لێ چاو دەکرا. کاتێ پێغەمبەر زەینی دەکاتێ لێی وەدوور دەکەوێتەوە نەکا بڕووخێ و بە سـەریدا بـێ. هـاواڵانی ئەو حەرەکە دەرک دەکەن لە پێغەمبەر و لێی دەپرسن: ئەو لاچوونەی تۆ یاڕەسـوول ئەوەی لـێ دەردەکەوێ بە لای ئـێمەوە کە تـۆ لە دەس قەزا ڕادەکەی؟ ئەئەوە بـۆ مە جێـی پرسـیارە چـونکە ئەو حەرەکەیەت ئەوەمان پێ دەڵێ هەڵاتن لە بەر قەزا دەکـرێ و دەگـونجێ. حەزرەتـی ڕەسـوولیش لە وڵامـدا

دەفەرمویَ: لە دەس قەزا ڕادەکەم بۆ لای قەدەر.

بە کورتی بە ئەندازەی ئەقڵ وشعوورێکی کە خودا پێـی بەخشـیوی، بـۆ پاراسـتنی لەش و گیان و ویژدان دەبیَ وریایی لە خۆ بکەی و لە خەتەر و ڕوودانی ڕووداو خۆ بپارێزی.

## مانای (كُنْ فَيَكُونُ)

وشەی (كُنْ فَيَكُونُ) لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتووە، ماناشی ئەوەیە: یانی هەرکاتیَ خودا ئیرادە بکا شتێکی پێکبێنیَ و وەدی بێنیَ هـیچ نیـازی بە کەرەسـە و وەسـایل نیـیە و نـابیَ واتە کارسازی و نەخشە و نەقشەدارڕژتنی پێشـەکی پێویسـت ناکـا و نیـیە. بەڵـکە بـۆ ئەو شـتەی کە ئیرادەی پێکهاتنی و وەدیهێنانی دەکا، ئەمری پیَ دەکا (كُنْ: ببە) (فَيَكُونُ: ئەو شتە دەبیَ).

لەو بەیانات و ئیرادەیەی باری کە لە زۆر شوێنی قورئاندا بە کار هاتووە هەسـت بە گیـر و گرفتێک دەکریَ کە زۆر پێویست و ئەساسییە ئەو گیر و گرفتە لابـریَ و وڵامـی وەدریَ. گیـر و گرفتەکە ئەوەیە: وشەی (كُنْ) ئیحتیمالـی دوو مانـای هەیە: یەک مەجـازی؛ یەک حەقیقـی و ڕاستی. مەجازییەکەی واتە خێرا پێکهاتنەکە یانی توانایی خودا هێندە تەواوە بۆ پێکهـاتنی شـت هیچ نیازی بە کەرەسە و وەسیلە نییە. بە خێرایی هەچی ئیرادە کا بڵیَ ببە، دەبیَ.

مانای حەقیقی و ڕاستی (كُنْ) دەو ئایەتە پیرۆزەدا ئەوەیە: خودای خاوەن توانا و تەواو بۆ پێکهاتن و وەدیهێنانی هەر شتێکی بیهەویَ تەنیا ئەوەندەی بەسە و کافییە بڵیَ (كُـنْ) واتە بـبە، بیَ‌گومان ئەو شتە دەبیَ: (فَيَكُونُ).

دە مانای مەجازی (كُـنْ)دا کە بە واتـای خێـرا و دەسـتەولەجیَ پێکهـاتنی شـتە، قەسـت کراوەکەیە هیچ گیر و گرفت نایەتە ڕوو، چونکە خودا ئەو حەق و هێزەی هەیە بیَ‌گومان، بەڵام دە مانای حەقیقەتی (كُنْ)دا کە بە واتای وەدیهێنان و پێکهاتنە، ئەو گیـر و گـرفتە دێـتە ڕوو: شتێکی کە قەرارە ببیَ، یا هەیە یا نییە؛ ئەگەر هەبیَ، هـیچ نیـازی بەوە نیـیە پێـی بکـوتریَ بـبە، چونکە هەیە؛ ئەگەر نەشبیَ و پێی بکوتریَ ببە، ئەوە پێی دەکوتریَ ئەمر و دەستوور بە سەر شتی نەبوو. جا خۆ ئەمر بە سەر بووندا ڕەوایە نەک بە سەر نەبووندا. ئەوەیە گیر و گرفتەکە.

دە وەڵامی ئەو گیر و گرفتەدا دەبیَ بۆ لیَ‌دەرباز بوون و نەجـات لەوی بکـوتریَ: بـوون و نەبوون واتە عەدم و وجوود. فەرقیان لە کن مەخلووقاتدا هەیە، ئەوە ئـێمەی ئینسـانین شـت لە سـەر ئەساسـی بـوون و نەبـوون بەراورد دەکەیـن و هەڵدەسـەنگێنین و ئـیللا لە لای خـودای

خەللاق و بەتوانا و خاوەنی عیلم و زانستی بەرفراوان، نە نهێنی و نە حـازر، نە مەوجـوود و نە مەعدووم، نە ڕابردوو و نە نەهاتوو، نییە؛ بەڵکە هەموو لە لای باری یەکسانە. چـونکە ئیـرادە و هەست و حەزی خودا بۆ بوونی هەر شت بکەوێتە گەڕ، ئەو شتە هەیە و دەبێ دە عیلمی ئەودا بێ و ئەمری باری بەو شتە دروستە و ڕەوایە. چونکە ئەمـر بە شـتێکە کە دە عیلمـی ئەودا هەیە. ئەمر بەو شتە نییە کە دە عیلمی ئەودا نییە. بۆ زێدەزانین ڕووکە دە تەفسیری کەبیر، هەمان ئایەی (كُنْ فيكون)

ئینسانی بێ باوەڕ لە هیچ بار و دۆخێک وەقرە ناگرێ. دڵی تاریک و بێ پـاڵ و پشـت مـل نادا بۆ دەلیل و بورهان و لە ڕاست هەموو حەق و ڕاستی، بەهانە وقسەی ناقۆڵا دێنێتەوە. وەک جوولەکە و گاورەکان. تا وێستا دەیانکوت خـودا هاوبەشـی هەیە، خـودا منـداڵی هەیە. کـاتێ هەستیان بەوەی کرد ئەو ئیهانەیە دڵ نایقۆزێتەوە و بەقای پێ ناکەن، قسەی نەفام و نەزانـانە ئەو جار بایان داوەتەوە وەلای ئەوەی قسەی ئەو کەسانە کە بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر نییە و کەوتـوونە پرسـیار و داوای قسـەی نـاقۆڵا و نـاڕەوا وەک بتپەرسـتەکان دەڵـێن: ئەگەر خـودا دەیهەوێ باوەڕی پێ بێنین، بۆچی بۆ خۆی ڕاستەوخۆ قسەمان دەگەڵ ناکا؟ جا بۆ ئەو ڕاسـتییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١١٨:

﴿١١٨﴾ وَقَالَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ لَوْلاَ يُكَلِّمُنَا اللّهُ أَوْ تَأْتِينَا آيَةٌ كَذَلِكَ قَالَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ تَشَابَهَتْ قُلُوبُهُمْ قَدْ بَيَّنَّا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ

**دەڵێن ئەوانەی کە تێناگەن و خۆ ناشـی دەکەن بە پێغەمبەریـان: دەبـا خـودا قسـەمان دەگەڵـدا بکـات و یـا مـوعجیزە و نیشـانەیەکی زۆر ڕوون و ئاشـکرامان نیشـان بـدات لە سـەر ئەوەی کککە تۆ پێغەمبەری. پێش ئەو داوا نـاقۆڵایەش جوولەکەکـان بەو شـێوەیە قسـەی سـەیر و ناجۆریان کردوون چـونکە هەردووکیـان واتە جـوولەکە و بتپەرسـتەکان یەک هەڵوێسـتن لە سەر بێباوەڕی. بێگومان ئێمە چەنـدین دەلیلـی ڕوون و ئاشـکرامان لە سـەر پێغەمبەرایەتـی پێغەمبەرمان بۆ خاوەن باوەڕان دەرخستووە و ڕاناوە.**

## خودا دەگەڵمان بدوێ

دەبــێ بکــوترێ و دڵــیش قەنــاعەت بکــا و بیســەلمێنێ: چەن لەحـزە بیـر و بەراورد و هەڵسەنگاندن لە هەزار ڕکاعەت نوێژی عـادەتی بەئەرزشـترە. چـونکە بە بیـر و ڕا بە دەروازەی مەقسەد دەگەی. بەڵام بە هەزار ساڵ عیبادەتی عادەتی ناگەی بە هیچ.

گۆیا موشـریکەکانی مەککە بە پێغەمبەریان دەکوت: خودا بۆ ڕاستەوخۆ دەگەڵمان نادوێ و ئایاتمـان بـۆ نـانێرێ؟ دیـارە ئەو داوایەی موشـــریکەکان هەر وەک ئەو داوایـانەن کە لە زۆر جێگای دیکەی قورئاندا هاتوون. ئەوانە بەهانەگیرییان پێ دەکوترێ بەغەیرەز ئاژاوەگێڕی هـیچ نەفعێک نادەن. مەسەلەن سەیری ئایەتی ٩٠ ئیسـرا کەن: ﴿وَقَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّى تَفْجُرَ لَنَا مِـنَ الأَرْضِ يَنبُوعًا﴾ **(کاتێ کافرەکانی مەکـکە دە بەرابەر موعجیزەکـانی قورئـان عەجایـب گیریـان خـوارد و دامان، کەوتنە قسـەی نـاقۆڵا و) کوتیـان: ئـێمە بـاوەڕت پـێ نـاهێنین هەتـا لە وڵاتـی ویشـک و گەرمـی مەککەدا سەرچاوە ئاومان بۆ لێ هەڵنەقوڵێنی.**

هەروا لەو جۆرە داوایـانەی بـێ سـەروبن کە لە کەسـانی جەهـل و نەفـام و نەبـیس وەک بتپەرست و موشـریک ڕوو دەدەن. خودای تەعالاش بۆ پەرچدانەوەی داوای قۆڕ و بێجێیان ئەو ئایەتەی نازڵ فەرموون. (تەفسیری کەبیر، ج٤، ل ٣١.)

## پرسیارت لێ دەکەن

خودای خـاوەن حـیکمەت و حەکـیم کە هەمیشـە یاریـدەدەر و هیدایەتـدەری نـوێنەرانی خۆیەتی واتە پێغەمبەران، بۆ دڵخۆشی دانەوەی پێغەمـبەری دەفەرمـوێ: دامەمێـنە و عەجایـب ڕامەمێنە لە پرسیار و ئاکاری بێ باوەڕانی موشـریک و بتپەرسـتان چـونکە لە پـێش تۆشـدا لە مووسایان شتی زۆر عەجایبتریان داوا و پرسیار کردووە. وەک ئەوە داوای دیتنـی خـودا و قسـە دەگەڵ کردنی ڕاستەوخۆ. بۆ باوەڕی بچۆ بۆ خزمەت ئایەتی: ﴿يَسْأَلُكَ أَهْـلُ الْكِتَـابِ أَن تُـنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَابًا مِّنَ السَّمَاءِ فَقَدْ سَأَلُواْ مُوسَى أَكْبَرَ مِن ذَلِكَ فَقَالُواْ أَرِنَا اللّهِ جَهْـرَةً فَأَخَـذَتْهُمُ الصَّـاعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ثُمَّ اتَّخَذُواْ الْعِجْلَ مِن بَعْدِ مَا جَاءتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ فَعَفَوْنَا عَن ذَلِكَ وَآتَيْنَا مُوسَى سُلْطَانًا مُّبِينًا﴾ (نساء: ١٥٣) **ئەی پێغەمبەر! جوولەکەکان کە خاوەن کتێبی ئاسمانین، داوات لێ دەکەن لە پێش چاویانـدا لە ئاسمانەوە کتێبێکیان بۆ بێنیە خوارەوە تاکوو بەڵگە بێ لە سەر پێغەمبەرایەتیت. تۆ لەو داواکاریـانەی بـێ بنەما و بێ سەروپا ڕامەمێنە و دامەمێنە و سەرسام مەبە. چونکە هەر ئەوانە لە پێشتر داوای شتێکی لەوە سەیرتریان لە مووسا پێغەمبەریان کردووە: وەک ئەوە کوتوویانە ئەی مووسا! بـۆ ئەوەی دڵنیـا بـین کە تـۆ پێغەمبەری خودای، وەرە خودامان بە ئاشکرایی نیشان بـدە تـا ببینـین! جـا بە هـۆی ئەو خەیـانەت بە خـۆ کردنەیان و ئەو ناماقووڵیانەیان هەورەتریشقەیەکیان ناردە سەریان و لێی دان و نابوودی کـردن. بەڵام پـاش ئەوە و لە پاش ئەوەش کە مووسا چەند مـوعجیزەیەکی ئاشـکرای لە سـەر پێغەمـبەری خـۆی نیشـان دان، کەچی دەستیان کردە گوێرەکە پەرستی، واتە ئەو گـوێرەکەیەی سـامری کە لە ئـاڵتوون دروسـتی کردبـوو بۆیان، لەو کاتەدا کە مووسایان لێ دوور کەوتبۆوە ڕۆیشتبوو بۆ سەر کێوی (طور) بۆ وەرگرتنـی فەرمـان**

**لە خودا. بەڵام دەگەڵ ئەوەشدا کە تۆبەیان کرد و پاشگەز بوونەوە مووسا پاڕایەوە بۆیان و منیش لێیان خۆش بووم و هێز و دەستەڵاتێکی ئاشکرامان بە مووسا بەخشی، واتە پێشەوایەتی قەومەکەی.**

بە کورتی و بە کوردی: ڕاستە ئەوە کە بکوترێ دڵ و دەروون و بیر و باوەڕی ناپەسەند و ناڕەوای هەموو لایەکی موشریک و جوولەکە و گاورەکان واتە ئەوانەی بێ باوەڕن ـ چ ئی دەورانی مووسا و چ ئی دەورانی پێغەمبەر ـ هەر وەک یەکن، لە سەر ئەساسی هەوا و هەوەس و ئارەزوو قسە دەکەن و پەڵپ دەگرن.

## (یوقنون) واتە چی؟

**شتێکی پەسند**: داوای بێ باوەڕان کە دەڵێن خودا قسەمان دەگەڵ بکا زۆر ناپەسندە و دوور لە ئەقڵ و شعوورە، بەو دەلیلە ئەگەر خودا دەگەڵ هەموو کەس بە ئاشکرایی و ڕاستەوخۆیی بدوێ و قسە بکا، جگە لەوەی بوونی پێغەمبەران بە زیاد دەردەچێ بڕوا بە ناچاری دێتە گۆڕێ نەک لە ڕووی بیر و بەراورد و بەرجەوەندی کە ئەوەش ئەساسی ئازادی و خودموختارییە و نیزامی تەکلیف و سەربەخۆیی تێک دەچێ. کە لە ئەساسی نیزامی ئیلاهیشدا ئەوە بە بناغە داندراوە: کە دەبێ ئینسان بە ئیختیار و ئیرادە و بیر و باوەڕی خۆی ڕێی خەتتی ئیعتیقاد و ئیمانی خۆی هەڵبژێرێ هەر بۆیەشە خودا فەرموویەتی: ﴿قَدْ بَيَّنَّا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ یانی: ئێمە نیشانەی زۆرمان لە ئەرز و ئاسماندا داناوە بۆ گەلانێک کە بیانهەوێ تێبگەن و بڕوا بێنن.

ئیشکالێک دەرکمان پێ دەگرێ لەو شوێنەدا کە خودا دەفەرموێ: ﴿لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ ئیشکالەکەش ئەوەیە: کەسێک یەقینی بێ و بە قۆناغی یەقین گەیشتبێ لە ئیماندا، نیازی بە نیشانە و دەلیل نامێنێ و نییە. چونکە بەڵگە و نیشانە هێنانەوە بۆ وەیە خاوەن باوەڕ بە یەقین بگا، دەیجا کەسێک خاوەنی یەقین بێ، نیازی بە نیشانە ناکات. لە سەر ئەو ئەساسە ﴿قَدْ بَيَّنَّا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ گیر و گرفت دێنێتە ڕوو.

وەڵام ـ بۆ ئیقناعی دڵ: مەبەست لە ﴿لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾دا ئەوە نییە کە ئەو قەومە پێش دەلیل و بورهان و نیشانە بە دەرەجەی یەقین گەیشتوون تاکوو ئەو ئیشکالەی کوتمان پێش بێ. بەڵکە مەبەست لەو جوملە پیرۆزە ﴿لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ نیشانە ڕادەنێن بۆ قەومێک کە بە شوێن دەلیل و نیشانەدا دەگەڕێن تا بگەن بە یەقین.

دڵ دەیهەوێ بزانێ ئەوانەی خاوەنی کتێبی ئاسمانی بوون وەک جوولەکە و نەسارا (گاور) بە چ دەلیل ئەو داوایان ڕادەنا و دەیانکوت: دەبێ خودا قسە دەگەڵ مەش بکا بۆ هەر تەنیا

دەگەڵ پێغەمبەر دەدوێ؟ خۆ ئەمەش وەک محەمەدﷺ ئینسانین!

وەڵام: ئەقڵ و شعوور ئاوا دەڵێن: دەبێ هەر واش بێ، خۆ ئەوە ڕاستە دە ناو کتێبەکەیاندا ئەوە نەنووسراوە کە خودا جگە لە پێغەمبەران دەبێ دەگەڵ تەک‌تەکی ئینسان بدوێ چونکە دوانی خودا دەگەڵ پێغەمبەران واتە دوان دەگەڵ عالەمی ئینسان. بەڵام ئەوان بە فکر و خەیاڵی خۆیان ئاوای بۆ چوون: کە هەر ئینسانێک شایستەگی و لێهاتوویی ئەوەی هەیە ببێتە پێغەمبەر و وەحی بکرێتێ، ئەو فکرە غەڵەتەش لەوەڕا تووشی بوون کە مەقامی پێغەمبەرایەتی تایبەتی نییە کەسب و فەزیلەت دەخالەتی تێدا هەبێ. ئیدی بێ‌خەبەر لەوەی خودای تەعالا لە ڕێی حیکمەت و ئیرادە و عیلمی خۆی لە ناو هەر قەوم و نەتەوەیەک یەک لەوان هەڵدەبژێرێ بۆ ڕێبەر بێ ئەوەی کەسب و هونەر و زانستی ئەو نەفەرە هەڵبژێردراوە دەخالەتی دەو هەڵبژاردنەدا بێ، کەوابێ دەبێ بە ڕاشکاوی بکوترێ هۆی داوای ئەو خاوەن کتێبانە ـ ئەو خەیاڵە خاوە و فکرە ناڕەوا و غەڵەتەیان بووە.

**سووکەئاوڕێک:** پاش ئەوەی کە ویست و قسەی گاور و جوولەکە و بت‌پەرستەکان بەرپەرچ درانەوە و بە بەتاڵ دەرکران، خودای تەعالا ڕوو دەکاتە پێغەمبەر و ئەو پیشەیەی کە پێی بەخشراوە پەردە هەڵدەداتەوە لە سەر ئەو کێشەیەی کە لە ناوەندی پێغەمبەر و گاور و جوولەکەدا هەیە، خودا دەفەرموێ: ئەی محەمەدﷺ ئێمە ئەتۆمان ڕەوانە کردۆتە ناو ئەو قەومەی بە ئایینێک و بەرنامەیەکی ڕاست و دروست و ڕێک‌وپێک کە بەرهەمی ئەو ئاینە خۆش و بەختەوەرەی هەر دوو دنیای پێوەیە و تێدایە. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١١٩ی بەقەرە:

﴿١١٩﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلاَ تُسْأَلُ عَنْ أَصْحَابِ الْجَحِيمِ

**خودا فەرمووی بە پێغەمبەر: ئێمە ئەتۆن (بە قورئانەوە) ناردووە بۆ شارەزا کردنی ئینسان و هەروا مزگێنی بدەی بە خاوەن باوەڕانی ساڵح و عەمەل پاک و هەروا ترسیش وەبەر بێ باوەڕان و خەیانەتکاران بنێ. کاری تۆ تەنیا شارەزایی و یاداوەرییە. و ئەوانەی دوات ناکەون و باوەڕت پێ ناهێنن و دەبنە هاوڕێی دۆزەخ، هیچ بەرپرسیاریەتیەکیان ڕوو ناکاتە تۆ.**

## وردەکاری

**تێڕوانین:** پرسیار لە تۆ ناکرێت لە بارەی ئەو کەسانەی کە بە هۆی لاساری و خراپی

خۆیانەوە دەچنە دۆزەخەوە، چونکە ئەتۆ بۆ ئەوە نەنێردراویت کە بە زۆر بیر و باوەڕ بخەیتە ناو دەروونی خەڵکەوە و هەروا خراپی و بێ باوەڕی ئەو خەڵکە تاوان ناخاتە سەر ئەتۆ. ئازادی ئایینی ئاسمانی لەوەدایە کەس بە زۆر باوەڕ ناخاتە ئەستۆی کەس و کەسیش لە سەر بێ باوەڕی کەس سزا نادرێ. هەرکەس تاوانی خۆی لە ئەستۆی خۆی. ئەتۆ هاوارچی و ڕێنوێنی فەقەت.

بەو پێیە لەو بارەوە واتە کێ باوەڕت پێ دێن و کێ ناهێنێ، نەیکەیە داخ و خەفەت لە سەر دڵت، هەروەک خوداش وا دەفەرموێ دە ئایەتی ﴿فَإِنَّ اللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَاء وَيَهْدِي مَن يَشَاء فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَاتٍ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ (فاطر: ٨) **خودا کێی بوێ و حەز بکا لاڕێی دەکا و کێی بوێ و حەز بکا شارەزای دەکا، کە وایە لەو بارەیەوە (واتە کێ ڕاستەڕێ دەبێ و کێ لاڕێ دەبێ) خەفەت داتنەگرێ چونکە ڕاست و ناڕاستی عالەم حەواڵە بە تۆ نەکراوە و نییە. ئەوەی ئەتۆی بۆ ڕەوانە کراوە ڕاگەیاندنە و بەس.**

گۆیا هێندێک کوتوویانە: ئەو ئایەتە لە سەر پرسیاری پێغەمبەر لە خودا لە مەڕ دایک و بابی کە ئایا دۆزەخین یان نا، هاتووە؛ بەڵام قەڵەمبەدەستانی تەفسیرنووس بێ ئینسافانە بڕیاریان داوە کە دای و بابی پێغەمبەر دۆزەخین بە پێی ئەو ئایەتە. بە داخەوە کەسانێکی هیچ پێغەمبەرێک نەبینن و ڕێنوێنی نەکرێن چۆن خودا دادەگژێتێ و دە دۆزەخی دەپەستێوێ. (تەفسیری کەبیر و ڕوح المعانی)

وەک ئەقڵ ددانی پێدا دێنێ و دەڵێ: دڵی تاریک و ڕەش‌هەڵگەڕاو بە هۆی جەهل و قین هیچ هەستێک بە نوور و ترووسکایی ئیمان و باوەڕ ناکا و هیچ حەق وڕاستیەکی بۆ هەزم نابێ. کەوایە دەبێ ئەوە بسەلمێندرێ کە جوولەکە و گاوری دڵڕەش و تاریک و قین لە دڵ، باوەڕ بە تۆ ناکەن و لێت ڕازی نابن. مەگەر ئەتۆش عەقیدە و باوەڕی وان قبووڵ کەی. بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٢٠:

**﴿١٢٠﴾ وَلَن تَرْضَى عَنكَ الْيَهُودُ وَلاَ النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ قُلْ إِنَّ هُدَى اللّهِ هُوَ الْهُدَى وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءهُم بَعْدَ الَّذِي جَاءكَ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللّهِ مِن وَلِيٍّ وَلاَ نَصِيرٍ**

**گاور و جوولەکەکان باوەڕت پێ ناکەن و لێت ڕازی نابن هەتا وە شوێن بیر و باوەڕیان نەکەوی، جا ئەتۆش پێیان بڵێ ئایینی ئیسلام کە ئایینی خودایە ڕێگای ڕاست و ڕەوانی خودایە (کەوایە دەبێ بزانی) ئەگەر وەشوێن ئارەزووی وان بکەوی، پاش ئەوەی کە بۆت ڕەوانە کراوە ئایات و بەڵگەی دینی حەق، ئەوانە لە لایەن خوداوە هیچ پشتیوانییەکت لێ ناکرێت و خوداش سەرت ناخا کە بە غەیرەز خوداش کەسی دی نییە یاریدە و یارمەتیت بدا و پشتت بگرێ.**

## وردەکاری

ئەو ئایەتە هەرچەند ئاراستەی پێغەمبەر کراوە بەڵام دەگەڵ هەموو موسوڵمانێکە.

**تێڕوانینێک:** تا ئێرە باس لەوەی بوو: بەشی زۆری گاور و جـوولەکە لە بەر دڵڕەشـیانیان و قین و کینەیان هیوای موسـوڵمان بوونیـان لـێ نـاکرێ و دیـاری نـادا. بەڵام لەو لایەشـەوە کە خودای تەعالا ڕێگای چاکسازی و چاکبوون لە ئینسان پێوە نادا، ئیشارە وەلای ئەویە چـاک و پاک بوون و خاوەن باوەڕی لە شەئنی ئینساندا هەیە و قەت کوێر نابێتەوە. بەو پێیە دەکرێ گاور و جوولەکە سـرنج بگرن و ڕاست و درۆ لێک هەڵاوێرن و بـگەنە حەق و ڕاسـتێکی کە لە نـاو کتێبەکانیاندا هەیە. ئایەتی ١٢١ی بەقەرە لەو بارەوە دەدوێ و ئامـاژە دەکـا. نەختێـک لەوە بە دوا دەچینە خزمەتی.

**﴿١٢١﴾ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَاب يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلاَوَتِهِ أُولَـئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ وَمن يَكفُرْ بِهِ فَأُولَـئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ**

**ئەوانەی کە کتێبمان داونێ لە گـاور و جوولەکەکـان، و دەوریشــی دەکەنەوە و لێـی تێـدەگەن بەڕاستی، ئەوا باوەڕ و بڕوا دێنن بە ڕێنموونی خودا کە ئایینی ئیسلامە و ئەو کەسەی بێ بـڕوا بێ پێی، هەر ئەوانن ڕەنج بە خەسار و زەرەرمەندن.**

## قوران خوێندن

**ئاوڕدانەوەیەک وەسەر (حقّ تلاوته):** هەر وەک ئەقڵیش دەیسەلمێنێ ئەساسیش هەر ئەوەیە قورئان خوێندن بێ بەراورد و عەمەل پێ کردن هەمچون بەهرەیەکی وای نییە، هەچەن زانایـانی عیلمی ئوسوول کوتوویانە خوێندنی بێ مانا زانین و بەراوردیش عیبادەتە. ئەمما دەبێ ئەو جۆرە بۆچوونە بۆ تەشویق بێ دەنا هیچ بەهرە نادا، چونکە (رُبَّ تـالٍ للقـرآنِ يَلْعَنُـهُ القـرآنُ) واتە زۆر قورئانخوێن هەن قورئانەکە لەعنەتیان لێ دەکا، بەو هۆیە عەمەلی پێ ناکەن.

کەوایە دەبێ بکوترێ خودای تەعالا بۆیە فەرموویەتی (حقّ تلاوتـه) واتە حەقـی تلاوەتـی قورئان ئەوەیە ڕیعایەتی نەزم و مانا و ئەمر و دەستوورەکانی قورئان بکرێ چونکە قورئان یاسایە بۆ ئینسان و دەستووراتی دین و دنیایە. ئەوە نییە بیخوێنی و تێـی چریکێنـی و ڕەفتاریشـی پـێ نەکەی. لانیکەم دەبێ چوار شەرتی ریعایەت هەر بکرێ:

١. وشە و لەفز و پیتەکانی بە دروستی وەڕێخرێن: ﴿وَرَتِّلِ الْقُـرْآنَ تَـرْتِيلًا﴾ (مزمل: ۴) واتە

دانەدانە و ساف و سالم وەخوێندرێ. ئەوە خۆی بەشێکە لە زینەت و ڕازانەوەی قورئان.

٢. تا ئەندازەیەک مانای ئایەتەکان بزاندرێن، خۆشت خاوەنی ویقار و ئەخلاقی قورئانی کەی.

٣. لە کاتی قورئان خوێندندا ئەوە بزانی کە ئەوە دەگەڵ خودا دەدوێی، بەقیمەتترین کات و ساتتە.

٤. بە ئەدەب و بە هەست عەمەل کە بەوەی دەیخوێنی، هەچی نەتزانی لە زانای وەرگرە.

بۆچوونی جۆراوجۆر لە سەر ئەو جوملەی (حقّ تلاوته) هەیە بەڵام ئەوەی لە هەمان بەرچاوترە ئەوەیە دانە دانە و دروست وەخوێندرێ بێ چاووڕاو.

گۆیا حەزرەتی عومەر فەرموویەتی: دە ساڵ وەیا دوازدە ساڵ هەر سوورەی بەقەرەم خوێندەوە تاکوو فێری مانایەکەی بووم. دەگەڵ بەراورد و هەڵسەنگاندنی مانای ئایەتەکانی.

دیارە ئەگەر بەرجەوەندی ئەوەی بووبین کە خودای تەعالا بە شێوەیەکی دوور و درێژ و ئاشکرا لە ئایەتی ٤٠ڕا تا ئایەتی ١٢٢ لەمەڕ ئاکار و ڕەفتار و لاساری بێ باوەڕانی وەک جوولەکە و گاور و بتپەرستەکان دوا، پاش ئەو بانگاوازەی خودا لەوانە، جارجار بە نەرمی و جارجار بە توندی، بەڵام هەر چاک نەبوون و نەهاتنە بار خۆیان وا نیشان دەدا کە هاتنە سەر ڕێی حەق لەوان چاوەڕوان ناکرێ، جێی باوەڕ نین کە چاک بن. بەڵام ئەوە بە سبووت گەیوە کە خودای بەسەبر تا ئاخرین لەحزەی حەیات و ژیان دەسبەرداری عەبدی نابێ و لە ڕێنوێنی و ئاگادار کردنەوەی ناوەستێ و غافڵ نابێ. دووبارە هەرا و هاوارێکی دیکەشیان دەکاتەوە. واتە: هەروەک لە سەرەتای باسەکەوە واتە ئایەتی ٤٠ بانگی کردن و ئاگاداری دانێ بەو ئایەتی نەرموشلی پیرۆز، دای بە بن گوێیان تاکوو دڵیان داچڵەکێ. ئەوە دووبارە بە ئایەتی ١٢٢ دەیانداتەوە بە بن گوێیاندا بەڵکوو پاش ئەو هەموو بێنە و بەرە و تاقی کردنەوەی دەگەڵیان کرا چاک بن و بێنە سەر ڕێی حەق و هیدایەت. با ئەو حاشار نەدراوەش حاشار نەدەین: خودا ئینسانی بە وەسیلەی ئەقڵ و شعوور و هەست هیدایەت داوە ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ (انسان: ٣) ئەوە ئینسانە خۆ ناشی و نەزان و کوێر دەکا بە هۆی ئارەزوو و هەوا و هەوەسی دنیا.

﴿١٢٢﴾ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُواْ نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ

ئەی نەوەی یەعقووب پێغەمبەر، یادی ئەو چاکانە بکەنەوە کە وەختی خۆی دامڕشتۆتە

**سەرتان و هەروا ئەمـن بـاوی بـاو و باپیرەکانتـانم دا لە دەورانـی مووسـا و دوای ئەویـش بـۆ ماوەیەک بە سەر جیهاندا بە ناردنی کتێـب و ڕەوانە کردنـی پێغەمـبەران یەک لە دوای یەک، کەوایە خۆتان بپارێزن لە سزای ڕۆژێک کە کەس لە جیاتی کەس تۆڵە و پاداشی نـادرێتەوە و هەروا لەو ڕۆژەدا بارمتەی لێ وەرنـاگیرێ (وهەروا) هـیچ تکـایەکیش نەفـع نـادا. وە بە هـیچ جۆرێکیش یارمەتیی نادرێن.**

بەو هۆیە کە ئایەتی ۱۲۳ تەواوکەری ئایەتی ۱۲۲یە، بە چـاک زانـدرا کە بەینیـان زۆر درێـژ نەکرێتەوە، جا بۆیە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۲۳:

**﴿۱۲۳﴾ وَاتَّقُواْ يَوْماً لاَّ تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْئاً وَلاَ يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلاَ تَنفَعُهَا شَـفَاعَةٌ وَلاَ هُمْ يُنصَرُونَ**

**مانا: (بڕوانە ماناکەی دەپاڵ مانای ئایەتی پێش خۆی واتە ۱۲۲ خراوە)**

**ئـاوڕدانەوەیەک وەســەر ئەو دوو ئـایەتە:** هەر دوو لە مەڕ بەنیئیسـرائیل دەدوێـن، بەڵام تەفاوەت لێیان چاو دەکرێ. یانی ئەگەر بە وردی سـرنج بگیردرێ و هەست ڕاگیردرێ لە سـێ جێگادا ئیختلافیان لێ دەبیندرێ:

۱. لە ئایەتی ۴۸دا لە پێشدا قبووڵ نەکردنی شەفاعەت باس کـرا و هـاتە گـۆڕێ لەمەڕ ئەو بێباوەڕانە و لە ئایەتی ۱۲۳دا قبووڵ نەکردنی عەدڵ واتە بەرتیل.

۲. دە ایەتی ۴۸دا لە سەر قبووڵ نەکردنی شەفاعەت فێعلـی (لايُقْبَـلُ) دەکـار کـرا بەڵام دە ئایەتی ۱۲۳دا فێعلی (لا تَنْفَعُها) لە سەر شەفاعەت دەکار کرا.

۳. دە ئایەتی ۴۸دا بۆ قبووڵ نەکردنی عەدڵ فێعلـی نەفـی (لايُؤْخَـذُ) دە کـار کـرا بەڵام دە ئایەتی ۱۲۳دا بۆ قبووڵ نەکردنی عەدڵ، فێعلی مەنفی (لا يُقْبَلُ) بە کار برا.

دیـارە هەر وەک ئەهلـی فەننـی عیلمـی بەلاغە دەزانـن ئەو ئیخـتلاف و تەغیـراتە نەزمـی بەلاغەیە.

## ئاوڕدانەوەیەکی دوور بۆ ڕابردوو

وەک ڕوون و ئاشکرایە لە ئایەتی ۴۰ڕا تا ئێرە باسی لە لاساری و بەدئەخلاقی جوولەکە کرا کە دەگەڵ پێغەمبەرەکانیـان لە مووسـا و عیسـاوە تـا حەزرەتـی مـحەمەدﷺ ناوبەنـاو نـاوی گاورەکانیش دەبرا و دەگەڵ دەکەوتن، کە هەر دوو لا پێیان وا بوو کە بەهەشـت هەر بـۆ ئەوانە،

هەروەک چەل‌وبەلەش ئاماژە وەلای بت‌پەرستەکانی عەرەبیش دەکرا.

دیارە گاور و جوولەکەکان خۆیان بە نەوەی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم پێغەمبەر دەزانین و زۆریشیان شانازی پێوە دەکرد. لەو ڕێگایەوە پێیان وا بوو کە ئیرشاد و سەروەری و سەرۆکایەتی ئایینی ئاسمانی دەبێ هەر ئەوان بن و هەر بۆ وانیش بێ.

وهەروا هاوەبشی پەیداکەرەکانی عەرەبی ناحاڵیش خۆیان بە نەوەی حەزرەتی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم دەزانن چاوەدێری کەعبەش هەر دەبێ ئەوان بن و سەرۆکایەتی ئایینیان لە ناو هۆزی عەرەبدا هەر بە ئی خۆیان دەزانی.

ئەوجار بۆ پووچەڵ کردنەوەی ئەو خەیاڵ و بیرە قۆڕ و بێ بنەمایەی ئەو بێ‌باوەڕانە باسێکی ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق دەکرێ، دەگەڵ بینا نانی کەعبە و ئاڵ‌وگۆڕی بە بەیتولموقەدەس و هەروا یەکێتی ئاینەکانی نووح و ئیبراهیم تا مووسا و عسا و محەمەدﷺ لە سەر ئەو ئەساسە کە ناکرێ ئایین هەر تایبەتی گەلێک بێ، چونکە هەر دەور و زەمانەی بەرنامەیەکی نوێ شایانیەتی لە لایەن خوداوە. بەو پێیە باوەڕ بە تەنیایی خودا بنچینەی هەر ئایینێکی ئاسمانییە و تەقواش هەوێنی ئایینە و خوداش دەگەڵ عەبدانی خزمایەتی نییە، تاکوو بکوترێ ئەوە خزمی خودایە و سەرۆکایەتی ئاینی خوداش شایانی ئەوە، بەڵکە نیزیک لە خودا ئەو کەسەیە کە بە تەقوا لێی نیزیکە.

کاتی ئەوەی هاتووە دڵ بزانێ: کاتێ خودا حەزرەتی ئیبراهیمی هەڵبژارد و گێڕای بە پێشەوای عالەم تا دەگاتە پێغەمبەرایەتی محەمەدﷺ پێغەمبەری ئاخر زەمان، چۆن کراوە و چۆن ڕابراوە، ئایین دە ناو عالەمدا هەر یەک ئایین بووە یا پێغەمبەر دەگەڵ پێغەمبەر ئاڵ‌وگۆڕیش لە ئایینەکاندا کراوە؟ بۆ تێگەیشتن لەو بارەوە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٢٤ی بەقەرە:

**﴿١٢٤﴾ وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي قَالَ لاَ يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ**

**(ئەی پێغەمبەر)! بیگێڕەوە بۆ موسوڵمانان و خاوەن نامەکانی ئاسمانی کاتێک کە خودا ئیبراهیمی تاقی کردەوە بە چەند فەرمووده و فەرمانێک ـ کە ئەویش هەمووی بەجێ هێنا ـ (وەک لە سوورەی نەجمدا خودا شاهیدی بۆ دەدا و دەفەرموێ (و ابراهیم الذي وفّىٰ: واتە ئەو ئیبراهیمەی کە فەرمانی خودای بەجێ هێنا) ـ ئەوجار خودای تەعالا مزگێنی دەدا بە ئیبراهیم بەوەی کە وا تۆ دەکەمە پێغەمبەر و پێشەوای عالەم.**

## ئیمامەتی ئیبراهیم

بەڵێ ئەگەر سەیری ﴿إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا﴾ بکرێ قبوولْ دەکرێ کە خودای تەعالا ئیبراهیمی کردە پێغەمبەرێکی گەورەی خاوەن کتێب (صحف) و پێشەوای عالەم و قەڵای بتپەرستیشی پێ ڕووخاند و هەروا بازاڕی ئەوانەی کە هاوبەشییان بۆ خودا پەیدا دەکرد لە ناوی بردن و لاواز و بێ هێزی کردن. هەروا ئیسحاق و ئیسماعیل کوڕانی و یەعقووبی کوڕەزای و دوازدە کوڕەکانی یەعقووبی دەکردن بە پێغەمبەر کە یەکێکیان یووسف بوو و لە پاشان خودای مەزن لە سەر ئەساسی حیکمەتی خۆی هەر لە نەوەی یەعقووب، مووسا و زەکەریا و یەحیا و عیسا و گەلێک پێغەمبەری دی لێ هەڵخست و هێنانیە دی کە هەتا لە دواییدا بۆ ئاخرین پێغەمبەر لە دنیادا هەر لە نەوەی ئەو یەعقووبە حەزرەتی محەمەدەلمستەفایﷺ هەڵخست و هێنایە دی. پاش ئەو (محەمەد)ﷺ دەروازە و دەرگای پێغەمبەرایەتی داخست، هەر بۆیە حەزرەتی ئیبراهیم ناو براوە بە بابی پێغەمبەران.

**تێڕوانینێک:** دە ئایەتەکانی ڕابردوودا قسە لە ئینکاری تەنیایی خودا و قورئان و قبوولْ نەکردنی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محەمەدﷺ دەکرا بەڵام دەو ئایەتە (١٢۴)دا خودای بێ هاوتا قسە لە پێغەمبەرێکی دەکا وەک ئیبراهیم بێ، کە قبووڵی لە سەراپای وە دواکەوتووانی ئایینەکانی ئاسمانییە، ناوی براوە بە پێشەوای تەوحید، خەلیلەڵڵا، ئیبراهیم، تەواو هۆزی یەهوود، نەسارا، ئەهلی زەبوور، موسوڵمانان و تەواوی ئەهلی کتێب و دواکەوتووی پێغەمبەران هەچی هەن، حەزرەتی ئیبراهیمیان بە یەکێک لە پێغەمبەرە بەرزەکان و سەرقافڵەی دینەکانی یەهوود و مەسیح و ئیسلام و غەیر زانیوە و قبووڵیانە، جا بۆیە خودای تەعالا ڕوو دە ئەهلی کتێبەکان وەک یەهوود و مەسیح و غەیرە دەکا ئەگەر ئیبراهیمو قبووڵە بە پێغەمبەرایەتی، دەبێ محەمەدیشتان قبوولْ بێ بە پێغەمبەر، دەنا ئیدیعاتان بە درۆ دەردەچێ.

دەکرێ بڵێین لە ئادەم تا خاتەم دوو مۆرەی ئەساسی ئینسان ئادەم و ئیبراهیمن، ئادەم واتە بنچینەی بەرەی ئینسان لە مەڕ هاتنە ڕووی دنیا، بەڵام ئیبراهیم واتە ڕاماڵدەری کوفر و شیرک و دامەزراندنی چینەی تەوحید کە مەعنەویەتی حەیاتی ئینسانی بەسراوەتەوە بەو خاڵە گرنگ و بەرچاوانە. (تبیین القرآن، ج٣، ل ٢٣١)

## نەقڵێکی خۆش هەیە با ون نەبێ

دەڵێن دە حەدیسدایە: ڕوحی منداڵانی کە دەمرن ئەگەر کوڕ بن لە ئاسمانی ٧ لە ژێر (سدرة المنتهى) لە کن ئیبراهیمی پێغەمبەرن و ئەگەر کچ بن لە کن سارای ئیبراهیمن.

## تاقی کردنەوەی ئیبراهیم

دڵ دەیهەوێ بزانێ ئەو کەلیماتانە چن کە خودای تەعالا ئیبراهیمیان پێ تاقی دەکاتەوە؟ وەک دەڵێن بە نەزەری زۆربەی قورئانزانەکان ئەو کەلیماتانە کە ئیبراهیمیان پێ تاقی دەکاتەوە خودای تەعالا بریتین لە سێ شت:

١. هەڵگرتنی باری پێغەمبەرایەتی کە پڕ لە باری ئەمانەتی تەکلیفاتی ئەحکامی ئایینییە.

٢. خاوێن ڕاگرتنی ماڵە خودا کە کەعبەیە ﴿طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ﴾ واتە بۆ زیارەتگەران ماڵە من خاوێن ڕاگرن.

٣. مەشغووڵ بوون بە دوعا و مناجاتی زهووری حەزرەتی محەمەدﷺ: ﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً...﴾ واتە خودایە هەڵخە و بنێرە لە ناو ئەو عالەمەدا پێغەمبەرێک (کە ئەویش محەمەدە) (تەفسیری کەبیر، ج٤، ل ٤١)

ئیبراهیم بۆ ئەو سێ شتە مەئموور کراوە. ڕا و بۆچوونی دیکەش زۆرن لە سەر (کەلیمات) ئەگەر دەتهەوێ هەموو ڕایەکان بزانی، بچۆ ناو باسەکە.

بۆ پاراو بوونی دڵ و باوەڕ لەمەڕ ئەو کەلیماتانەی ئیبراهیمیان پێ تاقی دەکرێتەوە، بچۆرە ماڵە تەفسیری (تبيين القرآن، ج٣، ل ٢٣٥ـ٢٣٧).

## بابی ئیبراهیم، (ئازەر)ە یان نا؟

وهەروا مشتومڕی زانایان لە سەر بابی ئیبراهیم زۆرە. دەڵێن بابی ئیبراهیم، ئازەرە؛ چونکە سەریحی قورئان وا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لأَبِيهِ آزَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا آلِهَةً﴾ (انعام: ٧٤) واتە کاتێ ئیبراهیم بە ئازەری بابی کوت: مەگەر تۆ بت بە خودا دەزانی؟

و هەروا دەشڵێن ناوی بابی ئیبراهیم، (تارخ) یا (ناجور) یا (ناحور) یەکێک لەوانە بووە. ئەمنیش دەڵێم زۆر بێ ئینسافییە لە سەر سەریحی قورئاندا ڕاکەیە شتێکی نایەقین.

لێرەدا وەک لازم دەچێ لە سەر حەزرەتی ئیبراهیم کورتە لێدوانێک بکرێ:

ئیبراهیم خەلیلەڵڵا دەگەڵ سارای ژنی لە فەلەستین دادەنیشت. پاشان هاجەریشی مارە کرد

و ئیسماعیلی لێ بوو. خوداش کردیە پێغەمبەر. ئەوجار ئیبراهیم ویستی شوێنێکی ئارام و پاک و دوور لە هەرا و بەزمی شارستانییەتێک ڕەچاو کا بۆ مەرکەزی پێغەمبەریەتیەکەی. بەو هۆیە هات جێگای شاری مەککەی هەڵبژارد و هاجەر و ئیسماعیلی کوڕی بردنە ئەو شوێنە لە نیزیک بیری زەمزەم نیشتەجێی کردن. خوداش بە پێی حیکمەتی خۆی ئاوی زەمزەمی بۆ هەڵقوڵاند چونکە ئەو شوێنە ویشکارۆ و بێ ئاو بوو ژیانی لێ نەدەکرا بە چاکی. دیارە بە هۆی ئەو ئاوی زەمزەم ئاوەدانی ڕووی تێکرد و ئاوەدان بۆوە.

حەزرەتی ئیبراهیم لە بەر ئەوەی کە ئەهلی فەلەستین لە لایەکەوە و لەولایەشەوە هاجەر و ئیسماعیلی لە مەککە دانابوو، دەمێ لە فەلەستین و دەمێ لە حیجاز دادەنیشت. تا ئیسماعیل خڕەکە بوو و پێگەیشت، خودا سرووشی بۆ کرد بۆ ئیبراهیم کە دەبێ دەگەڵ ئیسماعیل کەعبە دروست کەن. لە سەر ئەمری باری هەردووکیان بە جووتە بە تەمای خودا تێڕاچوون و دروستیان کرد. لە بەر ئەوەی وڵاتەکە زۆر ئەمین و ئەمان نەبوو و بۆ ژیانیش تێر و تەسەل نەدەهاتە بەرچاو، ئیبراهیم لە بەر خودا پاڕایەوە کە ئەو شوێنە قاقڕ و بێ ئاوە بکاتە شارێکی پڕ ئاو و ئاسایش و ئەمین و دڵنیایی و هەموو جۆرە خواردەمەنی و میوەیەکیان بۆ تێدا پێک بێنێ. تاکوو خەڵک لێر و لەوێڕا بە خاتری خۆش و پڕ دەرامەدی ئەوێ ڕووی تێبکەن. وەهەروا لە کاتی خۆشیدا پێغەمبەرێکی خۆش‌ناو و ناودار و خاوەن کتێب و ئایینێکی تێر و تەواوی تێدا هەڵخا و زهور پێ بکات. دیارە حەزرەتی ئیبراهیم بە دڵپاکی و نیەت‌خاسی نزاکەی کرد گیرابوو دوعاکەی، داواکەی هاتە جێ. لەوەیرا دەبێ وا باوەڕ کەین پاڕانەوەی بە پاکی و بە نیەتی پاک و خالیس خودا قبووڵی دەکا.

جورهوم کە خێڵێکی خێڵەکی بوون هاتن لەوێ ماڵ و بنەما و باریان لێ دامەزراند و حەزرەتی ئیسماعیلیش ژنی لێ هێنان و لەو ڕۆژەوە کەعبە وەک زیارەتگایەکی ئایینی سەری پێ گیرا. تا خودا لە سەر نزای ئیبراهیم پێغەمبەری ئیسلامی بە ناوی محەمەدﷺ تێدا هێنایە دی لە نەوەی ئیسماعیل و هەروا ئائینیی پاکی ئیبراهیمی پێ تازە و زیندوو کردەوە. ئینجا لەو حەلەوە هەموو ساڵێک بە هەزاران کەس لە هەر چوار قوڕنەی دنیا دەچن بۆ زیارەتی ئەو شوێنە پیرۆزە واتە کەعبە، بۆ تازە کردنەوەی بیر و باوەڕیان.

بۆ ئیسباتی ئەو ماجەرایە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٢٥ی بەقەرە:

﴿١٢٥﴾ وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْناً وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى وَعَهِدْنَا إِلَى

**إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ**

**(ئەی پێغەمبەر! وەیادی خۆت بخەوە) کاتێک کە کەعبەمان گێڕا بە پەناگای ئینسانان تاکوو موسوڵمانان لە هەموو ساڵێکا بێن و بچن بۆ حەج و هەروا ببینن بە هەزاران موسوڵمان کە لە هەموو گۆشە و کەناری دنیاوە بۆی دێن و دەچن و لە پێغەمبەرەکەیان و یارانی ئەو یادی دوور و درێژ دەکەن کە چۆنیان ئەو دینە پاکە نەهێشت بە دەس دینفرۆشانەوە بڕوا و نەجاتیان دا، و هەروا ڕووڕەشی وەرەقەی کردەوەیان ئاوەژوو کەنەوە بۆ وەرەقێکی سپی بێخاڵ، و هەروا ئەو کەعبەمان گێڕا بە مایەی ئەمن و ئاسایش و دڵئارامی، چونکە بە پێی یاسای دامەزراو کەس دەستی نەدەچۆ کەسەوە و مافی دەسدرێژی بۆ کەسی نەبووە لەو جێیەدا. و حەتا زۆر کەس براکوشتەی یا باب‌کوشتەی خۆی لە و جێیەدا چاو دەکرد و چاوی لێ دەقووچاند و دەستی بۆ درێژ نەدەکرد. وەهەروا پێمان دەکوتن کە جێنوێژ بگرن لە شوێنی ئیبراهیم کە (مسجدالحرام)ە واتە دەو ماوەیەی کە لە مەککەدان، بەشی زۆری لە مسجدالحرامدا بن و بە خوداپەرستی و نزا و پاڕانەوە خەریک بن. وەهەروا سپاردمان بە ئیبراهیم و ئیسماعیل کە خانەی من پاک بکەنەوە لە هەموو شتێکی ناڕەوا و ناحەز، بۆ ئەوانەی کە هەڵدەخولێن بە دەوری کەعبەدا، و هەروا بۆ ئەوانەی کە تێیدا دەمێننەوە بۆ ماوەیەکی بە ناوی خوداپەرستی. و هەروا بۆ ئەوانەی نوێژی تێدا دەخوێنن سەژدە و ڕکووعی تێدا دەبەن.**

## ئاوڕێک وەسەر مانای (مثابە) و (أمنا)

قورئانزانان ڕا و بۆچوونی زۆریان لە سەر (مثابە)ی ڕاناوە و داوە. هێندێک کوتوویانە (مثابە) واتە جێی کۆبوونەوە، یانی کەعبە شوێنی کۆبوونەوەی حاجیانە بۆ بەجێهێنانی ئەرکەکانی حەج.

هێندێکیش کوتوویانە (مثابە) واتە پەناگا بۆ هیوادارانی بەزەی خودا. هێندێکیش کوتوویانە (مثابە) واتە شۆقدەر و ڕووناکایی خودای عالەمین (تجلی‌گاە). هێندێکیش کوتوویانە (مثابە) واتە بەرهەم هێنانی خێر و حەسەنات و ڕاماڵی گوناە.

ئەو دەستەکوتەی زانایان گەڕانە بە شوێن ڕاستیدا. ڕاستیش دێرەدا واتە دە (مثابە)دا ـ خودا کەعبەی گێڕاوە بە شوێنی لێک کۆبوونەوەی عەبدانی موخلیس.

(ئەمن) واتە شوێنی دڵ لێ حەسانەوە و بێترسی. بەڵام ئەگەر جوان بەرجەوەند بی، سووکە پەرچێک دێتە ڕێ ئەویش ئەوەیە: خودای تەعالا خۆی ئەو شوێنە (کەعبە)ی بە ئەمن

داناوە کەچی حەزرەتی ئیبراهیمیش دەڵێ (رَبِّ اجْعَلْ هَـَذَا بَـلَدًا آمِنًـا) واتە خـودایە! ئەو شـارە ئەمین کە. ئەو دوو مانایە دژ بە یەکن واتە خۆی ئەمینە، تۆش دەڵێی ئەمینی کە. بـۆ ڕەفعـی ئەو ئیشکالە دەبێ بکوترێ مەنزووری ئیبراهیم ئەوەیە: خودایا ئەو ئەمنیەتە بەردەوام کە.

## هێرش کردنە سەر کەعبە

و هەروا لە سەر وشەی (أمنا) واتە (ئەمین)، مێژووی کەعبە بەرەنگارمان دەبێ بەو ئیشکالە: دیارە خودا ڕادەگەیێنێ کە کەعبە شوێنی ئەمین و ئەمانە لە هەر بارێکەوە، خـۆ دیـارە وەعـدە و گوفتەی خودا دەبێ باوەڕ کرێ بێ دڕدۆنگی و گومان. کەچـی ئەگەر زەیـن دەکەیـنە مێـژووی بەسەرهاتی کەعبە، چەن ڕووداوی دڵتەزێن و سەخت و نـاڕەوای تێـدا چـاو دەکـرێ وەک ئەو کارەساتانە:

١. لە ساڵەکانی ٦٤ی کۆچی، شاری مەککە کەوتە محاسەرەی عەبدوڵلا کوڕی زوبەیـر کە لە بەیعەت کردنی یەزیدی لایـدا و کەوتە بەربەرەکـانی سـەخت دەگەڵ یەک، لەوەڕا عـاملانی یەزیدی مەککەیان بەردباران کرد بە وەسیلەی قۆچەقەانی و ئاوریان تێ بەردا.

٢. و هەروا لە ســاڵەکانی ٧٢ی کــۆچی، بە هــۆی هێرشــی حەججــاج لە دەورانــی عەبدولمەلیک کوڕی مەروان بە نیەتی کوشتن و لە ناو بردنی ئیبنیزوبەیر هێرشێکی بێ ئەدەبانە کرایە سەر کەعبەی مبارەک. دەو هێرشە ناڕەوایەدا ئیبنیزوبەیر وێڕای چەند هاڵاوان کـوژران و شەهید کران.

٣. دووبارە لە ساڵی ٣١٨ی کۆچی، هێرشی هۆزی قرامطە کرایە سەر کەعبە کە جگە لە بێ ئیحترامی و بێ ئەدەبیەکی زۆر بەو مەقامە، بەردی (حجر الاسود)یان دزی و ڕفاندیان تا بیست ساڵ ئەو بەردە پیرۆزە نەدراوە و نەهاتەوە کەعبە.

٤. و هەروا هێرشی ئەبرەهە لە ساڵی (عام الفیـل) واتە ئەو سـاڵەی حەزرەتـی ڕەسـووڵ لە دایک دەبوو، ئەبرەهە بە نیەتی لە ناو بردنی کەعبە بە سواری فیلان هێرشـی بـردە سـەر مەکـکە بەڵام نەیتوانی دەو هێرشەدا سەرکەوێ. ناوی ئەو ساڵە نرا ساڵی فیل چـونکە بە سـواری فـیلان هجوومی کرایە سەر.

ئەگەر بە وردی و بە هەسـتەوە ئەو ڕووداوانە هەڵسـەنگێنین دەتـوانین بە ڕاشـکاوی بڵێـین کەعبە لە ئەمنیەت خراوە دەگەڵ ئەو ناوەی خودا لێی ناوە (أمنا) و دەگەڵ ئەو داوایەی ئیبراهیم

بۆی کرد واتە ﴿رَبِّ اجْعَلْ هَـٰذَا بَلَدًا آمِنًا﴾ نایەتەوە. کە وا لەو ڕووەوە تووشی ئیشکال دەبین و ئیشکالێکی سەختیش، چونکە ناکرێ خیلاف لە وەعدی خودادا بێ. خۆ خوداش وەعدی ئەمن و ئەمانی داوە بە مەککە.

## وڵامی پرسیار

بۆ وڵامەکەی دەبێ چ بکرێ و چ بکوترێ دێرەدا؟ وڵامێکی خۆ پچڕینەوە و خۆ نەجاتدان لە هجووم و هێرشی ڕەخنەگران!

وەک دیارە و دەبیندرێ ئەو هێرشە بێ ئابڕوانە و بێ شەرمانەش هەموو لە لایەن ناحەزانی بە ناو ئیسلامی کراون تاکوو دەرکەوێ کە ئۆمەتی ئیسلام ناتوانێ ئیسلام و سنووری ئیسلام بپارێزێ لە بێ ئیحترامی پێ کردن. بەڵام دە واقیعدا نەشیانتوانی بە زاتی کەعبە زەرەر بگەیێنن چونکە ئامانج و قەست و نیەتی ئەو هێرشبەرانە وێران کردن و تێکدانی ماڵی کەعبە نەبوو، بەڵکە دەگەڵ ئەهلی مەککە و دانیشتووانی مەککە بوو. کە لە سۆنگەی ئەو ناکۆکی و عەداوەتیەی کە دەگەڵ خەڵکی مەککەیان بوو، تا ئەندازەیەک مەککەش تووشی زەرەر بوو. خۆ دیارە ئەوەش حاشا هەڵنەگرە کە خودای تەعالا پارازتن و ئەرزش ڕاگرتنی کەڕامەتی بەشەری داوەتە دەسی ئەقڵ و شعوور و تەگبیری ئەو. واتە ئەو دەبێ حەکیمانە و زانایانە و ژیرانە ئەرزشی خۆی و ئایینی خۆی و قەداسەتەکانی دینی خۆی بپارێزێ و نەیخاتە بەر پەلاماری پلاری ناحەزان و ناحاڵیان.

و هەروا بۆ بەرگری و بەربەست کردنی زمانی ڕەخنەگران لەو بارەوە کە ئەمە دەڵێن: ئەو هێرشبەرانە نییەتیان وێرانی کەعبە نەبووە و دوژمنایەتی دەگەڵ ئەو شوێنە نەبووە، ئەوانیش بڵێین جا چۆن وایە ئەو داوایە یەقین و سابتە ئەبرەهە دژایەتی دەگەڵ زاتی مەککە بووە و هەدەفیش لە هێرشەکەدا تەنیا وێران کردن و لە ناو بردنی ئەو بارەگایەی بووە تاکوو بارەگای خۆی لە سەنعا ڕەونەق وەدەس بێنێ. ئەمەش دەڵێن ڕاستە ئەوە هەر بۆیەشە خودای تەعالا مەیدانی پێ نەدا سەرکەوێ و ئەمنیەتی ماڵی کەعبە بەرێ و لێی بستێنێ چونکە خودا شتێکی بیدا بە کەسی بەرگری لێ ناکرێ.

هێرشبەرەکانی دیکە هەدەفیان وێرانی و لە ناو بردنی کەعبە نەبووە بەڵکە لە ناو بردنی ناخۆشەویستەکانی خۆیان بووە، هەر بۆیە تا ڕادەیەک تێیدا سەرکەوتوو بوون.

بۆ زێدەزانین تەفسیری کەبیر و تەفسیری تبیین القرآن ج٣، ل ٢٥٨-١٥٧ تەماشا کە.

## مەقامی ئیبراهیم و نوێژ

دڵ دەیهەوێ بزانێ مەقامی ئیبراهیم کوێیە و بۆ خودا دەستووری داوە لەو مەقـامەدا کـاتێ دەستووراتی حەج بەڕێوە دەبرێ لەو شوێنەدا نوێژ بخوێندرێ؟

ئەمەش بۆ وڵامەکەی ڕوو دەکەینە دەرگای مێژووناسان و قورئانزانـان. ئەوانـیش ئاوایـان کوتووە: کاتێ ئیبراهیم و کوڕەکەی، ئیسماعیل، لە سەر ئەساسی ئەمریبـاری دەکەونە دروسـت کردنی کەعبە و سازی دەکەن تاکوو دیوارەکـان ڕە حەوا دەکەون واتە لە دەسـت پێڕاگەیشـتنی ئیبراهیم دوور دەکەوێتەوە، لەو کاتەدا حەزرەتی جبرەئیل بە فەرمانی خودا ئەو بەردی وا سـازاو لە یاقووتی بەهەشتی کە دە ناو کێوی (اَبو قُبَـیْس)دا نـاژرابوو هەڵیـدەگرێ و دەیهێنـێ بـۆ لای ئیبراهیم کە بیخاتە ژێر لاقی لە کاتی دیوار دانـان، گـۆیە ئەو بەردەش بە شـێوەی مـوعجیزە تـا دیوار بڕواتە سەر ئەویش بڵیند دەبێ بە پێی نیازی حەزرەتـی ئیبراهـیم و بە هەر چـوار دەورەی دیواریشدا دەگەڵ ئیبراهیم دەگەڕێ و دەسووڕێ، تاکوو بینای کەعبە تەواو دەبـێ ئەو بەردە بەو حاڵەتەوە دەبێ و دەمێنـێ. کـاتێ کەعـبە تەواو دەبـێ ئیبراهیمکـاری بە لای سـەرەوە نـامێنێ، بەردەکە بە حـاڵەتی موعجیزەئاسـا نەوی دەبـێ و دادەبەزێـتە خـوار بـن دیـوار لەو شـوێنەدا دادەمەزرێ کە دوو پێیەکانی ئیبراهیمی چوونە سەری لە کاتی دیـوار دانانـدا، هەر لەو جێگـایە دادەمەزرێ دەبێتە زیارەتگا و تەبەڕڕوکخانە، بە کوردی و بە کورتی ئەرزشداری و ڕێـزداری ئەو بەردە لە سێ ڕێوەیە:

١. لە بەهەشتەوەڕا هات بە هۆی جبرەئیل

٢. بۆ بنچینەی ماڵی کەعبە کەڵکی لێ وەرگیرا

٣. شوێنی دوو پێیەکانی ئیبراهیمی پێوە دیارە.

لەو بارەوە ڕا و بۆچـوون زۆرە، هەروەک لە هەمـوو شـوێنەوارەکانی مێـژوو و بابەتەکـانی شەرعی حەتا ئەو شوێنانەی نەسی سەریحی ئایەتیشیان لە سەرە، زانایانی ئەسپسواری عیلم و زانست ئەسپی خۆیان لینگ داوە و لە سەر یەک ڕانەوەستاون هەر یەکە بە لایەکـدا ڕۆیشـتوون واتە نەزەریان داوە.

## کورتەیەک لە ژیانی ئیسماعیل

ئیسماعیل وشەیەکی عەجەمییە، بە عەرەبی واتە ئیتاعەکێشی خودا. حەزرەتـی ئیبراهـیم لە

بەر ئەوەی بە پیری گەیشتبوو نیازی تەواوی بە ئەولادێکی گـوێ لە مسـت و بە حەیـا و ئەدەب هەبوو، جا بۆیە کەوتە نزا و پاڕانەوە لە بەر خودا بۆ حەولادێکی ئاوا، خوداش دوعاکەی قبووڵ کـرد و ئیسـماعیلی دایە. ئیسـماعیل هەوەڵـین حەولادی ئیبراهـیم بـوو لە وڵاتـی شـام لە هاجەرەخانم پەیدا بـوو. وێسـتا هەر منـداڵ بـوو کە دەسـتوور درا بە بـابی کە دەگەڵ دایکـی، هاجەرەخانم، بچنە مەککە وەک زاندراوە و بە سـبووت گەیـوە لە شـامڕا تـا مەکـکە نیـزیکەی بیست ڕۆژ دەخایەنێ تا دەگەنێ. جا چۆن ئیبراهیمی وا پیر و هـاجەرەی وا نـازک پـێ نەکـراو دەگەڵ ئیسماعیلی وا منداڵ توانیویانە ئەو ماوە دوور و درێژەی نێوان شـام و مەکـکە دە ئەرزی ڕۆژێکدا یا دوو ڕۆژ، دەبێ بەقا بکرێ و بکوترێ چونکە چوونەکەیان ئەمری باری بووە، هەر بە ئەمری باریش جبرەئیل بە سواری بوراق هەرسێکی، واتە: ئیبراهیم و هـاجەرە و ئیسـماعیل، دە ماوەی کەمتر لە چاوهەڵێنان و لە سەر یەکدانان ئەو مابەینەی بڕی و داینان لە ئەرزی مەکـکە. گۆیا لە هێندێک شوێنان ئیبراهیم بە جبرەئیلی دەکوت ئەو شوێنەیە دەبێ بیچمـێ، جبرەئیلـیش دەیفەرموو نەخێر، سەرەنجام جبرەئیـل لە مەکـکەی دابەزانـدن. ئەوزەمـانیش مەکـکە ئـاوەدان نەبوو، سـەرزەمینێکی چـۆڵ و قـاقڕ وەک ئەوەی دەچـوو لە پێشـدا (بیـت المعمـور) بـووبێ. مەککەش وەک تەپۆڵکەیەک لەوێدا خۆی دەنواند.

## هاتنی ئیبراهیم و ئیسماعیل و هاجەرە بۆ مەککە

بە هەر حاڵ ئیبراهیم هاجەرە و ئیسماعیلی لەوێ دانان و بۆخـۆی لە سـەر ئەمـری ئیلهـام بەرەو شام گەڕایەوە. هاجەرە لێی پرسی ئایا مەگەر ئەتۆ ئـێمە لەو چـۆڵ و قـاقڕە بـێ تێشـوو و ئاوی کانی بەجێ دێڵی؟ مەگەر فەرمانی خودات لە سەرە؟ ئیبراهیم فەرمـووی بەڵـێ. ئەوجـار هاجەرە فەرمووی کە وابێ خودا ئێمەی لەبیرە و کارسازی بۆ کردووین. حەزرەتی ئیسـماعیل لە داوێن دایکی ئازیزی بەخێو کرا تا تەمەنی مبارەکی گەیشتە دە سـاڵ یـا دوازدە سـاڵ. ئیبراهـیم دووبارە لە شامەوە بەرەو هـاجەرە و ئیسـماعیل گەڕایەوە. هەر لەو ساڵانەشـدا بـوو کە ئەمـری خودای لەمەڕ سـەربڕینی ئیسـماعیل دە خەودا پـێ ڕاگەیـی. لەو تـاقی کـردنەوە سـەختەدا بە سەربڵیندی هاتە دەر و شەیتانی شکست پـێ دا. هـۆزی بەنیجورهـوم لە بەر ئەوەی کە ئـاوی زەمزەمی لێ پەیدا ببوو بۆ لێژیان دەبوو هاتن لەوێ نیشتەجێ بوون. ئیسماعیل لەوانڕا زمـانی عەرەبی فێر بوو چونکە ئەوزەمان زمانی عەرەبی نەدەزانی هەر زمانی خۆی، عیـبری دەزانـی. و هەروا ژنیشی لەو هۆزی جورهـوم هێنـا. پـاش مـاوەیەک وەزع وا هـاتە ڕوو ئەو ژنـی هـۆزی

جورهم ئازاد کرد، ژنێکـی دیـکەی هێنـا لەو ژنەی دوایەی ١٢ ئەولادی لە نەسـلی عەرەب لـێ وەدی هات کە نەسلی عەرەب سەراپا لەو دوازدە کوڕەی ئیسماعیل هاتنە ڕوو. ئیسماعیل وەک دەڵێن لە تەمەنی ١٣٦ساڵیدا وەفاتی فەرموو، دە حەرەمدا نێژرا. ئەو جەریانە دڵ دەهـاژێنێ. بـۆ زێدەزانین تەفسیری تبیین الفرقان، ج٣، ل ٢٦٦ یان تەفسیری کەبیر ج٤/٣ چاو لێکە بۆ ئەو باسە دوور و درێژە.

ئیمامحەنەفی لەو ئایەتە (١٢٥) ئەوەی هەست پـێ کـردووە: کەسـێک لە دەرەوەی کەعـبە قەتڵ بکا و خۆ بخاتە ناو کەعبە تا دەوێدا بێ، قیساس ناکرێ. بەڵام ئەگەر دە ناو کەعبەدا قەتڵ بکا، هەر دەوێدا قساس ڕەوایە چونکە قەداسەت و ئەمنیەتی نەپاراستووە.

ئیمام مالک و شافعی دەڵێن هەر دە کەعبەدا قساس دەکرێ چونکە قاتڵە و قساس تۆڵەیە. بۆچوونی ئیمام ئەحمەد وەک حەنەفی وایە.



هاتین گەیشتینە ئەو قۆناغە کە نیازمان بە ئایەتی ١٢٦ بەقەرەیە تاکوو بزانین ئیبراهیم چۆن لە بەر خودا دەپاڕێتەوە بۆ کەعبە و ئەهلەکەی کە لەو چۆڵ و قاقڕەدا نیشتەجێ بوون.

﴿١٢٦﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَـٰذَا بَلَدًا آمِنًا وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُم بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلاً ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَى عَذَابِ النَّارِ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ

**وەبیر خۆت خەوە ئەو کاتەی ئیبراهیم کوتی: خوایە! ئەو شوێنەی کە مـاڵە تـۆم لـێ بینـا نـاوە، بیکە بە شارێکی پارێزراو لە دەسدرێژانی زۆرداری ستەمکار. (بەڕاستی خـودا نـزاکەی گیـرا کرد، ئاوا بەو شێوازە هەر ستەمکارێک و زۆردارێک بیویستایە دەستی بـۆ درێـژ کـا خـودا لە دەستی داوە و بێ ئابڕووی کردووە وەک لەشکری ئەبرەهە کە بۆخۆیان و فیلیان بەبێ ئابڕوویی قڕی کردن.) (هەروا ئیبراهیم لە نزاکەیدا فەرمووی): خودایە ڕۆزی دانیشتووانی ئەو شارە بدە، لە میوەجـات و خـواردەمەنی. ئەو دانیشـتووانەی کە ئیمانیـان هەیە بە خـودا و ڕۆژی تـۆڵە، (بەڕاستی خودا نزاکەی گیـرا کـرد هەمـوو چەشـنە میـوەیەک لە هەمـوو دەمانـدا بە زۆری لە مەککەدا هەیە، نەک هەر لە کاتی حەجا) خـودا فەرمـووی: ڕۆزی بێبـاوەڕانیش دەدەم و چەن ڕۆژێکی کەم بەهرەمەندیان دەکەم لە دنیادا، لە پاشان واتە ڕۆژی تۆڵە ناچاری دەکەم بە سزای ئاگری دۆزەخ، ئاگری دۆزەخیش جێگایەکی زۆر خراپ و ناخۆشە.**

دڵ دێرەدا دەکەوێتە دامان و ڕامان لەو بارەوە: حەزرەتی ئیبراهیم داوای شتانێکی کـردن لە خودای تەعالا کە بە شایانی شەئنی پێغەمبەران نابینـدرێ لە دنیـادا. شـتەکان: (ثمـرات، رزق،

امان). ئەوانە شتانێکن دنیایی، دیارە پێغەمبەران کەسانێکن هەڵبژاردەی خودا هێنـدە تـێکەڵاو و تامەزرۆی ئەو شتانەی دنیـا نـین و بۆشـی نـاکەونە فکـر و بیـر و غەم و دامـان. کەوایە چـۆن بەراوەرد دەکرێ ئیبراهیم پێغەمبەر بۆ ئەهلی مەککە ئەو سێ نیعمەتەی داوا کرد لە خودا؟!

دەبێ بۆ لابردنی ئەو نەختە ئیشکالە و ڕەخنەیە لە سەر ئیبراهیم ئاوا بچینە پـێش و بڵێـین: ئەنعامی دنیا دەبێ دوو بەش بن: ١. بەشێکیان دنیایین خالیسانە هیچ ڕەبتیـان بەولاوە نیـیە و بە ئایینیش، ٢. بەشێکیشیان بە تەواوی ڕەبتی بە دین و ئـاخرەتەوە هەیە و حەتـا دەبـنە پێشـەنگ و پێشوازی دنیای ئاخرەت. بـۆ نمـوونە ڕزق و ڕۆزی و ئەمنـیەت، ئەوانە ڕاسـتە نیعمەتـانێکن لە دنیادا ڕەبتیـان زۆر بە دیـن و ئـاخرەتەوە هەیە، بـۆچی؟ ئەگەر دە نـاو کـۆمەڵی موسـوڵمانان‌دا ئەمنیەت و ڕزق و ڕۆزی زۆر بێ و هەبێ بە میزانی یاسا ئیستیفادەیان لێ بکرێ، دە ناو کۆمەڵدا ڕەحـم و بەزە زۆر دەبـێ و ئینسـاف و عەداڵەت و برایەتـی و تەبـایی بە تەواوی بەردەگـرێ و سەردەگرێ.

ئەگەر دە ناو کۆمەڵدا ئەمنیەت نەمێنێ و ڕزقیش کەم بێ، ڕێگای ئایین پەرستی و بـازگەی پەڕینەوە لە تۆفانی موشکیلات وەتەنگ هەڵدێ. وردەوردە بازگەکانی دینی لادەچن بەرەو دیـن و ئایین چوون وە زەحمەت دەکەوێ، کۆمەڵ گرفتاری بێ ڕێـزی دەبـن لە ئاقـار یەک ئاسـار و نیشانەی ناحەزی نامرۆڤایەتی دێتە ڕوو. هەر ئەوەشە هۆ کە حەزرەتـی ڕەسـووڵ فەرمـوویەتی: (كادَ الْفَقْرُ أنْ يَكونَ كُفراً) واتە زۆر بەدوور نییە فەقیری ڕاتکێشـێ بەرەو کـوفر. جـا لەو ڕووەوە بووە کە حەزرەتی ئیبرایم داوای ئەو نیعمەتانەی بۆ ئەهلـی مەکـکە لە خـودا کـردووە، تـا کـوو ئەهلی ئەو شوێنە پیرۆزە بەدوور بن لەو ئافەتانەی باسمان کردن. بە پێی ڕێنمونی خودا نیعمەتی دنیا ڕاتدەکێشێ بۆ نیعمەتی ئاخیرەت. (تەفسیری کەبیر، ج٣، لاپەڕە ٦٣)

ئەوجار کاتی ئەوەی هاتووە بـڕوانینە ئەو دیمەنـانەی ئیبراهـیم و ئیسـماعیل کە کەعبەیـان دروست کردووە و بینایان ناوە، دەگەڵ یەک دووان، بۆ ئەو بـابەتەش دەچیـنە خـزمەت ئـایەتی ١٢٧ی بەقەرە:

﴿١٢٧﴾ **وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ**

**وەیـادی خەوە ئەو کـاتەی کە ئیبراهـیم و ئیسـماعیل بنچیـنەی کەعبەیـان ڕە حەوا دەخسـت و دەیانکوت: خودایە لێمان گیراکە ئەو کردەوەمان کە بۆ تۆیە، کە بەڕاستی هەر ئەتۆ دەبیسـی و (دەزانی نزاکەر دەڵێ چی و چی دەوێ) هەر ئەتۆ لە دڵ و دەروون باخەبەری.**

وەک دیارە و هەستیش دەکرێ ئایەتی ١٢٧ خوازیاری ئایەتەکانی ١٢٨ و ١٢٩یە بەبێ نێوبڕ، بەو پێیە دەبێ بچینە خزمەتیان بێ‌وەی ڕێ بدەین و ڕێ بدرێ نزا و پاڕانەوە و داواکاری ئیبراهیم نێوانی بکەوێتێ:

﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ

﴿١٢٩﴾ رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ

**(١٢٨) ئەی پەروەرەندەم! بمانگێڕە بە فەرمانبەری خۆت، بەو جۆرە کە هەر تۆ ئیتاعە کەین و بناسین و ڕووت تێکەین، و یارمەتی تەنیا هەر لە تۆ بخوازین، و هەچی بیکەین هەر لە بەر تۆی بکەین و هەچی نەیکەین هەر لە بەر تۆی نەکەین. (١٢٩) و لە نەوەکانمان زۆر بکە بە فەرمانبەری خۆت، تاکوو ئایینە پیرۆزەکەی ئیسلام پەرە بستێنێ و وڵات بخاتە ژێر ئیتاعەی خۆی و نیشانمان بدە ئەو ڕێگایانەی ناسینی خۆتی تێدایە و تۆ بەشمان و پەشیمان بوونەوەشمان لێ گیرا کە و وەرگرە، چونکە بەڕاستی هەر تۆی میهرەبان و قبووڵکەری تۆبە و پەشیمانی.**

## پاڕانەوەی ئیبراهیم و ئیسماعیل

حەزرەتی ئیبراهیم لە سەر ئەساسی ئیلهام و وەحی وەرگرتن لە باریتەعالا دڵی بەو هەستە هەستیار بوو کە ئەو خێزانەی ئەو لە مەککە دە پاشەڕۆژێکی دوور و درێژدا دەژی و کۆمەڵ و گەلێکی زۆری لێ پاشەکەوت دەبێ و بێ‌گومان نیازیشیان بە ڕێبەرێکی دڵسۆز و میهرەبان دەبێ. چونکە نازانن سەرەدەرێ دەرکەن و ڕوو دە خودا کەن بە شارەزایی، جا لە سەر ئەو نیەت و باوەڕە حەزرەتی ئیبراهیم ڕوو دە قاپی بارەگای خودای دەکا و دەڵێ: ئەی پەروەردەم! لە ناو نەوەکانم کە لەو شوێنە پیرۆزەدا (مەککە) نیشتەجێ دەبن و دەکەونەوە، هەر لە خۆیان ڕێبەر و ڕێنوێنێکیان بە ناوی پێغەمبەر بۆ بنێرە و لە ناویاندا هەڵخە، و ئایەتەکان و دەستووراتەکەی تۆیان بۆ وەخوێنێ و فێریان کا و بە شێوەیەکی وا کتێب و ڕێنوماکانی تۆیان فێر کا کە مشتومالی دەروونیان بکا و پاکیان وەکا لە هەچی چڵک و چەپەر و ژەنگ و لاساری و سەرەڕۆیی‌یە، بێ‌گومان هەر تۆی بەهێز و بتوان و زانا، و هەر لە دەس تۆ دێ هیدایەتی تەواو.

## ئاوڕدانەوەیەک

لە هەڵسەنگاندن و بەراوردی نزا و پاڕانەوەی ئەو دوو پێغەمبەرانە (ئیبراهیم و ئیسماعیل) لە خودا بۆ ئەو پێنج سیفەتانە: ١. قبووڵی تۆبە ٢. دەستەمۆ کردنیان بە تەسلیم ٣. ئاشنایی بە ئادابی دینی ۴. گیرای تۆبە و پەشیمانی ۵. ناردنی ڕەسووڵ لە ئاخر زەماندا.

هەست دەکرێ بە ڕوونی کە ئیسلام بریتی لەو ئەعماله زاهیریانە نییە کە نوێژ و ڕۆژوو، حەج و زەکات و...یە. بەڵکە کەماڵی عەبدایەتی و تەسلیمی خاس بۆ خودای یەکتا پێ دەکوترێ دین و ئیمان. بەو دەلیلە ١. تاعەتی زاهیری وەک نوێژ و ڕۆژوو ... هەستێکن لە هێزی باوەڕ بە هێزی خودای بەتوانان هەڵدەقوڵێ، واتە تەسلیم بوون بە عیبادەتی زاهیر، تەسلیم بوون بە باوەڕی بەهێزی دەروونییە. هەروەک بۆ تەئییدی ئەوەی کە ئیسلامی زاهیری، مەرزی کەماڵ نییە، بەڵکە ئیمان و باوەڕی هەستی ناو دەروون قۆناغی کەماڵی ئیمان و ئینسانە، بڕوانە لە ئایەتی ١۴ی حوجورات: ﴿قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ وَإِن تُطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَالِكُمْ شَيْئًا إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾
**عەرەبەکان کوتیان ئیمانن هێناوە. بڵێ پێیان ئیمانتان نەهێناوە، بەڵام با بڵێن موسوڵمان بووین و بڵێ پێیان: ئێستا ئیمان لە ناو دڵی ئێوە جێگیر نەبووە، ئەگەر ئێوە خودا و پێغەمبەر ئیتاعە بکەن، لە ئیمان و باوەڕ و ئەعمالتان هیچ کەم ناکرێ، خودا بە بەخشش و بەبەزەیە.**

ناوەرۆکی ئایەتی ١۴ی حوجورات دەڵێ بە ئینسانی، شوێنی ئیمان و باوەڕی ناو جەرگەی دڵە، چونکە جووڵانەوە و ڕاپەڕینی ئینسانی بۆ هەر لایەک، هەستی ناو ژووری ماڵی دڵە. هەروەک نەشە و گەشە و بەری دار و گیاوگۆڵ، ئاوخۆرەوەیەتی، لە ئاوخۆرەوەیەکی کە قەلبی دار و گیاوگۆڵە، لەوێڕا جوانی و بەرهەمی باش دەردەکەوێ و دێتە ڕوو. ئینسانیش لە نیەت و باوەڕی دەروونی هەڵس‌وکەوتی دەردەکەوێ.

٢. لە بڕگەی هەوەڵدا کوتمان ئەعمالی زاهیری دین وەک نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات بە تەنیا نیشانەی ئیمانی بەواقعی نییە، بەڵکە کەماڵی ئینسان کە لە ئیمانەوەیە دەبێ ئەو ئیمانە لە تەسلیمی مەحز و خالیسی خوداوە بێ.

وهەروا لەو بڕگە دوویەشدا دەڵێین: چرای ئەقڵ کە بە هۆی نووری ئەو دەگەی بە نووری زانست و خوداناسی، و لەوێشڕا دەگەیە قۆناغی کەماڵ، دەبێ هەوێنی دین و ئیمان کرێ. چونکە نوور ئەقڵ و شعووره قەناعەتی خوداناسی دەدا. واتە بە زۆری ئەقڵ تەسلیمی هەرچی

بێ، دڵیش خۆی تەسلیم دەکا. واش دەبـێ و هەشـە دڵ تەسـلیمی ئەقـڵ نـابێ، وەک لە سـێ شوێندا ئەوە هەست پێ دەکرێ کە دڵ لە خەتی ئەقڵ لادەدا و تەسلیمی ئەقـڵ نـابێ. ئەو سـێ شوێنەش: تەماع، خۆبەزلزانین و حەسوودی. خۆدیتن و حاشاردان لەو سێ شتانە: ١. تەمـاع: حەزرەتی ئادەمی بەرەو خواردنی ئەو دارە بـرد کە خـودا لێـی قەدەغە کردبـوو، ئەوە دێـرەدا دڵ تەسلیمی ئەقڵ نەبـوو بە هـۆی تەسـلیم بـوونی بە تەمـاع. ٢. خـۆ بەزلزانـی (تکـبّر) شـەیتان سەرپێچی کرد لە ئەمری باری سەژدەی نەبردە بەر ئـادەم بە هـۆی تەکەببـور، ئەوە دێرەشـدا دڵ خۆی تەسلیمی ئەقڵ نەکرد بە هۆی خۆ بەزلزانی. ٣. حەسـادەت: قـابیلی پـاڵ پێـوە نـا بەرەو کوشتنی برای خۆی هابیل. ئەوە دێرەشدا دڵ تەسلیمی ئەقڵ نەبوو بەڵکە خـۆی لە بەر نـووری ئەقڵ لادا بەرەو سێبەری حەسادەت چوو بۆیە کەوتە ناو بیری جەهل.

سـەراپای ئەو کـارە ناڕەوایـانەش لە وەشـوێن نەکەوتنـی دڵە بـۆ ئەقـڵ و شـعوورە. ئەو وەشوێننەکەوتنەش ناشی لەوەیە بە تەواوی پایەی ئیمان لە ناو هەستی دەروونی دانەمەزراوە بە چاکی، بە کوردی و بە کورتی دەبێ بیسەلمێنین هەچی ناشکوریە لەو سـێ شـتانەڕایە: تەمـاع، تەکەببور، حەسوودی. بۆ باوەڕی ورد بەوە لە ناوەرۆکی ئایەتەکانی ١٤ حوجورات، ١٤ نەحـل، ١٩ ئالیعیمران و ١٤٦ بەقەرە.

**ئاوڕدانەوە** وەسەر پێنجەمین داوای حەزرەتی ئیبراهیم لە خودای میهرەبان ئەویش کە ناردن و هەڵخستنی پێغەمبەرێکی خۆماڵییە لە ناو ئەو گەلە نیشتەجێیەی وڵاتی مەککە:

دە ئەساسـدا لزوومێکـی زەروورییـە بـوونی ڕێـبەر بـۆ هەر گەل و هـۆز و نەتەوەیەک بەو دەلیلە: حیکمەتی خەلقـی ئینسـان تەکـامول و کەمـاڵی ئینسـانە، و ئەوەی دەتـوانێ بە کەمـاڵ گەیاندنی ئینسانی وە ئەستۆی خۆی بگرێ، دەبێ هەم خودای هەم کەماڵی ئینسانی باش بناسێ و لە چوارچێوەی ئینسانناسیشدا شارەزا و پسپۆڕ بێ و هەروا دەبێ ئەو کەسە لە جنسی بەشـەر بێ تا بتوانێ ئەو نموونەی بەرزی بەشەریەت بێ و چاوەی ئەمنیەت و بەقای ئینسـان بـێ. جـا بۆیە حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل بە جووت داوایان کرد لە خـودای تەعـالا کە پێغەمبەرێـک ڕەوانە کا و بنێرێ بۆ نـاو گەل لە نەوعـی ئەو گەلە بـێ تـاکوو چـۆنیەتی و خسووسـیاتی یەک ئینسانی بێ و لەوەیڕا بتوانێ دەرد و نیاز و داوا و هەستی ئینسان هەست پێ بکا و دەرکـی کـا. پێغەمبەران بە وەسیلەی بەیانی کەلامی باری (کتێبـی ئاسـمانی) توانیویـانە هەسـتی دەروونـی ئینسـان هەسـتێنن و ڕاپەڕێـنن بەرەو دۆزیـنەوەی ڕێگـای ڕاسـت، کە خوداپەرسـتییە و هەروا

شارەزای خوێندنەوەی کتێبی خودایان کەن تاکوو بتوانن بۆخۆیان حەق و ناحەقی لێکەوەکەن. وهەروا دەبێ گەل بەرەو زانین و زانست و حیکمەت بەڕێوە ببەن، و تەواوی ئەو ڕێ و ڕەسمە بۆ گەیشتن بە قۆناغی پاکی و سەفایە (تذکیە)، بە کورتی هەدەفی هاتنی ڕەسوولان تەربیەتی ئینسانە لە سێ ڕێگاوە: ١. فایدەی هاتنی بۆ سەر زەوی تێگەیێندرێ ٢. فایدەی ڕۆژی ئاخرەتی تێگەیێندرێ ٣. فایدەی ئەخلاقی حەسەنەی تێگەیێندرێ.

بەڵێ خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم پاشی هەزاران ساڵ نزای ئیبراهیم و ئیسماعیلی هێنایە دی کە ناردنی ئاخرین پێغەمبەر بوو بە ناوی محەمەدﷺ لە شاری مەککە لە نەوەی پاکی ئیبراهیم و ئیسماعیل. ئەو پێغەمبەرەش هەر لە سەر ئەساسی ئایینی پیرۆزی ئیبراهیم ڕێبەری ئینسان دەکا کە بریتییە لە ناسینی خودا بە تاک و تەنیا و ڕوو تێکردنی بە دڵێکی پاک و ئیخلاسی کە ئەوەش ڕێکوپێکی سرشتی ئینسانە، کێ لێی لادا لە سرشتی بەشەری لایداوە، و کێش لێی لانەدا، توانیویەتی خۆ نەدۆڕێنێ، جا بۆیە خودای تەعالا دەفەرموێ دە ئایەتی ١٣٠ بەقەرەدا: کێیە ڕوو وەرگێڕێ لەو دینە پاک و سرشتیەی ئیبراهیم کە محەمەدﷺ ڕایدەگەیێنێ بە جوز هەرزە و پەتیارە و دۆڕاو. جا بۆ تەئیدی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٣٠ی بەقەرە:

**﴿١٣٠﴾ وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلاَّ مَن سَفِهَ نَفْسَهُ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ**

**کێ هەیە ڕوو وەرگێڕێ لە ئایینی ئیبراهیم مەگەر کەسێک کە خۆی دۆڕاندبێت و هەرزە و پەتیارانە و چرای بیر و ژیری کوژابێتەوە. (واتە ئایینەکەتان ئایینی ئیبراهیمی باپیرەگەورەکەتانە کە مایەی شانازی ئێوەیە، جا چۆن لێی لادەدەن و پشتی تێدەکەن) بەڕاستی ئێمە ئیبراهیمان هەڵبژارد لە جیهاندا بۆ پێشەوای ئینسانی دەورانی خۆی و ئەو (واتە ئیبراهیم) لە ڕۆژی ئاخیرەتدا لەو چاکانەیە کە پلە و پایەبەرزن و بەڕاستی شایستە و شایانە کە وە دوای خۆی و ئایینی بکەون.**

دەبێ موسوڵمان بە تەئکید ئەوە بزانێ و باوەڕی پێ بێ کە سەرچاوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەگەڵ سەرچاوەی ئایینی پاکی ئیبراهیم و پێغەمبەرەکانی دیش هەر یەک سەرچاوەن کە هەموو ئایینەکانیش بریتین لە باوەڕی هێنان بە تاک و تەنیایی خودا و پەرستنی بەبێ هەواڵ بۆ دانان. و هەروا باوەڕی بە فریشتەکانی خودا و پێغەمبەران و کتێبەکانیان و بە ڕۆژی دوایی و چاکەکردن و خۆپارازتن لە تاوان و فەسادکارییە. سەیر لەوەدایە دەگەڵ ئەو یەکبوونەدا کەچی

جوولەکەکان و عەرەبەکان کە خۆیان بە نەوەی ئیبراهیم دەزانن زۆربەیان باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام نەدەهێنا و نەیانهێنا.

## سووکەئاوڕێک

ئەوەی بەو هەموو ڕووناکاییەی ئایینی ئیبراهیم هەیەتی، ڕووی لێ وەرگێڕێ نەزانانە دەناو زەل و زۆنگی جەهلدا تلان دەدا، کەوابێ زانایان و پسپۆڕان و ژیران دەبێ قۆڵ وباڵی هیممەت هەڵماڵن بە وەسیلەی ئەقڵ و شعوور لە سەر ئەساسی حیکمەت و ئامۆژگاری جوان و موجادەلەی ئەحسەن، بەرەو حەق و حەقانیەت بانگێشتنیان کەن، چونکە ئەقڵ دەتوانێ ئینسانی لە سواری کەری شەیتانی کە جەهلە، دابەزێنێ. لە ڕوانگەی قورئان ئەقڵە دەتوانێ ئینسان بە خودا بگەیێنێ، چونکە نووری ئەقڵ ئەگەر دەلای حەقی دێری، حەق دەدۆزێتەوە، هەروەک ئەگەر دە لای دنیای کەی دنیای پێ داگیر دەکەی ئەمما ئەودەم بەو ئەقڵە ناکوترێ ئەقڵی سرشتی و ئەقڵی حەقناس، بەڵکە پێی دەکوترێ ئەقڵی خۆکوژی و خۆترێن.

**ڕاستییەک:** ئەقڵ و شعوور خۆ دەکوتن بۆ حەسانەوە و ئارامشی گیان، خۆ ئەوەش ڕوون و حاشاهەڵنەگرە، ئارامی لەش وگیان و حەسانەوە لە کن خودایە واتە دە یاد و بیر و هەڵسەنگاندنی ئاسارەکانی خودایە، جا لە سەر ئەو ئەساسە کێ پشت دە خودا کا و دووری لە ئەمر و دەستووراتەکانی کات، ئەو کەسە بێ گومانە شووشەی ئەقڵ و شعووری بە بەردی نەزانی شکاندووە و هاڕیوە.

دەبێ ئینسان لە پێغەمبەران و ئاکار و ڕەفتاریان دەرس وەرگرێ، تەماشاکە لەوەی خودا چۆنی ئیبراهیم هەڵبژارد و ئەویش چۆنی ئیتاعە کرد و شوێن دەستوورەکانی کەوت، بۆ ئەو بابەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٣١ی بەقەرە:

﴿١٣١﴾ إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ

**(دە بیخەوە بیرت) کاتێک خودا فەرمووی بە ئیبراهیم موسوڵمان بە و مل کەچی بنوێنە، ئیبراهیمیش بێوەستان کوتی: ئەوە من موسوڵمان بووم و مل کەچم بۆ پەروەردگاری عالەم.**

## دەبێ لە پێغەمبەر فێر بین

**ئاوڕدانەوەیەک:** وەک ئەوەی دەچێ ئەو ئەمرەی باری بە ئیبراهیم بە لەفزی (اَسْلِمْ) لە زەمانێکدا بووبێ کە حەزرەتی ئیبراهیم پێغەمبەر بووبێ. بەو پێیە ئەو ئیشکالە دێتە ڕوو: یەکێک

بە مەقامی پێغەمبەرایەتی گەیبێ، لەوە تێپەڕ دەکا پێی بکوترێ: موسـوڵمان بە، یـان تەسـلیم بە. کەوایە دەبێ مانای ئەو (اَسْلِمْ) چۆن تەعبیر کرێ تـا ئەو ئیشـکالە نەیەتە ڕوو. دەبـێ وڵام ئـاوا بدرێتەوە: ئیسلامی بوونی حەزرەتی ئیبراهیم بە پێی فەرموودەی قورئان، نمـوونەیە بـۆ هەمـوو پێغەمبەرانی دوای خۆی، چ جای موسوڵمانان؛ دەرسی زۆر بەرز و بەجێـی تێـدا ڕۆنـدراوە، لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ بڵێین دوو نوکتەی دڵگر و پەسند دەو لەفزە (اَسْلِمْ)ی ئیبراهیمدایە:

**نوکتەی ١.** (اَسْلِمْ) واتە مل بدە بە دروستی بە تەواوی ئەحکامات و تەکلیفات و ئیتاعـاتی عیبادەتی باری. بە سێ جیهەت: ١. زمانی، واتە ئیقرار بە زمان ٢. پاش ئیقرار بە زمان تەسـدیق بە دڵ لە سەر یەقینی خاڵی لە گومان و دڵەڕاوکێ. ٣. (اَسْلِمْ) واتە تەسلیم بە عەمەل. یانی پاش ئیقرار بە زمان و تەسدیق بە دڵ، دەبێ بە ئیخلاسی بە عەمەل بگەیێندرێ. کەوابـێ دەبـێ بڵێـین حەزرەتی ئیبراهیم داوای قبووڵ کردنی ئیسـلامی کـاملی لـێ کـرا، ئەویـش بە تەواوی قەول و ئەحواڵ و ئەمواڵ و ئەولاد و هەست و نیستی خۆی، خۆی تەسلیمی خودای خۆی کرد، وەک خودا دەفەرموێ: ئیبراهیم کوتی (أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ). بە کورتی و بە کوردی ئەوە بەو مانایە دێـتە ڕوو: ئیبراهـیم خـۆت بە هەمـوو هێـزی دەروونـی، زاهیـری، ڕوحـی و لەش و هەمـوو ئەندامەکانی لەش بە خودای خۆت بسپێرە.

ئەوەش با حاشار نەدەین و نەیشارینەوە: حەزرەتـی ئیبراهـیم ئەو جـۆرە تەسـلیم بـوون و ڕەفتارەی کە وەریگـرت لە بـاری هەر دە خۆیـدا حەبسـی نەکـرد، بەڵـکە سـپاردی بە عینـوانی وەسیەت بۆ وەچە و نەوەکانیشی، جا بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٣٢ی بەقەرە:

**﴿١٣٢﴾ وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلاَ تَمُوتُنَّ إَلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ**

**ئیبراهیم و یەعقووبی کوڕەزای ئامۆژگاری کـوڕانی خۆیانیـان کـرد بە ئیسـلامیەت بەو شـێوە جوانە، هەردوو لا بە کوڕەکانی خۆیانیان کوت: ئەی کوڕانی خۆمان! خودا ئایینی ئیسلامی بـۆ هەڵبژاردوون (توندتوند دە ناوماڵی دڵتاندا ڕام و حەمایەتی کەن) و کارێکی وا بـکەن: مەمـرن بە موسوڵمانەتی نەبێ.**

## ئامۆژگاری ئیبراهیم و یەعقووب

ئەو ئامۆژگارییە، ئامۆژگاری ئیبراهیم و یەعقووب بوو بـۆ کوڕەکانیـان تـاکوو یەعقـووبی کوڕی ئیسحاق کە باپیرەگەورەی جوولەکەیە، تا هاتە بەر مردن و گیـانەڵڵا، ئەو ئامۆژگـارییەی

هەر زەمزەمە دەکرد و لە بیر خۆی نەبردەوە.

دەگێڕنەوە کە جوولەکەکان بە پێغەمبەریان دەکـوت: ئایـا نـازانی کـاتی خـۆی یەعقـووب وەسیەتی کردووە بۆ کوڕەکانی کە هەر جوولەکە بن واتە لە سەر ئایینی جـوولەکە بـن. ئەوجـار خودای تەعالا بە هۆی ئایەتی ١٣٣ وەدرۆیان دەخاتەوە:

﴿١٣٣﴾ أَمْ كُنْتُمْ شُهَدَاء إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِن بَعْدِي قَـالُواْ نَعْبُـدُ إِلَـهَكَ وَإِلَـهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ إِلَـهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ

**(جوولەکەکـان دەیـانکوت ئـایینی ڕاسـت هەر ئـایینی ئـێمەیە، دیانەکـانیش هەر ئـاوا، وەک جوولەکەکانیان دەکوت. ئەوجار خوای تەعـالا بـۆ بەدرۆ خسـتنەوەیان لێـرەدا ڕووی قسـەیان تێدەکات و دەفەرموێت: ئێوە کە باوەڕتان بە ئایینی ئیسلام نیـیە،) ئایـا ئێـوە لە کـاتی مەرگـی یەعقووبدا لەوێ بوون؟ کە چی کوت بە کوڕ و نەوەکانی؟ پێی کـوتن ئێـوە لە دوای مـن کـێ دەپەرەسـتن؟ کـوڕ و نەوەکانیشـی کوتیـان: خـودای تـاق و تەنیـای تـۆ و باپیرەگەورەکانـت دەپەرستین (کە ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاقن) کە خـودای هەمـوانە، نەک ئەو شـتانەی کە زۆر کەس بە خودایان دەزانن و دەیانپەرستن، وەک ڕۆژ و مانگ و بـت و هەنـدێک گیانـدار. ئێمە تەنیا ڕوو لەو خودای تاک و تەنهایە دەکەیـن و فەرمانەکـانی ئەو بەجـێ دەگەیێنـین کە فەرمانە بۆ هەموو پێغەمبەرەکانی.**

## ئایەکانی ڕەحم و بەزە

**تێڕوانینێکـی دوور و درێـژ** لە نـاوەرۆکی ئایەتەکـانی ١٣٢ و ١٣٣ لەمەڕ ڕەحـم و بەزەی پێغەمبەران بۆ ئۆمەتیان و بۆ ئەولادیان کە دە بەرابەر هەردوو لا مەسئوول و عۆدەدارن:

لە هەڵسەنگاندن و بەرجەوەندی ئایەتەکانی بابەتی ئاینی ئیبراهیم و ئیسلامی مـحەمەدﷺ و هەروا لەو دوو ئایەتی ١٣٢ و ١٣٣ هەسـت بەو ئەمـرە واقـیعە کـرا و قبـووڵیش کـرا، چ ئـایینی ئیبراهیم و چ ئایینی ئیسلام کە لە ئەساسیشدا هەر یەکن، بۆ تەواو دنیـای بەشـەری بـێ فەرق و جیاوازی چـرای دەعـوەت و بانگـاوازن، مەسـئولیەتی ئەو دەعـوەتەش بەتـایبەتی لە ئەسـتۆی پێغەمبەرانە، کەوایە چۆنە ئیبراهیم و یەعقووب ئەولادەکانی خۆیان تایبەت کرد دەو ئایەتانەدا بە وەسیەت، و ئەوانیان هەڵاواردن ئەو دوو پێغەمبەرە هەڵبژێردراوانە لە عالەمی ئۆمەتیان.

دەبێ بە باوەڕەوە لەو بارەدا بڵێین و بیسەلمێنین: خۆشەویسـتی و تێبینـی لەمەڕ حەولاد دە سـرشتی ئینسانیدا لە سەرووی هەموو شتێکە، جگە لەوەش ئەو خۆشەویستیەی باب و دایی بۆ

ئەولاد، دەگەڵ مەقام و وەزیفەی پێغەمبەرایەتی دژایەتی ناخاتە ڕوو و نیەتی، بۆ نموونە ئیبراهیم بە یەک ئیشارەیی خەونی لە لایەن خوداوە بۆ سەربڕینی جگەرگۆشەکەی، ئیسماعیل، کەمەری ئامادەگی و ئیتاعەی بەست، ئەو ئیتاعەی ئیبراهیم ئەوە سابت دەکا کە خۆشەویستی خودا لەمەڕ پێغەمبەران لە سەرووی هەموو خۆشەویستییەکە. ئەو ئایەتە ئاماژە دەکا کە خۆشەویستی ئەولاد بەشێکە لە ئایین. (تەفسیری کەبیر).

جگە لەوەش دەکرێ و دەشتوانین بڵێین ئەو جەریانی ئیبراهیم و یەعقووب لەمەڕ وەسیەتی ئەولادانیان پەیڕەوی لە ئایەتەکانی ٦ی سوورەی تەحریم، ٢١٤ی سوورەی شوعەرایە و هەروا ١٣٢ی سوورەی تاها. بڕوانە بە تەرتیب لێیان:

﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا...﴾ **ئەی خاوەن باوەڕان! خۆتان و ماڵ و منداڵتان لە ئاوری دۆزەخ نەجات دەن.** (تحريم: ٦)

﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾ **خزمانی نیزیکتری خۆت لە عەزابی خودا بترسێنە.** (شعراء: ٢١٤)

﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ **دەستوور بدە بە ژن و منداڵانت بۆ نوێژ کردن و خۆشت پابەند بە بۆ ئەو وەزیفەیە.** (طه: ١٣٢)

لە ئیشاراتی ئەو ئایەتانەوە ئەوە بە سبووت دەگا کە وەسیەتی ئیبراهیم و یەعقووب لە ئەولادیان بە پێچەوانەی نیدای ئاسمانی نەبوون.

**سووکەئاوڕێک:**

ئەی جوولەکەکان و گاورەکانی کە ڕوو بە پێغەمبەر دەڵێن: ئایا مەگەر تۆ نازانی کە یەعقووب پێغەمبەر وەسیەتی بۆ کوڕەکانی کردووە کاتی خۆی کە ئێوە کوڕەکانم هەر جوولەکە بن؟! واتە هەر لەسەر ئەو دین و ئایینە بن!

مەگەر ئێوە نازانن ئەو گوفتارەی ئێوە واتە بە درۆ خستەنەوەی پێغەمبەرە، ئەوەش تەوهینە هەم بە مووسا و هەم بە کتێبەکانی ئاسمانی هەم بە پێغەمبەر محەمەدﷺ. بۆچی ئێوە لای حەزرەتی یەعقووب بوون کە دەهاتە بەر مردن کە وا دەڵێن: یەعقووب، جوولەکە یا گاور بووە؟ واتە ئێوە بێ گومانە لەوێ نەبوون و لە خۆتانەوە بێ بەڵگە و دەلیل ئەو قسە درۆیانە هەڵدەبەستن.

**وەهم و گومانێک:** دەگونجێ ئەو کوڕ و کوڕەزایانەی ئیبراهیم و یەعقووب بە هۆی گەورایەتی مەقامی باب و باپیریان لە ناو دڵیاندا وا بیر وەکەن کە لە ڕۆژی قیامەتدا تکامان بۆ

بکەن و بە هۆی ئەوەی کەسانی مەن، ڕزگارمان بـێ لە عەزاب و سـەخڵەتی ئەو ڕۆژە. ئەقـڵ و هەستی شعوور دەڵێ شتی وا نابێ و نابێ ببـێ، چـونکە ئەگەر ئەوە ببـێ، دەگەڵ دنیـا فەرقـی نابێ، خۆ دیارە فەرقی ئەو دونیـایە زۆرە و دە حیسـاب نـایە. چـونکە ئەو ڕۆژە پێـی دەکـوترێ نەفسی‌نەفسی. واتە هیچ نەفسێک باری هیچ نەفسێک وە ئەستۆی خۆی نـاگرێ. هەر نەفسـەی باری خۆی لە خۆی. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٣٤ی بەقەرە:

﴿١٣٤﴾ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلاَ تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ

**ئەوانە(ی باس کران لە ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب) دەستەیەک بوون ڕۆیـین بە ڕێی خۆیانەوە هەرچییان کرد بۆ خۆیان برد و ئێوەش هەرچی بیکەن بۆ خۆی دەکەن لە چـاکە و لە خراپە. (واتە هەر کەسێ خۆی و کردەوەی خۆی) و ئێوە بەرپرسیار نـین لە کـردەوەی وان (واتە ئەگەر خراپ بن ئێوە لە کرداری چـاکی وان بەش و بەهـرە نـاگرن و ئەوانـیش هەر وەک وە؛ کەوایە هەر پشت بە خۆتان ببەستن نەک بە باو و باپیرتان ئیبراهیم و یەعقووب و ..)**

### بە تەمای شەفاعەت

**قسەیەکی بەتامی ئیمامی غەزالی**: کەس بە مەلەی کەس ناپەڕێتەوە. کـوڕی برسـی بە نـان خواردنی بابی برسیایەتیەکەی لاناچێ، کوڕی تینـوو بە ئـاو خـواردنەوەی دایکـی، تینیـوایەتی لاناچێ.

لە ئیشاراتی ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ﴾ ئەوە هەست پێ دەکرێ (تەقلید) واتە خـۆ بەسـتنەوە بە غەیـر هیچ ئیعتبارێکی نەبێ، چونکە هەچی نەفسە لە ڕەهنی کردەوەی خۆیدایە، واتە کـردەوەی کەس ناچێتە سەر ئەستۆی کەسێکی دی. هەرکەس ئی خـۆی، ئـی خـۆیەتی، ئـی کەسـی دی نیـیە. ئەگەر تەقلید دروست بێ و ئیعتباری هەبێ، دەبێ کردەوەی قەڵادەچی بۆ قەڵادەکراو ببێ، دیارە ئەوەش نابێ لە سەر ئەساسی ئایەتی ﴿لَيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ﴾

هێندێک لە زانایان لە بارەی ئیمانی تەقلیدی مشـتومڕیان هەیە کە ئایـا ئیعتبـاری هەیە یـا نییەتی. تەحقیق‌گەران فەرموویانە بۆ زانایان تەقلید ناڕەوا و نادروستە بەو دەلـیلەی زانـا توانـای پەیدا کردنی دەلیلی هەیە لە سەر باوەڕ بە دین و ئـایین و حەتـا هێنـدێک کوتوویـانە تەقلیـد لە ئاییندا بۆ هیچ کەس ڕەوا و دروست نییە، نە بۆ زانا و نە بۆ نەزان دروست نییە، بـێ دەلیـل مـل نەوی کا بۆ قەڵاتە کردن. هێندێکیش بە کەڵک وەرگرتن لەو ئایەتە ﴿نَعْبُدُ إِلَـٰهَكَ وَإِلَـٰهَ آبَائِكَ

إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ إِلَـٰهًا وَاحِدًا﴾ کوتوویانه دروسته، ئەوە کە وڵامی کـوڕانی حەزرەتـی یەعقووبە کە ڕاستەوخۆ بێ دەلیل بە تێکڕایی کوتوویانە. بۆ زێدەزانین بڕوانە لە تەفسیری کەبیـر و تبيين الفرقان.

**ڕامـان و دامـان لەو بـارەوە:** ئایـا دەبـێ لە لای خـوداوە نـزا و پـاڕانەوەی پیاوچاکـان واتە (پێغەمبەران) گیرا نەبێ و ڕەد کرێتەوە؟ یان قەبـووڵ دەکـرێ و دەچێتە جـێ؟ ئەگەر گیـرا بـێ دوعای پێغەمبەران، ئەودەم دەبێ بەتەنیـا هەر دوعـا بـۆ وەچە و مەچە و حەولادی خـۆ نەکەن، چونکە ئەوان بۆ هەموو خەڵکێکن. خەڵکیش ئەولادی وانن بەو دەلیلە خێزانیان دایکی هەمـوو خاوەن باوەڕانن. کەوایە هەڵاواردنی ئەولادیان لە عالەمی دی دەبێتە هەڵە و تاوان و ئەگەر نزا و پاڕانەوەشیان لە لای خودا گیرا نەبێ، واتە کردار و کردەوەی هەرکەس بخرێتە ئەستۆی خـۆی، کە هەر ئەوەش نیزامی عەداڵەتە، دەبێ ئینسان خۆی بە کەس فریو نەدا و نەخوا، خۆی تێکۆشێ بۆ نەجاتی خۆی.

لەمەڕ پێغەمبەران کە دەپاڕێنەوە بۆ ئەولاد و غەیری ئەولادیان واتە عالەم، ئەوە هەست پـێ دەکرێ: خودا فەرموویەتی لە بەرم وەپاڕێن، لە بەر پـاڕانەوە جـگە لەوەی عیبـادەتێکی گەورە و بەجێیە، ئیسباتی بەندەگی خوداشی تێدایە. کاتێ ئینسان داوا و تکای خـۆی بـردە لای خـودا، ئەوە سابت دەکا خودایە ئەمن عەبدم ئەتۆش مەعبوودی. ئەمن نیـازم بە تـۆیە و بە تـۆش نەبـێ نایەتە جێ. ئەتۆش بێنیازی لە هەرچی عەبدە. ئەو تەرزە ڕەفتـارە ئیسـباتی وەحـدانیەت و بـێ شەریکی خودای تێدا چـاو دەکـرێ و سـابیت دەکـا. خـۆ دیاریشـە خـودا لە هەرچـی تـاوانە دەبوورێ، ئیللا شیرک نەبێ. جا لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ بڵێـین و قبووڵیشـی کەیـن هەرچـی ئەحکامی خودایە لە نوێژڕا بگرە تا دێتە سەلام، هەمووی هەر عیبادەت و دوعا و نزا و پاڕانەوەیە لە بەر خودا و بۆ خودا. بۆ ئیمتیحان و دڵئارامی بچۆ بۆ خزمەت ئایەتی ۷۷ی فورقـان: ﴿قُلْ مَا يَعْبَأُ بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَاؤُكُمْ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا﴾ بڵێ (ئەی پێغەمبەر)! ئەگەر دوعـا و **نزاتان نەبێ، خودای من مبالاتێکتان پێ نادا و ناکا. واتە ئەرزشێکتان بـۆ قایـل نـابێ. بەڵام ئێـوە ئەی بـێ باوەڕ ڕیسالەتی ئاسمانی بە درۆ دەزانن بەرهەمی ئەو باوەڕەتـان وەبـاڵی خۆتـان دەبێـو تـۆڵە و سـزای بـێ باوەڕان وە ئەستۆی خۆیانە.**

دێینەوە سەر ئەو باسە: حەزرەتی ئیبراهیم باپیری عەرەب و جوولەکەیە و باپیری مووسـا و عیسا و محەمەدەلمستەفایە، هەروەک زانراوە کوتراوە ئیبراهیم پـاش ئەوەی دەگەڵ ئیسـماعیلی

کوڕی کەعبەیان دروست کرد، لە بەر خودا پاڕایەوە بۆ وەچە و نەوەکانی، کە خودا ڕەحمی دنیا و ئاخرەتیان پێ بکات و بەرەکەتیشیان دە عومر و ماڵیان باوێ و زانیاری و تێگەیشتن لە کتێبەکانی ئاسمانی و فەلسەفەی دین و ئایینی خودا ڕوح و حەقیان وەڕازێنێ، پاشان ئیبراهیم بە هۆی ئیحتیات و ترسی خلیسکانی دنیای ڕازاوە بە زینەتی حوبی شەهەوات بۆ سەعادەتی ئەوسەری ئەولادەکانی وەسیەتی لێ کردن بەو جۆرە: مەمرن بەبێ موسوڵمانەتی. واتە بێ ئیمان و بێ ئایینی ئیبراهیم.

ئایا دەبێ ئەوە باوەڕ کرێ: پاشی ئەو هەموو نزا پاکانەی ئیبراهیم و وەسیەتی پڕ بەختەوەری بۆ کەس‌وکار و پاکان و خاوەن باوەڕانی دەورانی ئەو عالەمە پاشەوپاش وەگەڕێن بۆ سەر ئایینی جوولەکە و گاورەکان کە عوزەیر و عیسا بە کوڕی خودا بزانن؟ ئەو وەسیەتە لە بیر بەرنەوە؟ وەیا هەر سێ لایان، واتە جوولەکە و گاور و عەرەب موسوڵمان ببن و بە بەردەوامی ئەو ئایینە پیرۆزەی بگرنە بەر؟ بۆ ئەو بابەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٣٥ی بەقەرە:

**﴿١٣٥﴾ وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَارَى تَهْتَدُواْ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ**

**جوولەکە و گاورەکان کوتیان بە موسوڵمانەکان: ببن بە جوولەکە یا گاور. (یانی جوولەکەکان کوتیان ببن بە جوولەکە و هەروا گاورەکانیش کوتیان ببن بە گاور). تا ڕزگار دەبن، خودا فەرمووی: (ئەی محەمەد) پێیان بڵێ بە قسەو ناکەین. بەڵکوو ئێمە و ئێوە پەیڕەوی ئایینی پاکی باپیرە گەورەکەمان واتە ئیبراهیم دەکەین کە قورئان زیندووی دەکاتەوە و لە هەرچی ئایینی خراپە بەدوورە ئایینی ئیبراهیم لەو ئایینانە نییە کە هاوبەشی بۆ خودا پەیدا بکات.**

وەهەروا چاوەڕوانی ئایەتی ١٣٦ دەبێ بکەین بەو دەلیلە دەگەڵ ئایەتی ١٣٥ ڕەبتیان هەیە بە یەکەوە، چونکە جوولەکە عالەم بۆ ئاینی یەهوود بانگ دەکا و گاور عالەم بۆ ئایینی مەسیح بانگ دەکا. ئەوجار خودای تەعالاش موسوڵمانان بانگ دەکا بۆ تێگەیشتن لە سەر یەکەتی ئایین لە ئیبراهیمەوە تا مووسا و عیسا و محەمەدﷺ.

**﴿١٣٦﴾ قُولُواْ آمَنَّا بِاللّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ وَالأسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ**

**(خودای تەعالا بانگی موسوڵمانان دەکا بۆ ئاشکراکردنی یەکەتی ئایینی ئاسمانی لە ئیبراهیمەوە تا مووسا و عیسا و محەمەدەلمستەفاﷺ دەفەرموێ): ئەی موسوڵمانینە بڵێن: ئێمە بڕوامان هێنا**

**بە خودا و بەو قورئانەی کە بۆ خۆمان نێردراوەتە خوارەوە و هەروا بەو نامەیەی کە نێردراوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و کوڕانی یەعقووب و هەروا بەو نامانەی کە یەکەم جار دراون بە مووسا و عیسا نەک بەو تەوڕات و ئینجیلە تێکدراوەی کە ئێستا بە دەستیانەوەیە.وهەروا بەو نامانەی کە دراوە بە پێغەمبەران دی لە لایەن پەروەردگاریانەوە. ئێمە فەرق و جیاوازی ناخەین و ناکەین لە ناوەندی هیچ کامێکیانا. واتە بڕوا دێنین بە هەموو پێغەمبەران، بە خۆیان و نامەیانەوە وەک یەک، ئینجا ئەو پێغەمبەرانەی ناویان برابێ لە قورئانا، و یا ناویان نەبرابێ. و ئێمە فەرمانبەری خوداین، و پێغەمبەران بە ڕەوانەکراوی خودا دەزانین، نە بە کوڕانی خودا.**

## پاش ئادەم پێغەمبەران کێن؟

**تێڕوانینێک:** قورئان کوڕانی حەزرەتی یەعقووب بە (اسباط) ناو دەبا. دیارە (اسباط) لە (سبط)ە واتە قەبیلە و هۆز. هۆی ئەوەی کە ناوی کوڕانی یەعقووب بە ئەسبات براوە دە قورئاندا هەر دەبێ ئەوە بێ: کوڕانی یەعقووب کە لە پشتی ئەو خارج بوون ١٢ دانە بوون، پاشان هەر یەک لەو دوازدە کوڕانە یەک قەبیلەی بە جودای لێ پێک هاتووە. خودای مەزن بە هۆی بەرەکەت تێهاویشتنیان، کاتێ کوڕانی یەعقووب لە میسر هاتنە خزمەت حەزرەتی یوسف، ١٢ برابوون و هەروا کاتێ پاش تێکهەڵچوون دەگەڵ فیرعەون بە ڕێبەری مووسا و کوڕەکانیان واتە بەنیئیسرائیل کە ڕێژەیان بەراوەرد و ژمارە کران، ژمارەی ئەولادی هەریەک لەو ١٢ برایانە واتە ١٢ کوڕەکانی یەعقووب گەیشتبووە هەزار نەفەر.

دووهەمین بەرەکەتێکی کە خودا خستبوویە ناو ئەولادەکانی حەزرەتی یەعقووب ئەوە بوو: ١٠ پێغەمبەر نەبێ، باقی ئەنبیای پاش ئەوانی سەراپا لەو ١٢ کوڕانەڕا بوون.

جگە لەوەش واتە عەلاوە لە ئەنبیای بەنیئیسرائیل، باقی ئەنبیاکانی پاش حەزرەتی ئادەم بریتین لە: ١. نووح ٢. شوعەیب ٣. هوود ۴. ساڵح ۵. لووط ۶. ئیبراهیم ٧. ئیسحاق ٨. یەعقووب ٩. ئیسماعیل ١٠. محەمەدﷺ. ئەوانە ئەو پێغەمبەرەن کە لە بەرەی ١٢ کوڕی یەعقووب پێغەمبەر نین. (معارف القرآن، ج١، ل ۴۶٠)

## تێڕوانینێکی تەواو لە جوملەی ﴿بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا﴾

لە بەراورد و هەڵسەنگاندنی ئەو جوملە پیرۆزە ئەوە هەست پێ دەکرێ کە وەشوێن کەوتن و تەبەعیەت لێ کردنی ئایینی ئیبراهیم دەبێ ببێ. کە لە چەن شوێنی قورئانیش ئیشارە وەلای

تەبەعیەت لە ئایینی ئیبراهیم کراوە و دەستووریش بە پێغەمبەر دراوە. دیارە ئەو وەشوێن کەوتـن و تەبەعیەت لێ کـردنەی حەزرەتـی مـحەمەدﷺ لە دوو ڕێ بەدەر نیـیە. واتە تـابع بـوون یـا لە ئوسوول و فرووعە یا تەنیا لە ئوسوولدایە. بە هەر حاڵ لە هەر دوو لاوە بێ یا لە یەک لاوە بێ، تووشی پەرچ و ئیشکال دەبین. ئیشکالەکەش ئەوەیە: ئەگەر حەزرەتی محەمەدﷺ تابعی ئـایینی حەزرەتی ئیبراهیم بووبێ لە ئەسڵ و فەرعدا، ئەوە ئەوەی لێ پێکدێ کە حەزرەتی محەمەد دین و شەریعەتێکی سەربەخۆی بۆ خۆی نەهێنابێ و نەیبێ. بەڵکە دین و شـەریعەتەکە هەر دیـن و شـەریعەتی ئیبراهـیمە کە ڕوون و ئاشـکرا و حاشـاهەڵنەگرە. حەزرەتـی مـحەمەدﷺ دیـن و شەریعەت و ڕووگەی سەربەخۆی هەیە و کتێبی سەربەخۆی وەک قورئان بـێ لە بەر دەسـتاندا هەیە.

ئەگەر بشڵێین حەزرەتی محەمەدﷺ تەنیـا هەر لە ئەسـڵدا واتە نیهـادی تەوحیـدی، تـابعی ئیبراهیم بووە، دووبارە ئەو ئیشکالە هەر دێتە پێش کە حەزرەتـی مـحەمەد دەبـێ لەمەڕ ناسـینی خودا و بێشەریکی خودا هەر دەستوور و کتێب و ڕەوشـی ئیبراهیمـی هەبـێ، بـۆ خـۆی لەو بارەوە شەریعەت و کتێبی سەربەخۆی وەک قورئان بێ نەبێ؟ کە ئەوەش وا نیـیە چـونکە لەمەڕ ناسینی خودا محەمەد کتێبی سەربەخۆ و شەریعەتی سەربەخۆی هەیە.

جگە لەوانەش تابع‌بوون و وەشـوێن کەوتـن بـۆ هەر شـەریعەت و ئایینێـک هەر تـایبەتی ڕەسوولان نییە و نەکراوە، بەڵکە بـۆ ئۆمەتانیشـە. لێـرەدا بـۆ دەبـێ ئەو تەبەعـیەتە هەر بە نـاوی محەمەد مستەفا بێ؟ چونکە تەواوی ئەنبیاکانی بەنیئیسـرائیل ئەوانیش ئەو تەبەعیەتەیان بووە، جا لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ مانای ئەو ئایەتە ﴿بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًـا﴾ ئـاوا لـێ نەدرێـتەوە کە بکوترێ حەزرەتی محەمەد تابعی دین و شەریعەتی ئیبراهـیم بـووە لە ئوسـوول و فرووعـدا بە تەوری کامڵ؛ بەڵکە دەبێ ئاوا بەراورد بکـرێ و تەعبیـر بکـرێتەوە مانـای ئـایەتەکە: حەزرەتـی محەمەد تەنیا و تەنیا دە ئوسـوولدا ـ واتە ئەساسـی یەکیەتـی باریتەعـالا و هەروا مەسـائیلی بنچینەیی لە سەر تەوحید و عەقیدە ـ تـابعی ئـایینی ئیبراهـیمە و جـگە لەوەش زانایـانی بـاری عەقیدەتی و ئوسوول دە مانای واقیعی ئوسوولدا ئاوا دەنگیـا دەربڕیـوە. ئوسـوول واتە بنیـاد و بنچینەی باوەڕ و عەقیـدە. و هەروا یاسـا و دەسـتووراتی تەواوی بنچـنەی شـەرع و ئیجتیهـاد. (تەفسیری تبيين الفرقان، ج۳، ل ۳۲۲)

پاش ئەو هاوار و بانگاوازەی باریتەعالا لەمەڕ یەکەتی ئایین، ئایا دەبـێ چـاوەڕوانی ئەوە

بین کە ئەو خاوەن کتێبـانە واتە یەهـوود و نەسـارا (جـوولەکە و گـاور) هەموویـان دێـن دەبـنە موسوڵمان و پەیڕەوی قورئان. وەیا هەر لە سەر ئـایینی کـۆنی خۆیـان دەمێـنەوە؟ واتە ئـایینی یەهوود و مەسیح! و هەر لە سەر دوژمنایەتی ئایینی ئیسلام درێژە پێ دەدەن؟!

دیارە لە فڕ و فێڵی بێباوەڕانی وەک جـوولەکە و گـاور، هەر دەبـێ پەنـا بە خـودا بگـرین بمانپارێزێ، وەک خودا دەفەرموێ دە ئایەتی ١٣٧ی بەقەرەدا:

﴿١٣٧﴾ **فَإِنْ آمَنُواْ بِمِثْلِ مَا آمَنتُم بِهِ فَقَدِ اهْتَدَواْ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ**

**ئەگەر ئەوانە باوەڕیـان هێنـا وەکـوو ئێـوە (واتە باوەڕیـان هێنـا بە سـەرجەم پێغەمـبەران و کتێبەکانیان،) ئەوە ڕێگای ڕاست و دروست دەگرن و وێڵ نابن. بەڵام ئەگەر ڕوویان وەرگێڕا و خۆیان لادا، ئەوە بەبێ گومان جیاوازی و ناکۆکییان دەکەوێـتە نێوانیـان و هەر یەکەی لایەک دەگرێتە بەر و ناخۆشی دەکەوێتە نێوانیان. ئینجا خودا لێرەدا بە پێغەمبەر دەفەرموێت: خودا تۆ لە خراپەی ئەوانە دەپارێزێت و سەرکەوتنت پێ دەبەخشێت. خودا هیچ قەولێکی لـێ ون نابێـت و زۆر بیسەرە و زانایە.**

## ئاوڕدانەوەیەک

ئەگەر بە چاوێکی پڕ لە ئینساف و دڵێکی پڕ لە ئیمان و عەداڵەت سـەیری دەسـتوورات و ڕێوشوێن و ئاداب و ئەخلاقی ئایینی ئیسلام بکەین، دەس لە مل دەدەین و شـاهیدی دەدەیـن کە دەبێ ئاخرین ئایینی ئاسمان هەر دەبێ ئاوا بـێ، جیـاوازی هەڵگـرێ و لابەرێ لە ناوەنـدی پێغەمـبەران و کتێبەکانیانـا و ڕوو وەرگێـڕێ لە جیـاوازی زمـان و ڕەنـگ و سـنوور و وڵات و نەیانخوێنێتەوە و بە یەک چاو سەیری هەموو لایەک بکا. بەڵکە ئایینێکی عالەمی و پێکەوە ژیان دابمەزرێنێ.

بە وردی سەرنج بگرە و حەق حاشار مەدە و قووتی مەدە، ١٤٠٠ ساڵ دەبێ ئایینی ئیسـلام ئەو خزمەتە درەوشاوە و لێوەشاوە و ڕێزدارەی بە عالەمی ئینسـان کـردووە، هەر لە مەراکـیشڕا هەتا دەگاتە جزیرەکانی فیلیپین، و هەروا لە دەرگای سیلانەوە تـا بوخـارا و تاشـقەند. بە هـۆی حەکیمایەتی و لێهاتوویی و عەداڵەتی خۆی بە یەکدەنگی و هاوئـاهەنگی ڕایگرتـوون و یەکـی خستوون و هەرچی جیاوازی بێ و بۆنی جیاوازی لێ هاتبێ لە ناوی بردوون و هەڵی گرتـوون و بە یەک دەنگ و بە یەک ڕەنگ عالەمی ئیسلامی نواندووە.

بە کــوردی بە کــورتی: ئەگەر یەهــوود و نەســارا وەک ئێــوەی موســوڵمان بە هەمــوو پێغەمبەرەکان ئیمانیان هێنابا، تەعەسوب و لانی ڕەگەزپەرستییان وەلانابـا، ئەوانـیش دەکەوتـنە سەر شەقامی هیدایەت. دەنا ئەگەر ئاوا وەکی هەن لە حەق وەرگەڕێن و لە ڕاستی بتۆرێن، ئەوە ئەوان کەوتوونە ناو زەلی چارەڕەشی و ئەتۆش بێ نیازی لەوان.

## ﴿فَسَيَكۡفِيكَهُمُ ٱللَّهُۚ﴾

جوملەی ﴿فَسَيَكۡفِيكَهُمُ ٱللَّهُۚ﴾ ئیمتینـانی تەواو دەدا بە ڕوحـی پێغەمـبەر کە دووبەرەکـی و کێشەی ئەهلی کتێب هیچ زەرەرێک ناتوانێ بدا بە تۆ، و لەو لایشەوە دە پێغەمبەر دەگەیێنـێ کە مەنزووری یەهوود و نەسارا دە ئەساسدا پێکهێنـانی دووبەرەکیـیە لە ئـایینی ئاسـمانی. بەڵام بە باوەڕەوە ئیمتینانت بێ ئەتۆ، ئەوان بەو هەوایە کە گرتوویانەتە بەر خۆیان ناتوانن هیچ زەرەرێک بە تۆ و وەزیفەی تۆ بگەیێنن و لە کاتی خۆیشیدا بێگومان تۆڵەیان لێ دەستێندرێتەوە.

لە بەرجەوەندی و هەڵسەنگاندنی ئەو ئایەتە پیرۆزە (١٣٧) ئەوە هەست پێ دەکرێ: یەهوود و نەسارا، لە بەربەرەکانی و مەخالەفەتی خۆیان دەگەڵ پێغەمبەران بە ئەندازەیەک چوونە پێش تا سەری کێشابووە کوشتنی هێندێک لە پێغەمبەران بە دەستی وان. و هەروا هێندێکیشـیان هێنـدە پـێ هەڵبـردن، تـاکوو گەیانـدییان بە مەقـامی خـودا و یـا کـوڕانی خـودا. ئەو دوو شـێوازە پێهەڵچوونەی یەهوود و نەسارا ئەوپەڕی هەڵەیی و گومڕاییەک بوو لەوانـڕا بەشـێکی دنیـای دایە بەر خۆ.

ڕاستە ئیسلام واتە عالەمی ئیسلامی: دەبێ باوەڕی وابێ خۆشەویستی پێغەمبەری بەشـێکە لە ئیمان، بەڵام نە بەو ئەندازەی بگەیێندرێتە مەقامی خودا. لە زانسـت و توانایـیدا چـونکە ئەوە شـرکە ئینسان بکرێتە هاوبەشی خودا دە سیفەتدا، وەک توانایی زانسـتی نهێنـی و ... بـڕوانە لە ئایەتی ٩٨ی سوورەی شوعەرا و دەرس وەرگرە: إِذۡ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ بیر خۆت بێـنەوە (ئەی محەمەد) ئەو زەمانەی کە عەبدان، مەعبوودانی درۆیـان دەکـردنە هاوبەشـی خـودای تەنیـا دە عیبـادەت و ئیتاعە کردندا. خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم هەنگاو بە هەنگاو بە هۆی کتێبەکـانی وەحـی ئاســمانی و پێغەمــبەران ئینســانی خەبەردار کــردووە لە ئـایین و ڕێـی ڕاســت ئەگەر ئینســان کوێرکوێرینەی نەکا دەتوانێ بە سەر پردی قیامەتدا وەپەڕێ و ئەگەر چاوەکـانی دڵیشـی لێکنـێ ئەوە بێگومانە تێدەکەوێ.

کات هانمان دەدا بۆ بەرەوپیرەوە چوونی ئایەتی ١٣٨ی بەقەرە:

**﴿١٣٨﴾ صِبْغَةَ اللَّه وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّه صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُ عَابِدونَ**
**ڕەنگ دارشتنی خودا جوانترین ڕەنگە، واتە ئەوەی خودا ئیسلام و ئایینی ئیسلامی پێ ڕازاندۆتەوە جوانترین و پاکترین ڕەنگە لێی جیا مەبنەوە کە بە پێغەمبەرەکانیدا ناردوویەتی، جا ئایا ڕەنگرێژانی کێ لە ئی خودا چاکتر و جوانترە؟ ئینجا ئێوە ئەی موسوڵمانینە بڵێن: ئێمە هەر بەندایەتی خودا دەکەین و هەر ئەویش دەپەرستین.**

**تێڕوانینێک:** لە بەرجەوەندی ئەو ئایەتە ئەوە هەست پێ دەکرێ: کە ئایینی ئیسلام کردەوە و ڕێوشوێنێکی تایبەتی دانەناوە بۆ هەڵاواردن و جیاکردنەوەی موسوڵمانان لە یەکتر وەک گاورەکان، ئاوێکی زەردیان داناوە کە دەبێ هەموو ماڵێکی تێ هەڵکێشرێ کە پێی دەڵێن (معمودیە) بەو تێهەڵکێشانە بە خەیاڵی خۆی ئەو ماڵە خاوێن دەبێتەوە. ئەو کردەوە ناپەسند و ناحەزە لە لای گاوران بە ڕەوا داندراوە.

## ئاوڕدانەوەیەک وە سەر مانای (صبغة الله)

صبغة الله واتە ڕەنگی خودا کە موسوڵمانان دەبێ بەو ەڕنگە خۆ بڕەنگێنن و وەڕازێنن. ئایا دەبێ مەبەست و مەنزوور لەو ڕەنگەدا چ بێ؟ دیارە قورئانزانەکان لەسەر مانای ئەو «صبغة الله»یە بۆچوونیان زۆرە، هێندێکیان ئاوڕ وەسەر دەدەین، کە ئەقڵ و زانست بە باشی دەزانن:

١. خۆ ئەوە ڕاستە کە ئایینی ئیسلام خاوەن ڕەنگێکی بەتایبەتی نییە وەک زەرد و سوور و سەوز و بۆر و... چونکە ئایینی ئیسلام و هەچی ئایینە بریتین لە پۆلە قانوون و بەرنامەیەک کە دەبێ ئەوانەی خۆیان بە ئەهلی ئەو ئایینە دەزانن، باوەڕیان پێ بێ و شوێنی کەون و چەرخوخولی ژیانیان لەوڕا دەس کەن بە هەڵسووڕان. ئەو یاسا و بەرنامەش لە ئیسلامدا واتە قورئان و حەدیس و لە ئایینی مووساشدا واتە تەوڕات و لە ئایینی عیساشدا واتە ئینجیل.

٢. مەنزوو لە صبغةالله هێندێک کوتوویانە ئایینی ئیسلامە، یانی ئێمەی موسوڵمان بە ئایینی خۆ دەڕازێنینەوە.

٣. هێندێکیش کوتوویانە مراد لە صبغةالله سرشتێکە کە خودای مەزن ئینسانی لە سەر ئەو دروست کردووە کە فەرموویەتی ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا﴾ (روم: ٣٠) واتە: سرشتێکی وا کە ئینسانی لە سەر ئەو دروست کردووە. ئەو سرشتەش ئیقرار و قبوول کردنی دڵ و دەروونە کە خودا یەکە و بێ هاواڵە.

٤. وهەروا هێندێکیش کوتوویانە مەبەست لە صبغةالله دەو ئاینە ئیسلامەدا **خەتەنە** کردنە

هەروەک لە زەمانی ئیبراهیمدا بە عینوانی یەکێک لە سوننەتەکانی سـرشت خەتەنە کردنە.

٥. هێندێکیش دەڵێن صبغةالله ئاماژە وەلای ڕەنگ و کەیفیەتێکە کە دەنیشـێتە سـەر ڕوح و مەعنەوییەت.

بە کوردی و بە کورتی یەهوود و نەسارا ئیدیعای ڕەنگی تایبەتی ئایینی خۆیان دەکـرد، هەر یەکەی دابێکی تایبەتیان بۆ خۆ دانابوو بە ناوی دین کە فـڕی بە سـەر ئـایینی وەحـیەوە نەبـوو. خوداش بۆ باتڵ کردنی ئەو دابە ناڕەوایەیان ئاگاداری دا بە موسوڵمانان کە بڵێن ئـێمە بە داب و دەستوور و ڕەنگی باریتەعالا خۆمان دەڕازێنینەوە، نیازێکمان بە ڕەنگ و دابی ئێوەی یەهـوود و گاور نییە. بۆ زێدەزانین تەفسیری کەبیر و تەفسیری تبیین الفرقان هەمان ئایە ١٣٨ سەیر کە.

## گاور و جوولەکە چییان دەکوت؟

جوولەکە و گاورەکان دەیانکوت پێغەمبەران سەراپایان لە ئێمە بوون و لە ئێمەن. لە هۆزی عەرەب هـیچ پێغەمبەرێـک هەڵنەکەوتـووە و هەڵنـاکەوێ. ئەو هەواڵە بـوو دە سـەریاندا کە دەیانکوت ﴿وَقَالُواْ لَن يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلاَّ مَن كَانَ هُوداً أَوْ نَصَـارَى...﴾ (بقرة: ١١١) **واتە کوتیـان: بەتەنیـا جوولەکە و گاور دەچنە بەهەشت.** دووبارە دەیانکوت: ﴿كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَـارَى تَهْتَـدُواْ﴾ (بقرة: ١٣٥) **(ئەی موسوڵمانینە!) ببن بە جوولەکە یان گاور تا هیدایەتو دەس کەوێ.** پاش ئەو هەموو بێشـەرمی و بێئەدەبیەی نیشانیان دا، خودای خاوەن حیکمەت پاش مۆڵەتدانیان بۆ چـابوون، ئەوجـار بە پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِي اللّهِ﴾ **واتە پێیـان بڵـێ ئەی مـحەمەد!: ئایـا دمەوڕێـمان لەگەڵ دەکەن لە کاری خودادا!**

سەرەنجام هاتین گەیشتینە ئەو باوەڕە بەهێزە کە دڵی ڕەشی هەڵـگەڕاو نـووری زانسـتی لە دەس دەدا، حەق و ڕاستی هەست پـێ ناکـا، وەک کـوێر ڕەنگـی زەرد و سـوور لـێکەوە ناکـا، چونکە ماڵی دڵ جێگای باوەڕە، ئەویش دە سـرشتدا بە نووری سـرشت ڕووناکە بۆ دیتنی حەق و قبووڵ کردنی حەق، جا ئەگەر هات و ئەو سـرشتە لە ناو برا دەکەوێـتە سـەر بـاری جەهلـی هیچی ناچێتە پاڵ بەغەیرەز هەوا و هەوەس و سەرەڕۆیی و لاساری. جـا دەبـێ بڵێـین: پەنـا بە خودا!

ئەوجار دەچینە خزمەت ئایەتی ١٣٩ی بەقەرە بۆ دەرخستنی ئەو ڕاستییانە:

﴿١٣٩﴾ قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِي اللّهِ وَهُـوَ رَبُّنَـا وَرَبُّكـمْ وَلَنَـا أَعْمَالُنَـا وَلَكـمْ أَعْمَـالُكمْ وَنَحْـنُ لَهُ

**مُخْلِصُونَ**

**ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ بەو جوولەکانە و گاورانە: ئایا ئێوە دەمەوریمان دەگەڵ دەکەن لە کاروباری خودادا کەوا پێغەمبەرێکی وەک محەمەدەلمستەفاﷺ هەڵبژاردووە لە ناو نەتەوەی عەرەبدا، لە نەوەی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم، وە ئێوە ئەو نزیکیەتان لە خوداوە یا لە کوێ وەدەس کەوتووە! لە کاتێکا کە خودا پەروەردگاری ئێمەش و ئێوەشە. وەنەبێ هەر خودای لایەک بێ، بەڵکە ئی هەموو لایەکە، وە میهرەبانی هەر بۆ ئەولایە بێ، بەڵکە چاکی و خراپی هەر بە کردار و کردەوەیە، چونکە هەر کەس بەری چناوی کردەوەی خۆی دەچنێ و دەخوا، کردەوەی خۆمان بۆ خۆمانە و کردەوەی خۆتان بۆ خۆتانە، و ئێمە پاکین دەگەڵ خودامان لە کردەوە و بیر و بڕوامانا.**

وا دیارە ئێوە ئەی جوولەکە و گاور، هیواتان هەر بە باب و باپیر و پێشینەکانتانە، وا دەزانن لە لای خودا سبەینێ تکاتان بۆ دەکەن و بە تکای وان ڕزگارو دەبێ، دەگەڵ ئەوەی ئێوە لە ڕێی ئەو پێشینانەتان لاوداوە!

بە کوردی و بە کورتی: گیانی ئایین خودا بە یەک زانین و ئیتاعەیە، بیر و باوەڕی پاک و کردەوەی چاک و پاکە، هەر کاتێ دین و ئایین بێ گیان و حەیات بوو، واتە هەموو شتێکی بوو بە زاهیرپەرستی و ڕیاکاری و چاو و ڕاو و درۆ و وەک زۆربەی خەڵکی ئەوڕۆ کە موسوڵمانەتییان هەر دە قاڵبی ناو بەتاڵی نوێژ و ڕۆژوو و هێندێک داب و باوی پێشیناندا دەبینن ئەوە لە لای ئەقڵ و شعوور و هەستی عادڵانە نە لە دنیا نە لە قیامەت بە ئیمان و دینی خودا نایێتە ژمار و ناژمێردرێ.

تا ئێرە گاور و جوولەکەکان هەرایان لە سەر ئەوەی بوو دەیانکوت پێغەمبەر هەر لە مەیە و لە هیچ بەرە و هۆز و قەبیلەیەکی دی نییە، بەو درۆی گەورەوە نووسابوون و خوداش لێی ئاشکرا کردن کە درۆیە نەکەن.

ئەوجار کە زانییان خەڵک بەقا بە گوفتەی خودا دەکەن، نەک بە قسەی وان، هاتن لەو لایەوە سەریان هەڵدا بۆ کێشە و دەمەقاڵی. دەڵێن ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و کوڕانی یەعقووب جوولەکە بوون یا گاور. دووبارە خودا لەوەشدا وەدرۆیان دەخاتەوە، بە وەسیلەی ئایەتی ١٤٠ی بەقەرە کە نەختێک لەوە بە دوا دێ.

## کێشەی جوولەکە و گاور دەگەڵ موسوڵمان

**تیوتیوەیەک:** کێشەی ئەوانە واتە: جوولەکە و گاور دەگەڵ موسوڵمانەکان سێ شتە:

١. ئەوانە دەڵێن ئێمە لە خودا نیزیکترین بەو دەلیلە کە هەچی پێغەمبەرن لە مەن. موسوڵمانیش لە سەر ئەساسی فەرموودەی باری دەڵێن: ئەو بۆچوونەتان درۆیە. چونکە نیزیکی لە خودا بە تەقوایە. و هەروا پێغەمبەران هەر لەوە نین.

٢. ئەوان پەرستنی مەعبوودان بە شێوەی هەتکی مەعبوودی غەیری خۆیانە. بەو دەلیلە دەڵێن خودا هەر خودای ئێمەیە، خودای ئێوە نییە؛ دە سوورەتێکدا خودا خودای هەموو لایەکە.

٣. ئەوان نیزیکایەتی خۆیان لە خودا بەوە دەزانن کە پێغەمبەرەکان لە بەرەی خۆیانن، بەڵام دە واقیعدا نیزیکایەتی لە خودا بە دڵپاکی و عەمەلچاکی خزمەت بە گەلە.

دووبارە گاور و جوولەکەکان دمدرێژی دەکەن بۆ لای ئەوە دەڵێن: ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و کوڕەکانی، جوولەکە بوون یا گاور بوون. لەو ڕێیەوە گاورایەتی و جوولەکایەتی پلە و پایە و مەقامی بەرز بۆتەوە. ئەو قسەشیان هەر درۆیە وەک قسەکانی دیکەیان. چونکە ناوی جوولەکایەتی و گاورایەتی لە پاش مووسا و عیسا هاتوونە ڕوو پەیدا بوون، خۆ لە دەورانی ئیبراهیمدا ئەوانە نەبوون. وەک خودای تەعالا لە ئایەتی ١٦٥ی ئالیعیمراندا ئاماژەی وەلا فەرموە. پاش بەیانی ئایەتی ١٤٠ی بەقەرە کە مەربووتە بەو بابەتە، باسی ئایەتی ٦٥ی ئالیعیمران دەکەین.

**﴿١٤٠﴾ أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَـقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطَ كَانُواْ هُودًا أَوْ نَصَارَى قُلْ أَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللّهُ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَادَةً عِندَهُ مِنَ اللّهِ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ**

یا خۆ دەڵێن: ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و کوڕانی یەعقووب جوولەکە بوون. ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: ئایا ئێوە زاناترن بەوە یا خودا؟! ئەی جوولەکەینە! (خودا لە کتێبەکانوودا دوو شاهیدی داوە پێش ئەوەی کە جوولەکایەتی و گاورایەتی پەیدا بێ: ١. ئایینی ئیبراهیم ئایینێکی پاک و بێگەردە، خودا هەڵیبژاردووە بۆ عالەم. ٢. دواترین ئایینی پێغەمبەران ئایینی ئیبراهیمە، بەڵام ئێوە ئەو دوو شاهیدیە دەشارنەوە و حاشای لێ دەکەن). کێ لەو کەسە زاڵمترە کە شاهیدیەکی لە لابێ کە لە خوداوە بێ ئەو شاهیدیە لە کتێبی ئاسمانیدا بۆی باس کرابێ کەچی حاشاری دا، خودا بێ ئاگا نییە لەوەی دەیکەن و دەبێ بزانن و بزاندرێ کە پاداشی بە پێی کردەوەیە!

نەختێک لە پێشدا کوتمان ئایەتی ٦٥ی ئالی‌عیمران کە لەمەڕ نەبوونی جوولەکە و گـاور لە زەمانی ئیبراهیمدا نەبوون بەڵکە پاش مووسا و عیسا هاتوونەتە ڕوو، بـاس دەکەیـن ئەوە کـاتی باس کردنی هات، ئاوڕی وەسەر دە:

يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِي إِبْرَاهِيمَ وَمَا أُنزِلَتِ التَّوْرَاةُ وَالإنجِيلُ إِلاَّ مِن بَعْدِهِ أَفَـلاَ تَعْقِلُـونَ ﴿٦٥﴾ (آل عمـران) **ئەی خاوەن کتێبەکان! بۆچی ئێوە دەگەڵ پێغەمبەردا کێشە دەکەن؟ واتە هێندێکتان دەڵێن ئیبراهیم جوولەکە بووە هەندێکی دیشتان دەڵـێن دیـان بـووە. خـۆ لە کـنە خـۆ ئێـوە دەزانـن کە تەوڕات و ئینجیل دوای ماوەیەکی زۆر لە سەردەمی ئیبراهیم هـاتۆتە خـوارەوە. بـۆ مەگەر لە هـۆش و بیرتـان نیـیە؟ ئایینی ئیبراهیم ئایینی پیرۆزی ئیسلامە کە ئایینی هەموو پێغەمبەرانی دیکەشە.**

## ئاوڕدانەوەیەک وە سەر ئایەتەکانی ١٣٦، ١٣٨ و ١٣٩ی بەقەرە

دڵ دەڵێ دەبێ ڕازی ئەوەی چ بێ کە لە ئـاخری ئەو سـێ ئایەتـانەدا سـێ جـوملەی یەک بابەت بە سێ قاڵب و لەفزی لێک جیا هاتوون؟ ئایا دەبێ چ ڕازێکیان لە ژێردا بێ؟

دیارە دەبێ بۆ وڵامی ئاوا ئایەتی پیرۆزی قورئان، بچینە خزمەت قورئان‌زانان کە لە لای وان نەتیجە وەرگرین. ئەوانیش لەو بارەوە ڕا و بۆچوونی خۆیان ئاوا دەربڕیوە:

١. لە ئایەتی ١٣٦دا قسە لە ئیمان و باوەڕی بە خـودا و پێغەمـبەران و کتێـبە ئاسـمانییەکان کراوە، ئەو باسەش تەعبیرە لە تەسلیم و تەسدیق بە شێوەی نهێنـی و دەروونـی. کەوابـێ دەبـێ بکوترێ تەسلیم و ئیسلام یەک بابەت و یەک نەژاد و یەک خانەوادەن، هەر بۆیەشـە لە ئـاخری ئایەتەکەدا جوملەی ﴿وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ هاتووە.

٢. دە ئایەتی ١٣٨دا قسە لە صبغةالله کـراوە، واتە ئەوەش بـریتییە لە حـاڵەت و چـۆنیەتی بـــاری دەروونـــی و نهێنـــی. کە ئەوەش دەگەڵ دڵ و دەروون و ئەقـــڵ و هەســـتەی شـــعوور سەروکاری هەیە کە هەمووی دەبێتە عیبادەت و بەنـدەگی خـودا. کە ئەو عیبـادەتەش ڕەنـگ و زینەتی باری‌تەعالای ناوە. جا بۆیە لە ئاخری ئایەتەکەدا جوملەی عیبادەت هـاتووە: ﴿وَنَحْـنُ لَهُ عَابِدونَ﴾

٣. لە ئایەتی ١٣٩دا شک و گومانی عەقیدە و باوەڕی موشـریکانی ئەهلـی کتێـب هـاتۆتە ڕوو کە لە ناو باغەڵی جوملەی ﴿وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ﴾دا سەری هەڵداوە. جا خودای تەعالا بۆیە لە ئەسەری شک و گومان و تەردیدی موشـریکان دەستووری ئیخلاسـی لە ئایینـدا بە موسوڵمانان دەدا و دەفەرموێ ﴿وَنَحْـنُ لَهُ مُخْلِصُـونَ﴾ تـاکوو ئـایینی یەکتاپەرسـتی لە بـۆن و

ڕەنگی موشـریکایەتی تەبرەئە و بەدوور بێ.

پاش ئەوەی کە بە گوێ جوولەکە و گاوردا درا و تێی سـریواندرا کە هیچ کەس لە چاکەی یەکێکی تر لە ڕۆژی قیامەتا بەهرەمەند نابێ و هەرکەسیش بە داوی خراپەی یەکی دی لە قیامەتا پێوە نابێ، واتە هەر کەس باری کاری خۆی بۆ خۆی؛ جا بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٤١ی بەقەرە:

**(١٤١) تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلاَ تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ**

**ئەوانە(ی باس کران لە ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب) دەستەیەک بوون ڕۆیـین بە ڕێی خۆیانەوە هەرچییان کرد بۆ خۆیان برد و ئێوەش هەرچی بیکەن بۆ خۆی دەکەن لە چـاکە و لە خراپە. (واتە هەر کەسێ خۆی و کردەوەی خۆی) و ئێوە بەرپرسیار نـین لە کـردەوەی وان (واتە ئەگەر خراپ بن ئێوە لە کرداری چـاکی وان بەش و بەهـرە نـاگرن و ئەوانـیش هەر وەک وە؛ کەوایە هەر پشت بە خۆتان ببەستن نەک بە باو و باپیرتان ئیبراهیم و یەعقووب و ..)**

پێشتر لە تەفسیری ئایەتی ١٣٤دا مانای ئەو ئایەتە پیرۆزەمان کردووە ولێکـداوەتەوە. لێـرەدا ئایەتەکە دووپاتە کراوەتەوە. تا بە چاکی بزانرێت کە پیاوچاکانی سەردەمانی پێشوو لە دەسـتیان نایە قازانج یا زەرەر بە کەس بگەیێنن، چونکە جوولەکەکان دەیانکوت بـاپیرانی ئـێمە پێغەمـبەر بوون، بۆیە لای خودا فریامان دەکەون پشت بە شێخەکانیان دەبەستن.

بە داخەوە ئێستاش هێندێک لە موسوڵمانە ساوا و نەزانەکان پشت لە خودا دەکەن پشت بە شێخەکانیان دەبەستن بەو هیوایە کە بە هیممەتی وان بچنە بەهەشت، چونکە وا دەزانـن کلیلـی دنیا و ئاخرەت بە دەستی شێخەکانیانە، بۆیە پشتیان پێ دەبەستن. کە بێ‌گومان ئەو جۆرە ئاکارە بە تەواوی بە پێچەوانەی قورئانی پیرۆزە.

## ئاوڕێک وەسەر خەیاڵ و ئاکار

وامدانا کە ئیدیعای ئێوە دروستە و ڕەوایە، بەڵام ئەوانە ئۆمەتانێکن کە پەروەنـدەی ئاکـار و کردەوەیان پێچراوە و دانوشتاوە لە ڕۆژی خۆیدا خۆیان وڵامـدەرەوەی ئەعمالـی خۆیـانن، هەر ئێوە وڵامدەرەوەی ئەعمالتانن، کەوایە بـۆچی لە بـاتی ڕوو کـردن بە ئەعمالـی خـۆت، پـاڵ وە مێـژووی ڕابردووانـی خۆتـان دەدەنەوە و پێیـان دەنـازن. چـونکە ئینسـان دەبـێ بە خـۆی و بە ئەعمالی چاک و پاکی خۆی بنازێ نەک بە ئەعمالی کەسانی خۆی، ئەو ئایەتە ئەگەر دوو جار

وەرد دراوەتەوە بۆوەیە دەرسی لێ وەرگیرێ. نەک وەک ئەو جوولەکە و گاورە خاوەن کتێبانە بە هیوای ئەعمالی غەیر لاقان درێژ کەن. ئەوە هیوایەکی بێ بەهرەیە ڕەنجەڕۆیی پێ دەکوترێ.

## تێڕوانینێک لە سیما و ناو ژووری ئەو ئایەتە پیرۆزە (١٤١):

ئەو ئایەتە لە پێشدا هاتبوو، دووبـارە هـاتنەوەی لێـرەدا بێ‌گومـان بـێ سـوود نیـیە بەڵـکە ئامانجێکی لە بندا هەیە بە پێی هەڵسەنگاندنی ئایەتەکانیش دەبێ هەدەفـی دووبـارە کـردنەوەی هەر ئەوە بێ:

١. هەردوو ئایە مەبەستیان ئەوەیە: ئەوانە (جوولەکە و گاور) لە شانازی کردن و ئیفتیخار بە ئابا و ئەژدادیان وەکەون.

٢. دە ئایەتی پێشوودا (١٣٤) هەدەف تێگەیاندنی ئەهلی کتێب بـوو کە لەو فکـرە لادەن کە ئیبراهیم و ئەولادەکانی یەهوودی بووبن. بەڵام دێرەدا واتە ئایەتی ١٤١ ئاگـاداری موسـوڵمانانە بۆوەی دە فکری خۆیاندا بن. بیر و بۆچـوونی بـاتڵی ئەهلـی کتێـب واتە جـوولەکە و گـاور لە بارەی ئیبراهیم و حەولادەکانی ئاوەژووتان نکـاتەوە لە فکـری موسـوڵمانەتیتان. چـونکە ئەوان ئۆمەتێک بوون و ڕابردن، ئێوە لەمەڕ وان بەرپرس نین.

٣. دە هەر دوو ئایەتەکاندا هەدەف ئاگاداری و تێگەیاندنی یەهوودە، بەو جـۆرە: مـراد لەو ئایەتە (١٤١) بە ئۆمەت: ئەنبیان، و دە ئایەتی ١٣٤دا ڕابردووەکانی بەنی‌ئیســرائیلن لە سـەر ئەو ئەساسەیە خـودا بە بەنی‌ئیســرائیل دەفەرمـوێ: سـەلەفی ئێـوە یەک ئـۆمەت بـوون و ڕابـردن. سەرگوزەشتی وان ڕەبتی بە حاڵی وە نییە و نەداوە، بە قەباڵەی پاکی وان شانازی مەکەن چونکە کردوویانە بۆ خۆیانە، بۆ ئێوە نییە، ئێوە بۆ حاڵی خۆو بیر وەکەن و دەسبەرداری دژایەتی قورئان و پێغەمبەری ئاخر بن.

تا ئێرە باس لە دروست کردنـی کەعـبە و پـاک ڕاگرتنـی بـۆ نـوێژکەران و خواپەرسـتان و دەمەقاڵێی بوو دەگەڵ جوولەکە و گاورەکانی ئەهلی کتێب و موشـریکەکان لە بابەت ئیبراهـیم و کوڕانی ئیبراهیم و هەروا ڕووگە (قیبلە).

خودای تەعالا لە پێش کۆچ کردنی پێغەمبەر لە کەعبەوە بۆ مەدینە، ئەو پێنج فەرزە نوێژەی لە سەر واجب کردن. حەزرەتی ڕەسوول ئارەزووی کردنی کەعبە بە قیبلەی زۆر دە دڵـدا دێنـا و دەبرد، چونکە لە پێشدا ڕووگەی باپیرە گەورەی خۆی بوو وەک ئیبراهـیم بـێ. پـاش ١٦ مانـگ مانەوەی لە مەدینە خودا ئەو ئاوات و ئارەزووەی واتە بە ڕووگە کردنـی کەعـبە، بـۆ مـحەمەدﷺ

هێنایە جێ بە هۆی ئایەتی ١٤٤ی بەقەرە. ئەگەرچی ئەو ڕووگە گۆڕانە ناڕەزایەتی زۆری لێ کەوتەوە لە لایەن گاور و جوولەکەکان و بتپەرستەکان. بەڵام خودای تەعالا لە سەر ئەساسی حیکمەتی خۆی پێش ڕوودانی هەر ڕووداوێکی تاڵ و ناشیرین پێغەمبەری بە سەبر و خۆڕاگری ئاگادار کردۆتەوە بۆ وەی زۆر ناڕەحەتی و خەفەت نەچێژێ لە ڕاست ئەو ڕووداوانەی کە ڕووبەڕووی دەبنەوە. ئێستاش بۆ دەرخستنی ڕاستی ئەو بابەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٤٢ی بەقەرە.

﴿١٤٢﴾ سَيَقُولُ السُّفَهَاء مِنَ النَّاسِ مَا وَلاَّهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ الَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَا قُل لِّلّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ يَهْدِي مَن يَشَاء إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ

(پاش ئەوەی پێغەمبەری خودا کۆچی کرد بۆ مەدینە تا شازدە یا حەڤدە مانگ دەگەڵ موسوڵمانەکان ڕوویان کردە (مسجد الاقصی) لە قودس. دیارە ئەو ڕوو تێکردنە بە فەرمانێکی خودا بووە بەڵام پێغەمبەر لە دڵەوە حەزی دەکرد ڕووبکاتە کەعبە، ئینجا خوداش پێش ئەوەی ئەو ئارەزوویەی بۆ بهێنێتە دی، ئاگاداری دەکاتەوە کە ئەو کەسانەی گێل و نەفامن، لە جوولەکەکان و بتپەرستەکان و دووڕووەکان بە گۆڕانی قیبلە دەکەونە تانە و تەشەر لێدان و ڕەخنەگرتن و دەڵێن:

**بۆچی ئەوانە قیبلەی خۆیان گۆڕی؟ خودا لەو ئایەتەدا پێش وەخت بە پێغەمبەر دەفەرموێت: تۆش بەوانەی دەتخەنە بەر ڕەهێڵەی تیر و تانە بڵێ: هەموو لایەک ڕۆژهەڵات بێ یا ڕۆژاوا، هەر ئی خودایە، خودا چۆنی حەز کا و بیهەوێ، دەستوور دەدا ڕوو بکرێتە وێ، جا هەر کەس بۆ خودا بلوێت ئەوە خودا بەرەو ڕێگای ڕاست و دروست ڕێنمایی دەکات.**

## ئاگادارییەک

ڕوو کردن دە بەیتولموقەدەس هێندێک جار و وەرگەڕان بەرەو کەعبە هێندێک جار ئیشارە وەلای دووشتە: ١. سووڕی دەوڕان لە ژێر ئیرادە و حەزی خودادایە ٢. بۆ ئازمایشی موسوڵمانانە تاکوو ساغ بێتەوە کێیە باوەڕی تەواوە بە پێغەمبەر و فەرمانی خودا. دەنا بەردەکەی (بیت المقدس) واتە صخرةالله خۆی دە خۆیدا لە بەردی دی بەئەرزشتر نییە و هیچ جۆرە شتێکی تایبەتی وا نییە کە لە بەردی دی ژووراتر بێ پێی. و هەروا دار و بەردی کەعبە وە نەبێ دە خۆیدا لە دار و بەردی دی بەئەرزشتر بن بەڵکە بە ئەمری پەروەردگار ئەو شوێن و ئەو جێگا و ئەو شتانە کراونە شوێنی خوداناسی و خوداپەرستی، قەداسەتەکەیان لە ئیتاعەکەدایە.

دەشکرێ بکوترێ ئەو ئایەتە وڵامدانەوە بێ بۆ وانەی دەڵێن **نەسخ** نییە.

دڵ دەیهەوێ بە واقعی بزانێ (سوفەها) کێن؟ بیر و بۆچوون لە سەر سوفەها زۆرن بەڵام دەبێ بە پێی چەن بەڵگە سوفەها ئەوە بێ: هەرکەس لە بەرابەری دەلیل و بورهان چۆک دانەدا ئەو کەسە سەفیهە. وەک کافر کە دە بەرابەر قورئان و قسەی پێغەمبەران و قسەی خودا چۆک دانادەن و بە ڕوودا نایەن ئەوە سەفین. چونکە لەوانە ڕاستتر و حەقگۆتر نییە کە بۆ خودا چۆک دادەن، و هەرکەسیش ئاوەدان کردنەوەی دنیا وەپێش ئاوەدان کردنەوەی ئاخرەت بخا ئەو کەسەش هەر سەفیهە. بۆچی دنیا دەڕوا و وێران دەبێ پاش ماوەیەکی کەم کە وا بێ ئەوەی لێی خەرج کرێ بۆ جوانی و ڕازانەوە و ئاوەدان کردنەوەی ئەویش، دەگەڵی دەڕوا و وێران دەبێ، کەوابێ دەبێ بڵێین: ئاقڵ کەی بانی خانووی کە لە ژێریدا دانیشتووە وای گران دەکا بە سەریدا بڕووخێ و نەیەتەوە دەرێ لە بنیدا! زانایانی ئایینی کوتوویانە سەفی ئەو کەسەیە بێدەستەپارە بچێتە بازاڕی و بێ پارە ڕووکاتە شاری.

## ڕووگە (قیبلە) و ڕای زانایان

**ئاوڕدانەوەیەک** وەسەر تەعینی شوێن بە ناوی قیبلە واتە ڕووگە ڕوو تێکردن لە کاتی عیبادەتی وەک نوێژ:

دڵ دەیهەوێ بزانێ بۆچی خودای مەزن بۆ بەجێهێنانی نوێژ شوێنی ڕوو تێکردنی تەعین و مەعلووم کردووە؟ خۆ هەر کوێ ڕووی تێکرێ خودا زانا و ئاگادارە و لەوێیە! کە وایە دەبێ بۆ ڕێی نەدابێ نوێژخوێن بە ویست و وازی خۆی هەر کوێی واز لێ با، ڕووی تێ بکردایە!؟ ئێمەش دەبێ لە وڵامدا بۆ لابردنی تەمی ئیشکال ڕوو بکەینە زانایانی قورئان. ئەوانیش لەو بارەوە ئاوایان نەزەر داوە: هەچەن لەو بارەوە ڕا و بۆچوون زۆرە. بەڵام بە هێندێک نەزەر لێرە قەناعەت دەکەین لەوەی هەچی بۆچوونیانە ڕایگەیێنین:

١. هەروەک دەردەکەوێ لە ڕاپەڕین و تێگەیشتنی ئینسانی دەبێ دوو هێزی مودریک و زانا دە قەوارەی لەشدا جێگیر کرێن: یەکیان هێزی ئەقڵ، ئەوی دیکەیان هێزی خەیاڵ. دیارە هێزی ئەقڵ ئەو بوونەوەرە ئەقلاویانە دەقۆزێتەوە، واتە ئەوەی لە جوغزی چوارچێوەی ئەقڵدا بێ دەرکی دەکا و دەیقۆزێتەوە. هێزی خەیاڵ دەڕوانێتە عالەمی بوون بێ‌وەی بتوانێ بە تەواوی بەرهەم دەس خا. بەڵام بە پەلە هاوار لە هێزی ئەقڵ دەکا بیگاتێ بۆ قۆزتنەوەی ئەو تەماڵ و نەچیرە. جا چونکە ئەو دوو هێزەش هەر بە یەکەوەن، دەس‌بەجێ دەگاتێ و دەیقۆزێتەوە. بە

کورتی کاتێ ناسینی شتێک بێتە ڕوو جێی نیاز بێ، ئەو شتە کە دە عـالەمی نهێنیـدا بـێ، هێـزی ئەقڵ بە تەنێ ناتوانێ دەرکی بکا و بیخاتە ناو ماڵی زەینەوە. بۆ ئەو کارە هێزی خەیـاڵ دەبـێ بە هاوارەوە بێ فەورەن ڕەنگ و چۆنیەتی ئەو شتە وێنەبەرداری بکا و بیخاتە ناو ژووری زەیـنەوە و کە شوێن و کارگای ئەقڵە، لەوێدا هێزی ئەقڵ بە تەواوی دەیهێنێ و دەیبا و هەڵگێڕ و وەرگێـڕی پێ دەکا و ساغی دەکاتەوە.

خۆ دیارە نوێژیش دە زاتی خۆیدا کە خۆگەیاندنە بە قۆنـاغی بەرزی هەسـتەی نهێنـی واتە دواندن و ملاقاتی زاتـی بـاری. ئەوەش بێگومـان نیـازی بە تەواوی بە لەوێبـوونی قەلـب و هەستەی قەلب هەیە بۆ خۆ یەکلاکردنەوەی خودا و دواندن و حازر کردنی دە ناو ماڵی دڵـدا. جا دیارە و حاشا هەڵنەگرە گەیشتن بە قۆناغێکی ئـاوا سـەخت بە دڵبـڵاوی و دوور لە هێـزی ئەقڵ و خەیاڵ نابڕدرێ و ناکرێ پێگەیشتنی. (تەفسیری کەبیر، ج۴/۳، ل ۱۰۵). بە کـوردی و بە کـورتی دەبێ دە عیباداتدا وەک نوێژ بۆ گەیشتن بە مەتڵەب کە خودا دوانـدنە یەک شـوێن بـۆ ملاقـات دیاری کرێ. دەنا لە بێ شوێنی و بێ دیاریی شوێن، هەم هێزی ئەقڵ و هەم هێزی خەیاڵ بـڵاو دەبێ و هەم پەرێشان، نازانێ چۆن خۆ کۆ وەکا و گورجوگۆڵ ڕوو کاتە مەقسەد.

خۆ دیارە ئەوەش سابتە و حاشا ناکرێ دڵ وە شوێن چاو دەکەوێ، چـاویش یەک هەدەف چاتر ڕاو دەکا نەک چەند هەدەف، هەروا ڕوحی عیبادەت و خوداناسـی یەکلایەنە بـێ دەبـێ چونکە لە دوو لایەنیدا دوودڵی دێتە ڕوو، بۆیە خاوەنهونەر شیخ عەتار کوتوویەتی:

از هـــــمه بگریـــــز، بـــــا یـــــکروی بـــــاش
یـــک دل و یـــک قـــبله و یـــک ســـوی بـــاش

وهەروا زانا و ژیر شەمسی تەبریزی لەو بارەوە ئەویش تیرئەندازی کردووە و دەڵێ:

دویی را چـون بـه دَر کـردم یکـی دیـدم دو عـالم را
یکی بیـنم، یکـی دانـم، یکـی گـویم، یکـی خـوانم

و هەروا خاوەن هونەران لەو مەیدانەدا خۆیان بۆ ڕاگیر نەکـراوە و ڕمبـازی خۆیـان نیشـان داوە:

ز دست دیده و دل هر دو فریاد	که هرچه دیده بیند دل کند یاد
بـــسازم خنجری نیشش ز پولاد	زنم بر دیده تـــــا دل گردد آزاد

دەبێ ئەوە بزانین و بیسەلمێنین: چاو کاناڵ و دەرک و دەروازەی هـاتنە ژووری دڵە، ئەگەر

چاو شت وێنەبەرداری نەکا، دڵ ناتوانێ ڕاوی هیچ نەچیرێک بکا مەگەر شتی نهێنی، خۆ دیارە نوێژ خوێندن و ڕوو تێکردنی دە شوێنی ملاقاتی خودا دەبێ یەک کرێ تاکوو چاو و دڵ یەک‌لا بنەوە.

با ئەوەش پاشقول نەدەین: زانایان کوتوویانە و ئەقڵیش قبووڵیەتی چاولێکنان دڵ یەک‌لا و کۆکردنەوەیە، بۆ خۆگەیاندن بە هەدەف، هەروەک گیاندارێک کە دەیهەوێ بازدا لە کەنداڵێک و یا شوێنێکی بەرین. لە هەوەڵەوە خۆ وێک دێنێ و خڕ دەکاتەوە پاشان گورج‌وگۆڵانە بازەکە دەدا و دەپەڕێتەوە. چاو و دڵیش هەمان شتن، دەبێ خۆ یەک‌لا کەنەوە و خۆ وێک بێنن جا باز دەن.

## شێخ بایەزیدی بەستام

زانای ناودار شێخ بایەزید بەستامی لەو بارەوە کوتوویەتی: ئەو شێخی نازدار بۆوەی بتوانێ ئامانجی خۆی بخاتە نـاو هەسـتی دەروونـیەوە، دە نـاو ژوورێکـی چکـۆلە بە نـاوی حـوجرە دادەنیشت دەرک و پەنجەرەی ئەو هۆدەی دەبەست و داخنـی و تەنـانەت کـون و کاژێرەکـانی دەخنین نەبادا سیسـرە و جرجرکەر بسیرێنن. پاشان ئەگەر شەو بـا، چراشـی خـامۆش و خەفە دەکرد تاکوو نوور و هەستی چـرا نەدا لە نـووری چـاوی، بەو شـێوەیە چاویشـی لێـک دەنـان ئەوجار نوور و هەستی بە هەستی دڵی دەگێڕا بە شوێن یادی ئەڵڵای مـوتڵەق. تەواوی نـووری شعوور و حەواس و ئەقڵی بەرەو زاتی پاک و بێ‌هاوتای ئەو خـودای بێ‌ڕەنـگ و بێ‌دەنـگ و بێ‌وێنە وەگەڕ دەخست، دڵ و هەست و شـعوور دەکەوتـنە سـەر ئەو خەتە کە ئەوە خـودایە و دەگەڵی دەدوێن، بۆیە پیری خاوەن هەست و بیر فەرموویەتی:

چشم بند و گوش بند و لب ببند      گر نبینی سـرّ حقّ، بر ما بخند

بە کـوردی و بە کـورتی: خـودای زانـا و ئاگـا بە دڵ و دەروون و هەسـتی بەشـەر، بـۆ نوێژخوێنان ڕووگەی کردە یەک شوێن تاکوو لە کاتی دوان دەگەڵ گەورەی خۆی و خالقی هیوا و هومێدی هەموو کات و سات و دەور و زەمانی خۆی بە کۆدڵی بـدوێ. لە قەولـی پێغەمـبەر بڕوانە (إِيّاکَ و الالتفات فی الصلوة فأَنَّهُ هلَکـة) واتـە ئاگـادار بـە تـاکوو دە نـوێژدا بەولاولادا نەڕوانی. واتە دڵت نەڕوا. ئەو گوفتەشی هەیە: (هُوَ اختلاسٌ يَختَلِسُهُ الشيطانُ مِنْ صلاةِ العبدِ) واتە ڕوو دێر و دەوێ کردن لە شەیتانەوەیە تاکوو لەو ڕێیەوە دەس بگەیێنێتە نوێژی عەبدی.

پاش دامەزراندنی ئەو نیزامە بەهێز و پتەوە کە هیچ شتێک بە لێهاتوویی خۆی و سەربەخۆ نەهاتووە و نایەتە ڕوو، بەڵکە هەمووی بە دم ئیـرادە و حەزی هەڵـوەداو دەخـولێ و دەبـێ، بـۆ

نموونە قیبلە لە خۆوە پیرۆز نەبوە و نەبووەتە ڕووگە بەڵکە لە خوداوە ئەو ئەرزشـەی پـێ دراوە. گوڵ لە خوداوە جـوان کـراوە، ڕیحـانە لە خـوداوە بۆنخـۆش کـراوە. بە کـورتی و بە کـورتی کەیفـیەت و چـۆنیەتی دار و دەوەن و گیـاوگۆڵ لە خـوداوەیە. نە لە ئـاو و زەوی. چـۆنیەتی حەیوانات و حەمایەتبوونی لە خوداوەیە بۆ ئینسان، نەک لە خۆیانەوەیە.

ئەوجار خودای تەعالا دەگەڵ گەلی ئیسـلاما دەدوێ و دەکەوێـتە بـاس، لەمەڕ ئەو ڕێـز و ئیکرامەی کە بۆ ئینسان قایلە زیاد لە بوونەوەری دی. هەر بـۆیە ڕووگەی تـایبەتی بەخشـی بەو بەرەیە. بۆ ڕاستی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٤٣ی بەقەرە:

﴿١٤٣﴾ وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنتَ عَلَيْهَا إِلاَّ لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَى عَقِبَيْهِ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلاَّ عَلَى الَّذِينَ هَدَى اللّهُ وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ إِنَّ اللّهَ بِالنَّاسِ لَرَؤُوفٌ رَّحِيمٌ

ئەی موسوڵمانینە! ئێمە ئێوەمان گێڕاوە بە کەسانێکی خاوەن بیر و بـاوەڕی ڕاسـت و میـانەڕۆ، نەک وەک ئەوانەی کەوا دەزانن مەبەسـت لە ئـایین وازهێنـانە لە خۆشـیەکانی دنیـا، وە نەک وەک ئەوانەش کە هەموو خەمێکیان هەر بۆ کۆکردنەوەی مـاڵ و سـامانی دنیـایە. بەڵکـوو تـا ئێـوە ببـنە شـاهید لە سـەر کـردەوەی خەڵکانێـک کە ئایینیـان لە ئـایینی ئێـوە جیـاوازە و پێغەمبەریش ببێـتە شـاهید لە سـەر ئێـوە. ئـێمە ئەو قیـبلەی کە لەمەوپـێش لە سـەری بـوون گۆڕیمان بە قیبلەیەکی دی تاکوو دەرکەوێ کێ وەشوێن پێغەمبەر دەکەوێت و کێش وە شوێنی ناکەوێت و لە باوەڕەکەی پەشیمان دەبێتەوە. بەڵێ ئەو قیبلە گۆڕینە ڕووداوێکی قورس و گران بووە. بەڵام نەک لە سەر ئەوانەی کە ئیمانداری تەواو بوون و ڕاسـتیەتی ڕێگـای خودایـان بـۆ دەرکەوتبوو. خودای مەزن ئیمان و باوەڕی ئەوانە زایە ناکـات و خـاوەنی بەزە و شـەفەقەتێکی بێئەژمارە.

خودا لەو ئایەتەدا دەفەرموێ (لنعلم) واتە تاکوو بزانین. بێگومان زانینی خودا هیچ مەرز و سنوورێکی بۆ نییە و هیچ شتێکیش نییە خودا نەیزانێ و لێی بزر بێ، خۆ تێکەڵاو کردنی خـودا لەو ئایەتەدا دەگەڵ زانینی پێغەمبەران و هاواڵەکانی وەکوو ئەوە وایە کە کەسێک باش بزانـێ کە شاگردێک هیچ نازانێت و لە تاقی کردنەوەدا دەرنـاچێ بەڵام بە لێـژنەی ئیمتیحـانی شـاگردەکە دەڵێ: با پرسیاری لێ بکەین تـاکوو بـزانین دەردەچێـت؟ ئەو کەسـە کە دەڵـێ بـا بـزانین، خـۆ

مەبەستی خۆی نییە، بەڵکوو مەبەستی ئەوەیە ئەندامانی لێـژنەکە ئەو ڕاسـتییە بـزانن. نمـوونەی بەرز هەر بۆ خودایە.

**تێڕوانینێک لە سیما و دەروونی ئەو ئایەتە (١٤٣):**

**(امة وسطا)**

خودا کە دەفەرمویٚ ئێوەمان کردە ئۆمەتێکی وەسەت، واتە بە گەلێکی میانەی هەڵبـژاردە لە ناوەندی توندی و بەرەڵڵایی (افراط و تفـریط)دا هەروەک جیـاوازی لە ناوەنـدی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا یانی هەر وەک ڕێنونیمان کردن بۆ ڕێی ڕاست، ڕووگەیەکی سەربەخۆشـمان دانـیٚ و کردووشمانن بە گەلێکی میانە، تاکوو ببـنە چـاوەدێر بە سـەر مەردمەوە و هەر وا تەرازووی داد هەڵاوەسن لە ناو گەلدا و ببن بە پێشەنگ و پێشڕەو و چاولێکراو بۆ هەموو گەلانی دی، بۆ ڕێی ڕاستی ژیان. و هەروا پێغەمبەریش چاوەدێر بیٚ بە سـەرتانەوە چـونکە دواتـرین پێغەمـبەرە، بـۆ بەرەی ئادەمی تا دنیا هەیە، و هەروا یەکەمین سەرمەشقە لەو ڕێیەوە کە ڕووناکی ئـایینی بە ئێـوە گەیاندووە و هەروا لە ئێوەشڕا دەبیٚ بە هەموو دنیا ڕابگا.

بە پێی یاسا ئەو ئایینە بەخشـراوە بە ئێوە، دەبیٚ گەلێکی وا بن میـانەڕەو لە بیـر و باوەڕیشـا واتە ئەوەندەی دەڕواننە خزمەتی جەستە و لەش، ئەوەندەش بڕواننە گەشەی گیان و حەیـات و ڕێی نەدەن تەرازووی لەش و گیان لاسەنگ ببن، بە هۆی ئیسـراف و زیادە بەر خۆدان.

﴿أُمَّةً وَسَطًا﴾ واتە ئاگادار بە سەر ئاکـار و ڕەفتـار و کـردەوەی گەلانـی ڕابـردوو، و هەروا حاڵی کراو بۆ وەی چی بکا بۆ داهاتوو. هەرکەس بە وردی و ژیرانە بڕوانێتە مێـژووی گەلانـی ڕابردوو، دەزانیٚ و بۆی دەردەکەویٚ کە لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر سەت سـاڵی نەخایانـد کە ئیسلام و ئیسلامیەت خۆی گەیاندە ئەوسەرەو سەری دنیا واتە عـالەم بەرەوپیـری دەهـات و تەنانەت لە ڕۆژئاواوە داپۆشی و گرتی تا کوو سنووری وڵاتی فەڕانسە و هەروا لە ڕۆژهەڵاتەوە دایە بەر خۆی تا گەیشتە چـین و بوخـارا و لە ئیسـپانیادەوڵەتێکی پێـک هێنـا و زانسـتگای بـۆ کردنەوە کە بەبیٚ جیاوازی قوتابی موسوڵمان و گاوری تێـدا جـیٚ کرابـوو. ئەگەر بەو شـێوەیە ئیسلام بڕۆیشتایە پێش، وەک قورئان سوژەی دابوو نەخشەی بۆ کێشـابوو، ڕێبەرێکـی دادوەر و دادپرس ڕێبەری بکردایە، و تەرازووی دادی بە واقیعی هەڵاوەسیبا و ڕێگای نەدابا جیـاوازی لە ناو عالەمدا حکوومەتی بکردایە و دروست بە پێی یاسای قورئان ڕەفتـار بکـرایە، ئەبەو حەلە بە یەکجاری گەل ڕزگاری دەبوو.

بەڵام بە داخەوە هەروەک ئەوڕۆ ئـاییینی ئیسـلام کـراوەتە دێوجـامە بـۆ ڕاوی ئینسـان و قورئانیش کراوەتە گورزی دەستی زۆرداران بۆ سـەر و گـوێلاک تـێ کـردنەوەی بەرەی لاواز و بێهێز، ئیسلام مافی چاوەدێری بە سەر کەسەوە نەماوە.

سەربڕین و زگدڕین و سووتاندن و تۆقاندن و هەتکی حورمەت و کەڕامەتی بەشەر بـۆتە باو و دیاردەی دەستی دەستەڵاتداران، لە ژێر پەرچەمی پەڕۆی (لا اله الاّ الله).

بە کوردی و بە کورتی دینی تۆ ئەی پێغەمبەر محەمەدﷺ ئاییینێکی میانەیە بە تەواوی دەگەڵ ئاییینی سـرشت یەکە و یەک دەگرنەوە. وەک ئاییینی یەهوود نییە سەرەڕۆ و سـەختگیر بـێ کە بە هۆی ئەو سەرەڕۆیە و لاساریانەی گەلەکەی تووشی بە تووشی ئەو هەموو نەدامەتیـانە بـوو کە قورئان بەیانی فەرموون. و هەروا وەک ئاییینی مەسیحیش نـاچێ کە فیـدای پەسـتی کـراوە واتە پەیڕەوەکان لە ئەسەری ئەو لاساری و خۆگۆڕانە گەیشتوونە زەلکاوی موشـریکایەتی.

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم بە هۆی ئەو ئایەتە هەم میـانەڕەوی ئـۆمەتی ئیسـلامی ڕاگەیاند هەم میانەڕەوی ئاییینی ئیسلام. جا دەبێ بە پێی ئەو پەیـامەی بـاری هەچـی ئیمانـی بە خودا و بە ئاییینی ئیسلام هەبێ دەبێ میانەڕەو بێ لە هەموو شتەکانی ژیانی باوەڕی، ئەخلاقـی، تەنانەت خواردن و خواردنەوە و دەبەر کردن.

دڵ لە بەراوەرد و هەڵسـەنگاندنی جـوملەی ﴿لِتَكونُـواْ شُـهَدَاءَ عَلَى النَّـاسِ﴾ دادەمێنـێ و ڕادەمێنێ، واتە چۆنی قبووڵ کەین ئۆمەتی محەمەدی کە ئاگای لە ئاکـار و ڕەفتـاری ئۆمەتـانی ڕابردوو نییە و دەشتوانێ شاهیدی بدا لە سـەر کـردەوە و باوەڕیـان!؟ خـۆ دیاریشـە ئەو ئـایەتە کەلامی خودایە و شک لە ڕاستی ئەودا نییە. زۆر بیر و بەوێـدا دڵ بە چـرای ئەقـڵ و زانسـتەوە سووڕاوە لەوەی زیاتر کە دڵی پـێ دامەزرێ دەسـتی نەکەوت و چـاوی نەکـرد ئەوەی دەسـتی کەوت ئەوەیە:

ئۆمەتی ئیسلام بە وەسیلەی قورئان بە سەر بەسەرهاتی ئۆمەتانی ڕابردوودا ئاگادار و زانایە. ئەو شاهیدیەشی شاهیدی ئیمان و باوەڕە نەک هەموو تاوان و چاکە و خراپەیەک، کەوابـێ هەم پێغەمبەر هەم ئۆمەتی دەتوانن بە پێی خەبەردانی قورئان شاهیدی لە سەر ئەسڵی کاری ئۆمەتانی ڕابردوو بدەن کە باوەڕییە بە خودا و پێغەمبەران و کتێبەکـانی ئاسـمانی و ڕۆژی ئـاخیرەت. بـۆ زێدەزانین بڕوانن لە تەفسیری کەبیر، ج ٤/٣، ل ١١١-١١٣.

## شاهیدیدان

بە پێویست زاندار ئەوەش پاشقول نەدرێ: کێن ئەوانی دەتوانن لە ڕۆژی قیامەتدا لە سەر کرداری ئینسانی شاهیدی بدەن؟ چون باسەکە باسی شاهیدییە، دەبێ بزاندرێ ئەو شاهیدانە کێن؟

قورئانزانەکان بە پێی دەلایلی قورئانی کوتوویانە **چوار تاقم** ڕێگای شاهیدیدانیان پێ دراوە لە سەر خێر و شەڕی ئینسانی:

١. ئەو فرشتانەی کە لە کاتی حازربوونی ئینسانی بۆ مەیدانی حەشر، دەگەڵ ئەو فرشتانەی کە لە سەر کردار و گوفتار و ئاکاری شاهید بوون. وەک (سائق: لێخوڕ)، (شهید: حازر لە سەر ئەو). ﴿وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ﴾ (ق: ٢١) **واتە لەو ڕۆژەدا (قیامەت) هەر ئینسانێک دەگەڵ ڕێنوێنیانی فرشتە وەک (سائق و شەهید کە ناوی دوو فرشتەن) دێت**. یا دەڵێن ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ كِرَامًا كَاتِبِينَ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ﴾ (انفطار: ١٢-١٠)

٢. پێغەمبەران شاهیدی دەدەن لە سەر خێر و شەڕی ئینسانی بەو دەلیلە ﴿لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾ (بقرة: ١٤٣) لە پێشدا مانای لێ دراوەتەوە.

٣. ئەنبیا و شاهیدان بەو دەلیلە: ﴿وَجِيءَ بِالنَّبِيِّينَ وَالشُّهَدَاءِ﴾ (زمر: ٦٩) **کاتێ مەیدانی مەحشەر ئامادە کرا و بە نووری باری ڕووناک کرا، و نامەی عەمەل خرایە دەستی خاوەن عەمەلان، پێغەمبەران شاهیدان دێندرێن بۆ شاهیدی دان لە سەر کرداری وان.**

٤. ئەندامی لەش وەک دەست و لاق و قاچوقول، چونکە لەوێش هەیە ئینسان ئینکار و حاشای تاوان لە خۆی دەکا و تەنانەت دە حەولی وەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەرانیشدانە. جا لەو کاتیدا ئەندامی لەش بۆ شاهیدی دان لە سەریان دێندرێنە مەیدان و وەقسە دەخرێن و زاریش مۆر دەکرێن تاکوو لە قسە کردن بکەون. بەو دەلیلە: ﴿الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ (یس: ٦٥) **ئەو ڕۆژە مۆری بێدەنگی دەخرێتە سەر زار و، دەست وە قسە دەخرێن، و لاق شاهیدی لە سەر کردەوە و کردار دەدا.**



هەروەک زاندراوە پێغەمبەر پاش ئەوەی نوێژ لە سەر خۆی و موسوڵمان گەڕا بە فەرز، بۆ ئەنجامدانی ئەو فەرزە ڕێزدارە وەک پێغەمبەرانی پێش خۆی ڕووی دەکردە بەیتولموقەدەس، بەڵام دە نهێنی ناو دڵیدا حەزی ئەوەی دەکرد کە ڕوو بکاتە ڕووگەی باپیرەگەورەی خۆی واتە

ئیبراهیمی خەلیل کە بە بابی پێغەمبەران ناوبانگی دەرکردبوو چونکە ئیبراهیم بۆ نوێ کردنەوەی ئایینی ئاسمانی هاتبوو و هەروا کەعبەش دەسکردی ئەو بوو. دیارە کۆنترین قیبلەیە لە دنیادا. جا بە هۆی ئەو شتانە بە زۆری چاوی ئارەزووی دەبڕیە ئاسمان و بە دڵ ئاواتی ئەوەی دەخواست لە خودا کە قیبلەی بۆ بگۆڕێ بە کەعبە. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١۴۴ی بەقەرە:

﴿١۴۴﴾ قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنْتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ وَإِنَّ الَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ

بەڕاستی ئێمە دەتبینین ڕوو کردنە ئاسمانت و چاوەچاوت بۆ هاتنی سرووش و گێڕانی کەعبە بە ڕووگە، وا ئەوجار ڕووت دەکەینە ڕووگەیەک کە بۆخۆت هەم پەسەندت کردووە و هەم ئارەزووت کردووە. (ئەوجار خودا بەتایبەتی دەستوور دەدا بە پێغەمبەر بە ڕوو تێکردن دە مسجد الحرام دەفەرموێ): لەمەولا لە نوێژدا ڕوو بکە بۆ لای مسجد الحرام کە کەعبە لە ناوەڕاستی حەسارەکەیدایە. (پاش فەرمان دان بە پێغەمبەر بە ڕوو تێکردن لە مسجد الحرام دەفەرموێ بە موسوڵمانان کە ئێوەش لە نوێژدا ڕوو بکەنە کەعبە دەفەرموێ): ئێوەش ئەی موسوڵمانینە لە هەر لایەک بوون لە نوێژدا ڕوو بکەنە لای ئەو مزگەوتە. (ئەوجار ئاوڕ دەدرێتەوە سەر خاوەن کتێبەکان، بەرانبەر بەو ڕووگە تازەیە و دەفەرموێ): ئەوانەی کە نامەی خودایان پێ دراوە (واتە گاور و جوولەکە) دەزانن کە ئەو ڕووگە گۆڕینە شتێکی دروست و ڕاست و ڕەوایە لە خوداوەیە، چونکە دە کتێبە ئاسمانیەکانیانا باس کراوە و دەشزانن کە کەعبە ڕووگەی ئیبراهیم و نەوەیەتی و محەمەد و گەلەکەی لە نەوەی ئیبراهیمن. بەڵام ئەوان بە چاوی چاوەڕاو و درۆ سەیری دەکەن و خوداش ئاگایە و بێئاگا نییە لەو چاو و ڕاوەی دەیکەن دەربارەی گۆڕینی ئەو ڕووگەیە.

## سووکەئاوڕێک

بەڵێ، ئەوە حاشاهەڵنەگرە کە خاوەن کتێبەکان زۆر چاک دەزانن کە ئەو ڕووگە گۆڕینە لە خوداوەیە، چونکە لە تەوڕاتدا لە (اصحاحی ٣٣، لە سفری تثنیە)دا دەفەرموێ: خودا هات لە سیناوە ڕووناکی بۆ دانەوە، لە سەعیر و شەوقی بڵاو کردەوە لە شاخی فاران. ئەو ئایەتە تەوڕاتە مزگێنی دەدات بە پێغەمبەریەتی مووسا و عیسا و محەمەدﷺ چونکە خودا تەوڕاتی ناردۆتە

خوارەوە بۆ مووسا لە کێوی توور کە لە سینایە و ئینجیلی ناردووە بۆ عیسا لە شاخیر سـەعیر لە دێـی ناصـــرە و قورئــانی نــاردووە بـۆ مـحەمەدﷺ لە شــاخی فــاران کە لە مەکـکەیە، بە لای موسوڵمانەکان و گاورەکان و جوولەکەکانەوە. و هەروا پێغەمبەریش بە تەمای خاوەن کتێبەکـان بوو کە لە پێش بتپەرستاکانا بڕوا بەو قورئانە بێنن چونکە ئەوان نامەی ئاسمانی و پێغەمبەریـان لەوە پێش بۆ هاتووە، بەڵام بتپەرستەکان نەیاندەزانی ئەوانە چین.

**تێڕوانینێک لە ناوەڕۆک و سیمای ئەو ئایەتە:**

ئارەزوو و ئاواتی پێغەمبەر لە بابەت گۆڕینی قیبلە لە بەیتولموقەدەسـەوە بـۆ کەعـبە لە بەر ئەوەی نەبوو کە بڵێین بەیتولموقەدەسـی نـاخۆش دەویسـت بەڵـکە بە دڵ خوازیـاری ڕووگەی تایبەتی بوو، هەروا لەولایەشەوە بەیتولموقەدەس وەک قیبلەیەکی نەژادی و ئیرسی هاتبوو ڕوو لە ناو عالەمی ئەو سەردەمیدا لەو ڕووەوە ترسی ئەوە دەهاتە پێش کە وا گومان بکرایە لە بوونی بەیتولموقەدەس بە قیبلەی ئۆمەتی محەمەدیش، ئایینی ئیسلامیش ئایینێکی نژادییە، جا بـۆ وەی ئەو تەمە گومانە بڕەوێ لە سەرچاوەی دڵـی گەلـی ئیسـلام ڕووگە لە بەیتولموقەدەسـەوە گـۆڕا بەرەو کەعبە، سەرەڕای ئەوەش یەهوودییەکان تانە و تەشەری زۆریان دەهاویشتە موسوڵمانەکان بەوەی. پێیان دەکوتن: ها ئایینی ئێوە سەربەخۆ و موستەقیل نیـیە، بەڵـکە بەشـێکی کە ڕووگەیە بەسـراوەتەوە بە قیبلەی ئێمە کە بەیتولموقەدەسە.

بە کـورتی هـۆی گـۆڕانی ڕووگە زۆرن بەڵام ئەوانەی کە زۆر بەرچـاون ئەوانەن، جـگە لە ئەسـراری باری:

١.ئارەزووی سەربەخۆیی قیبلەی ئۆمەتی،

٢. ترس و گومانی نەژادی ئایینی ئیسلام

٣. ئارەزووی زۆری حەزرەت بە ئیبراهیم و ئاسارەکانی

٤. کەعبە کۆنترین مەرکەزی تەوحیـد بـوو و تەنـانەت موشـــریکەکانیش خۆشەویسـتی و عەلاقەیان پێی بوو.

جگە لە هەموو ئەوانەش خودا بۆ وەی بەرگری بکا لەوەی گەل وا خەیـاڵ نەکەن کە قیـبلە تــایبەتی پێغەمــبەرە، بە دووی ئەوەیــدا کە بە پێغەمــبەری دەسـتوور دا ڕوو بکــاتە کەعــبە، بە موسوڵمانانیشی دەستوور دا کە ڕوو بکەنە کەعبە تا ئەوە بێتە جێ کە کەعبە قیبلەی هەمووتـانە: پێغەمبەر و ئۆمەتی ئیسلام.

## وردبوونەوەیەک

دیـارە هەر وەک لە مانـای ئـایەتەکەڕا دەسـتمان کەوت بە کـۆدەنگی قیـبلەی موسـوڵمان کەعبەیە، مسجد الحرام کە کەعبە لە ناوەڕسـاتی قەراری گرتـووە قیـبلە نیـیە و بە قیـبلە نـایەتە حیساب. بەو شێوەیە ئەگەر کەسێک لە کاتی نوێژدا بە غەیرەز کەعبە ڕوو بکاتە شوێنێکی دیـکە نوێژەکە نایەتە ژمار و بەتاڵ دەردەچێ. کەوایە بۆچی خودای تەعـالا لە بـاتی ئەوەی بفەرمـوێ: (شطر الكعبة) بۆوەی لە ئیشکال و گومان خاڵی بێ فەرمووی: ﴿فَوَلِّ وَجْهَـكَ شَـطْرَ الْمَسْـجِدِ الْحَرَامِ﴾ ئەودەم خەیاڵی بزۆز و نەسـرەوتوو لە سەر جێبەجـێ کردنـی عیبـادەتەکە وەک نـوێژ دەکەوتە دڕدۆنگی لەمەڕ ئەو کەسانەی کە لە چۆڵ و وڵاتانی دوور بێ وەسیلە و نیشانەی قیـبلە کە ئایا ڕوومان بە دروستی کەوتۆتە ڕووگەیەی کە خودا بۆی تەعین کردووین یان نا؟

و هەروا دووبار جێگای سـرنج و بەرجەوەندییە کە خودای تەعالا لە باتی (الـی الْمَسْـجِدِ الْحَرَامِ) فەرموویانە (شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ)؟ ئەوە دێرەدا خودای تەعالا بەرفراوانی و ئـاواڵەیی ڕووگەی دە نەزەر گرتووە بـۆ موسـوڵمانان بەو دەلـیلەڕا دیـارە کە (شـطر)ی بە کـار هێنـاوە دە ئایەتەکەدا چونکە (شطر) هەم بە مانای پایە و بەشێکی تەواو و هەم بە مانای لا و تەڕەفی شت، جا لە سەر ئەو ئەساسە نوێژخوێن پڕ بە باوەشی خۆی قیبلەی خۆیەتی، بـێ دوودڵـی بـا نـوێژ بخوێنێ.



بۆ پێشوازی و بەرەوچوونی ئایەتی ۱۴۵ ئەو تێڕوانینە پێویسـتە، هەچەن خـاوەن کتێبەکـانی ئاسمانی واتە یەهوود و گـاور و بتپەرسـتەکان زۆریـان هەڵـدا و پێیـدا و لاسـاری دەنوانـد و پێغەمبەریش دەکەوتە سەخڵەتی و ناڕەحەتی ئەوەی: چۆنیان بێنێتە سەر ڕێ.

هەتا ئەو ڕۆژەی ڕووگە (قیبلە) گۆڕا، جوولەکەکان و گاورەکان کەوتنە چاووڕاو لەمەڕ ئەو قیبلە گۆڕانە و بە تەواوی هێزی بێپێزی فـڕ و فێڵیـان هەوڵیـان وەگەڕ دەخسـت بـۆ وەی دڵـی موسوڵمان ئاوەژوو کەنەوە لەو ڕوو تێکردنە بۆ لا کەعبە بەرگری بـکەن بەڵام بـێخەبەر لەوەی شتێک خودا بیکا و بیهەوێ ببێ و بێتە جێ، بە هـیچ هێـز و پێـز و تیـزی فـڕ و فێـڵ بەری پـێ ناگیرێ، هەروەک بیندرا دوژمنانی ئایینی ئیسلام نەیانتوانی پـێش بە موسـوڵمانان بگـرن لە ڕوو تێکردن لە کەعبە بە ناوی قیبلە.

ئەوجار باریتەعالا بە ئایەتی ۱۵۵ پێغەمبەر تێدەگەیێنێ کە ئەو خاوەن کتێبـانەی ئاسـمانی

وەک تۆ دەزانن و تێگەیشتوون کە ئەو قیبلەیە ڕاستە و حەققە و شتێکی ڕەوایە و سەربەخۆش نەگۆڕدراوە، بەڵکە بە ئەمری خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم گۆڕاوە بۆ چەن مەسڵەحەتێکی ئایینی ئیسلام. بەڵام لاساری و بەدڕەفتاری ئەوانە لە سەر ئەساسی حەسادەت و کینە چاوبەرینایی نەدانیانە کە بڕوای پێ ناهێنن. جا بۆ ڕاستی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۴۵ی بەقەرە:

﴿۱۴۵﴾ **وَلَئِنْ أَتَيْتَ الَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ بِكُلِّ آيَةٍ مَّا تَبِعُواْ قِبْلَتَكَ وَمَا أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءهُم مِّن بَعْدِ مَا جَاءكَ مِنَ الْعِلْمِ إِنَّكَ إِذَاً لَّمِنَ الظَّالِمِينَ**

**ئەی پێغەمبەری خودا! ئەتۆ هەرچەندە لە سەر پێغەمبەرایەتیت بەڵگە و سەنەد و بورهان بنوێنی و ڕانێی، ئەو خاوەن کتێبانە بڕوات پێ ناکەن و وەشوێن قیبلەی تۆ کە کەعبەیە ناکەون. و ئەتۆش هەروا، تازە پاشی ئەوەی کە لە لایەن خوداوە فەرمانت پێ درا کە ڕوو بکەیتە کەعبە، ئیتر ڕوو ناکەیەوە قیبلەکەی وان. و ئەوانیش هیچ کامیان وەشوێن قیبلەی تۆ ناکەون، ئەتۆش پاش ئەوەی کە خودای تەعالا ڕێگای ڕاست و دروستی بۆ ڕوون کردوویەوە، وە دوای شوێنی وان بکەوی و فریوی ئارەزوویان بخۆی، ئەوە بێ گومان بە لادەر لە حەق و ستەمکار دەژمێردرێی و لە قەڵەم دەدرێی.**

وەک دیارە دێرەدا خودا هەڕەشە لە پێغەمبەر ناکا بەڵام هەندێک لە موسوڵمانەکان لە بەر کاڵی و ساویلکەییان لە فەرمانی خودا لادەدەن و خۆ دوور دەکەنەوە لە ڕێگای ڕاست، بەو پێیە ئەوە هەڕەشەیە بۆ وانەیە کە لە پێناو سامان وزێڕ و زەمبەر و زینەتی دنیا خۆیان دۆڕاندووە. بۆ نموونە ئەوڕۆ بە ڕوونی چاو دەکرێ و دەبیندرێ هەندێک لە بە ناو زانایانی ئایینی یا بڵێین لە مێزەربەسەران، لەبەر قازانجێکی کەمی دنیایی بۆ دەستەڵاتدارانی وەخت و ستەمکارانی سەربەخۆ مەرایی و ڕایی و لامەلامە دەکەن و سەر دادەخەن و لە زۆر نیشانەکانی بەحەققی ئایینی لە پێناو ئەو سەرداخستنە بۆ ستەمکاران چاوپۆشی دەکەن و تەئییدی هەنگاوەکانی زاڵم دەکەن و بگرە زۆر وا هەیە خراپەکارەکانی حاکمی زاڵم بە حەق دەخەنە ڕوو بۆ خەڵکی هەژار و ناحاڵی. چونکە ڕەگەڵ کەوتنی زاڵم تەئیدی زوڵمەکەیان دەکەن، جا پەنا بە خودا.

## ڕووگە ناگۆڕن

**پوختەی مەبەست:** ئەی پێغەمبەر هەچی بەڵگە و نیشانەی هەیە ڕاینێی بۆ ئەو بێباوەڕە

خاوەن کتێبانە لەمەڕ ڕاستی ڕووگەکەت، وێستا باوەڕت پێ ناکەن و دوا قیبلەت ناکەون چ جای دین و ئایینەکەت، بێ باوەڕیەکەشیان لە بەر ئەوە نییە کە دوودڵیان هەبێ لە ڕووگەکەت تاکوو تۆ حەول دەی ئەو دوودڵیەیان لابەری و ساغیان کەیەوە بەڵکە هەر لاسار و سەرەڕۆن، دەنا زۆر چاک دەزانن و کتێبەکانیان مژدەیان داونێ بە هاتنی تۆ و ڕاستی تۆ. بە کورتی ئەتۆ چەندە لە سەر ڕاستیەکەی خۆت بەردەوام و جێگیریت، ئەوان بگرە زیاتر لە سەر ناڕاستی خۆیان سوورن و جێگیرن، کەوایە هەر هەوڵێکیان لە دوو بدەی بێ بەهرە و سەمەرە.

نموونەیەک لە سەر لاساری و بێئەمەکی و بەدقەولی ئەو جوولەکە و گاور و بێباوەڕانەی خاوەن کتێبەکانی ئاسمانین: حەزرەتی عیسا تا بۆخۆی لە حەیاتدا بوو، ڕووگەی هەر بەیتولموقەدەس بوو وەک حەزرەتی مووسا، کەچی هەر عیسا و مووسا نەمان، «بۆلس قسیس» ڕووگەکەی خۆیانی گۆڕی لە بەیتولموقەدەسەوە بۆ ڕۆژهەڵات جا کەوایە ئەی پێغەمبەر کاتێ ئەوان لە ناو خۆیاندا دەس لە ڕووگەی یەکتری هەڵنەگرن بۆ یەکتری، جا چۆن دەس لە ڕووگەی خۆیان هەڵدەگرن بۆ تۆیەکی کە باوەڕیان پێت نییە.

## ابن القیم، جوولەکە و گاور

**ئاگادارییەک لەو بارەوە:** یەکێک لە زانایان بە ناوی (ابن القیم) لە کتێبی (بدائع الفوائد) کوتوویەتی: ڕووگەی جوولەکە و گاور بە وەسیلەی سرووشی خودا نەبووە چونکە نە تەورات ڕووگەی دیاری کردووە بۆ جوولەکە و نە ئینجیل بۆ گاور، بەڵکوو مووسا لە سەر ئیجتیهادی خۆی (صخرة الله)ی کردە ڕوگەی خۆی و عیساش تا ما، ڕووگەی هەر هەمان «صخرةالله»ی مووسا بوو. جا پاشان زاناکانیان هاتن لە سەر وازی خۆیان ڕۆژهەڵاتیان کردە ڕووگەی خۆیان و لا کەوتن لە ڕووگەی مووسا و عیسا.

ئەوجار باریتەعالا بۆوەی ڕێنومایی و دەرسێک بدا بە موسوڵمانان، نەخوازە خوێندەواران و زاناکانی ئایینی، پێیان دەفەرموێ: نەچن بە ئارەزووی خۆتان وە دوای ئارەزووی ئەم و ئەو کەون و بۆ بارەقەڵڵا و ئافەرین و ڕەزای دڵی ئەم و ئەو بێدەنگ دانیشن و قڕ و قەپ بکەن و هاوار نەکەن و ڕاینەگەیێنن کە ڕووگەی تۆ حەقە و ئی وان ئەوڕۆ وا نییە، بەڵکە وە دوای ئارەزووی وان بکەون بەو جۆرە بڵێن: با بۆ ماوەیەک ڕوو بکەینە ڕووگەی وان، بەو هیوایە کە ئەوانیش بێنە سەر ڕووگەی تۆ. ئەوە بێگومان لە زومرەی گوناهکاران دەبی و دەژمێردرێی.

ئەو هەڕەشە بەپێز و تێزە گرانە هەچەن بە ڕواڵەت ڕووی دە پێغەمبەرە، بەڵام دە ڕاستیدا بۆ

هەموو موسوڵمانانە کە بۆ ئارەزوو و خۆشی دڵی ئەم و ئەو، وەشوێن شتی ناڕەوا مەکەون و بۆ بارەقەڵڵای بێئابڕوو و بێئەدەبان ماڵی دنیا و قیامەتت وێران نەکەی.

بە داخەوە هەڕەشەی وا قورس و گران لە قورئانا، زۆر دەبیسین و دەبینین موسوڵمانەکان، کەچی بۆ ئافەریم و بارەقەڵڵای زۆرداران و دەستەڵاتدارانی بێباوەڕ و بێئابڕوو، پەسەندی خراپە و ناڕەواکانیان هەر دەکەن و دەچنە پێشی لێیان و ئەگەر لە لایەن کەسێکی خاوەن هەستەوە بەو کەسانە بکوترێ: بۆ وەشوێن ستەمکار و بێباوەڕان دەکەون، و لە باتی عالەمیان لێ تێگەیێنن و لێ هان دەن کە بەڵکە دەس وەکێشن لەو کار و کردارە ناڕەوایانە، لە موقابیلدا دەڵێین: جا کێ هەیە ئەوڕۆ گوێ بداتە قسەی مە؟! بێگومان ئەو جۆرە قسانە لە سەر ئەو نیەتە بێئابڕوویەیان، لەشکری ناحەقن کەوتوونە بەروبووی باغ و باخاتی وڵاتی ئسلام و وێرانی دەکەن، وەک ئەوڕۆ دیارە و حاشا هەڵناگرێ.

**تێڕوانین و ڕامانێک** لە سیما و دەروونی جوملەی ﴿مَّا تَبِعُواْ قِبْلَتَكَ﴾ کە بە گشتی واتە عموومیەت بەیان دەکرێ. دێرەدا ئەو هەستە دێتە ڕوو و دەکرێ، کە لە ئەهلی کتێب هیچ کەس تابعی قیبلەی محەمەدﷺ نەبێ، دە حاڵێکدا کە زۆر لە خاوەن باوەڕانی وەک عەبدوڵڵا ئیبنی سەلام، ذی مخبر، نەجاشی و ... لە دەورانی حەزرەتدا ئیمانیان هێنا و ڕوویان کردە ڕووگەی محەمەدﷺ و هەروا پاش حەزرەتی ڕەسوولیش دەبیندرا پۆل و خێلی گەورە گەورە لە ئەهلی کتێب دەهاتن دەبوونە موسوڵمان و ڕوویان دەکردە ڕوگەی محەمەدﷺ واتە کەعبە. جا لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ مانای ئەو جوملە ئایەتە چۆن بەراورد کرێ و هەڵسەنگێندرێ؟

بۆ وڵام و ڕاماڵدانی ئیشکالی وا بەجێ، دەبێ خۆ بگەیێنینە خزمەت قورئانزانان و وڵامیان لێ وەرگرین ئە بەو وڵامانە:

١. هێندێک لە قورئانزانەکان فەرموویانە مەبەست لە جوملەی ﴿الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ﴾دا تەنیا ئەو کەسانەن کە خاوەن زانینی عیلمی تەورات و ئینجیلن نەک هەموو ئەو کەسانەی کە ئەهلی کتێبن. واتە لە زانایانی ئەهلی کتێب هیچ کەس بەو ئەمرەی مل نادا و نەوی ناکا. ئەگەر دەشڵێی ئەدی بۆچی عەبدوڵڵا ئیبنی سەلام و نەجاشی و هەروا هاوتای وانیش ملیان داوە بە باوەڕی و ڕووگەی محەمەدﷺ، ئەمەش دەڵێین وەک کوتوویانە ئەوانە پێش هاتنە خواری ئایەتەکە موسوڵمان بوون.

٢. یا دەبێ بکوترێ: مەنزوور لە تابیع بوون هەموو ئەهلی کتێب نییە واتە: وا نابێ تەواوی

ئەهلی کتێب تابیعی ڕووگەی تۆ بن ئەی محەمەدﷺ؟

یا دەبێ بڵێین وەک کوتوویانە: عمومیەتێکی کە لە جوملەی ﴿مَّا تَبِعُواْ قِبْلَتَكَ﴾دا بە خەیاڵدا دێ بە مانای ئەکسەرە، واتە بە زۆری، نەک بە تەواوی. بۆ زێدە زانست لەو بارەوە بڕوانە لە تەفسیری کەبیر، ئیمام ڕازی، ج ٤/٣، لاپەڕەی ١٤٠ بەولاوە.

وەک دەزاندرێ و هەستی پێ دەکرێ خودا کە لە ئایەتەکانی پێشوودا فەرمووی خاوەن کتێبەکان دەزانن کە ئەو ڕووگە گۆڕینە شتێکی ڕاستە و حەقە و لە خوداوەیە، ئەوجار خودای تەعالا لێرەدا واتە لە ئایەتی ١٤٦دا دەیهەوێ ئەوەی ڕاگەیێنێ کە ئەو بێباوەڕانە (جوولەکەکان و گاورەکان) چۆنیان دەزانی کە هەم محەمەد هەقە و ڕاستە هەم ڕووگە گۆڕان کاری خودایە و وایە و ڕاستە؟! جا بۆ پشت ڕاست کردنەوەی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٤٦ی بەقەرە:

**﴿١٤٦﴾ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءهُمْ وَإِنَّ فَرِيقاً مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ**

**ئەو خاوەن کتێبانە وەکوو چۆن منداڵەکانی خۆیان دەناسن، ئاواش ڕاستی و دروستی و حەقانیەتی ئایینی ئیسلام دەناسن و لە لایان ئاشکرایە، بەڵام بێگومان گەلێک لەو سەرۆکە ئایینیانەی جوولەکە و دیانەکان ئەو ڕاستییانە حاشار دەدەن بە ئەنقەست. نەبادا سەرۆکایەتی و پلە و پایە دنیاکانیان لە کیس بچێت.**

**ئاوڕێک و پێداچوونەوەیەک:** خودای بێهاوتا لە پێشدا فەرمووی خاوەن نامەکان چاک دەزانن کە ئەو قیبلە گۆڕانە لە خوداوەیە و ڕاستە. و هەروا پێغەمبەریش بە هۆی ئەو ناونیشانەی کە لە تەوڕات و ئینجیلا بۆ ناسینی پێغەمبەر بەیان کراون چاک دەناسن، بۆ نموونە عەبدوڵڵا کوڕی سەلام کە یەکێک بووە لە زاناکانی جوولەکەکان، موسوڵمان بووە. کوتوویەتی: ئەمن پێغەمبەر محەمەدﷺ لە کوڕەکانی خۆم باشتر دەناسم بەو دەلیلە: لە پێغەمبەرایەتی محەمەددا هیچ چەشنە گومانێکم نییە بەڵام دەکرێ لە کوڕەکانی خۆما گومانم هەبێ، چونکە هەڵدەگرێ لە دایکیانڕا خەیانەت سەری هەڵدابێ و نەمزانیبێ. چاو ئەو ڕاستییە (واتە پێغەمبەرایەتی محەمەد لە لایەن دڵڕەشانی ئەو بێباوەڕە جوولەکە و گاورانە) حاشار دەدرێ و دەیشارنەوە لە عالەم، ئەوەش دەکرێ بڵێین ئیشارەیە وەلای پێغەمبەر کە نەڕوانی وە لای کوتەی گاور و جوولەکەکان چونکە ڕاست و دروست ئەوەیە کە بە هۆی سرووش لە لای خوداوە بۆت هاتووە.

## بۆ هەر گەلێک ڕووگەیەک هەیە

با ئەو ئاگاداریەش بدرێ و گەل پێ بزانێ و باوەڕیشی پێ بکا: هەچی گەلە ڕووگەیەکی بووە کە لە کاتی نوێژدا ڕووی تێ کردووە. بۆ نموونە ئیبراهیم و ئیسماعیل ڕوویان کردۆتە کەعبە. بەرەو نەوەکانی بەنیئیسرائیل ڕوویان کردۆتە بەیتولموقەدەس و گاورەکان ڕوویان کردۆتە ڕۆژهەڵات. جا لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ بڵێین و بشکوترێ ڕووگە لە ئایینا شتێکی بنەڕەتی نییە کە نەگۆڕدرێ. کەوایە نارەوا ناژمێردرێ ئیسلامیش ڕووگەیەکی ببێ وەک خوداش ئاماژەی وەلا فەرمووە لە ئایەتی ١٤٨دا: ﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا﴾ واتە بۆ هەموو گەلێک لایەک هەیە کە لە کاتی خۆیدا ڕووی تێکات بۆ نوێژ. دیارە لێرەدا ئەو هەستە هەست پێ دەکرێ: ڕووگە زۆر شتێکی ئەساسی و گرینگ نەبێ، بەڵکە ئەوەی ئەساسییە و گرینگە و خاوەن ئەرزشە ئەوەیە: خوداناسی بە ئیخلاس، چاکە و چاکە چاندن بە پاکی.

دەو ئایەتە پیرۆزەدا بە هۆی هەڵسەنگاندن و زۆر بە دەورەدا هاتنی ئەو ئیشکالە خۆی لوور کردە زەین و خەیاڵمەوە نەمتوانی بە سەریەوە باز دەم و گوێ نەدەمێ. ئەویش ئەوەیە: لە سەر بەیانی پێزانینی ئەهلی کتێب کە محەمەدﷺ و ڕووگە حەقن، ئەو دوو کەلیمە بە کار گیراون: ١. يَعْرِفُونَهُ ٢. يَعْلَمُونَ. دە حاڵێکدا ئەو دوو کەلیمانە دە زاتی خۆیاندا هەر یەکەی تەعریفێکی تایبەتیان بۆ کراوە. جا دەبێ بۆ ڕەفعی ئەو ئیشکالە ڕووکەینە لای عیلمزانانی نەحو و عیلمی لوغەتشناسی، لەوانەوە فەرقی عیلم و مەعریفەت فێر بین و وەرگرین.

دیارە بە پێی لوغەت (معرفت) دە جوزئیاتدا بە کار دەگیردرێ، (علم) کە تایبەتیتر و خاستر لە مەعریفەتە، بۆ کوللیات بە کار دەبرێ.خۆ ئەوەش بێگومانە: هەچی کوللی بێ، جوزئیشی هەیە و هەچی جوزئیش بێ دەتوانێ بەرەو کوللی بچوێندرێ. کەوابێ دەتواندرێ بکوترێ جیاوازی نێوان عیلم و مەعریفەت پەردەیەکی نازکی حیکمەتە، واتە دەو ئایەتەدا خودای تەعالا ئاماژە وەلای ئەو پەردە نازکە حیکمەتە دەکا و دەفەرموێ: ئەهلی کتێب لە بارەی محەمەدﷺ و دین و دەعوەت و قورئان عیلمێکی جوزئییان هەیە و هەر وا زانستێکی کوللیشیان هەیە دە تەورات و دە ئینجیلدا کە باس لە محەمەد دەکەن بە تەواوی، و هەروا لە هێندێک شوێنی تەورات و ئینجیلدا موشەخەساتی جوزئی محەمەدﷺ باس دەکەن. جا لە سەر ئەو ئەساسە لە نێوان عیلم و مەعریفەت جیاوازییەکی وا نییە کە هۆی لێک هەڵاواردنیان بێ لێرە لەو ئایەتەدا. (تەفسیری کەبیر)

وا دەردەکەوێ لە سیمای ئایەتەکانی قیبلە گۆڕاندا، عالەمی ئەو سەردەمی لەمەڕ ئەو دەستووره بووبنە دوو دەستە، دەستەیەکیان کە موسوڵمان بوون و ئیتاعەی ئەو ئەمرەیان کرد و ڕوویان کردە ڕووگەی تازە کە کەعبەیە، و ئەهلی کتێبیش واتە جوولەکە و گاور و دیانەکان قبووڵی ئەو ئەمرەیان نەکرد و ئیتاعەیان نەکرد بۆ ڕوو کردن دە کەعبە. جا لە سەر ئەوئەساسە ئەو ئایەتی ١٤٧ و ١٤٨ هەم ڕەدی قسەی ئەوانە دەکەن کە حەقیان قووت داوە و شاردوویانەتەوە هەم بە موسوڵمانان غیرەت دەدا بۆ ڕووکردنیان دە کەعبە، هەم لۆمە و سەرزەنشی ئەهلی کتێب دەکەن. جا بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتەکانی ١٤٧ و ١٤٨ی بەقەرە:

﴿١٤٧﴾ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ

**ئەی پێغەمبەر! هیچ گومانێکت لەوەدا نەبێت ڕێگای ڕاست هەر ئەوەیە کە لە لایەن خوداوە بۆت هاتووە،**

(ئەو فەرمایشتەش وەک ئەوەی پێشوو، هەرچەندە ئاڕاستەی پێغەمبەر کراوە بەڵام مەبەست هەموو موسوڵمانێکە کە ئیمان لە ناو دڵیدا جێگر نەبووبێت بە تەواوی چونکە هیچ کاتێک پێغەمبەری خودا گومان بەرۆکی نەگرتووە. ئەوە وەک ئەوە وایە کە تۆ لە نێوان چەن کەسێکدا ئامۆژگاری کەسێکی دیاریکراو بکەیت بەڵام مەبەستت کەسەکانی دی بێ.

تیوتیوەیەک: ڕاست و دروست هەر ئەوەیە کە بە سرووش بۆت هاتووە لە لایەن خوداوە، نەک فڕ و فیشاڵی گاور و جوولەکە. کەوایە بێخەیاڵ بە و بێگومان، زۆر بە ئیمتینان و باوەڕەوە ڕوو بکە ڕووگەی خۆت.

﴿١٤٨﴾ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا فَاسْتَبِقُواْ الْخَيْرَاتِ أَيْنَ مَا تَكُونُواْ يَأْتِ بِكُمُ اللّهُ جَمِيعًا إِنَّ اللّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ

**بۆ هەر خاوەن ئایینێک جێگەیەکی تایبەتی خۆی هەیە بە نێوی ڕووگە ڕووی تێبکات. ئەی موسوڵمانینە! ئێوە ڕوو بکەنە قیبلەی خۆتان، و لە چاکە کردندا پێشبڕکێ بکەن. هەرکە مردیشن، لاشەتان لە هەر شوێنێ بێ، خودای مەزن کۆتان دەکاتەوە. ئەوەش وە نەبێ هێندە شتێکی قورس و گران بێ بۆ خودای بەتوانا، چونکە بێگومان خودا توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.**

**ئاوڕ وەسەردان و پێداچوونەوەیەک:** دەبێ ئەوە باوەڕ کەین کە بۆ هەموو گەلێک لایەک

هەیە کە لە کـاتی عیبادەتـا (نـوێژ) بە نـاوی ڕووگە ڕووی تێبکـات بەڵام ئەوەی ئەساسـییە و موهیممە زۆر: دەسپێشکەرییە دە کاری چاک و پەسند و پـاک لە ڕێـی خوداناسـیدا و ئیتـاعە لەو، چونکە سبەینێ لە هەر کـوێ بـی و هەرچـی بـی، دێـیەوە لای خـودا و دەخـڕێیەوە ژێـر دەستەڵاتی ئەو، و چوونە دەریش لە دنیادا نهێنییە و ڕوون نییە بۆ کەس و لە ناکـاو دێ، کەوایە بۆیە دەبێ پێشبڕکە لە چاک کردن و چاکەکاریدا لە بەر چاو بگیرێ.

**تێڕوانین** لە جوملەی ﴿فَاسْـتَبِقُواْ الْخَـيْرَاتِ﴾: ئەو هەسـتە بە تەواوی هەسـت دەکـرێ: ئەو ئینسانەی کە باوەڕیان بە هەستانەوە و حیسابی ڕۆژی قیامەت هەیە، دەبێ بە تەئکید و زەرووری بۆ پێشەبڕکە لە کاری خێردا ئامادە و تێکۆشەر بـێ لە دنیـادا، چـونکە هەر ئـان مەرگ و نەمـان تێتڕۆهات دەفتەر و بارەگات دەپێچرێتەوە، تازە هیچت لە دەس نایە.

گومانت نەبێ کە لەو جوملە ئایەتە زێڕینە و پیرۆزەیە ﴿فَاسْتَبِقُواْ الْخَيْرَاتِ﴾ گۆیـا حەزرەت وەسیەتی کردووە لە ئۆمەتی کە لە سێ شتدا پەلە بکەن لە ئەنجامدانیان:

١. نوێژ کاتێ کە کاتی هات.

٢. ناژتنی جەنازە کاتێ کە ئامادەی ناژتن بوو پاش شوشتن و نوێژ لە سەر کردن

٣. بێوەژن بە مێرد دان کاتێ کە هاوتای بابەتی دەس کەوت.

بە کـورتی و بە کـوردی: بـۆ تێشـووی ڕۆژی کەسبەکەسـی واتە نەفسینەفسـی، دەبـێ دەسپێشخەری و تاڵوکە بکرێ، نەبادا دە فریا نەکەوی. خێـر وەدوا خسـتنت پاشـی نەمانـت، هەرای دوای گورگە، کەپەنکی پاش بارانە، دەرمانی پاش نەمانە.

ئینسانی بەهەست و خاوەن باوەڕ ئەوە قبووڵ دەکا و دەیسەلمێنێ کە پێویسـتە بـۆ نەتەوە و هۆز و قەبیلە شـوێنی دیـاریکراو هەبـێ کە لە کـاتی تەماسـی دەگەڵ خـودا دڵ و هەسـت و شعووری تێکا لەو جێیەڕا دەخوا، چونکە بێ شوێن و بێ ڕووگەی دیاریکراو دڵ بـڵاو دەبـێ. دیارە دڵی بڵاو هەستی بڵاو دەگەڵ خۆ دێنێ و ناتوانێ بە هەست و دڵ و شـعووری کـۆزیلکە ببەستێ لە دەوری خودا و نیازی خۆی لێ داوا کا. بۆ ڕاستی ئەو قسەیە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٤٩ی بەقەرە:

**﴿١٤٩﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِنَّهُ لَلْحَـقُّ مِـن رَّبِّـكَ وَمَـا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ**

**ئەی پێغەمبەر! کە دەرچووی بۆ هەر لایەک، لەوێ ڕوو بکە بۆ کەعـبە (مسـجد الحـرام) ڕوو**

**کـردنە کەعـبە ڕووکردنێکـی تەواو و ڕاسـتە. (ئەوجـار خـودای تەعـالا بە شـێوەی هەڕەشـە دەفەرموێت): ئەوانەی گۆڕینی قیبلەیان کـردۆتە هـۆی ئاشـووبنانەوە و گومـان خسـتنە دڵـی خەڵکەوە، وە نەبێت خودای بیسەر و بینەر ئاگاداری کردەوەکانیان نەبێ.**

**وەردانەوەیەک:** ئەی پێغەمبەر! بۆ خۆت و وەشوێن کەوتووانت کاتێ چوونە ئێـرە و ئەوێ و لە سەفەردا بوون، بۆ نوێژ و عیبادەت ڕووتان بکەنە لای مسجد الحرام، ئەو ڕووکردنەتان بـۆ لای مسجد الحرام واتە کەعبە ڕاستە و لە لای خوداوە بۆتان سـرووش کـراوە. خـودای زانـا و دانا و بیسەر و بینەر، بێ ئاگا نییە لە کردەوەی هیچ گیانلەبەرێک، یانی ئەی موسـوڵمانان! هەر ئیتاعەیەکی بیکەن لە پێغەمبەر، لەمەڕ ئەو شتانەی کە لە خوداوە دەستوورتان پـێ دراوە، خـودا ئاگای لێیە.

هەست و شعوور و ئەقڵ بە تەئکید هەست دەکەن کە ئەو باسە واتە: باسی گۆڕینی ڕووگە زۆر باسێکی جەنجاڵییە، هەر بۆیە خودای تەعالا دەسبەرداری نابێ تاکوو بە تەواوی گەلی لێ تێنەگەیێنێ وسێ جاری باس دەکا و شی دەکاتەوە. بـۆ ئەو ڕاسـتییە دەچیـنە خـزمەت ئـایەتی ١٥٠ی بەقەرە کە هەر لە سەر ئەو بابەتە خۆ دەنوێنێ:

**﴿١٥٠﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنْتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلاَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْهُمْ فَلاَ تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِي وَلأُتِمَّ نِعْمَتِي عَلَيْكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ**

**ئەی پێغەمبەر! کە چووی بۆ هەر شوێنێک لەو شوێنەوە لە کـاتی نـوێژدا ڕوو بـکە دە کەعـبە، هەر ئێـوەش ئەی موسـوڵمانان! لە نوێژەکانتانـدا ڕوو بـکەنە یەک شـوێن (کەعـبە) ئەو جێگـا پیرۆزە تا وەکوو قسە و ڕەخنەی جوولەکەکان و بتپەرستەکان بەرپەرچ دەنەوە و ببڕن. ئەوانە هەندێکیان نەبێ ئەوانی دی ستەمکار و کینەلەدڵن، ئێوە لەوان مەترسن بەڵکە تەنیا و تەنیا لە من بترسن، وە لە بەجێهێنـانی فەرمـان و بڕیارەکانمـدا سسـتی و کەمتەرخەمـی مەگـرنە بەر. تاوەکوو بەخششەکانی خۆمتان بە تەواوەتی بە سـەرتاندا بڕێـژم و ڕێگـای ڕاسـتتان بـۆ ڕوون بکەمەوە. تاکوو بە پوخت و پاراوی پیادەی بکەن و لە سەری بڕۆن.**

لە دوو ئایەتی پێشوودا خودا سێ جار دەفەرموێ ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ مەبەست لە جاری یەکەم فەرماندانە بۆ ڕوو تێکردنی ئەو قیبلەیەی کە پێغەمبەر خۆی حەزی لێ کردووە؛ لە جاری دووهەمدا مەبەست ئەو قیبلەیە کە حەققە و شایانی ڕوو تێکردنە و مەبەسـت

لە جاری سێهەم پەرچدانەوەی ڕەخنە و توانجی جوولەکەکان و بتپەرستەکانە، کە ئاوایان دەکوت: ئایینی ئێمە ڕاستە، مەگەر نابینن موسوڵمانەکان ڕوو دەکەنە قیبلەکەی ئێمە، و هەروا ئەوەشیان دەکوت: ئەگەر پێغەمبەرایەتی محەمەدﷺ ڕاست بوایە ئەوە ڕووی دەکردە قیبلەکەی ئیبراهیمی باپیرەگەورەی خۆی.

**دووبارە ئاوڕ وەسەردانەوەیەک**: بۆ هەر کوێیەک چوویتە سەفەر بۆ دەرەوە، ڕوو بکە بۆ لای مسجد الحرام، موسوڵمانان ئێوەش هەروا لە هەر لایەک بوون ڕووتان وەرگێڕن بۆ لای ئەو مسجدالحرامە لە بەر سێ شت:

١. تاکوو قسەی خاوەن نامەکانتان نەیەتە سەر کە بڵێن: ئەگەر ئەو موسوڵمانانە خاوەنی ئایینێکی تایبەتین، ئەدی بۆچی ڕووگەیەکی تایبەتیشتان نییە؟ بەڵام بە بوونی کەعبە بە ڕووگە سەراپای قسەکانیان چۆوە پاش. واتە جوولەکە و بتپەرستەکان نەبێ کەس قسەی نەما، ئەو دووانەش (جوولەکە و بتپەرست) دەیانکوت محەمەد کە ڕووگەی خۆی کردە کەعبە، بۆ خاتری گەلەکە و شارەکەی خۆی بوو، چونکە ئەگەر ئایینەکەی ڕاست بایە، دەبا لە سەر ڕووگەی پێغەمبەرانی پێشوو ماباوە. و هەروا دووبارە دەیانکوت هێندێکیان محەمەد هاتۆتە سەر ڕووگەی ئێمە کە کەعبەیە و لەمەولا بەرەو ئایینەکەمان دەگەڕێتەوە. بە کوردی هەموو ئەو بێ باوەڕ و لابەلایانە نەنگی خۆیان خستە ڕوو.

٢. دەبێ لە خودا بترسین، تاکوو ڕەحمەت و بەهرەی کەرەمی خودامان بە نەسیب بێ و کەعبەمان بۆ بکرێتە ڕووگە. لە بەرجەوەندی و هەڵسەنگاندنی ئەو ئایەتە ئەوە هەست دەکرێ کە خودا لە پێشەوە کە کەعبەی نەکرد بە ڕووگە بۆ موسوڵمانان، چونکە کەعبە پڕ بوو لە بت و بتپەرست، و لەو کاتەشا بۆ گرتن و ئیدارە کردنی شاری مەککە هیچ هیوا و دەستەڵاتێکی کافی نەبوو و چاو نەدەکرا، تاکوو بتواندرێ مەککە لە بتپەرستان خاوێن و پاک بکرایەوە. بەڵام پاش ئەوەی موسوڵمانەکان بە هۆی یاریدەدانیان لە لایەن ئەهلی مەدینەوە دامەزران و هێزیان گرت، هەروەک لە غەزای بەدر سەرکەوتنیان بە دەست هێنا، ئەوجار شایانی پارازتنی کەعبەیان بە نەسیب کرا، کەعبەشیان بۆ کرا بە ڕووگە، لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا، هێرشێکی مرۆیانان کردە سەر شاری مەککە و گرتیان و ٣٦٠ بتیان لە ناو کەعبە و لە دەوروبەری کەعبەدا هێنا دەر و نابوودیان کردن، بە یەکجاری کرایە قیبلەی موسوڵمانان.

٣. بەو هیوایە کە بە تەواوی بە هۆی ئەو ڕووگەیە خۆ بگەیێنە پلەی بەرزی خوداناسی.

دەگێڕنەوە کە گۆیـا لە حەدیسـدا هـاتووە کە پێغەمـبەر لە یەکێـک لە یـارانی دەبیسـێ ئەو دوعـایە: (اللّهُـمَّ إنِّـی أسـئَلُکَ تمَـامَ النعمـةِ) واتە خـودایە لە تـۆم تەواوی نـیعمەت دەوێ. پێغەمبەریش لێی دەپرسێ ئایا تۆ دەزانی تەواوی نیعمەت چییە؟ وا داوای دەکەی لە خـودا. ئەو کەسەش لە وڵامدا دەڵێ نەخێر، نازانم؛ بەڵام دوعا بەو دەکەم و بەهـرەی خێریشـم لـێ دەوێ. پێغەمبەریش دەفەرموێ بۆوەی ئەو کەسە هیوا و بەردەوامی لە سـەر ئەو دوعـا و پـاڕانەوە بـێ: تەواوی نیعمەت ئەو کاتە دەبێ کە چوویە ناو ماڵی بەهەشت کە لە هەموو شت لە خۆ دەبـیەوە و دەکەویە ئەمن و ئەمانی و خۆشی بێ بڕانەوە.

هەروا دووبارە لە سیمای جوملەی ﴿وَلأُتِـمَّ نِعْمَـتِي عَلَـيْكُمْ﴾ دەگەڵ ئـایەتی ٣ی مائیـدە ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي﴾ دە زەماندا دژایەتی دێتە ڕوو، مەسـەلەن ئەو ئایەتی ١٥٠ی بەقەرە ئیشـارە وەلای بە قیـبلە کردنـی کەعـبەیە کە لە سـاڵەکانی دووهەمـی کۆچییە، بەو پێیە خودا لە ساڵی دووهەمی هیجری کە ساڵی گۆڕینی ڕووگەیە، نیعمەتی خـۆی لە سەر موسوڵمان تەواو کـرد.وە بەڵام دە ئـایەتی ٣ی سـوورەی مائیـدە کە ڕۆژی عـارەفەیە دە سەفەری حجةالوداعدا بوو، کە دەبێتە ساڵی دەهەمی کۆچی ئەو ئایەتە نازڵ بووە، لە سـەر ئەو ئەساسە دەبێ نیعمەتی خودا دەو ڕۆژ و مانگ و ساڵەدا تەواو بووبێ.

بۆ خـۆ ڕزگـارکردن لەو دوو نەزەردانە کە دژ بە یەکـن، چـۆن ڕادەبـوێری و دەڵێـی چـی؟ هەروەک لە هەموو ڕاستاندا لە کاتی چەنگ و چەڵەمەی مەسائیلی قورئانی، شـەرعی، عیلمـی دەبێ پەنا ببرێتە بەر کارناسان و پسـپۆڕ و زانایـانی تـایبەت، لێرەشـدا هەروا دەبـێ ڕوو بکەیـنە خزمەت قورئانزانەکان.

زانایان لەو بارەوە دوو جۆرە بۆچوونیان داوە:

١. دە ئـایەتی ١٥٠ی بەقەرەدا خـودا وەعـدەی تەواو کردنـی نیعمەتەکـانی داوە چـونکە فەرمووی: (وَلأُتِمَّ) واتە تا تەواوی کەم، نەیفەرموو (أَتْمَمْتُ) واتە تەواوم کرد.

٢. نیعمەتەکانی خودا بۆ ئۆمەتی موسوڵمانان بە شێوەی جۆراوجۆر دێنە ڕوو، کە دیـارە لە تەواوی ئەو نیعمەتانەی کە جۆراوجۆر دێنە ڕوو، بەرزتر و بەرچاوترین (قورئان، ئیسلام، قیـبلە) ئەو سێ نیعمەتانە پلەپلەی تەواو بوونیان هەیە، کاتێ هەر سـێ بە پـلەی تەواو گەیشـتن خـودا ئیعلانی تەواویان دەکات.

جا بەو پێیە دەبێ بکوترێ گۆڕانی قیبلە لە (مسجد الاقصی)وە بـۆ (مسـجد الحـرام) ئەوە

نیعمەتی قیبلە لە سەر ئۆمەتی موسوڵمان تەواو بوو، خـودای تەعـالاش بە فەرمـوودەی خـۆی ﴿وَلأُتِمَّ نِعْمَتِي عَلَيْكُمْ﴾ ئاگاداری ئیتمامی نیعمەتی وەک قیبلە بێ، دا بە موسوڵمانان.

نیعمەتی قورئان و ئیسلامیش لە ئاخری دەورانی پێغەمبەرایەتی کە بە ئیتمام دەگا خـودا بە وەسیلەی ئایەتی ٣ی مائیدە ڕایدەگەیێنێ، وەک ڕایگەیاندووە.

دیارە خودای تەعالا لە دابەخشینی ئەنعامی بە سەر موسوڵماناندا ئاگـاداری موسـوڵمانان دەکا و پێیان دەڵێ: ئەی موسوڵمانان شوکری ئەو نیعمەتـانە بـکەن جـا لە سـەر ئەو ئەساسـەیە ئایەتی ١٥١ی بەقەرەی ناردە خـوارێ تـاکوو ڕایگەیێنـێ بە موسـوڵمانان کە ئەو میهرەبانییەشـم دەگەڵ کردن:

﴿١٥١﴾ **كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِّنكُمْ يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ**

**پێغەمبەرێکم بۆ نـاردوون لە خۆتـان تـاوەکوو ئایـاتی منتـان بە سـەردا بخـوێنێتەوە و ڕێگـای ڕاستی ژیانتان پێشان بـدات و لە ڕەوشـتی خـراپ خاوێنتـان بکـاتەوە وفێـری مەبەسـتەکانی قورئان و تێگەیشتنتان بکـات. هەروەهـا ئەو شتانەشـتان فێـر بکـات کە خۆتـان نەتانـدەزانی، وەکوو پیشانـدانی ڕێگای ڕاست بۆ هەردوو وەرزی ژیان: دنیا و ئاخیرەت.**

**تێڕوانین و ئاوڕ وەسەر دانەوەیەک:** بۆوەی ئایەتەکانی ئێمەتان پێ ڕاگەیێـنن و بە سـەرتاندا وەخوێنن، پێغەمبەرێکمان لە نـاو خۆتانـدا بـۆ هەڵخسـتن ناردمـانە لاتـان. و هەروا لە هەمـوو ڕەوشت و ئاکارە ناڕەواکانتان وەگێڕێ و پاکوخاوێنتان کاتەوە، وەک زیندە بە گۆڕ کردنی کچ و منداڵ کوشتن لە ترسی ژیـان و بەخێـو کردنیـان. و هەروا دەسدرێـژی و کوشـتنی خەڵـک بە ناحەق بە هۆی شتی هیچ و پووچ و بێئەساس. و هەروا تـاڵان و بـڕۆ و ژن فڕانـدن و سـوود خواردن و گەلی شتی دی لەو شتانەی کە ئینسان شەرمەزار دەکات و بێئابڕوو و بێکەرامەت. بەڵام بە هۆی قورئان و پێغەمبەر تێگەیشتن لە ڕێگای ڕاست و خوار و حەق و ناحەق بەو هۆیە خۆتان لە پەستی و ڕەزیلە و بێئابڕوویی ڕزگار کرد و خۆتان گەیاندە پلەی بەرزی بەشەرییەت و دنیایەکی ئابڕوومەندانەتان هێنایە کایە و خستانە ڕوو و چرای ئیسلامتان هەڵکرد.

ئەگەر چرای ئینسافی ڕادێرێنێ، بە ڕوونی چاو دەکەین کاتێ پێغەمبەر هـات و هەڵـکەوت لە ناو گەلا، تا ڕادەیەک زانین و زانیاری لە عەڕەبستانا سەری هەڵدا و خۆی خزاندە ناو عالەم و جێگیر بوو لە ناو هەستی دەروونداء خێڵی جەهل و پەستی و زۆردای باری تێکنا و ڕۆیـی، و

هەروا پێغەمبەر بۆ بەرفراوان کردنەوەی دایـرەی زانسـت و هەسـت و شـعوور مزگەوتـی وەک فێرگەیەکی بەرزی بە واقیعی دەناو عالەمدا خستە ڕێ و کردی بە باو کە دەبێ مـزگەوت بـبن و قورئان و دەرسی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی تێدا دانرێ ۆ لە هەموو کـاتی تایبەتیـدا دەرسـی تێـدا بکوترێ، تاکوو هڵەکەوتوو و بلیمەتی تێدا پەیدا بن، بۆ پاسەوانی لە کەرامەتی ئینسانی.

دەتواندرێ بێ ترس و شکوا بکوترێ: دەو ئایەتە پیرۆزەدا (١٥١) ئەسەری دوعای ئیبراهـیم پێغەمبەر پاش داڕژتنی ماڵی کەعبە هاتە ڕوو کە فەرمووی: ﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُـو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ﴾ واتە ئیبراهیم فەرمووی **خودایا بۆ ئەو نەوانەمان (عەرەبەکان) پێغەمبەرێکیان لێ هەڵخە لە خۆیان تاوەکوو بڕیـار و فەرمانەکـانی تۆیان پێ ڕاگەیێنێت و ڕێگای ئیماندارییان پێ ئاشنا کات و پێیان بناسێنێت وفێری قورئان و فەرمانەکـانی ئاین و تێگەیشتن لە مەبەست و مانای ئەو فەرمانانەیان بکات و فێری حیکمەت و دانانیان بکـات و دڵ و دەروونیان لە شتان و وەهمی نارەوا خاوێن بکاتەوە. بەڕاستی هەر تۆ خاوەن توانا و دەسـتەڵاتی و هەمـو و بڕیار و کردەوەیەکت مەبەستی تێدایە.**

ئەگەر بە وردی سـەرنج بـدرێتە نـاو دەروونـی ئـایەتی ١٥٠ی بەقەرە، هەمـان مەبەسـت و مەتڵەبی ئایەتی ١٢٩ی بەقەرە کە دوعای نزای حەزرەتی ئیبراهیمە چـاو دەکـرێ و هەسـت پـێ دەکرێ بە ڕوونی. خۆ دیاریشە و حاشا هەڵناگرێ بە پێی یاسـا و قـانوون وایە کە دەبـێ وڵام و ئەسەری دوعا وەک یەک بن. واتە ئەسەری داوا وەک داوا بێ، نابێ لە مەسیری ئەو لابـدا. لەو دوو ئایەتانەدا کە دوعا و ئەسەری دوعان، بە پێچەوانەی ئەو یاسایە کە کوتمـان دەبـێ دوعـا و ئەسەری دوعا وەک یەک بن، چونکە لە دوعای ئیبراهیم خەلیل کە دەبێتە ئایەتی ١٢٩ی بەقەرە، (تعلیم الکتاب و الحکمة) وەپێش (تزکیة) خراوە. بەڵام دە ئەسەری دوعای ئیبراهـیم کە دەبێـتە ئایەتی ١٥٠ی بەقەرە، (تزکیة) وەپێش (تعلیم) خراوە. ئەوەیە بە ڕواڵەت لە نیزامی یاسای دوعا و ئەسەری دوعا لادراوە. دەبێ ڕازێکی دەبندا بێ، ئەو ڕازەش پێویستە بزاندرێ.

خۆ ئەوەش دیارە و ئینکـاری نـاکرێ کە دەبـێ بـۆ ئیشـکالی زانینـی قورئـان ڕوو بکـرێتە قورئانزانان و شارەزایان، ئەوانیش لەو بارەوە ئاوایان فەرمووە:

وڵام: لە نێـوان دوعـا و قبـووڵی دوعـا واتە بەجێهـاتنی ئەسـڵی داوا و ئەسـڵی مەتـڵەب موافقەت پێویستە و ئەساسییە، بەڵام موافەقەت و موتابەقەت دە تەرتیبی ئەلفاز و زیکر و دوعـا لازم نییە.

حەزرەتی ئیبراهیم لە خودای داوا کرد کە لە ناو بەرە و تۆرەمەی ئەودا پێغەمبەرێک هەڵخـا

و بنێرێ کە ئەو پێغەمبەرە بەرەی ئیبراهیم فێری کتێب و حیکمەت کا و دڵیشیان لە چڵکی فەساد پاک وەکا، دە دیارە خودا ئەو داوایەی ئیبراهیمی قبووڵ کرد و پێغەمبەر محەمەدﷺی ڕەوانە کرد ئیدی پێویست ناکا ئەو داوایە دەگەڵ داواکراوەکە دە تەرتیبی ڕستە و جوملە و ئەلفاز و کەلیماتدا وەک یەک بن و هەروا لە پێش و پاشیشدا. بۆ زێدەزانین بڕوانن لە تەفسیری تبیین الفرقان، ج٣، ل ٤٧٢.

هەروەک لە نێوان بەرەی ئینسانیشدا باوە و باو و دابێکی ئەساسییە، کەسێک چاکە و ئەنعام بە ڕەوای کەسێک بزانێ و بیداتێ و ڕایدێرێتێ، دەبێ کەسی چاکە دەگەڵ کراو و نیعمەت پێبەخشراو شوکر و سپاس و بیرەوەری ئەو کەسەی هەرگیز لە بیر نەباتەوە و بیکا. بەو پێیە ئەساسە دێرەدا خودای تەعالا لە موقابیل ئەو هەموو نیعمەتەی بەخشی بە ئینسان، چاوەڕوانی بوونی لەو ئینسانی چاکە دەگەڵ کراوە ئی شوکر و سپاسی نیعمەت و یادی خودا حەقە و ڕەوایە و بەجێیە، سەرەڕای ئەو هەموو نیعمەتە. ئەگەر شوکری نەکرێ، بێ ئەمەکی و سپڵەیی و خەیانەتێکی زۆر گەورە دەخرێتە ئەستۆی چاکە دەگەڵ کراو. بۆ ڕاستی ئەو مەبەستە دەچینە خزمەت ئایەتی (١٥٢):

﴿١٥٢﴾ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُواْ لِي وَلاَ تَكْفُرُونِ

**ئینجا کە وابێت با هەمیشە یادی منتان لە سەر دڵ و زمان بێت و لە هەموو کردەوەیەکتاندا هەر مەبەستتان ڕەزامەندی من بێت. ئەوکاتە منیش لە نیعمەتەکانی خۆم ئێوە لە بیر ناکەم و بێبەشتان ناکەم. هەروا سپاس و شوکرانەبژێری نیعمەتەکانم بن و مەیشارنەوە و حاشاری مەدەن و پێی کافر مەبن.**

**تێڕوانین و ئاوڕ وەسەر دانەوەیەک:** ئێوە بە فەرمانی من بکەن واتە فەرمانبەری من بن، تا ئەمنیش چاکەدەر و بەخشش‌کەری وە بم. و هەروا سپاسی چاکەکانم بکەن و ناسپاسی نەکەن. سپاس کردن هەر ئەوە نییە بە زمان بێ، بەڵکوو دەبێ بە گوفتار و بە کردار بێ.

ئەو ئایەتە لەو سیما و ناوەرۆکەیدا هەڕەشەی توندی لێوە دەردەکەوێ و چاو دەکرێ لە موسوڵمانان، تاوەکوو ئاگاداری خۆیان بکەن لەو هەڵە و تاوانانەی کە لە گەلانی ڕابردوودا ڕووی دەدا و دەهاتە جێ، نەبادا خودا ڕووی ڕەحمەتیان لێ وەرگێڕێ و ئەو چاکە و بەخششانەی ڕەوای داشتوون و پێی بەخشیون لێیان وەرگرێتەوە.

بەڵێ ئەگەر نەختێک بەرجەوەندی ڕەوشتی ئینسانی بین، بە باشی دەرکی ئەوەی دەکەین لە

ئینسان پاش ئەوەی کە چاکەی دەگەڵ کرا و نیعمەتی زۆر بە خۆوە دی، هەڵـداوێ و جیفڕکـی ناشکوری لە خۆ دەدا، ئێستاش کە تەماشا دەکەین ئەو موسوڵمانانە بۆ ماوەیەکی کەم فەرمـان و فەرموودەکانی قورئانیان بەجێ هێنا وەک شوکرانەی نیعمەت تا گەیشتن بە چڵەپـۆپەی ژیـان و بەختەوەری لە هەر لایەکەوە. پاشان لە سـەر ئەساسـی ناحاڵیـان بەرە بەرە ئەو نیعمەتەیـان دایە پشت گوێ و وەلایان نا، تا وایـان لـێ هـات کە لێیـان هـات و کەوتـنە بـن ڕکێفـی شـەیتان و هەڕەشەی خودا.

و هەروا دەبێ دێرەدا بە وردی سـەیری بەزە و عەداڵەت و ئینسـافی خـودا بکـرێ کە پـاش ئەوەی ئینسان سەرەڕای ئەو هەموو عەتا و بەخشش و میهرەبانیەی خودا خۆی حەوا دەداتە ناو دەریای بێ کەرامەت و مرۆیەتی و ناشـکوری و لاسـاری، بـاز خـودا مـوژدەی دەداتـێ ئەگەر بگەڕێـتەوە سـەر شـەقامی حەق واتە (پێغەمـبەر و قورئـان)، ئەوە خـوداش دەگەڕێـتەوە سـەر بەخشش و میهرەبانیەکەی جارانی. و ئەگەر هەر نەشگەڕێتەوە و بەردەوام بێ لە سەر سەرەڕۆیی و لاساری، ئەوکات تاوانبارانە دەمێنێتەوە تا دەمرێ، جا پەنا بە خودا.

**تیوتیوەیەک**: ئەگەر لە جەریانی گۆڕینی ڕووگە ورد بینەوە و ئینسافیش وەگەڕ خەیـن، بەو ئاکامە و بەرهەمە دەگەین کە ئەو گۆڕینە بەردی بنچینەی سەربەخۆیی ئایینی ئیسـلامە، چـونکە لەو گۆڕانەیە تەعبیر ئاوا دەکرێ: ئەی موسوڵمانینە! لە ئەورۆ بەولاوە لە سەرتان ئەرکە قیبلەتـان و چاوەی دڵتان خاوێن کەنەوە و خاوێن ڕاگـرن لە بـت و بتپەرسـتی کە ئەو هەڵوێسـتەتان بە مانای پاک کردنەوەی هەموو وڵاتی عەرەبستانە.

جـا خـۆ ئەوەش بـێ شـک و گومـانە: لابردنـی بـت و تێکشـکاندنی ئیـرادە و هێـزی بتپەرسـتان و گرتنـی وڵاتـی عەڕەبسـتان، بەبـێ خـوێن دان و دەربەدەری و چەرمەسـەری و لەخۆبوردن نایەتە جێ. جا دیارە ئەو سەردانان و خۆبەخشینەش بەهێزێکی نهێنی و ئیرادەیەکی تەواو بتوون و باوەڕێکی تایبەت و خالیسـانە نەبـێ نـابێ. جـا لەبەر ئەو سـەختییە کە خـودای تەعالا بەو چەن ئایەتە پیرۆزانەی دێن لەوە بە دوا، دڵخۆشـی دانەوە و مـوژدە دەدا بە لەشـکری ئیسـلام. بـۆ ئەو مەبەسـتە دەچیـنە خـزمەت ئایەتەکـانی ١٥٣، ١٥٤، ١٥٥، ١٥٦، ١٥٧ و ١٥٨ی بەقەرە، دەگەڵمان بن و تاڵووکە مەکەن تاکوو بە نەزم و تەرتیـب باسـیان دەکەیـن و ڕایانـدەنێین ئینشائەڵڵا.

﴿١٥٣﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ

ئەی ئەوانەی باوەڕتـان هێنـاوە، هەر کاروبـارێکی سـەخت و گـران ڕووی تێکـردن، یـا خۆتـان دەستان دایە کارێکی قورس و پـڕ لە زەحـمەت، ئەوە لە ڕاسـت ئەنجـامدانی ئەوانە خـۆڕاگری کەن و پاڵ وە سەبر دەن و پشت بە ئەنجام دانی بەهرەی نوێژەکانتان ببەسـتن. بێ گومـان خـودا دەگەڵ ئەوانەیە کە لە کـاتی سـەختی و تەنگـانەدا خـۆڕاگری دەکەن و دەڕوانـن لە هیمـدادی خودا.

﴿١٥٤﴾ وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ يُقْتَلُ فِي سَبيلِ اللّه أَمْوَاتٌ بَلْ أَحْيَاء وَلَكِن لاَّ تَشْعُرُونَ

بەو کەسـانەی کە لە ڕێگـای خـودادا دەکـوژرێن مەڵـێن ئەوانە مـردوون. ئەوانە زینـدوون (زیندوویەکی بەتایبەتی بۆ وانە هەیە) بەڵام ئێوە هەست بەو زیندووبوونە ناکەن.

﴿١٥٥﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوفْ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الأَمَوَالِ وَالأنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ

دوچار و گرفتاری هێندێک حاڵەتی ناخۆشیشتان دەکەم (بە ناوی تاقی کردنەوەتـان) وەک کەم بـوونەوەی خـواردن و خـۆراک و سـەروەت و سـامان، و لە دەسدانـی چەنـد کەسـێکی خۆشەویستتان، (لە بەرابەریدا) ئێوە دەبێ خۆ وەخۆ گرن و ئارام بـن. ئەی پێغەمـبەر مـوژدەی پاداشـتی گەورە و سـەرکەوتن بـدە بەو کەسـانەی کە لە بەرابەر سـەختی و زەحمەتـی بەڵا و نارەحەتیدا خۆڕاگری و سەبر لە خۆ دەگرن.

﴿١٥٦﴾ الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُواْ إِنَّا لِلّه وَإِنَّـا إِلَيْهِ رَاجِعونَ

ئەو کەسـە ئـارامگرانە ئەوانەن کە ئەگەر تووشـی بەڵایەک هـاتن دەڵـێن: بەڕاسـتی هەمـوو کارێک لە خوداوەیە و بوونیشمان هەر لەوڕایە و گەڕانەوەشمان هەر بۆ لای ئەوە.

﴿١٥٧﴾ أُولَـئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَـئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ

ڕەزامەندی و ڕەحمەتی خودا هەر بۆ ئەوانەیە، بەڕاستی ئەوانە ڕێگای ڕاستیان دۆزیـوەتەوە و گرتوویانەتە بەر و هیدایەت دراون.

﴿١٥٨﴾ إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّه فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّـوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللّه شَاكِرٌ عَلِيمٌ

ئەو کەسەی دەچێ بۆ حەج یا بۆ عەمرە، دەبێ حەوت کەڕەت لە نێوانی سەفا و مەروەدا بێت و بچێت.

لە سەردەمی نەفامیدا هەر یەک لە سەفا و مەروە، یەکی بتێکیان لە سەر بوو، بتپەرستەکان ئەو بتانەیان دەپەرست و هەر دەگەیشتنە لایان بۆ پیرۆزی دەستیان بە سەردا دێنـان، بـۆیە پـاش هاتنی ئیسلام هەرچەنـدە بتەکـان شـکێنران بەڵام موسـوڵمانان تەواوف کردنیـان لە نێـوان ئەو شوێنەدا هەر بە گوناه دەزانی. لەو ئایەتەدا خودا دەفەرموێت:

**سەفا و مەروە لە نیشانەکانی خودان و تەواف کردن لە نێوانیاندا وەکوو ئێوە وا دەزانن وا نییە و گوناه نییە. هەر کەسێک پـاش بەجێ‌هێنـانی حەج، عەمـرەی فەرز، ئەگەر بـۆ زیـادە سـوود وەرگرتن جارێک یا خۆ زیاتر حەج و عەمرە بکاتەوە، ئەوە خودا ئاگادارە و پاداشیشی دەداتەوە.**

## سەفا و مەروە

سەفا و مەروە دوو تابڵۆن واتە دوو تەپـۆڵکەن لە نزیکـی کەعـبەوە، دووری نێوانیـان ٨٠٠ هەنگاوێک دەبێ. (شعائر) جەمعی (شعیر)ە، واتە نیشانە. بەو شوێنانە دەکوترێـت کە لە کـاتی حەجدا ڕوویان تێ دەکرێت وەکوو سەفا و مەروە و مـوزدەلیفە. عەمـرە واتە زیـارەت و عەمـرە زیارەتێکی تایبەتییە وەکوو حەج (تطوع) بەجێ هێنانی کارێکە بەبێ زۆری لێکـردن و ناچـاری، بەڵکوو ئەوەی دەیکا لە سەر ویستی خـۆی ئەنجـامی داوە نە لە سـەر ئەمـری فەرز و واجـب. (جناح) واتە گوناح.

**ئاوڕوەسەردانەوەیەک:** ئەی ئەو کەسانەی کە بە خودا و قورئان و ڕەسوول ئیمانـو هێنـاوە، لەسـەر ئەساسـی ئەو ئـیمان و بـاوەڕیە داوای نیـاز بـکەن لە خـودا، و لە سـەر سـەختی و ناڕەحەتیانێک کە بەرەنگارو دەبن، بەسەبر و خـۆڕاگر بـن و تێکـی بشـکێنن، چـونکە لە کـاتی تووش‌بوون بە دەرد و بەڵا، گەورەترین سەنگەر کە بتـوانێ دژی بوەسـتێ، سـەنگەری سـەبر و پاڵدان بە نوێژە.

چونکە ئەوە ئاشکرایە و حاشا هەڵنەگرە حەیـاتی بەشـەر دە کـاتی هێرشـی بەڵا و تۆفـانی سەختی ئەگەر پاڵ بە هێزی ئیمان بە خودا نەدا، تێک شکاوە و بە دەم سێڵاوی تۆفانەوە دەڕوا.

نرخی نوێژ بۆ نوێژخوێن لێرەدا دەردەکەوێ کە پەیوەنـدی بەنـدەی لاواز و زەبـوون دەگەڵ خـودای بەهێـز و دەسـتەڵات دە سـەنگەری سـەختی و میحنەتـدا بەرابەر بە هێرشـی جەور و جەفادا، ئەوە بێ گومانە بە هۆی ئەو پەیوەندییە هێزی خـودا هەچـی هێـزی بەڵایە، تارومـاری دەکا.

و هەروا نوێژ ئەو نوێژەیە کە ڕۆژی پێنج کەڕەت بیر و باوەڕی دمە زەرد دەکاتەوە، خـودات

وەبیر دەخاتەوە. ئەوە نوێژ نییە هەر ڕوو دە ڕووگە کەی و نەزانی دەگەڵ کێ دەدوێـی و نەزانـی دەڵێی چی؟ بێ شک خودا ئاگای لە دڵانە و دەگەڵ ئەو دڵانەشە کە دەگەڵ خودان.

پێغەمبەر و موسوڵمانەکان لەو کاتەدا کە لە شـاری مەدیـنە هەر ئـان چـاوەڕوانی هێرشـی بێئامانی دوژمنانیان دەکرد لە هەموو لایەکەوە، پێغەمبەر بۆ قـایموقۆڵی هێـزی یـارانی و پـتەو بوونی هەستەی دەروونیان ئەوەی دەفەرموو: ئەوانەی دەو هەرایەدا دەکـوژرێن دە ڕێـی خـوداد دەڕۆن پێیان ناکوترێ و پێیان نەڵێن: مردوو. چونکە ئەوانە زینـدوون بەو هـۆیە کە ئەوەی ئەوان خۆیان بۆ بە کوشت داوە نەمرە، وەک خودا و ئاییني خودا بێ کەوایە ئەوانیش نەمرن. بەڵام ئەو نەمردن و زیندووبوونە هەر خودا دەزانێ چۆنە، ئێمەی ئینسان نایزانین و هەستی پێ ناکەین.

## یاسای خوداناسی

دیارە دە یاسای خوداناسیدا بەتایبەتی و هەروا دە هەموو یاسایەکدا بە گشتی، بەبـێ تـاقی کردنەوە هیچ قەول و قەرار و پەیمانێک و ئیدیعایەک نـاچێتە ڕێـزی بـاوەڕ پێکـردن. جـا بـۆیە خودای مەزن موسوڵمان تاقی دەکاتەوە بە شتانێک کە دەرد و ڕەنج و ئـازارن بـۆ گیـان و لەش وەک ترس، برسیایەتی، نەمانی سامان و ئەولاد و بەرهەمی دەسڕەنج. لە کـاتی شـەڕ و هەرا و بەزمی دوژمن ئەنجا ئەوانەی خـۆڕاگرن لەو هەرایـانەدا کـۆڵ نەدەن یـاری ڕاسـتن و باوەڕیـان شاهیدە لە سەر ڕاستییان و خاوەن پلەی بەرز و خۆشی خۆیانن. هەر خـودا مزگێنـی پـێ داون بەوە: ئەوانەن درووود و بەخششی خودای خۆیان بەشیانە و لە سەریانە و هەرگیـز ئەوانە خەم و خەفەتباری ناتوانێ سواری دڵیان بێ و داگیریان کات. و هەر ئەوانەشن کە بە پـلەی هیـدایەت گەیشتوون.

هەروەک خودای خاوەن حیکمەت گەلی موسوڵمانانی وەغیرەت خست بۆ گرتنی کەعـبە و خاوێن کردنەوەی لە بت و بتپەرستان بە وەعدەی بەهەشت و ڕەحمەت، ئەوجار لێرەدا خوا بە باسی سـەفا و مەروە جووتبـاقی ئەو مـزگێنییە دەکـاتەوە کە هـاتوچۆ لە نێـوانی ئەو دوو تەپۆڵکەیە نیشانەیەکن لە نیشانەکانی حەجی خودا، دەبێ بکرێن چونکە نیشانەکانی دینی خودا نیشانەی بەرزی موسوڵمانانە.

## سەفا و مەروە چن؟

پێویستە بـۆ ناسـینی سـەفا و مەروە نەختێکیـان بناسـێنین و هەروا تیوتیوەیەکیـان بـدەین.

جیٚبەجیٚ کردنی سەفا و مەروە وەک لە نووسـراوەکانی شەرعدا باسی لیٚوە کـراوە، بەشـیٚکە لە ئەرکە گرینگەکـانی حەج و عەمـرە، ئەگەر کەسـیٚک نەتـوانیٚ بەڕیٚوەیـان بەریٚ، بە پیٚـی فتـوای هێندێک لە شەرعزانان دەبیٚ فیدیە بدا واتە مەڕیٚک سەر بڕیٚ. ئەگەر کەسیٚک بیٚـت و بڵـیٚ: ئەو هــاتوچۆیەی بەینـــی ســـەفا و مەروە لە دەورانـــی جەهالەتـــدا بـــووە و بـــاو بـــووە، ئەگەر موسوڵمانەکانیش ئەو کارە بکەن، ئەوە چوونە سەر ئاکاری کافران و لاسـای ئەوانیـان کـردەوە، دەبیٚ ئیٚمەش لە وڵامدا بڵیٚین: لە ئەنجامدانی ئەو عەمەلە هیچ گوناهیٚـک نـایەتە جـیٚ و حەرام نییە، چونکە ئەو عەمەلە واتە هاتوچۆ لە نیٚوان ئەو دوو تەپۆڵکانە واتە سەفا و مەروە دە بنیاددا سوننەتی حەزرەتی ئیبراهیم بووە. ئەو عەمەلە جاهلانەی بیٚبـاوەڕانی دوای ئیبراهـیم. نـاتوانیٚ بەرگری لە موسوڵمان بکا، دە ئەنجامدانیدا چونکە ئەوە لاسـا کـردنەوەی کـافران نیـیە، بەڵـکە زیندووکردنەوەی ئاداب و ڕەوشتی باوەگەورەی پیٚغەمبەرانە کە ئیبراهیمە.

وەک لە ڕابردودا کوتمان سەفا و مەروە دوو تەپـۆڵکەن لە لای ڕۆژهەڵاتـی کەعـبە، کـاتی خــۆی بتپەرســتەکان هەریەک بتیٚکیــان لە ســەر دانــابوون دە کــاتی خۆیــدا لە نیٚوانیانــدا هاتوچۆیان چەن جاران بۆ پیرۆزی و هەموو جاریش دەسـتیان بە سـەردا دیٚنـان کە دەچـوونە لایان بۆ مبارەکی.

سەفا واتە بەردیٚکی ئەستوور و سەخت. مەروە واتە بەردیٚکی سپی و لووس وەک هەسـان و زۆریش سەخت و ڕەق. غاردان و هەڵاتن بە نەرمەغار لە نیٚوان ئەو گـردانە لاسـا کـردنەوەی دایکی بەرز و بەڕیٚزمان هاجەرە خانمە کە لە مابەینی ئەو دوو تەپۆڵکانە بۆ ئاو پەیـدا کـردن بـۆ ڕۆڵەی ئازیزی، ئیسماعیل، هەڵاتنی کردووە.

بە پیٚویست دەزاندریٚ ئەو ڕازەی دە ناو ئایەتی ﴿فَإِنَّ اللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ﴾دایە، قـووت نەدریٚ. ڕازەکەش ئەوەیە: شـاکر بە ڕواڵەت نـابیٚتە سـیفەتی خـودا چـونکە شـاکر واتە ئاشـکرا کردنـی نیعمەت و سپاس لە سەری بەو زاهیر کردنە نیعمەتە و نەشارنەوەی دەکوتریٚ: شوکری نیعمەت واتە «شاکر» لە سەر ئەو ئەساسە، وەپاڵ دانی وشەی «شاکر» وە لای خودا ناڕەوا دیٚتە بەرچـاو. کەوایە دەبیٚ بکوتریٚ ئەو وەپاڵدانە مەجازە، واتە لە سەر پیٚودانی خۆی نییە. دەبیٚ بڵیٚین مانای ئایەتەکە ئاوایە: خودا لە سەر تاعەت و عیبادەت پاداش دەدا، هەروەک لە سەر تاوان جەزا دەدا. بۆ زیٚدە زانین بڕوانە تەفسیری کەبیر، ج ٤/٣.



تـا ئێـرە لاسـاری جـوولەکە و گـاور و بتپەرسـتەکان کـرا بە تەواوی کە پێغەمبەرایەتـی پێغەمبەریان وەک کوڕی خۆیان دەزانی و دانناسی چونکە لە کتێبەکانیاندا باسـی لێـوە کرابـوو. ئەوجار لەوە بە دوا باسی سزای ئەو لاساری و بێئەدەبییان دەکا خودای تەعالا، کەوایە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٥٩ی بەقەرە:

﴿١٥٩﴾ إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَـئِكَ يَلعَنُهُمُ اللّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ

**ئەوانەی کە ئەو مژدەیەی لە تەوڕات و ئینجیلدا دەرحەق بە ڕاستێتی پێغەمبەرێتـی مـحەمەد ﷺ، بەیانمـان کـردووە لە ترسـی لە دەسـتچوونی پـلە و پـایەی خۆیـان حاشـاری دەدەن و دەیشارنەوە، ئەوانە خودا لەعنەتیان لێ دەکات و لە ڕەحمەتی خـۆی وەدووریـان دەخـا و هەروا هەموو نەعلەتکەرانیش هەر نەعلەتیان لێ دەکەن.**

## تێڕوانین و وردبوونەوەیەک

بەڕاسـتی ئەو گـاور و جـوولەکە و زانایـانەی کە ئەو نیشـانانەی دە تەوڕات و ئینجیلـدا ناردوومانەتە خوارەوە، حاشاری دەدەن و دەیشارنەوە، وەک ڕێنومایی و گوفتە و بەیاناتی ڕوون و ئاشکرا، پاش ئەوەی کە لە کتێبەکانی خۆیاندا باسـمان لێـوە کـردوون. ئەو کەسـانە خـودای تەعالا نەعلەتیان لێ دەکات، یانی وەدووریـان دەخـاتەوە لە ڕەحـمەت و میهرەبـانی خـۆی، و هەروا نەعلەتکەران نەفرینیان لێ دەکەن لە هەموو لایەکەوە. جا مەگەر لاق لە کەری شـەیتان بێننە خوار و وەگەڕێن بۆ ڕێگای ڕاستی خودا و تەسدیقی ئەو سیفاتانەی پێغەمبەر بـکەن کە تـا وێستا ئینکاریان کردوون. ئەوکات خودای پەنادەر پەنایان دەدا و لێیان خۆش دەبێ.

لەو ئایەتە ئەوە دەردەکەوێ و هەست پێ دەکرێ کە هەر زانایەکی موسوڵمان بێ وەیا غەیرە موسوڵمان، وەبەر ئەو نەفرین و نەعلەتانە دەکەوێ. بە مەرجێ حەق وەشارێ.

دڵ دەیهەوێ بزانێ ئەوانەی نەعلەتکەرن و نەفرینچین، کێن؟ کێ بـن؟ نەعلەتکەرانـی حەق حاشاردەران، دەبێ عولەما و ئەنبیا و مەلائیکە بن بە پێی نەزەری زانایانی ئایینی.

حاشاردانی حەق تیژترین و بەزەبرترینی وەسیلەی تەفرەقەیە لە ئاییندا بەتایبەت شاردنەوەی عیلم وزانستی ئایینی و لادانی خەڵک لە خەتی ڕاسـت لە لایەن زانایـانی ئـایینی چـونکە یەک بابەتی سـرشتیە، ئەگەر ڕاست نیشان درێ هەموو سـرشتێک وەریدەگرێ و دەیقۆزێتەوە. حەق حاشار دان بە بادانی خەلە و خەرمانی ڕەنجی پێغەمبەرانە.

هەروەک بە دەرەجە و قۆناغی یەقین گەیشتووە کە قورئان کتێبی هیدایەت و شارەزایە، وە هەروا ڕۆچنە و پەنجەرەی هیوا و ئومیدە بۆ ئینسان پاش هەموو هەڕەشەیەکی دەکرێتە سەر ئینسان بە هۆی تاوان و خەتاوە، ئەوەش بۆ ئەوەیە کە ئینسان نەکەوێتە قۆناغی نائومێدی. جا بۆیە خودا مزگێنی دەدا بە حەق قووتدەران و حاشاردەرانی کە پاش ئەو تاوانە گەورەیە کە شاردنەوەی حەق با داتەوە وەلای خودا و حەق و ددان بە تاوانیدا بنێ، ئەو بادانەوەی لێ وەردەگرین و قبووڵی دەکەین و دەیبەخشین. بۆ ئیسباتی ئەو مژدە بەرزەیە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۶۰:

> ﴿١٦٠﴾ إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ وَأَصْلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَـئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ
> **تەنیا ئەوانە نەبن کە لە کردەوەی خراپەکانی خۆیان پەشیمان دەبنەوە و ڕێگای ڕاست دەگرنە بەر و ئاشکرای دەکەن پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر و ئیمانی پێ دێنن و ڕوو دەکەنە کاری چاک و بەڕێوە بردنی ئەرکەکانی سەر شانیان. خودا دەفەرموێ لەوانە خۆش دەبم. چونکە ئەمنی خودا تەوبە وەردەگرم خاوەن بەزەیەکی بێ سنوورم.**

## حەقخۆر

**چاوپێدا خشکێنەوەیەک:** حەق شاردنەوە و داپۆشینی حەق چاوبەستنە، کام چاو بەستنە ئەو چاوانەی دەڕوانن حەق وەدۆزن و وەیقۆزن، دەیانبەستن تاکوو ئەو حەقە چاو نەکەن. و هەروا دە کەندالی جەهل و نەدامەتیدا بکەون، جا ئەو ڕەفتار و کردارە بێ شەرەفانە دەکەوێتە بەر هێرشی نەعلەت. واتە بێبەری لە ڕەحم و بەزەی باری و دوور خستنەوە لە ڕەحم و کەڕامەتی بەشەری.

ئەو ئاکارە ناڕەوایە لە هەموو چین و تیرە و بەرەیەک ناحەز و ناڕەوایە، ئەمما لە تیرەی مەلا و زانا و ڕێبەرانی گەل سنووربەزێنە و لە ئەندازە بەدەر و ناڕەوایە چونکە ئەوانە چاوەن، چاوەی زانست و شارەزایی و ئیرشادن و جێی باوەڕی گەلن. ئەگەر ئەوان خوار بن، گەل خوار دەکەوێ. وەک زانایەکی وردبێژ و وردبین فەرموویەتی:

هەچی بۆگەن بێ، بە وەسیلەی خوێ بۆگەنەکەی لادەچێ، جا ئەگەر خوێ بۆخۆی بۆگەن بوو، بە چی چا دەبێ و لادەچێ؟! پەنا بە خودا بۆخۆی.

بەڵێ بە پێی فەرموودەی باری، لە سەر حەق قووتدەران نەفرین دەبارێ، جا مەگەر

وەگەڕێن و پەشیمان وەبن، بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر نەفرینکەران ئەوانەن دەفامن و خاوەن شعوورن لە سەر زەوی، و ئەو نەفر و نەعلەتەش تا دەمرن. بۆ ئیسباتی ئەو داوایە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٦١ی بەقەرە:

﴿١٦١﴾ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَمَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ

**بەڵام ئەوانەی بێ باوەڕن، و هەر بەبێ باوەڕیش دەڕۆن و دەمرن، ئەوانە نەعلەتی خودا و فریشتەکانی خودا و سەرجەم خەڵکیان لە سەرە.**

بۆ تەواوی مەبەست ئایەتی ١٦٢ش دەپێوین، تا چاوەڕوان نەبن:

﴿١٦٢﴾ خَالِدِينَ فِيهَا لاَ يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلاَ هُمْ يُنظَرُونَ

**ئەوانە هەتا هەتایە لە دۆزەخدا دەمێننەوە بەبێ ئەوەی ئازار و عەزابیان لە سەر کەم وەکرێ، یا خود ڕێگای پەشیمان بوونەوەیان بدرێ، چونکە ژیانی دنیا جێگای تۆبەیە و پەشیمانی تێدا ڕێ دراوە، نەک ڕۆژی ئاخرەت.**

**تێڕوانینێکی بە وردی:** دیارە ئەوانەی تا مردن هەر لاسار بوون و بێ باوەڕ، نەفرینی خودا و فرشتە و ئینسانیان لە سەرە بە یەکجاری، لە ژێر ئەو نەفرینەدان، سزایان لێ کەم ناکرێتەوە و بە چاوی ڕەحمەتیان لێ ناڕواندرێ.

لە تێڕوانین و هەڵسەنگاندنی ئەولاولای ئایەتەکانی ١٦١، ١٦٢، ١٦٣ و ١٦٤ ئەو هەستە دەکرێ و دەیکەم کە خودای تەعالا پاش باسی گۆڕینی قیبلە و ئەو شتانەی کە بە دوایا هاتن، باسی دامەزراندنی ئیمان و بڕوا بکا. لە سەر دامەزراندنی دوو پایەی پتەو و قایم و قۆڵ و بەهێز: ١. تاک و تەنیایی خودا ٢. بیر کردنەوە لە عەجائیبی ئاسمانان و زەوی. یەقین دەبێ ئەوەش بزانین تاکوو پیرۆزتر و چاتر ڕۆچێ لە بیری تاق و تەنیایی خودا، چاتر و باشتر خودایەتی خودا دەردەکەوێ و بەو قەناعەتەش دەگەین کە بە دوو باڵی (خودا یەکە) و (بەتوانایە) دەتوانین بەرز بینەوە لە سەرووی تاریکایی ماددەوە بۆ ڕووناکایی جەلالی پاکی حەق. واتە دەرچوون لە دنیای ناسووت بۆ دنیای لاهووت. جا بۆ ئیسبات و ڕاستی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٦٣ی بەقەرە پاشان ئایەتی ١٦٤:

﴿١٦٣﴾ وَإِلَـهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ

**ئەی عالەمینە! خودای ئێوە کە ئێوە و هەموو کائیناتی بەدی هێناوە، یەک خودایە، زیاتر لەو**

هیچ خودایەکی دیکە نییە چونکە ئەگەر خودایەکی دی هەبایە، کاروباری ئەو بوونەوەرە ئاوا ڕێکوپێک و جوان بەڕێوە نەدەچوو و هەر ڕۆژەی لایەکی ئەو گەردوونە وێران دەبوو. ئەوکات هەر خودایەک لەو خودایانە بۆ خۆی دەیویست کاروبارەکان بە جۆرێک هەڵسووڕێنێ جیاواز لە کاری خواکانی دی. چونکە ئەوە یەقینە هەر زاتێک مەرامێکی تایبەتی خۆی هەیە بە پێی ئەو مەرامە دەجووڵاوە. سەرنج بدە ئەگەر لە وڵاتێکدا دوو پادشا ببن ئەوە بێگومان ئەو وڵاتە دەشێوێ و پەشێوی ڕووی تێدەکات. ئەو خودایە **خودایەکە میهرەبان و خاوەن بەزەییەکی بێ سنووور و کۆتا نەهاتووە.**

**تێهەڵڕوانین و هەڵسەنگاندنێکی شعووراوی لەو ئایەتە پیرۆزە** بۆ وەی دەرکەوێ تێکەڵاوی و خزمایەتی دەگەڵ ئایەتەکانی پێش خۆی تا چ ڕادەیەکە؟

خزمایەتی و تێکەڵاوی ئەو ئایەتە دەگەڵ ئایەتەکانی ڕابردووی لە سێ ڕێگاوە چاو دەکرێ:

١. خزمایەتی ئەو ئایەتە دەگەڵ بەشی هەرە بەرزی ئەو سووڕەتە (بەقەرە) چاو دەکرێ کە ئەو بەشەش بەشی یەکتایی خودایە و دەلیلەکانی یەکتایەکەی کە لە ئایەتی ٢١ی هەمان سوورەی بەقەرە دەردەکەوێ و دەس پێ دەکرێ. چونکە هەروەک دیارە و دەبیندرێ خودای حەکیم لەو سووڕە پیرۆزەدا بە بڵاوی لە چوار جێدا باسی یەکەتی خودا ڕادەنێ. ئەو چوار شوێنانەش ئایەتی ٢١، ئایەتی ١٦٣، ئایەتی ٢٥٥ و ئایەتی ٢٨٥ی ئاخری بەقەرەیە. ڕازی ئەو دووپات و سێ پات و چوار پات کردنەوەی ئایەتی تەوحید، دە ئینسان گەیاندنە کە ئەساس و بنچینەی ئیمان و باوەڕی بە خودا، لە کن خودا و لە ناردنی سەراپای پێغەمبەرەکان ئەو تەوحیدەیە، باقی ئایەتەکانی دیکەی ئەو سووڕە کە لە دەوری ئەو چوار ئایەتانەدا هەڵدەسووڕێن هەمووی هەر لە سەر تەوحید دەگەڕێن بۆ وەی بیناسێنن.

٢. هێندێکیش لە قورئان زانەکان نەزەر و بۆچوونیان لە مەڕ ئەو ئایەتە (١٦٣)یەدا ئاوایە: پاشاوی ئایەتەکانی پێش خۆنی واتە: ئەو ئایەتانەی کە لە سەر گۆڕانی ڕووگە و حاشاردانی حەق لەمەڕ پێغەمبەر و قورئان دەدوان.

٣. هێندێکیش ڕا و بۆچوونیان لە سەر ئەو ئایەتە ئاوایە: کە حەزرەتی ئیبراهیم و یەعقووب ڕایانسپاردە ئەولادەکانیان کە هەتا هەن خودای بە یەک بزانن. ئەو ئایەتەش تەواوانەتر دەگەڵ پۆلێک دەلیل و بورهان زەمزەمەی وەحدانیەتی خودا دەکا.

هێندێکیش ئاوای تەعبیر دەکەن: خزمایەتی ئایەتی ١٦٣ بەتایبەت دەگەڵ ئایەتەکانی بابەتی

گۆڕانی ڕووگە حاشاردانی حەقە، واتە گەرچی خودای میهرەبان ئارەزووی ناو دڵی پێغەمبەری بەجێ هێنا بە شێوەی گۆڕانی قیبلە، بەڵام دەبێ ئەوە بزاندرێ کە ئەو نیعمەتە بە تەنیا کافی نییە و چارەی دنیا و قیامەت چارە ناکا. بەڵکە ئەوەی هەموو کشتوکاڵ و باغ و باغاتی نوێژ و ڕۆژوو و باقی عیبادەت دێنێتە بەر و بەرهەمی دێنێ، تەوحیدە، واتە خودا بە تەنیا ناسین و زانینە. بەو دەلیلە: تەوحیدە بنچینەی خوداناسی، تا ئەو بنچینەی دانەڕژێ و قایم نەکرێ هیچ کردەوە و کارێک لە عیبادەت نایەتە بەر و بەر ناگرێ.



ئەوجار کاتی ئەوەی هاتووە بچینە خزمەت ئایەتی ١٦٤ کە نیشانەی توانایی خودا و تەنیایی خودایە:

﴿١٦٤﴾ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللّهُ مِنَ السَّمَاء مِن مَّاء فَأَحْيَا بِهِ الأرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخِّرِ بَيْنَ السَّمَاء وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ

بەڕاستی لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەویدا و ئاڵوگۆڕی شەو و ڕۆژ و ئەو پاپۆڕ و گەمیانەی کە لە دەریاکاندا بە قازانجی خەڵکی وان لە گەڕدا، ئەو ئاو و بارانەی کە وا خودا لە ئاسمانەوە دەیانڕێژێتە خوارەوە، بەو هۆیەوە زەوی دەبووژێنێتەوە لە پاش ئەوەی کە مردبوو، لە زەویدا لە هەموو زیندەوەرێکی ڕەوەندە و هاتوچۆکەرێکی بڵاو کردەوە، هەروەها لە ئاڵوگۆڕی باکان و هەورە ڕامکردووەکانیشدا کە وان لە نێوانی ئاسمان و زەویدا، ئەمانە گشت بەڵگە و نیشانەی ئاشکران لە سەر تاک و تەنیایی و میهرەبانی خودا، بۆ ئەو هۆزەی کە تێبگەن.

**تێڕوانین و ئاوڕ وەسەر دانەوە:** ئەوە بێگومان هیچ ئەقڵ و هەست و شعوورێک حاشای لێ ناکا، ئەو ئەستێرانەی کە هەزاران هەزار ملیۆن بە ژوروی سەرا دەدرەوشێتەوە و بە سەدان میلۆن ساڵی تیشک لێمانەوە دوورن، و هەریەک بە درێژایی ساڵ لە سەر چەمەرەی خۆی دەسووڕێتەوە، بێ ئەوەی هەناسەیەک پاش و پێش بکەوێ کە بە هۆی هێزی کێشندەوە بە یەکەوە بەستراون، و هەروا نیزیک و دووریان بە درێژایی بوونیان لە یەکتر نەگۆڕاون و وەک خۆن و وەک یەکن، بێگومانە ئەگەر هێزی بەهێزی نیزامی باری ئەو نیزامەی لەنگەر پێ نەگرتایە، و لە کاتی خولدان و سووڕان بە دەوری خۆ و یەکدا نەزمی ڕانەگرتایە، لە سەر چەمەرەی خۆیان تلاسا دەبوون و لادەچوون و بە گژ یەکدا دەهاتن و پێک هەڵدەپڕژان. ئەودەم

ئەو کائیناتە بە هەرچی بوونەوەری سەریەتی، تێک دەقرمان و تێک دەڕووخان و وێران دەبوون. کەواتە وێستانیان بە حاڵی خۆیان شاهیدە لە سەر بوونی خودایەکی مودەببر و بەتوانا و بەهێز و جوانترین و چاترین نازیم و نەققاش و خەللاق. بڕوانە ورد بڕوانە لەو ئەستێرە گەورە (ڕۆژ) کە هەچی خاوەن حەیاتە لە حەیوان و لە ئینسان و لە دار و دەوەن و گیاوگۆڵ، بە تینی تاوی ئەو و بە گەرمایی تیشکی ئەو و ڕووناکایی ئەو ژیان و حەیات دەبەنە سەر. دڵی خاوەن هەست کە لە شەودا بڕوانێتە پانایی ئاسمان و سەیری ئەو ئەستێرانە بکا کە دەدرەوشێتەوە، لە سەرووی ئەو دێن و دەڕۆن و ئاوا دەبن و هەڵدێنەوە، ئیمان دێنێ بە خودای خوڵپێدەری ئەوانە.

کەسێک خودی ئەقڵ و شعوور دەو زەویە بترێنجێنێ بە دار و بەرد و دەشت و شیو و دۆڵ و دەرە و ڕووبار و دەریا و وشکانی ئەودا، ئەگەر شاهیدی نەدا لە سەر خودای بەتوانا و نەققاش، ئەوە ﴿كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ﴾ و هەروا هاتوچۆی شەو و ڕۆژ بە دوای یەکدا، بێ لێکترازان و لێک پێش کەوتن و هەروا ئاڵوگۆڕی وەرزان بێ پاش و پێش لە یەکتر شاهیدن لە سەر تاق و تەنیایی خودا.

و هەروا ڕامان و بەرجەوەندی ئەو پاپۆڕانەی کە دێن و دەچن لە ناو دەریادا، بەو شتانەی کە بەهرە دەدەن بە ئینسان، و شت لە ڕۆژهەڵاتەوە دەبەن بۆ ڕۆژئاوا، یا لە لای ڕاستەوە بۆ لای چەپ بە پێنسەت هەزار تۆنەوە و قومیش نابێ، سەراپای ئەوانە شاهیدن لە سەر تاق و تەنیایی خودا و توانایی ئەو.

و هەروا مردنی ئەو زەوییە پان و بەرینە و وەگیان هێنانەوەی ئەو بە هۆی بارانە و هەروا هاتوچۆی هەوران بە وڵاتاندا، سەراپای ئەوانە شاهیدن لە سەر یەکەتی خودا لە لایەن خاوەن ئەقڵ و شعوور و هەستەوە. چونکە هەروەک بە زانست شت دەزاندرێ، دەبێ ئەوەش بزاندرێ زانست کە ئەقڵ ڕێنومایی نەکا و یاریدەی نەدا، تێبڕ ناکا و تێناچێ لە کاروباردا، ئەوە ئەقڵ و زانستن پێکەوە ئەوەی دەزانن شەو و ڕۆژ لێک وەدوور کەوتن و لێک وە نیزیک کەوتنەوە یان هۆیەکەی ڕۆژ و زەوین کە لێک وەدوور دەکەون و لێک وەنیزیک، هەر ئەو کارەساتەی لێک نزیک و لێک دووری ڕۆژ و زەوییە. هاتنی سەرما و گەرما لە زۆر شوێنی زەوی.

پێویستە ئاوڕێک وەسەر نەفامی و جەهلی بەشێک لە ئینسان وەدرێ: کە لە سەر ئەو هەموو شاهید و جاڕچی و بەڵگە و نیشانانەی کە هەرچی بوونەوەرە دەیکەنە شاهید لەسەر بوونی خودا، بوونی بە تەنیایی، وێستا ئینسان نایسەلمێنێ و ئینکاری دەکا؛ جێیەتی بکوترێ:

هەی لە ئینسان، سەڵا لە ئینسان، ماڵوێرانی بۆ ئینسـان! بـۆ ئیسـباتی ئەو ئیـدیعایە دەبـێ ڕوو بکرێتە ئایەتی ١٦٥ی بەقەرە:

﴿١٦٥﴾ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللّهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلّهِ وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ أَنَّ الْقُوَّةَ لِلّهِ جَمِيعاً وَأَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ
**کەچی هەندێ لە خەڵک هاوشان و هاوتا بۆ خودا دادەنێن ئەوانیشیان هەر وەکوو خـودا خـۆش دەوێ. ئەوانەی وا بڕوا و ئیمانیان هێناوە، خودایان زیاتر خۆش دەوێ، ئەگەر ئەو کەسـانەی کە ستەمیان کردووە، هەر ئێستە بیانزانیبایە وەکوو کاتێ کە سـزا دەبیـنن دەزانـن، هەمـوو هێـز و توانایەک هەر ئی خوایە (ئیتر هاوەڵیـان بـۆ خـودا دانەدەنـا) گومانیشـی تێـدا نیـیە، کە خـودا سزادەرێکی زۆر توند و تیژە.**

## هەی لە ئینسان!

دەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە و نیشانانەی کە خودا لە سەر خودایەتی خۆی بۆ ئینسانی هەڵدان و نواندنی، هێشتاش زۆر کەس هەن لە تاق و تەنیایی خودادا دە شـکدانە و کێشـەی دەکـا و لە حەق چاو دەقووچێنێ و هاوبەشی بۆ دادەنێ و پەیدا دەکا. لە بت و فرشـتە و ئەسـتێرە و دار و بەرد، وەکوو خودای بەحەقیش ئەو هاوبەشانەیان خـۆش دەوێـن واتە ئەوانەی خـاوەن ئـیمانن خودایان چەن خۆش دەوێ، ئەوانیش ئاوایان ئی خۆیان خۆش دەوێ و لە بەریـان دەپـاڕێنەوە، بۆ وەی نیازیان بێننە جێ.

بەڵام ئەو شتە سەیرەش لە هاوبەشپەیـداکەران چـاو دەکـرێ: دەگەڵکـوو تووشـی بەڵا و تەنگانە و سەختی هاتن، گورج ڕوو دەکەنە خودای بێ هاوتا و هاواری لێ دەکەن کە نەجاتیان دا. هاوار ناکەنە بتەکانی خۆیان، چونکە دەزانن هیچیان لە دەس نایە، ئەوەی شتی لە دەس دێ هەر خودای بانی سـەر و بێهاوتـایە. دەگەڵکـوو ڕزگاریشـیان بـوو، دووبـارە دەچـنەوە سـەر هاوبەش پەیدا کردنەکەی خۆیان. ئەقڵ و شعوور لەوە تێماوە نازانێ چۆنی بەراورد کا.

## هەڕەشەی خودا

ئەدێـرەدایە کە ئەوان هێنـدە خەیـانەت بە ئەقـڵ و هەسـت و شـعووری ســرشتی دەکەن، خوداش دەیانخاتە بەر هێرشـی هەڕەشـە و گەفـان وەک ئەوە کە دەفەرمـوێ خـودا پێیـان: ئەو هاوبەش پەیداکەرانە، ئەگەر ئەو ڕۆژە ببینن کە لە بەردەمـی دادگـای خـودای ڕادەگیـرێن و لەو

کاتەی سزای ئەعمالیان چاو دەکەن، ئیقرار بەوە دەکەن کە هەرچـی هێـز و توانـا و دەسـتەڵاتە هەمووی هەر ئی خودایە و هەر ئەویش شایانی پەنا بۆ بردنە، چونکە کەس چی لە دەس نایە بە غەیرەز ئەو نەبێ.

جگە لەوانەش کاتێ ئەو هاوبەش‌پەیداکەرانە دیتیان هاوبەشـەکان و پێشـەواکانیان یەخە و بەرۆکیان هەڵدەتەکێنن و دادەڕن لەو کەسانەی وەشوێنیان کەوتـوون و پەرسـتوویانن لە جیـاتی خودا، پێیان دەڵێن: ئەوڕۆ ئێمە هیچمان لە دەس نایە چونکە هـیچمان بە دەس نیـیە و نـاتوانین هیچ ئاوڕێکو وەسەر دەین و حەتا ناتوانین و لە دەسمان نایە ئاوڕێ وەسـەر خۆشـمان دەیـن و ئەو بەڵێنیانەی لە دنیادا کە لە لایەن مەوە بە خۆو دابوو سەراپا درۆ و تەوهین بوو بە خـودا و بە ئەقڵ و سـروشت و هەست.

ئەوجار لەو کات و ساتە سەختەدا هاوبەش‌پەیداکەرانی خوار و دۆڕاو ئاوات دەخوازن کە بۆخۆیـان و سـەرۆک و پێشـەواکانیان بـگەڕانەتەوە دنیـا تـاکوو هاوبەش‌پەیـداکەرانی وەک هاوبەشەکان یەخە و بەرۆکی خۆیان لە پێشەواکانیان هەڵتەکانبایە و دادڕیبایە و بێـزاری خۆیـان نیشان دابان هەروەک ئەوان بێزاری خۆیان لە ڕاست مە دەربڕین.

جا چونکە خودا کارەکانی لە ڕووی نەزم و نیزامە، تازە نایانگێڕێتەوە دنیا و ئاواتیان ناهێنێتە جێ بەڵکە هەربەو داخ و خەفەتەوە دەیانهێڵێتەوە و دەیانخاتە ژێر عەزابی حەسـرەت و داخـی سزایەکی وا کە دوایی نایە و نییە.

**تیوتیوە:** خودای خاوەن حیکمەت لە ئـایەتی ١٦٣دا یەکەتـی خـودای بەیـان کـرد بەڵام لە ئایەتی ١٦٤دا دەلیل و بەڵگەی ئیسباتی ئەو یەکیەتیەی بەیان دەفەرموێ تـاکوو خـاوەن ئەقـڵ و هەست و شعوورەکان لە سەر ئەساسی بەرجەوەندییان لەو نیشانانە بەو نەتیجە بگەن و ئیقراری پێ بکەن و قبووڵی کەن کە خودا هەیە و تەنیـایە و بەتوانـایە و زانـایە و کارسـاز و کـارجوانە و بەئاگایە.

دەشبێ ئەوە بە باشی بزاندرێ و قبووڵ کـرێ کە بەرزتـرین و گـرینگترین بـاس و بـابەتی قورئـان و بگـرە حەیـاتی هەمـوو سـوورەتەکانی قورئـان (تەوحیـد)ە. و هەروا سـەراپای ئەحکامەکان، وەعزەکان، چیرۆکەکان واتە (قصص) زینەتی تەوحیدن.

لە هەڵسەنگاندنی ئـایەتی ١٦٤ هەشـت دەلیـل و بەڵـگەی ڕوون لە سـەر بـوونی خـودا و تەنیایی خودا و دەستەڵاتی تەواوی خودا هەست پێ دەکرێ و قبووڵ دەکـرێ لە لایەن ئەقـڵ و

زانست و شعوور و سەلیقەوە. کەسێک هەستیان پێ نەکا چاوەی چاوی دڵی کوێرە و شعووری مردووە بۆیە خودا لە ئاخری ئایەتەکەدا فەرمووی: ﴿لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾. هەشت دەلیلەکان لە جوملەی ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ ئەگەر بە وردی بەراورد کرێ و هەڵسەنگێندرێ، ١ـ٢. ئاسمان و زەوی بەو چۆنیەتیەی کە هەن هەر دووکیان نیشانەی تەواون لە سەر بوونی خودایەکی تەنیا و بەتوانا و بێ هاوتا و زانا.

٣. شەو و ڕۆژ و هاتوچوونیان و نوور و تینیان و کورت و درێژییان و ڕووناکاییان و بەردەوامییان، هاوارن لە سەر خودایەکی تاق و تەنیا و زانا و کارساز و کارجوان و بەتوانا.

٤. هاتوچۆی پاپۆڕەکان لە ناو دەریادا بێ قومبوون و ڕۆچوونیان لە ئاوا بۆ بەرهەم و نەفعی ئینسانی چوارەمین دەلیلی ئافاقییە لە سەر بوونی خودای بێ هاوتا و بەهێز و زانا و بە دەستەڵات.

٥-٦. هەڵڕژانی باران و ئاو لە ئاسمان و وەگیان هاتنەوەی زەوی بە هۆی باران و ئاوسبوونی زەوی بە دانەوێڵە و گیاوگۆڵ و بژیوی گیانداران دەلیل و شاهیدن لە سەر خودای بە نەزم و نیزام و کارساز و کارجوان.

٧-٨. هەڵسووڕانی با بەولاولای وڵاتا و ڕامبوونیان لە نێوان ئاسمان و زەویدا دوو دەلیلی تەواون لە سەر توانایی و کەماڵی قودرەت و هێزی خودا. کەسێک بە هۆی ئەو دەلیلانە خودا هەست پێ نەکا و نەیدۆزێتەوە، نەفامە، مردووە، مردوویەکی بە زەرەرە و بێ شعوورە بۆیە خودای فەرموویەتی ﴿لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ واتە ئەو نیشانانە بۆ گەلی ئاقڵن کە خوایان پێ بناسێ.

با ئەوەندەش بۆ مەزەی شعوور و ئاگاداری زەین بڵێین کە دە واقیعدا ئەوەش نیشانەی عەزەمەتی خودان: دەریا گەورەکانی سەر زەوی عیبارەتن لە پێنج دەریا:

١. دەریای هیند کە پێی دەکوترێ دەریای چین و ئۆقیانووسی هیند

٢. دەریای مەغریب کە بە ئۆقیانووسی ئارام مەنشوورە

٣. دەریای شام و میسر و ڕووم کە بە ئۆقیانووسی ئەتڵەس ناو دەبرێ

٤. دەریای نیتش (نیطش)

٥. دەریای گورگان.

## دوو مەتڵەب هەن

دڵی خاوەن هەست و شعوور لەو ئایەتە (١٦٥) دوو مەتڵەب هەست پێ دەکا:

١. هەرکەسێ بە غەیری خودا پاڵ وەدا بە کەسێک و تێکەڵاوی لەو ڕێـیەوە دەگەڵ بکـا کە ئەوە دەتوانێ چارەی چاری بکا ئەوە نیـزیکە لە موشـــریکایەتی، جـا مەگەر نەفـامێ و نەزانــێ موشـریکایەتی چییە؟

٢. خۆشەویستی و وەشوێنکەوتنی کەسێک کە ئەو کەسە بۆ خۆی لە فەرمانی خودا لانەدا و دەستووریشی بە یاران و خۆشەویستان و وەشوێنکەوتوانی خۆی بدا بەوەی دەس دە یاسـای خودا گرن و پاڵ وە خودا دەن، ئەوە وەبەر ﴿كونُواْ مَعَ الصَّادِقِينَ﴾ دەکەوێ.



کاتی ئەوەی هاتووە بچینە خزمەت ئایەتی ١٦٦ی بەقەرە تا کـوو بـزانین حـاڵی ئەوانەی کە پێشەواکانیان یەخەیان لە بەر دادەدڕن و حاشایان لێ دەکەن چییە؟

﴿١٦٦﴾ **إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُواْ مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الأَسْبَابُ**

**لە ڕۆژی پەسڵاندا کاتێک پێشەوایانی ناڕەوا عەزاب و سزا دەبینن یەخە لە شوێنکەوتووانیان هەڵدەتەکێنن هەموو پەیوەندی و دۆستایەتییەک لە نێوانیاندا دەپچڕێت و هەڵدەوەشێ.**

**تێهەڵڕوانینێک:** بۆ وەی ئینسانی خاوەن هەست و شعوور و ژیر دەرس وەرگـرێ: خـودای خاوەن حیکمەت و حەکیم بەسەرهاتی ئەو کەسانەی کە وەشوێن بت و کەسانی غەیری خـودا دەکەون و ئەوانیش ڕۆژی قیامەت حاشایان لێ دەکەن بەیان دەکا. خودا دەفەرموێ: کاتێـک کە پێشەواکانیان یەخەیان دادڕی و هەڵیانتەکاند لە وەشـوێنکەوتوانیان و پێیـان دەکـوتن: ئەوڕۆ ئێمە هیچمان لە دەس نایە و هیچمان پێ نییە و ناشتوانین یارمەتیو بدەین لە هیچ بارێکەوە، وە ئەو بەڵێنیانەی لە دنیادا پێمان داون درۆن و درۆمان دەگەڵ کردوون کە چاویان بە سزای دۆزەخ کەوت و هەروا ئەو پەیمان و پەیوەندییەی بەستبوویان پێکەوە پچڕاو لێک هەڵوەشـا، وەشـوێن کەوتووان تێدەگەن کە هیچ کەس هیچی لە دەس نایە و هیچی بە دەس نیـیە. بەغەیـرەز خـودا. جـا لەو کـاتە حەسـتەمەدا خواردەسـتەکان ئـاوات دەخـوازن کە بۆخۆیـان و سـەرۆکەکانیان بگەڕایانەوە دنیا تاکوو ئەودەم وەک پێشەواکانیان بەرۆکیان لە بەر دادڕین و حاشایان لێ دەکردن ئەوانیش ئاوا یەخەیان لە بەر دادڕن و حاشا لە گەورایەتییان بکەن و بێزارییان لێ دەربـڕن. بەڵام تازە کار لە کار تـرازاوە و یاسـای خـودا وایە هەمـوو شـت بە دار و لەلەیە و بە کـات و سـاتە.

ئارەزووویان نایەتە جێ بەڵکە هەر لە بن باری عەزابی حەســـرەتدا دەمێـنـەوە و کردەوەکانیشـیان نیشان دەدرێن.

با لێرەدا ئەو ئاگادارییەی بدەین و ڕایگەیێنین: پێشەوا و سەرۆکەکانی وەشـوێنکەوتووان و خواردەستان هەر بت نین، بەڵکە ئینسانانی زۆردار و خـاوەن زوڵـم و بـێ ئینسـاف و سـیفەت شەیتانین وەک تاغووت و جبت و مترفین.

هێنـدێکیش هەن لە قورئانزانـان بۆچوونیـان لە سـەر ئەو وەشـوێنکەوتووانە (متبوعـان) ئاوایە، سەرۆک و مەزن و سەردارەکانی موشـریکانن کە نەیانهێشتوە عـالەم ڕوو دە پێغەمـبەران کەن. هەروا بەشی زۆری زانایان و پسپۆڕانی ئـایینی ئاسـمانی نەزەریـان ئەوایە: ئەو وە شـوێن کەوتووانە پێشەوا و ڕێبەرانی ئایینین (مەلا). ئەوانە شارەزای کتێبە ئاسمانییەکانن بەڵام بە خاتری ڕەزایەت و خۆشی دڵی تاغووت و جبت و مترفینان و تەماعی دنیایی خۆیـان حەقیـان حاشـار داوە و ڕاسـتییان قـووت داوە. نەزەری دیـش زۆر هەن لەو بـارەوە، بەڵام ئەوی پەسـندیان ئەو دووانەن کە ڕامانگەیاندن.



دیارە هەروەک ئایەتی ١٦٦ ڕایگەیاند کە پێشـەوا و سـەرۆکەکانی وەشـوێنکەوتووان یەخە دادەدڕن و هەڵـــدەتەکێنن لە وەشـــوێنکەوتووانیان حاشـــایان لـــێ دەکەن، ئەوانـــیش واتە خواردەستەکان لە داخ و حەسـرەتان ئارەزووی دووبارە گەڕانەوەی دنیا دەکەن تـاکوو ئەوانـیش بتوانن بۆ تۆڵە بە تۆڵە یەخەی خۆیان لە سـەرۆک و پێشـەواکانیان دادڕن و هەڵتەکێـنن. جـا بـۆ تەسدیق و تەئییدی ئەو بابەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٦٧ کە لەوێدا ئارەزوو و ئـاواتی گەڕانەوە بۆ دنیای دۆڕاوان چاو دەکرێ:

**﴿١٦٧﴾ وَقَالَ الَّذِينَ اتَّبَعُواْ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّؤُواْ مِنَّا كَذَلِكَ يُرِيهِمُ اللّهُ أَعْمَالَهُمْ حَسَرَاتٍ عَلَيْهِمْ وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنَ النَّارِ**

**ئەوانەی کە شوێن کەوتوو بوون کوتیان: بریـا جـارێکی دیـش بڕۆیشـتاینەوە بـۆ دنیـا تـاکوو ئێمەش یەخەی خۆمـان لـێ هەڵتەکانـدبانا، هەروەک ئەوان یەخەیـان لە ئـێمە هەڵتەکانـد. بەو شێوەیە خودا کار و کردەوە نارەوا و ناحەزەکانیان کە پڕ لە ئێش و ئازارن نیشانیان دەدات ئیتر تا هەتایە لە ژێرعەزابدا نایەنەوە دەر و ڕزگارییان نایە.**

**تێـڕوانین و ئـاوڕ وەسـەر دانەوەیەک:** ئەوانەی کە وەشـوێن سـەرۆک و گومڕاکەرەکـان

کەوتـوون دەڵـێن لەو ڕۆژە سـەخت و بـێ دەرەتـانەدا: خـۆزگە ئـێمەش و ئەوانـیش بـۆ دنیـا گەڕابانەوە جارێکی دی، تا ئێمەش بۆ تۆڵە بە تۆڵە یەخەمان لێ دادڕیبان و بێزاری خۆمان لـێ دەربڕیبان. دیارە هەرچی لە بەرەگە چۆ دەرێ، لە یاسا و باوی عورفـدا نـاگەڕێتەوە. دە دیـارە لە یاسای خوداشدا هەچی ئاوا بوو لە دنیای تەکلیفدا، واتە مرد و ڕۆیی، تـازە نـاگەڕێتەوە. جـا لە سەر ئەو ئەساسە ئەو ئاوات‌خوازانە تازە نایەنەوە دنیا و بێزاری لە ئاغاکانیان دەربڕن. بەڵـکە بـۆ عەزاب دانیـــان هەم تاوانەکانیـــان بە ســـەردا دەدەنەوە هەم دەخـــرێنە نـــاو دۆزەخ و لێـــرە ڕزگاربوونیشیان نییە.

**سـووکەئاوڕێک بە گۆشـەی چـاو:** موشـــریکەکان بە ئـاوات نـاگەن، ئەوە کە ئـارەزووی گەڕانەوە دەکەن هۆی نائومێدییانە لە هەرچی چارەیە. خودا کە پەردە لە سـەر کرداریـان لادەدا، لەشیان بە تەواوی دەکەوێتە ژێر باری داخ و حەسـرەتی ئەوەی بەهرەیان لە دەسڕەنجی خۆیـان نەبرد. حەسـرەت لە سەر پەرستنی بێ ئەرزش و بێ قیمەتان لە جێی خوداپەرستی. حەســرەت لە سەر ئەوەی کاتی سزا و پاداشە، هیچ شت تۆڵە ناکرێتەوە. تازە هەچی کرا کرا و هەچـی بـرا برا.



دەبێ خاوەنی ئەقڵ و شعوور ئەوە بزانێ کە خودای تەعـالا دەلیـل و بورهـانی تەوحیـدی بەیان کرد و نیشانی دا و خێر و سەوابی ئەهلی تەحیدیشی هەروا باس کرد. و لە پاشـان باسـی موشـریک و شیرکی هێنا شی کردەوە و چۆنیەتی حاڵی پێشەوا و پێشەواپەرستانی باس کـرد کە لە ڕۆژی ئاخرەتدا چۆن دەکەون. جا لە پاش باس و شەرحی حاڵی ئەوانە ئەوجار هات باسـی نیعمەتەکانی بۆ هەردوو دەستە واتە بێ باوەڕ و بەباوەڕ بەیان دەکا. یانی تاوانی تاوانباران کە خۆ وەدوور خسـتنەوەیە لە چـاکە و چاکەکـاری، بە فیڕۆدانــی بەخشـش و ئەنعـامی بـاری. هـیچ ئەسەرێک دانـانێ لە مەڕ زات و سـیفاتی بـاری و هەروا خـۆ وەنیزیـک خسـتنەوە لە چـاکە و چاکەکاری و بەهرە وەرگرتن لە بەخشش و ئەنعامی هیچ زیاد ناکا لە شەئنی باری. بە کـوردی، هەرکەس کردەوەی خۆی بۆ خۆیەتی، هیچی بۆ خودا نیـیە وهـیچ سـوود و زیانێـک لە خـودا نانیشێ. بۆ ئیسباتی ئەو ئیدیعایە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۶۸:

﴿۱۶۸﴾ **يَا أَيُّهَا النَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي الأَرْضِ حَلاَلاً طَيِّباً وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ**

**ئەی خەڵکینە! بخۆن لەو شتە پاک و خاوێنانەی زەوی، وە شوێن شەیتانیش مەکەون، بێ گومان شەیتان بە ئاشکرایی دوژمنی ئێوەیە.**

**تێهەڵڕوانین بە وردی:** ئەی ئینسان بخۆن لەو خواردمەنیانەی لە زەوی پەیدا دەبێ بەڵام وانا هەچی هاتە بەرت ڕایماڵی و دایماڵی، بەڵکە ئەو شتانەی یاسای ئایینەکەت بۆی بە حەڵاڵ داناوی، ئەو شتانەی خودا لێی قەدەغە کردووی بۆت نییە دەستی بۆ بەری، ئەو حەڵاڵ و حەرامەش دەبێ لە خودایڕا فێر بی و وەری گری نەک لە زاری ئەم و ئەو و ئارەزوو و هەوەسی دڵ؛ چونکە هەوا و هەوەس هەچی هەوەست بۆ چوو، بۆشت وە حەڵاڵ دەگێڕێ بە فتوای نارەوای خۆی.

## شرک و بتپەرستی

**لێکۆڵینەوە:** لە پێشدا بە توندی شیرک و بتپەرستانی وەبەر تەوس و لۆمە دا بەڵام دەشبێ ئەوە بزاندرێ بەشێک لە هاوتادانان بۆ خودا ئەوەیە کە نیزام و یاسای حەڵاڵ و حەرام لە غەیری خودا وەرگیرێ. قورئان ئەو کارە بە کاری شەیتان دەزانێ هەچی لە زەوی پەیدا بێ بە حەڵاڵی بزانێ و بێ یاسا و دەستووراتی ئایینی ڕایماڵێ و داپاچێ. و هەروا هەچی هەوەس و ئارەزووت چۆیە، سواری بێ و بیگەوزێنێ، ئەوە دوور لە یاسای خودایە، واتە دەبێ ئەو بەخششەی کە خودا بە هۆی ئەو ئاو و هەوا و زەویەی پێی بەخشیوی، بە هێز و تێزێکی ئیتاعە لە خودا بزانێ، نەک بە لەوەڕگە و مەزرای هەوا و هەوەسی سەرکەش بزانێ هەر وەسەر پەڕێ.

جوملەی ﴿إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ کە زیاتر لە ١٠ جار دە قورئانی پیرۆزدا بە دووی شەیتاندا هاتووە، ئاماژە وەلای ئەوەیە کە ئینسان هەچی هێز و توانای ئەقڵ و شعوور و هەستی ئیمانیەتی، بۆ بەرەنگار بوونی ئەو شەیتانی نەفس و هەوا وەکار خا و ئامادەی کا.

با ئەوەندەش پاش گوێ نەدەین: هۆی دابەزینی ئەو ئایەتی ١٦٨ دەڵێن ئەوانەن:

١. هۆز و قەبیلەیەک بوون وەک (ثقیف) و (خزاعه) و (عامر بن حعصعه) هەندێک لە میوەجات و سەوزە و حەیواناتیان بە حەرام دانابوون، بێ دەلیل و بەڵگەی ئایینی.

٢. هەروا هەندێک لەو کەسانەی کە لە یەهوودیەت دەستیان کێشابۆوە و پاڵیان وە ئاینی ئیسلام دابوو، لە سەر ئەساسی دەستووری پێشوویان واتە یەهوودیەت گۆشت و شیری وشتریان لە خۆ حەرام کردبوو، چونکە لە کاتی خۆیدا حەزرەتی داود پێغەمبەر بە حەرامی

دانابوون، ئەوانیش پاش ئەوەی کە هاتبوون ئیسلامیان قبوولْ کردبوو دەبا یاسای ئیسلامیشـیان لەمەڕ حەڵاڵ و حەرام قبوولْ بکردایە، بەڵام ئەو شتانەیان هەر بە حەرام دەزانی.

٣. موشـریکەکان لە زەمانی جاهیلیەتـدا هەنـدێکیان لە حەیـوان و پاتـاڵ بە نـاوی بتانیـان کردبوون و لە خۆیان حەرام کردبوون گۆشتیان، ئەو ناوانەیان لە سەر دانابوون (سایبە، وصیلە، حام). باوەڕیان وابوو ئیستیفادە لەو حەیوانانە حەرامە چونکە بە ناوی ئەو بتانەیان کردوون. جا خودای تەعالا بۆ پووچەڵ کردنەوەی باوەڕی وان ئەو ئایەتەی دابەزاندووە.

ئەو سێ شوێن و دەلیلە دەکرێ هۆی نازڵ بوونی ئایەتی ١٦٨ی بەقەرە بێ.

**پوختە و مەبەسـتی ئـایەتی ١٦٨:** وەشـوێن هەنگاوەکـانی نەفـس و شـەیتان مەکەون، واتە ئەگەر شتێکی خراپ دارژایە ناو دڵ و دەروونتان بە قسەی مەکەن و ئاوڕی وەسەر مەدەن، ئەوە فریوە لێت دەدا و وەسەر تەڵەت دەپەڕێنێ چـونکە بـێ گومـان بەر لەوەی کە نەفـس و هەوای شەیتانی دوژمنێکی بەڕاستی و ئاشکرایە. هیچ کات ڕێگـای چاکـت بـۆ دەس‌نیشـان ناکـات، بەڵکە هەر هان‌و دەدات بۆ لای خراپە و خراپەکاری، بەڵگە لەسەر ئەو ئیـدیعایە ئـایەتی ١٦٩ی بەقەرەیە:

**﴿١٦٩﴾ إِنَّمَا يَأْمُرُكُمْ بِالسُّوءِ وَالْفَحْشَاء وَأَن تَقُولُواْ عَلَى اللّه مَا لاَ تَعْلَمُونَ**

**وەنەبێ دەستوورو پێ بدا ئەگەر ئەمرو پێ دەدا ئەمـری خـراپ و ناشـیرین‌و پـێ دەدا و هەروا دنەشتان دەدا بۆ ئەوەش کە ئاگاتان لێی نییە کە بە دم خوداوە هەڵیدەبەستن.**

**ئـاوڕ وەسـەر دانەوەیەک:** نەفـس و هەوای شـەیتانی هەر فەرمـانی خراپتـان پـێ دەدات، فەرمانی واو پێ دەدات کە بەزار خوداوە شت هەڵبەستن بەو ئایینەوە کە نەزانـن و نەزانـدرێ بە ئاسانی خـودا فەرمـانی پـێ داوە یـا نەداوە، وەک هەنـدێک لە مێزەربەسـەرانی ئەورۆ لە ڕووی ئارەزووی خۆیانەوە فتوای شت دەدەن.

هەموو ئاین و یاسایەک کە لە سەرچاوەی خۆی تلاسـا کـرا و دوور خـراوە، جـگە لەوەی چاوەی بە لێڵ چاو دەکرێ بە بێ ئەرزشیشی دەڕواندرێتێ و زۆر شـتی پڕوپـووچ خـۆی لـوور دەکـاتە نـاو دەروونــی کە تـازە هەڵاواردنیـان ناتوانـدرێ. چـونکە بەشــی زۆری خەڵـک ئەو پڕوپووچانەی بە بەشێک لە ئایین وەرگرتووە و قبووڵی کردووە. تازە ئەگەر کەسێک پێیان بڵـێ: شوێن قورئان کەون کە دەستووری خودایە، ئەو شتانەی ئێوە ئەورۆ دەیکەن ئی خودا نـین و دە قورئان و سوننەتدا نین، دەڵێن بۆ مەگەر خەڵکی پێشوومان نەفام بوون ئەوانەیان کردوون، ئێمە

تـازە بە قسـەی ئێـر و ئەوەی شـوێنی ڕابردووانمـان بەرنـادەین، جـا پەنـا بە خـودا لە دەس دەستەڵاتدارانی هەواپەرست و ڕێبەرانی نەخوێندەوار.

## نەختێک دۆزین و پشکنینەوەی وەسوەسەی شەیتانی

دەکرێ بکوترێ و باوەڕیشی پێ بکەین کە شەیتان لە سێ ڕێگاوە بە زۆری ئینسانی بە تەفرە دەبا و هەڵیدەدێرێ:

١. دنەدان و تەڵقینی ئینسان بۆ لای کاری ناڕەوا

٢. لە بەرچاو شیرن کردنی کاری ناڕەوا و ڕازاندنەوەی بێ شەرمی و بێ حەیایی

٣. ئینسان ترساندن لە زاڵمانی دەسـتەڵاتدار، زل کردنـی سـەردارانی زۆردار و بێحەیـا و بێتەقوا.



## (سوء) چییە؟ (فحشاء) چییە؟

ئەو ئایەتە (١٦٩)یە ئیشارەیە وەلای (عدوّ مبین)ی ئایەتی ١٦٨ کە سێ ئەمر لە خۆ دەگرێ:

١. ئەمر بە (سوء) کە سوء هەموو خراپەیەک لە خۆ دەگرێ.

٢. ئەمر بە (فحشاء) کە فەحشاش بەشێکە لە سوء و لە ناحەزترین گوناهەکانە.

٣. ئەو سێهەمین کارە ناحەزەش ئەوەیە ﴿أَن تَقُولُواْ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ ئەوەش لە هەچی خەیانەت و تەوهین و بوختانە گەورەترە.

ئەو ئایەتە (١٦٩) هاوارە لە لایەن خوداوە بۆ وەی دڵ و گوێ بدەنە ئەو ئەمـرە نەهـیە: ﴿وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ﴾ کە لە ئایەتی ١٦٨دا بەیانی فەرمووە.

دڵ دەیهەوێ مانای (سوء) و (فحشاء) بزانێ و لێک جیا کرێنەوە. ئەمەش دەڵێین: فەحشاء لە سـەر نەزەری زۆربەی لۆغەتزانـانی عەرەب واتە (زنـا)، کە تـاوانێکی گەورەیە و خـاوەن حەددیشە. (سوء) گونـاهێکە بە قەت فەحشـاء گەورە نیـیە و خـاوەنی حەددیـش نیـیە. ئەمـما هەندێکیان کوتوویانە (سوء) هەموو گوناهێک لە خۆ دەگرێ حەتتا زیناش. بۆی بـڕوانە لە ابـو الفتوح رازی، تەفسیری شەعرانی، ج ٤/٣.

زۆر هەن لە قۆڵی سۆفیان و فیلسووفان کە کوتوویانە: فرشتەی خێرخـواز هێـزی ئەقـڵ و شعوور و هەستی ئیمانە، شەیتانی شەڕخواز هێزی هەوا و ئارەزووی شەهوانییە کە هەردووکیان

هەن دە ئینساندا و هێزیشیان بەرابەر بە یەک دە سەنگەردا دامەزراون.

لە سەر ڕاوێژی زانایان و پسپۆڕان و ژیرانی دووربین ئەو هەستە دەکرێ لە جوملەی ﴿وَأَن تَقُولُواْ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ کە ئەوە هێرشە بۆ سەر (مذهب فاسد) واتە بێ بنەما و بێ سەرچاوە و دوور لە کتێبە ئاسمانییەکان. و هەروا بۆ ئەهلی تەقلید واتە هەچەن تەقلید ڕێی درابێ و حەقیش بێ، بەڵام زۆر جاران وا هەیە بێ دەلیل بە دەم خودا و رەسوولەوە شتی وا دەڵێ و هەڵدەبەسێ کە لە جانتای ئایین و مەزهەبی خودا و رەسوولدا نییە و نەبیسراوە. بۆ زێدە زانین دەبێ ڕوو بکەیە ماڵە ئیمام فەخری ڕازی.

لە پێشدا ئاماژە وەلای ئەوەی کرا: سەربەخۆ و بێ دەلیل و پاڵدانەوە بە ئەساس و سەرچاوەیەک وەک کتێبە ئاسمانییەکان بن، حەڵاڵ و حەرام کردنی شت بە دڵخوای خۆت سەر دەکێشێتە هاڵۆزی و لێڵ و تاریکی ناو ماڵی ئایین و شەریعەتی خودا و رەسووڵ. سەرئەنجام بارانی خەرافات و فتوای نەزانان و هەوا و هەوەسی حاکمانی سەرەڕۆ دادەڕژێت و دادەبارێتە سەر گۆڕەپانی وڵاتی ئایینی ئاسمانی. جا بەو هۆیەوە شین دەبێ و دەڕوێ دڕوودال و چقڵی وا کە ڕێی ڕۆیشتن بە شەقامی ئایینی ئاسمانیدا دەگیرێ و نامێنێتەوە. وەک ئەوڕۆ کە زۆر بە ڕوونی چاو دەکرێ. دین و ئایین بۆتە دەستووری دەستەڵاتداران و فتوای وەشوێن کەوتوویان. جا ئەودەم بە هۆی دمەلاسکەی سەرەڕۆیان و داب و باوپەرستانی نەفام قسەی خودا و رەسووڵ نایەنە سەلماندن. بۆ تەئیدی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٧٠ی بەقەر کە ئەگەر بە چاوی ورد و ئینساف و باوەڕەوە سەیری سیمای دەروونی کرێ، باوەڕ دەکرێ کە ئەوڕۆ هەمان ڕۆژ و کات و دەورانە کە ئایینی وەحی کراوەتە ڕەنج و میحنەت و ناڕەحەتی و عەزاب بۆ عالەمی سەر زەوی، بۆیە خەڵکیش بە زۆری بێزاری دەردەبڕێ لە ئایینی ڕەحمەت و بەرەکەت و ئەمن و ئەمان و ئازادی.

ئەوەش ئایەتی ١٧٠، سەیر کە و دڵی دەیە:

**﴿١٧٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ شَيْئاً وَلاَ يَهْتَدُونَ**

کاتێ کە بکوترایە وەشوێن ئەو یاسا و بەرنامە کەون کەوا خوای زانا بە عینوانی ڕەحمەت ناردوویەتی بۆ سەر ئینسان، دەیانکوت نا، هەر لە سەر ئەو شتە دەبین کە باب و باپیرانی خۆمان لە سەری بوون. هەچەن باب و باپیرانیشیان گەوج و نەفام بووبن و ڕێی ڕاستیشیان

**نەدۆزیبێتەوە (هەر ئەومان پەسندە لە ڕێی دی).**

جا سەیر کە باغ بێ باغەوان و چتە و گۆرانیش بێ بەزە و بێ ئینساف، چی دەمێنێ؟!

**تێڕوانینێک بە وردی:** قورئان لێرەدا قسەکەی نەبردنە دواوە، بە بەڵگە و نیشانە. بەڵکە هەر لە سەرەتای قسە کردنا نیشانی دان کە بیر و باوەڕەکەیان پووچ و بێ بنەمایە، بۆیەش وای کرد خودا تا نیشان بدا کە ئەوانە لە بەڵگە و دەلیل ناگەن لە بەر قومبوونیان دە زەلکاوی جەهل و سەرەڕۆییدا، و ئەو لێهاتووییەیان نییە کە قسەیان دەگەڵ بکرێ، وەک حەیوان و پاتاڵ وان ئەوانە، شوان بیاندوێنێ نافامن، مەگەر بە پێی عادەتێکی کە شوانە بۆ خواردن و لەوەڕ و ئاودان فێری کردبن.

ئەقڵ و زانست و شعوور دەو ئایەتەدا هەست بەوە دەکا و دەرکی دەکا کە خودای تەعالا حاڵی قەومێکی دەنوێنێ و نیشان دەدا کە شوێنکەوتووی شەیتانن کە حازر نەبوون لە وەدواکەوتنی بێدەلیل و کوێرکوێرانەی بێباوەڕان و موشریکەکانی ڕابردوویان دەس هەڵگرن، و هەروا ئاماژەش وەلای خواردنی حەڵاڵ و لادان لە حەرامیش دەکا.

زانست و شعوور لە جوملەی (لایعقلون شیئا)دا و هەروا (و لا یهتدون)دا ئەوە دەرک دەکەن و هەستی پێ دەکەن کە ڕێدەرکردن و سەردەرکردن بۆ لای خوداناسی و بەهرەی شەرعی پاکی ئەو بە دوو شت نەبێ نابێ. ئەو دوو شتەش ئەوانەن: ١. ئەقڵی سەلیم و پاک و سرشتی ٢. تەعلیم و تەربیەتی دروست.

جا لێرەدا دەردەکەوێ کە موشریکەکان و باب و باپیرەکانیان نە خاوەنی ئەقڵی سەلیم بوون و نە تەربیەتی ئەخلاقی.

ئەوەی بە سبووت گەیی لە لایەن ژیران و خاوەن هەستان ئەوەیە: شوێنکەوتنی نەزان لە نەزانی، ڕۆیشتن بە تاریکاییدایە. و هەروا شوێنکەوتنی ڕابردووان و کەسانی خۆت ئەگەر لە سەر بنەما و ئەساسێکی لێکدانەوە و بەرجەوەندی نەبێ، ئەوەش خۆ هەوسار کردنە و خۆ بەستنەوەیە. ڕێگای گەیشتن بە حەق و حەقانیەتت لێ دەبەسترێ و لێ دەگیردرێ. چونکە هەر بەرەی داهاتوو لە بەرەی ڕابردوو دەبێ ژیر و وریاتر بێ لە چین و بەرەی ڕابردوو بە هۆی تەجرەبە وەرگرتن لە ڕەفتار و کرداری وان.

ئەوجار دەبێ بەرجەوەندی ئەوە بین کە خودای تەعالا میسال و وێنەی کافران بەوە دێنێتەوە کە هاوار و هەرا لە کەڕ و نەبیس کرێ واتە کافر بە کەڕ دەژمێردرێ لە فەرهەنگی ئایینی

ئاسمانیدا، کەچی ئەوڕۆ وا چاو دەکرێ هەر بە ناو ئیسلامن خۆ داوێنە بن پەناگـای کـافران، ـ بە داخەوە.

دەچینە خزمەت ئایەتی ١٧١ بۆ ئەو مەبەستە.



**﴿١٧١﴾ وَمَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ الَّذِي يَنْعِقُ بِمَا لاَ يَسْمَعُ إِلاَّ دُعَاء وَنِدَاء صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ**

**نموونەی ئەو بێبڕوایـانەش کە بانگەشـەی کـافران دەکەن وەک کەسـێکە کە بە سـەر مەڕ و ماڵاتدا دەقیڕێنێ و هەر تەنیا دەنگ و قیڕەکەی دەبیسن و ئیتر هیچی لێ تێناگەن، کەڕ و لاڵن، کوێر و بێئەقڵ و ئاوەزن و لە هیچ ناگەن.**

**ئـاوڕ وەسـەر دانەوەیەک:** قورئـان بـێئەوەی قسـەکەیان بەرێـتە دواوە، هەر لە سـەرەتای قسەکەیاندا نیشـانی دان کە بیـر و باوەڕەکەیـان بێبنەمـا و بێئەسـاس و هیچوپـووچە، تـاکوو بەباشـی تێـبگەن کە تێنـاگەن و شـایانی ئەوەی نـین باسـیان دەگەڵ بکـرێ. ئەوانە وەک شوانەوێڵەیەک وان کە هاوار لە ئاژەڵێک بکا کە ئاژەڵەکە هـیچ نابێـت مەگەر ئەوە ببـیەت کە بە پێی عادەت بۆ سەر لەوەڕ و ئاو فێری بووبێ. ئەو ئاژەڵە لە بۆ ئەو عادەتەی بانگ کرێ دەچـێ. ئاژەڵ دەسڵەمێتەوە بە دەنگێکی بەرز کە بانگ کـرێ بـێئەوەی بزانـێ ئەو دەنـگە بەرزە چیـیە و بـۆچییە، تەنیـا گوێبیسـە و دڵنەبیسـە و نەزانە. ئەو بێبـاوەڕانەش وان، حـاڵی نـین لە هـیچ مەبەست و مەتڵەبێک، لە پاتاڵ گومڕاتر و ناحاڵیترن. بەڵکە پاتـاڵ لەوان چـاترن چـونکە پاتـاڵ دەبیسێ دەنوێ و هاوار دەکا لە کاتی نیازیدا. وەک خواردن و ئاو بەڵام بێباوەڕ و کـافر کەرن، لاڵن، کوێرن، خۆ دیارە هەر ئەو سێ شتەشن کە ئینسان لە ئاژەڵ هەڵداوێرێ. واتە ئینسان حەق دەبیسێ و حەق دەڵێ و حەق دەبینێ. چـونکە ئەسـبابی ئەوانەی هەیە. ئەگەر ئەو ئەسـبابانە دە کار نەکا لە جێی خۆیدا، ئەوە ئەو کات لە خواروی حەیوانە چونکە حەیـوانە ئەو ئەسـبابانەی نییە تا داوای وانی لێ بکرێ بەڵام ئینسان هەیەتی. واتە: لَهُم قلوبٌ و لَهُم آذانٌ، و لَهُـم اَعـیُنٌ. جا ئەگەر دەکاریان نەکا، تاوان دەکا.

نموونە و وێنە: کـافرانی بێشـعوور کە بـت دەپەرسـتن وەک ئەو شـوانەی وان کە دەگەڵ ئاژەڵ دەدوێن و داوای نیازیان لێ دەخوازن. خۆ ئاژەڵ نازانێ شـوان چـی لـێ دەوێ هەروەک بت نازانێ بتپەرست چی لێ دەوێ.

و هەروا مەسەلەی ئەو کافرانەی کە وەشوێن باب و باپیرانیان دەکەون لە خەمی کافریدا، هەروەک ئەو شوانەوێڵە وان کە دەگەڵ پاتاڵ و ئاژەڵ دەدوێن خۆ دیارە پاتاڵ دواندن بێفایدەیە چون حاڵی نابن و وڵامیان پێ نییە.

بەرگری لەو پرسیارە: هەچی خاوەن گیانە، ئەقڵ و شعووری بۆ پاراستنی گیان و ژیان دراوەتێ لە لایەن خوداوە کە وابێ چۆن دەکرێ بە پاتاڵ بکوترێ بێئەقڵ و یا بە کافری لە ئاژەڵ کەمتر. بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە پێشەکی دەس دەگرین بە گوفتەی حەزرەتی عەلی کە فەرموویەتی: (اَلعَقلُ عَقلانِ: مطبوعٌ و مسموعٌ) ئیمام فەخری ڕازیش فەرموویەتی: عەقڵی مەسمووع ناتوان لە هەدەف دا و بپێکێ هەتا عەقڵی مەتبووع یاریدەی نەدا. ئەقڵی سروشتی خودا بەخشیویەتی بە گیان بە تایبەتی گیانی ئینسان. ئەقڵی کەسبیش واتە مەسمووعی لە ڕێی کەسب و تەجرەبە دێتە دەست. کافر هەر لە هەوەڵەوە چاوەی ئەقڵی سرشتی کوێر دەکاتەوە بۆیە ناتوانێ لە ئەقڵی مەسمووعیش واتە تەجرەبە سوود وەرگرێ. بۆ زێدەزانین بچۆ لای ئیمام فەخری ڕازی هەمان ئایەت.

**بەراوردێکی قووڵ و ورد:** تەواوی ئەقڵ و شعوور و هەست و تێگەیشتن حەتتا زانستی نهێنیش، لە سەر شتانی ئاشکرا و حەواسی لەشی داڵبەند و دابەستراوە و دەتوانن بە ئاکام و بەرهەمی نیاز بگەن. ئەمما وەدوا کەوتنی کوێرکوێرانە واتە تەقلید و وەشوێن کەوتنی هەوا و هەوەسی سەرەڕۆ و حەواس و ئەسبابانی زیت و زانا و پسپۆڕ لە دەرک و تێگەیشتندا دەڕووتێنن واتە ئینسان لە هەر دەرک و دەراوی پەڕینەوە وەدوور دەکەوێ. ئەو کافرە بێباوەڕانەش وان بە هۆی وە شوێن کەوتنیان لە هەوا و هەوەس لە زەل و زۆنگی نەزانیدا ڕۆچوون و داماون، بۆیە ئاوڕی ژیرانە وەسەر وتارەکانی پێغەمبەر نادەنەوە و بەرجەوەندی نابن وەک بوغز و حەسادەت بەری دڵی گرتبن وان. کەوتوونە سەر خەتی ئاژەڵ و پاتاڵ، هاوار و جاڕی جارچیان خێر و حەسەناتی حەق بە هێند وەرناگرن، چونکە دەزگای حەقبیستن و حەقبینییان لە کار خستووە. جا بۆیە خودای تەعالا بە کەڕ و لاڵ و کوێری داناون. بە کوردی حەقنەبیس و حەقنەوێژ و حەقنەبینن.

ئەگەر بە چاو و دڵێکی پڕ لە هەست و ژیرانە سەیری ئایەتەکانی ڕابردوو بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە خودای تەعالا تا ئێرە لە سەر ئەوانە دوا و باسی کرد کە بۆ قازانجێکی هیچوپووچێکی دنیا وەشوێن سەرۆک و گەورەکانی دنیا کەوتوون. هەروەک پاتاڵ و ئاژەڵ

دوای شوان دەکەون. بۆ لەوەڕ و ئاو و سەرحەوشەی مۆڵ و حەسانەوە. خودای خـاوەن عەدڵ و بەزە بـانگی لە هەمـوو ئینسـان کـرد و دەکـا کە چـاو نەبـڕنە ئەو ڕێبـازە پـڕ فـڕ و فێـڵ و هەوەسپەرستییە. بەڵکە تێکۆشن تا بە هۆی شان و بازووی بەهێزتـان بـژین و ژیـان تێـپەڕ کەن ئەمیش لە پشتتانم و یاریدەو دەدەم ڕوونە کە نە دەرگای دنیاپەرستان کە بەرهەم و ڕەنجی شـانی ئینسـانانی بە تـاڵان دەبەن و دەخـۆن، و ئێوەشـی لە سـەر بەکـرێ دەگـرن کە ڕێ نەدەن ئەوان نەفەسی ئازادانە و سەربەستانە بکێشن.

ئەدێرەدایە خودا بانگاواز و هەرا دەکا لە خاوەن باوەڕان و بەزیبکو ڕاپەڕان بە ئایەتی ١٧٢ی بەقەرە کە چۆن بژین و چۆن بین. ئەگەر ڕاست دەکەن دەگەڵ خـودان بە عەمەل، دەنـا قسـە و چاووڕاو ڕەواجی نییە لە بازاڕی خودادا.

**﴿١٧٢﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ**
**ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان هێنـاوە لەو ڕزق و ڕۆزیە پـاک و خـاوێنە بخـۆن کە کـردوومە بە ڕۆزیتان. و شوکر و سپاسی خودا بکەن ئەگەر ڕاست دەکەن هەر ئەو دەپەرەستن.**

**تێڕوانین و دۆزین**: خودا بانگ دەکا لەو کەسانەی کە خاوەن بـاوەڕن دەفەرمـوێ: ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتـان بە خـودا و ڕۆژی حیسـاب و لێپرسـینەوە هەیە، بخـۆن لەو خـۆراک و خواردەمەنیـانەی کە خـودا و ڕەسـووڵ فتوایـان لە سـەر داوە کە بـریتیە لەو خـۆراکە پـاک و خاوێنانەی ئایین پێی ڕەوایە، چونکە هەچی ئایین پێی ڕەوابێ ئەوە پاکە و ئەوەی ئایین پێی ڕەوا نەبێ، با لە زاتی خۆشیدا پاک بێ وەک ئاژەڵی دزراو، ئەوە ناپاکە لە بەر دزیەتی.

و هەروا لە سەر خـواردن و خـواردنەوەی ڕزقـی حەڵاڵ و خۆشـی لەزەتـی حەسـانەوە و ئەمنیەتی ژیان و حاوانەوە، شـوکر و سپاسـی خـودا بـکەن ئەگەر ڕاسـت دەکەن خودانـاس و خوداپەرستن. خودا ئەگەر هەندێک شتی لێ مەنع کردوون وا نەزانن کە خودا بەرگری کردوون لە نیعمەت و لەززەت بەڵکە لە بەر ئەوەیە بۆ لەشو سازگار نییە، دەرد و ئێشی لە دوو دێ. وەیا بڵێین تاقی کردنەوەی تێدا.

## پوختەی مەبەستی ئایەتی ١٧٢

بە نەختێک ئاڵوگۆڕ و تەغییرات دەتوانین بڵێین ئـایەتی ١٦٨ە دووپـات کـراوەتەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە ڕوبەڕوو کردنەوەی ئەو دوو ئایەتە دوو ڕازی نازک دە مە دەگەیێنێ:

١. دە ئایەتی ١٧٢دا خودا دەفەرموێ بە ئینسان بخۆن لەو خواردەمەنی پاکەی کە بە عینوانی ڕۆزی داومنێ.

٢. بەڵام دە ئایەتی ١٦٨دا خودا دەفەرموێ: ئەی ئینسان بخۆن لە خواردەمەنیانەی کە لە ناو زەویدایە.

ئەو تەغیرات و ئاڵوگۆڕە، ئەگەر ورد بەرجەوەندی بێ، ئەوەی لێ هەست دەکرێ: نیعمەتەکانی پاک و خاوێن و لەزیز، دە ئەساسدا بۆ خاوەن ئیمان و باوەڕ پێکهاتووە چونکە ئەوان ئیتاعەکێشی خودان وشایانی نیعمەتی خودان. و ئەوانەی ئیتاعە لە خودا ناکەن و ناسپاس و ناشکور و بێباوەڕن، لە سایەی بەرەکەتی خاوەن ئیمانەکان، بەهرەی لێ وەردەگرن و دەیخۆن. هەروەک ئاوێکی فەلاح و کەشاوەرز زەوی و دەخڵودانی پێ دەدێرێ لە سایەی دەغڵودانەکە دڕوداڵ و گیاوگۆڵی غەیری گەنمەکەش بەهرە لەو ئاوە وەردەگرن. ئە دێرەدایە خودا بە عالەمی ئاسایی دەفەرموێ: بخۆن لەو خواردەمەنیە بەڵام ئیتاعە لە شەیتان مەکەن، وەک لە ئایەتی ١٦٨دا ئاوا هەست دەکرێ. بەڵام دە ئایەتی ١٧٢دا خودا دەفەرموێ ئەی خاوەن باوەڕان بخۆن لە غەزای پاک و خاوێن کە کردوومەتە ڕۆزیتان و سپاس و شوکریشم بکەن، ئەگەر ڕاست دەکەن. دەو تەغیراتەدا ئەو ڕازە چاو دەکرێ و هەستی پێ دەکرێ: دە ڕاستیدا عالەمی عادی تەنیا ئەوەی لێ چاوەڕوان دەکرێ گوناە نەکا ئەمما دە عالەمی خاوەن ئیمان و باوەڕدا چجای ئەوە چاوەڕوانی گوناە نەکردنیان لێ دەکرێ، ئەو چاوەڕوانیەش دەکرێ کە ئەو نیعمەتەی دە چاترین ڕێگادا بە کار بەرن و ناشکوری پێوە نەکەن.

دەشکرێ وا بڵێین و باوەڕ کەین کە دووپات کردنەوەی کەڵک وەرگرتن لە خۆراکی خاوێن و تەمیز دە ئایەتەکاندا پەرچدانەوەی هەندێک لە ئادابی دەورانی جاهیلی بێ، کە بێ دەلیل بەشێکیان لە نیعمەت و خۆراک لە خۆ حەرام کردبوو لە سەر ئەساس و باو و دابی عورفی جاهلی. تەنانەت ئەو دابە غەڵەت و بێبنەمایانە وەک وەحی ئاسمانیان دەپاراست و زۆر جاری واش بوو پاڵیان وەلای خودا دەدا. بەو پێیە بە جێگای خۆی دەزاندرێ کە بکوترێ: دووپات کردنەوەی ئەو پاکیەی خۆراک واتە (طيّبا) دە دوو ئایەتی ١٦٧ و ١٧٢ی بەقەرە ئەوە بێ: قورئان دەیهەوێ ئەو بیر و باوەڕە غەڵەتەی بێباوەڕان کە حەرامکردنی نیعمەتانی پاکە لە سەر ئادابی نەزانیان لە میچک و دڵیاندا دەراوێ و ڕاماڵدا. و هەروا لە خواردنی خۆراکی ناپاک وەک گۆشتی مردار و دڕندە و خواردنەوەی شتی هۆشبەر وەدووریان خا.

کە لە سەر ئەساسی نیزام و دەستووراتی بەنەزمی جوان و ڕێکوپێکی کەلامی باری (قورئان)، باسی خۆراکی پاک و ناپاک کرا و هاتە ڕوو، شایانە و ڕەوایە لە لای خودا بە ڕوونتر و بەربڵاوتر باسێ لە حەرامی شتانی ناپاک بکرێ. بەو پێیە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٧٣ کە لەسەر ئەو بابەتە دەدوێ و دەڕوا.

﴿١٧٣﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ

**خودا تەنیا گۆشتی مردارەوەبوو و خوێن و گۆشتی بەرازی لێ حەرام کردوون. هەروەها (مَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللّهِ) واتە گۆشتی ئەو حەیوانانەشی لێ حەرام کردوون کە لە کاتی سەربڕینیاندا ناوی غەیری خودایان لەسەر دەبرێت خواردنی ئەو شتانە حەرامە، مەگەر بۆ کەسێک نەبێت کە برسێتی تەواو پەکی خستبێت و وەختە بێت بمرێت و هیچی دیکەی دەس نەکەوێت. بەڵام ئەو کەسەی کاتێک لەو حاڵەتە ناچاریەدا دەیخوات (غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ) دەبێت پێش برسیەتیەکەی حەزی لێ نەبووبێت. کاتێکیش کە خواردی، زیاد لە ڕادەی خۆی نەخوات بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر پێشتر ئارەزووی لێی هەبووبێت، یان لە خواردنیدا زیادەڕەوی کرد، ئەوە بێگومان خودا لێی خۆش بووە و زۆر بەڕوحمە.**

## ئەو شتانەی لە ئینسان قەدەغە کراون

**وەردانەوەیەک:** خودای تەعالا دەیهەوێ ئەو شتانەی قەدەغەی کردوون لە ئینسانی، بە ئینسانیان بناسێنێ وەک مردارەوەبوو کە زیانی هەیە بۆ ئینسان، جگە لەوەش شتی وا هەیە دڵ بێزێ لێ دەکا و بە قێز و بێزیشەوە بۆی ناخورێ. دیارە دەبێ ئەوە بزاندرێ مردارەوەبوو هەر ئەوە نییە کە ئێمە بیستوومانە و بەبێ سەربڕین گیانی دەرچووبێ بەڵکە ئەوەی بەبێ شەرعیش سەری بڕابێ هەر مردارەوەبوویە. جا کەیفی خۆیەتی خنکابێ، یا کوژرابێ، بە شتی قورس یا پسابێ بە هەڵدێران، یا ملی شکابێ یا دڕندە زگی دڕیبێ، وەک لە سووڕەی مائیدەدا ئایەتی ٣ بۆی بەیان کردووی:

حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُواْ بِالأَزْلاَمِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمْ فَلاَ تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ

مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣﴾

لەو ئایەتەدا خودا باس لەو گۆشتانە دەکا کە حەرام کراوە خواردنیان وەک ١. گۆشتی حەیوانی مندارەوەبوو ٢. خوێن ٣. گۆشتی بەراز ٤. حەیوانی خنکاو ٥. ئەو حەیوانەی بە لێدان دەمرێت ٦. ئەو حەیوانەی کەوتبێتە خوارەوە لە بەرزایی و گیانی لە دەس دابێ. ٧. ئەو حەیوانەی کە بە تێهەڵدانی حەیوانێکی گیانی لە دەس دابێ. ٨. ئەو حەیوانەی دڕندەیەک کوشتبێتی. ئەمما ئەو حەیوانانەی پێش گیان لە دەس‌دانیان سەریان ببڕێت و بەو سەربڕینە گیانی بڕوا، ئەوە گۆشتیان حەڵاڵە. ئەوەش جۆری ٥، ٦، ٧ و ٨ دەگرێتەوە.

لە سەردەمی پێغەمبەردا چەن بەردێک لە دەوروبەری کەعبەدا هەبوون عەرەبەکان دابیان وا بوو کاتێ حەیوانێکیان بکردایە قوربانی بۆ بتەکانیان، لە سەر ئەو بەردانە سەریان دەبڕین جا لەو بارەوە خودا دەفەرموێ: هەر حەیوانێکیش لە سەر ئەو بەردانە و بەو شێوەیە سەربڕابێت گۆشتەکەی حەرامە.

ئەزلام: واتە سێ تیکە دار لە سەر شێوەی تیری بێ سەر کە یەکیان لە سەری نووسرابوو (خودا فەرمانی داوە)، یەکی دیشیان لە سەری نووسرابوو (خودا فەرمانی نەداوە). سێیەمینیان بێ نووسراوە بوو. عەرەبەکانیش باویان وا بوو ئەگەر ویستبایان کارێکی بکەن، ئەو سێ دارەیان تووڕ دەدا و دەیانسووڕاند ئەگەر یەکەمیان دەربچوایە، ئەوە ئەو کەسە بە دڵنیاییەوە کارەکەی ئەنجام دەدا. ئەگەر دووهەمیان دەربچوایە ئەوە کارەکەی واز لێ دێنا و نەیدەکرد. ئەگەر سێیەمەکەیان دەربچوایە، ئەوە دووبارە ئەو کارەی بەو شێوەیە وەردەداوە هەتا داری هەوەڵ یا داری دووهەم یەکیان دەردەچوو. ئەوە جۆرێک بوو لە فاڵ گرتنەوە. بە داخەوە ئێستاش خەڵکی نەفام هەن پەنا بۆ فاڵ دەبەن.

ئەوجار خودا دەفەرموێت (ذلک فسق) واتە ئەوانەی باس کران، حەرامن و لادانە لە ئایینی خودا. جوملەی ﴿الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ...﴾ مەبەست لە (یوم) ڕۆژی عەرەفەی ساڵی دەهەمی کۆچییە کە پێغەمبەری خودا دەگەڵ موسوڵمانەکاندا لە حەجی ماڵئاواییدا (الوداع) لە داوێنی کێوی عەرەفە بوون. فەرمووی لەو ڕۆژەدا بێباوەڕان نائومێد بوون لەوەی کە ئێوە واز لە ئایینی خۆتان بێنن و بە سەرتاندا زاڵ بن. جا ئێوەش لێیان مەترسن بەڵکە تەنیا لە من بترسن. ئەوڕۆ دەستووراتی ئایینەکەتانم تەواو کردن شەریعەتەکەتانم تەواو کردن، هەروا بەخشش و فەزڵی خۆشم ڕژاندە سەرتان بەوە ڕازی بووم کە ئایینی ئیسلام ئایینتان بێ. و ئەگەر برسێتی هێرشی بۆ

هێنان و شپرزەی کردن ئەوە لەو کاتەدا دروستە بۆ بەقای مان لەو خواردەمەنیە حەرامـانە بخـۆن بەر لە واز و حەز لە خواردنا، بەڵکە وەک حەرامێـک بـۆ وەی نەمـرێ بخـوا. دیـارە خـودا هەم حەکیمە و هەم ڕەحیمە هەم ببوورە.

**ئاوڕدانەوەیەک بۆ سەر ناوەرۆکی ئایەتی ١٧٣ی بەقەرە:** خوێن خـواردن لە بەرچـی حەرام کراوە؟ خوێن وەک زاندراوە لە تەبیبـان و ئەقڵـیش وەریـدەگرێ شـتی وای تێـدایە زیـانی هەیە خواردنی بۆ لەش کەوایە حەقی خۆیەتی قەدەغە بکرێ و ئینسانیش بێـزی نـایە خـوێن وەخـوا چونکە دڵ بێزی لێ دەکا لە بەر ئەوەی قورسایی دەخاتە سەر لەش و گیـان. بەر لەوەش شـتی وای تێدایە کە بە گەرم کردن و کوڵینیش لاناچێ و پا نابێتەوە دەگەڵ ئەوەی خـوێنیش نـاکوڵێ. حەرامی گۆشتی بەرزایش بە پێی لێکۆڵینەوەی تەبیبیان ئەوەیە: گۆیا دوو جۆرە کرمی زۆر پیسی هەیە و دەیانخاتە ناو لەشی ئەوانەی دەیخۆن، یەکیـان لەو دوو کرمـانە پێـی دەکـوترێ «کرمـی تاقانە» واتە «الدودة الوحید» کرمەکەی دیکە پێـی دەکـوترێ «مـووە پێچپـێچکە» واتە «الشـعرة الحلزونیة». جگە لەوانەش بەرازیش حەیوانێکی پیس‌خۆرە، بە زۆری خواردنی مشک و جرجی تۆپیوە.

بەر لەو هەموو ئەو بێنە و بەرەیە، حەرامی گۆشتی بەرزای لە خوداوەیە خۆ ئەوەش یەقیـنە خودا ئینسانی خۆش دەوێ هیچ کات نایهەوێ گیان و لەشی تووشی زەرەر و زیان بـێ. ئەگەر گۆشتی بەراز زیانی نەبایە بۆ ئینسانی، خودا لێی قەدەغە نەدەکرد. دەبێ ئەوەش باوەڕ کەین ڕاز و ڕموززەکانی ئەمر و فەرمانەکانی خودای تەعالا هەموو نازاندرێن ئینسان دەبێ تـا دەتـوانێ لە دەلیل و ڕازی حەڵاڵ و حەرامەکان وەکۆڵێ ئەوەی نەیزانی نابێ وەلای نێ، بەڵکە دەبێ قبووڵی کا و وەریگرێ بە ئەمری بـاری. بشـڵێ ڕازەکەی نـازانم دە عیلمـی خـودادایە. ئەوەی زانیشـی وەریگرێ.

**تیوتیوە:** دیارە خودای مەزن بە چەن شتی حەرامی تایبەت ئیشارەی فەرمووە ئەمما ئەوانەی گیانیان کەوتە خەتەر و ناچار بوون بەرگری لە نەمانیان بکەن خودا ڕێی پـێ داون بە ئەنـدازەی پارازتنی گیانیان لە نەمان لەو حەرامکـراوە بخـۆن. بەو مەرجـانە: بە خـاتری لەززەت پەرسـتی نەبێ، و هەروا لە سنووری خۆی کە حیفزی گیانە تێپەڕ نەکا. ئەوکات ئەو خودایەی کە حوکمی حەرامی بە سەر ئەو خواردەمەنیانەدا داوە، دەو کاتە سەخت و تەنگانەیەدا لە سـەری لادەبـا بـۆ ناچاریان. بەڵام کەسانێکی کە بە هۆی دەس‌درێژی و زوڵـم و زۆری دوچـاری ئەو سـەختی و

تەنگانەیە بن گەرچی ئەوانیش بە ئەندازەی بەقای گیان ڕێ دراون بخۆن، بەڵام بە حەرامیـان لە سەر دەژمێردرێ. چونکە لە ڕێگای ناڕەواییدا خۆیان تووشی ئەو تەنگانەیە کردووە.

وا دەردەکەوێ و هەست پێ دەکرێ کە تا ئێرە باس لەوەی کـرا سـەراپای ئەو خواردنـانەی سەر زەوی بۆ موسوڵمان حەڵاڵە، چونکە ئەوە پەیـڕەوی خـودایە و نیعمەتـی خـوداش بـۆ وی ڕەوایە، چەن شتێکی کەم نەبێ کە ناویان بـرا. جوولەکەکـان دەگەڵ موسـوڵمانەکان لەو بـارەوە دەکەوتنە مشتومڕ و دەمەقاڵێ، چ لە بابەت حەڵاڵ کراوەکان، چ لە بـابەت قەدەغەکراوەکـان. چونکە هێندێک شت هەبوو لە موسوڵمان قەدەغە نەکرابوو، بەڵام لە جوولەکە قەدەغە کرابـوو، وەک لە ئایەتی ١٤٦ی ئەنعامدا ئاماژەی وەلا کراوە:

وَعَلَى الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٍ وَمِنَ الْبَقَرِ وَالْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَا إِلاَّ مَا حَمَلَـتْ ظُهُورُهُمَا أَوِ الْحَوَايَا أَوْ مَا اخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ذَلِكَ جَزَيْنَاهُم بِبَغْيِهِمْ وِإِنَّا لَصَادِقُونَ

**قەدەغەمان لە جوولەکە کرد ئەو حەیوان و باڵنـدانەی چڕنووکـدارن (نینۆکـدار) و هەروا پیـوی گـا و مەڕ. مەگەر ئەو پیوەی کە دەگەڵ ئێسک تێکەڵاو بـووبێ و هەروا دە پشـتیدا بـێ یـا دە نـاو زگیـدا بـێ. چونکە ئەو شوێنانە مەرکەزی هێز و توانان. شتی وایان دەناودا بەتام و لەزەتی تەواو.**

و هەروا هەندێ شت هەبوو لە موسوڵمان قەدەغە کرابوو، دەگەڵ ئەوەی لە تەوڕاتیشدا کە کتێبی خۆیان بوو لەوانی قەدەغە کردبوو بەڵام حاشاریان دەدا و دەیانشـاردەوە بەڵام بـۆ کرمـێ کردنـی دڵـی موسـوڵمانان و مـۆرکەدار کردنـی بیـر و باوەڕیـان، دەیـانکوت ئەوانە بـۆچی لە موسوڵمانان قەدەغە کراون تاکوو دوودڵی و دڕدۆنگی بکەوێتە نـاو دڵیـانەوە لەمەڕ ئایەتەکـانی قورئان. جا خودای تەعالا بۆ پەرچدانەوەی قسە و پرسـیارەکانیان و ئاشـکراکرانی درۆکانیـان و لەقاودانی ئەوەی دەیشارنەوە لە ناو قوجنی دڵیان، ئایەتی ١٧٤ی بەقەرە دادەبەزێنێ:

**﴿١٧٤﴾ إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلَ اللّهُ مِنَ الْكِتَابِ وَيَشْتَرُونَ بِهِ ثَمَنًا قَلِيلاً أُولَـئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلاَّ النَّارَ وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ**

**ئەو کەسانەی فەرموودەی خـودا حاشـار دەدەن وەیـا بە شـێوەیەکی وای دەخەنە ڕوو کە هـۆی ڕەزامەنـدی سـتەمکار بـێ، و هەروا ئـایەتی خـودا بە نرخێکـی بێبەهـا و کەم دەگـۆڕنەوە و بازرگانی پێوە دەکەن، ئەوە ئەوەی لەو ڕێگایەوە دەسـتیان دەکەوێـت و دەیخـۆن بە ڕاسـتی لە ئاگر زیاتر شتێکی دیکە نییە. خودا لە ڕۆژی ئاخرەتدا ڕوو ناکاتە ئەوانە و قسەیان دەگەڵ ناکا و لە گوناە پاکیان ناکاتەوە. ئەوانە سزایەکی سەختیان بۆ دانراوە. ئەوە هەڕەشـەیە لەو کەسـانە کە زانان و فەرمانی خودایان بە دینار و سامان گۆڕیوەتەوە و یا لە پێناو خۆشحاڵی ستەمکار و**

**سەرەڕۆ مانای ئایەتەکانی خودایان ئاوەژوو کردۆتەوە.**

**تێڕوانین و لێوردبوونەوە:** ئەو کەسانەی فەرمانی خودا با هەڵدەدەن و ڕاستیەکەی وەپاش دەدەن لە تەورات و لە قورئان وەیا لە هەر بارێکەوە، حەق لە حەق وەردەگێڕن و دەیفرۆشن بە نرخێکی کەم، ئەو نرخە کەمەی دەستیان دەکەوێ و دەیخۆن، ئەوە ئاگرە و دەیخۆن و دەیخەنە ناو زگیانەوە، واتە کاتێ دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە دەزانن چییان خستۆتە ناو زگیان. و هەروا خودا لەو ڕۆژە سەختەدا کە ئەو نەبێ کەس ناتوانێ پەنا بێ و وەتگرێ، پەنات نادا و ڕووت تێناکا و ناتدوێنێ. چونکە ئەوانە ڕۆژی خۆی واتە لە دنیادا هیچ ئاوڕێکی بەخێریان وەسەر خودا نەداوە، تاکوو خوداش لێرەدا ئاوڕیان وەسەر بدا و لە گوناە و تاوان پاکیان وەکا.

## حاشاردانی حەق

**تیوتیوە:** ئەو ئایەتە تەئیدی مانای ئایەتی ۱۵۹یە لە مەڕ حەق قووتدان و حاشار دان واتە ئەو کەسانەی بە پێچەوانەی ئەمری باری بەڵکە بە هەوای هەوا و ئارەزووی سەرکەشیان حەلاڵ حەرام دەکەن و حەرام حەلاڵ دەکەن ناڕەوا ڕەوا دەدێرن، ڕەوا بە ناڕەوا دەژمێرن، دەگەڵ ئەوەی تەرازووی کێشانی حەلاڵ و حەرامیان لە بەردەسدایە وەک قورئان بێ، ئەو کەسانە ناو زگ و دەروونی ناپاکیان بە بەهرەی بێ ئەرزشی دنیایی کە لە گۆڕانی حەق بە ناحەق دەس دەخەن بە ئاوری بەسۆز و بەتینی ڕۆژی قیامەت گڕ دەگرن. جگە لەوە خراپتر لەو عەزابە تووشی خۆی دەکەن کە پێی دەکوترێ دەرد و عەزابی ڕوحی وەک ئەوە قەڵس و تووڕەیی خودا و نەدواندنی لەو ڕۆژە سەختەدا نەبڕانەوەی ئەو عەزابەش.

دڵ ئارەزوویەتی بزانێ ئەوەی ئەو بێباوەڕانە حاشاری دەدەن بۆ وەی دەستیان بگاتە سامان و دارایی دنیا کە ئەوەش دەبێتە ئاور و دەخزێتە ناو زگیان چییە؟ هەندێک لە قورئانزانەکان وەک «ابن‌عباس» و «قتاده» و «سدّی» و «اصمّ» و «ابومسلم» و «حسن بصری» فەرموویانە باسی حەزرەتی محەممەد وسیفاتەکانی و مزگێنی هاتنی کە لە ناو تەورات و ئینجیلدا هاتوون حاشار دەدەن بەڵگەش لەسەر ئەو حاشاردانەیان ئایەتی ۳۴ی سوورەی تەوبەیە:

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ الأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ئەی **خاوەن ئیمانەکان زۆر لە عولەمای ئاییینی یەهوود و مەسیحی ماڵ و دارایی عالەم بە حەق دەخۆن و خەڵکیش لە ڕێی خودا لادەدەن. ئەی ژیر و بەبیرەکانی ئیسلام و ئاییینی ئاسمانی ئاگاداری عالمانی بەدکردار**

**و بەدڕەفتار و خۆفرۆش بن کە ئەوانە دنیاپەرست و ماڵویستن هەموو هەست و کەرامەتی خوداپێداویان لەو پێناوەدا دادەنێن و ئێوەش وەبەر دەدەن. و هەروا ئەوانەی زێڕ و زەنبەر کۆ دەکەنەوە و لە ڕێی خودادا خەرجی ناکەن، بە ئاوری تیژی دۆزەخ موژدەیان بدەنێ.**

هەندێکیش لە قورئانزانەکان کوتوویانە: هەدەف لەو حاشاردانە حەقە بەتاڵانبردنی ماڵ و سامانی عالەمە بە گشتی. و هەندێکیش دەڵێن: هەدەفیان خۆ وەنزیک خستنیانە لە دەستەڵاتدارانی کات و وەختی دەوران بۆ وەی بتوانن ماڵ و سامانیان لێ وەرگرن. وەک ئەوڕۆی دەوران کە چاو دەکرێ. ئەگەر وازت هەیە بڕوانە لە تەفسیری کەبیر.

هەروەک ئەو حەقە چاو دەکرێ لە کەلامی خودادا، ناحەزان بە تەواوی دەناسێنێ و جوانانیش بە جوان وەسف دەکا و دەیانناسێنێ. لێرەشدا دەسبەرداری خۆفرۆش و حەقفرۆشان نابێ تا بە تەواوی وەک گای قەشانیان لێ دەکا کە لە هەموو ڕاستانڕا دیاری بدەن. بۆ تەئیدی ئەو بابەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٧٥ی بەقەرە:

﴿١٧٥﴾ **أُولَـئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُاْ الضَّلاَلَةَ بِالْهُدَى وَالْعَذَابَ بِالْمَغْفِرَةِ فَمَآ أَصْبَرَهُمْ عَلَى النَّارِ**

**ئەوانە ئەو کەسانەن کە ڕێ ون کردن و هەڵە و گومڕایی دەگۆڕنەوە بە هیدایەت و ڕێنوێنی، و سزا و عەزابیش دەگۆڕنەوە بە لێبوردن. کەواتە ئەوانە چۆن خۆڕاگری بکەن لە بەرابەر ئاگری دۆزەخەوە.**

واتە هیدایەت دەدەن بە گومڕایی، حەق بە ناحەق دەدەن.

## هیدایەت و گومڕایی

**تێڕوانین:** ئەوانەی کە ڕێی ڕاست دەفرۆشن بە ڕێی خوار، بە گاڵتە کاتی خۆی پێیان دەکوترێ: چەن ئازان و خۆڕاگرن لە سەر ئاگری دۆزەخ؟ واتە چۆن دەتوانن خۆڕاگری کەن لە بەر ئاگری دۆزەخ؟

ئەو هەڕەشانەی خودا دەیانکا لەو حەق خۆرانە، ئی ئەوەیە: خودای تەعالا قورئانی بە تێروتەسەلی و دەلیل و بورهان ناردۆتە سەر ئینسان، ڕێگای گومانی بۆ کەس نەهێشتۆتەوە. لەسەر ئەو حاڵەشەوە ئینسان کە بێت و بە خاتری ماڵ و سامانی دنیا دەس کا بە لادان لە قورئان و گومڕایی بکا، بێ گومان ئەوە دۆزەخی کردۆتە جێگەی خۆی. چونکە ئیمانی نیە بە ڕاست و دروستکاری خودا، بۆیە ئەوەی قبووڵ کردووە. ڕۆژی خۆی هەر لە سەر ئەو بارە بێباوەڕیەی دادگایی دەکرێ.

لە سەر جوملەی ﴿فَمَآ أَصۡبَرَهُمۡ عَلَى ٱلنَّارِ﴾ شـتێک بە دڵـدا دێ ئەویـش ئەوەیە: (مـا) بـۆ عەجایبە، خۆ دیارە ئەو پەیام و کەلامەش لە خوداوەن. خوداش بەبێ گومان لە وەعەجایبمان بەرییە و پاک و بەدوورە، دەحاڵێکدا هیچ شت لە کن خـودا نە سـەیر و عەجـایبە و نە گەورە و چکۆلەیە و نە سـەبەبی هـیچ شتێکیشـی لـێ شـاراوەیە، جـا لە سـەر ئەو ئەساسـە، ئەساسـی عەجایبمـان لەو جـوملەدا چـۆن دەبینـی و دەبینـدرێ؟ چـۆن بەراورد دەکـرێ؟ دیـارە بـۆ وڵامدانەوەی هەر ئیشکال و پرسیارێک کە عیلمی بێ، دەبێ ڕوو دە ئەهلی عیلم بکرێ، ئەهلی عیلمیش حەقیقەت و مەجازیان دە جانتای خۆیاندا بەدیهێناوە، بە هەر لایەکدا پێویستیان بوو، بەو لایەدا عەمەلی پێ دەکەن. دێرەشدا واتە دەو ئایەتەدا تەعەجـوب بە مانـای حەقیقـی خـۆی وەرناگیرێ بەڵکە بە مانای مەجازی وەردەگیرێ کە تەئەسـوفە بـۆ حـاڵی ئەوانەی حەق حاشـار دەدەن.

ئەوجار خاوەن باوەڕ دەبێ ئەوەی بنچینە و کڵی باوەڕ بێ کە خودای خـاوەن عەدڵ و بەزە هیچ سزا و تۆڵەیەکی لە ڕووی زۆری و بێ دەلیل نییە هەروەک هـیچ چـاکە و پاداشتیشـی بـێ دەلیـل نیـیە، بەو پێـیە دەبـێ وەیـدۆزین هـۆی ئەو سـزایە کە عەزابـی دۆزەخە، بـۆ ئەوانەی حاشاردەری حەقن چییە؟ جا بۆ هۆیەکەی دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ۱۷۶، لەوێـدا هـۆیەکەی چاو دەکەین:

(۱۷۶) **ذَلِكَ بِأَنَّ اللّهَ نَزَّلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِي الْكِتَابِ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ**

**ئەو (سزا و تۆڵەیە) هۆیەکەی ئەوەیە خودا کتێبی بە حەق و ڕاستی ناردووە (وەک قورئان بێ) بێگومـان ئەوانەی سـەبارەت بە قورئـان کە کتێبـی خـودایە دەکەونە کێشـە و دووبەرەکـی، بێدەلیل و بورهان زۆر دوورن لە حەق و ڕاستی. چونکە ئیدیعای بێدەلیل و شاهید زۆرەملـی و ملبەملەی سەرەڕۆیی و کەڵەوەکێشییە، خۆ دیارە سزای زۆرەملچییان و تۆبزیگەران، دەبـێ ئاوری دۆزەخ بێ جا دەگاتە قەد و باڵای تاوانەکە.**

## تێڕوانین

تێهەڵڕوانینێکـی ورد و بەرجەوەنـدانە لە سـیما و دەروونـی ئەو ئـایەتە پیـرۆزە (۱۷۶) و هەڵسەنگاندنی بە تەرازووی ئەقڵ و ویژدان و شعووری ئیمان و ئینسافدارانە:

خودای بێهاوتا دەو ئایەتە پیـرۆزەدا هەڕەشـەی حەقخـۆران و تیجـارەت و دووبەرەکـی ناڕەوا لە بنچینەی ئاینی پـاکی ئیلاهـی بەیـان دەکـا و دەفەرمـوێ: سـەرەنجامی ئەوانەی حەق

حاشار دەدەن و تیجارەتی ناڕەوا بە دیـن دەکەن واتە حەق بە نـاحەق دەفرۆشـن و ڕەحـمەت بە زەحمەت دەدەن، دۆزەخی هەمیشەییە و نائومێدی لە چاوپۆشی و بەخشینی خـودایە. هەروەک سەرنویشتی زانایانی خۆفرۆش بەتایبەت زانا یەهوودیەکان وایە چونکە دووبەرەکی و ئیختلافی دە ئەساسی ئاییندا سەردەکێشێتە پەرتەوازەیی گەل و ڕێگـای وەحـدەت و هەمئـاهەنگی لە نـاو دەبا. ڕەنگە دێرەدا بکـوترێ ئەدی ئەو هەمـوو ئیخـتلافەی چـاو دەکـرێ لە فتـوا و ئیشـتیهادی زاناکانی ئایینی چن؟ئەگەر ئیختلاف ناڕەوایە و خودا قبوولّی نییە؟ ئێمەش دەبێ لە وڵامـدا بـۆ ڕامالّدانی ئەو تەم و مژە سیسەیە بلّێین ئالّوگۆڕی نەزەر و بۆچوون بۆ دۆزینەوەی ڕێی ڕاست و سوننەت واتە لانەدان لە ئایەت و سوننەت دە فرووعدا عەیب و ئیشکال ناهێنێتە ڕوو جا زانـای فتوادەر حەق بپێکێ یا نەپێکێ، چونکە ئەو بابەتە پێی ناکوترێ کێشەی ئوسوولی بەڵکە کێشەی فرووعین.



هەروەک لەوەپێش چاوەڕاوی یەهوود و جوولەکەکان لە سەر گـۆڕینی ڕووگە هەرایەکـی زۆر و ئاژاوەیەکی تەواوی خستە ناو گەلانەوە، هەرکەسە بۆ لای خۆی دەکێشا واتە دە حەولـی ئەوەدا بوو عالەم بۆ لای قیبلەی خۆی ڕاکێشێ. یەهوود دەیانکوت دەبێ بـۆ نـوێژ ڕوو بکـرێتە بەیتولموقەدەس، دەنا نوێژ بەتاڵە، موسوڵمانانیش پێیان وا بوو دەبێ ڕوو بکرێتە کەعـبە چـونکە بەیتولحەرام قیبلەی باپیرە گەورەی پێغەمبەران حەزرەتی ئیبراهیم بووە. جا لە سەر ئەو ملمـلانە و کەڵەوەکێشیە، عالەمیان خستبووە گێژاوییەکی ئەقیدە و باوەڕەوە ناندەزانی کێهە لایان یەقیـنە. ئەوانەی باوەڕیان بە پێغەمبەر بوو بە پێی باوەڕیان دەیانکوت کەعـبە قیـبلەیە، ئەوانەی یەهـوود بوون دەیانکوت نەخێر، قودس ڕووگەیە. بە کـوردی، هەرکەس بە یـاری خـۆی هەڵـدەکوت و شانازی دەکرد.

هەروەک ئەوەش یەقینە و حاشاهەڵگر نییە: خودای تەعالا لە هەمـوو ڕاسـتان بە هـاواری عەبدی سەرگەردانی خۆی هاتووە و دە فریای کەوتووە ڕێگـای ڕاسـتی نیشـان داوە. هەروەک دێرەشـدا بە هـاواریەوە دێ لەو سـەرگەردانیەی ڕزگاریـان دەکـا. ئەوەی خوازیـاری حەق بـن وەریدەگرن و ئەوانەی خوازیاری لاساری بن، ئاوری وەسـەر نـادەن. بـۆ ئەو ڕاسـتییە دەچیـنە خزمەت ئایەتی ١٧٧:

﴿١٧٧﴾ لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَـكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللّه وَالْيَـوْمِ

الآخِرِ وَالْمَلآئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّآئِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُواْ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاء والضَّرَّاء وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَـئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَـئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ

چاکە تەنیا ئەوە نییە ڕوو کەنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بەڵکە چاکەی تەواو چاکەی ئەو کەسەیە کە دەپاڵ باوەڕی بە خودا و ڕۆژی ئاخر و فرشتە و کتێبە ئاسمانییەکان و سەراپای پێغەمبەرەکان، ماڵ و دارایی لە سەر خۆشەویستی خۆی بدا بە خزمانی نەداری داماو، و بە هەتیوان و ئەو هەژار و ڕێبوارانەی کە بێ پارە و دەسمایە ماونەتەوە. هەروا بیدا لە پێناو ئازادکردنی بەندەکاندا. و هەروا بیدا بەو داماوانەی کە لە بەر نەداری سواڵ دەکەن. سەرەڕای ئەوانەش نوێژان بکات و زەکاتیش بدات. و لە سەر ئەنجامدانی پەیمان و بەڵێنیان سوور بن و لە کاتی ڕۆژی هەرا و سەختیدا و فەقیریدا خۆش ڕادەگرن. ئەئەوانەن ڕاست دەکەن کە خاوەن ئیمانن و ئەوانەن بە تەقوا و پارێزکارن.

**تێڕوانین و هەڵسەنگاندنی ئەو ئایەتە پیرۆزە کە ئیمانی بەڕاستی سنووردار کردووە و نیشانی ئینسانی داوە بە ڕوونی ڕاستگۆ کێیە لە ئیمانی بووندا!؟**

هەدەف لە ئایینداا ئەوە نییە ڕوو کەنە یەک قیبلەی تایبەتی و فەخر و شانازی پێ بکەن. بە هەرە چاکەی بزانی و بزاندرێ، چونکە ئامانج لە ڕووگەدا کۆکردنەوەی ئینسانە بۆ ڕووکردنە یەک لا دە کاتی نوێژدا، یانی ڕوو وەرگێڕی لە هەچی لایە ئیللا لای خودا نەبێ.

## سێ شت ئەساسە بۆ ئینسان

ئەوەی زۆر ئەساسییە و مەبەستە بۆ ئینسانی، سێ شتە دە واقیعدا:

١. بیر و باوەڕی پاک

٢. ڕەوشتی پاک و پەسند

٣. عەمەل بە ئیخلاس و پاکی دەگەڵ گەل.

دەنا ئەی بەندەی خاوەن ئەقڵ و هەست و شعوور و ژیر، چاک بەرجەوەند بە، چاکە و چاکی ئینسانی خاوەن باوەڕ ئەوە نییە ڕوو بکاتە ئەولاولا دە کاتی نوێژدا واتە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بکەنە ڕووگە وەک گاورەکگان و جوولەکەکان بۆ خودنمایی و خۆهەڵواردن لە یەکتر. چونکە ئەوانە هەدەف و ئامانج نین بۆ خوداناسی. بەڵکە خوداناسی بڕوا بوونە بە خودای یەکتا و حیسابی ڕۆژی ئاخر بە فرشتە و کتێبەکانی ئاسمانی و پێغەمبەرەکان، باوەڕی

ئینسـان بەو پێـنج شـتە نادیـارانە واتە خـودا و ڕۆژی قیـامەت و فرشـتە و وەحـی ئاسـمانی و پێغەمبەرەکان، هەڵاواردنی ئینسـانە لە حەیـوان، چـونکە حەیـوان هەچـی بەرچـاوی نەکەوێ، باوەڕی پێ نییە.

یەقینە و حاشای لێ ناکرێ، هۆی لادانی ئینسان لە پەرستنی هەچی شتی بـێ دەسـتەڵاتە، باوەڕیە بە خودای ون، چونکە ئەوە بێگومانە و حاشا هەڵنەگرە هێز و وزە و گوڕ و تینـی دڵ و دەروون هێزی ئیمانە بە خودا، کە ئەو هێزە چاوەدێرێک دادەمەزرێنێ لە نـاو هەسـتەی دەروون کە ڕێ نادا نەفس و هەوا ڕامالٚدەنە شتی ناڕەوا جا مەگەر بە هەڵکەوت، و هەروا ڕێ نادا ویژدان و کەرامەتی بەشەری، لە خۆ بایی بێ و بگۆڕێ بە هۆی پـلە و مەقـامی دنیـایی و هەروا لە بـن چەپۆکی ڕۆزگار نانالێنێ. چونکە ئاسۆی ڕزگاری ئەو کە ڕەحمەتی بارییە ڕوونە، و ئەگەر هاتو سەرسمی دا و سەرەنگرێش بێ بە دەس نەفـس و هەواوە، دەسـتەولەجێ پەشـیمان دەبێـتەوە و دەڵێ: ﴿ذَكَرُواْ اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ﴾.

باوەڕی بە ڕۆژی قیامەت باوەڕییە بە دادگـایی خـودا کە کەسـی لـێ قوتـار نـابێ و هـیچ شتێکیشی لێ ون نابێ و هـیچ بەرتیلیشـی تێـدا نیـیە. وە هەروا بـاوەڕی بە فرشـتە بـاوەڕییە بە سـرووش و پێغەمبەرایەتـی پێغەمـبەران و ڕۆژی ئـاخرەت. جـگە لەوانەش بـاوەڕی بە فرشـتە دەتگەیێنێتە قۆناغی باوەڕی بە کتێبەکانی ئاسمانی چـونکە نامەکـانی ئاسـمانی بەوانـدا دەگەنە دەستی ئینسانان واتە پێغەمبەران. بە کوردی و بە کورتی: باوەڕی بە خـودا و فرشـتە بـاوەڕییە بە پایە و بناغەی ئەسڵی ئیمان.

با بڕوانین لەو نیزام و دەستووراتە بێ عەیـب و نەقـس و بەهێـزە کە دسـتووراتی ئـیمان و بـاوەڕییە بە خـودا و قیـامەت و کتێـبە ئاسـمانییەکان و فریشـتە و پێغەمـبەران کە هەر یەکەی تیشکێکی بەهێزی ڕۆژی بەخـتەوەری گیـان و گیانـدارانن. جـا پـاش بـاوەڕی بەوانە ئـایەتەکە هاوارت دەکاتێ بۆ وەی دەرکەوێ کە ڕاست دەکەی لە باوەڕیتدا: ئاوڕ وەسەر نەدار و دامـاوان وەدە، تاکوو خێزانی ناوماڵی کۆمەڵ بەهێز بـن و دوور بـن لە لاوازی و پەرتەوازەیـی. چـونکە خێزان بەردی بناغەی گەلە و خشـتی کۆشـک و تەلاری یەکەتـین تـاکوو ئەو کۆشـکە پـتەو و بەهێزتر بێ، گەلیش بەهێزترە و بەهێزتر دەبێ، جا ئەو خێزانەش خزمی نەداری خۆت بێ، هەتیو بن، بێنەوایانی ناو کۆمەڵ بن، ڕێبوارانی بـێ دەسـمایە و پـارە بـن، سـواڵکەرانی بـێ چـاو و قاچوقول بن و یا بەندە بن.

لێرەدا ئەقڵ دەبێ هەڵوێستێک بگرێ لە سەر ئەوەی کە پاش ئاوڕدانەوە وەلای تێر و تەسەل و تۆکمە کردنەوەی کۆمەڵگە و خێزان ئەوجار دەفەرموێ ئاوڕ بدەنەوە سەر نوێژ و زەکات و وەفا بە قەول و قەرار و خۆڕاگری لە سەختی و تەنگانەدا. **ئێرە جێی سرنجە.** زۆر بێر و بەوێدا هەڵپەڕژام و بێر و بەوێدا دڵ و چاوم گێڕا کە بەڵکوو ئەو هۆیە بزانم کە ئاوڕدانەوە وەسەر نیازمەند و بێنەوایان وەپێش ئاوڕدانەوەی ئەدای نوێژ و زەکاتی خودای بێنیاز کەوتووە. لەو هۆیە زیاتر و نزیکتر لە قبووڵ و پەسەند بۆم نەدۆزراوە: خودای تەعالا خەڵقی ئینسانی لە سەر یارمەتی و کۆمەکدانی یەکتری ڕاناوە، چونکە ئینسان نیازی تەواویان بە هاوکاری یەکتری هەیە، بۆ کورتە ژیانی سەفەری دنیا؛ بەڵام خودای بێنیاز هیچ نیازێکی بە عیبادەتی عەبدی نییە، بەڵکە ئەو سەفاریشە هەر بە قازانجی ئینسانی فەرمووە تاکوو سەفای دڵ وەدەس بێنێ بۆ خزمەت بە خۆی لە سەر ئەساسی ئیمان و باوەڕی.

**تیوتیوە:** ئینسان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە یەک بوونەوەری تێکهەڵشێلدراوە لە لەش و ئەقڵ و ڕوح. دیارە بە پێی ئەقڵ و شعوور، نابێ لە نێوان ئەو سێ هێزە دژایەتی هەبێ، بەڵکە دەبێ وەسیلەیەک بێ کە هەر سێکییان بە هاوکاری یەک خۆ وەنزیک خەن لە سەعادەتی هەر دوو وەرزی ژیانیان، واتە دنیا و قیامەت. جا خودای حەکیم و عەلیم و کارزان هات بە ئەرزشترین و ئاسانترین وەسیلەی بۆ پێکهێنان وەک عیبادەتی نوێژ و زەکات بێ تاکوو بتوانن بە هۆی ئەنجامدانی ئەو وەزیفەیە ئەو سەعادەت و بەختەوەرییە وەدەس بێنن، بڕوانە و سەرنج دەیە لە نوێژ هاوئاهەنگی هەر سێ هێزی لەش و ئەقڵ و ڕوحی تێدا بەدیهاتووە و چاو دەکرێن کە بەرەو خالق و ئامانجیان دەجووڵێنەوە. ڕاوەستان و قیام، چوونە سەر ئەژنۆیان و ڕکووع، چوونە سوژدە و سجوود دە نوێژدا بەشی لەشن. قورئان خوێندن و بیر لێ کردنەوە و یادی خودا و دەرکی مانا، بەشی ئەقڵ و شعوورن دە نوێژدا. هۆشدان و ڕامان و هەستی ئەو عەمەلە بەرزە وەک نوێژ بێ، بەشی شادی ڕووحە. ئەو سێ هێزە دە یەک ئان و کاتدا دەو هاوئاهەنگییەدان بە هۆی ئەو وەسیلە گەورەیە وەک نوێژ بێ، خودا لێکی چەسپاندوون. ئەوەیە بەرهەمی نوێژ، ئەوەیە نوێژ بۆ خودا.

## ئیسلام دە زاتی خۆیدا پاکە

دیارە هەر وەک مێژوو نیشانی داوە بە درێژایە بوونی ئینسان لە سەر زەوی، زۆردار دەستی دە گەرووی بێزۆر ناوە و خەفەی کردووە و لە بەرابەر هەر شتێکی کە بێزۆر لێی ڕوودابێ، لە

ڕاست زۆردار دوو بارتەقا و چەن بارتەقا تۆڵەی ستێندراوەتەوە. وەک لە پێش هاتنی ئیسلاما لە ناو عەرەبی یاغی ئاوا باو بووە زۆردار لە باتی ژنێکی کە بێ‌زۆر لێی بکوشتایە، پیاوێکی لێ دەکوشتن و لە بەرابەر کۆیلەیەکی عەبدێکی ئازادی لێ دەکوشتن و لە ڕاست پیاوێکی بێ‌نرخ پیاوێکی جێدار و ماقووڵ و بەوەجی لێ دەکوشتن، هەروەک ئێستێ لە باتی غەیرە کوردێک سەت کورد دەکوژرێ. بەڵام کاتێ ئەو ئایینی ڕەحمەت واتە ئیسلام هاتە گۆڕێ و دەستەڵاتی پەیدا کرد، ئەو باوە ناپیاوانەی گۆڕی و بوو بە سایە ڕەحمەتی ئازادی و بەرابەری و حەسانەوەی ئینسانی. و ئەگەر سوئالیش بکرێ و بگوترێ، ئەوە نییە لە دنیای ئیسلامدا حەسانەوە نییە بەڵکە لە جیاتی حەسانەوە چەوسانەوە و کوشت و کوشتار و هەتکی حورمەتی ئینسانی دەکرێ؛ لە وەڵامدا دەبێ بکوترێ: ئیسلام دە زاتی خۆیدا بێ عەیبە و ڕەحمەتە، ئەوە ئەو کەسانەی خۆیان پێ هەڵاوەسیوە و ناوی ئیسلامیان لە خۆ ناوە، غەزەب و زەحمەت و عەیبدار و دوورە ئیسلامن؛ سادەتر بڵێین: ئیسلام هەنگوینە و دە پێستی سەی خراوە.

بۆ ڕاستی ئەو بابەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٧٨:

**﴿١٧٨﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاء إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ**

**ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان هێناوە، سەبارەت بە کوژراوەکان تۆڵە سەندنەوە لە سەرتان پێویست کراوە، ئازاد لە بری ئازاد و بەندە لە بری بەندە و ئافرەتیش لە بری ئافرەت. و هەرکەس لە لای برا موسوڵمانە خاوەن خوێنەکەیەوە چاوپۆشی لێ کرا، لە بری کوشتنەوە بە خوێن لێی ڕازی بوو، دەبێ بەخشەر ئەو بەڵێنەی خۆی بە باشی بەرێتە سەر، بەخشراویش ئەوەی بۆی دیاری کراوە بیدا بە خاوەن خوێنەکە، ئەو خوێن‌دانە لە بری تۆڵەی کوشتنەوەیە، بارسووکی و بەخششە بۆتان لە لای خوداتان، هەرکەس دوای ئەو ڕێکەوتنە دەستدرێژی بکات سزایەکی بەژانی هەیە.**

## تێهەڵڕوانینێکی بە وردی لە قصاص

ئێرە جێی ڕامانی ئەقڵ و شعوورە کە بۆچی ئینسان نەیتوانیوە و نەگەیشتووە بەو پلەیە کە بتوانێ یاسایەکی چاتر لە یاسای سرووشی باری‌تەعالا لە مەڕ قەساس‌دانی کۆمەڵگای ئینسان پێی دابین بێ و بە ڕەوای بزانێ، کەوابێ دەبێ هەست و ئەقڵ و شعوور بە قەناعەتەوە باوەڕ

بکەن کە یاسا لە یاسای خودا بۆ ژیـن و حـاوانەوەی ئینسـان لەو سـەرزەوییە چـاتر و پـاکتر و شایستەتر نییە و نابێ، هەرکەس دەستی تێگـرێ، نـاکەوێ بێـر و بەوێـدا هەرکەسـیش دەسـتی تێنەگرێ، هەڵوەدا و نەحەساوەیە بێر و بەوێدا.

جا بۆیە خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم هاوار دەکاتە ئینسانی و دەفەرمـوێ پێـی: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە بەوەی خودا یەکە و لە ڕاست ڕاگرتنی نیزامـی کاینـات و بەڕێـوە بردنی نیزامی ژیانی گیانلەبەر و غەیرە و لە حاند چەرخوخولی هەرچی لە گەڕدایە، بێهاوتـایە و خاوەنی عەدڵ و زانینە و ئاگاداری پاش وپێشی هەچی بـوون و نەبـووە، پێویسـت کـراوە لە سەرتان تۆڵە ستاندن بە مساوات لەو کەسانەی کە بە عەمد ئینسان دەکوژن، واتە لە سـەر داوای مافی خوداپێداوی دەیکوژن بە هۆی دەستەڵات و زۆرداری و بێ ئـاوڕدانەوە وەلای ویسـت و خواستی؛ تۆڵەی مساوات واتە هاوتای کـوژراو: ئـازاد بە ئـازاد، کـۆیلە بە کـۆیلە، ژن بە ژن و کەسیش لە باتی کەس ڕێ نەدراوە بکوژرێ. مەسەلەن کەسێک لە باتی تۆڵەی کوژراوی دەچێ لە تایفەکەدا کوژەری ناکوژێ هەچی وەبەری بێ دەیکوژێ. ئەوە دە ئـایینی ئیسـلامدا بە نـاڕەوا داندراوە، ئەو یاسایەی باسمان لێوە کرد ئەساسی دادی خودایە.

لە ئایینی یەهووددا بکوژ نابێ نەکژرێتەوە مەگەر بە ناچاری. واتە قاتڵ دە یاسای تەوڕاتـدا دەبێ بکوژرێتەوە. ئەمما دە یاسای ئینجیلدا ئەو باسە چاو نەکراوە، چونکە ئینجیل فەرمانی هەر بە چاکەیە دەگەڵ هەموو کەسێکا، حەتـا دەگەڵ ئەو کەسـانەش کە خـراپەت دەگەڵ دەکەن، لە بەرجەوەنـدی ئێـرەدا هەسـت بەوە دەکـرێ: کە لە ئـایینی گـاوردا کوشـتنی قاتـڵ لەوانەیە بە خوێنبەها چارە بکرێ و ناکۆکی ببڕێتەوە.

گەرچی ئەقڵ و هەست و شعووری خاوەن ئیمان ئەوە پەسەند دەکا کە کوشـتنەوەی قاتـڵ کۆڵەکەی خانووی ئەمن و ئەمان و حەسانەوەیە، و هەر کوشتنەوەی بکووژە، ناهێڵێ ئینسان لە سنووری خۆی تێپەڕێ، چونکە نەکوشتنی قاتڵ جەسارەت و جورئەت دەدا بە ئینسان بۆ کـاری خراپ و دووپات کردنەوەی خەڵک کوشتن، هەروەک لە ئایەتی ١٧٩دا خودا ئاماژە وەلای ئەوە دەکا کە لە کوشتنەوەدا ژیان و حەسانەوە هەیە: (وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ).

**تیوتیـوە:** پاراسـتنی ئەرزشـی خـوێن بـاس و بـابەتێکی زۆر گرینـگ و بەرچـاوە دە نـاو کۆمەڵگەدا. هەر بۆیە ئایینی سـروش ئاوڕێکی تایبەتمەندی وێ داوەتەوە. تۆڵەستاندن لە بکوژ وەک باقی حوکمەکانی دیکە عەداڵەت و حەقبینانەی ئایینی ئیسـلام نیشـان دەدا و دەینـوێنێ،

نەک وەک ئایینی یەهوود. هەر کوشتن چارە بێ و یا وەک ئایینی گاور هەر عەفو و بەخشین چارە بێ. بەڵکە وەک ئایینی ئیسلام چارەساز و میانەڕەو بێ، یا بەخشین یا خوێن یا کوشتن.

دڵ چاوەدێر و گوێدێرە بۆ وەی بزانێ قازانج و بەرهەمی تۆڵە واتە قەساس چییە؟ چ شتێک دەبەخشێ بە حەیات و حەسانەوەی حەیات؟

بۆ وەڵامی ئەوپرسیارە بەنرخە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٧٩ی بەقەرە:

﴿١٧٩﴾ وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَاْ أُولِيْ الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ

**ئەی ژیر و ئاقڵەکان! لەو یاسای تۆڵە سەندەوە و کوشتنەوەدا ژیان و تەمەندرێژی و ئەمن و ئەمانی و حەسانەوەو بۆ دابین کراوە، بەو هیوایە پارێزکار بن.**

## لە قصاصدا ژیان هەیە

ئاوڕ وەسەر ناوەرۆک و سیمای ئەو ئایەتە پیرۆزە: دەکرێ بکوترێ ئەو ئایەتە (١٧٩) تەواوکەری ئایەتی ١٧٨ە و لە لایەکی دیکەشەوە بەیانگەری ڕاز و فایدەی تۆڵە ساندنەوەیە و هەروا لە باغەڵ ئەو فایدانەشی هاندەرە بۆ بەڕێوە بردنی تۆڵە. هەڵسەنگاندنی جوملەی ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ﴾ ئەوە هەست دەکرێ: ئەگەرچی بە زاهیری نە تەنیا بەقای حەیاتی تێدا نییە، بەڵکە حەیاتێکیش لادەبا و دەیخاتە نەمانەوە، ئەمما ئەوە لە سیمای زاهیریدایە. وە ئیللا دە ڕاستیشدا دە تۆڵەدا دە هەردوو وەرزی دنیا و ئاخرەت ئەمن و ئەمان و حەسانەوە چاو دەکرێ. نموونە: دە دنیادا ئەگەر بێتوو ترسی تۆڵەی نەبێ، وەک دەورانی بێبەندوباری جەهالەت، هۆزەکان دەکەونە گیانی یەکتر و لە باتی یەک نەفەر، سەد نەفەر دەکوژن و جاری وا دێتە ڕوو هۆزێک لە ناو دەبرێ و ژیان لە ناو دەچێ و ئەمن و ئاسایش بۆ کەس نامێنێ. ئەمما ئەگەر ترسی تۆڵە ستاندن هەبێ و یاسای تۆڵەش بەڕێوە ببرێ واتە قاتڵ بکوژرێتەوە، عالەمی غەیرە قاتڵ دە ئەمن و ئەماندا ژیان دەبەنە سەر. بێجگە لەوەش کاتێ بزاندرێ بە یەقین قاتڵ دەکوژرێتەوە، زۆر بە کەمی خەڵک دەتوانێ خەڵک بکوژێ. چونکە لە ترسی کوشتنەوە دەپرینگێتەوە لە خوێنڕژتنی بەناحەق. ئەوە ئاسایشی دنیا کە دە بەهرەی تۆڵەدا چاو کرا.

ئەمما دە ئاخرەتدا با بزانین تۆڵە ستاندن چ بایخێکی ڕاست دەبەخشێ؟ شعوور وەگەڕ خە و وەرگرە تۆڵەی حەیاتی (طیبە) بەریەتی لە قیامەتا. چونکە ئەگەر بکوژ نەکوژرێتەوە و خاوەن خوێن ئەو بکوژە عەفو نەکا دە بەرابەری ئەو کوشتنەدا بکوژ ساڵانی زۆر دە ناو دۆزەخدا

دەمێنێتەوە، ئینجا دەبێ بکوترێ لە سەر ئەو ئەساسە (قەساس) واتە تۆڵەستاندن هەم لە دنیادا هەم لە ئاخرەتدا هۆی حەیاتی تەییبەیە.

## پوختەیەک لە مەبەستی ئایەتی ١٧٩

ڕەنگە لە لایەن کەسانێک کە بەرجەوەندی ڕاز و فەلسەفەی ئایەتەکە نەبوون وا فکر بکرێتەوە کە تۆڵەستاندن لە بکوژ واتە قەساس جۆرە ئینتیقامێک بێ کە دیارە ئینتیقامیش ناڕەوایە، بەڵام ئەگەر بە ئینسافەوە هەڵسەنگێندرێ، بارودۆخی قەساس دەرک دەکرێ کە ئەو جەریانی قەساسە، دەروازەیەکە بۆ بووژانەوە و حەسانەوەی حەیاتی تەییبە، و لەو لایەشەوە زامنی حەیاتی کۆمەڵە، چونکە ئەگەر ترسی تۆڵە نەبێ، ئینسانی دڵڕەق ڕێژەی جەنایەت و فەساد و خوێنڕێژی دەباتە سەرێ. جگە لەوانەش ڕێژەی ئینسانی شەروور و شەڕفرۆش دەڕواتە سەر.

ڕەنگە ئەوەش بکوترێ ئەگەر بکوژ واتە قاتڵ عەفو کرێ و نەکوژرێتەوە خۆشەویستی و تێکەڵاوی دە نێوانی تایفەی بکوژ و کوژراودا زیاد کا و پەرە بستێنێ دە حاڵێکدا بەڕێوەبردنی حوکمی قەساس هەمان عەمەلی قەتڵ بێ. بەڵام لە وڵامی ئەو فکر و خەیاڵە بێبنەما و سەرسەریەدا دەبێ بکوترێ: ئەوەڵەن قەساس قەتڵ نییە چونکە ڕیشەبڕینی فەساد و وڵات پاک کردنەوە لە خەتەر و ترس دەبێتە هۆی تەڕەقی و گەشە و نەشەی کۆمەڵ لە ژێر پەنا و سێبەری ئاسمانی ئەمن و ئەمنیەتدا. چونکە دەبێ بە تەئکید ئەوە بسەلمێندرێ کە دە یاسای بوون و ژیاندا شەروور و فاسد و ئاژاوەچی دەبێ دەرکرێ و بەری پێ بگیردرێ. ئەگینا نەزم و نیزامی ژیان و حەسانەوە نایەتە دی و وڵات دەشێوێ و ژیانی تێدا وە زەحمەت دەکەوێ. هەر بۆیەشە خودای زانا و کارجوان لە ئاخری ئایەتەکەدا دەفەرموێ ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ واتە ئەو یاسایە بەجێ بێنن و پێشێلی مەکەن خۆو بەدوور بگرن لە پێشێل کردنی. بۆ زێدە زانین بڕوانە تەفسیری کەبیر و...

دیارە وەک زاندرا و باسی لە سەر کرا لە ئایەتەکانی ڕابردوودا تا ئێرە باس باسی کوشتنەوە و تۆڵەستاندن بوو لە بکوژی واتە قاتڵ کەوابێ حاشا هەڵناگرێ ئەوە کە بکوترێ کوشتنەوەشی جۆرێکە لە مردن جا ئەو شێوە مردن و نەمانە بۆچی و لەسەر چییە؟ دەتوانین بڵێین هەم بە پێی وەسیەتە و هەم ئاگادارییە بۆ نەسل و نەتەوە و بەرەی داهاتوو. جا لەوەڕایە خودای خاوەن نەزم و نیزام و تەرتیب باسی وەسیەت دەکا بە تەواوی بۆ ئینسان. واتە ئەو کەسانەی دێنە بەر مردن،

تاکوو گیان لە دنیای تەکلیف ئـاوا نەبـووە، سـفارش و وەسـیەتی چـاک و پـاک ڕاگەیێنـێ بـۆ ئەوانەی کە دەمێننەوە پاشی ئەو، جا بۆ حاڵی بوونت لە وەسیەت دەچینە خزمەت ئایەتی ١٨٠ی بەقەرە، تاکوو ئێمەی ئینسان بە ئاگاداری ژیان بەرینە سەرێ.

﴿١٨٠﴾ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ

**لە سـەرتان پێویسـت کـراوە هەرکامتـان کەوتـنە گیـانەڵا واتە گیـاندان بە ئەڵـڵا، (ئەگەر قسەیەکی چاک و باش‌و هەبوو) و هەروا ماڵ و سامانێک هەبوو لە پاش‌و بەجێ‌دەما، دەبێ بە شێوەیەکی باش و پەسند و ڕەوا وەسیەت بکا بـۆ بـاب و دایـک و خزمـانی (ئەو دەسـتووراتە پڕبایخە) بە پێویست گەڕاوە لە سەر پارێزکاران.**

**وەسیەت‌کردن بەر لە مردن**

یانی کاتێ هاتنە بەر مردن، جا ئەو مردنە بە نەخۆشی بێ یا بە کوشتنەوە بێ، ئەوەو لە سەر پێویست کراوە لە لایەن خودای بێ‌هاوتا، ئەگەر سامانێک‌و لەپاش بەجێ‌دەما و باب و دایکیش مابوون، بەڵام لەو سامانە هیچیان نەدەگرت بەو هۆیە کە دەگەڵتـان هـاودین نەبـوون بەڵـکە لە سەر ئایینێکی جیاواز بوون، چونکە لەو ماڵەدا میرات ناگرن لە ڕۆڵەکانیان. ئەوجـار بـۆوەی کە لە ماڵی ڕۆڵەکانیان بێ‌بەش نەبن لە بەر ڕەحم، پێویست کراوە لە سەر ڕۆڵەکـانی کە ڕاسـپێرن و وەسیەت بکەن بۆ باب و دایکەکان، بەشـێکیان بـۆ دابـین بکـرێ و بیانـدەنێ. و هەروا بـۆ ئەو خزمانەش کە نیزیکیان بن، بەو باب و دایکە جۆرە خزمێک بێ‌بەش دەبێ لە میرات و یا ڕوونـتر بڵێین: مـردوو کوڕێـک و کـوڕەزایەکی لە پـاش بەجـێ دەمێنـێ، دیـارە بە کـوڕەکەی، کـوڕی کوڕەکەی بێ‌بەش دەبێ واتە کوڕ، نەوەی بێ‌بەش دەکا. جا بۆ ئەوەی نەوەکەی بێ‌بەش نەبـێ، بەشێکی بەو شێوەیەی بۆ دیاری بکا. وەیا کابرایەک دوو برای هەبن یەکێکیـان دای‌وبـابی بـێ، ئەوی دیکەیان تەنیا بابی بێ، دیارە بە پێی یاسا برای دای‌وبابی، برای بابی بەش‌بـڕاو دەکـا، جـا بۆوەی سیلەی ڕەحم و بەزە بێتە جێ، ئایین وای بە باش زانیوە و دایناوە مـردوو بەشـێکیش بـۆ ئەو برا بەش‌بڕاوە دابین بکا. بۆ زێدەزانین بڕوانە تەفسیری خاڵ و کەبیر و مونیر.

**تیوتیوە:** لە سەر ئەساسی ئایین و ڕاسپاردەی شاریع، وەسـیەت دەبـێ ژیـرانە و عـاقڵانە و نازیمانە بێ، نەبێتە هۆی داڕووشاندن و بریندار کردنی دڵانی واریسـان، بەڵـکە دەبـێ لە سـەر ئەساسی یاسای خودا و سـازانی دڵـی واریسـان بـێ. بەڵام ئەگەر هـاتو لە خزمـان کەسـانێک

هەبوون بێ‌ماڵ و حاڵ و دەس‌بەتاڵ کە نەدەکەوتنە بەر یاسای میرات‌گرتن، ئایینی پیرۆز پڕ لە ڕەحم و بەزەی ئیسلام ئەو ئیختیارەی داوە بە ئینسان کە یەک سێهەم لە ماڵی خۆی بکاتە وەسیەت و بیداتە ئەو دەس‌بەتاڵ و داماوانە. وەیا بە هەر کەس بیهەوێ و پێی خێر بێ، بەڵام بە پێی ئاماژەی ئایەتەکە دەبێ بەخشینی ئەو سێ‌یەکە، بە شێوەیەکی شایان بێ.

ئەگەر بێتوو بە وردی وشەی (خَيْرًا) هەڵسەنگێندرێ، ئەوە دێتە دەست و دەرک دەکرێ کە سەروەت و سامان دە زاتی خۆیدا ئینعامێکی گەورە و بەنەفعە بەو شەرتە دە پێناو ئاسایش و خزمەتی کۆمەڵ دە کار کرێ، دەنا شەڕە و شەڕی وا نییە. هەربۆیە خودا فەرموویەتی لە ئاخری ئایەتەکەدا: (حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ). ئەو وەزیفە بەنرخە هەر پارێزگاران دەتوانن بەڕێوەی بەرن.

و هەروا ئەگەر بە وردی سەیری ناوەرۆکی جوملەی (إِن تَرَكَ خَيْرًا) کرێ ئەو شتەهەست دەکرێ بە ڕوونی: ماڵ و سامان دژایەتی و بەرگری لە تەقوا و چاکسازی ناکەن کاتێ کە دە ڕێگای خۆیدا خەرج کرێ، کەوایە نابێ ساماندااران بە یاغی بزانین.

بە پێی سرشتی ئینسان و دەرگیری دەگەڵ بارودۆخی ژیان خۆشەویستی ماڵ و سامان و زێدەبوونی دەکرێ و وێدەچێ زۆر و کەمی وەسیەتەکە بە قازانج بگۆڕدرێ لە لایەن شاهیدەکان و وەسیەت بۆکراوەکان، واتە زیادی کەن یان کەمی کەن، وە یان یەکی لێ دەراوێن وەیا یەکی لێ زیاد کەن. بە هەر حاڵ لە ئینسان بەدوور نییە ئاڵوگۆڕ لە ئەحکاماتی شەرعیدا بە قازانجی دنیایی خۆی پێک‌بێنێ. بۆ ڕاستی ئەو بابەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٨١ی بەقەرە:

﴿١٨١﴾ فَمَن بَدَّلَهُ بَعْدَمَا سَمِعَهُ فَإِنَّمَا إِثْمُهُ عَلَى الَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ

**کەسێ بێتوو ئەو وەسیەتەی بگۆڕێ، پاش ئەوەی کە گوێی لێ بووبێ و حاڵیش بووبێ، بێ‌گومان تاوانی ئەو گۆڕینەی دەکەوێتە سەر ئەستۆی و بێ‌گومانیشە خودا پێی دەزانێ چونکە خودا بیسەریشە و بینەریشە.**

## گۆڕینی وەسیەت

**تێڕوانین و هەڵسەنگاندنی ئەو ئایەتە پیرۆزە:** دیارە پێش هەموو شتێک دەبێ ئەوە بزانین و باوەڕی پێ بکەین کە خۆشەویستی دنیا و ماڵی دنیا ئینسانی بە خۆوە دەخافڵێنێ و لە خودا و حیسابی ڕۆژی قیامەتی غافڵ دەکا. جا بۆیە خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم و میهرەبان کە لە ئینسان حاڵییە، چۆن دەکا و چی دەوێ، پێش ئەوەی بگاتە سەر بوار و دەراوی خەتا و تاوان

و هەڵە، ئاگاداری پێ دەدا کە وریا بێ و لە خودا بترسێ، بە عەمد خەتا نەکا و لانەدا لە ڕێگای ڕاست. وەک ئەوەی کەسێک وەسیەت بگۆڕێ پاش ئەوەی بیستوویەتی و لێی حاڵی بووە، گوناهی ئەو گۆڕینەی کە بە عەمد بەجێهێناوە بە خاتری هۆیەکی دنیایی دەکەوێتە سەر ئەستۆی، و وەسیەتکەر خێری کردووە و بەجێی هێشتووە، سەروەسی شەڕی بۆ خۆ پێ کڕیوە، بێ گومان خودا لەو خێر و شەڕە ئاگادارە و تۆڵە و سزا و پاداشی بە گوێرەی کردار ئامادە کردووە بۆ گش خێرکەر و شەڕکەرێک.

لە جوملەی ﴿فَإِنَّمَا إِثْمُهُ عَلَى الَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُ﴾ چەن مەبەستی گرنگی یاسای ئایینی هەست پێ دەکرێ:

١. ڕۆڵەی بیژو لە سەر تاوانی باب و دایکانی عەزاب نادرێ.

٢. کاتێ ئینسان شتێکی چاک وەسیەت دەکا بۆ کوڕەکانی، وەک دانەوەی قەرز و قۆڵە، کوڕەکانیش بەڕێوەی نابەن، ئەو بەڕێوە نەبردنە تاوان ناخاتە سەر شانی بابی وەسیەتکەر، بەڵکە هەر لە سەر شانی کوڕەکانە. بۆ تەئیدی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٦٤ی ئەنعام: ﴿وَلاَ تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلاَّ عَلَيْهِ﴾ واتە هەر کەس تاوانێک بکا وەباڵی لە ئەستۆی خۆیەتی.

باس، باسی وەسیەتە کەوایە وا چاکە ئەو فەرموودەی پێغەمبەری مەزنﷺ لێرەدا بێتە ڕوو و حاشار نەدرێ لە نێوان سەدەقە و وەسیەتدا کە فەرموویەتی: تمەنێک سەدەقە دە حاڵی ژیاندا لە لای خودا بەنرخترە لە سەد تمەن کە لە کاتی مردندا بیکاتە وەسیەت و سەدەقە. نەقڵکەری ئەو حەدیسە، نیسائی لە ئەبیدەردائەوە، ئەویش لە حەزرەتی ڕەسوولەوە. حەزرەتی ڕەسوول فەرموویەتی: مەسەلەی ئەو کەسانەی کە دە حاڵی مردندا وەسیەت بە سەدەقە و نەفەقەدان دەکەن، وەک ئەو کەسانە وان کە لە پاش تێرخواردن خۆراک و غەزای نەماوی ناو کاسەکە دەبەخشن بە ناوی هەدیە و سەدەقە؛ واتە هیچی دە کاسەی عەمەلدا نەماوە تاوەکوو بیکاتە سەوقاتی ڕۆژی هەرا. بڕوانە لە تەفسیری مونیر و سەیری کە.

پێویستە ڕوو بکەینە ئایەتی ١٨٢ کە تەواوکەر وڕوونکەرەوەی ناو ژووری ماڵی ئایەتی ١٨١ە، یانی وەسیەتکەر کە کەوتە بواری هەڵە بە عەمد یا بە هەڵە، و ئەو هەڵەش بوو بە هۆی ناکۆکی نێوان وەسیەت بۆکراوەکان، دەبێ کێ چارەی ئەو هەڵە بکا؟ ئینجا بۆ چارە پەنا دەبرێتە بەر ئایەتی ١٨٢:

**(١٨٢) فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ**

**پاشان ئەگەر هاتوو هەستی ئەوەی کرا وەسیەتکەر لە وەسیەتەکەدا تووشی هەڵە بووە (جا بە عەمد یا بە خەتا) دەمڕاستێک بێت و بتوانێ بۆ بەرگری لە ناکۆکی نێوان وەسیەتبۆکراوەکان دەس کا بە ناوبژی نێوانیان و حەول دا بۆ یەکخستن و ڕێکخستنیان جگە لەوەی گوناحی ناگاتێ، بەڵکە خێریشی دەگاتێ. چونکە خودای تەعالا سوڵح و ئاشتی نێوان ناکۆکانی پێ خۆشە و لێبوردە و دڵۆڤانیشە.**

## هەڵە کردن لە وەسیەتدا

ئەگەر هاتوو ترسی ئەوە هاتە گۆڕێ کە وەسیەتکەر لاڕێ بووە، بەر لەوەی عەمد بێ و لاڕێییەی وەیا هەڵە، یانی لە سێیەک زیاتر وەسیەتی کردبوو وەیا بۆ خزمانی فەقیری خۆی لە کەلەپوور هیچی دانەنابوو، وەیا لە نێوان خزمانی کەمخێزان و زۆرخێزاندا تووشی هەڵە ببوو یانی بۆ زۆرخێزانی کەم دانابوو و بۆ کەمخێزانی زۆر دانابوو، ئەو هەڵە و خەتایەش ببووە هۆی ناکۆکی نێوان خزم و کەسەکانی. ئەگەر یەکێک بتوانێ بە ئاڵوگۆڕ کردنی وەسیەتەکە ئەو پەڵە هەڵەیە ڕاست کاتەوە و ناکۆکی وەلابا لە نێوانیان، خێری دەگاتێ. بێگومان چونکە خۆی گەیاندۆتە بواری ئیسلاحێک کە خودا دەستووری پێ داوە.

**پوختەی مەبەست:**

هەڵاواردنێک لە یاسایەک: واتە ئەگەر هاتوو سەروەسیەت هەڵەیەکی عەمد وەیا غەیرەعەمد لە وەسیەتەکەدا چاو کرد و هەستی پێ کرد، کەوتە حەولی چارە کردنی و چارەی کرد، ئەو چارەیە دەبێتە هۆی گۆڕینی وەسیەتی وەسیەتکەرەکە، بە تاوان نانووسرێ واتە ئەگەر وەسیەتکەر مابێ، دەبێ حەکیمانە لە هەڵە و تاوانەکەی تێگەیێندرێ. ئەوکات ئیسلاحی کاری و چارەی کاری دەکەوێتە ئەستۆی وەسیەتکەر، بەڵام ئەگەر وەسیەتکەر نەمابوو ئەوکات سەروەسیەت دەتوانێ ئەو ڕێگا چارەیە بگرێتە بەر، هەڵاواردنەکە لە یاسا ئەوە بوو کە وەسیەت کەوتە گۆڕان.



کاتێ کە بە هۆی ڕێنوێنی خودای بێهاوتا لە وەسیەت تێگەیشتین و حاڵی بووین، ئەوجار خودای حەکیم دەیهەوێ کە لە ڕۆژوو عەبدی خۆی تێگەیێنێ، و هەروا ئەوەش ڕوون کاتەوە کە ئایا ڕۆژوو هەر لە ئایینی ئیسلامدا هەیە یا لە ئایینەکانی پێش ئیسلامیشدا بووە و قازانج و ڕازی ڕۆژوو چییە؟ جا بۆ ئەو بابەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٨٣ی بەقەرە، بێگومان دەوێدا بە

مەتڵەب دەگەین لە مەڕ ڕۆژوو:

﴿١٨٣﴾ **يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ**

**ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان بە خودا و فەرمووده و دەستووراتەکانی خودا هێناوە، هەر بە ئەمری باری، ڕۆژووتان لە سەر واجب کراوە. هەروەکوو لە سەر گەلەکانی پێش ئێوەش واجب کرابوو. داوا و هیوایە لێتان، وەریگرن و پارێزکار بن.**

## ڕۆژوو

**تێڕوانین و هەڵسەنگاندنێک:** ئەگەر هاتوو لە خودا ترسان و پارێزکاری لە ناو مەرکەز و دەفتەری ئومووراتی لەشدا هەبوو، ئەندامەکانی لەش کە بریتین لە زمان و چاو و گوێ و قاچ و قول لە فەرمانی ئەو مەرکەزە دەرناچن، باشترین و بەهێزترین ئامۆژگاری بۆ فێربوونی دەرسی لە خوداترسان ڕۆژووە چونکە بەغەیرەز خودا کەس ناتوانێ ئاگاداری ڕۆژوو و هەستی دەروونی ڕۆژووەوان بێ، هەر ئەوەشە هۆی ئەوەی کە حەزرەتی ڕەسوولﷺ فەرموویەتی: خودا دەفەرموێ ڕۆژوو بۆ منە و هەر ئەمنیش جەزای دەدەمەوە.

## ئاوڕدانەوەیەک وەسەر تایبەتمەندییەکانی ڕۆژوو

هەروەک ڕوون و ئاشکرایە و هەستی پێ دەکرێ قەساس و وەسیەت حوکمانێکن کە دەگەڵ سرشت و نەفسی ئینسان یەکەتی و موافەقەتیان هەیە واتە قەساس هەست و دڵی کەسانی خاوەن خوێن خوازیارن و ویستیانە کە ئەو تۆڵەیە دەبێ ببێ. وە هەروا وەسیەتیش هەم ویستی وەسیەتکەرە هەم خاستی وەسیەتبۆکراوانە. واتە وەسیەت دەگەڵ دڵی هەردوو (وەسیەتکەر و وەسیەتبۆکراو) موافقە. جا لە سەر ئەو ئەساسە قورئان بۆ ڕانان و بەیانی ئەو دوو حوکمانە واتە قەساس و وەسیەت پێشواز و بەرنامەڕیزی بۆ نەکردن. بەڵام ڕۆژوو کە شەڕ و جەبهەگیرییە دەگەڵ نەفس و هەوا، واتە بەرگرییە لەو شتانەی کە نەفس ئارەزوویەتی وەک خواردن و خواردنەوە، نیازی تەواوی بە بەرنامەڕیزی و پێشوازی هەیە، وەک ئەوەی خودای تەعالا لە هەوەڵەوە دەفەرموێ: ئەی خاوەن ئیمان و باوەڕەکان! وە هەروا بۆ وەی خاوەن ئیمانەکان لەڕێوە لەو حوکمە ڕۆژووە هەڵنەبەزنەوە خودا دەفەرموێ ئەو حوکمە هەر بۆوە نییە و نەبووە، بەڵکە بۆ گەل و قەومەکانی پێش وەش هەر بووە. خودای حەکیم ئاوا حەکیمانە

موسوڵمانان بۆ وەرگرتن و قبووڵ کردنی ئەو حوکمە کە ڕۆژوویە ئامادە دەکا، بێ‌وەی دڕدۆنگی و دڵگرانی بنوێنن. چونکە ئەو ئاگاداریەی خودا کە فەرمووی ڕۆژوو هەر تایبەتی ئێوەی موسوڵمان نییە بەڵکە بۆ گەلانی پێش ئێوەش هەر بووە، موسوڵمانانی لە نارەزایەتی و دڵگرانی و خۆبادان وەدوور خستەوە. و هەر شتی گرانیش ئەگەر کەوتە بواری تێکرایی، وەئاسان دەگەڕێ.

ڕاز و فەلسەفەی ڕۆژوو تەقوایە لە خودا، ئەو تەقوایەی کە سەراپای تێکۆشانی لەش و نەفس و چەرخ‌وخولی باری کۆمەڵایەتی و دارایی و ئابووری و ڕامیاری، نیزامیان لە تەقوا واتە لە پارێزکاریڕا سەرچاوە دەگرن. یانی ئەگەر لە خودا ترسان نەبێ، و پەرۆشی کۆمەڵت نەبێ، و شەرم لە ویژدان نەکرێ و سەرکۆنە و لۆمە و بەرگری لە نەفس و هەوا نەکرێ، تەقوا نایەتە دەست و نایەتە ڕوو. ئەوکات شێواوی و پەرێشانی و دز و دزکاری و قەباحەتی زۆر گەورەتر دێنە ڕوو و ڕوو دەدەن. حەسانەوە و ئەمن و ئەمانی لە ناو تاقە کەس و کۆمەڵدا بار دەکا و وڵات دەبێتە هەرکەس‌هەرکەس.

**تیوتیوە:** پیادەبوونی ڕۆژوو دە ناو عالەمی ئیسلامدا واتە واجب‌بوونی، دە ساڵی دووی کۆچیدا بووە، یانی پێش ئەوەی حوکمی جیهاد دابەزێ و ببێتە یاسایەکی شەرعی، حوکمی ڕۆژوو دابەزی بۆ ئۆمەتی ئیسلام.

ڕۆژوو تۆوی ترسان لە خودا دە مڵکی گیان و لەشی ئینساندا دەنێژێ و دادەچێنێ جا بۆیە بێ لە خودا کەس ئاگاداری دەروونی هەستی ڕۆژووەوان نییە، هەر ڕۆژووەوانە سواری سەری دێوی هەوا و هەوەسی شەهوەت دەبێ و دەیحامڵێنێ تا شەو.

ڕۆژوو چەن بەهرەیەکی پڕبایخی هەیە کە ئەقڵ دەیانقۆزێتەوە:

١. هەستەی تەقوا دە ڕووحی ئینساندا پێک‌دێنێ.

٢. هێزی هەوا و شەهوەتی سەرەڕۆ و سەرکەش تێکدەشکێنێ

٣. هەستەی ڕەحم و میهرەبانی لە ناخی ئینساندا وەجووڵەجووڵ دەخا

٤. بەرابەری و موساواتی نێوان دارا و نەدار و ئەشەرەف و نائەشەرەف نیشان دەدا و بێ هیچ فەرق و جیاوازی بۆ ڕۆژوو دە یەک ڕێزدا ڕێز دەگرن پاک ئەوانە.

٥. ڕۆژوو بونیەی لەشی ئینسانی دەسازێنێتەوە و دەیخاتە بواری ساغ و سڵامەتی و سەرلەنوێ هێزی تێدەچێنێتەوە.

دیارە ئەگەر ئاوڕێکی ژیرانە وەسەر پەیامی پێغەمبەر وەدرێ تەواوی ئەو شتانەی لە مەڕ ڕۆژوو کوتران قبوولْ دەکەی و وەردەگری، پەیامەکەش ئەوەیە: ڕۆژوو بگرە تاکوو ساغ و سلامەت بی. (صُومُوا تَصِحُّوا)

دەبێ ئەوە بزاندرێ کە دە یاسای ئایینــدا بۆ هەر ئەحکامێک نەزم و نیزام و دار و لەلە داندراوە و دامەزراوە، جا لە سەر ئەو ئەساس و یاسا بەئەرزشە دڵ دەیهەوێ ئەوە بزانێ، ئەو ڕۆژووە واجبە وا هەیە دەخورێ، جا بە عەمد بێ وەیا غەیرە عەمد. دەگەڵ ئەوەی ڕێ دراوە بە نەخۆش و ڕێبوار بەڕۆژوو نەبن، تا لە نەخۆشییەکە چا دەبنەوە و یا لە سەفەرەکە دەگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵی خۆیان. ئینجا بۆ تێگەیشتن و حاڵیبوون لەو بابەتە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ۱۸۴ دەوێدا ڕوون کراوەتەوە کە چۆنە دەستووراتی خودای تەعالا لەو بارەوە.

**﴿۱۸۴﴾ أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ**

ئەو ڕۆژوو گرتنەش چەند ڕۆژێکی دیاریکراوە کە لە ڕۆژانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزە. بەڵام ئەگەر یەکێکتان نەخۆشکەوت، وەیا خود کەوتە ناو سەفەر، ئەوە دەتوانێت بەڕۆژوو نەبێ و دوایی بە قەزا بیگێڕێتەوە. و ئەو کەسانەش کە زۆر بە زەحمەت نەبێ ناتوانن بەڕۆژوو بن، وەکوو پیاوی پیر یان نەخۆشێک کە چابوونەوەی نەبێ، یا خود کەسێک کە بۆ پەیدا کردنی بژیوی ڕۆژانە کاری گران ئەنجام بدا، ئەوانە بۆیان هەیە کە بەڕۆژوو نەبن و لە بری هەر ڕۆژێک، فدیە بدەن واتە ژەمێک خواردن بدەن. جا خودی خواردنەکە بدەن وەیا نرخی ئەو. ئەوە بوو مانای (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ) بەڵام ئەگەر زەحمەتی ڕۆژوو گرتنەکەیان زۆر زیاد نەبێ، ئەوە ڕۆژوو گرتنەکەیان لە فدیە دانەکە باشترە چونکە بەڕۆژوو بوون مایەی وەنزیک کەوتنە لە خودا، هۆکارێکی کاریگەریشە لە خودا و لەشساغی بۆ ئینسان، ئەگەر تێبگەن.

## ڕۆژان و چۆنیەتی ڕۆژوو گرتن

**تێڕوانین و بەرجەوەندی:** کەسانێک ئەگەر نەخۆش بوون نەخۆشێکی وا کە نەیدەتوانی ڕۆژوو بگرێ، وەیا لە سەفەری خێر بوو، واتە لە شەڕی ناموس و ئایین و ماف و ویژدان بوو، با نەیانگرێ بەڵام دە کاتی خۆیدا بیانگرێتەوە و ئەگەر هاتوو نەشگەیشتە ئەو ڕۆژە کە دەیتوانی تۆڵەیان وەک واتە کوژرا و مرد، ئەوە چونکە لە ڕێی خێری ئایین و شەرەف و کەرامەتی مافی

ئینسانیدا ڕۆیشتووە و مردووە گوناحی ڕۆژووەکانی لەسەر نییە و ناژمێردرێ.

و هەروا ئەو کەسانەی کە دەتوانن بیگرن و بەڵام زۆر بە ناڕەحەتی و سەختی، نایانگرن لە بەر ئەو ناڕەحەتییە کە لە ئەسەری بەتەمەندا چوون و ... با فدیە بدەن. بە کورتی ئەوانەی ناتوانن ڕۆژوو بگرن لە بەر هۆیەکی نەخۆشی و یا تەمەن زۆری، با نەیگرن، ئەگەر ماڵ و سامانیان بوو، فدیە بدەن و ئەگەر نەیانبوو با نەیدەن و خۆ قەرزدار نەکەن. و ئەو کەسانەی کە هیچ بەهانەیەکیان نییە، لە خۆڕا شتێکی ناپەسەندی شەرعی دەکەنە بەهانە بۆ ڕۆژوو نەگرتن، ئەوە جگە لەوەی تاوانی ڕۆژوو خواردنەکەی لە ئەستۆیە تاوانی ئەو درۆیەشی دەکەوێتە ئەستۆ.

فدیە دیارە خۆراکی یەک نەفەرە، یا بەهاکەیەتی بۆ فەقیران. ئەو فدیەیە ئەگەر کەسێک دەستی ڕۆیی و لە باتی خۆراکی یەک نەفەر، ئی دوو نەفەری دا، واتە زیاد لە فدیەی دا، ئەوە بۆ خۆی خێرە و باشترە. دەنا ئەگەر هاتوو ئینسان بە هۆی بەجێ نەمان لە گەلی ڕۆژووگران تینی دە خۆ کرد و غیرەتی نایە بەر خۆ، شانی دا بەر ڕۆژوو گرتنەکە، لە بەر ئەوەی ڕۆژوو گرتن هۆی نزیک بوونەوەیە لە خودا. لە بەر ئەوەی نا خەڵک پێی بڵێ ئازایە و یا فدیە نەدا، ئەوە زۆر خێرە ئەگەر تێبگا ڕۆژی خۆی پاداشی گەورەی بە نسیب دەبێ.

**تیوتیوە:** لە سەر ئەساسی هەڵسەنگاندنی ڕاز و حیکمەتی ڕۆژوو، دەبێ ڕۆژوو بە پێی شەوق و زەوق و ئارەزوو بگیردرێ نەک لە سەر ئەساسی تۆبزیگەری و زۆری، تاکوو نیشانەی بەرەکەت و خێر و سەوابی ڕۆژووەکە دەرکەوێ و بێتە جێ. و هەروا ئەگەر بەرجەوەندی ئاخری ئایەتەکە بی کە دەفەرموێ ﴿خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ڕۆژوو گرتن خێری هەر بۆ خۆتە وەک باقی عیباداتی دیکە، هیچ بەهرەیەکی بۆ خودا نییە. بەڵکە هەچی خێری عیبادەتە بۆ خاوەن عیبادەت زەخیرە دەکرێ.

ئەقڵ و شعوور و دڵ لە سەر ﴿عَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ﴾ ڕادەمێنێ و دادەمێنێ لەو بارەوە کە خودا دەفەرموێ: پێویستە لە سەر ئەوانەی کە دەتوانن دە واقیعدا بەڕۆژوو بن، بەڵام بەڕۆژوو نابن، جا هۆی پێنەبوونیان هەر خودا و بۆخۆیان دەزانن. بۆخۆیان ڕەنگە بڵێن نەخۆش دەبین یا تووشی برینی میعدە دەبین، جا ئەدێرەدایە خودا دەزانێ ڕاست و درۆی ئەو ئیدیعایە، بە هەر حاڵ ئەو کەسانە خودا فدیەی لە سەر داناون.

ڕامان و دامانی دڵ و ئەقڵ و شعوور دێرەدایە، هێندێک لە زانایان ڕا و بۆچوونیان لەو بارەوە ئاوایە: ئەو (يُطِيقُونَهُ) ڕێڕەو و نەخۆشن چونکە وا هەیە، مسافر و نەخۆش تاقەتی ڕۆژوو

گرتنیان هەیە، واش هەیە نیانە، جا ئەوانەی تاقەتیان نییە ئەوانەیە ﴿فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ ئەمما ئەوانەی کە توانای گرتنیان هەیە و نایگرن دە سەفەردان وەیا نەخۆشن، ئەوانە دەبێ فدیە بدەن، جا کەوابێ دەبێ بڵێین خودای تەعالا بۆ مسافر و نەخۆش دوو ڕێی داناوە: ١. ڕۆژوو نەگرێ، فدیە بدا و پاشان دەکاتی تواناییدا وەیانگرێ ٢. تاقەتی هەیە بیگرێ زۆری ناڕەحەتی تووش نابێ ئەوکات لە نێوان گرتن و نەگرتندا سەرپشکە، واتە وازی لێیە بیگرێ و فدیە نەدا، وازی لێیە نەیگرێ و فدیە بدا. بۆ زێدە زانین بڕوانە تەفسیری کەبیر هەر هەمان ئایە.

ئەوجار پێویستمان بەوەیە کە بزانین ئەو ڕۆژە هەڵژمێرانەی کە دە ئایەتی ١٨٤دا فەرمووی: ﴿أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ﴾ واتە ئەو ڕۆژوانەی کە دەبێ بگیردرێن کە دە ١٨٣دا خودا فەرمووی ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ﴾ چەندن؟ بە مانگن وەیا کەمتر لە مانگن وەیا زیاتر لە مانگن؟ جا بۆوەی بەڕوونی بۆمان دەرکەوێ چەند و چەند نین دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١٨٥ی بەقەرە:

**﴿١٨٥﴾ شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُواْ الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ اللّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ**

**مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە خودای گەورە لەو مانگەدا قورئانی پیرۆزی ناردۆتە خوارەوە بۆ شارەزایی ئینسان و پێشاندانی چاکەکان و خراپەکان. جا ئەو کەسەی کە دەگاتە مانگی ڕەمەزان، دەبێ تێیدا بەڕۆژوو بێ بەڵام ئەو کەسەی نەخۆش بێ تێیدا وەیا دە سەفەردا بێ، دەتوانێ بەڕۆژوو نەبێ بەڵام لە دوایە بیانگرێتەوە. ئەی موسوڵمانەکان خودا ئاسانکاری و بارسووکی بۆتان دەوێ و نایهەوێ ناڕەحەتتان کا. تاکوو بتوانن ئەو ماوە دیاریکراوە تەواو کەن و فەرمانی باریتەعالا بگەیێننە جێ و ناوی خودا بە بەرزی ڕابگرن بەو هۆیە کە شارەزای کردوون بۆ ڕێگای ڕاست و دروست، و هەروا سپاسگوزاری خودا بکەن.**

## مانگی ڕەمەزان و ڕۆژوو و نازڵ بوونی قورئان

**ئاگاداری:** لێرەدا لە بەر سوود و خێری زۆری ڕۆژووگرتن بۆیە خودای مەزن دووبارە باسی ڕۆژوو گرتنی کردەوە، دەنا هەر بە ئایەتەکانی ١٨٣ و ١٨٤ لە ڕۆژووگرتن حاڵی کراین و هەروا باسی ئەوانەشی بۆ کردینەوە کە نەخۆشن و یا دە سەفەردان هەر لە بەر ئاسانکاری و چاک لێ حاڵیبوون.

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانین:** مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی تێدا نازڵ کراوە، واتە بۆ هەوەڵین جار لە ئایینی محەمەدﷺ ئەویش بۆ شارەزایی و ڕێنوێنی عالەم دەگەڵ دەلیل و بورهان و نیشانەی ڕوون و جیا کردنەوەی چاک و خراپ لە یەکتر.

بەڵێ، دەتوانین بڵێین هەروەک هەموو نەتەوە و گەلێکی زیندوو شانازی دەکا بە خاڵە بەرچاوەکانی مێژوو و کاروانی ژیانی، واتە بە لەدایکبوونی، ڕۆژی سەرکەوتنیان و دەستووراتی ئایینیان وەک جێژنەکانی ڕەمەزان و قوربان و لەدایکبوونی پێغەمبەریان، و دابەزینی قورئان بۆ سەر زەوی، کە هەموو ساڵێک لەو ڕۆژەدا وەکۆ دەبنەوە و پیرۆزبایی لێک دەکەن.

جا لە سەر ئەو ئەساسە جێی خۆیەتی بۆ گەلی ئیسلام مانگی ڕەمەزان کە مانگی لەدایکبوونی دەستووراتی ئیسلامیە (واتە قورئان) بیکاتە جەژن و شادمانی و بیرەوەری لەو دەستووراتە. بە تەئکید بەو ڕۆژانە دەکوترێ (یوم الله). بە کوردی و بە کورتی ڕۆژی سەرکەوتن بە سەر دوژمن و ڕۆژی لەدایکبوونی یاسای ژیان و تەواوی ڕۆژی پێکهاتنی دروشمی پیرۆزی (یوم الله)ن. بۆ باوەڕی بڕوانە لە ئایەتی ٥ سووڕەی ئیبراهیم کە یادە لە ڕۆژی سەرکەوتنی مووسا بە سەر فیرعەون.

ئەوجار خودای مەزن هەر بۆ تێگەیشتن و حاڵیبوونی ئینسان دووبارە ڕۆژی واجببوونی ڕۆژووی ڕەمەزان و پێویست بوونی لە سەر ئینسان ساغ و نیشتەجێ و وەیا فیدە لە سەر نەگری و یا مەعافی نەخۆش و سەفەرچیان گرتنەوەی لە ڕۆژانی دواییدا بە بەربڵاوی باس دەکا، هەر بۆ ئاسانکاری و بارسووکی ئینسان، ئەوە، ئەوە سابت دەکا کە خودا دەگەڵ ئینسان بەڕەحمە و بەهانەش لە ئینسان دەبڕێ.

**بۆ ئاگاداری:** خودای تەعالا دە ئایەتی ١٨٥ی بەقەرەدا فەرمووی قورئان دە مانگی ڕەمەزاندا دابەزی و هاتە خوار بۆ شارەزایی ئینسان، بەڵام دەبینین دە سووڕەی (اسراء) ئایەتی ١٠٦دا خودا دەفەرموێ چین بە چین و ئایە بە ئایە نازڵم کرد تاکوو بەرەبەرە فێری عالەم کرێ. واتە دە ماوەی ٢٣ ساڵدا تەواوی نازڵ بوو. ئەو دوو قسانە مانایان چییە و بۆچی وایە؟

دیارە دەلیلی قورئانیمان نییە و حەدیسیشمان بە ڕوونی هەر نییە، کە وابێ دەبێ ڕوو بکرێتە دەلیلی ئەقڵ و شعووری ڕەوا و پەسند کە دژایەتی دەگەڵ قورئان لێ چاو نەکرێ. لە سەر ئەو ئەساسە وا چاکە بڵێین قورئان خاوەنی هەستە و ڕاز و حیکمەتانێکە یەک کەڕەت هەستە و ئەقڵ

و میچکی ئینسان ناتوانێ هەڵیگرێ و وەرگـرێ هەچەن دژایەتـی دەگەڵ سـرشتی بەشـەریش نییەبەڵام سـرشت یەک کەڕەت هەر ناتوانێ هەزمی کا و وەیقۆزێ. جا بۆیە دەڵێن: لە سەرەتاوە بۆ یەکەمین جار دە مانگی ڕەمەزاندا دەستی کرد بە دابەزین تاکوو بەرەبەرە بە پێی نیازی ئینسـان دە توولی ٢٣ساڵدا سـرشتی ئینسان و بیر و مێچک ئینسان کە خۆی ئامادەی وەرگرتنی کردووە وەریگرێ ئەویش هەموو هاتە خوار و هەروا دەبێ ئەوەش بزاندرێ باڵای قوڕئان بە قەد بـاڵای نیازی ئینسانە واتە کەمی نییە قورئان، واتە ئینسـان ئەو خەیـاڵە نەکـا و بڵـێ قورئـان نەیتوانیـوە نیازەکانی ئینسان بپێکێ و بەجێیان بێنێ بەڵکە دەبـێ بـاوەڕی وابـێ هەچـی بـۆ ئینسـان لازم و پێویست بێ هەم بۆ وەرزی دنیا هەم بۆ وەرزی قیامەت دە قورئانـدا دیـاری کـراوە. ئەگەر بڵـێ وبکوترێ وا نیـیە، نەخێـر وایە؛ بەڵام ئەوەی نـازانێ وایە خەتـای دەسـتەڵاتداران و ڕاگەیێـنەرە دۆڕاوەکانی قورئان بگرن کە حاشاردەر و قووتدەری حەقیقەتی قورئانن.

## ئاگاداری لە سەر مانای وشەی (رمضان)

لە ناو عەرەب زمانانـدا مشـتومڕ هەیە بەو شـێوەیە: هێنـدێک کوتوویـانە رمضـان نـاوی خودایە، بەو پێیە (شهر رمضان) واتە (شهر الله) گۆیا حەزرەتی ڕەسوولیش هەر وای فەرمـووە. هێندێکیش ئاوای بۆچوون: ڕەمەزان وەک ڕەجەب و شەعبان کە نێون بۆ مانگەکان، ڕەمەزانیش هەر ناوە بۆ مانگ، بەڵام هۆیەکەی چییە کە ناوی ڕەمەزانە؟ ئەوەیە رەمەزان بە بارانێک کـوتراوە دە ناو عەرەباندا کە لە پێش وەرزی پاییزدا باریوە و وڵاتی خـاوێن کـردۆتەوە، ڕەمەزانـیش وەک بارانە وڵاتی دڵان خاوێن دەکاتەوە.

**بۆ ئاگاداری:** خودا دە ئایەتەکەدا فەرمووی ﴿وَلِتُكمِلُـواْ الْعِـدَّةَ﴾ نەیفەرمـوو و (وَلِتُكمِلُـواْ الشهر) هۆیەکەی چییە؟ هۆیەکەی ئەوەیە جـوملەی (وَلِتُكمِلُـواْ الْعِـدَّةَ) هەم شـاملی عەدەدی (ایـام الشـهر) دەبـێ، هەم شـاملی (ایـام قضـا) دێ، واتە هەردوو مەتـڵەب دەپێکـێ. بەڵام دە جوملەی (وَلِتُكمِلُواْ الشهر)دا هەر حوکمی تەواوی مانگ دەپێکێ، حوکمی قەزا ناپێکێ.

بۆ بەرگری لە درێژی تەفسیرەکە و دووری لەو شتانەی کە بە وەزیـفەی تەفسـیر نەزانـراون بەڵکە دە ئەستۆی شەرع بەسـراون لە هێندێک شت خۆمان پارازتووە بۆ نموونە دە باسی مانگی ڕەمەزاندا ئەوانەمان باس نەکردوون کە پێویستن: کێ شایانە بۆ شاهیدی لە سـەر مانـگ دیتنـی ڕەمەزان؟ حوکمی ئەوانەی کە مانگی ڕەمەزانیان نییە؟ کێیە لە باتی ڕۆژوو فـدیە دەدا؟ ڕۆژووی

قەزا فدیەی چییە؟ ڕۆژوو بە چی بەتاڵ دەبێ؟ و هەروا زۆر شتی دیش.

بە پێی یاسای هاوارکەری دەبێ ئەو کەسەی هاواری دەکرێتێ و داوای دەکرێ، دەبێ بشبیسێ و وەرامیشی پێ بدرێتەوە. ئەوەش لە خودا نەبێ لە کەس نایەتە دی. جا بۆیە خودای تەعالا دە ئایەتی ١٨٥دا داوای لە عەبدانی کرد کە خودا بە گەورە بزانن و بە گەورەی ڕابگرن و هەروا سپاسی بکەن لە سەر گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان. بەو لەفزانە خودا داوای لە ئینسان کرد کە خودا بە گەورە ڕابگرن ﴿وَلِتُكَبِّرُواْ اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾.

هەروا لێرەدا خودا بە ئینسانی کوتووە ئەوەی ئێوە بە گەورەی ناو دەبەن و سپاسی دەکەن لێتان نزیکە و گوێشی لێتانە و جوابیش‌و دەداتەوە لە کاتێکا کە داوای دەکەن. جا بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٨٦:

**﴿١٨٦﴾ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ**

**ئەی پێغەمبەر ئەگەر عەبدەکانم لە بارەی منەوە پرسیاریان لێ کردی پێیان بڵێ من نزیکم لێیانەوە. ئەو کەسەی بە دڵ داوایەکم لێ بکا بێ‌گومان بە هانایەوە دەچم و داواکاریەکەشی بۆ دەهێنمە جێ، بە شەرتێ داواکاریەکەی بۆ خراپە نەبێ. بەڵام مەرج نییە داواکاریەکەی دەستەولەجێ بێتە جێ. ئەمما ئەوانیش چیم لێ داوا کردوون و دەستوورم پێ داون دەبێ بیهێننە دی، واتە ئەوان داوای من بێننە جێ، ئەمنیش داوایان دێنمە جێ. جا بۆوەی هیدایەتیان دەس کەوێ بەرەو چاکە بڕۆن ئەو بابەتەی بە هێند بگرن.**

## خودا لە ئینسان نزیکە، گیرابوونی دوعای دوعاکاران

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی بە وردی:** هەر کاتێ بەندەکانی من ئەی پێغەمبەر! لە مەڕ منەوە پرسیاریان لێ کردی، پێیان بڵێ ئەمن لێیان نزیکم، چونکە لە مابەینی عەبدەکانم و من کەس واسیتە نییە لە پێغەمبەران و پیاوچاکان، بەو شەرتە کە هەر من بناسن و داوای نیاز و مەبەستیان هەر لە من بخوازن و کەسم نەکەن بە هاوبەش، وەک دار و بەرد و قەبر و پیر و قسن و نەزرگە و عەبا و ڕیش و بەرماڵ و دەفە و دەسحێب، چونکە ئەوانە لە غەیبەوە نە دەبیسن و نە دەبینن و نە دەزانن زۆر لەوە کۆڵەوارترن.

بەڕاستی و دروستی لە سەر ئەساسی تێچوونی ئەقڵ و هەست و شعوور، کەسێک خودای بە حەق بناسێ واتە لە هێز و توانا و زانست و ئیرادەی خودا تێبگا، ئەوە دەزانێ خودا هەموو

شـتێکی لە سـەر ئەساسـی عـیللەت و مەعلـوول واتە نەزم و نیـزام و تەرتیـب و سـەبەب و موسەبەب دانـاوە، دار و لەلە و وەسـیلەی تێـدا سـازاندووە کەوایە داوای نیـاز لە خـودا داوای وەسیلە و ڕێنوێنی و پێکهێنانی ئەو نیازەیە عەبد دەیکا. نەک خودای تەعالا بەبـێ دەلیـل و هـۆ ئەو شتەی بۆ پێکدێنێ. چونکە خـاوەن ئـیمان و بـاوەڕ دەبـێ ئەوە بزانـێ کە ئەقڵـیش بـاوەڕی پێیەتی: بەبێ سـواربوونی نێـر لە مـێ، مـێ ئـاوس نـابێ مەگەر بە مـوعجیزە وەک حەزرەتـی مەریەمە. و هیچ دانەوێڵە و دار و دەوەن و شیناوەردێک شین نابێ و بەر ناگرێ. تـاکوو هەوا و با و باران و ئاو دەخالەتی تێدا نەکەن چـونکە ئەوە نیـزام و دار و لەلە و دەسـتووراتی خـودای کارجوانە. دەتوانێ بێوەسیلە بە هەچی بڵێ ببە، ببێ و دەبێ؛ بەڵام (أحسـن الخـالقین) ئەوەیە کارەکان بە ئەساسێکی نەزم و نیزام و تەرتیب بێ، گۆڕانی یاسا و نیزام نایەتە گۆڕ وەک خودا بۆ خۆی فەرموویەتی دە ئایەتەکانی ٧٧ ئیسـرا، ١٦٢ ئەحزاب، ٤٣ فـاتر، ٢٣ فەتـح کە دەسـتوور و باوی خودا گۆڕانیان بە سەردا نایە.

با ئەو قەزاوەتە بدەینە دەستی ئەقڵ و شعوور و ویژدانی زینـدوو ئەمنـی خـودا هێنـدە بەو شێوازە جوان و پڕ بەرەکەت و ڕەحمە دە خزمەت عەبدیدا بم ڕەوا و ئینسافە ئەویش دە خزمەتی ئایینی مندا نەبێ و سپاسی من نەکا؟ و ئەگەر سەرەڕای ئەو هەموو چـاکەیەی دەگەڵـی دەکەم، ئەویش هەر خراپم دەرحەق بکا و شەرمێم لێ نەکا، شایانی چییە؟ بۆوەی دەبێ چی لێ بکرێ؟ دەبێ ئەگەر ڕەحمی بەربڵاوی خودا لێ گەڕێ، تەنبێ بکرێ و بە سزای خۆی بگەیێندرێ.

دێـرەدا دڵ هەسـتێکی پێـدا دێ لە لەفـزی ﴿فَـإِنِّي قَرِيـبٌ﴾. هەسـتەکەش ئەوەیە: ئایـا ئەو نیزیکیەی خودا بە شێوەی جێ و مەکانە؟ چونکە ئەگەر خودا بە شـێوەی دەرک و مەکـان بـێ، نیزیکیەکەی ئەوە دەبێ خودا قابلی بەش بێ. دیـارە ئەوەش لە خـودا بەدوورە. کەوایە دەبـێ وا باوەڕ کەین ئەو نیزیکیە بە زانست و حفز و ئاگادارییە، هەروەک ئاماژە وەلای ئەو نیزیکیە کراوە بە وەسیلەی ئایەتی ٤ی سوورەی حەدید ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْـتُمْ﴾ یـان بە وەسـیلەی ئـایەتی ١٦ی سوورەی قاف ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ﴾.

بە کورتی موسوڵمان دەبێ لە سەر ئەو باوەڕە بێ: خودای تەعالا لە هەموو شـوێنێک هەیە بە عیلم و ئیرادە و قودرەت و تواناوە.

**بۆ ئاگاداری:** خودا بۆ فەرمووی (إِنِّي قَرِيبٌ) نەیفەرمـوو (العبـد قَرِیـبٌ)؟ ئەوە کە ئـاوەی نەفەرمووە بێسوڕ و ڕاز و ڕەمز نییە، شتێکی دە بنـدایە، دیتـنەوەی ئەو شـتە ڕاز و ڕمـووزە لەو

بەحرە بێ سەروبنە کەلامەیاری نیازی بە مەلەوانانی زیت و ژیر و مـاهیر هەیە وەیـدۆزن. خـۆ دیارە لە ئایاتی خودا وەمێنێ هیچ مەلەوانێک ناتوانێ وەک ئەقڵ و شعوور بێ. جـا لە سـەر ئەو ئەساس و باوەڕە، ئەقڵ ئاوای بۆ دەچێ: ئینسان «ممکن الوجوده»، واتە لەو بـارەوە کە هەیە دە مەرکەزی نەبووندایە، دەسخۆشی فەنایە، کەوایە ئینسان بەو پێودانەی هەیەتی نـاتوانێ و بـۆی دەس نادا کە لە خوداوە نزیک کەوێ. چونکە بە ون واتە عەدەم دانراوە ئەمما خودای حەکیم بە توانایە و دەتوانێ بە هۆی فەزل و ڕەحـم و بەزەی خـۆی خـۆ لە عەبـدی خـۆی وەنزیـک خـا ئەوکات دەڵێن: ئەوە نزیک لە حەققەوەیە وەلای عەبد، واتە لە زاتـی «واجـب الوجـود» وەلای مومکینـات، نەک لە عەبـدەوەیە وەلای حەق، واتە لە فەنـا وەلای بەقـا. دەتەوێ زیـاتر بزانـی، بڕوانە تەفسیری کەبیر.

دیارە بۆ ئیسبات و ڕاگەیاندنی هەموو شتێک پێشوازێک پێویستە، تاکوو گوێگر خۆ ئامادە کا بۆ وەرگرتنی ئەو شـتەی هەدەفە، جـا لە سـەر ئەو یاسـا و ئەساسـە خـودای تەعـالا باسـی ڕۆژووی کـرد وباسـی ئەو هۆیانەشـی کـرد کە دەبـنە سـەبەبی ڕۆژوو نەگـرتن. کەوایە دەبـێ هەندێکیش باسی ئەو شتانە بکا کە بە زمانی ڕۆژووەوە بۆ ڕۆژووەوان ڕەوایە، جا بـۆ ئەو بـابەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٨٧:

**﴿١٨٧﴾ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ اللّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُواْ مَا كَتَبَ اللّهُ لَكُمْ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّليْلِ وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَقْرَبُوهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ**

ئەو شەوانەی کە ڕۆژەکانی بەڕۆژوو دەبن تێیدا، سوار بوون و دەگەڵ ڕازانـی ژنەکانتـان بـۆ حەڵاڵ کراوە چونکە ئەوان لیباسن بۆ ئێوە هەروەک ئێوەش لیباسن بۆ وان. خـودا لەوە ئاگـادار بوو کە ئێوە دەرحەق بە خۆتان تاوانتان کرد. بەڵام سەرەنجام کە لەو تاوانانە پەشـیمان بـوونەوە خوداش چاوپۆشی لێ کردن پەشیمان بوونەوەیان قبووڵ کرد. جا ئەوجار هەر لە ئێسـتەوە بچـنە لایان (ئەگەر دە عوزردا نەبن). داوای ئەو خێر و بێرەش بکەن کە خودا لە چارەی نووسـیون. و هەروا بشخۆن و بشخۆنەوە تاکوو هێڵی سپێدەی بەربەیانتان لە هێڵی ڕەشی شەوتان بـۆ لێـک هەڵداوێرێ. پاشان لەو کاتە بە دواوە هەتـاکوو شـەو دادێ ڕۆژوو گرتنتـان ئیـدامە پـێ بـدەن. کاتێکیش بە نیازی بەندایەتییەوە لە ناو مزگەوتەکاندا دانیشـتوون بە نیـازی چـاک، تووشـی

**ژنەکانتان مەکەون، ئەو قەرە نەکەوتنەی ژنەکانتان، سنووربەندی خودایە و جوغزی کێشاوە مەیبەزێنن. جا بەو جۆرە خودا یاسای خۆی بۆ عەبدەکانی خۆی ڕوون دەکاتەوە تاوەکوو ئێوەی بەندە لە خەتا و هەڵە و تاوانی بەعەمد ڕزگارو بێ.**

## ڕازان دەگەڵ ژنان، خواردن و خواردنەوە لە ڕەمەزاندا

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی ورد:** وەک دەگێڕنەوە لە سەرەتای ئیسلام بە هۆی ئەوەی کە یاسای ئایینەکانی پێش ئیسلام وێستا بە تەواوی کاڵ نەبۆوە، یارانی پێغەمبەر دە ڕەمەزاندا کە ڕۆژوویان دەشکاند واتە بەربانگیان دەکردەوە دەیانخوارد و دەیانخواردەوە و دەنووستن و دەگەڵ ژنەکانیشیان دروست دەبوون. بەڵام ئەگەر بنووستبان و پاشان خەبەریان ببوایەوە ـ با چەند کاتژمێریش شەو مابا ـ لایان وا بووە کە تازە دروست نییە هیچ بخۆن و دەگەڵ ژنەکانیشیان سوار بوون بکەن، هۆیەکەشی ئەوە بوو کە بیستبوویان یاسای ڕۆژوو وایە لە لای خاوەن کتێبەکانی پێش خۆیان و یاسای ڕۆژووش هەر یەکە لە هەر ئایینێکدا دەبێ. ئەگەرچی هێندێکیشیان دەگەڵ ژنەکانیان دروست دەبوون کاتێ لە شەوی ڕەمەزانا وەخەبەر دەهاتن.

جا هاتنە خوارەوە و دابەزینی ئەو ئایەتە (۱۸۷) کە یاسا و دەستووراتێکی تەواوە بۆ ڕۆژووگران هۆیەکەی حاڵیبوونی ڕۆژووانانە.

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێک** لە سەروسیما و ناو دەروونی ئایەتی ۱۸۷: دیارە وەک دەزانین ئینسان بوونەوەرێکی عەجوول و زاڵمە زوو خۆ دەدۆڕێنێ بە هەوا و ئارەزوو و بەتایبەت بەو نەفسە تامەزرۆیە کە ژن و مێردایەتییە. جا بۆیە خودای تەعالا دە مانگی پیرۆز و پڕ بەرەکەتی ڕەمەزان دار و لەلەیەکی توندی بۆ دادەنێ و پێی دەڵێ: ڕێ دراوە بۆتان لە شەوی ڕۆژوودا دروستبوون دەگەڵ ژنەکانتان. تا ئێستا ئێوە بە هۆی چڵێسی فێڵتان لە خۆتان کردووە، شتێکتان بەجێ هێناوە کە دروست نەبووە بە لاتانەوە. ئەو عەمەلەو بە گوناە خراوەتە ملتان، تۆبەو لێ کرد و خوداش بەخشینی. بەڵام لە ئێستێ بەولاوە بچنە لای ژنەکانتان لە شەوگاری ڕۆژوودا، و بە دڵ خوازیاری ئەو یاسا و دەستوورە بن کە خودا بۆی دەسنیشان کردوون واتە هۆی چوونە لای ژنەکانتان ئەوە بێ: وەچە بخەنەوە. وەیا بۆ ئەوەی بچنە لایان کە دوور کەونەوە لە داوێنپیسی دەگەڵ ژنانی بێگانە. ئەو شێوە جووڵانەوەتان بە خێر بۆ دێتە ژمار.

وەهەروا بخۆن و بخۆنەوەش لە ئێوارێڕا هەتاکوو هێڵی سپی ڕۆژتان بۆ جیا دەبێتەوە لە هێڵی تاریک و ڕەشی شەو. و هەروا بۆ خەڵوەکێشان و مانەوە لە ناو ژووری مزگەوتا بۆ

خوداپەرستی. جا ماوەی مانەوەکەتان دە مزگەوتدا کەم بێ یا زۆر، دزە مەکەن بۆ لای ژنەکانتان و سواریان مەبن. ئەوە یاسا و دەستووری سنوورداری خودان نەچن سنووربەزێنی بکەن.

وە هەروا لە خواردنی ماڵی یەکتری بە ناڕەوا خۆ بپارێزن و هەروا مـاڵی خۆتـان بە بەرتیـل مەدەنە فەرمانداران، بۆوەی بەشـێک لە مـاڵی خەڵـک بخـۆن بە نـاڕەوا، واتە خەڵـک بە نـاڕەوا مەحکووم کا بە هۆی ئەو بەرتیلە. کەچی ئێوە دەشزانن کە ئەو بەرتـیلە نـاڕەوایە چـونکە تەڕەف حەقە و دەتهەوێ لە سەر ئەو حەقەش ڕا وەژێرەوەی خەی بە بەرتیل.

**تیوتیوە:** لە سەرەتای دابەزینی ئایینی ئیسلام دە مانگی ڕەمەزانێدا سوار بوون دەگەڵ ژنان بە شەو و بە ڕۆژ بە حەرام و ناڕەوا زانـدرابوو. جـا لە سـەر ئەو حـاڵەتە سـەختە خـاوەن نەوس و چڵێسەکان دە شەوەکاندا پارێزیـان دەبـرد و دەچـوونە زگ ژنەکانیـان. خەتـا و تـاوانی سـنوور پەڕاندنیان داویشتە سەر ئەستۆی خۆیان، پاشان کە هەوەسیان دادەمرکا و دەنیشـتەوە پەشـیمان دەبوونەوە و تۆبەیـان دەکـرد. خـوداش دیـارە بە پێـی بەزە و ڕەحمـی و عەجـوولی ئینسـانیش دەیبەخشین.

ئەدێرەدا هەست دەکـرێ ئـارەزووی هەوەس زۆر بەهێـزە بەغەیـرەز هێـزی ئـیمان بە هـیچ هێزێک تێکناشکێ و پاشەکشەی پێ نـاکرێ. و هەروا دێـرەدا ئەوە سـابت دەبـێ کە دەبـێ لە شوێنی خلیسک و هەڵدێر بە تەئکید دووری بکرێ دەنـا بەبـێ گومـان هەڵـدێران دێـتە ڕوو. بە کوردی و بە کورتی: قاچوقول و بەرۆک و سینەی ڕووتی ئافرەتان هەڵدێرانی هەوەسپەرستان و بێبـاوەڕی بە ئـایینی کەڕامەتبەخـش و حەیاتبەخشـی ئینسـانی پێـوەیە. ئەگەر پاشـبەند و پێشبەند بگرێ هەوەسی یاغی هەمان دەپسێنێ و کاری خۆی دەکا. بۆیە ئایینی پیرۆزی ئیسـلام پاسەوانی حەیا و کەرامەتی ئینسان ئەو دار و لەلەیەی دامەزراندووە، جا پەنا بە خودا. هەر بۆیە ئایینی وەحی ناحەزە لە پێش چاوی هەوەسپەرستان.

**ئیعتیکاف**

واتە مانەوە لە شوێنێک بۆ عیبادەت. زانایانی ئـایینی کـۆکن لە سـەر ئەوەی: شـەرت نیـیە دانیشتن لە ناو مزگەوتدا بە ناوی ئیعتیکاف، ئەگەر وا کوتراوە لە بەر قەداسەتی مزگەوتە، ئەگینا لە هەموو شوێندا دەبێ.

گۆیا حەزرەتی عەلی فەرموویەتی ئیعتیکاف لە مسجدالحرامدا نەبێ نابێ، بەڵگەش ئایەتی ﴿أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ﴾. لە سـەر ئەساسـی ئەو ئـایەتە مسـجدالحرام بـۆ عاکفـان

دیاری کراوە.

پێویست ناکا بۆ ئیعتیکاف بەڕۆژوو بێ، واتە بەبێ ڕۆژووش ئیعتیکاف دروستە ئەمما بەڕۆژووەوە چاترە.

مشتومڕی شاریعان: حەنەفی کوتوویەتی بێ ڕۆژوو دروست نییە ئیعتیکاف، شافعی کوتوویەتی بێ ڕۆژووش دروستە، و هەروا شافعی دەڵێ: کات و سات و ڕۆژ بۆ ئیعتیکاف دیاری نەکراوە واتە ئەندازەی چەند کات و سات و ڕۆژ بۆ ئیعتیکاف نییە. ئەگەر یەک کاتژمێریش نەزری دانیشتنی ئیعتیکاف بکرێ دێتە جێ. خودای تەعالا یەک حوکم نەبێ ئیعتیکافی دانەناوە، ئەو حوکمەش دەگەڵ نوستنی ژنە، واتە نابێ تا دە ئیعتیکافدا بێ، نابێ سواری بێ (فَلاَ تَقْرَبُوهَا) واتە نزیکیان مەکەون. یا ﴿وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ﴾.

پاش ئەوەی خودای تەعالا بە ئینسانی ڕاگەیاند لە خواردنی ماڵی خۆت دە کاتی ڕۆژوودا خۆ بپارێزن، جگە لەوەی لە هەموو کاتاندا لە ماڵ خواردنی بێهوودە ئینسان مەنع کراوە. ئەوجار خودای تەعالا ئینسانی مەنع دکا لە خواردنی ماڵی خەڵک بە ناحەق و ناڕەوا و دە هەموو کات و ساتاندا، بۆ تەئکیدی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٨٨ کە دەوێدا ڕوون کراوەتەوە مەتڵەب:

﴿١٨٨﴾ **وَلاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ**

**ئەی موسوڵمان هەرگیز ماڵ و دارایی یەکتری بە ناڕەوا مەخۆن، بەو شێوە کە کێشەکانتان بەرنە لای فەرمانڕەوایان بە بەرتیلدان هەندێ لە سامانی خەڵکی داگیر بکەن، و لە هەمان کاتیشدا خۆتان چاک دەزانن. کە بە هۆی ئەو بەرتیلە ئەو ماڵە ناڕەوایە وەدەست هێنا، (واتە خاوەن حەق بە زۆر و بە بەرتیل لە حەق خست.)**

## خواردنی ماڵی یەکتر

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی ورد** دە سیمای ئەو ئایەتە: ماڵی یەکتری بە هۆی فێڵ و فووت و حیلەگەری دە ناو خۆتاندا مەخۆن چونکە ئەوە خەیانەتە بە حەیاتی کۆمەڵگا و خۆتان و ئایینتان. بە زۆری دە دنیای ئەوڕۆی بێ مبالاتی بە ئایین ئەو ناڕەوایە وەک گەزۆ و مازوو دەخورێن و سڵە کردن لە خواردنیاندا نییە و ناکرێ:

١. سوود خواردن
٢. بەرتیل
٣. لە باتی گێڕانەوەی نوێژ و ڕۆژوو، پارە دەدرێ بە زەلام
٤. دەڵاڵی
٥. زیادەخەرجی: ئیسـراف.

بە کوردی و بە کورتی: ئایین دەڵێ دەبێ لە ڕێگای شەرعەوە بژی. ژیـانی بە ڕاووڕووت و فڕ و فێڵ ویژدان و کەڕامەتی زیندوو کە لە ئـیمانەوەیە نـایەوێ چـونکە خەیـانەتە بە کەڕامەتـی بەشەری. خراپە کردن بە زانینەوە ناحەزترە لەو خراپە کردنەی کە نەزاندرێ خراپە، بەشـی زۆری نارەواکانی ئێستێ کە خەڵک دەیانکا نازانێ و حاڵی نەکـراوە ئەگەر خـراپن وەبـاڵەکە دەکەوێـتە سەر ئەستۆی خۆی کە بێ پرسیار ملی لێ ناون و ئەستۆی ڕاگەیێنەرانی ئـایین کە چاوپۆشـییان لە ڕاگەیانـدنی کـردووە و ئەو دەسـتەڵاتدارانەی کە بە نـاوی یاسـای مەزهەبـی دەرخـواردی کۆمەڵگای دەدەن.

دە ئایەتی ١٨٦دا وا دەردەکەوێ پرسیار لە دوور و نزیکی خودا کرا، کە ئایا خودا تـا کـوێ دوورە لە ئینسانی و تا کوێ نزیکە؟ دیارە وەڵامی تەواویان پێ گەیی و قەناعەتیش هاتە جێ. دە ئایەتی ١٨٩دا پرسیاری چۆنیەتی مانگ دەکرێ و هەروا لە چەن سووڕەت و ئایەتی دی پرسیاری جۆراوجۆر دەکرێن. ئەو پرسیارانە نیشانەی ئەوەن موسوڵمانان گەیشتوونە ئەو قۆناغە شتی بـێ دەلیل و بەڵگە و بورهان وەرنەگرن و ناچنە ژێری. کەوایە جێی نیازە کە بچیـنە خـزمەت ئـایەتی ١٨٩:

**﴿١٨٩﴾ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوْاْ الْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَـكِنَّ الْبِرَّ مَنِ اتَّقَى وَأْتُواْ الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ**

**ئەی پێغەمبەر! پرسیارت لێ دەکەن بۆچی مانـگ لە سـەرەتاوە وا بـاریکە؟ لە وەڵامیانـدا بڵـێ: مانگ کاتەکانتان بۆ دیاری دەکات وەک کاتەکانی ڕۆژوو و حەج.**

پاش ئەوەی خودا وڵامی مانگی دانەوە ئینجا خودا داب و باوێکی عەرەبەکانی نەفـامو بـۆ باس دەکا تەنانەت پاش دابەزینی ئیسلامیش هەر ئاوا نەفامانە دەجووڵانەوە. دابە نەفامەکەشیان ئەوەبوو: کاتێ کە ئیحرامیان بۆ حەج یا بۆ عومرە ببەستایە وایان دەزانی کە نابێ تازە لە دەرگای ماڵەکانیانەوە بچنە ژوورەوە. بەڵکە دەبوو لە پشتەوەڕا بچنە ژوور. جا وا هەبوو بـۆ چـوونە نـاو

ژووریان لە پشتەوەڕا ماڵەکانیان کون دەکرد حەتا ئەگەر ڕەشماڵنشین بان، هەڵیان دەداوە لە پشتەوەڕا بۆ چوونە ناو. جا لەو بارەوە خودا دەفەرموێت:

**لە پشتەوەڕا چوونە ناو ماڵ وەنەبێ کارێکی چاک و خوداناسانە بێ. بەڵکە چاکی و خوداناسی لەوەدایە کە یەکتاپەرست بن و خۆتان لە خراپەکاری وەدوور خەن. و کاتێ ویستتان بچنە هەر ماڵێک، پاش ئیجازە وەرگرتن لە دەرگاوە بچنە ژوور و بە ئاکاری چاک خۆو لە خودا وەنزیک خەن. تا بە هۆی ئەو کردەوە چاکانە سەرکەون.**

## مانگ بۆ زانینی کاتە

**تێوەڕامان:** ئەقڵ و شعوور ئەگەر نەشێوێندرێن کاروبار و پرسیاریان لە جێی خۆیدا دێننە جێ، شتێ بێجێ نە دەکەن نە دەیڵێن. ئێستێ چەن جوانە ئەگەر سەرنجی دەیەی کە لە پاش باسی ڕۆژووی ڕەمەزان، پرسیاری مانگێ لە پێغەمبەر دەکەن، چونکە بە پێی عادەت ئەگەر ڕەمەزان هات لە بەر ئەوەی خەڵک تێیدا بەڕۆژوو دەبن و خوازیاری ئەوەن زوو تێپەڕ بێ و تەواو بێ، باس هەر باسی ئەو مانگەیە داخوا کەنگێ پڕ دەبێ و باریک دەبێتەوە وەک جاری هەوەڵی نوێ بوونەوەی. جا بۆیە لە پێغەمبەریان پرسیار کرد مانگ بۆ لە پێشەوە وا باریکە و پاشان بەرەبەرە گەورە دەبێ تاکوو شەوی چاردە پڕ دەبێ ئەوجار وردەوردە بەرەو چکۆلەبوون و باریکبوون وەک شەوی نوێبوونەوەی لێ بە سەر دێتەوە؟ خوداش بۆ وڵامدانەوەیان بە پێغەمبەر دەفەرموێ: ئاوایان پێ بڵێ: ئەو جۆرە حاڵەتانەی مانگ بۆ دیاری کردنی کات و زەمانی پێویستی ئینسانە، وەک ئەوە: ڕەمەزان سنووردار دەکا، حەیزی ژنان، عیددەی تەڵاقدانی ژنان، شیردانی منداڵان، کات و ساتی کرێی کرێکاران، قەول و قەراردادی بازرگانان لە کڕین و فرۆشتندا و لە قەرزداندا، کاتی حەج و ئیحرام، سەراپای ئەوانە بە مانگ قەرارداد و سنووردار دەکرێن.

هەچەن ئەگەر سرنجی بدرێتێ دەردەکەوێ کە پرسیارەکە لە هۆی گۆڕانی مانگە، ئەمما وڵامی پرسیارەکە باس لە حیکمەتی گۆڕانەکەیە. جا خودای تەعالا بۆیە لایدا لە بەیانی حیکمەتی گۆڕانی مانگ کە ناشی لە جووڵانەوەی زەوی و باقی کائیناتە، جگە لەوەی فکر و بیری پرسیارکەران دەرەقەتی نەدەهات و بۆی هەزم نەدەکرا و قازانجیشی بۆ نەدەبوون، بەڵکە ئەوەی قازانجی بوو بۆ ئینسان، ئەوە بوو: دیاری کردنی کات و زەمانی پێویست وەک حەج و ڕۆژوو و تەڵاق و عیددە و...

## پرسیار لە ١٤ شت

وەک زاندراوە و دیاریشە سـرشتەن ئینسان پڕ پرسیارە تا دڵـی دادەمرکـێ بەڵام لە سـەر ئەو حاڵەتەش ڕا واتە بەپرسیار، وێستا ناگاتە قەومەکانی دی. گۆیا «ابن‌عباس» کوتوویەتی ئـۆمەتی ئیسلام لە بەر ئەوەی بە کوتەی پێغەمبەر دڵیان زوو باوەڕی کردووە و دامرکاوە، زۆریان لە شـت نەکۆڵیوەتەوە. تەنانەت لە ١٤ شت پرسیاریان کردووە و جوابیشیان وەرگرتۆتەوە. هەشتیان وا دە سوورەی بەقەرەدان:

١. ئایەتی ١٨٦ ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ﴾

٢. هەر هەرمان ئـایەتە ١٨٦ە. شەشـەکانی دیـش هەر لە دوای ئەو ئـایەتەوەن دەو سـوورە بەقەرەیەدا دێن. ئەوە دەبنە هەشت ئایە و هەشت پرسیار.

ئایەتی نۆهەمین (٩) دە سـوورەی مائیـدەدا ئـایەتی پێـنجە ﴿يَسْـأَلُونَكَ مَـاذَا أُحِـلَّ لَهُـمْ﴾. دەهەمـین (١٠) ئـایەت دە سـوورەی ئەنفالـدایە ئـایەتی هەشـتە ﴿يَسْـأَلُونَكَ عَـنِ الأَنفَـالِ﴾. یازدەهەمینیش (١١) دە سوورەی ئیسـرادایە ئـایەتی ٨٥: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ﴾. دوازدەهەمـین (١٢) دە سـوورەی کەهفـدایە ئـایەتی ٨٢ ﴿وَيَسْـأَلُونَكَ عَـن ذِي الْقَـرْنَيْنِ﴾.سـێزدەهەم (١٣) دە سوورەی تەهـادایە ئـایەتی ١٠٥: ﴿وَيَسْـأَلُونَكَ عَـنِ الْجِبَـالِ﴾. چـاردەهەمین (١٤) دە سـوورەی نازیعاتدایە ئایەتی ٤٢: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ﴾. بۆ زێدە زانین بـڕوانە تەفسـیری کەبیـر، هەمـان ئایەت.

خودای خـاوەن توانـا و کـارزان و کـارجوان، دەورانـی بە خـول و گەڕی بە چـوار کـات پایەسازی کردووە: سَنَة، شَهْر، يَوْم، ساعَة. چۆن پێک‌هاتنی هەریەک لەو چوار جیهەتـانە کە لە ئەسەری جووڵانەوەی ڕۆژ وزەوی‌ڕا سەردەگرن و دێنە دی، لە سەر ڕۆیشتنی زۆری پـێ دەوێ و لە تایبەتی عیلمـی تەفسـیریش نیـیە، بەڵـکە عیلمـی تـایبەتی خـۆی هەیە، کە ئەستێرەناسـی فەلەکییە. کێ وازی لێیە لەو بارەوە زاناتر بێ، تەفسیری کەبیر بگرێ و سەیری کا.

زۆر پێویست و ئەساسییە ئەوە قووت نەدرێ و نەشاردرێتەوە: ئایینی ئیسلام ئایینی پـێکەوە ژین و تێکۆشان و هاویاری و دەسبارییە پێکەوە. ئایینی خودنما و چاوڕاو نییە و هەروا ئایینی لاف و گەزاف و خۆبادان نییە. ئەو شتانەی بەهرەیان بۆ ئایین نەبێ، خۆی لـێ لادەدا. هەروا لە باسی گۆڕانی ڕووگەدا قورئان خێـر و چـاکەی لە ڕوو تێکردنـی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئـاوادا نەدی

بەڵکە لە ڕوو تێکردنی خێر و حەسەنات و چاکە و چاکەکاری و تەقوادا دی. هەروەک دە ئایەتی ١٨٩شدا باریک و لاواز و قەڵەوی و پڕی مانگ بۆ ئاشنایەتی و زانایەتی کاتەکانی ئایینین تاکوو ژیان لە سەر ئەساسی تەرتیب و نەزم و نیزام بڕوا و خول داتەوە و هەچی کاتەکانی ئایینین خاوەنی سەرحەد و سنوور بن و دیاریکراو، بێ تێکەڵ بوون لە یەکتر.

لە ئایەتی ١٨٩دا بە ئاشکرایی ئیشارە وەلای ئەوە دەکا مێژووی ئیسلام بەر ئەساسی مانگە نەک ڕۆژ. واتە مێژووی ئیسلام لە سەر تاریخی قەمەری دامەزراوە نەک لە سەر تاریخی شەمسی. دە ئایینی ئیسلامدا بەراوەرد و لێکدانەوەی شەو وڕۆژ و مانگ هەڵاتن و ئاوابوون بە حیسابی مانگ بووە نەک ڕۆژ، هەر وەک ئەو ئایەتی ١٨٩یە و ئایەتی ٥ی سوورەی یونس ئاماژەی تەواو وەلای ئەو بابەتە دەکەن ﴿وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُواْ عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ﴾ واتە ئێمە مانگمان دە چەند مەرحەلەدا دامەزراند تا ژمارەی ساڵ و حیساب بزانن. کەوابێ بە پێی ئەو یاسایە دەبێ کاتەکانی ڕۆژوو و حەج و عیددەی ژنان و هەروا... لە سەر ئاساسی پێوانەی مانگ بێ، بەڵام بە داخەوە ئەوڕۆ هەموو نامە و کارەکانمان لە سەر ئەساسی ڕۆژە نەک مانگ. حیسابی قەمەری داپۆشراوە بە حیسابی شەمسی. هەروەک زۆر شتمان کەوتوونە ژێر داب و باوی ڕۆژ.

## حورمەت شکێنی مانگە حەرامەکانی ذی‌القعده، ذی‌الحجة، محرم، رجب

گۆیا پێغەمبەر لە ساڵی شەشەمی هیجرەتیدا دەگەڵ ١٤٠٠ کەس لە یارانی دە شازدەی مانگی ذی‌القعدەدا چوو بۆ مەککە بە نیەتی بەجێهێنانی عەمرە، کەچی بێباوەڕەکانی مەککە ڕێیان پێ نەدان و حورمەتی مانگی حیرامیان شکاند. پێغەمبەریش لە حودەیبیە کە ناوی بیرێکە لە نیزیک مەککەوەوە بە پێی دانیشتن دەگەڵیان پێکهات بۆ ساڵی داهاتوو بێتەوە سێ شەو و سێ ڕۆژ مەککە دە ئیختیاری ئەودا بێ بۆ زیارەت کردن. جا لە سەر ئەو قەراردادە پێغەمبەر گەڕاوە. بۆ ساڵی داهاتوو کە خۆی و یارانی بۆ ماڵی خودا واتە کەعبە، ئەمما موسوڵمانەکان ترسی ئەوەیان لە بێبڕواکانی مەککە هەبوو کە بیانکوژن چ بە دزی چ بە ئاشکرایی، ئەوانیش بە خاتری حورمەتی کەعبە و ئیحرامێکی کە تێیدان نەتوانن دەست وەکەن، چونکە کاتەکەیان کاتێکە ڕێگای شەڕیان گیراوە لە بەر دوو هۆ: یەک حورمەتی کەعبە، دوو «شهر الحرام» کە مانگی حەجە. ئینجا خودای ئاگاداری هەستی دڵان حاکم و عادڵ و بەبەزە، ئایەتی ١٩٠ی دابەزاند و نازڵ کردە سەر حەزرەتی محەمەدﷺ بۆ هەموو موسوڵمانانی حاجی و غەیرە حاجی، جا بڕۆ سەیری کە و دەرسی لێ وەرگرە و خودا و خۆت بناسە:

﴿١٩٠﴾ وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ

**شەڕ بکەن دە ڕێی خودادا دەگەڵ ئەوانەی شەڕتان دەگەڵ دەکەن، دەس‌درێژیش مەکەن و لە سنوور دەرمەچن، خودا لە سنوور دەرچووانی خۆش ناوێ.**

﴿١٩١﴾ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ وَلاَ تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّى يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ كَذَلِكَ جَزَاء الْكَافِرِينَ

**لە هەر لایەکەوە تووشی شەڕکەرە بێباوەڕەکان هاتن، بێ ڕامان بیانکوژن و شارەودەریان کەن، چونکە ئەوان کاتێ خۆی وایان بە سەر ئێوە هێناوە، کە دیارە ئەو کوشتن و دەرکردنە بە شیددەت‌ترە لە کوشتنی بێ دەرکردن، بەڵام دە ناو کەعبەدا تا ئەوان لێتان وەدەس نەیەن لێیان وەدەس مەیەن. جا کاتێ ئەوان هاتنە شەڕ دەگەڵتان ئەوجا لێیان وەخۆ کەون و بیانکوژن، ئەوەیە جەزای بێباوەڕانی حورمەت‌شکێنی کەعبە و فێڵباز.**

## جیهاد لە ڕێی خودادا

### تێڕوانین و ئاوڕدانەوە وەسەر هەردوو ئایەتەکانی ۱۹۰ و ۱۹۱:

ئەقڵ و ویژدان و شعوور لەو باوەڕەدان ئایینی ئاسمانی شەڕخواز نابێ ببێ بەڵکە لە سەر ئەساسی ئەو هەموو ڕێنوما و ئاگادارییانەی دەیانداتە ئینسان، دەبێ ئایینێکی ئارام و ئەمین و ئەمان و ئاشتی‌خواز بێ، و هۆی حەسانەوەی هەموو گیاندارێک بێ. جا ئەوسیفەتە بەرزەی ئایینی وەحی دەگەڵ مانای ئایەتی ۱۹۰ و ۱۹۱ نایەتەوە چونکە دە مانای هەرکاندا دەستووری شەڕ لە لایەن خوداوە دراوە و دیاری دەدا. خۆ دەبێ ئەوەش بزاندرێ و بیزانین قسەی خودا سەراپای دروست و ڕەوایە و حەکیمانەیە، کەوایە دەبێ چارەی ئەو ئیشکالە بدۆزرێتەوە. ئەگەر ئینساف هەبێ دەگەڵ ئەقڵ و بەرجەوەندی، ئەوە وەڵامەکەیەتی: ئایینی ئیسلام ئایینێکی بەغیرەت و دەستکەرەوەیە و دە بەرابەر دوژمنانیدا زۆر بە شیددەت لە خۆبوردوو و بە زیبک و بەڕاپەڕە. جا ئەدێرەدا واتە ئایەتەکانی ۱۹۰ و ۱۹۱ کە خودا دەستووری شەڕی پێ داون دە بەرابەر ئەو کەسانە کە هاتوون بە فێڵ و فووت بیانکوژن و شەڕیان پێ دەفرۆشن. خۆ دیارە ئەگەر خاوەن باوەڕانی موسوڵمان وەدەس نەیەن و ئانگژایان نەبن بێ باوەڕان ڕەحمیان پێ ناکەن و فەلەجیان دەکەن و لە ناویان دەبەن. کەوایە ئایینی موقەدەس و بەرز و بەڕێز حەیفە و ناڕەواشە

دە موقابیل کەسانی پەست و نامەرد تەسلیم بن و دەستەپارچە و داماو وەمێنن.

شەڕیش دە ئایینی ئاسمانیدا بۆ داگیر کردنی ماڵ و سامان و خاک و وڵات و نامووسی ئینسان نییە بەڵکە بۆ ئازادی وپارازتنی نامووس و کەرامەتی ئینسانە لە ژێر ئاڵای ئاینی ئیلاهی. و هەروا دەستووری خودایە نابێ دەستدرێژی بکرێ، واتە شەڕ هەڵگیرسێن مەبن لە هەوەڵەوە و زێدەڕەویش مەکەن دە شەڕدا. واتە پاش بە دیل گرتنیان ئازاریان مەدەن و ماڵ و منداڵ و ژن و نامووسیان بپارێزن. و هەروا پیر و نەخۆش و لەڕەوکەوتوو خەلە و خەرمان و ڕەز و باغ و کانیاو و بیر و چاڵاویان بپارێزن، چونکە خودا ئەو کەسانەی خۆش ناوێن کە کاری خوێڕی و دەستدرێژی دەکەن.

ئەقڵ و شعوور و ویژدان و ئیمان ئەوەی بەبێ کیفایەتی دەزانێ: دوژمن دەرکت پێ بگرێ و بە تەمای داگیر کردنی ماڵ و نامووس و نیشتمانت خۆت دەپاڵ باوێ و شەڕت پێ بفرۆشێ و هەڵی گیرسێنێ، مەردانە و مرۆیانە لێی ڕانەپەڕی و تێکی نەشکێنی و دای نەپاچی و بە سەرشۆڕی بەرەو پاشی نەبەیەوە. جا بۆیە خودای تەعالا دەستوور دەدا و دەفەرموێ: ﴿وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ﴾ واتە بیانکوژن و دایان پاچن لە هەر کوێ تووشیان بوون، با ناوماڵی بەیتولحەرامیش بێ، دەریان کەن و ڕاویان نێن لەو ماڵە کەعبەیەشدا کە ئێوەیان لێ وەدەرنا، چونکە ئەوان خەریکی فێڵ و فووت و داونانەوەن بۆ ئێوە، بەو هۆیە کە غیرەتی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئێوەیان نییە. خۆ دیارە ئەو فیتنەگەرییەیان خرابترە لە شەڕی ڕووبەڕوویان. دیارە بۆ پارازتنی حورمەتی کەعبە دەوێدا تا بەرەنگاو نەبن، بەرەنگاریان مەبن.

وەک دە ئادابی دڵ و ئەقڵدایە: پرسیار دەکرێ لە شتێکی کە لێی بە ئاکام ناگەی، ئێرەش تا کوێ دەبێ خاوەن باوەڕ دەگەڵ بێ باوەڕ ئاشتی پەیدا نەکا و وازی لێ نەهێنێ!؟ دیارە موسوڵمان بە پێی ئیمان و باوەڕێکی کە هەیەتی بە کاروباری ئایینی و کۆمەڵایەتی و دۆستایەتی و دژمنایەتی دەبێ بڕوانێتە دەستووری باری تەعالا، چونکە خودا موسوڵمانان لە هەموو بار و بوار و بابەتی جووڵانەوە و ژیاندا شارەزاییان دەداتێ، لێرەشدا بۆ شارەزایی لەو بارەوە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١٩٢ کە دەوێدا خودا ڕێنوێنی موسوڵمانان دەکا چ بکەن لەو بارەوە:

﴿١٩٢﴾ **فَإِنِ انتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ**

ئەگەر ئەو بێباوەڕانە دەستیان کێشایەوە لە بێئیمانی و موسوڵمان بوون بە ڕاستی و پاکی، نەک بە منافقی و بەهرە گرتن وفێڵ بۆ خۆ تێخزانی ناو ئەوزاعی عالەمی ئیسلام، ئەوکاتە

**ئێوەش وازیان لێ بێنن و دەستیان بۆ درێـژ مەکەن بە نـاوی شـەڕ. بەڵـکە چـاکە و دڵـدارییان دەگەڵ بکەن، چونکە خودا لێبـوردەیە و خـاوەن بەخشـش و بەزەیەکـی بەرفـراوانە لە ئاکـار و کردەوەی پێشوویان دەبووڕێ.**

## دەس لە شەڕ کێشانەوەی بێباوەڕان

**تێڕوانین دە سیمای ئەو ئـایەتە ۱۹۲یە:** دیـارە هەروەک لە ڕابـردوودا ڕاگەیێنـدرا کە ئـایینی ئاسمانی بەغیرەتە و ببوورە و ئایینی ئاشتییە بەو پێیە دەبێ کەسێک دەستی ئاشتی بۆ درێژ کـا و بیهەوێ بێتە سەر مەڕامی و یا لە ژێر سایەی ئەودا بژی و وەحاوێوە و وەحەسێ، دەبـێ بە پێـی لێهاتوویی و شەئنی خۆی لە دەستی نەدا و دەسـتی بەرێـتەوە پـاش و وەلای نـێ بەڵـکە دەبـێ ڕێگای بداتێ و پارێزگاری لە ژیانی بکا، چونکە وەک خـودا ببـوورە بە بەخشـشـە و پەنـادەرە و ئاشتیخوازە، دەبێ خاوەن باوەڕەکانیشی دە کاتی خۆیدا ئاوا ئاشتیخواز و بەبەخشش بن.

دەبێ ئەوە بزاندرێ لە سـەر ئەساسـی ئەمـر و فەرمـانی بـاری کە دە ئـایەتی ۱۹۰ و ۱۹۱دا ڕاگەیێندرا شەڕ و بەربەرەکانی گەڕا بە دەستوورێکی وجووبی، بەڵام سنووردار نەکرا تا کـوێ؟ بەڵام خودای خاوەن بەزە و میهرەبان ئەوجار دەیهەوێ سنووری بۆ دانێ، وەک دە ئایەتی ۱۹۲دا بە تەواوی ئاماژەی وەلا دەکا و تەنانەت دەشفەرموێ بۆ تاوانبارەکان: ئەگەر واز بێنن لە ئاکار و کـرداری ناڕەواتـان لە ڕابردووتـان خـۆش دەبـم وەک دە ئـایەتی ۳۸ی ئەنفالـدا ئیشـاڕەی وەلا فەرمووە: ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغَفَرۡ لَهُم مَّا قَدۡ سَلَفَ﴾ **بڵـێ ئە پێغەمـبەر بەوانەی بێبـاوەڕن: ئەگەر واز بێنن لە کافریتان، خۆش دەبم لە ڕابردووتان.** ئەو ڕابردووەشیان شـەڕ بـێ یـان شـیرک بـێ هەچی بێ دەبێ. دەستبەردار بوونیشیان چ بە تۆبە بێ، چ بە داخڵبوون بە ئایینی ئیسـلام بـێ دەبێ.

## قەتڵی عەمد و تۆبە

**بۆ ئاگاداری:** کوتوویانە تۆبە قەتڵی عەمد وەلا نابا. بەڵام بە پێی ڕاگەیاندنی ئایەتی قورئان ئەو قسە ناڕەوایە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا﴾ ئەوجار خودا لە کافر خۆش بێ کە کافر بـوونیش هەچی تاوانە دە پاڵیدا چۆن لە قاتڵ خۆش نابێ؟! بە کوردی وبە کورتی خودا لە حەقی خـۆی خۆش دەبێ، حق‌الناسیش چارە دەکا.

دیارە خودای تەعـالا فەرمـووی ئەگەر واز بێـنن ئەوان وازیـان لـێ بێـنن ئێـوەش ئەمـیش

دەیانبەخشم. و دووبارە دەفەرموێ: شەڕیان دەگەڵ بکەن تاکوو دوژمنایەتیان دەگەڵ ئایینا نامێنێ و ناتوانن ئازار و زەرەرتان پێ بگەیێنن. چونکە تاکوو ئایینیان دەگەڵ ئێوە نەبێتە ئایین، ئیمکانی زەرەریان بۆتان هەر دەبێ، ئاوا بە تێکەڵاوی و دە پاڵتاندا. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۹۳دەوێدا ئەوەی پێویست بێ دەوێدا ڕاگەیەندراوە.

**﴿١٩٣﴾ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلّه فَإِنِ انتَهَواْ فَلاَ عُدْوَانَ إِلاَّ عَلَى الظَّالِمِينَ**

**بیانکوژن ئەوانەی دەستدرێژیتان دەکەنە سەر و شەڕتان دەگەڵ دەکەن و بە گژوودا دێن. تاکوو بەردەستیان دەکەن و هێزیان لێ دەبڕێ و ناتوانن جارێکی دی بە گژتاندا بێن، وازیان لێ مەهێنن تاکوو کار دەگاتە ئەو جێگایە: ئایین هەر ئایینی خودا دەبێت و تەنیا ناوی خودا دەبێ و دەدرەوشێتەوە. ئەگەر ئەوان وازیان لە شەڕ هێنا و دەسبەرداری کردار و ئاکاریان بوون ئێوەش وازیان لێ بێنن و دوژمنایەتییان مەکەن، چونکە شەڕ و دوژمنایەتی هەر دەگەڵ زاڵمان ڕەوایە و دەبێ بکرێ.**

## ئامانجەکانی جیهاد

**تێڕوانین:** ئەو ﴿حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾ واتە دەگەڵیان شەڕ بکەن و وازیان لێ مەهێنن و دەسبەرداریان مەبن تا ئەوزاع دەگاتە ئەو جێگایە هەموو کەس بە تەواوی ئازادی و سەربەستی خۆی دەتوانێ هەموو جۆرە پێویستێکی ئاینی و کۆمەڵایەتی خۆی بەجێ بێنێ بەبێ ترس و لەرز و گاڵتە پێ کردن. جا ئەگەر ئەوان پێشدەستییان کرد و وازیان لە خراپەکاری هێنا، تازە بۆ دوژمنایەتی نابن و ئێوەش وازیان لێ بێنن. و هەروا خراپەکاریەکەشیان مەخەنەوە بیر و بە چاویاندا مەدەنەوە.

جیهاد واتە تێکۆشان دەبێ بۆ ڕەزایەتی خودا بێ و دامەزراندنی باوەڕی تەوحید، جا بۆیە دەبێ مەیدانی بۆ وەڕازێنی تاکوو تەوحید دێتە ڕوو و جێگیر دەبێ. دەیجا خۆ ئەوە بێگومانە تا فیتنە هەبێ و بازاڕی شیرک دە ناو کۆمەڵدا هەبێ، تەوحید ناکرێ و ناتوانێ ببێ. جا بۆیە دەبێ بازاڕی ئەوانە کۆ کرێتەوە تاکوو بازاڕی تەوحید بێتە ڕوو. دە واقیعدا سێ ئامانج دە جیهاددا دەبێ هەبێ و یاسایەتی ئەو سێ هەدەفەش ئەوانەن:

١. نەمانی شیرک و بتپەرستی و فیتنەگێڕی

٢. بەرگری لە زوڵم و تەجاوز و دەسدرێژی

٣. پارازتنی مافی ئازادی و سەربەخۆیی.

بە کوردی و بە کورتی ئایینی وەحی ئاسمانی کە پایەی لە سەر ئەقڵ و شعوور و مەنتق و ئەخلاقە دەستووری تەئکیدی لە سەر ئەوەیە: دەبێ بە هەموو هێز و تواناوە بەرەنگاری یاغیان و سەرەڕۆیان واتە (طاغوت و جبت و مترفین) ببنەوە چونکە ئەوانە ببن، مافی ئازادی و سەربەستی ناڕوێ و شین نابێ. کاتێ ئەوانە نەمان، ئازادی و سەربەخۆیی شین دەبێ و دێتە ڕوو. ئەوانەی ئەوە دەزانن هەژار و ژێرچەپۆک و دیل و مافخوراوانن. و ئەوانەی ئەو یاسایەشیان قووت داوە و حاشای لێ دەکەن زاڵم و زۆردار و ملهوڕ و سەرەڕۆن، ئەگەر دەتانهەوێ باوەڕ کەن بەو واقیعەتە، بە چاوێکی حەقبینانە تماشای حاڵی نەتەوە بندەستەکان کەن.

جیهاد کەلیمەیەکی زۆر پیرۆز و پڕمانایە: واتە تێکۆشان و بەربەرەکانی دەگەڵ ئەو هێز و چینانەی کە ڕێی ژین و حەیات و کەڕامەت و نامووس لە ئینسان دەگرن و دە حەولی نەمان و بنبڕ کردنی ئینسانەتی، جا بۆیە ئایینی ئیلاهی ئەو کەلیمە پیرۆزەی جیهادی ڕاناوە چونکە نیشانەی حەیاتی سەربەخۆی هەموو خاوەن حەیاتێکە و یاسایەکی عموومی و گشتی عالەمی هەستییە وەک ئینسان و حەیوان و گیاوگۆڵ و دار و دەوەن، تەواوی حەیاتی ئەوانە بۆ بەقایان دە گژ کەند و کۆسپی سەر ڕێی ژیان و بوونیان دەبێ ڕاچن و ڕادەچن. ئەو بەرەنگارییە مافی سرشتییە هەرکەس خۆی لەو مافە وەدوور خا و هەڵاوێرێ، ئەوە بوونەوەرێکی نابوود و زەرەراویە، نەمانی قازانجترە بۆ کۆمەڵ لە مانی.

## هێندێک لە ئامانجەکانی جیهاد

١. هەڵکردن و پارازتنی ئاڵای ئەڵڵا. ئازادی و ئەمنیەت، ڕاگرتنی عیززەتی ئیسلام

٢. پارێزگاری لە خاک و نیشتمان و کلتووری نەتەوە

٣. پارازتن و ڕێزدانان بۆ ئایین و فەرهەنگی نەتەوە. شەڕ وبەربەرەکانی بۆ داگیر کردنی خاک و وڵاتی غەیر و خۆ داسەپاندن بە سەر خەڵکدا نە جیهادە و نە ڕەوایە.

٤. تەجاوەز و وێران کردنی وڵاتی غەیر و هەڵپەڕتاندنی ماف و فەرهەنگی عالەم نە جیهادە و نە ڕەوایە.

٥. تۆبزیگەری و زۆری بۆ تەسلیم بوون و ژێر خستنی عالەم و نەتەوە نە جیهادە و نە ڕەوایە.

٦. سەلبی عەقیدە و باوەڕ لە خەڵک و مل پـێ دانەوانـدن و ڕاکێشـانی بـۆ لای عەقیـدە و باوەڕی خۆت نە جیهادە و نە ڕەوایە. چونکە قورئـان بە ئاشـکرایی ئەوە مەحکـووم دەکـا: ﴿لآَ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ﴾ (بقره: ٢٥٦) بە زۆر مل پێدانەواندنی عالەم لە ئایینی پیـرۆزی ئاسـمانیدا نیـیە و بە ڕەوا نەزاندراوە.

٧. دە سوورەی یونسدا ئایەتی ٩٩ دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًا أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ﴾ ئەی پێغەمـبەر ئەگەر خـودای تـۆ بیویسـتایە سـەرجەم دانیشتووانی سەر زەوی بە جارێک ئیمانیان دەهێنا و وای دەسازاندن هێـز و بیـری بێبـاوەڕی و خراپەیـان نەبوایە. ئەو کاتە دەبـوونە فریشـتە لە سـرشتی ئینسـانی دەچـوونە دەرێ. بەڵام خـودا لە سـەر ئەساسی ڕاز و حیکمەتی خۆی ئەوەی نەویستووە بەڵکوو خودا هۆش و سەلیقەی جۆراوجـۆر و ئیختیاریشی دەگەڵ داوەتێ، تاکوو بە پێی سەلیقە و ئیختیاری خۆی ڕێگـای ئـاین و بـاوەڕی خۆی هەڵبژێرێ پاش ئەوەی کە لە پێغەمبەرکانڕا باسی هەموو لایەکی ژیان و ئەقیدە و باوەڕی پێ گەیوە. جا ئەوەی خـوار و خـێچ و خـراپ دەڕوا لە سـەفەرەکەیدا لە ئـاخری سـەفەرەکەیدا تووشی خراپە دەبێ.

ئەی پێغەمبەر! مەگەر تۆ دەتهەوێ زۆری لە خەڵک بکەی و ناچاریـان بـکەی تـا ڕێگـای ڕاست بگرنە بەر و ئیمانێ بێنن؟ بێگومان ئیمانی بەزۆری نە ئیمانە نە ئیفتیخارە نە خاوەن سـزا و پاداشە، کورد کوتەنی: بە زۆر لەش پیس نابێ.

بێگومان کینە لە دڵان و بێئەقڵ و شعوور هەن دەڵێن: ئیسلام ئایینێکە کە بەزۆری نێـزە و شمشیر هاتووە و خۆی بە سەر وڵاتدا داسەپاندووە. ئەوانە زڕە ئینسانن. سەیرکە ژێـر و زانایـان گۆستاو لۆبۆن فەیلەسووفێکی فەڕانسەوی دەڵێ چی؟: مێژووی خەباتگێڕانی دنیا و فاتیحـانی وڵات دە عەداڵەت و شەرەفبەخشـین و کەڕامەت پارازتنـدا نـاگەنە خەبـاتی مێـژووی ئـایینی ئاسمانی لەمەڕ عەداڵەت و ڕێزداری لە ئینسان. ئەوانەی ئەوە چاو ناکەن چاوەی ئەقـڵ و بیـر و هەست و شعووریان کوێرە.

دەبێ کینەلەدڵانی بێبەراوەرد لە ئایینی وەحی واتە ئایینی ئیسلام ئینسـافانە ئـایەتی ١٩٠ی سوورەی بەقەرە هەڵسەنگێنن: ﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْ﴾ نەهـی لە زێدەڕەوی و تەجاوەز بەو مانایە: شەڕکەرانی ئیسلام واتە موجاهید، دەبێ لە شەڕدا لە کوشـتنی ژنان و منداڵان و زانایان و پیران و ئەو کەسانەی کە هیچ نەقشێکیان دە شەڕدا نییە، خۆ بپـارێزن

چونکە ئەوانە بێتاوانن و هیچ هێز و تینێکیش نادەن بە شەڕ، دەبێ دووری بکرێ لە ئازار دانیشیان، ئەوە یاسای وەحی ئاسمانی بۆ شەڕکەرانی ئیسلام بە ناوی موجاهید.

دەگێڕنەوە لە زاری عەبدوڵڵای کوڕی عومەر گۆیا حەزرەتی ڕەسوول لە یەکێک لە غەزاکانی ئیسلامدا جەنازەی ژنێکی کوژراوی دی و چاوی لێ کرد زۆر تێکچوو و خەفەت دایگرت. چۆوە سەر تەپۆڵکەیەکی بەرز هاواری کردە یاران و شەڕکەرانی ئیسلام فەرمووی: ئەی ئەو کەسانەی شەڕ بۆ ئایینی خودا و بەرزی دینی خودا دەکەن! وا بکەن خودا لەو شەڕکردنەتان ڕازی بێ. واتە خۆتان لە کوشتنی ژن و منداڵ و پیر و حەیوان و پاتاڵ بپارێزن. ئەوەیە جیهادی ئایینی. ئەدێرەدایە وەرگرتنی قەباڵە و میداڵی شەهادەت. نەک ئاور دە وڵات بەردان و چاندنی مین لە وڵاتی ئیسلام بۆ لە ناوبردنی مەڕ و ماڵاتی بێگوناە و خەڵکی کاسبکار. بەوە ناکوترێ جیهادی ئایینی، بەڵکە پێی دەکوترێ کەڵەزەری.

جیهاد دەبێ لە سەر ئەساسی بنچینەی ئایەتی ١٢٦ی سوورەی نەحل بێ: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّابِرِينَ﴾ کاتێ ویستت سزا بدەی بە تاوانبار بەو ئەندازە سزای بدە سزای داوێ. دە بڕوانە موسوڵمان لە سیمای ئەو ئایەتە و جا خەڵک بخنکێنە و بە داریدا کە! یان وڵات گڕدە بە ئاگر و حەیوانات و ئاژەڵ بکوژە. چاوڕەوانی ڕۆژی ئاخر بە!

هەچەن نەمدەویست بە باسەکە ئاوا درێژە بدەم چونکە تەفسیرە کارەکەم نە شەرع، جیهادیش بەشێکە لە شەرع، بەڵام ئەوزاعی نابەشەرعی ئەوڕۆ لە بن ئاڵای (لااله الا الله محمد رسول‌الله) دەڕوا و خەڵکی پێ فریو دەدرێ، هانی دام کە ئەو ڕاستییە ڕاگەیێنم.

## باسێک لە سەر مانگە حەرامەکان

تا ئێرە وا بزانم باسمان لەوەی کرد کە خودای تەعالا ڕێز و حورمەتی کەعبەی سفاریش کرد بەو جۆرە کە نابێ شەڕی تێدا بکرێ، مەگەر بێباوەڕانی مەککە و دەورووبەر دە ناو کەعبەدا شەڕتان پێ بفرۆشن، ئەوکات شەڕیان دەگەڵ بکەن و ئانگژای بن نابێتە حورمەتشکێنی بە کەعبە و بێڕێزی. ئەوجار خودای حەکیم دەیهەوێ باسی ڕێز و حورمەتی ئەو مانگانە و بۆ بکا کە شەڕ و هەرایان تێدا بە حەرام داندراوە لە لایەن خوداوە مانگەکانیش ئەوانەن: ذی‌القعدە، ذی‌الحجة، محرم، رجب. خودای تەعالا شەڕی دەو چوار مانگانەدا بە حەرام داناوە بە پێی داوا

و پاڕانەوەی حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی کە دە ئایەتی ١٢٦ی بەقەرەدا ئاماژەی وەلا کراوە: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَـٰذَا بَلَدًا آمِنًا وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُم بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ...﴾ حەزرەتی ئیبراهیم بە زمانی پاڕانەوە کوتی: خودایە ئاسایش و ئارامیی و ئەمینی بخە ئەو شارە (مەککە) لە دەستدرێژی و دوژمنایەتی دوژمنانی بپارێزە. و هەموو جۆرە بەروبوومێکیشی بۆ دانیشتووانی بڕەخسێنە و بەربێنە و بۆ ئەوانەش کە باوەڕیان بە تۆ و بە ڕۆژی دوایی و بە زیندووبوونەوە هەیە.

بۆ مەبەست و مەتڵەبی (حورمەت و ڕێزی چوار مانگەی ذیالقعدە، ذیالحجة، محرم، رجب) بڕوانە لە ئایەتی ٢١٧ی بەقەرە تاکوو تێبگەی لە ڕێزداری ئەو چوار مانگە: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ اللَّهِ﴾ ئەی پێغەمبەر لێت دەپرسن دەربارەی ئەو مانگانەی کە شەڕیان تێدا حەرام کراوە کە بریتین لەو مانگانە (ذوالقعدە، ذوالحجة، محرم، رجب)، ئایا دروستە شەڕیان تێدا بکرێ؟ پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر بەو پرسیارکەرانە: شەڕ لەو مانگانەدا ناڕەوایە و خراپە. بەڵام ئەوانەی کە بێباوەڕن دەیکەن لە ڕێگرتن لە ئایینی خودا و شەریک دانان بۆ خودا و ڕێگری موسوڵمانان لە چوونیان بۆ حەج و عومرە و دەرکردنیان لە شاری مەککە، لای خودا گەورەترە لە شەڕ کردن لەو مانگانەدا. هەروا ئازاردانی موسوڵمانە هەژارەکان بۆوەی واز لە ئایینەکەیان بێنن زۆر خراپترە لە شەڕ کردن لەو مانگانەدا.

کوتمان شەڕ کردن لەو چوارمانگەدا کە قەدەغە کراوە و بە حەرام داندراوە لە سەر زمانی حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلڕایە بە کوتەی هێندێک لە قورئانزانەکان. چونکە چوون بۆ حەج و گەڕانەوە لە حەج لەو سێ مانگەی پێشوودا دەبێ واتە (ذیالقعدە، ذیالحجە، محرم). مانگی ڕەجەبیش کە لە ناوەڕاستی ساڵدایە واتە شەش مانگی دە پێشدایە، پێنجیش دە دوایەدایە، بۆ ئەوەیە عالەمی کاروانچی و کاسب پشوویەکی حەسانەوەی تێدا بدەن.



ئەوجار دەچینە سەر باسەکە کە باسی مانگە شەڕ تێدا قەدەغە کراوەکانن کە دە ئایەتی ١٩٤دا بەیان کراون وڕاگەیێندراوە بە تەواوی.

(١٩٤) الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُواْ اللَّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ

شەڕکردنی ئێوە دەو مانگەدا کە شەڕی تێدا حەرامە بۆ بەرپەرچدانەوەی شەڕی ئەوانە و ئێوەیە و شەڕ کردنەتان دەو مانگەدا خۆتان لە شەڕی وان دەپارێزن. چونکە دیفاع لە خۆت و

**کیانی خۆت دە هەموو کات و سات و ئانێکدا بە ڕەوا داندراوە.**

## شەڕ لە مانگە حەرامەکاندا

دیارە خودا لە ئایەکانی پێشوودا بە پێغەمبەر و بە یارانی فەرموو: ئەگەر سەرانی مەککە پەیمانەکەیان شکاند و ڕێگایان نەدان بچنە ناو ماڵی کەعبە بۆ بەجێهێنانی عەمرە، وەک لە ساڵی پێشوودا لە سەری ڕێک کەوتبوون و شەڕیان دەگەڵ کردن؛ ئێوەش دەس دانەنوێنن، شەڕیان دەگەڵ بکەن و دەستیان لێ مەپارێزن؛ ئەگەرچی دە مانگی حەرامیشدا بن و بەرگی ئیحرامیش و دەبەردایە بەرەو مەککەش دەچن کە نابێ شەڕی تێدا بکرێ. جا لە بەر ئەوە کەسێک دەستی دوژمنایەتی بۆ درێژن کردن دەستی بپەڕێنن، خودا دەگەڵ ئەوانەیە دیفاع لە ناموس و کەرامەتی خۆی دەکات.

(حرمات) شتانێکن دروست نیە بکرێن وەک دزی و کوشتن، ڕێگری دە کاتی ئەنجامدانی حەج و عەمرەدا.

(قصاص) واتە تۆڵەستاندن و بەربەرەکانی ئەوانەی بە گژتدا دێن.

**ئاوڕ وەسەر دانەوە:** مانگی حەرام بە مانگی حەرام یانی چی؟ یانی مانگی ذی‌القعدەی ئەوساڵ کەوا تێیدا دەچن بۆ ئەنجامدانی عەمرە بە مانگی ذی‌القعدەی پارەکە کە ئێوەیان تێدا گێڕاوە و نەیانهشت عەمرە بکەن. ئەجار ئەوساڵ ئەگەر هات و ئەوان ئەوساڵ ڕێز و حورمەتیان هەم بۆ قەرارادیان و هەم بۆ مانگەکەیان دانا و شەڕیان تێدا هەڵنەگیرساند دەگەڵتانا، ئەوە ئێوەش هەم بۆ بەرگری لە شکاندنی پەیمان دەگەڵیان، هەم بۆ ڕێز و حورمەتی مانگەکە، شەڕی تێدا هەڵمەگیرسێنن دەگەڵیان، ئەمما ئەگەر هاتوو ئەوان هەم حورمەت و هەم پەیمانیان شکاند و پێش کەوتن لەو کارەدا، ئێوەش پێیاندا دەن و بە توندی بەرپەرچیان بدەنەوە، بەو شێوەیە (و الحرمات قصاص) واتە حورمەتیان گرتن حورمەتیان بگرن، حورمەتیان نەگرتن حورمەتیان مەگرن. چونکە دە یاسادا هەموو ڕێز و حورمەتێک لە سەر ئەساسی یەکسانییە. دێرەدا ئەوە دەرک دەکرێ: دوژمن بە چی شەڕت دەگەڵ بکا، ئەتۆش بەوەی دەگەڵ بکە. نەک وەک بێباوەڕانی ئەوڕۆ کە دە بەرابەر تفەنگی گەلانی بێهێز و بندەست بە تەیارە و مووشەک و تۆپ و کاتیۆشا بە گژیاندا دێن بێدەسی پارازتن، واتە مێش و محانج هەچی وەبەر بێ.

ئەگەر بە چاوێکی دادگەرانە و ژیرانە و ئاقڵانە سەیری ئەو یاسایەی ئایینی ئاسمانی بکرێ سەر بۆ ئەو دەستوورە جوان و دیموکراسیانە دادەنوێندرێ. ئەو جۆرە یاسایە دە هیچ ئایین و

مەکتەب و یاسایەکی چاو ناکرێ و نەبیندراوە، بەڵکە تەنیا و تەینا دە مەکتەبی وەحی ئاسمانیدا نەبێ، واتە قورئان. ئەگەر یەکێک بە شێوەی ڕەخنە و ئیحتیراز بڵێ: ئەدی بۆ دەڵێن و کوتراوە دە ئایینی عیسادا کە ئەویش سەرچاوەکەی وەحی ئاسمانییە، ئەگەر یەکێک بە ڕوومەتی ڕاستیدا زللەیەکی دا و پێیدا ماڵی، دەبێ ڕوومەتی چەپیشی بۆ ڕاگری لێیدا و پێیدا ماڵێ. ئە ئەو نەقڵە و ڕووداوە بۆچی بۆ هەموو کات و هەموو کەس نەبووە و نابێ؟ بەڵکە ئەوە بۆ کەسانێکە کە نافامن و بێدەستەڵاتن لە تاوی ژان و دەردی خۆی، بۆ زەوت نابێ دەستێک دەوەشێنێ لە یەکی گەورەی خاوەن دەستەڵات. دە بڕوانە لە مێژووی مەسیحیەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کە زۆر جار وا هەبووە لە سەر شتێکی هیچ و پووچ شارێکیان وێران و خاپوور کردووە و بە هەزاران ژن و منداڵ و پیرەپیاو و پیرێژنیان تێدا کوشتووە و سووتاندووە وەک یاغی و بێباوەڕەکانی ئێستێ کە دەگەڵ نەتەوەی بێدەستەڵاتی دەکەن، یەهوود و مەسیح کە بۆمبا ئەتۆمەکەی هێرۆشیما سێسەدهەزار کەسی بە چرکەیەک لە ناو برد. ئەوە سەیرترە یا شاری حەڵەبجەی کوردستانی عێراق بە یەک چرکەی بۆمبی شیمیایی پێنجهەزار ژن و منداڵی لە ناو برد کە بۆ هەتا هەتایە ئاساری ئەو شیمیایە لە ناو ناچێ. سەرەڕای ئەوە، شەرم ناکەن ئەو دەستەڵاتدارانە بە گۆڤار و ڕۆژنامەکان ئایینی ئیسلام و زاتی پێغەمبەر دەدەنە بەر تیر و تانەی ئەوانەی ئەوەی پێغەمبەر دەستووری شەڕی داوە، ئایینی ئیسلام هەر شەڕ و شەڕخواز بووە. ئەوە ناڵێن و نابینن شەڕی ئیسلام بۆ دیفاع بووە.

بە پێی ئاداب و باوی ژیانی کۆمەڵایەتی دە ڕێی سەعادەتی کۆمەڵایەتی دەبێ گیانی شیرن و ماڵی خۆشەویست دە پێناو ژیان و حەسانەوەی کۆمەڵ بنرێ. جا لە سەر ئەو ئەساسە خودای تەعالا تا ئێرە بە وەسیلەی ئایەتەکان دەستووری شەڕ کردن و خۆبەخت کردنی دە پێناو پارازتنی گیان و ماڵ و نامووسی ئینسانی ڕاگەیاند و فێری ئینسانی کرد. لێرە بەو لاوە باسی بەخشین و خەرج کردنی ماڵ و دارایی دەکا دە پێناو دین و ژیان و ئازادی و ئاسایشی جامعە. بۆ تەئیدی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی:

**﴿١٩٥﴾ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوَاْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ**

**لە کاتی شەڕ و هەرا بەتایبەتی دەگەڵ دوژمنان سامان و ماڵتان لە پێناوی ڕێگای خودادا ببەخشن بە دەستی خۆتان (بە هۆی خۆ ڕەزیل کردن و ترس بە سەر خۆدا برین) خۆتان مەخەنە ژێر باری ڕەزالەت و نابوودی. چونکە ئاوا دوژمن بە سەرتاندا زاڵ دەبێت و دەتانخاتە داو و**

**دەتانکوژێت و دیلتان دەکات ئەوە دینەکەشتان شکستی دێنێ. پێویستە لە سەرتان لە هەموو کار و کردەوەتان ڕوو دە چاکە کەن و چاکە بکەن، چونکە خودا ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە شوێن کاری چاک دەکەون.**

## ئینفاق و بەخشینەوە

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم پاش دەستووردان بە شەڕ لە پێناو ئایینی خودا ئەوجار دەستوور دەدا بە بەخشینی سامان و بەخت کردنی دە ڕێی ئەودا، دێرەدا نەختێک ئەگەر بیر بکرێتەوە ئەو هەستە دەکرێ کە ماڵ و سامان وەک گیان شیرین و خۆشەویستە بۆیە خودای زانا بە هەوەڵ و ئاخر پاش دەستووری خۆبەشین دەستووری ماڵبەخشین دەدا. دێرەدا دەبێ ئاوا هەست پێ بکرێ ماڵ بەخشین دە ڕۆژی ئاوا سەختدا کە دوژمن دەرکی پێ گرتی، هەر ئەوە نییە بدرێ بە بێنەوایان، بەڵکە دە پێشدا دەبێ بدرێ بە چەک و چۆڵ و وەسیلەی شەڕ بە شێوەیەکی وا لە دوژمن کەمتر نەیەوە لە کەرەسەی شەڕدا. و ئاوڕدانەوەش وەسەر هەژاران لە بیر نەکرێ. ئەگەر ئاوا نەکرێ، ئەوە بە ئاشکرایی خۆتان بە دەستی دوژمن بە هیلاک دەدەن. ئەوەیە کە خودا دەفەرموێ ﴿وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ واتە بە دەستی خۆتان خۆتان مەخەنە دەست و داوی دوژمن چونکە بە خەتەرو نادا و دەوکوژێ و چۆرتمو لێ دەبڕێ. کەوایە لە هەر بارێکەوە بەزەییتان بەخۆودا بێ بە کردەوەی چاک و بەراوەردی چاک و ئیحتیاتی چاک و نیشانەشکێنی چاک و مەکر و حیلەزانی چاک بۆ شەڕ بێگومان خودا چاک و چاکزان و ژیری خۆش دەوێ.

## (تهلكة) یانی چی؟

لە سەر جوملەی ﴿وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ مشتومڕی تەفتیش و تەفسیرگەران زۆرە:

١. هێندێک دەڵێن: ئەو جوملەیە دەگەڵ ئەوانەیەتی هەچی ماڵ و سامانی هەیەتی دەیبەخشێ و بۆخۆی ڕووت و ڕەجاڵ و برسی دادەمێنێ و بە هیلاک دەچێ.

٢. هێندێکی دیش دەڵێن: هەرچی داراییە ڕۆژی هەرا و شەڕ مەیدەن بە چەکوچۆڵ، بێ قووت و مووچە وەمێنی و شکست بخۆی و دوژمن داتپاچێ و بتگرێ.

نەزەری هەوەڵ ڕووی دە نەفسی نەفەقە بوو، نەزەری دوو ڕووی دە دارایی بوو.

ئەگەر سەیری ئایەتی ٦٧ی سوورەی فورقان بکرێ کە واژەی (انفقوا)ی تێدا بە کار بردووە، نەزەری ئەوەڵ پەسند دەکرێ، و هەروا ئایەتی ٢٩ی سوورە ئیسراش ئەو نەزەرە هەوەڵە تەئید دەکا.

٣. هێندێکیش نەزەریان ئاوا داوە کە دە شەڕێدا خۆنوێنی و دلێری کە ببێتە هۆی لەناوچوونت بێ فایدەیە. خۆ بە هیلاکدانە خۆی لێ بە دوور بگرە وەک خۆ تەقاندنەوە وەک یاری موهاجر کە خۆی خستە ناو سەف و پۆلێ لە دوژمن، هاوار هەستا کە ئەوە خۆی دا بە هیلاک. گەرچی هێندێکیش کوتوویانە پێغەمبەر فەرموویەتی جێی بەهەشتە. چونکە عیشق و ئەویندارى دین و ئایین ئەوەی ئەنجام داوە. بڕوانە تەفسیری کەبیر.

**ئینفاق**: خودا دەستووری بە ئینفاق داوە، ئەمما بە شێوەی گشتی فەرموویەتی ئایا چۆنی بەراوەرد دەکەین؟ ئینفاقی گیان دە ڕێی خودادا وەیا ئینفاقی ماڵ دە ڕێی خودادا و یان هەردوکی گیان و ماڵ؟

زانایانی قورئان بە هەشت جۆری بۆچوون:

١. ئینفاقی ماڵ و گیان مەنزوورە لە کن «ابوایوب انصاری» و «ابن‌عباس» و «حذیفە بن سیمانی»

٢. تەنیا ئینفاقی ماڵ مەنزوورە لە کن «براء بن عازب» و هێندێکی دی.

٣. هێندێک لەو بارەوە کوتوویانە ئینفاق واتە خەرجی ماڵ بەڵام بەڕێکوپێکی. واتا کە هەمووی بدەی و خۆت بە هیلاک دەی دە بێ ماڵیدا.

٤. هێندێکیش کوتوویانە ئینفاق واتە جیهاد ئەمما خۆت نەدەی بە هیلاک واتە خۆ مەتەقێنەوە

٥. هێندێکیش کوتوویانە ئینفاق واتە خەرجی ماڵ خاڵی لە ئیسرافێک کە هۆی هیلاکەتە

٦. هێندێکیش کوتوویانە ئینفاق واتە گیان و ماڵ بەخشین دە پێناو ئازادی

٧. هێندێکیش کوتوویانە ئینفاق واتە ماڵ و گیان بەخشین چونکە ئینفاق بە گشتی ناو براوە.

٨. هێندێکیش کوتوویانە ئینفاق واتە بەربەرەکانی دوژمن کە فەرزە، بەڵام خۆت مەتەقێنەوە.

بە هەر حاڵ، جیهاد و ئینفاق دە ئایینی ئیسلامدا زۆر گەورە و بەرچاوە بەڵام هەردووی

جیهاد و ئینفاق خاوەنی شەرت و شـەرایتی زۆرە و دەسـتووراتی گەورەن. بـۆ نمـوونە شـەڕ و کوشتار لێی سەختتر و وەحشەتناکتر نییە، بەڵام دە کـاتی تـایبەت و هەدەفـدا نەبـێ نـابێ. ئەو کاتەش دوژمن تەمای ماف و کەرامەت و خاک و نیشتمانت تێکا و هجوومت کاتە سەر. دەبێ لێی وەدەست بێی، موجاهیدانە بە گیان و بە ماڵ، ئەگەر وا نەکەی و ملی دانەوێنـی و سـوارت بێ، ئەوە نە ئینسانی نە خاوەن ئیمانی. بۆ زێدە زانین بڕوانە لە تەفسـیری «تبیـین الفرقـان» ج٤، لاپەڕەی ١٨٢.

هێندێک ڕا و بۆچوونیان لە جوملەی (إِلَى التَّهْلُكَةِ) وەک کوتوویانە خۆ بە هیلاک‌دانە، خۆ تەقاندنەوە بۆ دوژمن تۆقاندن و بەزاندن و هەروا غیرەت و شەجاعەت‌دان بە هاواڵانی. وا نییە. بەڵکە ئەوپەڕی شەجاعەت و جورئەتە بۆ دوژمن بەزاندن و هەروەک حەزرەتی ئەبووئەیووب لە جەریانی پیاوێکی موسوڵمان کە هێرشی کردە سەر لەشکری ڕۆمیەکان و خۆی خستە ناویان و تۆقاندنی و کوژرا، زۆران کوتیان بە هیلاک چوو بە پێی ئەو ئایەتە (إِلَى التَّهْلُكـةِ). ئەو حەزرەتە فەرمووی مانای ئەو ئایەتە وا نییە وەک ئەوانە کوتوویانە، بەڵـکە مانـای ئـاوایە: هەرکەس لەبەر جیهاد و شەڕ هەڵێ ڕۆژی شەڕ، ئەوە خۆ بە هیلاک‌دانە. نەک فیداکاری و گیان بەخت کردن لە پێناو بەزاندن و تۆقاندنی دوژمن. هەچەن باسەکە زۆر ئەساسی حەساسە، بەڵام ئەوەنـدە بەسـە بۆ ئەوانەی بە بەراوەرد و لێزانن.

دیارە وەک ئاگادارین و دەزانین لە ئایەتی ١٨٩دا پرسیار لە پێغەمبەر کـرا لە بـابەت مـانگی «نوێ» کە بۆچی ئاوا باریکە و ناتەواوە و لە شەوەکانی دیدا وا نییە. دیارە لەو بارەشـەوە وڵامـی تەواو و قانیعمان وەرگرتەوە و پرسیارکەران کە بەڵێ ئەو مانگە نوێیانە نیشانەی سنووردار کردنی کات و زەمـانن بـۆ هەمـوو ئـیش و کارێـک وەک مانگەکـانی ڕەمەزان و حەج، دیـارە مـانگی حەجیش دوای مـانگی ڕەمەزان دێ. هەروا تەواوی ئەوقاتەکـانی عیـددە و تەڵاق و تـازیە و .. هەموو بە مانگێ دیاری دەکرێن ﴿هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ﴾.

وا هەڵکەوت حەزرەتی پێغەمبەر لەو سەردەمی مانگی حەجدا ئیحرامی دابەست بە عومرە و لە حودەیبی، کەچی بێباوەڕەکانی شاری مەککە گێڕایانەوە بەو مەرجە کە لە ساڵی داهاتوودا بچێتەوە بۆ عومرە و بەرگری لێ نەکەن. وا هەڵکەوت ساڵ ڕۆیی و سـاڵی قەرارداد، کە دەبـووە ساڵی دوایە، داهات. پێغەمبەر و یـارانی خەریکـی ئەنجـامی سـەفەری عـومرە بـوون کەچـی هاواڵانی لەوە دەترسان کە بێ باوەڕانی مەککە بە گژیاندا بێن و ئەوانیش لە بەر حورمەتی کەعبە

هیچیان دەگەڵ پێ نەکرێن. جا ئەدێرەدا خودای ئاگاداری هەستی دڵان بۆ وەی ئەو ترس و دڵەڕاوکەیان نەمێنێ ئەو ئایەتی ١٩١ کە ڕێی شەڕ و بەربەرەکانی پێ دان لە کاتی شەڕ پێ فرۆشتنی بێباوەڕان و هەروا ئەو ئایەتانەی کە دە باسی شەڕ دە مسجدالحرامدان هاتنە خواری و دابەزین، وەک ئایەتەکانی ١٩١ هەتا ١٩٤.

جا پاش ئەو ئاگاداریانەی خودا، خودا هاتە سەر باسی حەج و بڕێک لە داب و دەستوور و ئەحکامەکانی، بۆ ئەو ڕاستیەش دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١٩٦:

﴿١٩٦﴾ وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلّهِ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ وَلاَ تَحْلِقُواْ رُؤُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ فَإِذَا أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ذَلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ

حەج و عەمرەکانتان بە تەواوی بۆ خودا بەجێ بێنن ئەگەر لە کاتی حەج کردندا دوژمن ڕێگای لێ گرتن و دەورەی دان نەیانهێشت حەج و عەمرە بەجێ بێنن، ئیحرامەکانتان بشکێنن و هەرچیتان بۆ هەڵسووڕا لە حەیوان و مەڕ و ماڵات بیکەنە قوربانی لەوێ، بەڵام ئیحرام مەشکێنن و سەرتان مەتاشن، تا قوربانیەکان دەگەنە جێگای خۆیان و سەریان دەبڕێن. ئەگەر هاتوو یەکێکتان نەخۆش کەوت و یا سەری تووشی نەخۆشی هات و تاشی، ئەوە پێویستە لە سەری فدیە بدا جا فدیەکە چ توانی ڕۆژوو بگرێ یا حەیوان سەربڕێ. کاتێ کەوتنە ئاسایش و ئەمنیەت واتە ترسی پەلاماری دوژمن لاچوو و ڕەوی، یا هەر لە ئاسایشدا بوون، کەسێک عەمرەی کرد و پاشان ئیحرامەکەی شکاند، چێژەی کرد لەو شتانەی دە ئیحرامدا لێی قەدەغە بوون، ئینجا ویستی ئیحرام دابەستێتەوە و حەج بەجێ بێنێ، دەبێ هەچی بۆ هەڵسووڕا و دەستی کەوت لە پاتاڵ سەری بڕێ، و هەرکەس نەشیبوو و دەستی نەڕۆیی لەباتان با سێ ڕۆژ ڕۆژوو بگرێ هەر لە کاتی حەج کردندا. حەوت ڕۆژیش کە گەڕاوە ماڵێ. تاکوو ڕۆژووەکان بە سێ ڕۆژی ماڵی کەعبە و بە حەوت ڕۆژی ماڵی خۆی دەبنە دە ڕۆژ ڕۆژووی تەواو. ئەو دابە بۆ کەسانێکە کە نیشتەجێی شاری مەکە و دەوروبەری مەکە نەبن. بترسن لە خودا و یاسای خودا بپارێزن چونکە خودا بەڕاستی سزادەرێکی توندوتیژە.

## پێنج پایەکانی حەج

**تێڕوانین و ئاوڕێکی بەرجەوەندانە:** حەج و عەمرەتان کە داگیرساند بە هۆی ئیحرام واجبە

تەواویان بکەن و بە پێی ڕیز کردنی پایەکانی ئیسلام کە بریتین لە: شهادتین، نـوێژ پێـنج کەڕەت دە شەو و ڕۆژدا، ڕۆژوو، زەکات، حەج. حەج دەکەوێتە پایەی پێنج، وێدەچێ حەج کە کراوەتە پایەی پێنج، هۆیەکەی ئەوە بێ کە لە تەواوی تەمەنا یەک جار واجب بێ.

حەج کە بۆخۆی پێنجەمین پایەی ئیسلامە، بۆخۆشی خاوەنی پێنج پایەیە:

١. ئیحرام بەستن لە کاتی خۆی و شوێنەکانی خۆی

٢. وێستان لە کێوی عارەفات

٣. خولدان بە دەوری ماڵی کەعبە ٧ کەڕەت

٤. هاتن و چوون دە بەینی سەفا و مەروە ٧ جاران

٥. ئیحرام شکاندن بە سەرتاشین یا کورت کردنەوە

ئەمما ئەگەر هاتوو مانیعێکی شەرعی وەک شەڕ و دەرگیری یا نەخۆشـی یـا لە پـێ بـوون دەرکی پێ گرتن دە شاری مەککەدا بێ و یا لە شوێنێکی دیـدا بـێ، جـا ئەو مـانیعەش لە لایەن بێباوەڕانیەوە بێ و یا لە لایەن موسوڵمانانەوە بێ، جا لە پێش دابەستنی وێستانی عەرەفە دابـێ یاکوو لە پێش وێستانی عارەفەدا بێ، ئەوانە هەموویان دەبوونە هۆی بەرگری و مـانیعێکی تەواو لە تەواو کردنی حەج و عەمـرە بیانشـکێنن واتە ئیحرامەکـانو بشـکێنن. و لە بـاتی ئەو ئیحـرام شکاندنە هەچەن بە هۆی مانیعێکی شەرعیش بووە و بووبێ، بە ئەندازەی دەست ڕۆیشـتنتان و بە پێی بۆ هەڵسووڕان بۆتان بە ناوی قوربانی، سەر بڕن لە وشـتر، لە گـا، لە مەڕ، لە بـزن. واتە لەوانەی یاسای قوربانی بیانگرێتەوە. یانی مەڕ یا بزن هەر بۆ یەک نەفەر دەبێ و وشتر و گـا بـۆ حەوت کەس دەبـێ. جـا لە هەر زەمانێکـدا ڕێـی حەجتـان لـێ گیـرا و لە هەر کـوێ بـێ ئەو قەدەغەیە، لەو شوێنەدا قوربانیەکانو بکەن هەروەک پێغەمبەر و یارانی لە حودەیبیە کردیان.

با ئەوەندەش نەقرتێنین: یاسای ئایین وادیارە هەروەک ئیحرام دابەسـتن بـۆ حەج و عـومرە کراوە بە نیشانەی چوونە ناو حەج و عومرە سەرتاشین و موو هەڵپەرتاوتنیشی گێڕاوە بە نیشانەی خاریج بوون لە حەج و عومرە. ئەوە بە پێی ئیشاراتی ﴿الْهَدْيِ وَلاَ تَحْلِقُواْ رُؤُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ﴾ کەسێک نیازی بە زانینی ئادابی حەج و عەمرەیە لەوە زیاتر بچێتە ماڵە شەرع.

دانیشتوانی شاری مەککە لە یاسای کوتراو ئەو جیاوازیەیان بۆ داندراوە: ئەوان هەر لە نـاو شاری مەککەدا ئیحرام دادەبەسـتن بە حەج و عەمـرە واتە دەگەڵ حەجەکەدا عەمرەکەشـیان بـۆ دێتە جێ و جێبەجێ دەبێ. ئەوان فیدیەیان لە سەر نییە چونکە تەمەتوعیان بۆ نییە.

لە واجب‌بوون و نەبوونی عەمرەدا ڕا و بۆچوونی زانایانی ئـایینی زۆرە و هەیە. ئەگەرچـی ئەو جەریانانە دڵەڕاوکێ دەخەنە ناو عەقیدە و باوەڕەوە بەڵام تازە هاتووە. شـافعی دەڵـێ واجـبە بەو دەلیلە پێغەمبەر پێش بەجێ‌هێنانی حەج، عەمرەی بەجێ هێناوە، ئەگەر عەمرە واجب نەبایە وای نەدەکرد واتە حەجی دەکرد لە پێشدا چونکە واجب لە پێشەوەن.

غەیری شافعی کوتوویانە واجب نیـیە بەو دەلـیلە کە کـابرایەکی عەرەب پرسـیاری کـرد لە پێغەمبەر پایەکان و واجبەکانی ئیسلام چـن و چەنـدن؟ حەزرەت لە وڵامـدا فەرمـووی: نـوێژ، زەکات، حەج، ڕۆژوو. عەرەبە کوتی یا پێغەمبەر! لەوانە زیـاتر نین؟فەرمـووی: نەخێـر، مەگەر سوننەت. یارانی ڕەسوول لە سەر ئەو باس‌وخواسە ئەوەیـان لـێ پرسـی بە کـورتی دەبـنە چەن ئەرکانی ئیسلام؟ پێغەمبەر فەرمووی: بُنِيَ الاسلامُ عَلَى الخَمسِ: شهادةُ أن لا الهَ الاّ اللّهُ ـ و أنَّ محمداً رسولُ اللهِ و إقام الصّلوة و إيتاء الزكوة و صوم رمضان و حجّ البيت.

دووبارە یەکی دیکە لە پێغەمبەری پرسی عەمرە واجبە یـان سـوننەت؟ فەرمـووی: لا؛ و إن تَعتَمر خَيرٌ لکَ. هەر پێغەمبەر فەرمووی: الحَجُّ جهادٌ و العمرةُ تَطَوُّعٌ. (تەفسیری کەبیر).

هەروەک لە سیما و مانـای ئایەتەکـانی ١٩٦ و ١٩٧ڕا دەردەکەوێ، ئـایەتی ١٩٧ تەواوکەری بەشێک لە سیمای ئایەتی ١٩٦ە. جا لە سەر ئەو ئەساس و یاسایە پێویسـتە هەچـی زووتـرە واتە دوور نەکەوتووینەتەوە لە ئایەتی ١٩٦، ئایەتی ١٩٧ی بێنینە پاڵ بۆوەی بە چاکی لە سـەر و بنـی کاروباری یاسای حەج تێبگەین و حاڵی بین.

﴿١٩٧﴾ **الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلاَ رَفَثَ وَلاَ فُسُوقَ وَلاَ جِدَالَ فِي الْحَجِّ وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ اللّهُ وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى وَاتَّقُونِ يَا أُوْلِي الأَلْبَابِ**

**بەجێ‌هاتن و ئەنجام‌دانی حەج لە چەند مانگێکی دیاری‌کراودا دێتە جێ کە ئەوانەی دادەبسـتن ئیحرامی حەجیان لەو چەند مانگانەدا لە سـەر خۆیـان بە پێویسـت دادەنـێن. بـا زۆر بە چـاکی بزانن و ئاگـادار وەبـن. لە کاتێکـدا کە لە حەجـدانە، بـا نەچـنە لای ژنانیـان، و لە یاسـای حەج دەرنەچن. کێشە و هەرا و قڕە و دەمەقاڵێ نەیێنە ڕوو چونکە بە خاتری کەعبە ومـانگی حەج و ئەو وەزیفە بەنرخ و گەورەیە، ئەوانە قەدەغە کراون. هەر کـارێکی چـاک و خێـر بـکەن خـودا ئاگاداریەتی، باری تێشوو بۆ کاتی خۆی داگرن و هەڵگرن، چاترین تێشـووش تـرس لە خـودا و پارێزگارییە. جا کەوایە ئەی خاوەنی هەست و ئەقڵ و شعوور، «ئەگەر دە باوەڕتانـدا ڕاسـتن و ڕاست دەکەن» تەنیا لە من بترسن.**

## کات و ڕێوڕەسمەکانی حەج

**پوختەی مەبەست لەو ئایەتە پیرۆزە:** لە دەورانی حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیلەوە تاکوو دێتە ئەوڕۆ ئەو مانگانەی کە حەجیان تێدا دەکرێ مانگانێکی ئاشکرا ژمردەن، وەک مانگەکانی شەواڵ، زیقەعدە، زیحەججە، نە واتە لەو ماوەیەدا ئیحرام بۆ حەج دادەبەسترێ کەوایە هەر کەسێک لەو مانگانەدا حەجی لە سەر خۆ بە لازم گێڕا واتە ئیحرامی بۆ حەج دابەست، نابێ بچێتە لای ژنی و نابێ هەروا دەمەقاڵێ بکا و نابێ کاری خراب بکا لەو کاتانەدا بەتایبەتی. چونکە ئەوە بە خەیاڵ پشت لە خراپە و ڕوو لە چاکەیە، لەو حەجەدا ئەنجامی دەدا. دیارە خودای زانا بە هەموو زاهیر و شاراوەیەک هەچی بیکەن و دە ناو دڵداش بیهێنن و بیبەن دەزانێ و ئاگای لێیە.

ئەوەی مەنشوورە ئەوەیە کە دە دەی مانگی زیحەججەدا حەج بەڕێوە دەچێ، کەوابێ بزاندرێ بۆچی مانگەکانی شەواڵ و زیقەعدەش ڕەگەڵ خراون؟ قورئانزانەکان بە کۆدەنگی نەزەریان داوە کە مانگەکانی شەواڵ و زیقەعدەش لە مانگی حەج بۆ ئیحرام تێدا بەستن ئەگینا دە دەی زیحەججەدا بوو دەستوور و ڕوکنەکانی بەڕێوە دەبرێ گەرچی لە مانگی زیحەججە بە تەواوی بێنە و بەرەیان هەیە زاناکان. «ابوعبیدالل عروة بن زبیری بن عوام اسدی قریشی» کوتوویەتی مانگەکانی شەواڵ و زیقەعدە لە مانگەکانی حەجن. مالکیش هەر نەزەری وا داوە بەڵام حەنەفی هەر دەیەی مانگی زیحەججەی بە مانگی حەج داناوە. «ابن‌عباس»یش لە سەر ئەو قەولەیە. شافعی دەڵێ نۆ ڕۆژی هەوەڵی زیحەججە دەگەڵ شەوی قوربان لە مانگی حەجە. یاسازانەکانی عیلم بەتایبەت عیلمی نەحو کوتوویانە کەلیمەی (اشهر) جەمعە، خۆ دیارە جەمعیش دەبێ لە یەک ژووراتر بێ، واتە لە یەک زیاتر بێ. جا دوو دەبێ یا سێ یا هەروا زۆرتر بێ‌ئیشکالە. جا لە سەر ئەو نیزامە دەبێ شەواڵ و زیقەعدەش هەر مانگی حەج بن چونکە خودا فەرموویەتی ﴿الْحَجُّ أَشْهُرٌ﴾ بە هەر حاڵ لەو بارەوە ئەگەر پێوە بچین دەبێ نەڵێم خەریکی تەفسیرم، دەبێ بڵێم خەریکی ساغ کردنەوەی کێشەی زاناکانی عەرەبم.

لە ناو مانای ئایەتەکەدا ئەوە بیسترا و بیندرا: کە دە کاتی دابەستنی ئیحرام و حەجدا چوونە لای ژن و قڕەقڕ و دەمەقاڵێ نابێ ببێ. خۆ ئەوە بێ‌گومانە کڕین و فرۆشتن دەبێ و دێتە ڕوو و بۆ حاجیان. جا خۆ ئەوەش بێ‌گومانە کە کڕین و فرۆشتن کەم وا هەیە بێ قڕەقڕ و دەمەقاڵێ بێ. وا هەیە ئەو قڕەقڕە سەر دەکێشێتە ناکۆکی و بە گژ یەکدا چوونیش، کەوایە دەبێ چۆن خۆ

لەو بێنە و بەرەیە ڕزگار کەین؟ خودا ڕزگارمان دەکات بە وەسیلەی ئـایەتی ١٩٨ بە وردی دەبـێ سـرنجی درێتێ و لێی وەکۆڵدرێ:

﴿١٩٨﴾ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلاً مِّن رَّبِّكُمْ فَإِذَا أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَاتٍ فَاذْكُرُواْ اللّهَ عِندَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ وَاذْكُرُوهُ كَمَا هَدَاكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِ لَمِنَ الضَّآلِّينَ
هیچ تاوان و گوناحێکتان لە سەر نییە ئەگەر لە ڕۆژانی حەجدا وەشوێن خێـر و بێـر و مـامەڵە کردندا بڕۆن کە پەروەردگارتـان ڕێـی پـێ داون، کـاتێ لە عەرەفـاتەوە هـاتنە خـوارێ و بەرەو دەشتی مەزدەلیفە شۆڕ بوونەوە، لە لای مەشعەرولحەرامدا یاد و زیکری خـودا بـکەن چـونکە خودا شارەزا و ڕێنوێنی کـردوون بێ‌گومـان لە پـێش ئەوانـدا لە دەسـتە و گرووهـی گومڕایـان بوون.

## کڕین و فرۆشتن لە کاتی حەجدا

**تێڕوانین و ئاوڕ وەسەر دانەوە:** ئەی ئەو کەسانەی کە لە حەجدان، هیچ گوناحتـان ناگـاتێ کە بـۆ ژیـانی مـاڵ و منداڵتـان داوای ڕزق و ڕۆزی لە خوداتـان بـکەن و دەگەڵ بەجێ‌هێنـانی واجباتی حەجتان لە کاتی تایبەتی خۆی بە کڕین و فرۆشتن خەریک بن، بە شەرتێ لە ماڵەوە بە نیەتی حەج و بۆ ڕەزای خودا هاتبن بۆ حەج، نەک بە نیەتـی تیجـارەت و کـڕین و فرۆشـتن دە بن‌باڵ و پەردەی حەجدا هاتبن بۆ کەعبە.

لە سەر ئەساسی خووخدەی ئینسانی کە خۆبەزل‌زانییە لە غەیر بە هۆی مـاڵی دنیـا و یـا بە هۆی هۆز و تایفە و پۆست و پلە و مەقام، لە پێش هاتنی ئیسـلام و دابەزینـی یاسـای ئیسـلام، قوڕەیشییەکان لە هەموو عەڕەبەکانی دیکە خۆیان بە زیاتر و ماقوولتر دەزانی و دادەنـا. جـا بەو هۆیەوە لە کۆبـوونەوە و دانیشـتنا دەگەڵیـان کـۆ نەدەبـوونەوە و خۆیـان لـێ بەدوور دەگـرتن، تەنانەت لە کاتی حەجا کە دەبا حـاجی لە عەرەفاتـا بوێسـتبان، ئەگەر عەڕەبەکـان لە عارەفـات بوێستابان، ئەوان دەچوون لە موزدەلیفە دەوێستان. ئەوە دەورانی جەهالەتی عەرەب بـوو پـێش ئیسلام. بەڵام کاتێ ئایینی ئیسلام تیشکی دایە دنیا و عالەمی عەڕەبستان بەتایبەتی، پێش هەموو شتێک نیدای جیاوازی بە گوێی عالەمدا درا و هەڵگیرا لە نـاو خەڵکـا، مەگەر نەفـام؛ ئەدێـرەدا دەستووری دا بە خاوەن باوەڕان کە لە عارەفاتا هەموو کەسی حاجی پێکەوە ڕاوەستن لێک جیـا نەبنەوە، و هەروا هەمووتان بە یەکەوە لە عەرەفاتەوە بەرەو مـوزدەلیفە داگەڕێـنەوە خـوار تـاکوو ڕەنگ و دەنگی لێک جیاوازی لە ناوتاندا لە کاتی وا گەورە و بەڕێزدا چاو نەکرێ و نەمێنێ.

دەبێ بە تەوری گشتی ئینسان ئەوە بزانێ و بیکاتە حەڵقە و بیکاتە گوێ، کەس لە لای خودا لە کەس گەورەتر نییە مەگەر بە تەقوا و کەڕامەتی دینی؛ ماڵ و سامان و پلە و پایە نیشانەی بەڕێزی لای خودا نییە بەڵکە هەر تەقوایە هۆی ڕێزداری لە لای خودا.

وە هەروا عەرەبی ناحاڵی ئەو یاسا ناحەز و ناقۆڵایەشیان هەبوو پێش ئیسلام، پاش تەواو بوونیان لە حەج دەهاتن بۆ فیز لەلای مزگەوتی «منا» کۆ دەبوونەوە بۆ شانازی و فیزڕانان بە سەر یەکتردا. هەرکەس بە پێهەڵاکوتنی باب و باپیرانیان خۆیان هەڵدەکێشا و خۆیان ڕادەنا و هەڵدەداوە بە سەر ئەوی دیدا. دووبارە خودای دژ بە چاو و ڕاوی درۆ و بێئەساس هات دەستووری لابردنی ئەو باوە ناشیرینەشی پێ دان بە وەسیلەی جوملەی ﴿فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُواْ اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءكُمْ﴾. جا بۆ تەئکیدی ئەو بابەتە ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٩٩ و ئایەتی ٢٠٠ تا بە تەواوی تێبگەی لە مەتڵەب.

﴿١٩٩﴾ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ وَاسْتَغْفِرُواْ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ

**پاشان هەر لەو شوێنەوە کە خەڵک لێی دێنە خوارەوە ئێوەش هەر بەو شوێنەدا وەرنە خوارەوە و داوای لێخۆشبوون لە خودا بکەن، بێگومان خودا لێبوردە و میهرەبانە.**

﴿٢٠٠﴾ فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُواْ اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا فَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا وَمَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ

**هەرکاتێ بە تەواوی کاروباری حەجتان تەواو کرد، یاد و زیکری خودا بکەن، هەروەک بە یاد و باسی باب و باپیرانتان فەخر و شانازی دەکرد لە دەورانی نەفامیتاندا، بەڵکە ئاوا توندتریش بە یاد و زیکری خودا فەخر و شانازی بکەن. چونکە هەر خودا شایانی فەخر پێ کردن و سەنایە. هەندێک لە خەڵکی نەفام دەڵێن خودایە بەشمان بدە لەو دنیایە، بێگومان ئەوانە لەولا هیچ بەشێکیان نیە، کە بەشیش هەر بەشی ئەولایە بێگومان، ئەگەر دە فریا بێ.**

## یادی خودا

**تێڕوانین و بەرجەوەندی ڕاز و ئامانجەکانی هەر دوو ئایەتەکانی ١٩٩ و ٢٠٠:**

بێگومان دە یاسای ئایینی ئیسلامدا کەس بۆی نییە خۆ لە کەس بە زیاتر بگرێ، مەگەر بە خوداپەرستی و چاکە و چاکەکاری، جا خۆ وەک دەڵێن و واش دەردەکەوێ نیزیک لە ڕاستییە مەیدانی کەعبە دە ڕۆژی حەجدا وێنەیەکە لە مەیدانی مەحشەر، کە کەس لەو کاتەدا نە بۆی

هەیە و نە دەشتوانێ لە تاو دەردی خۆی هەستی خۆ بەزل‌گری و جیاوازی لەگەڵ خەڵک بکا، واتە دە کاتی پۆشینی بەرگی بێدرووومان و سپی و خاولی بە سەر شانەوە و سەر ڕووت و پێ پەتی. دەبێ بزاندرێ لەو کات و شوێنەدا ئاغا و گەدا و مەلا و شێخ و حاجی و سەید و کۆیلە و سەید کە دە سەف و ڕیزی یەکسانیدان، نیشانە و وێنەیە لە مەیدانی مەحشەر. واتە هەروەک لە دیوانی خودا کە حەشرە لە بەر نەزەری خودا کەس هۆشی ئەوەی نییە لە تاو دەردی خۆی خۆ بە ئاغا و سەردار بزانێ. ئەو ڕۆژە حەجەش لەو ماڵە کەعبەیە کە ماڵی خودایە، ئاوا نابێ کەس خۆی بە ئاغا و سەردار بزانێ. جا ئەوەیە ڕازی ئەوەی کە خودا پێی دەڵێ بە ئینسان دەو کاتەدا بڵێ: خودایە لێمان خۆش بە ﴿وَاسْتَغْفِرُواْ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾.

ئینسانی نەفامیش هەن کە دەچێ لە حەج دەپاڕێتەوە بۆ دنیا واتە هەر داوای دنیا دەکا لە خودا و دەڵێ: ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا﴾ واتە لە دنیادا زۆرم دەیە و بەس. ئەوە لەوانەیە نزای لێ وەرگرێ خودا و ئەگەر لێی وەرگرێ، لە قیامەتدا بێبەشە.

هەچی ئینسانی بەفام و بەئەقڵ و شعوورە داوای دین و دنیا دەکات لە خودا دەو ڕۆژەدا وەک خودا لە ئایەتی ٢٠١دا دەفەرموێ لە زمان وانەوە:

﴿وِمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ٢٠١﴾
**خودایە شتی جوانمان دەیە لە دنیادا واتە ماڵ و منداڵ و سامانی وا لە بەری وەحەسێین، و شتی جوانمان دەیە لە ڕۆژی ئاخرەتدا واتە ئەعمالی وامان دەیە کە لە ڕۆژی قیامەتا جوان بێ بۆمان و ناحەز نەبێ.**

## خواستنی دنیا و ئاخرەت

بەڵام دەبێ ئەوە بزاندرێ ئینسان کە بە چەکی هەرە چاکی ئەقڵ و هەست و شعوور بۆ شەڕی دنیا چەکدار کراوە، دەبێ دەس وەکا بەو چەکانە واتە زۆر چاک بزانێ هیچ ئایین و دین و مەزهەبێک و هیچ چاکە و خراپەیەک بە قسە نابێ و خودا وەری‌ناگرێ بەڵکە عەمەل، عەمەل، عەمەل.

ئایەتی ٢ سوورەی عەنکەبووت کافیە بۆ وانەی بە بەهانە نین بۆ کوتەی بێعەمەل: ﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ﴾ **ئایا خەڵک وا دەزانن هەر بڵێن ئیمانمان هێنا، هەروا وازیان لێ دەهێندرێ و تاقی ناکرێنەوە بە ئەعمال؟**

بە کورتی و بە کوردی: خودای تەعالا ئینسانی بە دوو دەستە نیشان دا: دەستەیەکیان تەنیا لەززەت و خۆشی دنیای دەوێ و دنیاشی هەدەفە لە ژیانی خۆیدا. دیارە ئەوە زۆر زۆر خەتەرترە لە هەرچی بوونەوەرە بەزیانترە. چونکە ئەوە هەچی وەبەری بێ دەیکاتە فیدای ئەو هەدەفەی کە دنیایە. دەستەی دووش بیر و شعووری هەر لە سەر ژینی دنیا چەرخان لێ نادا، چونکە دنیای وەک بارگە و بنەی قۆناغی ئاخرەت داناوە، جا بۆیە دەپاڕێتەوە لە بەر خودا: هەم بارگە و بنەی جوانم لە دنیادا پێ عەتا کە، هەم ڕەحمەت و جوانی ڕۆژی ئاخرەتیشم دەیە.

دیارە خودای خاوەن عیلم و داد و بەزە و عەداڵەت ئاگاداری نیەت و باوەڕی ئینسانە بەو هۆیە کە دڵ و دەروون و هەستەی نیەتی دەستەی دوو واتە ئەو کەسەی کە داوای خێر و خۆشی هەر دوو وەرزی دنیا و قیامەت دەکا، خودا دەزانێ کە ئەو عەبدەی دەزانێ خودا زانایە بە هەست و ویستی، و هەر ئەو عەبدە لێی یەقینە خودا غەنییە و دەستەڵاتدارە و بەبەزەشە بۆ وانەی داوای لێ دەکەن. و هەر ئەو عەبدە دەشزانێ هەر دوو لای واتە دنیا و ئاخرەتی لێ داوا دەکا. جا بۆ ڕاستی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٠٢:

﴿٢٠٢﴾ أُولَـٰئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُواْ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ

**ئەوانەن بەرهەمی ئاکار و کردەوەی جوانی خۆیان وەردەگرن، دیارە خوداش زوو حیسابژمێرە. (واتە کەس دیقەدیقە نادا دە حیسابی پاداش و تۆڵەدا)**

**ئاوڕ وەسەر دانەوەیەک:** ئەوانەی کە داوای خێر و خۆشی هەر دوو دنیا دەکەن بەشی تەواوی ئەوەی دەیکەن و حەولی بۆ دەدەن و لە بەر خودای بۆی دەپاڕێنەوە، هەیانە و دەیاندرێتێ. هەرکەس بە گوێرەی نیەت و باوەڕی خۆی و تێکۆشانی خۆی و ئاکاری خۆی بە نسیبی دەبێ و دەیدرێتێ لە خەزانەی خودادا. جا زیاد یا کەم. ئاوڕ وەسەر ئایەتی ٢٠ی سوورەی شووڕا وەدە و نەتیجە وەرگرە: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ﴾ هەرکەس بەرهەمی پاشەڕۆژی بوێت واتە کەسێک **بۆ ئاخرەت تێکۆشێ، بەرهەمی تێکۆشانەکەی بۆ زیاد دەکەن و دەیدرێتێ. هەرکەسیش بەرهەمی ئەو دنیایەی بوێت واتە هەر بۆ دنیا تێکۆشێ، لە بەرهەمی تێکۆشانەکەی بۆ دنیا نەختێکی دەدەنێ بەڵام لە ئاخرەتا بەشێکی نییە.**

خودا ئەگەر فەرمووی لە بەرهەمی تێکۆشانی دنیا شتێکی دەدەنێ، دیارە وەک ئەوە دەچێ ئەو بەشە کەم بێ، ڕازەکەش ئەوەیە لە دنیادا ئینسانی کەم باوەڕ هەرچەندی زۆریشی بێ هەر

کەم دیاری دەدا لە کن وی، چون تێرخواردنی نییە دنیاپەرست.

## چیرۆکی شێخ ئەبولعەباس لە سەر گۆڕی شەهیدانی ئوحود

گۆیا «شیخ ابوالعباس مرسی» دەگەڵ تاقمێک لە مریدان بـۆ زیـارەت کردنـی گۆڕسـتانی شەهیدەکانی هەرای ئوحود کەوتـنە ڕێ. کـاتێ گەیشـتنە سـەر گـۆڕی شـەهیدان، لە پێشـەوە گەیشتنە گۆڕی حەزرەت حەمزەی سەیدولشوهەدا. لەوێ وێسـتان. شـێخ ڕووی تـێ کـردن و کوتی: کوڕینە! ئێرە پیرۆزترین مەکـانە، دوعـایە بـکەن و بڵـێن خـودایە خێـری جـوانی ڕۆژی ئـاخرەت ببەخشـە بەو شـەهیدە بەرز و عەزیـزانە. هەمـوو لە زاریـانڕا دەردەکەوت کە وایـان دەکوت. بەڵام دیار بوو یەکیان وای نەدەکوت. شێخ تێگەیی کە ئەو مریدە وا ناڵێ و تێی گەیـی شتێکی دی داوایە. لە سەر ئەو بەرجەوەندییە شێخ ڕووی تێکرد و پێـی کـوت ئەوە ئەتـۆ چـت کوت و چت داوایە؟ مریدیش کوتی ئەمن ژیانم ناتەواوە، چەن دینار و دراوم دە دوعای خۆمدا داوا کرد. شێخ تێگەیی لە نهێنی ئەو و پێی کوت: ئەی پەست هیممەت و بێتەوەکول! دوعای خێرت دا بە شەڕ بە هۆی نەزانی و بێتەوەکولی.

پاشان هاتن و کەوتنە ڕێ. دەو گەڕانەوەیەدا بە تاجرێکی گەیشـتن. تـاجر بە پێـی پرسـیار لێیان، تێگەیی لێیان و لەو مریدەش گەیی. کیسەیەکی زێڕ بە وی دا، پێی کوت ئەوە ئەو بەشەی کە تۆ لە خودات داوا کرد لە سەر گۆڕی شەهیدانی ڕێی خودا. ئەمن دەتـدەمێ. بەشـی داوای ئەوانی دیش بە خـودا نەبـێ بە کەس نـادرێ چـونکە گـرانە و زۆرە؛ کە دەبێـتە پاداشـی ڕۆژی ئاخرەت. ئەوە بوو تەمسیلی دنیاخوازان و ئاخرەتتەڵەبان.

چاترین و باشترین دوعایێکی کە هەم حەسانەوە و ئاسایشی دنیای تێدا بێ و هەم ئەمـن و ئەمانی ڕۆژی ئاخرەت، لە سەر قەولی قورئانزانان ئایەتی ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِـرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾. تەفسیری کەبیر، ج٥، ل ٢٠٤.

دیارە بە نیشانە و ڕاوێژ خودا دەیهەوێ دڵ و دەروونی عەبـدی خـۆی بە یـادی خـۆی و بە هەستی حیسابی ڕۆژی ئاخرەت نۆرماڵ و تەیار کا. بۆیە پاش ئەوەی کە فەرمانی بە یادی خۆی لە مەشعەرولحەرامدا پێ دەدا دوای بەجێهێنانی حەج و تەواو کردنی ئەوجار فەرمانی پێ دەدا بە یادی خۆی خودا لە سێ ڕۆژەی «منا»دا. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٠٣:

﴿٢٠٣﴾ وَاذْكُرُواْ اللّهَ فِي أَيَّامٍ مَّعْدُودَاتٍ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَـلا إِثْـمَ

عَلَيْهِ لِمَنِ اتَّقَى وَاتَّقُواْ اللَّه وَاعْلَمُوا أَنَّكمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ
**دەو چەند ڕۆژە دیاری کراوانەدا زیکر و یادی خودا بکەن، ئەگەر کەسێک پەلەی کرد و دە دوو ڕۆژدا تەواوی کردن، ئەوە هیچ تاوان و گوناحی لە سەر نییە، و هەروا ئەگەر کەسێکیش دواکەوت «بۆی نەکرا دە کاتی دیاری کراویدا تەواوی کا» ئەوەش هیچ تاوانێکی لە سەر نییە. دیارە ئەو دەستوورە بۆ ئەوانەیە کە لە خوداترس و بەپارێزن. جا واتە هەر لە خودا بترسن و هەر بۆ لای ئەویش وەکۆ دەکرێنەوە**

## ڕەجمی شەیتان

**تێڕوانین:** ئەو ئایەتە ئاماژە وەلای ئاخرین ئەحکامی حەج دەکا کە شەیتان بەردباران کرانە و قوربانیە و تەواف و باقی زیارەتەکانن کە هەموویان لە ئەرکانی حەجن. و هەروا پێویستیشە ئەو ڕۆژە مەعدوودانە کە دە ئایەتی ٢٨ی حەجدا بە (ایام معلومات) ناو براون کێها ڕۆژانەن، لە سەر قەولی شافعی بریتین لە دە ڕۆژی هەوەڵی مانگی قوربانی، و هەروا مەبەستیش لە (ایام معدودات) کە دە ئایەتی ٢٠٣دا هاتوون ڕۆژەکانی ١١ و ١٢ و ١٣ی مانگی قوربانن.

دەبێ ئەوە بزاندرێ مەبەستی خودا لە کەلیمەی تەعجیل ڕوخسەتە واتە ئەگەر هاتوو کەسێک بۆ ڕۆژی سێزدە نەماوە هەر لە دوازدەدا تەواو بوو، گوناهی ناگاتێ. بە کورتی کەسێک لە دوو ڕۆژاندا بگەڕێتەوە واتە دە پێش ڕۆژئاوابوونی ڕۆژی ١٢ ڕۆژی ١٣ بقرتێنێ و نەمێنێتەوە، گوناهی ناگاتێ. و هەروا کەسێکیش دواکەوێ تا ئێوارێی ڕۆژی ١٣ هەر گوناهی ناگاتێ. بە کورتی کەسێک زیاد لە ڕۆژەکانی حەج لە مەککەدا ماوە گوناحی ناگاتێ. هەروەک ئەگەر لە ترسی تووش‌بوون بە بێ‌ئەدەبی نەیویست زیاد لە ڕۆژەکانی حەج وەمێنێ گوناح نییە.

**تیوتیوە:** خودای تەعالا دە یاسا و مەناسیکی حەجدا دە سووڕەی بەقەرەدا وەک ئایەتی ٢٠٣ بێ (ایام معدودات)ی هێنا، و دە ئایەتی ٢٨ی سووڕەی حەجدا (ایام معلومات)ی هێنا. شافعی کوتوویەتی: (ایام معلومات) دە ڕۆژی هەوەڵی مانگی قوربانن کە ئاخرەکەی ڕۆژی قوربانە ئەمما (ایام معدودات) سێ ڕۆژی پاش ڕۆژی قوربانە کە پێیان کوتراوە (ایام التشریق)، بەو دەلیلە (ایام معدودات) (ایام التشریق)ن، چونکە لەفزی (ایام) جەمعە واتە لانی‌کەم دەبێ سێ بن، بەو پێیەیە هەرکەس ئەو سێ ڕۆژانە بە دوو ڕۆژ ببڕێ تاوانی نەکردووە چونکە ڕۆژەکانی دوای حەج و قوربانین، ئەو یاسا و دەستوورەش تەنیا بۆ حاجیانە. ئەوە بوو کورتەی مەبەست لەو ڕۆژە (معدودات) و (معلومات)ە، درێژاییەکەی لە تەفسیری کەبیردایە.

**بۆ ئاگاداری:** شافعی لە بەشی زۆری تەفسیرەکاندا کوتوویەتی (ایام معلومـات)ی ئـایەتی ٢٨ی سـوورەی حەج بـریتین لە ڕۆژەکـانی هەوەڵـی مـانگی قوربـان (زیحەجـجە) و (ایـام معدودات)ی ئایەتی ٢٠٣ی بەقەرە بریتین لە ڕۆژی ١١ و ١٢ و ١٣ی پـاش جێژنـی قوربـان واتە پاش قوربان کە ناویان (ایام التشـریق)ە.

بەڵام دە تەفسیری مونیردا نەزەری بە پێچەوانەی ئێرەیە واتە (ایام معلومات) بریتین لە سـێ ڕۆژی پاش ڕۆژی قوربانی، نەزەری دە تەفسـیری مـونیردا خیلافـی نەزەری تەفسـیری کەبیـر و تبیین الفرقان و باقی تەفسیرەکانە، یا چاپەکەیان سەهوی تێدا کراوە.

**ڕابیتە و تێکەڵاوی ئایەتەکانی حەج دەگەڵ ئایەتی ٢٠٤ی بەقەرە:** ئەگەر هۆش و سـرنجی درێتێ ئەوە دەردەکەوێ کە خودای تەعالا ئەوانەی نیشانەکانی حەج جێبەجـێ دەکەن و هەروا خەڵکی دیـش، بە دوو دەسـتەی ڕانـان و نـاو بـردن: ١. دنیاپەرسـت و ئاخرتنەویسـت کە لە پاڕانەوەیاندا دەڵێن (واتە خودا لە زاری واندا دەڵێ): ﴿فَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا وَمَـا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ﴾ هەندێ لە خەڵک دەڵێن ئەی خوایە لەو دنیایە بەشمان بـدە، ئەمـانە لە پاشـەڕۆژ هـیچ بەشـێکیان نیـیە. ٢. دووهەمیـان دەڵـێن: ئەی پەروەردگارمـان لە دنیـادا چـاکە و لە ڕۆژی ئاخرەتیشدا هەر چاکەمان پێ ببەخشە، بشمانپارێزە لە سزا.

بە کــوردی و بە کــورتی: ئەوانەی دم لە ئــیمان دەدەن دوو دەســتەن لە لای خــوداوە، دەستەیەکیان تەنیا دنیای دەوێ، خوداش هەر دنیای دەداتێ، بەشی ئاخرەتیشی ناوێ و خوداش نایداتێ. دەستەی دووهەمیان دنیا و ئاخرەتی دەوێ و هەرکان داوا دەکا لە خودا کە دەڵێ ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾. ئەگەر بەرجەوەند بی لەو ماجەرایە ئەوە بە ڕوونی دێتە ڕوو کە شوێنی لە خوداترسان و ئیمان و باوەڕی دڵ و دەروونە، نەک زار و زمان. و نیشانەی پاکی و ناپـاکی دڵ و دەروون ئەخـلاق و کـردارە نە چـاو و ڕاو و گوفتـار. جـا بـۆ باوەڕی و ڕاستی دەچینە خزمەت ئـایەتی ٢٠٤ تـاکوو تێـبگەی کە خـودای تەعـالا ئینسـانی لە ڕووی کردەوە بە دوو جۆر ناو دەبا:

﴿٢٠٤﴾ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُعْجِبُـك قَـوْلُهُ فِي الْحَيَـاةِ الدُّنْيَـا وَيُشْـهِدُ اللَّه عَلَى مَـا فِي قَلْبِـهِ وَهُـوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ

هەندێ هەنە لە ئینسان ئا لەو ژیانی دنیایەدا سەرت لە چاووڕاو و گفتوگۆ و قسەیدا واق و وڕ و سوڕ دەمێنێ، خـودا دەکـا بە شـاهید لە سـەر ئەو شـتەی کە دە دڵ و دەروونیـدایە (ئەویـش

**درۆیە) کەچی لە هەمان کاتیشدا سەرسەختترین و خرابترین دوژمنە دەگەڵ ئایین.**

## قسەی زمان و قسەی دڵ

**تێڕوانین و ئاوڕدانەوە وەسەر ناوەرۆکی ئایەتەکە:** ئی وا هەیە لە ئینسان بە چاووڕاو و قسە سەرسامت دەکا و بە واق و وڕ و کاس دادەمێنی لەو ژیانە دنیایەدا، بەو هۆیەی کە هێندە ناپاکە لە هەموو لەش و گیانی بگرە لە بەری پێیڕا تا تەپڵی سەری، هەر درۆ و خەیانەتی لێ دەبارێ. بۆ ساتێکیش دڵ و زمانی وەک یەک ڕێ ناکەون، کەچی بە قسە موسوڵمان و پاک و ئەمین و لەخوداترس و دمپاک و داوێنپاک و دەستپاک، دە ئاکار و کرداریشدا پشیلەیە دە سپڵەییدا، دوژمنێکی زۆر سەختە دەگەڵ خودا و ڕەسوولی خودا و گەل و نیشتمان و کۆمەڵ.

ئەو جۆرە کەسانە لە هەموو دەور و زەماندا لە ناو هەموو گەلێکا هەبوون و هەن زۆر وا هەیە بە جارێک عالەمێک بە دووی خۆدا ڕادەکێشن و هەڵیاندەفریوێنن، بە زۆری ئەو کەسانە لە سەرۆک پەرستانی گەلدا هەڵدەکەون، بە قسەی ڕەسوولان دەدوێن بە ئاکاریش دنیا دەکاتە باڵاگەردانی میز و کورسیەکەی، لە ڕووبەڕوودا باب و برایە، لە پشتەوەڕا مار و دووپشک و حەزیایە، وەک خودا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ...﴾ **واتە ئەگەر پشتی هەڵکرد تێدەکۆشێ و هەوڵ دەدا وڵات وێران کا و کشتوکاڵ گڕدا و داری ژیانی ئینسان لە ڕەگ و ڕیشەڕا لە ناو بەرێ. بە زۆری ژیر و زانا و دانا و مرۆیان دەبوغزێنێ و ناکۆکییان و ململەیان دەگەڵ دادەبەستێ.**

دێرەدا واتە بە وەسیلەی ئەو ئایەتە (۲۰۴) دەکرێ بڵێین خودای تەعالا حەزرەتی ڕەسووڵی ئاگادار کردووە لە کەسانی شیرینزمان و دمتەڕ و زارپاراو و هەلپەرست کە بەو چەکە فریودەرانە تێدەکۆشن ڕەگی ئایین بقرتێنن بە زاهیری هەنگوین و مەڵحەم دەبەخشن، دە باتین و نهێنیشدا ژەهر دەڕێژن. ئەو کەسانە بەوەیان بناسن کە زۆربڵێ و چاووڕاوچین، هەم سپڵە و بێئەمەک لێیان وەدوور کەون خۆیان تخوون مەکەن.

گۆیا ئایەتەکانی ۲۰۴ و ۲۰۵ و ۲۰۶ دەربارەی «اخنس بن شریق ثقفی» دابەزیوە کە کابرایەکی زمانشیرین و زارتەڕ و دەمپاراو بووە، دێتە خزمەت پێغەمبەر و ئیدیعا و ئیزهاری ئیسلامەتی دەکا جا بە هەر هەدەف و ئامانجێک بێ، پاشان کە لە خزمەت حەزرەتی پێغەمبەر دەڕوا و دەردەچێ و دەگەڕێتەوە بەرەو وڵاتی خۆی، هەچی تووشی دەبێ و وەبەری دێ دە ڕێگایەدا، لە ناوی دەبا و وێرانی دەکا. وەک زەراعەت و کشتوکاڵ ئاوریان تێبەردەدا و ئاژەڵ و

گاوگۆل دەکوژێ و هەچی بۆی دەس بدا لە ناوی دەبا.

دەتوانین لەو ئایەتە (٢٠٤) شەش بابەتی خاوەن بەهرەی لێ فێر بین:

١. ئیحتیات و هەڵوێست لە سەر ئەوانەی بێ لێپرسین ئیزهاری دین و چاکی و پاکی دەکەن.

٢. دەبێ ئەوە بزاندرێ و لێی غافڵ نەبین کە بێباوەڕ هەچی لە دەستی بێ دەیکا.

٣. ئینسان ئەگەر هاتوو دە داواکانیدا خودا و ڕەسوولی کردە شاهید و سوێندی پێ خواردن، ئەوە بۆ باوەڕ پێ کردن نابێ، خەریکی فریودانە بەو سوێندانە

٤. نیشانەی ڕاستی و درۆیی دەروون ئاکار و کردارە

٥. لە چاووڕاوڕا ناو دەروون و نیەت دیارە، ورد بڕوانە.

٦. دابەزینی ئەو ئایەتە ئەوە دەڵێ: دەبێ زوو تەسلیم نەبی واتە بێ تەفتیش.

ئەو ئایەتە ئەو دەرسانەمان دادەدا:

١. ئینسان بۆ باوەڕ کردن و باوەڕ نەکردن بە ئیدیعا و داوای داواکاران دەبێ تەفتیش و لێکۆڵینەوە بکا، نە باوەڕ.

٢. پیسترین و گڵاوترین و دوژمنترین بۆ ئینسانی، ئینسانی دووڕوویە، چونکە بە زەحمەت دەناسرێتەوە، تاکوو تخوونی نەبی، بە هۆی ئەو دووڕوویەی.

٣. خودا بە شاهید گرتن لە سەر ئامانجی بەدرۆ گەورەترین تاوانە، چونکە فریو و خلیسکاندنی خەڵکە.

٤. چاووڕاو بۆ باوەڕ پێ کردن نابێ، کورد کوتەنی: عەتر دەبێ بۆنی شاهید بێ لە سەر چاکی نەک عەترفرۆش.

بە کوردی و بە کورتی: ئەو ئایەتە (٢٠٤) پێمان دەڵێ ئینسان لە مەڕ دنیاویستی و ئاخرەتپەرستی دوو دەستەن: دەستەیەکیان خۆ دەفرۆشێ بە دنیا و ئاخرەتیشی ڕێدەهاڵێنێ، دەستەیەکیشیان دنیا بە ئاخرەت دەفرۆشێ خۆشی باقی دەداتەوە.

هەروا لە سیمای ئەو ئایەتەڕا تا ئایەتەکانی ٢٠٥ و ٢٠٦ و ٢٠٧ ئینسان لە بابەت مناتی و ئیخلاس و ڕاستی هەر دەبنەوە دوو دەستە: دەستەیەکیان ئاخرەت دەدا بە دنیا سەربەسەر بە خۆیەوە، دەستەیەکیان ئاخرەت دەکڕێ بە دنیا و خۆیەوە، سەربەسەر.



ئەوجار خودای تەعالا هەر وەک ئەو کەسانەی پێ ناساندی کە گورگن و دە کەوڵی مەڕدان، (واتە منافق) ئاکارەکانیشیانت پێ دەناسێنێ بۆ وەی بیناسی و خۆی لێ بەدوور بگری،

بە وەسیلەی ئایەتی ۲۰۵ی بەقەرە:

﴿۲۰۵﴾ وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الفَسَادَ
**کە پشتی هەڵکرد تێدەکۆشێ و هەوڵ دەدا کە لە سەر زەویا خراپە بکا و کشتوکاڵ و ڕێچەڵووکی ئادەمیزاد لە ناو بەرێ، دیارە خوداش وێرانکەر و فەسادکاری خۆش ناوێ.**

## فەسادکاری لە زەمیندا

**تێڕوانین و لێکۆڵینەوە:** کاتێ ئەو ناپاکی زمانلووسی دمتەڕ و زارپاراو چاو دەگێڕێ بە وڵاتاندا تاکوو لە گوێی ئاوی ڕوون هەیە قوڕاوی کا، چونکە بە غەیرەز ئاژاوەگێڕی و دووبەرەکی نانەوە لە ناو کۆمەڵگادا هیچ ئاوات و ئامانجێکی لە ژیاندا نییە، جا بۆیە لە فیتنەگێڕیدا دڵی قەت تێر نابێ و نابێزێ و نە چاویش قەت پڕ دەبێ لە بێ مرۆیی و خەیانەت بە کەرامەتی بەشەری، هەمیشە دەگەڵ زانا و کەسانی ناودار و لێهاتوو دوژمنایەتی هەیە چونکە دەزانێ ئەوانە کۆسپی سەر ڕێی فەسادکارانن، دڕووی چاوی خەیانەتکارانن.

و بە هۆی تووز و نەزەری ئەو ناحەز و ناپاکانە پیت و بەرەکەت لە وڵاتدا بار دەکەن و نامێنن، خانووی ئەمن و ئەمانەت تێک دەڕوخێ و وێران دەبن. و هەچی لە زاری عالەم دەرپەڕێ ئەوانە دەیقۆزنەوە خێرا دەیخەنە ناو گوێی پۆلیس و چاوەدێرەکانی دەستەڵات تاکوو گیرۆدەی بەندیخانەی کەن.

هێندێک لە قورئانزانەکان ڕا و بۆچوونیان بە پێی ڕاوێژی دەستەڵاتداران و سەردارانی ناحەز و نارەوای ئەوڕۆ، دەڵێن کەلیمەی (تَوَلَّى) لە (تولیت)ە بە مانای ڕیاسەتە. ئەودەم مانای ئایەتەکە ئاوا تەعبیر دەکرێ: ئەگەر نیشتنە سەر کورسی دەستەڵات وڵات ئاور تێبەردەدەن و وێران دەکەن، کاریان پەرە پێدانی ستەم و ئاژاوە نانەوەیە. وەباڵ بەستۆ زۆر وێدەچێ وابێ مانای ئایەتەکە. چونکە ئەوڕۆ کوێر و کەڕ و لاڵیش ئەوە دەبینێ و دەزانێ.



ئەوجار خودای تەعالا بۆ ڕانان و ئاشکرا کردنی نیشانەیەکی زەق و ئاشکرای منافقان و هەروا بۆ بە سبووت گەیاندنی ئەوەی ئەوان دەیکەن ئی نیەت و قەستی بەڕاستیانە نەک لە ڕووی هەڵە و سەهو بێ ئایەتی ۲۰۶ ڕادەنێ و دادەبەزێنێ. ئێستێ دەچینە خزمەتی ئەو ئایەتە:

﴿۲۰۶﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللّه أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ

**ئەگەر هاتوو پێی کوترا: ها لە خودا بترسە فیز و لووتبەرزی و لەخۆبایی لە سەر تاوان شێلگیرتری دەکات، بەو هەوایە ئاگری دۆزەخ پڕ بە پێستیەتی. سوێند بە خودا خراپترین شوێنی بۆ ساز کراوە.**

## هەڵبژاردنی گوناه لە جیاتی تەقوای خودا

**ئاوڕ وەسەر دانەوەیەک:** کاتێ لە ڕووی پەند و ئامۆژگاری بەو نامرۆ و ناپاکانە بکوترێ لە لایەن خێرخوا و خاوەن باوەڕێکەوە: تۆزێ شەرم و شوکوا و ترسو بێ لە خودا و دیوانی خودا، بە هۆی فیز و دەمار وەک شیر هەڵدەگەڕێن و هەڵدەچن بەرەو گوناح و بەدکرداری و تاوانی زیاتر پەلان داوێن واتە یاچێتر دەبن و ناگەڕێنەوە و واز ناهێنن لەو خیرەسەریەی هەیانە تاکوو ڕۆژێ خودای خاوەن سەبر لە دادگای عەداڵەتی خۆی دەیانکاتە دەستەچیلە و زەخیرەی ئاگری دۆزەخ. ئەوکات کافیە و بەسیەتی پاڵدانەوەی دە ناو ئاگردا بۆ هەتاهەتایە. بە داخەوە هەڕەشەی تیژ و گڕدار کارێ ناکا لە دڵی ڕەقی وەک بەرد و دار.

## سفەتە ناحەزەکانی منافق

ئەگەر سرنج بدەیەی دێرەدا بەو ئاکام و هەستە دەگەی: کە خودای حەکیم دەیهەوێ لەوانەی ئەوە ئاکار و ڕەفتاریانە، هێندێک لە سیفەتە ناحەزەکانیان بەیان کا بۆ دەرسی عیبرەت. وەک ئەو سیفەتانە:

١. قسەی ڕێک و پاراو بۆ بەرهەمی سامانی دنیا و لەززەتی دنیا
٢. خودا بە شاهید گرتن لە سەر درۆ و بوختان هەر بۆ دنیا
٣. ئینکاری حەق و ڕاستی بۆ ئیسباتی باتڵ و خواری هەر بۆ دنیا
٤. شێلگیری تێکۆشان بۆ ئاژاوە و ناکۆکی بەینی عالەم هەر بۆ دنیا
٥. حەول و تێکۆشان بۆ وێران کردن و لەناوبردنی دنیای ئاژەڵ بۆ دنیای نەسلی بەشەر

## دوو لەفزی (حرث و نسل)

ئەگەر بە وردی لە دوو لەفزی (حرث و نسل) وەکۆڵدرێ، بە پێی نەزەری «مولانا عبیدالله» کە دە تەفسیری «مقام محمود»دا نیشانی داوە ژنان و منداڵان دەگرێتەوە چونکە دە قورئاندا ژن بە «حرث» ناو براوە وەک دە ئایەتی ٢٢٣ی بەقەرەدا چاو دەکرێ و هەروا منداڵانی بێ موریس واتە «ئەمرەد» ئەوانە نەسلن، لە سەر ئەو ئەساسە بە هیلاک بردنی «حرث و نسل» واتە

ڕاکێشانیان بۆ مەیدانی زینا و قوونـدەری، وەک لەو وڵاتـانەی کـافرن کـراوەتە بـاو. وەک ڕۆی تێیەتـی بـارودۆخی ئەوڕۆ بە وەسـیلەی دەزگاکـانی مـاهوارە و موبایـل و ئینتێرنێـت و بـاقی دەزگاکانی کەسافەت خۆی خزاندۆتە وڵاتە بەناو ئیسلامیەکان.

بە کوردی و بە کورتی، خـووی سـەرەڕۆیی و لاسـاری ڕیشـەی وا ڕۆچـووە دە نـاو دڵـی منافقان و ئەقڵ و شعووری داگیر کردوون کە بە تەواو هێزی پەند و ئامۆژگـاری تێـی ڕاچـن و تێکۆشیَ تازە ڕزگاریان نایە و بۆیان ئازاد ناکرێن بەڵکە ئینکاری و سەرەڕۆیی و لاسـارییان هەر زیاد دەکا و پێوە دەڕوا تا سەرحەد و سنووری گەورەترین گوناەە و تـاوان پێـوە دەچـن. تـازە بە ئاگری دۆزەخ نەبیَ دوولا نایەنەوە.



ئەگەر لە بیرمان بیَ لە ڕابردوودا واتە نەختاڵێک لەوە پێش لە باسی ئـایەتی ٢٠١دا کوتمـان ئینسان بە دوو دەستە نیشان دراوە لە لایەن خوداوە، دەستەی هەوەڵیان دنیاویست و خـۆفرۆش و قیامەتفرۆش بە دنیا، کە تا ئێرەش باسی لە دەوروبەری ئەودا بوو، بەڵام ئەوجار کاتی ئەوەی هاتووە کە باس لە دەستەی دووهەم بکەین کە قیامەتویستە و گیـان و ژیـانی دنیـای دە پێنـاو ڕەزایەتی خودادا بەخت دەکا، بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٠٧

﴿٢٠٧﴾ **وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاء مَرْضَاتِ اللّهِ وَاللّهُ رَؤُوفٌ بِالْعِبَادِ**
**هەندیَ لە ئینسان هەیە کە لە پێناوی ڕەزامەندی خودادا گیـانی خـۆی بەخـت دەکـات خـوداش دیارە لە مەڕ بەندەکانیدا بەبەزەیە.**

## وەدەس هێنانی ڕەزامەندی خودا

**تێڕوانین لە شەئن و سیما و دەروونی ئەو ئایەتە پیرۆزە:** ئی وا هەیە لە مرۆیان گیانی ئازیزی دە پێناو ڕەزایەتی خودای خۆیدا بەخت دەکا واتە بڵێین سەر و مـاڵی دادەنـیَ لە پێنـاو ڕەزایەتـی خودا. دیارە ئامانجی ئەو جۆرە کەسانە ئەوەیە کە دەیانهەویَ بەو فیـداکاریەیان ڕەزایەتـی خـودا بستێنن. دێرەدا ئەگەر نەختێـک سـرنج بـدەین و بەراوەرد بکەیـن ئەوەمـان لێـڕا دەردەکەویَ و چاوی دەکەین کە خودای تەعـالا دەگەڵ عەبـدەکانی بەبەزە و ڕەئـووفە، کەوا ئەوا نێونێـوە ئەو جۆرە مرۆیانە هەڵدەخا دە ناو کۆمەڵی ئینساندا کە بە گیان و ویژدانێکی پاک و بیرێکـی بەرز و بوێر و لەخۆبوردووانە نیشانی دەدەن و دەیسەلمێنن بە دنیا کە گیانێکی دە پێناو خـودا و گەل و نیشتماندا بەخت نەکریَ نابیَ پێی بکوتریَ گیانی ئینسانی، بەڵـکە دەبـیَ پێـی بکـوتریَ گیـانی

حەیوانی؛ چونکە بەڕاستی ئەو جۆرە کەسانە پایە و لەنگەری کەرامەت و ناموسی بەشەرن.

هێندێک لە قورئانزانان دەڵێن و کوتوویانە: هۆی دابەزین و هاتنە خواری ئەو ئایەتە پیرۆزە ئەوەیە: «ابن عباس» دەڵێ: هاتنە خواری ئەو ئایەتە لەمەڕ «صهيب بن سنان مولای عبدالله بن جدعان» و هەروا «عمار یاسر» و «سمیه»ی دایکی و بابی و «بلال»ی مەولای «ابوبکر»دا هاتۆتە خوار کە ئەوانە بە دەستی موشریکەکان ئەسیر کرابوون و دە ژێر عەزابی ئازار و شکەنجەدا هەر هاواریان لە خودا بوو وازیان لە گیانیان هێنابوو بەڵام وازیان لە ئیمان و باوەڕی بە خودا نەدێنا. سەرەنجام «صهیب» بە ماڵی دنیا خۆی لێ کڕینەوە، هێندێکیشیان هەڵاتن بەڵام «سمیه» و «یاسر»یان کوشت. ئەوانی دیش بە بەرتیل وپارە خۆیان کڕیەوە. کاتێ ئەوانە هاتنەوە شاری مەدینە بەتایبەت «صهیب» موژدەیان دانێ کە دەربارەتان ئایەتی خودا دابەزیوە و هاتۆتە خوار. ئەو ئایەتی ٢٠٧ و هەر لە سەر ئەو کەسانە گۆیا ئایەتی ٤١ی نەحل دابەزیوە ﴿وَالَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي اللّهِ مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُواْ لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَلَأَجْرُ الآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ﴾ **ئەوانەی وا پاش ئەوەی ستەمیان لێ کرا و لە بەر خوداش کۆچیان کردووە، بێ گومان هەر لەو دنیایەدا لە جێگای چاکیان دادەمەزرێنین، بەڕاستی پاداشی ئاخرەت گەورەترە ئەگەر بیانزانیبا.**

دەو تیجارەتەدا سوڕ و ڕازێک ڕازاوە: ڕازەکەش دەبێ هەر ئەوەبێ: معامەلەی ئێرە دەگەڵ خودایە، زۆر بەرزە کالا دێرەدا گیانە، بەهای ئەو گیانە ئاسایش و حەسانەوەی گیانە کە دە ڕەزایەتی خودادا دێتە جێ، ئەو سەودایە لە دەستی کەم کەسان دێ، دیارە بوونی ئەو کەمە کەسانە هۆی ژیان و زیندوو بوونی کۆمەڵە. هەر بۆیەشە خودا لە ئاخردا دەفەرموێ: خودا دەگەڵ عەبدانی ڕەئووفە.

بۆ بەرگری لە ڕەخنەگران کە بڵێن جا خۆ لەفزی (شرا) دە جوملەی ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ﴾دا بە واتای کڕینە، دێرەشدا دەبێ بۆ وەی مانای ئایەتەکە ڕاست و دروست بێتە ڕوو دەبێ (شرا) بە مانای (بیع) بێ، واتە فرۆشتن. بەڵێ، بێ گومان قورئانزانەکان فەرموویانە (شرا) دێرەدا بە مانای فرۆشتنە واتە (بیع)

دوای ئەوەی خودای تەعالا ئاگاداری کردینەوە بە هۆی ئایەتەکانی لەوەی کە ئیسانی دە چاکی و خراپیدا دوو دەستەن، یەکیان لە شوێن ڕەزایەتی خودادا وێڵە، یەکیشیان بۆ خۆ لەوەڕاندن و ئارەزوو و لەززەتی وێڵ و سەرگەردانە، ئەوجار خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم دێ موسوڵمانان ڕێنومایی دەکات بۆ بەرگری لە ئاژاوە و دووبەرەکیەکی کە ڕێی دروست و

ڕاستی تێدا ون دەبێ و نادۆزرێتەوە بۆ وانەی کە خوازیاری ڕێگای ڕاستن. و هەروا لە ئایەتەکانی نەختێک لەوە پێشدا باسی ئەوە کرا کە منافق دە نهێنیدا کافیر سەخت و دڵڕەقن، و دە زاهیریشدا ئینسانی دمتەڕ و زارپاراو و شیرین‌گوفتار خۆ دەنوێنن. جا ئەوجار خودای یار و یاوەری خاوەن باوەڕان بەڕاستی دێ ئاگاداری دەدا بە موسوڵمانان کە دە ئایین و ڕەفتاری ئاینتاندا ڕاست بڕۆن بێ هەڵدا و پێیدا واتە چوونە سەر و هاتنە خوار، عەرەب پێ دەڵێن (افراط و تفریط). ئەو ئاگاداریيەی خوداش بە وەسیلەی ئایەتەکانی ٢٠٨ و ٢٠٩ دێنە جێ. بۆ ڕاستی ئەو بابەت و مەبەستانە ئەوە دەچینە خزمەتیان:

﴿٢٠٨﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ادْخُلُواْ فِي السِّلْمِ كَآفَّةً وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ

ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمانو هێناوە بە خودایەتی خودا بە ڕێکوپێکی و تێکڕایی و گورجوگۆڵی وەرنە سەف و ڕیزی ئیسلامەتیەوە، وەشوێن هەنگاوەکانی شەیتان کە پڕپڕ لە پلانن مەکەون، چونکە شەیتان بە ڕاشکاوی دوژمنتانە، لێو دەخەفتێ بتانخاتە ناو داو و تەڵە.

﴿٢٠٩﴾ فَإِن زَلَلْتُمْ مِّن بَعْدِ مَا جَاءتْكُمُ الْبَيِّنَاتُ فَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ

ئەگەر هاتوو هەڵخلیسکان و تلاسابوون پاش ئەو هەموو بەڵگە و بورهانانەی خودا بۆی ناردن و پێی دان، ئەوە باش تێبگەن و بزانن و بن گوێتان کەوێ، خودا (ئاگادارتانە) و زاڵە بە سەر تۆڵە و کارەکانیشی بەجێ‌وڕێیە.

## پەیڕەوی کردن لە شەیتان

**پوختەی مەبەست لەو دوو ئایەتە پیرۆزانە:** ئەی ئەوانەی بەڕاستی ئیمانو بە خودا و کارەکانی خودا هەیە، بچنە ڕیز و سەفی ئیسلامەوە و ئاڵای ئیسلام و برایەتی و پێکەوە بوون هەڵکەن و دەست بدەنە ناو دەستی یەک و دووبەرەکی ڕاونێن و قاودەن، مەکەونە شوێن هەنگاوەکانی نەفس و هەوای شەیتان، چونکە شەیتان بەڕاستی دوژمنێکی وایە هەر لە ڕۆژی هاتنی ئینسان بۆ ناو مەیدانی ژیانەوە کاری تەنیا ڕاکێشانی ئینسان بووە بۆ ناو زەل و زۆنگی چارەڕەشی و ڕووڕەشی لای خەڵک و خودا. ئەگەر سەیری مێژووی ڕابردووان بکرێ و سرنجێکی حەکیمانە و ژیرانەی بدرێتێ، بە ڕوونی چاو دەکرێ (طاغوت و جبت و مترفین) کە فریوخواردەی دەستی شەیتانن، چییان دەگەڵ خۆ بردووە و چیشیان بەجێ هێشتووە.

بە کوردی و بە کورتی: خودا پێمان دەڵێ ﴿وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ﴾ (بقرە: ١٠٣) **واتە دەست بگرن بە ئایین و یاسا و بەرنامەی خودا بە تێکڕایی، پرژ و بڵاو مەبن بێر و بەوێدا.** گورگ لە حەیوانی هەڵبڕاو لە مێگەل دە کەمیندایە.

**بۆ ئاگاداری:** جوو بۆ کرانە ئاردی ناو درک و داڵانەوە، پرژ و بڵاو و پەڕەوازەی هەندەران بوون؟ خۆ لە هەوەڵەوە تاقە یەک گەل بوون ئەوەها ئەسپی تۆڕی سەرکەشی هەوا و ئارەزوو و نەفسی شەیتانی بوو وای پێ کردن لە دنیا و دینی کردن تەوراتی ئەساسنامەی ئایینەکەیان پێ زیاد و کەم کردن دەستی پێ تێ وەردان هەچی بە زەرەری نەفس و هەوایان با پێی فڕێ دەدان و هەچی بە قازانجیشیان با، دانهێشتەوە، وەک بەشی زۆری حاکمانی ئەوڕۆ مانای ئایەتەکان وا لێ دەکەن چونکە لە دەستیان نایە کەلیمەکان زیاد و کەم کەن.

هێندێک لە قورئانزانەکان لە بەر ئەوەی کەلیمەی (سلم)یان بە مانای ئیسلام تەعبیر کردۆتەوە ئیشکالیان هێناوەتە ڕوو چونکە بەو پێیە دەبێ مانای ئایەتەکە ئاوا بەراوەرد کەین: ئەی ئەوانەی ئیمانو هەیە وەرن ببنە ئیسلام. دە دیارە ئاوا مانا کردن ئەو ئیشکالە دێنێتە ڕوو: ئیمان واتە ئیسلام. لەو لاشەوە بکوترێ وەرە ببە بە ئیسلام ئاوای لێ دێ: ئیسلام وەرە ببە بە ئیسلام. دە دیارە ئەوە بۆ مانای قورئانی خاوەن بەلاغەت و ڕەوان و بێ گرێوگۆڵ ئیشکالە و ناڕەوایە. جا بۆیە هێندێک دێ لە قورئانزانەکان هاتوون بۆ بەرگری لەو ئیشکالە مانای ئەو ئایەتەیان هێناوە و بردووە بەو شێوەیە:

١. هێندێک کە پێیان وایە (آمنوا) دەگەڵ ئەو منافقانەیەتی کە بە درۆ ئیمانیان لە خۆ نیشان داوە، بۆیە خودا پێیان دەڵێ: ئەی ئەوانەی تاجی ئیمانو بە درۆ لە سەر ناوە! وەرن بەڕاستی داخڵی ئایینی ئیسلامی ڕاست و دروست و سەلیم بن وە دوای هەنگاوە بەدرۆکانی شەیتان مەکەون، وەک ئەوڕۆ بە درۆ ناوی خۆتان ناوە خاوەن ئیمان. ئەوانەش بۆ ئەو جۆرە مانا و تەعبیراتە بەڵگەیان ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ...﴾ی ئایەتی ٢٠٤ە، چونکە ئەو ئایەتە باسی منافقانە، دەبێ ئەوەش هەر دەگەڵ منافقان بێ.

٢. هەروا هێندێکی دیکە هەن دەڵێن ئەو ئایەتی ٢٠٨ لە بارەی تایفەیەک لە موسوڵمانانی ئەهلی کتێب هاتووە کە لە واندا «عبدالله بن سلام» و یارانی ئەو دیاری دەدەن. ئەوانە ئیمانیان بە پێغەمبەر هێنابوو بەڵام لە بەر لە لا گەورەبوونی ئایینی مووسا ڕۆژی شەممەیان هەر ڕێز لێ دەگرت و گۆشتی وشتر و شیریان هەر بە حەرام دادەنا. خودای تەعالا بۆ وەی بە تەواوی

داخڵی ئایینی مـحەمەد واتە ئیسـلام بـن، لەو ئیشـە نـاڕەوا و ناپەسـەندە لادەن ئەو ئـایەی ۲۰۸ دابەزاند و پێی کوتن (کافـة) واتە بە تەواوی ئاکارەکـانی ئیسـلادم قبـووڵ کەن تەبەعیەتـی لـێ بکەن.

۳. هێندێکی دەڵێن ئەو ئایەتە ڕووی دە ئەهلی کتێبەکانی تەوڕات و ئینجیلە، کە ئیمانیان بە پێغەمبەری نەهێنابوو و نەیاندەهێنا، دەشیانکوت باوەڕمان بە تەورات و ئینجیلیشە، جا خـودای تەعالا ڕوویان تێ دەکات و دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی بە کتێبەکانی پێشێ واتە تەوڕات و ئیجیل ئیمانو هێناوە و شوێنیان دەکەون و ئیتاعەیان لێ دەکەن ﴿ادْخُلُواْ فِي السِّلْمِ كَآفَّةً﴾ داخڵی ئیسلام بن بە تەواوی؛ واتە دە ئیتاعە کردنتان لە کتێبەکانی پێشێ کامڵ بن و تەواو بن کە پێتان کـوتراوە دەواندا ئیتاعە لە محەمەدﷺ و ئایینەکەی بکەن بە تەواوی.

لەو جۆرە نەزەرانە لە سەر ئایەتی ۲۰۸ زۆر هەن بەڵام دێرەدا بەو چەند نموونانە چاوپۆشـی دەکەین لەوانی دیکە.

ئەو ئـایەتی ۲۰۹ ڕازێکـی دە بنـدا شـاراوەتەوە و تroوسـکەی دێ ئەویـش ئەوەیە: خـودا دەفەرموێ ئینحراف و ئاوەژوو بوونەوە و خلیسکان پاشی ئاگـاداری و شـارەزایی بە عـاقیبەتی کار و کردەوەی چاک و خراپەیە. جا لە سەر ئەو یاسا و ئەساسە دەبێ ڕۆژی خۆتـان مجـازاتی (علمایان) بەو شەرتەی خۆی تووشی گوناهی بکـات، چـونکە تـاوانەکەی لە سـەر زانسـت و زانیارییە زۆر گەورەترە لە تاوانی ئەوانەی کە بەبێ زانست لە سەر عاقیبەتی خەتـا و تـاوانەکەن. بە کوردی و بە کورتی، زانا و نەزان وەک یەک نابن و نین.

ئەوجار بەرجەوەندی ئەوەی دەبین: کەسانێکی کە لە ڕووی زانستەوە عەمدەن شوێن خراپە و کاری ناڕەوا دەکەون و چاوەڕوانی پاداشی چاکیش دەکەن، دەبێ ئەقڵ و شعوور چۆن تەعبیر لەو کارە بدەنەوە؟ ئایا دەبێ وا تێبگەن خودا هێنـدە بەبەزە و بەبەخشـە ئەوانەی کە تاتێنیـان لە بەردایە و دەتوانن ببڕن و بخوڕن زەود نابن و ناپرینێگنەوە و هەر دەبڕن و دەخوڕن، دەیانبەخشێ هەروەک ئەوانەی کە دایم دە خۆ پارازتندان؟ وەیا وا تێـدەگەن سـەرباقی ئەو هەمـوو نیشـانە و بەڵگـانەی وەک ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا﴾ خـودا داویە و نیشـانی داوە ڕۆژی ئاخرەت و حیساب هەر قسەن و فشەن؟ و زیندوو بوونەوەش هەر فشـەیە؟ دیـارە ئەگەر واز لە ڕاوێژ و نیشانە وبەڵگان بێنن و نەوێـرین تەعبیـر لە دڵ و دەروون وەدەیـن و حەواڵە بە خـودای کەین زانست و ئاگاداری لە سەر دڵ و دەروون دەبێ هەر ئەوەندە بڵێین ڕەش و سپی وەک یەک

نین، ئەوی دی حەواڵە بە خودا کەین.

جا لەو ڕێیەوە خودای حەکیم ئایەتی ۲۱۰ وەک پلارێک و یا بڵێین وەک تەوسێک دەیهاوێتە بنان‌گوێی ئەوانەی بە ڕواڵەت دەڵێن موسوڵمانین کەچی ئەوەی ئیسلام نایهەوێ و نایقۆزێتەوە ئەوی دەکەن. با بچینە خزمەت پلارەکە واتە ئایەتی ۲۱۰:

﴿٢١٠﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ أَن يَأْتِيَهُمُ اللّهُ فِي ظُلَلٍ مِّنَ الْغَمَامِ وَالْمَلآئِكَةُ وَقُضِيَ الأَمْرُ وَإِلَى اللّهِ تُرْجَعُ الأمُورُ

**ئەوانە هیچی دی چاوەڕوان نین، ئەوە نەبێ کە سزای خودا لە دووتوێی سێبەری هەورێکی سپیدا و فریشتەکانی خوداش ڕوویان تێکا، تازە کار سەری گرتووە و لە کار ترازاوە و کارەکانیش هەر بەرەو خودا و بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە.**

## چی بچێنی، هەر ئەوە دەدروویەوە!

**ئاوڕ وەسەر دانەوەیەک:** ئایا کەکرەچێن و دڕووچێن لە دڕوو و کەکرە بەولاوە چاوەڕوانی چیی دی دەکەن و دەکرێ؟ ئەوانە لە چاوەڕوانی سزا و پاداشی کار و کردەوەیان زیاد بەولاوە چ چاوەڕوانی دەکەن؟ ئەوانە هەر دەبێ هەر ئەوەیان چاوەڕوانی بێ کە لە ناو چەند توێ‌توێی هەوری سپیدا سزاکەی خۆیان و بەرهەمی کردەوەکەی خۆیان بۆ بێ و هەروا دەگەڵ فرشتەی سزا و تۆڵەیان، چونکە شتەکە لە بەرەگە چۆتە دەرێ و کار لە کار ترازاوە، لەوە زیاد هیچ شتێک بۆ داد و هاوار و فریاکەوتن و داد و چارە نەماوە و ناتوانێ ببێ، چونکە قاتڵ لە تەنافی پەتی ئەتسۆی زیاد چی دی چاوەڕوانە!

دەشکرێ ئاواشی بۆ بچین، بڵێین: ئایا ئەوانە چاوەڕوانی ئەوە دەکەن خودا بە فرشتەوە لە نێوانی هەوری سپی ڕەحمەتەوە سێبەردەر بۆ لایان بێت و دووبارە دەلیل و بورهان و نیشاەکانی خۆی بە ڕوونتر لەوانەی پێشوو بێنێ دەگەڵ خۆ. ئەو خەیاڵ و چاوەڕوانەیان محاڵە و خەیاڵە و کەچەڵ کڵاوە. چونکە خودای مەزن لە هیچ ئاگاداری و ڕێنوێنیەکدا کۆتایی نەکردووە، ئەوی چووش، نایخاتەوە دوا و هەچی هەیە و دەشبێ هەر بۆ لای ئەو بۆ حیساب دەگەڕێتەوە.

بە کورتی و بە کوردی: خودای تەعالا بە پوختی و بە پاراوی و تێروتەسەلی هەموو شتێکی تێگەیاندوون و وەسیلەی جێ‌بەجێ کردنی شتەکانیشی بە تەسەلی داونێ، واش ئیتاعە ناکەن و دەیهاوێنە پاش گوێیان و وەشوێن ئارەزووی دەکەون. کاتێ کە دەستیان لە پنچکان بڕا و کار لە

کار ترازا، ئەوجار چاوەڕوانی ئەوە دەکەن دووبارە خودا دەزگا و بار و بارەگایان بۆ وەڕازێنێ و بۆ خۆی لە باتی ئایەتەکان و پێغەمبەرەکانی بێتە لایان پێیان بڵێ جا ئەوجار ئەوە بۆخۆم هاتمە لاتان دەبێ بە قسەم بکەن و ئیتاعەم بکەن. ئەوە بێ گومان خەیاڵی پووچە. جا بۆیە دە ئایەتی ۲۰۹دا خودا بە شێوەی هەڕەشە و لۆمە ڕوویان تێدەکا و دووبارە خودا بە تەوسەوە بە وەسیلەی ئایەتی ۲۱۰ پێیان دەڵێتەوە لە سەر ئەو حاڵەتەشیانڕا چاوەڕوانی ئەوە دەکەن جەزای چاک وەرگرن لە باتی جەزای کردارە ناحەزەکانیان؟ ئەوە لە یاسا و دابی خودا بەدوورە. کەسێکی کە لێرە دڵی پاراو نەبوو بچێتە لای تەفسیری کەبیر دەراوی پان و پۆڕترە بەڵکە لەوێ بە تێر و تەسەلی پاراو بێ.

**ئاگاداری:** بۆ ئەوانەی بە بیر و ژیرن و چاوی گەش و وردبین و حەقبینیان هەیە و هەستی بەزە و عەداڵەت و ئینسافیشیان لە سەرووی هەموو کارەکانیانەوە چاوەدێرە ئەو ئایەتانە واتە لە ئایەتی ۲۰۴ەوە هەتا ۲۱۰ هاوار و بانگاوازێکی زۆر بەتین و تەوژمن کە لە سەروبەری ئینسانانی بەهەست و هۆش زیادن. چونکە ئەوە نیشان دەدەن بە بڕوادارن: واز بێنن و دەس هەڵگرن لە ئاژاوە و ئاگردانی وڵات و وێران کردنی هێلانەی گیانلەبەران و هەتک و ناموس دڕین و فڕاندنی خاوەن ناموسان، تێبگەن هەر ڕۆژەی ئەمرازێکی تازەی قڕکەر دێتە ڕوو، دنیاش دەبێتە یەک کۆگە نەوت و بێنزین و گاز و باڕووت، ئەوکات ئەو بێبەراوەردیەی ئێوەی ئینسان بە هەڵەیەک دە چرکەیەکدا وڵات دەکاتە دۆزەخ وەک وڵاتەکانی عێراق و سووریە و ئەفغانستان و ...، دنیا دەبێتە تەمێکی تاریک و تنۆک وەک ئایەتی ۹ سوورەی دوخان ئاماژەی وەلا کردووەوە، ئەوەش ئایەتەکە، زەینی دەنێ: ﴿بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ يَلْعَبُونَ * فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ * يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (دخان: ۹/۱۰/۱۱) واتە: **نەخێر ئەوانە لە ناو شک و گوماندا گەمە دەکەن * کەواتە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بکە ئاسمان دووکەڵێکی ئاشکرا بەدی دێنێ * هەموو خەڵکی دادەپۆشێ، ئەوە سزایەکی بەژانە.**

جوملەی ﴿وَإِلَى اللّـهِ تُرْجَعُ الأمُورُ﴾ بە قەولی خاوەنی تەفسیری «ابوسعود» ئەوە جوملەیەکی سەربەخۆیە، پاڵی نەداوەتەوە بە پێش و پاش (مستأنفه)؛ یانی کاتێ خودا و فرشتە دێن ئیدی کار لە کار ترازانە، تەکلیف ئاشکرانە، تازە بۆ کەس مەودا و مۆڵەتی گەڕانەوە و نەجات و پەنا نامێنێ، جا لە سەر ئەو یاسا و دەستوورە ئەوانە تا ئەو ڕۆژە چارەساز و سەرنویشتسازە هەر مل پێوە دەنێن کوێرانە هەچی وەبەر بێ وەک مێش و محانج یان گورزی

کوێری هەر دەیهاوێن، دەبێ غەیری ژیلەمۆی ئاگر بە خۆدا کردن چیدی چاوەڕوان نەکەن، چونکە بۆخۆیان چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بوون پێیان کوتراوە دە پێشدا بە وەسیلەی قورئان و پێغەمبەران ﴿وَإِلَى اللّهِ تُرْجَعُ الأُمُورُ﴾ هەچی هەیە بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە، نە بۆ لایەکی دیکە تاکوو بۆ لای وی پەنا ببرێ. و گەڕانەوەش لە سەر ئەساسی تەنزیم و دەبەریەکنانی کائینات و دەزگاکانی دوو وەرزی دنیا و قیامەت بەرەو دوا گەڕانەوەی نییە و نابێ. هەرچی ڕۆیشت و ئاوا بوو، ناگەڕێتەوە و هەڵنایەتەوە. مەگەر چەرخوخولی ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە، ئەوانیش دە کاری گەڕاندان چونکە ئەوانیش ئەگەر لەو چەرخ و ئاوابوونی تازە هەڵنایەنەوە ناکەونە چەرخوخول، جا مەگەر لەو وەرزی دی بۆ وەرزی دی.

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم هەموو ئامراز و وەسیلەیەک وەک ئەقڵ و هەست و شعوور بێ، دە ئیختیاری ئینسانی ناوە کە لەو کورتە سەفەر و کاروانەی وەرزی دنیا ڕێ دەربەرێ و خۆ ون نەکا، جا ئەگەر خۆ ون کا لە بێ کەرەسەیی و بێ وەسیلەیی نییە بەڵکە لە گوێ پێنەدانیانە، پیاوی خاوەن چەک ئەگەر چەک کرێ خەتا لە چەکەکە نییە، خەتا لە خاوەن چەکە و دە کاری نەهێناوە. ئەو ئایەتانەی ٢٠٩ و ٢١٠ هەر ئەوە دەڵێن: هەر شتەی دەبێ دە کات و بەرەگەی خۆیدا دەکار کرێ. دەنا شتەکە ئەگەر لە بەرەگە چۆ دەرێ، تازە هەزار هاوار بە شاییێکە. خودا بە ئینسانی دەڵێ: ئەی ئەوانەی کە داوای ئیمان دەکەن! هەمووتان بە تێکڕایی وەرنە سەر سفرەی ئاشتی و تەبایی و سازش، و لە هەنگاوەکانی شەیتان واز بێنن و دوای مەکەون. بە کوردی چاک بن و ئەمر بە چاکە بکەن، خراپ مەبن و نەهی لە خراپە بکەن تاکوو نەکەونە بەر شالاوی هەڕەشەی ئایەتی ٢٠٩ی بەقەرە. ئەودەم دەڵێی چی لە بەرامبەر ﴿فَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ تێبگەن بە حەققەت خودا بەتوانایە و کاریش دە جێی خۆیدایە پێت دەڵێ ئایەتی ٢١٠ت دە بن گوێ دەکوتێ: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ أَن يَأْتِيَهُمُ اللّهُ فِي ظُلَلٍ مِّنَ الْغَمَامِ﴾ ئەوکات ئەگەر هەر نەهاتیە بوار و بازێ، دووبارە بە هەڕەشەوە ئاگادارت دەکاتەوە وەک دە ئایەتی ٢١١دا هەستی پێ دەکرێ کە دەفەرموێ: دا پرسیار بکەن لە بەنیئیسرائیل واتە لەو حازریانە کە ئێمە چۆن بۆ پێشینەکانی وان نیشانە و بەڵگەمان بۆ ڕانان و هێنان و ئینکاری و حاشایان لێ کردن تا خۆیان تووشی عەزاب کرد جا ئەو کارەساتە هۆشدار و هەڕەشەیە و ئاگادارییە بۆ وەی ئەگەر بێتوو بخلیسکێنەوە و لادەن لە قبووڵ کردنی ئیتاعە لە خودا، بە دەردی ڕابردووەکانتان گیرۆدە و گرفتار دەبن. جا بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢١١:

﴿٢١١﴾ سَلْ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَمْ آتَيْنَاهُم مِّنْ آيَةٍ بَيِّنَةٍ وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ اللَّهِ مِن بَعْدِ مَا جَاءَتْهُ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ

**(دێرەدا خودا بە پێغەمبەر دەفەرموێ): لە نەوەی ئیسـرائیل بپرسە و بزانە چەند موعجیزەی ئاشکرا و ڕوونمان بە پێشنیانیان نیشان دان بۆ ئەوەی ڕێگای ڕاست بگرنە بەر بەڵام ئەوان هەر یاخی بوون، بۆیە ئێمەش دوچاری چەندین جۆر ڕەزالەت و سووکایەتیمان کردن، جا ئەوانەی ڕێگای چەوت بگرنە بەر، پاش ئەوەی کە ڕێگای ڕاستیان نیشان دراوە ئەوە حاڵیان وەکوو حاڵی ئەوانەی لێ دێت، بێ گومان سزادانی خودا پڕئێش و ئازارە لە هەر دوو لا.**

## نیعمەتەکانی خودا بۆ بەنیئیسرائیل

**تێڕوانین و ئاوڕ وەسەر دانەوە:** ئەی پێغەمبەر! لە جوولەکەی نەوەی یەعقووب بپرسە چەندمان پێغەمبەر بە بەڵگە و نیشانەکانی ڕوون و ئاشکرا ناردنە ناویان و چەندم ئاگاداری پێ دان بەڵام لە بەر لاساریانیان لەو گوێیەیان نەیانـدا بەو گوێیەیان، دەگەڵ ئەوەی کە وەریان نەگرتن، هێندێکیشیان کە بە قازانج نەدەزانی لە فەرموودەکانی خودا، گۆڕییانن بە قازانیجان بە خەیاڵی خۆیان.

ئەگەر دە ئاکاری جوولەکە بڕوانـدرێ بەو جۆرەی کە چاک بوون دە ڕوحیەی واندا نەبیندراوە و نابیندرێ هەزار هێندەی دیش ئەگەر ئاگادارییان بدرێتێ؟ دێینە سەر ئەو باوەڕەی دێرەدا واتە ئەو پرسیارەی باریتەعالا لە بەنیئیسرائیل خودا دەگەڵ وانی نییە، بەڵکە هۆشدارە بۆ موسوڵمانان کە ئەی موسڵمان لە بیرو نەچێتەوە کە خودا بارەها بە وەسیلەی مووسا و هەروا چەن جاران بە هۆی موعجیزە ئاگاداری بە جوولەکە دا هەر چاک نەبوون و لە سەرەڕۆیی و زۆرداری خۆیان پاشەکشەیان نەکرد، ئەئەوە بە نیشانەی نەگبەتی و نەهاتی و چارەڕەشی گەلی جوولەکە هاتە ڕوو، جا هەر گەلێکیش ئەوەی ئاکار بێ، هەر ئەوەش چارەی دواڕۆژی دەبێ.

ئەو ئایەتانەی کە لە ئایەتی ٢٠٤ڕا تا دەگاتە ئایەتی ٢١٠ کە دەبنە ٧ ئایەت، هۆشدارێکی زۆر توند و هەڕەشەیەکی زۆر ئاشکران بۆ موسوڵمانان، بەڵام بە داخەوە دەگەڵ دڵانی سەخت و ڕەشهەڵگەڕاو بە تاوان هیچ ناکرێ چونکە لەزەت و ئارەزوو و هەوەسی دنیا وای دەورەی دڵی تەنیوە ڕێگا و کەلێن و دەرۆی ئەوەی بۆ نەهێشتۆتەوە، نووکی تیژی وەعز و ئیرشاد و ڕێنوێنی خۆ بگەیێنێتە چاوەی دڵی بیر و ژیری. ئەو زڕە موسوڵمانانە بە خۆیان نەزانیوە کە زۆر لە جوولەکە خراپتریان دەگەڵ خۆ و ئایینی خۆیان کردووە، ئەو قورئانەی کە هەموو ڕۆژێ دەوری

دەکرێتەوە و تەفسیر دەکرێتەوە، بە قسەی ناکەن ﴿مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا﴾ (مائدە: ٣٢) **بێ گومان کەسێ بکوژێ یەکێ، بێ ئەوەی لە تۆڵەی کوشتنی کەسێکدا بێ یاخۆ خراپەکارییەکی کۆمەڵایەتی لە سەر زەویدا ئەنجام دابێ، هەر وەکوو ئەوە وایە هەموو خەڵکی بە تێکڕایی کوشتبێ.**

دەجا با ئاوڕ وەدرێ تا ئەوە بە چاوی کوێریش چاو کرێ: کۆمەڵکوژی و سەربڕین و زگدڕین و هەڵاوەسران و پەرتەوازە کران و نامووس فڕاندن و بێ ئابڕوو کردنی وا لە جانتای کام جوولەکە و گاور و دڕندەیەکدا چاو دەکرێ؟ خوێن ڕژا، حەیا بڕا، نامووس دزا، بەرهەم دزا، یاخی هەر دانەڕزا، ئەوەی ئەوەی ئاوا چاو نەکا بێ گومان چاوەی چاوی ئیمان و دین و کەرامەت و ویژدانی ئینسانی کوێرە.

جوملەی ﴿مِن بَعْدِ مَا جَاءتْهُ﴾ ئەگەر ئاوای تەعبیر لێ بدەینەوە: واتە ئەو ئایەتانەی کە بۆ دڵانی ژیر و خاوەن هەست، نیعمەتن. ئەوکات مانایەکە ئاوای لێ دێ: پاش ئەوەی کە تێگەیشتن و زانینی مانای ئایەتەکان بۆیان مومکین و ڕەخسابوو، وەیا دەڵێن پاش ئەوەی کە دە مانای ئایەتەکان گەیشتبوون ئەمجار گۆڕییانن، واتە وەک ئاماژە بەو جۆرە واقیعانە دەکا ئایەتی ٧٥ی بەقەرە و دەفەرموێ: ﴿وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلاَمَ اللّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ **ئەوانە هەندێکیان فەرمووەدەی خودایان دەبیست و پاش ئەوەی کە تێیدە گەیشتن دەیانگۆڕی دەگەڵ ئەوەشدا دەیانزانی.** جا ئەو جۆرە نەیە: (فَأَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ). هەندێک لە قورئانزانەکان کوتوویانە بۆ وەی مانای ئایەتەکە تایبەتی ئەوان جۆرە کەسانە بێ، کەلیمەی (لَهُ) دەگەڵە کەواتە (شَدِيدُ الْعِقَابِ لَهُ)یە. لە کتێبی (دلائل الاعجاز)دا کوتراوە: ئەو (لە)وەی نەبێ، ڕەواترە، چونکە ئەو عەزابە گشتییە بۆ هەموو یاغی و سەرەڕۆیانە.

ئەو پرسیارە لە سەر ئەساسی نەزەری هەندێک لە قورئانزانان ئەگەرچی ڕووی دە بەنیئیسرایلەکانە بەڵام دەگەڵ هەموو ئەو کەسانەیەتی کە قورئانزانن و گوێبیسن و موسوڵمانن، چونکە پرسیارێکی سەرزەنشی و لۆمەییە بۆ هەموو کەسانی شێلگیر و ئیهانەچی.

ئەقڵ و هەست و شعوور حەقی خۆیانە پرسیار بکەن دێرەدا ئەوان جۆرە کەسانەی بەو شێوە خراپەی باسیان کرا و دە واقیعدا ئاواشن، بۆچی نازانن و سەلیقەیان پێ ناشکێ کە ئاوا ناحەزی بەرچاوی خودا و خەڵکی خودان، دەگەڵ ئەوەی ئەقڵیشیان هەیە و دەرکی چاک و خراپیشیان لێ نەگیراوە؟! دەبێ لە وەڵامدا بکوترێ: کە خودا دە ئایەتی ٢١٢دا فەرموویەتی:

ئەگەر ورد ورد بوونەوەی لە سەر بکرێ و دابێژرێ بە داشگیر و کەو و هێڵەگی زانست و سەلیقە، حەق و ڕاستی دەدۆزرێتەوە. ئەوەش ئایەتی ٢١٢ زەینی دەیە و هەڵیسەنگێنە.

﴿٢١٢﴾ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ اتَّقَواْ فَوْقَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَاء بِغَيْرِ حِسَابٍ

ڕازێنراوەتەوە بۆ کافران دنیا بە جوانی. چونکە ئەوان دە دنیادا لە لەززەت و خۆشگوزەرانی و هەوا و هەوەس لەوەڕاندن بەولاوە هیچ مەبەستێکی دیکەیان نییە و ناوێ. هەربۆیە فشە و گاڵتە نەبێ بە ئیماندارانیان نایە. جا ئەو بێباوەڕانە هەچەندی ساماندار ببوایەن، بۆ دوارۆژیان هیچ سوودی نییە و دەردێکیان دەوا ناکا. لە ڕۆژی قیامەتا پلە و پایەی خاوەن ئیمانان لە سەرووی ئەوانەیە و وەهەروا ڕەحمەتی خوداش دەڕژێتە سەریان. ماڵ و سامانی دنیا پلەی قیامەتێت ناباتەسەرێ مەگەر بە خودا بێ. خودا ڕزق و ڕۆزی بێمنەت و بێ سنوور دەبەخشێ بۆ هەر کەسێکی وازی لێ بێ. بێباوەڕ بێ ئەو کەسە یان بەباوەڕ بێ.

## جوانی سەر زەوی بۆ تاقی کردنەوەیە

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی بە هەستەوە:** دنیا بە ژیانی خۆشی ڕازاوەتەوە لای ئەو کەسانەی کە ژینپەرستن و خودانەویستن. یانی خۆشەویستی دنیا سەری پێ داخستوون و ملی پێ نەوی کردوون دە بەرابەر هەمووی ئەو ملهوڕ و ناسپاس و خوێنمژ و حەیا و کەرامەت شکێنانە دەو زەمانەدا. لە ترسی ئەوەی سامانەکەیان مەحفووز بێ ئەگەر دەسدرێژییێکی بێشەرم و حەیا دەستی بۆ درێژ کا، چۆرتەی ناکا و مەکەی ناکا، دەستی نامەردی بە کڵاوی حیزانەیدا دەگرێ و دەڵێ حیزی و سڵامەت. جا بێگومان ئینسان بۆ ئەو جۆرە ژیانە نەخراوەتە سەر زەوی و نەخوڵقاوە، بەڵکە بۆ ڕاپەڕینە بۆ دیفاع لە مافە، بۆ پارازتنی کەرامەتە، بۆ پێکهێنانی ئەمن و ئاسایشە بۆ کۆمەڵ. ئەوانەن عیبادەت و خوداناسی، ئەگەر یەکێک ڕاستەوە بێ بڵێ چ دەکەی لەو ئایەتە پیرۆزەی ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (ذاریات: ٥٦) ئەمن جنۆکە و مرۆم دروست نەکردووە تەنیا بۆ پەرستنم نەبێ. ئەگەر ئەو کەسە وا تێبگا لە پەرستن واتە: نوێژ و ڕۆژوو و ... سەرداخستنی لە مزگەوتەکان و دنیاش ئاوری تێبەربێ و ئاو بیبا و ئەتۆش سەر لە سەر سوژدە لانەبەی لە بەر خودا، ئەوە بێگومان تێی نەگەیوە چونکە خوداپەرستی خزمەت بە ئینسانە، نەجاتی ئینسانە، سەرکوتانی زاڵمانە، پارازتنی ئایین و شەرەفی ئینسانە.

ئەگەر وەک دەڵێم و کوتم وا نەبێ خوداپەرستی، دەبا پێغەمبەران هەر دە غار و ئەشکەوت

و مزگەوتاندا عیبادەتیان کردبایە، ئیبراهیم ڕانەپەڕیبایە لە نەمرووود؛ مووسا ڕانەپەڕیبا لە فیرعەون، محەمەدﷺ ڕانەپەڕیبا لە موشـریکانی مەککە. دەبێ ئەقڵ و شعوور ئەوە باش وەقۆزن ڕێبەری و سەرکەشی بۆ نەجـاتی ئینسـان لە تاریکستانی زوڵـم و زرۆداری یـاخیگەران خوداپەرسـتی و خوداناسی و خۆناسییە و ڕێبازی پێغەمبەرانە.

جوانی و ڕازاوەیی دنیا بۆ تاقی کردنەوەیە ئاخۆ کێ دەتوانێ لە نـاو ئەو هەمـوو خۆشـی و جوانیەدا فریو نەخوا و خۆی نەدۆڕێنێ و خودای وەلا نەنێ؟ بۆ بەقا کردن بەو ڕاستییە دەچیـنە خزمەت ئایەتی ٧ و ٨ی سوورەی کەهف: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا * وَإِنَّا لَجَاعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا﴾ **ئەوەی لە سـەر زەویـدایە ئـێمە کە کردوومـانەتە هـۆی جوانی و ڕازاوەیی زەوی تا ئینسان تاقی کەینەوە پێی (ئایا کـام لە ئینسـانەکان دەو حـاڵەتە پـڕ لەززەت و خۆشیەدا بە فریو ناچێ و) کار و کردەوەی جوان ئەنجام دەدا تێیدا. دە دیارە لە خزمەت بە ئینسـانی عەمەل جوانتر نیە و نابێ لە نەجاتی ئینسان جوانتر عەمەل نابێ، چونکە ئینسان ئەمـانەت هەڵگـرە. (٧) بەڕاسـتی هەچی لە سەر ئەو زەوییەدایە (لە زینەت و جوانی) تەختی دەکەن و دەیکەینەوە دەشتێکی قاقڕ و بێ گژ و گیا. (٨)**

ئەوە هەر دێرەدا دەرکەوت بەغەیرەز کرداری چاک هیچ شت لە سەر ئەو زەویە مایەی نییە، دەبێ خۆ بەخت کردن لە پێناو خزمەت بە ئینساندا بێ نەک دە پێناو خۆشی و لەززەت و هەوا و هەوەسی دنیا.

بەڵێ، ئایینی خودا بەرگری ناکا و مانیع نییە بۆ خۆشی ژیانی دنیا چونکە بۆ هەمـوو کەس ڕەوایە بژی بە خۆشی و ئازادی و سەربەسـتی لەو دنیـایەدا بەڵام هەر ئـاوا بەر بەرەڵا نیـیە، نـا؛ بەڵکە دەبێ ماف و کەرامەت و سەروەری کەسی تێدا پێشێل نەکـرێ و دەس‌درێـژی بـۆ مـافی خودا پێداوی کەس نەکرێ، هەروا سەربەخۆ لێ‌نەنیشێ، دەبێ سپاس و پێزانینی خۆی لە سـەر ئەو نیعمەتانە بۆ خودا دەرببڕێ. و هەروا بە هۆی بوونی دنیا باغر و بـادی‌هەوا نەبـێ، گـاڵتە بە ئیمانداران بکا وەک خودا دەفەرموێ ﴿وَيَسْخَرُونَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ **واتە گاڵتە نەبـێ بە ئیهانـدارانیا.** بە کوردی، دنیاپەرست بەقای بە ئەرزشی مەعنەوی و حەیاتی ئوخرەوی نییە.

دەبێ ئەوە بزاندرێ: هۆی دابەزینی ئایەتی ٢١٢ چ بووە و چییە؟ هۆیەکەی ئەوەیە: خودای تەعالا حاڵی ئەو کەسانەی کە نیعمەت و بەرەکەتەکانی خـودا پێـی بەخشـیویان ئـاڵوگۆڕ پـێ کردن بە کفر و هەوا و هەوەسی شەیتانی لە پێشدا کە ڕایگەیانـدن و عـالەمی تێگەیانـدن ئەوانە کەسانێک بوون ئینکاری قورئان و پێغەمبەریان دەکرد واتە ئەوانە بە سەر حەقدا بازیان دا بۆ لای

ناحەق. خودای تەعالاش هات بـۆ ئاگـاداری و دەرس لـێ وەرگـرتن لەو بـازدانە نـابەحەق و ناڕەوایانە هۆیەکەی ڕاگەیێنێ بە ئینسان، واتە ئەوەی دەتـوانێ بە هێـزی خـۆی حەق لە ئینسـان بستێنێ و بفڕێنێ و ناحەقی پێ بفرۆشێ، زینەت و لەززەت و خۆشی دنیایە. ئەگەر ورد سـرنج بدرێتە ناوەرۆکی ئەو ئایەتە پیرۆزە (٢١٢) پێهەڵاکوتن و شـەجاعەتدار کردنـی موسـوڵمانانی لـێ دەردەکەوێ. چـونکە ئەوانـن بە زینەتـی دنیـا فریویـان نەخـواردووە و لە تـاقی کـردنەوەدا دەرچوون. و زەم و لۆمە و سەرکۆنەی کـافرانی لـێ دەردەکەوێ چـونکە ئەوانـن فریویـان پـێ خواردووە و لە تاقی کردنەوەیدا دەرنەچوون.

«ابن‌عباس» فەرموویەتی ئەو ئایەتە هۆی دابەزینەکەی (ابوجهل) و سەرانی قوڕەیش بوون کە فەقیرە موسوڵمانەکانیان مەسخەرە دەکردن. چونکە ئەوان بەو دەلیلە کە زۆر دوچاری دەرد و ڕەنجی دنیا ببوون و زۆریشیان پەلاماری سەروەت و سامان نەدەدا، دە کەمدەستی دارایـی دنیـا مابوونەوە، گۆیا ئەوانەش ئەوانە بوون: عبدالله بن مسعود، خباب، سالم مـوالی ابـی حـذیفه، عامر بن قهیره، ابوعبیده بن جراح. دە حاڵێکدا کە سەرانی قوڕەیش دە ناز و نیعمەتەکانی دنیادا بوون گاڵتەیان بەوانە دەکرد و دەهات. هەندێکیش کوتوویانە هۆی دابەزینـی ئەو ئـایەتە ٢١٢یە منافقەکانی وەک عبدللەبن‌ابی و هاوقەتارەکانی بوون. هۆی دابەزیـنەکەی هەرکـام لەوانە بـێ، هیچ ئیشکالێک ڕوو نادا.

## شەیتان خراپەت پێ دەکا یان هەوا؟

ئێمەی موسوڵمان دەبێ بە پێی بەراوەردێکی کە لە بەرجەوەندی قورئاندا دەستمان کەوتووە نابێ لە سەر کارە ناڕەواکانی کە بە تووشن دێـن و دەیـانکەین ڕاسـتەوخۆ شـەیتانی بە سـەبەب بزانین، چونکە شەیتان ڕەپ‌وڕوو ناتوانێ بەزۆر وەسەر داو و تەڵەت پەڕێنێ، بەڵکە ئەوە هێـزی بەهێزی نەفس و هەوای بەرەڵدا کراوی بێهەوسارە ئەو کـارانە بە ئینسـان دەکـا، لە ڕامـان و لە هەڵسەنگاندنی کەلیمەی ﴿زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ الْحَيَاةُ الدُّنْيَـا﴾دا ئەو ڕاسـتییە خـۆ نیشـان دەدا کە نەفس و هەوای بێبەندوبار و هەوسار فریوت دەدا و لێـت دەبـنە شـەیتانی وەسوەسـەچێن. و هەروا دووبارە بۆ تەئکیدی ئەو داوا ڕاستییە واتە فریـودەرە: وەسوەسـەی هەوا و هەوەسـی بـێ هەوسارە دەڕوانینە نـاو دەروون و سـیمای ئـایەتی ٧ی سـووڕەی کەهـف هەڵیدەسـەنگێنین و وەزنی دەکەین بە تەرازووی ئەقڵ و هەست و شعوور تاکوو لێی دەردەکەوێ کە زینەت و زێڕ و زەمبەری دنیا چۆن نەفس و هەوا دێننە سـەما و هەڵـپەڕین کەوا دەکەونە جـۆش و خـرۆش، بە

کەس ڕاناوەستن و دابین نابن و دانـامەزرێن: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ **بەڕاستی ئەوەی کە لە سەر زەویدایە کردوومانەتە هۆی ڕازاندنەوەی زەوی تاکوو تاقیـان کەینەوە (نەفس و هەوا و ئەقڵ و شعوور کە ئەندامی لەشـی ئینسـانن) کامیـان کـردەوەی جـوان دەکەن و (کامیان پێی فریو دەخۆن و دەکەونە بەدفەڕی و لاساری).**

## لە ڕێ هەتڵە بوون

دێرەدا زۆر ڕوون و ئاشکرایە و بە هەموو چاوێکی ئەقڵ و زانست دەبیندرێ: چییە سەبەب و هۆی لە ڕێ هەتڵەبوون. نەفسە، هەوایە، ئارەزووی لەززەتی دنیا کە بـۆت ڕازاوەتەوە کە پێـی تاقی کرێیەوە؟ کەوابێ دەبێ بڵێین بە کورتی: مریشک بۆخۆی خۆڵێ وەسەر خۆی نەکا، کەس وەسەری ناکا.

دەشبێ ئینسان ئەو خەیاڵەش نەخاتە ناو دڵ و نەینێژێ دەوێدا کە بڵێ: خودا هۆی ئەو بەزم و ڕەزمەیە کە دنیا ئاوا جوان دەکا و دڵانیشی ئاوا پێ ئاشـنا و گرفتـار دەکـا، بەڵـکە دەبـێ ئـاوا بکوترێ: (قَالُوا بَلا)ی ڕۆژی ئەزەل با هەر قسە نەبێ دەبێ عەمەل و تـاقی کردنەوەشـی دەگەڵ بێ، جا ئەو زینەتە دنیایە بـۆ تـاقی کـردنەوەی ئەو قسـەیە زەیـن دەیە ئـایەتی ١٧٢ی سـوورەی ئەعراف: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَىٰ شَهِدْنَا أَن تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَافِلِينَ﴾ خـودا هەر بە سـرشت و فیـترەت، ئیمانی بە خودا و چاکە و خراپە ناژتۆت و چاندوویەتی ناو ناوی هەست و دەروونی ئینسانەوە، و ئینسان بەو سـروشت و فیترەتە پەیمانی دەگەڵ خودا بەستووە و ئەو پەیـمانەش پشتاوپشـتی بەرەی ئینسان هاتووە و نەپساوەتەوە و ناپسێتەوە تـا ئینسـان تەواو دەبـێ (خوداناسـی) و هەروا ڕوحی ئینسان بە ئەقڵ و شعوور و هەستەوە و یا بڵێین سـرشتی ئینسانی کە بـریتییە لە دەرک و هەست و ئەقڵ و شعوور ﴿وەک فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ (شمس: ٨) خودا خراپەکاری و چـاکە و پارێزکاری خۆی چکاندە ناو هەستەی مێشک و دڵیەوە) کردوونیە شایەت لە سەر خۆیان (وە ئەوانیش هەر لەو ڕۆژەوە بەو سـرشتەوە) شاییدیان لە سەر خودا و تەق و تەنیایی خـودا داوە و هێناویانە. تاکوو لە ڕۆژی دواییدا (ڕێی ئەوەیان نەمێنێ بڵێن): ئێمە بێئاگا بووین لە تۆ و تـاک و تەنیاییت.

ئەئەوە پەیمانەکە، ئەوەش بوو مانایەکە. جا ئەو پەیـمانە بـۆوەی لە قسـە بچـتە دەر، دەبـێ عەمەلەن تاقی کردنەوەی لەسەر بکرێ. کەوایە دەبێ بە کوردی بڵێین دنیا بەر بەرەڵدا نییە و ئاش

بێ ساحەب نییە، هەرکەس بێ وەسەری کا و حەقی ئاشـەوان نەدا کە پێـی دەڵـێن ئـاوان: واتە حەقی ئاشەوان.جێگەیەتی ئەو بەستە هەڵبەستەی خۆم لەو بارەوە بیهاوێمە سەر باس:

### ئاش و ئاشەوان

خـــــودایە ئاشــــەوانی ئاشـــــی دڵمــــی
کە خــۆت بیـــرازکەری بەرداشــــی دڵمــی
بەچەکـــوچی ڕەحمەتـــت بیـــراز کە ئاشـــم
کە خــۆت بیـــرازکەرم بـــی، چـــاک و باشـــم
ســـەرەنجام ئـــاش و ئاشـــێڕ دەبـــنەوە خـــاک
دەمێنــــێ ئاشـــــەوان و ڕۆحــــی چـــالاک
لە خــــــۆتە ڕوح لەبـــــۆیە ئەو دەمێنـــــێ
دەنــــــا نــــــابێ لە تــــــۆ بەولا وەمێنـــــێ

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم بە ئادەمیزادی فەرمووە: دەست بگرن بە تەنافی خـودا، واتە بە یاسای خودا کە قورئانە، و لێک پڕژ و بـڵاو مەبـن، نەکـا دوژمـن بـووویرێتێ. دیـارە لە ئایەتەکانی پێشوودا خودا ئەو وەسیەتەی لە موسوڵمانان کرد کە بە تێکڕایی دەسـت وێکـدەن و پاڵ ڕێکدەن تاکو ئاشتی و تەبایی خووی پێ بگرن کە هەوێنی یەکەتیتانە نەکا کەلـێن‌و تێخـا. و ئەوەش دەبێ بزاندرێ هەوێنی دووبەرەکی و ناکۆکی، خۆشەویستی لە حەد بەدەری دنیا و ژینی خۆشی و لەززەتی دنیایە کە هیچ شکیشی تێدا نییە بەرهەمی ئەو خۆشەویستیەش لە خشتە بردن و پاڵەپانی و خلیسکاندنی خەڵکی بێ‌هێز و لاوازی دنیایە، ئەوەش خەیانەت و نائەمینیە بە گەل و نیشتمان. چونکە خودا لە هەوەڵەوە گەلی بە یەک کـۆمەڵ و یەک‌پـارچە ڕانـا و هێنـایە ڕوو، بەڵام ئەو دنیاداریە و لەززەت پەرستیە لێکی کردن و کردنیە پـارچە پـارچە و تێکـی بەردان. جـا پێ‌بەخشینی ژیر و بیـر و بەراوەرد و لێکـدانەوە و ئیختیـار بە ئینسـان وەک وەسـیلەیەک وایە و بۆوەیە کە ئەو ئیتحاد و یەکەتیە بپارێزرێ و وەمێنێ. تاکوو وەک ڕایەڵ و پۆ و تەونی پەکپارچەی گەل بێتە تەنـدن و بە هێـزی هەمـوو هەوداکـان و تـاڵی ڕایەڵەکـان فەرش و بەڕەی ئاسـایش و ئامانەت و ژیانی ئینسانا بێتە ڕاخستن و لە سەر دانیشتن. بۆ ڕاستی ئەو مەبەسـتە پـڕ لە هەسـتە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٢١٣:

﴿٢١٣﴾ كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُواْ فِيهِ وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلاَّ الَّذِينَ أُوتُوهُ مِن بَعْدِ مَا جَاءتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ فَهَدَى اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ لِمَا اخْتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ وَاللّهُ يَهْدِي مَن يَشَاء إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ

**بەرێ، مەردم هەمووی چین و بەرەیەک بوون. خودا پێغەمبەری ناردن مژدەدەر و ترسێنەر بن، کتێبی ڕاست و ڕەواشی ڕەگەڵ خستن تا ئەوشتەی بوونە بنەمای کێشەیان، بۆیان یەکالا کەنەوە و پێکیان بێنن. هەر ئەوانەش بۆ یەکتریان نەدەسەلماند کە دە پێشدا کتێب بۆ ئەوان هاتبوو، بەڵگەی ئاشکراشیان لابوو؛ بەڵام ئێرەیی ناو خۆیان کارێکی وای کرد پێک نەیەن. ئیتر خودا بە ئیزنی خۆی ڕێگەی ڕاستی نیشانی باوەڕداران دا و تێی گەیاندن ئەو کێشە لە بەر چی کرا. خودا بۆ هەر کەس حەز بکا شارەزای ڕاستەڕێی دەکا.**

مەبەست لەو ئایەتە پیرۆزە ئەوەیە کە ئادەمیزادەکان پێش ئەوە پەرە بستێنن و زۆر بن هەموو هەر یەک بیر و باوەڕیان هەبوو. خوداناسیان هەر لە باوەگەورەکانیانەوە پێگەیشتبوو، بەڵام وردە وردە کە پەرەیان ستاند و زۆر بوون، بوونە بە چەندین تیرە و هۆز و گەل و قەبیلە. ئەو حاڵەتە چوونە سەرەیان و قۆڵ قۆڵەیان، بووە هۆی لادانیان و لەتلەتبوونیان (واتە کەوتنە سەر باری مەرام و مەرامی هەر دەستەی باوەڕێکی بۆ خۆ دامەزراند) وەک ئەوەیان لێ هات لە هەموو ڕێبازێکی ئایینی وەلا کەون و ون بن و ڕێ دەرنەکەن. ئەدێرەدا خودای خاوەن بەزە و لێزان هات بە هاواریانەوە نەوەکا بکەونە سەر خەتی پێکدادان و تێ سرەواندنی یەک لە ئاخردا، پێغەمبەرێکی بۆ دانان ولە خۆیانی لێ هەڵخستن دەور دەگەڵ دەور لە سەر ئەساسی باو و ئەزموون و توانایی و ئەقڵ و سەلیقەی ئەو زەمان، ناردنیە ناویان و واشی دەگەڵ کردن کە خۆشەویستی و ئیختیاری ئەو پێغەمبەرەیان دە ناو دڵ و دەروونیاندا ببێ تاکوو ئەو سەروەرە ڕێزدارە بتوانێ بە هۆی نەزم و نیزامێکی سووک و سادە و ساکار بێ ئازاردانی یەکتر بیانحاملێنێ و خودایان لە بیر نەچێتەوە لانی کەم ئەوەندە بزانن خودایەک هەیە و یەکتا و بێ هاواڵە بە توانایە و گیانیش دەدا و گیانیش دەبا. ئەو پێغەمبەرەش ئەو کار و مەئموورییەتەی بە هۆی سەلیقەی خۆی نا، بەڵکە بە هۆی یاسا و دەستووراتێکی تایبەتی خودا لە ژێر ناوی (کتێبی ئاسمانی) تاکوو خەڵک بەدوور بن لەو گومانە: ئەوە ئەو پێغەمبەرە ئەو قسانە ئی خۆنی دەیانلێ و دەیانکا

بێبایەخن. بەڵکە وا باوەڕ بکەن ئەو گـوفتەی خـودان و جێـی بـاوەڕن. بەڵام ئەوەنـدە هەبـوو گەلەکان پاش نەمانی پێغەمبەرەکان کە ماوەیەکی پێ دەچوو دەکەوتنەوە سەر باری لاڕێییـان. و هەروا زانا ئاینیەکانیشیان بە هۆی خۆشەویستی دنیا و هەوەس‌پەرستی و ئارەزوویان بـێ خەبەر لە ئایین و ڕۆژی دوایی، دەستوور و فەرمانە ئایینیەکەیان دەگۆڕی. وەکوو زانایانی جوولەکەکان و قەشە و مەشەی هەرمەنی و دیانەکان. «ئەمما ئەوانە کە بە تەواوی چێژەیان لە ئیمان و باوەڕی کردبوو دایم دە یادی خودادا بوون و خوداش لە یادی واندا بوو، ڕێنوێنی دەکـردن لە خەیـاڵ و بیری خراپیان لادەدا. دیارە خوداش بۆ هەر کەسێک کە خودای بـوێ، خـوداش ئەوی دەوێ و شارەزای ڕێی ڕاستی دەکا.

## هەموو ئادەمیزاد، یەک بیر و باوەڕیان هەبوو؟

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی بە لەسەرەخۆیی:** بە پێی چـۆنیەتی داب و بـاو و ئاکـار و ڕەفتاری ئێستێی ئینسانەکان وا دەردەکەوێ کە ئینسان هەر لە سەرەتای هـاتنیەوە بـۆ سـەر زەوی بوونەوەرێکی خاوەن بیر و ژیر و هەڵسـەنگاندن و بەراوەردی جوێ‌جـوێ و جۆراوجـۆر بـووە کەواتە دەبێ بکوترێ: ئادەمیزاد کۆمەڵێکی تایبەتین و سەربەخۆن و خاوەن ئیختیار و هەڵوێستی سەربەخۆن وەک گیاندارانی دی نین هەڵس‌وکەوتیان لە سەر ئەساسـی ئیلهامـات بـێ، واتە لە ئیختیار و سەربەخۆیی و هەڵوێست گرتن بێبەری. دێـرەدا دەبـێ بە پێـی یاسـا و دابـی عـیلم لەفزی (کان) بۆ سبووت و ئیستمرار بـێ واتە بەردەوامـی. وەکـوو (کـان)ەی ﴿كَانَ اللَّهُ غَفُـورًا رَّحِيمًا﴾ کە خودا هەمیشە غەفوور و ڕەحیمە. دەکرێ بکوترێ ئینسـان دە شـەئنی خۆیـدا بیـر و بۆچوونی لێک جیاوازیان هەیە بە پێی ئاماژەی ئایەتی ۴ سووڕەی لەیل: ﴿إِنَّ سَـعْيَكُمْ لَشَـتَّىٰ﴾ واتە حەول و دەول و تێکۆشانی جۆراوجۆر دراوە بە ئینسان و هەیەتی. ئەمما دە واقیعـدا وەک ئەنـدامی یەک لەش وان: واتە هەر دانەی یەک کـاری هەیە، وە بەبـێ هاوکـاری یەکـتری ئەو ئەندامانە کاریان ناچێتە سەر و بۆیان بە بەرهەم ناگا. یانی ئەو توانایەیـان نەدراوەتـێ کە بتـوانن ئەوەی نیازیانە سەربەخۆ و بە تەنیایی پێکی بێنن بەڵکوو دەبێ بە تێکڕایی و بە هاوکاری یەکـتر وەکار کەون بۆ ئیش و کار. جا ئەودەم هەر ئەندامەی کاری خۆی دەکا بە هیمەتـی خـۆی و بە بیری خۆی، مەجمووعی ئەجزای ئەو کارخانە کۆمەڵایەتیە یا بڵێین ئەو لەشە بەرهەمێکی باشی ئاسایش و ژیانی بێ گێرە و کێشە وەدەست دێنن. ئەمما ئەو شێوە کارەی ئەندامانی کۆمەڵ بـێ

وێک هەڵپڕژان و لێک سووڕان و تێسـریواندنی یەکتری نایەتە ڕوو دە ناو کۆمەڵی ئینساندا، جا خۆ ئەوەش بێ گومانە ئەگەر پێک هەڵپڕژان و پاڵ پێکەوەنان یاسـا و نیزامێـک دەفریـا نەکەوێ ژیان ناتوانێ تا سەر بەردەوام بێ. کەوابێ دەبێ یاسا و دەستوورێکی ئەساسـی و قـایم و پـتەو بگاتە نێوانیان بۆ وەی هەرکەسە لە بەشی دەستەڵاتی خۆیـدا وەجـووڵێ و کـار بکـا. جـا بـۆیە خودای خـاوەن حـیکمەت و حەکـیم فەرمـوویەتی و دەسـتووری داوە: ﴿فَبَعَـثَ اللَّهُ النَّبِيِّـينَ مُبَشِّـرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُواْ فِيهِ...﴾

بە کوردی و بە کورتی: بەرهەم و قازانجی ئینسانی بە تێکڕایی دە یەکتر بەستراوە و دە یەکتر چڕژاوە، دیارە هەر کەسەی تەقەلا و هەوڵی بۆ خۆیەتی و بۆ لای خـۆی ڕادەکێشـێ دەیـهەوێ لەوی دی بیچڕێ بۆ خۆی. خۆ ئەوەش حاشا هەڵنەگرە و بێ‌گومانە دووبەرەکی و ئاژاوە و شەڕ پێکهێنە ئەو شێوەیە. کەواتە ژیانی ئاوا بە شـەڕ و هەڵـلا و دووبەرەکـی و بە گـژ یەکـدا چـوون ناکرێ بەردەوام بێ هەتا سەر نەگاتە لە ناوچوونی ژیان و ئاسایش و ئەمنیەت. جا بۆیە خـودای تەعالا بۆ بەردەوامی ژیان و ئاسایش و بەرگری لە دووبەرەکـی و پێـک هەڵپـڕژان پێغەمبەرانـی بەیاسـای کتێبـی خـۆی نـاردە نـاو ئینسـان دەور دەگەڵ دەور بە یاسـای نـوێ و داب و بـاوی سەردەمی خۆیان.

**تیوتیوە:** وەک گوتمان و ڕامانگەیاند: ئینسـان بە پێـی سـرشتی شـەڕخواز و دووبەرەکـی خوڵقینە بۆ بەرهەمی ژیان و مانی، بۆیە خودا ئەو پێغەمبەرانەی تێدا هەڵخستن و نامە و یاسـا و دەستووری نەزم و نیزامیشی پێ دان بە ناوی کتێبی وەحی ئاسمانی، تـاکوو بەرگـری بکـرێ لە شەڕ و ناکۆکی و مل‌بەملە و ڕاکێش ڕاکێشی یەکتری. ئەدی ئەگەر ئەوە وایە و خوداش بەتوانایە بۆ بەرگری لە هەچی بیهەوێ، بۆچی ئاوا دەکا ئینسـان؟ شـەڕ و پێکـدادان و ئـاژاوەیەکی وای پێکهێنـاوە کەس خێـوی خـۆی ناناسـێ و کەس نیـیە ئـاوڕی بەڕاسـتی وەسـەر پێغەمـبەران و کتێبەکـانی ئاسـمانی وەدا؟ بـۆ مەگەر خـودا بەتوانـا نیـیە بەرگـری لە یاسـای خـۆی بکـا و دەستوورێک داوێتە پێغەمبەرەکەی بیباتە سەر؟! بەڵێ، ئەوە بیر و باوەڕی خاون باڕانە: کە خودا دەتوانێ هەچی حەز کا، بیکا و کەسیش نەتوانێ بەرگری بکـا، بەڵام خـودا ئەو دەسـتوورات و پێغەمبەرانەی بۆ ئاگاداری ئینسـان و ڕێنـوێنی ئینسـان و تـاقی کـردنەوەی ئینسـانی نـاردووە و دامەزراندووە. دەجا دیارە مەیدانی تاقی کردنەوەش دەبێ ئازاد و بەردەوام بێ تا مـاوەی تەعـین کراو کە ڕۆژی قیامەتە وەیا بڵێین ڕۆژی مردنە. جا بۆیە خودای تەعالا پاش ئەوەی بە ئەنـواعی

ئامراز و وەسیلە و ئەسبابی وەک قورئان و پێغەمبەران، وەک ئەقڵ و شعوور و ئاڵوگۆڕی وەرزان و پیری و نەخۆشی، تاقییان دەکاتەوە، مەیدانی ئەو تاقیکردنەوەشیان بۆ دەڕازێنێتەوە تاکوو دەرکەوێ کامە ئینسانە هەیە دەو تاقی کردنەوەدا دەرچێ واتە چاک و پاک و بەکەرامەت بێ و پشت لە زۆردار و بیعار و بێ ویقار بێ. ڕوو لە ئینساف و کەرامەت و شەرم و حەیا و ویقار بێ. ئەوانەی بە درێژایی تەمەنیان هەر دە منافقەتی و زوڵم و بێشەرمیدان، خوداش باسیان ناکا لە بەر ئەوەیە: ﴿وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ (بقره: ١٥) **ئەوانە تا ماوەیەک خودا مۆڵەتی پێ داون کوێرانە لە سەر خراپەکاری و چارەڕەشی خۆیان بڕۆن و بەردەوام بن. ڕۆژێکی تفت و تاڵ چاوەڕوانیانە.**

ئەگەر بێتوو پرسیار بکرێ لەوەی مەگەر ئەو بێباوەڕ و یاخیانە ڕێگای ڕاست و خواریان نیشان نەدراوە؟ و عاقیبەتی چاکە و خراپەیان پێ ڕانەگەیەندراوە؟ وەیا دەیزانن و دەیکەن؟ دەبێ لە وڵامدا حەواڵە بەو فەرموودەی باریتەعالا کرێ کە فەرموویەتی: ﴿وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلاَّ الَّذِينَ أُوتُوهُ مِن بَعْدِ مَا جَاءتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ﴾ **کەس نەبوو دووبەرەکی و لاساری بکا و نەزانێ خودا و پێغەمبەر چ دەستوور و فەرمانێکیان داوە. هەروا دووبەرەکیشیان دانەدەنا مەگەر ئەو کەسانەی کە قورئانیان درابوویە و تێیان گەیێندرابوو و نیشانە و بەڵگەی ڕاست و دروست و ڕووناکیان بۆ هاتبوو.**

بە کوردی، ئەو دەستوور و فەرمانانەی وەک قورئان بێ، کە خودا دابوویە پێغەمبەرەکان و ئەوانیش بێ کەم و کووڕی بە خەڵکیان ڕاگەیاندبوو، نیشانەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەکان بوو، بەڵام بە داخەوە ئەو ئارەزوویانەی کە لە ناو توێ توێی دڵ و دەروون و لەشی دنیاپەرستیاندا ناژرابوو و چاندرابوو هەموو ئەوانەی لێ دزین و ون کردن لێیان و لە وڵات و زەوی فەرامۆشکاریدا ناژتن و ڕزاندیانن بۆ وەی نەڕوێن و تازە سەر هەڵنەدەنەوە: (بَغْيًا بَيْنَهُمْ) ئەوەیە و ئەوە بوو. دیارە ئەو سێڵاو و لافاوە بێ داد و ئامانەش بە زۆری لە هەوری ڕەشی دەستەڵاتداران و زانایانی ئایینڕا هەڵستاوە و سەرچاوەی گرتووە. ئێستاش خەڵک لە زاری مەلایانڕایە دەڵێن: ژن ئەگەر بە پیاو ڕازی بوو مارەی ناوێ و تەڵاقیش درۆیە. و ئەگەر پیاویش ناچار بوو دە عوزریشدا بچێتە لای ژنی، جا لە هەر لایەکڕا بێ، ڕەوایە چونکە دەفر و جەواڵی خۆیەتی. خانەقا و تەکیە و شێخ و سەید هەر مەلایان دایاننان و خەڵکیان پێ ئاشنا کردن. کەچی ئێستاش دەڵێن چاک نین، هەر لە زاری مەلایانڕا داکەوتووە مارەبەجاش. ئێستاش دەڵێن ئەوە کاری مەلعوونانە. هەر لە زاری مەلایانە دەڵێن لە کاتی ظهاردا واتە ژن لە

خۆ حەرام کردن بە هۆی کارەکانی ناڕەوا وەک بە ژن بکوترێ دایکمی، خوشکمی، یا دەکاتی ڕۆژوودا بچیە لای، تا ئەو سێ شەرتانەی خودا دایناون وەک: ئازادی بەندەیەک، یان نان‌دانی شەست نەفەری فەقیر، یا شەست ڕۆژ ڕۆژوو گرتن نەگری و نەدەی حەڵاڵ نییە بچیە لای. دەڵێن مەلایان کوتوویانە ئەگەر توانایی هیچ لایەکیانت نەبێ بچیە لای هیچ نا باش نییە. بت و بت‌سازی واتە مجەسسەمە و تەجەمولات و تەعزیماتی بێ‌جێ لە حاکمان و دەستەڵاتدارانڕا داکەوتوون، هەڵەستان لە بەر سروودی نیشتمانی وەلەو سروودی غەیرە ئاینیش بێ لە دەستەڵاتدارانڕا داکەوتووە. بە کورتی و بە کوردی ئایینی سپی ئیسلامی کە کراوەتە ڕەش و سپی، لە لەخۆگۆڕاوان و دۆڕاوانڕا سەری هەڵداوە.

## پوختەی مەبەست لە ئایەتی پیرۆزەی ٢١٣ی بەقەرە:

١. لە سەرەتادا ئینسان کۆمەڵێکی سادە و لە سەر ئەساسی فیترەت و سرشتی خوداپێداویان عیبادەت دەکرد.

٢. پاشان بە پێی زیاد بوونی کۆمەڵ بەرەو نیازی زیاتر و جۆراوجۆرتر هاتە ڕوو بەو نیزامە سادەی هەوەڵ خۆی بۆ ئیدارە نەدەکرا، دەوەیدا خودای ئاگا بە هەوەڵ و ئاخر بۆ چارە کردنی نیازیان پێغەمبەرانی بە یاسای ئاسمانی بۆ ڕەوانە کردن لە خۆیان.

٣. هەم پێغەمبەرەکان هەم یاساکانی ئاسمانی دەگەڵ سەرنوشت و سرشتیان ڕاستەوخۆ بە تەئسیرەوە هەم موژدەگانی پێغەمبەرەکان و هەم ترساندنەکانیان وەردەگرتن.

٤. پاش وەرگرتنی دەستووراتی خودا و ڕەسووڵ و تەسدیق کردنی یاسا و پێغەمبەر، کەوتنەوە دووبەرەکی و ناکۆکی و تلاسابوون لە ڕێگای ڕاست، بەڵام دووبەرەکی و لادانی ئەو کەڕەتەیان لە ڕووی جەهل و نەزانی نەبوو بەڵکە لە ڕووی ئاگایی بوو، تۆڕی ئەسپی هەوا و هەوەس بوو.

٥. عالەم دەو شەرابیتەدا بوونە دوو دەستە: یەک خاوەن باوەڕ، یەک کافر.

٦. بە پێی دەرکی مێژووی بەشەر لە سەر زەوی، حاوانەوەی کۆمەڵ بەبێ ئایین و دینی ئاسمانی دەکەوێتە کەشمەکەش و دووبەرەکی و فەسادی ئەخلاقی. هەر ئەوەشە کە لە هەوەڵی ژیاندا لە سەر ئەساسی یەکتاپەرستی بووە، هاوتای بۆ خودا دانەناوە، پاشان کە کەوتۆتە ناو شەپۆلەکانی ژیان لە تاو دەردی ژیانی لە ئایینی یەکتاپەرستی وەلاکەوتوە. ئەدێرەدا کۆمەڵی بە واقعی و سالەم ئایینی بە واقعی و سالەمی دەبێ.

٧. دین بریتیە لە دەستووراتێکی تایبەتی هەم مەسڵەحەتی دنیـای تێـدا گونجـاوە هەم ئـی قیامەت.

٨. دینی ئاسمانی هەر لە سەرەتای هاتنی ئینسـان بـۆ سـەر زەوی بـۆ لابردنـی کێشـەکانی سـرشت و فیترەتی ئینسان بووە، جا ئەوجار وردەوردە بەرەو تەواوی نیازی ئینسانی هاتووە بۆیە لە ئاخردا توانیویەتی ڕەفعی نیازی سـرشتیش بکا و غەیرە سـرشتیش.

٩. دینی ئاسمانی لە هەوەڵەوە هەر بەرەو کەماڵ هاتووە جا وردە وردە بە پێی نیازی ئینسان تا ئەو جێگایەی لە هەموو بوار و بار و ڕاستاندا دەتوانێ نیازی ئینسانی دابین کا ئەگەر بەهانەی پێ نەگیردرێ. وەک ئایینی ئیسلام ئایینی خاتەمی پێغەمبەران تازە ئایینێکی دیکە نایێتەوە چونکە لە هەموو باراندا تەواوە و پڕاوپڕی نیازی بەشەرە، ئەگەر بەهانە نەگیردرێ.

١٠. هەر ئەو دین و شەریعەتەی دێ تەواوتر دەبێ لەو دینەی دەچێ و دەڕوا.

١١. هەر ئەندازە کۆمەڵگا بەرەو تەمەدونی باڵا بڕوا بە پێی سـرشت و فیـترەت ڕووبەڕووی دووبەرەکی دەبێتەوە لە سەر ئەو ئەساسە ناتواندرێ بۆخۆی چارەسەری کێشـەکان بکـا، بەڵـکە دەبێ یاسا و دەستووراتێکی سـرشتی بێ و عۆدەدار و زامنی چارەسەری کێشەکان بێ.

جا ئەدێرەدایە کە خودای تەعالا یاسـا و شـەریعەتێکی ئاسـمانی بە وەسـیلەی پێغەمـبەری ئاخرزەماندا بۆ ناردن کە لە هەر بارێکەوە ئەگەر بە وردی سەیری بکرێ، تێر و تەسەل و تەواو و بێکەموکووڕی مافی هەموو خاوەن مافێکی تێدا و پارازتوویەتی و مـافی تـاق و جـووت واتە کۆمەڵ و فەردی ئینسان و حەیوان، ژن و پیاو دەوێدا هەیە و پارێزراوە ئەوەی ئاوا نەزانێ نازانێ ئەساسـنامەکەی کە قورئـانە بە تەواوی پێویسـت پێـی زانـا و ئاشـنا نیـیە. بە کـوردی قورئـان دەستووراتێکە لە خوداوەندەوە بە بەژن و بـاڵای ئینسـان و حەیـوان و ژیـان و دنیـا و قیـامەت گیراوە و بڕدراوە. ئەگەر لەو ئەندازەیەدا کورت و درێژی تێدا بێ خەتا دەکەوێتە ئەستۆی خـودا (نعوذ بالله). دە دیارە لە خوداش خەیـاتی چـاتر و نەققاشـی چـاتر و زانـای زانـاتر و چـاتر و خەمخۆری چاتر نەبووە نە هەیە و نە دەبێ. ڕۆژ دە زاتی خۆیدا جوان و شـۆقدارە چەکچەکـیلە (شب‌پره) بۆخۆی چاوی لە بەر هەڵنایە و ناتوانێ تەماشای کا.

## بیر و ڕا لە سەر (امة واحدة)

دڵ و هەستی شعوور دەیانهەوێ بزانن ئایا (امـة واحـدة) کە دە ئـایەتی ﴿كَانَ النَّـاسُ أُمَّـةً

وَاحِدَةً﴾دایە، ئەو ئۆمەتە واحدە کێن و لە کوێ و لە چ زەمان و دەورانێکـدا بـوون؟ لە ئـادەم و حەواڕایە؟ یا لە نووحڕایە؟ یا لە مووساڕایە؟ ئەو ئۆمەتەش لە سەر حەق بوون یا باتـڵ؟ وەیـا لە ڕۆژی ﴿أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ﴾ڕایە؟

نەزەری «ابومسلم بحر اصفهانی» و «قاضـی عبـدالجبار همـدانی» وایە عـالەم لە بـابەت دەرک و هەستی سـرشتی و زانستی ئەقڵ و شعوور، یەک ئـۆمەتی واحیـدن، واتە لە سـەرەتای بوونیان لە بابەت ئەقڵ و دەرکەوە یەک ئۆمەتی واحیدە بوون. هەر لەوێڕا ئیقـرار و هەسـتیان بە بوونی خودا و سیفاتی خودا و ئیتاعە بەو و سپاسی ئەو کردووە و هەروا ئەو هەستە دە دەروونی ئەو خاوەن سـرشت و شعوورانەدا ناژراوە و بووە کە دەبـێ خـۆ بپـارێزرێ لە درۆ و جەهـل و زوڵم و دەس‌درێژی بۆ خەڵک بە نـاڕەوا. دەلیلـیش لە سـەر ئەو ڕاسـتییە ئامـاژەی ﴿فَبَعَـثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ﴾ە، چونکە هاتنی پێغەمبەران بۆ ناو عالەم دوای ئۆمەتی واحدەی عالەم بـووە، دێـرەدایە کە دەبێ باوەڕن بێ بەوەی ئۆمەتی واحـدەی پەیـڕەو لە عەقـڵ و شـعووری سـرشتی لە پـێش هەموو شەریعەت و پێغەمبەرانێکدا بووە.

هەنـدێکیش ڕا و بۆچوونیـان وایە کە ئـۆمەتی واحـدە لە ڕۆژی (قـالووبەلا)دا بـووە واتە ﴿أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ﴾ (اعراف: ٧٢) دەو ڕۆژەدا عـالەم ئـۆمەتی واحـدە بـووە و لە سـەر دینـی حەق. ئەو نەزەرە لە لایەن هەندێک قورئانزان وەکوو «ابیّ بن کعب» و قۆڵێـک لە موفەسـیران تەئید کراوە.

## ئایینی حەق ـ ئایینی ناحەق

دیارە هەروەک ئاشکرا و ڕوونە ئایەتەکەی ٢١٣ ئاماژەی تەواو دەکا وەلای ئۆمەتی واحـدە. ئەوە ئیشارەی وەلای ئەوەی تێدا نییە ئەو ئۆمەتی واحدە ئایا لە سەر ئاینی حەق بـووە یـا ئـاینی باتڵ؟!

قورئانزانەکان لەو بارەوە کەوتوونە تەفتیش و لێکۆڵینەوەیەکی دوور و درێژ تـا سـەرەنجام گەیشتوونە ئەو قۆناغە: سێ ڕێگایان دە نەزەر گرتوون جوێ‌جوێ:

١. قەول و ڕێـی هەوەڵ ئەوەیە: ئەو ئـۆمەتە واحـدەیە لە سـەر یەک دینـی حەق بـوون کە ئەویش ئیمان بە خودای بێ‌هاوتا بووە. ئەو نەزەرەش زۆربەی زانایانی قورئان تەئیدیان کردووە، لە سەر ئەساسی بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئەو ئایەتە پیـرۆزە: ﴿فَبَعَـثَ اللَّهُ النَّبِيِّـينَ مُبَشِّــرِينَ

وَمُنذِرِينَ﴾. ئەو ئایەتە ئاماژە وەلای ئەوەی دەکا کە هاتنی پێغەمبەران پاش زەمانی گێرە و کێشە و ناکۆکی ئۆمەت بووە. هەروا بۆ تەئیدی ئەو هاتنەی پاش ئیختلاف، ئایەتی ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ﴾ دیارە حەرفی «ف» لە سەر «فبعث» بۆ تەئخیرە. بەو پێیە دەبێ پاش ئیختلافەکە بەعسەتەکە ڕووی دابێ.

٢. قەولی دوو دەڵێن: خودا بۆخۆی ڕاستەوخۆ دەفەرمووێ: ئینسان ئۆمەتێکی واحدە بووە و ناکۆکییان دە ناو خۆیاندا پێک هێناوە. پاشان ئێمەش بۆ چارەسەری ناکۆکییەکەیان پێغەمبەرانن ناردوونە ناویان. ئەدێرەدا ئاوا هەست پێ دەکرێ: هەچەن ئەو ناکۆکییە لە سەر ئەساسی «بغي» واتە یاخیگەری پێک هاتووە بۆوەی دەبێ دینی وان ناحەق و باتڵ بووبێ، ئەمما دە هەموو ڕاستاندا بەغی و ناکۆکی ئیشارە ناکا و دەلالەت ناکا لە سەر دینی ناحەق، واتە بکوترێ: ئەوانە دینیان ناحەقە بۆیە یاخین و ئاژاوە دەگێڕن.

قەولی سێ قۆڵێکن نەزەریان وایە: ئەو ئۆمەتە واحدە ئادەم و حەولادەکانی بوون. ئەوانیش لە سەرەتاوە خوداناس و تابعی ئەمر و فەرمانی خودا بوون هیچگۆنە ناکۆکییەکیان لەو بارەوە نەبووە، تا ئەو کاتەی قابیل بە هۆی حەسادەت و بەغی هابیلی کوشت. بەو پێیە دەبێ باوەڕ کرێ: عالەمی ئەو سەردەمی واتە ئادەم و حەولادەکانی و ژن و پیاوەکانی ئۆمەتێکی واحدەی یەک ئایین بوون، بە هۆی حەسادەت و بەغی قابیل بنچینەی ناکۆکی و ملبەملەی دامەزراند و سەری هەڵدا. تەماشا کە خودا دەڵێ چی لەمەڕ ئەو دوو کوڕانەی ئادەم دە ئایەتی ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِن أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ (مائدە: ٢٧) **ئەی پێغەمبەر! هەواڵە گرینگەکەی دوو کوڕەکانی ئادەم واتە قابیل و هابیل بخوێنەوە بە سەر موسوڵماناندا و چۆن بووە ڕووداوەکە وای دە خەڵکی بگەیێنە کە هەر یەکە لەو دوو کوڕە قوربانییەکیان سەر بڕی، قوربانی یەکیان قبووڵ کرا، ئی ئەوی دیکەیان قبووڵ نەکرا، جا ئەوەی قوربانیەکەی قبووڵ نەکرا حەسوودی برد و بەوەی کە قوربانیەکەی قبووڵ کرا پێی کوت: سوێند بە خودا دەتکوژم. ئەویش کە خوداناس و پابەندی دەستووراتی خودا بوو کوتی: خودا لە پیاوچاک و بەتەقوایان قوربانی قبووڵ دەکا.** (ئەو قسەش ئاماژە وەلای ئەوە بووە کە تۆ خودانەناسی) دیارە ئەو کوشتنە هۆیەکەی بەخیلی و حەسوودی بوو کە ئەوڕۆ بەرۆکی عالمی سەرزەوی گرتووە. بەتایبەت بەرۆکی حاکمان و سەرداران و یارانی قابیل.

خودای تەعالا زۆر جارانی ئامۆژگاری موسوڵمانانی داوە و دڵخۆشی داونەوە و بە

خـۆڕاگری و دان بەخـۆدا گرتنـی دەعـوەت کـردوون بـۆ نمـوونە پـاش ئەو ئاگـاداری و ئامۆژگاریانەی کە لە ئایەتی ۲۰۴وە تا ئایەتی ۲۰۷ەوە ڕایگەیاند ئاوڕ دەداتەوە سـەر ئەو خـاوەن بڕوایانەی دەوری پێغەمبەر کە لە دەست دوژمنانی سەخت و بێ بڕواکانیانەوە دایمە دە دڵەڕاوکە و ترس و لەرزدا بوون کە نەبادا بێن بە گژیاندا. وا هەڵکەوتبوو لەو کاتەشـدا خەبەری ئەوەی کە دەهەزار چەکداری دوژمن هاتوون بە خەیاڵی خۆیان بێنە سەر شاری مەدینە و بیگرن، ئەوانیش بۆ بەرگری لە سەرکەوتنی دوژمن و ئیحتیات خەندەقێکی پان و قووڵیـان لـێ دابـوو لە دەوری مەدینە. موسوڵمانەکانیش ئاگاداری و پاسـەوانی ئەو خەنـدەقەیان سـپاردبوو بە جوولەکەکـانی مەدینە. لە سەر ئەساسی قەرار و پەیمانێکـی کە لە مـابەینی ئیسـلام و جـوولەکەدا بەسـترابوو، دەگەڵ ئەوەی جووەکـان نیهـانەن لە بـنەوە وایـان قەرار دانـابوو لە نـاو خۆیانـدا کە دە کـاتی هەڵکەوتنی هەل ئەو پەیمانە بشکێنن و دەگەڵ ئەو کەسانەی دێنە سەر شاری مەدینە ببنە هاوکار و دەسباری یەکتر. بەو جۆرە کە کەلێنیان بدەنێ و ڕێگایان بـۆ چـۆڵ کەن لە پشـتەوەی مەدیـنە تاکوو موسوڵمانەکان غافڵگیر کەن دە ناو شاردا. با تەماشای بەزەی خودا کـرێ دەو کـاتەدا کە هەردووکیان واتە جوولەکەکانی ناو شار و دوژمنەکانی دەوروبەر نەقشەکە پیادە کەن و بە شاری مەدینەدا بدەن خودا نەقشەکەی لێ پووچەڵ کردنەوە بەوە: ئەوەی خستە نـاو دڵیـان کە دەورەی مەدینە بەردەن و چۆڵی کەن وێستا کاتی بەڕێوە بردنی ئەو نەقشەیە نەهاتووە. سـەرلەبەیانی زوو کە موسوڵمانەکان هەر چاوەڕوانی ئەو شەڕە بوون و بە ترس و لەرزەوە کات و سـاتیان دەبـردە سەر، تەماشایان کرد دەوری مەدینە چۆڵ کراوە و کەسی لێ نەماوە، لە خۆشیان جاڕیـان کێشـا کە دوژمنی دەهەزار نەفەری نەماوە و ترسی لە ناو دڵان وەلاچووە. ئەدێـرەدایە خـودای تەعـالا ئاگـاداری دەداتە موسـوڵمانەکان بە وەبیرخسـتنەوەی ئەو واقعـیەتە. دەفەرمـوێ مەترسـن ئیمانـدارەکانی پـێش ئێـوەش ئەو جـۆرە تەنگانانەیـان بـۆ هـاتۆتە پـێش و خۆشـیان دە بەرابەر ڕاگرتووە خوداش دەرووی خۆشی و ئاسایشی هەر بۆ کردوونەتەوە. جگە لە هەمـوو ئەوانەش ئێوە دەتانەوێ بە هەقـیش ڕەزای خوداشـتان بـێ چەرمەسـەرەی ڕۆژگـار دەس کەوێ؟ ئەوە دە ئادابی ئێوەدا هەیە، نان خواردن بێ کار و تێکۆشانی جووت و گا؟ نا، نیە و نابێ؛ دەجـا چـۆن بەرهەم هێنانی ڕەحمەت و بەرەکەتی بەهەشـت و ڕەزایەتـی خـودا بـێ تێکۆشـانی سـەخت و توندی دنیا پێک دێن و دێتە دەستتان؟ بۆ تەئید و پشت ڕاستی ئەو باسە دەچینە خزمەت ئایەتی ۲۱۴ کە دەوێدا هەموو ڕاستیەکان دێنە دی ئەگەر بە وردی هەڵسەنگێندرێ:

﴿٢١٤﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاء وَالضَّرَّاء وَزُلْزِلُواْ حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللّهِ أَلا إِنَّ نَصْرَ اللّهِ قَرِيبٌ

**ئایا وا دەزانن و گومان دەکەن کە هەروا بە سووک و ئاسان بگەنە بەرهەمی ناو چوونە بەهەشتەوە، بێ ئەوەی جەور و جەفا و مەینەت بچێژن (ئاوڕ دەنەوە) وەشوێن کەوتووانی پێغەمبەرەکانی پێشووش تووشی ئەو تەنگانانە و سەختیانە بوون لە بەرەنگاری دەگەڵ دوژمنانیان. وا هەبوو ناڕەحەتیەکانیان دەگەیشتە ئەو ڕادەیە: بە ڕێبەرەکانیان دەگوت (واتە پێغەمبەرەکانیان) ئەدی کەنگێ یاریدە و یارمەتی خودا دەگات و دێتە جێ؟ بەڵێ، بزانن و ئاگادار وەبن و بە چاکیش باوەڕ بکەن یارمەتی وپشتیوان بۆ ئێوە دێ و دەو نیزیکانەدا دەگا پێتان**

## گەنج بەبێ ڕەنج نابێ!

هەندێک کوتوویانە لە قورئانزانەکان ئەو ئایەتە لە غەزای ئوحوددا دابەزیوە و هەروا هەندێکی دیش دەڵێن لە غەزای خەندەقدا دابەزیوە چونکە دەو دوو غەزایەدا شەڕکەرانی ئیسلام تەنگانە و سەختی زۆریان بۆ هاتۆتە پێش و لە یەکێک لەو دوو غەزایانەدا بەشێک لە شەڕکەرەکان ناڕەحەتی و دامان و داماوی خۆیان دەنواند و لێیان چاو دەکرا و هەست پێ دەکرا. جا پێش ئەوەی ئەو ناڕەحەتیە خۆ بگەیێنێتە ناو پۆلی شەڕکەران خودای تەعالا دە فریا دێ و دەکەوێ و ئەو ئایەتە دەفەرموێ.

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی ورد و بەرجەوەندییانە:**

کاتێ خودای تەعالا دەبینێ شەڕکەرانی ئیسلام لەو بەربەرەکانی و بەرەنگاریەدا سیما و دەروونیان لە بەر سەختی و توندی کات و مەیدانداریەکە گرژی و هەڵقرچاویان پێوە دیارە، دە هانا و هاواریان وەدێ و ڕوویان تێدەکات و دەفەرموێ: ئایا ئێوە ئاواتان زانیوە و خەیاڵ کردووە کە بەهەشت کڕین و لەسەر خۆ تاپۆ کردنی دنیای ئاخرەت هەروا بێ بەها و سووک و ئاسانە؟ بێ فیداکاری و لەخۆبوردن و زەجر و میحنەت دەکرێ و پێی دەگەن و دەچنە ناوی. دەگەڵ ئەوەی ئەو سەختی و تەنگانانەی کە دوچاری گەلانی پێش ئێوە بووە و بەرۆکی گرتوون و خۆشیان دە بەرابەریدا ڕاگرتووە، هێشتا تووشی ئێوە نەبووە و نەهاتووە و تەنانەت گەلانی پێش ئێوە زۆر جاری وا بووە بە ئەندازەیەک کەوتوونە سەختی و تەنگانەی شەڕ و کەوتوونە دەم سێڵاو و تۆفانی خەتەرەوە. ڕوویان کردۆتە پێغەمبەرەکانیان و لێیان پرسیون: ئەرێ بڵێی کەنگێ

یاریدە و یارمەتی خوداماں دەگاتێ دێ موژدەی پیرۆزی و ڕزگاریمان بـۆ دێنـێ و پـێمان دەدا؟ جا ئەدێرەدایە و ئەدێـرەدا کە خـودا بەوەی دەیـداتە پێغەمبەرەکـان و ئەوانـیش دەیـدەنە یـاران و هاوقەتارانی خۆیان کە دەگەڵیان دەو تەنگانانەدان کە خودا دەفەرموێ ﴿أَلَا إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ﴾ ها! ئاگادار وەبن کە فریاکەوتن و یارمەتی خودا نزیکە. یانی خـاترجەم بـن و بێ‌گومـان خـودا غافڵ و بێ‌ئاگا نییە لە بەندە خوداویسـتەکانی خـۆی. سـەریان دەخـا بە سـەر دوژمنیانـدا و لە هەچی جەور و جەفاشە وەدووریان دەخا. سەرکەوتن و پیرۆزیش هەر بۆ یارانی خودا و دینـی خودایە. کەوایە بە پێی ئەو یاسا و دەستووراتەی کوتمان ئەوانەی داواکاری ئـایین و فیـداکارین بۆ ئاین دەبێ تفت‌وتاڵی و سوێری و چەرمەسەرەی بچێژن لە ڕێی داوا و ئیدیعای ئاینیانەوە جـا کەوایە ئەی خـاوەن ئـیمان و بڕواکـان، ئەی دەرکـراوی خـاک و نیشـتمانتان، ئەی لە مـاف دوورکراوەکان! نائومێد مەبن و خۆڕاگر بن وەعدەی خودایە، بێ‌گومـان پیـرۆزی بـۆ ئێـوەیە و سەرکەوتن. ڕۆژێک بە هەچی مافتانە دەگەن، جا بـا دوژمنـانی ئـایین و ئـاداب و فەرهەنـگ و ئینسان لێخۆڕێ بە دوودڵی و دڵەڕاوکەیی و نەحەساوەیی.

**تیوتیوە:** یاسای خودا وایە هیچ شتێک بێ شەرت و شەرایت نایەتە جێ و بۆ هەیە و دەبـێ عیللەت و مەعلوو واتە سـەبەب هەیە کەوایە بە قسـەی کەس نـاتوانێ داخڵـی بەهەشـت بـێ چونکە قانوونی خودا وا دانەمەزراوە، ئینسانی خـاوەن بـاوەڕ بـۆ ئیسـباتی ئەو بـاوەڕەی تـاقی نەکرێتەوە کەوایە هەروەک لە ئادەمڕا هەتا ئێرە تەنگانە و سەختی هەر بووە بۆ ئیمانداران، لێرەش بەو لاوە تا دنیا دەبڕێتەوە هەر دەبێ ببـێ. ئەمـا بـۆ وەی کە دە بەرابەر سـەختی و سـەخڵەتیدا بتواندرێ خۆڕاگری بێتە ڕوو لە خۆبوردوویی دەبێ بگرێتە سـوپەر. کـورد کـوتەنی: تەنگانـان بەریان کورتە، واتە مەودای مانەوەی تەنگانان کورتە.

ئەوەش با قووت نەدرێ: هاوار و دادی شـەڕکەرانی ئیسـلام لە ڕووبەڕوو بـوونەوە دەگەڵ دوژمن ناڕازی بوون بە شەڕ و بەربەرەکانیەکە نەبووە بەڵکە داوای هیمداد و یارمەتی خودا بووە.

«ابن‌عباس» کوتوویەتی دابەزینی ئایەتی ۲۱۴ هۆیەکەی دڵخۆشی دانەوەی یارانی پێغەمبەر بووە. چونکە یارانی محەمەدﷺ هەچی ماڵ و مڵک و سامان و ژیانیان بوو دە پێنـاو کـۆچ‌کردن دەگەڵ پێغەمبەریـان دانـا و بەجێیـان هێشـت و کەوتە دەسـتی موشـریکانی مەکـکە و یەهوودیەکانی مەدینە و دەوروبەریش دوژمنایەتییان دەگەڵ پێغەمبەر و یارانیان دامەزرانـد. جـا ئەدێرەدا ئەو هەست و خەیاڵە دەهاتە ناو دڵی یارانی پێغەمبەر کە ئێمە لە مەککە هەچی بوومـان

کەوتە دەستی دوژمنانمان و لێرەش ئەوەتا دووبارە دوژمنانمـان لە بنەوپـاڵەوە هەرەشـەمان لـێ دەکەن. جا خودای تەعالا بۆوەی شۆقی چرای ڕووناکی دڵی پڕ لە ئیمانیان کەم نەبێ و سـیس نەبێ هێزی غیرەتیان دەخاتە ناو دڵیانەوە و دڵخۆشـییان دەداتەوە بەو بیـرەوەریەی پـڕ لە هیـوا و هومێد کە دەفەرموێ ﴿أَلا إِنَّ نَصْـرَ اللّٰهِ قَرِيبٌ﴾ واتە یارمەتی خودا نزیکە و دەوگاتێ، بەڵام پاش جەور و جەفای زۆر.

## وەڵامی ئیشکالی: (کەنگێ یارمەتی خودا دێ؟)

دڵ دەو ئایەتەدا هەست بە ئیشـکالێک دەکـا. ئەو ئیشـکالەش ئەوەیە: پێغەمبەرێکـی کە بە تەواوی یەقین و باوەڕی بە خودا و وەعدەکانی خودا هەبێ، چۆن دەکرێ ئەوەی لێ ڕوو دا بڵێ کەنگێ یارمەتی خودا دێ؟

بۆ وەڵامی ئەو ئیشکالە دەبێ هەر ڕوو بکـرێتەوە لای خـودا کە لەو بـارەوە فەرمـوویەتی: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَـدْرُكَ بِمَـا يَقُولُـونَ﴾ (حجر: ۹۷) **بە قەتعـی دەزانـین سـینەی تـۆ وە تەنـگ هەڵاتووە لەوەی بێ باوەڕان دەیلێن.**

دووبارە جگە لەوەی دەو ئایەتەدا ئەوە هەست دەکرێ کە پێغەمبەرانیش وەتەنگ هەڵاتوون دە ناو نالەباری و بەدڕەفتاری گەلان و سەخڵەتی ئەوزاعدا، و هەروا جگە لەو ئایەتەش: دەکرێ و ئیمکانی ئەوەش هەیە پێغەمبەرانیش بە فێڵ و فووت و حیلەی دوژمنان سەخڵەت و ناڕەحەت ببن چونکە پێغەمبەرایەتی مانای وا نییە دەبێ لە مەکری دوژمن ئەمین بێ، بەڵکە دەبێ هەر ئەو لە مەکری دوژمنانی دین بترسێ و سەخڵەت بێ. هەروەک ئەو نەزەرە سابت دەبێ بە ئایەتی ۳ سووڕەی شوعەرا کە پێغەمبەر لەو داخ و حەسـرەتەی کە خەڵک ئیمانیان نەدێنا وەتەنگ هەڵدەهات و سەخڵەت دەبوو. ئایەتەکە ﴿لَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾ ئەوە دەتهەوێ **خۆت نابوود و خەفەتبار کەی لە داخ و غەمی ئەوەی بێ باوەڕان ئیمان ناهێنن. واتە غەم و خەفەت** داتنەگرێ لەوەی خەڵک ئیمان ناهێنێ. ئەوەش هەر دەکرێ بکرێتە جواب بۆ ڕەفعی ئەو ئیشکالەی خرایە سەر پێغەمبەر.

بەر لە هەموو ئەو جوابانە خودای تەعالا بە وەسیلەی ئایەتی ۲۱۴ ڕادەگەیێنێ کە پێغەمـبەر و یارانی ئەو کوتوویانە (مَتَىٰ نَصْـرُ اللّٰهِ) پاشـان هەر پێغەمـبەر فەرمـوویەتی ﴿أَلَا إِنَّ نَصْـــرَ اللّٰهِ قَرِيبٌ﴾ ئەو دوو جوملانە ئەگەر هەڵسەنگێندرێن و بدۆزرێن و هەر یەک لە جوملەکـان بـدرێنە

پاڵ ئەو کەسانەی کوتوویانن، ئـاوا دێـنە ڕوو: ئەوانەی خـاوەن ئـیمان و باوەڕەکـانن و یـارانی پێغەمبەرن ڕوو دە پێغەمبەر دەکەن و دەڵێن (یا رسول الله! مَتَىٰ نَصْـرُ اللَّهِ) واتە ئەی پێغەمـبەری خودا! کەی یارمەتی خودا دێت؟ پێغەمبەریش لە جوابیاندا دەفەرمـوێ بـۆ تەسـکین و ئـارامی دڵیان: (أَلَا إِنَّ نَصْـرَ اللَّهِ قَرِيبٌ) ها! بە باوەڕەوە بزانن و بێ‌گومـان بـن یـارمەتی خـودا دێـت و نزیکە هاتنی. واتە خۆڕاگر بن و سەخڵەت مەبن، نیزیکە یارمەتی بتانگاتێ.

ئەو هیوا و ئومێدە پـڕ لە فەتـح و زەفەر و پیـرۆزیەی ئەو ئـایەتە (أَلَا إِنَّ نَصْــرَ اللَّهِ قَرِيـبٌ) دەکرێ شامیلی حاڵی هەموو ئەو کەسانە بێ کە لە ژێر دەستی ماف‌خۆراندا ماف و نیشـتمانیان خوراوە و زەوت کراوە. واتە دەس لە کراس نەهێننە دەرێ و تەسلیمی دوژمن نەبن. سـەرکەوتن و پیرۆزی و ئاش‌بوونەوە بە ماف و نیشتمان لە سەر ئیزن و ئیرادەی خـودا نیـزیکە و دەڕێـدایە. ڕەنگە هەندێک وای بۆ بچن ئەو ئایەتە تایبەتی پێغەمـبەرانە بەڵام ئەوە دوورە لە ڕاسـتی چـونکە قورئان بۆ هەموو ئینسانە نە هەر بۆ پێغەمبەرە. جا ئەوجار جـگە لەوانەش، داگیـرکەر نـاحەقە و مافی ئەو نابوود بوونەو پێی دەگا. ماف‌خوراو مەزلوومە، نەسـرەوتوویە ڕۆژی سەرکەوتنی دێ و دە ڕێدایە.

پوختەی مەبەستی ئایەتی ۲۱۴: بێ‌گومان نیازی جامعەی بەشـەر بە پێغەمبەرانـی خـودا و کتێبەکانی ئاسمانی دە هەمـوو دەور و زەمانێکـدا ئەساسـیە و بەرچـاوە دەبـێ و هەیە، چـونکە ئەوانەن جامعەی بۆ ڕێگای ڕاستی پڕ لە ئەمن و ئاسـایش و کەڕامەتەوە دەعـوەت و بانگێشـتن دەکەن، چونکە ئەوەشتێکی حاشـاهەڵنەگرە کە سـرشت و فیترەتـی تەنیـای ئینسـان بە تەوری گشتی ناتوانێ ئینسان بۆ لای بەرهەمـی نیـاز و شـارەزایی تەواو بەرێ و بیگەیێنـێ. لە بەر ئەوە ئەقڵ و شعووری سـرشتی ئینسانی جوێ‌جوێ و پلە بە پلە، هەموویان نـاتوانن ئیـدارەی ژیـان ئیدارە کەن و هەڵیسووڕێنن جا بۆیە باوەڕ دەبێ بکرێ: ئەقڵی سـرشتی لە حاند دەرک و هەستی ڕێگاچارەی نیازەکانی دوو وەرزی دنیا و قیامەت عاجز و نـاتەوانە، دەبـێ نەڕوانـدرێتە ئەقـڵ و دەرک و شـــعووری دانەدانەی ئەوانەی ژیـــر و بەبیـــر و پســـپۆڕ و فەیلەســـووفی دەوران و هەڵکەوتووی دەورانن، ئەوانە دەبێ بکوترێ ئەمرێکی تایبەتین بۆ هەموو ئینسان نییە ئەو ئەمرە.

جا بۆیە دەبێ بە تەئکید ئەوە باوەڕ بکرێ و بسەلمێندرێ: ناردنی پێغەمبەران و وەحیەکـانی ئاسمانی کە یارمەتی‌دەری ئەقڵ و سـرشتی ناتەوانی ئینسانن نیعمەتانێکن لە ڕووی حیکمەت و فەزلەوە، خـودا بەخشـیونی بە ئینسـان تـاکوو ئەوانە بەشـەری بـۆ کانگـای پـڕ لە خێـری دوو

وەرزەکانی دنیا و قیامەت ڕێنوێنی و شارەزا کەن و هەروا دەبێ ئەوەش بسەلمێین و باوەڕ کەین: بەشەر ناچارە بە تەوری قەتعی نیازی بە بارەگایەکی تەربیەت و ئاموزشی غەیرە سرشتی هەیە کە دەگەڵ تێز و هێز و پێز و دەرک و هەستی ئەقڵی دژایەتیان نەبێ بەڵکە یەکتر بتوانن قبووڵ کەن. جا ئەو بنکە و بارەگایە بێگومانە دەستووراتی وەحی ئاسمانی و پێغەمبەرانن، هەر ئەوەشە کە ئینسان موکەللەفە دەبێ باوەڕی بە خودا و کتێبە ئاسمانیەکان و پێغەمبەرەکان ببێ. هەر بۆیەشە باوەڕی بەوانە کراوەتە پایە و کلێکی ئیمان.

ئەدێرەدایە کە دەتوانین بڵێین مەبەست لە جوملەی (أَمْ حَسِبْتُمْ) نیشاندانی ئەو ڕاستییەیە کە ئیمان و باوەڕی خاوەنی کۆمەڵێک دەستووراتە هەرکەس ئیدیعای ئیمان بکا و نەتوانێ ئەو کۆمەڵە دەستووراتەی دەگەڵ بەجێ بێنێ، ئەو ئیدیعایەی درۆیە و بێئەساسە. بەڵام تا جێگای خۆی بەقا ناکا کە درۆیە ئیدیعاکە. بۆ ڕاستی ئەو قسەیە جا بە تەرازووی ویژدان ئەو داوایەی دەگەڵ ئایەتی ٢ی عەنکەبووت وەزن کەی تا دەرکەوێ درۆ و ڕاست.

﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ﴾ ئایا ئینسان وا خەیاڵ دەکا هەر بەوەندەی کوتیان ئیمانیان بە خودا هەیە و هێناومانە، وێڵ دەکرێ و تاقی کردنەوە و لێپرسینەوەی لێ ناکرێ؟ ئەگەر وا بزانێ یا ئەوەتا نەزانە و یا خۆ نەزان دەکا، هیچ کامێکیشانی لێ قبووڵ ناکرێ.

هەروەک لە زۆر جێگا قورئان نیشان دەدا کە پرسیار دەکرێ لە پێغەمبەر بۆ شتێک و لە شتێک بۆ نموونە وەک ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَهِلَّةِ﴾ (بقره: ١٨٩) بە پێی ئەو یاسا و باوە، ئەوە لێرەشدا لە پێغەمبەر پرسیاری ماڵ بەخت کردن دەکرێ لە پێغەمبەری بۆ وەی خێرخوازان بزانن واتە چ جۆرە خێرێک چاک وباشن و چ جۆرە خێرێک دەگا بە خودا. پێشەکی دەبێ ئەوە بزاندرێ هەچی دە پێناو خودادا بدرێ چاکە و پاداشەکەی دەگاتەوە بە پێی ئیشارەی ئایەتی ٩٦ی نەحل:

﴿مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ اللَّهِ بَاقٍ وَلَنَجْزِيَنَّ الَّذِينَ صَبَرُوا أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئەوەی کە لە لای ئێوەیە (واتە ئەوەی بۆ دنیایەی دەکەن وەک ئاوی خڕاو وایە ویشکاوی دێ و بە دەردی ئەولاو ناخوا) و ئەوەی کە لە لای خودایە دەمێنێ (واتە ئەوەی بۆ خودا بەخت بکرێ وەک ئاوی سەرچاوەدارە ویشکایی نایە لە ڕۆژی قیامەتا دێتەوە ڕووت و دەدرێتەوە) بێگومان پاداشی ئەو کەسانەش کە خۆیان ڕاگرتووە دە بەرابەر تەنگانە و سەختی دنیا) بە پێی جوانترین کارێکی کە کردوویانە پاداشیان دەدرێتەوە.

دیارە پێغەمبەریش هەر پرسیارێکی لێ کرابێ بەبێ وەحیی خودا وڵامی نەداوەتەوە، وێستاوە بۆ وڵامەکەی و چاوڕەوانی خودا بووە. دیارە خوداش هەموو کات و ساتان ئاگاداری

پێغەمبەران بووە لە هەر بارێکەوە. جا ئەدێرەدا دەستوور بە پێغەمبەر دەدا کە لە جوابی ئەو پرسیارەدا بڵێ:

﴿٢١٥﴾ يَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلْ مَا أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ

**لێت پرسیار دەکەن چی ببەخشن؟ پێیان بڵێ: هەر شتێکی دەیبەخشنەوە، با بۆ دایک و باب و خزمانی نزیک و هەتیوان و بێنەوا و هەژاران و ڕێبوارانی بێتێشووتان بێ، بێگومان هەچی ئێوە چاکە و بەخشش بکەن خودا پێی زانایە.**

## ئینفاق بە کێ دەدرێ؟

ئەگەرچی قازی ویژدان و سرشت هەست بە خێر و شەڕ و چاکە و خراپە دەکەن بە پێی ئیشاڕاتی ئایەتی ٨ی شەمس ﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ خودای تەعالا دایچکاندە ناو هەستی دەروونی نەفسەوە هەم خراپە و هەم چاکە، واتە خوای تەعالا دە نەفسی گەیاند چاکە چییە و چۆنە و خراپە چییە و چۆنە؟ یا دەڵێن خودای تەعالا چاکە کردن و خراپە کردنی دە شەئنی نەفسدا گونجاند هەچ لایەکیانی واز لێ بێ نەفس دەتوانێ بیکا.

بەڵام بۆ قەناعەت دان بە سرشت و ئەقڵ و ئیمان لە پێغەبەری مەرکەزی ڕێنوێنی پرسیار دەکرێ، جا ئەدێرەدایە کە خودا بەپێغەمبەر دەفەرموێ: پرسیارت لێ دەکەن کەچی دە ڕێگای خودادا خەرج کەین؟ و ئەو خەرجە خێرە بدەین بە کێ؟ زۆر بە باشی خودا وەریدەگرێ؟ دیارە خودای تەعالا ئەو پرسیارانەی کە لە پێغەمبەرەکان کراوە بە پێی یاسای خودایەتی لە ڕاست پێغەمبەران، بێوەڵامی نەهێشتوونەوە، جا لە سەر ئەو ئەساسەیە لێرەدا واتە لە وڵامی ئەو پرسیارکەرانەدا خودا بە پێغەمبەر دەفەرموێ بڵێ پێیان: ئەوەی دەتانهەوێ لە ماڵی پاک و خاوێن و حەلاڵی خۆتان بیبەخشن بە خێر دە ڕێگای خودادا، لە پێش هەموو کەسێکدا بیدەنە دایک و بابی خۆتان. ئەگەر هاتوو دەس کورت و نەدار بوون، چونکە ئەوان بە ڕەنج و کوێرەوەری گەورەیان کردوون و بەخێویشیان کردوون. پاش دایک و بابان، بیدەنە خزمانی نیزیکتان وەک کوڕ و کوڕەزا و برا و برازا و مام و ئامۆزا و هەروا بەو دابە.

ئەگەر ئینساف و ویژدان ئێرە بە تەرازووی ئیمانی وەزن کا و هەڵیسەنگێنێ شاهیدی دەدا ئەگەر کۆمەڵگای ئینسان ئەو یاسا و ڕێگایە بگرێتە بەر، جگە لەوەی یەکەتی جێگیر دەبێ لە ناو

کۆمەڵگادا و فەقیر و بێنەواش وا نامێنێ دەستی نیازی نەداری درێژ کا بۆ ئێر و ئەوێ، لەشکری هەژاریش دەڕوا و دەپێچێتەوە و بەرد و کوچکی بناغەی کۆمەڵیش کە خاوخێزانە تێر و تەسەل و کۆک و پۆشتە دەبن.

ئەوجار دوای دایک و باب و خزمانی نزیک، بیدەنە هەتیوان، چونکە پێویستە ئەو دەرسە بە هەتیو بدرێ کە ئەگەرچی بابی خوێنی و ئیرسی مردووە بەڵام بابی ئیسلامی هەر ماوە و نامرێ کە وەزیفەی هەموو کەسە باب بێ بۆ سەغیران لە مەڕ خەرج و خزمەتەوە، ئەوجار پاش ئاوڕدانەوە وەلای باب و دایک و خزمانی بێنەوا و هەتیوان، دەبێ ئاوڕ بدرێتەوە سەر بێنەوایان و دەستەوستانان لە جیران و دانیشتووانی دێ و شارێکی کە ئەتۆی تێدا نیشتەجێی. و ئەوجار پاش ئەوانەش بۆ ڕێڕەوانی ڕێگای خێر کە بێتێشووی ڕێگا کەوتوونەتەوە. دیارە دەبێ باوەڕن وابێ هەچی بیکەن لە چاکە و خراپە خودا زانا لێی و پێی ئاگایە.

بە کوردی و بە کورتی: تۆڵە و سزا، پاداش و عەتا لە قەدەر عەمەل کردنە، کەوایە خۆ فیدا کردن و خۆ بەخت کردن لە ڕێی خودا هەر ئەندازە زۆر بێ، پاداشیشی زۆرتر دەبێ ڕۆژی خۆی لە لای خودا.

مێژوونووسانی مێژووی ئیسلام کوتوویانە لەسەر ئەساسی ئایەتی ٧٧ سوڕەی نیساء پێغەمبەر تا لە شاری مەککەدا بوو شەڕ و بەربەرەکانی لێ مەنع بووە و شەڕی نەکردووە، چونکە یاسای شەڕ ئەوەی یاسایە: تاکوو ئەو ئامانج و هەدەفەی بۆی دەچی نەیخەیە ناو دەروون و مێشکی هاواڵان، نابێ هەروا سەربەخۆ و ڕەمەکی بێ ئەوەی شەڕکەران بزانن بۆچی دەبێ شەڕ بکرێ، شەڕ هەڵایسێنی و داگیرسێنی. بۆیە پێغەمبەر ئەو دە دوازدە ساڵەی کە لە ناو مەککەدا بوو هەر خەریکی داڕژتنی پایەی ئیمان بوو لە ناخی دڵی عالەمدا. هەروەک ئەو مەبەستە ڕاستە لە ئاماژەی ئایەتی ٧٧ی نیساءدا دەردەکەوێ ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّواْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاسَ كَخَشْيَةِ اللّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً وَقَالُواْ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا الْقِتَالَ لَوْلا أَخَّرْتَنَا إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ قُلْ مَتَاعُ الدَّنْيَا قَلِيلٌ وَالآخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ اتَّقَى وَلاَ تُظْلَمُونَ فَتِيلاً﴾ ئایا ئەوانە نابینی پێیان کوترا واز بێنن و دەس هەڵگرن، نوێژ بکەن و زەکات بدەن کەچی کە جیهادیان لە سەر واجب کرا لەپڕ دەستەیەکیان لە خەڵکی دەترساند، ئەوەندەی ترس لە خودا و بگرە زیاتریش. وتیان: ئەی پەروەردگاری ئێمە، بۆچی جیهادت لە سەر پێویست کردین؟ بۆچی تا ماوەیەکی دی دوات نەخستین؟ بڵێ: ژیان و کالای دنیا کەم و کورتە، پاشەڕۆژ چاترە بۆ

**ئەوەی لە خودا بترسێ بە ئەندازەی تاڵی چاڵی ناوکە خورمایەکیش ستەمیان لێ ناکرێت.**

ئەو ئایەتە پیرۆزە حاڵی هەندێک لە موسوڵمانانی شاری مەدینە باس دەکا کە ئیمانیان زۆر پتەو نەبووە، و لەو لایەشەوە حاڵی ئەو بێباوەڕانەش باس دەکا کە تەنیا بە زمان موسوڵمان بوون. جا خودا دەفەرموێت: **ئەی پێغەمبەر! ئایا ئەتۆ ئەو کەسانەی هۆزی ئەوس و خەزرەج بن نابینی کە پێشتر سمکۆڵیان دەکرد بۆ شەڕ و کوشتار دەگەڵ یەکتری کەچی ئێستێ کە پێیان بکوترێ: واز لە شەڕ بێندرێ چاترە و ڕوو بکرێتە خودا و نوێژ و زەکات، دارایەکتان دە ڕێگای خودادا بدرێ باشترە. و هەروا کە «غەزا»شیان لە سەر واجب کرا ترس و لەرز دایاندەگرێت هەندێکیان خوداخودایانە شەڕ نەکرێ.**

بەڵام پێغەمبەر دوای هیجرەتی واتە کۆچ کردنی بۆ مەدینە پاش دوو ساڵان ڕێ دران پێغەمبەر و یارانی بۆ شەڕ بە وەسیلەی ئایەتی ٣٩ی حەج: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾

**ئەوانەی شەڕیان بە سەردا سەپاوە، ڕێگای شەڕ کردن و دیفاع لە خۆیان پێ دراوە چونکە خراونە ژێر باری زوڵم و زۆری (کەسێک مل بۆ دوژمن نەوی کا تاوانبارە)، بێگومان خودا تەواو لە بۆ یارمەتیدان و سەرخستنی ئەوانەی بەرابەر تەجاوەزکاراندا ڕادەپەڕن پشتیوانە.**

«ابن‌عباس» شتێکی پەسند و دڵگر نەقڵ دەکا لەسەر دابەزینی ئایەتی ٢١٥. شتەکەش ئەوەیە: کابرایەک دێتە خزمەت پێغەمبەر و دەڵێ: یا ڕەسوولی خودا! دینارێکم هەیە بیدەمە کێ؟ پێغەمبەر فەرمووی: بیکە خەرجی خۆت. پاشان کابرا کوتی دوو دینارم هەیە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی بۆ ژنەکەتی خەرج کە. پاشان کابرا کوتی: سێ دینارم هەیە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بۆ خزمەتکارەکەتی خەرج کە. پاشان کابرا کوتی چوار دینارم هەیە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بۆ دایک و بابتی خەرج کە. دووبارە کابرا کوتی پێنج دینارم هەیە. پێغەمبەرﷺ کوتی: بۆ خزمانی خەرج کە. ئەوجارەش کوتی: شەش دینارم هەیە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوە دە ڕێگای خودادا خەرج کە.

بە کوردی پێغەمبەرﷺ تەرتیبی خەرج کردنی فێری کابرای پرسیارکەری کرد تا کوو موسوڵمانان فێری بن.

ئەگەر نەختاڵێک بەرجەوەندی ئەو ئایەتە ببین و هەڵیسەنگێنین ئەو ئیشکالە هەست پێ دەکرێ: عالەم دیارە پرسیارەکەی لەوەی کرد کە چ دەکرێتە نەفەقە. لەوانەی نەکرد کە نەقەکەیان بدرێتێ و دەدرێتێ؟ خوداش ئەوانە نیشان دەدا کە نەقەکەیان دەنێ وەک باب و دایک و خزم و هەتیو و بێنەوا و بێماڵ. دەبێ ئەو ئیشکالەی چۆن جواب وەدەین و لە دەستیان ڕزگار بین و

قانع بین؟

دەبێ لە وەڵامدا ئەوە بکوترێ: شتێک دە ناو ئایەتەکەدا وەک ﴿مَـا أَنفَقْـتُم مِّـنْ خَـيْرٍ﴾ بـێ وەڵامی پرسیارەکەیە. چونکە پرسیارەکە ئەوەیە چی ببەخشن. واتە لێـت دەپرسـن چ ببەخشـن؟ ئەتۆش پێیان بڵێ: هەر شتێک دەبەخشنەوە، با بۆ دایـک و ... ئەوانە بـێ. شـتەکەی کە دەبێـتە جـوابی پرسـیارەکەی ئەوەیە: هەر شـتێکی دەیبەخشـنەوە. دێـرەدا واتە دەو هەر شـتێکی دەیبەخشنەوەدایە کە وڵامی پرسیارەکەیە، زێدە شتێک خراوەتە پاڵ کە بەو شـتە نەبـێ ئینفـاق و بەخشینەکە تەواو نابێ. شتە دەپاڵخراوەکەش باب و دایک و .. ئەوانەن کە نەقەکەیان دەدرێتێ.

جگە لەوەش پرسیارەکە بە حەرفی (ما) کراوە، واتە (مَـا أَنفَقْـتُم) پرسـیاریش لە چـۆنیەتی خەرجە، چونکە زاندراوە ئەوەی خەرج دەکرێ هەر ماڵە، بۆ خـاتری نزیکـی لە خـودا. ئەوەش دوورە لە خەیاڵ و فکر بکوترێ ئەو ماڵەی خەرج دەکرێ چییە؟ بەڵـکە ئەوە دێـتە خەیـاڵەوە بە زۆری ئەو خەرجە ماڵە بدرێ بە کێ؟ جا لە سەر ئەو ئەساسە سوئال و جـواب موتـابیقی یەک دەبن. نموونەی ئەو پرسیارانە هەن دە قورئانێدا وەک ئایەتی ٧٠ و ٧١ی بەقەرە:

﴿٧٠﴾ قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ البَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ إِن شَاء اللَّهُ لَمُهْتَـدُونَ ﴿٧١﴾ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لاَّ ذَلُولٌ تُثِيرُ الأَرْضَ وَلاَ تَسْقِي الْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لاَّ شِيَةَ فِيهَـا قَـالُواْ الآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ

**کوتیان لە خودات داوا کە بۆمان بە چاکی ڕوون کاتەوە ئەو مانگایە چۆن مانگـایەکە؟ چـونکە چۆنیەتی ئەو مانگایەمان لێ شـێواوە، ئەگەر وازی لـێ بـێ و بـیهەوێ ئـێمەش لێـی حاڵی و شارەزا دەبین.**

**مووسا کوتی: خودا دەفەرموێ مانگایەک بێ «لا ذلـول» کـاری پـێ نەکرابێـت «تثیـر الارض»: زەوی پێ نەکێڵرابێ. «ولا تسقي الحرث» ئاوی دەغڵودان و کشتوکاڵی پێ نەدرابێت «لا شـیة فیها» لە ڕەنگی خۆی زیاد ڕەنگی دی تێدا نەبێت. ئەوجار کوتیان ئێستا چـۆنیەتی مانگـاکەت ڕوون کردەوە. ئینجا گەڕان و دۆزیانەوە و سەریان بڕی.**

## باسی چۆنیەتی و تایبەتمەندییەکانی مانگای بەنیئیسـرائیل

پاش ئەوەی بەو هەموو پرسیار لە سەر لێکردنەوە، مەسەلەکەیان لە خۆیـان ئاڵۆزانـدبوو و وەخت بوو سەری ببڕن خۆ ئەگەر ئەو جوولەکانە هەر لە سـەرەتاوە هۆشـیان لە جێـی خۆیـدا بوایە، بەبێ ئەو هەموو پرسیارە هەر مانگایەکیان سەر ببـڕایە، فەرمـانەکەی خـودا فەرمـانی پـێ

دابوون کە مانگایەک سەر ببڕن دەهاتە جێ، واتە هەر مانگایەک با ـ جگە لەوەی مانگایەکی پیر بێت یا گەنج، زەرد بێت یان بۆر، ئیشی پێ کرابێت یان نا.

ئەگەر بەرجەوەند بین ئەو جوابە کە ئایەتی ٧١ە موافقی پرسیارەکانی ئایەتەکانی ٦٨ و ٦٩ و ٧٠ن. چونکە ئەوە یەقین بوو ئەو مانگایە مانگایەک بوو چۆنیەتی دەگەڵ سیفەتەکانی هەر یەک بوون. چونکە کاتێ بکوترێ: (ما هي) چییە ئەو مانگایە؟ ئەوە نایێتە پرسیار لە ماهیەتی مانگا، بەڵکە دەبێتە پرسیار لە سیفەتەکانی؛ چونکە بە سیفەتەکان هەڵداوێردرێ لە غەیری خۆی. بەو پێیە دەبێ بکوترێ ئەو جواب و سوئالە موتابیقی یەکن.

**پوختەی مەبەست:** دەو ئایەتەدا بە سبووتێکی یەقینی گەیی کە ماڵ و سامان دە زاتی خۆیاندا خێرو نیعمەتی خودان، هەر وەک لە ئیشارەی ئایەتی ٨ی عادیات دەردەکەوێ: ﴿وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ﴾ ئینسان بە شیددەت ماڵدۆستە. دێرەدا ماڵ خێرە، بەڵام کاتێ ئینسان ئەو ماڵ و سامانە خێرەی لە ڕێگای ناپەسەند و شەریعیدا خەرج کرد ئەوە جگە لەوەی بە زەرەری دنیا و قیامەتی تەواو دەبێ، دەشتوانین بڵێین: ماڵ ڕەوایە و سامانی خێر دێردایە ئاڵوگۆڕ دەکرێ بە شەڕ. واتە ئەگەر ماڵ و سامان دە جێی خۆیدا خەرج نەکرێ، نەبێ چاکترە.

**کورتەی جواب و سوئال دە جوملەی (ماذا ینفقون)دا:** دیارە دە ئادابی عەرەبدا سوئال بە (ماذا) سوئال لە ماهیەت و نەوعیەتە کەوایە دەبێ وڵامەکەش بە ماهیەت و نەوعیەت بێ. هەروەک هەستی پێ دەکرێ دە ئایەتەکەدا پرسیار لە ماهیەتی نەفەقە دەکرێ، واتە پرسیارکەر دەڵێ: ئایا چ جۆرە ماڵێک خەرج بکرێ دەبەخشینەوەی ماڵدا چاکە؟ کەچی وڵامەکەی ئەوانە بەیان دەکا و نیشان دەدا کە بۆ نەفەقە پێدان چاکن. ئەوە پرسیار و جواب موتابەقەتیان نەکرد.

وڵام: دەبێ بکوترێ کە جواب تەنیا وەسفی ئینفاق نییە، بەڵکە هەم وەسفی ئینفاقە هەم وەسفی ماهیەتی ئینفاقە، هەردووکان دەگەیێنێ وڵامەکەیانی کاتێ کوترا ﴿مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ﴾ واتە هەر چەشنە ماڵێک بێ فەرق ناکا بیدەن بە دای و بابان بە کوردی، ئەو وڵامە واتە (مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ) زۆر حەکیمانەیە. چونکە پرسیارکەر تەنیا ماهیەت پرسیار دکا، ئەمما خودای تەعالا بۆ تەواوی و کەماڵی مەسئەلەکە هاتووە سیفەتی چاکیەکەی و هەم بە کێ بدرێی نەفەقەکەی بەیان کردووە تاکوو پرسیارکەر بە ئامانجی تەواو بگا: واتە چ چاکە لە ئینفاق، بۆ کێ چاکە ئینفاق. بۆ زێدە زانین تبيين الفرقان، ج٤، ل ٢٩٠؛ تەفسیری کەبیر هەر وا بەو دوور و درێژییە.

**پوختە:** ئایەتی پیرۆزی ٢١٥ی بەقەرە سابیتی کرد نەفەقەدان بە دایک و باب لە لایەن کوڕی

خاوەن دەستەڵات واتە خاوەن ماڵ و هەروا ئەوەشی بەیان کرد بە تەوری گشتی ئینفاق خێرە و تەرتیبی خێر دانەکەشی لە کوێڕا تا کوێ بەیان کرد واتە لە دایک و باب‌ڕا تا هەچی خاوەن نیازە و لەو کافری غەیری شەرکەر بێ.

پێغەمبەر دە دوو ساڵەی کۆچیدا بۆ مەدینە ئەمر و دەستوور و ئیجازەی شەڕی پێ دەدرا بە وەسیلەی ئایەتی ۲۱۶ی بەقەرە. دیارە هەم عەقڵ و ویژدان هەم غیرەتی ئایینی و وەحیی ئاسمانی هەم غیرەتی ئینسانی ئەوە دەسەلمێنێ و بە ڕەوای دەزانێ کە لە سەر هەموو گیان‌لەبەرێک ئەرکە و واجبە کە دە بەرابەر دەس‌درێژکەران و تەماتێکەران دەبێ ڕاپەڕین بکرێ و ڕاناپەڕن بێ‌گومان ئەوانەی چێژەیان لە خۆناسی و خوداناسی و ئایین‌ناسی ژیان و کەرامەتی ئینسانی نەکردووە ئەوانە لە ڕاست چاک و خراپ و کەرامەت و بێ‌کەرامەتیدا بێ تەفاوەتن، جا کاتێ دوژمنانی وەحیی ئاسمان دیتیان پێغەمبەر (محمد المصطفی)ﷺ بەرەبەرە پایەگای خۆی دە ناو وڵاتی مەدینەدا پەرە پێدەدا داخ و حەسرەت گرتنی و داپۆشین قەستی هێرش بردنە سەر پێغەمبەر و یارانی پێغەمبەریان بە ئامانجی ئەوەی بەرگری بکەن لە ئایینی ئیسلام و ئەو ناو و ناوبانگ و شۆرەتەی لە ناو بەرن و وەیکووژێنن. خودای تەعالا بۆ وەی پێغمەبەر و یارانی ئیسلام وەخۆ کەون و ڕێ‌وشوێنی خۆیان بگرنە بەر بەبێ دوودڵی و دڵەڕاوکێ، شەڕ و بەربەرەکانی دوژمنانی هێرشکەریان لە سەر واجب کرا، و داب و باو و ئادابی شەڕیان بە تەواوی بۆ دیاری کرا بە وەسیلەی ئایەتی ۲۱۶ی بەقەرە:

﴿۲۱۶﴾ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ

**ئەی موسوڵمانینە! ئێوە غەزاتان لە ڕێگای خودادا لەسەر فەرز کراوە، ئەگەرچی خۆتان حەزی لێ ناکەن، جاری وا هەیە ئێوە حەز لە شتێک ناکەن کەچی ئەو شتە خێری ئێوەی تێدایە. وە واش دەبێ کە حەزتان لە شتێک دەبێ، کەچی ئەو شتە خراپە و زیانی بۆتان تێدایە. ئەوە شتێکە هەر خودا خۆی دەیزانێت، نەک ئێوە. غەزا و تێکۆشان لە ڕێی خودادا دە دنیادا مایەی سەربەرزییە و لە قیامەتیشدا مایەی شادبوونە بە بەهەشتێ.**

## واجب بوونی شەڕ و پێ‌ناخۆش‌بوونی هێندێک لە موسوڵمانان

خودا لە سەری بە واجب گێڕان و کردیە بە ئەرکێکی ئیمانی و ویژدانی لە سەرتان کە دەس دانەنوێنن لە بەرابەر ئەو کەسانەی کە بە دوژمنانە دەیانهەوێ خاک و نیشتمان و ئایین و ویژدان

و بکەنە جێگای خۆیان و تاڵان و داگیـری کەن و بە چـاوێکی سـووک بـڕواننە شەخسـیەت و کەرامەت و ناموستان. دیارە ئەو دەسـتووراتە بـۆ یەکەمـین جـار دە ئـایەتی ١٩٠ی سـوورەی بەقەرەدا ئاماژەی تەواوی پێ کرا وەک ﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ﴾ واتە: لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا پێغەمبەرﷺ کە بۆ عەمـرە دەیویسـت بچێـتە مەککە، سەرانی قورەیش ڕێگایـان پـێ نەدا زیـارەتە عەمـرەکەی کەوتە سـاڵی دوایە. دە سـاڵی دوایەدا کە هاتنەوە بۆ مەککە بۆ ئەو زیارەتە، ترسی ئەوەیـان بـوو دە حـاڵی ئیحـرام و زیارەتـدا بێباوەڕانی قورەیش بە هەلی بزانن و ڕاماڵیاندەنێ. خودای تەعالاش ئەو دەستوورەی پێ دان: **ئەوەی بەرەنگارتان دەوەستنەوە شەڕتان پێ دەفرۆشن، ئێـوەش بەرەنگاریـان ببـنەوە و لێیـان وەخـۆ کەون، بەڵام لە سنووری دەستوور تەجاوەز مەکەن واتە بێگوناه مەکوژن. خودا تەجاوەزکارانی خۆش ناوێ.** بـۆ درێژیەکەی بڕوانە جێگای خۆی ئایەتەکە.

دەبێ ئەوە بسەلمێندرێ و باوەڕیشی بکـرێ کە شـەڕ دەگەڵ ئەو کەسـانەی کە دەیـانهەوێ مافی ئایین و ئەخلاقی و ویژدان و نیشتمانی و کەرامەتی ئینسانیەت پێشێل کا و زەوتی کا و بـۆ خـۆی سـەروەریت لە سـەر بکـا دە مـاڵە خۆتـدا، ئەرکێکـی ئینسـانی و ئیمانـی و ویژدانـی و سـرشتییە، لە سەر ئەو ئەساسە ئایینە هەرکەس بتوانێ ڕاپەڕێ بە گیان یا بە ماڵ یا بە زمـان یـا بە هەر شێوەیەک کە ئیمکانی هەیە ڕانەپەڕێ و ڕانەکاتە مەیدان و دەستەپارەی خۆی نەهاوێتە سەر مەشقەڵی ئاوری جیهاد، ئەوە بێگومانە مەوجوود و بوونەوەرێکی موزیرە، دڕوویەکـی بەرپێـی ڕێڕەوانی ڕێگای شەڕەفە، سەرەتانی لەشی ئـایین و ئەخـلاق و مـافی بەشـەرە، هەروەک دار بە بەرەوە جوانە، ئینسانیش بە شەڕەفەوە جوانە، داری بێبەر بۆ بڕین باشە، ئینسانی بێویـژدان بـۆ نەبوون باشە.

دیارە ئەوە سەلمێندراوە و حاشای لێ ناکرێ: گیان و ماڵ عەزیز و شیرینە، بەڵام بێگومان سەربڵندی و ناموس و کەرامەت کە مافی ئینسانن عەزیزتر و شـرینترن. جـا بـۆیە دەبـێ ئەوە بزانین هەچەن حەز ناکرێ شەڕ چونکە ئەوانەی تێیدان واتە کوشتن و نەمان و بێ ژیان و تـاڵان کردن، بەڵام کەرامەت و ویژدان و مافی بەشەریەت هەر بە مـۆری و سـاغ و سـەلامەتی هەیە و ماوە. جا بۆیە خودای تەعالا بۆ ئیسـباتی ئەو داوایە دەفەرمـوێ: ﴿وَهُـوَ كُـرْهٌ لَّكُـمْ وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ﴾ واتە لە هەمان کاتی شـەڕدا لە ترسی گیان لە دەسدان زۆرتان شەڕەکەتان پـێ ناخۆشـە. بەڵام زۆر شـتی وا هەیە لە بەر چەن

هۆیەکی دنیایی پێشتان ناخۆشە بەڵام ئەگەر بەرجەوەندی عاقیبەتی بن، پڕ لە خێر و بێری دنیا و قیامەتتانە: خێری دنیایی حیفزی ناموس و کەڕامەت و شەرەفە، کە ئەوانە بەئەرزشترین شتن بۆ ئینسان چونکە ئینسان بە ناموس و کەڕامەت و شەرەفەوە ئینسانە و جوانە، ئەگەر ئەوانەی نەبێ، زۆر لە حەیوان ژێراترە. زۆر شتیش هەیە ئینسان حەزی لێ دەکا و دەیحوبێنێ کە ئەگەر بەرجەوەندی بێ، سەراپا شەڕە و چارەڕەشییە و بێئابڕووییە بۆ دنیا و قیامەتی ئینسان. شەڕی دنیایەکەی ئەوەیە تەمات تێکەن لە پیاوەتیت کەن و مل دانەوێنی، ئەوە پیاو و مرۆ و بەشەر نی، ئابڕوو مرۆت پێ دەچێ. و لە قیامەتیشدا تاوانباری چونکە خودا بە ئینسانی مرۆڤ بە زیبک و ئەقڵ دروست کردووی کەچی هەموو ئەو سیفەتە باشانەت لە خۆ داڕنی، بە کوردی بە گوڵ گوێ بڕای، کەچی بە دێڵ دەرچووی.

**تیوتیوە:** دیارە ئەوە سابیت بووە کە پێغەمبەر لە شاری مەککە ئیزنی شەڕ کردنی پێ نەدرابوو، هۆیەکەی خودا دەزانێ و ئەقڵی بزۆزیش بە پێی خۆ تێهەڵقوتانی وای باوەڕە کە دەبێ ئینسان لە ناخی دەروونیدا باوەڕێکی توند و تۆڵ و پتەوی ببێ کە بتوانێ بە گیانەوە بپارێزرێ و دیفاعی پێ بکا، ئەوکات پێغەمبەر کە لە مەککە بوو هەر خەریکی ئەو قانون و شەرایەتە بوو بەڵام کە هیجرەتی فەرموو بۆ مەدینە، ئەو شەرایەتە هاتە ناو دەروونی یاران و موسوڵمانان، کە حازر بوون گیان بەخت کەن دە پێناویدا. جا بۆیە خوداش پاش بەدیهاتنی ئەو شەرایەتە پیرۆزە واتە گیاندانان لە پێناو خودا و ئایینی خودادا خوداش ئیزن و دەستووری شەڕی پێ دان و ئیجازەی دانێ بۆ دیفاع لە مافی ڕەوای خۆیان. و هەروا دە جوملەی (وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ)دا هەست بەو ئیشکالە دەکرێ: دیارە خودای تەعالا ڕووی دە موسوڵمانانە، موسوڵمانانیش هەموو دەستوورەکانی خودایان لە لا بەئەرزشە و قبووڵە، کەوایە چۆن دەکرێ پێیان ناخۆش بێ، بەرەو پیری ئەمری باری بچن؟ وەڵامەکەی: (كُرْهٌ) واتە دشوار و سەخت یانی موسوڵمانان شەڕیان پێ سەخت و گران و دشوارە دەگەڵ ئەوەشدا لە سەر ئەساسی عەقیدە و باوەڕ بەرەو پیری دەچن. یا دەشکرێ بکوترێ ئەو (كُرْهٌ) پێش بە ئەرک و فەڕز کردنی شەڕ بووە لە سەریان.

**پوختەی مەبەست لەو ئایەتە پیرۆزەی ٢١٦ی بەقەرە:**

وا دەردەکەوێ و هەست پێ دەکرێ کە جیهاد و نەفەقە شان بە شانی یەکتر دێن دە مەیدانی فیداکاریدا، هەر ئەوەشە هۆ کە خودای تەعلا پاش باسی لە ئینفاق هاتە سەر باسی لە جیهاد. و هەروا لە ئیشاڕاتی ئەو ئایەتە پیرۆزە ٢١٦یە ئەو ڕاستییە خۆ نیشان دەدا کە لە سەر یاسای شەرعی

باری نابێ ئینسان دە بەرابەر یاسا و دەستووراتی خودای تەعالادا ئەقڵ و دەرکی خۆی بکاتە سەنەد و بەڵگەی واقیعەتی کار، بەو دەلیلە کە ئەقڵ و شعووری ئینسانی سنووردارە هەموو شت نازانێ و لە سەر و بنی کاران ئاگادار نییە. بەڵام عیلم و زانستی خودا بێ سنوورە زانا بە هەوەڵ و ئاخری هەموو بوون و نەبوونێکە. جا ئەدێرەدایە زۆر لە کاروباری دنیادا هەیە ئینسان بە زاهیری بە خێری دەزانێ، کەچی ئاقیبەتێکی پڕ لە شەڕی هەیە. وەکوو خۆدزینەوە لە هێندێک لەو کارانەی دیفاعی لە گیان و نامووس و مافی بە واقعی وەک بەرەنگار بوونەوەی دوژمن، کە ئینسان لەو بارەوە دەڵێ بە من چی دوژمن ڕوو دەکاتە وڵات؟ ئەمن گیان و ماڵم سڵامەت بێ. واتە پارازتنی گیان و ماڵی کە لە خۆنەدان و نەچووندا بۆ دیفاعی دەبینێ، ئەوە بۆ وی شەڕە چونکە دوژمن بۆ گیان و نامووسی ئەو دێ. وەیا دەڵێین زۆر کاری وا هەیە ئینسان بە ئەقڵی خۆی بە شەڕی دەزانێ وەک چوون بۆ شەڕ و دیفاع لە کەڕامەتی بەشەری، کەچی ئاوایە لە ئاقیبەتدا ئەو دیفاعە گەرچی تاڵە چونکە خەتەری گیان لە دەس‌دانی تێدا، بەڵام بەر و سەمەرەی ئەو دیفاعە گیان و شەرەف و کەڕامەت و حەسانەوەی تێدا.

جا بە پێی ئەو یاسا و ئەساسە تەواوی دەستووراتی خودای تەعالا تەشریعی بێ یان تەکوینی (تەشریعی وەک: ئەحکامەکانی نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات و ...؛ تەکوینی وەک: مەرگ و نەمان، وەک مردن و گرانی و ویشکەساڵی و...) بە قازانجی ئینسانە. واتە هەچی لە لای خوداڕا بێتە سەر ئینسان بە قازانجی ئینسانە و خاڵی لە ڕاز و ڕەمزی باری نیە.

بە کوردی و بە کورتی: ئینسان ئەگەر بێزاری دەردەبڕێ لە شەڕ لە ترسی گیان دانە و دنیا بە جێ هێشتنە، خوداش ئەگەر پێی دەفەرموێ: ئەوەی تۆ بە شەڕی دەزانی، خێری بۆ تۆ تێدایە، خێرەکەش ئەوەیە بە سەربەرزی و دەستی پڕ دەچیتە لای خودا.

**پوختەی ئایە:**

ئینسان نابێ تەنیا ئەقڵ بە کافی بزانێ دە بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئایاتی قورئان و ئەحکامی شەرع. چونکە ئەحکاماتی شەرعی لە قورئان وەرگیراوە و قورئانیش دانراوی خودایە کە لە ئینسان چاتر ئاشنا بە ئینسان و نیازەکانی ئینسانە، جا لە سەر ئەو ئەساسە هەر بە ئەقڵەوە مل بدە و نەوی کە بۆ قورئان و ئەحکامی.



پاش ئەوەی خودای تەعالا دە چەن ئایەتی ڕابردوودا هەم شەڕی دیفاعی بە پێویست گێڕا لە سەر موسوڵمانان هەم داب و باوی شەڕیشی تا ئەندازەیەکی پێویست دەگەڵیان بەیان

فەرموو، ئەوجار چونکە خودا لە هەست و ناخی دڵی ئینسان ئاگادارە و دەشزانێ ئینسانە موسوڵمانەکان لە شەڕ کردن لە مانگە حەرامەکاندا نائاشنان و نازانن شەڕ دەبێ یا نەبێ دەو مانگانەدا بکرێ یا نەکرێ؟ خودای ئاگا و حەکیم و کەریم دەیهەوێ ئەو تەمە لە سەر چاوی دڵی موسوڵمانانیدا ڕامالێ و بڕەوێنێ بە وەسیلەی ئایەتی ٢١٧ی بەقەرە:

﴿٢١٧﴾ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ اللّهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ وَلاَ يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّىَ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُواْ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَـئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُولَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ

**ئەی پێغەمبەر! پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ئەو مانگانەی کە شەڕ تێدا کردنیان حەرامە (کە مانگی زیقەعدە، زیحەجە، موحەڕڕەم و ڕەجەبن) ئایا دروستە شەڕیان تێدا بکرێت؟ پێیان بڵێ: شەڕ لەو مانگانەدا خراپە ەبڵام ئەوەی کە بێباوەڕانی مەککە دەیکەن لە ڕێ گرتن لە ئایینی خودا و شەریکدانان بۆ خودا و ڕێ گرتن لە موسوڵمانان کە بچن بۆ حەج و عەمرە و دەرکردنیان لە شاری مەککە، لای خودا گەلێک گەورەترە لە شەڕ کردن لەو مانگانەدا. هەروەها سزا و ئازاردانی موسوڵمانە هەژارەکان بۆ ئەوەی واز لە ئایینەکەتان بێنن، زۆر خراپترە لە شەڕ کردن لەو مانگەدا، ئەوانەی کە دەڵێن لەو مانگەدا شەڕ دروست نیە خۆیان هەموو کاتێک هەوڵی شەڕتان لەگەڵدا دەدەن بەو هیوایە کە لە ئایینەکەتان وەرتانبگێڕنەوە، جا هەر کەسێکتان لە ئایینەکەی هەڵگەڕێتەوە و بە کافری بمرێت ئەوە ڕەنج بە خەسار دەبێ، دەبنە هاوڕێی دۆزەخ بۆ هەتا هەتایە.**

## شەڕ لە مانگی حەرامدا

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانین:

دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر چەن کەسێک لە یارانی موهاجرینی ناردن بە سەرۆکایەتی عەبدوڵڵا کوڕی جەحش لە دوای مانگی «جمادی‌الاخر» وە لە پێش شەڕی بەدردا بە دوو مانگ. ناردنی بۆ شوێنێک کە پێی دەکوترێ «بطی نحله» لە بەینی مەککە و تائیفدا کە ئەو جێگایە سەرەڕێی کاروانی قوڕەیشیەکان بوو. تاکوو دەنگ و باسی ئەو کاروانەی بۆ بێننەوە کە بەڕێوە بوو کاروانکە لەو شوێنەدا شەڕ لە نێوان وان و کاروانەکەدا دەستی پێ دەکرێ و سەرۆکی کاروانەکە بە ناوی عەمری حەفری دەکوژرێ و دوو کەسیش لە هاوڕێکانی بە دیل دەگیرێن دەگەڵ

کاروانەکەدا. دیارە یارانی ڕەسوول ناشزانن کە ئەو ڕۆژە یەکەم ڕۆژی مـانگی ڕەجەبە کە شـەڕی تێدا قەدەغەیە. سەرەنجام کاروان و دیلەکان دێننەوە بۆ شاری مەدینە بۆ خزمەت پێغەمبەر. کاتێ پێغەمبەر لە جەریانەکە حاڵی دەبێ دەفەرموێ: مەگەر ئەمن پێم نەکوتوون لە مانگەکانی حیرامدا شەڕ حەرامە و ئازاردانی ئینسان حەرامە؟ کاتێ پێغەمبەر ئەوەی فەرمـوو ئەو یـارانەی دەسـتەی پێغەمبەر خەفەت و ناڕەحەتی دایاندەگرێ و زۆر دەترسن لەوەی لە باتی فەتح و شانازی گونـاه و تـاوانێکی زۆر گەورەیـان بـۆ بنووسـرێ. ئەو جەریـانە بە پێغەمـبەر و یـارانی بە گـوێی بێباوەڕەکانی قوڕەیش دەگا، ئەوانیش دەیـکەنە چـاووڕاو و تەبلیغـاتی گەورە و دەڵـێن: بەڵـێ محەمەد دەڵێ شەڕ لە مانگی حەرامدا حەرامە کەچی دەشیکا و خوێن دەڕێژێ. دیارە مـحەمەد بێحـورمەتی بە مـانگی حەرام دەکـا. ئەو قسـە و باسـە زەلام دەکـرێ و گەورە دەبـێ، موسوڵمانەکان دێنە قسە و پرسیار دەکەن لە پێغەمبەر و دەڵێن: یـا ڕەسـوولی خـودا! ئایـا شـەڕ کردن دە مانگی حەرامدا تا کوێی حەرامە؟ ئەوە ئەو بێباوەڕانە گوێی دنیایان پـێ کەڕ کـردووە! پێغەمبەریش لە لایەن خوداوە وەحی بۆ دێ بە ئایەتی ٢١٧ی بەقەرە. (تەفسیری خاڵ)

بەڵێ شەڕ کردن دەو مانگانەدا حەرامە و قەدەغە کراوە بەڵام کاتێکی کە دوژمن هـات و کە دەرکی پێ گرتی و ڕێی خوداپەرستی لێ گرتی و مەنعی کردی لە چوون بـۆ حەج و عەمـرە، و دەریشـی کـردن، بە هـۆی کەڵـک وەرگـرتن لەو قەدەغەیە ئەوە زۆر تـاوانێکی گەورەتـرە لەو دەستووراتە قەدەغەی شەڕ دەو مانگانەدا چونکە ئەگەر بێتوو بە گژ دوژمنـدا نەچیـتەوە یـارانی ئیسلام بێباوەڕان بەزەییان پێدا نایەن، کەوایە دەبێ لە هەموو کات و زەمـان و مەکانـدا دوژمـن دەرکی پێ گرتی و خەریک ئابڕوو بردن و کەڕامەت شکاندنت بـوو، بە تەواوی هێـز و توانـاوە دەبێ بەرەنگار ببییەوە دەنا بەبێ ئیمانی و بەبێ ویژدانـی لە قەڵەم دەدرێـی. ئینسـان دەبـێ ئەوە بزانێ: هەر مافێکی خودا دابێی و پێی ڕەوا دیبێ بیپارێزێ و دیفاعی لێ بکەی، دەنا بە خـوێڕی دەردەچی لە دنیا و قیامەت.

لە سەر ئەو پرسیارکەرەی کە دەڵێ بە پێغەمبەری: ئایا شەڕ دە مـانگی حەرامـدا حەرامە یـا حەرام نییە! نەزەری جۆراجۆر هەیە، واتە هێندێک کوتوویانە ئەو پرسیارکەرانە کافرەکان بـوون. هێندێکیش کوتوویانە موسوڵمانەکان بوون.

مەبەست لە (شهر الحرام) دەو ئـایەتەدا مـانگی ڕەجەبە بە پێـی قەولێـک ئەوە کافرەکـانی مەککە بوون واتە کاتێکی ئەو کافرانە دیتیان عەمـری کـوڕی حەفـری سـەرۆکی کاروانەکەیـان

دەکوژرێ دەیکەنە هاوار و دەنگۆیەکی گەورە و دەڵێن بۆ مەگەر محەمەد دە مانگی ڕەجەبدا کە یەکێکە لە مانگەکانی حەرام، شەڕی تێدا بە ڕەوا داناوە؟

قەولی ڕاست و یەقینیش ئەوەیە: کاتێ موسوڵمانەکان ئەو هاوار و دەنگۆیان لە کافرەکـانی مەککە بیست، تێگەیشتن ئەو هاوارە ئەگەر وڵامی نەدرێتەوە، وەک مـۆرانە مـۆرکە دەخـاتە نـاو دڵی عالەم بەتایبەت دڵی خاوەن باوەڕان. جا لە سەر ئەو نیەتە موسوڵمانەکان هـاتن پرسـیاریان لە پێغەمبەر کرد بەو جـۆرە: دە مـانگی حەرامـدا شـەڕ دروسـتە و ڕەوایە دە ئـایینی ئیسـلامدا؟ خودای تەعالاش بۆ وەڵامی ئەو داوایە بە پێغەمبەری وەحی دا بەو ئایەتە ٢١٧یە.

## مورتەد

لە بەر ئەوەی دە ناو ئایەتەکەدا باسی (مرتد) کرا واتە ئەوانەی لە ئایینی ئیسـلام بـادەدەنەوە وەلای ئایینی پێشوویان کە کوفر بووە، پێویستە نەختێک لە سەر مورتەد بدوێین. ئەوە کە خـودا فەرمووی: ﴿وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ...﴾ واتە کەسـێک لە ئێـوەی موسـوڵمان کە لە ئـایینی خـۆی پاشگەز بۆوە، و هەروا دەو حاڵەتەدا مرد ئەوە کافرە، ئەوە خۆی هاوارە وەلای موسوڵمانان کە لە سەر ئاینیان وەلا نەکەون.

شاریعەکان: شافعی هەر بە مەحزی ئاوەژوو بوونەوەی لە ئایین هەچی ئەعمالیەتی بە فیڕۆ دەچێ، بەو شەرتە لە سەر ئەو حاڵەتە بمرێ. کەوایە دەڵێن هەر بە مورتەد بوون ئەعمالـی باتـڵ نابێ.

مالکی و حەنەفی هەر بە مورتەد بوون ئەعمال لە نـاو دەچـێ و لەو دووبـارە بـادانەوە بـۆ ئیسلام.

مورتەد ئایا مورتەد پێش کوشتنی داوای تۆبە و گەڕانەوەی لێ دەکرێ یان نا؟

حەنەفی دەڵـێ بەێ، دەبـێ داوای لـێ بکـرێ بەو دەلـیلە دە دەورانـی حەزرەتـی عـومەر کابرایەکی مورتەدیان کوشت بێ داوای تۆبە. عومەر فەرمووی دەبا داوای تۆبەو لێ کردبا.

کۆی زانایانی شەرع سێ جار داوای تۆبە لە مورتەد دەکەن جا پاشان کوشتن، بەو دەلـیلە: ژنێک بە ناوی (ام مروان) مورتەد بـوو. مـورتەدی وییـان بە پێغەمـبەر ڕاگەیانـد، پێغەمـبەریش فەرمووی داوای گەڕانەوەی لێ بکەن، ئەگەر قبووڵی نەکرد پاشان حوکمی کوشتنی بدەن.

ماڵی مورتەد پاش کوشتنی بۆ کێ دەبێ؟

شافعی و مالکی و ئەحمەدی: میرات و کەلەپووری مورتەد بۆ بەیتولماڵی ئیسـلام دەبـێ،

چونکە موسوڵمان میرات لە کافر ناگرێ.

حەزرەتی عەلی و حەسەنی بەسری و کۆیەکی دی کوتوویانە: میراتەکە بۆ واریسە موسوڵمانەکانیەتی.

حەنەفی: ئەوەی دە حاڵی مورتەدیدا وەدەستی هێناوە بۆ بەیتولماڵی ئیسلامە، و ئەوەی دە کاتی ئیسلامیدا وە دەستی هێناوە بۆ وەرەسە موسوڵمانەکانیەتی.



خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم لە دڵخۆشیدانەوەی خاوەن باوەڕان ڕانەوەستاوە و ڕاناوەستێ. دێرەدا خودا دەیهەوێ دڵخۆشی ئەو پۆلە ئەسحابانەی موهاجر کە بە فەرمانـدەیی عەبدوڵڵا کوڕی جەحش دە مانگی جیمادیئاخردا و لە پێش شەڕی بەدردا بە دوو مانگ ڕەوانەی ئەو شوێنە کران کە ناوی «بطن نخله» بوو دە مابەینی مەککە و تائیفدا کە دەروی کاروانی قوڕەیشی بوو تاکوو بتوانن دەنگ و باسی ئەو کاروانە وەدەس خەن و دەو مەئمووریەتەدا شەڕ ڕوو دەدا سەرۆکی کاروانی قوڕەیشیەکان بە ناوی عەمری حەفرمی دەکوژرێ. سەرەنجام هاوار هەڵدەستێ کە پێغەمبەر و یارانی ڕێز و حورمەتی مانگی حیرامیان وەک مانگی ڕەجەب بێ، شکاند. پێغەمبەریش پاش ئەوەی کە دڵخۆشی شەڕکەرەکانی دەداتەوە بە هۆی دابەزینی ئایەتی ٢١٧ کە دڵنیا بن حورمەتی مانگی ڕەجەبو نەشکاندووە بەڵکە ڕێزو لێ گرتووە. بە هەر حاڵ ئەو شەڕکەرانە جگە لەوەی کە بە دەستووری پێغەمبەر بۆ ئەو مەئمووریەتە چووبوون و هەروا لەوەی ئایەت لەو بارەوە دابەزی وەک ئایەتی ٢١٧ بێ، بەڵام خودا کە لابەری چرپە و خورپە و هەستی دڵانە، دەیزانی کە لە ناو دڵی ئەو فیداکارە خاوەن باوەڕە بەهەستانە نەختە هەستێکی خەفەت لەمەڕ کوشتنی عەمری حەفرمی سەرکاروانی قوڕەیش دە مانگی ڕەجەبدا هەیە، هات بە وەسیلەی ئایەتی ٢١٨ ئەو نەختە تارماییە و خەفەتەشی ڕاماڵ دا و لایبرد. جا بە وردی سەیری ناو دەروون و سیمای ئایەتەکە بکە ئەی تەماشاچی!

**﴿٢١٨﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَاهَدُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أُوْلَـئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ اللّهِ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ**

بێگومان ئەوانەی کە ئیمانیان هێنا و لە دەست سزای بێباوەڕان لە مەککەوە کۆچیان کردووە بۆ مەدینە دە ڕێگای خودادا هەوڵیان داوە و غەزایان کردووە، ئەوانە چاوەڕێی ڕەحمەتی خودا

**دەکەن و خوداش زۆر لێخۆشبووە و خاوەن بەزەییەکی بێ بڕانەوەیە.**

## کۆچ و سەفەر لە ڕێی خودادا (مهاجرت)

ئەوانەی بڕوایـان هێنـا بە خـودا و پێغەمـبەر و بـۆ ڕەزایەتـی خـوداش دەگەڵ پێغەمـبەر لە مەککەوە بەرەو مەدینە کۆچیان کرد و چاویان پۆشـی لە هەچـی مـاڵ و سـامان و سـەروەت و جێگا و ڕێگا و نیشتمانە، ئەوانە ڕاستە چاوەڕوانی ڕەحمەتی خودان ئەمما بێگومانە ڕەحـمەت و بەرەکەتی خودا چاوەدێر و چاڕوەوانی ئەوانە.

دەشتوانین دە دابەزینی ئەو ئـایەتە پیـرۆزەدا ئەوەش بڵێـین: عەبـدوڵڵای کـوڕی جەحـش کوتبێتی یا ڕەسوولی خودا! دڵم قەناعەتی پەیدا کردووە کە خودا ئەو شـەڕەم بە تـاوان لە سـەر حیساب ناکا، بەڵام دەمهەوێ ئەوەش بزانم:بڵێی خێر و سەوابێکیشم پێ نەدا؟ خوداش ئیقناعی بە دڵی داون کە جگە لەوەی گوناەو ناگاتێ، خێریش و دەگاتێ. جگە لەوەش خودای تەعالا لە پێشدا غەزای لەسەر واجب کردن وە دە ئایەتی ۲۱۶ی بەقەرەدا، ئاماژەی وەلا فەرمووە. و هەروا خودا ئیشاڕەشی وەلای ئەوە فەرمووە: کەسێک بێدەلیل لە ڕووی بەهانە تەرکی ئەو جیهادە بکا بە تاوانی بۆ دێتە حیساب، جا ئەو جۆرە گوفتارە هەڕەشەیە (وەعیـدە)، ئەوجـار خـودا بە دوای وەعید سوننەتی خۆیەتی وەعدە دێنێ، جا لە سەر ئەو ئەساسە دەتوانین بڵێین دابەزینـی ئـایەتی ۲۱۸ مزگێنی و وەعدەی خۆشە بۆ موهاجران.

جگە لە هەموو ئەوانەش کەسێک دەگەڵ پێغەمبەری کۆچی کردبێ (موهاجرین) و خاوەن باوەڕیش بێ و موجاهیدیش بێ دە ڕێـی خـودادا، بە غەیـرەز چـاوەڕوانی ڕەحـمەت لە خـودا چیدی دەبێ چاوەڕوان کا؟

دێرەدا ئیشارە وەلای کۆچ (هجـرت) کـرا. دڵ دەیـهەوێ بزانـێ کـۆچ کەنگـێ ڕەوا دەبـێ بکرێ؟ و کەی ناڕەوایە؟ کاتێ نەتواندرا و ڕێگای دیفاع نەبوو دوژمنیش دەهاتە پێش ئیمانت لێ بدزێ و ئازارت دا، ئەوە سەنگەر دەبـێ وەگـوێزی واتە هیجـرەت بـکەی. بەڵام کـاتێ ڕێگـای بەربەرەکانی و دیفاعت هەبێ، نـاڕەوا و تـاوانە هەڵێـی و وڵاتـی بـۆ چـۆڵ کەی، بکـوژرێی بە هیلاک دەچی، ئەمما دە کاتی دیفاعدا بێگومان شەهیدی.

وەک دەڵێن کاتێ پێغەمبەر هیجرەتی کرد دەگەڵ هەندێک لە یـارانی بـۆ مەدیـنە، خەڵکـی مەدینە ئارەقیشیان دەخـواردەوە و قوماریشـیان دەکـرد. ئەو خەڵـکەش ئەوەیـان دەزانـی کە ئەو پێغەمبەرە لە حەڵاڵ و حەرام باشتر دەزانێ چونکە لە لایەن خوداوە کراوەتە پێغەمبەر بۆ ڕێنوێنی

عالەم بۆ ڕێگای ڕاست و لادان لە ڕێگای خراپ، و هەروا شارەزا کردنی خەڵک لە سەر حەڵاڵ و حەرام. جا لە سەر ئەو باوەڕ و نیەتە هاتن پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد لەو بارەوە واتە حەرامی ئارەق و قومار.

وەک دیاریشە دوو مەتڵەبی ئەساسی دە ئایەتی وڵامدا دیاری کراون: ١. لە مەڕ حەرامی ئارەق و بێهۆشکەری ٢. لە مەڕ ئینفاق.

دیارە پێغەمبەریش لە سەر ئەساسی باوی وەزیفەکەی ئەگەر پرسیارێکی لێ کرابێ بۆ وڵامەکەی چاوەڕوانی خودای کردووە کە بۆی وڵام داتەوە نەک ڕاستەوخۆ بە پێی ئەقڵ و بەراوەردی خۆی وڵامی دابێتەوە. خودای تەعلاش بە وەسیلەی ئایەتی ٢١٩ پێغەمبەری ڕێنوێنی دەکا و دەفەرموێ:

﴿٢١٩﴾ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ

**ئەی پێغەمبەر! لە بارەی خواردنەوەی ئارەق و خواردنی قازانجی قومارەوە پرسیارت لێ دەکەن، ئەتۆش پێیان بڵێ: هەردوو ئەوانە گوناە و زیانێکی گەورەیان تێدایە. ئەگەرچی هەندێک قازانجی خەڵکیشیان تێدایە بەڵام زەرەر و زیان و گوناهەکەیان لە سوودەکەیان گەلێک زیاتر و زۆرترە. پرسیارت لێ دەکەن کە چ بکەنە خێر و ببەخشن؟ لە وەڵامدا پێیان بڵێ ئەوەی کە بۆتان دەگونجێت و لە خۆتان زیادە، ئەوە ببەخشن. نەک ئەوەی کە خۆتان و ماڵ و منداڵتان پێویستتان پێیەتی و لێتان زیاد نییە. خودا بەو شێوەیە ڕێگەی شەریعەتتان بۆ ڕوون دەکاتەوە بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە و دەست بکەنە کاری چاک و پاک. تاکوو لە هەر دوو وەرزی دنیا و ئاخرەت سەرفراز بن.**

## سوود و زیانی ئارەق و قومار

بێ گومان ئارەق و هەر جۆرە خواردنەوەیەک کە مرۆڤ سەرخۆش کات، زیانی ئەقڵ و ماڵ و لەشی ئینسانی تێدایە. هەروا قوماریش مایەی دروستبوونی ڕق و کینە و نخۆشی دەبێ لە نێوان ئەوەی بردوویەتەوە و ئەوەی دۆڕاندوویەتی. هەروەها بۆ هەندێک کەس مایەی موفلیس بوون و فەوتانی پارە و سامانە، بۆ هەندێکی دیش مایەی دەسکەوتنی پارەی بەلاشە. (خەمر: ئارەق، هەموو جۆرەخواردنەوەیەکە کە ئادەمیزاد سەرخۆش و بێ ئەقڵ دەکا).

چونکە هەر دوو ئایەتی ٢١٩ و ٢٢٠ بە پرسیارەوە تێک بەستراون ئەویش دەڵێین جا پاشان

تێڕوانین و ئاوڕ وەسەر دانەوەیان بۆ دەکەین:

﴿٢٢٠﴾ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْيَتَامَى قُلْ إِصْلاَحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ وَإِنْ تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ الْمُفْسِدَ مِنَ الْمُصْلِحِ وَلَوْ شَاء اللَّهُ لأَعْنَتَكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ

**بیر بکەنەوە تا دە هەردوو وەرزی دنیا و ئاخرەتدا سەرفراز بن. لێت دەپرسن ئەی پێغەمبەر دەگەڵ بێبابان (هەتیوان) چۆن وەجووڵێین؟ ئەتۆش پێیان بڵێ: بە چاکە دەگەڵیان ڕەفتار بکەن و وەجووڵێن. چ لە بابەت ماڵ و سامان و پووڵەوە، چ لە ڕوی ئەخلاق و سەرپەرستی و بەخێوکردنیانەوە. ئەگەر لە بابەت مامەڵە و کاسپیدا تێکەڵاوییان بکەن، ئەوە زیانی نییە، بەو شەرتەی بە چاوی ئینساف و عەداڵەت و سۆز و بەزەی بابەتی وبرایەتی سەیریان بکەن، خودا چاک و پاکان و خراپ و خراپەکاران لێک دەکاتەوە. ئاگاداری کار و کردەوەیانە. خودا ڕێگای کاسپی و تێکەڵاویتان لێ ناگرێت دەگەڵیان، خودا نایهەوێ تووشی زەحمەتتان کات بە ڕێ لێ گرتن دەگەڵیان، خودا خاوەن توانایە، فەرمانەکانی بێ هەدەف نین، دوارۆژیانی لە بەرچاوە.**

## باسی هەتیوان و بێبابان

### ئاوڕ دانەوە و تێڕوانین لە هەر دوو ئایەتی ٢١٩ و ٢٢٠:

لە بابەت ئارەق خواردنەوە و قومار کردن پرسیارت لێ دەکەن کە ئایا دروستن دە ئایینی ئسلامدا یان دروست نین؟ ئەتۆش لە وڵامیاندا پێیان بڵێ: دە ئەنجامدانی ئەو دوو شتانەدا گوناهی زۆر گەورە هەیە، چونکە زەرەری زۆر گەورەیان لێ وەدی دێ. یەکێک لەو گوناهە گەورەی کە لە ئەنجامدانی ئارەق خواردنەوەدا تووشی ئینسان دەبێ لەڕێوەیە ئەوەیە خودای تەعالا ئەقڵ و شعووری کە داوەتە ئینسانی بۆ وەی وەک نوورێکی زۆر ڕووناک بەرپێی خۆی پێ ببینێ تاکوو دە کەند و لەندی دنیای ڕەش و تاریکدا نەکەوێ و نەمێنێتەوە، ئەو وەسیلە گەورەیە بفەوتێنێ و نەیهێڵێ. ئەوەش واتە ئەو ئەقڵ و هۆش لابردنەی کە بە هۆی ئارەق خواردنەوە بە سەر خۆیدا دێنێ ئینسان، وەک ئەوە وایە: خودا بە خودایەتی پڕ لە ڕەحمی خۆی دەتکاتە ئینسان، ئەتۆش پڕ بە بێ لیاقەتی خۆت، خۆت دەکەیە حەیوان. بە هۆی حیکمەتی خۆی وەسیلەی لە خودا وەنزیک خستنەوەت پێ دەبەخشێ کە ئەقڵە، ئەتۆش ئەو وەسیلەیە دەفرۆشی بە هەوا و هەوەسی دنیایی. خودا دەتکاتە پیاو بە کەرەمی خۆی، ئەتۆش خۆت دەکەیە ناپیاو. خودا میداڵی جێنشینیت پێ دەبەخشێ کە خەلافەتە، ئەتۆش لە باتی ئەو میداڵە پڕ کەڕامەتە، میداڵی نەدامەتی وخۆ دەخەی کە بێئەقڵییە. خودا وە سەرووی فرشتە و پەریانت

دەخا و دەستوور دەدا بە فرشتە کڕنۆشت بەرنێ بە هۆی ئەقڵ و دەرک و شعوور، کەچـی ئەتـۆ خۆت دێنیەوە خوارتر لە حەیوان بە هۆی دوور خستنەوەی ئەقـڵ و شـعوور لە خـۆت. خـودا دەگەڵ تۆ دەدوێ بە هۆی ئەقڵتەوە کەچی تۆ لـووت و ڕووت لە خـودا بـادەدەی و لادەدەی بە هۆی دوور خستنەوەی ئەقڵ لە خۆت. هەزاران هەزاران شتی لایق و بەئەرزش و بەقـیمەت کە خودا بە وەسیلەی ئەقڵ و هەست و شعوور بۆ تۆی دابین کردوون و ئەتۆی پێ بەرز کردۆتەوە، ئەتۆش دێی وەک منداڵێکی نەفام ئەو شووشە پـڕ لە نـووره بە ئەرزیـدا دەدەی و دەیشـکێنی و دەیهاڕی. مەگەر بەو کارە بە تەمای چی؟ دەتهەوێ ببـی بە چـی؟ بەغەیـرەز لە خـودا تـۆران و خزمایەتی دەگەڵ شەیتان، چی دیت پێ دەگا و بە نسیب دەبێ؟ ئەی ئینسانی لە خـۆ گـۆڕاو و دۆڕاو؟

ئەوانەی باسمان کـردن زەرەری ئەخلاقـی و ویژدانـی و کەڕامەتـی بـوون، زەرەری مـاڵ و سامان و دارایی دنیاشی زۆر زیاتر لەوەش هەن ئەگەر هەمان بێنینە ڕوو کتێبەکەمـان زۆر درێـژ دەبێ، ئەوەندە بە کافی دادەنێین.

یەک پرسیار لە ئارەقخۆر دەکەین و بەس: ئەی ئـارەقخۆر! قـازانج و بەهـرەی ئێسـتێ و دواڕۆژت دەوکارەدا چییە؟ دابڵێ بزانە کێ پێت دەڵێ کاری چاکە و ڕەوایە؟

قوماریش هەر لەو قوماش و پارچەی ئارەقە، هەر دوو ئـابڕووبەرەن و لە لایەن زۆرداران و تاغووت و لەخودا بێخەبەرانەوەن.

## چوار پلە بۆ حەرام کردنی ئارەق

ئارەقفرۆشی و ئارەقخواردنەوە جگە لەوەی کە ئینسانەکە دەزانێ و دەبیسێ لە زانایـان کە حەرام کراوە لە لایەن خوداوە، بەڵام خوو پێ گرتنی، بڕستی لێ بڕیوە و دەرکی دەرک و ئەقڵ و شعووری لێ داخستووە و لە خودا ترسانی لە بیر بردۆتەوە. خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم و میهرەبان یەک دەفعە پێی ناڵێ لای لێدە بەڵکە بە سێ چوار جار حـاڵی دەکـا کە لای لێـدا و لێی بتۆرێ چونکە لە زەرەر زیاتر هیچ بەهرە و قازانجێکی دنیا و ئـاخرەتی تێـدا بەدی و ڕەچـاو ناکرێ. دە پلەی یەکەمدا بە وەسیلەی ئایەتی ٦٧ سوورەی نەحل حەرامی کردووە ﴿وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ لە بەری خورما و ترێ شەربەتی سەرخۆشکەر و ڕزق و ڕۆزی خاوێنی لێ دروست دەکەن. دیـارە موسـوڵمانان ئەوەیـان دەخوارد و بە حەڵاڵیشیان دەزانی. ئەدێرەدا کۆمەڵێک لە یارانی ئیسـلام وەک عـومەر و مەعـاز

کوڕی جەبەل و هەندێکی دی لە ئەسحاب لەو بابەتەوە پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد و داوایان لێ کرد کە دەبێ بۆمان ڕوون کەیەوە ئارەق حەرامە یا حەڵاڵە؟ دیارە ئارەقخواردنەوە ئەقڵیش دەبا و ماڵیش دەبا. پێغەمبەریش بۆ وڵامەکەیان ڕاما و داما، تا خودای مەزن لەو بارەوە فەرمووی ﴿فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾ واتە گوناهی گەورەی تێدا و قازانج و بەرهەمی زۆرە بۆ عالەم. دیارە بە هۆی ئەو ئایەتە زۆر لە موسوڵمانانی باوەڕ توند و تۆڵ لە خواردنەوەی ئارەق کشانەوە و دەستیان لێ هەڵگرت. بەشێکیش کە باوەڕ دەڵەمە و دین تەسک و دەڵەمە بوون، لێی نەکشانەوە و ئیدامەیان دا تا ئایەتی ٤٣ی نیساء دابەزی لەو بارەوە، واتە پللەی دوو: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى﴾ **ئەی خاوەن باوەڕەکان! دە حاڵێکدا کە مەست و بێهۆشن لە نوێژ خوێندن وەلا کەون چونکە نازانن دەڵێن چی؟**

پلەی ٣: ئایەتی ٢١٩ سوورەی بەقەرە کە تەفسیرمان کرد نازڵ بوو لەو بارەوە لە مەدینە. ئیسلام لەو دەمەشدا قووەت و هێزی گرتبوو بەو هۆیە کە دەوڵەتی دامەزراندبوو شەریعەتیش یاسا بوو ناچار بوو دەبا بە پێی یاسا وڵام داتەوە. دیارە ئەوجار تەنگە و پاڵوویان لێ توند کرا ئارەقخۆران چونکە کار لە قۆناغی پێ کوتن چووبۆ قۆناغی سزا، بەو هۆیە بەشکێی بەرچاوی تەواو لە ئارەقخۆران گەڕانەوە ـ خۆش یا ناخۆش ـ پاڵیان وە پاڵی یاسای ئیسلام دا. بەڵام بە دزیەوە دە ماڵاندا هەر مابوو.

پلەی ٤: لێرەدا ئایەتی ٩٠ی مائیدە دابەزی بە توندی لەو بارەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ ئەی **ئەوانەی ئیمانو هێناوە هیچ گومانی تێدا نییە ئارەق و قومار و ئەو بتانەی بۆ پەرستن دانراون، و ئەو تیرانەی کە بۆ چارەنووس و بەخت تاقی کردنەوە بە کاری دەهێنن، پیسن و لە کار و کردەوەکانی شەیتانن، کەوایە خۆتانی لێ بپارێزن بەڵکوو ڕزگاربن.**

بە پێی کوتەی ڕەبیع کوڕی ئەنەس ئەو ئایەتە پاش قەدەغە کردنی ئارەق هات، دووبارە بۆ تەئکید کردنەوەی حوکمی قەدەغە کردنەکەی ئارەق.

دیارە ئەو ئایەتانەی کە بەڵگە و دەلیلن لەسەر حەرامی ئارەق، سێ ئایەتن، دوو ئایەتیان ڕاستەوخۆ ناوی ئارەق دەبەن بە (خَمر: ئارەق) واتە بێهۆشکەر، ئەو دووانەش کە بەلەفزی خەمر هاتوون بریتین لە ئایەتی ٢١٩ی بەقەرە، ئەوی دی ئایەتی ٩٠ی مائیدەیە. سێهەم ئایەتیش کە بە (سُکْر) هاتووە وە ئایەتی ٤٣ی نیساء بێ. ئەم ئایەتە ئاماژەیە وەلای ئەوەی (خَمْر) واتە هۆشبەر.

دەلیل و بەڵگەی قاتیع لە سەر حەرام کردنی ئـارەق، ئـایەتی ٩١ی مائیـدەیە: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾. بێ گومـان شـەیتان هەر ئەوەی دەوێ بە هـۆی ئـارەق و قومـارەوە ئـاژاوە و دووبەرەکایەتی و کینە و ڕق بخاتە ناوتان و تێکوو بەردا. تـاکوو ڕێگـای یـادی خـودا و زیکـری خـودا و نوێژتان لێ بگرێ و لە بیر بەرێتەوە. جا کەوایە ئایا ئێوە واز دێنن!؟



## باسێک لە سەر هەتیو

هەتیو واتە بێ باب لە ئینسان. و ئەو هەتیوشە نەگەیشـتبێتە تەمەنێکـی شـەرع تەکلیفـی لە سەر دانابێ. بە کوردی شەیتانی پێ نەکەنیبێ.

دیـارە مێژوونووسـانی ئیسـلام و زانایـانی قورئـان ئەوەیـان بـۆ عـالەم بەیـان کـردووە و ڕاگەیاندووە کە لە سەرەتاوە عالەمی جاهیلیەت واتە بـێ‌خەبەر لە ئـادابی ئـاینی ئیسـلام مـاڵی هەتیوانیان دەخوارد و تەمایان تێ دەکرا لە هەموو بارێکەوە و وەک ئەوە کچی هەتیو و نابالغیان بە هۆی تەمـا تێکـردن دەو مـاڵەی کە بە میـرات لە بـابیەوە پێـی گەیبـوو، مـارە دەکـرد تـاکوو ڕاستەوخۆ لە بنەوپاڵەوە دم بنێنە ناو ماڵەکەیـان و بیخـۆن. یـا ئەگەر بۆخۆیـان ڕێگایـان نەبـایە مارەیان بکەن جا لە بەر هەر هۆیەک بایە، دەهاتن لە کوڕەکانیان مارە دەکـردن هەر بـۆ وەی ئەو ماڵە میراتە لە دەستیان دەرنەچێ. دیارە ئەو بەرنامە بێ‌بەرنامەیە دە ناو عەرەبی جاهیلیدا باو بوو، باوێکی توند و بەرچاو، تاکوو خودای تەعالا لە سەرەتای دامەزراندنی یاسای ئایینی ئیسـلامدا بە وەسیلەی ئایەتی ٣ی نیساء و هەروا ئـایەتی ١٠ی نیسـاء، هۆشـدار و ئاگـاداری پـێ دان کە دەس‌درێژی و تەما کردن بۆ ماڵی هەتیوان زوڵم و خەیانەتە و بێ تۆڵە و سزا نابێ.

بە تەرتیب ئایەتەکان سەیر کە و لێیان ورد بەوە هەڵیانسەنگێنە تـاکوو بە باشـی تێبگەی کە هەر خودا مەسڵەحەت و کەڕامەتی ئینسان چاوەدێری دەکا و دەیپارێزێ.

## حەرامبوونی ماڵی هەتیوان بە چەن پلە

﴿٣﴾ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلاَّ تَعُولُواْ.

**ئەگەر ئێوە لەوە دەترسێن کە ناتوانن دەگەڵ کچە هەتیوەکاندا دادپەروەری بەجێ بێـنن (لێیـان لادەن و دوورییان لێ بکەن و ماڵی دنیا بەری چاوتـان نەگـرێ) جـا ئەوەی دڵتـان دەیخـوازێ لە ژنـانی دی مـارە**

**بکەن.**

﴿١٠﴾ إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا.

**ئەو کەسانەی ماڵی هەتیوان بە ناڕەوا و زوڵم دەخۆن، بێ گومان ئەوەی دەیخۆن لە ناو ورگیاندا ئـاگرە (واتە دەبێتە ئاگر). سەرەنجام لە تۆڵەدا دەخرێتە ناو ئـاگرێکی بڵێسـەداری دۆزەخەوە. مەگەر خـودا بزانـێ ئێش و ئۆفی ئەو ئاگرە ناودارە چەندە و چۆنە؟**

هەروا دووبارە و چەن بارە خـودای حەکـیم لەو بـارەوە هۆشـداری دەدا بە ئینسـان تـاکوو ئەوانیش ئەو بـابەتە بەرچـاوە، واتە جەریـانی هەتیـو لە بەرچـاو بگـرن و بە هێنـدی بگـرن، بە وەسیلەی ئایەتەکانی قورئان وەک ئایەتەکانی ١٥٢ی ئەنعام، هەروا ١٢٧ی نیسـاء. دەگەڵـم بە بە تەرتیب باسیان دەکەم:

ئەنعام ﴿١٥٢﴾ وَلاَ تَقْرَبُواْ مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ

**ئەی موسوڵمانان! توخن و قەرەی ماڵی هەتیوانیش مەکەون، بە جـوانترین شـێوە نەبـێ. هەتـا خـڕەکە دەبێ و بەرجەوەندی قازانج و زەرەر دەبێ.**

نیساء ﴿١٢٧﴾ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاء قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ فِي يَتَامَى النِّسَاء الَّلاتِي لاَ تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْوِلْدَانِ وَأَن تَقُومُواْ لِلْيَتَامَى بِالْقِسْطِ وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِهِ عَلِيمًا

**ئەی پێغەمبەر پرسیارت لێ دەکەن سەبارەت بە ئافرەتان و مافەکانیان و دەیانەوێت ڕێگایـان نیشـان بدەیت، تۆش پێیان بڵێ: خودا ڕێگاتـان پیشـان دەدات و وەڵامتـان دەداتەوە دەربارەیـان. ئەوەش بەوەی کە بۆتان دەخوێندرێتەوە لە قورئانی پیـرۆز. (مەبەسـت ئەو چەنـد ئـایەتەیە کە لە پـاش ئـایەتی یەکەمـی ئەو سووڕەتەوەن). بۆتـان ڕوون دەکـاتەوە کە دەبـێ کردەوەتـان چـۆن بێـت دەگەڵ ئەو ئافرەتـانەی کە لە ژێـر چاوەدێریتاندان وەکوو کچەمامی بێ باب و برا، کە مارەییان دێت لێتان، ئەو میـراتەی کە حەقـی خۆیـانە و نایاندەنێ. ئەگەر جوانیش بن بێ ئەوەی مارەییـان پـێ بـدەن مارەیـان دەکەن لە خۆتـان، بەڵام ئەگەر جـوان نەبوون، خۆتان مارەیان ناکەن و لە بەر ئەوەی چاوتان بڕیوەتە دارایی و سامانەکانیان ڕێگاشیان پێ نـادەن بۆخۆیان بە وازی خۆیان شوو بکەن. ئەوەش کارێکی زۆر خراپ و گونـاهە، دەبـێ ئەگەر خـاوەن بـاوەڕ و مرۆڤن خۆتانی لێ بەدوور بگرن. هەروەها خودا بۆتان ڕوون دەکاتەوە کە دەبێـت هەڵوێسـتتان چـۆن بێـت دەگەڵ ئەو منداڵە هەتیوە بـێ توانایـانە کە لە میـرات بێ بەشـیان دەکەن، خـودا فەرمانتـان پـێ دەدات کە دادپەروەر بن دەگەڵیاندا و بێ بەشیان نەکەن. ئێوە هەر چاکەیەک ئەنجام بـدەن، بـاش بـزانن خـودا زۆر بە چاکی ئاگادارە و پێی زانایە.**

بە کورتی و بە کوردی: ئەی پێغەمبەر لە بـابەت مـار کـردنەوەی هەتیـوان و پـێکەوە ژیـان

دەگەڵیان، پرسیارت لیَ دەکەن: ئایا ئەو کارە ڕەوایە یا ناڕەوایە؟ یا دەبیَ ماڵی هەتیوان بە جیـا و سەربەخۆ بیَ؟ تۆش بڵیَ لە جوابیاندا: ئەگەر تێکەڵاوی و مارەکردنیان و پەیمانی هاوژیانیـان و شەراکەتی لە ماڵ و دارایيدا لەسـەر ئەساسـی ڕاسـتی و دروسـتی پـێکەوە ژیـان بـیَ، ڕەوایە و حەڵاڵە؛ ئەمما ئەگەر ئەو کارە بۆ قازانجی تایبەتی خۆت بیَ، زۆر نـاڕەوایە. دیـارە خـوداش لە هەموو کەس چاتر ئاگاداری دڵانە.

دە ئایەتی ٢٢٠دا کە خودا دەفەرمویٚت: ﴿قُلْ إِصْلاَحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ وَإِنْ تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ﴾ کار کردن بە قازانجی ئەوان زۆر چاکە، ئەگەر لە ژیان و ژیواردا دەگەڵیاندا تـێکەڵاو بـبن، ئەوە برای دینیتانن.

دوو شتی بەرچاو دەو ئایەتەدا هەست پیَ دەکریٚن، یەکیان: تێکەڵاو کردنی مـاڵ و دارایـی هەتیـوان دەگەڵ مـاڵی خـۆت، ئەگەر ئیسـلاح و خێرخـوازی بـیَ، ئەوە زۆر چـاکە و ڕەوایە. دووهەمیان: نان و ئاو خواردن و دەس دەگەڵ دەستی هەتیوان وەزیفەیەکی ئایینیە.

ئایەتی زۆر لە سەر هەتیو دابەزیوە چونکە لە هەتیو بیَهێزتر نییە لە ناو ئینساندا، هەتیو واتە بیَ باب. لە غەیری ئینساندا واتە بیَ دایک. لە جەواهیراتدا واتە بیَ وێنە وەک دوڕڕی یەتیم.

## پوختەی مەبەست لە ئایەتی ٢٢٠

ئەو دوو وەرزی دنیا و قیـامەت مەیـدانی بەراوەرد و هەڵسـەنگاندنە بە تەرازووی ئەقـڵ و هەست و شعووری تەواو چونکە ئەو دوو وەرزە گەشە و نەشە و سیسـی و پیسـی و لاوازی و نابوودیان تێک هەڵکشاون و لە سەر یەک نیزام تەشکیل دراون. وێرانـی یەکیـان وێرانـی ئەوی دیکەیە. ڕوونتر بڵێین ئاوەدان کردنەوەی دنیا بە چاکە و عەداڵەت و ئینساف و ڕەحـم، ئـاوەدان کردنەوەی قیامەتە بە ڕەحمەت و خۆشی و نیعمەتی خودا دەوێدا. وێران کردنی دنیا بە زوڵـم و زۆری و بیَدادی و فەساد و فەحشا، وێران کردنی ڕۆژی قیامەتتە، بە قەهر و غەزەبـی خـودای تەعالا.

جا بـۆیە خـودا ڕێنـوێنی دەدا بە ئینسـان کە چـاوە و سـەرچاوەی دڵان ئـاوەدان کەنەوە بە عەداڵەت و ئینساف و ڕەحم و بەزە. تاکوو چاوەی ئەولاتان ئـاوەدان وەبـیَ بە ڕەحـم و کەرەم. هەتیو بەخێو کردن یەکێکە لەو کارە چاکانەی کە قیامەتی پیَ ئـاوەدان دەبێـتەوە. فێـڵ کـردن لە هەتیو و وێران کردنی ماڵ و شەئنی هەتیو یەکێکە لەو کارانەی ماڵی قیامەتیشی پیَ وێران دەبیَ. چاکی وەرگری، چاکی وەردەگریَ؛ خراپی وەرگری، خراپی وەردەگریَ.



ئەگەر بە دروستی بەرجەوەند بووبی لە ئایەتەکانی پێشـوودا خـودا ئامـاژەی وەڵای ئەوەی کرد و فەرمووی ئەو هەتیوانەی کە لەماڵتاندان چاوەدێریان بکەن و ئەگەر کچەکانتانیان بدەنێ، و هەروا کچانیان بخوازن و بێنن، جێگای خزمەت پێ کردنیانە و زۆر باشە، جـگە لەوەی بـرای دینیتانن، دەبنە خزم و قایم لە بەر و پشتدا. ئەوە گەلـێ باشـترە لە ئافرەتـانی جـوانی هاوبەشـی پەیداکەر و ساماندار. بۆ ئیسباتی ئەو داوایە دەچینە خـزمەت ئـایەتی ٢٢١ی بەقەرە، وردی لـێ ورد دەبینەوە:

﴿٢٢١﴾ وَلاَ تَنكِحُواْ الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ وَلأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ وَلاَ تُنكِحُواْ الْمُشِرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُواْ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ أُولَـئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ وَاللَّهُ يَدْعُوَ إِلَى الْجَنَّةِ وَالْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِ وَيُبَيِّنُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ

**ئەو ئافرەتانە مەخوازن کە شەریک بـۆ خـودا دادەنـێن و بـت پەرسـتن. ئافرەتـانێکی کـۆیلەی موسوڵمان لە ئافرەتێکی بتپەرست و بێباوەڕ باشترە. هەرچەندە بتپەرستەکە جوانێکی وا بێ سەرنجتان بۆ لای خۆ ڕابکێشێت و پێی سەرسام بن. (جا لەبەر جوانیەکەی بێ کە هەیەتی، یـا لە بەر ئەوەی بێ کە ماڵ و سامانی زۆرە) هەروەهـا ژن مەدەنە کەسـێکی خـودا نەنـاس بـێ و بتپەرسـت، هەچەنـد ئەو کەسـەتان زۆر وەبەر دڵ کەوتبـێ تـاکوو موسـوڵمان نەبـێ. ئەو بێبـاوەڕانە بە پیـاو و ئافرەتیـانەوە (دەتـوانن و دە حەولـی ئەوەش دان) بە بیـری پـووچەڵ و کردەوە خراپەکانیان خەڵکی بەرەو خۆ ڕاکێشن کە بەرەو دۆزەخە. خوداش بە ڕەحم و کەرەمـی خۆی بەرەو بەهەشـتی ڕازاوە و ڕێگـای ڕاسـت و لـێ حەسـانەوە بانـگ دەکـا لە سـەر حەز و ویستی خۆی. کەوایە شوێنی بەرمەدەن و ونی مەکەن و وەیقۆزن (دەنا شەیتان دەوقۆزێتەوە).**

## نیکاحی موشـریک و موئمین

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی بەرجەوەندانە:

ژن و مێـرد لە بەر ئەوەی کە شـەریکی ژیـانن دەگەڵ یەک و یاریـدەدەری بیـر و هۆشـی یەکترن، دەبێ هاوباوەڕیش بن تـاکوو بە ئاسـانی بتـوانن ئەو ژیـانە ئابڕوومەنـدانە بەرنە سـەر. هەرئەوەشـە هـۆی ئەوەی کە خـودا دەسـتووری داوە لەو بـارەوە و فەرمـوویەتی: ژنانێـک کە هاوباوەڕت نەبن واتە شەریک بۆ خودا دانێن، مارەیان مەکەن تاکوو نەیەنە سەر ڕێگای بـاوەڕی و هاوبیریت دە خوداناسیدا. کاتێ بڕوای هێنا کەند و کۆسپی لادەچێ لە سەر ڕێ و مارەی کە. چونکە ترسی ئەوە نامێنێ ڕاتکێشێ بەرەو خۆی هاوبەشی پەیدا کەی بۆ خودا، چونکە بە زۆری

دەبیندرێ مێردان شوێن ژنانیان دەکەون. ئەو نەقڵە دەقۆزێتەوە، ئەو شوێن کەوتنە (ژن هەسانی مێردە) واتە زۆرت خۆ ڕێخا تیژت دەکا بۆ هەر لایەک بیهەوێ (چۆنی بۆ بچی دەیگرێتەوە).

خودا کە دەفەرموێ بەندەیەکی خاوەن ئیمان باشترە لە بەندەیەکی هاوبەشدانەر، نیشانەی ئەوەیە خاوەن ئیمان بڕێکی تێدا هەر دێڵێتەوە،بەڵام موشریکێک کە هیچ بۆ خودا نەهێڵێتەوە، هیچ بۆ تۆ هەر ناهێڵێتەوە. ئەگەر سرنجیش درابێ، قووڵتر و بەهێزتر و بەتینتر لە بیر و باوەڕی ئایینی نییە هیچ شت. جا بۆیە خودا قەدەغەی کردووە مارە کردن و هێنانی ژنانی موشریک.

## بەسەرهات و بابەتێکی بەرچاو و دڵگر

پێش ئەوەی پێغەمبەر لە مەککە کۆچ کا بۆ مەدینە، زۆر ژن و مێرد بوون وێکڕا موسوڵمان، هەشبوون مێرد موسوڵمان و ژن کافر بوو یان بە پێچەوانە مێرد کافر و ژن موسوڵمان بوو. لەو کاتەدا کە هەر ژنەکە موسوڵمان بوایە بە ناچاری لای مێردە کافرەکەی دەماوە، چونکە موسوڵمانەکان توانایەکی وایان نەبوو کە بتوانن ئەو ژنانەی کە کافرن و لایانن بیانهێننە دەرەوە بیانگێڕنە لای خۆیان. ئەو شێوە ژیانە ئاوا بەردەوام بوو تاکوو پێغەمبەرﷺ ئەمری کۆچی بۆ مەدینە پێ درا و کۆچی کرد. ئەوکات لە مەدینەدا تا ئەندازەیەک سەربەخۆیی و دەستەڵات هاتە دەستیان و بەرەبەرە نەزم و نیزامی ئایینی هاتە ڕوو و دەستی پێ کرا. بە پێی ئەو دەستەڵاتە و سەربەخۆییان خوداش هاتە لایان و ئەو ئایەتەی ٢٢١ی بۆ دابەزاندن وەک تەفسیرمان کرد لەوە پێش. ئەو ژنە موسوڵمانانەش کە چەن ساڵ بوو موسوڵمان ببوون و لە لای مێردە موشریکەکانیان مابوونەوە، هەر وا مانەوە تا ساڵی شەشەمی کۆچی کە لە حودەیبیە ئایەتی ١٠ی سوورەی مومتەحینە هاتە خوارەوە:

﴿١٠﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَآتُوهُم مَّا أَنفَقُوا وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ وَاسْأَلُوا مَا أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنفَقُوا ذَٰلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ

**ئەی ئەوانەی خاوەنی بڕوان! کاتێ ژنە موسوڵمانەکان کۆچیان کرد و هاتنە لاتان ئێوە تاقییان کەنەوە، خوداش زاناترە بە بڕوا و ئیمانیان، ئەگەر ئێوەش بۆتان دەرکەوت ئیمانەکەیان ڕاستییە، ئەوجار مەیاننێرنەوە بۆ لای کافرە بێبڕواکان (چونکە تازە) نە ئەمان حەڵاڵ و هاوسەری ئەوانن، نە ئەوانیش حەڵاڵ و هاوسەری ئەمانن. ئەوەی کە خەرجیان کردووە بیاندەنەوە هیچ گوناحتان ناگاتێ ئەو ژنانە مارە**

**بکەن (هەرکاتێ کە مارەییەکانیان بدەنێ) ژنە کافرەکانتان لە لای خۆتاندا ڕامەگرن و مەیانهێڵنەوە. ئەوانە ژنی ئێوە نین و ئێوەش داوای ئەوە بکەن خەرجتان کردووە. ئەوانیش با داوای ئەوە بکەن خەرجیان کردووە. ئەمە فەرمانی خودایە و لە نێوانی ئێوەدا داوەر دەکات، خودا زانا و کارجوان و کاربەجێیە.**

## ئاوڕدانەوە و ئاگادارییەک لە سەر نیکاحی ژنانی ئەهلی کتێب

بۆ موسوڵمان دروستە ژنانێکی ئەهلی کتێب بن با لە یەهوود و مەسیحیش بن، مارەیان بکەن و بیانخوازن. چونکە هەر دوو لا باوەڕیان هەیە بە خودا و پێغەمبەران و ڕۆژی ئاخرەت و چاکە و خراپە، کەوابێ هەر دوو لا خوداپەرستییان هەیە، فەرقێکیان ئەگەر هەیە ئەی ئەوەیە کە ژنەکە لە ڕووی کەمدەرکی و نەفامی باوەڕی بە پێغەمبەرﷺ نییە واتە پێغەمبەری ئاخرزەمان ناناسێ، ئەوەش ئەگەر بێتوو زانایەکی زمانپاراو و دڵپاک دەلیل و بورهانی ئەقڵی و نەقڵی بە حەکیمانە بۆ بەیان کا، نیزیکە لەوەی ئیمانی بەویش بێنێ. چونکە ئەو بێباوەڕیەی بە پێغەمبەری ئیسلام کە محەممەدە، لە ڕووی عەمد و غەرەزەوە نییە بەڵکە لە ڕووی بێدەرکیەوەیە.

دێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێشێ: وەک پیاوی موسوڵمان بۆی دروستە ژنی یەهوود و گاور مارە کەن چونکە ئەهلی کتێبن، ئایا دروستە ژنی موسوڵمانیش مێرد بکا بە یەهوود و گاور کە ئەهلی کتێبن؟ دەبێ لە وڵامی ئەو پرسیارەدا بکوترێ: ژن چونکە لادەبرێ لە ماڵی بابی و دەبرێتە ماڵە مێردی، و کەس‌وکاری مێردەکەشی دەگەڵی دەبنە هاواڵ و شەریکی ژیان، لەوە نزیکە بکەوێتە سەر ئەقیدە و باوەڕی وان؛ جا لە سەر ئەو ئەساسە دروست نییە ژنی موسوڵمان شوو بکا بە پیاوی یەهوود و گاور، با ئەهلی کتێبیش بن.

بەڵام دەبێ بڵێم و بشکوترێ دنیای ئەوڕۆ لەمەڕ ئایینی ئیسلام وەک کوولەکەی شەققەباغییە، واتە خاوەن قەوارە و ناو بەتاڵ؛ بە گوفتار ئیسلامین، بە کردار لە گاور کەمتر و لە جوو خراپتر. لاو و گەنجەکان لە باتی لە شارە گەورەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کە بۆی دەچن زانست و هونەر و تەجرەبە بێننەوە بۆ وڵاتەکەیان، هەر یەکە ئافرەتێکی لاق ڕووت دێننەوە و فێری توڵەپەرستیش دەبن، هەموو هەست و باوەڕێکی کە لە بابیانەوە تیاندا چناوە، دەیخەنە ژێر پێی ئەو ژنە لاق ڕووتە.

بە کوردی دەبێ بڵێین ئایینی ئیسلام لە بابەت ژن هێنانی پیاوان و مێرکردنی ژنان زۆری توند گرتووە. چونکە ئەو بازاڕە شوێنی تەربیەتی حەولادانە کە ئەوانیش هیوای داهاتووی کۆمەڵن. جا بۆیە خودا ئەو دەستوورەی داوەتە دەر کە ژن و مێرد دەبێ هاودین و هاوباوەڕ بن.

کورد کوتەنی: گایەک دە پاڵ گایەک خەی، یا خووی دەگریٚ یا ڕەنگ. لەو دوو گایانە پێت‌وایە کامیان مێردە و کامیان ژنە؟ ڕەنگە زوو نەزانی و هەڵی نەدەی. ئەمن پێت دەڵێم پیاو دەچێتە زگ ژن و دەخزێتە پاڵی بە زۆری، جا بەو پێیە گای هەوەڵ پیاوە، گای دوایە مانگایە، ژنەکەیە. کەوایە دەبیٚ بڵێین بۆیە پیاو نابیٚ بچێتە پاڵ ژنی موشریک، نەبادا خووی ژنەکە بگریٚ بۆ خۆی و منداڵەکانی.

**پوختەی مەبەست:**

ئەو ئایەتە (٢٢١) هاوارە لە موسوڵمانان کە ژنی موشریک و کافر مارە مەکەن و مەخوازن. واتە ژنانی بت‌پەرست و بودایی و مولحید و مەجووسی و بیٚ‌باوەڕ.

بەڵام شەرع دەڵیٚ چی؟ دوو دەستە ژنانی ئەهلی کتێب وەک یەهوودی و نەسارا مارە بکەن، ئەگەرچی کافریش بن. وەک ئایەتی ٥ی مائیدە ئاماژەی وەلا فەرمووە: ژنانی پاک‌داوێنی موسوڵمان و ئەهلی کتێب بۆتان حەڵاڵن.

**جیاوازی نێوان موشریک و کافری کتێبیٚ**: ژنی موشریک چونکە بە هیچ ئایینێک وابەستە نییە، بۆ موسوڵمان مارەی نابیٚ و نایە. بەڵام ژنانی کافری وەک یەهوودی و مەسیحی مارەیان دیٚ و مەباحە مارە کردنیان.



دیارە باسەکە باسی ژنانە لە بابەت مارە کردنیان و هەروا ئەو شتانەی کە پاش مارە کردنی دێنە جیٚ و شەرع ڕێت پیٚ دەدا. جا بۆیە دەبیٚ چاو بگێڕین بۆ یاسایەکی ئیسلامی لەو بارەوە، واتە پیاو هەموو کات دەتوانیٚ بچێتە لای ژن؟ یا ئەو چوونە کنەش خاوەنی داب و یاسایە؟ چونکە وەکی زانراوە گۆیا عەرەبەکانی پێش ئیسلام وەک جوولەکەکان ڕەفتاریان دەگەڵ ژنان دەکرد، واتە کاتیٚ ژنەکان دەکەوتنە حەیز واتە «دە خوێن کەوتن»، دەگەڵیان دادەنیشتن، بەڵام نان و ئاوی دەستیان نەدەخواردن و دەگەڵیشان نەدەنووستن. جا ئەدێرەدا بوو کاتیٚ ئایینی ئیسلام هاتە ڕوو، خەڵک لەو بارەوە پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد کە ئایا دەگەڵ ژنی حەیزدار چۆن وەجووڵێین؟ خودای تەعالاش بە هۆی ئایەتی ٢٢٢ وەڵامی دانەوە و پێغەمبەری کردە مەئموور کە ئەو دەستوورە بە عالەم ڕاگەیێنیٚ:

﴿٢٢٢﴾ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ

ئەی پێغەمبەر! پرسیارت لێ دەکەن ئایا دروستە پیاو لە کاتی بێنوێژیدا (واتە حەیز) بۆ جووتبوون بچێتە لای ژنەکەی خۆی؟ پێیان بڵێ: چوونە لای ئافرەتان لەو کاتەدا مایەی ئازار و زەحمەتە بۆ ژنەکان. بۆیە دەو کاتەدا نابێ بچنە لایان تا پاک دەبنەوە و خۆیان دەشۆن. ئەوجار دەو کاتە پاک و خاوێنەیاندا بچنە لایان بەڵام لەو ڕێگایەیەوە کە خودا ڕێی پێ داون. بێگومان لە تاوان ببوورە، خودا لەوانەی کە تا ئێستا واتە پێش ڕوون کردنەوەی ئیشەکە) دە هەموو کاتێ کە وازی هەستاوە چوونە لای ژنەکان. دیارە خودا ئەوانەی خۆش دەوێ کە لە تاوانیان پاش پێزانین دەگەڕێنەوە. هەروا ئەوانەشی خۆش دەوێ کە بە پاکی خۆیان ڕادەگرن، ناچنە لای ژنانیان دە کاتی بێ نوێژیدا.

## ڕازان دەگەڵ ژنان لە کاتی حەیزدا (بێنوێژی)

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ۲۲۲:

ئەی پێغەمبەرﷺ لێت دەپرسن لە بابەت ژنانی بێنوێژ واتە دە عوزر کەوتوو، چوونە لایان دەبێ یا نابێ؟ ئەتۆ ئاوا وڵامیان دەوە: حەیز بۆ خۆی ڕەنج و عەزابێکە بۆ ژن، دە سوار بوونیشیان دەو کاتەدا هەر عەزابە بۆ ئەو. کەوایە لەو ئازاردانە دەبێ خۆ لادان بکرێ. کەوایە تاکوو خاوێن دەبنەوە لەو خوێن پێدا هاتنە، سەرجێییان مەکەن، پێش خۆشوشتنیان ئەگەر زەروور بوون دەبێ بەڵام ئەگەر بتوانن خۆڕاگری کەن چاترە و پاکترە و ئارەزووگرترە تا خۆ دەشوا.

لە کاتی حەیزدا چوونە لای ژن جگە لە بێئەمری کردنی خودا، ئەو زەرەرانەش دەدا بە لەشی ئافرەت: ۱. گەرادانی تووشی زەرەر دەبێ ۲. خوێنی حەیز دەچتە ناو ژۆری چووکی پیاو گەرا دەنێژێ دەوێدا لە داهاتوودا دەبێتە برینێکی کێماوی ۳. خوێنی حەیزەکە کە بە لوولەی سیرەتی پیاوەکەدا هەڵدەکشێ بۆ هێلکە گونەکانی و سەرەنجام بۆ نەمانی تۆوی خەتەرە.

پێویستە بۆ ژن و بۆ پیاو ئەو خوێنانەی بە ژناندا دێن و ژن تووشیان دەبێ بناسرێن.

### ئەو خوێنانەی بە ڕەحەمی ژندا دێن

خوێنانێکی کە بە ڕەحەمی ژندا دێن، سێ جۆرن:

۱. حیض، ۲. نفاس ۳. استحاضه.

**حەیز** خوێنێکە دە کاتی تایبەتیدا بە ژندا دێ. ماوەی مانەوەشی لە سەر نەزەری شاریعەکان لێک جیاوازە:

حەنەفی و وەشوێنکەوتووانی دەڵێن لانی کەم ۳ ڕۆژە مانەوەی.

مالکی: لانی زۆری مانەوەی ژن دە خوێنی حەیزدا ۱۵ ڕۆژە سنووری کەمەکەی دیاری نەکراوە.

شافعی: لانی زۆری ۱۵ ڕۆژە،لانیکەمیش ۲۴ کاتژمێر.

ئیمام ئەحمەد: لایەکی وەک حەنەفییەکانە لایەک وەک شافیعیەکانە.

هاوارە بۆ ئۆمەتی ئیسلام کە چۆن ڕێ دەردەکەن دە ناو ئەو هەزارەیەدا.

**خوێنی نفاس**: خوێنێکە کە لە پاش منداڵبوون دەستەولەجێ بە ژندا دێ. شافعی و حەنەفی دەڵێن ۴۰ ڕۆژ ماوە زۆریەتی، واتە وا هەیە تا ۴۰ ڕۆژ ژن لەو خوێنە خلاسی نایە. ماوە کەمەکەشی وا هەیە ڕۆژێکە و یا کاتژمێرێکە یا لەحزەیەکە.

## ژن لە کاتی حەیز و نفاسدا لە چەند شت دوورن؟

زانایانی ئایینی بە کۆدەنگی کوتوویانە ژن دە کاتی خوێنی حەیز و نفاسدا لە ۱۱ شت بەدوور دەبن:

١. نوێژ نەکردن

٢. چ واجب و چ سوننەت، چ قەرز. گێڕانەوەشیان نییە.

٣. ڕۆژوو، چ واجب، چ سوننەت، چ قەرز؛ بەڵام پاش نەجاتبوون واجبەکان وەگێڕێ.

۴. جیماع واتە دەگەڵ نووستنی حەڵاڵ نییە

۵. بە عیددەی تەڵاق ناژمێردرێ

۶. تەڵاقدانی ژن دەو کاتەدا کەراهەتی هەیە، هەندێکیش کوتوویانە حەرامە و ناکەوێ.

٧. زیارەتی خانەی خودا واتە کەعبە.

٨. قورئان دەس دان

٩. چوونە ناو مزگەوت

١٠. ئیعتیکاف واتە گۆشەنشینی مزگەوت بۆ عیبادەت

١١. قورئان خوێندن لە بەر. هەندێک گوتوویانە بۆ لە بەر کردن مەباحە.

**خوێنی استحاضە:** واتە دایمە دە خوێندا بوون. ئەوە جۆرێکە لە نەخۆشی. ئەو حاڵەتە مانیعی هیچ شتێک نییە لەوانەی کوتمان و بەرگری ناکا تەنانەت بۆ جیماعیش.

ئەوەندە شەرعە بە پێویست زاندرا، دەنا دەگەڵ تەفسیر یەک ناگرن.

دێرەدا هەستێک خۆ ڕۆ دێڵێتە نـاو دەروونەوە، هەسـتەکەش ئەوەیە: خـودای تەعـالا کە بە توندی چوونە لای ژنی قەدەغە کردووە دە حاڵەتی حەیزدا، دەبێ هەر ئەوەبێ: ئەو تۆوە دەبێ لە شوێنی پاکدا بچێندرێ، تاکوو نەسلی خاوێنی لێ بڕوێ و شین بێ. جا ئەدێرەدایە هەستەکە خۆ لوور دەکاتە ناو بیر وهەست و ئەقڵەوە.

ئاوا دەڵێ بیر و ئەقڵ: ڕەحەمی ژنان جێی لێ داچاندنی تۆوە، دەبـێ ئەو جێـیەش خـاوێن بێ، کەوابێ بەو پێیە بە تەئکید دەبێ پاشی ئافرەتان بـۆ تـۆو تێـدا چانـدن قەدەغە بـێ. جـا بـۆ پشتڕاست کردنەوەی ئەو هەستە ڕەوایە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ۲۲۳.



## من و دوکتور ئیبراهیمی

پێش ئەوەی بچینە خزمەت ئایەتەکە، لیزگە هۆنراوەیەکم هۆنـدۆتەوە لە مەڕ ژن دەیڵـێم کە ڕەنگە کەس لێم تووڕە نەبێ و بڵێ: ئێرە جێی تەفسیرە، نە جێی ئەو بیرەیە، چونکە ئەوەی دەڵـێم وایە.

دوکتور ئیبراهیمی (واتە مەلا مەحموود ئیبراهیمی[1]) کتێبێکی بۆ من نـارد بە نـاوی (زن در اندیشه اسلام)، لە باغەڵدا فەرمووبووی دەبێ لە ژنم حاڵی کەی. ئەمنیش ئەو پارچە هەڵبەستەم بۆ نارد و قانیعم کرد:

ژن

ژن و ئیســـــلام و ئەندیشــــەت بە مــــن دا
بە ژن تیــــری هەرای لاویـــــت لە مــــن دا
ئەزەل فەرمـــوویە ژیـــن بـــێ ژن محـــاڵە
زەوو زوو بـــێ هەوێنـــی مـــێ بەتـــاڵە
لە حەیوانـــات هەتـــا خێڵـــی نەباتـــات
بەبـێ مـێ ڕایەڵ و پـۆی قـاتە، هەیهـات!
لە ئـــــایەی ۶۷ی مـــــاڵی یاســـــین
ئیشـــاڕەی لا کـــراوە نەزمـــی هـــاوژین
هەچـی دەڕوێ لە خـاک و ئـاو و ئینسـان

---

[1] دوکتور ئیبراهیمی بۆ نووسینەوەی ئەو تەفسیرەم بەڕاستی هاندەرم بوو. خودا جەزای وەدا.

شـــەمی ژینـــی لە مێـــدا دێـــتە گیرســـان
ســـیمای کـــۆمەڵ بەبـــێ مـــێ نـــانوێنێ
زەوی بـــێ ئـــاو و تـــاو هـــیچ نـــاڕوێنێ
شـــەمی مـــێ شـــەمع و شـــەمدانی ئەویـــنە
لە شـــەمدانی ئەویـنـــدا هەســـت وەژیـــنە
لە ئـــــایەی ٢١ی ســــــوورەیی ڕۆم
دەبینـــدرێ نەقشـــی ژن تیشـــکە لە ئاســـۆم
ژنە ئـــــارامگەیی هەســـــتی ئەویـــــنە
ڕەحەمـــــدانی پەناگـــــای ئـــــاوی ژیـــــنە
ڕەحەمـــــدانی هەوەڵ قۆنـــــاغە بـــــۆ ژیـــــن
لەوێـــــڕایە وزەی شـــــادی و غەم و شـــــین
ئەگەر هاتو گرووی گـرت هەستی هەستی
بەبـــێ مـــێ نـــابێ ژێـــر ئەو دێـــوی مەستی
بەری ژن ژینگەیـــــی بەزمـــــی بەزیـــــنە
لەوەڕگە و مەزرەعەی چیـــــنە و ژەنیـــــنە
عـــــومەر نەیـــــماوە بەزمـــــی ئاشـــــقانە
بەشـــی پیـــر چـــاوە چـــاو و زار داچەقـــانە



ئەوجار هاتین گەیشتینە ئەو قۆناغە کە بچینە خزمەت ئایەتی ٢٢٣:

﴿٢٢٣﴾ **نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ وَقَدِّمُواْ لأَنفُسِكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّكُم مُّلاَقُوهُ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ**

**ژنانتان کێڵگەتانن، (واتە هەروەک چۆن زەوی دەکێڵدرێت و تۆوی تێدا دەچێندرێت، ئاواش ئافرەت دەشوبهێنێتە ئەو زەویە کە پیاو تۆوی منداڵ بوونی تێدا دەچێنێت، واتە خێزانەکانتان کێڵگەی ئێوەن) هەرکاتێک بە هەر شێوەیەک و هەرچۆنێکتان دەوێت بەو شێوەیە بچنە لایان. (یانی شێوازی چوونە لایەکە گرینگ نییە، بەڵکە چوونە لایەکە دەبێ ئەو جێگەیە بێت کە تۆوەی لێ دەڕوێ کە شوێنی منداڵ لێ بوونە؛ بە کوردی دە پێشیدا بچێنە تۆوەکە نەک دە پاشیدا، وەک هەندێ کەسی نەفام ئەرزشو ئیحترام بۆ فەرمانی خودا دانانێن) چاک بزانن لە ڕۆژی خۆیدا هەموو کردارێک لێپرسینەوەی هەیە. ئەی پێغەمبەر مزگێنی بدە بە ئیمانداران کە**

گوێڕایەڵی فەرمانی خودان.

## ژنان کێڵگەی ئێوەن

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی ورد و هەستیارانە:**

ژنەکانتان جێی چینە و ژەنینە واتە جێی بەرهەمی ئەو تۆوەیە کە دایدەچێنی هەروا جێی لێ ڕاحەتبوون و دامرکانی ئارەزوویە و جێی وزەی خۆشەویستی و مەحەبەت تێکەڵ کردنە. ئەو تۆوە دەچێنن لەو شوێنە (پێشەوە) کە دەڕوێ، مەیچێنن لەو شوێنە کە ناڕوێ (پاشەوە). جا هەر جۆر و بە هەر لایەکدا دەیچێنن، دە وازی خۆتاندا، دە کاتی پاک و خاوێنیدا بێ واتە دە حەیزدا نەبێ. چاکە و چاکەکاری دە پێش خۆتان خەن واتە پێش مردن، بێگومان ئەو ڕۆژە دێ و دەگاتە لاتان کە دەچنە لای خودتان بۆ دادگا و پرسیار لێتان. مزگێنیش بۆ پارێزەران.

بە کوردی چوونە لای ژن بە پاش دە هیچ ئایینێکدا ڕەوا نەدراوە تەنانەت لە مەزەبی پاتاڵیشدا. چونکە بە پێچەوانەی سرشتە. ئەوانەی واش دەکەن بێسرشتن.

## بە پاش پەڕین و بەزین

دەڵێن جوولەکەکان کوتوویانە ژن ئەگەر بە پاش بچیە لای، منداڵێکێ لێی دەبێ هەم خێل دەبێ هەم شێت و سەرسەری. گۆیا کوتوویانە دە تەوراتدا ئاوا هاتووە. ئەو باسە دەبرێتە خزمەت پێغەمبەر، پێغەمبەریش فەرمووی جوولەکە کە دەڵێن و کوتوویانە ئەوە دە تەوراتدایە، ئەوەیان درۆیە و ئەوەش کە دەڵێن منداڵێکی لەو کارە ناڕەوایە دەبێ، خێل دەبێ؛ دێوانە ئەوەشیان هەڵبەستە. ڕاستیەکەشی ئەوەیە ئەو عەمەلە واتە بە پاش چوونە لای ئافرەت ناڕەوایە و بێ سرشتییە. جا پاشان خودا بۆ ڕوون کردنەوەی کار و عەمەل ئەو ئایەتەی (٢٢٣) نازڵ فەرمووە. دیارە هەوەسبازانی سەرسەری و بێ کەرامەت زۆریان ئەو بابەتە هێناوە و بردووە، وەک کونە نیریان لێ کردووە هێندەیان شت تێ وەرداوە زۆر فراوان بوو سەرمژانەی پێوە ڕاناوەستێ. واتە ئەو بابەتەیان هێندە جووە، هەتا گەیاندوویانەتە ئەو قۆناغە پاش و پێشی ئافرەتیان مەباح و بێ ئابڕوو کردووە. تەنانەت ئەوەش دەزانن کە حەیوان لەو ڕاستەوە سواری حەیوان نابێ و کاری دەگەڵ ناکا.

گۆیا لە «ابن‌عباس»ەوە نەقڵ کراوە قوڕەیشیەکان تا نەهاتبوونە مەدینە دەگەڵ ژنەکانیان بە پاش و بە پێش ڕاساون، بەڵام کاتێ هاتنە مەدینە و دەگەڵ ژنانی ئەنساری تێکەڵاویی و

زەماوەندیان پەیدا کرد و ویستیان دەگەڵ وانیش ئاوا بە پاش و بە پێش خەریک بن، ژنەکان پێیان کوتن ئەو کارە کـارێکی نـاڕەوایە دەنـاو مەدا. ئەوانـیش دوورییـان لـێ کـرد و بە پێغەمبەریـان ڕاگەیاند، پێغەمبەریش فەرمووی: ناڕەوایە.

لە سەر ئەساس و یاسای عیلمی نەحو، جوملەی ﴿فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾ واژەی (أَنَّى) واتە (اَيُّ وَجْهٍ) واتە بە وازی خۆت بە ڕاکشانەوە و یا بە پێوە و یا لە سەر تەنیشت و یـا لە سـەر پشت. نە مانای وایە: (اَيُّ جهةٍ) واتە بە پاش و یا بە پێش. (روح المعانی، قرطبی)

پەڕتووکێک دانراوی «ابوالعباس مالکی» هەیە، لە ژێر ناوی (اظهار ادبار من اجاز الـوطي في الأدبار) عەللامە «ابن جوزی» ئەویش هەروا پەڕتووکێکی بە ناوی (تحريم الحمل المكـروه) نووسیوە. هەر دوو پەڕتووکەکە لە بابەت حەرامی ئەو کارە، چەن گوفتەیەکیان بە ناوی حەدیس لە زار پێغەمبەرەوە تێدا نەقڵ کردوون:

١. ايّها الناسُ إنَّ اللهَ لا يَستَحْيي من الحـقِّ، لا تَـأْتُوا النِّسـاءَ في اعجـازهنَّ: ئەی ئینسـان خودا لە کوتنی حەق شەرم ناکا، دەفەرموێ: دەگەڵ ژنانتان بە پاش جیماع مەکەن.

٢. مَنْ أتَىٰ امْرَأَتَهُ في دُبُرِها لَم يَنْظُر اللهُ تعـالى يَـومَ القيامـةِ: هەر کەس لە پاشـەوە دەگەڵ ژنەکەی جیماع بکا، ڕۆژی قیامەت خودا بە چاوی مەرحەمەت نایڕوانێتێ.

٣. تِلْكَ الْوَطيَّةُ الصُّغْرىٰ: ئەو عەمەلە لە قووندەری چکۆلەیە.

٤. مَلعونٌ مَنْ أتَىٰ امرَأَةً في دُبُرِها: کەسێک ژنەکەی بە پاش وا لێبکا ڕۆژی قیامەت بەرییە لە ڕەحمی خودا.

بە کوردی و بە کورتی: پاش‌بەند وپێش‌بەنـد پسـێن و سـنووربەزێن هەوەسـباز و لە خـودا بەدوورە.

دیارە ئەوە دەرکەوت ژن جگە لەوەی هاوڵێکی بەئەرزش و بەنرخە بـۆ ژیـان، نیعمەتێکـی زۆر بەتام و لەززەتی لەش و ڕوحیشە، ئەگەر بزانی و بیناسی عەمەل بەو ئایەتە ١٩ی سـوورەی نیساء دەکەی و ئیتاعە لە هەستەی ئایەتی ٢١ی سوورەی ڕۆم دەکەی. دەگەڵمبە بە تەرتیب بۆت باس دەکەم هەردوو ئایەتەکان:

نیسـاء ﴿١٩﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهًا وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلاَّ أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا.

**ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان هێناوە، هەرگیز بۆ ئێوە ڕەوا نییە، ژنی خزمە مردووەکانتان بە زۆر بـکەن بە میرات و لە جێی بەشەمیرات داینێن بۆ خۆتـان. هەروەهـاش ڕەوا نیـیە بـبن بە کۆسـپ لە ڕێگـای مێـرد کردنەوەیاندا. وەیا زۆریان بۆ بێنن و بیاندەنە بەر لۆمە تاکوو لەو مارەیەی کە وا داوتاننێ، هەنـدێکیان لـێ وەرگرنەوە، کاتێک نەبێ کە لاساری و سەرپێچی بکەن و یا بە ئاشکرایی داوێـن پیسـی ئەنجـام بـدەن. بـا هەڵس‌وکەوتتان دەگەڵیان ڕێک‌وپێک و باش بـێ. ئەگەر هـاتوو خۆشیشـتان نەویسـتن خێـرا لێیـان جیـا مەبـنەوە، چـونکە زۆر شـت وا هەیە ڕێـی وێـدەکەوێ لە لاتـان خـراپ و نـاحەز دەنـوێنێ، کەچـی ئەگەر خۆڕاگری کەی خودا خێر و بێری زۆری تێدا دێنێتە دی.**

هاواری ئەو ئایەتە ئەوەیە کە ژن نیعمەتێکی وایە لە هەموو باراندا نایناسی دەبێ لە هەمـوو ڕاستانیدا حاڵەتێکی عەداڵەت و ئینساف و ڕەحمی دەگەڵ بە کار بەری.

ئەوجار وەرە سەر ئایەتی ۲۱ سووڕەی ڕۆم:

ڕۆم ﴿۲۱﴾ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ

**لە نیشانەکانی یەکتایی و توانـایی و کـارجوانی خـودایە کە هەر لە خۆتـان هـاوجووتی بـۆ دروسـت کردوون، تاکوو لەو سایەدا پـێکەدا پەنـا بگـرن و ئـارام بگـرن و خۆشەویسـتی و ئەویندارییشـم خسـتۆتە نێوانتانەوە تاکوو بۆ یەک بسۆزێن و بسازن.** بەڕاستی (ئەگەر ئەو جـۆرە نیـزامە هەڵسـەنگێنن) بەڵـگەی زۆر زۆر هەیە دێرەدا بۆ خاوەن هەست و شعوور و بیـرداران کە ژن لە سەرووی هەمـوو نیعمەتەکـانی دنیایە، کە بێ ئەو نیعمەتە ژیان نابێ و یا ئەگەر بشبێ ژانە. دیوی هەوەس بێ ئەو دانـامەزرێ و ئارام نابێ و ئۆقرە ناگرێ، ڕۆڵە شیرنەکان نابن و ڕیشەی خزمایەتیش نابێ. (وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ) نابێ، هەتا لە بەهرەی ژن وەکۆڵدرێ بەهرە وقازانجەکـانی دێـنە ڕوو، ئەوانەی وا نـازانن تووڕن لە ژن، هێزی تووڕەییەکەی هەست و شعووری لێ فڕاندووە.



دیارە خـودای تەعـالا لە پـاش بـاس کردنـی حەیـز وقەدەغە کردنـی چـوونە لای ژن لەو کاتانەدا، کە ئەوە حاڵەتێکی سـرشتیە و خودا دە لەشی ژندا دایمەزرانـدووە، لە سـەر ئەساسـی حیکمەتی خۆی وەدوای ناکەوین. بەڵام لە لای خودای زانا بە ئاکاری ئینسانی، ئەوە ئاشکرایە: وا هەیە ئینسان واتە پیاو لە ژن تووڕەیە و دەیهەوێ ئەو تووڕەییەی بە ژن بدڕێ و سـوێندی لـێ دەخوا کە سەرجێیی نەکات ئی ژنەکەی و دەزانێ ژنەکە بەوەی ناڕەحەتە. خودای تەعالا دێـرەدا دەیهەوێ ڕێنوێنی بکا ئینسانی کە لە بابەت سـوێندخواردنەوە ژیـرانە و ئـاقڵانە و بە ئینسـافەوە بەرخورد بکا، بۆ ئەو باسە دەچینە خزمەت ئایەتی ۲۲۴ی بەقەرە، بەرجەوەندانە سـەیری کە و دە

ئایەتی ٢٢٦دا سوێند خواردن لە سەر نەچوونە لای ژن باس دەکرێ:

﴿٢٢٤﴾ وَلاَ تَجْعَلُواْ اللّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَانِكُمْ أَن تَبَرُّواْ وَتَتَّقُواْ وَتُصْلِحُواْ بَيْنَ النَّاسِ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ

**سوێند خواردنتان بە خودا مەکەنە بە تەگەرە و بەربەست و ڕێگر لە چاکە کردنتان، (وەک ئەوەی بڵێیت وەڵڵا لەوەدوا یاریدە و یارمەتی فڵان کەس نادەم و ناکەم، یان بڵێیت وەڵڵا بەڕیوان و ناوبژی نێوان فڵان و فیسار کەس ناکەم و دەگەڵ یەکتر ئاشتیان ناکەمەوە) دیارە خودا زۆر بە چاکی دەزانێ و دەبیسێت کرداری هەموو کەس و زانایە بە سەر هەموو شتێکدا.**

## سوێند خواردن

ئەو کەسەی سوێندی وا دەخوات، چاک وایە سوێندکەی بخوات و بیشکێنێ، تاکوو کارە چاکەکە بکات، پاشان کەفارەتی سوێندەکەی بدات. کە نان دانی ١٠ هەژارە یا پۆشتە کردنیانە، یاخود ئازاد کردنی کۆیلەیەکە؛ ئەو کەسەش کە ناتوانێ هیچ کام لەو سێ شتانە بکات با سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ.

گۆیا قورئانزانەکان لەسەر ئەو ئایەتە زۆریان باس کردووە و بێنە و بەرەیەان زۆرە لە سەری. ئەمما چاترینی ئەو نەزەرانەی داویانن دەبێ ئەوە بن: ئەو ئایەتە ﴿وَلاَ تَجْعَلُواْ اللّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَانِكُمْ﴾ ئاماژەیە وەلای ئەوەی زۆر سوێندان بە خودا مەخۆن لە سەر کاران. چونکە زۆر سوێند خواردن بە خودا دەکرێتە وەسیلەی فریودانی غەیر بۆ لای ڕاستی خۆت. چونکە سوێندخۆر دەیهەوێ خەڵک بەقایەی پێ بکا کە دە هەڵوێستەکەیدا ڕاستە. ڕاستیش دە ڕاستیدا لە عالەم بێ باکە بەقای پێ دەکەن یا ناکەن و شاهیدی خەڵک لە ڕاستیەکەی زۆر مەبەست مەنزوور نییە. چونکە ڕاستی بۆخۆی شاهیدی خۆیەتی، ئەو درۆیە پەنا دەباتە بە سوێند و بیکاتە شاهیدی خۆی. هەر بۆیەشە خودای زانا بە ڕاست و درۆیان بە ئایەتی ١٠ی سوورەی قەڵەم ڕێنوێنی دەدا بەوەی کە گوێڕایەڵی سوێندخۆرانی پەست و ڕووسیا مەبن: ﴿وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ﴾ واتە گوێدەری هیچ سوێندخۆرێکی سووک و ڕیسوا مەبە. هەربۆیەشە خودا ئەو ئاگاداریەی داوە چونکە زۆر سوێندخۆر جڵەوی زمان و دڵی دەکەوێتە دەستی شەیتان، تازە بۆ خۆی ئیرادەی ئەوەی نەماوە و نامێنێ، خۆی وەخۆ گرێ و بێ باک بێ لەوەی خەڵک بەقایەی پێ دەکا یا ناکا. بۆ باوەڕی بڕوانە لە تەفسیری کەبیر هەمان ئایە.

کەسێک بەڕاستی هەست بە جەلال و عەزەمەت و ئاگاداری خودا بکا هەرگیز جورئەت ناکا و نادا بە خۆی سوێندی پێ بخوا و بیکاتە شاهید.

**پوختەی مەبەستی ئایەتی ٢٢٤:**

دەو ئایەتە پیرۆزەدا سێ ڕازی بایخدار هەست پێ دەکرێن، دەبێ هەرسێکیشیان دروست بن و یەکیش بن لە ئیعجازی قورئان:

١. بە خودا سوێندان مەخۆ کە کاری چاک نەکەی، و یا پەرهیزکار نەبی، و یا لە نێوان خەڵکدا ئاشتی نەدەی. چونکە خودا بەوەی ڕازی نییە بۆ خۆ دوور خستنەوەت لە کاری چاک و باش، سوێندی پێ بخۆی.

٢. تەنانەت بۆ بەجێ هێنانی کاری چاک و تەقوا و پارێزگاری و ئاشتی عالەمێش، هەر نابێ سوێند بە خودا بخورێ، جا چ دەگا بەوەی سوێند بە خودا بخورێ بۆوەی کاری چاک و باش نەکرێ!

٣. سوێند نابێ بخورێ بە زۆری لە سەر هیچ کارێکی چاک و خراپ. چونکە زۆر سوێند خواردن پاڵت پێوە دەنێ بۆ لای تەرکی کاری چاک و تەقوا و ئابڕوو چوون و بێشەرمی و هەروا وردەوردەش عەزەمەت و جەلالی خوداش کەم دەکا، ڕادەکێشرێی بۆ دۆڵی درۆیان و هەروا بێ ئەرزش و بێ قەدر دێیە دەرێ لە لای عالەم و ڕاستیەکانیشت هەر بە درۆ لێ وەردەگیرێ.

## لەغو واتە چی؟

شافعی دەڵێ سوێندی (لغو) واتە بێنیەت و ئاگاداری دڵ بە زماندا بێ. حەنەفی و مالکی و ئەحمەدیش دەڵێن سوێندی لەغو واتە سوێندخۆر بە خەیاڵی خۆی پێی وابێ جا لە پاشانیش دەرکەوێ کە ئەو خەیاڵەی ئەو درۆیە. دیارە فەرموودەی شافیعیان بە پەسند داناوە، چونکە وا دیارە خودای تەعالا سوێندی بە دوو بەش داناوە:

١.سوێند یا بە دڵ و قەست و نیەتە.

٢. یا بەبێ ئیرادەی دڵ و ئاگاداری هەستی ئیمانە.

دیارە خودای تەعالا ئەوەی دوایەی (واتە سوێندی بێ نیەت و ئیرادەی دڵ)ی بە لەغو داناوە. بۆ بەرگری لە سوێندی لەغویش کەفارەت دە نەزەر گیراوە، وەک لە بابەت سوێندی بە تەڵاق. لە لایەن هێندێک لە زانایانی ئایینی، بۆ وەی سوێندخۆر لە ترسی زەرەری ماڵی دنیا لە

سوێندان بپرینگێتەوە، ئەگەرچی سەرسەری هەر وەسەر دەپەڕێ.

**کەفارەی** سوێندی بەڕاستی و بەقەست و نیەتەوە سێ شتن: ١. نانْدانی ١٠ نەفەران، ٢. یا جلکی دە نەفەر بێنەوا ٣. یا ئازاد کردنی کۆیلەیەک. ئەگەر هیچیان لە دەس نەهاتن وەک بۆ فەقیران وا هەڵدەکەوێ، سێ ڕۆژان بەڕۆژوو بێ.

دیارە لە پێشدا خودا ئەو ئاگاداریەی پێ دان سوێندخواردن بە خودا مەکەنە وەسیلەی کارەکانتان. دیارە هیچ باسێک لە کەفارەت نەهاتە گۆڕێ لەو بارەوە ئەگەرچی لە هێندێک مەقاماتی سوێنددا کەفارەت دە نەزەر گیراوە لە لایەن شەرعی ئیسلامەوە وەک ئینسانێک کە خاوەنی ئیمان و تەقوایە و عەزەمەتی خوداشی لە لایە. دەبینی لە سەر کارێکی خێر سوێندێ دەخوا کە نەیکا: وەک ئاشتی بەینی عالەم و یا چوونە عەیادەت و دیاری نەخۆش، یا دروست کردنی مزگەوت و ماڵ بۆ فەقیران.

ئەوە دەتوانێ و شەرع ڕێی داوەتێ کە ئەو سوێندە بشکێنێ و کارەکە بکا پاشان کەفارەتی سوێند شکانەکە بداتە هەژارن. و ئەگەر نەشیتوانی کەفارەتی ماڵی دنیایی بدا، وەک نانی دە هەژار، یا جلکی دە فەقیر  یا ئازاد کردنی کۆیلەیەک، با سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ.

بەڵام سوێندی لەغو نە بە گوناه دێتە ژمار و نە کەفارەتی دەخاتە سەر خودای خاوەن ڕەحم و کەرەم، بە پێی فەرموودەی ﴿لَّا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَانِكُمْ﴾ واتە خودا بە تۆڵەی ئەو سوێندە سەرسەرییانەو گرفتار ناکا.

بە کوردی و بە کورتی: خودا هەر وەک خولقاندوویەتی بەرەی ئینسان، دەشزانێ بە هۆی عەجوولی و لاوازی، تووشی هەڵە و تاوان دەبێ. جا خوداش لە سەر ئەساسی جەلال و عەزەمەت و کەرەمی خۆی، ئەو عەبدە هەڵەباشەی خۆی لە حانْد ئەو سوێندانەی کە هەروا لە خۆیانەوە بە سەر زاریدا دێ و دایاندەگژێتێ، بێ ئەوەی مەبەستێکی تیا بێ، عەفوی دەکا و تووشی سزا و تۆڵەی ناکا. بۆ تەئکیدی ئەو ڕاستیە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٢٥ی بەقەرە، ئەتۆش بە بەرجەوەندەوە سەیری کە:

**﴿٢٢٥﴾ لَّا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ**

**خودا تۆڵەی ئەو سوێندە هەڕەمانەتان لێ ناستێنێت، بەڵام خودا تۆڵەی ئەو سوێندخواردنەتان لێ دەستێنێت کە بە ئەنقەست و ئارەزووی دڵی خۆتان خواردووتانە، دیارە خوداش ببوورە و**

ئارام و نەرم و نیانە.

## سوێندی هەڕەمە

### ئاوڕ دانەوە وەسەر ئەو ئایەتە و تێڕوانینێکی هەستیارانە:

دیارە هەموو ئەقڵ و هەست و شعوور ئەوەی بە سبووت گەیانـدووە کە بـاوەڕ و ئـیمان بە نیەت و دڵە، پاشان دەکەوێتە باری عەمەلەوە، چونکە دڵ پادشای لەشە؛ تا ئەو شت وەرنەگـرێ و قبووڵی نەکا، شتەکە ناتوانێ بن‌گرتوو بێ. هەر ئەوەشە هۆ کە خودای تەعالا خێر یان شەڕ کە بە ئیـرادە و ویسـتی دڵ و نـیەت و بـاوەڕ نەبـێ، خـودا وەرینـاگرێ. بـۆ تەئیـدی ئەو ڕاسـتییە پێغەمبەریش فەرموویەتی عەمەل چ چاک و چ خراپ بە نیەتە، واتە قەست و ویستی دڵ. باوەڕ کردنی هەموو ئەو حاڵەتانە لە سەرچاوەی ئەمری باری‌تەعالا هەڵبەستراون کە بە وەسـیلەی ئەو ئایەتە پیرۆزەی ۲۲۵ بەیانی فەرمووە کە خودا دەڵێ: خودا سوێندی بێهوودەتـان لـێ وەرنـاگرێ واتە خودا ئەو سوێندانەی کە هەر لە خۆوە و بێ ئاگاداری و قەسـتی دڵ بە سـەر زارتانـدا دێ، وەک ئەوە کابرایەک دەڵێ ئەرێ لە کوێ بووی؟ ئەتۆش خێرا دەڵێی: **وەڵڵا** لە هیچ کـوێ. بەڵام خودا ئەو سوێندەتان لێ دەگرێ کە بە ئیرادە و ویستی دڵ بتانەوێ وەک سوێند بیخۆن لە سـەر کارێکی باش کە نەیکەن، یا کارێکی خراپ کە بیکەن، لە پاشان پەشیمان دەبنەوە. جـا ئەوجـار پاش پەشیمان بوونەوە دەتوانن بریتی بۆ بدەن بۆ سوێندەکە چ بیکەن و چ نەیکەن.

**بۆ ئاگاداری:** ئەگەر سوێند بخورێ لە سەر شتێکی کە بڵێین نەمان‌کردووە بەڵام کردبێتتـان، یا بڵێین کردوومانە، بەڵام نەوکردبێ، ئەو جـۆرە سـوێندانە درۆیەکـی زۆر گەورە و بـێ‌ڕەزایە، نە کەفارەتی هەیە، نە لێ‌خۆشبوون، ئیللا تۆبە و ڕەدکردنەوەی زەرەرەکە. خودا بۆ سەهوران ببوورە بەڵام بۆ بەئەنقەست‌کاران سەبوورە و نەبوورە، مەگەر بە تۆبە.

سوێندی سەرسەری و غەیرە عەمد گرفتاری تـۆڵە و سـزای نیـیە، وەک سـوێندی دە ڕق و تووڕەییدا، یا سوێندی لەغو. ئەمما سوێندی بە دڵی چ لە سەر چاک، چ لە سەر کاری خـراپ، سوێندە وشەرع بە هێندی دەگرێ و ئەگەر هاتوو شکا و نەچۆ جێ، لە سەری بۆ کـاری چـاک شکا دەبێ کەفارەتی بدا، ئەگینا ئینسان تووشی گوناە دێ.

**لەغو** دە ئادابی عورفدا واتە ساقیت کە نایەتە ژمار چ گوفتار بێ چ کـردار بـێ، هـاتنی ئەو وشەیە بۆ ناو باساندا ئاوایە کە ئایەتیش وەخۆی گرتووە و حەدیسیش و ڕیوایەتیش. دەبـێ لـێ وردبوونەوە و هەڵسـەنگاندنی تەواوی لە بـارەدا بکـرێ. مەسـەلەن ئـایەتی وەک ئـایەتی ۵۵ی

قەسەس: ﴿وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ﴾ واتە هەر کاتێ قسەی پڕ و پووچیان دەبیست ڕووی خۆیان لێ وەردەگێڕا دەیانکوت کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان، سڵاوتان لێ بێ، ئێمە نەفامانمان ناوێ، هەرگیز دەگەڵیشیان نابین.

هەروەها ئایەتی ٢٥ی سوورەی واقیعە: ﴿لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا﴾ واتە لەوێدا (واتە بەهەشت) نە قسەی پڕوپووچ دەبیستن و نە کوتەی خراپ و ناڕەوا.

دووبارە ئایەتی ٢٦ی سوورەی (فصلّت): ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ﴾ واتە ئەو بێ باوەڕانەش کوتیان گوێ مەگرن بۆ ئەو قورئانە و بیکەنە گەمە و گاڵتە بەڵکوو دەنگی مە ڕەسەر دەنگیان کەوێ و لێی حاڵی نەبن.

دووبارە ئایەتی ١١ی سوورەی غاشیە: ﴿لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَاغِيَةً﴾ واتە دەوێدا پڕوپووچ نابیستی.

هەروا قورئان بە ئاسانی دەس‌بەرداری واژەی (لەغو) نابێ. ئەو قەولانەی خودای تەعالا لە ئایەتەکانی ٥٥ی قەسەس، ٢٥ی واقعە، ٢٦ی فوسسیلەت و ١١ی غاشیە بەڵگەن لە سەر ئەوەی واژەی (لەغو) بە واتای پڕوپووچ دە ژمار نەهاتوویە. ئەمما ئایەتی ٧٢ی سوورەی فورقان کە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا﴾ واتە ئەوانەشن کە شاییدی بەدرۆ نادەن و کە بە لای کاری پڕوپووچیشدا تێدەپەڕن بە ویقار و بە سەنگینی و دوورەپەرێزانە خۆ دەنوێنن.

ئامـاژەی تەواوە وەلای ئەوەی خاوەن ویقاران و خاوەن کەرامەتان ئەگەر بە قەول و گوفتاری پڕوپووچ گەیشتن، ویقارانە و حەیادارنە و کەریمانە لای لێ دەدەن و ڕادەبرن بە تەنیشتیدا.

بە کورتی و بە کوردی: چاوەدێری پلە و پایەی عەزەمەتی خودا یەک وەزیفەی ویژدانی و شەرعیە، ئەوە یەقینە: سوێند شکان و سوێند خواردن زۆر یا کەم بە خودا دەگەڵ جەلال و عەزەمەتی ئەو خودای ژووری سەری نایەتەوە. جا کەوایە خاوەن ئیمان و باوەڕ بە تەئکید دەبێ خۆ بە دوور بگرێ لەوەی خودای بکاتە وەسیلەی گەمە دە کارەکانی حەق و باتڵیدا، جا بۆ نان و ئاو بێ یا بۆ چاوڕاو بێ.

سوێند دە ڕوانگەی شەرعدا ئەو سێیەن: لَغْو، غُموس، مُنعَقِد.

لەغو: واتە پڕوپووچ و بێ‌بنەما. نە تۆبەی هەیە نە کەفارەت.

غموس: واتە سوێندی بەنیەت و قەستەوە. هەم تۆبەی دەوێ هەم کەفارەت. (شافعی)

منعقد: واتە (بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ) دەگەڵ غموس دە لەفزدا یەک نین، دەنا هەر یەکن. شارعان بە کۆی دەنگ فەرموویانە کەفارەتی دەوێ. (احکام قرآن)



دیارە وەک ئاگادارین و لە بیرمان مابێ لە سەرەتای ئایەتی ٢٢٤دا ئاماژەن وەلای ئەوە کرد کە سوێندخواردن بۆ نەچوونە لای ژن کە دە ئایەتی ٢٢٦دا ئیشارەی بۆ لا دەکرێ، جا ئێستا گەیشتووینەتە ئەو قۆناغە کە دەبێ باسی ئەو سوێندەش بکەین.

(ئیلاء) یانی لە دوای باس لە سەر سوێندەکانی لغو و غموس و منعقد، دێینە سەر باسی سوێندی (ئیلاء).

ئیلاء مەنشوورە کە سوێندێکە لە سەر ئەوەی مێرد نەچێتە لای ژنەکەی، واتە سەرجێیی نەکا. ئەو سوێندەش ماوەکەی چوار مانگە یانی تا چوار مانگ مێرد دەتوانێ نەچێتە لای ژنەکەی. ئەگەر ئەو چوار مانگە تێپەڕی و نەچوو بۆ لای ژنەکەی، ئەوە ئەو سوێندە دەبێتە یەک تەڵاق، واتە مێردەکە یەک تەڵاقی دەکەوێ. جا ئەدێرەدایە کە شەرعزانەکان فەرموویانە: ئیلاء و تەڵاق هەردوو سوێندن، هەر ئەوەشە هۆی ئەوەی خودا دە قورئاندا بە شوێن یەکیاندا باس دەکا. دەگەڵمان بن ئەوە دەچینە خزمەتی ئایەتی ٢٢٦ کە ئایەتی ئیلایە:

> ﴿٢٢٦﴾ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَآؤُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ
> **ئەو کەسانەی کە سوێند دەخۆن نەچنە لای ژنەکانیان، مۆڵەتیان هەتا چوار مانگانە، ئەگەر هاتوو سوێندەکانیان خست و چوونە لایان، خودا بە تەئکید ببورر و دلۆڤانە.**

### (ئیلاء) چییە؟

بۆ ئەو کەسانەی سوێند دەخۆن لە ژنەکانیان دەگەڵیان نەنوون، جا بە یەکجاری دەگەڵیان نەنوون، یا بۆ ماوەیەکی لە چوار مانگ زیاتر بێ، ئەوە دێرەدا؛ ژنەکان بۆیان هەیە تا چوار مانگ تەواو دەبێ ڕاوەستن. لە چوار مانگ بەولاوە ژنەکە بە فەرموودەی ئیمامی حەنەفی تەڵاقێکی گەورەی دەکەوێ بەڵام بە مەزەبەکانی دی دەبێ دادگا تەڵاقی بدا و بخا. چونکە نەگەڕانەوەی پیاوەکە دە ماوەی ئەو چوار مانگەدا بە جێگای تەڵاقە. هیچ تەڵاقدانی پیاوەکەی ناوێ. بەڵام ئەگەر پیاوەکە دەو ماوە چوار مانگەدا زوو یا درەنگ گەڕاوە بۆ لای ژنەکەی و سەرجێیی کرد، ئەوە خودا دەیبەخشێ ئەگەر تاوانێکی بێ. و هەروا دەو ماوە چوار مانگەدا پیاوەکە تەڵاقی دا دیارە ئەو تەڵاقە دەکەوێ لە لایەن پیاوەکەوە. چونکە تا ماوەی چوار مانگ تەواو دەبێ، تەڵاق

هەر بە دەست پیاوەکەیە، لە چوار مانگ بەولاوە تەڵاقی بە دەس نامێنێ چـونکە چـوونەوە لای ژنەکە کە جایگای تەڵاقە بۆ پیاو نەماوە. بۆیە خودا دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ عَزَمُواْ الطَّلاَقَ﴾ واتە ئەگەر ویستیان ئازادیان کەن، دەبا بیکەن دەو ماوەیەدا.

ئەگەر بە زمانیش ئەو تەڵاقە نەڵێن، دیارە هەر بەو ئاکار و کردەوەیان کە نەچوونە لایانە دەو ماوەیەدا، بۆخۆی تەڵاقدانە. بزانە: بێ‌گومان خودا شنەوایە هەم سوێندەکە هەم تەڵاقەکە.

دە دادگای خودادا وەک پیاو ڕێزدارە و خاوەن مافە، ژنیش ڕێزدارە و خاوەن مـافە، ئەوانەی لایان وایە ژن دیلە و هەچی لێیان بـکەن ڕەوایە، ئەوانە بۆخۆیـان بە خۆیـان نەزانیـوە کە دیلـی نەفس و هەوا و سەرسەری خۆیانن، بێ ئاگا لە مافی خودادادی. ڕۆژی خۆی ئەو کەسانەی کە ناڕوانن لە عەداڵەت و ئینساف، دەخرێنە دادگای عەداڵەت و حەق.

دە یاسای شەرعدا (ئـیلاء) واتە سـوێند خـواردن لە سـەر جـیماع دەگەڵ ژن، واتە تەرکـی جیماع، وەک بڵێی (واللهِ لا أُجامِعُکِ) واتە قەسەم بە خودا دەگەڵت نانووم. بە لای هەندێک لە قورئانزانان ئایەتی ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ أن يعتزلوا مِـن نِّسَـآئِهِمْ﴾ لە ئـایەتی ٢٢٦ دابـڕاوە، ئەسـڵەکەی (لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ أن يعتزلوا مِن نِّسَآئِهِمْ) بووە. بۆیە هەنـدێک لە زانایـانی ئـایینی فەرموویـانە ئـیلاء خـۆی دە خۆیـدا تەڵاق بـووە دە دەورانـی جەهالەتـدا. چـونکە نـامەردی وا هەبـووە ژنەکەی خۆش‌نەویستووە، نەشی‌ویستووە مێرد بە یەکی دی بکـا، سوێندیشـی لـێ خـواردووە دەگەڵـی نەنوێ، هەر ئاوا هێشتوویەتەوە. هەدەفیش دەوەیدا ئازار و هەتکی حوڕمەتی بووە و هەروا تـازە موسوڵمانەکانیش بۆ ماوەیەک ئەو کارانەیان بەڕێوە بردووە. تـاکوو خـودای بەپەرۆش هـات بە هاوار و هانای ژنان و دێوئاکارانی پیاو بەو ئایەتە (٢٢٦)، ئەو کارە ناڕەوایەی سنوورداری کرد بە چوار مانگ.

## بیروڕای زانایان لە سەر ئیلاء

«ابن‌عباس» فەرموویەتی: دەورانی جەهالەت ئیلاء یەک ساڵ یا دوو ساڵ یا شـتێک زیـاتر بووە. خودای تەعـالاش بـۆ بەرگـری لەو داب و بـاوە نـاڕەوایە دە ئـایینی پیرۆزیـدا ئەو دابەی سنووردار کرد بە چوار مانگ کەوایە بە پێی ئەو یاسایە کەمتر لە چوار مانگ ئیلاء نییە و زیاتر لە چوار مانگیش دەکەوێتە باری تەڵاقەوە.

و هەروا ئیلاء هەرکەس مافی تەڵاقی بێ، مـافی ئیلائیشـی هەیە بەو پێـیە، ئـازاد، کـۆیلە،

مەست، سەفی مافی ئیلاءیان هەیە.

زانایانی ئایینی لە سەر ئیلاء مشتومڕیان هەیە لە سەر ئەوەی چ جۆرە سوێندێکە؟

شافعی: ئیلاء بەغەیرەز سوێند بە خـودا نـابێ. چـونکە پێغەمـبەر فەرمـوویەتی: یـا دەبـێ بێدەنگ بی سوێند نەخۆی، یا دەبێ ئەگەر سوێند دەخۆی بە خودای بخۆی.

حەنەفی: سوێندی ئیلاء بە خوداش دەبێ و بە تەرکی جیماعیش دەبێ و بە تەڵاقیش دەبێ. و هەروا سوێند بە ئازاد کردنی کۆیلە و یا نەزر کردنی سەدەقەش دەبێ.

و هەروا تاقمێک لە زانایان (وەک علی ابن ابی‌طالب و ابن‌عبـاس و زهـری) فەرمووییـانە: ئەگەر کابرای ئیلاءچی قەستی زەرەردانی بە ژنی نەبێ واتە جیماعی دەگەڵ نەکا، ئەوە بە ئـیلاء نایەتە ژمار. چونکە خودای تەعالا ئەو چوار مانگەی بۆیە دیاری کردووە تاکوو مێرد لەوە زیـاتر نەتوانێ سەرجێیی ژن نەکا. جـا خـۆ کـابرای مێـرد ئەگەر قەسـتی خێـر و چـاکەی بـێ دەگەڵ ژنەکەی، نە قەستی نەچوونە لای ژن، ئەو ئایەتەی نەدەنارد خودا.

ئەگەرچی هێندێکیش کوتوویانە ئیلاء بە هەر جۆر بێ دەبێ و دەچێتە ژێر یاساوە.

ئەمنیش دەڵێم شاریعەکان هێندەی دەتاشن ئەحکامەکانی ئاینی تا وەک نیـری حەمەبـۆری لێ دەکەن کە تازە کـونی نیـرەکە هێنـد فـراوان دەکـرێ بە کـاری هـیچ شـتێک نـایە تـێکەن و ئامووره‌کەی ڕاکێشێ.

نیر دارێکە دەگەڵ ئاموور، جووتێر جووتیان پێ دەکا، جا پێیـان دەکـوترێ نیـر و ئـاموور. ئاموور دارە درێژەکەیە گاسنی پێوەیە. «نیر» دارێکە داویشـرێتە سەر ملی گایەکان. جا ئەو نیـرە کە داویشـرێتە سەر ملی گایان، لە ڕاستی ملـی گایەکـان هەر یەکەی دوو کونیـان تـێ دەکـرێ تاکوو داریان بە ناوی چۆڵەمە تێکرێن و لە ملی گایەکە ئامووره‌کەی پێ قایم کـرێ و گایەکـان ڕایکشێن بۆ زەوی‌دڕین. جا ئەو کونەی نیرەکەی نەجاڕ هەندە زەلام و فراوانی کردبوو لە کـاری ئەوەی کرابوو شتی تێکرێ لە ملی گایەکان قایم کرێ نیرەکە و ئامووره‌کەی ڕاکێشێ.

ئەحکامەکانی شەرعیش هێندە ئەولاولایان پێ کراوە دز و فێڵبازەکان بۆ خۆ نەجـات دان کونێک دەدۆزنەوە پێیدا هەڵێن. بۆ نموونە وەک ئێرە ئیلاء دەتواندرێ بۆ دزەکان بڵـێ ئەمـن دەو سوێندەدا مەنزووم تەربیەتی ژنەکەم بووە نەک نەچوونە سەر جێـی؛ یـان نەمزانیـوە ئەو حـوکمە ئاوایە، هەزاران شتی دی.

حەنەفی: گەڕانەوە بۆ لای ژن دەو ماوە چـوار مانگـانەدا بە جـیماعە؛ یـا بە قەولە و ئەگەر

گەڕانەوەشـی نەکـرد دەو مـاوەیەدا، ماوەشـی تێـپەڕی تەڵاق دەکەوێ (بەینـونە)، واتە ڕێگـای ڕجوعی دەبەسترێ مەگەر سەر لە نوێ مارەی بکاتەوە.

جومهووریش دەڵێن پاش تێپەڕ بوونی ماوە چوار مانگەکە تەڵاق خودبەخود ناکەوێ بەڵکە دەبێ یا مێردە تەڵاقی دا یا قازی. هەندێکیش کوتوویانە تەڵاقێکی ڕەجعی دەکەوێ.

ئیلاء واتە سوێند خواردن بۆ نەچوون لای ژن، لەمەڕ یاسای تایبەتی خۆی لە نێوان ژنـانی جماع دەگەڵکراو و جیماع دەگەڵنەکراو جیاوزای و فەرق نیە.

کەفارەتی شکاندنی سوێندی ئیلاء مەزاهب بە کۆ دەنگیان لە سەر داوە.

تەئکید و تەئیدی چوار مانگ ماوە بۆ ئیلاء لە لایان شاریعانی شەرعی کراوە لەو بارەشەوە عەبدوڵلا کوڕی دینار نەقلێک لە حەزرەتی عـومەر دەگێـڕێتەوە کە گۆیـا حەزرەتـی عـومەر لە شەوگەڕانی خۆیدا ئاوازە و دەنگێکی نازک و دڵگر دەبیستێ، دەنگەکەش ئەوەی دەکوت:

تَطاوَلَ هذا الليلُ و اسوَدَّ جانِبُه          و أدّاقَنی أن لا خَلیل ألاعِبُه

فَوَاللهِ لَو لا اللهُ أني أُراقِبُهُ          لَحَرَّکَ مِن هذا السـریرِ جَوانِبُه

واتە: ئەوشۆ دووریم لە یار دوور و درێژ بوو. دەوروبەر تاریک و تنۆکە، ئەمن کە بەخەبەرم و خەوم نایە ئـی ئەوەیە خۆشەویسـتم لە لا نیـیە. تـاکووکەیفەی دەگەڵ بـکەم.کەوایە بە خـودا سوێند ئەگەر ترسی خودام دە دڵدا نەبایە، تەنیشتی ئەو تەختەم بێ هـاواڵ نەدەبـوو، (واتە دەبـا ئەو تەختەم هەر دە جۆڵلانە کردن با)

کاتێ حەزرەتی عومەر ئەوهەی بیست لە کچەکەی (حفصە) پرسیار کرد: زۆرترین وەخت کە ژن بتوانێ لە دووری مێردی خۆ وەخۆ بگرێ چەنـدە؟ حەفسـە کـوتی: ۴ یـا ۶ مانـگ. لەو کاتەوە حەزرەتی عومەر بە لەشکریانی واتە یارانی شەڕکەری ئیسلامی فەرمووە: لەو ماوە زیـاتر نابێ وەمێنن، دەبێ بە نۆرە بچنەوە لای ژن و منداڵتان.

پاش ئەو هەموو ڕاوڕاوێن و بازبازێنە لە بابەت ئیلاء (واتە سوێند خواردن لە سەر نەچوونە لای ژن) چاو کرا و زاندرا و بەو ئاکامە گەیشتین: مێرد ڕێی بەدفەڕی و بەدڕەفتاری دراوە دەگەڵ ژن. ئەمما خودای بانی سەر هاتووە چارەی چاری ژنان بکا بەوەی کە پیاو نەتـوانێ حـاکمیەتی خۆی لە سەر ئازاردانی ژن ئیدامە پێ بدا. چـوار مـانگی بـۆ دانـا لە سـەر نەچـوونە لای ژن و هەڵپەساردنی. پاش ئەو ماوەیە دوو لکی لە سەر ملی دادەگیرێ یا گەڕانەوە بۆ لای یـا ئـازادی پـێدان. ئەوەیە کە خـودای تەعـالا بە وەسـیلەی ئـایەتی ۲۲۷ ڕەفتـارەکەی سـنووردار دەکـا و

دەفەرموێ:

﴿٢٢٧﴾ وَإِنْ عَزَمُواْ الطَّلاَقَ فَإِنَّ اللّه سَمِيعٌ عَلِيمٌ
**ئەگەر هات و (مێردەکان) بڕیاری تەڵاقدانیشیان دا، خودا بیسەر و زانایە.**

## تەڵاق

واتە ئەگەر هات و سوێندخۆر (مێرد) دەو سوێندخواردنەی خۆیدا نەگەڕاوە ویستی تەڵاقی دا، با بیدا؛ دیارە خودا بیسەریشە و زاناشە بە هەڵوێست و دەروونی هەمـوو خـاوەن هەسـت و دڵێـک. کەوایە ئەگەر بە زمـانیش تەڵاقەکەی نەڵـێ هەر بە ئاکـار و کـردەوە تەڵاقەکە درا ئەوە کەوتووە.

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانین:**

ئەو پیـاوانەی کە لە ڕووی بەهـانەی غەیـرە شـەرعی بەڵـکە بە هـۆی سـەرەڕۆیی هەتکـی حورمەتی ژنیان بکەن، هەتکی حورمەت و ڕێزی ئاینیان دەکەن و بێ تۆڵەش نابن. چونکە ڕێـز و حورمەت مافی هەموو لایەکە.

ئەو ئایەتە پیرۆزەی ٢٢٦ و ٢٢٧ پوختەی مەبەستەکەیان ئەوەیە: ئەوانەی بێ تەعینی مـاوەی چوار مانگی  و زیاتر سوێند دەخـۆن نەچـنە لای ژنانیـان، مۆڵەتیـان چـوار مـانگە، ئەگەر دەو ماوەیەدا ئەوان سوێندەکەیان شکاند و چوونە لای ژنەکانیان، ئەوە تەڵاقیان هەر لە جێی خۆیانە و بۆیان حەڵاڵە دەگەڵیان بنوون. خـوداش لەو قەڵسـی و تـووڕەیی وان دەبـوورێ و ئەوانـیش کەفارەتی شکانی سوێندەکە بدەن ئەگەرچی شکاندنەکەشی لە سەر خێر بووە.

ئەگەر هاتوو سوێندخۆر قەستی ئازار و ئازادی ژنەکەی پـاش مـاوەیەکی دوور و درێـژ دە نەزەر گرتبوو و هەروا نەزەری وی زۆر زیاتر لە چوار مانگ بوو و دەو چوار مانگە سوێندەکەی نەشکاند و نەگەڕاوە، ئەوە بە تەواو بوونی چوار مانگ تەڵاقی دەکەوێ، و خوداش بەبێ گومان بە هەڵوێست و گوفتار و ڕەفتاری ئەوانە زانا و شنەوا و ئاگادارە.

دەبێ ئەوە بە چاکی بزانین و باوەڕی پێ بکەین: ئیمان و بـاوەڕی حـاکم و پادشـای دڵ و لەش لە سەر کورسی کاروبار و قەزاوەتی ژیان و مـان و چـۆن ژیـان، قەزاوەت دەکەن. ئەگەر بێتـوو ڕێ بـدرێ بە شـەیتان و نەفـس و هەوا، خـۆ بگەیێـنە ئەو سـەر کورسـیە ئەوە قەزاوەت دەکەوێتە دەستی نەفس و هەوا و شەیتان جا ئەوکات خۆت دەزانی «کەرێ بێنە و شەڕ بار کە».

لە کن ویژدان و ویقار خوداناسی زۆر زۆر ئاسانە و ئیفتیخارە، لە کن گیانی خاڵی لە ویقار و دەمار و ویژدان خۆدۆڕاندن و خۆفرۆشتن ئاور دە ماڵە هەتیو بەردان زۆر ئاسانە و بە ئیفتیخارە.



تا ئێستا بە بەژن و باڵای شۆڕەلاوی سوێندخۆر هەڵاکوتراوە، قسە لەو ژنە ژێردەستەی کە بە داوی مێردی لاسار پێوە بووە، نەکراوە کە لە پاشان ئەو چوار مانگە تەخسیر کراوە کە نەجاتی بووە، ئایا عیددەی دەوێ یا نایەوێ. چونکە وەک دەزانین چوار مانگە دەخالەتی تێ نەکراوە منداڵدان دەبێ پاک بێ هیچی تێدا نەبێ؟ جا بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٢٢٨:

﴿٢٢٨﴾ وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ وَلاَ يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُواْ إِصْلاَحًا وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكُيمٌ

**ئافرەتانی تەڵاقدراو ئەگەر بە تەمای شوو کردن بن، ئەوە لازمە لە سەریان تا سێ پاکی تەواو دەکەن چاوەڕوان بن، ڕەوا نییە بۆ ئەو ژنانە ئەوەی خودا دروستی کردووە دە منداڵدانیاندا بیشارنەوە، ئەگەر باوەڕیان بە خودا و ڕۆژی قیامەت بێ. مێردەکانیان لە بێگانە لە پێشترن بۆ هێنانەوەی ئەو ژنانە، ئەگەر وازیان لە ئاشت بوونەوە کرد. ژنان مافی خۆیان هەیە کە بە گوێرەی بەرنامەی (خودا دەگەڵیان ڕەفتار بکرێ) جا هەر وەکوو ژنان ئەو ئەرکەیان لە سەر شانە، پیاوانیش لە هەندێ ئەرکی سەر شاندا، پلەیەک وان لە سەرووی ئافرەتانەوە. دیارە خوداش بەتوانا و زاڵ و کاربەجێیە.**

## عیددەی ژنانی تەڵاقدراو

دیارە ئینسانی خاوەن هەست و شعوور ئەگەر سرنج داتێ و بەرجەوەند بێ، ئەوە بە جوانی دەرک دەکا: ژن جگە لە دابین کردنی بەشێک لە ئارەزووی نەفسانی و لەزەتی هەوەس، بۆ داڕژتنی بنچینەی نەسل و بەرەیە و بۆ حەسانەوە و گەرم داهێنانی هۆدەی ژیانی دنیایە، ئەوەش پێویستی تەواوی بە هاوفکری و خۆشەویستی و لێک ئەمینی هەیە. جا بۆیە دەبێ ئەو ژن هێنان و مارە کردنە بۆ یەکجاری بێ و هەتا سەر. چونکە ئەگەر ئەو نیەتە یەکجاریە نەبێتە بناغە و کڵی ئەو مارە کردنە، ئەو هاوفکری و خۆشەویستیەش ناگوورێ دە ناو دڵدا، چونکە مارە کردنی ماوەییی بەغەیرەز تێخستن و ڕێخستن هیچی دی لێ چاو ناکرێ و دیاری نادا.

چونکە ئەو بناغەیە واتە پێکەوە نووساندنی ئەو دوو نێر و مێیە لە خوداوەیە، کەوابێ هەر ئەویش چاک و باش دەزانێ چۆن بە یەکەوە بوونیان ڕەوایە و دەوایە بۆ دەردیان، هەروەک لە ئایەتەکانی ۱۹ی نیساء و ۲۲۸ی بەقەرە ئاماژە وەلای ئەو بابەتە دەکا:

نیساء ﴿۱۹﴾ وَعَاشِـرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ. هەڵسوکەوتتـان دەگەڵیـان ڕێکوپێـک و شایسـتە بـێ. یـا ڕوون و ئاشکراتر بڵێین: گوزەرانیان دەگەڵ بکەن بەوپەڕی ڕێز و حورمەت و باشی.

بەقەرە ﴿۲۲۸﴾ وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَـيْهِنَّ بِـالْمَعْرُوفِ. بـۆ ژنـان هەیە بە سـەر مێردیـانەوە هەر وەک ئەوەی بۆ مێرد هەیە بە سەر ژنەوە.

ئەگەر لە خۆ گۆڕان نەیەتە گۆڕێ، باوەڕ ناکرێ کەس بدۆڕێ، خودا ڕێنوێنی عەبـدی زۆر بە ڕوونی کردووە لەو بارەوە بە هۆی ئایەتی ۲۱ی سوورەی ڕۆم: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّـنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَـوْمٍ يَتَفَكَـرُونَ﴾ لە نیشـانەکانی (یەکتـایی و توانـایی و زانـایی و کـارجوانی خـودایە ئەو یاسـایە) ئەوەیە کە هەر لە خۆتـان هاوجووتی بۆ دروست کردوون تاکوو لە سایە و پەنایاندا داسەکنن و ئارام بگرن و خۆشەویستی و ڕەحم و بەزەییشی خستۆتە نێوانتانەوە، بەڕاستی ئا لەوەدا بەڵـگەی زۆر هەیە بـۆ کەسـانێ کە خـاوەنی هەسـت و شعوورن و دەکاریشی دەکەن.

بەڵام لە سەر ئەساسی سـرشتی ئینسانی و ئەساسی ژیانی دنیایی و باری ئەخلاقی وا دەبێ و هەڵدەکەوێ، ئەو بناغەی پێکەوە بوونە و هاوسەریەتیە، پایەی دڕز دەبا و دەلەرزێ و مۆرانەی دەخرێتە تێ، کە بارودۆخی خۆشەویستی و ژیـانی پـێکەوە بـوون دەکەوێـتە نـاو گێژاوەیەکـی نەحەسانەوە و نەحاوانەوە. جا خودای کارزان و کارجوان ئەدێرەدا بـۆوەی ئەو دوو نێـر و مێـیە هاوسەرەکە تا وێستا پێکەوە حاواونەوە و بەڵام ئێستا ڕایەڵ و پۆی حاوانەوە پسپـس بـووە، بـۆ چـارەی کاریـان و ڕزگارییـان لەو تەنـگوچەڵەمەیە تەڵاقـی دانـاوە بە یاسـایەکی عـادڵانە و چارەسەرانە. ئەگەر مێردەکە خوازیاری ئەوەی بوو تەڵاقی دا دەبێ مافی شەرعی خۆی پێ بدا و ئازادی کا بە خۆشی نەک بە شێوەی دوژمنایەتی. ئەگەر ژنەکە خوازیاری جودابوونەوە بوو ئەوە دەبێ ئەگەر مێردەکە داوای ئەو زەرەر و زیـانەی کە لە کـاتی هێنانیـدا داویەتـی و کێشـاویەتی، وەک حەقەمارەیی بێ، ژنەکە بۆی ڕەد دەکاتەوە و ئەگەر مێردەکەش داوای نەکرد و پێویستی پێی نەبوو، ئەوە لازم ناکا بۆی ڕەد کاتەوە، ئەوجار مێـردەکە بە خۆشـی تەڵاقـی بـدا و لێـک جـودا ببنەوە.

جا ئەوجار ئەو ژنە تەڵاق دراوە، هەر لەڕێوە ڕێگـای نەدراوە مێـردی دی بکـاتەوە، بەڵـکە

دەبێ بە هۆی عیددە کە یاسایەکی ئایینیە منداڵدانی خاونێ بێتەوە بۆ وەی ئەمین بێ لەوەی بەشی مێردی تەڵاقدەری تێدا نەماوە، جا پاشان کە پاک بۆوە منداڵدانی ڕێگا ئاواڵەیە بۆ مێرد کردنەوە. ئەو عیددەش خاوەنی یاسایەکی تایبەتییە بە پێی کەیفیەت و چۆنیەتی ژنەکە.

عیددە: ئەو ژنانەی کە تەڵاق دەدرێن یا حەیزیان پێدا دێ یا حەیزیان پێدا نایە، ئەوانەی کە حەیزیان پێدا دێ و مێرد چۆتە لایان، دەبێ سێ حەیزان بپێون واتە خۆڕاگریکەن تاکوو بە تەواوی منداڵدانیان لە مێردی پێشوو پاک دەبێتەوە بەو سێ حەیزە.

ئەو ژنانەی کە حەیزیان پێدا نایە، جا یا لە بەر پیری لە حەیز کەوتنەوە یان لەبەر تەمەن کەمی حەیزیان پێدا نایە، ئەوە بۆ هەرتک لایان سێ مانگە عیددەیان دەبێ، وەک دە ئایەتی ٤ی سوورەی تەڵاقدا دانی بە سەردا هاتوو: ﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِن نِّسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ وَأُوْلَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا﴾ **ئەو ژنانەتان کە لە شتنی عوزری ژنانە ناهومێد بوون، ئەگەر لە گوماندان ئەوە ماوەی عیددەکەیان سێ مانگە، و هەروا ئەوانەی کە تا ئێستا عوزریان نەشتووە ئەوانیش هەر سێ مانگە عیددەیان. ئەو ژنانەی کە زگ پڕن ماوەی عیددەیان دانانی منداڵەکەیە. کەسێ لە خودا ترسی بێ، کاری وەئاسانی دەگێڕێ خودا.**

بەڵام ئەو ژنانەی کە مێردەکانیان دەگەڵیان نەنوستوون لاقەیان نەکردوون تەڵاقیش دەدرێن، ئەوە عیددەیان لە سەر نییە، وەک لە ئایەتی ٤٩ی سوورەی ئەحزابدا هاتووە:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا﴾

**ئەی ئەوانەی ئیمان و بڕواو هێناوە، کاتێ ژنە باوەڕدارەکانتان مارە کردن جا پێش ئەوەی بچنە لایان تەڵاقتان دانەوە ئەوە ئێوە هیچ مافێکی عیددە هەڵبژاردنتان بە سەر ئەوانەوە نییە، کەواتە حەق و مافی خۆیان بدەنێ و بە شێوەیەکی جوانیشیان وەڕێ خەن.**

و هەروا ئەو ژنانەی کە زگیان لە مێردیان پڕە، عیددەیان دانانی زگەکەیانە هەروەک دە ئایەتی ٤ سوورەی تەڵاقدا ئاماژەی وەلا کراوە:

﴿وَأُوْلَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ **ئەو ژنانەی دووگیانن ماوەی عیددەیان دانانی زگیانە.**

دیارە خودای تەعالا شوێنی بۆ ئینسان دادەنێ و دادەمەزرێنێ، بەو شوێندا چوونەش حەواڵە بە ئینسان و ئیمان و باوەڕیەتی، جا لە سەر ئەو یاسا و ئەساسەی تەواوبوون و نەبوونی

عیددە، حەواڵە بە ژنە چونکە هەر بۆخۆی دەزانێ ماوەی تەواو بـوون و نەبـوونی؛ کەسـی دی نایزانێ و ئاگای لە ناو زگی نییە. جا بۆیە خودای مەزن بە لازمی گێڕا لە سەر ژنـان کە بە بـاری ڕاستیدا ئیقرار بکەن لەو بارەیەوە، واتە پـاکبوونەوەی لە عیـددە و پـاک نەبـوونەوەی، وەک لە ئایەتی ٢٢٨ی بەقەرە ئیشارەی وەلا کردووە: ﴿وَلاَ يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ﴾ **ڕەوا نییە بۆ ئەو ژنانە ئەوەی کە خودا دە ناو منداڵدانیاندا دروستی کردووە بیشارنەوە.** جا حەیـز بـێ و چ منداڵ! ئەو هۆشدار و ئاگـاداریە بەرگـرییە لەو ژنـانەی کە بە شـەو مێـردەکەی دەیێـتە لای و کەچی بۆ بەیانی تەڵاقی دەدا. و لە پاش چەن ڕۆژێک هەست بەوەی دەکـا کە زگـی پـڕ بـووە. بەڵام دەیشارێتەوە تاکوو زوو بگا بە مێردی دووهەم، ئەو زگەش دەکاتە ئی وی و ڕێگای مێردی هەوەڵەکەی دەبەستێ کە تازە بتوانێ وەیگێڕێ بـۆ لای خـۆی، وەبـاڵەکەی دەهـاوێتە ئەسـتۆی خۆی.

وەیـا ئەو ژنە لە خـودا نەترسـە بەو لایەدا دەجـووڵێتەوە زگـی پـڕ نیـیە و لە دادگاشـدا تـا عیددەکانی بە سەر دەچێ، نەفەقەی بۆ دەبڕدرێتەوە، جـا بـۆ ئەوەی نەفەقەی مانگێـک و زیـاتر بستێنێ، عیددەی تەواویش بووە، دەڵێ ئێستا سێ جار پاک نەبوومەتەوە. دیارە ئەو تاوانە فێڵ و دزیەش داوێتە سەر ئەستۆی خۆی.

خودای خاوەن بەزە دەو عیددەی کە دایناوە بۆ ژنـی تەڵاقدراو، جـگە لە تەوەجـوە وەلای پاکبوونەوەی منداڵدانی ژنەکە، ئەو ئـاوڕە بەڕەحمانەشـی داوەتەوە وەلای مێـرد و ژنـی لێـک دابڕاو: واتە هەر کاتێ بۆ یەکتر پەشیمان بوونەوە، پیاوەکە دەتوانێ و ڕێگای هەیە ژنە بگێڕێتەوە ژێر ڕکێفی خۆی، هەروەک خودا ئیشارەی تەواوی وەلای ئەو بابەتە کردووە بە هۆی ئەو ئـایەتە ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُواْ إِصْلاَحًا﴾ **مێردەکانیان بۆ گێـڕانەوەی ژنە تەڵاقدراوەکانیـان دە ماوەی عیددەدا شایستەن و باشترن لە یەکی دیکە، ئەگەر بەڕاستی بیانهەوێ پـێکەوە ژیـان بـکەن.** وە ئیللا ئەگەر مێرد بیهەوێ دەو گێڕانەوەیەدا ژنەکەی تووشی داو و تەڵەیەک بکا بە هەر لایەکـدا، ئەو مێردە ناتەواوە خۆی تووشی تەڵە و تاوانی دنیا و ئاخرەت دەکـا، وەبـاڵی تـاوانێکی قـورس داوێتە ئەستۆی خۆی، هەروەک خـودای تەعـالا ئیشـارەی وەلا فەرمـووە بە وەسـیلەی ئـایەتی ٢٣١ی بەقەرە: ﴿وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لَّتَعْتَدُواْ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ﴾ **مەیانهێننەوە بـۆ ئەوەی تووشی زەرەر و زیان بکەن بە دەستدرێژی بۆ سەر مافیان، هەرکەس کاری ئـاوا بکـات بێگومـان ستەم لە خۆی دەکات.**

دەو ئایەتەدا ڕازێک هەیە زۆر بەرچاوە بۆ ئاوڕ وەسەر دانەوە دەبێ. ئایەتەکە ﴿وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ واتە بۆ ئەو پیاوانەی ژنەکانیان تەڵاق داوە پلە و پایەیەک هەیە، ئەو پلە و پایە بۆ ژنەکانیان نییە. پلەکەش ئەوەیە: پیاوەکە دەتوانێ تا ژنەکەی عیددەی بە سەر نەچووە، پەشیمان بێتەوە و ژنەکەی بباتەوە، بەڵام ئەو پلە بۆ ژنەکە نییە، واتە ژنەکە هەچەن پەشیمانیش بێتەوە بۆ مێردەکەی، ناتوانێ خۆی لێ جووت کاتەوە.

ئەگەرچی بە عام قورئانزانەکان بۆ ئەو دەرەجەیە ئاوا دەچن پیاو بە تێکڕایی لە هەموو بواران سالاری بە سەر ژنانیاندا هەیە.

ئەگەر بێتوو ئیدیعای سەروەری و سالاری لەسەر دەراوێین، و یا سەروەری و سالاری لە سەر ئەساسی ویژدان و ویقار و مرۆیی بێ، ئەو مافەی ئاینی ئاسمانی داوێتی با ئافرەت هیچ ئایین و یاسایەک نەیداوەتێ. ئەوەی ئاوا نەزانێ، ئایینی ئیسلام و ئاخرەت و حەیاتی ئافرەتانی هەڵنەسەنگاندووە. دە تەکلیفاتی ئایینیدا ژن چی لە پیاو کەمترە بە جوز دەبارەی کەیفیەتی لەشدا نەبێ وەک حەیز و ... و دەبارەی نامووس و ویژداندا ژنە نیشتمان فرۆشە و نەتەوە فرۆشە؟ یا پیاو؟ ژنە دنیا وێرانکەرە یا پیاو؟ دەبارەی نەفس و هەوادا تا نێرەکە نەیجوولێنێتەوە ئەو ناجوولێتەوە، ژنە سەربڕ و زگدڕە یا پیاو؟ بە هەر حاڵ دەبێ ئەو قەزاوەتە بدرێتە دەستی قورئان.

## نێر بۆچی لە مێ ژووراترە؟

دووبارە ئاوڕدانەوەی موفەسرانی قورئان بە تایبەتی ئیمام فەخری ڕازی وەسەر ﴿وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾:

زانایان بە زۆری هاودەنگ و کۆدەنگن لەسەر ئەوەی: پیاو بەرزی بە سەر ئافرەتانەوە هەیە. ئەمما ئەو زێدە پلە و پایەیەی پیاو بە سەر ئافرەتانەوەی هەیە دەبێ بۆی بگەڕێین تاکوو بزانین و بزاندرێ لە کام ڕێگەوەیە؟ ئایا لە بابەت ئەخلاقەوەیە؟ یا لە بابەت ئایینەوەیە؟ یا لە بارەی نامووسەوەیە؟ یا لە ژیانەوەیە؟ یا لە بارەی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی و نیشتمان پەرستیەوەیە؟ چەن خاڵی بابەت لەو بارەوە دەس‌نیشان دەکەین:

١. دە یاسا و قانوونی لوغاتی عەرەبدا (رَجلٌ بَيِّنُ الرُّجْلَةِ: اَيْ القُوَّةِ) واتە نێرینە هێز و خۆڕاگری و بەربەرەکانی دە کاراندا لە مێیینە زیاترە بە پێی سرشت و فیترەت، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەوەی کە باری نەفەقە و خەرج و بەجێ هێنانی دۆخی ژیان بە ئەستۆی

نێرینەکەوە هەڵاوەسراوە. و هەروا هێز و خۆڕاگری بۆ دیفاع لە ئایین و خاک و ئاو و نیشتمان بە زۆر لە ئەستۆی نێرینەیە. دەتوانین بڵێین ئەوانەن هۆی فەزڵی نێرینە بەسەر مێدا. ئەگەر ورد لێکی دەینەوە و هەڵیسەنگێنین ئایەتی ٣٤ی نیساء شاهیدە لەسەر ئەو داوایە، سەیری کە:

نیساء ﴿٣٤﴾ الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللّهُ وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا.

**پیاوان چاوەدێر و سەرپەرشتی ژنانن، چونکە خودا هەندێکی بە سەر هەندێکی تردا بەرز کردۆتەوە، بە هۆی ئەوەوە کە پیاوان لەماڵ و دارایی خۆیان خەرج دەکەن، کەواتە ژنانی چاک وپاک ئەو ژنانەن کە فەرمانبەرداری خودا و پارێزەری حەیا و ناموسی خۆیانن و ئی ماڵ و سامانی مێردیان بن، ئەوەش بە هۆی ئەوەوەیە کە خودا مافی پارازتوون، ئەو ژنانەش کە لێیان دەترسێن نافەرمانی بکەن، ئامۆژگارییان بکەن و جێگایان لێ جیا بکەنەوە، لێشیان بدەن، جا ئەگەر چاک بوون و بە قسەیان کردن، ئەوجار ئازاریان مەدەن، هیچ گومانی تێدا نییە، خودا زۆر بەرز و مەزنە.**

لە سەراپای ئەو ئایەتە پیرۆزە، ئەوە دەدرەوشێتەوە و خۆ دەنوێنێ کە مەرزی پلە و پایەی پیاو بە سەر ژندا هەیە، ئەما ئەو پلە بەرزیە ئی ئیدارە کردنی ژیان و نیزامی هاوژینی و خێزانەتییە، ئەو کۆڵ و بارەش بۆیە خراوەتە سەر شانی پیاو، خودای بانی سەر لە سەرتای خیلقەتەوە نێرینەکەی بە هۆی زێدە پێ بەخشینی بەراوەرد و هەستەی شعوور، ئەو کۆڵ و بارەی خستۆتە سەر ملی، چونکە ئافرەت نیعمەتێکی نازک و تەسک و تەمیزە ئەگەر زۆر تخوون کۆمەڵگای کرێ ئەو نازک و تەسکیەی دەکەوێتە ژێر تیری تیرئەندازان و بەردێ. بۆیە دەبێ پیاو خەرجی مارەیی و جلک و خۆراک و خانوو وەئەستۆ گرێ تاکوو ئەو ژنە دەو کارانە تێهەڵنەگلێ و بکەوێتە دەستی ڕاوکەرانی بێبەندوبار. ئافرەت وەک جەواهیراتێکی بەقیمەتە دەبێ زۆر بە چاک و توندی و خۆشەویستانە لە ناو سندووقی پۆڵادا قایم کرێ. ئەدێرەدایە چونکە مێرد ئەو بارانەی خراوەتە سەر شان و بارێکی قورس و گرانیشن پێغەمبەر گۆیا فەرموویەتی: ئەگەر ئەمن ڕێم پێ درابایە، بمکوتایە لە غەیری خودا سوژدە دەبێ ببرێ دەمکوت دەبێ ژن سوژدە ببا بۆ مێردی مرۆی بە ویژدان و بە ویقار.

و هەروا بە پێی فەرموودەی (صحیح و مسلم) لە جابرڕا گۆیا پێغەمبەر دە خوتبەی «حجة الوداع»دا فەرموویەتی: لە خودا تەقوا بکەن و ژنانیش کە لە لایەن خوداوە بە ئەمانەت خزمەتکار بە ئێوەی پیاو سپێردراون، ئاگاداریان بکەن بە شێوەی چاک و پاک و جوان.

دووباره هەدەف و مانـا دەو زەوجـیەتەدا چیـیە؟ واژەی زەوج جـووتی لە سـەر ئەساسـی: سووکنایی بە یەک هاتن و ئولفەت و دۆستایەتی، لەززەت لێک وەرگـرتن و داڕشـتنی بنـاغەی نەسـەب و هەمـووی ئەوانە لە نێـوان ژن و مێـردا شـەراکەتییە، جـا هەر وەک ژن لە بـابەتی حوقووقاتی شەرعی عۆدەداری بەجێ هێنانی مافی پیـاوەکەیە، پیـاوەکەش عـۆدەداری بەجـێ هێنانی ئەو مافانەیە کە شەرع بۆ ژنەکەی خستوویەتە سەر شانی مێردەکەی لە جیاتی مـارەیی و نەفەقە و جلک و جێخەو و حەسانەوە و پارێزگاری ئەو ژنە و مافی ئەو.

گفت پیغمبر که ز بر عاقلان غالب ةید سنت و بر صاحبدلان

باز بر زن جاهلان غالب شوند زانکه ایشان تند و بس خیرەسـرند

پێغەمبەر فەرموویەتی: إنَّهُنَّ یَغْلِبْنَ العاقِلَ و الجاهِلُ یَغْلِبُهُنَّ. مانای دوو شێعرەکانە.

پێغەمبەر: فإنَّهُنَّ عِندَکُم عنوانٌ. واتە ژنان خزمەتکارتانن.

## ژن کۆیلەیە؟

لە سەر بەرجەوەندی و هەڵسەنگاندنی دوو ئایەتەکـانی ۲۲۸ی بەقەرەوە ﴿وَلِلرِّجَالِ عَلَـيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ و ۳۴ی نیساء ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ﴾ بە واقعی هەسـت بەوە دەکـرێ کە پیـاو لەو بارەوە کە پیاوە، واتە: خاوەنی ئەو سـیچم و بـیچمەیە و دارای ئەو سـرشتەیە، لە ئـافرەت لەو بارەوە کە ئافرەتە واتە نیعمەتێکی ناسک و تەسک و زوو زەربە پەزیرە، نیشانە و هەدەفـی تیـری چاوبـازان و ڕاوکەرانە، پیـاوەکە دەرەجە و پـلەی بەرزتـرە. واتە سـەخت و قـایم و قـۆڵترە و لە نیشانەی تیربازان بەدوورە، ئەرکی خول و سوڕ پێدانی بـاری دنیـای کـۆمەڵایەتی و دیفـاعی و هەروا بەزمی دنیای زیاتر لە ئەستۆ خراوە و ئەرکی باری ئیتـاعە لە مێـرد و ئەمانەتـداری مـاڵ و سامان و داب و باوی ناو ماڵ و خێزان پتر دە ئەستۆی ژن خراوە.

ئەمما وەک لە گۆشەیەک لە گۆشەکانی شەرع و دابی ئاییندا چاو دەکرێ لە هەشت بابەتدا پلەی نێر ڕەسەر پلەی مێ خراوە، ئەوەش بابەتەکان:

۱. ئەقڵ: گۆیا دەبێ پیاو ئاقڵتر بێ لە ژن، بەڵام نەهەموو پیاوێک لە هەموو ژنێک.

۲. دیە واتە خوێنی ژن: گۆیا زانایانی شەرع کوتوویانە خوێنی پیاو لە ئی ژن زیاترە گەرچی قورئان ئەوە بە سەرڕاحەت نالێ و نەبیندراوە. تا کوێ وایە سەرم لێ دەرنـاچێ، چـونکە قورئـان هەر فەرموویەتی: ﴿مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ...﴾ (مائدە: ۳۲) یا ﴿أَنَّ النَّفْـسَ بِـالنَّفْسِ...﴾ (مائـدە: ۲۵)

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى﴾ (بقره: ۱۷۸). ئەو ئایەتانە لێیان چاو ناکرێ کە خوێنی ژن کەمتر بێ لە ئی پیاو، شەرعیش دیارە سەروەرە.

۳. میرات (کەلەپوور): ژن نیوەی پیاوی بۆ دانراوە لە ماڵی بابی، دەبێ نیوەکەی دیکە لە ماڵە مێرد وەرگرێ. یا دەڵێن پیاوەکە ئەرکی ژیانی لە سەرە، ئەو زیادیە ئی ئەوەیە.

۴. ئیمامەت: ژن ڕێی نەدراوە ئیمامەت بکا بۆ پیاوان. ئەوەش وا بزانم لە بەر بێ لیاقەتی ژن نەبێ، بەڵکە لە بەر بزۆزی پیاو بێ.

۵. پیاو دەتوانێ ژن بە سەر ژن بێنێ یا کەنیزەک، بەڵام ژن ناتوانێ ئەو کارە دەگەڵ مێردەکەی بکا، پیاوێکی دی بێنێ بیکاتە ڕەفیقی مێردەکەی.

۶. دیارە پیاو دە میراتدا بەشەکەی دوو بەرابەری ئافرەتانە، ئەوەشمان دە بەندی سێدا باس کرد.

۷. پیاو توانای تەڵاق دانی ژنی هەیە هەرکات بیهەوێ، یا بۆ لای خۆی وەرگێڕێ کاتێ تەڵاقی دا، بەو شەرتە دە عیددەدا بێ و تەواو نەبووبێ. عیددەکەی بەبێ ئیجازەی ژن، بەڵام ژنە تەڵاق دراوەکە ڕێگای نییە خۆ بخاتەوە ژێر ڕکێفی مێردەکەی بە وازی خۆی و یا ڕجووع بە خۆی بکاتەوە پاش بە سەر چوونی عیددەکەی.

۸. دە تاڵان و غەنیمەتدا بەشی پیاو زیاترە لە بەشی ژن، وا دەردەکەوێ دە شەڕ و هەرادا باری پیاو گرانتر و سەختتر بێ لە ئی ژن.

جا بە پێی ئەو هەشت بابەتە بەرچاوانە، ئەگەر بکوترێ ئافرەت کۆیلە و عاجزی دەستی پیاوە، ڕەنگە ئەوە بە عەیب نەگیردرێ، ئەمما ئەو هەشت خاڵانە زاهیری قەزیەن، نیازیان بە لێکۆڵینەوەیەکی ژیرانە و ئاقڵانە هەیە تاکوو دەگەینە ئەو نەتیجەیە کە دە هیچ کوێی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا زوڵم لە ئافرەت نەکراوە. بۆچی؟ ئافرەتیش و پیاویش خەلیفەی سەر زەوین بە پێی ئایەتی ۳۰ بەقەرە:

وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً بیر خۆت وەخە ئەی پێغەمبەر! ئەو کاتەی خودا کوتی بە فرشتەکانی: ئەمن لەو سەر زەوییەدا جێنشینێک دادەنێم. دیارە خودا فەرمووی جێنشین وەک ئینسان بێ، نەیفەرموو پیاو! نەشیفەرموو ژن! بەڵکە ئینسانی مەبەستە دێرەدا چ ژن و چ پیاو.

تەنانەت ئەوڕۆ لە دنیای ڕۆژئاوا ئافرەتی بە مەوجوودێکی لاواز و سووک چاو لێدەکەن

بەڵکە ئەو ئایین و یاسا ئاسمانیانەی کە مافی هەموو بـوونەوەر و گیانلەبەرێکیـان بە ئەنـدازەی شەئن و لێهاتوویی خۆیان بۆ دابین و داناون، دەبـێ بـۆ کـردنەوەی هەمـوو گرێوگـۆلێکی کە دەرکی دەکەین کۆسپی بەر دڵن و بۆن هەڵنادرێن و نایزانین. ڕوو دە یاسای قورئان و سـوننەتی ڕاستی پێغەمبەرﷺ و هەست و شعووری پـڕ لە کەرامەتـی کەیـن نەک ئەقڵـی خودپەسـندان و ژێری بێ بیری یاساکانی غەیرە ئاسمانی. بـۆ زێـدە زانـین لەو بـارەوە بـڕوانە لە تەفسـیرەکانی: کەبیر، مونیر، تبیین الفرقان، قرطبی، روح المعانی و...

## بۆچوونی شێخ محەمەد عەبدە لە سەر ژن دە یاسای ئیسلامدا

دڵم ئیجازەی پێ نەدام ئەو فەرموودە زێڕینەی شێخ محەمەد عەبدەی خودالێخۆشبوو بازی بە سـەردا بـاوێم کە لەمەڕ ئـافرەت و ئـایینی ئیسـلامدا فەرمـوویەتی: ئەو ڕێـز و حـورمەت و پایەبەرزیەی کە ئایینی ئیسلام بە ئافرەتی بەخشیوە دە هیچ ئایین و دینێکی دیـدا چـاو نـاکرێ و هیچ گەلێک تا ئەمڕۆ پێی نەگەیوە. وڵاتانی ئەورووپا ئەوڕۆ کە شـانازیمان بە سـەردا لێـدەدا بە خەیاڵی خۆی هێشـتا پـلەی ژن لە ناویانـا زۆر لەو پـلەیەی کە ئـاینی ئیسـلام بەخشـیویەتی بە ئافرەت نزمترە، چونکە ئێستاش لە ناو هێندی دەوڵەتانا ژن بە بـێ ڕازی بـوونی مێـردی نـاتوانێ دەس بەرێتە دارایی خۆیەوە.

دە ئایەتەکانی پێشوودا باسی ئەوەی کرا ژنی تەڵاقدراو یا بڵێـین تەڵاقکەوتـوو بە تەڵاقـی ڕەجعی (واتە بیلاعەوەز) مێرد دەتوانێ دە عیددەیدا ڕجووعی پێ بکاتەوە واتە وەیگێڕێ بـۆ لای حەڵاڵی خۆی، ژن ڕازی بێ یا نـاڕازی. بەڵام ئەو هێنـانەوەی ژنەکە لە سـەر سـەڵاح و خێـر و خۆشی بێ، نەک لە ڕێگای فێڵ و کەڵەکدانی ژنەکە بێ.

ئەوجار کاتی ئەوەی هاتووە بزاندرێ مێرد تا چەند جار ڕێگای ئەوەی هەیە هەر تەڵاقـی دا و وەیگێڕێ، چونکە ئەگەر ئەو ڕێگا و دەرووە ئاواڵە بێ بۆ مێرد، ئی وا هەیە ژن ناناسێ و نازانێ یاسای دین لە مەڕ ژن و مێرددا چی فەرمـوووە، ژن دەخـاتە نـاو تەڵە و داوەوە واتە نە بۆخـۆی مافی ژن و مێردایەتی دەداتێ و نە ڕێی دەدا چارەی خۆی چارە کا، واتە مێردێکی دیکە بکا. جـا لە بەر ئەوەی مێرد نەتوانێ ئەو کەڵەکبازییەی دەگەڵ ژن ئەنجام بدا و بەڕێوەی بەرێ، خـودای پارێزەری مافی خاوەن مافان هات دار و لەلەی لەو بـارەوە دامەزرانـدووە و دیـاری کـردووە بە وەسیلەی ئایەتی ۲۲۹ ئاگاداری دا بە ئینسان کە تەڵاقدانی ژن دوو کەڕەتانە، واتە مێـرد تـا دوو کەڕەتان ژنی خۆی تەڵاق کەوتوو وەگێڕێ بۆ لای خۆی. جا یا بە شێوەی ڕجووع واتە بێ مـارە

کردنەوە یا بەشێوەی مارە کـردنەوە. ئەوەش بەو مەرجە کە ئەو تەڵاقدان و کەوتـنە بـۆ گـاڵتە و گەمە بە ژن و بە ئایینی ئیسلام نەبـێ وەک قومـار، قومـارێی پـێ بکـا، بەڵـکە بەهەڵە بـێ و یـا شێواوی و بابەتێکی ئەخلاقی بێ. جـا لە پـاش ئەو دوو کەڕەتە خـۆ وەخـۆ گـرێ واتە دەگەڵ خێزانی بە خۆشی و بە لەباری دەگەڵی ژیان بکا. و یا بە یەکجاری ئـازادی کـا. دەنـا ئەگەر ئەو تەڵاقدانە بکاتە سێ کەڕەت ڕێگای حەڵاڵ بوونەوەی ئەو ژنەی لێ دەبەسـترێ، مەگەر ئەو ژنە بە خۆشی خۆی مێردی دیکە بکا و بۆوەشی نەکا تاکوو بۆ مێردەکەی پێشێی خۆی حەڵاڵ وەکا بەڵکە بۆ هەمیشەی بکا وەک جاری هەوەڵ چۆن بۆ یەکجاری و هەمیشەی مێـرد کـردووە. جـا ئەودەم ئەگەر وا هەڵکەوت دەگەڵ ئەو مێردەی دوایەش لێک ترازان و جیـا بـوونەوە، جـا چ بە مردن بوو یا بە تەڵاقدان، ڕێگا دەکرێتەوە بۆ مێرد کردن بە مێردەکەی هەوەڵی.



ئەوجار دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٢٩ بۆ وەی بە باشی تێبگەن لەو بارەوە:

﴿٢٢٩﴾ الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاك بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلاَّ أَن يَخَافَا أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْك حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللّهِ فَأُولَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ

**تەڵاقدان تاکوو دوو کەڕەتانە، جا دوای ئەو کەڕەتانە یا هاتنەوە و بە خۆشی پێکەوە ژیـانە، یـا سێهەم کەڕەت بە خۆشی تەڵاق دان و دەست لێک بەردانە. ئەو مارەییەی بۆ ژنەکانتـان بڕیـار دراوە ڕەوا نییە هیچی لـێ هەڵگـرنەوە، کاتێـک نەبـێ کە ژن و مێـرد بترسـن لەوە کە نـاتوانن سنووری یاساکانی خودا بپارێزن، ئەگەر ئێوە ترسان ئەو دووانە ناتوانن سنووری خودا بپارێزن ئیتر ئەو کاتە هیچ کامیان تاوانیان لە سەر نییە لەو بارەوە، ئەگەر ئافرەتەکە ویسـتی خـۆی لە مێردەکەی ڕزگار کا و مارەییەکەی و یا هەنـدێکی یـا شـتێکی تـر بـدا، ئەو یاسـایە سـنووری خودایە. ئەو سنووورە مەبەزێنن، ئەوەی ئەو سـنووورە ببەزێنـێ کە سـنووری خـودایە، بێگومـان ئەوانە ستەمکارن.**

## تەڵاق چەند کەڕەتە؟

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر تەڵاق (جیابوونەوەی پیاو لە ژن):**

هەروەک ژن مارە کردن لە سەرەتای دامەزراندن و پێکهێنانی خانووی ژیانی پێکەوە بوونی دنیایە و پڕ لە هیوا و ئارەزووی تەشکیلی دنیای کـامڕانی و بەختەوەریـیە تەڵاقـیش دوایـی پـێ

هێنان و وێران کردن و تێک ڕووخانی ئەو خانووەیە و بە بادا دانی ئەو هەموو خەڵە و خەرمانە ئاوات و ئارەزوو و هیوایەیە. وای بە حاڵی تەڵاقخۆران.

تەڵاق واتە کردنەوەی گرێی مارەیی، یا بڵێین جیابوونەوەی مێرد لە ژنێ. ئەو جیابوونەوەش لە شەرایەتی بێ عیوەزید و بێ سێ کەڕەتیدا دەتوانێ مرد دەو دوو دەفعەیەدا پێش بە سەرچوونی عیددە، ژنەکەی وەگێڕێ بۆ لای خۆی، ژنەکە پێی خۆش بێ یا پێی ناخۆش بێ. دیارە عیددەش چونکە هاتە کایەوە، دەبێ بناسرێ و بزانرێ: ژنی جیماع دەگەڵ کراو سێ حەیزە ئەگەر خاوەن حەیز بێ، دەنا ئەگەر لە حەیز وەستابێتەوە، دەبێ سێ مانگ بێ، وەیا هەر حەیزی نەدیبێ هەر دەبێ سێ مانگ بێ.

تەڵاق ئەگەر بە شاهیدی دوو شاهیدی خاوەن ئیعتبار نەبێ، ناکەوێ و گرێیەکەی هەڵناوەشێتەوە. ئەوانەی لێر و لەوێش هەر دەیخۆن و بێ شاهید و ئاگاداری ژن لە جێی خۆی باسی لێوە دەکەین.

چاوەترین چاوەی ئیسلام و شەرعی ئیسلام قورئانی کەریمە، کە بە ڕوونی و ئاشکرایی و غەیرە قابیل پێچ و پەنا و بەولاولادا بردندا دەفەرموێ: تەڵاق دە دوو کەڕەتی لێک جیا و نێواندارادا واقیع دەبێ دەشتە جێ، ئەگەر لە باری فەرهەنگی قورئان و لۆغات سرنج بدەیە ئایەتی ٢٢٩ی بەقەرە، دەیسەلمێنی کە تەڵاق دەبێ دە سێ کاتی جیاجیادا بێ، سەیری ئایەتەکە بکەین: ﴿الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾

ئەوەی دێرەدا جێی باسی ئێمەیە (مرّتان)ە. ئایە (مرّتان) بە مانای دەفعەتان و کەڕەتانە؟ یا بە مانای عەددەدانە؟ شک دەوەیدا نییە کە بە مانای کەڕەتانە، واتە دوو کەڕەت. کەڕەتی سێش یا (إِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ) یا (تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) یانی مانەوەی بەخێر و خۆشی و یا ئازادی بە چاکە. کەوایە تەڵاق سێ کاتی سەربەخۆی خاوەن سنووری دەوێ، بەو پێیە کەسێک بڵێ هەرسێک تەڵاقم کەوێ، یەک کەڕەت و یەکجێ، یەک تەڵاقی ڕەجعی دکەوێ. چونکە بە یاسا و دابی (اسماء العدد) کە سەلاسەیە، ئەگەر بۆ ئیسمی مەعنایان وەخوێنی، وەک تەڵاق بێ، وە یا (سبحان الله) یا (لا الە الاّ الله) بێ، ئەوە هەر بە یەک دەژمێردرێ و دێتە ژمار. ئەگەر (اسماءالعدد)یش بۆ ئیسمی زات وەخوێندرێن وەک قەڵەم، کتێب، مەڕ، بزن، گا، ئەوە بە ئەندازەی (اسم العدد) کەیە، جا ١، ٢، ٣، ٤ بێ، بەو ئەندازە دێتە حیساب و ژمار. نموونە: کابرایەک بڵێ هەر سێک مەڕم بە تۆ دا یا فرۆشت، بێگومان هەر سێ مەڕەکە فرۆشی دێ؛

ئەمما ئەگەر بڵێ هەزار جار (لا اله الاّ الله) یان (سبحان الله)، هەر بە یەک (لا الـه الا اللـه) و یەک (سبحان الله) دێتە ژمار.

تەڵاقیش لە سـەر ئەو ئەساسـە، چـونکە لەفـزی تەڵاق ئیسـمی زات نـیە، بەڵـکە ئیسـمی ماعنایە. ئەگەر کابرایەک لاپرەسەن بێ، یا بە بەراوەرد بـێ بڵـێ: هەر سـێ تەڵاقـم کەوێ، ئەوە ئەگەر ئینساف بە کار بەری، یەک تەڵاقی ڕەجعی دەکەوێ. ئەگەر هات و لەو لەغـوەی خـۆی پەشیمان بۆوە دەتوانێ تا ژنەکەی عیـددەی بە سـەر نەچـووە ڕجـووعی پـێ بکـاتەوە. تـا دوو کەڕەتان دەتوانێ پـێش تەواو بـوونی عیـددە، مێـردی پەشـیمان لە لەغـوی ڕجـووع بە ژنەکەی بکاتەوە، ژنەکە پێی خۆش بێ یان پێی ناخۆش بێ. بەڵام کە هـاتوو مێـرد ئەو کـارەی نەکـرد و وازی لێ بێ سەرلەنوێ بە یاسا و دابی مارە کردن مارەی بکـاتەوە، بەڵام لە پـاش سـێ کەڕەت ناتوانێ تازە، چونکە ئەو ژنە تازە تـاکوو مێردێکـی دیـکە بە دابـی شـەرعی نەکـا و ئـازاد نەبـێ لەویش، لەو مێردەی هەوەڵی حەڵاڵ نابێتەوە و مارەی لێی نـایەتەوە. وابـزانم ئەوەش تـۆڵە بـێ لێیان بکرێتەوە.

دە حەدیسدا هاتووە کە دە زەمانی پێغەمبەرﷺ و ئەبووبەکردا و بەشێکیش لە خەلافەتی عومەردا سێ تەڵاق بە یەکجار و یەک لەفز، یەک تەڵاق ژمێردراوە. بەڵام بەشێک لە شەڕکەرانی ئیسلام کە ئارەزوومەندی بەربڵاوی ئایینی ئیسلام بوون و هەروا ئارەزوومەندی ژنانی پاک و خاوێنی کاتی شەڕ و هەرای پیرۆزی یەک لە دووی یەکی ئیسلام بوون، ژنانی خۆشیان تا لە ژێر ڕکێفیاندا بان ڕێی مارە کردنی ئەو ژنانەیان پێ نەدەدان، ناچارەن بۆ ئاڵوگۆڕ کردنی ژنەکانیان بەو ژنە زۆرانەی کاتی شەڕ، بەپەلە و بەتاڵووکە ئەو مۆڵەتە سێ کاتیەی شەرع بۆی دانابوون بەزاندیانن و خۆی گەیاندە یەک کەڕەت تەڵاق کەوتنی تەواو. حەزرەتی عومەریش بە پێی کات چاوپۆشی لێ کردن بێدەنگی لێ کرد. بەڵام کاتێ پیرۆزی ئیسلام پەرەی ستاند و شەڕ کەم بۆوە حەزرەتی عومەر یاسای تەڵاقی وەک خۆی سێ کاتە لێ کردەوە.

حەدیس: عَن ابن‌عباس: قال کان الطلاقُ علی عهد رسـول اللـه و ابی‌بکـر و سـنتین مـن خلافة عمر الثلاث واحدة. فقال عمر بن الخطاب ان الناس قد استعجلوا فی امر کانت لهم فیه اناةٌ لَـلَوْ اَمضیناهُ علیْهِم فأمضاهُ عَلَیهِم. رواهُ احمد و مسلم و ابوداود.

یەک تەڵاق کەوتن، دە سێ تەڵاق‌خـواردن بە یەکجـار، دە هەمـوو دەورو زەمـان و کـاتی مێژووی شەرعی ئیسلامدا هەوادار و تەرەفداری زۆر لێهاتوو زانـای بـوون و هەن، بـۆ نمـوونە

ئاماژە وەلای هەندێکیان دەکەین:

شێخ ئەبولحەسەن ئەشعەری ئیمامی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دە ناو کتێبی بەئەرزشی خۆیدا (مقالات الاسلامی) لەو بارەوە نووسیویەتی و فەرموویەتی: (وَ قالَ القـائلونَ إذا طلَّقَهـا ثلاثاً کانتْ واحدةً) (ج٢، ل ١٤٣)

ئیمام فەخری ڕازی دە تەفسیری کەبیردا دە پاڵ بەیانی مانای ئایەتی (الطلاق مرّتان)دا سـێ کەڕەتی بوونی تەڵاقی بە شێوەیەکی ڕون و جوان قبووڵی کردووە و فەرموویەتی: (فَثَبَت أنّ هذه الآیة دالّةٌ علی الأمر بتفریق الطلقات و علی الشدید في ذلک الاثر و المبالغة فیه، ثُمّ القـائلونَ بهذا القول اختَلَفوا علی قَولینِ (الاول: و هو اختیار کثیر من علماء الذین انَّهُ لَوْ طَلَّقَها اثنینِ او ثلاثاً لا یَقَعُ الاّ الواحدةُ و هذا القولُ هُوَ الا قیسُ لان النَّهيَ یَدُلُّ علی اشتمالِ المنهيِّ عَنْهُ علی مفسدة راجحة و القولُ بالقوع سَعيٌ في ادخالِ تلک المفسـدةِ فـی الوجـود و انَّـهُ غیـرُ جـائزٍ فَوَجَبَ اَنْ یَحکُمَ بِعَدِمِ الوُقوعِ).

## ئاوڕدانەوە وەسەر نەزەری ئیمام فەخری ڕازی لە سەر (الطلاق مرّتان)

موفەسـرەکان لە بارەی ئەو ئـایەتەی ڕا و بۆچـوونی جوداجودایـان هەیە. لەو بـارەوە ئایـا جوملەی (الطلاق مرّتان) سەربەخۆیە (مبتداء) واتە ئاوڕدانەوە نییە بۆ پێشەکە کە (طلاق رجعیە) و یا ئەو ئایەتە سەربەخۆ نییە (مبتداء) نیـیە بەڵـکە ئـاوڕدانەوەیە وەلای پێشـێ، وا مەڕبـووتە بە تەڵاقی ڕەجعی. ئەودەم لە سەر قسەی دوایە مانای ئایەتەکە ئەوە دەبـێ: (تەڵاقـی ڕەجعـی دوو کەڕەتە).

ئەمما بەشی زۆری قورئانزانەکان نەزەریان وایە کە جوملەی (الطلاق مرّتان) جـوملەیەکی سەربەخۆیە واتە بە قەولی عیلمـی، مـوبتەدایە و ئـاوڕدانەوەی وەلای پـێش خـۆی نیـیە و بـێ عەلاقەیە. دەلیل و بەڵگەی ئەو خاوەن نەزەرانەش ئەوەیە: لەفزی (الطـلاق) کە ئەلـف و لامـی ئیستغراق واتە گشتی و کوللی بە سەرەوە، نەک زیهنی، واتە شتێکی کە دە پێشدا لە زەیندا هەیە. خۆ ئەوەش دیارە دە یاسای عیلمی نەحودا ئەو ئەلف و لامانەی کە دەچنە سەر کەلیمان، یا بـۆ ئیستغراقن واتە کوللی، یا بۆ زیهنین واتە بۆ شتێکن کە دە پێشدا دە زیهندا دامەزراوە.

لە سەر ئەو ئەساسە و ئەو نەزەرەیان کە ئەلف و لامی سەر (الطلاق) بۆ ئیسـتغراقن مانـای ئایەتی (الطلاق مرّتـان) واتە (کـلُّ الطـلاقِ مرّتـانِ و مَـرَّةٌ ثالثـةٌ) بەو پێـیە و بەو بەراوەرد و بەو بۆچوونە، دەبێ بکوترێ: تەڵاقی شەرعی ئەو تەڵاقەیە کە دەبێ کەڕەت بە دوای کەڕەتـدا بـێ و

هەر کەڕەتەی سنووری خۆی دیار بێ. چونکە (مرّتان)ی ئایەتەکە مانای کەڕەت لە دوای کەڕەتە. ئەگەر مانای وا بەراوەرد نەکرێ غەڵەتە. (کَرَّتَینِ) و (مَرَّتَینِ) قورئان مانایان دوو کەڕەت و دوو کەڕەتە.

ئەگەر کابرایەک لەولایەڕا بێ و بڵێ ئەو ئایەتی (الطلاق مرّتان) بۆ بەیانی تەڵاقی سوننەت دابەزیوە، نە بۆ تەڵاقی فەڕز؛ و هەروا لە لای مەش جەمع تەڵاقی مەباحە نە سوننەت، دەبێ وڵامی ئەو کابرایە ئاوا بدرێتەوە: ئایەتی (الطلاق مرّتان) بۆ بەیان و ڕانانی سیفەتی تەڵاقی سوننەت دانەبەزیوە، بەڵکە بۆ بەیانی ئەسڵی تەڵاقە. ئەوکات دەبێ بکوترێ ئەو کەلامی (الطلاق مرّتان) گەرچی بە ڕواڵەت و زاهیری، خەبەرە، ئەمما دە واقع و نەفسی ئەمردا مانای وی ئەمر و دەستوورە، واتە مانای (الطلاق مرّتان = طَلِّقُوا مَرَّتَینِ) واتە تەڵاقی خۆتان بڵێن: دوو بار دوو بار بدەن نە یەک کەڕەت.

دەشڵێن تەجاوەز لە هێنانی لەفزی ئەمر و دەستوور، وەلای لەفزی خەبەر بۆ تەئکیدی مانای ئەمرە. جا لە سەر ئەو بەراوەرد و هەڵسەنگاندنە، ئەوە بە سبووت دەگا کە ئەو ئایەتی (الطلاق مرّتان) دەلالەت و شارەزایی دەکا و دەدا لە سەر ئەمر و دەستووری تەڵاقدان بە شێوەی جار لە دووی جار، واتە کەڕەت لە دوای کەڕەت. ئەوکات دەڵێن ئەوانەی کە لە سەر ئەو باوەڕەن: تەڵاق دوو کەڕەتە، دە ناو خۆیاندا دوو نەزەری لێک جیاوازیان دەسنیشان کردووە:

١. ئەوە کە پەسەندی زۆربەی زانایانی دینە، ئەوەیە: ئەگەر ژنت بە لەفزی دوو یا سێ تەڵاق دەی بە جوز یەک کەڕەت نایەتە ژمار. ئەو نەزەرەش قیاسترە، چونکە نەهی شامیلی نەهی کراوە لە فەسادێکی راجحە، دیارە ئیقرار بە واقع بوونی تەڵاقیش تێکۆشانە بۆ ڕوودانی ئەو فەسادە کە ئەوەش واتە حەولدان بۆ هاتنە دی فەسادە شەرع بە ڕەوای نەزانیوە. جا لە سەر ئەو ئەساس و یاسایە واجبە و بە واجب دێتە گۆڕێ حوکم بە تەڵاق نەکەوتنی سێ تەڵاق بکرێ و بدرێ دە یەک جار خواردنی تەڵاقدا بە سێبەسێ.

٢. نەزەری دووهەم: قەولی ئەبووحەنیفەیە کە فەرموویەتی هەر سێ تەڵاق خواردن هەچەن حەرامە و خیلافی قورئان و سوننەتە، بەڵام دەشکەوێ.

## مشتومڕ لە سەر سێ تەڵاق

ئەگەرچی ئیمام فەخری ڕازی دە تەفسیرەکەی خۆیدا (تەفسیری کەبیر) و هەروا ئیمام

محەمەد کوڕی عەلی شەوکانی یەمانی دە تەفسیرەکەی خۆیدا (فتح القدیر) لە سەر ئەو ئایەتە (الطلاق مرّتان) نەزەری ئاوایان بەیان فەرمووە: «وَ قَد اخْتَلَفَ اَهلُ العِلمِ في اِرسالِ الثّلاثِ دفعةً واحِدَةً هَل يَقَعُ ثلاثاً أو واحدةً فقط؟ فَذَهَبَ الى الأوّلِ الجمهورُ، و ذَهَبَ الى الثاني مِن عَداهم و هُوَ الحقُّ و قَد قَرَّرتُهُ فى مؤلفاتي تقريراً» بألفاء و أفْرَدتُهُ برسالةٍ مُسْتَقِلَّةٍ». واتە زۆربەی عولەما (واتە شافعی و حەنەفی و مالکی و ئەحمەدی؛ ئەوانە پێیان دەکوترێ کۆی عولەما واتە جمهووری عولەما) نەزەریان وا داوە هەر سێ خواردنی تەڵاق هەر سێ دەکەون و غەیری وان دەڵێن یەک دەکەوێ. شەوکانی دەگەڵ ئەوانەیە کە دەڵێن یەک دەکەوێ. دیارە مشتومڕی عولەمایانی ئیسلام لە سەر سێ تەڵاق زۆرە دە ژمار نایە، دوو دەستە و سێ دەستە نین، بەڵکە زۆرن؛ بۆ نموونە:

١. جمهوور دەڵێن سێ بە سێ تەڵاق هەر سێ دەکەون
٢. هەندێک دەڵێن سێ بە سێ تەڵاق هەر هیچ ناکەون چونکە بیدعەتە
٣. هەندێک دەڵێن هەر سێ دەکەون ئەگەر ژنەکە دخوولی پێ کرابێ
٤. هەندێک دەڵێن هەر یەک دەکەوێ ئەگەر دخولی پێ نەکرابێ.

هەرکەسەی بۆ ئیدیعای خۆی دەلیلی هێناوەتەوە، مەسەلەن ئەوانەی بە گژ جمهووردا هاتوون و دەڵێن: کاتێ دە ئایینی ئیسلامدا شتێکی حەرام بێ و مەبغووز بێ، خودا و ڕەسوول پێیان بدعەت بێ و بەرهەڵستی ئایەتی ڕجووع بێ و ئایەتی ٢٢٨ی بەقەرە بێ ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ﴾ بێ؟! ئەوە چۆن ڕەئی پێ دەدرێ دروست بێ؟ شتی ئاوا یا دەبێ بە تەوری تەواو بێ ئەسەر کرێ یا دەبێ ئەسەری ئەوەی وا سنووردار کرێ کەس نەتوانێ سنووربەزێنی تێدا بکا.

ئەو ئایەتە پاک و پیرۆزەی (الطلاق مرّتان) بەو هەمموو ڕوون و گەشیەی هەیەتی بە قازانجی کام ئایین و مەزهەبە و بە قازانجی کام ژن و مێردەی وا پچڕ پچڕ کراوە و لە بەر یەک هەڵوەشا و تیتۆڵ تیتۆڵ کرا؟ بۆ مەگەر نەزاندراوە ئێستێ و لەوە بە دواش زانایانی بە ناو ئایینی وا کەم دەس دەکەون بزانن بەرەکەتی نیکاح چەندە و چۆنە، و ماڵوێرانی و پەشیمانی بێسوودی تەڵاق چەندە و چۆنە؟

(اَبغَضُ الحلالِ الى اللهِ الطّلاقُ) بوغزاویترین حەڵاڵ لە لای خودا تەڵاقە. بەڵام دەبێ بزاندرێ کەی کاتی حەڵاڵی تەڵاق دێ؟ خۆ ئەو حەڵاڵییە بێ شەرت و شەرووت و دار و لەلە نییە! ئایینی ئیسلام هەمووی بەزە و ڕوحم و عەفو و گوزەشتە، دەرگای پەشیمان بوونەوەی لە

سەر هەڵەچی و هەڵەباشان دانەخستووە.

ئەدێرەدایە کە مەلایانی ناحاڵی لە عیززەتی ئیسلام، بە **مارەجاش** ئابڕووی ئیسلامیان بردووە هەزاران هەزار ژن و مێردی پاک و بەئیمان کە لە سەر هەڵەیەکی ڕق هەڵستاوی (تەڵاق) جەرگی پاک و پڕ لە ئیمان و باوەڕیان بە کوچکیەوە داوە و لەو ئایینە موقەددەس و پاکەیان بێزار و دڵڕەش کردووە. ئێستاش و ئێستاش هەر هەیە و بەردەوامە، جا نازانم وەباڵەکەش دەکەوێتە ئەستۆی جۆگەلە هەڵبەستی هەوەڵ، یا جۆماڵکەری نەزان.

خودای تەعالا دە قورئانی پاک و پیرۆزی خۆیدا ڕاجع بە نیکاح و تەڵاق زۆر بە ڕوونی دواوە، بەتایبەتی دە دوو سووڕەی بەقەرە و نیساءدا و هەروا دەلیلی دووپات و سێ پات کردنەوەی نیکاح و تەڵاق ئاماژە وەلای ئەرزش و ئەهمیەتی نیکاح و تەڵاقە دە ژیانی کۆمەڵایەتی و خاوخێزانیدا، لە بارەی زەوزوو، بەرەو نەسل و ڕزق و مەسکەن و ئیرتیبات و شەراکەت و تێکەڵاوی و ژن و مێردایەتی.

## نیکاح دە ئایینی ئاسمانیدا

نیکاح واتە ئەو تێکەڵاوی و پێکەوەیی ژن و پیاو لە ژێر ناوی ژن و مێردایەتی، خاوەنی تایبەتمەندی زۆر بەوەج و بەئەرزشە، ئەو بابەتە واتە ئەو نیکاحە، دە دەرووی ئیسلامدا خاوەنی دوو شتی زۆر بەقیمەتین: ١. لە سەرێکەوە سەودا و هاوپەیمانی و گرێبەستێکی هەمیشەییە دەگەڵ ژن، هەروەک ژنەکە دە بابەت مارەیی و خەرج و نەفەقەدا خۆی دەدا بەو پیاوە، پیاوەکەش دە موقابیل بەهرە وەرگرتن لەو ژنە خۆی دەدا بەو ژنە. ٢. لەو سەرەشەوە پەیڕەوییە لە یاسا و سوننەتێکی گەورەی عیبادەتی.

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم لە سەر ئەساسی فەزڵ و حیکمەتی خۆی بۆ دامرکاندنی هەوەس و ئارەزووی نەفسانی لە باری شەهوەتەوە و هەروا بۆ بەرەو تۆرەمە و نەسل و ئەوینداری لە چەشنی خۆی ئافرەتی بۆ بە ڕەوا زانی و دایە و لێی حەڵاڵ کرد بە پێی دەستووراتێکی قایم و قۆڵ و تەواو. ئەدێرەدا دیاری دەدا کارجوانی و کارزانی و حیکمەتی خودای بێ هاوتا کە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُ نَسَبًا وَصِهْرًا وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا﴾ (فرقان: ٥٤) **هەر ئەویشە کە مرۆڤی لە ئاو خوڵقاند، پاشان کردنی بە تۆو و تۆرەمە و ڕەگەز و ژن و ژنخوازی، پەروەردگاریشت هەمیشە بەتوانایە.**

و هەروا ئەگەر سرنج دەینێ و بەرجەوەند بین ئەوەشمان دێرەدا بۆ ڕوون دەبێتەوە کە خودا

ئاگادار بە هەوەڵ و ئاخری هەموو کاروبارێکی دنیا و قیامەتە: وەک ئەوە زانیویەتی ڕۆژێک لە ڕۆژان لە ڕووی ئەخلاق و بـاری ژیـانی کـۆمەڵایەتی و فەردی ئەوە دێـتە پێشـێ و ڕوو دەدا لە مابەینی ژن و مێرددا کە نیازی تەواویان دەبێ بە لە یەک جیابوونەوە، چونکە ئەوزاع و ئیشی ئەو ژن و مێردە گەیشتۆتە ڕادەیەک کە ناتوانن ژیانێکی خۆشی هاوبەشی پێکەوە بەرنە سەر، چـاکتر بۆ ئەو دووانە ئەوەیە کە بە خۆشی و شەرعانە لێک دابڕێن و جیا ببنەوە، جا ئەدێـرەدایە خـودای خاوەن جەلال ئەو دەروویە تەڵاقەی بۆ داناون کە پێیدا دەرچن و ڕزگار بن.

ئەگەرچی لە سەرەتای نیکاح و پەیـمان دابەسـتنیاندا ڕۆژی لێـک جودابوونەوەیـان ڕۆژی مەرگیان بووە، ئەو ڕۆژە پڕ لە نەدامەتییە کە ڕۆژی تەڵاقدانی ژنە لەوانڕا دیار نەبـووە، بەڵام لە خوداڕا دیار بووە. جا بۆیە خوداش بۆ چارە ئەو دەروویییەی بۆ داناوە کە تەڵاقە، کە بێ گومـانە خودا ئەو لێک هەڵبڕانەی (واتە تەڵاق) ئەگەرچی بۆخۆشـی وەک دەروویەکـی ڕزگـاری بـۆی داناون و بە حەڵاڵیش، بەڵام لە هەرچی حەڵاڵیشە ناحەزترە لای خودا، بۆیە پێغەمبەری خاوەنی وەحی و ئیلهامات فەرموویەتی لەو بارەوە: (اَبغَضُ الحلالِ الی اللهِ الطّلاقُ) ناحەزترین حەڵاڵ لە لای خودا تەڵاقە.

ئەی وای بۆ ئەوانەی کە ڕۆژی چەن جاران ئەو ناحەزەی دە ڕووی خودادا داوێ.

## تەڵاق چەند جۆرن؟

بە کورتی و بە کوردی: تەڵاق سێ بەشە: ڕجعی، بائن، مغلّظە.

١. تەڵاقی ڕەجعی ئەوەیە: مێرد بۆ لای ژمارەی تەڵاق نەچێ و ئەگەر هات و وەسەر پەڕی و چوو، لە یەک و دوو تێپەڕ نەکا. بە ڕوونی بەبـێ عەوەز تەڵاقەکە بخـوا و بڵـێ: تەڵاقـی تـۆم بکەوێ، یا تەڵاقێکی تۆم کەوێ یا تەڵاقم کەوێ.

دەو جۆرە تەڵاقەدا واتە ڕەجعی مێردەکە ڕێی پێ دراوە تا دوو کەڕەتـان ژنەکە وەگێـڕێ بـۆ لای خـۆی، ژنە پێـی خـۆش بـێ یـا نـاخۆش بـێ، بەو مەرجە ژنە عیـددەی مـابێ و بە سـەر نەچووبێ، بەڵام ها ئەو بێنە و بەرەی گاڵتە و گەمە نەبێ بە ژنەکەی. (وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ)

٢. تەڵاقی بائنە: تەڵاقی بائنە ئەوەیە گوفتارێکی ڕەمزدار (کینایە) بێ و نیەتی تەڵاقـی تێـدا بێ لە لای مێردەوە. بۆ نموونە بە ژنەکەی بڵێ: ئەتۆ ئی من نی تازە. ئەتۆ لە من جـودای. ئەتـۆ بڕۆوە ماڵە بابت و مەیەوە. یان بڵێ ئەتۆم لە سەر تمەنێک ئـازاد کـرد، ژنەش بڵـێ ئەوە قبـووڵم کرد.

ژن دە تەڵاقی بائنەدا بۆ مێردەکەی ڕێ نییە بێ مارەکردنی دووبارە وەیگێڕێ بۆ لای خـۆی. جا ئەو مارە کردنەوەی دووبارەش دە عیددەدا بێ هەر دەبـێ و عیـددەش بە سـەر چـووبێ هەر دەبێ.

٣. تەڵاقـی مغلـظە: ئەو تەڵاقەیە کە سـێ کەڕەت خـورابێ، جـا ئەو سـێ جـارە بە لای جمهوورەوە کەیفـی خـۆیەتی بە یەک کەڕەت خـواردبێتی دە یەک جـوملەدا، یـا بە سـووڕەتی ڕەجعی و بائنە بە سـێ جـار گەییبـێ، جـا بەو پێـیە دەبـێ بکـوترێ تەڵاقـی مغلـظە واتە سـێ تەڵاق‌دراو. پیاو دە تەڵاقی مغلظەدا ناتوانێ ڕجووع بە ژنەکەی وەکا یان مـارەی کـاتەوە تـاکوو ئەو ژنە شەرایەتی یاسای شەرعی نەهێنێتە گۆڕێ، شـەرایتەکەش ئەوەیە مێردێکـی دی لە سـەر ئەساسی نیکاحی شەرعی بکـاتەوە، یـانی لە بەر ئەوەی مێـردی نەکـا تـاکوو لە مێـردی هەوەڵ حەڵاڵ بێتەوە، وەک مارەبەجاشی ئابڕووبەری ئیسلام، بەڵکە دەبێ مێرد کردنەکە بە نیەتی دایمی بێت و جیماعیشـی دەگەڵ بکـرێ، جـا پاشـان ئەگەر بە پێـی تەقـدیرات وا هەڵـکەوت مێـردە دووهەمەکە مرد یا تەڵاقی دا، ئەوجار ژنەکە بۆ مێردی هەوەڵ ڕێگای مێرد پێ کردنی دەبێتەوە.

تەڵاق ئەو سێیە بوون: رجعی، بائنە، مغلظە.

ئەو سێ جۆرە تەڵاقانەش سێ بابەت و تایبەتمەندی خۆیان هەیە، دەبێ بە تەئکید ئاوڕیان وەسەر درێ دە کاتی خۆیدا. ئەو سێ شتەش ئەوەن: ١. تەڵاقی ئەحسەن ٢. تەڵاقی حەسەن یـا سوننەت ٣. تەڵاقی بدعی. دەگەڵم بە.

١. تەڵاقی ئەحسەن: ئەو تەڵاقەیە کە مێردەکە دە کاتی پاک و خاوێنی ژنەکەیدا یەک تەڵاقی بدا و نـابێ چـووبێتە لاشـی، تـاکوو عیـددەی تەواو دەبـێ. ئەوکـات کە عیـددەی تەواو بـوو خودبەخود ژنەکە دەبێتە بائنە.

٢. تەڵاقی حەسەن یا بڵێین سوننەت: ئەو تەڵاقەیە کاتێ مێرد ویسـتی ژنەکەی سـێ تەڵاقە بدات، دەبێ ئەو مێردە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە لە ڕوانگەی شەرعەوە ئاوا بکا: دە کاتی خاوێنی زگـی ژنەکەی، یەک تەڵاقـی بـدا، تـازە ڕجووعیشـی پـێ نەکـات و دە پاک‌وخـاوێنی جـاری دووهەمیدا تەڵاقی دووهەمیشی بدا و دە پاک‌وخاوێنی جاری سـێهەمیدا تەڵاقە سێهەمەکەشـی بدا. ئەو شێوە ڕەفتارە بۆ ئەو کەسانەیە کە دەیانهەوێ ژنەکانیان بە تەڵاقی مغلظە تەڵاق بدەن.

بێ‌گومان کەسێک پابەندی دین و ئایین بێ، ئەو ڕەفتارەش دەبەر دەگرێ.



ئەوجار دەگەڕێینەوە بۆ لای ئایەتەکە، کە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلاَّ أَن يَخَافَا أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ﴾ ڕەوا نییە ئەو مارەییەی بۆ ژنەکانتان بڕیار دراوە هیچێکیان لێ زەوت کەن و هەڵگرنەوە. دەبێ بیاندرێتێ و ڕەگەڵیان خرێ، جا مەگەر کاتێ کە ئەو ژن و مێردە ترسیان بێ لەوەی کە تازە ناتوانن دە ژن و مێردایەتی خۆیان، سنووری یاسای خودا بپارێزن. جا ئەودەم تاوانبار نابن، کە ژنەکە بە مارەییەکەی خۆ لە مێردەکەی وەکڕێ.

ئەدێرەدا هەست بە ناڕەواییەک دەکرێ، ئەو ناڕەواییەش ئەوەیە: بۆ دەبێ ئەو زەرەرە وە ژنەکەبکەوێ، لەوەدا کە ژنەکە مارەییەکەی بدا و خۆ لە مێردەکەی وەکڕێ، بۆ دەبێ مێردەکەش زەرەرێک وەخۆ نەگرێ، خۆ بە پێی ئایەتەکە کە دەفەرموێ ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ...﴾ واتە هەردووکیان نەحاواوەن دەگەڵ یەک، بەو پێیە دەبێ هەردووکیان بەرتیل بدەن، تا لە یەک بترازێن و جودا وەبن.

ئەگەر بێتوو بکوترێ زەرەری مێردەکەش ئەوەیە کە ژنەکەی دەچێ و ماڵی وێران دەبێ و هەروا خەرجی ژن هێنانی دێتە ئەستۆ هەروا لە هەوەڵەوە خەرجی بۆ هێنانی ئەو ژنە داوە، ئەمەش دەبێ بڵێین ئاخر ئەو ژنەش وەبەر پەلاماری زەرەر کەوتووە و ماڵی لێ خرابووە و بێ مێرد ماوەتەوە و دەبێ تا مێردێکی دیکەی دەس دەکەوێ شتێکیهەبێ خۆی پێ بەخێو بکا.

بە هەر حاڵ ناکرێ بۆ کەسانی خاوەن باوەڕ ئەوەی دەو ئایەتەدا دەستووری پێ دراوە نەیسەلمێنێ و ئەنجامی نەدا. ئەوەی دە ئایەتەکەدا ئەوەیە: ئیحسانە، واتە پاش تەڵاقدان، مارەیی و جلک و ئەو شتانەی کە دە کاتی گوێزتنەوەیدا پێی بەخشیون نابێ لێی زەوت کا بەڵکە دەبێ ڕەگەڵی خا و بیتداتێ. چونکە ئەو شتانەی بارتەقای کچێنەتیە، دیارە ئەویشی لێ ستاندووە؛ کەوایە دەبێ ئەویش (واتە مێرد) ئەو حەقە بدا بە ژنەکە و ناشبێ ژنەکەی وا وەتەنگ هەڵێنێ و ناڕەحەتی کا بۆوەی مافی ڕەوای خۆی دە پێناو ئەو ناڕەحەتیەدا بدا بە مێردەکە؛ وەک زۆربەی دادگا و قازیەکانی ئەوڕۆ وا دەکەن، خۆیان دەدەنە بەر پەلاماری ئایەتی ١٩ی سوورەی نیساء: ﴿وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ﴾ ناڕەحەتیان مەکەن و مەیاندەن لە هەتیتە و مەکۆ، تاوەکوو لەو مارەییەی کەوا پێتان داون هێندێکیان لێ وەگێڕن.

بەهەر حاڵ ئەو قەزاوەتە حەواڵە بە کێ دەکرێ و بە کێ بکرێ، خودای تەعالا ئەدێرەدا ڕووی دە کێیە؟ واتە دە (وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ)دا و دە (وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ)دا؟ ئەگەر ئەو دووانە دەگەڵ مێردە، بابەتی دڵی ئەو نییە چونکە ئەو بۆ وەی زەرەری لێ نەکەوێ، دەڵێ فاحیشەیە،

وەک دە ئایەتی ١٩ نیساءدا ئاماژەی وەلاکرا. ئەگەر ئەو دوواندنەش دەگەڵ ئیمامان و قازییان و حاکمان بێ، ئەوانیش چاوپۆشی و هێواش و سووکباری و ئاسانکاری تێدا بە کار دەبەن، واش دەبێ پارتیبازیش ڕێگای بکاتەوە. چارە چییە؟ بۆ چارەی ئەو چارە تەقوا و پارێزگاری لە ئـایین. دەبێ بڕۆن و ئاوڕ دەنەوە تاکوو دەگەنە ئاخری ئایەتی ٢٠ی نیساء: (أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَاناً وَإِثْماً مُّبِيناً) **ئایا دەتانەوێ بە بوختان و گەواهی ئاشکرا ئەو ماڵ و سامانەیان لێ وەستێنن.**

وەک لە ڕاوێژی ئایەتەکان دەردەکەوێ ئەو ترسـەی کە لە ئـایەتەکەڕایە، نە لە لایەن ژنەکەیە بەتایبەتی و نە لە لای مێردەکەیە بەتایبەتی. شاریعەکانیش فتوای ئەو خولعەیـان داوە، کە وابـێ دەبێ ئەو ماڵ و سامانەی کە لە ژنەکە دەستێندرێ دە موقابیل تەڵاقدانیدا حەڵاڵ بێ. ئەگەرچی بەشێکی زۆریش هەن دەڵێن ئەگەر ناڕەزایەتی ژنەکەی تێدا بـێ و ناچـار کرابـێ، حەڵاڵ نیـیە. وەباڵەکەی دەکەوێتە ئەسـتۆی کـێ؟ بەغەیـرەز مێـردەکەی، خـودا دەزانـێ، ئـاخر دەکەونە بەر غەزەبی ئایەتی ٤٩ی ئەحزاب.

## خولع، فەسخە یان تەڵاقە؟

ئەوەندەش بە پێویست زاندرا کە بزانین ئایـا (خلـع) تەڵاقە یـا فەسـخە؟ بە پێـی ڕیـوایەتی ئەبوداود دە کتێبی سونەنی خۆیـدا کە لە عەکـرەمەی وەرگرتـووە، ئەویـش لە ئیبنیعەبباسـیڕا هێناوە، چونکە ژنی عەبباس کوڕی قەیس خولعی وەرگرت لێی، پێغەمبەریش یەک حەیزی بـۆ عیددەکەی دانا، بەو پێیە دەبێ خولع فەسخ بێ و تەڵاق نەبێ. چونکە خودای تەعـالا عیـددەی تەڵاقی دیاری کردووە بە وەسیلەی ئایەتی ٢٢٨ی بەقەرە: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَـةَ قُرُوَءٍ﴾ **ئافرەتانی تەڵاقدراو پێویستە لە سەریان تاکوو سێ پاکی تەواو دەکەن چاوەڕوان بن.**

خطّابی کە یەکێکە لە زانا بەرزەکانی شەرع، کوتوویەتی: ئەو جەریانە بەهێزترین بەڵگەیە لە سەر ئەوەی خولع فەسخە و تەڵاق نییە. جمهوور دەڵێن: خولع تەڵاقە.



لەسەر ئەو ئەساسەی کە ژن و مێردایەتـی و ئینکـاح دە ئـایینی وەحیـدا ئەرزشـی زۆر بـۆ داندراوە و تەوەجوهی زۆر پێ کراوە و بنچینەی کۆمەڵایەتیش و خـاووخێزانیش هەر لەو ژن و مێردایەتیەڕا سەرچاوە دەگرێ، خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم و سەبوور هەر ویستوویەتی تەڵاق واتە لێکجیـابوونەوە نەیەتە گـۆڕێ، لە بەر یەک نەتـرازێن ژن و مێـرد، جـا بـۆیە دەسبەرداریان نابێ و ڕێوشوێنی بەرگری لە لێکترازانیان زۆر بۆ دادەنێو دەکێشێ. بـۆ نمـوونە

یەکێک لەو ڕێگایانەش کە بۆ وەسیلەی پێکەوە بوون و لێک جیا نەبوونەوەیان دامەزراوە و داڕژاوە لە لایەن خوداوە، ئەو دوو کەڕەت و سێ کەڕەت تەڵاقەیە. واتە خودا بۆ ئەو ژن و مێردانەی کە لێک تووڕەن و دەیانهەوێ بە هۆی ئەو ناڕەحەتیەی کە هاتۆتە پێشێ بۆیان، لێک جودا وەبن و ماڵە خۆیان وێران و منداڵانیش بێر و بەوێدا هەڵوەدا و ئاوارە کەن، سێ تەڵاقی بۆیان داناوە، واتە بۆی داناون کە دە سێ قۆناغی نێوانداردا لێک جیا وەبن. بۆیەشی ئەو سێ قۆناغە داناوە خودا بەڵکە بتوانن دەو سێ قۆناغەدا ئەو ڕق و تووڕەییەی وەلانێن و ئاشت ببنەوە، ماڵی لە خۆ تێکنەدەن و منداڵانیش سەغیر و بێ دایک نەکەن. مەسەلەن جاری هەوڵە تەڵاقێکی بدا تا عیددەی تەواو دەبێ مێردەکە ڕێگای هەیە دەگەڵ ژنەکەی ئاشت بێتەوە و بیگێڕێتەوە لای خۆی، بەبێ مارە کردنەوە. کەڕەتی دووهەمیش ئەگەر ئاشت بوونەوە نەهاتە گۆڕێ هەر ئاوا تەڵاقێکی دیکەشی بدا، ئەو کەڕەتەش ڕێگای ئاشت بوونەوەیان هەیە، بێ مارە کردنەوە، هەر بە لەفزی ڕجووع. بۆ جاری سێ ئەگەر هەر ئاشت نەبوونەوە و پێکەوە بوونیان بۆ نەدەگونجا، ئەوجار بە شێوەیەکی عادڵانە و بەزەییانە ئازادی کا ژنەکە و حیسابی شەرعی خۆی بداتێ. بۆ ئیسباتی ئەو جەریانە دەچینە خزمەت ئایەتی ۲۳۰ی بەقەرە تاکوو بە تەواوی تێی بگەین و بەزەی خوداش لەو بارەوە دەرک کەین:

**﴿٢٣٠﴾ فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا إِن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ**

**ئەگەر هاتوو بۆ جاری سێهەم تەڵاقی دا، تازە بۆ ئەو حەڵاڵ نییە و ناتوانێ وەیهێنێ تاکوو پیاوێکی دی مارەی نەکات. جا ئەگەر ئەویش تەڵاقی دا، هیچ تاوانی تێدا نییە بگەڕێنەوە بۆ لای یەک بەو مەرجەی ئەو باوەڕەشیان بوو کە دتوانن سنووری خودا بپارێزن، ئەو یاسایە سنووری خودایە، کە بەیانی دەکا بۆ ئەو قەومەی تێدەگەن و هەست و دەرکیان هەیە.**

## تەڵاقی سێهەم

ئەدێرەدا ئەوە هەست پێ دەکرێ: ئەوانەی خێرا تەڵاقان دەخۆن، ناشی و بێشعوورن.

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی زۆر هەستیارانە بۆ سەر ئایەتی ۲۳۰:**

ئەگەر هاتوو کابرای مێرد لە پاش دوو کەڕت تەڵاقدانی ژنەکەی، تەڵاقی سێهەمی دا، واتە کردیە سێ کەڕەت تەڵاق، بە پێی فەرموودەی خودای تەعالا کە دەفەرموێ (فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن

بَعْدُ) تازە ئەو ژنە بۆ ئەو مێردە دروست نییە، نە بە ڕجووع و گێڕانەوە، نە بە مارەکردن. تاکوو ئەو ژنە بە ئارەزووی خۆی مێرد نەکا بە مێردێکی دی بە یەکجاری و مێردکردنێکی ڕاستەقینەی شەرعی، یانی نەوەکوو بە شێوەی جاشایەتی ئابڕووبەری ئیسلام بۆ وەی بیدەنەوە بە مێردەکەی. و حەتا دەبێ ئەو مێردەی دوایە جیماعی دەگەڵ بکا. جا ئەوکەڕەت ئەگەر هاتوو ئەو مێردەی دوایەی بە تەقدیری خودا مرد و یا بە وازی خۆی تەڵاقی دا، ڕێگای لێک حەڵاڵبوونی ئەو ژنە و مێردەکەی ئەوەڵی دەکرێتەوە. واتە هیچ گوناهێکی تێدا نابیندرێ کە بچنەوە بۆ لای یەک و لێک مارە بکرێنەوە، بەڵکوو ئەو کەڕەتە هەردووکیان تەجرەبەیان هاتبێتە دەست و خۆ لە یەک قایم کەن بە نەختە قەڵسی و تۆزە گرفتارییەک، دەس لێک بەرنەدەن. زۆر زۆر باشتر لە ژن و مێردایەتی هەوەڵیان بتوانن لەنگەری باری ژیان بۆ یەکتر ڕاگرن. ڕازی ئەوەش کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە پاش ئەو قۆناغە ئازمایشیانەی کە دامەزراون لە نێوان مێردی هەوەڵێ تا دووهەمی و لە مێردی دووهەمی تا دەگەڕێتەوە بۆ لای ئی هەوەڵی، هەر ئەوە بێ کە دەرسی تاڵ و سوێریان چاشتبێ و بۆیان بووبێتە عیبرەت. و هەروا گەڕانەوەی ئەو ژن و مێردەش بۆ لای یەک بێ مەرج نییە، بەڵکە دەبێ ئەو وێک کەوتنەوەی دووبارەیان لە سەر ئەو ئەساس و مەرجە بێ کە باوەڕ و یەقینیان بێ دەتوانن یاسا و سنوروی فەرمانەکانی خودا لە بابەت ژن و مێردایەتی بپارێزن و ڕیعایەت بکەن. بەڵام ئەگەر بەشی زۆری بە لایانەوە وابێ چاک نەبوون و هەر وەک جاری پێشوو دەبن، خۆ تووشی یەک نەکەنەوە، با لێکیش حەڵاڵ بن و مارەیان لێک بێ.

## دابی مارەبەجاش

ئەو یاسا و دەستووراتانەی نێوان ژن و مێردان خودا داناون و سنوورداری کردوون بۆ ئەوانەن کە خاوەن ئەقڵ و شعوور و هەست بن. چونکە کەسێک خاوەنی غیرەتی ئایینی نەبێ و خاوەنی ویژدان و کەڕامەتی بەشەری نەبێ، پەکی بەوەی ناکەوێ کێ سواری نامووسی دەبێ و بە هەموو عەیبەکانی نامووسی ئاشنا دەبێ و پاشان دەشیهێنێتەوە، کارێکی وا ناکا تووشی ئەو موسیبەتە بێ سێ تەڵاقە بخوا و ژنەکەی یا بە دابی جاشی خەیانەت بە حەیاتی دین و ئایین، مارە کاتەوە و بیهێنێتەوە لای خۆی و هەموو ڕۆژیش چاوی بکەوێ بە جاشی خێزانی، یا ژنەکەی پاش تەڵاقدانی مێردی دووهەمی بیهێنێتەوە.

بە کوردی و بە کورتی: ئەو ئایەتە پڕ بەزار هەرا و هاوار دەکەن و دەڵێن: ئایینی ئیسلام پاکە، بەعیززەتە، بەویقارە، بەشەڕەفە، پاسەوانی نامووس و شەرەف و کەڕامەتی ئینسانە، کەس

لە موسوڵمانان خۆی تووشی سێ جار تەڵاقدانی ژنی نەکا، نەبادا تووشی ئەو بێ ئـابڕووییە و بێ عیززەتی و بێ کەرامەتیەی بێ.

دەبێ بکوترێ داخی بە جەرگ و هەناوم! شووشـەی شـەرەف و کەرامەت و ویقـار ئەگەر شکا، هیچ شت جێی ناگرێتەوە. تازە ئـابڕوو کە ڕژا کـۆ نـاکرێتەوە. دووبـارە دەبـێ بکـوترێ: حەیف دوژمنانی ئایینی ئیسلام ڕێگایان گرتووە و ئێستاش دەیگرن بۆ وەی موسـوڵمانان دە ڕاز و فەلسەفەی قورئان نەگەن کە سەرچاوەی ئایینی ئیسلامە، بۆیە دەیانهەوێ فێڵ لە ئیسلام بکەن. ئەمما فێڵ لە ئیسلام ناکرێ، بەڵکە فێڵ لە عالەمی ئیسلام کراوە و دەکرێ. بۆ نمـوونە دێـنن ئەو کابرا فەقیر و نەزانە لە سەر نان و چێشت سێ بە سێ تەڵاقـی بە زاریـدا دێ، بـێ ئەوەی بزانـێ تەڵاق چییە؟ بێ ئەوەی ئەو تەڵاقە وەپاڵ ژنەکەی بدا (اضافه به محـل)، بـێ ئەوەی مەقسـەدی تەڵاقدانی ژنەکەی بێ، دەڵێن کاکە تازە ئەو ژنە لە تۆ مارەی نـایەتەوە، ئـیللا بە جاشـی نەبـێ. کابرای ماڵوێرانی لێقەوماو ئەگەر تەماشا دەکا منـداڵەوردەکان لە لایەک ڕووت و ڕەجـاڵ، لەو لایەشەوە کیسە بەتاڵو حەتاڵ، و لەو لایەشەوە کەمکـار و بێکـار و مەحـتەل! دەگـاتە دەرووی تەنگی: وای لە قوونێ و وای لە دۆشاوێ! مل دادەخا و دڵ ڕادەخا لەو دنیا بەرفرەوان و پـان و بەریـنەدا، کونێـک دەسنـاکەوێ خـۆی ڕۆهێڵێتـێ! ئـای لێقەومـاو! وای لە منـداڵ و وای لە ناموس! مەلاش دەڵێ بابم هیچ ل ەشەرعی شوورەیی نیـیە، شـەرع وای دانـاوە. لە سـەر ئەو بەیت و باوە ئاوری منداڵان و بێچارەیی دڵی پڕ لە خەفەت و داخ و حەسـرەتی نێڵ دەدا و گـڕ دەدا، سەری بەدبەختی بە لاوە دەنێ و ددان بە جەرگیدا دەگرێ و دەڵێ: دەی باشە چـۆنم لـێ حەڵاڵ دەکەنەوە بیکەنەوە! لەولایەش ژنی خاکەسار هەر دەڵێی حەیوانی دەس قەسابانە دیل و ماڵوێران و چاو لە جاشی ئاخۆ کەنگێ شەرەفی دەبا و سەری دەبڕێ! جا بەو شـێوە ناشـیرینە زەلامێکی ناقۆڵای مەترەلۆسی داوێنێ و پاشان بە زەلام دەڵێن دەی تەڵاقی دەوە. ئەویش بە پێی قەراردادی هەوەڵ تەڵاقی دەداتەوە و دەیدەنەوە بە مێردەکەی هەوەڵێ تا عیددەی تەواو دەبـێ لە ماڵە وی دەبێ، چونکە دراوەتەوە بەو، کە ئەوەش لە جاشەکە خرابترە. ئەو زەهـراوە و ئاسـیدەیە دەکرێتە ناو دەروونی ئایینی ئیسلامەوە کە هەر لە نەقڵەکەی دڵی دەبێزێ. پەنا بە خودا لە جاش. پێغەمبەر بۆیە فەرموویەتی: (لَعَنَ اللهُ المُحَلِّلَ و المُحَلَّلَ لَهُ). واتە نەفرینی خودا لەو کەسە بـێ کە ژنی تەڵاقدراوی عالەم مارە دەکات لە کابرایەک بە جاشی، بـۆوەی پـاش دەگەڵ نووسـتنی تەڵاقی داتەوە بۆ مێردەکەی هەوەڵی؛ هەروەها نەفرینی خودا لەو کەسە بێ کە ژنی تەڵاقدراوی

خۆی مارە دەکات لە زەلامێک تا لەپاشان بۆخۆی مارە بکاتەوە.

باشە پێغەمبەر نەفرینی کردووە لە مارەکەر و ژنتەڵاقدەر، ئەدی زەلامی سوارەکەر؟ ئەویش هەروا وەبەردێ.

ئەوەی بە پرسیار دێتە ڕوو دێرەدا ئەوەیە: ئەو جاشە بەو پێیە دەبێ دە دەورانی پێغەمبەریشدا بووبێ؟یا لە پاش پێغەمبەر و خولەفاکان و جمهووردا بووبێ؟ ئەقڵ دەڵێ: ئەو جاشە کاری تاغووت و جبت و موترەفینان بووە کە دە یاسای ئیسلامدا ڕێگای هەوەسبازییان لێ گیراوە، لە بنەوە ئەو فێڵەیان ساز کردووە و بە نەزانان لە بنەوە بەڕێوەیان بردووە تاکوو ئاوازە و سەدای بە گوێی پێغەمبەر گەیوە، ئەویش ئەو حوکمەی لە سەر دەرکردووە، ئەوە نەزەری خۆمە، لۆمەم مەکەن چونکە نەمدیوە دە کتێباندا کە لە دەورانی پێغەمبەردا کارێکی وا کرابێ، تاکوو پێغەمبەر حوکمی لە سەر دەرکردبێ.

وهەروا دەشکرێ بکوترێ ئەوەی کە بە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ ناسێندراوە وەک (لَعَنَ اللهُ المُحَلِّلَ و المُحَلَّلَ لَهُ) ئی پێغەمبەر نەبێ، بەو دەلیلە ئەو جاشجاشێنە دە ڕاوڕاوێن و نەزەراتی جۆراوجۆری عولەماکانی شەرع لە سەر تەڵاقڕا هاتۆتە مەیدانەوە. مەشهوور نییە دە دەوری پێغەمبەردا، نە هەرای تەڵاق بەو حەدە بووبێ و نە جاشیش بووبێ. ڕەحمەت لە چاترزانی.

وەک دەڵێن حەزرەتی عومەریش فەرموویەتی: هەر ژن و جاشێک ببینم و ببیسم و ڕاست بێ، دەستوور دەدەم بەردەبارانیان کەن تا بە سزای مردن دەگەن. چونکە ئەو قەزیەیە وەک چڵکە هەورێکە کشاوەتە ڕووی ئاسمانی سافی ئیسلامەوە. ئەو کارە دزێوە دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو مەلایانەی کە زانستیان لە باری شەرعەوە نەگەیوەتە پلەی تێگەیشتن لە ئایەتی قورئان و شەئن و کەرامەتی ئایینی ئیسلام.

## کەندەوە و کۆژەوە لە سەر تەڵاق

دەبێ ئەوە قبووڵ کەین: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ﴾ تەڵاق سێیە کە حەقی ڕجووع کۆتایی دێ و نامێنێ. جا ئەدێرەدا ئەگەر نەختێک سرنج بدەینێ و هەڵیسەنگێنین چەند مەسەلەمان بۆ دێتە پێشێ دەبێ ئەو مەسەلانە لێک هەڵاوێرین. مەسەلەکان:

١. دە پێشدا وا گوێبیس بووین و حاڵیش کراین کە جوملەی (أو تسریح بإحسان) ئاماژە بە تەڵاقی سێیە، کەوایە دەبێ دە جوابی ئەو کەسەیدا کە دەڵێ (فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ)

تەڵاقی سێیە، چ جواب درێ؟ دیارە ئەئەوە ئیشکالە و دەبێ خۆی لێ ڕەها کرێ. ناچارین دەبێ بڵێین موجاهد کە یەکێکە لە قورئانزانان فەرمـوویەتی: (فَإِن طَلَّقَهَا) تەعبیـر و تەفسـیرە لە بـری قەولی (تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) سـەرەڕای ئەوەی کە کـوتراوە قەبـووڵیش کـراوە مەبەسـت لە قەولـی (تَسْرِيـحٌ بِإِحْسَــانٍ) تەڵاقـی سـێهەم نەبـێ لایقـترە و باشـترە، لەبەر ئەوەش لایقـترە: مێـردی تەڵاقدەری تەڵاقـی دووی ژنەکەی، دەگەڵ ژنەکەی دەکەونە نێـوان سـێ بەرداشـان، واتە سـێ حاڵەتان: یەکێک لەو سێ حاڵەتانە ئەوەیە مراجعە بە ژنەکەی وەکا کە ئەو مراجەعەش مەبەستی خودایە دە جوملەی (فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ)دا. حاڵەتی دوو ئەوەیە مراجەعە بە ژنەکەی نەکا، بەڵکە وێڵی کا با عیددەی بە سـەر بچـێ ببێـتە بە نیـونە، واتە لێـک جیـا بـوونەوە، کە ئەو حـاڵەتەش مەبەستی خودایە دە جوملەی (أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)دا. حاڵەتی سێهەمیش لەو سێ حاڵەتانە و یـا بڵێین لەو سێ بەرداشانەی دە ناویاندا گیـری خـواردووە، ئەو حـاڵەتەیە: مێـردەکە ژنەکەی بـۆ جاری سێ تەڵاق دا، ئەوەش مەبەستی خودایە دە ئایەتی (فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ).

جا ئەوجار چونکە ئەو سێ حاڵەتانە خودای تەعالاش سـێ لەفـزی تـایبەتی خۆیـانی بـۆ داناون وەک ئەو لەفزانە بێ (فَإِمْسَاكٌ بِمَعْـرُوفٍ) (أَوْ تَسْــرِيحٌ بِإِحْسَــانٍ) (فَـإِن طَلَّقَهَـا)، دەبـێ هەریەک لەو سێ جوملە جیاوازانە بەسـەر مەعنـایەک لەو سـێ مەعنایـانە دابـڕدرێ و تەتبیـق بکرێ. جا ئەدێرەدایە ئەگەر بێتوو جوملەی (أَوْ تَسْـرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) بکەینە بـابەتی تەڵاقـی سـێ، ئەودەم ناچارین بڵێین دوو لەفزی (فَإِن طَلَّقَهَا) و (أَوْ تَسْـرِيحٌ بِإِحْسَــانٍ)مـان لە سـەر ئەساسـی تیکرار بۆ یەک مەعنا دەکار کردووە و بە کـار هێنـاوە. حاڵەتێـک لەو سـێ حاڵەتـانە بـێ جـێ دەمێنێتەوە. ئەوجار بۆوەی لەو گیرودارە خۆ دەرباز کەین دەبێ بڵێین: باری هەوەڵمان پەسـەندە کە ئایەتی (فَإِن طَلَّقَهَا) تەفسیر و تەعبیرە لە بری (أَوْ تَسْـرِيحٌ بِإِحْسَانٍ).

**ئاگاداری:** نە بۆ کوتن باشە شتی وا، نە بۆ حاشاردان؛ بۆ کوتن بۆیە باش نییە هەڵپەرستان و ساویلکەزانایان دەیقۆزنەوە، بۆ کوتنیش بۆیە باشە ئایینپەرستان و دیندۆستان بە تەواوی تەکیە دەکەنە سەر قورئان و سوننەت.

ئاگادار بە: بە کۆی عولەمایان و موشتەهیدان کوتوویانە ژنی سێ جار تەڵاقدراو لە لایەن یەک مێردەوە بۆ ئەو مێردە تەڵاقخۆرە حەڵاڵ نابێتەوە بە پێنج شەرت نەبێ:

١. دەبێ لەو مێردە عیددە بەرێتە سەر.

٢. ئەوجار مارە بکرێ بە مارەی شەرعی لە کابرایەکی دی.
٣. ئەو کابرایە مێردی دووەم دەگەڵی بنوێ و جیماعی دەگەڵ بکا.
۴. پاشان لە سەر ئەساسی مردن و یا تەقدیرات تەڵاقی داتەوە.
۵. لەو مێردە دووهەمەش عیددە بباتە سەر.
جا ئەوجار بۆ مێردی هەوەڵ حەڵاڵە مارەی کاتەوە.

شتە سەیرەکەی کە نە کوتنی باشە نە حاشاردانی، ئەوەیە: «سعید بن جبیر» و «سعدی بن مُسَیِّب» کوتوویانە هەر بە مارە کردنی بێ چوونە لاشی حەڵاڵ دەبێتەوە لە مێردی هەوەڵ.

زانایان لەو بارەوە کەوتوونە مشتومڕ، شەرتی حەڵاڵبوونەوەی لە مێردی هەوەڵ بەستراوەتەوە بە دەگەڵ نوستنی، بە پێی قورئان و سوننەت ئایا ئەوە وایە ڕاستە؟ وەیا قسەی ئەو زانایانەیە؟

«ابومسلم اصفهانی» دەڵێ هەر دوو نەزەر و هەر دوو کوتە بە قورئانە، ئەو قەولەش موختارە. واتە بە پێی لۆغەت دە هەموو جێگایەکدا لەفزی نیکاح بە مانای جیماع و وطی نییە. ئەو نەفەرە هاتوون ئیستیفادەیان لەو ڕاستە کردووە و جمهووریش ئیستیفادەیان لەوە کردووە کە عەقد و نیکاح دەگەڵ نوستنی بەر و سەمەرەیە. پەنا بە خودا لە بێبەراوەردانی یاسا و ئایینی وەحی. (تەفسیری کەبیر، هەمان ئایە، ٢٣٠)

**ئاگاداری:** گۆیا شافعی فەرموویەتی ئەو ژنانەی کە سێ کەڕەت مێردەکەیان تەڵاقی داوە و لە خۆی حەرام کردووە، تا مێردێکی دیکە لە سەر ئەساسی شەرع نەکاتەوە و هەروا ئەو مێردە دووهەمەش لە سەر ئەساسی شەرع تەڵاقی نەدا و یا نەمرێ، ئەو ژنە ڕێگای حەڵاڵ بوونەوەی لە مێردە هەوەڵەکەی بەستراوە؛ ئەمما حەزرەتی شافعی لەو بارەوە فەرموویەتی: ئەگەر مارە کردنی ئەو ژنە لە مێردی دووهەم بەو مەرجە بێ حەڵا بکرێتەوە لە مێردی هەوەڵی و جیماعیشی دەگەڵ بکرێ، ئەوە ئەو نیکاحە پووچ و باتڵە، دەگەڵ سیغە واتە نیکاحی کاتی و وەختی تەفاوەتی نییە.

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم و دامەزرێنەری یاسای ژیانی ئینسان هەروا بە ئاسانی دەسبەرداری نیکاح و تەڵاقێکی کە ئەساس و بنچینەی خانووی ژیانن نابێ، تاکوو لە هەموو بوار و دەراوی لێدان و پەڕینەوە ئینسان تێنەگەیێنێ و شارەزای نەکا هەر بۆی باس دەکا.

جا بۆیە پاش ئەوەی کە بە تێر و تەسەلی باسی ژمارەی تەڵاقی کرد و ڕوونی کردەوە،

ئەوجار ئامۆژگاری بە تەواوی دەدا بەو کەسانە کە ژنەکانیان تەڵاق دەدەن کە دەبێ ئەو پیاوانە دەگەڵئەو ژنە تەڵاقدراوەیان چۆناوچۆن ببنە هاوسەری یەک و تا ئێستاش هەر خوشک وبرای دینی بوون پێکەوە پێش ئەوەی ببنە هاوسەرییەک و ئێستاش هەر خوشک و برای یەکترن کە لێکیش جیا بوونەوە و لێک ترازاون، بەڵام لە خوشک و برایەتی ئیمانی لێک نەترازاون و هەروەک خۆی تا هەن، و هەروا ئەوەشیان زانیوە کە دەبێ موسوڵمان دەگەڵ موسوڵمان هەڵوێستی چۆن بێ؟ بە قین و کینە بێ؟ یا بە خۆشی و هاویار و دەسباری یەک بن؟ ئەوە یەقینە کە بە پێی ئاگاداری ئایەتی ٢ی سوورەی مائیدە دەبێ یاریدەدەری یەک بن لە سەر چاکە و عەیبی یەکتر لێر و لەوێ نەڵێن:

﴿٢﴾ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ. **هاوکار و یارمەتی یەکتری بن و بکەن لە سەر چاکە و لە خودا ترسی. بەڵام یاریدەی یەکتری لە سەر خراپە و گوناح مەکەن و لە سنووری یاسای باری دەرنەچن.**

ئەگەرچی ئەو ئایەتە لە سەر بابەتی حەج دابەزیوە، بەڵام ئەو مەتڵەبە بەنرخە بۆ هەموو کات و ساتی باری ژیان و کۆمەڵایەتییە.

دیارە ئەوە حاشای لێ ناکرێ کە ئەو ژنە تەڵاقدراوە دە تەنگانە و گێژاوەی ژیاندا شەپۆل هەر جارێ بە لایەکیدا دەبا و دەدا. نیازی بەوە هەیە یاریدەی بدرێ نەخنکێ، جا ئەدێرەدایە کە خودای بانی سەر ڕادەسپێرێتە ئەو مێردەی کە تەڵاقی داوە لەو بارەوە کە هاودین و ئایینن، ئاوڕی چاکە دەگەڵ کردنی وێدا، بە وەسیلەی ئایەتی ٢٣١ی بەقەرە. ئەوە ئایەتەکە و ئەوە ئیمان و ئەقڵی تۆ:

**﴿٢٣١﴾ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النَّسَاء فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لَّتَعْتَدُواْ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ وَلاَ تَتَّخِذُوَاْ آيَاتِ اللّهِ هُزُوًا وَاذْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ وَمَا أَنزَلَ عَلَيْكُمْ مِّنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ**

**ئەی خاوەن ئیمان و باوەڕان، کاتێ کە ژنەکانتان تەڵاق دان گەیشتنە نیزیک تەواو بوونی عیددەکەیان، ئەوکات یا بە چاکی بیانبەنەوە یا بە ڕێکوپێکی جیا ببنەوە، مەیانهێننەوە بۆ وەی تووشی ئازار و زیانیان بکەن، بە دەستدرێژی بۆ سەر مافیان؛ هەرکەس کاری وا بکات، بێ گومان زوڵم لە خۆی دەکات. ئایەتەکانی خوداش بە گاڵتە مەگرن، یاد و بیرێک لەو ناز و نیعمەتانەی خودا بکەنەوە کە ڕشتوویەتە سەرتان، ئەوەش کە ناردوویەتە خوارەوە بۆتان (لە**

**قورئان و فەرمووده‌کانی پێغەمبەر) کە بەمانە ئامۆژگاریتان بۆ دەکات، لە خودا بترسن و بشزانن بێگومان خودا ئاگای لە هەموو شتێکە.**

## هەڵس‌وکەوت لەگەڵ ژنانی تەڵاقدراو

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانین و هەڵسەنگاندنی ئەو ئایەتە پیرۆزە:**

دیارە وەک بۆ ئەوانەی خاوەنی ئینساف و ئیمانن و هەست بە حەق و ناحەقیش دەکەن، ئەوە دەزانن کە خودای خاوەن بەزە لە ئینسان غافڵ نیە و نابێ، بەڵکە لە هەموو ڕاستانی، ئاگاداری دەداتێ و زانای دەکا لە سەر کاروبارەکانی ژیانی خاووخێزانی و باری پێکەوە ژیان و لێک جیابوونەوەش. جا بۆیە بە پیاوەکان دەڵێ: کات و زەمانێ کە ویستتان ژنەکانتان تەڵاق دەن و تەڵاقیشتان دان بە تەڵاقێکی وا کە پەشیمان بوونەوەی لە دوا بێ و مێرد بتوانێ بۆی وەگەڕێ، جا ئەو ژنانە کە هاتوو گەیشتن بە ئاخر و ئۆخری عیددەیان، واتە مابوویان عیددەکە تەواو بێ بەڵام کەم، واتە هەر بەشی ئەوەندەی مابوو مێردەکەی بتوانێ ڕجووعی وەکا، وەیانگێڕنەوە بۆ لای خۆتان بە خۆشی و بە ڕاستی. وەیا سەرفراز و ئازادیان کەن و وازیان لێ بێنن تاکوو بتوانن بۆخۆیان شوو بکەنەوە بەو کەسانەی دڵیان دەیهەوێ. بەڵام ها وایان گل نەدەنەوە بۆ وەی تووشی زیان و تەڵە و داویان کەن و ناچاریان کەن بۆ وەی دەس لە مافی ڕەوای خۆیان وەک حەقە مارەیی بێ هەڵگرن و یا شتێکی وەخۆ گرن و بیهاوێنە ئەستۆی خۆیان. ئەگەر بێتوو بازدەن بە سەر ئەو یاسا پڕ لە عەداڵەتەی خودا، ئەوە بێگومان باری سەخت و گرانی زوڵم و تاوان دەخەنە ئەستۆی خۆتانەوە. جگە لە تاوانی بێئەمری باری بۆ قیامەت، هەر دە دنیاشدا ناکۆکی و دوژمنایەتی کەس‌وکاری ژنەکەش دەکڕێ بۆ خۆی. و هەروا بەدناوی خۆشی بە عالەم نیشان دەدا.

دەبێ بەرجەوەندی ئەوە بین کە قورئانی پیرۆز ئەو ئامۆژگاریە لە دوو سێ لاوە ڕادەگەیێنێ خاڵی لە حیکمەت نییە. تاوان و بە سەر بازدانیدا تۆڵە و سزای سەخت و گرانی دە بەردا و حەتا دەتوانین بڵێین: ئەو هەڕەشەشی خودا دە بنیدا ناژتووە. هەڕەشەکەش دەبێ ئەوە بێ: خودا دەفەرموێ: نەچن گاڵتە و گەمە بە دەستوور و فەرمانەکانی خودا بکەن، واتە ئەمری دەبێ بە هێند بگرن، نەچن بە کەمی بگرن. چونکە خودا میهرەبانی دەگەڵ بەندەی خۆی هەیە بەڵام شۆخی دەگەڵ نییە. دەبێ ئینسان هەر بەو ئەقڵ و شعوورەی خودا بە سرشتی بەخشیوە، ئەوە بزانێ و دەرکی بکا بەخشینی ئەو نیعمەتانەی وەک ناردنی پێغەمبەر لە خۆتان و قورئان بە

دەستەوە بۆتان؟ پێش ئەوەی هیچ کارێکی چاک و پاک و باشوو کردبێ، خاڵی لە حیکمەت و داوا نییە، ئێوەی نەزان زانای کردن، ئێوەی بێ ناو و نیشانی ناودار کرد، لە سەر ئەو حاڵەتەش ڕا ئەگەر گوێی پێ نەدەن، لە غەیرەز سزا و عەزاب چیدی چاوەڕوان دەکرێ؟ کەوایە ئەی ئینسانی بە بیر و ژیر ئەو ئامۆژگاریانە دە گوێ گرە و لە کیس خۆتیان نەدەی، تا هەی و هەلت بۆ ڕەخساوە. دەنا ئەگەر لە کار کەوتی و کەلەلا بووی، دەکەویە خواردنی نانی حیزی گەری، خوداش پیاوی حیزی خۆش ناوێ.

وا دیارە و هەست پێ دەکرێ کە خودای تەعالا تا ئێرە ئاگاداری دا بە پیاوانی خاوەن ژن واتە مێرد کە نەچن ژنانتان بخەنە تەڵە و داو و ئازاردان، واتە بە تەڵاقدان و هێنانەوە. چونکە نیعمەتێکی هاوبەشە دەگەڵتان وەکوو خۆتان خاوەنی مافی ئەرزش و ڕێز و حورمەتە، دەبێ کارێکی وا نەکرێ شووشەی کەرامەت و ئەرزش لە لایەن مێردەوە بشکێندرێ ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾ ئەویش دەگرێتەوە چونکە ئەویش بەنیئادەمە.

ئەوجار خودای تەعالا دەیهەوێ سفارش و وەسیەت بکاتە کەس‌وکاری ژن، بەو جۆرە ئەگەر ژنەکە هات و ویستی بگەڕێتەوە لای مێردەکەی، پێشگیری لێ نەکەن و نەکرێ، وەک لە ئایەتی ٢٣٢دا باسی لێ کراوە، ئەمەش کاتی خۆی باسی لێ دەکەین.

دە ئایەتی ٢٣١دا دڵ ئەو هەستە دەکا و پێیدا دێ: ئەو ئایەتە ٢٣١ە دەگەڵ ئایەتی ٢٢٩ واتە ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ فەرقێکیان نەبێ، ئەوە بێ‌فایدەیە، چونکە تیکراری کەلامێکی وەحیدەیە دە بابەتێکی واحیدەدا و بێ قازانج و فایدەیەکی بەرچاو. ئەوە دیارە ناڕەوایە. بۆ وڵامەکەی دەبێ ڕوو دە یارانی ئەبووحەنیفە کەین کە دەڵێن و کوتوویانە: ئایەتی ٢٢٩ی قورئان واتە ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ حەواڵەی ئەو دەراوەیە کە کۆ کردنەوەی سێ تەڵاقە بە یەک جار ناشەرعیە و بە پێچەوانەی ئەمری باریە و ناشکوری کردنە بە نیعمەتێکی کە مۆڵەتە و خودا داویەتە ئینسانی کە دە کاتی ناڕەحەتیدا خۆی وە خۆ بێتەوە بیر وەکۆ نەکا لە ناکاو وەسەر تەڵەی مین پەڕێ. و ئەوەی لە لای خودا ڕەوایە و کۆمەک بە ئەقڵ و سەلیقەی ئینسانە، ئەوەیە: تەڵاقخواردن و تەڵاقدانی ژن دەبێ کەڕەت کەڕەت و نۆبە بە نۆبە بێ، تاکوو نەخنکێ و گەرووی نەگیرێ. جا لە سەر ئەو ئەساسە، هێنانەوەی ئایەتی ٢٣١ تیکرار و دووپات کردنەوەی ئایەتی ٢٢٩ نییە و ماناشیان یەک نییە. چونکە ئەو ئایەتە ٢٣١ە بەیانی چۆنیەتی کۆبوونەوەی سێ تەڵاقەیە، کە دەبێ وا نەکرێ و نەبێ،

و ئایەتی ٢٢٩ش بەیانی ڕیجەعەتە، واتە دەراو هێشتنەوە بۆ پەڕینەوە و گەڕانەوە بۆ ئەوبەری ژنەکە. ئەگەرچی یارانی شافعی بێ ئەوە بترسێن لەو ئیحتیڕازە تیکراره لە سەر ئەو باوەڕەن کە ئەو ئایەتە ٢٣١ە بۆ بابەتی ڕیجعەتە، بە هەر حاڵ وا دیارە زانایانی شەرع هەر نەیانتوانیوە تخوون عیلمی فەڕایض بن بۆ ڕاوڕاوێن، دەنا ئەحکاماتی شەرعیان کەم لە بەردەستیان قوتار بووە و بازبازێنیان تێدا نەکردبێ، ئینشائەڵڵا (اختلاف امّتي رحمة) دەگەڵ نەزە رو بۆچوونە، نە دەگەڵ بەرپەرچدانەوەی یەکتری.

**تیوتیوە:**

دە ئایەتی ٢٢٩دا ناچارەن مێرد دە ماوەی عیددەدا دەبێ یەکێک لەو دوو ڕێگایانە هەڵبژێرێ: یا پێکەوە ژیان و ڕەفتار بە خۆشی، یان ئازادی و سەرفرازی ژنەکە بە چاکی. ئەمما دە ئایەتی ٢٣١دا مێرد دە کاتی وەنیزیک بوونەوەی بەسەرچوونی عیددەدا یەکێک لەو دوو ڕێگایانە دەبێ یەکێ هەڵگرێ و ڕەچاوی کا: یا بە یەکەوە ژیان و بە سەر بردنی بە خۆشی، یا دەست لێکبەردانی بە ئیحسان.

دە چۆنیەتی ڕجووعیشدا واتە گێڕانەوەی ژن بۆ لای مێرد، مشتومڕ هەیە دە نێوان شافعی و حەنەفیدا. شافعی دەڵێ چونکە نیکاح و تەڵاق هەر بە لەفز و قەولە، دەبێ گەڕانەوەش واتە ڕجووع هەر بە لەفز و قەولە، واتە مێرد دەڵێ ئەوە گێڕامیەوە. ئەمما حەنەفی و ثوری دەڵێن: ڕجووع واتە گێڕانەوە بە دەگەڵ نوستنە. دەلیلی شافعی ئەوەیە: لە کوڕی حەزرەتی عومەر ڕیوایەت کراوە کاتێ کە ژنەکەی تەڵاق دا و بابی کە دەبێتە حەزرەتی عومەر، لەو بارەوە لە پێغەمبەری پرسیار کرد و پێغەمبەریش لە وەڵامی عومەردا فەرمووی بڕۆ بە کوڕەکەت بڵێ ڕجووعی پێ بکاتەوە و ئاگاداریش بێ تاکوو لەو حەیزەی تێیدا پاک دەبێتەوە. ئەو دەستوور و ئەمرەی حەزرەتی ڕەسووڵ بە حەزرەتی عومەر لە مەڕ گەڕانەوەی ژنی کوڕەکەی وە لای کوڕەکەی دە حاڵی حەیزدا ئیشارە وە لای ئەوەیە کە گەڕانەوەی ژنی تەڵاقدراو وەلای مێرد دە حاڵی حەیزدا دروستە و ڕەوایە. ئەمما جیماعی دەگەڵ دە کاتی حەیزدا ناڕەوایە. بە کوردی بۆ ڕجووعی ژن جیماع پێویست نییە لە لایەن شافعی.

حەنەفی دەلیلی ئەوەیە کە دەڵێ ڕجووع بێ جیماع ڕجووع نییە ئەوەیە کە خودای تەعالا فەرمووی ﴿فَأَمْسِكوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾ مەعرووف واتە دەگەڵ نوستن.

## پوختەی مەبەستی دوو ئایەتی پیرۆزی ٢٣١ و ٢٣٢

١. ڕاگرتن و پێکەوە بوونی دەگەڵ دەبێ بە پەسندانە بێ،

٢. تەڵاقدانی ژن بە مانای (تَسْـرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) واتە تەڵاقدانی بێ ئازار و زەرەر.

٣. تەڵاقدانی ژن دەبێ دوور بێ لە گاڵتە و گەمە بە ئایاتی خودا.

٤. کەسێک بە گاڵتە و گەمە تەڵاق بخوا بە کۆی دەنگ تەڵاقی دەکەوێ.

٥. شوکرانەی نیعمەتی ئیسلام و ئیمان و یاسای ئیسلام لەسەر هەموو موسوڵمانێک لازمە.

٦. کەس‌وکار و سەرپەرستانی ژن مافی ئەوەیان نییە ڕێگـری بـکەن لە مێـرد کردنـی ژن بە هاوکوفی خۆی.

٧. کۆی زانایان دەڵێن ژن بێ وەلی مارەی دروست نییە بە پێی ئایەتی (لاَ تَعْضُـلُوهُنَّ) واتە بەرگری مێرد کردنیان مەبن.

٨. جوملەی (بالمعروف) ئامـاژەیە وەلای ئەوەی بەرگـری لە ژن بـۆ مێـرد کـردن بەغەیـرە هاوکوفی حەرام نییە.

٩. ئیمان و نووری ئیمان ڕازانەوەی دڵە بۆ پەزیرایی لە ئایەتەکانی قورئـان بە پێـی ئامـاژەی ﴿ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِـاللَّهِ وَالْيَـوْمِ الْآخِـرِ﴾ (بقـره: ٢٣٢) ئەو پەنـد و ئامۆژگاریـانە دەکرێ بۆ ئەوانەی کە لە ئێـوەن و بڕوایـان بە خـودا و ڕۆژی پەسـڵان هەیە. ئەو ئـایەتە دەڵـێ: خاوەن باوەڕی بەڕاستی پەند دەقـۆزێتەوە و هەروا ئەوەش دەڵـێ: ئەوانەی کە بە ئەمـری بـاری تەکان ناخۆن و ئەمری باری ڕایاننـاچڵەکێنێ هـیچ هێـز و پێـز و تێزێکـی ئیمنیـان دە بـاوەڕ و دەروونیدا نییە. جا با بە زمانیش بوختان بکەن و بڵێن بەئیمانین.

## هۆی نازڵبوونی ئەو دوو ئایەتە (٢٣١ و ٢٣٢)

دەبێ ئەوانە بن وەک کوتوویانە:

١. «ابن‌جریری طبری» لە «ابن‌عباس»ەوە نەقڵ دەکا و دەڵێ: عادەتی ئەعرابـی جاهیـل وا بوو کە پیاوەکانیان پاش تەڵاقدان و پێش بەسەرچوونی عیدەیان واتە دەو نێوانەدا ڕجووعیـان بە ژنەکانیان دەکردەوە، دەستەولەجێ پاش گێڕانەوەیان تەڵاقیان دەدانەوە، ئەو کارە ناڕەوایەشیان بۆ وەی بوو تاکوو بەرگـری بـکەن لەوەی ئەو ژنە مێـردی دی نەکەن و هەروا دەو ڕۆژە ڕەشـەدا وەمێنن و هەروا کابرایەکیش لە ئەنسارییەکانی مەدینە بە ناوی سابتی کوڕی یەسار ئاوای دەکـرد

لە ژنەکەی، بێ خەبەر لەوەی خودا لە سەر مافی هەموو گیانلەبەرێک هەڵدەداتێ و دیفاع دەکا، جا هات بۆ بەرگری لەو کارە ناڕەوایە خودا ئایەتی ٢٣١ی دابەزاند فەرمـووی: ﴿وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لَّتَعْتَدُواْ...﴾ واتە ژنەکانتان مەهێننەوە بۆ ئەوەی تووشی زەرەر و زیانیان کەن.

٢. بوخاری و غەیری بوخاریش لە «معقل کوڕی یساری» نەقڵ کـردووە کە ئەو خوشـکی خۆی دابوو بە موسوڵمانێک و لێی مـارە کردبـوو. ئەو کـابرا موسـوڵمانەش مـاوەیەکی دەگەڵ ڕابوارد و پاشان تەڵاقێکی دا ڕجووعی پێ نەکردەوە تاکوو عیددەی بە سـەر چـوو و ژن بـوو بە بانیەی بچکۆڵە واتە (صغریٰ)، و بێ مارە کردن تازە نەدەکرا بیهێنێتەوە. کـابرای مێـردیش هـات دەستەیەکی دۆست و خزم و کەس حازر کرد و هـاتە لای «معقـل» بـرای ژنەکە دووبـارە لێـی بخوازێتەوە و مارەی بکاتەوە. حاڵەتەکەش وا کەوتبـوو هەم کـابرا ژنەکەی خـۆش دەویسـت و هەم ژنەش کابرای دەویست. «معقل» برای ژنە ڕاستەوخۆ و ڕووبەڕوو بەو کابرایەی کوت لە کن ئەوانەی دەگەڵـی بـوون: ئەی ناکەسـی لە خـودا بـێخەبەر، لە هەوەڵەوە ئەمـن ئیـرادەت و سوپاسگوزاری تۆم نواند و کرد بەو هۆیە کە ئەو خوشکەی منت مـارە کـرد، کەچـی لەبەر بـێ ئەدەبی و بێ کەڕامەتیت نە مایەت بۆ فەرمانی خودا دانا، نە مایەت بۆ منی خزمەتگوزارت دانا، نە ئەو مایەت بۆ منی سپاسگوزار دانا نە مایەت بۆ هاوسەری خزمەتگوزارت دانا، تازە لە سـەر ئەو بـێ ڕێـزی و بـێ حـورمەتیەی کە دەربـارەی ئەو ژنە و مـن و یاسـای خـودات نیشـان دا، ناتدەمەوە بە خودا سوێند.

جا ئەدێرەدایە کە خودا دەفەرموێ موسوڵمانی بەڕاستی ئەوانەن کە ڕق و توورەیی خۆیـان دەخۆنەوە وەک بە وەسیلەی ئایەتی ١٣٤ی ئالیعیمران ئاماژەی وەلا دەکا: ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ﴾ ئەو کەسانەش کە ڕقی خۆیـان قـووت دەدەنەوە و دەیخـۆنەوە و خەڵـک دەبەخشن، خوداش لە چاکەکارەکانی خۆش دەبێ.

سەرەنجام خودای تەبارەک و تەعالا لە سەر جەریانی خوشکی «معقل» و کـابرای مێـردی خوشکی کە تەڵاقی دابوو، بۆ یەکیش پەشیمان ببـوونەوە، بەڵام «معقـل» بـرای ژنەکە مـانیعی چوونی خوشکەکەی بـۆ لای کـابرای مێـردی بـوو، ئەو ئـایەتی ٢٣٢ی بەقەرە دابەزی. ئەوەش ئایەتەکە و ئەوەش ئەقڵ و ئیمانی تۆ:

﴿٢٣٢﴾ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا

**تَرَاضَوْاْ بَيْنَهُم بِالْمَعْرُوفِ ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ**

**ئەی خاوەنی ئیمانی ڕاستەقینە! کە ژنەکانتان تەڵاق دان و عیددەیان هات و بە سەر چوو، مەبنە کۆسپ و بەرگریان لێ مەکەن. ئەگەر هات و ویستیان جارێکی دیکەش شوو بکەنەوە بە مێردە پێشووەکانیان. کاتێ کە لە نێوان خۆیاندا بە چاکی لە یەک ڕازی بوون. ئەو پەند و ئامۆژگارییە دەکرا بۆ ئەوانەی کە لە ئێوەن و بڕوایان بە خودا و ڕۆژی پەسڵان هەیە، ئەوەش مایەی پاکی و خێر و بێرێکی زۆرە بۆ ئێوە، خودا دەزانێ و ئێوە نازانن.**

## تەواو بوونی عیددەی ژنانی تەڵاقدراو

کاتێک ژنەکانتان تەڵاق دان بە هۆی هەر هۆکارێکەوە، و هەر ئەو ژنە تەڵاقدراوانەتان عیددەیان تەواو بوو، بۆوەی بیانهەوێ مێرد بکەنەوە ـ جا چ بە مێردەکانی پێشوویان، چ بە کابرایەکی دیکە کە بۆخۆیان قبووڵیانن و ڕێک کەوتوون، بەرگریان لێ مەکەن و مەبنە کۆسپ لە سەر ڕێی کارەکەیان. بەڵام ئەگەر هات و وا هەڵکەوت ئەوەی ژنەکە پەسندی کردبوو شایان و لێهاتوو نەبوو، و نەنگ و عار بوو لە ناو کۆمەڵدا، ئەوە ئەودەم بۆ کەس‌وکاری ئەو ژنە هەیە کە ڕێ نەدەن شووی پێ بکات. دیارە ئەگەر بەڕاستی خاوەن ئیمان و باوەڕ بن دەبێ ئەوەش بزانین کە فەرموودەکانی خودا هەموو پەند و ئامۆژگارین و قازانجی دنیا و قیامەتیان تێدایە. دیارە خوداش مەسڵەحەتی بەندەی خۆی چاکتر دەزانێ.

## بەرخوێن

ئەگەر بەرجەوەندی فەرموودەکان و ڕێنوێنییەکانی خودا بین لە هەر بارێکەوە و ئاکارەکانی هێندێک لە داب و باوی ناو خۆمان بخەینە ڕوو، هەر بۆخۆمان دەبێ لە خۆمان بێزار بین، بۆ نموونە لەو داب و باوانەی خۆمان:

١. دەبیندرا کابرایەکی شەست حەفتا ساڵە، ژنێکی بۆ خۆی دێنا دە بەرابەر ئەو ژنەدا کچێکی سەروعوزرشۆری خۆی دەدا بە منداڵێکی شیرەخۆرەی کەس‌وکاری ئەو ژنە. کە لە پاش زەمانێکی کە ئەو کوڕە دەگەیشتە کاتی ژن هێنان و کچە زەلامەکەی لەوی مارە کرا و دەگەیشتە ڕیزی دایک و نەنکی ئەو کوڕەی کە لێی مارە کرابوو کاتی خۆی لە باتی ئەو ژنەی کە بابی هێنابووی. دیارە ئەو کوڕە کە دەیڕوانی لەو ژنە مارە کراوەی خۆی، بۆ یەک نەدەبوون لێک نەدەوەشانەوە و بۆ وەش نەدەبوو تەڵاقی بداتەوە چونکە بەرخوێنی بوو بە خۆڕایی دەچوو. لەو

لایەشەوە چونکە ئەو ژنە بەرخوێن دراوەی مارە نەهاتوو، ئەگەر کوڕە تەڵاقی دابایە لە سەر شتێک، چونکە پیر بوو و بەرچاویش نەبوو، بە زەحمەت کەسێکی وا دەس دەکەوت پارەکەی بدات و بیکڕێتەوە بۆ خۆی. دەو نێوانەدا هەم ئەو کوڕە مێرمنداڵە کچی هاوتەمەنی خۆی گیر نەدەکەوت و نەیاندەکرد، چونکە مارەکراوی هەبوو کە ژنە پیرە بوو، هەم ژنە پیرەی مارە کراوی کوڕەکەش کەسی وا نەبوو بیکڕێتەوە لە کوڕەکە و بەرخوێنەکەی بۆ بدات. ئەوە سەرنویشتی ڕەش و تاریکی دوو نەفەر لە کوڕ و لە ژن لە ناو عالەمی بە ناو ئیسلام ـ کە بە دەستی ناحاڵییان لە ئایینی ئیسلام دەهاتە ڕوو ـ و هەزاران نارەوای ئاوا ناشیرین و ناحەز. بە هەر حاڵ عالەمی نەخوێندەوار زۆری لۆمە ناکرێ لەو بارەدا چونکە بە خەیاڵی خۆی کارێکی خراپی نەکردووە لە دیدگای ئایینەوە چونکە مەلا ئەو کارەی بۆ پێکهێناوە. با لە ڕووی ویژدانەوەش لۆمە و سەرزەنش بکرێ، بەڵام مام مەلای نابەڵەد لە ئایین ئەگەر لە بەرنامەی ئایینەکە شت حاڵی نەبووی، خۆ دە ئینساف و عەداڵەت و ویژدانی مرۆڤایەتی دەگەیشتی، چۆنت غیرەت بە خۆ دا ئەو دیمەنە ناحەز و ناشیرینەت بە ناوی ئایینی پڕ لە غیرەت و شەڕافەت و کەڕامەت و پارێزی ئیسلام نیشانی دنیای بەشەرەف دا؟

ئێستاش ئەو دیمەنە ناحەز و ناشیرنانە نیشان دەدرێن دە ناو عالەمی ئیسلامدا وەک مارە بەجاش. بەسە با بەڕە لە سەر فەقیر و گونڕووتان هەڵنەدرێتەوە.



دەبێ ئەوە باوەڕ کەین و بیسەلمێنین ئەوانەی بۆ ئایینی ئیسلام بەپەرۆشن، ئەوانەن کە دەزانن و تێگەیشتوون کە ئایینی ئیسلام بە بەژن و باڵای ئینسان گیراوە دە ئەزەلدا، تەواوی عەیب و عار و شوورەیی ئینسان دەشارێتەوە. ئەمما ئەوانەی کە دنیاپەرست و هەواپەرستن، چ باک و پەرۆشی ئەوەیانە کە دنیا بێ دەرپێ دەبێ و گەڵوگونی ڕووتە یا کۆکە و جلک و لیباسیش بۆ داپۆشینی حەیا و کەڕامەتی ئینسانە وەک خودای حەیادۆست ئاماژەی وەلا فەرمووە: ﴿يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْءَاتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ذَٰلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ (اعراف: ٢٦) **ئەی بەرەی ئادەم و ڕۆڵەکانی، بێ گومان جلوبەرگێکمان بۆ ساز کردوون حەیا و شەرمگاتان دادەپۆشێ و بۆ خۆ ڕازاندنەوە و جوانیش دە بەری کەن بەڵام جوانترین و چاکترین جلوبەرگ (بۆ دنیا و قیامەت) تەقوایە، ئەوەش لە نیشانە و بەڵگەکانی خودایە، بەو هیوایە یاد و بیرێک وەکەنەوە.**

بەڵام بە داخەوە ئەوانەی بەری خۆیان داوەتە دنیا، نە لیباسی قیامەتیان دە بەر خۆدا

هێشتووە، ـ وەک تەقوا و حەیا و شەرم بێ ـ نە لیباسی دنیا ـ وەک ویژدان و کەرامەتی بەشەری بێ ـ، دەبێ خۆلادان بکرێ لەوانە تا وەبەر پێیان نەکەوین.

**پوختەی مەبەستی ئەو دوو ئایەتانەی ٢٣١ و ٢٣٢:**

جوملەی (فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ)ی ئایەتی ٢٣١ بە مانای (قارِبْنَ التَّمامَ)ە، واتە نزیک بوونەوە لە تەواوبوونی عیددە. (قرطبی: ١٥٥/٣) و هەروا وەپێش کەوتنی جوملەی (فَأَمْسِكوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ) لە سەر جوملەی (أَوْسَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ) نیشانەی ئەوەیە: بە هەر شێوەیەک کە بگونجێ بۆ ئەو مێرد و ژنە، ڕجووع چاترە لە لای خودا بە شەرتی سازش و ئاشتی تەواو و ڕاست. چونکە خودا ئاشتی‌خوازە دەگەڵ گوناهکاران، بە تۆبە، هەر بۆیەشە سفارشی فەرمووە: (وَلاَ تُمْسِكوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُواْ) واتە بە نیەتی زەرەر و ئازاردانیان مەیانهێننەوە لای خۆتان. کەسێک بیهەوێ وا بکا، زوڵم لە نەفسی خۆی دکا.

شاعیرێکی فارس دەڵێ ڕاجع بەو جۆرە کەسانەی غەدر لە خەڵک دەکەن:

پنداشت ستمگر که جفا بر ما کرد　　بر گردن وی بماند بر ما بگذشت

دەتوانین بڵێین یەکێکە لە نیشانەکانی کەرەمی خودا دەگەڵ بەندەکانی: کە لە پێش ئەوەی خۆ بگەیێنێتە تاوان و گوناه، ئاگاداری پێ ددا کە ئاوا مەڕۆ تووشی خەتەر دەبی، وەک ئەوە کە پێی دەڵێ: ﴿وَلاَ تَتَّخِذُوَاْ آيَاتِ اللّهِ هُزُوًا﴾ ئەحکام و دەستووراتی خودا بە گەمە و گاڵتە مەگرە، دەکرێ بڵێین ئەو فەرمایشتەی خودا بە ڕوونی سێ شت دە بەر دەگرێ: ١. نیکاح و تەڵاق دەبێ بەوپەڕی ڕێز و حورمەتەوە چاوەدێریان لێ بکرێ ٢. ئەو فەرموودەی خودا ڕەد کردنەوەی عادەتێکی ناشیرینی دەورانی جەهالەتە، کە هەر مابۆوە و دە ناو عالەمی موسوڵماندا وەک ئەوە تەڵاق و عیتاق واتە تەڵاق خواردن و بەندە و کۆیلە ئازاد کردن زۆر بوو بە شۆخی و گاڵتە، وەک بەشێک لە خەڵکی ئێستێ دەس‌بەرداری ئەو دابە بێ‌شەرمانە هەر نەبووە. وا هەیە لە سەر شتی زۆر سادە و بێ‌ئەرزش تەڵاق دەخوا، پاشان بە پێکەنینەوە دەڵێ بە شۆخیم وا کردووە. ئەو جۆرە کار و ڕەفتارانە لە دیدگای ئایینی پیرۆزەوە و لە کن مرۆیانی خاوەن ئەرزش و کەسایەتی، گاڵتەیە بە موقەددەساتی دین و ئایین و کەرامەتی بەشەری، بۆیە خودا ئاگاداری بە هەڕەشەوەی لە سەر دەدا و دەفەرموێ ئەی بەندەکەم! ئەگەر ڕاست دەکەی بە گەورەم دەزانی، قسە و دەستووراتەکانیشم بە گەورە و بەئەرزش لە بەر چاو بگرە، دەنا بڵێ: درۆم کرد. وەیادی خۆتی بێنەوە و لە بیر خۆتی مەبەوە ئەو نیعمەتانەی خودا کە بە یەک جوملەی نیکاح ژنێکی تەمیز و بە

دڵت بێگانە و حەرام، لێت حەڵا دەکا و دەیکاتە ڕەفیقێکی هێندە نزیک لە خۆت کە هیچ خزم و کەس و کارت ئاوات لێ نزیک و دڵسۆز و مەحرەم نییە و نایگاتێ دە نزیکیدا. جا ئەوە کە خودا پێت دەڵێ: ﴿وَاذْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ...﴾ واتە وەیاد خەوە ئەو نیعمەتانەی خودا کە بە ڕەوای تۆی زانیوە داویەی.

جوملەی (فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ)ی ئایەتی ٢٣٢ بە مانای (اَتمَمْنَ) واتە تەواو کردن و بەسەرچوونی عیددەیە. واتە کاتێ ئەو ژنانەی تەڵاق دراون، عیددەیان تەواو بوو و بە سەر چوو و بوون بە بانیە. (روح المعانی: ج١، ل٧٣٣) ئەوکات لە مێرد کردنەوەیان بە مێردی پێشووی خۆیان پێشگیری و بەرهەڵستیان مەکەن، وەک خودا دەفەرموێ ﴿فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ﴾ مەنعیان مەکەن لە شوو کردن بە مێردەکەیان ئەگەر یەکتریان دەوێ و پێک ڕازین. چونکە ئەو ژن و مێردە بۆ یەک پاک و تەمیزن، چونکە دە هەموو عەیب و عار و ئەخلاق و ئاکاری یەکتر بەڵەد و شارەزان، بۆیەشە خودا فەرموویەتی: ﴿ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ﴾ ئەو ڕجوعە و بۆ لای یەک گەڕانەوە، پاک و خاوێنترن بۆ ئێوە. (ازکی) بە زاهیری، (اطهر) دە باتیندا.

ئەوەش بێ گومانە کەس دواڕۆژی خۆی چاو ناکا و لێی ڕوون نییە. بەڵام خودای بانیسەر هەوەڵ و ئاخری هەموو کاروباری ئینسان و هەموو گیانلەبەرێک دەزانێ بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ خودا دەزانێ، ئێوە نازانن.

لە سەر جوملەی ﴿فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ﴾ مشتومڕێکی شەرعزانەکان هەیە بە پێویست زاندرا بە سەریدا باز نەدرێ.

شافعی: لە سەر ئەو ئەساسەی کە دەو ئایەتەدا ڕووی خیتاب دە ئەولیای ژنەکەیە، ئەو ڕووتێکردن و خیتابە نیشانەی ئەوەیە: ژن ناتوانێ بێ وەلی خۆ مارە کا، چونکە ئەگەر توانیبای ژن بێ وەلی خۆ مارە کا، خودا بە کەسانی ژنی نەدەفەرموو: مانعی ژن مەبن مێرد بکەن. جا دیارە بە پێی مانای ئەو ئایەتە مارە کردنی ژن بە وەلی دەبێ و بە خۆی نابێ.

ئیمامی حەنەفی: دە جوملەی ﴿أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ﴾دا دەردەکەێ نیکاح بەبێ وەلی دەکرێ و دەبێ، بۆچی؟ دەلیلی حەنەفی ئەوەیە: خودای تەعالا نیکاحی ئیزافە کردووە وەلای ژنەکە، واتە مارە کردنەکەی داوەتە پاڵ ژنەکە، دیارە وەپاڵدانی فێعل بە فاعیل واتە ئیزافە کردنی فیعل لە نیکاحە وەپاڵ فاعیل کە مێردە، وەلی لە دەخالەتی مارە کردن وەلادەنێ. و هەروا ئایەتی ﴿حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ﴾ دووبارە حەنەفییەکان دەیکەن بە بەڵگە بۆ وەی ژن بێ وەلی دەتوانێ

مارە کرێ، چونکە مانای ئەو جوملەیە ئاوایە: مەگە ژنەکە شوو بکات بە مێردێکی دی. دە دیارە دەو مانایەدا سەربەخۆیی ژن دیاری دەدا.

## ئافرەت دەتوانێ خۆ ببەخشێ؟

بۆ پشتڕاست کردنەوەی ئەو بابەتە: واتە نیکاحی بێ وەلی لە ڕوانگەی حەنەفیان دەچینە خزمەت ئایەتی: ﴿وَامْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنْ أَرَادَ النَّبِيُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا﴾ (احزاب: ٥٠) **هەر ژنێکی موسوڵمانیش ئەگەر هاتوو خۆی پێشکەش کرد بە پێغەمبەر، ئەگەر پێغەمبەریش ویستی مارەی بکا، ئەوە تایبەتی تۆیە نەک موسوڵمانان.**

**سووکە ئاوڕێک لێرەدا:** ژنی خاوەن ئیمان کە خۆی ببەخشێ بە پێغەمبەر و پێغەمبەریش بیهەوێ مارەی کات با بیکات. ئەو نیکاحەم بۆ وی حەڵا کرد و ئەو جۆرە نیکاحە تایبەتی تۆیە، نەک بۆ خاوەن ئیمانانی دی.

دەبێ ئەوە بزاندرێ ئایا ئەو ژنە خۆی مارە کرد لە پێغەمبەر؟ یا نەیکرد؟ ئەدێرەدا مشتومڕ ڕابوو لە نێوان قورئانزانەکان، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و هەندێکی دیش کوتوویانە: ئەو ژنە لە کن پێغەمبەری نەبووە، بەڵکە ئەو بابەتە مەرج و شەرتە واتە: ئەگەر ژنێک ئاوا خۆی پێشکەش کردبێ ئەویش وازی لێ بووبێ، مارەی بکا ناڕەوا نەدەبوو، بەڵکە دەبوو. هەندێکی تر کوتوویانە: ئەو ژنەی کە خۆی پێشکەشی پێغەمبەر کردووە ناوی زێنەبی کچی خەزیمە (ام المساکین) بووە، ژنێک بووە ئی ئەنساری. (تەفسیری تەبەری، ج٢٢، ل ٢١٨- ٢٠٠؛ ئیمام فەخر، تەفسیری کەبیر، ج ٢٥، ل ٢٢٥- ٢٢٠؛ ئەبولفتوح ڕازی تەفسیر، ج ٩، ل ١٦٨؛ مەیبودی، کشف الاسرار، ج ٨، ل ٦٨)

و هەروا دە ئایەتەکەشدا ئەگەر سرنجی بدرێتێ، مەیلێک واتە: (التفات) لە غایبەوە وەلای حازر چاو دەکرێ.

بە کوردی و بە کورتی: دەو ئایەتەدا بە تەوری قەتعی باسێک لە وەلی نەهاتۆتە گۆڕ و ناوی نەبراوە.

ئایەتی (حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ) واتە تاکوو ئەو ژنە مێردێک غەیری مێردی هەوەڵی نەکا. ئەدێرەدا ڕاستەوخۆ مارە کردن وەپاڵ ژنەکە دراوە، بێ ئەوەی باسێک لە وەلی کرابێ. و هەروا (لاَ تَعْضُلُوهُنَّ) موخاتەب مێردەکانن کە دە ڕجووع کردنەوەی ژنەکانیان دە حاڵی عیددەدا بە قەست و نیەتی ئازار و زەرەر پێدانیان، نەیانهێننەوە. و هەروا (إِذَا تَرَاضَوْاْ بَيْنَهُم) ڕەزایەتی ژن و مێردەکە بۆ نیکاحە کە شەرتی ئەساسی دروستی نیکاحەکەیە. مەلەوانی دەوێ بتوانێ لەو

بوارەدا وەپەڕێ، چونکە من تێیدا خنکاوم و نەپەڕیومەوە.

دیارە ئەوەی حەقە و ڕاستە ئەوەیە دەبێ باوەڕی پێ بکەین کە خودای تەعالا چارەسازە و ڕزقدەرە و لە هیچ گیانلەبەرێکی کە وەدیهێناوە لە ڕزق پێدانیشی غافڵ نییە، بۆ نموونە ژنێک منداڵ و کۆرپەیەکی مەمک خۆرەی لە بەرە و وا دێتە پێش مێردەکەی تەڵاقی دەدا و ژنەکەش لە داخی مێردەکەی ئەو کۆرپە شیرەخۆرەی وەسەر دەکاتەوە، هەچەن جەرگیشی بۆ دەسووتێ، و مێردەکەش نەدارە و دەستی ناڕوا دایەنێک (واتە شیردەرێک)ی بۆ بە کرێ بگرێ، ئەوە ڕەنگە لە لایەن ئێمەی ناتەواو بڵێین قەیدی ناکا با بمرێ بەڵام خودای خاوەن بەزە و ڕزقدەر چارەی دەکا و دەستوور دەدا کە ئەو شیرەی وەک ڕزق لە سەرێتی ئەو دایکە و مەمکانەی وەجۆش هێناوە بۆ ئەو منداڵە، بیدەنێ و مافی خۆیەتی و ڕزقی خۆیەتی، کە نابێ لە سەر ڕق و توورەیی ژن و مێرد لە یەکتر مافی خاوەن مافێکی وەک منداڵەکە بێ لە ناو بچێ. جا دێرەدایە دەبێ بەزەی خودا بسەلمێنین و جەهلی ئینسانیش. بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٣٣ی بەقەرە:

﴿٢٣٣﴾ وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا لاَ تُضَآرَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلاَ مَوْلُودٌ لَّهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالاً عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُواْ أَوْلاَدَكُمْ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ آتَيْتُم بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ

پێویستە لە سەر دایکان، چ لە ماڵی مێردیاندا بن یا خود تەڵاق درابن، ئەگەر بیانەوێت بە چاکی شیر بدەنە منداڵەکانیان، ئەوە با تا دوو ساڵی تەواو شیریان بدەنێ، جا ئەگەر دایکەکە تەڵاق درابوو، ئەوە پێویستە باوکی منداڵەکە بە پێی توانا و دەستەڵاتی خۆی، خەرجی خواردن و جلوبەرگی ئەو دایکە بکێشێ و دابین کا. چونکە هیچ کەس لە توانای خۆی بەولاوە داوەی لێ ناکرێت. و هەروا نابێ باوکی کوڕەکە کە دەبێتە مێردی دایکی کوڕەکە، بەرگری لە سۆز و میهرەبانی دایکەکە بکات و بیخاتە زەحمەت و ناڕەحەتیەوە، بەوەی نەفەقەی کەمی بداتێ. هەروەها نابێت دایکەکەش سۆز و شەفەقەتی بابەکەی بەرگری بکات و بە داوا کردنی نەفەقەی زیادی، تاکوو باوکەکەی بخاتە مەینەت و زەحمەتەوە. و هەروا ئەگەر هات و بابی منداڵەکە مرد، دەبێ میراتگران نەفەقەی دایکی منداڵەکە دە ماوەی شیردانداندا بکێشن و وەئەستۆی بگرن، و هەروا ئەگەر هات و بابەکە و دایکەکە بە پێی ڕاوێژ دەگەڵ یەکتر ویستیان پێش ئەوە منداڵەکە دوو ساڵە تەواو بکات لە شیری دابڕن و بیکەنەوە، ئەوکات ئەو

**لە شیردابڕینە بۆ منداڵەکە زیان و زەرەری نەبێ، هیچ گوناهێکیان پێ ناگات ئەو دایک و بابانە. و ئەگەر هات و بە ڕەزایەتی هەر دوو لا واتە دایک و بابەکە، ویستیان دایەنی بۆ بگرن، تاوەکوو شیری بداتێ و خزمەتی منداڵەکەتان بکات، دیارە ئەوەش کارێکی پەسند و ڕەوایە هیچ گوناه و تاوانێکی نییە بۆ دایک و بابەکە. بەو شەرتە بە تێروتەسەلی و چاکی مافی دایەنەکە بدەن، تاکوو ئەو دایەنەش بە دڵگەرمی و دڵنەرمی خزمەتی منداڵەکە بکات. دەبێ ئەو فەرمایشتانە زۆر بە ڕێکوپێکی و لەباری جێبەجێ بکەن و لە خوداش بترسن و خۆتان لە غەزەبی خودا بپارێزن. بێگومان خودا ئاگادارە لە هەموو کار و کردەوەکانتان.**

## شیردان بە منداڵی ساوا

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی زۆر ورد و هەستیارانە لە سیما و دەروونی ئایەتی ٢٣٣:**

دیارە لە سەر ئەساسی دەستووراتی خودای بانی سەر، ژنی تەڵاقدراو دەبێ شیری بدا بەو منداڵەی کە دەگەڵ بابی تێکچووە و تەڵاقی لێ وەرگرتووە، و دەبێ هەردووکیان چاوەدێری بکەن، هەر کەس لە ڕێگای خۆیەوە، دایکەکە بە شیردان و پاکوخاوێنی، باوکەکەش لە ڕێگای خەرج و نەفەقەی ژنەکە و منداڵەکەوە، چونکە ئەو منداڵە جگە لەوەی هیچ سووچ و تاوانێکی لەو لێک جیا بوونەوەی دایک و بابیدا نییە، بە هۆی لێک جووتبوونی ئەو دایک و بابەوە هاتۆتە دنیاوە، جا بۆ وەی دەو جۆرە کارانەدا و دە سۆنگەی دوو کەسی لێک جیاکەوتوودا، ژیان و مافی ژیان لە منداڵێکی بێچارە نەتۆرێ، ئەمر و دەستوورە لە لایەن خودای چارەساز کە ئەو منداڵە بەخێو بکرێ و شیری بدرێتێ. ئەوەیە کە خودا دەفەرموێ: ﴿وَالْـوَالِدَاتُ يُرْضِـعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كامِلَيْنِ﴾ پێویستە لە سەر دایکانی ـ تەڵاق درابن یان تەڵاق نەدرابن ـ شیر بدەنە منداڵەکانیان دوو ساڵی تەواو. ئەو دوو ساڵە شیردانە بۆ ئەو کەسانەیە کە بیانهەوێ شیری تەواو بدات. یانی ئەو کەسانەی کە دەسکورت و هەژار و ناتەوانن بۆ وەی بتوانن خواردەمەنی سووک و ئاوەکی بدەنە منداڵەکانیان، با دایکەکانیان ئەو دوو ساڵە ڕەبەق شیر بدەنە منداڵەکە. دیارە شیری دایک ئەگەر تێیدا بێ چاترین و پاکترین قووتی منداڵە و بیدرێتێ. چونکە پێش ئەوەی بێتە دەرێ ئەو منداڵە لە زگی دایکیدا خودا ئەو غەزا پاکەی لە سەر سینەی دایکی بۆ ئامادە کردووە، وەک شاعیری نازک خەیاڵ دەڵێ:

غم روزی مخور بر هم مزن اوراق و دفتر را
که قبل از طفل ایزد پر کند پستان مادر را

دیــارە ئەو کەســانەی کە داران و هەیــانە، دەتــوانن خــۆراک و غەزای بــاش بــدەن بە منداڵەکانیان. ڕێگای دراوەتێ و دەتوانن پێش ئەو ماوەی قورئان دیاری کردووە کە دوو ساڵە، لە مەمکیان وەکەن. هەروەک خودای تەعالا دەستوور دەفەرموێ و دەڵێ: ﴿فَإِنْ أَرَادَا فِصَـالاً عَـن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَـلاَ جُنَـاحَ عَلَيْهِمَـا﴾ واتە ئەگەر هــات و ویســتیان ئەو دایــک و بــابە، لە مەمکێی ببڕنەوە لە پێش دوو ساڵەکەدا، بە ڕەزامەنــدی ڕاوێژگــاری هەر دوو لایــان، ئەوە هــیچ گوناهێکیان ناگاتێ.

## شیری منداڵ لە سەر کێیە؟

وا دەردەکەوێ لەو ئایەتەدا کە ماوەی تین و هێزی شیرخواردن بــۆ وەی منــداڵ خــۆی پــێ قایم و توندوتۆڵ بکا دوو ساڵە، پاشان ئەو شیرە تێـز و پێزێکــی وای نــابێ و نــامێنێ. جــا هەر ئەوەشە کە دەڵێن زانایانی شەرع، ئەگەر هات و کوڕ و کچ لە دوای دوو ساڵ شیریان بە یەکەوە خوارد لە یەک حەرام نابن.

بە ئەرک و پێویست دانراوە لە سەر بابی منداڵەکە، نەفەقە و خۆراکی دایکە شیردەرەکە بدا، و هەر وا جلک و پۆشاک لە ســەر ئەساســی بــاوی کــۆمەڵ، وەک خەرج و نەفەقەی منــداڵ و ژنەکە ئەرکی سەر شانی بــابەکەیە. ئەمــما ئەو شــتە پێویســتانە وەک خەرج و پۆشــاک لە ســەر ئەساسی توانا و دەستەڵاتی بابە، واتە چەندەی دە تواناداا بــێ، هەر ئەوەنــدەی لە ســەر دادەنــێ شەرع، هەر وەک خودای بانی سەریش ئاوای دەستوور داوە: ﴿لاَ تُكَلَّـفُ نَفْـسٌ إِلاَّ وُسْـعَهَا﴾ واتە لە توانا بەولاوە داوا لە هیچ کەس ناکرێ. جا کەوایە فیل لە قەدەر لاقی کەوشــی بــۆ دێ و وڵاغە بەرزەش ناڵی لە قەدەر لاقی بۆ دێ.

دیارە ڕەحم ســرشتییە مافی کەس نییە ئەو مافە ســرشتیە هەڵبڕهەڵبڕ کا، هەرکەس دابڕی کا و هەڵبڕهەڵبڕی کا، خۆی لە ڕەحم و بەزەی خودا هەڵدەبڕێ و دادەبڕێ. بۆیە خودای تەعــالا بە تەئکید ئەمر دەکا دەڵێ: هیچ دایکێکی شیردەر بە کۆرپەکەی، نابێ تووشی زەرەر و ئازار بکــرێ بەو هۆیەوە منداڵە شیرنەکەی لە بەر سینگی لابرێ و لێی وەســتێندرێ. یــا ئەگەر ئەو منــداڵە لە کن باوکی بوو، بابی بەرگری ئەوەی بکا کە نەچێتە لای دایکی و دایکی نەبینێ، و یا خاروباری کەم بدرێ بە دایکەکەی لە بەر ئەوەی ئەو دایکە گوزەرانی لێ وەتەنگ هەڵــێ و هەڵــێ. ئەوجــا لەو لایەشەوە نابێ بابی ئەو منداڵە ئازار بدرێ بەوەی ئەو منداڵەی بە سەردا بدرێتەوە و ئەویش

یا دایەنــی دەس نەکەوێ یــان دایەن هەبــێ و بەڵام لە بەر نەداری و هەژاری بــۆی نەگیــرێ، یــا دایکی نەهێڵێ بابی چاوی بە منداڵەکە بکەوێ.

ئەگەر هات و ئەو بابە مرد، کێ بەخێو کردنــی ئەو منــداڵە و نەفەقەی دایــکە شــیردەرەکەی وەئەستۆی خۆی دەگرێ؟ ئەمەش دەڵێن: ئەو بابەی کە دەمرێ یا دارایە و خاوەن ســامانە، یــان نەدار و هەژار و بێسامانە؛ ئەگەر دارا بوو دیارە مــاڵە بەجێمــاوەکەی بەشــی واریســەکانە، ئەو منداڵەش یەکێکە لە واریسان و بەشگر و بەشبەر. دیــارە خەرج و پیتــاکی ئەو منــداڵە دەکەوێــتە سەر ئەو بەشەی کە لە بابیڕا بۆی بەجێماوە تاکوو ئەو کاتەی لە غەم دەرەسێ و گەورە دەبــێ. و ئەگەر هــات و بــابی مــردووش نەدار بــوو هیچــی وای لە پــاش بەجــێ نەمــابوو خەرجــی منداڵەکەی دەربێنێ، ئەودەم خەرجی منداڵەکە دەکەوێتە سەر ئەســتۆی واریســانی ئەو منــداڵە. وەک خــودای مەزن ئامــاژەی وەلا فەرمــووە: (وَعَلَى الْــوَارِثِ مِثْــلُ ذَلِــكَ) واتە لە ســەر شــانی میراتگرەکان بەخێو کردنی منداڵەکە.

## شیردان لە سەر دایک واجبە؟

لە تێڕوانین و ســرنجدانێکی هەستیارانە لە یەک شــوێنی ئەو ئــایەتەدا واتە جــوملەی (عَــن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا) قورئان ئاگاداری دەدا بە ئینسان، باب دەگەڵ ژنی تەڵاقدراوی خۆی بۆ لە مەمک دابڕینی منداڵەکەیان دەبێ پێکەوە ڕاوێژ و مەشوەرەت بکەن و هیچ کامێکیان لەو دایــک و بــابە حەقیان نییە بە تەنیا هەڵوێست بگرێ بۆ لە مەمک دابڕینی منــداڵەکەیان. جــا لەو جێــیەدا و لەو یاسایەدا ئەو هەستە دەکرێ کە چەندە لادەرن لەیاسای باری تەعــالا ئەو کەســانەی کە کورســی ڕیاسەتیان کەوتۆتە دەست، ڕێ نادەن بۆ کاروباری وڵات (....) بێ لە خــۆی کەس دەخــالەت بکا!!

ئەگەر هات و کاری منداڵەکە گەیشتە ئەو قۆناغە کە دەبێ دایەنی بۆ بگیردرێ، بۆی بگــرن و گوناهتــان ناگــاتێ بەو مەرجە ئەوەی دایــدەنێن بــۆ دایەن، بیــدەنێ؛ واتە دە کــاتی خۆیــدا بە ڕووخۆشی و دەستی پڕەوە قەراردادی خۆیان بدەنێ و دە کاتی جێژنانەدا و کاتی دیکەی شادی دیارییان بدەنێ بە شەرتی دەست ڕۆیشــتن. بترســن لە خــودا و بشــزانن ئەوەی دەیــکەن خــودا ئاگای لێیە.

دەبێ بزاندرێ کە دە جوملەی ئایەتی (وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ)دا سێ نەزەر دیاری دەدا

و هەیە، کاتێ سـرنج بدرێ و بەرجەوەندی تێیدا بە کار ببرێ ئەو سـێ نەزەرە قبـووڵ دەکـرێن. نەزەرەکان ئەوانەن:

١. ئەگەر بە زاهیری بەرجەوەندی (والدات) بین ئەو دایکانە دەگرێتەوە چ لە کن مێرد بـن، چ تەڵاق درابن؛ بەو دەلیلە لەفزی (والدات) عامە واتە گشتییە و نەکـراوەتە تـایبەتی لایەک لەو دوو لایانەی تەڵاقدراو یان لە لای مێرد بێ.

٢. بەو پێیەی کە ئایەتی (والدات) بە دووی ئایەتی تەڵاقدا هـاتووە، وا دەردەکەوێ کە ئەو ئایەتی (والدات) تەواوکەری ئایەتی تەڵاق بێ. و هەروا ڕابیـتە لە نێـوان ئەو ئـایەتی (والـدات) دەگەڵ ئایەتی ٢٣٢ی پێش خۆی ئەوە دەگەیێنێ: کاتی لێک جـودا بـوونەوەی ژن و مێـرد هـاتە گۆڕێ، دژایەتی و ناکۆکی ژن و مێردەکەش دێـتە گـۆڕێ، ئەوکـات دەکـرێ ئەو ژنە لە داخـی مێـردەکەی ئـازار بـۆ کـۆرپەکە بێنێـتە پێشـێ بە دوو دەلیـل: ١. ئـازاردانی منـداڵەکە ئـازاردانی بابەکەیەتی ٢. زۆر نزیکە ئەو ژنە تەڵاقدراوە سستی بێنێتە پێشێ دە خزمەتی منداڵەکەدا بـۆوەی مەیل هەڵگرێ و پاڵی پێوە نێ بۆ مێردێکی دی. دەکرێ ئەو بابەتانە هـۆ بـن بـۆ ئەوەی خـودای تەعالا ئاگاداری بداتە دایکەکەی خاوەن منداڵ با تەڵاقیش درابێ، دەبێ ئاگاداری منداڵەکە بکا، لە سـەر ئەو ئەساسـەیە دابەزینـی ئـایەتی (الوالـدات)، جـا کە وایە دەتـوانین بڵێـین: ئەو (و الوالدات) مەنزووری دایکی تەڵاقدراوە.

٣. (والدات) لێرەدا دایکانی تەڵاقدراو بن بەو دەلیلە خودای تەعالا بە شـوێن ئەو ئـایەتی (والوالدات)دا ئایەتی ﴿وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ﴾ دێنێ. جا خۆ ئەوە ڕوون و ئاشـکرایە ئەگەر ژن و مێردایەتی بە جێی خۆی باقی مابا و ژنەکە تەڵاق نەدرابـا، چ حەوجـێ بەوەی بـوو دەستوور بە مێردەکە درابا لە لایەن خوداوە کە خۆراک و جلـک و پۆشـاک بـۆ شـیردەر بەجـێ بێنێ. چونکە ئەو ژنە شیردەرە ژنی خۆیەتی، بابی منداڵەکە واجبە لە سەری هەموو شـتێکی بـۆ بێنێتە جـێ لە بەر خـاتری ژن و مێردایەتـی. بەڵام ئێسـتێ کە دەبـێ بیـداتێ، لە بەر شـیردانە بە منداڵەکەی.

ئەوەش با بڵێین: ئایەتی (وَالْوَالِدَاتُ) ئەگەرچی بە ڕواڵەت خەبەرە، بەڵام دە واقیعدا بە دوو دەلیل دەبێ ئەمر و دەستوور بـێ؛ دەلیلەکـان: ١. (وَالْـوَالِدَاتُ يُرْضِـعْنَ أَوْلاَدَهُـنَّ) دە حـوکمی ئەوەدایە: (في حُكْمِ اللهِ الذي اَوْجَبَهُ) یانی دەبێ لە سەر ئەو بەراوەردە جوملەی (في حُكْمِ اللـهِ الذي اَوْجَبَهُ) حەزف کرابێ. ٢. (يُرْضِعْنَ) واتە (لِيُرْضِعْنَ).

هەندێک لە قورئانزانانیش هەن ڕا و بۆچوونیان وایە کە ئەو ئایەتی (و الوالـدات) ئەمـر و دەستووری ئیجابی نییە، واتە واجب نییە ئەو دایکانە شیر بدەنە منداڵەکانیان، پاش تەڵاقدانیـان لە لایەن بابی منداڵیان بە پێی ئامـاژەی ئـایەتی ٦ی سـوورەی تەڵاق: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَى﴾. **هەر لەو جێگایانەدا دایاننێن کە بۆ خۆتانی تێدا نیشتەجێن و دەژین، بە پێی توانا و دەستەڵاتتان زەرەر و زیانیان لێ مەدەن، نەکا تەنگیان پێ هەڵچنن، ئەگەر هات و دووگیانیش بـوون دەبـێ خەرجیان پێ بدەن تاکوو منداڵەکەیان دادەنێن، جا ئەگەر شیریان بـۆ دان بە منـداڵەکان کرێیـان بـدەنێ، لە نێوان خۆتاندا ڕاپرسی و مەشوەرەت دەربارەی منداڵەکەدا بکەن، ئەگەر تووشی کێشەش هاتن بـا ژنێکـی دیکە شیری بۆ بداتێ.**

ئەو ئایەتە ئاوا دەڵێ: ئەگەر شیردان لە سـەر دایکـی واجـب بـایە، دایکـی موسـتەحەق و شایانی کرێ پێدان نەدەبوو، جا لە سەر ئەو یاسایە ئایەتی (و الوالدات) ئەمری بە واجبی نیـیە. جگە لەوەش جوملەی (فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَى) بە سەراحەت ئەوە تەئید دەکا کە (الوالدات) ئەمری وجووبی نییە. هەندێکیش هەن لە قورئانزانان دەڵێن: شیردان لە سـەر ژنـی تەڵاقدراو واجـب نییە بیداتە منداڵی تەڵاقدەر، بەو دەلیلە: ئەو ئایەتی (وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ) هـاوارە وەلای ئەوەی: واجب نییە لە سەر دایکی تەڵاقدراو شیری بداتە منـداڵی تەڵاقدەری. چـونکە ئەگەر واجب نەبێ لە سەر بابی منداڵەکە ڕزق و خۆراک بداتە دایکـی تەڵاقدراوەکە، مەگەر لە بەر شیردانی بە منداڵەکەی. ئەودەم ئەوە دێـتە ڕوو: ئەگەر شـیردان بە منـداڵەکە لە سـەر دایـکە تەڵاقدراوەکەی واجب بوایە، ڕزق و خۆراک و جلک و پۆشاک لە سەر بابی منداڵەکە واجـب نەدەبوو. دە ئێستێ کە لە سەری واجبە، کەواتە دایکەکەی لە سەری واجب نیـیە شـیری داتـێ، مەگەر بەو مەرجە بابی کوڕە ساوایەکە ئەو خەرجانەی کوتمان، بیاندا.

زۆر پێویستە لە سەر و بنی (حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ) بە تەواوی حـاڵی بـین و تێبگەین. وەک لە ڕاوێژی ئایەتەکانی مەربووت بە شیردان و شیرخواردنی منداڵەکان و ڕەزایەتی دایک و باب لەو بارەوە و یا ناکۆکی نێوانیـان، چەن مەسـەلە و بـابەتی تـایبەتی هەبـێ و هەسـتیان پـێ بکـرێ، پێشەکی وشەی (حَوْلَيْنِ) لە بـاری لـۆغەتەوە واتە حەول لە حـاڵێکەوە وە لای حـاڵێکی دی، ئاوەژوو بوونەوە لەو کاتە وە لای کاتێکی دی.

ئەوجار دەبێ بزاندرێ سنووردار کردنی شیردان بە منـداڵی بە دوو سـاڵ لە لایەن خـوداوە سنوورێک و ئەمرێکی ئیجابییە، ئەمما بە دوو دەلیل ئەو ئەمرە ئیجابییە دەخرێتە ژێر پرسیارەوە و بەرەبڕ دەدرێتەوە. دوو دەلیلەکان ئەوانەن:

١. لە بەر ئەوەی کە خودای تەعالا پاش (حَـوْلَيْنِ كامِلَـيْنِ) دەفەرمـوێ: (لِمَـنْ أَرَادَ أَن يُـتِمَّ الرَّضَاعَةَ) واتە تەواو بـوونی دوو سـاڵەکە دەبەسـتێتەوە بە ئیـرادەی ئـێمە کە وابـێ دەتوانـدرێ بکوترێ لەو بارەوە. واتە: لەو بارەی: کە ئەو دوو ساڵ شیردانە دەبەسترێتەوە بە ئیرادەی ئینسان، ئەو ئیتمامە دوو ساڵە ئیجابی نییە. چونکە ئەگەر (حَـوْلَيْنِ كامِلَـيْنِ) ئیجـابی بـوایە نەدەتوانـدرا هەڵاوەسـرێ بە ئیرادەی هیچ کەس.

٢. دەلیلی دووهەم ئەوەیە: خودای تەعالا کە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَرَادَا فِصَالاً عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا﴾ واتە ئەگەر ویستیان بە ڕەزامەنـدی و ڕاوێـژی هەر دوو لایـان پـێش ئەوەی دوو ساڵ تەواو کا، منداڵەکە لە شیر خواردن ببڕنەوە، هیچ قەیدی ناکـا و گونـاح ناگـاتە سـەر هـیچ لایەکیـان. ئەئەوە خـۆی ئیشـارەی تەواوە کە مەبەسـت لە بەیـانی تەحدیـدە، واتە سنووری دوو ساڵی کامل، ئیجابی ئەو دوو ساڵە کـاملە نیـیە، بەڵـکە مەبەسـت لە نـاو بردنـی (حَوْلَيْنِ كامِلَيْنِ) قەتعی نیزاع و کێشەی نێوان ژن و پیاوەکەیە. یـانی هەرکـاتێ ژنەکە و پیـاوەکە کەوتنە کێشە و هەرا و قڕەقڕ دە ماوەی شیردانەکە، خودای تەعالا بـۆ قەتعـی نیزاعەکەیـان دوو ساڵی ڕەبەقی بۆ دیاری کـردوون، تـاکوو هەرای خۆیـان بەو دوو سـاڵە شـیر دانە بە منـداڵەکە ببڕنەوە. جا ئەدێرەدایە: ئەگەر بابەکە یان ژنەکە تەنیا بە تەنیـا بیـانهەوێ پـێش تەواو بـوونی دوو ساڵەی تەعین کراو لە لاین خوداوە، منداڵەکە لە شیر خواردن داببـڕن نـاتوانن و حەقیـان نیـیە، بەڵام پێکەوە لە ڕێگای ڕاوێژ و ڕاوێژکـاری دەتـوانن لە مەمکـی وەکەن، وەک خـوداش ئـاوای فەرمووە: ﴿عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا﴾.

دەشـتواندرێ بکـوترێ: مەبەسـت لەو سـنووردارییە ئەوەیە شـیر خـواردن دە شـەریعەتی ئیسلامدا حوکمێکی تایبەتە، تەئیدی ئەو حوکمە دەکا ئەو گوفتەی پێغەمبەری کە فەرمـوویەتی: (يَحرمُ مِنَ الرضاعِ ما يَحرَمُ مـن النَّسَـبِ) واتە ئەوەی بە نەسـەب حەرامە، بە شـیریش هەر ئـاوا حەرامە.

جا لە سەر ئەو یاسا و ئەساسە، (ارتضاع) واتە شیر خواردن دەو دوو ساڵەدا واقیـع نەبـێ، واتە لە دوو ساڵ بەولاوە بێ، ئەو فەرموودەی پێغەمبەری ناگرێتەوە. شافعیش هەر ئاوای نەزەرە

و عەلی و ئیبنی‌مەسعوود و ئیبنی‌عەبباس و ئیبنی‌عومەر و عەلقەمە و شەعبی و زوهریش تەئیدیان کردووە. بۆ وەی ئەو حوکمەش لە هەرای شەرعزاناندا قوتاری نەبێ، حەنەفیش دەفەرموێ: ماوەی شیر خواردنی سی مانگە واتە دوو ساڵ و شەش مانگ. ئەگەر وازت لە زێدە ئاگادارییە، تەفسیری کەبیر بگرە بەر خۆت.

### (المولود له) کێیە؟

لازمە بزاندرێ (الْمَوْلُودِ لَهُ) کێیە؟ دایکە؟ یان بابە؟ خۆ دیارە ئەو منداڵە لە هەردووکیانە و دەشبێ بۆ هەر دووکیان بێ. ناکرێ ئی بابی بێ بە تەنیا، و ناشکرێ ئی دایکی بێ بەتەنیا. کەوایە دەبێ بزاندرێ کە دێرەدا (الْمَوْلُودِ لَهُ) کە دەڵێن بابە، دەلیلی چییە؟ ئەگەر ئی دایکی نییە، دەلیلی چییە؟

ئەگەر بکوترێ: الْمَوْلُودِ لَهُ بابە، واتە ئەولاد ئی بابیە، ئەوە مەحزی ئاگاداریە لەسەر ئەو ڕازەی کە ئەولاد دەخرێتە پاڵ باب، چونکە پێغەمبەر فەرموویەتی: (الوَلَدُ لِلْفَراش و لِلْعاهِرِ الحَجَرُ) واتە وەلەد ئی فەڕاشە، ئەو کەسەی کە خاوەنی سەرجێیەکەیە، زیناکەر خیت و دەرکراوە بێ خاوەنی نەسەبە دێرەدا. چونکە مافی سەرجێیی نییە شەرعەن.

بە کوردی منداڵ ئەگەر دەدرێتە پاڵ باب لە بەر ئەوەیە: لە سەر جێوبانی بابی دەبێ.

یا ئەوەتا لەو بارەوە دەڵێن: دایک دڵسۆز و میهرەبانە و شەفەقەتی زیاترە بۆ منداڵەکەی بۆیە ناوی (والد)کە دایکە بڕاوە بە (مولود له) ئەوەش ئاماژەیە وەلای ئەوەی کە ئەولاد بە خاتری بابی بە وەلەد هاتووە، کە وایە ناتەواوی ئەولاد دەگەڕێتەوە بۆ لای باب، بۆیەشە چارەی چارەکانی و مەسڵەحەتی ئەولاد ئەرکی سەر شانی بابە.

با ئاوڕێک لەو بارەوە بدەینەوە سەر ئایەتی ١٥٠ی ئەعراف، کە چۆناوچۆن هاڕوون بە مووسای برای خۆی کوتی: کوڕی دایکم! ئەو تەرزە قسەیە یا ڕازێکی دە بندا و یا ئەو قسەیە ڕەد دەکاتەوە کە دەڵێن وەلەد دەدرێتە پاڵ بابەوە.

﴿وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَى إِلَى قَوْمِهِ غَضْبَانَ أَسِفًا قَالَ بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِي مِن بَعْدِيَ أَعَجِلْتُمْ أَمْرَ رَبِّكُمْ وَأَلْقَى الألْوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُ إِلَيْهِ قَالَ ابْنَ أُمَّ إِنَّ الْقَوْمَ اسْتَضْعَفُونِي وَكَادُواْ يَقْتُلُونَنِي فَلاَ تُشْمِتْ بِيَ الأعْدَاء وَلاَ تَجْعَلْنِي مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ **جا کە مووسا بە تووڕەیی و پەرۆشییەوە گەڕاوە بۆ لای هۆزەکەی کوتی: پاش من چەند جێنشینێکی بەدفەڕ و خراپ بوون بۆ من؟ ئەوە پەلەتان کرد لە فەرمانی پەروەردگارتان؟ تەتەڵەکانی فڕێ دا و تووکەسەری براکەی (هاڕوون)ی بەرەو خۆی ڕاکێشا،**

**هاڕوون دەو کاتەدا کوتی: کوڕی دایکم! بێ‌گومان ئەو هۆزە هێز و توانایـان لە دەسـتی مـن سـتاند و زۆر لەوەشدا نزیک بوو بمکوژن، کەواتە دوژمنانم پێ دڵخۆش مەکە و مەشمخە ڕیزی هۆزی ستەمکارانەوە.**

ئەدێرەدا دەبێ چۆن جواب دەینەوە، بۆ دواندنی هـاڕوون دەگەڵ مووسـای بـرای کە پێـی کوت: کوڕی دایکم، و نەیکوت کوڕی بابم. خۆ دیاریشە کەلامی باری تەعـالا واتە قورئـان لە تەواوی بوارەکانی فەساحەت و بەلاغەت و ڕەوانی و ڕێک‌وپێکی و بێ‌گرێ‌وگۆڵیدا تێروتەسەل و تەواوە، کەس ناتوانێ قورئان نەکاتە دەلیل و بەڵگە لە سەر تەواوی نیازەکانی.

مەگەر بە ترس و لەرزەوە بۆ پینە کردنی قسەی ئەوانەی دەڵێن: حەولاد وەپاڵ باب دەدرێ، ئەوە بڵێین: دایک دڵسۆزتر و میهرەبانترە بۆیە دێرەدا هاڕون ئاوای بانگی کاکی خۆی مووسا کرد تاکوو ئەویش ڕەحمی ببزوێ و بێتەوە هۆش و تووڕەیەکەی کەم بێتەوە. ڕەحمەت لە چاترزانی!

لە سەراپای ئەو سفارشانەی خودای بانی‌سەر کردویەتی لە دایک و بابـان ئەوە دەردەخـا و دەرهاتووە کە خودای تەعالا بە ئاگاداری و ڕیعایەتی منداڵ وەسـیەتی لە دایکـی کـردووە، جـا پاشان بە ئاگاداری و ڕیعایەتی دایکی وەسیەت لێ کردووە. ئەو وەسـیەتانەی خـودای مەزن لە دایک و بابی منداڵان بەو شێوەیە، ئاماژەیە وەلای ئەوەی نیازی منداڵی بـۆ ئاگـاداری لە بـاری بەخێو کردن و خاوێن ڕاگرتن زیاتر وەلای دایکە، نەک باب؛ چونکە لە نێوان دایک و ڕۆڵەدا لە باری خاوێن ڕاگرتن و ئاگاداری هیچ واسیتەیەک دە گۆڕێدا نییە جوز خۆشەویستی و دڵسۆزی و میهرەبانی. ئەمما ڕیعایەتی باب بۆ ئەولادی واسـیتەی هەیە، ئەویـش وەک بە کـرێ گـرتن و نەفەقەدان بە دایک و دایەن. ئەو جەریاناتە ئیشاڕەیە وەلای ئەوەی حەق و مافی دایـک لە سـەر ئەولاد زیاترە لە ئی بـاب، زۆر ڕیـوایەت هەن لەو بـارەوە کە تەئیـدی ئەوە دەکەن بەڵام دێـرەدا چاوپۆشی لە هێنانیان دەکەین.

**پوختەی مەبەست لە ئایەتی ٢٣٣:**

خودای بانی‌سەر چونکە دە ئایەتەکانی پێشێدا باسی لە ئەحکامەکانی نیکاح و تەڵاق کرد، دیارە کە ئەو چاتر دەزانێ بەرهەم و نەتیجەی ئەو نیکـاحەش ئەولادە بـۆیە بە دووی باسـی ئەو دوو لەفـزانە: نیکـاح و تەڵاق هـاتە سـەر باسـی شـیر دانـی منـداڵن لە لایەن دایکیـانەوە. جە تەڵاق‌درابێ ئەو دایکەیان چ تەڵاق نەدرابێ، چونکە بە پێی عەداڵەت و ڕەحمـی خـودا نە تەنیـا منداڵ هیچ شتێک و گیاندارێک نابێ فیدای یاغی و تاغووت و ملهوڕان سەرەڕۆ بێ ...

شیر پێدانی منداڵان لە لایەن دایکان سوننەتێکی بەرزە تا دوو ساڵ، ئەمـما ئەگەر هـات و

ئەو منداڵە بە غەیرەز مەمکی دایکی، مەمکی دیکەی نەدەمژت، یان بابی لە بەر هۆکارەکانی نەداری و هەژاری نەیدەتوانی کەسی بۆ بە کرێ بگرێ بە دایەن، ئەودەم واجبە لە سەر دایکی شیری بداتێ.

## پوختەی مەبەست لە سەر شیردانی منداڵ

چونکە لابار و لانیری گرانی باری کۆمەڵایەتی لە سەر ئەستۆی پیاوە، لە چەند بڕگەدا ئەو تیوتیوەیە پێک دێنین:

١. شیردانی دایکی بە منداڵ تا ئەو جێگایەی دە ژێر ڕکێفی مێرددایە واجبە، جا ئەو منداڵە کوڕ بێ یان کچ، بە دەلیلی فەرموودەی خودای تەعالا: (وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ) (روح المعانی، ج٢، ل ٧٣٤)

٢. ئەئیمەی سەلاسە فەرموویانە ماوەی شیردان بە منداڵی دوو ساڵە بە دەلیلی ئایەتی (حَوْلَيْنِ كامِلَيْنِ)، بەڵام ئیمامی ئەعزەم واتە حەنەفی فەرموویەتی دوو ساڵ و شەش مانگە، بە دەلیلی ئایەتی ١٥ی سوورەی ئەحقاف: (وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا) واتە ماوەی دووگیانی تاکوو لە شیر دابڕینەوەشی سی مانگە.

٣. نەسەبی ئینسان لە بابەوەڕایە و سابیت دەبێ، نەک لە لایەن دایکەوە. بۆ ئیسباتی ئەو داوایەش دەچینە خزمەت ئایەتی (وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ) واتە دەبێ بابی منداڵەکەش بە جوانی و تێروتەسەلی جل‌وبەرگ و خواردنی بدا. ئەو مانایە ئەوە سابیت دەکا کە نەسەب لە بابەوەیە.

جێگای سرنجە: ئەدی بۆچی بەرەی حەزرەتی فاتیمەی زەهرا ئاوایە بە لای بابیدایە کە حەزرەتی ڕەسوولە؟ ڕەنگە هەندێک بڵێن: هەڵوەشاندنەوەی ئەو یاسا شەرعییە لەبەر ئەوەیە کە فاتمەی زەهرا نەسەبی لە لایەن بابیەوە بەرزترە لە نەسەلی عەلی، یەقین پێغەمبەر لە گۆڕێدا با ڕێگای نەدەدا شەرعی ئایینی ئەو غەدری لە سەر نیشتبا، بەڵام دەی با وابێ ئەوەی نابێ وا بێ.

٤. ئەولاد ملْکی بابە و بابیش مافی بە سەر ئەولادەوە هەیە، بۆیە ئەگەر هات و باب نەدار بوو کوڕ دارا بوو، ئەو بابە ڕێی پێ داوە شەرع کە بەبێ ئیجازەی کوڕەکەی لە ماڵ و دارایی کوڕەکەی ئیستیفادە بکا، ئەمما ئەگەر بابەش دارا بوو، نابێ. دەلیلی ئەوەش جوملەی ﴿الْمَوْلُودِ لَهُ﴾یە، واتە ئەولاد بۆ بابە، یا دەڵێن ئی بابە.

٥. نەفەقەی بابی ئەگەر هات و کەوتە بواری نەداری و نیاز لە سەر ئەولادیەتی، ئەولاد واجبە نەفەقەی بدا، نەک برا، نەک بابی خۆی (باپیری)، نە کەسی دی.

٦. ئەگەر هات و دایک و باب لێک جودا بوونەوە، بە هۆکاری تەڵاق، ئەو دایکەش کە دەبێتە ژنی تەڵاقدراو بەبێ مێردەکەی حازر نییە شیر بداتە منداڵەکەی، پیاوەکە دەبێ کرێی بداتێ. چونکە دێرەدایە شیر پێدانی منداڵەکە دەو حاڵەتەدا نە ئیمانەن و نە قەزاوەتەن واجب نییە لە سەر دایکەکەی، کەوا بێ نەفەقەی شیردەر لە ئەستۆی بابە. بە دەلیلی ﴿وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ﴾

٧. نەفەقە کە خراوەتە سەر شانی پیاوەکە، ڕاستە؛ ئەمما حاڵ و ئەحواڵی فەقیری و دارایی پیاوەکەش شەرع دە نەزەری گرتووە. یانی ئەو نەفەقەیە بەستە بە تەوانایی پیاوەکەیە، کەوایە ئەگەر ژنەکە تۆزێک دارا بێ و پیاوەکە نەدار بێ، ئەو پیاوە بە ئەندازەی توانایی خۆی موکەللەفە نەفەقە بدا بەو ژنەی شیر دەداتە منداڵەکە، ئەوەش بەو دەلیلەیە: ﴿لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ واتە بار ناخرێتە سەر شانی هیچ کەسێک، بە ئەندازەی توانای خۆی نەبێت.

٨. منداڵ نابێ ببێتە هۆی زەرەر پێدانی دایک و بابان، کەوایە ئەگەر دایکی ئەو منداڵە، نەخۆش بوو شیر پێدانی منداڵەی زەرەری پێ دەدا یان شیری دە مەمکیدا نەبوو، نابێ ئەو پیاوە بە بەهانەی منداڵەکەوە بێ دەلیل ناچاری کا شیری داتێ. یا ئەگەر ژنەکە بێ عەیب و توانا بوو دە شیردانی منداڵەکەدا، نابێ پیاوەکە مەجبوور کات بۆ بەکرێ گرتنی ژنێکی دیکە بۆ شیردانی منداڵەکە. یا ئەو ژنە تەڵاق دراوە بێ پیاوەکە نەدارە ناتوانێ ئەو بارە هەڵگرێ ژنێکی دی بە کرێ بگرێ.

٩. ژنەکە چ لە ژێر ڕکێفی مێردەکەدا بێ، چ تەڵاق درابێ، ئەمما دە عیددەی تەڵاقدایە، دەربارەی شیردان بە منداڵەکە کرێی ناکەوێ و نیەتی. بەڵام دیارە وزەوزی ئەوەی دێ جل و پۆشاکی بڕێک زیاد بدرێتێ، پیاوەکە ناچار نییە بچێتە ژێر ئەو وزەوزەیە.

١٠. ئەگەر هات و باب مرد و منداڵەکەش هەر شیرەخۆرە بوو، دیارە ئەو نەفەقەی کە بۆ ئەو منداڵەی لازم و پێویستە بدرێ، دەکەوێتە ئەستۆی واریسانی بابی. مەسەلەن ئەگەر هات و دایکەکەی شیری تێدا نەبوو بۆ منداڵەکەی، تەواوی ئەو وەزیفەی کە لە ئەستۆی بابەکەی بوو تا وێستا، ئەوجار بە مردنی ئەو بابەی دەکەوێتە ئەستۆی واریسەکانی ئەو بابە مردووە، لە سەر ئەساسی ئەو ئایەتە ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾ واتە ئەگەر منداڵ بێ باب مایەوە ئەو وەزیفەیە کە لە ئەستۆی بابیدا بوو دەکەوێتە سەر شانی واریسان و سەرپەرشتی بابی.

١١. لە مەمک دابڕینی منداڵ لە شیر پێش تەواو بوونی ماوەی دابڕاو کە دوو ساڵ و شەش

مانگە، بە ڕاوێژ و ڕەزایەتی دایک و بابەکانی دەبێ، واتە بە تەنیا بە باب و یا دایک نابێ.

١٢. ئەگەر بێت و دایکی شیردەر نەخۆش کەوت لە شیر وەستاوە و یا بە هۆیەک لە هۆیان نەیتوانی شیر بداتە منداڵەکە، بۆ بابی وەزیفەیە و دروستە و ڕەوایە شیردەرێک بۆ منداڵەکە بە کرێ بگرێ. بە دەلیلی ئایەتی ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُواْ أَوْلاَدَكُمْ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ واتە ئەگەر هات و ویستتان منداڵەکانتان بدەن بە دایەن هیچ گوناهێکوو لە سەر نابێ.

**بۆ ئاگاداری لەو بارەوە:** هۆزە عەرەبەکان بە پێی داب و باوێکی کە هەیانبوو منداڵەکانیان دە تەمەنی شیرخواردنیدا دەیاندانە ژنەکانی عەرەبە چۆڵنشیەکان، تاکوو ئەو منداڵە پتەو و ئازا و ڕەشید و نەترس هاتبا دەرێ. و هەروا تاکوو لە زمانی فەسیح و ڕەوانی عەرەبیدا شارەزا بایە. جا بۆیە هەر لە سەر ئەو دابە حەزرەتی محەمەد المصطفی پێغەمبەرﷺ دە تەمەنی منداڵیدا درایە حەلیمە و سۆییەی کەنیزانی ئەبوولەهەب بۆ شیرخواردن و ڕاهاتنی ئازایەتی و پتەو بوونی ڕۆژی هەرا. حەزرەتی حەمزە و ئەبوسەلمە و عوسمان کوڕی مەطنون ئەوانیش شیریان لەو ژنانەی دایەنی پێغەمبەر خواردبوو.

١٣. بە کرێ گرتنی ژنی بێگانە بۆ شیر دان بە منداڵی دەبێ لە سەر ئەساسی دیاری کردنی کرێیەکە بێ کە لە پێشدا دیاری کراوە و بە ژنەکەش ڕاگەیێندراوە. بە دەلیلی ئایەتی ﴿إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ آتَيْتُم بِالْمَعْرُوفِ﴾ واتە بەو مەرجەی ئەو کرێی کە بۆتان داناون و دیاریتان کردووە، بە ڕێکوپێکی بیاندەنێ.

١٤. ئەوە بە سبووت گەی و بە تەواوی کە دەبێ ئەو کرێ و حەقە باب بیدا.

١٥. دە بەخێوکردن و پاک و خاوێن ڕاگرتنی منداڵی چ کوڕ و چ کچ دایک لە پێشترە و حەقی زیاتر بە دەستە، چونکە ئەگەر دایک نەما، منداڵ دەبێ بدرێتە نەنک، ئەگەر بگونجێ و ببێ.

**شافعی:** منداڵ کاتێ گەیشتە تەمەنی تەمیز و دەرک، ئازادە کێ بۆخۆی دیاری کا بۆ لامانەوە، چ باب و چ دایک. (احکام قرآن، تهانوی)

١٦. ماوە و زەمانی شیرخواردنێکی کە لێک حەرام بوون دێنێتە ڕێ، لە لایەن عولەمایانی جمهوور، دوو ساڵە، بە پێیە منداڵی لە دوو ساڵ بەولاوە شیر خواردنی تەئسیر دانانی بۆ حورمەت، بەڵام ئەو ماوەیە لە لایەن ئیمامی ئەعزەم واتە حەنەفی سی مانگە واتە دوو ساڵ و شەش مانگ.

**بۆ ئاگاداری:** «عطا بن رياح» و «ليث بن سعد» و «ئەهلـی ظـاهر» لە سـەر ئەو بـاوەڕەن: حەرامی کچ و کوڕ لە یەک لە بابەت شیرخواردن پابەندی تەمەنی تایبەتی نییە، واتە دوو سـاڵ؛ و یا دوو ساڵ و شەش مانگ؛ بەڵکە ئینسان دە هەر تەمەنێکدا بـوو، شـیر لە هەر ژنێـک بخـوا دەگەڵ ئەو ژنە لێـک حەرام دەبـن، ئەو نەزەرە گۆیـا لە لایەن دایکـی بەرز و پـاک و بەڕێـزی موسوڵمانان حەزرەتی عایشەوە وەرگیراوە. وزەوزی ئەوەش بیســـراوە و دەبیســـرێ کە هەر ئەو دایکە نازەنین و پیرۆزەیە پەشیمان بۆتەوە.

**ئاگاداری:** عولەمایانی ئاخر وەک عەللامە ئیبنـی‌تەیمیە و عەلـلامە شـوکان کوتوویـانە بـۆ کاتی زەروورەت و پێویست دەکرێ و ڕەوایە ئەو نەزەرەی حەزرەتی عایشە عەمەلی پـێ بکـرێ، مەسەلەن ژنێک مێردەکەی بمرێ و هیچ کەسیش دەس نەکەوێ ژیـانی ئەو ژنە مێـرد مـردووە بە منداڵیانەوە هەڵسووڕێنێ، ئەو ژنە ئەندازەیەک لە شیری مەمکانی دادۆشـێتە زاری کەسـێکی کە جێی باوەڕ و بەقا بێ. ئەودەم حەرامی لە نێوان ئەو ژنە و ئەو پیاوە دێتە جێ و بە سبووت دەگا. بەڵام ئەو نەزەرە لە لایەن هەندێکیان بەرپەرچ دراوەتەوە کوتوویانە: (هذا قولٌ حادثٌ مُستَحدَثٌ لا اعتبارَ لَهُ). بە داخەوە کەم حوکم لە ئەحکامەکـانی شـەرع بە مـۆری مـاوەتەوە لە دەسـت و زمانی ئینسان نەجاتی بووبێ، تەنانەت قورئـانی پیـرۆزیش. پەنـا بە خـودا. نە بە کەس دەکـرێ بکوترێ کافر چـونکە دەرووی ئیسـلامەتیان داوەتـێ کە خـۆی پێـدا دەربـاز کـا، و نە بە کەس دەکرێ بکوترێ موسوڵمان، چونکە نیشانەی کوفریـان وێ هەڵاوەسـیوە. دووبـارە هەر پەنـا بە خودا ئێمە کێین پێ خوارە ئەویش ئەمەی پێ خوارە، بێ گومان حەقـیش هەر دوو لامـانی پـێ خوارە. حەقیش ڕاستە و ڕاست دەکا.



وەک ڕوون و ئاشـکرایە ئەو چەنـد ئایەتـانەی ٢٢٨ و ٢٢٩ و ٢٣٠ و ٢٣١ و ٢٣٢ باسـیان لە عیددەی ژنانی سەروعوزرشۆر کرد کە کاتێ تەڵاق دران، چ بکەن و چۆنیان دەگەڵ وەجـووڵێن و لە بارەی کۆمەگ و ئاوڕ وەسەر دانەوەیان هەڵوێست چۆن بێ؟ ئەوجـار خـودای تەعـالا کە حاڵ و ئەحواڵ و ژیانی هەموو کەسی لێڕا دیارە و دە چـارەی چاریـدایە، دەیـهەوێ حـاڵی ئەو ژنانەمان بۆ باس کا کە لە بابەتی عیددەدا دەبێ چۆن بن کاتێ مێردیان دەمرێ و ئاوسیش نـین؟ ئایا عیددەی ئەوان ژنانە بە مانگ دەبێ؟ یا بە عوزر دەبێ؟ جـا بـۆ تێگەیشـتن و شـارەزایی لەو بارەوە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٣٤ی بەقەرە کە خـودای تەعـالا دەوێـدا هەر جـۆر بـێ ڕوونـی کردۆتەوە:

﴿٢٣٤﴾ وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ

**ئەو پیاوانەی دەمرن و ژنیان لە پاش بەجێ دەمێنێ، با ژنەکانیان هەتا چوار مانگ و دە ڕۆژان، چاوەڕوان بن و شوو نەکەنەوە. جا کاتێ عیددەیان بە سەر چوو، ئێوە هیچ گوناحتان ناگاتێ ئەو ژنانە بە شێوەیەکی شیاو خۆیان جوان وەڕازێنن، دیارە خوداش ئاگادارە لەوەی ئەنجامی دەدەن.**

## ماوەی عیددەی ژنی مێردمردوو

### ئاور دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە سیمای ئەو ئایەتە:

ئەوانەی کە لە ئێوە دەمردن و ژنیان لە پاش بەجێ دەمێنێ، ئەو ژنانە یا ئەوەتا بە هۆی ئەوەی کە تازە و جوانن وازیان لە مێردە و مێرد دەکەنەوە و یا ئەوەتا لە کاری مێرد کردن کەوتوون و نایکەنەوە. جا دەچینە سەر ئەو بەشەیان کە وازیان لە مێردە و دەیکەنەوە، ئەوانە دەبێ عیددەی مەرگی مێردیان خودا چەندی داناوە ڕاوەستن و ڕێزی لێ بگرن جا پاشان مێرد بکەنەوە، ئەو ماوەی خوداش بە ناوی عیددەی مەرگی مێرد و ڕێز لێگرتنی مێردیان دیاری کردووە بۆ ژنەکانیان چوار مانگ و دە شەوە. وەک خودا فەرموویەتی ﴿يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾ واتە چاوەڕوانی دەکێشن و خۆ وەخۆ دەگرن بە ماوەی چوار مانگ و دە شەو. یانی عیددەی ژنی مێردمردوو ـ چ جوان و کەم تەمەن بێ، چ پیر و لەزگ وەستابێتەوە ـ چوار مانگ و دە شەوە. ئەوە بەو مەرجەی ژنەکە زگی ئاوس نەبێ لە مێردەکەی. بەڵام ئەگەر بێتوو لە مێردەکەی ئاوس بێ، ئەودەم عیددەی زگدانانەکەیە.

**بۆ ئاگاداری:** وا هەیە ژنی مێرد مردوو مەیلی مێردەکەی درەنگ دادەنێ بە سێ پاکی و پیسی مێردەکەی لە بیر ناچێتەوە. جا ئەو لەبیر نەچوونەوە و فەرامۆش نەکردنە ڕێی لێ دەگرێ کە دڵی وەجووڵێ بۆ مێردێکێ دی. ئەمما لە وانەیە لە پاش تێپەڕ بوونی چوار مانگ و دە شەوان بە ناوی عیددە، ئەگەر هیچ بڕ تەڕایی هەوا و هەوەسی دە لەشیدا مابێ، ئەو تەڕایە هەوا و هەوەسە مەیلی مێردە مردووەکەی پێ وەلانێ و بیخاتە باری مێردێکی دیکەی تازە، لەوانەیە هۆی ئەوەی کە خودای زانا بە قوژبن و قەڵش و کەلێن و جزرەکانی لەش و دەروونی ئینسانی دەزانێ، هەر ئەوە بێ کە چوار مانگ و دە شەوی گێڕاوە بە ماوەی عیددەی ژنی مێرد مردوو. و

هەروا ئەوەش دەگەڵ چوار مانگ و دە شـەوە عیـددەکەدا پێویسـتە کە ژنەکە وەک مریشـکی بە هێلکە گارەگار نەکا و دێـر و دەوێ هەڵنەپـڕژێ و لە مـاڵی مێـردەکەی نەچێـتە ئێـر و ئەوێ. و خۆشی بۆ لار و لەنجە نەڕازێنێتەوە، چ لە بەر ڕێز و حورمەتی مێردە مردووەکەی، چ لە بەر تانە و تەوسی لۆمەگەران پلاری پلارهاوێژان، و چ لە بەر حورمەتی کەس‌وکاری مێردەکەی.

ئەمما کاتێ ماوەی عیددەکەی چوار مانگ و دە شەوە بە سـەر چـوو، ئەوە ژنەکە ئـازادە و کەس‌وکارەکـانیش بۆیـان نیـیە و گوناهیـان ناگـاتێ کە بەرگـری لـێ نەکەن، کە بە شـێوەیەکی نەجیبانە و پاک و خاوێن و باوی کۆمەڵ جل دەبەر کەن و خۆ جوان کەن و دەس کەن بە چـاو و دڵ گێڕان بە ئەدەبەوە بە نیەتی دۆزینەوە و قـۆزینەی مێردێکـی بـاش و بەئـیمان و بەویـژدان. دەبێ ئەو ژنانەلە سەر دوو بوارەکان واتە بواری عیددە و هەروا بواری پاش عیددە، لە سـنووری حەیا و شەرم و ئەدەبی ئەخلاقی و ئـایینی و بـاو و عـورفی کـۆمەڵایەتی تێـپەڕ نەکەن، تـاکوو نەکەونە بەر پلاری کەس‌وکاریان و پلاری غەزەبی خودا.

کەوایە ئەوە وایە: تازیەداری بۆ مردوو، بـۆ ژن ڕەوایە و شـەرعییە، نیهـایەتەکەی تـا چـوار مانگ و دە شەو لەوێ بەولاوە ئازادە ژن. و لە غەیری ژنیش بۆ عامەی عالەم تاکوو سێ ڕۆژان بە شێوەیەکی بێ ئەزیەت و ئازار و زەرەری دارایی بـۆ واریسـانی مـردوو و دڵخۆشـی دانەوەی دوعای بەخێر بۆ مردوو ڕەوایە و ڕێـی پـێ دراوە. ئەمـما بە شـێوەی ئەوڕۆکە دە جانتـای هـیچ شەرع و مەزەبێکدا نییە، نە شەرعییە و نە عورف و باوێکی پەسندە.



دیارە بۆ ئەهلی خاوەن ئەقڵ و شعوور و هەست، ئەوە سابتە و بە یەقین گەیوە کە خـودای تەعالا هەموو شتێک دە کاتی خۆیدا دەکا و دەیفەرموێ چونکە یەکێک لە سیفەتەکانی حەکیمە، واتە شت بۆ بابەتی خۆی دادەنێ و دایناوە بۆ هەر دەردێک دەرمانی خۆی دەداتێ، جا لە سـەر ئەو ئەساسەیە کە تا ئێستا ئاگاداری و ئامۆژگاری دا بەو ژنانە کە دە تازیەی مێردیاندان، بۆ وەی شتێکی کە ناوەشێتەوە لێیان دەو تازیەدا خۆی لێ نەدەن و نەیـکەن. جـا ئەوجـار کـاتی ئەوەی هـاتووە پیاوەکـانیش کە وەک ژنەکـان گرفتـاری ئەو تـازیەن و دەرگیـرن تێیـدا، ئاگـاداری و ئامۆژگاریان دەداتێ بەو شێوەیە: کە ئەگەر هات و خوازیاری خوازبێنی ئەو ژنە مێرد مـردووانە بـوون، نـابێ لە سـنووری ئەدەب و حەیـا دەرچـن و دڵـی برینـداری ژنەکەش و کەس‌وکـاری مردووەکە بریندار کەن و وەیکولێنن. واتە چاوەچاو و قیتەقیت و فیتەفیـتەی بە دەور و دەرک و بانیدا بکەن. ئەمما ئەگەر بە ئەدەبانە و حەیادارانە بە نیەتی چاک و خواستن و هێنـان، بـۆ دەس

پێ گەرم کردنەوە نا، ژنەکە حاڵی کەی کە ئەمن خوازیاری تۆم و دەتهێنم ئەگەر بمکەی گوناه نییە، با دە عیددەی مێردەکەشیدا بێ. وەک خودای تەعالا ئیشارەی وەلا کردووە و دەفەرموێ دە ئایەتی ٢٣٥دا:

﴿٢٣٥﴾ وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاء أَوْ أَكْنَنتُمْ فِي أَنفُسِكُمْ عَلِمَ اللّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَـكِن لاَّ تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلاَّ أَن تَقُولُواْ قَوْلاً مَّعْرُوفًا وَلاَ تَعْزِمُواْ عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّىَ يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ

**هیچ تاوان و گوناحێکتان ناگاتێ ئەگەر لە ژنانی مێرد مردوو کە هێشتا هەر لە ناو عیددەدان، بە ئیشارە خوازبێنیان لێ بکەن، و یا دەناو دڵ و دەروونتاندا بڕیاری هێنانیان بدەن، خودا ئاگای لە دڵتانە و چاک دەزانێ لەو نیەتەی لە ناو دڵتاندایە، بەڵام ئاگاتان لە خۆ بێ، هەرگیز بە دزیەوە بەڵێنیان پێ مەدەن مەگین بە گوفتاری چاک و باو و نەریت، دەخیلە مارەیان مەکەن تا عیددەیان بە سەر نەچێت، بزانن خوداش ئاگاداری هەستی دەروونتانە، کەواتە چاک لێی بترسن، ئەوەش بزانن کە خودا لێبوردە و لەسەرخۆیە.**

## خوازبێنی کردن لە ژنانی مێردمردوو

**تێڕوانین و ئاوڕ وەسەر دانەوەی هەستیارانە وەسەر سیمای ئەو دوو ئایەتە (٢٣٤ و ٢٣٥)**

دیارە بە پێی ئاماژەی ئایەتی ٢٣٤ ئەوە دەردەکەوێ کە سەختی و ناڕەحەتی بۆ ژنانی پاش مەرگی مێردیانە لەو بارەوە کە ئایین دیارە بەرگری لە مێرد کردنەوەیان ناکا بەو مەرجەی کە ماوەی دیاریکراوی عیددەیان بە سەر بەرن، تاکوو ئەو ڕێز و حورمەتەی ئایین بۆ مێردی داناوە بێتە دی بپارێزرێ، و هەروا پاکی ڕەحەمیشی دەرکەوێ و کولاندنەوەی دڵی واریسانی مردووش دوور لێ بکرێ.

ئەو یاسایە ئەوە دەڵێ بە موسوڵمانان: کە ئایینی ئیسلام ڕێزی زۆر داناوە بۆ ژن و مێردایەتی.

**ئاگاداری:** لە حسن بصری و ابن‌ابی‌عالیەوە نەقڵ کراوە خودای تەعالا بۆیە ماوەی عیددەی ژنانی مێرد مردووی کردۆتە چوارمانگ و دە شەو، دەو ماوەیەدا منداڵ دە زگی دایکیدا ڕوحی دەخرێتە بەر، واتە دەو دە شەوەی پاش چوار مانگەیدا منداڵ ڕوحی وەبەر دێ.

و هەروا عیددەی مردوو کە چوار مانگ و دە شەوە، بۆیە بە شەو تەعبیر کراوە ئەو دەیەیە،

گۆیا سەرەتای مانگ لە شەوڕا دەس پێدەکرێ و هەروا ئەو چوار مانگ و دە شەوەش کە ماوەی عیددەی مێردی مردوویە بۆ ئـافرەتی چـووک و گەورەیە و فەرقـی نیـیە. و هەروا بە کـۆدەنگی عولەمایان کوتوویانە ئەو ئایەتی ٢٣٤ کە ماوەی عیددەی ژنی مێرد مردووی بە چوار مانگ و دە شەو دیاری کردووە، ڕەدی مانای ئایەتی ٢٤٠ی بەقەرەیە دەکاتەوە کە دەوێدا عیددەی ژنی مێـرد مردووی بە یەک ساڵ داناوە. تەماشا کە بۆ باوەڕی: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِـنكُمْ وَيَـذَرُونَ أَزْوَاجًـا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيَ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ واتە: ئەوانەی دەمرن و ژنەکانیان بەجێ دێڵن دەبێ لە سەرەتای مەرگـا سەبارەت بە ژنەکانیان وەسیەت بـکەن، هەتـا یەک سـاڵی ڕەبەق بیـانژێنن و لەو ماڵەشـدا دەریـاننەکەن، بەڵام ئەگەر هەر بە واز و کەیفـی خۆیـان ڕۆیشـتن، ئێـوە تاوانتـان نـایەتە سـەر، ئەگەر ئەو ژنـانە بە شێوەیەکی ڕەوا و شیاو و ئەدەبەوە خۆیان بۆ خوازبێنیکەران وەڕازێنن، دیارە خودا زاڵ و کاربەجێیە.

بەڵام «ابومسلم بصـر اصفهانی» ئەو ڕەدەی قبـووڵ نەکـردووە هەچەن بـۆ دەلیـل ئـاوڕی داوتەوە سەر ئەوەی: ئەو ئایەتی ٢٤٠ زۆر پاش ئایەتی ٢٣٤ دابەزیوە، بەڵام وڵامـی ئاغـای بەوە دراوەتەوە: تەرتیبی دابەزینی ئایەت مانیعی حوکمی ئایەت نابێ، واتە پێشکەوتن و پاشکەوتنی بەرگری لە ئەوزاعی حوکمی ئایەت ناکات، چونکە تەرتیبی نەزمی قورئان جیایە دەگەڵ تەرتیبی دابەزین و حوکم.

هەندێکیش کوتوویانە: ئایەتی ٢٣٤ تەعینی ماوەی عیددەی وەفاتە، بەڵام ئایەتی ٢٤٠ ئاماژە وەلای وەسیەتە و ڕێز گرتن لە ژنی مێرد مردوو.

ئەگەر یەکێک پرسیار بکا و بڵێ: ئەو حوکمی چوار مانگ و دە شەو عیددەیە کە دە ئایەتی ٢٣٤دا دیاری کراوە بۆ ژنانی مێرد مردوو، هەر بۆ موسـوڵمانانە نەک بـۆ گشـت گەل و هـۆز و قەبیلەی کافر و موسوڵمان؟ دەبێ چ جوابی ئەو پرسیارکەرە وەدرێ؟ وڵامەکەی دەبێ ئەوە بێ: چونکە موسوڵمانان عامل و هەڵگری ئەو حوکمەن بۆیە ئەوان کراونە تایبەت بۆ یـاد و زیکـر و بەیان، دەنا حوکمەکە عـامە. ئەو جـۆرە نموونـانەش دە قورئانـدا زۆر هەن، وەک ئـایەتی ٤٥ی نازعات: ﴿إِنَّمَا أَنتَ مُنـذِرُ مَـن يَخْشَـاهَا﴾ واتە ئەتـۆ تەنیـا ترسـێنەری ئەو کەسـەی کە لە پاشـەڕۆژ دەترسێت. دەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر ترسـێنەر و هۆشـیاریدەری هەمـوو عـالەمە، وەک خـودا دە ئایەتی ١ی فورقاندا ئەوە سابیت دەکا: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَـزَّلَ الْفُرْقَـانَ عَلَى عَبْـدِهِ لِيَكُـونَ لِلْعَـالَمِينَ نَذِيرًا﴾ گەورە و هێـژایە ئەوەی قورئـانی دابەزانـد بـۆ بەنـدەکەی (محمـد المصـطفی) تـاکوو ئەو قورئـانە

ترسێنەر و داچڵەکێنەر بێ بۆ تەواوی دنیا.

دیارە بە سبووت گەیی قورئان هۆی ئاگاداری ترسێنەرییە بۆ هەموو ئینسانەکانی سەر زەوی، دەگەڵ ئەوەی خودا دەفەرموێ بە پێغەمبەر ئەتۆ ترسێنەری ئەوانەی کە لە خودا ترسیان هەیە.

دە جوملەی ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾دا کە ماناکەی ئەوەیە: کاتێ عیددەیان بە سەر چوو، ئێوەی وەلی هیچ گوناحێکتان ناگاتێ کە ئەو ژنانە بە شێوەی شیاوی خۆیان بە جوانی وەڕازێنن بە هیوای شوو کردن. ئەو هەستە دەکرێ: کاتێ کە ماوەی دیاریکراوی عیددە تەواو بوو، ئێوەی کەس‌وکاری ژن گوناهو ناگاتێ لە سۆنگەی ئەو کارەیان. ئەمما ئەگەر بێت و دە عیددەدا ئەو عەمەلە نیشان دەن ژنەکانتان لە سەر کەس‌وکارەکان پێویستە بەرگری بکرێ. و ئەگەر هات و کەس‌وکاری ژن ناتەوان بوو لە بەرگری ئەو کارە دەبێ دەستەڵاتی وەخت ئاگادار بکرێ تاکوو ئەو بەرگری بکا.

و هەروا شتێکی دیش هەیە لە ﴿فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ و ﴿فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾دا. شتەکەش ئەوەیە: تاوان لە سەر ئێوەی وەلی و ژنەکان نییە لەوەی ئەو ژنانە بە شێوەیەکی ئەدەب و حەیا و عاقڵانە بەڕێوەی دەبەن دە نەفسی خۆیاندا. دیارە ئەو شێوە حەیا و ئەدەب و عاقڵانە واتە نیکاحی حەڵاڵ و شەرعانە.

هەندێک لە زانایانی ئایینی ئایەتی ﴿فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾یان گێڕاوە بە دەلیل لە سەر ئەوەی کە ژن خاوەنی ئیختیارە دە ماوەی عیددەدا، چ بکا و چ نەکا. دیارە نیکاح وا نییە و دە ئیختیاری ژندا نییە. جا ئەو ئیختیارە بۆ ژن کە چ بکا و چ نەکا هەر دبێ بۆ ئەولایە ببرێتەوە کە ژن خۆی بۆنخۆش و جوان ڕازاوەکا و بنوێنێ بۆ دۆزینەوەی شوو. دەنا بۆ لای عیددە بەزاندن و سنوور بەزاندن دەبێتە خیلافی ئایەت و دروست نییە.

## عیددەی تۆڵپڕ و وەفات

دیارە لە لایەن جمهووری عولەما عیددەی ژنی تۆلدار واتە زگپڕ، دانانی باری زگەکەیەتی. حەزرەتی عەلی و ئیبنیعەبباسیش دەڵێن: عیددەی ژنی زگپڕی مێرد مردوو، دوو ماوەیە: واتە ئەگەر دانانی زگەکەی زەمانی پتر دەگرت لە ماوەی عیددەی وەفاتەکە کە چوار مانگ و دە شەوەکەیە، ئەوە دانانی زگەکەی عیددەکەیەتی و دەبێ بیپارێزێ. و ئەگەر چوار

مانگ و دە شەوەکە زەمانی زیاتر دەگرت لە دانانی زگەکە، ئەوە عیـددەکەی چـوار مانـگ و دە شەوەکەیە دەبێ بیکێشێ و بیپارێزێ. ئەوەش لە سـەر ئەساسـی ئەو دەلـیلەیە: ئـایەتی ۲۳۴ی بەقەرە دەگەڵ ئایەتی ۴ی تەڵاق لە بارەی عیددەوە کۆ بوونەوە وەخۆ دەگرن و دە یەک بوار و دە یەک بڕگەدان. بە کوردی و بە کورتی: ژنی خاوەن عیددەی وەفـاتی مێـردی درێژتـرین مـاوەی عیددەی وەفات دەپێون و دەکێشن.

پێویسـتە ئاوڕێـک وەلای ڕابیـتەی نێـوان ئەو دوو ئـایەتی ۲۳۳ و ۲۳۴ وەدرێ چ ڕابیـتە و مناسەبەتێکیان پێکەوە هەیە؟ دیارە ئەگەر لە بیرمان مابێ دە پێشدا واتە دە ئایەتی ۲۳۳دا باسـمان لە شیر پێدانی منداڵ کرد پاش تەڵاقدانی دایکی یـان مردنـی بـابی، و هەروا دە ئـایەتی ۲۳۴دا باسـمان لە عیـددەی ژنــی پاشــی مردنــی مێـردی کــرد. و هەروا دە ئـایەتی ۲۳۵دا باسـمان لە خوازبێنی یا نیکاحی تازەی ژن کـرد لە پـاش مەرگـی مێـردی. جـا لە سـەر ئەو نەزم و یاسـایە دەتوانین بە ڕاشـکاوی بڵێـین: ئەو سـێ مەسـەلە واتە: شـیر و عیـددە و خـوتبەی خـوازبێنی، هەرسێک مەربووت بە یەک دەور و زەمانن، ئەو ڕابیتەیە ڕابیتەیەکی نیزیک پێکەوە بوونە.

## تیوتیوەی ئایەتی ۲۳۵

جوملەی ﴿وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم﴾ ئاماژەیە وەلای خـوتبەی خـوازبێنی نیکـاحی ژنانی تەڵاقدراو یا مێرد مردوو. و هەروا جـوملەی ﴿أَوْ أَكْنَنتُمْ فِي أَنفُسِكُمْ﴾ ئامـاژەیە وەلای ئەوەی مەیل بۆ لای ژنی تەڵاقدراو و یا مێردمردوو بە نهێنی ناڕەوا نییە.

ئایەتی ﴿عَلِمَ اللّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ﴾ ئیشاڕەیە وەلای ئەوەی خودای تەعالا لە هەسـتە و خورپەی دڵو خەبەرداره.

ئایەتی ﴿وَلَـكِن لاَّ تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا﴾ دواندنی ژنانی عیددەدار بە ئاشکرایی دە ماڵ و سـەرا و دەراواندا ناڕەوایە و نابێ ببێ.

ئایەتی ﴿إِلاَّ أَن تَقُولُواْ قَوْلاً مَّعْرُوفًا﴾ ئیشاڕە وەلای ئەوەیە دواندنی ژنـانی خـاوەن عیـددە بە نهێنی نەبێ نابێ و ناڕەوایە.

ئـایەتی ﴿وَلاَ تَعْزِمُواْ عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّىَ يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ﴾ ئیشـاڕە وەلای ئەوەیە خـوتبەی خوازبێنی ژنی خاوەن عیددەی مردن یا تەڵاق دە ماوەی عیددەدا نابێ ئاشکرا بکوترێ.

ئایەتی ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ ئیشـاڕە وەلای ئەوەیە ئەگەر هـات و دەو بابەتـانەدا

وەسەر پەڕی و فریوی هەوا و هەوەس و شەیتانت خوارد بە مەرجی گەڕانەوە لە تـاوان، خـودا دەتبەخشێ چونکە بەخشندەیە.

## عیددەی ژنی بێخەبەر لە مردنی مێرد

ژنێک وای بۆ دێتە پێشێ مێردەکەی دەمرێ و لە مردنی مێـردەکەی بـێخەبەر، هەتـا چـوار مانگ و دە شەوان و یا زیاتر پێ نازانێ پاشان پێ دەزانێ و لێی بە یەقین دەگـا کە نەمـاوە. ئایـا ئەو ژنە عیددەی چۆناوچۆن دەبێ لە ڕوانگەی ئایینەوە؟ ئایا دەبێ لەو ڕۆژەوە پێ دەزانێ عیددە دەس پێبکا؟ یا عیددەی تەواو بووە بەو چەن مانگە بێخەبەرییە؟ لە لایەن عولەمایانی جمهوور بۆ سیحەت و ئیعتیباری عیددە عیلم و زانست شەرت و مەرج نییە، جا لە سەر ئەو ئەساسە بـۆ ژنی ئاوا عیددەی تەواوە بۆ نیکاحی دی ئازادە.

بەڵام لە لایەن «عمر بن عەبـدالعزیز» و «حسـن بصـری» و «شـعبی» ژنـی ئـاوا هەر لەو ڕۆژەوەیە کە خەبەری مەرگی پێ دەگا دەبێ عیددە دامەزرێنێ ئەوەی پێشێ بێ ئیعتیبـارە. بەڵام کۆی عولەما واتە جمهوور بۆ ژنی تەڵاقدراو زانسـت مەرجـی عیـددەی نیـیە، واتە ژنـی ئـاوا بێخەبەر لە تەڵاقی پاش تێپەڕبوونی ماوەی عیددەی کە پێی زانی، ئەوە عیددەی تەواوە.

**بـۆ ئاگـاداری:** بـۆ ژنێـک ئـاوا دێـتە پێشـێ: لە لایەن مێـردیەوە تەڵاق دەدرێ، یـا خێـر و مێردەکەی دەمرێ، دەکەوێتە مەیدانی عیددە کێشانەوە. وا هەڵدەکەوێ عیددەی هـیچ لایەکیـان تەواو نابێ ئەمما ژنە بە خەیـاڵی خـۆی تەواوی کـردووە عیـددەکە، جـا هەر لایەکیـان بـێ، لە کابرایەکی دی مارە دەکرێ. پاش زەمانێکی زۆر کەم بـۆی ئاشـکرا و ڕوون دەبێـتەوە کە وێسـتا عیددەی مێردی هەوەڵی ـ جا مردبێ یان تەڵاقی دابێ ـ تەواو نەبـووە، ئە دەو حـاڵەتەدا ئەو ژنە دەبێ چبکا؟ ئایا ئەو ژنە دەبێ عیددەی ئەو دوو مێردە جودا جودا و نۆبە بە نۆبە بیانکێشـێ؟ یـا ئەو دوو عیددە بۆ ژنەکە تێک دەچڕژێن و دەچنە پاڵ یەکەوە (تداخل)، یەکیان بکێشێ کافیە؟

لە لایەن ئیمامی ئەعـزەم و ئـیمام مالـک و سـەوری و ئەوزاتـی لە بـاتی ئەو دوو عیـددە تێکەڵاوانە لە سەر ژنەکە لازمە تەنیا یەک عیددە بکێشێ و بیباتە سـەر، دیـارە ئەو جـۆرە عیـددە تەداخولانە بۆ هەموو ژنان ئاوا بە سەر هاتوویە، جا ئەو عیددەش بە حەیز بێ و یا بە تۆلدانـان بێ (واتە وضع حمل)، یا بە مانگ بێ؛ ئەمما شافعی و حەسەن بەسـری و لەیس کوڕی سەعد کوتوویانە بۆ هەر یەک لەو دوو مێردانە، عیددەی سـەربەخۆیان لازمە ژنەکە بـۆ مێـردی هەوەڵ عیددەی هەوەڵ، بۆ مێردی دووهەم عیددەی دووهەم.

برای موسوڵمان ئەوڕۆ هەموومان دەزانین عیلم چۆتە ئەو جێگایە شارەزایی بە تەواوی ناو ڕەگ و زگ و مێشک و دڵ و گورچیلەی هەموو لەشـی ئینسـان هەیە، کەوابـێ دەسـتەولەجێ دەزانێ ئەو ژنە ئاوی کامە مێردی لە ناو ڕەحەمدایە و چی لە ناو زگیـدایە، کەوایە ئـازاردانی ئەو ژنە بۆچی؟ بۆ ئیحترامی دین و ئایین؟ یا بۆ ساغ بوونەوەی ناو زگی ژن و بەرگری لە تێکەڵاوی نەسەب؟ وڵامی ئەو ئیختلافاتە دەبێ کێ حەکیمانە وەیدا؟ دەڵێم خودا لەو عالمانە خۆش بێ و بە ئەندازەی زەحمەتیان خودا پاداشیان داتەوە و زیاتریش و ناشیشارینەوە زانستی ئەو زانایـانە چرای ئایینی ئیسلامن، بەڵام ئەودەم ئەو دەزگایـانە نەبـوون کە شـت مەعلـووم کەن ئـاوا وەک ئێستێ، بەڵام ئێستێ کە هەیە دەتوانم بڵێم لە هەندێک مەسائیلی ئاوا و بچووکی دیـش بەقایـان پێ بکەین و دەکاریشیان کەین.

دیارە دەبێ ئینسانی خاوەن ئیمان و باوەڕ بە خودای ئاگادار بە سەر ژیـان و مـان و نەمـانی بوونەوەر بە تایبەت بەرەی گیانلەبەر لەوانیش بەرەی ئینسان دەبێ ئەو باوەڕ بوونەی بە خودا ئاوا بێ کە خودا هەچییەک دە شەئنی ئەو ئینسانەدا بێ و مایە و هەوێنی ژیانی بێ و مایەی پارازتنی کەرامەتی بێ و مایەی سیحەت و سازگاری لەش بـێ، پـێش ئەوەی ئەو ئینسـانە یـا بڵێـین ئەو حەیوانە وەگەڕ کەوێ بۆ ژیان و بێتە مەیدانی ژیانەوە بۆی دابین کردووە و لە بن سەری دانـاوە. واتە هەر بوونەوەرێک بە پێی مافی ژیان دەبێ بپارێزرێ و ئاگاداری لێ بکرێ. جا ئەوەیە هۆ کە خودای بانی سەر لە بابەت ئەو ژنانەی کە تەڵاق دەدرێن و مێردەکانیان وێستا نەچـوونە لایـان، واتە لە پاش مارە کردنیان و لە پێش چوونە لایان تەڵاق دەدرێن، جا ئەوجار مارەبڕانەیان چ نـاو برابێ و تەعین کرابێ و چ ناو نەبرابێ، دەستوورات و یاسا دادەنێ لەو بـارەوە کە دەبـێ بە پێـی ئەو دەستووراتە لە بابەت ئەو حەقە مارەیەی ڕەفتار بکرێ. بۆ ئیسباتی ئەو بابەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٣٦ی بەقەڕە کە دەوێدا بە تێروتەسەلی حاڵی دەکرێن:

**﴿٢٣٦﴾ لاَّ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاء مَا لَمْ تَمَسُّوهُنُّ أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدْرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ**

**گونەحباران نـابن ئەگەر ژنەکانتـان تەڵاق بـدەن کە هێشـتا سـەرجێییتان نەکـردوون، یـا هـیچ مارەیەکتان بۆ بڕیار نەدابن (ئەگەر ژنتان وا تەڵاق دا) ئەوە دەبێ بۆ دڵنیایی و دڵنەوایی کـردن پـووڵ و پارەیەکیـان بـدەنێ، هەر یەک بە پێـی دەوڵەمەنـدی و هەژاری خـۆی، ئەوە ئەرکـی سەرشانی چاکەکارانە.**

## تەڵاقدانی ژن پێش سەرجێیی کردنیان

### تێڕوانین و ئاوڕ وەسەر دانەوەی ئایەتی ٢٣٦:

ئەو کەسانەی ژنیان لە خۆ مارە کردووە و حەقە مارەیی دە مارە کـردنەکەدا نـاو نەبـردووە و دیاری نەکردووە، و هەروا سـەرجێیی ژنەکەشـیان نەکـردووە و تەڵاقـی دەدەنەوە، جـگە لەوەی گوناحیـان ناگـاتێ، ژنەکە حەقە مارەییشـی نـاکەوێ. چـونکە نـاوی حەقە مـارەیی دەکـاتی مـارەبڕینەکەدا نـاو نەبـراوە، ئەمـما مێـردەکەی لە بـاتی مـارەیی بە پێـی دەسـتەڵاتی خـۆی بە ئەندازەیەک پارە یا شتی دی بداتێ، بۆ خاتری ڕێز لە ژنەکە، کەوا نێـوی ئەو مێـردەی کەوتبـووە سەری لە لایەکەوە، و لەو لایەشەوە کەرامەتی پیاوەکەی پێ دەچێتە سەرێ. ئەوانە بەو مەرجەن کە ئەو ژنە وەک ژنـانی بەربەرەڵـلای ئێسـتێ دەگەڵ پیـاوانی بێبەنـدوباری ئێسـتێ ڕەدوو نەکەوتبێ. ئەو شتدانە بەو ژنانەی کە تەڵاق دراون و سەرجێییان نەکراوە بە دەلیلی ئەو ئایەتەیە ﴿وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ﴾ واتە ئەو ژنانە بەهرەمەند بکەن. دەوڵەمەند لە قەدەر خۆی، نەدار لە قەدەر خۆی. وەک خودا ئیشارەی وەلا فەرمووە: ﴿وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدْرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ﴾ واتە دارا و نەدار بە پێی تەوانی خۆی و هەروا ئەو بەخشش و ئەنعامە چاکەش کە دەیدەن بەو ژنـانە دەبـێ بە ڕووی خۆش و دڵی پڕ سەفا بـێ. ئەوجـار ئـایەتی ﴿حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾ ئیشـارەیە وەلای ئەوەی ئەو بەخشینەی دەیاندەنێ لە جیاتی مارەیە، چونکە ناوتـان نەبـردووە، ئەو کـارەش ئەرکە لەسەر چاکەکاران.

## تەڵاق چوار جۆرە

ئەوە ڕوون و ئاشکرایە کە ئەو حوکمەی (واتە تەڵاقدانی پێش ئەوەی دەگەڵی جووت بـی و ناوی حەقە مارەیەش نەبرێ و هیچی ناکەوێ لە مارەیی) حوکمی ئـایەتی ٢٣٦ە، جـا لە سـەر ئەو ئەساس و یاسـایەی بـۆ تەڵاقـمان وەرگـرت لە قورئـانی پیـرۆز، تەڵاق دەبـنە چـواربەش، بەجێمان مەهێڵن تاکوو بۆتان باس کەین بە تەرتیب:

١. یەکێک لەو چوار بەشـانە ئەوەیە: هەم جیماعـی دەگەڵ کرابـێ، هەم مـارە بـڕانەی نـاو برابێ. ئەوە ئەو ژنانە سێ حەیزی لە سەرە و حەقی خۆشی کە مارەییە دەبێ بیدرێتێ، دەلیلـیش ئەم ئایەتەیە: ﴿وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا ...﴾ (بقرە: ٢٢٩)

٢. دووهەمین بەش لەو چوار بەشانەی تەڵاق کە دەربارەی ژنان دەکار کراوە و دەکرێن ئەو

بەشـەیە: نە مـارەیی دیـاری کـراوە، نە جیماعیشـی دەگەڵ کـراوە، ئەو ژنە مـافی داوا کردنـی حەقەمارەیی نییە، ئەمما بە عینوانی چاکە و چاکەکاری دەبێ شتێکی لە قەدەر توانایی مێردەکەی بدرێتێ، دەلیل ئایەتی: ٢٣٦ی بەقەرەیە: ﴿لاَّ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً﴾ واتە گوناهتان لە سەر نییە ئەگەر ژنتان تەڵاق بدەن کە نەچوونە لایان ئێستا و هیچ مارەییەکتان بۆ بڕیار نەداون.

٣. سێهەمین بەش لەو چوار بەشانەی تەڵاق واریدی سەر ژن دەکرێن ئەو تەڵاقەیە: ژنـێکە مارەبڕانەی دیاری کراوە ئەمما مێردەکەی وێستا نەچۆتە لای و دەگەڵی جووت نەبـووە. ئەو ژنە نیوەی مارەیی دەکەوێ و حەقی خۆیەتی. دەلیل ئایەتی ٢٣٧ی بەقەرەیە: ﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ﴾ واتە ئەگەر هـات و تەڵاقتـان دان، پێش ئەوەی بچنە لایان، بەڵام مارەییتان بـۆ دانـابوون ئەوە نیـوەی مارەییەکەیـان دەکەوێـت کە بۆتان دیاری کردوون.

٤. چوارەمین بەش لەو چوار بەشە تەڵاقانەی واریدی سەر ژن دەکرێن ئەو بەشەیە: ژنـێکە سەرجێیی کراوە لە لایەن مێردەکەیەوە بەڵام مارەیی بۆ دیاری نەکراوە و ناوی نەبراوە. ئەو ژنـانە بە پێی فەرمانی باری دەبێ دە بەرابەر ئەو بەهـرەی لێـی وەرگیـراوە، حەقە مـارەییەکی بـدرێتێ. دەلیل ئایەتی ٢٤ی سووڕەی نیسائە: ﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً﴾ واتە هەر ژنێکتان مارە کرد و چێژ و لەززەتتان لێ وەرگرت، حەقی لەززەت و بەهرەکەی لێت وەرگرتـووە بە ناوی حەقە مارەیی بیدەیە.

## مشتومڕ لە مەڕ سیغە

دێرەدا هەست و ئەقڵ و شعوور و کەڕامەت و ویژدان دەکەونە سـرت و خورت و ڕامان و دامان و هەڵسەنگاندنی حوکمەکانی خودای حەیا و کەڕامەت پارێز. دەو ئایەتی ٢٤ی نیسـاءدا نە باسێک بە سەراحەت لە لەفزی نیکاح نە لە لەفزی تەڵاق چاو نـاکرێ و نەکـراوە. و هەروا دە ئایەتی پێش ئەو ئایەتەشدا واتە ئایەتی ٢٣ باس هەر لەوانە کراوە حەڵاڵن و حەرامن، باسـەکەی ئایەتی ٢٤یش ئاماژە وەلای ئەوەی کراوە ژنی ژێر ڕکێفی مێرد نەبێ، دەکرێ بە وەسیلەی مـاڵ و سامان و دارایی ژن بێنن نەیفەرموو مارەی کەن، بەڵام فەرمـووی خـودا دە بەرابەر لەززەت لـێ کردنیان بەهرەیان بدەنێ و کرێیان بدەنێ، نەیفەرموو حەقە مارەییـان دەنـێ. بە تەئـویلات نەبـێ

خۆت بۆ نەجات نابێ لەو بوولێڵەدا. دەکەویە دەرووی تەنگی ناڕەوای سیغەی مەشهوور و لەو لایەشەوە ئایینی ئیسلام بەو لەفزە مبارەکەی قورئـان واتە نیکـاح ژن لە پیـاو حەڵاڵ دەکـا و بەو لەفزەش واتە تەڵاق ئەو گـرێ نیکـاحە هەڵدەوەشـێ، وە هەروا کـۆمەڵی ئیسـلام واتە ئـیجماع لەسەر ئەوەن جیماع بە شوبهە (مهر المثل)ی دەکەوێ. و هەروا مـارەیی دەگەڵ نیکـاح نەبـێ، ناوی چی لێ دەندرێ؟ و هەڵوەشانەوەی گرێی نیکاح بە تەڵاق و بە لەفزەکانی هاوتـای تەڵاق نەبێ نێوی چ دەبێ؟

و لەو لایەشەوە ژن هێنـان و مـارە کـردن ڕاز و فەلسـەفە و حـیکمەتەکەی هەر لەززەت و خۆشی بەدەنی نییە بە پێی ئایین و کەڕامەت؟ کەوایە ئەقڵ و دین و قورئان و کەڕامەتی ئینسانی دە بەرابەر ئەو بەشە چوارەی کە ناوی بە تەڵاق براوە و وەک **سیغە** دەچێ، دەڵێن چی؟ و هەروا لە ڕاست سیغەدا دەڵێن چی؟

ئیمام ڕازی دە تەفسـیرەکەی خۆیـدا لە سـەر ئـایەتی ٢٤ی نیسـاءدا فەرمـوویەتی: قیاسـی ئاشکرا دێرەدا واتە دە مانای ﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ فَـآتُوهُنَّ أُجُـورَهُنَّ فَرِيضَـةً﴾دا لەسـەر ئەوە شارەزایی دەدا (وطـیء) بە شـوبهە (مهـر المثـل)ی دەکەوێ. ئەوە پـاش هەرایەکـی زۆر ئەوەی فەرمووە.

ئایەتی ﴿لاَّ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ﴾ زۆربەی زانایانی ئایینی کردوویانەتە دەلیـل لە سـەر ئەوەی کـۆکردنەوەی سـێ تەڵاقە بە یەکجـار حەرام نیـیە، چـونکە دەڵـێن: ئەوە نەسسـی ئاشکرای قورئانە و عامیشە بۆ هەموو جۆرە تەڵاقێک.

ئایەتی ﴿حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾ کە لە ئاخری ئایەتی ٢٣٦دایە، ئیشارەیە وەلای ئەوەی دەدرێتە ئەو ژنەی بە ئیحسانی دەدرێتێ نە بە شـێوەی واجـب، واتە ئەگەر واجـب بـایە دانـی ئەو شـتە کەلیمەی ئیحسانی بۆچی بۆ بەکار دەبرا؟ چونکە دەبایە بە تەئکید دابایە، دەلیل لە سـەر ئەوەی کە ﴿حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾ ئیشارەیە وەلای ئەوەی ئەو پێ بەخشینە شتە بۆ ئەو ژنانە واجـب نیـیە بەڵکە هەر چاکەیە (المحسنین)ی ئـایەتی ٩١ی تەوبەیە: ﴿ماعَلَى الْمُحْسِنِينَ من سبيل﴾: واتە بـۆ خودا و پێغەمبەر هیچ ڕێگەیەک نییە بۆ تاوانبار کردنی چاکەکاران. چونکە لۆمە لە سەر ئەوانەیە تەرکی واجب دەکەن، ئەوانەی کاری مەباح تەرک کەن لـۆمە نایـانگرێتەوە بە مەرجـێ ڕێگـای تەرکی مەباحەکەی مەباح بێ، نەک بڵێ پێی موعتەقید نیم، بە خێر و خێرات و چاکەکاری.

و هەروا ئایەتی ﴿عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدْرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ﴾ ئیشارەی تەواوە وەلای

ئەوەی (متعە) واتە دانی شت بەو ژنانەی کە بەهرەی لەززەتیان لـێ وەردەگـرێ دە ژێـر یاسـای نیکاحی شەرعیدا واجبە چونکە ئەوە وەک نەفەقکەیە کە خودا بە واجبی گێڕاوە لە سـەر پیـاوان کە بیدەنە ژنەکانیان.

و هەروا بە پێی گوفتەی هەندێک لە زانایانی ئایینی ئـایەتی ﴿مَتَـاعًا بِـالْمَعْرُوفِ﴾ دەبـێ بە واتای ئەوە بێ: ئەو مەتاعە واجب بێ بە ئەندازەی توانای دارا و نەداری.

با ئەوەش پاش گوێ نەدەین: هۆی دابەزینی ئایەتی ٢٣٦ ئەوەیە: گۆیا پیـاوێکی ئەنسـاری ژنێک مارە دەکا و مارەیی دە کاتی مارە کردنەکەدا بڕیار نـادا و دیـاری ناکـا، پاشـان بـێ ئەوەی بچێتە لای و جیماعی دەگەڵ بکا، تەڵاقی دەداتەوە، نـایهەوێ هیچـی بـداتێ. ئەو جەریـانە بە پێغەمبەرﷺ دەکوترێ لە لایەن کەس‌وکاری ژنەکەوە، پێغەمبەریش دەستوور دەفەرمـوێ لە سـەر ئەساسی دابەزینی ئەو ئایەتە، بە پیاوە ئەنسارییەکە، بە شتێک ئەو ژنە بەهرەمەنـد کە. (تفسیر منیر، ج٢؛ بحر المحیط، ج ٢، ل ٢٣١)

**تیوتیوە:**

ئەو ئایەتە (٢٣٦) بەیانی حوکمی ئەو ژنەیە پێش دەگەڵ نوستنی و بڕیاردانی مـارەیی تەڵاق بدرێ.

ئایەتی ﴿لاَّ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ ئاماژەیە وەلای ئەوەی پێش دەگەڵ نوسـتنی ژن و بـێ دیـاری کردنی مارەیی، گوناە نییە تەڵاقی دەی.

ئایەتی ﴿أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً﴾ ئیشارەیە وەلای ئەوەی: ئەگەر دە کاتی مـارە کردنـی ژنـدا مارەیی بڕیار نەدرا لە سەر پیاوەکە گوناە نییە کە تەڵاقی دا و موتعەی داتێ، نەک (مهر المثـل)، بەو مەرجە نەچووبێتە لای. (روح المعانی، ج٣، ل ٧٤٣)

ئایەتی ﴿وَمَتِّعُوهُنَّ﴾ ئیشارەیە وەلای ئەوەی ئەگەر مارەیی دیاری نەکـرا و بڕیـاری لە سـەر نەدرا و تەڵاق درا لە سەر تەڵاقدەر حەقەمارەیی واجب نییە.

ئایەتی ﴿عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَـدْرُهُ﴾ ئیشـارەیە وەلای ئەوەی: دانـی مـوتعە بە پێـی توانایە.

و هەروا ئایەتی ﴿وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾ (بقـرە: ٢٤١) ئیشـارەیە وەلای ئەوەی هەمچوون ژنانێکی ئاوا موتعەیان بە گوێرەی دارا و نەدارییە لە ڕوانگە شەرعەوە.

ئایەتی ﴿حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾ واتە دانی مـوتعە حەقێکـی دیـاریکراوە و دەبـێ بە تەواوی

زەرووری بدرێ لە لایەن چاکانەوە.

دەبێ ئەو باسە (واتە ئەو شێوە تەڵاقدانەی بێ چوونە لای ژنەکە و بێ دیاری کردنی مارەیی و پاشان دانی موتعە بەو ژنە)، زۆر بە وردی هەڵسەنگێندرێ. دڵ و ئەقڵ و شعوور دەڵێن ئەو ماستە بێ موو نییە، واتە ئەو کارە بێ سوڕ و ڕاز نییە. سوڕ و ڕازەکەش ئەقڵەن بە پێی ڕێز و ڕێزدارییەک کە لە نیکاحدا هەیە و هەروا ناحەزی و توورەییەکی باری کە دە تەڵاقدا هەیە و دەبیندرێ، دەبێ هەر ئەوە بێ: ئەو پیاوە لەبەر تاڵووکە و بێ لێکۆڵینەوە لەو ژنەی دەیخوازێ، وەسەر تەڵە دەپەڕێ هەتا مارەشی نەکا و نەیتەوە سەرە خۆ و بڵاو نەبێتەوە مارە کردنەکەشی بە ناو عالەمدا، ئەو تەڵەی ئەو مێردە وە سەری پەڕیوە دەرناکەوێ. پاشان کە بە هۆی ئینسانانی عەیبدڕ و زار بە هاوار تەڵە دەتەقی و دەنگی تەقینەکەی بە گوێی مێردەکەی دەگا و ئەودەم تێدەگا ئەو کارەی ئەو کردی لە بابەت ئەو ژن خوازتنە، بێ بەراوەردە، خێری بۆ وی تێدا نییە و نابێ، ئەوجار دەیهەوێ وردەوردە خۆی لێ وەکرێ و وەدزێ و دوور خاتەوە بەبێ دەنگی. دێنێ پێش ئەوەی تخوونی کەوێ تەڵاقی دەدا و دەشڵێ بە خەیاڵی خۆی جا خۆ حەقەمارەییم بۆ بڕیار نەداوە و نایکەوێ، ئەمنیش ئەو خەرجەی لێم کردووە با بڕوا هەر ئەوەندە نەجاتم بێ و عالەم زۆر پێ نەزانێ و شتەکە بڵاو نەبێتەوە. ئیدی بێخەبەر لەوەی خودای بانی سەر ئاگاداری هەموو کار و بارێکە و حافیزی کەرامەت و حەیا و ئەرزشی هەموو گیانلەبەرێکە بەتایبەت ئینسان، و تەنبێ کردنی ئەو کەسانەش کە بەبێ هەڵسەنگاندن و بەراوەرد و لێکدانەوە وەسەر کاران دەپەڕن، دێنێ ئەو حوکمە جەزا و سزای بۆ دادەنێ و دیاری دەکا و دەفەرموێ: ﴿وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدْرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾ واتە بەهرەمەندیان بکەن ئەو ژنانەی ئاوا تەڵاقیان دەدەن و مارەییتان بۆ دیاری نەکردوون و نەچوونە لایان، ئەو بەهرەیەش بە پێی توانایی و دارایی خۆتان، بە ڕوویەکی خۆش و دڵێکی پاکەوەتان.

بە دڵی من و هەڵسەنگاندنی من. ئەوە بوو سوڕ و ڕازی ئەو تەڵاقدانە، کێش چاتری بۆ دەچێ سپاسی دەکەم.

دیارە هەر وەک زانیمان و ڕامانگەیاند لە لایەن خوداوە: ناو نەبردن و دیاری نەکردنی حەقەمارەیی ژن دە کاتی مارە کردندا تەڵاقدانەوەشی ئاوا بەو شێوە ڕاگەیێندرا دە ئایەتی ٢٣٦دا، سەر دەکێشێتە ئەو ڕاستییەی کە ئەو ژنە لە مافی مارەیی بێبەش دەبێ. ئەوکات بەهرە پێدانی دەکەوێتە ئەستۆی پیاوەکە ئەویش خۆی و خودای خۆی.

ئەمما ئەگەر حەقە مارەیی ناو برا و دیاری کرا دە کـاتی خۆیـدا و واش هـات تەڵاق درا و چوونە لاشی دەگەڵ نەهاتبووە جێ، چی دەکەوێ ئەو ژنە؟ جا بۆ ئەو بـابەتە دەچیـنە خـزمەت ئایەتی ٢٣٧ی بەقەرە کە دەوێدا دیاری کراوە:

﴿٢٣٧﴾ وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إَلاَّ أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ وَأَن تَعْفُواْ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَلاَ تَنسَوُاْ الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ اللّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ

**ئەگەر هات و تەڵاقتان دان (ژنەکانتان) لە پێش ئەوەیدا بچنە لایان، بەڵام ئەوجارە مارەییتان بۆ دانابوون، ئەوە (نیوەی ئەو مارەییە دیاری کراوەیان) دەکەوێت. (دەبێ بیانـدرێتێ). جـا مەگەر ژنەکە بۆخـۆی بە وازی خـۆی نەیەوێـت و یـا سەرپەرشـتیارەکەی بیبەخشـێ و بیبـووریێ. یـا لێبوردن و بەخشندەگی لە تەقوا نزیکە، لە ناو خۆتاندا، چاکە و خێرتـان لە بیـر نەچـێ، چـونکە بێگومانە خودا ئاگادارە بە سەر ئەو کردەوانەدا کە ئەنجامی دەدەن، چ دە شەودا چ دە ڕۆژدا.**

## مارەیی ژنی تەڵاقدراوی سەرجێیی‌نەکراو

### تێڕوانین و ئاوڕدانەوەیەکی ورد و هەستیارانە:

ژن بە پێی یاسای ئیسلام پێش ئەوەی جیماعی دەگەڵ بکـا مێـردی و تەڵاقـی دا، ئەوە ئەو مارەییەی کە دە کاتی مارە کردنـدا نـاوی بـراوە و بـۆی دیـاری کـراوە نیـوەی دەکەوێ و دەبـێ بیدرێتێ. ئەوە ئاوا بەو شێوەیە ئەوەمان پێ دەڵـێ: ئەو مـارەییە جـگە لە ڕاز و حیکمەتێکـی کە خودا دێرەیدا بەدی کردووە بەهرەی ئەو لەززەتەیە کە لە ژنەکە وەردەگیرێ، جا بۆیە ئەگەر مێـرد نەگەیـی ئەو بەهـرەی لـێ وەرگـرێ و تەڵاقـی دا، نیـوەی قەراردادی دەبـێ بـداتێ. ئەوەش بە بـاوەڕیمان دەبـێ ئـی ئەوەی بـێ کە ئەو ژنە شـەرمەزاری تـووش بـووە دەو مـارە کـردن و تەڵاقدانەیدا بۆ دڵنوازش و دڵداری ئەو ئافرەتە شەرع ئەو نیوە حەقەی بۆ دیاری کردووە.

یەکێک دێ ئەو پرسیارە دەکا و دەڵێ: شەرع بە زاهیـری ئەو حەقە مـارەییە و یـا نیـوە حەقە مارەییەی بۆیە داوێتە ئەستۆی پیاوەکە، چونکە پیاوەکە بەهرەی لەززەتی لێ وەردەگرێ لە ژنەکە؛ بەڵێ باشە، ئەوە با وا بێ. جا خـۆ ژنەکەش ئەو بەهـرەی کە مێـردەکەی لە ژنەکەی پێـی دەگـا، ژنەکەش لە پیاوەکەی پێی دەگا؛ جا کەوایە ئەو حەقە بۆ بە تەنیا خرایە ئەستۆی پیاوەکە؟

بۆ وڵامەکەی دەبێ لەو ڕوانگەوە هەنگاو باوێژرێ و هەڵوێستی بۆ بگیردرێ: پیاوە کڕیار و خوازبێنیکەر و مارەبڕ و قبـووڵکەری نیکـاحەکەیە، و هەروا پیـاوە نەفەقە هەڵگـر و دابیـنکەری

خەرج و مخاریجی ژن. ژنە خۆفرۆش بە پیاوەکە لە بابەت نیکاحەوە، سەیری کاتی مارە کردنی ژن و پیاو لە یەک بکە: وەلی ژن ڕوو دەکاتە پیاوەکە و دەڵێ: ئەوە ئەو کچەی خۆم یا ئەو خوشکەی خۆم مارە کرد لە تۆ، یان دام بە تۆ بە ئایین و مەزەب بە حزووری ئەو شاهیدانە. حەقەمارەییش لە سەرە تۆ ئەوەندە بێ. پاشان دەستەولەجێ پیاوەکە دەڵێ: ئەوە قبووڵم کرد ئەو نیکاح و مارەییە بەو مەرجانەی ناوت بردن.

جا ئەدێرەدا لە ژن و پیاوەکە کامەیان درا بە کامەیان؟ ئەگەر لە خۆ نەگۆڕین دیارە ژنەکە درا بە پیاوەکە. جا لە سەر ئەو ئەساس و یاسایایە دەبێ ئەو حەقە مارەییە لە ئەستۆی پیاوەکە بێ نەک ژنەکە. ئەو مارەییە حەقێکە ئی ژنەکەیە و خودا پێی بەخشیوە دەو سەودایەدا، جا بۆیە ژنەکە دەشتوانێ دە کاتی خۆیدا بیبەخشێ بە پیاوەکە، جا ئەگەر ئەو حەقە لە لایەن خوداوە مافی ڕەوای ئەو ژنە نەبایە، نەیدەتوانی بیبەخشێ چونکە کەس مافی کەسی پێ نابەخشرێ. و هەر لە سەر پێ خۆشبوونی ئافرەتەکە سەرپەرشت و چاوسوور و کەسوکاری ژنەکەش دەتوانن ئەو مافە شەرعیەی ژنەکەی ببەخشن بە پیاوەکە دە کاتی تایبەتیدا، وەک خودای تەعالا دەو ئایەتەدا ئاماژەی وە لا فەرمووە: ﴿إِلاَّ أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ وَأَن تَعْفُواْ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَلاَ تَنسَوُاْ الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ اللّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ واتە (ئەو مارەییەی داتاننـاوە **نیوەیان دەکەوێ) مەگەر ژنەکە خۆی نەیەوێت و بیبەخشێ و یا سەرپەرشتیارەکەی ببووری و لێتان خۆش بێ. دیارە لە دیوانی خودادا بەخشندەیی و لێبوردن زۆر خێرە و لە تەقواش زۆر نزیکە لە کن خودا لە بیر ناچێت و خوداش ئاگاداری کردەوەتانە.**

لێرە لەو حەقە نیوە مارەییەی کە ژنەکەی دەیبەخشێ و یا چاوسوور و کەسوکارەکانی، هەست بە شتێکی زۆر چاک و باش و بەقیمەت دەکرێ، لەوانەیە زۆر کەسی بەئیمان و شاییبەخۆ و بەویقار وەیقۆزێ، ئەو دیاردە بەنرخەیە. ئەو شتەش ئەوەیە: ئەو بەخشینە لەوانەیە ئەو دڵ ناڕەحەتیە و پەرێشانیەی کە وەک برینێک خزاوەتە سەر دڵ و جەستەی شەخسیەت و کەسایەتی کەسانی ژنەکە، ڕاماڵ درێ و سارێژی کاتەوە و لەو لایەشەوە بە کەسانی پیاوەکەش بلێ و تێی گەیێنێ کە ئێمەی کەسوکاری ئەو ئافرەتە ماڵپەرست و دنیاپەرست نین بەڵکە کەرامەت و عیزەتی ئینسانی هەدەف و ئامانجە دە خزمایەتیدا. جا ئەو مەبەست و نیەت و ئاکارە ڕەوا و پەسندە واتە بەخشین، دەبێتە وەسیلەی لەنگەر ڕاگرتنی خزمایەتی و ڕابیتەی حەسەنەی چاک و پاک، هەروەک خوداش ئاماژەی وەلای فەرمووە بە هۆی ئایەتی ﴿وَلاَ تَنسَوُاْ

﴿الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ﴾ چاکەی یەکتریتان لە بیر نەچێتەوە کە دە وەخت و کاتی خۆی دەگەڵ یەکتری دەکەن، وەک ئەوە کاتی خۆی ئەو پیاوە دەستی خزمایەتی درێژ کردووە بۆ ماڵی ژنەکە و هەروا کەس‌وکاری ئەو ژنەش دەستی خزمایەتی وییان قبوول کردووە و نەیانبردۆتەوە پاش. کە بەو کارە تەڵاق‌دانە ئەو خزمایەتی و برایەتییە تێک نەچووە و نەڕووخاوە.

## بۆ ئاگاداری

کەسانی خاوەن هەست و ویقار ئەگەر بە چاو و دڵی بەئیمان و ویژدانەوە سەیری ئایەتەکان بکەن و بەرجەوەندی بن و لەو لایەشەوە خەڵکی پێ وەزن کەن و هەڵیسەنگێنن و لە قەپان و محەکی قورئانی بدەن، دەبێ چۆنی بەراوەرد کەن و چ ناوێکی بۆ ئەو عالەمە دانێن؟ دادگاکان سەیر کەن پڕن لە خیلافکار، سەرۆکەکان زەین دەنێ بەجوز خۆپەرستی و خۆپەسندی و سەرەڕۆیی لێیان چاو ناکرێ، چۆنێکی بۆ بڕوا و ڕاوەستی و دەستەڵاتی ئاوا دەکا هیچ ئاوڕێکی وەسەر ئەساسنامەی ژیانی ئینسانی کە قورئانە ناداتەوە و ئایەتی ٢٢ی سوورەی موجادەلە لە لایەن خەون و خەیاڵە:

لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾

**هیچ هۆزێک دەست ناکەوێ کە باوەڕی بە خودا و ڕۆژی ئاخرەت هەبێ و دە هەمان حاڵ و ئەحواڵ و کاتی باوەڕیدا ئەو کەسانەیان خۆش بوێ و دۆستایەتی و تێکەڵاوی بکەن، کە دەگەڵ خودا و پێغەمبەرەکەیدا دوژمنایەتی بکەن (واتە ئیتاعەیان ناکەن) هەچەن ئەو دوژمنانەی خودا و ڕەسووڵی خودا باب و کوڕ و یا برا و تایفە و بەرەیان بن. ئەوانە خودا بڕوا و ئیمانی دە دڵ و دەروونیاندا داڕژتووە و جێگیر کردووە، بە یارمەتی‌دانێک لە لایەن خوداوە، دەشیانخاتە ناو باغ و باغاتێکەوە کە ڕووبار لە ژێر دار و درەختەکانیدا جاری دەبێ. هەتا هەتایە لەوێدان. خودا لەوان ڕازی بووە و ئەوانیش لە خودا ڕازی بوون، ئەوانە حیزب و دەستەی خودان. ئاگادار بن بێ‌گومان هەر حیزب و دەستەی خوداش بەختەوەرن.**

برا و کاکی خاوەن ئیمان و هەست و ژیر! سەیری مانا و حوکم و دەستووری ئەو ئایەتە ڕاست و ڕەوان و پیرۆزەی خودا بکە و ڕەفتاری دەستەڵاتدار و حاکمانی بە ڕواڵەت ئیسلامیش بکە. جا ویژدانەن ڕێگا بدە بە ویژدان و ئیمان و باوەڕی بە خودا و قەزاوەتەکە بکە. بۆ ژیران

ئیشارەیەک بەسە.

پاش ئەوەی خودای بێهاوتــا و زانــا و ئاگــادار بە ســەر ســـرشت و ئاکــار و خووخــدەی هەموو گیانلەبەرێکی وەک ئینسان و حەیوان، هات لە سەر ئەساسی حیکمەت و یاسای نیزامی بێوێنەی خۆی خزمەت بەو ئینسانە خەلیفەیەی خۆی بکا کە دە کــاتی ســەختی و تەنگــانەدا و هەروا دەو کاتەدا کە غەم و پەژارە سواری دڵی دەبن بۆ حەسانەوە و ڕزگار لەو باری وا گــران و قورس، پەنا بەرێتە بەر چی؟ بۆ وەی پشووی بێتەوە بەری و دست لە لکی داری هیوا و هومێـد بەرنەدا؟ با پەنا بەرێتە بەر ئەو شتەی کە خودا بۆی دەسنیشان کردووە کە ئەویش نوێژە.

ئەوجار خودای بەرز و بێهاوتا تائایەتی حافزی نوێژانی هێنا لە پاش دەســتووراتێکی پــڕ لە گێــرە و کێشــە و هەرا و بەزمــی ژیــان و کەڕامەت و بەرزایەتــی و نزمــایەتی لە ســەر ڕێبــاز و بازگەکانی کاروانی ژیان. وەک باری هاوسەرایەتی واتە ژن و مێردایەتــی و تەڵاق و لێــک جیــا بوونەوە و خزمایەتی و هەزاران شتی دیکەی کە ئینسانی دەکوشێ و ڕادەچڵەکێنێ و دەیانخــاتە ژێر باری غەم و پەژارەوە.

ڕازی ئەو یاسا جوانەی خودای بێ هاوتا، واتە دابەزانــدنی ئایــاتی نــوێژان بە دوای ئایــاتی مەڕبووت بە ژن هێنان و تەڵاقدان و تێکەڵاوی و خزمایەتی و تەشکیلی هێلانەی خــاووخێزان و خزمایەتی، وەئەستۆ گرتنی قورسایی باری ژیانی ناو خێزان دەبێ هەر ئەوەبێ: گەورەتــرین و بەرزترین و نزیکترین دەروو بۆ خۆ ڕزگار کردن لە ژێر باری ئەو خەم و پەژارەی دنیا و پەلامــار و هێرش و شاڵاوی تۆفان و سێلاوی بێ ئابڕوویی و نەدامەتی، نوێژێکە کە پێی دەکــوترێ پەنــا بردن بۆ خودا و دوان دەگەڵ خودا.

تەڵاق کە ڕاتدەکێشــێتە نــاو زەلکــاوی نەدامەتــی، نــوێژیش ڕاتدەکێشــێتە لای خۆشـــی و سەعادەت و حەسانەوە. ژنهێنــان کە ڕاتدەکێشــێتە بــازاڕی ژیــانی پــڕ لە ئــاوات و ئــارەزوو و خەیــاڵاتی دزی و فــزی و گــزە لە هــاواڵان، نــوێژ ڕاتدەکێشــێتە نــاو پــارازتنی ڕاز و ڕازداری و ئەمانەتداری.

بە کوردی هەرچەند ژیانی خاووخێزان ڕاتکێشێتە ناو دەریای پەژارەوە، نــوێژیش کە دەگەڵ خودا دووانە، ئەوەندەت ڕادەکێشــێتە لای وڵاتــی حەســانەوە و هومێــد و هیــوا و دواڕۆژێکــی تاووساو و خۆشی و بەخــتەوەری، و ئەوەنــدەی ژیــانی مــاڵ و منــداڵ لاواز و بێهێــزت کــا، نوێژیش بگرە زۆر زیاتر و بەتین و گوڕ و بەهێز و پێــز و تێــزت دەکــا. جــا لە ســەر هەمــوو ئەو

بەختەوەریانەی دە نوێژ کردندایە دڵــی مانــدوو و شــەکەتی ژنهــێن و ژنتەڵاقدەر دەیــهەوێ و دەخوازێ بە ئارەزوو و تامەوە بگاتە نوێژ و دەستووراتی. جـا ئـێمەش بەپەلە بـۆ بەجێهێنـانی ئاواتی دڵ دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٣٨ی بەقەرە، کە دەوێدا خـودای ئاشـنا و زانـا بە بەرەکەتــی نوێژ و بە تەنگەتاوی و ماندوویی دڵی خاوەن خێزان و ژیان، تێماندەگەیێنێ بۆ دەبێ پەنا ببرێتە بەر ئەو سەنگەر و مەتەرێزیەی کە هیچ دوژمنێک نەیتوانیـوە و نـاتوانێ ئەوەی دەو سـەنگەرەدا مەتەرێز بگرێ، بیگری و گرتبێتی و ئەسیری بکا، بەڵام بێزار لەو سـەنگەرە جـگە لەوەی لە هەر دوو دنیادا بێپەنایە، هەڵوەدا و بێورە و بێئەنوایە.

﴿٢٣٨﴾ حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ
**پارێزەر بن و سوور بـن لە سـەر نوێژەکانتـان، بەتـایبەت نـوێژی ناوەڕاسـت. لە بەردەم خـودادا بەردەوام بە ملکەچی بۆ بەندایەتی ڕاوەستن.**

## بەردەوامی لە سەر نوێژەکان

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە:

کۆڵەکە و خانووی ئیمانی شەش کڵی (واتە: باوەڕی بە خودا، باوەڕی بە فرشتە، باوەڕی بە کتێبە ئاسمانییەکان، باوەڕی بە پێغەمبەران، باوەڕی بە ڕۆژی قیامەت، باوەڕی بە قەزا و قەدەر)، نوێژە؛ ملاقات و دوانی بەندەکانی خودا دەگەڵ خودا پێکدێنێ، نوێژ نێوانی بێبـاوەڕ و بـاوەڕە بە خودا، نوێژ وەسیلەی حەسانەوە و سووکنایی دڵە، نوێژ شاهیدی لە سەر بەندایەتییە بۆ خودا. نوێژ شاهیدە لە سەر عەبدایەتی خۆت و مەعبوودایەتی خودا، عەبد و مەعبـوود لە یەک بـابن، کاتێ دە مەعنادا ئەوە سـابیت دەبــێ کە عەبـد لە بـابی مەعبـوودە کە ئەو عەبـدە نـوێژ بکـا بـۆ مەعبوود، ئەگەر نوێژ نەکا عەبد هەر عەبدە، ئەمما عەبدی هەوا و هەوەس و شەیتانە، نە عەبدی مەعبوودی بەحەقە.

جا لەبەر ئەوەی نوێژ کۆڵەکە و پایە و کڵی گەورەی پردی ئیمانە، خودا دە قورئانی پیرۆز و ئەساسنامەی ژیان و ئیماندا زۆری ئاوڕ وەسەر داوە، بگرە وەک لە بیرم بێ و ئیشتبام نەکردبێ لە ٨٦ جێدا باسی لەسەر کردبێ. کەم سووڕەتی قورئان هەیە باسی نوێژی تێـدا نەکرابــێ، وەک لە بیرم بێ لە ٦٨ ئایەتدا دەو سووڕەی بەقەرەیەدا باسی نوێژ براوە، دەنا باسی نوێژ ناوە بە نـاوە هەر کراوە. واتە لە ئایەتی ١٧٧ەوە تا ئایەتی ٢٣٨ باسی نوێژی تێـدا نەکـراوە، لەوێ بەولاوە خـودای

تەعالا باسی داگیرساندۆتەوە.

دەبێ بە تەئکید ئینسان ئەوە بزانێ ئەوەی پێویست بوو لە بابەت ناسینی دینی خودا و هەروا ئەوەی لازم بوو بۆ زانین لە شەریعەتی ئەودا، خودا بێکەموکوورِی رِایگەیاند و بەیانی کرد. پاشان هەر خودا بۆ وەی ئینسان بەهانە نەگرێ دەستووری پێ دا کە دەبێ لە سەر ئەنجامدانی نوێژ، وشیار و ئامادە بن. ئەو ئاگاداری و وشیار کردنەوەی خودا لە مەرِ ئینسان لە بابەت نوێژەوە چەن رِازێکی بەنرخیان تێدایە. یەکێک لە رِازەکان ئەوەیە: چونکە کەیفیەتی نوێژ پێک هاتووە لە رِاوەستان و هاتنە سەر ئەژنۆیان و رِۆچوونە سەژدە و دانیشتنی سەر چۆکان و بێدەنگی و چاونەگێرِان بێر و بەوێدا، سەراپای ئەو حاڵەتانە زیللەت و دڵی داچڵەکاو مات و داماوی تێدا هەست پێ دەکرێ.

## گرینگایەتی نوێژ

لە دیوانی خودای خاوەن هەیبەت و بەشکۆ و جەلالدا هەروا سەرکۆنە و لۆمەی نەفس و هەوا و تێکشکانی هەوای کیبر و دەعیە و تەشەخوسی لێ پێکدێ و هەروا دەسکێشانەوە و واز هێنان لەو شتانەی نەهیان لێ کراوە. سەرەرِای ئەو ئاکارانە بەری داری ئەو نوێژە عیبادەتە، هەروەک خودای بانی سەریش ئیشارەی وەلا فەرمووە گەرِانەوەیە لە مەنهیات:

اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾ عنكبوت

**واتە وەیخوێنە هەرچیت لە وەحی (واتە لە کتێب) بۆ نێردراوە، نوێژیش بکە، بەرِاستی نوێژ بەرگری دەکات لە کاری ناشیرین و خراپ. بێگومان یادی خوداش گەورە و مەزنترە. خوداش دەزانێ چی دەکەن.**

نوێژ جگە لە یادی خودا، ئینسانی بەرەو خۆ بەکەمگری و هیوای پاداشی چاکە و ترسی تۆڵەی خراپە دەبا. ئەدێرەدایە کە وە ئاسان دەگەرِێ، عیبادەتی خودا، جا بۆیە خودای تەعالا فەرموویەتی:

وَاسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلاَّ عَلَى الْخَاشِعِينَ ﴿٤٥﴾ بقره

**واتە (دە هەموو کاروبار و چەنگ و چەڵەمەی رِۆژگاردا) پەنا بەرنە بەر خۆرِاگرتن و نوێژ کردن (چونکە بێگومان) نوێژ کارێکی گرانە، بۆ ئەوانە نەبێ کە وا ملکەچی فەرمانی خودان.**

## کاتەکانی نوێژ

جگە لەوەی لە ئیشارِاتی ئایاتی قورئان بە تەواوی بۆمان ئاشکرا دەبێ کە نوێژ پێنج کاتن،

واتە شەو و ڕۆژ پێنج جارن، زانایانی قورئانیش کـۆدەنگن لە سـەر ئەوەی پێـنجن و ئەگەر لەو ئایەتی ٢٣٨ ورد بینەوە زۆر بە ڕوونی بۆمان ساخ دەبێتەوە کە نوێژ پێنجن، بەو دەلـیلە: ﴿حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ﴾ شارەزامان دەکا لە سەر سێ نوێژان بەو دەلیلە (صلوات) جەمعە، جەمعـیش کە دەبێ لە سێ کەمتر نەبێ. و هەروا دووبارە کە دەفەرموێ ﴿والصَّلاَةِ الْوُسْطَى﴾ ئەوەش بۆ خـۆی ئیشارەیە وەلای زیاتر لە سێ، دەنا تکـرار لازم دێ، چـاکیش ئەوەیە تکـرار نەبـێ. دووبـارە ئەو زیادەیەی کە لە ﴿الصَّلاَةِ الْوُسْطَى﴾دا دەستمان دەکەوێ، نـابێ یەک بـێ و نوێژەکـانی پـێ ببـنە چوار، چونکە وەسەت دەبێ ئەولاولایەکەی بە ئەندازەی یەک بـن، کەواتە دەبـێ بڵێـین: ئەولا دوو نوێژ و ئەولایش دوو نوێژ، وەسەتیش یەک نوێژ، ئەوە پێنجەکە هـاتە ڕوو. ئەدێـرەدا دەبـێ بکوترێ بۆ وەسەت (نێوەڕاست): ئیمتیاز و فەزیلەتی کاتی و زەمانی هەیە بە سەر دوو لایەکەی خۆی، دەنا دەکەوینە باری پرسیار ئەوەی بۆ وەسەتە؟ خودا بۆ ناوی برد بە وەسەت؟ خـودا بـۆ ئەو نوێژەی هەڵاوارد لەوانی دی؟ ئەوەش هەر پێوە دەچێ و چاک نییە.

ئەو ئایەتی ٢٣٨ تەنیا ئیسباتی واجببوونی پێنج فەڕزەی نوێژەکان دەکا و بەیانی وەخـت و کاتەکانی نوێژەکان ناکات. ئەمما ئەگەر مۆڵەتێ بگرن ئایەتانێک هەن بەیانی وەختەکـانی پێـنج نوێژەکان دەکەن بە ڕوونـی. ئەمەش بە تێروتەسـەلی باسـیان لە سـەر دەکەیـن. ئەو ئایەتـانە کە وەختەکانی دیاری دەکەن چوارن، ئەگەر گوێم ڕادێرنێ دەچمە سەر باسەکەیان:

**١. سوورەی ڕۆم ئایەتی ١٧ و ١٨:**

فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْـبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ الْحَمْـدُ فِي السَّـمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِـيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴿١٨﴾ **واتە کاتێ دەکەونە دەمەو ئێواران و دەمەو بەیانان، پـاک و خـاوێنی خـودا بڵـێن و پەسنی بکەن (١٧) هەموو سپاس و ستایشێ لە ئاسمانەکان و زەوی هەر بۆ خودایە، ئێـواران و کە دەکەونە نیوەڕۆش (١٨)**

ئەگەر بە چاوێکی وردبینانە سـەیری ئەو دوو ئـایەتە بکـرێ، بە ڕوونـی وەختەکـانی پێـنج فەڕزەی نوێژەکانت دێتە دەست و بۆت مەعلووم دەبن. زەین دەیە:

﴿فَسُبْحَانَ اللَّهِ﴾ واتە (سبّحوا اللَّه)، دە ماناشدا (صَلُّوا اللّهَ)؛ ﴿حينَ تُمسونَ﴾ کە واتە نوێژی مەغریب و عیشاء؛ ﴿وَحِينَ تُصْبِحُونَ﴾ واتە نوێژی سبەینێ. هەروا لەفزی ﴿عَشِيًّا﴾ چ ئی ئایەتی ١١ی سوورەی مەریەم و چ ئی ئەو ئایەتە (١٨ی ڕۆم) هەر دوو بە واتای نوێژی عەسـر؛ ﴿وَحِينَ تُظْهِرُونَ﴾ واتە نوێژی نیوەڕۆ.

ئەگەر بە چاوی ورد زەین بکرێتە ئەو دوو ئایەتە و وەکۆڵدرێ لێیان، کاتی هەر پێنج نوێژەکان دێتە دەست و دەشیانسەلمێنن بێ دوودڵی.

**٢. سوورەی ئیسراء ئایەتی ٧٨:**

﴿أَقِمِ الصَّلاَةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَى غَسَقِ اللَّيْلِ وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كانَ مَشْهُودًا﴾ واتە نوێژ بکە بە ڕێکوپێکی لەو کاتەوە کە ڕۆژ ناوەڕاستی ئاسمان بەجێ دێڵێ، تا تاریکایی شەو دادێ، و لە شەبەقی بەیانیشدا؛ بێ گومان (فرشتەکان) ئامادەن لە نوێژ کردنی بەیانیدا.

ئەگەر بەرجەوەندی ئەو ئایەتە بی، هەر پێنج فەرزە نوێژەکانی (ظهر، عصر، مغرب، عشاء و صبح) هەست پێ دەکەی، بەو دەلیلە ﴿لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَى غَسَقِ اللَّيْلِ﴾ واتە لەو کاتەوە کە ڕۆژ ناوەڕاستی ئاسمان بەجێدێڵێ؛ ئەوە وا مەنشووره کە ڕۆژ لە جوغزی ناوەڕاستی ئاسمان لایداوە و بەرەو ئاوا بوون دێ. ئەوە دێرەدا نوێژەکانی (ظهر، عصر، مغرب، عشا) وەبەر دێن، چونکە دەو مابەینەدا واتە لە سەرەتای لادانی ڕۆژ لە خەتی ئیستیوا تا تاریکایی شەو دادێ، کاتی ئەو چوار نوێژانەی تێدا وەبەر دێ.

خۆ ئەوەش ڕوونە ﴿وَقُرْآنَ الْفَجْرِ﴾ واتە نوێژی (صبح). کەوابوو دەبێ بکوترێ: ئەو ئایەتی ٧٨ی ئەسرا هەر پێنج فەرزە نوێژەکانی دە ناو خۆدا کۆ کردۆتەوە.

**٣. ئایەتی ١٣٠ی سوورەی تەها:** هەر پێنج نوێژەکانی دە ئامێزی خۆ گرتوون:

﴿فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا وَمِنْ آنَاءِ اللَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ النَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَى﴾ واتە ئەتۆ لە بەرابەر ئەو شتانەوە ئەوان دەیڵێن خۆڕاگر بە، پێش هەتاو کەوتن وپێش ئاوابوونیشی، پەسنی پەروەردگارت بە سپاسەوە بکە. لە نیوەشەوان و سەرەتا و کۆتایی ڕۆژیشدا هەر پەسنی خودا بکە، بەڵکە نیازت بێتە دی.

دەبێ دەو ئایەتەدا بڵێین، بۆیە باوەڕیمان وایە کە هەر پێنج نوێژەکانی دە باوەشی خۆ گرتوون. چونکە زەمان یا پێش ڕۆژهەڵاتنە کە کاتی شەوی پێ دەکوترێ، یا پێش ئاوابوونی ڕۆژە کە دەبێتە کاتی ڕۆژ، کەوایە دەتوانین بڵێین: شەو و ڕۆژ دەو دوو وشانەدا کۆ بوونەوە، واتە طلوع و غروب، یانی ڕۆژهەڵاتن و ڕۆژئاوابوون. جا خۆ ئەوەش یەقینە ئەو پێنج نوێژانە کات و سات و وەختەکانیان هەر دە شەو و ڕۆژدانە.

**٤. ئایەتی ١١٤ سوورەی هوود:**

﴿وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى

لِلذَّاكِرِينَ﴾ نوێژەکانت بەجێ بێنە، لە بەرەبەیانیدا و دە ئێوارێدا و سەرەتای شەودا (ئەو شێوە عەمەلە) بەڕاستی چاکەکان، خراپەکان دەشۆنەوە و دادەماڵن، ئەوەش بیرخستنەوەیەکە، بۆ ئەوانەی پەند وەردەگرن.

بەڵگە لە سەر ئەوەی ئایەتی ١١٤ی هوود چۆناوچۆن هەر پێنج نوێژەکان دەگەیێنێ: دیارە دوو تەرەفی ڕۆژ سوبح و عەسرە؛ ﴿وَزُلَفًا مِّنَ اللَّيْلِ﴾ مەغریب و عیشان، دەمێنێتەوە (ظهر)، ئەویش هەندە ئاشکرایە دە گوێدا قەراری گرتووە بۆ باس کردن نابێ کە دە نێوان دوو تەرەفەی ڕۆژدایە.

ئەوەمان لە بیر نەچێ کە لە پێشدا کوتمان ٥ ئایەتی دە ٤ سووڕەدا باسی پێنج کاتەکانی نوێژەکان دەکەن ئەمما پێنج ئایەتمان هێنانەوە، ٢ ئایەتی ڕۆم (١٧ و ١٨)، ١ ئایەتی اسرا (٧٨)، ١ ئایەتی طه (١٣٠)، ١ ئایەتی هود (١١٤). ئەوە دە ژمارەدا دەبنە پێنج، بەڵام بۆوەی بە چوارەکە کارەکەمان ڕاست بێ، دوو ئایەتی ڕۆم واتە یەک ئایەت، چونکە بە هەردوو ئایەتی ١٧ و ١٨ی ڕۆم جا ئینجا پێنج نوێژەکە کاتیان هاتە جێ. بەڵام ئایەتەکانی دیکەی اسرا و طه و هود بەتەنیا پێنج نوێژەکانیان دە ئامێز گرتبوون.

ئەوجار دەبێ بە چاکی ئەوە بزانین و گوێی بدەینێ و بێ مبالاتی دەگەڵ نەکەین ئەمری خودا بە محافزەت و پارێزگاری لە نوێژ هەر نوێژ کردن نیــیە بە تەنیا و ڕووت و ڕەجاڵ لە خاوێنێ و لە خشووع و خزووع واتە لە یادی خودا و تێکەڵاوی دڵ دەگەڵ سام و هەیبەتی خودا. بە کوردی دەبێ نوێژکەر خاوێن بێ لەش و جل و جێگای نوێژی، داپۆشراو بێ حەیا و ئەدەب و شەرمگای، ڕوو بە قیبلە و دیارە بۆ ئەنجامدانی ئەو پاک و خاوێنییە جیاوازی هەیە بۆ ئینسانەکان بە ئیش و کار و شوغڵ و جێگا و ڕێگا، وەک شوان و گاوان و کاردار و مەیتەر وپاڵە و جووتێر و دروێنەوان، ئەوانە بە پێی توانایان و جێگاوڕێگایان نوێژەکانیان بەجێیە.

بەرزترین پایەترین ڕوکنی نوێژ نیەتە، واتە رعایەتی نیەتە و کۆ کردنەوەی دڵ واتە ڕێی پێ نەدرێ دەو کاتەدا بێر و بەوێدا هەڵپرژێ و هەڵڕووسکێ، هەروەک خودای تەعالا ئاماژەی وەلا فەرمووە: إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي ﴿١٤﴾ طه بەڕاستی هەر ئەمن خودام، جگە لە من خودایەک نییە، جا کەواتە من بپەرستن و لە بەر یادی من نوێژ بکەن (واتە نابێ گێرەت لە هەولێر بگەڕێ)

## سەبارەت بە (الصلاة الوسطى)

با ئەوەش نەخەینە پشت گوێ: زۆر لە قورئانزانەکان فەرموویانە: ﴿الصَّلاَةِ الْوُسْطَى﴾ لەو

شتانەیە: هەر کامێک لەو نـوێژانە بڵێـی هەو بـێ وەک موتەشـابەهات وایە، و هەر وا دەتـوانین بڵێین وەک ئەو چەند شتانە وایە کە خودای تەعالا دەستنیشانی نەکردووە بـۆ وەی کە بە جـێ بێن دەوروبەرەکانیش بەو هیوایە کە ئەوەی لێی دەگەڕێ و دەخەفتێ وەبەر دێ.

ئەو چەند شتانەی کە خودای تەعالا شاردوونیەوە دە ناو چەند شتاندا ئەوانەن:

١. شەوی قەدر، دە پاڵ دە شەوی ئاخری ڕەمەزاندا

٢. نوێژی ناوەڕاست، دە پاڵ پێنج نوێژەکاندا

٣. کاتی ڕابوونی قیامەت دە پاڵ کاتەکانی دنیادا

٤. ناوە بەرزەکەی خۆی دە پاڵ ناوەکانی خۆیدا

٥. ئەو کاتژمێری قبووڵبوونی دوعا دە پاڵ کاتژمێرەکانی جومعەدا

٦. کاتی مردنی دە پاڵ کاتەکانی ژیاندا شاردۆتەوە.

هەندێکیش هەن لە یارانی ئـایینی فەرموویـانە ﴿الصَّـلاَةِ الْوُسْـطَى﴾ نـوێژی بەیـانییە، وەک زۆربەی ئەسحابەکان، و قەولی عمرو ابن عاص و ابنعبـاس و جـابر بـن عبـدالله و ابوامـامە باهل، طاووس و عطـا و عکـرمە و مجاهـد. شـافعیش هەر ئـاوای نەزەرە کە نـوێژی بەیـانییە. دەلیلیان: دە تەواوی ڕۆژێدا دوو نوێژ دیارن: ظهر و عصـر. دە تەواوی شەودا دوو نوێژ دیارن: مغرب و عشاء. کەوایە دەکرێ بکوترێ و ڕەخنەی لـێ نەگیـردرێ کە لە نێـوان ئەو دوو کـاتەدا نوێژی سبحەینێیە لە نێوان دوو نوێژی شەو و دوو نوێژی ڕۆژدایە. ئەگەر بشـکوترێ: جـا خـۆ نوێژی مەغریبیش ئەو حاڵەتەی هەیە کە بۆ نوێژی سبحەیێنت داناوە، ئەمەش دەڵێین: فەزیلەتی نوێژی بەیانی زیاترە لە فەزیلەتی نوێژی مەغریبێ، ئەگەر بشکوترێ جا بۆ وایە؟ ئەمەش دەڵێین ئەگەر کار بگاتە جا بۆ وایە، هیچ کارێک هەڵنابڕێ.

هەنـدێکی دیـش هەر لە سـەر ئەو بـاوەڕەن کە ﴿الصَّـلاَةِ الْوُسْـطَى﴾ هەر نـوێژی بەیـانییە، دەلیلیان: ئەوەیە دە عارەفاتدا بە ئیتفاق نوێژی نیوەڕۆ و عەسـر دێنەجێ و کۆ دەکرێنەوە، لە لای شافعیش هەر وایە، دە کاتی سەفەردا نوێژی نیوەڕۆ و عەسـر کۆ دەکرێنەوە و هەروا مەغریب و عیشا؛ کەواتە نوێژی سبەینێ تەنیا دەکەوێتەوە دە یەک کاتی واحیـددا. بە کـورتی کـاتی نـوێژی نیوەڕۆ و عەسـر کاتی واحیدەیە، و کاتی مەغریب و عیشا یەک کاتی واحیدەیە و کاتی نـوێژی سبەینێش یەک کاتی واحیدەیە لە نێوان دوو کاتەکانی دی.

دەلیلیش لە سەر فەزیلەتی سبەینێ ئەوەیە: ئایەتی ٢٣٨ی بەقەرە ﴿وَقُومُواْ لِلّٰهِ قَانِتِينَ﴾ واتە لە

بەردەم خودادا بەردەوام بە مل‌کەچی بۆ بەندایەتی ڕاوەستن. دە شەرعدا وا گویٚ بیس بـووین بە پێی حەدیسی دروست نوێژێکی کە قنووتی تێدا سابتە نوێژی بەیانییە.

لە سەر ئەوە کە کامە نوێژ (وُسْطَی)یە، مشت‌ومڕ زۆرە، گەر دەتهەویٚ خـۆی لە قەرە دەی، بڕۆ بۆ لای تەفسیری کەبیر، ئیمام ڕازی.

## نوێژ نەکردن بیٚ عوزرە

وەک باسمان کرد لە پێشدا و تێگەیشتین پاش بەیانی ئایاتی ئەحکـام، هـاتینە سـەر باسـی عیبادەت و معاملات و نەزم و نیزامی تایبەتی خـاوخێزان کە ئەوانە بەشـێک بـوون لە ئایـاتی ئەحکامات. دوای ئەو باسە خاسە کە پڕ بوو لە دەستوورات و تەربیەت، خودای تەعالا لە سەر ئەساسی حیکمەتی هـات بە شـوێن ئەحکامـاتی خـانەوادە، یەک کەڕەت ئەحکامـاتی نـوێژی دامەزراند و دایگیرساند، ئەئەوە جێی پرسیارە کە بۆچی خودای بانی سەر یەک کەڕەت کاروانی ئایاتی خاوخێزانی وەلانا و کاروانی ئەحکاماتی نـوێژانی وەڕیٚ خسـت؟ بە پێـی فەرمـوودەی زانایانی ئایینی «شەهید سـەید قوتـب» ئەو ئـاڵوگۆڕە لەناکـاوە ئامـاژەیە وەلای ئەوەی قورئـان دەیهەویٚ دە عەبدانی خاوەن باوەڕ بگەیێنیٚ کە ئیتاعەی خودا دە تەواوی ئەحکامات عیبادەت و خوداپەرستییە، واتە ڕیعایەتی دەستووراتی نوێژ عیبادەتە هەروەک پارازتنی نیزامـی خـاوخێزان عیبادەتە، چونکە ئیتاعە لە خودا لە هەر بار و بوارێک بیٚ عیبادەتە، و هەروا بوونی ئینسانیش بۆ عیبادەت سازاوە و ڕازاوە وەک خودای تەعالا بە وەسیلەی ئایەتی ٥٦ی زاریـات ئیشـاڕەی وەلا فەرمووە: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ **ئەمن جنۆکە و مـرۆم دروسـت نەکـردووە تەنیـا لە بەر ئەوە نەبیٚ بمپەرستن.**

لە سەر ئەو ئەساسەی کە ڕابیتەیەکی تـایبەتی و دەروونیـیە دەگەڵ خـودا و بەو پێـیەش کە دەسـتووری تەئکیـدی لە سـەر بەجیٚهێنـانیش دراوە، دە نـاو ئایـاتی مەڕبـووت بە ئەحکـامی خاوخێزان، دەتوانین بڵێین: ئەوە تەئکیدە لە سـەر ئەو ڕاسـتیەی کە ئینسـانی خـاوەن ئـیمان و باوەڕ دە ناو گێرە و کێشەی خاوخێزان، هەروا بەزمی کۆمەڵایەتیدا نیازی زۆری بە حەسانەوە و لەخـۆبردوویی و لەسـەرەخۆیی هەیە، بەتـایبەتی دە کـاتی تەڵاقدانـی ژن کە بەرەو مەیـدانی دڵئێشی و ناڕەحەتی و سـەخڵەتیت ڕادەکێشـیٚ. جـا ئەوە ئەو نـوێژەی کە تێکەڵبـوونە دەگەڵ خـودا و یـادی خـودا، نـوور دەخـاتە نـاو ئەو دڵەی کە بەتینـی نـاڕەحەتی ژن تەڵاقدان گەرم داهاتووە هێواشی دەکاتەوە و ساردی دەکاتەوە. بەرەو خۆوە خۆگری و پشت بە خـودا بەسـتن

لەنگەرێت پێ دەگرێ.

نیزامی شەریعەتی ئیسلام دە هیچ شـەرایەتێکدا ڕێگـای تەرکـی نـوێژی نەداوە و تەنـانەت خودای تەعالا بە هیچ جۆر عوزری تەرکی نوێژی قەبووڵ نەکردووە و حەتا دە کاتی شەڕ وبەزم و هەراشدا؛ ئەمما دە کاتی سـەختی و تەنگـانەدا بە پێـی توانـا ئەمـری پـێ داوە. «قرطبـی» دە تەفسیرەکەیدا (ج ٣، ل ٢٢٥) فەرموویەتی: کاتێ ترس و تەنگـانە وای دە ئـامێزی خـۆی گرتبـووی دەرەتانی نوێژ کردن و خوێندنی بە زمانیشی لێ بڕیبووی، دەو حـاڵەتە سـەخت و دشـوارەدا بە زمان و بە دڵ یادی نوێژ دەبێ بکرێ. ئەگەر ئەو حاڵەتە وەلاچوو دەسـتەولەجێ بـۆی وەگەڕێ بۆ شوکرانەی خودا بکە لە سەر ئەوەی ئەگەر دەو حاڵەتە تەنگانەیەشدا ڕێگـای نەداوی تەرکـی نوێژەکە بکەی ڕێگاشی بە پێی توانا بۆ ئاسان کردووی.

جا لە سەر ئەو یاسا و نیزامەی کە بەجێهێنانی نوێژ فەڕزە و تەرک و عوزری تەرکـی تێـدا نییە دە هیچ شەرایەتێکدا، خودای تەعالا بـۆ وەی ئینسـان بتـوانێ دە هەمـوو کـات و سـات و حاڵەتدا بتوانێ ئەو وەزیفەیە ئەنجـام دا، ئـایەتی ٢٣٩ی بەقەرەی بـۆ دابەزانـد تـاکوو دە کـاتی شەڕیشدا بتوانێ ئینسان بە پێی توانای ئەنجامی دا:

**﴿٢٣٩﴾ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَانًا فَإِذَا أَمِنتُمْ فَاذْكُرُواْ اللّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ**

**ئەگەر هاتو ترسـان بە دەم ڕێـوە، بە پیـادە یـا خـۆ بە سـواری، نوێژەکانتـان بەجـێبێنن کـاتێ کەوتنە ئاسایش و ترستان نەما، نوێژەکانتـان هەروەک جـاران ئەنجـام بـدەن. جـا لە سـۆنگەی ئەوەدا خودا فێری ئەو شتانەی کردوون کە هیچتان لێ نەدەزانی.**

## نوێژ کردن دە کاتی شەڕدا

### تێڕوانین و ئاوڕ وەسەر دانەوەی سیمای ئەو ئایەتە پیرۆزە:

واتە ئەگەر هات و کەوتنە شەڕ و دەرگیری دەستەویەخە و ترسان لەوەی دوژمـن سـەرتان کەوێ، وەیا لافاو و خزینی زەوی، زەلزەلە، یا پەلامار و هێرشی دڕندەیەک بەرەو ڕووتان هـات، ئەودەم نەتانتوانی ڕوو بە ڕووگە (قیبلە) بۆ نوێژ بوێستن ئەودەم هەر جۆر دەتوانن بۆتان دەسـت بدا نوێژ بکەن، دە غار و هەڵاتندا بـێ، بە ڕاکشـان دە مەتەرێـزدا بـێ، پشـت بە ڕووگە بـێ، یـا تەنیشت بە ڕووگە بێ هەر دەبـێ. هەروەک خـودا ئامـاژەی وە لا فەرمـووە: ﴿فَرِجَـالاً﴾ واتە بە

پیادەیی نوێژەکە بخوێنن، ﴿أَوْ رُكْبَانًا﴾ یا بە سواری، ئەدەو کاتاندا بیانخوێنن با نەشتوانن رکووع و سەژدە بەرن بە لەش، با بە دڵتاندا بێ یادی ئەوانە، چونکە ئەو کاتە کاتی هەڵمەت و دەستەویەخەیە، ئەگەر ڕکووع بەرن یا سەژدە بەرن، دەکەونە دەستی دوژمن، جا بۆیە ئیجازەو پێ دراوە ئەو حاڵەتانە بە لەش وەلانێن، بەڵام بە دڵ و زمان یادیان بکەن.

بەڵام کاتێ ئەو حاڵەتە تەنگانییە لاچوو و نەما و ئەمین بوونەوە، ئەودەم وەرنەوە سەر یادی نوێژەکانتان بە شێوەی تەواو. جا لە سۆنگەی ئەو شێوە زانستیەی خودا پێی دان لە بارەی نوێژ خوێندنی کاتی وا سەخڵەت و تەنگانە. کە جاران ئاواتان نەدەزانین، یادی خودا سپاس و حەمد و شوکری بکەن.

یەکێک دێ و پرسیار دەکا و دەڵێ: ئایا مەگەر نوێژی کاتی شەڕ و هەرا و ترس و تەنگانە و سەخڵەتی ئاوایە و بەو شێوەیە و شێوەی دیکەی نییە؟ ئەمەش دە وەڵامیدا دەبێ بڵێین: نوێژی ترس، بە گوێرەی ترس و شەڕەکە و تەنگانەکەیە، واتە دەبێ بڵێین نوێژی ترس بە دوو شێوەن، دەگەڵم بە تاکوو هەر دوو شێوەکان باس کەم و ڕوونیان کەمەوە و لێکیان جیا کەمەوە:

١. یەکیان ئەوە بوو کە دەو ئایەتە پیرۆزەی ٢٣٩ی بەقەرەدا بە تەواوی و تێروتەسەلی باسمان کرد کە ئەو شێوە نوێژ خوێندنە دە کاتی شەڕی تەنبەتەن و دەستەویەخەییدایە، هەر ئان و لەحزە لە فێڵ و فووتی دوژمن و شەڕ غافڵ بی و بخافڵێی بە شتێکی دیکەی غەیری شەڕ بە دەس دوژمن دەکەوی، دوژمن فرسەتت لێ دێنێ و داگیرت دەکا، جا بۆیە دەبێ تەواوی هەست و هۆشت بە لای دوژمنەوە بێ، نەکا بتخاتە داوەوە.

٢. شێوەی دووهەم لە نوێژی ترسدا و دە شێوەی دووهەمی شەڕدا ئەوەیە: ئەودەم کە هەر دە حاڵی چاوەڕوانی شەڕدای، داخوا لە کوێوە دوژمن هێرش دێنێ و ڕاماڵ دێنێتە سەرمان، ئەوە ئەو شێوە دە شەڕدا بوونە دەگەڵ حاڵەتی شەڕی دەستەویەخەیی و تێکچڕژان لێک جیاوازن، وەک دە ئایەتی ١٠٢ی سوورەی نیسادا باسی لە سەر دەکا، خودای تەعالا بە تێر و تەسەلی:

نساء ﴿١٠٢﴾ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلاَةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَى لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَاحِدَةً وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَى أَن تَضَعُواْ أَسْلِحَتَكُمْ وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ إِنَّ اللّهَ أَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا

**(ڕووی ئەو فەرمایشــتە پیــرۆزە لە پێغەمــبەرە، دەفەرموێــت): ئەگەر دەگەڵ لەشــکردا بوویــت و پێش‌نوێژیت بۆ دەکردن ئەوە بــا دەســتەیەکیان نــوێژت دەگەڵــدا دابەســتن بــێ ئەوەی چەکەکــان لە خۆیــان بکەنەوە، و بە شێکی تریان با ئاگایان لە ئێوە بێ و ئاگاداریتان بــکەن. جــا ئەوجــار لە دوای ڕکــاتی یەکەم ئەو بەشەیان کە دەگەڵ ئیمام (واتە پێغەمبەر) نوێژیان دابەستووە لە نوێژ دەبنەوە بە یەک ڕکــاتی و دەچــنە پشتەوە تاکوو ئاگاداریتان بکەن و ئینجا ئەو دەستەی کە بە هــۆی پاســەوانی لە ئێــوە نوێژیــان نەکــردووە، دێنە جێگای ئەوانەی ڕکاتێکیان کردووە، جا دێشن بە چەکەوە دێــن و بە وریــایی ڕکــاتی دووهەم دەگەڵــت دادەبەستن و نوێژ تەواو دەبێت.**

دیارە ئەو نوێژە دوو ڕکاتین، یانی ئەو کەسەی دەبێتە ئیمام دە ڕۆژی ئاوا شەڕدا دوو ڕکــات نوێژ دەکات و هەر دەستەیەک لە لەشکرەکە تەنیا یەک ڕکات دەکا. ئەو شێوە نــوێژە دە کاتێکــدا دەکرێت کە هێشتا شەڕ دەستی پێ نەکردبێت ئەمما کە شــەڕ دەســتی پێکــرد و دامەزرا و کــاتی نوێژیش هات و گەیشت دەو گەرمە شەڕەدا، هەندێک لە زانایان کوتوویانە هەرکەســە و نــوێژی خۆی بە دڵ و زمان بکات، سەژدە و ڕکووعیش بە ئیشارەی چاو بەرێــتە ســەر بە هەر جۆرێــک بۆی دەکرێ، بەڵام هەندێک دەڵێن: نوێژەکە دوا بخرێت بۆ دوایی شــەڕەکە، ئەودەم دوای شــەڕ وەستان با وەیگێڕێ. بێ‌باوەڕان بە ئاواتەوە کە ئێوە ئاگاتــان لە چەکەکانتــان و باروبنەکانتــان نەمێنێــت تاکوو کتوپڕ بدەن بە سەرتاندا. وەک خودا ئاماژەی وەلا فەرمووە: ﴿وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَاحِدَةً﴾ کەوایە دەبێ ئێوە زۆر وریــا بــن و هەر **چاو لە دوژمن ببڕن، بەڵام ئەگەر ئازار و ناڕەحەتییەکتان هەبوو یان نەخۆش‌کەوتن یاخود باران بــاری، ئەو کاتە ئەگەر چەکەکانتان لە خۆتان داماڵن، ئەوە گوناهتان ناگاتێ، بەڵام دەبێ هەر وریا و ئاگادار بن نەبــادا لەناکاو پەلامارتان بدەن و دەستێکتان لێ بوەشێنن، بەڕاســتی خــودا ســزایەکی زۆر بەئــێش و ئــازاری بــۆ بێ‌باوەڕان ئامادە کردووە.**

ئەوە بوو مانای ئایەتی ١٠٢ی سوورەی نیساء لە مەڕ نوێژی ترسان پێشی شەڕ دامەزران.

## نوێژ دە ترسێدا

لە سەر ئەساس و ڕاوێژی ئەو دوو ئایەتە پیرۆزانەی ٢٣٩ی بەقەرە و ١٠٢ی نیساء لە بابەت نوێژی ترسەوە، ئەو هەستە ڕاستیە بە دڵدا دێ و ڕادەبرێ: نوێژ بە تەواوی ناوەڕۆک و مێشــک و کاکڵی سێ شتن:

١. کرداری دڵ واتە نیەت

٢. کردار بە زمان واتە خوێندن

٣. ئیشارەی دەست و پێوەندانی لەش

قیام و قعود و سجود و ڕوو بە ڕووگە کە بەشێکی زینەتین لە نوێژ لادەچن بەڵام ئەو سێ شتانە کە دڵی نوێژن لاناچن. چونکە نەمانی ئەو سێ شتە نەمانی نوێژ دەگەیێنێ. و هەروا دەبێ ئەوەش بزانین و باوڕەی پێ بکەین هەموو شت بە گوێرەی توانینە و لە قەدەر تاقەتە، ئایەتی ٢٨٦ی بەقەرەش هەر ئاوامان پێ دەڵێ: ﴿لاَ یُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ خودا ئەرک ناخاتە سەر شانی هیچ کەس، بە پێی وزە و توانای نەبێ. جگە لەو ئایەتە پیرۆزە کە کافییە و قەناعەت بە دڵ دەدا و پێغەمبەریش فەرموویەتی: (إذا اَمَرتُكُم بِشيءٍ فَأْتُوا مِنهُ مَا اسْتَطَعْتُم) واتە کاتێ بە شتێک دەستوورم پێ دان، لەو دەستوور پێدراوە هەچی دەتوانن ئەوە ئەنجام بدەن.

زۆربەی زۆری قورئانزانەکان واتە (مفسرین) ئەو ئایەتی ٢٣٨ و ٢٣٩ی لە مەڕ ئەو نوێژەی کە کەوتۆتە فاسیلە و نێوانی عیددە و وەفات و ئەحکامی تەڵاق بە شتێکی چاوەڕواننەکراو دەزانن، هەچەن نوێژ حەقوڵڵایە و نیکاح و تەڵاق حەقوناسە، ئەو حەقوڵڵایە لە پاش حەقوناس هاتووە و بەیان کراوە کەچی نەختێک پاش ئەو باسە حەقوڵڵایە بابەتی حەقوناس وەک باسی عیددەی وەفات و تەڵاق و کارەکانی مەڕبووت بە تەڵاق دێنەوە ڕوو باسیان دەس پێدەکاتەوە دەردەکەوێ کە ئایەتی ٢٣٨ و ٢٣٩ لە بابەت دابەزینەوە پێش کەوتووە لە سەر ئایەتەکانی ٢٣١ و ٢٣٦ و ٢٣٧ بابەتی ئەحکامی تەڵاق. ئەمما دە تیلاوەت و خوێندنەوەدا وەئاخر کەوتووە. بە هەر حاڵ زانایانی قورئان داوەڵۆزی ئەوەن بزانن هۆی ئەو فاسیلە کەوتنەیەی ئایەتی ٢٣٨ و ٢٣٩ لە نێوان عیددەی وەفات و ئەحکامی تەڵاقدا چییە؟

دێرەدا بوخاری و تەبەری و زەیدی کوڕی سابیت فەرموویانە پێغەمبەرﷺ نوێژی نیوەڕۆی دە کاتی شیددەتی گەرمای سووتێنەر و لادانی ڕۆژ لە خەتی ئیستیوادا بەجێهێناوە، ئەو نوێژە بەو شێوە قورسترین نوێژ بوو لە سەر یاران، جا ئەو کارەساتە بەشێکە لە هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە، لەوەڕایە کە هەندێک کوتوویانە ﴿الصَّلاَةِ الْوُسْطَى﴾ نوێژی نیوەڕۆیە.

دە ڕیوایەتێکی دیکەدا لە زەیدی کوڕی سابیت نەقڵ دەکرێ کە پێغەمبەرﷺ نوێژی نیوەڕۆیەی دە کاتی زەواڵی ڕۆژدا لە خەتی ئیستیوادا دەیخوێند و لە پشت سەری ئەو بە غەیرەز یەک سەف یا دوو سەف زیاتر چاو نەدەکرا. هۆیەکەشی ئەوە بوو: خەڵک دە خەودا بوون و یا بە سەودا و معامەلە مەشغووڵ بوون و دەخافڵان، ئینجا خودا ئەو ئایەتەی دابەزاند.

دووبارە جگە لەوانەش شەش ڕاویە حەدیسەکان و زەیدی کوڕی ئەرقەم ڕیوایەتیان

کردووە: ئێمە دە دەورانی سەرەتای ئیسلام لە پشت پێغەمبەرەوە دە کاتی نوێژ خوێندنـدا دەگەڵ ئەوانەی لە تەنیشت یەکتر بووین دەدواین و قسەمان دەکرد، تاکوو ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿وَقُومُـواْ لِلَّهِ قَانِتِينَ﴾ واتە خۆبەکەمگرانە و ئەدەبانە بۆ خودا بوێستن. ئەدێرەدا بوو پێغەمبەرﷺ دەستووری داینێ بێ سەر و سەدا و بێ قسە دەگەڵ یەک کردن بین.

شەهید سەید قوتب لە مەڕ ڕاز و ڕەمزی ئەو بازدانە (لە ئایاتی ئەحکامی نیکاح و تەڵاق بۆ سەر ئایاتی نوێژی ترس و پاشان بادانەوە بۆ سەر ئەحکاماتی تەڵاق و عیـددە) فەرمـوویەتی بە پێـی نەزەر و بۆچـوونی خـۆی: ڕازی ئەو نێـوانەتیەی ئەحکـامی نـوێژ دە مـابەینی ئەحکـامی عیددەی وەفات و ئەحکاماتی تەڵاق دەبێ ئەوە بێ: ئامانجی قورئان تێگەیاندنی ئینسانە لەوەی کە بزانێ ئیتاعە کردنی خودای لە هەر بارودۆخێکدا بـێ عیبـادەتە، واتە هەروەک بەجێهێنـانی نوێژ بەو داب و دەستووراتەی شەرع بۆی داناوە عیبادەتە، بەجێهێنانی دابی نیکـاح بەو نەزم و دار و لەلەی شـەرع بـۆی دیـاری کـردووە و یـا بەڕێـوە بردنـی حـوکمی تەڵاق بەو شـەرت و مەرجانەی شەرع بۆی دامەزراندووە هەموویان عیبادەتن، جا لە سەر ئەو ئەساس و یاسـا ڕەوایە دەکرێ بکـوترێ: نـوێژ کە ڕابیتەیەکـی تـایبەتییە دەگەڵ خـودا و دەربڕینـی ڕاز و نیـاز و نـزا و پاڕانەوەیە لە بەر ئەو سووکنایی دڵە و سووکناییە بۆ ئەو دڵانەی کە بە هەر هۆیەک بێ ژنەکەیـان تەڵاق داوە و دڵ و مـاڵی خۆیـان وێـران کـردووە کە دەتـوانن بە ملاقـاتی خـودا تەم و غەمـی سەرچاوی دڵیان بڕەوێ و لاچێ و لەو لایەشەوە بۆ ئەو کەسـانەی نیکـاح دەکەن واتە ژن مـارە دەکەن، لە سـۆنگەی ئەو نـیعمەتە پـڕ لەززەتە و دامـرکێنەری ئـاوری بەتینـی هەوا و هەوەس و دامەزرێنەری دێوی سەرکێش و سەرەڕۆی نەفسی بەگوڕ و تین، دەس کا بە شـوکر و سـپاس و حەمد و عیبادەتی نوێژ.

بە کورتی و بە کوردی: دەبێ هێز و کێشی خاوخێزان و گیروداری باری ژیان نەتوانێ ئەو دیاریەی گەورەی خودادادیمان وەک عیبادەتی نوێژ بێ لێ بقرتێنێ و لێ بستێنێ.

خاوەنی تەفسیری (المنار) فەرمـوویەتی: هەدەف و ئامـانج بە سـەڕاحەتی ئـایەتی ٢٣٨ی بەقەرە نوێژە بە گشتی، و مراد بە ﴿الْوُسْطَى﴾ فەزیلەتەکانی نوێژە وەک دڵ گۆڕ و ئاوەدان و پاک و خاوێن بۆ میوانی خودا.

ئەمنیش دەڵێم دڵ کاتێ کەوتە بازران و هەڵدێران بە تەرت و تەلان و تەراشی باری ژیـان و باری کۆمەڵایەتی دەتوانێ بە لکی داری بەرز و پڕ بەری نیعمەتەکـانی ئـارامش و حەسـانەوە و

هیوا و ئومێدی دوارۆژ وەک عیبادەتی نوێژ بێ، بگیرسێتەوە و خۆ وەگـرێ، هـاتن و دابەزینـی ئایەتی ٢٣٨ی بەقەرە لە بابەت نوێژەوە دەو حـاڵەتەدا واتە لە دووی ئـایەتی ٢٣٧دا هەر ئەوە بـێ هۆیەکەی. و هەروا نوێژ کردن دە کاتی ترس و سەخڵەتی هۆیەکەی دەبێ هەر ئەوە بێ: لە خودا غافڵ مەبە و پشت بەوی ببەستن، چونکە چاترین و بەهێزترین حافز و پـارێزەر هەر ئەوە و هەر ئەوە. جا بۆیە خودای زانا و ئاگا لە دڵان و هەستی دڵان دە شەڕ و هەراشدا فەرموویەتی نـوێژو لە بیر نەچێ. واتە خوداو لە بیر نەچێ.

دیارە هەر وەک لە پێشدا ڕامانگەیاند کە نەختێک پاش باس‌کردن و بەیانی نوێژەکانی کـاتی ترس و لەرز دەگەڕێینەوە سەر باسی ئەحکاماتی وەفات و باقی ئەحکامەکانی تەڵاق و وەفـات و وەسیەت و ...

لە سەر ئەو یاسا و دەستووراتە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٤٠ی بەقەرە:

﴿٢٤٠﴾ وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيَ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ

**ئەوانەتان کە دەمرن و ژنەکانتان بەجێ‌دێڵن دەبـێ هەر لە سـەرەمەرگا سـەبارەت بە ژنەکانتـان وەسیەت بکەن هەتاکوو یەک ساڵی ڕەبەق بیانژیەنن و لەوماڵەشدا وەمێـنن و دەریـان‌نەکەن. بەڵام ئەگەر هاتو بە وازی خۆیان ڕۆیشتن و دەرچوون، دیارە ئێوە تاوانبار نابن و نـین، ئەگەر هاتو بە شێوەیەکی ڕەوا و شیاو، خۆی ڕازاندەوە بۆ مشتەرییان و خوازبێنیکەران، دیارە خودا زاڵ و کاربەجێیە.**

## وەسیەتی مێرد بۆ ژن

### تێڕوانین و ئاوڕ وەسەر دانەوەیەک:

خودا ئامۆژگاری دەکا و دەدا بە ئینسان کە ئەو کـاتەی دێ دەمـرێ و یـا دە هەمـوو کـاتی ژیانیدا لە بابەت ئەو ژنانەی کە لە پاش خۆیان بەجێیان دێڵـن بە وەسـیەت و ئامۆژگـاریەکی وا کەزەرەری نەبێ بۆ واریسانی دیـکەی، کە ئەو ژنـانەی بەجـێ دەمێـنن بەخێویـان بـکەن تـاکوو ساڵێک، بێ ئەوەی حاڵێکی وایان بۆ بێننە پێش کە دەریانکەن. واتە ئەگەر مێـرد مـرد و ژنەکەی ویستی پاش چوار مانگ و دە شەوی عیددەکەی هەر وەمێنێ لە مـاڵە مێـردەکەی، دەریـنەکەن. ئەمما ئەگەر هات و ئەو ژنە بە وازی خۆی ویستی بڕوا و ڕۆیـی، ئەوە دەوەیـدا هـیچ گونـاه و تاوانێک نایەتە ئەستۆی ئێـوەی واریـس و کەس‌وکارەکـانی مـردوو، لە بـابەت ئەو ڕۆیشـتنەی

ژنەکان، کە خۆیان جوان دەکەن بۆ مشتەری و خوازبێنیکەران، دیارە خوداش ئاگاداری هەمـوو نیەت و هەڵوێستێکی ئینسانە و قازانجی ئینسانیشی دەوێ.

## عیددەی ژنی مێرد مردوو

ئەو ئایەتی ٢٤٠ی بەقەرە کە لە بارەی وەسیەتی مێرد بۆ ژنی پێش مردنی نازڵ بووە، گۆیا بە پێی ڕا و بۆچوونی کۆی زانایانی قورئان، سـێ ڕێگایـان دەگـرێتە بەر خـۆ، ورد بـڕوانە لە سـێ ڕێگاکان تاکوو تێیدا هەڵە نەیەتە پێشێ:

١. جمهوور دەڵێن: ئەو ئایەتی ٢٤٠ی بەقەرە حوکمەکەی مەنسـووخە، واتە شـۆراوەیە. لە سەر ئەو ئەساسە وا دەڵێن جمهوور: عیددەی وەفاتی مێرد لە سەر ژنانی بەجێماو لە سـەرەتای ئیسلامەوە بە پێی داب و باوی گەلی عەرەب یەک ساڵ بووە، پاشان کە یاسـای ئیسـلام پەرەی ساند ئەو دابە عەرەبیە جاهیلەیە بە پێی دابەزینی ئایەتی ٢٣٤ی بەقەرە و هەروا ئایەتی میـرات کە دە سوورەی نیساءدا ئایەتی ١١ دابەزیوە، عیددەی ژنانی مێرد مـردوو گەڕا بە چـوار مانـگ و دە شەو، لە سەر ئەساسی ئایەتی ٢٣٤ کە دە خوێندنەوەدا پێش کەوتووە، بەڵام بە پێـی دابەزیـن لە ئاخرە، ئەو حوکمە یەک ساڵەیەی شۆراوە.

گۆیا پرسیار لە ئیبنیجەریری تەبەری دەکرێ لەو بارەوە ئەویش بە نەقـڵ لە هومـام کـوڕی یەحیا نەقڵ دەکا لە بابەت ئەو ئایەتی ٢٤٠ی بەقەرە، دە وەڵامی پرسیارەکەدا ئاوای فەرمـووە: لە ڕابردوودا یاسای عیددەی ژنی مێرد مردوو ئاوا بوو کە مێرد دەیکرد ئەگەر ژنەکەی دە ماڵە مێردە مردووەکەیدا دەماوە و نەدەوڕیی، پاش چوار مانگ و دە شەوان، ئەوە تـا یەک سـاڵی ڕەبەق لە سەر خەرجی ماڵە مێردەکەی ڕایدەبوارد بە خەرجـی نەفەقەی جلـگ و جێوبـانەوە، پاشـان ئەو حوکم و یاسایە بە ئایەتی ١١ سوورەی نیساء شۆراوە. بەشی ژنانی مێرد مردووی تەعین کـرد لە ماڵی مێردی مردوو بەو شێوەیە: یەک هەشـتوم لە مـاڵی بەجێمـاوی مێـرد بـۆ ژن، ئەگەر ئەو مردووە حەولادی بێ؛ دەنا یەک چوارم ئەگەر مێردی مـردوو حەولادی نەبـایە و عیـددەی ئەو ژنەش چوار مانگ و دە شەوە.

٢. نەزەر لەو بـارەوە واتە لە بـارەی حـوکمی ئـایەتی ٢٤٠ لە بـابەت عیـددەی یەک سـاڵ مـانەوەی ژن دە مـاڵی مێـردی مردوویـدا کە عولەمایـانی جمهـوور فەرموویـان ئەو حـوکمە مەنسووخە، مجاهد و ابومسلم اصفهانی، کە لە موفەسـرانی ڕابردوون نەزەریـان ئـاوا داوە: کە ئەو حـوکمی ئـایەتی ٢٤٠ی بەقەرە سـابیتە و مەنسـووخ نیـیە کە ئـیمام فەخـرەدین ڕازیـش دە

تەفسیری خۆیدا هەر وای ئاماژە وەلا کردووە کە ئەو حوکمە سابیتە.

مجاهد لە سەر نەزەری خۆی کە پێی وایە مەنسـووخ نیـیە و بەڵـکە سـابیتە دەڵـێ: بە پێـی کوتەی تەبەری عیددەی وەفاتی ژنی مێرد مردوو دوو ئایەتی لە سـەر دابەزیـوە یەکیـان ئـایەتی ٢٣٤ی بەقەرەیە کە چوار مانگ و دە شـەوی دیـاری کـردووە، ئەوی دیکەشـیان ئـایەتی ٢٤٠ی بەقەرەیە کە بە پێی حوکمی ویش یەک ساڵە عیددەی ژنی مێـرد مـردوو. دەبـێ بڵێـین هەر دوو حوکم سابیتن و مەنسووخ نین، بەو دەلیلە: هەر یەک لەو دوو حوکمە لێک جیـاوازانە حـاڵەتی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەو بەو شێوەیە:

١. ئەگەر ئەو ژنە مێرد مـردوویە بمێنێـتەوە دە مـاڵە مێـردە مردۆکەیـدا، لە لای واریسـان و کەس‌وکاری مێردی مردوو، و کەڵک لە نەفەقە و خەرج و خـۆراکی وان بکـا، ڕاسـتە عیـددەی یەک ساڵە، واتە تا یەک ساڵ نابێ و ناتوانێ مێردی دیکە بکاتەوە و هەروا واریسـانی مـردووش نابێ دەریکەن.

٢. ئەگەر ژنی مێرد نەماو نەیهەوێ دە ماڵی مێردی مردوویدا وەمێنێ، بەڵـێ ئەوە عیـددەی چوار مانگ و دە شەوە، واتە ئەو ماوە عیددەیە تێپەڕ نەکا ناتوانێ مێرد وەکا.

ئەوجار ابومسلم اصفهانی لە سەر نەزەری خـۆی ئەویـش وەک ئاغـای مجاهـد بەیانێـک دەردەکا و ڕایدەگەیێنێ، ئاوا: مانا و تەعبیری ئایەتی ٢٤٠ی بەقەرە ئاوایە: ئەوانەی دەمـرن و بـۆ ژنەکانیـان بە شـێوەی وەسـیەت نەفەقە و جێوبـان و بـاقی خەرج و مخـاریجی یەک سـاڵ بـۆ ژنەکانیان ڕادەسپێرنە واریس و کەس‌وکاریان، کەوایە ژنی مێردی مردوو دەتوانێ تـا یەک سـاڵی بە پێی وەسیەتی مێردەکەی دە ماڵێدا وەمێنێ و مێرد نەکاتەوە. جا بە ناوی عیـددە و یـا بە نـاوی وەسیەتی مێردی. جا ئەگەر هات و ژنەکانیان ئاوڕیان وەسـەر وەسـیەتی مێردیـان نەداوە پـێش ئەوەی ماوەی ساڵەکە تەواو کەن بە وازی خۆیان ڕۆیشتن لە ماڵە مێردەکەیان، دەبـێ بە واجبـی چوار مانگ و دە شەوان عیددە بکێشن و بیبەنە سەر، ئەوکات واتە پاش تێپەڕ کردنـی ئەو مـاوە چوار مانگ و دە شـەوە بـۆ مێـرد کردنەوەیـان مانیعێـک نـایەتە پێشـیان. بەو دەلـیلە وەسـیەتی مێردەکەی لازم الاجرا نییە دێـرەدا چـونکە وەک ابومسـلم اصـفهانی ئامـاژەی وەلا کـردووە دە زەمانی جەهالەتی عەرەبیدا نەفەقەی یەک ساڵە و مەسکەن بۆ ژنان وەسـیەت دەکـرا و ژنەکەش دەبایە بەو پێیە تا یەک ساڵی تەواو دەبوو عیددەی ڕابگرتایە و مێردی نەکردباوە، دێرەدایە خودای تەعالا بە ڕوونی بەیانی فەرمـوو دە ئـایەتی ٢٣٤ی بەقەرەدا ئەو بەیانـاتەی خـودا ئەو دا بە یەک

ساڵی ڕەد دەکاتەوە. ژنە دەتوانێ پاش چوار مانگ و دە شەوان کە تێپەڕ بوو بە ناوی عیـددە، بە هەر کەس بـیەهەوێ مێـرد بکـاتەوە. کەوایە دەتـوانین لە سـەر ئەو ئەساسـە بڵێـین ئـایەتی ٢٤٠ نەشۆراوەتەوە، بەڵکە دەڵێـین: بـۆیە دابەزیـوە تـاکوو دە سـوورەتێکدا کە مێـرد وەسـیەتی کـرد عیددەی یەک ساڵەی ژنی مێرد مردو لە حاڵەتی ئیجباریدا وەلاکەوێ بۆ حاڵەتی ئیختیاری.

ئاوڕێک وەسەر جێیی ژنی مێرد مردوو تا ئەو چوار مانگە و دە شەوەی عیددە تێـپەڕ دەکـا. ئایا دەبێ لە ماڵی مێردەکەی ئەو ماوەیە بەرێتە سەرێ؟ یان هەر جێیەک بیهەوێ دەتـوانێ لەوێ بێ؟

١. حەنەفی و شافعی و ئەحمەد کوڕی حەنبەل کوتوویانە واجب نییە لە مـاڵی مێـردەکەی ئەو ماوەیەی بەرێتە سەرێ، بەڵکە هەر جێیەکی وازی لێ بێ، دەتوانێ، مەگەر مـاڵە ئەو کەسـە نەبێ کە بیهەوێ مێردی پێ بکاتەوە و مەشهوور بێ.

٢. مالکی دەڵـێ: شـوێنێکی کە مڵکـی مێـردەکەی بـێ و یـا ئیجـارەکراوی پـێش مردنـی مێردەکەی بێ، حەقی نیشتەجێ بوونی دەوێدا هەیە تاکوو عیـددەی بە سـەر دەچـێ، دەنـا هەر شـوێنێک وازی لـێ بـێ بـۆ وی مەبـاحە. و هەروا ئـیمام مالـک دەفەرمـوێ مـوتعە بـۆ ژنـی تەڵاقدراوی جیماعدەگەڵ کراو پێویستە. بەڵام شـافعیەکان کوتوویـانە مـوتعە بـۆ هەر ژنێکـی تەڵاقدراو چ دخوولی پێ کرابێ چ نەکرابێ، واجبە.

## چوار حاڵەتی ژنانی تەڵاقدراو

بە کورتی و بە کوردی ژنانی تەڵاقدراو چوار حاڵەتیان بۆ دانراوە:

١. ژنانی تەڵاقدراو کە دەگەڵیان جووتبوون کرابێ و مارەشی دیاری کرابێ، ئەوە هەموو مارەییەکەی هەیە.

٢. ئەو ژنانەی جیماعیان دەگەڵ نەکراوە و مارەییان دیاری نەکراوە و تەڵاق دەدرێن مێرد بە پێی توانا موتعەی لە سەرە بیداتێ.

٣. ئەو ژنانەنی مارەییـان دیـاری کـراوە و جیماعـی دەگەڵ نەکـراوە و تەڵاقدراوە نیـوەی مارەیی هەیە بە دەلیلی ئایەتی ٢٣٧ی بەقەرە.

٤. ئەو ژنانەی جیماعیان دەگەڵ کراوە و مارەییان دیـاری نەکـراوە و تەڵاق دەدرێـن ئەوانە مافی (مهر المثل)یان هەیە بە دەلیلی ئایەتی ٢٤ی نیساء. ئێرە جێـی سـرنج و بەرجەوەنـدێکی ژیـرانە و ئینسـاف و ئیمانـانەی دەوێ، چـونکە سـیغە ئەدێـرەدا دۆزیویـانەتەوە و دەرخـواردی

عالەمێک دراوە.

ئەو باسە دەبایە لە سەر ئایەتی ٢٤١ هاتبایە بەڵام خۆی ڕە پێش دا.

ئەوجار دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٤١ کە دووپات کردنەوە و تەئکید کردنی حوکمی موتعەی تێدا چاو دەکرێ کە نەختێک لەوە پێش ئەگەر لە بیرمان مابێ کوتمان لە لایەن هەندێک لە زانایانی قورئان موتعە بۆ هەر ژنێکی تەڵاقدراو واجبە، هەواداری ئەو قسەن ئاغایانی: سعید بن جبیر و ابوالعالیه و زهری. و هەر ئەو ئایەتەی ٢٤١یش دەکەنە دەلیل لە سەر قسەکەیان:

﴿٢٤١﴾ وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ

**فەرزە لە سەر ئەو پیاوانەی کە ژنەکانیان تەڵاق دەدەن بە پێی توانا پارە و پووڵێکیان پێ بدەن. ئەئەوە ئەرکی سەر شانی پارێزکارانە**

## چاکە دەگەڵ ژنانی تەڵاقدراو

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە سیمای ئایەتی ٢٤١:**

کوتراوە دابەزینی ئەو ئایەتە دەبێ هۆیەکەی ئەوە بێ کە خودای تەعالا دە ئایەتی ٢٣٦ی بەقەرەدا لە پێشەوە فەرمووی: ﴿وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدْرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾ **واتە ئەگەر ژنتان تەڵاق دان، ئەوە دەبێ بۆ دڵنەوایی کردنیان پارە و پووڵێکیان بدەنێ، هەرکەس بە پێی دەوڵەمەندی و هەژاری خۆی، ئەوە ئەرکی سەر شانی چاکەکارانە.**

### موتعە

بە پێی کەڵک وەرگرتن لەو ئایەتە ٢٣٦ کابرایەک کە ژنەکەی تەڵاق دابوو بەو شێوەیەی ئەو ئایەتە ئیشارەی وەلا کردووە، لە بابەت موتعەکەی دەیکوت: وازم لێ بێ دەیدەم، وازم لێ نەبێ نایدەم. لە سەر ئەو وازوازییەی، خودای تەعالا ئەو ئایەتی ٢٤١ی دابەزاند، بەرهەمی ئایەتەکەش ئەوەیە: هەر کەس پەرهیزکار بێ لە سەری ئەرکە ئەو موتعەی بدا بەو ژنانەی بەو شێوەیە تەڵاق دەدرێن. بەشی زۆری قورئانزانەکان وەک سعید بن جبیر و ابوالعالیه و زهرا و شافعی نەزەریان وایە: هەر ژنێکی تەڵاق درێ بەو شێوەیە کوترا دەبێ مەتاعی بدرێتێ.

ئەگەر کابرایەک بڵێ: مەتاع بۆ دێرەدا واتە دە ئایەتی ٢٤١دا دووپاتە کراوەتەوە وەک دە ئایەتی ٢٣٦ی بەقەرەدا کوتراوە؟ لە وەڵامدا دەکوترێ: دە ئایەتی ٢٣٦دا حوکمی مەتاع حوکمێکی تایبەتی و خاسە، و دە ئایەتی ٢٤١دا حوکمی مەتاع حوکمێکی عامە. یا لە وەڵامی

کابرای پرسیارکەردا دەڵێین: مراد بەو موتعە یا مەتاع دەو ئایەتە ٢٤١ەدا نەفەقەیە خۆ دیارە کاتێ نەفەقە بە مەتاع هاتە گۆڕێ و خوێنرایەوە، ئەوە تیکرار نایەتە گۆڕێ، ئەو وڵامەش شایانترە.

ئەو ئایەتی ٢٤١ ئاخرین ئایەتی ئەحکامە دە سوورەی بەقەرەدا بەیان کرا ئەوجار لە پاش تێپەڕ کردنی باس و بەیانی ئەو ئایەتانەی کە خودای تەعالا لە بابەت خزمایەتی و تێکۆشانی ئیسلاح و ڕێکوپێکی خزمایەتی و خاووخێزان کە کڵ و بنچینەی ژیانی دنیایەن، فەرموونی و بە ئینسانی ڕاگەیاندن بە تێر و تەسەلی، ئەوجار خودای بانی سەر دەیهەوێ دەستوورات و حوکمەکانی غەزا (بە زمانی عەرەبی واتە جهاد)مان بۆ باس بکا و بەیانی بفەرموێ. ئەساسی ئەو جیهادەش بۆ پارازتن و پارێزگاری لە بیر و باوەڕ و عەقیدە و ئاگاداری و دیفاع لە ئایین و موقەددەسات و ئەمنیەت و کەرامەتی ئینسانە چونکە ئەوە بێ گومانە پارازتنی دین و ئایین و خاک و ئاو و وڵات و کەرامەت و مافی ئینسانی نیازی تەواوی بە دیفاع و جیهاد هەیە. بێ دیفاع و جیهاد هیچێک لەوانە ناپارێزرێن و دەستی خراپی دوژمنانیان لێ قەتع ناکرێ. جا ئەدێرەدایە کە خودا بۆ ژیانێکی ئەمن و ئەمان و پڕ لە کەرامەت و عیززەت و شەرەف، غەزای دانا واتە دیفاع و بەربەرەکانی دەگەڵ دەسدرێژکەران و یاغی و زۆردار و مافخۆران.

جا پێش ئەوەی بنچینەی سەر ئایەتی جیهاد ئاگادارییەکی خودا لە سەر شوکر و سپاس و ستایشی ئەو لە بابەت حاڵی کردنمان بە تێروتەسەلی لە سەر ئەحکاماتی باری کۆمەڵایەتی و خزمایەتی ئایەتی ٢٤٢ دەخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

**﴿٢٤٢﴾ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ**

**بەوشێوەیە خودا ئایە و بەرنامەکانی خۆی بۆ ئێوە ڕوون دەکاتەوە، بەو هیوایەی ئەقڵ و هەست و بیر و شعوورو بخەنە گەڕ و کار.**

**ئاوڕدانەوەیەک و تێڕوانینێک لەو بارەوە:**

واتە خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم بە شێوەیەکی وا شیاو ئایات و نیشانەی ئەحکامەکانی خۆی بۆ ئێوە ئاشکرا و بەیان دەکا، کە هەموو کەڵک و بەهرە و ڕازەکانی خۆیان دەگەڵ باس دەکا، و هەموو پەند و ئامۆژگارییەکانی کە ڕادەگەیێنێ بۆ ئێوەی ئینسان، ڕاز و مەبەستەکانیشی دەگەڵ ڕادەنێ. کە وایە دەتواندرێ بکوترێ: خودا حەکیمە واتە حەکیمێکی وایە کە بۆ هەر دەردێک دەوای تایبەتی دەردەکەی پێ دەدا و نیشان دەدا. جا کە وایە ئەی ئینسان لاڕێ مەبە و مەڕۆ، ژیرانە و حەکیمانە دەگەڵ ئەحکامەکانی خودای وا حەکیم و عەلیم

وەجووڵێن و هەڵوێست بگرن.

دەبێ ڕازی ئەوە بزاندرێ و بەرهەمی لێ وەرگیرێ کە بۆچی خودای تەعالا پاش هەندێک باس لە ئەحکامەکانی خۆی واتە شێوەی هەڵسوکەوت دەگەڵ خاووخێزان و کۆمەڵایەتی ئەوجار هات بە وردی بەسەرهاتی گەلانی ڕابوردوو بۆ گەلانی ئێستێ و داهاتوو باس دەکا و نیشان دەدا. دیارە ئەوە دەبێ بە هێند بگیردرێ چونکە کار و ئیشەکانی خودا سەرسەری و بێبەراوەرد نین، بەڵکە هەموو سەر و بنی شتەکە لێک دراوەتەوە جا ڕاگەیێندراوە. تەماشا ئاگادارییەکانی خودا، ڕاستەوخۆ پێت دەڵێ: ئەوە دوژمنتانە، ئەوە پێو دۆستە، ئەو شێوە ڕەفتارانە خەتەرە بۆتان، ئەو شێوە هەڵسوکەوتە قازانجە بۆتان، واتە هەچی پێتان دەڵێ: ڕاستەوخۆ و بێتوێکڵە، جا هەر ئەوەشە کە بە ئایەتی ٢٤ ئەنفال هاوارمان لێ دەکا و دەفەرموێ پێمان: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَجِيبُواْ لِلّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُم لِمَا يُحْيِيكُمْ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ وَأَنَّهُ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ واتە ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕیتان بە خودا هێناوە، ئەگەر خودا و ڕەسووڵی **خودا بانگیان کردن (بە وەسیلەی ئایەتی قورئان) بۆ ئیش و کاروبارێک کە ئەو بانگەوازەشتان بۆ ئاگاداری و زیندوو بوونەوەتان دەکا، وەڵامیان بدەنەوە و بە دەنگیانەوە بچن و بڕۆن، بەبێ گومان بشزانن خودا دەبێتە بەرپرس لە نێوان ئینسان و دڵیان، بێ گومان کۆبوونەوە و لێک خڕبوونەوەش هەر لە لای ئەوە و بۆ لای ئەوە.**

ئەو ئایەتە ئامۆژگارییە و هەموو ئامۆژگارییەکانی دیکەی خودا ئاماژەیە وەلای ئەوەی خودایەکی کە بەسەرهاتی هەموو گەلانی ڕابردوو و ئێستێ و داهاتووشی لە لایە و دەزانێ، ئەوەشی زانیوە و دەزانێ کە زۆر لە موسوڵمانان تووشی ئەو نەخۆشی و نەدامەتیانە دەبن کە جوولەکەکان تووشی بوون و ئەو موسوڵمانانەش ئەگەرکوو لە خۆ وریا نەبن، وەک ئەوان ڕۆژێک دێ لە ئایین و دینەکەیان لادەدەن بە هۆی سەرەڕۆیی و لاساری و ئاوڕ نەدانەوە وەلای قورئان و پێغەمبەر، بە نەزانی تووشی سەرسمدان و هەڵەنگوتن دێن و تێک بەردەبن و دەکەونە یەکتر کوشتن و بڕین. جا بۆیە خودای تەعالا و حەکیم لە هەر شوێنەی بەسەرهات و سەرگورشتەیەک ڕادەنێ و دەگێڕێتەوە بۆ وەی ئێوەی موسوڵمان دەرسی لێ وەرگرن، جا ئەدێرەدا ئێستێ دوو بەسەرهات و سەرگورشتەی جوولەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە بە وەسیلەی ئایەتەکانی ٢٤٣ و ٢٤٤ بۆوەی دەرسیان لێ وەرگرین.

﴿٢٤٣﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ اللّهُ مُوتُواْ ثُمَّ

**أَحْيَاهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَشْكُرُونَ**
**ئایا ورد نەبوویتەوە بە چاکی و دەنگ و باس و بەسەرهاتی ئەو کەسانەت پێ نەگەیشتووە کە دە کاتێکدا هەزاران کەسیش بوون و لە ترسی مردن لە زێدی خۆیان هەڵاتن، ئینجا خودا فەرمووی بمرن، پاشانیش خودا زیندووی کردنەوە، بێ گومان خودا خێر و بێر و چاکەی زۆر دادەڕژێتە سەر خەڵک، کەچی بەشی زۆریش شوکر و سپاسی خودا و نیعمەتەکانی خودا ناکەن.**

## ترسان لە مەرگ

### تێڕوانین و ئاوڕدانەوە بە هەستەوە وەسەر سیمای ئایەتی ٢٤٣:

ئەی گەلی موسوڵمان و خاوەن باوەڕ! ئەرێ ئێوە هیچ ئاوڕ نادەنەوە وەلای ئەو کەسانەی کە لە ترسی مەرگ و نەمانی خوێڕی‌گەرانەیان و خۆش‌گوزەرانی خۆیان لەو خاکی پاکی باب و باپیر و کەسانیان هەڵاتن و دەرچوون؟ و ئەو پەندە پێشینەیان خستە پشت گوێیان کە کوتوویانە: سەردانان ئابڕوومەندانەیە دە ڕێگای دیفاع و پارازتنی نیشتمان؛ بەڵام نیشتمان‌دانان هەم سەردانانە وهەم کەڕامەت و شەڕەف؟

ئەرێ ئەی خاوەن باوەڕەکان! بۆ بەبێ کێشە و هەرا ئەو نیشتمانەیان دایە دەستی دوژمنی بێبەزە؟ دەگەڵ ئەوەی ئەوان دوژمنانە هەر خاوەنی یەک لەش و گیان بوون و ئەو موسوڵمانانەش هەر خاوەنی لەش و گیان بوون! دەگەڵ ئەوەی ئەوان کەمیش بوون و موسوڵمانەکانیش زۆر! وەک خودا دەفەرموێ: ﴿وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ﴾ واتە ئەو خاک و نیشتمان چۆڵکەرانە هەزاران کەس بوون و دەیانتوانی زۆر بە چاکی بەرهەڵستی دوژمنانیان بوێستن و وریایی نیشتمانی خۆیان بکردایە. بەڵام ئەوە زۆر ڕوون و ئاشکرایە و حاشا هەڵنەگرە و لە هەموو کەس‌ڕا دیارە کە بەبێ تەقە و ڕەقە وڵاتیان دایە دەس دوژمن و نامەردیان بۆ خۆیان تاپۆ کرد، ئی ترسان لە کوشتن بوو، وەک خودای ئاگا بە هەستی دڵان دەفەرموێ: ﴿حَذَرَ الْمَوْتِ﴾ واتە وایان بردبووە خەیاڵ و مێشکی خۆیانەوە ئەگەر بە گژ دوژمنیاندا هاتبانەوە و دیفاعیان لە خۆ و کەڕامەت و مافی خۆیان بکردایە دەکوژران. جا ئەو کردەوە نامرۆیانە و ناکەسانە دەبێ هەموو کەس بە دەرسی وەربگرێ و نەیهاوێتە پشت خەیاڵەوە و نەیخاتە پشت گوێ. چونکە ئەو دەستوور و ئەمری دینە: (دیفاع لە ناموس و کەڕامەت و نیشتمان) ڕوکنێکە لە دین و ئیمان. عەکسەکەشی: واتە کەڕامەت فرۆشتن و وڵات بەرەڵلا کردن و خۆ خوێڕی

کردن نیشانەی بێئیمانییە.

## چۆڵ کردنی نیشتمان خوێڕیانەیە

دەتواندرێ بکوترێ دەستووری خودایە لە دنیای تەکلیف و ژیانـدا هەر هـۆز و نەتەوەیەک نیشتمانی خۆی ئەپارێزێ و دە بەرابەر دوژمنانی داگیرکەری وڵاتی شێرانە و ڕۆڵانە ڕائەوەستێ، نەک بە ناپیاوانە وڵات بدۆڕێنێ و بە پارە و بەرات دەست دانەوێنێ لە پارازتنی وڵاتی، ئەوە ئەو کەسە مردووە و زیندوو نییە، چونکە گەلی بێ سەربەست واتە گەلی ژێردەست، هیچی نیـیە و هیچی ئی خۆ نییە، نە خاک و نیشتمان و نە نـامووس و گیـانی، نە مـان و نە نەمـانی، چـونکە خۆی بە هەموو شـتێکەوە فرۆشـتووە بە دوژمـن. جـا بـۆیە خـودای ئاگـا بە نـیەت و بـاوەڕی دەروونەوە دێرەدا بەبێ ویسـت پێیـان دەڵـێ بەو کەسـانەی لە ترسـی مـردن و لە دەسچـوونی خۆشگوزەرانی، دیفاع ناکەن و بەرەنگاری دوژمن نابن.

﴿فَقَالَ لَهُمُ اللَّهُ مُوتُواْ﴾ واتە خودای حەکیم پێی کوتـوون جـا کە وایە بمـرن تـاکوو دوژمـن دەس بە سەر ماڵ و مڵک و ناموستان داگرێ، خوێنتان بمژێ و هێزتان دە بەردا نەهێڵێ و نـاو و نیشانتان دە سەفحەی دنیای بەشەریەتدا وەکووژێ و بشواتەوە، کەسی ئاوا بێ ناو و نیشان و بێ فەرهەنگ، مردوویە بێ گومانە.

ئەمما با ئەوەش وەبیر بێنینەوە کە دە نـاو هەر هـۆز و نەتەوەیەکـدا کەڵەپیـاوان و مرۆیـانی بەهەست و بەویقار و گورجوگۆڵی ڕۆژی مەیدان هەن و نامرن و هەدا نادەن و سەر بـۆ خـودا نەبێ بۆ کەس دانانەوێنن، جا ئەو کەڵەپیاوانە کاتێ کە دیتیان وڵاتی وا کەوتۆتە دەس دوژمـن و داگیـری کـردووە و هەروا وردەوردە خەریکـی تـاپۆکردنی فەرهەنـگ و نـامووس و کەڕامەتـی گەلەکەیەتی، وەک شێرێکی تووڕە و قەڵس بێچووخوراو لە لانەی دەردەپەڕێ و شاڵاوان دێنـێ و ڕاماڵان دەبا و هێرشان دەکا، لە هەموو لاوە وێدەپڕژێ و تێدەکۆشێ کە هەستەی ئینسـانیەت و مافی ئینسانی کە تاوێستا مردووە و گنخاندوویانە لە ناو دڵی گەلەکەیدا وەیژێنێ و زینـدووی کاتەوە، بە تەواوی هەستیەوە بێ باک و بـێ ترسـانە تێدەکۆشـێ گەلێـک یەکدڵ و یەکبیـر و یەکئامانج وێکخا و ڕێکخا. سـەرئەنجام ئەو مـرۆ شـێرەپیاوانە بە هەسـتی پاکیـان و بە نیەتـی ڕاست و دروستیان، گەل دەکەنە یەکپارچە و زیندووی دەکاتەوە، وردەوردە پشتی دوژمنیان پـێ چۆڵ دەکا و دەستیان پێ لە دوژمن هەڵدەگرێ. بە ناوی گەلێکی زیندوو دێنەوە مەیدانی بـوون و دنیاش ئیقراریان بە بوون دەکا. دیارە ئەوەش با بڵێین تا گەل دەگاتە ئەو قۆناغە پێی بکـوترێ:

هەیە و زیندووە و نەمردووە و نامرێ، هەزاران هەزار قوربانی و خوێن ڕژتنی دە پێناودا دەبێ بدرێ و بڕژێ. وەک ئەوڕۆی نەتەوەی کورد.

جا ئەدێرەدایە کە خودای تەعالا بە عینوانی مزگێنی و دەرس لێ وەرگرتن دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَحْيَاهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَشْكُرُونَ﴾ واتە پاشانیش زیندووی کردنەوە، بێ گومان خودا خێر و بێر و چاکەی زیادە دەڕێژێت بە سەر خەڵکیدا، کەچی زۆربەی خەڵکیش سوپاسی خودا ناکەن.

یانی خودای خاوەن بەزە چەن ساڵێکی دوور و درێژ ئەو گەلی وا مردوو دە ژێر ڕکێف و چەکمەی دوژمنی زۆردار و بێبەزەدا مابوونەوە، خودا بە وەسیلەی پیاوانی لێهاتوو و هەڵکەوتەی دەوران هێنانیەوە گیان و ژیانی ئینسانانە، بەو شێوەیە دنیا ددانی نەتەوەیی و زیندوویاتی پێدا دێنان و دەبوونەوە خاوەنی ئاو و خاک و وڵاتی سەربەخۆ. ئەو جەریان و کارەساتانەش ئەوەمان پێ دەڵێن و فێرمان دەکەن: هەموو شتێک بە پێی دابی خودا تاکوو تین و ئێشی نەگاتێ، ناتەقێتەوە و وەخۆ ناکەوێ، و هەر نەتەوە و گەلێک لەو بارەوە زیاتری چەرمەسەرە دیبێ، وشیارتر و ژیرانەتر تێدەکۆشێ ڕزگاری و سەربەخۆیی دەستی، هەروەک خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم ئاماژەی وەلا فەرمووە بە وەسیلەی ئایەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ﴾ واتە خودای مەزن خاوەنی چاکە و هیدایەت و بەخششە بە سەر ئینسانەوە کە وا ئێش و چەوسانەوەی دەورانی بۆ کردونە مایەی وەخەبەر هاتن و ڕاپەڕین بەرەو ڕزگاری و سەربەخۆیی، ئەمما زۆر هەن کە بە هەموو زەجر و بێحورمەتی دوژمن ڕازییە و هەر سەر دادەخا و وەخەبەر نایە و ڕاناپەڕێ و سپاسی خودا بکا وەک خودا ئیشارەیان وەلا دەکا بەو ئایەتە ﴿وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَشْكُرُونَ﴾ واتە زۆر کەس سپاسی خودا ناکا لە سەر نیعمەتەکانی خودا و دەکاریان ناکا و ناهێنێ. وەک ئەقڵ و هەست و کەرامەت، .واتە هەزاران پەتپەتێن و پێدادانی بە سەر بێ لە ویژدانی ناگەڕێ لێی وەخۆ کەوێ.

بە زاهیری شێوەی ئایەتی ٢٤٣ لە لەفزی ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ وا دەردەکەوێ کە خودای تەعالا ڕووی دە پێغەمبەر بێ، بەڵام دە واقیعدا خودا دەگەڵ پێغەمبەر و ئۆمەتی بێ، وەک زۆر شوێن هەیە لە قورئاندا ئاوا کە ڕووی خیتابی دە پێغەمبەر بێ و مرادیش عالەم بێ، بۆ نموونە: ئایەتی ١ی سوورەی تەڵاق: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء ...﴾.

## چەند ڕیوایەت لە سەر ئایەتی ﴿إِلَى الَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَارِهِمْ﴾

ئەو ئایەتی ﴿إِلَى الَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَارِهِمْ﴾ چەن ڕیوایەتێکی لێ چاو دەکرێ:

١. یەک لەو ڕیوایەتانە ئەوەیە: ئەو جەریان و کارەساتە واتە هەڵاتن و ڕۆیشتنی ئەو قەومە دە زەمانی بەنیئیسرائیلیاندا بووە، گۆیا عالەمی دێیەک بە ناوی داوردان کە لە یەک فەرسەخی شاری «واسطه»دا بووە، و یا خەڵکی شاری ««اذرعات» شامی بوون کە ئەو دێیە دەردی تاعوونی تێدا بووە کە لە ترسی ئەو دەردی تاعوونە خەڵکەکەی هەڵاتوون، دە حاڵێکدا کە ئەو خەڵکە دەیانکوت هەڵدێن بۆ وڵاتێک مردنی تێدا نەبێ کەچی دەو هەڵاتنەدا ڕووبەڕووی دوژمنێک هاتن کە هەموویان لە ناو بردن. یا دەڵێن ئاوایە کارەساتەکە: تەواو خەڵکەکە لەو شارە هەڵنەهاتن، هەندێکیان هەڵاتن و هەندێکیان مانەوە دە ناو شاردا. ئەوانەی دە ناو شارەکەدا مانەوە هەندێکیان مردن و هەندێکیشیان مانەوە، بەڵام هەر بە دەم نەخۆشیەکەوە بوون. پاش لاچوونی تاعوون ئەوانەی هەڵاتبوون خەبەری نەمانی تاعوونیان کە پێ زانیبوو هاتنەوە بۆ شارەکە و ئەوانەی وا لەوێش مابوون و نەمردبوون پێکەوە کەوتنە باسی ئەوەی: ئەوانەی لە ناو شار مابوون کە هەندێکیان لە ناو چوون و هەندێکیشیان بە نەخۆشی مابوونەوە کوتیان بە وانەی وا هەڵاتبوون ئەگەر ئێمەش وەک وە هەڵاتباین لە دەس ئەو تاعوونە نەجاتمان دەبوو، قەرار بێ ئەو کەڕەتەی تاعوون بێت، ئێمەش وەک خەڵکەکە هەڵدێین، کەچی دووبارە هاتنەوە ناو شارەکە و هەموویان هەڵاتن کە بە پێی هەندێک لە ڕاویان ئەو جەماعەتە هەڵاتووە سێ هەزار نەفەر بووە. و دەو ماجەرای هەڵاتنەیاندا کە دەکەونە چۆڵ و بیابانەوە فرشتەیەک لە نهێنیدا و فرشتەیەکی دیکەش هەر لە غەیبەوە هەر دوو فرشتە لەو لایان هەرایان ئاوا لێ دەکەن: هەمووتان بمرن، بەو هەرایە دەمرن هەموویان و لەشیان دادەڕزێنێ و تەواو دەبن. پاش مودەتزەمانێک پێغەمبەرێک بەوێدا ڕادەبرێت و چاویان دەکا، گۆیا ئەو پێغەمبەرەش ناوی حزقیل دەبێ کە یەکێک لە پێغەمبەرانی بەنیئیسرائیل دەبێ. کاتێ ئەوانەی ئاوا بە ڕزیوی و داتوڵاوی دی کەوتە فکر و هەستەوە: خودایە ئەوانە بە چ دەردێک ئاوایان لێ بە سەر هاتووە؟ خودای تەعالا ئیلهامی دا بەو پێغەمبەرە ئایا دەتهەوێ حاڵی بی لە حاڵیان و دەتهەوێ بشزانی چۆنیان زیندوو دەکەمەوە؟ پێغەمبەرەکە کوتی بەڵێ خودایە دەمهەوێ بزانم. خودا فەرمووی بە پێغەمبەرەکە دەی بڵێ: ئەی ئێسکەکان بە ئەمری خودا لێک وەکۆ بن. بەو هەرایە ئێسکەکانی لێک وەکۆ بوون. دووبارە خودا ئیلهامی دا بە پێغەمبەرەکە: دەی ئەوجاریش هەرا کە و بڵێ ئەی

ئێسکەکان گۆشت و خوێن وەخۆ کەن و دەخۆ کەن. ئێسکەکان ئەوەشیان ئەنجام دا. دووبارە خودا دەستووری دا بە پێغەمبەرەکە، ئەوجارەش بڵێ ئەی ئێسک و گۆشت هەستن و قسە بکەن. ئەوجار هەستان و دەیانکوت دەو حاڵەتە هەستانەیەدا (سُبحانَکَ ربَّنا و بِحَمدِکَ لا الـهَ الاّ أنتَ).

ئەوە تا ئێرە نەزەری هەندێک لە قورئانزانان و مێژووزانان بوو.

٢. ئیبنی‌عەباس دەڵێ: گۆیا پادشایەک لە پادشایانی هۆزی بەنی‌ئیسرائیل لەشکری خۆی بۆ شەڕ وەگەڕ دەخا و وەڕێ‌دەخا. لەشکرەکەش بە پێچەوانەی پادشا ناچنە سەر و نەهی دەکەن لە چوون بۆ شەڕی ئەو وڵاتەی شا دەستووریان پێ دەدا. دەڵێن چونکە نەخۆشی تاعوون و وەبای تێدا ئەو وڵاتە، واتە تاکوو ئەو تاعوونە لەوێ بێ ناچین. بە ئەمری باری تەعالا ئەو لەشکرە لەوێ دەمرن و چەن ماوەیەک لەوێ بە کەلاک دەمێننەوە. پاشان کە خەبەر بە بەنی‌ئیسرائیلیەکان دەگا و ئەوانیش دەزانن بەو مەرگە عاجایبە و لەناکاوە بە دەستەجەمعی، دێن بۆ وەی بیانبێژن. کاتێ دێنە لایان لە بەر بۆنیان عاجز دەبن و ناتوانن بیانبێژن. دادەمێنن و ڕادەمێنن لە کاری خودا واق دەمێنن دەوێستن بۆ وەی تا بۆنەکەیان هەوا و با ببیا و لاچێ. پاشان بێنەوە بیانبێژن، کەچی بە ئەمری باری پاش هەشت نۆ دە ڕۆژان زیندوو دەبنەوە و بەرەو یەک دێن لەو قەومەی گۆیا ئێستاش هەر هەن و ماون. (ئیمام فەخری ڕازی) ئەوانەی ئەهلی نەزەرن لە قورئانزانان بەو ڕیوایەتە ڕازیترن تا ڕیوایەتی هەوەڵ بەو دەلیلە کە ئایەتی ٢۴۴ی بە شوێندا دێ.

٣. ڕیوایەتی سێ لە سەر ئایەتی ﴿إِلَى الَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ﴾: حزقیل کە یەکێک لە پێغەمبەرانی بەنی‌ئیسرائیل قەومەکەی بۆ لای شەڕ دەعوەت دەکرد و تەشویق دەکردن. ئەمما قەومەکەی قسەکەیان پەسند نەدەکرد ولێیان وەرنەدەگرت، چونکە دەترسان لەوەی دە شەڕدا بکوژرێن و بمرن. خودای تەعالاش لە سەر ئەساسی حیکمەتی خۆی مەرگی بە گژدا کردن و مردن. ئەوانەی کە وێستا مەرگ وەبەر خۆی نەدابوون لە ترسی ئەوەی کە مەرگ نەبادا دایانبێتێ و بیانبا هەڵاتن لە ماڵ و وڵاتی خۆیان بەرەو وڵاتی بێ ترس ڕایانکرد. حزقیل پێغەمبەری بەنی‌ئیسرائیل کە ئەو حاڵ و جەریانەی چاو کرد و دیتی، پەژارە و ماتەمێک دایگرت و ڕووی کردە بارەگای پەروەردگار و کوتی: ئەی خوای یەعقووب پێغەبەر و ئەی خودای مووسا پێغەمبەر! خۆت تاوان و گوناهی بەندەکانی خۆت دەبینی و دەزانی،

کارێکی وا بکە ئەوانە گیانیان بێتەوە بەر تاکوو تەوانای تۆ بە چاوی خۆیان چاو کەن و لە دایـرە و جوغزی ئیتاعەی تۆ نەچنە دەرێ. دیارە خودای زانـا و دانـا بە نیەتـی ئینسـان دوعـا و نـزای حزقیل پێغەمبەری وەرگرت و گیانی هاویشتەوە بەریان.

ئەوەش ڕیوایەتی سێ بوو. ئەگەر دەشتەوێ لەو بارەوە زۆرتر تێوەچی و بزانـی، تەفسـیری کەبیری ئیمام فەخری ڕازی بگرە و بەری مەدە.

«قرطبـی» یەکـێکە لە قورئانزانـان و موفەسـری قورئـان، ئەوەی نەزەرە و قبـوولێەتی: دروستترین و نیزیکترین قەول لە ڕاستی ئەوەیە کە ئیبنیعەباس نەقڵی کردووە کە هۆی هەڵاتنی ئەو قەمە لە خاک و وڵاتی خۆیان نەخۆشی تاعوون بووە و پاش مردنی بەکۆمەڵیـان و زینـدوو بوونەوەیان بە ئەمر و فەرمانی باری داوا و پـاڕانەوەی یەکێـک لە پێغەمـبەران بـووە بـۆ خـاتری ئەوەی ڕێی ئیتاعەی خودا بگرنە بەر و تێبگەن کە خودا بە سەر هەموو شتێکدا زاڵە و تەوانایە.

## نەخۆشی تاعوون

**تاعوون:** یارانی حەدیس لە زاری عامری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبیوەقاس دەگێـڕنەوە کە لە ئوسامەی کوڕی زەیدی بیسـتووە کە پێغەمـبەر لە مەڕ مەسـەلەی تـاعوون ئـاوای فەرمـووە: تاعوون عەزابێکی سەختە کە هەندێک لە ئۆمەتانی پێ عەزاب دەدرێن.

**حەزرەتی عـومەر و تـاعوون:** گۆیـا عـومەر و ئەسـحابی پێغەمـبەر لە سـەر ئەساسـی ئەو حەدیسەیان عەمەل کردووە لە بابەت تاعوونەوە، لە کاتی گەڕانەوەی عومەر لە دێی «سـرغ» کە دێیەکە دە دۆڵی تەبووکدایە لە سەر ڕێگای شام کە ١٣ مەنزڵی دەگەڵ شاری مەدینە فاسیلەیە.

گۆیا حەزرەتی عومەر کاتێ بە نیەتی دە هاوار وەچوونی یارانی شەڕکەری ئیسلام دەیهەوێ بەرەو شام بڕوا و ڕۆی، تاکوو گەیشتە ئەو دێیەی کە ناوی «سـرغ»ە لەوێ دەگاتە کاروانچییـان کە لە وڵاتی شام دەگەڕانەوە. لێیان پرسیار دەکا کە حاڵ و ئەحواڵ و هەواڵی وڵاتی شام چـۆنە و چۆن نییە؟ ئەوانیش ئاوا وڵامی حەزرەتی عومەر دەدەنەوە: بۆ مەگەر ئەتۆ دەتهەوێ بچی بـۆ شام؟ ئەویش دەفەرموێ: بەڵێ. کاروانچییانیش عەرزی دەکەن: وڵاتی شـام ئەوڕۆ بـۆ چـوون نابێ چونکە نەخۆشی تـاعوونی تێـدایە. ئەدەوەیـدا کە کـاروانەکە دەڕوا حەزرەتـی عـومەریش دەکەوێـتە ڕاوێـژ دەگەڵ هـاواڵانی کە یـارانی موهـاجرین و ئەنسـار بـوون، سـەرەنجامی ڕاوێژکارییەکەیان ئەسحاب نەیانتوانی بەخۆیـان بە هـیچ لایەک لەو دوو لایـانە سـاغ بـنەوە یـا چوون یا گەڕانەوە. حەزرەتی عومەریش ئەو حەدیسـەی پێغەمـبەری دە زەینـدا بـوو لە بـابەت

تاعوونەوە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: تاعوون عەزابێکە بەعزێک لە ئۆمەتانی پێ عەزاب دەدرێن. جا لە سەر ئەساسی ئەوەی کە عومەر باوڕەی تەواوی بە فەرموودەکانی پێغەمبەر بوو ڕێگای بە خۆی نەدا کە بە سەر فەرموودەی پێغەمبەردا باز بدا و بڕوا. ڕووی کردە یارانی و فەرمووی باوەگەڕێین، دیارە گەڕانەوە لە سەر ئەو نیەتە و پەیڕەوی لە عومەر. ئەدەو کاتەدا «ابوعبیدە بن جراح» ڕووی کردە حەزرەتی عومەر و پێی گوت: ئایا دەکرێ لە بەر قەزای خودا هەڵاتن؟ ئەوە ئەتۆ لە بەر قەزای خودا هەڵدێی. عومەر لە وەڵامدا فەرمووی: خۆزگە لە باتی تۆ یەکی دیکە ئەو قسەی بکردایە! بەڵێ ئەی ئەباعوبەیدە، ئێمە لە بەر قەزای خودا دەڕۆین و لادەدەین بۆ لای قەزای خودا. عومەر ڕووی کردە ئەباعوبەیدە و میسالێکی داهێنایە بۆ حاڵیبوون. ئەباعوبەیدە کوتی: ئایا ئەتۆ ئەگەر دەستە وشترێکت پێ بێ و بگەیە دۆڵێکی، دەو دۆڵەشدا دوو شوێن هەبن یەکێکیان ئاو و باغ و مێرگ و مێرغوزار و خۆش بێ، و یەکێکیشیان قاقڕ و بێ ئاو و لەوەڕ بێ، ئەگەر ئەتۆ وشترەکانت دەو لایەی کەی کە خۆش و دڵگرو ولەوەڕدارە، ئەوە هەڵاتنە لە بەر قەزای خودا؟ و هەروا ئەگەر وشترەکانت دەو لایەی کەی کە قاقڕ و بێ ئاو و لەوەڕە، ئەوەش مەگەر بە قەزای خودا نەچوونە؟ جا ئەدەوەیدا بوو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف هات و کوتی بە عومەر و یارانی هەواڵی عومەر ئەمن لە پێغەمبەرم بیستووە لە بابەت تاعوونەوە چی فەرمووە، فەرموویەتی ئەگەر هات و خەبەرتان پێ گەیی لە هەر وڵاتێک نەخۆشی تاعوونی تێدا، بۆ لای ئەو وڵاتە مەچن. دووبارە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئەو مەکان و شوێنەی کە تێیدای و نیشتەجێی لێی، تاعوونی تێکەوت لەوێ هەڵمەیە و وەمێنە. ئەدێرەدا حەزرەتی عومەر بە ڕوویەکی گەش و خۆشەوە ستایش و سەنای خودای کرد و سژدەی شوکری برد کە هەڵوێستەکەی پێچەوانەی پێغەمبەرﷺ نەبووە. و سپاسی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفیشی کرد لە سەر ئەوەی ئاگاداری فەرموودەکانی ئی حەزرەتی ڕەسووڵە. بەرهەمی هەڵوێستی عومەر دەبێ ئەوەبێ: هەڵاتن لە بەر ئەوەی خودا تەقدیری کردبێ، نابێ و ناکرێ. ئەمما خودای تەعالا بۆیە ئینسانی بە چەکی ئەقڵ و شعوور و تەجرەبە و بەراوەرد موسەللەح کردووە کە لە جێی خۆیدا دەستی پێ وەکەی. واتە لە ڕاست شەڕ و بەڵا و کێشە دەتوانی تا ئەو جێگایەی بڕ دەکەی لادەی و ئیللا دەبێ خاوەنی باوەڕ و ئیمان ئاوا بزانێ هەچی خودا ئیرادە و حەز کا خۆ لە بەرلادان و هەڵاتنی ناکرێ. ئەوەش حەزرەتی عومەر و تاعوون. بۆ زێدە زانین: تەفسیری مونیر و کەبیر.



ئەوجـار دەچیـنە خـزمەت ئـایەتی ٢٤٤ کە دەگەڵ ئـایەتی ٢٤٣ خزمایەتییـان هەیە و لێـک دەوەشێنەوە:

﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ﴿٢٤٤﴾
**لە ڕێی خودادا بجەنگن و شەڕ بکەن، و چاک بشزانن کە خودا بیسەر و زانایە**

## شەڕ لە ڕێگای خودادا

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە سیمای ئایەتی ٢٤٤ی بەقەرە:**

لە سەر ئەساسی ئاوڕدانەوە وەسەر بەسەرهاتی هەڵاتوانێکی کە دە ئـایەتی ٢٤٣دا ئامـاژەی وەلا کرا، دوو نەزەر دەو ئایەتە ٢٤٤ەدا هەست پێ دەکرێن و دێنە بەرچاو:

١. یەک لەو دوو نەزەرانە ئەوەیە: ئەو دەستوور و ئەمرەی باری‌تەعـالا کە بە وەسـیلەی ئەو ئایەتە ٢٤٤ ڕایدەگەیێنێ و ئەمری شەڕ کردن دەدا دەگەڵ ئەو کەسانەیەتی کە بە هۆی نەخۆشـی تاعوون مردن و پاشان زیندوو بوونەوە. واتە لە هەوەڵەوە لە ترسی تاعوون ڕایانکرد و هەڵاتن و وڵاتیان چۆڵ کرد و پاشان بە ئەمری باری مردن و هەروا بە حیکمەتـی بـاری دووبـارە زینـدوو بوونەوە. جا ئەوجار خودا پاش زیندوو کردنەوەیان دەسـتووری شـەڕ کـردن و دیفـاع لە ئـاو و خاکی وڵاتی خۆیان پێ دەدا. دیارە کە خودای بانی‌سـەر بـۆیە یەکسـەرە دە مەرگ و نـابوودی کێشان چونکە هەڵاتنیان لە ترسی مەرگ بە سەر مـانەوە و دیفـاع لە موقەدەسـات و کەڕامەتـی ئینسانیان تەرجیح دا و پەسەندیان کرد، جـا بـۆیە خـوداش ئەوەی ئەوان لە بەری هەڵـدەهاتن، وەک مەرگ بێ تووشی هێنان و لە ناوی بردن.

## نەمان چاترە لە مان!

ئەئەوە دەرسە ئەوە بە عالەم دەڵێ: هەرکەس مانی بە حیزیگەری تەرجیح دا بە سەر نەمان و مردن بە شەڕافەتمەندانە ئەوەی سزایە کە بە خوێڕی بڕوا و سەر بنێتەوە.

٢. نەزەری دووهەم لەو دوو نەزەرانەی کە لە سەر ئایەتی ٢٤٤ دەربڕاون ئەوەیە: جمهووری تەفتیشکەران ئاوایان بڕیار داوە کە ئەو ئایەتە سەربەخۆیە و دەسـتووراتێکی عـامەیە بـۆ تەواوی خاوەن باوەڕانی حازر و ئەوەی لێرە بە دواشدا دێن ئەمر بە جیهادە واتە ئەمرە لە لای خوداوە بۆ وەی هەچی ئینسانە دە بەرابەر دوژمنـانی زۆردار و دەس‌درێـژکەر بـۆ مڵـک و مـاڵ و خـاک و وڵات و ناموس و کەڕامەتی ئینسانی، دەبێ بەربەرەکانی و دیفاع و ڕاپەڕین لە خۆ نیشان دەن،

سەرنەوی نەکەن و دەس دانەنەوێنن لە بەر دوژمن لە ترسی ئەوەی گیانت لێ دەستێندرێ و گوزەرانت لێ دەشێوێ و تێکدەچێ چونکە هەر کەسێک ژیانی شەرافەتمەندانە دە پێناو ژیانی پەست و چاوشۆڕانە بنێ، بە سەرشۆڕ و بە ناپیاو و بە نامەردانە دەمرێ و ناوی دەڕوا. ئەگەر بە وردی و بەرجەوەندانە سەیری ئایەتی ١٦ی سوورەی ئەحزاب بکرێ ئەگەر ئینسافانە قەزاوەت بکرێ و لە خۆ گۆڕان وەلا بندرێ ئەوە دەردەکەوێ کە ئاماژەن وە لا کرد:

احزاب ﴿١٦﴾ قُل لَّن يَنفَعَكُمُ الْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ الْمَوْتِ أَوِ الْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا

**بڵێ: ئەگەر هەڵبێن لە مردن و یا لە بەر کوژران، هەڵاتن هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنێت لەو حاڵەشدا بەهرەی ژیانتان پێ نادرێ کەمێک نەبێ.**

ئەو ئایەتە ئەگەر بە هەللاجی ویژدان و ئەقڵ و شعووری غیرەتمەدانە وەپشکێندرێ و هەللاجی کرێ، چی لێ بەرهەم دێ بەغەیرەز ئەوە کە دەبێ ئینسان ئەودەمەی شایی بە خۆ بێ کە ئینسانە و خەلیفەی خودایە، دە بەرابەری دوژمنانی خودا و ئینساندا سەر نەوی نەکا و دەست دانەنوێنێ لە ترسی ئەوەی دەمکوژن و یا دەمرم. بەڵکە دەبێ ئەو گیانە عەزیز و شیرنەی دە پێناو گیانی عەزیزتر و شیرنتریدا دانێ، وەک ئازادی و سەربەخۆیی و مافی ئینسانیەت بێ، با بمرێ بە عیزەتەوە، بەڵام نەژی بەبێ عیزەتی.

لای هەڵۆی بەرزەفڕی بەرزەمژی　　　چۆن بژی شەرتە، نەوەک چەندە بژی

## (فی سبیل الله) واتە چی؟

ئەگەر خودا دەفەرموێ: ﴿فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ واتە دە ڕێگەی خودادا، دیارە ڕێگەی خودا هەمان ئەو ڕێگایەیە کە هەموو خاوەن مافێک مافی پارێزراو بێ و ئەوەش یەقینە شەڕ و بەربەرەکانی تەواوی پێغەمبەران دەگەڵ تاغووت و جبت و موترەفینان هەر بۆ پارازتنی ماف بووە، چونکە ئەوانە ماف‌خۆرکەیان پێ کوتراوە کە ئێستاش هەن و زۆرن. دەبێ ئەوەش بسەلمێندرێ جیهاد واتە تێکۆشان و دیفاع و بەربەرەکانی بۆ هێزی دینی و ئاین و مافی خودا پێداو.

ئایەتی ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ئاماژەیە وەلای ئەوەی خودا ئەوەی دەیڵێن و دەکوترێ، دەیبیسێ و دەشزانێ نیەتت چییە دە دڵدا، ئەویش دەزانێ. و هەروا ئەو ئاڵا (لا اله الا الله محمد رسول‌الله)یەی کە نیشانی عالەم دەدرێ و چیشی دە بندا دەکرێ دەزانێ، کە ئەوە دێوجامەیە واتە درۆیە بۆ وانەی خاوەنی هەستن بەسە یەک ئاماژە، و بۆ ئەوانەی بێ‌هەستن: ﴿وَسَوَاء عَلَيْهِمْ أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ (یس: ١٠) هیچ تەفاوەتی نییە بۆ بێ‌هەستان، چ

**بیانترسێنی و چ نەیانترسێنی، ئیمانێ ناهێنن. (تربیت نااهل را چون گردکان بر گنبد است).**

با ئەوەش بڵێین شەڕ بە پێی ئەساس و دابی خۆی نیازی بە کەرەسەی شەڕ هەیە هەر گیانبەخشین نییە بە تەنیا، بەڵکە ماڵ و داراییشی دەوێ، واتە ئەوانەی دارایییان هەیە دەبێ ئەگەر ڕاست دەکەن ئەهلی دیفاعن ماڵ بدەن، تا دەگەڵ ئەوانەی گیان دەدەن لێک بادرێن و قەوی بن، بە دوژمن نەپسێ هێزیان، هەروەک خودای ئاگادار بە سەر هەموو کاروبار و نەزم و نیزامێک ئاماژە و ئیشارەی تەواوی وەلای ئەو بابەتە شەڕ و دیفاعە کردووە بە وەسیلەی ئایەتی:

انفال ﴿٦٠﴾ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ. **ئەوەی دە تواناتاندایە لە ئامێری بەهێز و کەرەسەی شەڕ و لە ئەسپی گورج و گۆڵ و توند و چالاک و دابەستە، ئامادەی بکەن بۆیان، دوژمنی خودا و خۆتانی پێ بتۆقێنن، دوژمنی دیش بێجگە لەوان، کە ئێوە نایانناسن و خودا دەیانناسێ، هەر شتێک لە ڕێگای خودادا ببەخشن، بێ گومان دەدرێتەوە پێتان، ستەمیشتان لێ ناکرێ.**

هەچەن ئەو ئایەتە ئەوڕۆ هەموو هێرشکەر و هجوومبەرێک لە پەڕۆی دەنووسێ و بەرزی دەکاتەوە پێی دەخورێ و دەتازێ، ئەمما ئەو ئایەتە بەبێ شک بۆ دیفاعکەرانە، واتە بۆ ئەو کەسانەیە تەمایان دە ماڵ و مڵک و خاک و ئاو و نیشتمان و فەرهەنگ و کەرامەتیان کراوە و دەربەدەر و تاڵان کراون.

کۆی عولەما واتە جمهوور لە سەر ئایەتی ﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ نەزەراتی جیاوازیان ڕاناوە، هەندێکیان دەڵێن: خودا دێرەدا دەگەڵ محەمەد و ئۆمەتی محەمەدیەتی کە جیهاد بکەن دە ڕاهی بەرز کردنەوەی ئاڵای (لا اله الا الله)، هەندێکیش کوتوویانە ئەوە ڕاستە، ئەمما بەرز کردنەوەی (لا اله الا الله) واتە ڕێگای حەسانەوە و ئەمن و ئەمانەت بۆ وەی ئینسان بتوانێ لە سایەی ئەو دینەی ڕێگای حەق لە ڕێگای ناحەق جودا وەکا، هەندێکیش کوتوویانە خودا مەنزووری دەو ئایەتەدا بەرەنگار بوونی زاڵمانی تەجاوەزکار و مافخۆر و ناموسبەر و حەیادڕە، کە دەبێ ئینسان بە گژ ئەو کەسانەدا بێ کە لە ڕێبازی خودا لادەدەن. مالکی دەفەرموێ دیفاع لە ماڵ و مڵک و ناموسو نیشتمان ڕێگای خودایە. (تەفسیری مونیر)

خودای تەعالا ئەوجار باسی ئەو کەسانە دەکا کە ئاوڕ دەدەنەوە سەر ئەو کەسانەی بە گیان و ماڵ و دارایی شەڕ دەکەن دەگەڵ دوژمنانی ئیمان و ئینسان. هەر ئەوەشە کەبە دووی ئایەتی

شەڕ (٢٤٤) ئایەتی کۆمەک بە شـەڕکەرانە کە قەرزە دەگەڵ خـودا کـردنە دێ واتە ئـایەتی ٢٤٥. خاوەنی تەفسیری مـونیر فەرمـوویەتی: ئەوە کە لە دووی ئـایەتی جیهـاد ئـایەتی کـۆمەک دێ، نیشانەی ئەوەیە کە هەرکەس بە هەچی لە دستی دێ و تەوانایە، ئـاوڕ وەدا؛ ئەوە بەخـۆی (فـی سبیل الله)یە. ئەوجار دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٤٥:

**﴿٢٤٥﴾ مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافًا كَثِيرَةً وَاللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْسُطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ**

**کێیە ئەوەی کە قەرزێکی جوان وبێخەوش دەدا بە خودا، تـاکوو خـوداش بە چەنـدین قـات و بەرابەر پاداشی پێ بداتەوە!؟ خودا بـۆ تاقیکـاری بەنـدەکانی خـۆی هەرکەسـێ خـۆی بـیەوێ هەژاری دەکات، کە بیشیەوێ سامانی زۆری پـێ دەدات، ئێـوەش سـەرەنجام هەر بـۆ لای ئەو خودایە دەگەڕێنەوە**

## قەرز دەگەڵ خودا

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانەی سیمای ئایەتی ٢٤٥:

بە پێی نەزەر و بۆچوونی هەندێک لە ڕاوێژکارانی قورئان، لە بەر ئەوەی کە خودای تەعـالا دەستووری شەڕ دەگەڵ دوژمنانی خودا و ئیمانی دا لە هەوەڵەوە، جا پاشان بە دووی ئەودا ئەو ئایەتی ﴿مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ی هێنـا، ئەوە لە بابـاەت دابەزینـی ئەو ئـایەتە دوو نەزەر دێتە گۆڕێ. یەکیان ئەوەیە: ئەو ئایەتە بە ئایەتی پێش خۆی واتە ئـایەتی ٢٤٤تـێکەڵاوی و یەکەتی هەیە، لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ بکوترێ: مراد لە قەرز کردن دەگەڵ خودا واتە کـۆمەگ و هاوکاری جیهادکەرانی ڕێگای خودا.

٢. دووهەم نەزەر ئەوەیە: ئەو ئایەتە (٢٤٥) ئـایەتێکی سـەربەخۆیە و دامەزرانـدنی یاسـا و دەستووراتێکی تازە و سەربەخۆیە، ئەوەیش کە بریتیەلە دەسـتگرتنەوە و ئـاوڕدانەوە بـۆ سـەر بێنەوا و خاوەن نیازان، جا هەر کەس بن شەڕکەرانی ڕێگای خودا بن وەک جیهادکەران، و یـا هەتیو و ئەسیر و فەقیر و پیر و لەکارکەوتوو بن.

٣. نەزەرێکی سێهەمیش هەیە لەو بارەوە. ئەویش ئەوەیە و بە نەزەرێکـی پەسـەند و ڕەواش وەرگیراوە. ئەو دوو نەزەرانی کـوتران دە پێشـدا هەر دووکیـان لە خـۆ دەگـرێ ئـایەتەکە و بـێ ئیشکالە. چونکە ئەو دوو نەزەرە دە ئامێزی ئەو ئایەتی ٢٦١ی بەقەرەدانە کە دە بـابەت نەفەقە دە

ڕێگای خودادایە کە قورئانزانەکـان کوتوویـانە مـراد لە قەرز کـردن دەگەڵ خـودا هەر ئینفـاقە وبەس. ئایەتەکەش ئەوەیە: ﴿مَّثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللّٰه كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّئَةُ حَبَّـةٍ وَاللَّهُ يُضَـاعِفُ لِمَـن يَشَـاء وَاللَّهُ وَاسِـعٌ عَلِـيمٌ﴾ واتە: **نمـوونەی ئەوانەی کە سـامانیان دە ڕێگـای خـودادا دەبەخشـن، هەر وەک دەنـکە دانەوێـڵە و تۆوێـک وایە و حەوت دانە گـوڵی گرتبێـت، لە هەر گوڵێکیانـدا سـەد دانەی تێـدا بێـت، خـوداش بـۆ هەر کەس بیهەوێـت چەنـد بەرابەری دەکاتەوە. خودا خاوەن بەخششێکی بەرفراوانە و زانایە.**

جا ئەدێرەدایە کە نەزەری سێ ڕەدی نەزەری ئەو کەسـانە دەکەن کە کوتوویـانە قەرز دەگەڵ خودا ئەوەشی دە پاڵدایە: کە هەر کەس بڵێ: (سُبْحَانَ اللّٰه ـ لا إِلَـٰهَ إِلاَّ اللهُ ـ اللهُ اكبر) ئەوەش قەرزە دەگەڵ خودا. چونکە لۆغەتی قەرز دە عـورفی عەڕەبـدا بـۆ ئەوەی نەکـوتراوە بەڵـکە بـۆ ئینفاق کوتراوە.

ئـایەتی ﴿وَاللَّهُ يَقْـبِضُ وَيَبْسُـطُ﴾ واتە خـودا ڕۆژی خـۆی لەو گەلانەی دە ڕێـی خـودادا چرووکی دەکەن و دەستان دەقووچێنن، لێیان دەگرێتەوە و بۆ ئەوانەی دە ڕێی خودادا بەخشش دەکەن سفرەی ڕەحمەتیان بۆ ئاواڵە دەکات و ڕادەخات.

## دایکێک و دوو کچۆڵە لە میوانی حەزرەتی عایشە

با ئەو ڕیوایەتە دڵ پشکوێن و دڵخۆشکەرە نەبوێرم. کـوتراوە: ڕۆژێکـی ئافرەتێـک کە دوو کچـۆڵەی هەتیـوی دەبـن دەسـتیان دەگـرێ و ڕوو دەکـاتە مـاڵە پێغەمـبەرﷺ. دەو دەمەشـدا پێغەمبەرﷺ لە ماڵێ نابێ. هەر تەنیا حەزرەتی عایشەی دایکی موسوڵمانان لە ماڵ دەبـێ. و هەر وا حەزرەتی عایشە دەزانێ و هەست پێ دەکـا ئەو بێـنەوایە بـۆیە هـاتووە شـتێکی دەس کەوێ ویستی پاش بەخێرهێنانێکی گەرموگوڕیان خواردنەمەنیەکیشیان بـۆ دانـێ، شـتێکی واشـیان دە ماڵێدا نابێ، بێ لە نەختێک خورما و قاسپی ڕەق. بڕێکیان بۆ دێنێ و دانداتە دەستی داکەکەیان. دایکەکەش کە بۆخۆی دڵی نایە هیچیان لێ بخوا دەیداتە دسـەتی دوو کچۆڵەکـان. حەزرەتـی عایشەش هەست بەوەی دەکا کە دایکەکە دەزانێ خورماکان کەمن بەشـی ئەویـش و کچەکـان نـاکەن دڵـی دایـکەکە نـاڕەحەت دەبـێ کە کچەکـان نەیخـۆن، ئە دەوەیـدا حەزرەتـی عایشـە عوزرخـوایی لە دایـکەکە دەخـوازێ کە بمانبەخشـە هەر ئەوەنـدەمان دە ماڵێـدایە، دەو کـاتەدا پێغەمبەرﷺ وەژوور دەکەوێ و دەفەرموێ: عایشە ئەوە کێت میوانە؟ حەزرەتی عایشەش بێ کەم و زیاد جەریانەکەی بۆ باس دەکا. پێغەمـبەرﷺ ئەدێـرەدا دەفەرمـوێ هەرکەس لە زار و نەفسـی

خۆی وەگێڕێ بۆ زاری سەغیر و بێنەوایان، خودا ڕۆژی قیامەت باڵاپۆشی بە نێوی حیجاب لێ وەردەگرێ کە گەرما و تینی ئاوری جەهەننەم ئەزیەتی نەکا. و هەر دایکێکیش ئاوا شت لە زاری خۆی وەگرێ بۆ زاری هەتیوەکەی، خودا بەهەشتی بۆ وی دەڕازێنێتەوە. (مسلم و صحیح: کتاب البر و الصلة و الآداب و الاحسان الی البنات)

عەللامە ئیبنی‌عەرەبی لە سەر دابەزینی ئەو ئایەتە (٢٤٥) نووسراوەیەک دەردەکا و دەڵێ: عالەم کاتێ ئەو ئایەتەیان بیست بوونە سێ دەستە و ئەوەیان دەکوت و بە عالەمێیان ڕادەگەیاند:

١. دەستەیەکیان ئیحتیرازیان لە خودا و پێغەمبەرﷺ و قورئان دەگرت و دەیانکوت: ها ها! خەڵکینە سەیر کەن خودای محەمەد فەقیرە و داوای قەرز لە عالەم دەکا، نەتیجەی ئەو کارەی خودا ئەوەیە کە هەموو بانگاوازەکان و دەعوەتەکانی محەمەد و قورئان درۆن. ئەوە ئەو دەستە لە ناو یەهوودیان داکەوت. خوداش بە ئایەتی ١٨١ی ئالی‌عیمران لێیان وەجواب هاتووە کە دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاء سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ الأَنبِيَاء بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ الْحَرِيقِ﴾ واتە **بێ‌گومان خودا قسەی ئەوانەی بیست کە وا کوتیان بێ‌گومان خودا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین. جا بەو زووانە ئەوەی کە وا کوتوویانە و هەروا کوشتنی پێغەمبەرەکانیش کە بە ناحەق کوشتیانن، تۆمار دەکەین پێشیان دەڵێین دەیجا ئەوجار بچێژن سزایەکی زۆر سووتێنەر.**

٢. دەستەی دووهەم لەو سێ دەستانەی کە لە سەر دابەزینی ئایەتی ﴿مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ هەڵیانداوەتێ، ئەو کەسانەن کە لە بابەت قەرز و قۆڵە دەگەڵ خەڵکی خودا نارەزایەتییان هەیە و حەسوودی دەبەن پێی. جا لە سەر ئەو نیەتە نارەوا و ناپاکەیان کوتیان ئەو مەبەستەی کە خودا دەڵێ قەرزم دەگەڵ بکەن درۆیە چونکە خودا نیازی بە قەرز نییە دەگەڵ عالەم. ئەو ئایەتە هەڵبەستراوی محەمەدە تاکوو بەو وەسیلەیە ماڵ و سامانێک لە عالەم وەدەست بێنێ و بیداتە ڕەش و ڕووتان و لە دەوری خۆیان وەکۆ کا و بە گژ عالەمیاندا کا، گۆیا ئەو قسەکەرانەش منافقەکانی یەهوود و نەسارا بوون.

٣. دەستەی سێ لەو سێ دەستانە کە هەر بە دابەزین و بیستنی ئەو ئایەتە هاتنە پێشێ و بەڵێیان کوت و سەری ئیتاعەیان بۆ داخست ئەوانە بوون کە ئیمان و باوەڕیان کوێرکوێرانە وەرنەگرتووە و دایان‌نەچاندۆتە ناو دەروونیان بەڵکە لە سەر ئەساسی هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەیەکی دروست بووە، جا ئەوانە بە تێکڕایی هاتنە خزمەت پێغەمبەری تاکوو بتوانن ئەو ماڵ و دارایی‌یەی کە لە خەرج و نەفەقەی خاووخێزانیان زیادە، چۆناوچۆن بیدەنە خوا بە قەرز.

دەبێ خاوەن هەست و شعوور و ئیمان ئەو جەریانـاتی سـێ دەسـتە ئینسـانە چۆنـاوچۆن بەراوەرد کا و هەڵیسەنگێنێ و تەعبیر کاتەوە. دەبێ ئاوای تەعبیر لێ دەینەوە: ئیمان و بـاوەڕی تەقلیدی واتە کوێرکوێرانە دەتوانێ لە هەموو ڕاستی ڕاستان ئیشـکال وەدۆزێ و بگـرێ چـونکە باوەڕ و ئیمان دەڵەمەیە و ناکـامڵە، بەڵام ئەوانەی ئـیمان و باوەڕیـان لە ڕووی هەڵسـەنگاندن و بەراوەردەوە دارژاوەتە ناو دڵیان ناتوانن لە ڕاست حەق مل بادەن. ئەوانەی دە سەنگەری شەڕی ژیانـدا مەتەرێزیـان گرتـووە دەزانـن ڕێـز و قەدری ئەوانەی ئازووقەیـان بـۆ دەگەیێنێـتە نـاو سەنگەرەوە، چەندە بەرزە و دەشزانن ئەوانەی دەتـوانن بە هـاوارەوە بـێن و بەڵام نـایەن چەنـدە پەست و ناپیاو و نامرۆن.

ڕەنگە ئەوجار جەریانـاتی هـۆزی بەنیئیسـرائیل دە سـوورەی بەقەرەدا بەو ئـایەتە (٢٤٦) کۆتایی پێ بێ، چونکە ئەو داستانە بە ڕوونی ئیسباتی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر دەکـا بەو دەلـیلە بەغەیرەز دەستەیەکی کەم لە زانا وشیارەکانی بەنیئیسـرائیل نەبێ لەو داستانەدا شارەزاییان نییە.

دیارە خودای بانیسەر دە ئایەتەکانی پێشێدا ڕاز و فەلسەفەی شەڕ کە پاسەوانی لە عیززەت و لە کەڕامەت و گەلە، بە تێروتەسەلی بەیان کـرد. ئەمـما دەو ئـایەتە ٢٤٦دا داسـتانی گەلـێ لە بەنیئیسـرائیل باس دەکا و بەیان دەکا کە بە زەبری زۆر لە سـەر مـاڵ و لانە و خـاک و وڵاتـی خۆیان دەرکراون و ڕەتێندراون. هەروەک لە داستانەکانی پێشدا ئەوە زاندرا کە زۆر هۆز و قەبیلە بوون لە ترسان وڵاتی خۆیان بەجێ هێشتووە و هەڵاتوون. ئەمما داستانی ئەو کەڕەتەی ئـایەتی ٢٤٦ بەرفراونتر باسی لێ دەکرێ تـاکوو بـۆ موسـوڵمان ڕوون بێـتەوە کە جیهـاد تەنیـا تـایبەتی موسوڵمانان و عالەمی دەوری پێغەمبەر نەبووە و نییە. بەڵکە جیهادێک کە بە واتای بەربەرەکانی دەگەڵ زۆردار و تەجاوەزگەرانە لە دەورانی ئۆمەتانی پێشداش هەر بووە.

جا ئەوجار پێویستە بچینە خزمەت ئایەتی ٢٤٦ جا پاشان هەرچی دە جانتای مبارەکیدا بـێ وەدەستی دەگرین و لێی حاڵی دەبین:

**﴿٢٤٦﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلإِ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ مِن بَعْدِ مُوسَى إِذْ قَالُواْ لِنَبِيٍّ لَّهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلاَّ تُقَاتِلُواْ قَالُواْ وَمَا لَنَا أَلاَّ نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَارِنَا وَأَبْنَآئِنَا فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوْاْ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمْ وَاللّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ**

**ئەی مـحەمەد! ئایـا هـیچ نـابینی و ورد نەبـوویەوە و دەنـگ و باسـی پیاومـاقووڵانی نەوەی**

**یەعقووبت لە پاش مووسات پێ نەگەیشتووە؟ کە کاتێک گوتیان پادشایەکمان بۆ بنێرە تا لە ڕێی خودادا شەڕ بکەین، پێغەمبەرەکەش پێی کوتن: لەوانەیە کە شەڕ پێویست بکرێ لە سەرتان، ئەوجار ئێوە لە ژێری دەرچن لە ترسان. ئەوانیش کوتیان ئێمە جا چۆن لە ژێری دەردەچین و شەڕ ناکەین دە حاڵێکدا کە دوژمن لە زێدی باب و باپیر و نیشتمان و ناوماڵ و منداڵمانی دەرکردووین؟ بەڵام کاتێ کە شەڕیان لە سەر پێویست کرا بێجگە لە تاقمێکی کەمیان تێکڕا ڕوویان وەرگێڕا و پشتیان لە شەڕ کرد و خۆیان لێ بادا. جا خۆ دیارە خودا زانایە و ستەمکاران چاک دەناسێت.**

## داخوازی بەنیئیسرائیل دوای مووسا، بۆ دیاریکردنی پادشایەک بۆیان

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە سیما و دەروونی ئایەتی ٢٤٦:

خودا ڕووی باسی دە پێغەمبەری دەکا و دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر ئایا ئەتۆ هیچ ئاگاداری و خەبەرێکت لە بەسەرهات و ماجەرای جەماعەتێک لە گەلی بەنیئیسرائیلی کە لە پاش دەورانی مووسا و دە دەورانی داوود پێغەمبەردا ڕووی داوە نیتە؟ هیچی لێ ئاگادار نی؟ کە کاتێ بە پێغەمبەری خۆیان بە ناوی «صمویل» کوت و ڕایانگەیاند کە ئێمە هەست و نیستمان بە دەست دوژمنانمانەوە داگیر کراوە و چووە. دەمانەوێ لە تۆ ئەو چاکەمان دەگەڵ بکەی کە سەرکردە وفەرماندەیەکمان بۆ دابین بکەی و بۆمان هەڵبژێری، کە ئەو کەسەی بۆمان هەڵدەبژێری بە ناوی فەرماندە هەم بتوانێ لە باری شەڕەوە عۆدەدارمان بێ هەم لە باری وێکخستن و ڕێکوپێکیمان. چونکە ئێمە ساغ بووینەوە لە سەر شەڕ کردن و بەرەنگار بوونەوەی دوژمن و دەرکردنی لە وڵاتی خۆمان و لێ ساندنەوەی ملک و ماڵ و وڵاتی غەسب کراومان بە دەست وانەوە. بەو دەلیلە کاسە و تاسی ویژدان و غیرەتمان لەوەی زیاد نابا و خۆ ڕاناگرێ لە بەر جەور و جەفای فەلەستینیان. چونکە ئەو فەلەستینیانە جگە لەوەی کە زۆریان بەبێ ڕەحمان لێ کوشتووین و یەخسیر کردووین، سندووقی موقەددەسی ئێمەی بەنی ئیسرائیل کە دروشم و ڕەمزی سەرکەوتن و پیرۆزیمانە بە سەر دوژمناندا بە تاڵان بردوویانە کە ئەو سندووقە نەمانەی ئێمە ئەوڕۆ نیشانەی زەبوونی و لاوازی ئێمە دەگەیێنێ.

دێرەدا دەبێ ئەو شتە وەقۆزرێ کە هیچ پێغەمبەرێک سەربەخۆ و بێ بەراورد و هەڵسەنگاندن ڕووی دە کاران نەکردووە، جا لە سەر ئەو ئەساس و بەراوردە و زانستێکیش کە دە پێشدا هەیبوو لە سەر ئەو قەومە، ترسی ئەوەی بوو ئەگەر بێتوو شەڕیان بۆ پێشبینی بکرێ و

وەفەرز گەڕێ لە سەریان لەوانەیە پاشەکشەی لێ بکەن و خۆی لێ وەدزن. جا لە سەر ئەو نیەت و بارەی خۆی پێغەمبەر «صمویل» ڕووی تێ کردن و پێی کوتن: ئەمن بە پێی ئەو زانستەی هەمە لە سەر ئێوە تێو ڕانابینم بتوانن بەرەنگاری دوژمن ببن و شەڕی دەگەڵ بکەن ئەو ترسەم هەیە لە ئێوە ئەگەر بۆو داوای شەڕ بکەم و لە سەرتان فەرز بکرێ، سەرپێچی لێ بکەن و لە بەری دەرچن! ئەوانیش دە وڵامی پێغەمبەریاندا بە تێکڕایی جەسوورانە کوتیان: ئێمە جا چۆن لە بەر ئەو دەستووره هەڵدێین و خۆی لێ دەدزینەوە دە حاڵێکدا لە سەر خاک و ئاو و سامان و کەرامەتی خۆمان دەرکراوین؟

بۆ فەرز کردنی شەڕ لە سەریان و تەعین کردنی فەرماندە بۆیان و سەرپێچی و خۆبادانیان و دزینەوەیان لە شەڕ، دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٢٤٧ دەوێدا ڕوون کراوەتەوە جەریانەکە بە کوێ دەگا.

پێویستە کە پێش ئەوەی بچینە خزمەت ئایەتی ٢٤٧ ئەوە بزانین: بە پێی ئاگادارییەک کەم ـ نەک ئاگاداری و زانیارییێکی کۆدەنگ لە سەر ـ گۆیا ئەو پێغەمبەرەی کە ئەو گەلە دەرکراوە پەنایان بۆ بردووە بۆ وەی فەرماندەیەکیان بۆ دانێ و شەڕیان بۆ دامەزرێنێ و دوژمنیان بۆ تێک شکێنێ و لە وڵاتیان دەرکا، «یوشع بن نون بن افرایم بن یوسف» بووە، بەو دەلیلە کە خودا دە ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿مِن بَعْدِ مُوسَى﴾ دیارە لە پاش مووساش ئەو پێغەمبەرە بووە «یوشع»، گەرچی ئەو دەلیلە لاوازە چونکە ﴿مِن بَعْدِ مُوسَى﴾ تا دەگاتە عیسا، هەر ﴿مِن بَعْدِ مُوسَى﴾یە، و هەروا هەندێکیش لە قورئانزانەکان نەزەریان وایە ئەو پێغەمبەرە «اشموئیل» لە ئەولادانی هارۆون برای مووسا بووە کە بە زمانی عەرەبی ئەو ناوە «اشموئیل» ئیسماعیلەو هەندێکی دیش دەڵێن: ناوی ئەو پێغەمبەرە «شەمعوون» بووە چونکە دایکی کاتی خۆی لە خودای داوا کرد حەولادێکی داتێ خوداش دوعای قبووڵ کرد و داییە و دایکیشی ناوی نا شەمعوون. بۆیەش ئەو ناوەی لێینا چونکە مانای شەمعوون واتە (سَمِعَ دُعاءَها فیهِ) یانی خودا نزای وەرگرت لەو ژنە. دیارە پیتی «سین» بە عەبری واتە «شین». ئەو شەمعوونەش یەکێک بوو لە ئەولادانی یەعقووب. یەعقووبیش باپیری یەکێک لە دوازدەگانەی (اسباط) بەنیئیسرائیل بووە.

دیارە ئەو باسە درێژە هەموو زەینێک ناتوانێ هەڵیگرێ. وازی لێ بێندرێ چونکە هەدەفی ئەساسی دە ئایەتەکەدا ئەوەیە: جیهاد لازم و پێویستە دەبێ خۆی بۆ ئامادە بکرێ بە تێروتەسەلی و گورجوگۆڵی. وەئیللا هەدەف دەو ئایەتەدا ئەوە نییە کە بزانی ئەو پێغەمبەرە یا ئەو تایفەیە کە

چوونە خزمەتی کێ؟ جا بۆیە ئەمەش لە درێژەپێدانی واز دێنین و دەچینە سەر ئەسڵی هەدەف و بابەتی مەبەست و مەتڵەب.

خۆ ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە کە دڵ تامەزۆری لێ حاڵیبوونی سەر و بنـی ئەو واقـیعەیە. سەر و بنیشی لە ئایەتی ٢٤٦ەوە تـا ئـایەتی ٢٥٢دایە. کەوایە بـۆوەی بە تەواوی تـام و لەززەتـی باسەکە وەرگرین و بچێژین و بیکەینە دەرسێک بۆ خۆمان، دەبێ یەکتر بەجێ نەهێڵین و ئاگامان لێک بێ تا دەگەینە ئاخری کار.

دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٤٧ تاکوو بـزانین پێغەمبەرەکەیـان کێیـان بـۆ دەسنیشـان دەکـا و دادەنێ و ئەوانیش ئیتاعەی دەکەن یا نایکەن؟

﴿٢٤٧﴾ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكاً قَالُوَاْ أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ قَالَ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ وَاللّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ

**پێغەمبەرەکەیان پێی کوتن: ئەوا خودا تالووتی کرد بە پاشاتان. کوتیان ئەرێ چۆن دەگونجێت تالووت ببێ بە پادشامان؟ کە ئێمە لە پێشـترین بـۆ پادشـایی؟ جـگە لەوەش مـاڵ و سـامانێکی زۆری پێ نەدراوە. وتی خودا خۆی ئەوی هەڵبـژاردووە و کردوویەتـی بە فەرمانـدە. زانینێکـی بەرفراوان و وزە و توانای جەستە و لەشی پێ داوە و بەخشیوە، خودا کەیفی لە هەر کەس بێت دەستەڵاتی خۆی دەداتێ، خودا بەخششی زۆرە و ئاگای لە هەموو کارێکە.**

## دیاری کردنی تالووت وەک پادشایەک

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە و بەرفراوان لە ئایەتی ٢٤٧:**

خـودای بـانی سـەر لە سـەر ئەساسـی عـیلم و حیکمەتـی خـۆی دایـڕژتە نـاو دڵـی پێغەمبەرەکەیان کە تالووت ناوێکیان بۆ بکاتە پادشـا و فەرمانـدەگییان بکـات کە جوولەکەکـان پێیان دەکوت بەو پاشایە «شاووڵ». جا ئەوجار ئەوانیش لە جیاتی ئەوەی ئیتاعەی کەن و سەری بۆ دانەوێنن هاتن کەوتنە بڕ و بەهانە و خراپە لێ هەڵدانی ئەو پاشایە. وەک خودا دەفەرموێ لەو بارەوە: ﴿قَالُوَاْ أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا﴾ واتە جا ئەوە چۆن دەبێ بۆ پاشا بە سەر ئێمەوە؟ کە لە خانەدانێکی ناودار و ناودار نییە؟ بـۆ ئیسـباتی داوای خۆیـان کوتیـان وەک خـودا دەفەرمـوێ: ﴿وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ﴾ واتە ئـێمە شـایانترین و لێهـاتووترین بـۆ پاشـایی لەو پاشـایە. جـگە لەوانەش ئەو پاشایە هەژارە و بێ سەروەت و سامانە. بە کـوردی ئەو گەلە نەفـامە وەک زۆر لە

گەل و هۆزی نەفام و خۆپەرست، لۆمەکەیان ئەوانە بوون: بێماڵ و دارایی، بێ ناو و نادیاری ناو عالەم، بێ خانەدانی ناودار. هەروەک خوداش وایان لێ نەقڵ دەکا و دەفەرمێ ﴿وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ﴾ واتە لە لایەن خوداوە نەیدراوەتێ ماڵ و سامانی زۆر.

بێگومان ئەو ئیحتیرازانەی وان، بەیانی گەلێکی نەفام و دواکەوتوو و پەست ئەخلاقە. هونەر و لێهاتوویان دە چاویدایە و دە ماڵ و سەروەت و ساماندایە.

ئەدێرەدایە کە پێغەمبەرەکەیان لێیان وەجواب دێ و پێیان دەڵێ ئەو قسانەی وە قسەی کەسانی ناحاڵییە کە پێی وایە: ئیمامەت ئیرسییە، بەو دەلیلە هۆزی بەنی ئیسرائیل ئێستاش مونکیری ئەوەن کە پاشایی لە بەیتی مەملەکەت نەبێ نابێ، هەروەک زۆر قەومی دیش هەن کە پێیان وایە ئیمامەت ئیرسییە، بێگومان ئەوە نەزەرێکە بێ ئەساس و باتڵە و خیلافی ئایەتی ۲۶ی سوورەی ئالی عیمرانە: ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بڵێ ئەی پێغەمبەر: **خودایە! ئەی خاوەن و فەرمانڕەوای هەموو شتێک، هەرکەس کە خۆت بتهەوێ و وازت لێ بێ دەخەیتە دەستی دەستەڵات، هەرکەسیش ویست و ئیرادەت لێی نەبێ دەستەڵاتی هەشبێ لێی دەستێنی، ئەوەی بتهەوێ بە ڕێز و بەهێزی دەکەی، ئەوەی نەتهەوێ زەلیل و بێ ڕێزی دەکەی. خێر و بێر هەر بە دەست تۆیە و بەس. بەبێ گومان تۆ بە سەر هەموو شتێکدا توانا و زاڵی.**

ئەی گەلانی وا بیر کورت و ناحاڵی هەتا کەنگێ هەر ئاوا لێ دەخوڕن دەو ئایەتە پیرۆزەدا خودا بە حاڵەواڵیش ئاماژەی والای ئەوەی نەکرد کە ئێوە دەڵێن و بە ئیحتیراز داوتانەتە سەر ئەو پێغەمبەرە و خەڵکی دیش: واتە ماڵ و سەروەت، خانەدار و ناوداری، ئەهلیەت مەلاک و سەنەدی ئیمامەت و پادشایی بێ؟!

## تالووت شایانە بۆ ڕێبەرایەتی

و هەروا دووبارە خودای تەعالا بۆ بەرپەرچدانەوەی شوبهە و بێئەساسی داوا و ئیحتیرازی ئەوانە دەفەرموێ: ﴿وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ﴾ واتە خودا ئەوەی هەڵبژارتووە بە سەر ئێوەدا وەک تالووت بێ، بەشێکی زۆری لە زانین و توانایی و ئیرادەی بەهێز و جەستەیەکی ڕێکوپێک و لێهاتوو و جوانی داوەتێ. ئەو ئایەتەش بەرپەرچدانەوەی ئەو نەفامانەیە کە بە دوو جۆر تانە و لۆمە داویانە پاڵ تالووت لە سەر ئەوەی کە بۆ پاشا نابێ. دوو لۆمە و تانە بێئەساسەکەشیان ئەوەن:

١. دەڵێن بۆیە تالووت شایانی ئیمامەت و پاشایەتی نییە، چونکە لە ئەهل و خانەدانی پاشایان نییە.
٢. چونکە ناودار نییە و دارا و دەستڕۆیشتووش نییە، بەڵکە هەژارە و بێ ناونیشانە.

بەڵام ئەی خاوەنی هەست و ئەقڵ و شعوور سەیر کە خودای بەرز و بێعەیب و هەڵە ئەو دوو تانە و عەیبانەی بە دوو سیفەتی بەرز و ڕەوا و ئەقڵپەسندانەی بەتاڵ کردنەوە:

١. یەکێک لەو دوو سیفەتانەی خودا ناوی بردوون ئەوەیە: عیلم، زانست و زانیاری و لێزانی قەباڵەی ڕێزداری ئەقڵ و زانستە و بەس.
٢. هێز و ئیرادەی بەپێز و بەتین و بەگوڕ لە هەر بارێکەوە، نەک سەری زل و شاڵی کەسک و سیواک و مێزەری زەلام و عەبای فشوفۆڵ.

ئەو دوو سیفەتانەی کە خودا دەستنیشانی کردن و ناوی بردن بۆ پاشایەتی و سەرداری، بێ دەلیل بەڵگە نین بەڵکە لە چەن بابەت و جیهەتەوە ڕەوا و پەسندن، بڕوانە لەو جیهەتانە:

١. عیلم و زانستی شیاو هێز و ئیرادەی بەهێز و پێز لە ڕیزی کەماڵاتی واقیعی ئینسانن، ئەمما بێ گومان ماڵ و سامان و دارایی خانادانی و ناودێری لە کەماڵاتی ئینسان نین.
٢. عیلم و قودرەت واتە زانست و هێز و توانایی بەپێز بەرهەمی کەماڵات و جەوهەری نەفس و حەیاتی ئینسانن، ئەمما ماڵ و مەقام و ناوداری دوو ئەمری جودا لە زات و حایتی ئینسانین.
٣. عیلم و زانست و هێزی بەپێزی ئینسان مومکن نییە لە ئینسان داڕندرێن ئەمما ماڵ و سامان و ناوداری و خانەدانی لە ئینسان دادەماڵدرێن.
٤. زانست و ئیرادەی بەهێز و بەپێز لە سەر فەند و فووتی شەڕ و بەهرەگیری لە پارێزگاری وڵات، تێر و تەواوترە بۆ دوژمن بەزاندن و ڕاماڵدانی لە وڵات، تاکوو نەسەب و ناوداری و خانەدانی. جا لە سەر ئەو یاسا و ئەساسە دروست و ڕەوایانە دەبێ بسەلمێندرێ بەڵگە لە سەر شایانی پادشایی و سەرداری و ئیمامەت و خەلافەت دانایی و تەوانایی و ئیرادە و هێزی بەپێزە، نەک بە نەسەب و حەسەب.

با ئاوڕێکی هەستیارانە وەدەین بۆ سەر فەرموودەی زانایانی بێئەولاولا:

چو کنعان در طبیعت بی هنر بود　　پیمبرزاده‌گی قدرش نیفزود
اگر داری هنر بنما نه گوهر　　گل از خار است و ابراهیم ز آذر

سەعدی

هەندێک لە قورئانزانەکان کوتوویانە مەبەست لە (بسط جسم) دە ئایەتی ﴿وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ﴾دا درێژی لەش و باڵایە، چونکە تالووت لە باری شان و مل و قەد و باڵا بەرزتر بوو لە خەڵکەکە، بۆیەشیان ناو ناوە «طالوت» واتە بەرز و بڵێند.

و هەروا خودای تەعالا دە ئایەتەکەدا کە عیلم دە پێشدا هێناوە پاشان جسمی هێناوە، پسپۆڕانی باری ئەدەبیات فەرموویانە نیشانەی ئەوەیە کە بەستی عیلم لە بەستی جیسم پێشکەوتووترە لە هەموو بارێکەوە بۆ ئینسان نەک بۆ حەیوان. واتە فەزایلی نەفسانی لە سەرووی فەزایلی جیسمانییەوەیە.

دووبارە هەر بۆ پەرچدانەوەی قسەی ڕەخنەگران لە طالووت، ئایەتی ﴿وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاءُ﴾ ئیشارەی تەواوە وەلای ئەوەی کە ملْک و ماڵ ئی خودایە، ئینسانیش ملْکی خودایە، کەوابێ دەبێ ئەوە قەبووڵ کەین خودا کێی بوێ، ملْکی خۆی دەداتێ، بێ ئەوەی مافی کەسی پێشێل کردبێ. هەروا دووبارە خودا کە دەفەرموێ ﴿وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ ئەگەر بخرێتە بەر تیشکی ئەقڵ و زانست سێ شتی لێ چاو دەکرێ. سێ شتەکان:

١. خودا خۆی خاوەن ڕزق و ڕەحمەت و فەزڵە، دیارە ڕەحمەتیش هەموو دنیای دە باوەشی گرتووە و داپۆشیوە. کەوابێ دەبێ بکوترێ بەو کەسانەی تانە و تەشەریان داوە لە شایەتی طالوت، بەوەی کە فەقیرە و لە خانەدانان نییە، چۆن دەڵێن لەو بارەوە کە خوایە فەزڵ و زانست دەدا بە پێی شەئنی کەسەکە، چۆن فەزڵی عیلم داوەتێ بۆ پاشایەتی، جاخۆ ئەگەر ماڵ و سامان شیاوتر بایە بۆ پاشایەتی، دەبایە ئەوی دابایە.

٢. خودا خۆی دەزانێ بۆ هەر کار و کردەوەیەک چ باشە و چ بابەتە! جا ئەگەر بۆ پاشایەتی طالوت ماڵ و نەسەب بابەت بایە، ئەدی بۆ نەیداوەتێ؟ مەگەر دەکرێ بڵێین خودا بە هەڵە چووە دێرەدا کە عیلمی داوەتێ؟ نا، ناکرێ هەڵەی وەپاڵ خودا دەین. کەوایە دەبێ گومان نەمێنێ دێرەدا کە ئەو قەومە ئاوی وڵاتی نەفامییان خواردۆتەوە وڵاتی نەفامانیش وڵاتی لەخۆڕازییان و سەرەڕۆیانە وەک کابراکان.

٣. خودا بە هۆی عیلمی بەزاتی خۆی سەروبنی هەموو شتێکی لێڕا دیارە، بۆ پاشایەتی طالوت بۆ سەرکەوتنی ئەو، عیلم و هێز و ئیرادە و سیمای بابەتە و کافیە نەک ماڵ و دارایی.

وەک لە ڕاوێژی ئایەتەکانڕا دەردەکەوێ جوولەکەکان گوێیان نەدایە قسەی پێغەمبەرەکەیان و بەدڵ ئامادەی شەڕ نەبوون دەگەڵ دوژمن لە ژێر ئەمر و فەرمانی طالوت. ئەو لاسارییەی وان

نیازی بە موعجیزەیەکی بوو کە نیشانیان دریٚ بەڵکوو وەجووڵێن و بێنە سەر ڕێی هیدایەت.

## سندووقی پیرۆز دەکەوێتە دەست تالووت

بەڵیٚ، هەروەک لە بەسەرهاتی جوولەکە قورئان باخەبەرن دەکا و داستانیان بۆمان بەیان دەکا ئەوە لەوان دیاری دەدا و دێتە بەرچاو کە هۆزی بەنیئیسرائیل گەلێکی زۆر سەخت و سەختگیر بوون لە بەرابەر پێغەمبەرەکانیان و زۆر ماڵپەرست و گوزەران دۆست بوون کەمتر وا هەبوو بۆ شەڕ حازر بن لە ترسی ئەوەی نەبادا ئەو خۆشی ڕابواردنەیان لە قیس بچیٚ. جا بۆیە لە بەرابەر قبووڵ کردنی تالووت بە پاشا و فەرمانەدەی خۆیان کێشەیان دەکرد دەگەڵ پێغەمبەرەکەیان و قبووڵیان نەدەکرد و نەیاندەکرد. تاکوو پێغەمبەرەکەیان ڕووی تیٚ کردن و پێی کوتن: ئەی گەلی دوودڵ و لێقەوماو بە دەس دوژمنی وەک هۆزی عەمالیقە بیٚ بە سەرکردایەتی جالووت، گویٚ گرن لێم، دەلیل و بەڵگە لە سەر هەڵبژارتنی طالوت بە پاشا و ڕێبەری ئێوە هەیە و ئەوەشە: ئەو سندووقەی کە ڕەمزی پیرۆزی ئێوەیە جێی ئیعتیبار و باوەڕیتانە کەوا ئێستیٚ بە دەس دوژمنەکەتانە، بە وەسیلەی ئەو شا تالووتە دێتەوە دەست ئێوە. ئاواش دێتەوە پێش ئەوەی بچنە شەڕی دوژمنەکەتان، بە وەسیلەی فرشتەکانی خودا لە ڕێی موعجیزەوە دێتەوە و دەخرێتەوە دەستی تالووت لەویشەوە دەخرێتەوە دەستی ئێوە. دیارە ئەو سندووقەش کە مایەی شان و شەوکەت و ئارامی و غیرەت و جورئەتتانە، بە تەواوی هێواش‌و دەکاتەوە غیرەت و دە گیان و لەشدا زیندوو دەکاتەوە. ئەوکات ئێوەش بۆ چوونە شەڕ و بەربەرەکانی دەگەڵ دوژمن لە پێشەوەی سەفی شەڕ دەیخەنە بەر چاوی خۆتان و هەڵیدەگرن. دیارە هەروەک بۆخۆشتان دەزانن بەسەرهاتی مووسا و هاڕوون بە تەوڕات و وەکاز و کراسی مووسا و هەموو جۆرە ئەو شتانەی کە متفەڕکن بۆ ئێوە، دە ناو ئەو سندووقەیدا هەن کە عولەماکانی بەنیئیسرائیل و پەیڕەوانی مووسا و هاڕوون دەستاودەست ئەو سندووقەیان دەگەڵ خۆ هێناوە.

و هەروا پێغەمبەرەکە لە ئاخردا پێی کوتن هەڵبژارتنی ئەو تالووتەش لە لایەن منەوە نییە، بەڵکە خودای تەعالا بە وەسیلەی وەحی بۆ ئێوەی هەڵبژاردووە.

سەرەنجام فرشتەکانی باری بۆ ڕێز لێنان لە تالووت بە ئەمری باری سندووقەکەیان هێنایە لای تالووت و خستیانە ژێر دەستی ئەو. جا ئەوجار پێغەمبەرەکەیان بە گەلەکەی کوت: جا ئەوجار قبووڵی کەن و ئیتاعەی لیٚ بکەن و گویٚڕایەڵی فەرمانی بن ئەگەر ڕاست دەکەن بە خوداتان باوەڕە.

جا ئەوجار کە بەنیئیسرائیل بە چاوی خۆیان سندووقەکەیان کە بە دەستی دوژمنیانەوە بوو چاویان کرد سەراپایان ئیقراریان بە پاشایەتی ئەو کرد و لە دەورەی شاتالووت گیان لە سەر دەست ئامادەیی خۆیان بۆ شەڕ دەربڕی لە ژێر دەستوور و فەرمانی ئەودا.

وەک دەڵێن هێزی شەڕکەرانی شاتالووت ئەودەم دەچووە حەفتا تا هەشتا کەس. ئەمما با ئەوەش بڵێین شاتالووت لە هەڵسەنگاندنی ئەو گەلە ئەوەی بۆ مەعلووم بوو تا تاقی نەکرێنەوە جێگەی باوەڕ نین کە بە تەواوی لە ژێر نەزمدا وەمێنن و دەرنەچن. جا ئەدێرەدا شاتالووت ڕووی دە لەشکرەکەی کرد و کوتی: خودای بانیسەر دەیهەوێ تاقیتان کەمەوە بۆ ئەو سەفەرە، تاقی کردنەوەکەش و ئاوایە: دەگەینە سەر ڕووبار و چۆمێک لەو ڕێگایەیدا کە بەرەو ڕووی دەچین. هەرکەس لە ئاوی ئەو ڕووبارەی خواردەوە ئەوە دەگەڵ ئێمە نییە و لە شەڕکەران نییە، و هەرکەس لێی نەخواردەوە مەگەر لاوێچێک بۆ زار تەڕکردن، ئەوە لە مەیە و دەگەڵ مەیە.

سەرەنجام بەشی زۆری لە ئاوی ڕووبارەکەیان خواردەوە بە نیشانەی لاوازی ئیمان و باوەڕی و بەشێکی کەمیش نەیانخواردەوە بە نیشانەی ئیمان و باوەڕی پتەو و بەتین و تاو و هێز. بە ئیرادە و بە هێز ک ەبە ئاو نەخواردنەوەیان دیاری دا. داوودێکیان دەگەڵ بوو پتەو خاوەنی ئیرادە و تازە لاو. لە سەر ئەساسی نیەت و باوەڕەی بە سەرکەوتنی دەیەک مەیدانداری و ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی دەستەو یەخەییدا جالووتی دا بە زەویدا و لە ناخی پڕ ئاخوداخی زەویدا ڕۆی برد. هاواری پیرۆزی وڵاتی پڕ کرد و دوژمنی قڕ کرد. دیارە ئەو داستانە لە هەموو تەفسیرەکاندا زۆرە و درێژە بەتایبەتی دە تەفسیری کەبیردا. بەڵام ئەمن ئەوەندە بە کیفایەت دەزانم دێرەدا.

بۆ تەئیدی مەبەست و ڕاستیەکان دەچینە خزمەت ئایەتەکانی ۲۴۸ تا ۲۵۲ هەریەکەی بە نۆرەی خۆی لە جێی خۆی بە تێروتەسەلی باسیان لێ دەکەین. ئینشائەڵڵا.

ئێستێ نۆرەی ئەوەیە بچینە خزمەت ئایەتی ۲۴۸ تاکوو هێنانی سندووقەکەمان بۆ دەرکەوێ کە چۆناوچۆن فرشتەکانی خودا هێنایانە لای شاتالووت واتە تالووتی پێغەمبەر:

**﴿۲۴۸﴾ وَقَالَ لَهُمْ نِبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَن يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَى وَآلُ هَارُونَ تَحْمِلُهُ الْمَلآئِكَةُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنْتُمْ مُّؤْمِنِينَ**

**پێغەمبەرەکەیان کوتی: بەڵگە لە سەر پاشاییەکەی هاتنی ئەو سندووقەیە بۆ لای ئێوە کە مایەی ئارامیتانە لە لای پەروەردگارتانەوە، ئەو پاشماوەشی تێدایە کە بنەماڵەی مووسا و**

**هارووون بەجێیان هێشتووە. ئەو سندووقەش فرشتەکان هەڵیدەگرن. بێ گومان ئا لەو ڕووداوەدا نیشانەی خودای تێدایە بۆتان ئەگەر ئێوە بڕوادارن.**

## تالووت و سندووق

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ٢٤٨**

پێغەمبەرەکەیان بۆ باوەڕی ئەو قەومە ڕووی تێ کردن و پێی کوتن نیشانەی ئەوەی کە تالووت لە خوداوەیە پاشایەتیەکەی، ئەوەیە کە سندووقەکەی مووساتان بۆ دێنێتەوە و دێتەوە، کە ئەو سندووقەش دەمێکە دوژمن لێی زەوت و داگیر کردوون کە دیارە دەو سندووقەشدا هەیە هەوێنی دڵ و ئارامی و حەسانەوە لە لایەن خوداوە. و هەروا دەگەڵ چەن شتێک لەوانەی کە دەکاتی خۆیدا مووسا و هارووون بۆتانی بە عینوانی تەبەڕوک بەجێ هێشتووە لە وەکاز و کەوش و کراس و زۆر لە شتی دی مووسا و مێزەری سەری هارووون.

دێرەدا شتێکی خۆش نەقڵ دەکرێ لە زۆربەی تەفسیرەکاندا بۆ وەی نابێ پاشقول درێ. ئەگەرچی زۆر هەدەف نییە دە تەفسیری قورئاندا بەڵام مەزەی دڵە. شتەکەش تەفسیری خاڵ هێناویەتی، ئەمیش لەویڕا دەیێنم.

دەگێڕنەوە بەو هۆیەی لەشکری جالووتی عەمالیقە کاتێ ئەو سندووقەیان بە شتەکانەوە لە بەنیئیسرائیل گرت و هێنایان بۆ خۆیان، ئەوانیشیان لە قاو دان و دەربەدەریان کردن بێر و بەوێدا. ئەو فەلەستینیانەی کە ئەو سندووقەیان دەس کەوت تووشی دوو شتی سەیر و چاوەڕواننەکراو بوون کە زۆریان لە بەری بەئازار بوون:

١. یەکەم شت کە تووشی بوون مشک لە ناو زەراعەت و شیناوەردیان سەریان هەڵدا و داگژانە شیناوەردەکانیان هیچی بۆ نەهێشتن.

٢. دووهەم شت لەو شتانەی کە لە بەری وە ئازار هاتبوون: نەخۆشی بێوەسیری بوو کە بە ناویاندا بڵاو ببۆوە لە ترسانی نەیاندەزانی ڕوو دە کوێ کەن.

جا ئەو دوو شتەیان بە فاڵی خراپ بۆ خۆیان لێک دەداوە دەیانکوت ئەوە لە سۆنگە و شوومی ئەو سندووقەیە کە خودا تۆڵەمان لێ دەستێنێتەوە و کە لە جوولەکەکانمان ستاندووە. وا چاکە و مەسڵەحەتە و باشە هەچی زووترە بۆیان وەنێرین.

## فرشتە سندووق دەهێننەوە

جا لە سەر ئەو باوەڕە هاتن بەخێرایی سندووقەکەیان بە هەچی دە ناویدا بوو خستیانە کالیسکەیەک و دوو گایان تێ خست و بەبێ ئینسان ڕووبەڕووی وڵاتی جوولەکەکان بەڕەڵاڵان کردن. بە ئەمری باری وا هەڵکەوت ئەو گایانە بەرەو وڵاتی جوولەکەکان ڕۆیشتن وەک ئینسانی شارەزایان دەگەڵ بێ وابوو. واتە وەک فرشتە لێیان خوڕێ وا دەهاتە بەر دڵ و چاوان. هێنایان هێنایان تاکو کردیانە ناو جوولەکەکان. هەروەک خودای تەعالا ئاماژەی وەلا داوە بە وەسیلەی ئایەتی ﴿تَحْمِلُهُ الْمَلآئِكَةُ﴾ واتە ئەو سنووقە فریشتەکان هەڵیدەگرن. جا بێگومان ئەقڵ بە دووری نازانێ هەم پەیدا بوون مشکەکان و هەم هاتنی نەخۆشی بێوەسیری خودا کردنیە وەسیلەی ئەوەی کە ئەو سندووقە بگەڕێتەوە لای جوولەکە دەرکراوەکان بە وەسیلەی فرشتەکان کە لەشکری نهێنی خودان. وەک خودا ئاماژەی وەلای دەکا و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ واتە بەبێ گومان لەو ڕووداوەدا نیشانەی تەوانایی خودای تێدایە بۆتان ئەگەر باوەڕیتان بە قودرەت و نەزم و نیزامی خودا هەبێت.

جگە لە ئیسباتی قودرەت و تەوانایی خودا بە سەر هەرچی کە بیهەوێ دەو کارەساتەی گەڕانەوەی سندووقەکە بەو شێوە ڕێکوپێکە جوانە بێوێنەیە، ئەوەش بە ئیسبات دەگەیێنێ و گەیاندی کە پێغەمبەران سەداقەتیان هەیە دە قەول و قەرار و وەعدەی خۆیان کە ئەو پێغەمبەرەیان پێش ئەوەی دەس کەن بە شەڕ و پاشایەتی تالووت قبووڵ کەن، پێی کوتن و وەعدەی دانێ کە سندووقەکەو دەگەڕێتەوە لاتان بە وەسیلەی تالووتشا.

دیارە باوەڕی بە سەداقەت و دروستکاری پێغەمبەر وابەستە بەو مەرجەیە کە ئەو ئیمان وباوەڕیە لە دڵەوەڕا بێ، کوێرکوێرانە و عادەتی نەبێ. چونکە ئیمان و باوەڕی ئەگەر لە دڵەوەڕا نەبێ هەرچەندی خەریکیش بێ هەر بێ ئەسەر و بێ بەهرەیە وەک نوێژ و ڕۆژووی عالەمی ئیمان عادەتی نەک عیبادەتی.

ئەوجار بۆ حاڵیبوون لە سەر و بنی داستانەکە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتەکانی مەڕبووت بەو کارەساتە. جا ئێستا دەچینە خزمەت ئایەتی ۲۴۹ تاکوو بزانین تالووتشا و فەرماندەی لەشکر چۆناوچۆن بەرەنگاری دوژمن دەبن و تالووتیش چۆنیان تاقی دەکاتەوە.

**﴿۲۴۹﴾ فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن**

لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلاَّ مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ فَشَرِبُواْ مِنْهُ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمْ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ قَالُواْ لاَ طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنودِهِ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلاَقُو اللّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ

**کاتێ تالووت بە خۆی و لەشکریەوە لە ناو شار چوونە دەرێ کوتی: خودا بە ڕووبارێک ئێوە تاقی دەکاتەوە، ئینجا هەرکەس لێی خواردەوە ئەوە لە لەشکری من نییە. هەرکەسیش لێی نەخواردەوە ئەوە لە لەشکری منە، کەسێک نەبێت کە بەڕاستی لاوێچێکی لێ هەڵێنجێ. هەموو تێریان لێ خواردەوە بێجگە لە هەندێکی کەمیان، کاتێ خۆی و ئەوانەی وا بڕوا و ئیمانیان هێنابوو لەو ڕووبارە پەڕینەوە، کوتیان ئەو کەسانەی دڵنیا بوون لە ڕۆژری پەسلاندا بە خزمەتی خودا دەگەن، کوتیان: زۆر دەستەی کەم زاڵ بووە بە سەر دەستەیەکی زۆردا بە ویستی خودا. خودا دەگەڵ خۆڕاگرانە.**

## تالووت و تاقی‌کردنەوەی لەشکر بە ئاوی ڕووبار

کاتێ کە تالووت خۆی و لەشکرەکەی چوونە دەرێ لە شار و تاکوو نزیک کەوتنەوە لە دوژمنێکی سەرکردەکەی جالووت ناوێک بوو پاڵەوانێکی زۆر ناودار بوو سابیقەی سەرکەوتنی دە شەڕاندا زۆر بوو، جا کاتێ ئاوا لێک وەنزیک کەوتن تالووت تەماشایەکی هەستیارانەی لەشکرەکەی کرد و زانی کاتی ئەوەی هاتووە تاقییان کاتەوە. بۆوەی دەرکەوێ کێیە بە دڵەوە بەرەو پیری شەڕ دەگەڵ دوژمنە و کێیە غیرەتی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو دوژمنەی نییە؟

کوتی بە لەشکرەکەی: خودا تاقیتان دەکاتەوە بە چۆمێک کە دەیگەیێنێ، کێ لە ئاوی ئەو چۆمە وەخوا ئەوە لە لەشکریمن نییە و شەڕکەر نیە دەگەڵ دوژمن، کێش لێی نەخواتەوە، ئەوە لە لەشکری منە و دەتوانێ شەڕ بکا و ڕووبەڕووی دوژمن بوەستێ، یەک دوو لاوێچیش بخوا بۆ گەروو تەڕ کردن ئیشکالی نییە، هەر لە منە و لە لەشکری منە. لە سەیری جەریانی لەشکرەکە وا دەردەکەوێ لە بابەت ئەو تاقی کردنەوە سێ دەستە هاتنە ڕوو لە ناو لەشکرەکە:

١. هەندێکیان بۆ وەی تالووت باوەڕی تەواوی بە شەڕکەریان هەبێ ئەسڵەن هەر ئاوڕیان وەسەر ئاوەکە نەداوە و دەستیشیان پێ تەڕ نەکرد.

٢. هەندێکیشیان بۆ گەروو تەڕ کردن کە ئیجازەیان پێ درابوو لە لایەن تالووتەوە، بە لاوێچ گەروویان تەڕ کرد.

٣. هەندێکیشیان کە بە دڵ ورەی شەڕیان نەبوو، نەیاندەتوانی بەرەنگاری جالووت بن

تێرتێریان ئاو خواردەوە.

سەرەنجام کاتێ تاقی کردنەوە تەواو بوو، ئازا و شەڕکەر و نائـازا و شـەڕنەکەر دەرکەوتـن، تالووت و ئەوانەی ئازا و شەڕکەر و بەئیمان لە ئاوەکە پەڕینەوە بۆ بەرەو پیر وەچوونی دوژمن و ئەوانەی ئاوەکەیان خواردەوە خۆیان بە شەڕنەکەر و نائازا نیشان دا، ئەوانیش پەڕینەوە و گەیشتنە تالووت و ئەوانی دی. جا کاتێ دەستەی ئاوخۆرەوەکان گەیشـتنە تـالووت و ئەوی شـەڕکەر و ئـاونەخۆرەوە، تـالووت کە کەوتە سـەر باسـی شـەڕ و بەرەنگـار بـوونی دوژمـن، دەسـتەی ئاوخۆرەوەی شەڕنەکەر کوتیان: ئەوڕۆ ئێمە توانایی شـەڕمان دەگەڵ جـالووت و لەشـکرەکەی نییە، واتە دەڕۆستی نایەین. وەک خودا دەفەرموێ: ﴿قَالُواْ لاَ طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنـودِهِ﴾ واتە تاقەتی بەرەنگار بوونی جالووت و لەشکری جالووتمان نییە ئەوڕۆ.

ئەوانەی کە ئاوەکەیان نەخواردبۆوە و ئیمان و باوەڕییان بە شەڕ و دیفـاع و بەرەنگـاربوونی دوژمـن هەبـوو تـالووتیش بـاوەڕی پـێ بـوون کوتیـان: لە سـەر بـاوەڕی بە ڕۆژی قیـامەت و ڕووبەڕوو بوونەوە و چوونە ملاقاتی خودا، زۆر دەستە و تاقمی کەمی بەئیمان زاڵ بوون بە سەر دەستەی زۆری بێباوەڕ.وەک خودا ئیشارەی وەلای ئەو قسەیان فەرمووە: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَـةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ﴾ واتە لە سەر ئەمـر و ئیزنـی بـاری زۆر دەسـتەی کەم و بەئـیمان زاڵ بوون بە سەر دەستەی زۆری بێباوەڕ.

جا ئەوجـار تـالووت و لەشـکرەکەی کە ڕووبەڕوو بـوون دەگەڵ جـالووت و لەشـکری، دەستی نزا و پاڕانەوەیان بەرز کردەوە بۆ لای خودا و کوتیان: خودایە هێزی خۆڕاگریمان بدەیە، دەو شەڕ و بەربەرەکانیەدا و هەروا خۆڕاگری لە سەر وێستان لە ڕووی دوژمـن نەک هەڵاتـن و پشت دە دوژمن کـردن، و زاڵیشـمان کە بە سـەر بێباوەڕانـدا. سـەیر کەیـن ڕازێکـی گەورە و بەرچاوی فیداکارانەی تێدا چاو دەکرێ ئەویش ئەوەیە:لە بەر خودا نەپاڕانەوە بۆ وەی نەکوژرێن بەڵکە بۆ خۆڕاگری پاڕانەوە چونکە دەیانزانی مردنی ئاوا عیززەت و شەڕەفە.

**پوختەی مەبەست و تیوتیوەیەک:**

دە ئایەتی ﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ﴾دا دوو شت هەست پێ دەکرێن: ١. کـاتێ تـالووت سندووقەکەی بۆ هێنان و نیشانی دان ئەوجار لەشکرەکە ئامادەگی تەواویان نیشان دا و سـەری ئیتاعەیان دانەواند بۆ تالووت. ئەوجار تـالووت هەلـی شـەڕی هـاتە دەسـت و بـۆی ڕەخسـا، دەستووری شەڕ و حەملەی دا بۆ سەر دوژمن.

٢. تـــالووت ڕووی دە لەشـــکرەکەی کـــرد و کـــوتی: لازم ناکـــا و شـــایان نیـــیە ئەوانەی خۆڕاگرییان نییە و دە خۆ ڕانابینن دەگەڵ من ڕاکەن و بەرەنگاری دوژمــن بــن. ئێســتا وەگەڕێ، بەقازانجمانە نەک کەوتە ڕووی دوژمن و هەڵێ.

لە سەر ئایەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ﴾ چەن مەبەست هەست پێ دەکرێن:

١. موفەســرانی قورئان لەو بارەوە بۆچوونی لێک جیاوازیان هەیە: کە ئـایە دەبــێ وێـژەری ئەو گوفتەیە کە کوتوویەتی (خودا تاقیتان دەکاتەوە بە چۆم، واتە ئاو خواردنەوە) کێ بــێ؟ ئایـا دەبێ تالووت بێ؟ یا پێغەمبەرەکەیان بێ؟

زۆربەی قورئانزانەکان لایان وایە: ئەو گوفتەیە دەبێ گوفتەی تالووت بــێ، بەو دەلـیلە: بە پێی ڕاوێژی بەرنامەی شەڕ و فەرماندەگی شەڕ دەبێ تـالووت بــێ چـونکە ڕاوێژکـاری پێشـوو دەگەڵلەشکری تالووت بوو.

هەندێکیش نەزەریـان وایە پێغەمـبەری کـاتی خۆیـان بـووە کە ئەو قسـە تـاقی کـردنەوەی کوتووە، و لە ســەر ئەو نەزەرش لازم نـایە کە تـالووت پێغەمـبەر بــێ. جـا مەگەر تـالووت ئەو کوتەیەی بۆ ئیلهام کرابــێ لە لایەن خـوداوە و ئەویـش ناچـارەن ڕایگەیانـدبێ. جـا ئەگەر ئەو ئیحتیمالەی بۆ بگرین ئەودەم ناڕەوا نابێ بکوترێ: تالووت هەم پاشا بووە هەم پێغەمبەر.

٢. یا ئەگەر بێتوو بکوترێ: وێژەری مانای ئەو ئایەتە پێغەمبەرەکەیان بووە ئایەتەکە دە تەعبیر و بەراورددا ئاوای لێ بە سەر دێ: (فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَـالَ لهـم نبـيّهم إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِـيكُم بِنَهَرٍ) چونکە تالووت لەشکرەکەی خـۆی لە شـاری دوور خسـتەوە، ئەوکـات پێغەمبەرەکەیـان پێیانی کـوت خـودا ئێـوە بە چـۆمێ تـاقی دەکـاتەوە. دە دیـارە بەو پێـیە لەشـکر لە شـار دوور خراوەتەوە و بەرەو دوژمن دە ڕێیەدایە، هەر دەبێ پێغەمبەرەکەیان بێ خاوەنی ئەو کوتەیە.

دڵی بزۆز دەیهەوێ بزانێ ڕاز و حیکمەت دەو تاقی کردنەوە ڕاستەوخۆ و ئاشـکرایەدا و لە بەر چاوی هەموو ئەفرادی لەشکر چ بــێ؟ لەو بـارەوە زانایـانی قورئـان کوتوویـانە: ئەو تـاقی کردنەوەیە ئیحتیمالی دوو شتی لێ دەکرێ، ئەقڵیش بە ڕەوایان دەزانێ:

١. بەنیئیسـرائیلیەکان ئەو ڕەفتارانەیان بە پێی ڕەوشت و خوویان دەگەڵ دەلیـل و بورهـان لە ســەر دروســتکاری و ڕاســتگۆیی پێغەمــبەران و شــایەکانیان مخالەفەتیــان هەر کــردوون و دەیانکردن جا بۆیە خودای تەعالا دەگەڵ ئەوەی تالووت سندووقەکەشیانی بۆ هێنـایەوە، بەڵام بۆ ئیتمینانی تالووت تـاقی کـردنەوەی هەر بـۆ دانـان تـاکوو ئەو لەشـکرە پـێش ئەوەی دەگەڵ

دوژمن تێک چرژێن دەرکەوێ خۆڕاگر دەبێ یان نابێ؟ بەو پێشبینیە نەچوونە ناو ڕیزی شەڕ و جەبهەوە تەئسیرێکی دانانێ لە سەر شەڕیان و دوژمنیش نازانێ بە هێزی لەشکر و بێ هێزی لەشکر. بەڵام هەڵاتن و کشانەوە وپشت دە دوژمن کردن هەم دوژمن پێی وە غیرەت دەکەوێ هەم هاواڵانی شەڕت پێی بێ غیرەت و بێ هێز دەبێ.

با ئەوەش وەقۆزین و پاشقولی نەدەین: ئەو ڕووبارەی کە خودا بۆ تاقی کردنەوەی دانا، نەزەری جۆراوجۆری لە سەر هەیە کە چۆمی کوێیە؟

قەتادە و رەبع کوڕی ئەنەس کوتوویانە ڕووباری نێوان ئوردون و فەلەستینە. ئیبنیعەباس و «سدي»ش کوتوویانە: تەنیا چۆمی فەلەستینە. ئەمما خاوەنی کەششاف نەزەری ئاوایە: کاتێ شەڕەکە کاتێکی گەرما بوو بە بیابانێکی قاقڕ و بێ ئاودا ڕۆیشتوون لە خودایان داوا کردووە چۆمێکیان بۆ بێنێتە ڕوو کە خۆی پێ فێنک وەکەن. تالووت فەرماندەکەشیان ئەو مزگێنیەی پێ داون چونکە ئێوە بۆ خودا بەرەنگاری دوژمنی خودا دەبن هەرچی لە خودا بخوازن و دە شەئنودا بێ خودا دەوداتێ. ئەوانیش ئەو هیوایەیان هەبوو داوایان لە خودا کرد و خوداش داوای بەجێ هێنان.

ئەوەش زۆر پێویستە بزاندرێ: ئایا ئەوانەی ئاوەکەیان خواردەوە چونکە تالووت کوتبووی هەرکەسێ لەو چۆمە وەخوا لە من نییە واتە لە لەشکری من نییە، ئایا گەڕانەوە یا دەگەڵ تالووت چوون و بوون؟

زۆربەی زانا و مێژووناسەکان نەزەریان وای بۆ چووە کە چوون، بەو دەلیلە کە ئایەتی ﴿لاَ طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنودِهِ﴾ ئیشارە وەلای ئەوەیە ئەو قەولە وەک قەولی ئاوخۆرەوەکان دەچێ. جا لە سەر ئەو باوەڕە تا لە چۆمەکە ڕەد نەبوون و نەگەیشتوونە ڕووبەڕووی جالووت و لەشکرەکەی دوور و نیزیک نەگەڕاونەتەوە هەر ئەوەندە دوژمن نەیزانیوە بەو گەڕانەوە. ئەو دەلیلە و ئەو نەزەرەشیان بەبێ هێز داناوە.

وەک هەموو دەزانین بەشێکی زۆرمان لەو داستانە عیبرەت ئەنگیزە زانی و تێی گەیشتین بەڵام بۆ حاڵی بوون لە بنەکەی و نەتیجەکەی هەر ماومانە و چاوەڕوانین، جا لە سەر ئەو هیوایە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٥٠ لەویشڕا وە نزیک دەکەوین لە ئاخرەکەی و نەتیجەکەی:

﴿٢٥٠﴾ وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالُواْ رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ

**کاتێک دەگەڵ جالووت و لەشکرەکەیدا ڕووبەڕوو وێستان، کوتیان: ئەی پەروەردگارمان خۆڕاگری بدە پێمان، بڕێژە بە سەرماندا خۆڕاگری و پتەومان کە، و هەروا زاڵیشمان کە بە سەر دەستەی بێ باوەڕاندا.**

## پاڕانەوەی لەشکری تالووت

سەرەتا کاتێ کە خاوەن هێز و ئاقڵەکانی لەشکری تالووت خۆیان بە دەستەیەکی کەم و کەمهێز لە قەڵەم دا، سەرەڕای ئەوەش فەتح و زەفەر و سەرکەوتنیان لە ژێر ئیزن و ئیرادەی خودا بە نەسیبی خۆ کرد، ڕوونیان کردەوە بۆ هەموو دەور و زەمانێک کە سەرکەوتن دە هەموو ڕاست و بوارانـدا لە لای خـوداوە دێ و دەسـت دەکەوێ. و هەروا دە کـاتی ڕووبەڕوو بـوون دەگەڵ لەشکری جالووت کەمی خۆیـان و زۆری دوژمنیـان لـێ دەرکەوت، ولەو لایەشـەوە ئیـرادە و غیرەت و هیوای سەرکەوتنیان دە خۆدا چاو دەکرد و دە دوژمنیشیاندا بێ ئیرادەیی و بێ هیوایی سەرکەوتن و بێ غیرەتییان چاو دەکـرد، جـا لە سـەر ئەو نـیەت و بـاوەڕەی کە لە ئـایەتی ٧٧ی فورقاندا هەست پێ دەکرێ و چاو دەکرێ، بەرەو خودا دەستی نزا و پاڕانەوەیان بەرز کـردەوە و کوتیان: ﴿رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا﴾ واتە خودای ئێمە! خۆڕاگری و خـۆ قـایم و قـۆڵی بڕێـژە بە سـەرماندا. ﴿قُلْ مَا يَعْبَأُ بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَاؤُكُمْ﴾ (فرقان: ٧٧) واتە ئەگەر لە بەر نـزا و پاڕانەوەکانتـان نەبێـت پەروەردگارم بەهیچ جۆر گوێی پـێ نەدەدان. ئەئەوە ئاماژەیە وەلای ئەوە کە دەبـێ بـۆ سـەرکەوتن بە سەر کاراندا پاڕانەوە لە بەر خودا فەرامۆش نەکرێ.

جا ئەدێرەدایە کە تالووت و لەشکرەکەی ئەو داوایەیان لە خودا خواست و خوداش گـوێی پێ دان و لێی وەرگرتن.

با نەختێک لە ئایەتی ﴿رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا﴾ وەکۆڵین، ئەو ئایەتە ئەوەی لێ چاو دەکرێ و هەست پێ دەکرێ: سەبر واتە سبات و خۆڕاگری. سباتیش واتە وێستان دە بەرابەر هەموو گیـر و گرفتێکی کە ڕووبەڕووی گیان و ژیان دەبێتەوە. بێگومان ئەو لە سەر لاق ڕاوەستانە دە ئیرادە و ویستی خودادایە، بۆیە نزاگەران ئاوا لە بەر خودا دەپاڕێنەوە ﴿وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا﴾ واتە سـابیت و ڕاوەستاو کە لاقەکانمان. ئەوەشی دە باغەڵدا ئەو نزایە: واتە خـودایە ئەمـن ڕاوەسـتاو کە بەڵام دە پاڵ ڕاوەستاوی من دوژمن ناڕاوەستاو کە. واتە ترس بخە ناو دڵی و خۆ وەخۆگری لێ داماڵە.

**پوختەکارییەک دێرەدا:**

کاتێ تالووت و لەشـکرەکەی ڕووبەڕووی جـالووت و لەشـکری بـوون دیتیـان کە ئەوان

زۆرن دە نەفەردا بەڵام وایان لێ دەردەکەوێ کە کەم بن دە ئیرادە و خۆڕاگریدا. بەڵام ئێمە کەمین دە نەفەردا لە چـاو وان، بەڵام زۆریـن دە ئیـرادە و سـەبر و خۆوەخۆگریـدا. ئەوەش نیشـانەی شکستی وانە و سەرکەوتنی ئێمەیە. جا بۆیە کەوتنە نزا و پاڕانەوە لە خودا وەک دە دڵماندایە هەر وا بێتە پێشێ خۆڕاگریمان دەیە تا دەگەینە ئەو نیەت و مەقسەدە کە سەرکەوتنی مەیە و شکستی وانە.

دەبـێ ئەو باوەڕەشـمان ببـێ: سـەرکەوتنی هەر بە دوعـا و پـاڕانەوەی ڕووت لە ڕاپەڕیـن داپەڕین نایەتە جێ و نەهاتۆتە جێ بۆ کەس. نەبیستراوە پێغەمبەرﷺ ئایینی ئیسلامی هەر بە نزا و دوعا و نوێژ و ڕۆژوو سەر خسـتبێ و دەری خسـتبێ لە دنیـادا. بەڵـکە ڕاپەڕیـن و ڕاکەوتـن و تێکۆشانی وەپێش هەموو دوعایەک خستووە، جا دەپاڵ ئەو جیهاد و ڕاپەڕینەدا لە سەر ئەساسی ئیمان و باوەڕی دوعا و نزاشی کردووە لە خودا بۆ سەرکەوتنی.

دڵ هەر چاوەڕوانە بۆ وەی بزانێ کەنگێ و لە کوێ و چۆناوچۆن تـالووت و لەشـکرەکەی سەرکەوتن بە دەس دێنن و جالووت ولەشکرەکەی تێـک دەشـکێن. جـالووتیش دەکەوێـتە بەر ڕەهێڵەی زەبری قورس و گرانی تالووت و یارانی. جا دەبێ بـۆ ئەو مەبەسـتە چـاوەڕوانیە خـۆ بگەیێنینە ئایەتەکـانی ٢٥١ و ٢٥٢ لەوانـڕا دەرکەوێ داری بەرزی شـەڕ بە کـامە لایەدا دەکەوێ. ئەوەش ئاشکرایە سەرکەوتن بۆ یارانی خودایە واتە تالووت و هاواڵانی. سەرشۆڕی و نەدامەتی بۆ ئەو کەسانەیە هێرش دەکەنە سەر خاک و نیشـتمان و مـافی خەڵـک و داگیـری دەکەن وەک جالووت و هاواڵانی و جالووتسیفەتان بێ. ئەوەش ئایەتی ٢٥١:

**﴿٢٥١﴾ فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ اللّهِ وَقَتَلَ دَاوُدُ جَالُوتَ وَآتَـاهُ اللّهُ الْمُلْـكَ وَالْحِكْمَـةَ وَعَلَّمَـهُ مِمَّـا يَشَـاء وَلَوْلاَ دَفْعُ اللّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الأَرْضُ وَلَـكِنَّ اللّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ**

**بە ویسـتی خـودا تێکیـان شـکاندن، داوود لەوێـدا جـالووتی کوشـت، خـوداش پاشـایەتی و کاربەجێیی پێ دا و لەو زانینەش کە خودا خۆی کەیفی لە سەر بـوو فێـری کـرد، ئەگەر خـودا هەندێ خەڵکی بە هەندێکی دیکە لەنـاو نەبـردایەت، ئەو سـەرزەوییە تیـا دەچـوو. بەڵام خـودا خاوەنی بەخششە بۆ هەموو جیهانیان.**

## تێکشکانی لەشکری جالووت

**تێڕوانین و ئاوڕ وەسەر دانەوەیەکی هەستیارانە:**

دیارە وەک لە بەر چاوە و دیارە خودای بانی سەر، کوتەی یارانی تـالووت کە پـێش ئەوەی

بگەنە مەیدانی شەڕ و کوتیان ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ وەڕاستی گێڕا و سابتی کرد. هەروا خودای تەعالا ئەو سەرکەوتنەشی دا پاڵ خۆی. واتە ئەگەر هیمدادی خودا نەبایە ئەو سەرکەوتنە نەدەهاتە ڕوو. پاش تێکشکانی جالووت و لەشکرەکەی ئەوجار هاوار هەڵستا کە داوود جالووتی کوشت.

## داوود کێیە؟

دڵ حەز دەکا داوود بناسێ کە کێیە و لە کوێڕا دەگەڵ لەشکری تالووت کەوت و ئەو فەتحە ناودار و بێوێنەیەی کە قورئان سەبتی کردووە بە نەسیب بووە؟

لە ئیبنی عەبباسەوە خەبەر دەبیسین کە داوود شوان بووە و ٧ برای بوون کە براکانی دەگەڵ تالووت بووە. جا لەوەیڕا کە بابی داود لە کوڕەکانی کە دەبنە برای داوود ماوەیەکی درێژ بوو لێیان بێ خەبەر بوو، بابی داودی وەدوا خستن تاکوو پەیسەرێک و سۆراخێکیان دەست خا بۆ بابی بێنێتەوە. ئەوان کە لە شەڕێ بوون داودیش کە شوێنی ئەوانی گرتبوو بەری هەتا دەیاندۆزێتەوە. بە سەر شەڕێدا دەکەوێ و دەبینێ دەو کاتەدا جالووتی دێوەزمەی زۆردار ئەوە لە مەیدانی شەڕە و دەنەڕێنێ بۆ وەی کێیە بێت و دەگەڵی بکەوێتە شەڕ. دیار بوو کەس توانایی ئەوەی نەبوو بۆی هاتبایە مەیدانێ. ئەدەوەیدا جالووت بە تانە و تەشەرەوە هاواری کرد و کوتی: ئەی بەنی ئیسرائیل ئەگەر ئێوە دەڵێن ئێمە حەقین و لە سەر ئایینی حەقین، ئەدی بۆچی یەکو بۆم نایەنە مەیدانێ؟ ئەدەوەدا داود غیرەتی وەجۆش هات و ڕووی کردە براکانی خۆی پێی کوتن ئەوە لە ناو ئێوەدا کەس نیە بۆ ئەو خەتەنە نەکراوە بڕواتە پێشێ. براکانی وڵامیان نەداوە و سکووتیان نیشان دا. ئەوجار خۆی لە براکانی دزیەوە و چوو بۆ لایەک کە لەو شوێنە تالووت لەشکرەکەی بۆ شەڕ هان دەدا و لە ڕیزی دەدان. داود ئەلەو جێگایەدا بە تالووتی کوت: بە جەسوورانە ئەمن بۆی دەچمە مەیدانێ و عادەتیشم وایە بە قۆچەقانی هیچ شت نابوێرم. چونکە شوان بووم و کارم زۆر پێ کردووە بۆ گورگ و شێر و بەبر و پڵینگان هیچم قوتار نەکردوون دە کاتی پارازتنی مەڕەکانمدا. تالووت هەر زۆر زوو دەرکی ڕەشادەت و ئازایەتی لە داوودی چاو کرد و ئافەرینێکی پێ بەشی و پێی کوت: جا ئەتۆ دەوک اتەدا ئەو قۆچەقانیەت پێیە؟ داود کوتی بەڵێ پێمە و قەتی دانانێم وەسیلەی شەڕمە و سووکیشە بۆ هەڵگرتن. تالووت فەرمووی پێی: دەس پێ بکە بە ئیزنی خودا. داواد یەک بەردی خڕ و لاباری خستە ناو قۆچەقانیەکەی و هەڵیسووڕاند و هاویشتیە جالووتی فیلەتەن دای لە سینەی پان و بەرینی جالووتی گێژ کرد و

دای لە زەوی و غاری دایە سەری و دەستووری سەربڕینی لە لایەن تالووتەوە پێ درا و سەری گۆشاوگۆش بڕی و لێکی کردەوە و هەڵیهێنا تاکوو لەشکرەکەی چاوی کەن، هاواری کوشتنی جالووتێ مەیدانی داگرت و لەشکرەکەش تێکشکان و کوژران و یەخسیر کران، ئەوە بوو داستانی داودی سەرەنجام داوود هەم پاشا و هەم پێغەمبەرایەتی بوو بە نەسیبی، وەک دیارە لە هۆزی بەنیئیسرائیل بەغەیرەز داوود کەسی دی بەو مەقامە نەگەیوە.

**تیوتیوە:**

دیارە وەک خودا ئیشارەی وەلا فەرمووە لە لایەن خوداوە داوود زانیاری و زانستی فێر کرا ئەگەرچی عیلم و زانستی پێغەمبەران بەرفراوانە بەڵام خودای تەعالا سنووورداری هەر کردووە. دیارە وەک دەو جۆرە کارەسات و بەسەرهاتانەی وەک تالووت و جالووت و ئیبراهیم و نەمروود و مووسا و فیرعەون و محەمەد و ئەبووجەهل و وێنەکانیان، یاسا و نیزامێکی زۆر ئەساسی و بەرز و بەرچاو هەست پێ دەکرێ و دیارە، وەک ئەوە ئەگەر خودای لێزان و کارزان و کارجوان، پێشەوبڕەی زوڵم و زۆرداری و تەجاوەزگەری زاڵمان و سەرەڕۆیانی نەداباوە بە وەسیلەی هیممەت و ئازایەتی خاوەن باوەڕانی ڕاست و دروست و ئەمینیانی گەل، فەساد وفەسادکاری و وێرانی و وێرانگەری دنیای داگیر دەکرد و دەیدایە بەر خۆی، ئەودەم ژیانی ئابڕوومەندانە بۆ کەس نەدەما. کەوایە دەبێ خۆ حازر کەین بۆ شوکر و سپاسی ڕەحمەت و بەرەکەتی خودا نسیبەت بە بەندەگانی.

دەبێ ئەوەشن باوەڕ پێ بێ بە تەواوی بیکەینە حەڵقە و دە گوێی کەین هەچی بە دەست و شان و باهۆی خۆی ئینسان گیری نەهێنێ گیری ناکەوێ هەروەک خودای بانی سەریش ئیشارەی وەلا فەرمووە لە ئایەتی ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ﴾ (نجم: ٣٩) واتە **مرۆ هیچی دەس ناکەوێ بێجگە لەوەی بە هەوڵ و کۆششی خۆی دەستی دێنێ.** دەست لە سەر دەست دانان و چاو لە دەستیو هەر خواردن و قسە بەڕەڵلا کردن هیچی لێ بەرهەم نایە بەجوز ژێردەستی و ژێرچەپۆکەیی. دەبێ ئەوە لە بیر نەکرێ ژیانی پێغەمبەران کە نموونەن دە ئینسانیدا بەو هەموو ڕاپەڕین و تەکان و جووڵانەوەی لە خۆیان نیشان داوە، بە دەرسی سەرمەشقی وەربگیرێ.

لە پێشدا ئەوەمان ڕاگەیاند گە ئەو داستانی تالووت و جالووت ناکرێ لە سەر و بنی تێگەیشتن تا نەگەینە ئایەتی ٢٥٢ لەوێ کە دادەکوژێندرێ لە سەر و بنی تێدەگەین و حاڵی دەبین. ئەودەم دەبێ بڵێین و ئیقراریش پێ بکەین، کە تەواوی ئەو داستانە و بەسەرهاتانەی باس

کران لە داستانی گەلی حـزقیلەوە بگـرە تـا داسـتانی شـەڕی تـالووت و جـالووت لە نەتەوەی بەنیئیسـرائیل و هەروا کوشتنی دێوەزمەی وەک جالووت بە دەستی داود، سەراپای ئەوانە و ئی دیش لە وێنەی ئەوانە نیشانە و دەلیل و بورهـانن لە سـەر حـیکمەت و قـودرەت و تەوانـایی و زانستی باری تەعالا. کەوایە دەبێ سەژدە هەر بۆ ئەو بچێ، ئیتاعە هەر لەو بکـرێ، پەنـاش هەر بۆ ئەو ببرێ، داواش هەر لەو بکرێ. بۆ ئیسباتی ئەو داوا و ئیـدیعایە دەچیـنە خـزمەت ئـایەتی ٢٥٢:

﴿٢٥٢﴾ تِلْك آيَاتُ اللّه نَتْلُوهَا عَلَيْك بِالْحَقِّ وَإِنَّك لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ

**ئەوانە سەراپا بەڵگە و نیشانەی خودا بوون، بەڕاستی و هەق دەیخوێنینەوە بە سەرتا، بێ گومان ئەتۆش یەکێکی لە پێغەمبەران.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە:**

دێرەدا هەرکەس خـاوەنی هەسـت و ئەقـڵ و شـعوور بـێ دەیسـەلمێنێ و بـاوەڕ دەکـا کە پێغەمبەران بەرز و بەڕێزی لای خودان و خوداش خەبەرداری ئەوەی نیازیان بێ دەیانکـا. دەنـا نەخوێندەوارێکی وەک محمدالمصطفی ئاوا بە ڕێکوپێکی و پوخت و پاراو چۆن بەسـەرهات و داستنای ئاوا دوور و درێژ دەزانێ و بە پاڵاوتە و بێکەموکووڕی بۆ عالەمی بەیـان دەکـا. جـا ئەدێرەدایە کە خودا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى وَلَـكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ بێ گومـان لە **بەسـەرهات و چیرۆکەکانیانـدا پەنـد و ئامۆژگـاری هەیە بـۆ ئەوانەی خـاوەنی هەسـت و ژیـرین. قسـەی هەڵبەستراویش نین، بەڵکوو مۆرکەری ئەو شتەیە کە دە پێش خۆیدا بووە، ڕوونـکەرەوەی هەمـوو شـتە و ڕێنوێنیکەر و ڕەحمەتە بۆ گەلێک کە ئیمان دێنن.**

## واژەکانی (تلک) و (ذلک)

شتانێک لە سیمای ئایەتەکە هەست پێ دەکرێن کە ڕەنگە بواردنیان بۆ هەنـدێک زانسـت و ئاگاداری زیانی ببێ جا بۆیە دەمهەوێ نەختێک ئاماژەیان وەلا بکەم.

١. ڕەنگە واژەی (تلک) ئیشارە بێ وەلای ئەو بەسەرهاتانەی کە لە لەفزی (الوف) دە ئایەتی ٢٤٣دا هاتووە. و هەروا مراندن و زیندووکردنەوەیان و بە شا کردنیان وەک تـالووت بـێ، چـاو کردن و بیستران، و هەروا (تلک) ئاماژە بێ بۆ زاهیر کردنی تابووت واتە سندووقی مبارەک و پڕ

لە ئاساری پێغەمبەرانی لە ئاسمانەوە بە وەسیلەی فریشتەکان بۆ لای تالووت و سەرکەوتنیشی بە سەر جالووت و کوشتنیشی بە دەستی لاوێکی کاڵ و تازە پێگەیشتوو وەک داوود بێ. جا دەبێ بە دڵ وەریگرین ئەو کارەساتانە بە تەواوی دەلیل و نیشانەی حیکمەت و قودرەت و لەکارجوانی و لەکارزانی و ڕەحمەت و بەرەکەتی خودان، کێ مونکیر بێ ئینسانەتی دەشکدایە.

٢. ئەگەر کابرایەکی عەرەبی عیلمزان بڵێ جا بۆ دێرەدا (تلک) دەکار کراوە، خۆ (تلک) بۆ عالەمی غەیب بە کار دەبرێ؟ بۆ (هذە) نەهێندراوە کە بۆ عالەمی حازرە؟ ئەمەش دەڵێین ئەو جوابەمان دە ئایەتی ﴿ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾دا داوەتەوە بەو جۆرە: (تلک) و (ذلک) هەردوو بە مانای (هذا و هذە) هاتوون کەوایە (تلک) دێرەدا بۆ عالەمی حازرە.

٣. دەبێ بکوترێ دە (نتلوها)ی ئایەتەکەدا واتە حەزرەتی جبرەئیل بۆ تۆی محەمەدی دەخوێنێتەوە، لە بەر ئەوە دەبێ وا بکوترێ: خوێندنەوەی جبرەئیل لە جێگای خوێندنەوەی خودایە.

٣. ئەوە کە خودای تەعالا لە پاش داستانەکە دەفەرموێ بە پێغەمبەرﷺ: ﴿وَإِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾چەن ئیحتیمال و شت دە ئامێزی خۆ دەگرێ:

١. یەکێک لە ئیحتیمالەکان ئەوەیە: ئەتۆ بێ ئەوەی هیچ خوێندەواری و کتێبی ئەو داستان و بەسەرهاتە پڕ لە عەجایبە بۆ عالەم بەیان دەکەی بێ هەڵە و پەڵە، کە بە هەڵکەوت مەگەر دەنا خوێندەواریش ئاوای نازانن، کەوایە ئەتۆ پێغەمبەرایەتیت بۆ ئینکار کردن نابێ مەگەر لە لای ئەوانەی کە مونکیری ئینسانیەتی خۆیانن.

٢. دووهەمین ئیحتیمال ئەوەیە: خودا ڕادەسپێرێتە پێغەمبەر کە تۆ لە ڕاست مونکیرانی خۆت و قورئان سەخڵەت مەبە چونکە پێغەمبەرانی پێش تۆش ئەو زەبرەیان لە دەس خەڵک دیوە و چەشتووە.

## گۆشەیەک لە مێژووی بەسەرهاتی تالووت و جالووت لە «قصص الانبیاء»وە

بەنیئیسرائیل واتە عەبرانیەکان سەرەوژێر بوونەوەیان بۆ سەرزەوی و وڵاتی فەلەستین پاش فەوتی حەزرەتی مووسا بۆ ماوەی ٣٥٦ ساڵ سەپەرستی و شایەتی ئەو وڵاتەیان دەس خۆیان گرتووە و دەو ماوەیەدا ٣٥٦دا بە هۆی هێرش وپەلاماردانی جیرانەکانی خۆیان وەک هۆزەکانی عەمالیقە عەرەبەکان و ئەهالی مەدیەن و فەلەستینیەکان نەفەسی ڕاحەتی و حەسانەوە

و ئارامیان بە خۆوە نەدەدی، وەک هەموو داگیرکەرێک دەبایە لە خۆ ئەمین نەبانە. دەو هێرش و شەڕانەی تووشیان دەبوون و دەکرایە سەریان، جارجار تێدا سەردەکەوتن و جارجاریش ڕەبن دەکەوتن. دە ناوەڕاستی سەدەی چوار دە دەورانی «عالی کاهن» عەبرانیەکان دەگەڵ فەلەستینیەکانی دانیشتووی شاری «اشدود» لە نزیک وڵاتی غەززە تووشی شەڕ و پێکدادان هاتن. فەلەستینیەکان بە سەریاندا پیرۆز بوون و سەر کەوتن. ئەو تابووتە (سندووق)ە مبارەک و پیرۆزەی کە دە کاتی خۆیدا لێیان گرتبوون و زۆریشی پێوە سەخڵەت و داماو و کەساس و بەپەرۆش بوون، لێیان ستاندنەوە. شێوەی شەڕەکە و لێ‌ستاندنەوەی سندووقەکەش لەوەڕا بوو ئاوا بوو: لە فازڵ و پیاوە ناودارەکانی ئەو بەشە بەنی‌ئیسرائیلیانەی لە هەوەڵەوە دەرکرابوون و سندووقەکەیان لێ سێندرابوو پاش مووسا، پێغەمبەرێکیان بوو بە ناوی صموئیل، دەستەیەک لە ناوداران و ئەشرافەکانی ئەو کاتی بەنی‌ئیسرائیلەکان لە شاری ڕامەڵڵا هاتنە خزمەت ئەو پێغەمبەرە بۆ ڕاوێژکاری لە بابەت گرتنەوەی وڵاتەکەیان و ستاندنەوەی سندووقەکەیان لەو داگیرکەرانە (عەمالیقەی بەنی‌ئیسرائیل). لە ناو ڕاوێژکاریەکەدا ئەو داوایان کرد لە پێغەمبەرکە، کە بە هۆی ئەوەی ئەمە کەسێکی وامان نییە ڕێک‌وپێکمان کا بۆ بەرەنگار بوونی دوژمن و شەڕ دەگەڵ کردنی، دەبێ پاشایەک و ئەمیرێکی وامان بۆ هەڵبژێری و تاعین کەی، کە بتوانێ ڕێکمانخا و وێکمانخا. پاش باسێکی زۆر و تاوتوێ کردنی جەریانی پێغەمبەرەکەیان ئەوە بوو کە تالووتی بۆ دیاری کردن. دیارە جەریانی هەڵبژاردنی تالووت و تێکشکاندنی جالووت لە ئایەتی ٢٤٦ەوە تا ئایەتی ٢٥١ خودای تەعالا هەنگاو بە هەنگاو بۆ پێغەمبەری باس دەکا و پێی دەڵێ جا کێ خوازیارە لەوێڕا تاوێ بە وردی سەیری کا.

## سندووقی پیرۆز چ بوو؟

پێویستە تا ئەو جێگایەی ڕیوایەت و نەزەر هەیە لەسەر ئەو تابووتە (سندووقە) ناودارە ڕاگەیێندرێ. گۆیا ئەو سندووقە مبارەک و موقەددەسەی یەهوودیان لە سەرەتای هاتنی ئادەم بۆ سەر زەوی، خودای تەعالا داویەتە ئادەم کە مایەی ئارامی و دامەزران و سووکنایی دڵانە. دەبێ ئەوەش باوەڕ کەن هەر دڵێک موقەددەساتێکی هەیە پێی دادەمەزرێ و سووکنایی دەگرێ. وەک لە ئیشاراتی ئایەتەکانی ٢٤٨ی بەقەرە، ٢٦ی فەتح، ٢٦ی تەوبە، ٤٠ی تەوبە، ١٨ فەتح و ٤ی فەتح دەردەکەوێ. (سکینة) واتە ئارامکەرەوە و دامەزرێنەرێک هەبێ بۆ ڕۆح و لەش.

جا ئەوجار لە ئادەمەوە دەستاودەست هاتووە تا گەیشتۆتە دەستی یەعقووب پێغەمبەر.

پاش یەعقووب لە ناو گەلی بەنیئیسـرائیلدا مـاوەتەوە و هەروا بە وەسـیلەی ئەو تـابووتە، زۆر جاران بە سەر دوژمنانیاندا زاڵ بوون و سەر کەوتوون و توانیویانە تا ئەو جێگایەی ڕێزیـان لـێ گرتووە و بە پاک و موقەددەسیان زانیوە بەهرەیان لێ وەرگرتووە، بەڵام کاتێ کەوتوونەتە گوناح و ناشکوری بەو موقەددەساتە لە دەستیان دەرهێنـان عەمالیقەکـان و دەریشـیانکردن لە وڵاتـی خۆیـان. دەتـوانم بڵـێم ئەدێـرەدا وەک ئـێمەی ئەوڕۆ بە ڕواڵەت تـابیعی قورئـان و سـوننەتین، قەداسەتیان نازانین و ناشکوریان پێ دەکەین بۆیە لە هەمـوو وڵاتـانڕا دێـن و دەشـمانکوژن و حەیامان دەبەن و کوێخایەتیشمان لە سەر دەکەن. جا دەبێ ئەوە بسەلمێنین ناشکوری خۆ لە بیر چوونەوەیە چونکە ڕوح یا بڵێین حەیات پاڵوپشتێکی دەوێ بۆ خۆڕاگری و وێستان دە هەمـوو کاتاندا. جا ئەو پاڵپشتەش خودا بێ، یا ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ بێ، یا حەسەن و حسێن بێ یـا تابووتی بەنیئیسـرائیلیان بێ، یا ئاوری ئاورپەرستان بێ.

## تیوتیوە و پوختەی مەبەستی ئایەتەکانی ٢٤٦ تا ٢٥١

١. ئایەتی ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلَإِ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ مِن بَعْدِ مُوسَى﴾ واتە ئایا ئەی پێغەمبەر ئەتـۆ چـاک بەرجەوەند نەبووی و دەنگوباسی پیاوماقووڵانی نەوەکانی یەعقووبت لە پاش مووسا پێ نەگەیشتووە؟

دیارە وڵامی ئەو پرسیارە دە ناو خودی ئایەتەکەدا ڕازاوە، واتە بەڵێ، ئەی پێغەمـبەر دەزانـی بەسەرهاتی ئەو قەومەی بەنیئیسـرائیلە کە لە بەر لێقەوماویانیان چوونە لای پێغەمبەرەکەیان کە ڕێی نەجاتیان بۆ وەدۆزێ، پێغەمبەرەکەشیان ناوی «اسموئیل» بووە.

٢. کەلیمەی (ابعث) واتە «کوتیان بە پێغەمبەرەکەیان کە ناوی «شمویل» بـوو: کەسـێکمان بـۆ هەڵبژێـرە بە ڕێـبەر تـاکوو لە ژێـر فەرمـانی ئەودا دەگەڵ دوژمنەکەمـان شـەڕێ بکەیـن تـا دەریاندەکەین لە وڵاتمان.

٣. ئایەتی ﴿قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ﴾ لە سیمای ئەو ئایەتەدا دەردەکەوێ کە ئەو پێغەمبەرە ئەخلاقی ئەو قەومەی دەزانی بۆیە وای دواندن تاکوو قەسـتی شـەڕ (جیهـاد) دە دەروونی واندا وەجووڵێ و وەجۆش بێ. ئاوا بە تەعنە و تانە پێی کوتن، بەڵێ ئێستێ پاشایەکو بۆ دانێم و ئێوەش دە کاتێ کە شەڕ هاتە گۆڕێ و لە سەرو بە لازم گەڕا، ئیتاعەی نەکەن.

٤. ئایەتی ﴿قَالُواْ وَمَا لَنَا أَلاَّ نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ کوتیان مەگەر ئێمە لە سەر وڵات و مڵک و مـاڵ و ژیانی خۆمان لانەبراوین و دەرنەکراوین، ئەوە دە وەڵامی پێغەمبەرەکەیاندا کوتیـان لە سـەر ئەوەی کە تانەی لێدان. ئەوە دەمەقاڵێیان دەگەڵ پێغەمبەرەکەیان دەو زەمـانەدا بـوو کە لە وڵاتـی شـام

دەرکرابوون و بە سەرگەردانی لە وڵاتی عێراق و حیجاز و میسردا دەسووڕانەوە.

٥. ئایەتی ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوْاْ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمْ﴾ واتە بەڵێ کاتێ شەڕیان لە سەر واجب کرا بەشێکی کەمیان نەبێ، ڕوویان لێ وەرگێڕا.

٦. جوملەی ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾ واتە خودای ئاگادار پێش ئەوەی بڵێن و نەڵێن، ئاگاداری ئەو زاڵمانە بوو و دەیزانی چەندیان ئامادەی شەڕ دەبن و چەندیشیان ئامادە نابن بە دڵ.

٧. جوملەی ئایەتی ٢٤٧ کە دەفەرموێ ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا﴾ واتە ئایەتی ٢٤٦ کورتەیەک بوو لە سەرەتای دامەزراندنی شەڕی بەنیئیسرائیل دەگەڵ جالووت ئەمما ئەو ئایەتی ٢٤٧ە بە درێژایی باس لە شەڕەکە دەکا.

٨. جوملەی ﴿إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا﴾ واتە اشمویل پێغەمبەر بە وانی ڕاگەیاند ئەوە خودای تەعالا تالووتی بە پاشا و ئەمیرتان بۆ فەرماندەی شەڕ هەڵبژارد.

٩. ئایەتی ﴿قَالُوَاْ أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا﴾ ئەوە ئیشارەیە وەلای هەوەڵین قەول شکاندنێکی کە ئەوان بە شێوەی ئیحتیراز دە بابەت شەڕەکەدا دەیانویست.

١٠. ئایەتی ﴿وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ﴾ ئەوە ئاماژەیە وەلای دووهەمین ئیحتیراز و ناڕەزایەتیان لە هەڵبژاردنی تالووت بە پاشا و ئەمیری شەڕ.

١١. ئایەتی ﴿قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ﴾ ئەوە ئاماژەیە وەلای ئەوەی پێغەمبەرەکەیان ویستی تێیان گەیێنێ ئەوە تالووت خودا هەڵبژرادوە بۆتان نەک ئەمن، کەوابێ نابێ ناڕەزایەتی و ئیحتیرازو بێ لەو بارەوە.

١٢. ئایەتی ﴿وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاءُ﴾ واتە خودا لە ئاخرین پەیامی خۆیدا لە باری عەقیدەوە تێی گەیاندن پاشایەتی دە دەستی خودادایە، بە هەرکەس بیهەوێ دەیداتێ کەوایە ئەوەی دراوە بە تالووت ئیرادە و ویستی خودایە.

١٣. ئایەتی ﴿وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ خودا خاترجەمی کردن دە هەموو شتدا (واسعة) یانی توانایی خودا بەربڵاوە.

١٤. دە ئایەتی ٢٤٨دا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەوە ئاماژەیە وەلای ئەوە کە خودای تەعالا دەفەرموێ: دانەوەی تابووت بەو شێوە بێوێنەیە بە قەومەکەی هاوار و نیشانەیە لە سەر سەداقەت و دروستکاری پێغەمبەر لە بابەت هەڵبژاردنی تالووت بە

پاشا لە سەر ئێوەی بەنی‌ئیسـرائیل.

١٥. ئایەتی ٢٤٩ کە دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَـالُوتُ بِـالْجُنُودِ﴾ ئەوە ئیشـاڕەیە وەلای ئەوەی جووڵانەوەی بەنی‌ئیسـرائیل بەفەرماندەیی تالووتی بەرەو دوژمن بابەتەکانی ئەو سـەفەرە درێـژە واتە کاتێ تالووت دەگەڵ لەشکرەکەی لە وڵاتی خۆی بەرەو وڵاتی دوژمن کەوتە ڕێ.

١٦. جوملەی ﴿قَالَ إِنَّ اللّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ﴾ ئەوە ئامـاژەیە وەلای ئەوەی مەلیک‌تـالووت دە کاتی وا سەخت و تەنگ و دشواریدا توونیایەتی و برسیایەتی و مانـدوویەتی و ترسـی دوژمـن ڕووی کردە لەشکرەکە و پێی کوتن: خودای بـانی سـەر دەیـهەوێ ئەدێـرەدا تاقیتـان کـاتەوە بە چۆمێک، کە هەرکامتان لێی وەخۆن لە ئێمە نییە، و هەر کامێکتـان لێـی نەخـۆنەوە لە ئـێمەیە و دەگەڵ مەیە.

١٧. ئایەتی ﴿فَشَرِبُواْ مِنْهُ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمْ﴾ ئەو ئایەتە دەڵێ: لەوەدا پاک و ناپاک لێـک جـودا بوونەوە، واتە دەستەیەکیان خواردیانەوە، دەستەیەکی کەمیشیان نەیانخواردەوە.

١٨. ئایەتی ﴿فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِيـنَ آمَنُـواْ مَعَـهُ﴾ واتە کـاتێ خـۆیی و ئەوانەی وا بڕوایـان هێنابوو و لەو ڕووبارە پەڕینەوە.

١٩. ئـایەتی ﴿قَـالُواْ لاَ طَاقَـةَ لَنَـا الْيَـوْمَ بِجَـالُوتَ وَجُنـودِهِ﴾ واتە کوتیـان ئەوڕۆ ئـێمە وزەی بەرەنگاری و شەڕمان دەگەڵ جالووت و لەشکرەکەی نییە، ئەو گوفتارە ئی ئەوانەیە کە بێ باوەڕ بوون.

٢٠. ئایەتی ﴿قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلاَقُو اللّهِ﴾ واتە ئەوانەی دڵنیا بوون لە ڕۆژی پەسـڵاندا بە خزمەتی خودا دەگەن گوتیان ﴿كَم مِّن فِئَـةٍ قَلِيلَـةٍ غَلَبَـتْ فِئَـةً كَثِـيرَةً بِـإِذْنِ اللّهِ﴾ واتە زۆر دەستەی کەم زاڵ بووە بە سەر دەستەی زۆردا بە ویستی خودا. (قرطبی و کبیر)

٢١. ئایەتی ﴿وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ واتە خودا دەگەڵ خۆڕاگرانە.

٢٢. ئایەتی ﴿وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالُواْ رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا﴾ وەک چـاو دەکـرێ دەو ئایەتەدا کارەساتی هەندێک سەرەتای شەڕەکە دەردەکەوێ.

٢٣. ئـایەتی ٢٥٠ واتە کـاتێ لەشـکری تـالووت دەرکەوت و ئاشـکرا بـوو لە بەرچـاوی لەشـکری جـالووتی، هەم لەشـکری تـالووتی زۆری لەشـکری جـالووتی لـێ دەرکەوت هەم لەشکری جـالووتی، کەمـی لەشـکری تـالووتی بـۆ دەرکەوت. جـا ئەدێـرەدایە کە تـالووت و لەشکرەکەی یادی خودایان کرد و داواشیان لێ کرد بەو لەفزانەی خودا بـۆ پێغەمبەریـان بەیـان

دەکا دە ئاخری ئایەتەکەدا کە دەفەرموێ:

٢٤. ئایەتی ﴿رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ کوتیان ئەی پەروەردگارمان خۆڕاگری بڕێژە بە سەرماندا و لە سەر لاق ڕاوەستانمان پتەو کە و زاڵیشمان کە بە سەر دەستەی بێباوەڕاندا.

دەبێ ئەوە بزاندرێ دێرەدا کە ئەو پاڕانەوەیە نیشانەی ترسانی تالووت و لەشکرەکەی نەبوو بەڵکە نیشانەی ئەوە بوو سەرکەوتنی کەمی وان بە سەر زۆری وان پیرۆزییەکی زۆر گەورە و ناودار دێنێتە ڕوو بۆ دنیای وان دەو کاتە هەستیارییەدا. جا ئەوە بوو کە لە خۆشی ئەو سەرکەوتنەی کە ئەوان پێی هیوادار بوون بۆ بەرگری لە غەرڕەیی و غرووری ئەو یاد و داوایان لە خودا کرد کە لە یاسای ئەدەب و ویقار دەرنەچن و هەروا سابیت و پایەدار وەمێنن.

٢٥. ئایەتی ٢٥١ ﴿فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ اللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُدُ جَالُوتَ﴾ واتە بە ویستی خودا تێکیان شکاندن و داود لەوێدا جالووتی کوشت. ئەوە دێرەدا بەر و بەهرەی نزا و پاڕانەوەی تالووت و یارانی نیشان دراوە و هاتە دی.

٢٦. ئایەتی ﴿وَقَتَلَ دَاوُدُ جَالُوتَ﴾ هاوارە و دەڵێ: ئەو تێک شکاندنە بەو شێوەیە (واتە کوشتنی دێوی ناوداری وەک جالووت بە دەستی لاوێکی بچووکی قەد و باڵای وەک داوود) بە گەورەترین پیرۆزی بەنیئیسرائیل دێتە ژمار و کە گەورەترین ئاواتی ئەو گەلەش بوو پاش دەرکردنیان لە وڵات و ماڵ و حاڵیان بە دەستی جالووت.

٢٧. ئایەتی ﴿وَآتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ﴾ واتە خوداش پاشایەتی و کارجوانی و کاربەجێیی پێ دا. یانی خودا دە پێناو ئەو قارەمانەتیەی داودی، پاشایەتی و پێغەمبەرایەتی پێ بەخشی کە تا وێستای داود واتە پێش داود ئەو دوو مەقامە ڕێزدارە نەدرابووە کەس. چونکە دە ناو قەومی بەنیئیسرائیل ئاوا داب بوو: پێغەمبەرایەتی بۆ یەک خانەوادە و پاشایەتیش بۆ یەک خانەوادە. جا لە سەر ئەو ئەساس و دابە کە پاشایەتی و پێغەمبەرایەتی درا بە داوود، دەبێ بڵێین ئەوە بۆ هەوەڵین جار دیترا دە دونیای یەهووددا پاشایەتی و پێغەمبەرایەتی درا بە یەک بنەماڵە کە هەوەڵین داوودە، پاش ویش هەر لەو بنەماڵەدا بە کوڕەکەی (سلێمان). جا دەبێ بە باوەڕەوە بڵێین: هەر قارەمان و شاکاری یەکە دە تایفەدا بۆ هەزاران قەڕن ناو و ناوداری و ڕووسپیەتی بۆ ئەو هۆز و تایفە تاپۆ و سەبت دەکا. وەک داوود پێغەمبەر بۆ قەومی بەنیئیسرائیل ئەو شۆرەت و ناوەی پاشایەتی و پێغەمبەرایەتی بە خەڵات وەرگرت، بێگومان لایەکەی دیکەش هەر ئاوایە

بێ کەموکووڕی واتە: دە تایفەدا ئەگەر یەک نەفەر بە دژی نەتەوەکەی ناوێکی ناحەزی نایە سەر خۆ تا تایە ئەو تایفە ناحەز و سەرشۆڕە لە بەرچاوی نەتەوەکەی، وەک جاش.

۲۸. ئایەتی ﴿وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاءُ﴾ واتە لەو زانینەشـدا کە خـودا خـۆی کەیفـی لە سـەر بـوو، بیداتێ، تێیدا زانا و ماهیر و وریا کـرد. یـانی داوود لەو زانیـنەدا ئەو بەهـرەانەی لـێ وەدەسـت هێنانن: ڕاگرتن و بەڕێوە بردنی کاروباری وڵات، زانا بە زمانی پەلەوەران، دروست کردنی زرێ واتە لیباسی شەڕ، لە شوێنەکانی دیکەی قورئان لە بابەت کارە جوانەکانی داوود خودا دواوە.

ئەوە بوو چاو پێداخشان و ڕێخستنەوەیەک بە ئایەتەکانی ۲۴۶ تا ۲۵۱ کە لە بابەت داسـتان و چیرۆکی زۆر بەرچاو و ناوداری قەومی بەنیئیسـرائیل هەبوو. ئەو چیـرۆکە ئەگەر بە چـاو و دڵێکی زیندوو هەستیارانە سەیری کرێ و دەرسی لێ وەرگیرێ، هەژار و مافخوراو دەرکراوەکان زۆر شێلگیرانەتر و وریایانەتر دەڕۆنە پێش و ناوەستن تا دەگەنەوە ئەو مافەی لێیان زەوت کـراوە و بەرەوپیریان دێن.

و لەو لایەشەوە داگیرکەرانی غافڵ لە پاشـەڕۆژیان، دەبـێ بە دڵنیـاییەوە و بە قەتعـی خـۆ حازر کەن بۆ تۆڵە و سزای تەجاوزگەرییان هەم لە دنیادا هەم لە ڕۆژی پەسڵاندا.

چیرۆکی تالووت و جالووت و داوود و هاتنی زانا و بلیمەتکـانی بەنیئیسـرائیل بـۆ لای پێغەمبەری کاتیان و هەڵبژاردنی تـالووت بـۆ پاشـایی و نـاڕەزایەتی وان بە پاشـایی تـالووت و سەرەنجام سەرکەوتنی گەلی بێبەش کراو بە سەر گەلی داگیرکەر بە سەرکردایەتی تالووت زۆر هەستیارە بۆ خاوەن هەستان دەبایە زۆر سەیر کرابایە لە لایەن داواکاران. کە خـودای تەعـالا دە شەش ئایەتەی قورئاندا جێی پـێ داوە بەو چیـرۆکە. ئایەتەکـان: بەقەرە ۲۴۶، ۲۴۷، ۲۴۸، ۲۴۹، ۲۵۰ و ۲۵۱، بۆوەی ئاخری چیرۆکەکە دە زێڕ بگیردرێ ئایەتی ۲۵۲ کراوەتە سەرقەپاغ.

## ۱۴ دەرسی سەرکەوتن دە تالووت و جالووتدا

و هەروا ئەو داستان و چیـرۆکە قورئـانیە کە دە نـاو خۆیـدا جەواهیـرات و بەرهەمـی زۆر بەبایەخ و بەئەرزشی ڕێـزداری تێـدا شـاراوەتەوە کە بە دەردی هەمـوو دەورێـک دێ بەتـایبەت دەروانی ئێستێ کە زۆرداران بەبێ شەرم و شکۆ دەستیان نـاوەتە بینەقاقـای گەلـی بندەسـت و بێچارە. ویستم سووکەئاوڕێکی کورتۆکەی دیـکەی وەسـەر دەمەوە. ئەوەش سـووکە ئـاوڕەکە، چونکە شتی زۆر بابەتی تێدا شک دەبەم. ئەوەش شتە بابەتەکان:

۱. هەست و دەرک و ئیحساسـی زیلـلەت و بندەسـتی دەبێـتە هـۆی ئەوەی کە شـەپۆلی

دەریــای ویــژدان و غیرەتــی ئینســان هەســتێ و بــدا لە بنــاغەی کۆشــک و قەڵای زۆرداران و داگیرکەران و مافخۆران، تێکیان بڕووخێنێ و وێرانیان کا.

٢. کاتێ گەلێ تەجاوەزی پێ دەکـرێ خـاک و نیشـتمانی لـێ زەوت دەکـرێ، نـاتوانێ لە دوژمنی وەستێنێ و دەریکا لە سەر خاک و نیشتمان، ئیللا بە یەکەتی و کۆدەنگی و یەکدڵی لە ژێر دەستووراتی ڕێبەری عادڵ و جەسوور و بەئیـرادە و لێـزان و دەراوپـاک و بەپەرۆش نەبـێ. بێ گومان لەوە زیاتر بەو لاوە هەر هاوار و خۆهەڵاویشتنە.

٣. بەبـێ شـک و گومـان ئەوەی بە تەواوی و بە واقیعـی دەرک و هەسـت و ئیحساسـی خەتەری لە نـاوچوونی وڵات و کەڕامەت و مـافی ئـازادی و سـەربەخۆیی نەتەوەکەی دەکـا، هەڵکەوتوو و چەوسـاوە و زاناکـان و بە پەرۆشـەکانی ئەو قەوم و گەلەن، هەروەک زاناکـان و ناودار و بەپەرۆشەکانی بەنیئیسـرائیل هەستی ئەو خەتەرەیان کرد و هەسـتان چـوونە خـزمەت پێغەمبەرەکەیان بۆوەی ئەمیرێکی خاوەنی ئەو سـیفەتانەی کوتمـان ببـێ و بۆیـان هەڵبژێـرێ و تەعینی کا تاکوو بتوانن لە ژێر ئەمر و فەرمـانی ئەودا وڵاتـی خۆیـان ڕزگـار کەنەوە لە دەسـتی داگیرکەران. دیتت کراش و کردیان.

٤. هەرزە و نەزان و تێنەکەوتووان وا بیر دەکەنەوە و بە خەیاڵیاندا دێ چـاترین و لێـزانترین ڕێبەر و سەرۆک خـاوەن سـامانەکان و بنەماڵەکـان وسـاحب تایفەکـان نەبـێ نـابێ، هەروەک بەنیئیسـرائیل ئەوەیان بیر و بۆچوون بوو کە ئیحتیڕازیان لە تالووت گرت دەیانکوت لە شازادە و مەلازادە و شێخزادان نیە، دەحاڵێکدا هەڵکەوتووترین بۆ ڕێـبەر ئەو کەسـەیە کە هەڵقـوڵاوی دەریای شەڕ و هەرای ئەوبەراوبەری ڕزگاری نەتەوە و نیشتمانی بـێ و دەراوپـاک و بەئیـرادە و ناوداری جووڵانەوەی شۆڕش بێ.

٥. ئیحتیمالی کێشە و دووبەرەکـی و چەن بەرەکـی دە نـاو گەلانـدا لە سـەر هەڵبـژاردن و تەعین کردنی سەرۆک ئەمیر دەبێ و هەیە، ئەمما بۆ ڕزگاری و چارەسەر کردنی ئەو کێشەیە بـێ شەڕ و دەرگیری و دڵئێشـاوی ئەوەیە کە دەبـێ مەرکەزیەت و مەرجەعێکـی بـاوەڕپێکراو ببـێ تاکوو بتواندرێ لەو گەردەنە سەخت و هەڵەمووتە سەرکەوتن بێتە دی و کار بە دروستی بچێـتە سەر. هەروەک ئەو مەرجەعە لە ناو بەنیئیسـرائیل پێغەمبەرەکەیان و دە ئـایینی ئیسلامیشـدا دە کاتی خۆیدا پێغەمبەر بوو. لە پاش ئەویش ئەهلی پاک و بێلایەن و دروسـتکاری نـاو گەلەکە بووە کە پێیان کوتراوە (اهل حل و عقد).

٦. سیفەتە تایبەتەمەندییەکانی سەرۆکایەتی و ڕێبەرایەتـی لە دوورەوە چـاوی بـێ غەرەز و حەسادەت دە کەسانی خاوەن کیفایەت و بەتوان و تەجرەبەکراوی دەوران و ڕۆژانی هەرا وبەزم و تەنگانە و سەختیدا دەبیبسێ و دەبیندرێ حاشای لێ ناکرێ. ئەوەی چـاوی نەکـا، یـا چـاوی دڵی کوێرە یا چەکچەکیلەیە و چاوی لە بەری هەڵنایە. ئەمما بۆ بەهێزی و دەخۆخـوڕین و خـۆ ون نەکردن ئەگەر دە زەنجیرە کەسانی ڕابردوویدا قیادە و ڕێبەرایەتی بووبێ ئەو سابیقەیە لەنگەر و لەمپەری دەبێ بۆ وەی ئەو ڕچە پڕ ئیفتیخارە لە دەس نەدا. ڕیوایەتە لە طبرانی و اویلعل و ...

٧. ئەو ئایەتە ٢٤٧ی بەقەرە ﴿وَاللّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاءُ﴾ دەلیل و بەڵگەیە لە سـەر ئەوەی کە ئیرادە و ویستی خودا لە سەر هەڵبژاردن و تەعینی سەرۆک و ڕێبەر لە سەر ئەساسی عەداڵەت و حیکمەت و چاوەدێری و قازانج و ئاسایشی کۆمەڵ جێگیر و دامەزراوە.

٨. ئیتاعە و گوێدان وبەردەوامی لە سەر نیـزام و دەسـتووری سـەرۆک، شـەرتی ئەوەڵـی پیرۆزی و سەرکەوتنە دە هەموو کاروباراندا.

٩. دەستەی کەم و خاوەن نەزم و نیزام و باوەڕ و خۆڕاگر لە ژێر فەرمانی ڕێبەر توانیـویەتی و دەتوانێ سەرکەوێ بە سەر هێزی زۆر و بێباوەڕ. وەک لەشکری داگیرکەران کە هەمیشـە بـێ ئیرادە و بێهێز بوون چونکە تەجاوەزکارن و خۆشیان بە تەجاوەزکار دێتە بەرچاوی.

١٠. دە کـاتی تەنگـانە و سـەخڵەتیدا و گەرمەی شـەڕ و دەرگیـری، پشـت بەسـتن بە موقەددەسات و یادی خودا، ورەدەر و هێزدەری مەعنەوین، هێزی شەڕکەر بە ئامانج دەگەیێنـێ هەروەک ئایەتی ٤٥ی سوورەی ئەنفال ئەو هەستەی لێ دەکرێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُواْ وَاذْكُرُواْ اللّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلَحُونَ﴾ ئەی ئەوانەی ئیمانتـان هێنـاوە کـاتێ دەگەڵ دەسـتەیەک تێک هەڵپڕژان خۆڕاگر و خۆوەخـۆ گـرن بـۆ ئەو خـۆ وەخـۆگریە پـاڵ وە خـودا و موقەددەسـاتتان دەن، تـا سەرکەوتوو و ڕزگار بن.

١١. تارومار کردن و لەناوبردنی تەجاوەزکارانی فەسادکار و هێشتنەوەی چاکان و پاکـان و خاسـان لە جێـی وان، وەک ئەوە وایە کە لە نـاو ئایەتەکـانی ٢٥١ی بەقەردا و ١٧ی سـوورەی ڕەعددا خۆ نیشان دەدەن و خۆ دەنوێنن. سەیر کە:

بەقەرە ﴿٢٥١﴾ وَلَوْلاَ دَفْعُ اللّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الأَرْضُ. ئەگەر خودا هەندێ خەڵکی تەجاوەزکاری بە هەندێکی باش و چاک وپاک لە ناو نەبردایە، ئەو سەرزەوییە تێدادەچوو واتا بۆ ئاوەدانی نەدەبوو بەڵکە هەر چۆل و وێرانە دەبوو.

ڕەعد ﴿١٧﴾ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًا وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاء حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاء وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الأَمْثَالَ. **خودا لە ئاسمانەوە ئاوی ڕشتۆتە خوارەوە چەم و شیوەکان بە ئەندازەی خۆیان لافاویان لێ هەڵستا، ئەو لافاوە کەفێکی بەرز و بڵێندی هەڵگرتووە،لەو شتانەش کە ئاگری لە سەردا هەڵدادەگیرسێنن، بۆ خشڵ و خاو و شتی دی، کەفی وەک کەفی ئەو لافاوە دەکەوێتە سەری، ئا بەو شێوە خودا نموونەی هەق و بەتاڵ دێنێتەوە. جا ئەو کەف و کوڵە دەڕوا و دەکەوێتە قەراخەوە و تێدا دەچێت، بەڵام ئەوەی کە سوود وقازانجی بە خەڵک دەگەیێنێت لە سەر ئەو زەویەدا دەمێنێتەوە، بەو شێوەیە خودا نموونەکان دێنێتەوە.**

بە کوردی و بە کورتی: ڕۆژی خۆی کە دە ڕێیەدایە، باتڵ (تەجاوەزکار) دەڕوا و حەق (مافخوراو و زوڵم لێکراو) دەمێنێتەوە.

١٢. وێدەچێ جووڵەجووڵ و زەمزەمە و توندڕەوی هەندێ سەرۆک فەرماندەران بە فریو بەرێ و بەو مەرجە ڕێ بە زاهیری کار لە بەر چاو بگرێ. جا بۆیە دەبێ ڕێبەر حەکیمانە باری تاقی کردنەوەی گەلی خۆی لە بەرچاو بێ و بیکا؛ هەروەک تالووت بە هۆی ئیلهامی باری لەشکرەکەی تاقی کردەوە بە چۆمەکە، جا پاشان بە ئیرادەوە چوو بۆ مەیدانی شەڕ دەگەڵ جالووت و سەریش کەوت.

١٣. دە ڕێبەری و سەرۆکایەتی تالووتیدا کە هەڵبژاردەی خودا بوو بێ لەو سیفەتە تایبەتیانەی خۆی کە خودا پێی دابوو ناوی بردن وەک عیلم و دڵفراوانی، دیارە دەو سیفەتانەشدا بەشدار بوو، وەک فریو نەخواردن بە ئیحساساتی لەشکرەکەی، و هەروا بە ئاوخواردنەوەی بەشی زۆری لەشکرەکەی هەڵوێستەی نەکرد بەڵکە ئیدامەی بە بەرەو پیر وەچوونی دوژمن دا و ڕۆیی. و هەر ئەو بە کەمی شەڕکەرەکان ڕوحیەی بەرز و بڵیندی لە خۆی نیشان دەدا.

١٤. دڵی پڕ لە هیوا و هومێد و باوەڕی بە خودا و یاریدەی خودا، وره و ئیرادە و خۆڕاگری ماڵبراو و نیشتمان داگیرکراو بۆ خۆی بە ویژدانیەوە و بە ئیمانیەوە بۆ وەرگرتنەوە و ڕزگار کردنی نامووس و وڵاتی خۆی هاتۆتە مەیدانەوە کە ئەوانەش هەموویان دەبێ گیانیان دە پێناو بندرێ.

ئەمما دڵی داگیرکەر و زردار کە خاڵی لە ویژدان و لە ئیمانە، بە تەنیا خۆی لە مەیدانی داگیرکارییەکەیەتی، ئەو دوو دڵانە لێک جیاوازن و فەرقیان ئەوەیە داگیرکەر چاوێکی هەر لە

دواوەیە بـۆ ڕاکـردن و پاشەکشـە، چـونکە دەزانـێ هـیچ مـاف و حەقێکـی لە لایەن هـیچ حەقخوازێکەوە پێ نەدراوە بۆ ئەو شەڕە. ئەمما ماف‌خوراو و تەجـاوەز پێکـراو دوو چاوەکـانی هەر بەرەو پێش‌چوون دەڕوانن، بست بە بست گرتنەوەی خاک و نیشـتمانی حیسـابی لە سـەر دەکا.

ئەو سووکە ئاوڕە وەسەر دانەوەمان وەسەر هەڵوێستەکانی چیرۆکی تالووت و جـالووت بە پێویست زانی، هیوایە دەرسی لێ وەرگیرێ.



دەبێ بزاندرێ و بزانین عەلاقە و تێکەڵاوی ئایەتی ٢٥٣ دەگەڵ ئایەتەکانی پێشەوەی خـۆی چییە؟ ئەگەر هەڵیانسەنگێنین و بەراوەردیان کەین ئەو ئایەتە ٢٥٣ دەگەڵ ئـایەتی ٢٥٢ فەرقێکـی وایان لێ چاو ناکرێ واتە هەڵوێستی ئەو دوو ئایەتی سەر (تلک) بابەتەکانیان لـێکەوە نیـزیکن، دەگەڵم بن تاکوو گۆشەیەک‌و لە بابەت کەم جیاوازی ئەو دوو ئایەتانەی ٢٥٣ و ٢٥٢ نیشان دەم.

ئەگەر نەختێک واتە چەن ئایەتێک بگەڕێینەوە دوا، دەچینەوە سەر ئەوەی کە بـاس لە سـەر ئەوەی بوو کە دەبێ حەق بە سەر ناحەقدا زاڵ بێ. وەک زاڵ‌بوونی تالووت بە سەر جالووتـدا. ئەوەش دیـارە: بەیـان و ڕاگەیانـدنی ئەو بەسـەرهات و چیرۆکـانەیە لە لایەن زاتێکـی پـاکی نەخوێندەوار وەک پێغەمبەر محمدالمصطفی بێ. نیشان‌دانی بێ‌کەم‌وکووڕی، ئەوەش نیشانەی ڕێز و ڕێزداری ئەو پێغەمبەرەیە. جا ئەدێرەدا ئەو هەسـتە بە دڵـدا دێ و دەمێنێـتەوە دە نـاو دڵـدا تاکوو لێی حاڵی نەبێ هەر دەجووڵێتەوە ئەو هەستەش. ئەوەیە: ئایا بـۆ دەبـێ پێغەمبەرانـیش لە یەک گەورەتر بن و فەرقیان هەیە دە پلە و مەقامدا؟

جا خۆ بە پێی عورف و عـادەت نـابێ پرسـیار بـێ وەڵام بەڕێ کـرێ و گـوێی نەدرێتـێ؟ کەوابێ بۆوەی وڵامی ئەو پرسیارەن دابێتەوە کە لێیان پرسیوین ئایا پێغەمبەرانـیش پـلەی بەرز و نەوییان لە یەکتر هەیە؟ دەبێ بڵێین بەڵێ، بە پێـی ئیشـاراتی قورئـان هەنـدێکیان لە هەنـدێکیان بەرزتر ناسێندراون.



ئەگەر نەختاڵێک زەحمەت بکێشـرێ لە سەر بەراوەرد و بەرجەوەنـدی ئەو دوو ئایەتـانەی ٢٥٢ و ٢٥٣ پێکەوە هەڵسەنگێندرێن و وەزن کرێن، ڕابیتە و تێکەڵاوییان بە ڕوونی دەردەکەوێ و دێتە دەست. سەیر کەن:

﴿٢٥٢﴾ تِلْكَ آيَاتُ اللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ

﴿٢٥٣﴾ تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ

**مانایان:**

٢٥٢ ئەو دوو داستانی چوونی پیاوماقووڵانی بەنیئیسرائیل بۆ لای پێغەمبەری کات و شەڕی تالووت و جالووت کە بۆ تۆمان بەیان کرد، لەبەر ئەوەی کە تۆ یەکێکی لە پێغەمبەران و دەبێ ئاگاداری بەسەرهاتی گەلانی ڕابردوو بکرێ و ببی. چونکە لەو بابەتانە پرسیارت لێ دەکەن و دەبێ وڵام بدەیەوە. ئەگەر بێ وڵام بی، بەقای پێغەمبەرایەتیت نابێ. جا ئەدێرەدا دەبێ بکوترێ: ئەی پێغەمبەر دەزانی لە کام پێغەمبەران؟ دە وەڵامدا دەبێ ئایەتی ٢٥٣ بەیان بکرێ، ببێتە وڵام جا بەو داب و دەستوورە دەتوانین بڵێین سەر و بنی دوو ئایەتی ٢٥٢ دەگەڵ ئایەتی ٢٥٣ هەر لە بەرەیەکدان:

**﴿٢٥٣﴾ تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ اللّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ وَلَوْ شَاء اللّهُ مَا اقْتَتَلَ الَّذِينَ مِن بَعْدِهِم مِّن بَعْدِ مَا جَاءتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَلَـكِنِ اخْتَلَفُواْ فَمِنْهُم مَّنْ آمَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ وَلَوْ شَاء اللّهُ مَا اقْتَتَلُواْ وَلَـكِنَّ اللّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ**

**هەندێک لەو پێغەمبەرانەمان بە سەر هەندێکیاندا بەرز کردۆتەوە، هەندێکیشیان هەر ڕاستەوخۆ خودا دەگەڵیان دواوە. و هەروا هەندێکیانی پلە و پایە بەرز کردۆتەوە، بە عیسای کوڕی مریەمیش بەڵگەی ڕووناکمان پێ بەخشیوە، و بە وەسیلەی جبرەئیلیش پشتمان بەهێز کردووە و گرتووە. ئەگەر خودا بیویستایە ئەوانەی پاش ئەوان هاتن لە پاش ئەوەی بەڵگەی ڕووناکیان پێ بەخشرا شەڕ و شۆڕ لە نێوانیاندا ڕووی نەدەدا، بەڵام ئاژاوە و کێشە کەوتە نێوانیان، هەندێکیان ئیمانیان هێنا و هەندێکیشیان کافر بوون. ئەگەر خودا بیویستایە، شەڕ و شۆڕ لە نێوانیاندا ڕووی نەدەدا. بەڵام خودا هەرچی بوێ، پێکی هێنا.**

## بەرزکرانەوەی هێندێک لە پێغەمبەران بە سەر ئەوانی دیکەدا

### تێڕوانین و ئاوڕدانەوەیەکی هەستیارانە:

ئەو پێغەمبەرانەی کە باسمان کردن هێندێکیان بە سەر هێندێکیانا بەرز کردۆتەوە لە بابەت هەندێ لە سیفاتا، نەک لە بابەت پێغەمبەرایەتی واتە پاش ئەوەی خودای بانیسەر چیرۆکی تالووت و جالووت و داوودی بەیان کرد و ڕایگەیاند و بە وردی ئەو داستانە پڕ ماجەرا و پەند و دەرسی ئەو ئایەتە ٢٥٢ی بەقەرەی هێنا، ﴿تِلْكَ آيَاتُ اللّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّكَ لَمِنَ

الْمُرْسَلِينَ﴾ی هێنا: ئەوە هەموو بەڵگە و نیشانەی خودا بوون، کە بەڕاستی دەیخوێنینەوە بە سەر تۆدا. بێ گومان ئەتۆش یەکێکی لە پێغەمبەران. تا بە هۆی دەرک و ناسین و بەرجەوەندی تەواوتان لەو داستانە ڕابردوی دەورانی زۆر لەوە پێشتان ئەو ڕاستی و واقیعیەتە بزانن و باوەڕ کەن کە محەمەدﷺ لە دەستەی پێغەمبەرانە، کە ئەو پێغەمبەرەش بە هۆی وەحیی خودا لە بەسەرهات و ئەحواڵی جۆراوجۆری ئۆمەتانی ڕابردوو خەبەر ڕادەگەیێنێ، بەڵگە و دەلیل نیشان بدا و بینوێنێ.

هەروەک لە دۆزین و هەڵسەنگاندنی ئەو ئایەتە ٢٥٣یەدا زانیاری لە سەر پێغەمبەران زیاتر دێتە دەست، دوو ڕاستی و حەقیقەتیش خۆ نیشان دەدەن:

١. یەک لەو دوو ڕاستییانە ئەوەیە: پێغەمبەران وا دیارە خاوەنی پلە و پایەن و خودای خاوەن حیکمەت هەندێکیانیشی بە هۆی هەندێک بابەتەوە ئیمتیازی پێ بەخشیون بە سەر هەندێکیان.

٢. عالەم بە گشتی دە وەشوێنکەوتن و ئیتاعە کردنیاندا بوونەتە دوو دەستە: یا ئیماندار، یا بێئیمان. واتە یا کافر یا موسوڵمان. ئەو حاڵەتە بێگومان ڕاز و سوڕ و تەلەسمێکە تایبەتی حیکمەتەکانی خودایە، هەچەن وەبەر نەقڵان و ئەقڵ و هەست و شعوور درێ لە لایەن ژیران و هێژا و پڕفسۆرانی دەوران تەلەسمێکیان بۆ لێ هەڵنابێ: کێ پێی خۆشە بسووتێ؟ کێ پێی خۆشە ڕووڕەش بێ؟ کێ پێی خۆشە گەورەی لێ ناڕازی بێ؟ کێ پێی خۆشە بمرێ؟ کێ پێی خۆشە پیر و نەخۆش و ڕووت و ڕەجاڵ بێ؟

## گازەگاز و زەمزەمە و شنەشن

هەستم بزووت خۆم بۆ زەوت نەکرا کەوتمە سەر زەمزەمە:

کوا شنەی ڕەحمەت دەشنێ، تا نەشنێ سۆزی حەق؟<br>
گوڵ بە نەرمی کوا دەقەڵشێ بێ لە حیکمەت شاخی ڕەق<br>
تا بریسکان لێ نەدا، هەوری حەیات نەڕژێنێ ئاو<br>
خاکی مردوو کوا حەیاتی دێتە بەر دەکرێ بە چاو؟<br>
تاکوو نەققاشی ئەزەل نەقشی نەکا نەقشی جیهان<br>
کوا سرشتی تەبعی هەستی دێتە سەر خەتتی ژیان<br>
نووری ئەقڵی کوا دەقەڵشێ زوڵمەتی جەهل و نەفام<br>
تا نەدا تیشکی هیدایەت لەو دڵەی پڕ هەست و فام<br>
با لە مزگەوتێ «عومەر» هەر نوێژ و ڕۆژوو و حەمد کا

گەر نەدا قەلبــی ســەلیم خــالق، چ ســووده زیکــر بکــا

دەبێ کاتێ کوترا ئەوە کاری خودایە، بە بیر و هەست و شعوور بکــوترێ، دامەزرێــی و لە سەری مەڕۆ و مەڵێ.

دە ئایەتی ٢٥٢دا کاتێ خودا فەرمووی ﴿وَإِنَّــكَ لَمِــنَ الْمُرْسَــلِينَ﴾ واتە ئەتـۆش یەکێکـی لە پێغەمبەران. ئەوە زاندرا و بە تەواوی هەستی پێ کرا کە پێغەمبەران هەن و دە پـلە و پـایەی زۆر بەرزتـر لە پـایەی غەیـری خۆیانـدان وەک عـامەی ئینسـان بـێ. دەگەڵ ئەوەش هەموویـان دە هیدایەت و ڕیسالەت و ڕێنوێنی عالەم بۆ لای سـەعادەت و بەختەوەریـدا بـۆ دنیـا و ئـاخرەت یەکسانن، ئەمما خودای خاوەن حیکمەت هێنـدێکی بە سـەر هێندێکیانـدا بەرتەری داوەتـێ بە هۆی تایبەتمەندییان. هەروەک دە ئایەتی ٥٥ اسـراءدا ئامـاژەی وەلا فەرمـووە خـودای تەعـالا: ﴿وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَى بَعْضٍ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا﴾ واتە بێ گومان هەندێ لە پێغەمبەرانمـان بە سەر هەندێکیاندا بەرز کردەوە، زەبووریشمان دا بە داوودی.

هەروا دە زۆر شوێنی دیکەی قورئاندا هاتووە دەلیلی بەرتەری لە هەر شوێنەی بە جۆرێک، بۆ نموونە ئایەتی ٥٥ اسـراء و ئایەتی ٢٥٣ی بەقەرە.

یەکێک لەو پێغەمبەرانەی کە خودا ئیمتیازی پێ بەخشیوە بە دواندن دەگەڵـی وەک مووسـا کە دە ئایەتی ١٦٤ی نیساءدا فەرموویەتی ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا﴾ واتە خـودا ڕاسـتەوخۆ دەگەڵ مووسا قسەی کرد بە قسە کردن. بێ واسیتە و دیلمانج.

یا دە ئایەتی ١٤٣ ئەعرافدا کە دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ﴾ کـاتێ مووسـا گەیشتە ژوانگەی مە، خودا دەگەڵی کەوتە دواندن.

بەڵێ دەبێ ئەو باوەڕ و یەقینەمان هەبێ کە خودای تەعالا لە پێغەمبەرانی دە فەزڵ و عیزەت و پایە و پلەدا هێندێکیانی بە سەر هێندێکیان وەسەر خستووە. ئەمما ئەدێرەدا تووشی ئەو کۆسپە دەبین کە بە هۆی ئایەتی ٢٨٥ی بەقەرە دێتە پێش دەوبارەدا: ﴿لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُــلِهِ﴾ ئـێمە هیچ فەرق و جیاوازییەک ناخەینە نێوان هیچ یەکێ لە پێغەمبەرانی خودا.

دەبێ بۆ لادان لەو کۆسپە بڵێین: جیاوازی دانانێین لە نێوان پێغەمبەران، دە پێغەمبەرایەتیدا، دە تەشـریعدا، دە ئیمان پێبووندا؛ واتە باوەڕمـان ببـێ بە هەنـدێکیان و نەمـانبێ بە هەنێکیـان. بەڵکە هەموو حەقن، هەموو ڕاستن.

## محەمەد بۆ بەرزە؟

دەمانهەوێ بزانین بەرتەری مـحەمەد پێغەمـبەرﷺ بە سـەر پێغەمبەرەکـانی دیـکەدا چیـیە و دەلیلی ئیمتیازەکەشی چییە؟

١. دەلیلێک لەو دەلیلانە کە دەبێتە بەڵگە لە سەر بەرتەری محەمەد بە سـەر پێغەمبەرەکـانی دیکە ئەو سیفەتەیە کە ئەوانی غەیری ئەو نیانە، ئایەتی ١٠٧ی سوورەی ئەنبیـایە: ﴿وَمَا أَرْسَـلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ ئەتۆمان نەناردووە بۆ لای عالەم، ئەگەر ناردوومانی تەنیا بۆ ڕەحمەت و بەرەکەتمـان ناردووی. جا بەو پێیە دەشبێ لە هەموو عالەمی دنیا گەورەتر بی دە فەزل و ئەخلاقدا.

٢. دەلیلی دووهەم ئایەتی ۴ی سوورەی شەرحە ﴿وَرَفَعْنَا لَـكَ ذِكْـرَكَ﴾ بەرزمـان کـردیەوە لە بابەت شان و شکۆ و شەوکەتەوە.

٣. دەلیلی سـێهەم ئـایەتی ۴ سـوورەی قەڵەمە: ﴿وَإِنَّـكَ لَعَـلى خُلُـقٍ عَظِـيمٍ﴾ ئەتـۆ لە سـەر ئەخلاقێکی بەرز و جوان ڕازاویەوە.

۴. دەلیلی چوار ئایەتی ٩ سوورەی حیجر: ﴿إِنَّا نَحْـنُ نَزَّلْنَـا الذِّكْـرَ وَإِنَّـا لَهُ لَحَـافِظُونَ﴾ ئـێمە بۆخۆمان قورئانمان ناردۆتە خوارەوە (بۆ تۆ) هەرخۆشمان دەیپارێزین.

۵. دەلیلـی پێـنج قورئـانە، ئەگەرچـی قورئـان بە ڕواڵەت حەرف و دەنگـن و ڕەوەنـدەن و دەڕۆن، ئەمما دەستوورات و ئەحکامات و مانا و ماهیەتی قورئان زەوالی بە سەردا نایە بۆ هەتـا هەتایەن، بەڵام موعجیزەی پێغەمبەرەکانی دیکە کاتی و زەمانین.

۶. دەلیل شەش ئایەتی ٢٨ی سوورەی سەبایە: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ﴾ ئێمە ئەتۆمـان نەناردووە ئیللا کە ناردوومانی بۆ گشت ئینسانانمان ناردووی.

٧. دەلیلی حەوت ئەوەیە: خودای تەعلا دە قورئاندا بانگی پێغەمبەرەکان بە نـاوی خۆیـان دەکا، وەک: ﴿يَا آدَمُ اسْكُنْ﴾ (بقره: ٣٥) ﴿وَنَادَيْنَاهُ أَنْ يَا إِبْرَاهِيمُ﴾ (صافات: ١٠۴)، ﴿فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِيَ يَـا مُوسَى إِنِّي أَنَا رَبُّكَ﴾ (طه: ١١،١٢)، ئەمما بانگی محمدالمصطفی دەکا بە: (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ) و (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ).

دەلیل زۆرن لەو بارەوە بەڵام لە هێنانی هەموویان خـۆم بەدوور گرتـووە چـونکە پـێم وایە یەک دەلیلی قورئانی کافیە بۆ ئەهلی خاوەن هەسـت، چـونکە هەر ئەوەنـدە کە تـازە پـاش ئەو پێغەمبەری دی و کتێبی دی و یاسای دی نایە، بەسە بۆ ئیمتیازی بە سـەر پێغەمبەرانـی دی، بەو دەلیلە: قورئان بەشی عالەم دەکا تا تایە و بەراوەردی نیازی هەموو نەتەوە و تیرە و هۆزێکی دێنە

سەر زەوی دەکا ئەگەر گرووگر و بەهانەگر نەبن. کەوایە دەبێ بکوترێ و باوەڕیش بکرێ: ئایینی ئیسلام بە یاسایەوە تا دنیا هەیە بەشی ئینسان دەکا. چونکە ئایینێکی کاتی و یەک عالەمی و یەک نەتەوەیی نییە، بەڵکە (كَافَّةً لِّلنَّاسِ و الجنّ)ـە.

پێویستە ئاوڕێک وەسەر ئەو لایەش بدەینەوە و سەرێکی پێداگرین کە بۆچی بەرەی ئینسان لە سەر ئەو هەموو ئایات و ئەحکامات و نیشانە دڵگرانە و ئەو هەموو پێغەمبەرە بەحەققانە بوونەتە دوو دەستە؟ یەک کافر و لاڕێ، یەک موسوڵمان و ڕێڕاست. موسوڵمانەکە هۆیەکەی چ بووە ئەو ڕێ ڕاستەی دۆزیوەتەوە و هەڵی گرتووە، و کافرەکە هۆیەکەی چ بووە ئەو ڕێگا ڕاستەی وەلاناوە و ڕێگا خوارەکەی پەسند کردووە و هەڵی‌گرتووە؟ ئەوە دەکرێ بڵێین هەر موسوڵمان خاوەنی ئەقڵ و شعوور و دەرکە؟ و هەر کافرە لە ئەقڵ و شعوور بێبەشە؟

بێ‌گومان ئەو قسە و ئەو خەیاڵە ناڕەوایە ناکرێ و ناگونجێ کە بکوترێ: عالەمی کافر نەفام و گەوجن، عالەمی بە ڕواڵەت موسوڵمان ئاقڵ و خاوەن دەرکن! چونکە ئەگەر عالەمی کافر گەوج و نەفام بن و خوداش وای بە سەر هێنابن، ئەوە لەو بارەی کە ڕوویان دە لای هەڵە و تاوان کردووە، تاوانبار نین چونکە خودا سەلیقەی هەڵگرتنی ڕاستەڕێی نەداونێ. ئەگەر بشڵێین نەخێر، خودا وای بە سەر نەهێناون بەڵکە بۆخۆیان ئاوایان بە سەر خۆ هێناوە، ئایا باوەڕ دەکرێ ئینسان مادام شێت و ماخولیا نەبێ خۆ دە ئاور هاوێ؟ ئەوە باوەڕ ناکرێ. ئەدی چۆنی هەڵیسەنگێنین ئەو بابەتە؟

ئەوە دەبێ بڵێین لەو لایەشەوە عالەمی ئیسلام چۆنی ئەقڵ بەوە شکاوە کە ئەو لایە ڕاستەڕێیە؟ ئەو ئەقڵەی لە کوێ بووە و کێ داویەتی؟ یا بڵێین: عەلەل‌بەخت بە سەریدا کەوتووە، خۆ دیارە دین و ئایینی عەلەل‌بەخت و بێ‌دەلیل نە بەهرەی هەیە، نە قبووڵە! چۆنی وەکەین ئەو گرێیە و بچینە لای کێ لە خۆن زاناتر بێ لەو بارەوە بتوانێ ئەو گرێیەمان بۆ وەکا؟!

ئەوەی ئێمە پێی دەنازین و پێی دەخوڕین لەو بارەوە هەر ئەوەیە: دەڵێین کاکە ئەو کافربوون و موسوڵمانبوونە و ئەو شەڕ و هەرا و خوێن‌ڕێژییە و ئەو مل‌بەملە و پاڵەپەستۆیە هەر لە ئەزەل‌ڕایە و قەزا وقەدەر و ئیرادە و ویستی خودایە و ڕازێکی سەرداپۆشراوە، وەک تەلەسمێکە، ئەو ئەقڵ و شعوورە کەمەی ئینسان بۆی هەڵنادرێ و ڕێگای هەڵدان و تێچوونی نەدراوە بە ئیمان. جا ئەگەر بێتوو ئەوە ڕاست بێ و وابێ، ئەودەم بە گوناە و بە تاوان ناژمێردرێ لە سەرمان کە بڵێین کوفر و ئیسلام و تێکبەردانی ئەو عالەمە بەو شێوەی کە هەیە کاری خودایە و تەڵە و

داوە نراوەتەوە بۆ ئینسان و جنۆکە.

شەهید سەید قوتب لەو بارەوە دە تەفسیرەکەیدا فەرموویەتی: ئەو شەڕ و هەڵڵا و بگرەبگرە و بکوژە خیلافی مەشیەت و ئیرادەی خودا نییە. کەوابێ لە سەر فەرمـوودەی ئەو، دەبـێ خـودا پێی ناڕازی نەبێ بەو هەرا و هەڵڵا و بگرە؟!

بە هەر حـاڵ ڕوو بـا دە ئەقـڵ بکـرێ کە چـۆنی دەقـۆزێتەوە چـۆنی هەزم دەکـا؟ خـودا سەعادەت و بەختەوەری داوایە و دەوێ بۆ ئینسان هەرەک ئاواشـی لـێ داوا کـردووە: وەک دە ئایەتی ۵۶ی زاریاتدا فەرموویەتی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ ئەمن جنـۆکە و مـرۆڤم دروست نەکردووە تەنیا لە بەر ئەوە نەبێ بمپەرستن.

جا ئایا دەکرێ بڵێین کافر خودا پەرست نیە؟ بەڵێ چونکە عیبادەت واتە ئیتـاعە، کـافریش واتە دوور لە ئیتاعە. جـا مەگەر وەدوای قسـەی ئەوانە کەویـن کە کوتوویـانە (لِيَعْبُـدُونِ) واتە (لِيَعْرفونِ)، واتە ناسین. ئەودەم دەکرێ بکوترێ: کافریش خودا دەناسێ.

لەوانەیە بەو پێیەی کە دەڕوانم لە ئایەتەکانی ۱۱۸ی هوود و ۹۳ی نەحـل و ۱۳ی سـەجدە، بۆ ئەولایە بچم و لەوێ بە یەکجاری سەر بێنمەوە. دەگەڵم بە با ون نەبم:

هود ﴿۱۱۸﴾ وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ

**ئەگەر خودات ویستی لە سەر بایە هەموو خەڵک هاوباوەڕ دەبوون (بەڵام خـودا وا دیـارە ویسـتی لە سەر ئەو یەکیەتیە نەبووە) خەڵک بەردەوام جۆراوجۆرن.**

نەحل ﴿۹۳﴾ وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلكِن يُضِلُّ مَن يَشَاء وَيَهْدِي مَن يَشَاء وَلَتُسْأَلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ

**ئەگەر خودا بیویسـتایە بێ گومـان دەیکـردن بە یەک گەل (بەڵام دیـارە نەیویسـتووە یەک گەل بـن) ئەوەی خودا بیهەوێ گـومڕای دەکـا، ئەوەی بیشـیهەوێ ڕاسـتەڕێی دەکـا و پرسـیاریشو لـێ دەکـرێ لە ڕۆژی خۆیدا سەبارەت بەو کارانەی کردووتانن.**

سەجدە ﴿۱۳﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَآتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَاهَا وَلَكِنْ حَقَّ الْقَوْلُ مِنِّي لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ

**ئەگەر ئێمە بمانویستایە شارەزایی و ڕێنومایین بە هەموو کەس دەبەخشی (بەڵام ئەوەمان نەویستووە کە هەموو کەس شارەزا کەین) بەڵام لە لایەن مـنەوە بڕیـار سـەقام گیـر بـووە کە دۆزەخ دەبـێ پـڕ کەم لە جنۆکە و لە مـرۆڤ.** کەوابێ ئەگەر هەموو عالەم ڕاست با، دۆزەخ کێی دەچۆتێ؟ خـۆ تـازەش لە هەوەڵەوە (ئەزەل) بڕیاری پڕ کردنی لە جنۆکە و لە مرۆڤ دەرچووە، دە بڕۆ و بوێرە قسـەی لـێ

بکە! ئەقڵ با واق و وڕ نەمێنێ.

با ئاوڕێکی هەستیارانە وەدەین بۆ سەر ئایەتی ٤ی سوورەی لەیل، و لەوێشەوە تۆبە بکەین کە قسە لە کاری خودا نەکەین: ﴿إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّى﴾ هەوڵ و تێکۆشانو جۆراوجۆرە. خۆ دیاریشە ئەو هەوڵ و تێکۆشان و سەلیقە جۆراوجۆرەیە لەخۆڕا هەڵنەقولاوە لە ناو دەروونی ئینساندا، بەڵکە ئەو کەسەی کە لە هەوەڵەوە دەبەر یەکی ناوە، ئەو سەلیقە جۆراوجۆرەشی دەپاڵ ناوە. کەوابێ قسە لێ کردنی ناوێ، چونکە بۆخۆی دە ئایەتی ٢٣ی ئەنبیاءدا فەرموویەتی: ﴿لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ﴾ خودا سەبارەت بەوەی دەیکا پرسیاری لێ ناکرێ، بەڵام ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێ.

بەسە ئەوەندە کە خودا دەفەرموێ پێمان: وست بن لە ڕاست پرسیار لە کردەوەکانم.

ئایەتەکانی ﴿وَلَـكِنِ اخْتَلَفُواْ فَمِنْهُم مَّنْ آمَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ وَلَوْ شَاء اللّهُ مَا اقْتَتَلُواْ وَلَـكِنَّ اللّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ﴾ خودا ئەگەر بیویستایە ئەوانەی پاش ئەوان هاتن لە پاش ئەوەی بەڵگەی ڕووناکیان پێ بەخشرا شەڕ و شۆڕیان لە نێواندا نەدەبوو. بەڵام ئاژاوە و کێشە کەوتە نێوانیان، هەندێکیان ئیمانیان هێنا و هەندێکیان کافر بوون. جاخۆ ئەگەرخودا بیویستایە شەڕ و شۆڕ لە نێوانیاندا ڕووی نەدەدا، بەڵام چۆنی بوێ وا دەکا و ئەنجامی دەدا.

بەڵگە لەو ئایەتە بەهێزتر نابێ کە خول وهەڵسووڕانی گەردوون بە چەپدا بێ یا ڕاست، فەرمانەکەی بە دەست خۆیەتی.

هەروەک ئەگەر لە بیرمان مابێ لە ئایەتی ٢٤٥ی بەقەرەدا خودای تەعالا بە وەسیلەی ﴿قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَاعِفَهُ لَهُ﴾ ویستی بە شێوەیەکی ئارام و هێدی ساماندارەکان ڕاکێشێ بۆ لای ئاوڕدانەوە وەلای خودا بە بەخت کردنی ماڵ و دارایی بە عینوانی قەرز دەگەڵ خودا. ئەوجار خودا دەیهەوێ بە وەسیلەی ئایەتی ٢٥٤ دەعوەتی ساماندارەکان بکا بۆ بەخت کردنی ماڵ و داراییان دە ڕێگای خودادا بۆ بێنەوایان، ئەمما ئەو داوایەی کە بە وەسیلەی ئایەتی ٢٥٤ دەیکا فەرقی هەیە دەگەڵ ئەو داوایەی کە بە وەسیلەی ئایەتی ٢٤٥ کردی لە ساماندااران داوای ٢٤٥ نەرم و هێدی بوو، داوای ٢٥٤ بۆنی هەڕەشەی لێ دێ ئەگەر نەیکەن. بۆ ڕاستی ئەو ئیدیعایە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٥٤:

﴿٢٥٤﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لاَّ بَيْعٌ فِيهِ وَلاَ خُلَّةٌ وَلاَ شَفَاعَةٌ وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ

**ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، لەو ڕزق و ڕۆژیەی داومنێ ببەخشن (بە بێنەوا و خاوەن نیازان)، پێش ئەوەی ئەو ڕۆژە بێت کە نە مامەڵەی تێدایە نە وێمدە و هانێی تێدایە، نە دۆستایەتی و لاڵەلاڵ و تکاکاری تێدایە، تەنیا هەر بێ باوەڕن زوڵمکەر.**

## ئینفاق کردن پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت

**تێڕوانین و ئاوڕ وەسەردانەوە:**

ئەی ئەو کەسانەی باوەڕو هەیە بەوەی خودا هەیە و قیامەتیش دادێ و پرسیاریش‌و لێ دەکرێ کە بە چی‌و تەمەن بردۆتە سەرێ، جا لە سەر ئەو باوەڕە ئەگەر ڕاست دەکەن، لەو ماڵ و داراییەی خودا پێی داون بەشێکی بۆ ئەو ڕۆژەی بکەنە تێشوو و زەخیرە، واتە دە پێناو ئەو ڕۆژە سەختەدا بیدەنە بێنەوایان، دە پێش ئەوەیدا ئەو ڕۆژە دابێ، چونکە کە داهات تازە نە سەودا دەمێنێ نە دۆستایەتی دەمێنێ نە تکاکار دەمێنێ هیچ ڕێگایەک بۆ ڕزگاری نامێنێ بەغەیرەز عەمەل ئەوەش دەبێ بزاندرێ: ئەوەی باوەڕی نەبێ زوڵم لە خۆی دەکا و خۆی ماڵوێران دەکا و بە کافر دێتە ژمار دە ڕۆژی حیسابێدا.

دێرەدا کە خودا دەفەرموێ: (مِمَّا رَزَقْنَاكُم) هەست بە شتێکی دەکرێ کە دڵ و ئەقڵ وەریدەگرن. شتەکەش ئەوەیە: خودا دەفەرموێ: لەوەی ئەمن داومنێ، ئەوە تەئکیدە لە سەر ئەوەی کە دەبێ ئێوە ئەو ئینفاقە بکەن چونکە خودا داوای ئەوەو لێ ناکا کە بۆخۆ و بە خۆو داوە، داوای ئەوەو لێ دەکا کە بۆخۆی بە ئێوەی داوە، و هەروا ئەوەش دەگەیێنێ: شتەکەو دەبێ هەچی هەیە لە خودای بزانن.

ئەو ئایەتە پیرۆزە ئەوەشی لێ چاو دەکرێ: ئەوانەی دارایییان هەیە و بەڵام هەر لە خۆی دەهاڵێنن هیچ بۆ ئەولا بەڕێ ناکەن، ئەوە بزانن ئەوانە خۆرکە و مۆرکەی ڕەگ و ڕیشەی داری بەرزی کۆمەڵایەتی و گەلی ئینسانن، بەو دەلیلە تاکوو گەلی بێ قاچ و قول نەکەن، ناتوانن خۆیان بە قاچ و قول کەن، واتە تا عالەم فەقیر نەکەن ناتوانن خۆیان غەنی کەن.

دە ئایەتەکانی ڕابردوودا باس لە جیهاد واتە تێکۆشان و شەڕ بە گیان و بە لەش کرا لە ڕێگەی خودادا. هەروەک لە باسی تالووت و جالووت و اشمویل پێغەمبەرەکەیاندا هاتە گۆڕێ باسی ئینفاق، ئەمما دێرەدا باسی جیهاد بە ماڵ و داراییە، کەوایە دەکرێ بڵێین: شەڕ و تێکۆشان واتە جیهاد چ بە گیان و چ بە ماڵ و دارایی بێ، هەر دوو هەر جیهادن: گەورە و چکۆلە. جیهادی گەورە ئەوە بوو کە دە ئایەتی ٢٤٤ی بەقەرەدا باس کرا: ﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾.

جیهادی چکۆلەش ئەوەیە بە ماڵ و سامان و دارایی کە دیارە لە سەر دڵیشــی بەخشـینی مـاڵ و سامان قورسایی هەیە.

دە ئایەتەکەدا هێنانی ئەو سێ شتانە واتە (بیع) و (خلّة) و (شفاعت) هەستێک بە دڵدا دێنن هەستەکەش دەبێ ئەوە بێ: خودا کە دەفەرموێ: دە فریای خۆتـان کەون لە دنیایەکـدا کە بـار و تەوەرەی ژیان بەو سێ شـتانە دەگەڕێ و پێکـدێ، جـا پـێش ئەوەی دنیـایەک بـێ کە ئەو سـێ شتانەی تێدا نییە، وەخۆ کەون، وەسیلەی ژیانی دنیا، یا بە معاملەیە، معامەلەش واتە فرۆشتن و کڕین، یا داوا کردنی یارمەتی و کۆمەگە لە دۆستان و کەسانی دەسـت و دڵئـاوا، یـا تەوەسـول دەکەی بە باوەڕ پێکراوێکی لێهاتوو. دیارە ئەو سێ شتە لە ڕۆژی قیامەتدا قاتن.

ئەو هەستەش دەکرێ لەو ئایەتە پیرۆزە (أَنفِقُواْ) ئەمر و دەستوورە، واجب دەگەیێنێ، جا ئە دەو ئەمرەدا ئەو هەستە دەکرێ: ئینفاق، بۆ وەی ئەرزشی ببێ و جێ بگـرێ، و ڕۆژی خـۆی دڕ بدا بۆ چوونە پێش ئەو ئینفاقەیە کە دە حاڵی حەیاتدا بکرێ، بەو دەلیلە کاتێ بتوانی بەو هەمـوو ئاوات و ئارەزوویەی هەتە لە دنیـادا بـۆ مـاڵی دنیـا ئەو مـاڵە دنیـایە ببەخشـی، ڕاسـت دەکەی قیامەتت دەوێ، ئەمما ئەگەر هاتیە بەر مردن و بەجێ هێشتنی ماڵ و ملّک و ژن و منداڵ ئەودەم بڵێی: دا ئەوەم بۆ بکەنە خێر و دە ڕاهی خـودادا بیـدەنە خـاوەن نیـازان. ئەو کـارە و ئەو خێـرە پووچەڵە و پووچەکە، چونکە زۆر لەوە نزیکە تازە ماڵ ئی تۆ نەبـێ هەر وەک بۆخـۆت دەزانـی تازە ڕۆیی ئەتۆ، بێجگە لەوەش باری ئەزیەت و ئازار دەخەیە سـەر شـانی واریـس و کەسـانت لەوانەیە ئەوانیش کە لە تۆن هەروەک تۆ دڵیان نەیە، و ئەگەر ئاوڕێکیش وەدەین بۆ سـەر مانـا و وردەکاری ئایەتی ٩٦ی ئەنعام ڕەنگە باوەڕ بکرێ بەوەی کوترا: واتە ﴿مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ اللَّهِ بَاقٍ﴾ (نحل: ٩٦) **ئەوەی کە لە لای ئێوەیە تەواو دەبێ، ئەوەی کە لە لای خودایە دەمێنێ.** یـانی ئەوەی هەر لە بەژن و باڵای هـاڵێنێ و دە خـۆتی وەرێنـی و زەگ و هەوەسـی پـێ دابـین کەی ئەوانە شتانێکن بە مردنت ویشکاوی پێ دێ. بەڵام ئەوەی لە ئیمان و ویژدانتی هاڵێنی ئەوە بۆ خودایە و ویشکایی نایە، بەڵکە بە مردنت شینتر دەبنەوە و هەڵدەدەنەوە. ئـایەتی ٩٤ی ئەنعـام: ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَى كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاءَ ظُهُورِكُمْ وَمَا نَرَى مَعَكُمْ شُفَعَاءَكُمُ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَاءُ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾ **بەڕاستی بە تاقی تەنیاگەڕانەوە بۆ لای خۆمان، هەروەک هەوەڵ جار دروستمان کردبوون، ئەوەی کە پـێمان بەخشیبوون لە پـاش خۆتـان بەجێتـان هێشـت، ئەو تکاکـارانەش نـابینن لە گەڵتانـدا کە بە خەیـاڵ واتـان**

**دەزانی، لە کاروبارەکانتاندا شەریکی خودان، لە ڕاستیدا پەیوەندی نێوانتان پچڕا و خەیاڵەکەشتان بە پووچ دەرچوو.**

ئەو ئایەتە زۆر هەڵدەگرێ نەزەر و ڕا، ئەمما ئەوەی زۆر بەرچاوە و دڵ وەریدەگرێ ئەوەیە: ئینسان بەتەنیا دەگەڕێتەوە لای خودا، ئەوەی لە دنیادا کەسبی کردووە دەگەڵی ناچێ. ئەوە نەزەرێکە. یا دەڵێن ئەقڵ و دەرک و شعوورێک کە بۆ دنیایەی دابوویە بۆ ڕەنێوهێنانی بەرهەمی ژیانی دونیا، ئەوانیش دەگەڵ خۆ نابەیەوە، چاو و گوێ و دەرکی قیامەت تایبەتی ئەو ڕۆژن وەک ئی دونیایە ناچن. ئەوەش نەزەرێکە. هەندێکیش دەڵێن چۆن بە ڕووتی لە زگی دایکتڕا هاتوویە سەر زەوی، ئاواش دەگەڕێیەوە لای خودا، ئەوەش نەزەرێکە.

هەندێکیش دەڵێن: ئینسان بێ ماڵ و سامان هاتۆتە دنیاوە و دیسان هەر بەبێ ماڵ وسامان دەگەڕێتەوە لای خودا.

پوختەی مەبەست لەو هەموو بوارەوە تەنیا بۆ خودا هێنرایە سەر زەوی واتە عیبادەت، ئایەتی ٥٦ی زاریات. تەنیا ئەوەی بۆ خودا شت بەکار هێناوە دەگەڵت دەگەڕێتەوە لای خودا و بەس. بۆ ئەو ڕاستیە سەیری ئایەتی ٨٠ی سوورەی مەریەم کە: ﴿وَنَرِثُهُ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا﴾ **ئەوەی دەیڵێ ئێمە بە میرات لێی وەردەگرینەوە، خۆشی بە تاقی تەنیایی دێتەوە لامان.**



دە ئایەتەکانی پێشێدا شەفاعەتی ڕۆژی قیامەتێ نەهی کرا واتە ئەوە (لا شفاعة) کوترا یانی خودا ڕێ نادا کەس بۆ کەس تکایە بکا. دیاریشە لە ژووروەی قودرەتی خودا هیچ قودرەتێک نییە. و هەروا دە ئایەتی پێشدا کافر و زاڵم دەسنیشان کران، گەورەترین هۆی زوڵمی کافرانیش ئینکاری یەکتایی خودا بوو. و هەروا دە چەند ئایەتی پێشێدا چیرۆکی بەنیئیسرایل بوو بە ڕێبەری پێغەمبەر اشمویل و هەروا ڕێبەرایەتی تالووت بە دژی کافرانی وەک جالووت، و هەروا نەختاڵێک لەوە پێش باس لە سەر زانستی ئەحکامات و دەستووراتی چاکە و چاکەکاران بوو. پاشان گۆشەیەک لە چیرۆکی گەلی حزقیل پێغەمبەر و گەلی اشمویل پێغەمبەر بوو. ئێستا و ئەوجار دەمانەوێ بچینە سەر باسێک سەرتۆپی هەموو باسان بێ. ئەو سەرتۆپەش **تەوحیدە** واتە خودا بە یەک ناسین. چۆن بە یەک ناسینێک! ناسینێکی وا کە هەر ئەو بە ڕازق بناسرێ، نەک شێخ و مەلا و ئاغا. سوژدە هەر بۆ ئەو ببرێ نەک بەرد و دار و ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە، داوای نیاز هەر لەو بخوازرێ نەک لە سەید و مەلا و شێخ و ئاغا، پەنا هەر بۆ ئەو ببرێ نەک بەرد و دار و مردوو، مردن و زیندوو بوونەوە هەر لەوڕا بزاندرێ نەک لە شتی دی.

بە کوردی: ﴿وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ دیارە هەچی ئامانج و هەدەفـی زانسـت و چیـرۆک و عیلمە هەر لە دەوری تەوحیدا هەڵدەسوورێن و دێن و دەچـن. جـا بـۆ ڕاسـتی ئەو کوتـانە و تەئیدی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٥٥ی بەقەرە:

﴿٢٥٥﴾ اللَّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاء وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ

**خودا هەر ئەو خودایەیە کە کەس شایان و شیاوی پەرستن نییە جگە لەو، زیندوویەکی بێ دوایـیە و بەردەوامە، ڕاگـر و هەڵسـووڕێنەری بـوونەوەرە. هەرگیـز وێژینـگ نـادا و خەویـش نایباتەوە. هەرچـی لە ئاسمـانەکان و زەویـدانە، مڵکـی ئەون. کێـیە بەبـێ ئیـزن و مـۆڵەتی ئەو بتوانێ لە لای ئەو شەفاعەت بکا؟ خودا ئاگادارە بە سەر ڕابردوو و داهاتوویاندا. هـیچ کەس بە سەر هیچ شت لە زانیارییەکـانی خـودا ئاگـادار نیـیە و ڕاناگـا، مەگەر بە ویسـتی ئەو نەبـێ. تەختی فەرمانڕەوایی خودا ئاسمانەکان و زەوییەکانی گرتۆتە بەر، لە سەرپەرستی و ئاگـاداری ئاسمان و زەوی و ئەوانەی دە ناویاندان، ماندوو نابێ و ناوەستێ. هەر ئەویشـە کە پـایەبەرز و گەورەیە.**

## ئایەتەلکورسی

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە سیمای ئایەتی ٢٥٥:

خودا ئەو خودایەیە کە بە تەنیا دەبێ بپەرسترێ و سەژدەی بۆ بچێ، چونکە ئەقڵ و ویژدان دەڵێن و سـەلماندوویانە کە هەر ئەو شـایانی ئەو پـلە و پـایەیە کە دەبـێ سـەژدەی بـۆ بچـێ و بپەرسترێ، بەو دەلیلە ئەو دروستی کردووین، ئەو دەنژێنێ و ئەو ڕزقن دەداتێ و ئەو دەنمرێنێ و ئەو زیندوون دەکاتەوە و ئەو حیسابێی دەگەڵ دەکا. کەوایە چـۆن دەبـێ کەسـێک هەسـت و نیستی تۆی پێ بێ و سەژدەشـی بـۆ نەبەی و نەیپەرسـتی؟ و هەروا ئەو خـودایەی کە شـایانی پەرستنە، هەمیشە زیندووشە، فەنا و نەمانی بە سـەردا نـایە هەرگیـز، ڕاوەسـتاو بە خۆشـییەوە و ڕاهێنەر و تەدبیرکەر و ڕاگری بوونەوەرە، بێ‌گیان و بەگیان ڕزق‌دەریشـیانە (واتە قەییـوومە)، نە وەنەوز دەگرێ نە خەو دەیگرێ، واتە هەرگیز غافڵ نییە لە ئیدارەی ئەو بوونەوەرە، چونکە ئەگەر ئانێـک لە بـوونەوەر لە بـابەت نەزمەوە غافـڵ کـرێ لە نەزم دەردەچـێ و وێـران دەبـێ نیزامـی

کائینات، هەروەک دە ئایەتی ٤١ی فاطردا ئاماژە وەلای ئەو ڕاستییە کراوە:

﴿إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَن تَزُولَا وَلَئِن زَالَتَا إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّن بَعْدِهِ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾ **بێ گومان خودا بە تەواوی ئاسمانەکان و زەوی ڕادەگرێ بۆ ئەوەی لە سەر تەوەر و بستەی تلاسا نەبن و دەرنەچن (واتە لە نەزم دەرنەچن) چونکە ئەگەر بترازێن لە سەر تەوەر و بستەی خۆیان (کائینات بەو بوونەوەرەی دە ناویدا دەکەونە ناو نەمان) و بەغەیرەز خوداش کەس نییە بتوانێ ڕایانگرێ. بێ گومان ئارام و هێدی و لێبوردەیە.**

جا ئەگەر ئەو خودایە ڕاگری ئەرز و ئاسمانەکان بێ کەوایە دەبێ بکوترێ ئەوی دەوانیشدا بە ئەرز و ئاسمانەکانیشەوە ئی خودان و ملکی ئەون و کەسیش ناتوانێ و مافی ئەوەی نییە بتوانێ دەستیان تێ وەردا جا مەگەر ئەو ئیزنی بدا؟ هەروەک خودا بۆخۆشی ئەوەی فەرموو: ﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾ کێیە بتوانێ یەکێ ڕزگار کا دە کاتی حیسابێدا لە دەس خودا، مەگەر خۆی ئیزن بدا؟ ئەدێرەدایە دەدرێ لە دمی ئەوانەی کە خەیاڵیان وایە ڕۆژی حیسابێ بێن شەفاعەتی دەکەن بۆ هەوادارانیان وەک خودای تەعالا خەبەریان لێوە دەدا بە وەسیلەی ئایەتی ٣ی سوورەی (زمر) و ١٨ی یونس:

زمر ﴿٣﴾ أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ

**ها بزانن: ئایینی پاک و خاوێن هەر ئایینی خودایە. ئەو کەسانەی کە لەباتی خودا سەرپەرشت و دۆستانێکیان بۆ خۆ هەڵبژاردووە و دەڵێن: ئێمە ئائەوانە ناپەرستین لە بەر ئەوە نەبێ لە خودامان وەنزیک خەن، دیارە خودا بەو دووبەرەکییە و کێشەیە ڕادەگا کە دە نێوانیاندا هەیە. بێ گومان خوداش درۆزن و ناسپاسەکان شارەزا ناکا. چونکە درۆزن خودای ناوێ تا شارەزایی لێ فێر بێ.**

دووبارە هەر موشریکەکان دەڵێن: ﴿هَـؤُلاء شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللّه﴾ (یونس: ١٨) **ئائەوانە تکاکار و شفاعەتکارمانن لای خودا.**

## وریا بە شووشە نەشکێ، ئەگەر شکا پەکووی ناوێ!

دەبێ ئەوەش بزانن کە لە دنیادا خودا وەعدەی لێخۆشبوونی داوە لە هەرچی تاوانە بەغەیرەز شیرک. جا دەبێ ئەدێرەدا وریا بین بە هەڵە نەچین. ئەو وەعدەی خودا لەمەڕ بەخشینی تاوان لە تاوانکەران دە دنیادا ئاماژەیە وەلای ئەوەی ئینسان، ڕێ نەدەی و نەهێڵی کار لە بەرەگە بچێتە دەرێ. واتە تاوان و خەتاکانت هەڵگری بۆ ڕۆژی حیسابێ واتە قیامەت. لەوێ

لێخۆش‌بوونت نییە چونکە ئەوێ جێگـای پـاداش و تـۆڵەیە، جێگـای حیسـاب و کیتـابە، ئەو هەموو مەیدانەی دنیا جێگـای تـاقی کـردنەوەیە. تـۆبە بـکە، چـاکە بـکە، قەرزان وەدە، ئەگەر شووشە شکا و ئاو ڕژا، پەکوو پەکوو دەرد چارە ناکا.

ئایەتی (إِلاَّ بِمَا شَاء) دوو شتی لێ هەست دەکرێ:

١. لە سەر ئەساسی کوتەی فرشتەکان کە خودا لێیان نەقڵ دەکا بە وەسـیلەی ئـایەتی ٣٢ی بەقەرە، دەبێ خودا زانا و خەبەرداری شتانێکە فرشتەکان لەوەی نازانن: ﴿قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْـمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ **فرشتەکان کوتیان ئێمە هیچ زانیارێکمان نییە بـێجگە لەوەی کە تۆ فێرت کردووین بەبێ گومان هەر ئەتۆی زانا و کاربەجێ.**

٢. هـیج کەس لە نهێنییەکـانی خـودا خەبەردار نیـیە، جـا مەگەر زەمـانێ کە خـودا خـۆی بیهەوێ. بە پێی حیکمەتی و بۆ ئیسباتی پێغەمبەرایەتـی پێغەمبەرەکـان لە سـەر هەنـدێک شـت ئاگاداریان وەکا. وەک دە ئایەتی ٢٦ و ٢٧ی سوورەی جندا فەرموویەتی:

عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِن بَيْنِ يَدَيْـهِ وَمِـنْ خَلْفِـهِ رَصَـدًا ﴿٢٧﴾ **خـودا خـۆی زانـای هەمـوو نهێنییەکـانە و کەسـیش ئاگـادار ناکـا بە سـەر نهێنییەکانیدا (٢٦) بێجگە لە پێغەمبەرێکی هەڵبژێردراو. بێ‌گومان خودا لە بەردەم و پێشەوە چاوەدێرێـک دەنێرێت. (٢٧)**

## کورسی ئاسمان و زەوی دە بەردایە

ئایەتی ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ قورئانزانەکان نەزەر و بۆچوونی زۆریان لە سـەر داوە. بۆ نموونە:

١. شـــتێکی گەورەیە کە ئاســـمانەکان و زەوی بە هەمـــوو ئەو شـــتانەی دە ناویانـــدایە، دە ناوخۆی گرتوون و داگیری کردوون. واتە لە ژێر عەرشەوە و لە سەرووی ئاسمانی حەوتەمەوە، ئەگەرچی ئەقڵ لێرەدا هەڵدەبەزێتەوە چونکە ئەگەر لە سەرووی ئاسمانی حەوتەم بـێ و لە ژێـر عەرشەوە بێ، نابێ ئاسمان و زەوی دەخۆ گرتبن، بەڵام ئەو شتانە ئەقڵ ئەقڵێنن.

٢. هەندێکیش لایان وایە بوونەوەرێکی گەورەیە دە عالەمی ژووروودایە لەوی ژووراتر نییە وەک عەرش و لەوح و قەڵەم. شێخ حەسەنی بەسـریش دەڵێ: کورسی هەمان عەرشە.

٣. (سدی) کە یەکێکە لە زاناکانی قورئـانە فەرمـوویەتی: کورسـی بـوونەوەرێکی گەورەیە ئاسمانەکان وزەوی وەک مۆرەیەکی چکۆلە دە ناویدا جێگیر کراوە.

٤. هەندێکیش دەڵێن: کورسی واتە دەستەڵات و قودرەت و هێز و زانستێکی وا کە هەچی هەیە دە ناو خۆیدا داگیری کردووە.

٥. هەشن کوتوویانە: کورسی واتە عیلمی کاملی خودا.

٦. هەشن کوتوویانە: کورسی واتە دڵی عارفان، جا ئینسان بن ئەولیا بن، هەرکەس بێ. (روح المعانی ج ٣، ل ١٩٠)

ئەو هەموو نەزەرانە ئەوە دەڵێن: یەقین نییە لە ئینسان کورسی یا عەرش یا لەوح یا قەڵەم چن و چۆنن؟ لە چن و بە چی هەڵاوەسراون؟ زانینیشیان لە واجباتی دینی نین کەوایە وەدواکەوتنیان لەوە زیاد ڕەوا نییە.

زانینی گەورایەتی ئایەتەلکورسی بەشێک نییە لە ئەرکانی دین بەڵام چونکە خەڵکی موسوڵمان عادەتەن لە پاش نوێژەکان هەر دەیخوێنن بۆ ئازایەتی و توندوتۆڵ کردنیان ناحەز نییە، ئەو سیفەتەشی لێ بەیان کەین تاکوو شێلگیرانەتر بن لە سەر خوێندنی ئایەتەلکورسی.

## سیفەتی ئایەتەلکورسی

خاوەنی ١٠ جوملەیە، ئەو دە جوملەیە لە پەنجا کەلیمە پێک هاتووە، هەر جوملەیەکیش ئاماژە وەلای سیفەتێک یا چەن سیفەتی بەرزی باری تەعالای تێدایە.

دەچینە سەر دە جوملەکان و دەگەڵ ئاماژە وەلای سیفەتەکانیش:

١. ﴿اللّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ﴾: ئاماژەیە وەلای دوو سیفەتی ئولوهیەت و وەحدانیەت.

٢. ﴿الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾: ئاماژەیە وەلای سیفەتەکانی حەیات و قەیوومەت و تەسەڕوف دە هەموو ئەشیادا.

٣. ﴿لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ﴾: ئاماژەیە وەلای نەهی لە سیفاتی نەهیکراو پاکی خودا و دووری لە خەو و وەنەوز.

٤. ﴿لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾: ئاماژەیە وەلای مالکیەت و سەڵتەنەت و تەسەڕوف دە جەمیعی کائیناتدا.

٥. ﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾: ئاماژەیە وەلای نەهی شەفاعەت لە عالەم و ئیسباتی قودرەت بۆ خودا.

٦. ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾: ئاماژەیە وەلای ئیسباتی عیلمی کاملی لەخۆگری کائیناتە.

٧. ﴿وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاء﴾: ئاماژەیە وەلای عاجزی مەخلووقات لەمەڕ دەركی زانستی خودا و ئیسباتی ئیرادەی كامڵی خودا.

٨. ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾: ئاماژەیە وەلای پادشایەتی بێ سنووری خودا.

٩. ﴿وَلاَ يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا﴾ ئاماژەیە وەلای هێزی كامیلی خودا و نیازی كائینات بەو هێزە.

١٠. ﴿وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾: ئاماژەیە وەلای دوو سیفەتی (علوّ) و (عظمت).

ئەگەر بە وردی ئەو ١٠ جوملەیە هەڵسەنگێندرێن دە هەر یەک لەو دە جوملانەدا دوو سیفەت لە بابەت زاتی پاک و بێهاوتای خودا چاو دەكرێن. جا بەو پێیە ئایەتەلكورسی ئەو دە جوملانەی نیشاندەری ٢٠ عیلمی زاتی خودان. كەوایە دەبێ بكوترێ ئەو ئایەتە كورسیە جەواهیراتی زۆری دە پاڵدا.

هەروەک بە تەواوی بۆمان دەركەوت و ڕوون كراوە بە وەسیلەی ئایەتی ٢٥٥ی بەقەرە، بابەتی تەوحید بە هەموو لایەكیەوە واتە بانگ كردنی عالەم بۆ لای تەوحید بە زۆر و زۆرداریيە، یا بە ئیختیار و ویستی ئینسانە؟ زیادە كێشە لە سەر ئەوەی نییە كە دەعوەت بۆ لای تەوحید واجبە و فەڕزە، ئەمما هەرا و كێشەكە هاتۆتە سەر ئەوەی كە ئایا ئەو دەعوەتە فەڕزی تەواوە یا ئیختیارییە؟ جا هەر لەو بارەوەیە هەندێک لە قورئانزانەكان كوتوویانە: ئەو دوو ئایەتی ٢٥٦ و ٢٥٧ تەواوكەری ئایەتی ٢٥٥ن، چونكە دەواندا بە تەواوی ئەو پرسیارە كە دەڵێن: ئایا دەعوەت بۆلای تەوحید زۆرییە یان ئیختیارییە؟ ڕوون دەبێتەوە؛ گەرچی هەشن هەندێک دەڵێن نەخێر ئەو دوو ئایەتی ٢٥٦ و ٢٥٧ سەربەخۆن. جا كەوایە ناچارین ئەو شەرعەی بەرینە لای خودا چونكە خودا قازی سەرەوەی هەموو قازییانە. خوداش بە وەسیلەی ئایەتی ٢٥٦ ڕوونی دەكاتەوە كە ئایا دین و ئایین دەبێ بە زۆری بە گەرووی عالەمدا بكرێ؟ یا بە خۆشی و ئیختیارەوە دەبێ عالەم قووتی داو هەزمی كا؟ جا ئەوە ئایەتی ٢٥٦ و ئەوەش تۆ:

**﴿٢٥٦﴾ لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ**

**هیچ چەشنە زۆری و تۆبزیگەرییەک بۆ قبووڵ كردنی دین و ئایین دە ئاییندا نییە، چونكە خودای تەعالا لە بارەی دینەوە ڕێگای ڕاست و خواری دەسنیشان كردووە واتە شارەزای لە ناشارەزایی جیا كردۆتەوە (كامە لای واز لێیە ئینسان با هەڵگرێ). جا هەركەس بڕوا بە خودا بێنێ و بڕوا بە تاغووت و ستەمكار نەهێنێ، بێگومان ئەوە دەستی بە دەستگرێكی پتەو**

گرتووە کە هەرگیز ئەوەی ئەو دەستی تێ گرتووە پچڕانی نییە و بە سەردا نایە. خوداش بیسەریشە و زاناشە.

## دین بە زۆر قووت نادرێ

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر سیمای ئایەتی ٢٥٦:

بە پێی فەرموودەی ئەو ئایەتە، خودا مەسەلەی بەدین بوونی داوەتە دەستی ئینسان تاکوو بتوانێ بە ئارەزووی خۆی و ویستی خۆی دینی خۆی هەڵبژێرێ، بەو دەلیلەوەیە خودا ئیمان بوونی داوەتە دەستی ئادەمیزادی، چونکە ئیمان و بڕوا دەبێ لە سەر ئەساسی باوەڕ و یەقین بێ. خۆ دیارە شتی بەزۆر داڕێژنە دەروونت، خاڵی لە گومان نابێ. نیەت و یەقینیشت بۆی قووت ناچێ. ناوەرۆکی ئایەتی ١٢٥ی نەحل تەئیدی ئەوەی دەکا: بانگێشتنی خەڵک بۆ لای دین نابێ بە زۆری بێ، بەڵکە دەبێ بە شێوەی دەلیل و بورهان و حیکمەت بێ:

﴿ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ **بە حەکیمانە و بە جوانی بانگەشە بکە بۆ ڕێبازی پەروەردگارت، و جوانترین شێوەش دەگەڵیا بدوێ. بەڕاستی هەر پەروەردگارت زاناترە بەوەی لە ڕێگای لاداوە و هەر ئەویشە ئاگای لەوانەیە کە ڕێی ڕاستیان گرتووە.**

دیارە ئەوە سابت بووە: چ ئیمان چ کوفر بە زۆر ناچێتە ناو ژووری دڵەوە، هەچی نەشچێتە ناو دەروون بێ قیمەتە و هیچە. ئەوانەی لە لاوەڕا لە ڕووی بێ دەلیلی کوتوویانە: ئایینی ئیسلام ئایینی شیر و تیرە، واتە بە زەبری شیر و تیر دەرخواردی عالەم دراوە، بوختان و تەوهینە بە ڕاستی دەکەن.

ئەگەر یەکێک لەولاڕا بێ و بڵێ: ئەی ئیسلام ئەگەر ئایینی شیر و تیر و شەڕ نییە و نەبووە، ئەو هەموو غەزایانەی کراون لە سەر چی کراوە؟ مەگەر ئەو بە شیر و تیر نەکراون؟ دەبێ لە وڵامیدا بکوترێ بە شێوەیەکی حەکیمانە: لەو ئایەتانەی قورئان کە لە بابەت شەڕەوە دابەزیون بڕوانە و هەڵیانسەنگێنە، تاکوو بۆت دەرکەوێ ڕاستییەکە، کە شەڕ دە ئیسلامدا تەنیا بۆ ئەوەی بووە ئیسلام دابەزێتە ناو عالەم و هەروا دیفاع لە ئیسلام بکرێ و یاساکانی بپارێزرێن. شەڕ دە ئیسلامدا وەک ئەو غەزایانە بۆ داگیر کردنی ماڵ و مڵک و دارایی عالەم نەبووە، و بۆ بەزۆر موسوڵمان کردنی عالەم نەبووە. ئەگەر ئاقڵانە و ئینسافانە و حەکیمانە سەیری جوملەی ﴿لاَ إِكرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ بکرێ کە کەلامی خودایە کەلامی خوداش ڕاست و بێ درۆ و بێ هەڵەیە،

ئەوەی قبووڵ دەکەین زۆری لە دیندا نییە و ئەوەی ڕۆژهەڵاتەکان و هەوادارانیـان دەڵـێن درۆن. جگە لەوانەش خودا ڕاست و خوار و حەق و باتڵی پێ ناساندووین و بۆی ڕوون کـردووینەوە جا ئەگەر کارەکە هەر زۆری و تۆبزیگەری بوایە ئەو جیا کـردنەوەی چـاک و خـراپ و حەق و باتڵی بۆچی بوو؟

یەقین یەک هەر یەکە و دووش هەر دوویە، ئەوەی ئاوا نـازانێ و ئـاوا نـابینێ، خـێلە، واتە یەک بە دوو دەبینێ.

و هەروا ئەگەر حەکـیمانە و ژیـرانە سـەیری ئـایەتی ٢٩ی کەهـف بکـرێ زۆر بە ڕوونــی دەردەکەوێ و دێتە ڕوو کە دین بە خاستی ئینسانە و بە ئیختیارە، زۆری لێ چاو ناکرێ:

﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ بڵێ حەق هەر لە لای پەروەردگارتاندایە، جا کەواتە کێ دەیهەوێ ئیمان بێنێ با بێنێ، کـێش نـایهەوێ بـا نەهێنـێ (واتە بـا کـافر بێ).

ئەوە گەورەترین بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە دین زۆری تێدا نییە بەڵکە ئیختیارییە.

## تاغووت کێن؟

موفەسـرانی قورئان پێنج ناویان لە سەر تاغووت نیشان داون:

١. دەڵێن شەیتانە
٢. دەڵێن کاهنن، واتە فاڵگر و سیحرباز
٣. دەڵێن ساحرن
٤. دەڵێن بتن
٥. دەڵێن جنۆکە و مرۆڤ و شەیتانن

## هۆی دابەزینی ئایەتی ٢٥٧

ئیبنی‌جەریری تەبەری لە ئبنی‌عەبباسەوە نەقڵ دەکا و دەڵێ: کابرایەک لە هۆزی بەنی‌سەلیم دەبێ کە ناوی «حصین» دەبێ بۆخۆی موسوڵمان دەبێ ئەمما دوو کوڕی دەبن مەسیحی. دێـتە خزمەت پێغەمبەر و عەرزی دەکا ئەو بابەتە و دەڵێ: ئەمن بە زۆر ئەو دینە ئیسلامەیان پێ قبووڵ کەم دەبێ؟ چونکە ئەوان لە سەر ویستی خۆیان ئایینی نەسـرانییان قبووڵ کـردووە. سـەرەنجام حصین ڕاناوەستێ لە سەر وەڵامی پێغەمبەر، تێیان هەڵدەپێچێ بۆ قبووڵ کردنی دینی ئیسـلام و

وەلانانی دینی خۆیان. ئەو جەریانە دەهێنـدرێتە خـزمەت پێغەمـبەر چـونکە کوڕەکـان ئەویـان قەبووڵ بوو بۆ داوەر. دەپێشدا بابەکەیان (حصين) قسەی خۆی کرد و کـوتی: ئەمـن نـامهەوێ ئەو دوو کـوڕانە کە بەشـێکن لە لەش و گیـانی مـن بە ئـاوری دۆزەخ بسـووتێن بە هـۆی ئەو باوەڕەیان. دیارە پێغەمبەر بە پێی دابی پێغەمبەرایەتی بۆ وڵامدانەوەی هەر پرسیارێک چاوەڕوانی وەحی خودای کردووە، جا لە سەر ئەو ئەساسە پێغەمبەر وەڵامی نەدانەوە تا خودا ئەو ئـایەتەی دابەزاند کە زۆری دە دیندا نییە. بەڵکە ئینسان ئازادە و خاوەن هەڵوێستە کامە دینە هەڵـدەگرێ بـا هەڵگرێ: ﴿فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ﴾.

## منافات لە نێوان ئایەتەکانی ٧٣ی تەوبە و ١٩٣ی بەقەرە

بە کورتی و بە کوردی: هەروەک ئایینی ئیسلام بە ڕەوای دانەناوە بە زۆر کەس موسـوڵمان کرێ، ئاواش ڕێی نەداوە و بە ڕەوای دانەناوە کەس بەزۆر لە دین و ئایینی خـۆی دەرکـرێ. جـا ئەوجار لە سەر قبووڵ کردنـی ئەو یاسـا ڕەنگیـنە دەبـێ دە بەرابەر ئەو ئـایەتە (٧٣ی سـووڕەی تەوبە)دا چ بڵێین چونکە ئەو ئایەتە دەگەڵ ئەو ئیدیعایە منافاتی هەیە. بـا ئـایەتەکەش بڵێـین جـا پاشان وڵام دەدەینەوە:

﴿يَـا أَيُّهَـا النَّـبِيُّ جَاهِـدِ الْكفَّـارَ وَالْمُنَـافِقِينَ وَاغْلُـظْ عَلَـيْهِمْ﴾ ئەی پێغەمـبەر دەگەڵ کـافر و دووڕووەکاندا جیهاد بکە و توندوتیژیش بە کار بەرە.

ئەدێرەدا حاشا ناکرێ لەوەی کە مانای ئەو ئایەتە دەگەڵ مانای ﴿لاَ إِكـرَاهَ فِي الـدِّينِ﴾ یەک ناگرنەوە.

وەڵام: هەندێک دەڵێن ئەو ئایەتە (٧٣ی تەوبە) شۆراوەتەوە و بەڵام ئیبنیمەسـعوود دەڵـێ: ئەو ئایەتە دە ساڵی سێ یا چواری هیجری نازڵ بووە پاش ئەوەی کە ئایەتی جیهاد دابەزیـوە کە وایە منافاتەکەی هەیە بە توندی دەگەڵ ﴿لاَ إِكرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ ئەمما لە سەر نەسـخەکەی شـەش قەول هەن لێیـان دەگەڕێـین هەروەک «قرطبـی»ش نەزەری وایە (ج ٣، ل ٢٨٠). ئەمـما شـەعبی و قەتادە و زەحاک ئەوان دەڵێن کە سەرانەیان دابا مەجبوور نەدەکران بـۆ ئیسـلام بوونیـان ئەمـما ئەگەر سەرانەیان نەدابا ئەو بتپەرستانە ناچار دەکران یـا شـەڕ بـکەن یـا ئـیمان بێـنن. چـونکە بتپەرستی دین نییە ناکوو بەزۆر لێی دەرنەکرێ. ئەوەی بە زۆر نـابێ لە دینـی خـۆی دەرکـرێ دینی موسوڵمانە، یەهوودە، مەسیحییە، واتە ئەهلی کتێب، نەک بتپەرست.

لە سەر منافاتی نێـوان دوو ئـایەتی ٧٣ی تەوبە و ٢٥٦ی بەقەرە، بێـنە و بەرە زۆرە لە نێـوان

قورئانزانەکان. ئەوەی حەقیقەتە و حاشا هەڵنەگرە، ئەوەیە: دەستووری شەڕدان دەگەڵ کـافر و منافق کە بە وەسـیلەی ئـایەتی ٧٣ی تەوبە دابەزیـوە نیشـانەی زۆری لـێ دیـاری دەدا، چـونکە بۆوەی بە شەڕ دێی هاودینت نییە، ئەتۆ موسوڵمانی و ئەو کافرە. دە لێ‌گەڕێ ئەویش بـا لە تـۆ گەڕێ، چونکە هەردووکتان بە واز و ئیختیاری خۆتان دینەکەو هەڵبژاردووە. ئێستێ کە ئەتـۆی موسوڵمان شەڕی پێ دەفرۆشی و پێی دەڵێی یا سەرانە بدە یا بڕۆ دەر لە وڵات یا موسـوڵمان بە و دانیشە و دیـنەکەت وەلانـێ، مەگەر ئەوە ئیکـڕاە نیـیە؟ لە زۆری زیـاتر مانـای دی نـادا، ئەو جوملەیە بەو شێوەیە. ئەمما بۆ خۆ نەجات دان لەو منافاتە و دروستی مانای هەر دوو ئایەتەکان و منافاتیشان نەبێ دەگەڵ یەک دەبێ ئاوایان تەعبیر لێ دەینەوە:

﴿لاَ إِكرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ واتە دینێکی بە خواهیشت و ویست و لێکدانەوە دانەڕژێتە ناو دەروون لە لای خودا حیسابی لە سەر ناکرێ. یا بە پێی مەسڵەحەتی کـات و زەمـان و بـێ دەسـتەڵاتی بشـڵێی: بەڵـێ دەسـبەردارم بـن ئەوە ئەو دیـنەی داوام لـێ دەکەی قبـووڵم کـرد بە داب و دەستووریەوە. و شەڕی ئیسلامیش دەگەڵ کافر و منـافق کە ئـایەتی ٧٣ی تەوبە ئیشـارەی وەلا دەکا، هەدەفەکە ئەوەیە: وڵاتی ئیسلام ڕاحەت و ئەمین و حەساوە بێ لە دەس فیتـنە و ئـاژاوەی دەسدرێژی وان. نەک بۆ وەی دەبێ کافر نەبن و موسوڵمان بن. جا کێ چـاتر دەزانـێ بڵـێ تـا سپاسی کەم، واتە کێ دەتوانێو دەزانێ ئیسلام لە تۆبزیگەری و زۆرەملەیی وەدوور خا وەپیچڕێ سپاسی دەکەم.

## منافات لە نێوان ئایەتەکانی ١٩٣ و ٢٥٦ی بەقەرە

بە کوردی و بە کورتی: بۆوەی بتواندرێ خۆ نەجـات دان و ڕزگـاری لە منافـاتی ئەو دوو ئایەتی ١٩٣ و ٢٥٦ی بەقەرە بێتە جێ، دەبێ مانای ئایەتەکان وەکوو تەعبیر کراون ئاوایان تەعبیر لێ نەدرێتەوە. واتە ﴿لاَ إِكرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ زۆری لە کەس نابێ بکرێ لە بابەت هەڵبژاردنی دین، یـا بڵێین ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ﴾ یانی شەڕ بـکە دەگەڵ کـافر و دووڕوو لە سەر دین. بەڵکە دەبێ مانایان ئاوا تەعبیر کرێن:

١. ﴿لاَ إِكرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ واتە بە هۆی زۆری دین دامەخزێننە نـاو دڵتـانەوە و دینـی زۆری لە کەس قەبووڵ ناکرێ. چونکە دینێکی لە سەر ویست و ئیختیار هەڵنەبژێردرێ ناتوانێ داواکـانی دین لە سەر ئەساسی باوەڕ و نیەتەوە دابین بکا و بەجێ بێنێ.

٢. ئایەتی ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلّهِ فَإِنِ انتَهَواْ فَلاَ عُدْوَانَ إِلاَّ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ (بقرە: ١٩٣) واتە شەڕ دەگەڵ کافر و دووڕوویان بکەن تاکوو ئاژاوە و فیتنەیان ببڕێتەوە. دێرەدا ئەگەر بە وردی سەیری مانای ئایەتەکە بکرێ ئەوەی تێدا نابیندرێ بیانکوژن و بە زۆر ئیمانیان پێ بێنن.

٣. ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ﴾ (توبة: ٧٣) واتە ئەی پێغەمبەر دەگەڵ کافر و دووڕووەکاندا شەڕ بکە و توندوتیژیشیان دەگەڵ بنوێنە. ئەگەر سەرنجێکی بەرجەوەندانە بدرێتە سیما و مانای ئایەتەکە ئەوەی تێدا چاو ناکرێ: ئەی پێغەمبەر شەڕیان دەگەڵ بکە تا بە زۆریش بێ، ئیمانیان پێ قبووڵ دەکەی.

بە کورتی و بە کوردی: مانای ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ نابێ ئاوا تەعبیر کرێ: بە زۆر دین دامەسەپێننە سەر عالەم. بەڵکە دەبێ ئاوا تەعبیر کرێ: بە زۆر دین دامەڕێژنە ناو دڵتانەوە. بەڵکە دەبێ لە سەر ئەساسی هەڵسەنگاندن و بەرجەوەند، دین قبووڵ کرێ.

و هەروا تەعبیری ئایەتەکانی ٧٣ی تەوبە و ١٩٣ی بەقەرەش ئاوا دەبێ تەعبیر کرێنەوە: شەڕیان دەگەڵ بکەن تاکوو ئاژاوە و فەساد و خراپەکارییان ببڕێتەوە و دەبڕێتەوە. نەک تا بە زۆر ئیمانیان پێ دێنن.

ئەو شێوە تەعبیرانە لە مانای ئایەتەکانی ٢٥٦ و ١٩٣ی بەقەرە و ٧٣ی تەوبە ڕزگارمان دەکا لە منافاتێک کە دە نێوانیاندا دێتە جێ و یا لە فەسخی ئایەتی ٧٣ی تەوبە وەک بڕیاری لە سەر داوە: ئیبنیمەسعوود بەڵام شەعبی و قەتادە و حەسەن بەسری و زەحاک کوتوویانە مەنسووخ نییە. قوڕتوبیش دەڵێ لەو دووبەرەکییە با واز بێندرێ.

**تیوتیوە:**

حەوت نەزەر هەیە لە سەر دابەزینی ئایەتی ٢٥٦:

١. دەعوەتی کافران و غەیرە نابێ زۆری تێدا بە کار ببرێ.

٢. کاتێ جزیە درا لە لایەن بێباوەڕان، نابێ مەجبوور کرێن.

٣. منداڵانی یەهوودی کە بابەکانیان موسوڵمان ببوون دانویست بە زۆر منداڵەکانیشیان موسوڵمان کەن.

٤. کێشەی (ابوحصین)ی موسوڵمان دەگەڵ دوو کوڕە مەسیحیەکانی دەیویست موسوڵمانیان کا بە زۆر.

٥. کەسانێکی کە لە ترسی شمشێری ئیسلام موسوڵمان ببوون و تەنگاویان دەکردن بە ناوی مەجبوور.

٦. زۆری کردن لە دیلەکان بۆ موسوڵمان بوونیان لە لایەن موسوڵمانانەوە.

٧. ئەو ئایەتە هۆی دابەزینی نییە، بەڵکە ئەو ئایەتە لە سۆنگەی تەوحیدەوە دابەزیوە.

کاتێ کە لە شەڕ و هەرای کوفر و ئیسلام بووینەوە دڵ دەیهەوێ بزانێ کە ئەوانەی دەبنە خاوەن ئیمان و باوەڕ چ پاداش و ئیمتیازێکیان پێ دەدرێ؟ و ئەوانەی کە بێباوەڕی هەڵدەبژێرن چ سزا و تۆڵەیەکیان تووش دەکرێ؟ جا بۆ وەڵامدانەوە و ڕوون کردنەوەی ئەو بابەتە هەستیارە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٥٧ی بەقەرە:

﴿٢٥٧﴾ **اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّوُرِ وَالَّذِينَ كَفَرُواْ أَوْلِيَآؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُولَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ**

**هەر خودایە سەرپەرشتی ئەوانەی کە خاوەن ئیمان و باوەڕن لە ناو تاریکاییەکانی نەزانیدا ڕزگاریان دەکات و بەرەو ڕووناکایی دەیانبات. ئەو کەسانەش کە بێباوەڕ و کافرن، تاغووتەکانیان دۆست و سەرپەرستیانن، لە ناو ڕووناکایی نووری ئیمان و زانستڕا دەریاندێنن و بەرەو تاریکایی جەهل و بێباوەڕی ڕایاندەکێشن. ئەوانە هاوڕێی ئاگرن هەتا هەتایە دە ناویا دەمێننەوە.**

## خودا سەرپەرستی ئیماندارانە؛ تاغووت سەرپەرستی کافرانە

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٥٧:

دەڵێین خودا دۆستی خاوەن ئیمانانە و چارەسازیشیانە، بێگومان ئەگەر خاوەن ئیمان ئەوەی لێ یەقین با، واتە وەک بەو پێنج شتانەی وەک چاو و گوێ و لووت و زمان و پێستی لەش شت دەزانێ و یەقینی لە سەر حاسڵ دەکا، ئاواش یەقینی لە سەر دۆستایەتی خودا حاسڵ کردبایە، هەرگیز بێ ئەمری ئەو دۆستە ڕاست و دروستکاریەی نەدەکرد، ئەمما ئێستێ داخەکەم هەر وەعد و بەڵێنی بە کوتەیە، زۆری پێ دەوێ تا بە هۆی ئەو نیشانە و بەڵگە ڕوونانەی هەن لە سەر دۆستایەتی خودا دەگەڵ بڕواداران، دەگەیە حەقولیەقین، وەک عەینولیەقین، ئێستێ دەبێ بکوترێ: بێ ئەمری کردنی ئەو دۆستە ڕاستەی وەک خودا بێ لە لایەن خاوەن باوەڕانەوە، ئەی ئەوەیە تێز و تین و پێزی ئیمان و باوەڕی بە تەواوی ڕۆنەچووە لە بیخ و ناخی دڵەوە، دەنا جگە لەوەی هەرگیز بێ ئەمری ڕووی نەدەدا لە مرۆدا، دایمە دە جووڵەجووڵ و جەزبە و جەزمەدا

دەبو دڵ. و هەروا ئەو دۆستە کە خودایە ئەو بەندە خاوەن ئیمانەی خۆی بە وەسیلەی زانست و ئەقڵ و شعوور و هەست و بەراوەردەوە لە ڕەشە شەو و تاریکایی نەزانی و نابەڵەدی و لاساری و سەرەڕۆیی دەیهێنێتە دەرەوە، بۆ وڵاتی نوورانی و ڕووناکی ئەقڵ و کەماڵ و حەیـا و ئەدەب و تەقوا. ئەمما ئەوانەی کە بێ باوەڕن و دڵ تاریکن بە هۆی بێ نووری ئـیمان و ڕەش هەڵـگەڕان بە دووکەڵ و چڕەچەمانی دنیاپەرستی و ئاخرەتنەویستی، دۆستایەتی یاغی و یـاغی‌گەران ئەو نەفـامی و نەزانـیەی بـۆتە وەسـیلەی خـارج بوونیـان لە ڕووناکـایی زانسـت و شـعوور وەلای تاریکایی جەهل و نەفامی، جا ئەئەوانە بە هۆی ئەو کارەساتەی کە بە سەر خۆیان هێناوە دەبـنە هاوڕێی و هاواڵی ئاوری دۆزەخ و هەمیشە مانەوە دەوێـدا. بـۆیە بەدایمـیش دەوێـدا دەمێـنـەوە چونکە تا مان دە دنیادا بە دایمە ئاوا لاسار بوون، کەوابێ تا هەن دەبێ ئاوا دە دۆزەخدا بن.

## سزا لە قەدەر تاوانە

ئەگەر یەکێک بێ پرسیار بکا و بڵێ: مەگەر عەزابی سزا لە قەدەر تاوان نییە؟ جا خۆ دیـارە تاوانی بێ باوەڕان زۆر زۆر سەت ساڵ هەزار ساڵ ئەوە بوو خۆ زیاتر نیـیە، ئەدی بـۆچی هەتـا هەتایە بێ بڕانەوە و بێ سنوور دەبێ دە ناو دۆزەخدا بـن؟ دەبـێ دە وەڵامـی ئەو پرسـیارکەرەدا ئەوە بکوترێ: مەسەلەی چوونە بەهەشـت و نەچـوونە دۆزەخ و یـا چـوونە دۆزەخ و نەچـوونە بەهەشت، سەودایە لە دنیادا لە بابەت کڕینـی ئەو دوو مـزڵانە. واتە هەچ لایەکیـان بکـڕی ئەوە دەبێتە ماڵت بۆ هەتا هەتایە. کەوایە لە سەر ئەو ئەساسە زۆر و کەمی تـاوان و تەمەن دەخـالەتی دەو سەودایەدا نییە بەڵکە ئەسڵ کڕینەکەیە. سەیر کە لە بابەت سەودای بەهەشت لە ئایەتی:

تەوبە ﴿١١١﴾ إِنَّ اللَّه اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّه فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللّه فَاسْتَبْشِرُواْ بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُم بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ. **بێ گومان خودا گیان و ماڵی لە موسوڵمانان کڕیـوە، لە پێناو ئەوەدا بەهەشتیان هەبێ. کێ لە خودا جاتر و زیاتر پەیـمان دەبـاتە سـەر و دەیهێنێـتە دی. کەواتە بەو مامەڵە کە دەگەڵ خودا کردووتانە، شادمان بن، بەڕاستی ئائەوەیە خۆشبەختی و دەسکەوتی گەورە.**

ئەگەر یەکێک دێرەدا بڵێ خۆ یەقینە خودا وەلی هەموو گیانلەبەرە، چ ئینسان بێ بە گشتی، چ حەیوان بێ، بۆچی دێرەدا فەرمووی وەلـی خـاوەن بـاوەڕان؟ بەو هەوایە خـودا تەنیـا وەلـی خاوەن باوەڕانە؟ دە وەڵامیدا دەبێ بکوترێ: خودا لە بابەتی ژیـان و ڕزق و حـاوانەوە و ئیـدارە کردن وەلی هەموو گیاندارێکە ئەمما ئەو وەلایەتیەی کە تایبەتی موئمینانە و ئەوان بەهـرەی لـێ

وەردەگرن ویلایەتی تایبەتییە، واتە هیدایەت و یاریدەدان بۆ سەعادەتی دنیا و قیامەتە.

## شیعە و موعتەزلە لە مەڕ ئیمان

ئـایەتی ﴿يُخْـرِجُهُم مِّـنَ الظُّلُمَـاتِ إِلَى النُّـوُرِ﴾ بە کـۆدەنگی قورئانزانەکـان نەزەریـان وایە: (ظلمات) کوفرە، (نور) ئیمانە. کەوایە تەعبیرەکەی دەبێتە ئەوە: ئەوە خودایە ئینسان لە تاریکایی کوفرەوە دەیخاتە دەر و دەیباتە ڕووناکایی نووری ئـیمان. جـا ئەلەو تەعبیـرەدا ئەوە لازم دێ کە ئیمان بە دەست خودا بێ، نەک بە ئاکار و کرداری ئینسـان. بە پـێچەوانەی نەزەری هەنـدێکیان وەک موعتەزیلە و شیعە کە نەزەریان وایە: ئیمان کردار و کردەوەی ئینسانە، ئەشاعیرەش دەڵێن: ئیمانی فێعلی خودایە. ئەمما ئەوەی ڕاستییە ئەوەیە کە ئەو مەسەلەیە لە موتەشـابەهاتە. و هەروا دە جوملەی ﴿يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّوُرِ﴾ موعتەزیلە ئەوە ڕادەگەیێنن: ئەو ئایەتە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە کوفر لە خـوداوە نیـیە، واتە (ظلـمات) چـونکە ئەگەر لە خـوداوە بـایە، خـودا موئمینی لێ خاریج نەدەکردن. (تەفسیر کەبیر)

ئایەتی ﴿اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ ئیبنی جەریر لە عەبدە ئیبنی ئەبی‌لەبابی نەقـڵ دەکـا و دەڵـێ: ئەو خاوەن ئیمانانەی کە (الَّذِينَ آمَنُواْ) وەخۆی گرتوون ئەو کەسانەن کە باوەڕیـان بە حەزرەتـی عیسا هێناوە دەکاتی حەیاتی عیسادا. پاشان کە حەزرەتـی مـحەمەد پێغەمـبەرﷺ هـاتۆتە ڕوو و بۆتە پێغەمبەر، بەویشیان ئیمان هێناوە. وا خەیاڵ نەکرێ ئەوانەی دە کـاتی عیســادا باوەڕیـان بە پێغەمبەرایەتی عیسا هێناوە کـوا تەمەنیـان هەنـدە بـووە تـا مـحەمەدﷺ بەوەلەد هـاتووە و بـۆتە پێغەمبەر و ئەوانیش ئیمانیان پێ هێناوە. ئەمەش دەڵێین: ئاوا ئەو دەستەی کە دە کـاتی حەیـاتی عیسادا باوەڕیان بە عیسا هێناوە، هەر وەکوو ئەو دەستەیەش دەستەیەکی دەورانـی محەمەدیـش ئیمانیان بە محەمەدﷺ هێناوە.

خاوەن باوەڕان بە ئایینی ئیسلام دەبێ تێزی باوەڕیان ئەو قۆناغەی داگیر کردبێ کە ئەو دینە ئاسمانییە بە ئەندازەیەک ئاشکرا و ڕوون و خاوەن بەڵگە و دەلیلە پێویستی بە زۆر و زۆرداری و ئیجبار نییە خۆ بە سەر ئینساندا بسەپێنێ. بـۆ دەلیـل لەو بـارەوە ئەگەر لەخۆگـۆڕان ڕێ بـدا بە قەزاوەتی ئینساف و ویژدان، ئەو ئایەتی ٩٩ی یونس کافیە بۆ وەی کە ئیجبار دە ئایینی ئاسمانیدا نییە بۆ وەی بە زۆر خۆ بە سەر عالەمدا داسەپێنێ:

﴿وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَـتَّى يَكُونُـواْ مُـؤْمِنِينَ﴾

(ئەی محەمەدﷺ) ئەگەر خودات بیویستایە (ئەو عالەمی سەر زەوی هەموو خاوەنی ئیمان بانە) خودا دەیتوانی هەمووان خاوەن ئیمان کا. (ئەمما یاسای ئیمان و بێئیمانی داوەتە دەستی ئینسان کە بۆ خۆی بە وازی خۆی بە ئیختیاری خۆی دینی خۆی هەڵبژێرێ.) جا کەوایە ئەتۆ ئەی پێغەمبەر زۆری لە خەڵکی چۆن دەکەی هەتاکوو ئیمان بێنن؟ واتە ناتوانی و بۆت نییە زۆری لە خەڵک بکرێ بۆ باوەڕی. باوەڕی شتێکی دەروونییە بەغەیرەز خاوەنی دەروون کەس ڕێگای نییە شت دەوێدا بچێنێ و بنێژێ.

دەلیل لەوە ڕووناکتر و قانیعتر نابێ لە سەر ئەو ئیدیعایە کە زۆری دە دیندا نییە و کوتک و گورزیش لەوە بەشیددەتتر نییە بۆ لە دم دانی ئەوانە کە دەڵێن: دینی ئیسلام دینی گورز و گۆپاڵ و شەڕ و شمشیرە. نەخێر، دینی ئەقڵ و دەلیل و حیکمەت و شعوورە، ئەگەر ببینن.

کاتێ بە ڕوونی ئەوەمان وەرگرت و تێگەیشتین کە خودا دۆستی خاوەن ئیمانانە و دە مەیدانی جەهل و نەفامیشیاندا ناهێڵێتەوە بەڵکە دەیانهێنێتە مەیدانی دەرک و هەست و شعوورەوە، واتە حەقناس و خوداناسی و باوەڕی بە ئایینی ئاسمانی. و هەروا ئەوەشمان بۆ ڕوون بۆوە کەسانێک غەیری خودا بە وەلی و چاوسووری خۆ بزانن و داوای نیازی خۆیانیان لێ بخوازن، ئەوانە دیارە بە هەڵە چوون و لاڕێ ڕۆیشتوون. بڕوانن لەو ئایەتە پیرۆزەی ٢٥٨ی بەقەرە تاکوو بە ڕوونتر لە ڕوون ئاشکرا بێ هەڵەی لاڕێیی ئەوانە:

﴿٢٥٨﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَآجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رِبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّ اللَّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ

ئایا سەبارەت بەو کەسەی کە دەگەڵ ئیبراهیم لە ڕووی سەهەندەییەوە دەمەقاڵێ کرد لە سەر بوونی خودای تاک و تەنیا، ئەو دەمەقاڵێەش دە کاتێکدا بوو کە کردبوویە بە پاشا و داراییەکی زۆریشی وەپێش کردبوو کە دەبوویایە لە سپاسی ئەو خودایەدا دەرنەچووبا و کڕنۆشی بربایە، کەچی دەمەقاڵێ دەگەڵ پێغەمبەرەکەیا دەکرد بەو شێوەیەی کە خودا دەفەرموێ (اذ قال ابراهیم) واتە کاتێ ئیبراهیم جوابی نەمروودیدا کوتی: خودای من ئەو کەسەیە کە ژیان و زیندوویەتی دەدا و دەشمرێنێ، واتە گیانیش دەدا و دەشستێنێتەوە. نەمروود یا خۆی هەڵە کرد یا نەیزانی، کوتی جا خۆ منیش ژیان و حەیات دەدەم و دەشمرێنم. ئاوا بەو شێوەیە: یەکێک کە قەرار درابوو بکوژرێ دەستووری دا مەیکوژن و ئازادی کەن. کوتی نەمروود ئەوە گیانم دایە. هەروا یەکی بێ تاوانیشی هێنا و کوشتی. ئەوە ئەوەشم گیان لێ ساند. پاشان ئیبراهیم بۆ حاسیە کردنی نەمروود و قسە لێبڕینی کوتی: خودا هەموو ڕۆژێ

**ڕۆژ لە ڕۆژهەڵاتەوە دەردەخات، جا ئەتۆش ئەگەر ڕاست دەکەی و دەتوانی ڕۆژمان بۆ لە ڕۆژئاواوە بۆ دەرخە بۆ لای ڕۆژهەڵات با بێ؟ جا نەمروود ئەبەوە پەکی کەوت و قرەی لێ بڕا وەک خودا فەرمووی (فبهت الذي كفر) بێدەنگ بوو ئەو بێبڕوایە. دیارە خودا ڕێنوێنی گەلی زۆردار و تەجاوەزکار ناکا.**

## چیرۆکی ئیبراهیم و نەمروود

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٥٨:

پێش هەموو شتێک با ئەوە بزاندرێ کە لە سیمای مبارەکی ئەو ئایەتە و یا بڵێین داستانی نەمروود و ئیبراهیم سێ شت دێنە بەرچاو:

١. ئیسباتی زاتی بەتوانای خودا.

٢ و ٣. ئیسباتی حەشر و نەشر و بەعسەت.

جوملەی ﴿إِلَى الَّذِي حَآجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رِبِّهِ﴾ واتە ئایا دەبینی ئەو کەسەی کە دەگەڵ ئیبراهیم دەمەقاڵی دەکرد لە بابەت خوداوە. ئەوە ئەو کەسە گۆیا نەمروودی کوڕی کەنعانی کوڕی کوشی کوڕی سامی کوڕی نووح بووە. (تفسیر قرطبی، ج ٣، ل ٢٨٤)

هەوەڵین کەسێک بووە کە داوای خودایەتی کردووە، نەختێک لەوە بە دوا بە درێژی و بە تەواوی چیرۆکی نەمروود باس دەکرێ.

ئایەتی ﴿أَنْ آتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ﴾ واتە لە سۆنگەی ئەوەیدا خودا دەستەڵاتی پێ بەخشیبوو، دێرەدا دوو نەزەر هەیە لەو بارەوە: ئایە ئەوەی خودا دەستەڵات و مڵکی پێ بەشیوە ئیبراهیمە یا نەمرووده؟ هەندێک دەڵێن ئیبراهیمە، بە دەلیلی ئایەتی ٥٤ی نیساء: ﴿فَقَدْ آتَيْنَا آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكًا عَظِيمًا﴾ بێگومان ئێمە کتێب و پێغەمبەرایەتی و دەستەڵاتێکی گەورەمان بە تۆرەمەی ئیبراهیم بەخشی. ئەو شێوە مانایە ئیسباتە لە سەر ئەوەی ئەو خاوەن دەستەڵاتە دەبێ ئیبراهیم بێ.

جگە لەوەش بە پێی دابی عیلمزانانی عیلمی نەحو، ئەو پیتە (ە) دە ناو جوملەکەدا کە لە نێوان نەمروود و ئیبراهیمدا دەبێ ئاوڕ داتەوە سەر یەکیان. بۆ وەی نزیکتریان دەبێ ئاوڕ وەدا ئەویش ئیبراهیمە. بەڵام بەشی زۆری قورئانزانەکان داویانە بە نەمروود، دەلیلیشیان زۆرن لەو بارەوە بۆ نموونە دەڵێن ئەگەر ئیبراهیم خاوەن دەستەڵات بایە دەو کاتەدا ڕێگای نەدەدایە نەمروود ئەو کابرایەی بکوشتایە.

ئایەتی ﴿قَالَ أَنَا أُحْيِـي وَأُمِيتُ﴾ منیش زینـدوو دەکەمەوە و دەش‌مـرێنم. نەمـروود دوو نەفەری هێنان یەکیانی لە ئیعدام ڕزگار کرد و یەکیانی کوشت. هەموو هەست و شـعوورێک ئەو شـێوە زیندوو کردنەوە و کوشتنە لە بابەت (یحیی و یمیت) خودای تەعـالا بە دەلیلێکـی باتـڵ و بـێ ئەساس دەزانێ. چونکە دەبێ حەیات لە مەماتڕا بێ، ئەوەی نەمروود لەو حـاڵەتێکی زینـدوو بۆ حاڵەتێکی زیندوو ڕێخرا.

ئایەتی ﴿قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّ اللَّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ﴾ ئیبراهیم کوتی: خودای من ئەو خودایەیە ڕۆژێ لە ڕۆژهەڵاتڕا دێنـێ بەرەو ڕۆژئـاوا، ئەتـۆش ئەگەر دەتـوانی ڕۆژێ لە ڕۆژئاواوە هەڵبێنە. ئیبراهیم هەر لە هەوەڵەوە زانی ئەو زۆربلێیە بەوە نەبێ زووت نابێ، جا بۆیە نەمروود دەمکوت کرا و بێدەنگ بوو.

## نەمروود کێیە؟

نەمروود کوڕی کوش کوڕی کەنعان کوڕی سام کوڕی نووحە. (قرطبی، ج۳ ل ۲۸۴) پاشـایەتی نەمروودی ئیقلیم‌گیر بوو ئەوە مەشهوورە کە دە مێژووی ئینساندا لەو سەرزەوییە چـوار نەفەران پاشایەتییان بە سەر تەواوی دنیای ئینساندا کـردووە. دوو لەو پاشـایانە خـاوەنی ئـیمان بـوون، دووشیان بێ ئیمان و بڕوا. ئەو دووانەی کە خاوەن ئـیمان بـوون وەک حەزرەتـی سـولەیمان و زولقەڕنەینن. ئەو دوو نەفەرانەی کە بێ باوەڕ بوون وەک نەمروود و بەختەننەسـرن. (تفسیر طبری، ج ۳، ل ۲۷)

نەمروود پاشایەکی کافر و زاڵم هەوەڵـین کەسـێک بـووە کە داوای خـودایەتی کـردووە دە دنیادا. ئەو نەمرووده دە کوفر و دوژمنایەتی دەگەڵ خـودای یەکتـا زۆر کـاری دوور لە ئەقـڵ و ویژدانی دەکرد، بۆ نموونە دەستووری دا بورجێک واتە منارەیەک دروست کەن هێنـدە بەرز بـێ بگاتە خودای ئیبراهیم. تاکوو بزانێ چ کارەیە و ئیبراهـیم پێـی دەنـازێ و پێـی دەخـوڕێ؟ ئەو منارەیان دروست کرد و بڵینـد، نەمـروود هـات پێیـدا وەسـەر کەوت لەوێـوە کە هیچـی نەدی هەچەندی ڕوانی بۆ لای ژووررووی سەرەوە ڕوو بە ئاسـمان تیرێکـی ڕەوانە کـرد و هەڵیـدا بەو خەیاڵ و نیازە خودای ئیبراهیم بکوژێ. ئەو جەریانە ئاماژەیەکی وەلا کراوە دە قورئاندا.

خودای بانی‌سەر دە دەورانی نەمرووددا بۆ ڕزگاری ئینسان لە ژێر باری گرانـی زۆرداران و درۆزنان، هات ئیبراهیمی ڕاپەڕاند و غیرەتی دا بەری و زانای کرد. دەعوەتی نەمـروودی کە لەو ڕێگە خوارەی گرتوویەتی بەر خۆی: وەک داوای خودایەتی بێ، دەسبەردار بێ، ئەمما نەمروود

گوێی پێ نەدا لە بەر غرووری و سەرەڕۆیی خۆی. دوژمنـایەتییەکەی دەگەڵ ئیبراهـیم گەیشـتە ئەو پـلەی کە دەسـتووری دەرکـرد ئیبراهـیم دە ئـاور هـاوێن و بیسـتووتێنن. ئەو کارەسـاتە دەستووردانە بۆ سووتاندنی ئیبراهیم ئەوەڵین بەرخوردی ئیبراهیم و نەمرووود بوو. بەڵێ خستیانە ناو ئاگر و ئیبراهیم بە ئەمری خودا کە نەیسووتاند هیچ، دەورەش ڕازاندەوە بە گوڵ و گوڵزار.

بناغەی هەرای ئیبراهیم و نەمروودیش لەوەڕا بـوو داگیرسـا: کە لە سـەر وڵاتـی عێراقـی ئەوڕۆی وێران و ئـاور تێبەربـووی دەسـتی «ش.ع.د» گـرانە ڕوو دەدا دەو گـرانییەدا نەمـروود دەسـتوور دەدا دەغـڵودان و دانەوێـڵە هەرچـی هەیە لە وڵاتـدا کـۆی کەنەوە و دە حەمبـاری نەمروودی کەن تاکوو عالەم ژیانی خۆی لە ژێر چاوەدێری نەمـروودا بەرێـتە سـەرێ و ئەوەش ببێتە هۆی ئیسباتی خودایەتی ئەو لە ناو عالەم. چونکە دەیزانـی عـالەمی برسـی سـەڵاوات لە دیداری ناندەری دەدا، وەک ئێسـتێ ڕوون و ئاشـکرایە. عـالەم بە تێکڕایـی جیـرەی خۆیـان لە دەرباری نەمرووود وەردەگرت و سەڵاواتیان لە دیداری لێ دەدا و دەشـبایە هەرکەس هاتبـایە بـۆ جیرە وەرگرتنی لە دەرباری نەمرووود پـێش ئەوەی جیـرەکە وەرگـرێ سـەژدەیەکی بـۆ نەمـروود بەرێ. دەنا جیرەیان نەدەدایە.

ئەدێـرەدایە کە حەزرەتـی ئیبراهـیم دەچـێ بـۆ جیـرە وەرگـرتن بـۆ هەوەڵـین بـار پـاش خۆڕاگرتنێکی زۆر بە سواری وشترێک دەگاتە دەرباری نەمرووود و نەمروودیش لەوێ دەبێ بـۆ چاوەدێری کە بزانێ کەس هەیە سەژدەی بۆ نەبا؟ ئیبراهیمیش سەژدەی بۆ نابا. نەمـرووود کە ئەو حاڵەتە چاو دەکا لەو ئینسانە، عەجایب دەمێنێ کە بۆ هەوەڵین جار یەک نەفەر سەژدەی بۆ نابا. بانگی ئیبراهیمی دەکا بۆ هاتووی بـۆ جیـرە و بـۆ سەژدەشـت نەبـرد بـۆ خـودای ڕزقدەروو؟ ئیبراهیمیش زۆر بە غیرەتەوە ڕووی تێ کرد و کوتی: ئەمن تەنیا سەژدە دەبەمە بەر خودای دنیا و بەتەنیێ، خالقی تۆش و هەموو عالەم. جا ئەدێرەدا بـاس و پرسـیار و بەربەرەکـانێی ئیبراهـیم و نەمرووود دادەمەزرێ و دەس پێدەکا دەو شوێنەدا. واتە لە بەر دەروازەی حەمبـاری دەغـڵودانی نەمرووود. نەمرووود بە داماوی خۆی دی دە بەرابەر ئیبراهیمدا. نەشیدەویست ئیـدامە بە باسـەکە بدا تاکوو ئەو عالەمەی دەهات بۆ جیرە، پێ نەزانێ بەو باسە. هەر ئەوەندەی لە دەس هـات کە دەستوور بدا جیرەی نەدەن بە ئیبراهیم. ئیبراهیمیش بە دەستی خـاڵی و بـێ جیـرە لە دەروازەی حەمباری نەمروودی سـەری وشـتری بـاداوە و گەڕایەوە. دە دەڵـدا زۆر شـاد و دڵئـاواڵە بـوو چونکە لە سەر حەق بەربەرەکانی زاڵمی کرد و تا ئەندازەیەک ڕیسوای کرد و عالەمێکیشـی لـێ

تێگەیاند. بەڵام بە پێی عادەتی ئینسانی کە ئاوری ماڵ و منداڵ تیژە نەختێک خۆی وێک هێنا و برد، کەوتە ئەو خەیاڵە: با لەڕێوە ماڵ و منداڵ نەزانێ چی نەهێناوە لە جیرە، هات باری وشترەکەی بە ئەندازەیەک گڵ و خیزی تێ کرد. کاتێ گەیشتەوە ماڵێ، ماڵ و منداڵ ڕوانییان لە باری وشترەکەی قەبە و هەڵمساو بوو. دڵیان خۆش بوو کە جیرەی هێناوە. ئیبراهیم پاڕاوە لە بەر خودا کە ئەو خۆشحاڵیەی لە ماڵ و منداڵەکانی نەستێنێتەوە. دیارە ﴿هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَى﴾ ئەتۆی خودایە شادیهێنەر و پێکەنیندەر! دەشزانی بۆ نانی خاووخێزان سەژدەی نەبردە بەر نەمروود. چونکە سەژدە تەنیا بۆ تۆ دەبێ بچێ. دیارە ئیبراهیم سەژدەی برد و خێزانی دەو ئانەدا هات و کوتی: یا ئیبراهیم! نایەی بارەکەم دەگەڵ داگری، بە تەنیا تاقەتم پێی ناشکێ؟ ئیبراهیم فەرمووی بڕۆ ئەتۆ نەختێک خەریک بە جا پاشان ئەمنیش دێم. خێزانی کاتێ چوو بۆ سەر بارەکە و تەماشای کرد ئاردێک ئەمما چ ئاردێک! بێ نموونە دە تایەکاندا دیارە، هەرای کرد لە ئیبراهیم کە هاتنی تۆی ناوێ بۆ خۆم دەستم پێی ڕاگەیشت بەو ئاردە خاوێن و جوانەی. ئیبراهیم زانی کە خودا نیازی پێک هێناوە. جا ئەدێرەدا یەکێ بۆ خودا بێ خوداش بۆی دەبێ. (تەفسیر طبری، ج ٣ ، ٢٧)

با ئەو حیکمەت و توانایییەی خودا بیر کەینەوە کە ئەو شای وا زاڵم و بەهێزی دەورانی خۆی بە لاواز و بێ هێزترینی گیانلەبەری خۆی بە چۆکدا هێنا و لە ناوی برد، وەک مێشوولە بێ. واتە خودا لەشکرێکی زۆری لە مێشوولە پێک هێنا کە بەری ئاسمانی گرت و ڕووناکایی لە ڕۆژ بڕی، داهاتنە لەشکر و گەلی نەمروودی، خوێنیان مژتن و گۆشتیان خواردن. ئەمما نەمروود بۆ وەی حاڵی گەلەکەی ئاوا بەبێ لەززەتی چاو کا، دەوی ڕۆ نەهاتن و ئەویان هێشتەوە. تاکوو خودا یەک دەنکە مێشوولەی کردە مەئموووری ئەوەی بە کونی لووتیدا خۆ بگەیێنێتە مێشکی سەری دەوێدا خەریکی مێشکی بێ. بەڵێ مێشوولە مەئموورییەتی خۆی بەجێ گەیاند. نەمروودی تووشی ژانەسەرێکی کرد ک ەبە دەرباریەکانی خۆی دەبایە ئان لە دووی ئان بە کوتک و چەکوچێک سەری خەڵکی پێ دەکوتا، سەری نەمروودیان پێ دەکوتا گۆیا چوارسەد ساڵ نەمروود بەو حاڵە ژیا. (طبری، ج٣، ل٢٧) ئەوە بوو ژیان و دەستەڵاتی نەمروود.

هەوەڵین کەسێک کە لە سەر وەحدانیەتی خودا واتە یەکەتی و تەنیایی خودا دەگەڵ زاڵمان و تاغووتی دەور و زەمانی بکەونە باس و کێشە، حەزرەتی ئیبراهیم بووە. جا ئەوجار پاش حەزرەتی ئیبراهیم ئەو جۆرە ڕووبەڕوو بوونەوەیە دەگەڵ بێباوەڕان هاتە کایە. وەک مووسا

دەگەڵ فیرعەون، عیسا دەگەڵ بێباوەڕانی دەوری خۆی، مـحەمەدﷺ دەگەڵ ئەبووجەهلەکـان. قورئان دەگەڵ زۆردارەکان.

هەندێکیش لە ئەهلی نەزەر هەن کوتوویانە دەرگیری ئیبراهیم و نەمروود لە سەر شکاندنی بتەکانیان بووە. بەڵام ئەوە ڕاستە قورئانە ئەوانی دی کە بە قورئان نەڕازابنەوە نەزەرە، دەکرێ واش بن وەک کوتوویانن، دەشکرێ وا نەبن.

پاش ئەوەی کە حەزرەتی ئیبراهیم دە دەمەقاڵیەکەیدا دەگەڵ نەمروود، نەمروودی دەمکوت و سەرکوت کرد بە دنیای ئەودەمیشی سەلماند کە ئینسان خودا نابێ بەغەیرەز خـودایەکی ئـاوە بێ هاوتا و زانا و بەتوانا، هیچ خودا نییە بتوانێ ئیدارەی بوونەوەر بکا، دڵـی خوازیـاری ئەوەیە بزانێ هەڵەستانەوە و زیندووبوونەوەی پاشی مردن و بوونەوە بە خاک دەبێ چۆن بێ و کەی بێ و ئەو عالەمە چییان بە سەر دێ؟ جا بۆ ئەو مەبەستە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٢٥٩ی بەقەرە:

﴿٢٥٩﴾ أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَى قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ وَانظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ

یا وەکوو ئەو کەسەی کەوا بە لای شـارێکا تێـپەڕی، کە داروبـاری بە سـەر یەکـدا تەپیبـوو، کوتی خودا خەڵکی ئەو شارە وێرانە چۆن زیندوو دەکاتەوە پاش مردنیان؟ خودا یەکسەد سـاڵ مراندی و پاشانیش زیندووی کردەوە. خودا فەرمووی چەنـدە دەبـێ ئـالێرەدا مـاویتەوە؟ کـوتی ڕۆژێک یا کەمتر لە ڕۆژێک دەبێ کە دێرەدا ماومەتەوە. خودا فەرمووی: نەخێـر، سـەد سـاڵی ڕەبەقە ئـالێرەدای. کەواتە سـەیری خـواردن و خـواردنەوەکەت کە نەگـۆڕاوە. ئینجـا سـەیری گوێدرێژەکەت کە، چلـۆن ئێسـک و پرووسـکی لە بەر یەک تـرازاوە و بـڵاوە؟ جـا بـۆ ئەوەی بتکەیـنە دەلیـل و بەڵـگە و نیشـانە بـۆ خەڵـک، سـەیری ئەو ئێسـکانە بـکە چلـۆن ڕاسـتیان دەکەینەوە و لە سەر یەک هەڵیاندەچنین. جا بە گۆشت دایاندەپۆشـین. کاتێـک کە ئەمەی بـۆ دەرکەوت، کوتی: دەزانم بێگومان خودا بە سەر هەچی هەیە زاڵە و بەتوانایە.

## چیرۆکی عوزێر و بەختنەسـر و کورش

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٥٩:

بە پێـی بەراوەرد و هەڵسـەنگاندنی ئایەتەکـان، دەردەکەوێ کە ئەو داسـتانەی ئـایەتی ٢٥٩

دەگەڵ داســتانی ئــایەتی ٢٥٨ لێــک بێگــانە نــین و دوور نــین بەڵام جیاوازیەکیشــیان هەیە، جیاوازییەکەشیان دەوەیدایە: داستانی ئایەتی ٢٥٨ لە سەر ئیسباتی وجوودی یەکتایی خودا بوو، بەڵام چیرۆکی ئایەتی ٢٥٩ بۆ ئیسباتی ڕۆژی هەستانەوە و حیسابە. مانای هەر دوو چیرۆکەکان سەیر کە: چیرۆکی ئایەتی ٢٥٩ خودا دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر! ئایا وەک ئەو کەسەی کە ڕابـرد بە قەراغ تەنیشتی دێیەکی کە ئەو دێیە بە سەر یەکدا تەپیبـوو نە دیـواری مـابوو نە دەرک و بـانی مابوو دیتووتە؟!

مانای چیرۆکی ئایەتی ٢٥٨: خودا دەفەرموێ: ئەی پێغەمـبەر! ئایـا ئەتـۆ چـاو دەکەی ئەو کەسەی کە لە بابەت خودای بێ هاوتا کێشەی دەکا؟

جا لە سەر ئەو بەراوەردە دوو چیرۆکەکان لێک دوور نین.

دڵ حەز دەکا بزانێ ئەو دێیەی کە ئاوا وێران بووە و بە سەر یەکدا تەپیوە کوێ بـووە؟ و ئەو کەسەی بە پەنایدا ڕابردووە کێ بووە؟

هەندێک لە مێژووناسان کوتوویانە ئەو دێیە «بیت المقدس» بووە و ئەو کەسـەی بەوێشـدا ڕابردووە و ئاوای دیـوە «عـوزەیری کـوڕی شـەرفیاء» بـووە. ئەوە قەولـی مەشهووریشـە. بەڵام هێندێکی دی نەزەریان ئاوایە کە ئەو دێیە «سەومەعەی هرقل» بووە کە لە داوێنی چۆمی دەجـلە واقع بووە و ئەو کەسی کە ڕابردووە بە لایدا «ئەرمیا» بووە کە لە تائیفەی هاروونی برای مووسـا بووە. هێندێکی دیش کوتوویانە ئەو کابرایە «خدر» بووە، ناویشی :حەزقیل کوڕی بوار» بـووە. مجاهیدیش کە یەکێکە لە زانایان و شارەزایانی باری مێژوو کوتوویەتی ئەو کابرایە یەکێک بـووە لە بەنیئیسـرائیلەکان.

بە هەر حاڵ هەر کـوێ بـووبێ دێـیەکە و هەرکەس بـووبێ کەسـەکە، جەریـان ئەوەیە ئەو کەســەی کە بەوێــدا ڕابــردووە کوتــوویەتی: یــا پەروەردگــاری عــالەم! ئەو دێــیە پــاش ئەو هەڵوەشاوەیی و وێرانبوونیەی و نەمانی دانیشتووانی، ئاوەدان دەبێتەوە تازە؟ بە ئاوەدانی دێتەوە ڕوو؟ ئەو شێوە خەیاڵەی میوانی ئەقڵ و شعووری دەبێ.

## عوزێر و خەو

خودای خاوەن حیکمەتی حەکیم کە هەمیشە عەبدی خۆی لە گێـژاوی شـک و گومـان و خەیاڵات ڕزگار کردووە بۆ ئەوبەری یەقین و زانست، ئەو کەسەی بۆ ماوەی سەد سـاڵی ڕەبەق دێنێ لە هەست و شعوور و دەرکی وەدوور دەخا بە هۆی نـیمچە مردنێـک وەک خەو بـێ، یـا

بڵێین مەرگ بێ، جا لە پاشان وەخەبەر دێنێتەوە و هەڵیدەستێنێ و دێیەکەی بە ئـاوەدانی نیشـان دەدا و دەشیخاتە ژێر پرسیارانە تاکوو بە تەواوی توانایی خودای بۆ دەرکەوێ و بۆی سابت بێ. بۆ نموونە خودا لێی دەپرسێ بە هۆی فرشتەیەک ﴿كَمْ لَبِثْتَ﴾ واتە چەندە ئاوا بەبێ هەسـت و شعوور ماویەوە؟ ئەو کەسەش بە پێی بەراوەردی خۆی دەڵێ: ڕۆژێک یا نیوەڕۆژێـک. بـۆیەش ئەو کەسە ئاوای بۆ دەچێ: ڕۆژێـک یـا نیوەڕۆژێـک، چـونکە ئەو مـردنەی لە هەوەڵـی ڕۆژا بە سـەردا دێ، و زیندووکردنەوەشـی دە ئـاخری ڕۆژدا بە سـەردا دێ. جـا بـۆیە بە خەیاڵیـدا ئەوە ڕادەبرێ: ڕۆژێک یا نیوەڕۆژێک. ئەو مردن و ئەو شێوە جوابدانەوە وەک جەریانی یارانی غـار دەچێ کە کوتیان لە وڵامی خودادا کاتێ هەڵستان لە خەوی مەرگ کوتیان دە وەڵامی ﴿قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾ **واتە وێژەرێکیان لە خۆیان کوتی: چەنـدە مـاونەتەوە دەو حاڵەتەدا؟ کوتیان ڕۆژێک یا بەشێک لە ڕۆژ ماوینەتەوە.** جا ئەو پرسیار و وڵامەی یارانی غار دەگەڵ پرسیار و وڵامی کابرای ڕابردوو بە پەنا دێیدا لە یەک دەچن کە ئامانج دە هەرکیشـیاندا ئیسـباتی داهاتنی ڕۆژی قیامەتە و ئیسباتی توانایی خودایە لە سەر ئەنجامدانی ئەو ڕۆژە.

بە کوردی و بە کورتی: مراندن و زیندووکردنەوەی عـوزەیر و کەرەکەی و هەروا مرانـدن و دەخەو کردنی ئەسحابی کەهف و وەخەبەر هێنانەوەیان دەلیل و بەڵگەن لە سەر داهاتنی ڕۆژی قیامەت. هەروەک ئایەتەکانی ٢٩ی ئەعراف و ١٠٤ی ئەنبیا ئیشارە وەلای ئەو بابەتە دەکەن:

ئەعراف ﴿٢٩﴾ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ. **چۆن یەکەم جار دروستی کردوون هەرئاواش دەگەڕێنەوە**

ئەنبیا ﴿١٠٤﴾ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا. **چۆن یەکەم جار دروست کردنمان دەس پێکرد، هەر ئاواش دەیگێڕینەوە، بەڵێنیەکە لە سەرمانە.**

کاتێ بە هۆی ئایەتی ٢٥٨ تاک و تەنیایی خودامان بۆ سابت بوو لە ناو دەمەقاڵی ئیبراهـیم و نەمروودا، و هەروا بە هۆی ئایەتی ٢٥٩ش زیندووبوونەوەی گیاندارانمان دە ڕۆژی قیامەتـدا بۆ سابت بوو لە سەر مراندنی عوزەیر و وەگیان هاتنەوەی دووبارە، خۆ ئەوەش حاشا هەڵنەگرە کە باوەڕ بە زیندووبوونەوە سەختترە تا باوەڕی بە مردن. جا دەبێ تێکۆشـرێ کە دەلیلی دیکەش وەدۆزرێ و نیشان بدرێ لە سەر زیندوو بوونەوە. ئینجا بۆ ئەو مەبەستە و ئەو دەلیلە دەبـێ ڕوو بکەینە بارەگای قورئانی پیرۆز، ئایەتی ٢٦٠.

**﴿٢٦٠﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِـي الْمَوْتَى قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَى وَلَـكِن لِّيَطْمَـئِنَّ قَلْبِي قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ فَصُـرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَى كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُـمَّ ادْعُهُـنَّ**

يَأْتِينَكَ سَعْيًا وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ
**باسێکی ئەو کاتە بکە کە ئیبراهیم کوتی ئەی پەروەردگارم نیشانم بدە چۆناوچۆن مردووەکان وەگیان دێنیەوە؟ فەرمووی: ئەی بۆچی ئیمانت نەهێناوە و باوەڕیت نییە؟ کوتی بەڵێ با، بەڵام با دڵم چاک دامەزرێ. خودا فەرمووی: دەی چوار پەلەوەر بگرە و وردیان کە، ئەنجن بە ئەنجن، هەر نەختەی لە سەر کێوێک دانێ وپاشان بانگیان لێ بکە، بەپەلە دێن بە دەنگتەوە. بشزانە هیچ گومانێک نابێ و نییە دەوەدا کە خودا زاڵ و کاربەجێیە.**

## داوای ئیبراهیم لە خودا بۆ نیشاندانی زیندووکردنەوە

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٦٠:

گۆیا حەزرەتی ئیبراهیم تاووس و کۆتر و قاژوو و کەڵەبابێکی گرت و بە پێ ئەو دەستوورەی پێی کوترابوو، تێکی جنین و لێکی دان. بەڵام گۆیا سەرەکەی لە لای خۆی داناون، بردی هەر پارچە گۆشتەی لە لایەکی دانان و بۆخۆشی هاتەوە لای سەرەکانیان و هەرای لێ کردن. بە چاوی خۆی چاوی کردن هەر پارچە گۆشتەی لە لایەکڕا هاتن دەچوونەوە لای سەرەکەیان و دەبوونەوە شکڵی هەوەڵیان. حەزرەتی ئیبراهیم سووکنایی دڵی هات کە خودا چۆن گیان دەخاتەوە ناو لەش و وەک خۆی لێ دەکاتەوە. بە تەئکید ئیبراهیم لە جاران زیاتر ئەوەی باوەڕ کرد کارەکانی خودا دەستەولەجێیە. وەک ئایەتی ٨٢ی یاسین ئیشارەی وەلا فەرمووە:

﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ **بەڕاستی کاری خودا وایە، ویستی لە سەر هەر شتێک ببێ و ئیرادەی بکا و بڵێ ببە، خێرا دەبێ.**

لە ڕابردووی عەقیدە و باوەڕی ئیبراهیم ئەوە دەردەکەوێ لە داواکەی لە خودا، کە شەوق و زەوقی ئەو بووە بۆ زیادە زانین لە سەر دەستوبردی و خودا و نەزم و نیزامی دەکار و ئیرادەکانیدا، کەوایە دەبێ بکوترێ: داوای حەزرەتی ئیبراهیم لە خودا ﴿رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى﴾ تەنیا و تەنیا زەوق و شەوقی ئیحساساتی هەستی دەروونی بووە. بۆ زیادە زانست لە ڕازی سنعەتی باری لە بابەت زیندوو کردنەوەی مردووان. دەنا هیچ ڕەبت و عەلاقەی بە سەر ئیمانی ئیبراهیمەوە نەبووە و نابێ.

شەهید سەید قوتبیش هەر ئەو نەزەری فەرمووە.

ئایەتی ٢٦٠ی بەقەرەش کە دەفەرموێ ﴿وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾ واتە با دڵم چاک داسەکنێ و

دامەزرێ هەر ئەوەی لێ چاو دەکرێ کە شەوق و زەوقی دەروونی بووبێ ئەو داوایە.

**پوختەی مەبەست**

کاتێ ئیبراهیم کوتی خودایە نیشانم بدە چۆن مردوو زیندوو دەکەیەوە، خوداش لە وەڵامیدا فەرمووی: بۆ مەگەر سروشت بۆ نەکراوە لەو بارەوە کە لە ڕۆژی خۆیدا هەموو عالەم زیندوو دەکرێتەوە؟ ئیبراهیمیش لە جوابدا کوتی: بەڵێ، خودایە، سروشت بۆ کردووم، باوەڕیشم پێ هێناوە، بەڵام ویستم کە بە دوو چاوانم دە دنیادا ببینم و تێبگەم تاکوو دڵم دامەزرێ و داسەکنێ.

لەو جواب و سوئالەدا ئەوە دەرناکەوێ کە ئیبراهیم گومانی دە زیندوو بوونەوەی ڕۆژی قیامەتدا بووبێ، بەڵکە بە ڕوونی ئەوەی لێ چاو دەکرێ کە ئیبراهیم شەوق و زەوقی ئەوەی بووە بە چاو ئەو کارەساتە ببینێ.

ئەوە بۆ ڕامان و دامان دەبێ کە بۆچی خودای تەعالا دە ئایەتی ٢٥٩دا ناوی عوزەیری نەبرد بە ڕوونی، بەڵام دە ئایەتی ٢٦٠دا ناوی ئیبراهیم بە سەراحەت برد و کوتی: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ﴾، دە ئایەتی ٢٥٩دا فەرمووی: ﴿أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ﴾؟ خۆ دیارە مەبەست دە هەردووکاندا هەر یەک شتە. هەچەن هەندێکیان بە من بێئەدەبانە نەزەریان داوە. ئاوا بەو شێوەیە: گۆیا عوزەیر کە کوتوویەتی ﴿أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ واتە جا چۆن خودا خەڵکی ئەو شارە وێرانە زیندوو دەکاتە، گۆیا دەڵێن ئەو شێوە دواندنە دەگەڵ خودا بێئەدەبانەیە، بۆیە خوداش ناوی عوزەیری نەبردووە. ئیبراهیمیش لە هەوەڵەوە سەنای خودای بە (ربِّ) واتە (ئەی پەروەردگارم) برد، پاشان فەرمووی (أَرِنِي) ئەوە بۆیە خوداش بە ئاشکرایی ناوی برد. ئیبراهیم بە ئەدەبەوە دوا بۆیە خوداش ڕیعایەتی کرد و زیندوو کردنەوە و مراندنی دە باڵندانـدا نیشان دا ئەمما بۆ عوزەیر، مردن و زیندوو بوونەوەی دە خودی عوزەیردا نیشان دا.

ئەمیش ئەو نەزەرە بەبێ ئەدەب دەزانم چونکە دیارە بە پێی جوملەکان عوزەیر پرسیارەکەی لە خودا نەکردووە بەڵکە ڕووی کردۆتە ئەقڵ و بیری خۆی و فەرموویەتی: ئایا خودای تەعالا چۆناوچۆن ئەو وڵاتە بە سەر یێکدا تەپاوە ئاوەدان دەکاتەوە و خەڵکەکەشی چۆن دەبێ زیندوو کاتەوە؟ و هەروا پێغەمبەران هەرگیز ئەو فکرەیان لێ ناکرێ: کە دە مەقامی خودادا بێ ئەدەب بدوێن و وەجووڵێن، کێ فکری بێ ئەدەبییان لێ بکا ئەوە عەقڵ و بیری نەخۆش و بێئەدەبە.

حەتا هێندێکیان نەزەریان وایە کە ئەو کەسەی بەوێدا ڕابردووە عوزەیر نەبووە، وەک لە پێشدا ڕامانگەیاند. هەموو نەزەرەکان لەسەر ئەو کەسەیە.

ئەمما ئیبراهیم ڕاستەوخۆ ڕووی کردە خودا و کوتی (ربّ) ئەوجار جگە لەوانەش ئەو دوو ئایەتانەی ٢٥٩ و ٢٦٠ شەرحی حاڵی ئەو دوو کەسانەیە خـودا بـۆ پێغەمبەریـان بەیـان دەکـا کە ئاوایان کوتووە، نەیفەرمووە ئاوا دەگەڵ من دواون. ئەو دوو قسەیە فەرقیان هەیە و بێئەدەبی دە هیچ لایەکدا چاو ناکرێ و هەست پێ ناکرێ.

دێرەدا کورتەیەک لە سەر کەسایەتی بنەماڵەی عوزەیر پێغەمبەر و بەختەنەسـر شـای زاڵـم بدوێین تاکوو بزانین کێن؟

## عوزەیر پێغەمبەر کێیە؟

یەکێـک بـووە لە پێغەمبەرانـی بەنیئیسـرائیل. ئیبنیعەبـاس فەرمـوویەتی: دە تەوڕات و ئینجیلدا عوزەیر پێغەمـبەر پـاش حەزرەتـی داود و سـلێمانی کـوڕی داود بـووە. واتە نـزیکەی حەوت قەڕن پێش حەزرەتی عیسا بووە. دە قورئانی پیرۆزدا دوو کەڕەتان ناوی عوزەیر پێغەمبەر هاتووە و براوە، جارێکیان دە ئـایەتی ٣٠ی سـوورەی تەوبەدا: ﴿وَقَالَـتِ الْيَهُـودُ عُزَيْـرٌ ابْـنُ اللّٰه وَقَالَتْ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللّٰه...﴾ **جوولەکە کوتیان عوزێر کـوڕی خـودایە، گاورەکـانیش کوتیـان عیسا کوڕی خودایە.**

جاری دووهەمیش لە ئایەتی ٢٥٩ی بەقەرەدا بەبێ ناوبردن،بەڵام واقیعەکە لە سەر ئەوە.

پێغەمبەر عوزێر لە حەولادانی هاڕوون برای مووسایە، ناوی بابی گۆیا «جروه» یا «سورق» یا «یاسـروخ» یا «خليقا» بووە. بەڵام ئەوەی نزیک لە ڕاستی بێ «خليقا» بووە.

کاتێ عوزێر پێغەمبەر لە دایک بووە، نەتەوەی بەنیئیسـرائیل ئـاخرین سـاڵی قـودرەت و دەستەڵاتیان بووە چونکە بە زۆری بەریان دابـووە لەززەت و شـەهوەتڕانی و خۆشـگوزەرانی و ناشـکوری، کەوتـنە ژێـر بـاری سـەختترین دوژمنـی زاڵـم و تەجاوەزکـاری دەوران وەک بەختەنەسـر بێ.

ئەمما دە پێش عوزێر پێغەمبەردا بەنیئیسـرائیل پێغەمبەرێکی دیکەیان بە ناوی «یرمیـا» زۆر دڵسۆز و بەڕەحم و میهرەبان، زۆر جاران بە بەنیئیسـرائیلەکانی دەکـوت: بترسـن لە غەزەبـی خودا و دەست لەو بێ ئیتاعەییەی خودا هەڵگرن دەنا تووشی عەزابی خودا دەبـن. بەڵام لە بەر سەروەت و دارایی زۆری معامەلەی شام غەڕڕە ببوون هیچ گوێیان نەدا بە پێغەمـبەر یەرمیـا. بە خەیاڵی پووچیان وا بوو کە ئەو خۆشی و سامانە هەر دەمێنێ.

یەرمیـا پێغەمـبەر کـوتی پێنـاچێ دە سـاڵ یـا پـازدە سـاڵی دی کە لە لای ڕۆژهەڵاتەوە

زۆردارێکی زۆر بێڕەحم دەستو بە سەردا دەگرێ، فەلەستین (ئورشەلیم) باقی وڵاتی شام لە دەستو دەردێنێ ئاوارە و دەربەدەری وڵاتانو دەکەن و هەروا یەرمیا پێغەمبەریش لە سۆنگەی خراپەکاری ئەو قەومە سەرمەست و ناشکورە دەکەوێتە زیندانەوە. سەرەنجام وایان بە سەر هات: بەختەننەسری زاڵم سواریان بوو و تارومار کردن ئەوەی کوشتی، کوشتی، ئەوەی بێناموسی کرد کردی، زۆر زیاتر لە تەجاوەزکارانی ئێستێ دەگەڵ کردن.

## بەختەننەسر کێیە؟

بەختەننەسری زاڵم زۆر بێ باوەڕ یەکێک بووە لە شاکانی ئێران، لە پاش نەمروود ئەو بووە شای سەر زەوی. وڵاتەکانی بابل و عێراق و دەوروبەر دە ژێر دەستەڵاتی ئەودا بووە. پەلاماری دا بە وڵاتی شام، سێ کەڕەتان. دە هەر سێ هێرش و پەلامارەکانیدا سەرکەوتوو بووە کە دەو هێرشانەدا شارە گەورەکانی وڵاتی شامی خاپوور و وێران کردن. تەواو گەلی بەنیئیسرائیلی لە وڵاتی خاوەن بەهرە و خۆشی دڵگر تارومار کردن بێر و بەوێدا و زۆریشیانی لێ بە دیل گرتن و زۆریشی لێ کوشتن و زۆریشی بێر و بەوێدا پرژ و بڵاو کردن، بە جۆرێکی وای شپرزە کردبوون کە لە لایان ببووە قارِ ناوی خۆیان لە ناو عالەم بە بەنیئیسرائیل بێنن. تەنانەت وڵاتی بەیتولموقەدەس بە بەیتولموقەدەسەوە ئاور تێبەردرا و دەگەڵ خوێنی تێکەڵ کرد. یەرمیا پێغەمبەری بەنیئیسرائیلی دەسگیر کرد و خستیە ناو زیندانەوە. کتێبەکانی تەوڕات هەچەن نوسخەی هەیبوو دە بەیتولموقەدەسدا ئاوری تێبەردان. بەو پێیە دەیەویست گەلی بەنیئیسرائیل لە سەر ڕووی زەوی بشواتەوە و ئاساری نەهێڵێ وەمێنێ لە دنیادا.

بەختەننەسر دەستوورێکی توندی دەرکرد کە نابێ هیچ کەس تازە نیشتەجێ بێ دە بەیتولموقەدەسدا، ئەو شەڕ و هێرش و پەلامارەی بەختەننەسر دایە وڵاتی شام و بەیتولموقەدەس دە مێژووی دەوراندا بە گەورەترین و وەحشیانەترین و بێ شەرمانەترین شەڕ وهێرشی دنیا دەهاتە ژمار و حیساب، بەو دەلیلە نە ماڵی هێشت نە گیانی هێشت نە ناموس، نە ناو و ناوبانگ لە گەلی بەنیئیسرائیل. ئەوانەی کە دە هەڵاتن و ئاوارەگی خۆیان گەیاندبووە وڵاتەکانی میسر و حیجاز و عێراق، هێندە مابوونەوە دەو ئاوارەگیەدا منداڵەکانیان ناوی وڵاتی خۆیان هاتبوو لە بیر بچێتەوە.

جا پاش سی چل ساڵ ئەو بێ لەززەتیە کە بەختەننەسر بە سەری هێنان پێغەمبەرەکەیان یەرمیا، وەفاتی کرد. پاش وەفاتی ئەو، دوو پێغەمبەری دی بە ناوەکانی عوزێر و یەشعیاە کە لەو

کەسانە بەوەلەد ببوون کە ئـاوارەی وڵاتـی عێـراق ببـوون، واتە کـاتی لە دایـکبوونی ئەو دوو پێغەمبەرە هاوزەمانی هێرشی بەختەننەسـر و ئاوارەگی خەڵکی شام و بەیتولموقەدەس بووە. جا ئەو دوو پێغەمبەرە دڵسۆز و بەڕەحمە بەزەییان جووڵاوە بۆ ئەو گەلە تێکۆشان خرِیـان کەنەوە و وێکیان خەنەوە و ئامادەیان کەن بۆ وەرگرتنەوەی وڵاتـی ئازیزیـان. خۆششانسـی وانـیش دەو کـاتەدا دەسـتەڵاتی بەختەننەسـر بە لاوازی هەسـت پـێ دەکـرا لە ژێـر دەسـتەڵاتی شـا کەیخوسـرەوی ئێران با بڵێین (کورش). کوتەیەکی زێڕینی پێغەمبەر یەرمیاش دەزرینگاوە دە ناو گوێی گەلی بەنیئیسـرائیلدا. کوتەکەش ئەوە بوو کە ئەو پێغەمبەرە فەرمـوویەتی: پـاش حەفتـا ساڵی دیکە بەختەننەسـر شکستی دێنێ و تێکدەشکێ بە دەستی کورش شای ئێـران و وڵاتـی شام و بەیتولموقەدەسی لـێ دەسـتێندرێتەوە و ئـاوەدان دەکـرێتەوە ئەو دوو شـوێنە مبـارەک و پیرۆزە. (قصص القرآن، سیوهاروی، ج ۲، ل ۲۳۷-۲۴۰)

دیارە گەلـی بەنیئیسـرائیلی ئـاوارە بە هـۆی بانگـاوازی ئەو دوو پێغەمـبەرە و ئەو کـوتە زێڕینەی یەرمیای پێغەمبەر غیرەتیان هاتەوە بەر دە حەولی خـۆ تونـدوتۆڵ کـردنەوەی خۆیانـدا بـوون بـۆ وەی بتـوانن سـەرزەوی خۆیـان لە بەختەننەسـر وەسـتێنن. سـەرەنجام بەو ڕۆژەش گەیشتن کە ئەوە بۆخۆی زەنگێکە بۆ داگیرکەرانـی خـاک و وڵاتـی نەتەوەکـان کە ئەو ڕۆژە دێ دەردەکرێن لە سەر خاکی زەوتکراو.

عوزێر پێغەمبەر دەو زەمانیدا ئارەزووی کرد بەرەو شاری وێرانکراو بڕوا و لەوێوە کە بتوانێ خاکی پاکی بەیتولموقەدەس زیارەت کا و کاروباری وڵاتـی عێـراقیش لە بـابەت کـۆکردنەوە و گەرمداهێنانی دڵی بەنیئیسـرائیلی ئاوارە سپاردە پێغەمبەر یەشعیاە. بۆخۆشی عوزێر پێغەمبەر پڕ بە ئاواتەوە بەرەو فەلەستین کەوتە ڕێ بێباک لە هەر دەرد و بەڵای ئەو سـەفەرە کە بێـتە پێشـێ. عوزێر پێغەمبەر دەو سەفەرەدا وڵاغێک و بڕێک خواردەمەنی و ئاو ساز دەکا و دێ. پـاش چەن شەو و ڕۆژان واریدی خاکی پیـرۆزی فەلەسـتین دەبـێ. دەو سـەفەرە پیرۆزەیـدا زۆر بە وردی وڵاتی وێرانکراوی بەیتولموقەدەس دەخاتە ژێر تەماشـای خـۆی. ئەدەو ورد ڕوانیـنەی خـۆی چاوی دەکەوێ بە دێیەکی وێرانی بە سەر یەکدا سـەپاو و تێکڕووخـاو دە فکـران ڕادەچـا لەو بارەوە ئایا خودایە بڵێی وڵاتی وا وێران زیندوو بێتەوە و ئـاوەدان وەبـێ؟ زۆر بە دم ئەو فکـرەوە حەسـرەت و داخ دەخوا و دەهۆشەوە دەڕوا. وەک خـودای تەعـالاش دەفەرمـوێ لەو بـارەوە: ﴿قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ کوتی: خودا خەڵکی ئەو شارە وێرانە چۆن زیندوو دەکاتەوە پـاش

مردنیان؟

عوزێر ئەئاوا خەوت: لە بن دارێک وڵاغەکەی بەستەوە، ئاو و نانەکەشی بە دارەکەدا کـرد. توورەکەیەکی خورما و هەنجیر کە پێی بوو ئەویشی نایە ژێر سەری. چۆ دە خەوی سەد ساڵەی تەواو. دەبێ کێ بێ پەند لەو بەسەرهاتە وەرگرێ؟ سەرەنجام دەبێ بڕوا و بەجێی بێڵێ و دەبـێ داگیرکەر وڵات بەجێ بێڵێ چونکە ئی خۆی نیـیە ئەو وڵاتە. ئەمەش دەبـێ دنیـا بەجـێ بێڵـین چونکە ئی ئێمە نیە دنیا!

ئەوە بەسەرهاتی بەختەننەســری زاڵـم کە بە نـاوی زاڵمـی ڕۆی بەرەو نەگەڕانەوە و هەروا بەسەرهاتی عوزێر پێغەمبەری عادڵ و بەڕەحم ڕۆی بەرەو دنیای خۆشی.

بە پێویستی دەزانم پوختەیەک لە ناوەرۆکی ئەو پێنج ئایەتانە (٢٥٦ تا ٢٦٠) نیشان بدەمەوە و وەردیان دەمەوە چـونکە چیرۆکـی زۆر بەنرخیـان تێـدایە و پەنـد و ئامۆژگـاری بەنرخیـان لـێ وەردەگیرێ بۆ کەسێکی خاوەن هەست بێ.

**ئایەتی ٢٥٦:** ﴿لاَ إِكرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ **واتە دە هەڵبژاردنی دیندا زۆری نییە.**

بەو دەلیلانە: ١. پاش ئەو هەموو ڕێگا و نیشانانەی بۆ شارەزایی ڕێگەی ڕاست و خـوار چ نیازێک دەمێنێ بۆ ئیجبار و زۆری؟

٢. دین عیبارەتە لە بەری هەستەیەکی دەروونی و هەر لەوێشەوە سـەرچاوە دەگـرێ. شـتی ئاوا دەروونی قەتعەن ناکرێ بە زۆر بخرێتە ناو دەروونەوە.

٣. کەرامەتی ئینسانی و سەعادەتی ئینسانی، دە سەربەستی و ئـازادی هەڵبژاردنـی ڕێگـای خۆیدایە.

٤. شەڕ وبەربەرەکانی عالەمی ئیسلام دەگەڵ عالەمی غەیرە ئیسلام لە سەر ئایین و دیـن و ئەقیدە نییە، بەڵکە بۆ بەرگری لە ئاژاوە و خراپەکارییە کە ناحەزان هەڵیدەگیرسێنن دە وڵاتـدا بـۆ بەربەست کردنی پەرەگرتنی ئادابی ئیلاهی.

**ئـایەتی ٢٥٧:** هەریەک لەو دوو داسـتانە واتە موسـوڵمان و کـافر ڕێـبەر و چاوسـووری تایبەتی خۆیان هەیە، ڕێبەری موسوڵمانان خودایە، ڕێبەری کافران تاغووت و جبت و موترفینە. شوبهاندنی کوفر و ئیمان بە ڕووناکایی و نوور و بە تاریکـایی جەهـل وێچـووترین وباشـترین تەشبیهە. بەو دەلیە: ڕووناکایی سەرچاوەی ژین و بەرەکەتە، ڕەحمەتە، حەسـانەوەیە، هێـزدەری جووڵانەوەیە، هەوێنی ئـارامش و ئیتمینـان و ئاگـادارییە. ئەمـما تاریکـایی ڕەمـزی سـکووتە،

هەوێنی مەرگە، پێشوازی کاروانی خەو و نەزانی و دەستەوستانییە.

**ئایەتی ۲۵۸**: هەروەک زانیت و دەرکت کرد ئایەتی ۲۵۷ لە بابەت هیدایەتی موسوڵمانان بەهۆی پەیڕەوی لە خودا و گومڕایی کافران بەهۆی پەیڕەوی لە تاغووتیان بوو. ئەمما ئایەتی ۲۵۸ دەلیل و نیشانەی زۆر ڕوون و ئاشکرا دێنێ لە سەر ئەوەی هەرکەس دەستەڵات و سەروەت و سامان بە نیعمەتی خودایان نەزانێ و شوکریان نەکا، بەڵکە سواری ئەسپی سەرکێشی غووروری هەوا و هەوەس بێ دەگاتە ئەو قۆناغە و پلەیە داوای خودایەتی بکا و دە ئاخریشدا دە زەلکاوی ڕەشی دەرد و میحنەت و بێ ئابڕووییدا هەر تلان بدا، ناویشی لە لەوحەی ڕۆژگاردا وەمێنێ تاکوو هەچی هاتە سەر زەوی، بیبینێ، وەک نەمروود و فیرعەون و هاومەرام و هاوسیفەتانیان. جا با زەین بدرێتە ڕۆچوونی نەمروود و فیرعەون دە زەلکاوی نەفامیدا:

١. هەچی ئینسانە ئەوەی دەبینێ و لێی یەقینە کە بە پێی سرشت دەزانێ کە ئەو دنیایە دانەر و ڕانەرێکی هەیە لە سەرەوەی هەموو خەیاڵاتە و هیچ تیری بیرێک نایگاتێ ئەوەش خودایە. بەڵام فیرعەون و نەمرود لەو سرشتە شۆرابوونەوە.

٢. ئینسان بە تەوری گشتی واقیعەکانی ڕوو دەدەن بۆ هەر یەکێکیان هۆیەک ڕەچاو دەکا ئەمما دە دەروونی خۆیدا ئینسان هۆی هەچی ڕوو دەدا هەر بە خودا دەزانێ.

٣. ئینسانانی وەرگەڕاو و بێباوەڕ بە خەیاڵیان خودای گەورە دنیای داناوە بەڵام خودایانی دی وەک باو و ئاو و ئاور ئیدارەی دەکەن، یا دەڵێن: ئەستێرەکانی خودا واقیعەکان دێننە ڕوو. ئەو کارەسات و ڕووداوانە هەڵقولاوی زەلاوی بێباوەڕین.

**ئایەتی ۲۵۹**: چیرۆکی ئایەتی ۲۵۸ و ۲۶۰ هەر سێ چیرۆک سێ جۆرە هیدایەت و شارەزایی نیشان دەدەن:

١. شارەزایی بە دەلیل و بورهانەوە وەک دە بەینی حەزرەتی ئیبراهیم و نەمروودی زۆردار چاو کرا و نەمرود بە هۆی بێ دەلیلی خۆی لە سەر ئیدیعای مەحکووم و بێدەنگ مایەوە.

٢. شارەزایی و هیدایەت وەک عوزێر بە چاوی خۆی دیتی و پێی قانیع بوو.

٣. شارەزایی و هیدایەت بە هۆی عیللەت و مەعلوول یا بڵێین سەبەب و موسەبب کە ئەوە بەرچاوترینی بەڵگەی پێ قانعبوونە. وەک ئیبراهیم بە چاوی خۆی دیتی کە خودای تەعالا چۆن لەشی پرژ و بڵاو و لێکهەڵوەشاو دەخاتەوە پاڵ یەک و گیانیشیان وەبەر دەخاتەوە.

**ئایەتی ٢٦٠:** ئیبراهیم پێغەمبەر باوەڕی بە ڕۆژی زیندوو بوونەوە بوو ئەمما بە شوێن ئەوەیدا دەگەڕا بزانێ چۆناوچۆن پاش ساڵەهای ساڵ ئەو ڕوحی تۆراو لە لەش چۆن دەچێتەوە پاڵ لەش؟ خۆ ئەوە ڕاستە کە زانست و ئەقڵ و شعوور دەتوانن دەلیل بن لە سەر یەقین بەڵام وێستا ناگەنە ئەو زانستەی کە بە ئەجزای لەش چاو دەکرێن وەک دیتن بە چاو، بیستن بە گوێ، تام چاشتن بە زمان، یا دەس لێدان لە شت بۆ دەرکی زبر و نەرمی و ڕەقی.

جا ئیبراهیم کاتێ بە چاو ئەو بابەتەی دی دڵ و گیان و لەشی دامرکان و داسەکنین.

ئەوجار ئەگەر بە وردی سرنج بدرێتە ئایەتی ٢٦٠ بە ڕوونی زیندوو بوونەوە و وەک خۆ لێکردنەوەی لەش ئاشکرایە واتە میعادی جسمانی، چونکە ئێمە ئەگەر پرسیارمان و گومانمان دە زیندوو بوونەوەی ڕوحدا با، دەکەوتینە گێژاوەیەک خۆمان بۆ نەدگیرساوە چونکە ڕوح نامرێ تا زیندوو وەبێ و دووبارە ڕوح قابلی لەت و پچڕپچڕ نییە تاکوو وەک لەش ئەنجڕ ئەنجڕ کرێ و دەگەڵ خاک و خۆڵ تێکەڵ کرێ و ببێتەوە خاک و پاشان وەک خۆڵی لێ بکرێتەوە.

ئەگەر ئەو پێنج ئایەتە ورد دابێژرێن و لە کەو درێن بەهرەی گەورەیان لێ وەدەس دێ.

ئەوجار دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٦١ کە دەگەڵ ئایەتەکانی پێش خۆی دە مەبەست و مەتالیبدا تێکەڵاوی زۆریان هەیە. نموونە: دە ئایەتەکانی ڕابردوودا ئینسان کرایە دوو دەستە: ١. ئەولیائوڵڵا: خاوەن باوەڕ و ئیمان ٢. ئەولیای تاغوت: واتە کافر و بێباوەڕ.

پاشان لە دووی ئەو دوو قۆڵانە نموونەی ئیمان و نموونەی بێئیمانی بەیان کرا. ئەوجار باسی پێغەمبەرایەتی و مەعاد واتە زیندوو بوونەوە کرا دە پاڵ چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم و عوزێردا. ئەوجار ڕووبەڕوو بوونەوەی ئیبراهیم پێغەمبەر دەگەڵ شای زۆرداری وەک نەمروود. ئەوجار کارەساتێکی زۆر گرینگ بێ ڕابروود وەک سەد ساڵ مردن و زیندوو بوونەوەی حەزرەتی عوزێر. ئێستاش باسی شتێکی زۆر ئەساسی دێتە پێش کە دەیاسای ئیسلامدا زۆری ئەرزش بۆ دانراوە. وەک بەخشینی ماڵ و دارایی دە ڕاهی خودادا بەبێ نەوا و خاوەن نیازان. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٦١:

**﴿٢٦١﴾ مَّثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّئَةُ حَبَّةٍ وَاللّهُ يُضَاعِفُ لِمَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ**

**نموونەی ئەوانەی کە دارایی خۆیان دە ڕێی خودادا دەبەخشن هەر وەکوو دەنکە تۆوێک وایە حەوت دانە گوڵی گرتبێت لە هەر گوڵێکیاندا سەد دانەی تێدا بێت، خوداش بۆ هەرکەس**

بیەوێت چەند بەرابەری دەکاتەوە. خودا خاوەن بەخششێکی بەرفراوانە و زانایە.

## یەک بە حەوتسەد

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٦١:

ئەوانەی کە دە ڕێگای ڕەزایەتی خودادا دارایی و ماڵیان دەبەخشن و یا بە گیان فیداکاری دەکەن، دە بابەت پاداشیان لە لایەن خوداوە چۆن دەکەون و چۆن دەبن؟ مەسەلەی پاداشی ئەوانە ئاوایە: وەک دەنکە دانەوێڵەیەک وایە کە لە خاکێکی خاوێن و بێ بەرد و دار چێنرابێ و بە ئاوێکی خاوێن ئاو درابێ، ئەو دانەیە پنجێکی شۆخ و شەنگی جوانی بە نەشەی لە زەویدا قایم کردبێ و لەو پنجە حەوت لقی لە شۆقی دەرکردبێ و هەر لقەی گوڵێکی گرتبێ و لە هەر گوڵێکا، سەت دانەی تێدا بەرهەم هاتبێ. کە دەبێتە یەک بە حەوتسەد. و حەتا خودای بەخشندە لەو یەک بە حەوتسەدەشی زیاتری دەداتێ ئەگەر حەز بکا. چونکە بەخشندەگی خودا وەک ئی عەبدی ناچێ، چونکە خەزانەی خودا کەم ناکا هەچەندی لێی خەرج کا. ئەو یەک بە حەوسەدەی خودا و زیاتریش لە سەر ئەساسی دڵ و دەروونی عەبدەکەیە واتە خودا زانایە بە دڵ و دەروونی عەبدەکانی دەزانێ کە دڵی ئەو عەبدەی لەوە زیاتر بەخششی تێدایە ئەمما هەر ئەوەندەی هەیە. بەڵام خودا لە یەک بەو حەوسەدەی زیاتر هەیە بۆیە دەتوانێ بیدا بە عەبدی چاکەکاری.

بە پێی بەراورد و هەڵسەنگاندنی ئایەتەکانی لەمەڕ بەخشندەگی و چاکە دە ڕێگای خودادا بە چوار لەفز دواوە خودای تەعالا.

١. (اطعام) وەک ئایەتی ٨ سووڕەی ئینسان: ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾ خواردەمەنی دەدەن بە هەژار و هەتیو و دیلەکان.

٢. (صدقه) وەک ئایەتی ٦٠ سووڕەی تەوبە: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ﴾ سەدەقە ماڵی فەقیر و بێنەوایانە.

٣. (ایتاء) وەک ئایەتی ٤٣ی بەقەرە: ﴿وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ وَارْكَعُواْ مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾ نوێژ بخوێنن و زەکات بدەن و لەگەڵ ڕکووعبەران بچنە ڕکووعەوە.

٤. (انفاق) وەک ئایەتی ٢٦١ی بەقەرە: ﴿مَّثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾

دەو چوار لەفزەدا مانای (انفاق) و (اطعام) و (صدقه) گشتین واتە بۆ بەخشینی ماڵ بە شێوەی سوننەت و واجب و فەڕز دەبێ. ئەمما لەفزی (ایتاء) کە تایبەتی زەکاتی ماڵ و زەکاتی

فیتر و عوشـره، هەر بە شێوەی فەرز و واجبە.

دەوەیدا کە خودای تەعالا بۆ پاداشی ئەوانەی دەرێی خودادا ماڵ دەبەخشـن نمـوونەی بە دانە و دانەوێڵەی سەر وە جووتیار و کشاوەرز هێناوە. ئەو هەستە دەکرێ کە چاکترین کەسب و کەسابەت جووتێری بێ واتە کەسبی فەلاحەتی.

شتێکی خۆش و بەلەززەت هەیە دەیلێم با ون نەبێ و نەختێکیش لە سەر زارانە:

گۆیا ڕۆژێکی پێغەمبەر دەچێتە دیاری یەکێ لە یارانی، دەبینێ ئەو یارەی ئەو لە بەری گەنم ڕنینەوەیە و دەستی دەخاتە ناو دەستی و چاو دەکـا بەشـی زۆری قامکەکـانی بە بەن بەسـتووە. پێغەمبەر لێی دەپرسێ ئەو قامکانەت بۆ ئاوا بەستووە؟ ئەویش عەرزی دەکا ئەوە قەڵشیون. جـا بۆ وەی برینەکەیـان ئـاواڵە نەبـێ، بەسـتوومن. پێغەمـبەر ئەدێـرەدا دەسـتەکانی بە دوو دەسـتی مبارەکی خۆی کوشین و مـاچی کـردن. فەرمـووی بۆیەیـان مـاچ دەکەم چـونکە بەو قامـک و دەستانە بەرهەم و بەهرەیەکیان پێ ڕەنێو دێ کە جگە لەوەی قووتی ئینسانە ڕزقی مێروو و باڵندە و گیانلەبەری دیشە.

وەک دەڵێن دایکی موسـوڵمانان (حەزرەتـی عایشـە) لە زاری پێغەمـبەرەوە فەرمـوویەتی: (اُطْلُبوا الرزقَ في خبايا الارضِ) واتە ڕزقی خۆتان لە ناخی زەویدا دەرێنن.

دڵی بزۆز و بەپرسیار دەڵـێ تـا ئێـرە خـودای تەعـالا لە بـابەت پاداشـی چاکەکـاران هەر ئەوەندەی فەرمووە: یەک بە حەوسەدە، بەڵام ڕاسـتەوخۆ نەیفەرمـوو ئەو یەک بە حەوسـەدە بـۆ ڕۆژی قیامەتە و یا لە دنیادایە و یا دە دنیاش و قیامەتدایە؟ جا بۆوەی دڵی بزۆز دە چاوەڕوانیـدا نەمێنێ، دەچینە سەر ئەو باسە کە پاداشی بەخشینی ئەو داراییە دە ڕێی خودا بۆ ڕۆژی ئاخرەتی چۆناوچۆنە؟ جا بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٦٢:

**﴿٢٦٢﴾ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ ثُمَّ لاَ يُتْبِعُونَ مَا أَنفَقُـواُ مَنًّـا وَلاَ أَذًى لَّهُـمْ أَجْـرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ**

**ئەو کەسانەی سـامانیان دە ڕێگـای خـودادا دەبەخشـن، پاشـان مـنەت و ئـێش و ئـازار نـادەنە خـاوەنی ئەو بەخششـانە، ئەوانە پاداشـیان لە لای خودایـانە. ئەوانە نە ترسـی عەزابـی دنیـا و قیامەت سواریان دەبێ و دایاندەگرێ، نە خەمی بوون و نەبوونیش دایاندەگرێ.**

## ئینفاق و مەسەلەی ئازار و منەت

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ۲۶۲:

دیارە کەسانێکی کە دە ڕێگای خودادا ماڵ و گیانی خۆیان بەخت دەکەن ئەو کەسە دەبێ ماڵ و گیانی داوە بە کێ و بۆ کێی فیدا کردووە، لەو کەسە داوای ئەجر و پاداشی بکا، چونکە بە گوێرەی شەرع و ئایین و ویژدان و عورف قەرزی دەگەڵ کێ کردبێ پاداش و قەرزەکەی لەو کەسە دەکەوێتەوە. جا بۆیە خودای دانەری یاسا و یاسادانەر و یاساپارێز ئیشارەی ڕوون و ئاشکرای فەرمووە دێرەدا کە ئەو کەسە خێرکەرەی دە ڕێگای مندا خێری کردووە نابێ منەت لە سەر کەس دانێ و نابێ خۆی بە سەر کەسدا هەڵکێشێ و نابێ لە هیچ ڕێگایەکەوە بە منەت و خۆهەڵکێشان ئازار و ئەزیەت ڕانێ و بیکا. جا ئەو کەسەیە و مەرجانە ئەجر و پاداشی گەورەی هەیە لە لای ئەو خودایەی کە ماڵ و گیانی دە پێناودا بەخت کردووە و ئەو کەسانە هیچ جۆرە ترسێکیان نابێ ببێ لە ڕۆژی حیسابدا کە ئەو ئەجر و پاداشە لە بیر بچێتەوە و یا بە تەواوی بیدرێتەوە و لەو بارەوە واتە لە بیر بچێتەوە پاداش و یا کەمی بدرێتەوە خەمی بە سەردا بێ.

بە کوردی: بەهرە وپاداشی خێری بێ‌منەت و ئازار و خۆهەڵکێشان لە لایەن خودای خاوەنی بەخشش و میهرەبان سێ بەهرەی دەبێ بگرێ بە لانی زیادەوە:

١. پاداشی پڕاوپڕ

٢. ترسی نابێ لەوەیدا بڵێ ئایا دەبێ ئەجرم بدرێتەوە

٣. خەمی نابێ لەوەدا بڵێ ماڵ و گیانم بە فیڕۆ چوو. (تەفسیری ابومسعود، ج١، ل ٤٠٥)

دیارە ئەوەشی دەبێ بەراوەرد کەین ﴿لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ واتە ترسی دواڕۆژی نابێ، بڵێ لەو ڕۆژەدا بێ دەسمایە و بێ سەرمایە دەمێنمەوە. ﴿وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ واتە خەمی ئەوەی بە ڕێ کردووە لە ڕابردوودا دە ڕێگەی خودادا بە فیڕۆ نەدراوە و بە فیڕۆ نەڕۆیشتووە. چونکە ئەوانەی ماڵ بۆ لاف و گەزاف و فیزی دنیا دەدەن و خەرجی دەکەن، هەر قەزاوەتی دڵ و ویژدانی خۆیان دەکاتی خۆیدا ئیلهامی دەدەنێ ڕەنج بەخەسار هاتوویە دەرێ ئەوەی خەرجت کرد و بەخشیت بە فیڕۆ و بێ بەهرەیە.

عولەمایانی ئیسلام کۆدەنگن لەوەدا کە منەت و خۆ هەڵکێشان و لەخۆبایی دەبابەت خێر و چاکە و چاکەکاری وەک ئاور دە کردەوەی چاکی بەردەی ئاوایە. بەو دەلیلە: ئەتۆ ئەگەر ئەو چاکەت بۆ خودا کردووە و لە بەر ویت کردووە، ئەوە ئەو دەزانێ و سەبتی دەکا لە دەفتەری

خۆی، هیچ حەقی منەت و خۆهەڵکێشانت نـامێنێ بە سـەر خەڵـک چـونکە دەگەڵ خـودات کردووە بە خەڵکی خودا، و ئەگەر بـۆ چـاووڕاو و خۆهەڵکێشانیشـت کـردووە ئەوە بێ گومـان شەیتان پێی کردووی و ئەویشە دنەت دەدا بۆ خۆهەڵکێشان و منەتدانان لە سەر عالەم.

بۆ ئیتمینان و ئیقناعی دڵ لە سەر ئەوەی هەچـی بـۆ خـودا بـدرێ، دەدرێـتەوە بە زیـادوە، هەچی بۆ خوداش نەدرێ نادرێتەوە، دەچینە خزمەت دوو ئایەتی: ١١٢ طه و ٩٦ نەحل:

طه ﴿١١٢﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا.

**ئەوانەی کە کارە چاکەکان ئەنجام دەدەن و بڕواداریشن، ئەوە نە لە ستەم لـێ کـردن دەترسـن و نە لە کەم کردنەوەی ماف.**

نحـل ﴿٩٦﴾ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ اللَّهِ بَاقٍ وَلَنَجْزِيَنَّ الَّذِينَ صَبَرُوا أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ. **ئەوەی لە لای ئێوەیە تەواو دەبێ، ئەوەی لە لای خودایە دەمێنێ، واتە ئەوەی لە خۆی هـاڵێنن بـۆ لاف و فیز و گەزاف، دەڕوا بێ بەهرە و نامێنێ) ئەوەی دە ڕێگای خودادا بڕوا و بدرێ، نـابڕێ و دەدرێـتەوە لە کاتی پێویستدا.**

نیە هیچ کەس لەوە حاڵی نەبێ و تێنەگا کە هەچی بۆ خـودا بـێ دەدرێـتەوە و هەچـی بـۆ خۆت و زگ و نەوست بێ، بۆ فیز و لاف و گەزاف، دەخورێ و دەڕوا و دەبرێ.

دڵ دەڵێ: ئەمن وا هەست پێ دەکەم ئەو چاکە و چاکەکاریانەی کە تا ئێستا باس کران هەر لە سەر ماڵ و سامان و دارایی دەوریان گێڕا، واتە ماڵ خەرج کـرێ دە ڕێـی خـودادا، کەوابـێ دەبێ پەرۆشی بێ ماڵانن بێ کە نییانە، تاکوو خۆ بگەیێننە ئەو پلە و پـایەیە و لەوانەیە ئەوانـیش بەزەییان بە حاڵی خۆدا بێ؟ ئەمـما خـودای ئاگـادار بە هەسـتی دڵان دە هـاواری هەمـوو ئەو کەسانە دێ کە نیەتی خێر و چاکەیان ببێ. جا دەبێ بڵێین ئەدێرەدایە کە خودا تـێمان دەگەیێنـێ کە چاکە و چاکەکاری دە ڕێی خودادا هەر ماڵ بەخشین نییە، واتە هەر بە ماڵ نییە چاکە و خێـر و حەسەنات، هەروەک بە وەسیلەی ئایەتی ٢٦٣ حاڵیمان دەکات بۆمان بەیان دەکا. جا دەچیـنە خزمەت ئایەتەکە:

**﴿٢٦٣﴾ قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٌ**

**قسەی شیرین و جوان و حەیادارانە، و چاوپۆشین لە بابەت ناحەزان، چاکترە لە بەخشینی مـاڵ و سامان کە منەت و ئازاری لە شوێن بێ.**

## قسەی جوان باشترە لە سەدەقەی بە ئەزیەتەوە

دەبێ بکوترێ لێرەدا خودا ئاوڕی بەخێری وەسەر بێ ماڵ و سامانان داوەتەوە ڕێگای گرت لە ساماندااران کە خۆهەڵکێشان بکەن لە سەر بێ‌ماڵان.

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٦٣:**

دەبێ ئەوە بزاندرێ قسەی نەرم و حیلم و شیرن دەگەڵ هەژاران و ئەوانەی کە ئیستیفادەی خراپی لێ نەکەن لە ڕووخۆشی و قسەخۆشەکانی چاترە لە ماڵ بەخشینی بە منەتەوە. و هەروا چاوپۆشین و بەخشین و گوزەشت لە هەژاران و بێ‌دەستەڵاتان چاکترە لە ماڵبەخشین بە منەتەوە.

ئەمما قسەی نەرم و هێدی و شیرین دەگەڵ زۆرداران کەوا بزانێ دەترسێی و شەرمی لێ دەکەی ئەوە چاکتر نییە لە ماڵ بەخشینی بە منەتەوە. هەردووکیان ناپەسەندی شەرعن. بەڵکە دەبێ چاپۆشیت لەو کەسانە بێ کاریان لێ ڕوو دەدا بە هەڵە. عوزرخوازی دەکەن نەک لەو پیاوکوژ و ڕێگر و زۆردارنی وا کە لە بەخشینەکەت ئیستیفادەی خراپی لێ بکەن و چێ‌تر بن لە سەر خراپەکارییەکانیان. دیارە دەبێ لەوەش حاڵی بین: ماڵ بەخشین دە ڕێی خودادا یانی چی؟ یانی خودا بۆخۆی بێ‌نیازە، نیازی بە هیچ خێر و حەسەناتی عەبدی نییە، بۆیە ئەوەت ڕێنوێنی دەکات کە فێری چاکەت بکا تا چاکەت دەگەڵ بکرێتەوە.

دەبێ ئەوەش باش بزاندرێ کە خودا حەلیمە، واتە دەگەڵ خراپەکاران لە سەرەخۆیە بۆ وەی بەڵکە بگەڕێنەوە، دەنا دەتوانێ دەستەولەجێ تۆڵە لە خراپەکار وەستێنێ.

دوو شتی شیرین و دڵگر هەن پاشقول دانیان بە زەرەر دەبیندرێ بەڵام گێڕانەوەی دەبێتە هۆی ئەوەی شاهیدی بدەن لە سەر ئەخلاقی بەرزی پێغەمبەرﷺ و لە سەر ئیتاعەیی حەزرەتی عومەر لە دەستوورەکانی ئایینی ئیسلام.

## حەزرەتی عومەر و عەرەبێکی برسی

لە بوخارییەوە:

١. گۆیا ڕۆژێکی عەرەبێکی هەژار و برسی و خاوەن خێزان ئامبازی پێغەمبەر دەبێ و چادرێک کە لە سەر شانی پێغەمبەر دەبێ وەبەر دەستی عەرەبە دەکەوێ و دەیکێشێ و توندی دەکا لە شان و ملی پێغەمبەر و هاوار دەکا و دەڵێ بە پێغەمبەری ئەمن خاوەن خێزان و برسیمە

بۆچی لە ماڵی غەنیمەت و بەیتولماڵ نامدەیەی؟ لەو کـاتەدا چـادرەکەی وا تونـد کـرد پێسـتی لاملی پێغەمبەری سوور هەڵگێڕا. دەوروبەری ڕەسـوول بە هـۆی بێئەدەبـی عەرەبە نـاڕەحەت بوون هاتن ڕاکەن و تاو دەنە عەرەبەی بەڵام پێغەمبەر بە ئیشارات حاڵی کردن کە نەکەن ئـازادی کەن و لێی گەڕێن. عەرەبەش هەستی ئەو تووڕەییەی یارانی پێغەمـبەر و ئیشـاڕاتی پێغەمـبەری کرد، دەستی نەختێک شل کردەوە ئەدەوەیدا پێغەمبەر زەردەیەکی پـڕ لە مەحەبـبەت هـاتە سـەر لێوانی و فەرمووی بە یارانی دەوروبەری خۆی: بڕۆن لە بەشی ژینـی خـۆی و منـداڵەکانی بـۆ بێنن، و نەرمیشی دەگەڵ بدوێن با دوو ئاوری تێ بەرنەبێ: یەک ئاوری برسیایەتی منـداڵەکانی، دوو ئاوری خەجاڵەتی ئەو کارەی.

٢. گۆیـا دە جەنـگەی دەسـتەڵات و خەلافەتـی حەزرەتـی عـومەردا و دە کـات و سـاتی گەڕانەوە لە شەڕ بەرەو مەدینـە دیسـان عەرەبێکـی سـەختی بادیەنشـینەکانی برسـی و ڕووت و پاپەتی و خاوەن خێزان دێتە پێش حەزرەتی عومەر دە ڕێگایەدا جڵەوی وڵاغی عومەر دەگرێ و دەڵێ: هاهاها! بزانە بۆچی لەو تاڵانە بەشی من و مـاڵ و منـداڵانم نـادەیەی؟ مەگەر ئەو مـاڵە تاڵانە ماڵی بابتە؟ سوێند بە خودا ئەگەر هەرئێستێ بەشم نەدەی دەڕۆم چونکە دەستەڵاتم نییە و ناتوێرمێ، ئەمـما ڕۆژی قیـامەت کە حـاکمی ئەوێ ڕۆژی خـودایە زنجیـرت دە ملـی دەکەم و ڕاتدەکێشم و لەوێ شکایەتی ئەوەت لە خودا لێ دەکەم و دەڵێم خودایە هەیبوو ماڵ بمداتێ لە برسیایەتی من و ماڵ و منداڵانم نەجات دا نەیدامێ.

دەوروبەری حەزرەتی عومەر ویستیان جڵەوی وڵاغی عومەری لە دەستی دەرێـنن و ڕێـگە بدا عومەر بڕوا بەڵام حەزرەتی عومەر بە دڵێکی پڕ لە خەم و پەرۆشـەوە فەرمـووی ئەی کـاکی عەرەب! شکایەتم لە کن خودا لێ مەکە و زنجیریشم لە قیامەتێ دە مل مەکە! بەڵام سەرپشـک بە لێرەت دەمێ بەشی دوو حەوتووان بژیو و زەخیرە یا دەگەڵم وەرە بچینەوە نـاو مەدیـنە لەوێ هەچی وەبەر من کەوت لەو غەنـیمەت و تـاڵانە هەمـووی دەدەم بە تـۆ و بـێجگە لە ئەنعـامی یارانیش.

عەرەبە کوتی: یا عومەر دێم دەگەڵت چونکە لەوێشم تێر دەکەی.

ئەوجار عەرەبە بە پێخواس ویستی دە پێش عومەردا بڕوا، حەرزەتی عومەر فەرمـووی وەرە سوار بە، ئەمن دادەبەزم. عەرەبە قەبووڵی نەکرد. حەزرەتی عومەر بـۆوەی پێـی قبـووڵ کـا بـێ سوار بێ، پێی کوت بە عەرەبەی ئەگەر نەیەی سوار نەبی بە پێیان دەگەڵمان دەرناچی تـاڵان دە

پێشدا دەگاتەوە هەمووی لە خۆیاندا بەش دەکەن بۆ تۆ و بۆ من هیچ نامێنێتەوە.

ئەوجار عەرەبە هات و عومەر دابەزی و عەرەبەکە سوار بوو. یارانی عومەر کە ئاوایـان دی هاتن وڵاغێکی دیکەی خۆیان دا بە حەزرەتی عومەر سواری بێ.

ئایا دەبێ دە بەرابەر ئەو دوو بابەتە بەردڵانە و حەکیمانە و بەزەییانە و عادڵانەی پێغەمـبەر و عومەر دڵ و ئەقڵ و ویژدان و ئیمان چ بڵێ بەغەیرەز کڕنۆش بردن بۆ ئایینی پـڕ لە ڕەحـمەت و میهرەبانی خودا.

خودای تەعالا بە وەسیلەی ئایەتەکانی ٢٦١ و ٢٦٢ و ٢٦٣ گەورایەتـی و پـڕ خێـر و بێـری سەدەقە و ئینفاقی بە ڕوونی بەیان کرد و هـۆی لە نـاوچوونی بەرەکەت و ئەجـر و پاداشـی ئەو شتە پڕ خێر و بێرانەشی بەیان کرد کە ئازار و منەت و خۆ هەڵکێشانە لە سەر ئەنجامدانی ئینفاق و سەدەقە. پاشان خودای بانی‌سەر دەیهەوێ دوو جۆرە ئینفاق و بەخشش بەیان کا بە وەسیلەی ئایەتەکانی ٢٦٤ و ٢٦٥ کە یەکیان وەک حوکمی ئایەتی ٢٦٤ بـێ لە سـەر ئەساسـی ڕیاکـاری و چاوڕاو و خۆهەڵکێشان بێ، ئەوی دیکەشیان وەک حوکمی ئایەتی ٢٦٥ بێ لەسـەر ئەساسـی ڕەزایەتی خودای تەعالا بێ.

بە کوردی و بە کورتی: سەدەقەی بێ بەهرە و باتڵ، سەدەقەی پڕبەهرە و قبووڵ. دە ناو دوو میسال و وێنەی زۆر بەرچاو و پەسەند و دڵگردا نیشان دەدرێن لە لایەن خوداوە.

یەک لەو دوو جۆرە نەفەقانە حوکمی ئایەتی ٢٦٤ە و دەچینە خزمەتی:

**﴿٢٦٤﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُبْطِلُواْ صَدَقَاتِكُم بِالْمَنِّ وَالأذَى كَالَّذِي يُنفِقُ مَالَهُ رِئَاء النَّاسِ وَلاَ يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْدًا لاَّ يَقْدِرُونَ عَلَى شَيْءٍ مِّمَّا كَسَبُواْ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ**

**ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان هێناوە، چاکەکاری و بەخشش و دەستگرتنەکانتان پـووچ و بەتـاڵ مەکەنەوە بە مـنەت و ئازارەکانتـان، وەک ئەو کەسـەی مـاڵ و سـامانی خـۆی بە ڕیاکـاری و چاوڕاو دەبەخشێ و ئیمانیشی بە خودا و ڕۆژی ئاخرەت نییە. نمـوونەی ئەوە وەک نمـوونەی بەردێکی لووس و ساف وایە کە هێندێکی خۆڵ لە سەر بێ، بارانی بەغوڕەم بە سەریدا بڕژێ و هیچـی لە سـەر نەهێڵـێ و بە سـاف و لووسـی بیهێڵێـتەوە، ئەمـا لەوەی بەخشـیوانە هـیچ بەهـرەیەک وەرنـاگرن و خـوداش هەرگیـز ڕێنمـوونی بـێ بڕوایـان ناکـا، (واتە بـێ بڕوایـان لە ڕێنومایی خودا بەهرە ناگرن).**

## باتڵبوونی سەدەقە

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٦٤:

پێش ئەوەی بچینە ناو بـاس و بەیـان و لێکـۆڵینەوەی نـاو دەروونـی ئـایەتەکە دووبـارە بە تەئکیـدەوە تووشـی پێشـواز و پێشـەنگێکی دەبـین کە خـاوەن بـاوەڕانی ئینفـاقی بە مـنەت و ئازارەوەی نەهی کردووە. ئەگەر بەرجەوەندی دە کار کـرێ و ئـایەتەکە هەڵسـەنگێندرێ خێـر و سەدەقەی مەقبووڵ و نامەقبووڵ دە قاڵبی دوو نموونە و وێنەی بەرچاو و جوان دەبیندرێن.

١. سەدەقەی نامەقبووڵ تەماشا کە دە ئایەتی ﴿لاَ تُبْطِلُـواْ صَـدَقَاتِكُم بِـالْمَنِّ وَالأذَى﴾ واتە پووچەڵ مەکەنەوە خێر و سەدەقەکانتان بە منەت و ئازاردانی خێرپێکراوەکـان. وەک ئەو کەسـانەی کە ئیمان و باوەڕییان بە خودا و ڕۆژی ئاخرەت نییە، ئەمما بـۆ چـاووڕاو و خۆهەڵکێشـان دە نـاو عالەمدا ماڵ و دارایی خۆیان ئینفاق دەکەن واتە دەیبەخشـن، وەک خـودا دەفەرمـوێ: ﴿كَالَّذِي يُنفِقُ مَالَهُ رِئَاء النَّاسِ وَلاَ يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ واتە ئەو کـارەی وان وەک ئەوە وایە بەردێکـی ساف و لووس بێنی گڵ و خۆڵی بە سەردا کرێ و تۆویشی پێ وەرکرێ، جا بارانێکی بەلێزمە و بەغوڕەم ببارێ بە سەریدا و بە توندی لێی دا. ئەوە بێ گومان هیچی لێ ناڕوێ لەو تۆوەی پێـی وەرکراوە، هەر گڵەکەشی لە سەر نامێنێ. بەردەکە بە ساف و لووسی دەمێنێتەوە. جا لە سەر ئەو ئەساسە خێر و سەدەقەی کەسانی خاوەن منەت و ئازار و خۆهەڵکێشان ئاوایە هیچ بەهرەیەکیان لێ دەس ناکەوێ لە بەخشینەکەیان ماڵ و سامانەکەشیان دەچێ. وەک ئایەتەکە وا نیشـان دەدا: ﴿فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْدًا لاَّ يَقْدِرُونَ عَلَى شَيْءٍ مِّمَّا كَسَبُواْ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ واتە نموونەی ئەوە وەک نموونەی بەردێکی ساف وایە هەندێ خـۆڵی لە سـەردا بێ، بارانی بەلێزمە لێی بدا و هیچی لە سەر نەهێڵێ و بە سافی جێـی بێڵـێ. ئەوانە هـیچ کەڵکێـک لەوەی بەخشیویانە وەرناگرن و خوداش هەرگیز ڕێنوێنی گەلی بێباوەڕ ناکات.

٢. ئەوجار نموونەی سەدەقەی مەقبـووڵ سـەیر کە و هەڵیسـەنگێنە دە نـاو ئـایەتی ٢٦٥ی بەقەرەدا:

**﴿٢٦٥﴾ وَمَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمُ ابْتِغَاء مَرْضَاتِ اللّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْـوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَآتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ**

**نموونەی ئەو کەسانەی کە ماڵ و سامانی خۆیان لە بەر ڕەزایەتی خودا و دامەزرانـدنی دڵ و دەروونیـان بەخـت دەکەن، وەک بـاخێکە لەسـەر تەپـۆڵکەیەکی بەرزدا، ڕەهـێڵە بـاران**

**دەبـارێ بە سـەریا و لێـی دەدا و میـوە بگرێـت دوو بەرابەر. ئەگەر ڕەهـێڵە بـارانیش لێـی نەدات، هەر هیچ نەبێت بارانێکی سووک و هێواش لێی بـدات خـوداش بینـا و بەسـیرە بەو کارانەی کە ئەنجامی دەدەن.**

## ئینفاق بۆ ڕەزایەتی خودا

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٦٥:

دیارە ئەو ئایەتانەی بە شێوەی تەمسیل و نموونە کە دەهێندرێنەوە بۆوەیە کە ئینسان شتێکی کە بە نموونەی بۆ بێندرێتەوە، بەهانەی لێ دەبڕێ و نامێنێ قسەی، وەک خێری بەچاوڕاو و بە منەت کە هیچ بەهرەیەکی نییە بۆ خێرکەرەکە، ئەگەر کەسێک وا نەزانـێ ناشـزانێ ئەو خێـرانەی دەیانکا بۆ کێیان دەکا و لە بەر چییان دەکا؟

مانای ئایەتی ٢٦٥ واتە نموونەی سەدەقەی مەقبوولْ، ئەوەمـان پـێ دەڵـێ: ئەوەی ئـێمەی ئینسان دەیبەخشین لە ماڵی خۆمان، دەبێ لە سەر ئەساس و بنچینەی باوەڕی بە ڕۆژی پاداش و تۆڵە بێ، داوەر و قازی مـوتڵەقی ئەو ڕۆژەش هەر دەبـێ خـودا بـێ، چـونکە بەوی نەبـێ ئەو جەریانی ڕۆژی حیسابێ جێبەجێ نـابێ. جـا کەوایە دەبـێ خێـرکەر ئەوە بزانـێ و دە بەر دڵ و چاوی بگرێ کە خودای مالکی موتڵەقی ڕۆژی حیساب ئەو خێـرە بە خـاتری ڕەزایەتـی تـۆی دەکەم، ئەو خێرەشم دەکەمە شاهید لە سەر باوەڕم کە دە ڕۆژی خۆیدا دێـتە بارەگـای تـۆ و ون نابێ وەکی فەرمووتە: مسـقاڵە زەڕڕە لە خێـر و لە شـەڕ ون نـابێ و دێـتەوە ڕوو و خـاوەنەکەی چاوی دەکا و دەیبینێ. کەوابێ ئەو ئینسانە ئەو خێرەی لە بەر خودا و پاداشـی ڕۆژی ئـاخرەتی کردووە چ مافێکی ئەوەی هەیە ئازاری من بدا و منەت لە سەرم دابنێ و خۆی پـێ هەڵکێشـێ. ئەگەر وا بکا ئەوە بێ‌گومانە نە باوەڕی هەیە نە بۆ خودای کردووە نە بۆ ڕۆژی ئاخرەت. نەتیجە ئەوەیە: ڕۆژی قیـامەت هیچـی نیـیە لە بەهـرەی ئەوانەی بەخشـیویەتی و لە دنیاشـدا زەرەری ماڵەکەی لێ کەوتووە، ئەوە پێی دەکوترێ: دەس‌بەتاڵ و کیسە خاڵی و ڕەنج‌بەخەسار.

ئەوە نەتـیجەی ئـایەتی ٢٦٤ بـوو بە وەسـیلەی ئـایەتی ٢٦٥ واتە" چـاکە و چاکەکـاری لە بەرزایەتی باری، بە بەرهەمەکەی دەگەیەوە، چـاکە و خێـری بە مـنەت و ئـازارەوە کە نیشـانەی بێ‌باوەڕییە، بێ‌بەهرەیە و بێ پاداشە.

با ئەوەشمان لە بیر نەچێ: خێـر و خێـرات دەبـێ بە مـاڵی حەڵاڵ بـێ، دەنـا ئەگەر لە بەر ڕەزایەتی خوداش بێ هەر بێ‌بەهرەیە. چونکە ئەو ماڵەی دەیکەیە خێـر و دەیبەخشـی، لە سـەر

ڕەزایەتـی خـودات وەدەسـت نەهێنـاوە، کەوابـێ ناشـتوانی و نـاکرێ لە بەر ڕەزایەتـی خـودا دەرخواردی بەندەگانی خودای دەی و چاوەڕوانی پاداشیش بی چـونکە مـاڵی وا ئـی تـۆ نیـیە تاکوو خێری لە سەر بکەی.

ئایەتی ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ چمان پێ دەڵێ؟ ئەوەمان پـێ دەڵـێ: ئەگەر بشـتواندرێ چاوی عالەم ببەسترێ چاوی خودا نابەسترێ، بـۆچی خـودا لە هەسـتی دەروونـت بـاخەبەرە، تەرازووی عەداڵەت و حەق و پاکەرەوەی هیچ شتێکی لە بەر قوتار نابێ، چۆن بووبێ ئاوات دەنوێنێ ئاوێنەی خودا.

بە کوردی و بە کورتی: بەرهەمی ئایەتەکانی ئینفاق ئەوە سابت دەکەن کە بۆ قبووڵ کردنـی خێر و چاکە دە ڕێگەی خودادا شەش شت پێویستە:

١. ماڵی حەڵاڵ

٢. ئینفاق مخالفی سوننەت نەبێ واتە ئیسـراف و زێدەڕەوی تێدا نەبێ

٣. بدرێ بە نیازی شەرعی، نەک بە زاڵم و نەک بە کافری شەڕێ، نەک بۆ ئارەقخۆر

٤. ئینفاقەکە بێ منەت بێ.

٥. ئەوەی دەیدەیەی بە چاویدا نەدەیەوە

٦. مەحزی ڕەزای خودا بێ.

**کورتەی ئەو دوو ئایەتی ٢٦٥ و ٢٦٦:**

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم بۆ پەند و ئامۆژگاری لە لایەکەوە وەک ئـایەتی ٢٦٥ و لە لایەکی دیکەشەوە بۆ مزگێنی وەک ئایەتی ٢٦٦ عەبدی خۆی خەبەردار دەکا دە ئایەتی ٢٦٥دا بۆ وانەی خاهانی ئیخلاسن دە بەخەشندەگیدا نموونەی نیشان دان. دە ئایەتی ٢٦٦دا بـۆ وانەی ڕیاکارن منەتکەران ئازەردەرن دە ئینفاقدا نموونە و مەسەلی نیشان دان. ئامـانجی خـودا دە دوو مەسەلاندا هەڵسەنگاندنی حاڵی دوو تاقمانە، و هەروا کەسێک خاوەنی هەست و بەرجەوەندی بێ، ئەوەش دەزانێ: نموونە هێنانەوەی ئایەتی ٢٦٦ تایبەتی ئاخرەت نییە، بەڵکە بۆ هەردوو دنیـا دەبێ دەرسی لێ وەربگیردرێ. واتە هەرچی بۆ خودای دابچێنی، پڕبەر و پڕسێبەرە، هەچـی بـۆ دنیا و تاغووت داچنێ، بێبەر و بێسێبەرە.

پاش ئەوەی کە لە مانا و مەبەستی ئایەتەکـانی ٢٦٤ و ٢٦٥ حـاڵی بـووین ئەوجـار دەچیـنە خزمەت ئایەتی ٢٦٦ کە دەوێدا ئەوانەی ڕیاکارن و منەتکەرن و ئازاردەرن دەناسـرێن کە کـار و

بەرهەمی کاریان چۆنە؟ میسال و نموونەی بۆ دێندرێتەوە:

﴿٢٦٦﴾ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ لَهُ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَأَصَابَهُ الْكِبَرُ وَلَهُ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَاء فَأَصَابَهَا إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَاحْتَرَقَتْ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ

**ئایا یەکێک لە ئێوە حەز دەکات باغێ لە خورما و لە ترێی هەبێ، چەندین ڕووباری بە ناودا تێپەڕێت و بڕوا، خاوەنەکەی هەموو چەشنە میوەیەکی لە باغەکەدا هەبێت پیری داوێنگیری بێت و کۆشێ منداڵی بێ دەستەڵاتیشی هەبێ، لەپڕدا گێژەڵووکەیەکی ئاگرین لە باغەکەی دا و بیسووتێنێ؟ بەو چەشنە خودا ئایەت و نیشانەکانی خۆتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەو هیوایە بە وردی و بە قووڵی بیر بکەنەوە.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٦٦:**

دەبێ ئەوە بزاندرێ کە ئەو ئایەتەش مەسەلەیەکی دیکەیە کە خودای تەعالا دەرحەق بەو کەسانەی کە ئینسانی لە سەر نەفەقە پێ دان ئەزیەت دەکەن و ئازاری دەدەن و منەتی لەسەر دەکەن، خودای تەعالا ئاوەی بۆ بەندەی خۆی هەڵدەسەنگێنێ: کە کابرایەک باغ و باغاتێکی گەش و جوان و پڕ لە بەر و میوەی تەڕ و تازە و جوانی هەیە. ئەو کابرا خاوەن باغە دە نیهایەتی لاوازی و بێ ماڵوحاڵیدا ماوەتەوە بە هۆی ئەوەی کە خاوەنی منداڵی زۆر و پێنەگەیشتووە، خاوەن باغ نیازی زیاتری هەیە بە بوون و دارایی، دیارە ئەو حاڵەتە خەم و دەرد و ئازاری زۆر لێ دەبارێ. جا ئەو خاوەن باغە لە کارکەوتووەی خاوەن منداڵ و خێزان، بەرەبەیانی کە زوو بۆ سەیری باغی هیوای ژیانی خۆی و منداڵەکانی دەچێ، لەناکاو باغەکەی بە سووتاوی و بە دامرکاوی دە ئاوردا چاو دەکا. دەکەوێتە بەر پەلاماری کام غەم و خەفەت و حەسرەتەوە. هەر خودا دەزانێ و بۆ خۆی دە کام ئاگری بەسۆز و تین و تاودا دەچۆقێ و دەسووتێ.

جا دروست بێ کەموکووڕی حاڵی ئەو کەسانەی خێر و حەسەنات و سەدەقە و ئینفاق دەدەن بە هیوای ڕۆژێکی بەهرەکەی وەرگرنەوە کام ڕۆژە؟ ئەو ڕۆژە کە نە ئەو چی لە دەس دێ و نە کەسیش دەتوانێ ئاوڕی وەسەر دا و یارمەتی بدا. یەک ناگا کە پەروەندەی ئەعمالی دەخرێتە حیساب و وەزن و کێشانەوە هیچی پێ نەماوە و سووتاوە بە ئاوری منەت و ئازار و خۆهەڵکێشان لە دنیادا. (تەفسیری ئیمام ڕازی، زۆرتر و وردتر دواوە لەو بارەوە کێ وازی لێیە.)

## عومەر و وەڵام

عمرو ابن لە بخاری = ابن‌عباس دەڵێ: ڕۆژێکی حەزرەتـی عـومەر لە یەکێـک لە یـارانی ڕەسووڵ (ئەسحاب) دەپرسێ: ئەتۆ لە بابەت ئەو ئایەتی ﴿أَيَـوَدُّ أَحَـدُكُمْ أَن تَكُـونَ لَهُ جَنَّـةٌ﴾ نەزەرت چۆنە؟ دەربارەی کێ و چیدا دابەزیوە؟

ئەسحابەکە کوتی: (الله اعلم).

حەزرەتی عومەر ناڕەحەت بوو لەو جوابە وفەرمووی: بڵـێ نـازانم. ئیبنی‌عەببـاس دەڵـێ: ئەمن کوتم یا ئەمیری موسوڵمانان ئەمن لەو بارەوە شتێکم دە زەیندا هەیە.

عومەر کوتی بیڵێ ئەی برام خۆت بە فەقیر مەزانە.

ئیبنی‌عەباس کوتی: ئەو ئایەتە مەسەلەیەکە بۆ جۆرە عەمەلێک.

عومەر کوتی: کامە عەمەلە؟

ئیبنی‌عەباس دەڵێ: کوتم جۆرە عەمەلێک!

حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئەو ئایەتە مەسەلەیە بۆ یەکێک خاوەن سـەروەت و سـامان کە تاعەتی خودا بەجێ دێنێ. پاشان شەیتان بە سەریدا زاڵ دەبێ و دێتە لای و هەڵـیـدەپێچێ بەرەو خراپەکاری هەچی ئاکار و کرداری چاکە کە هیوای ڕۆژی قیامەتی پـێن ئاگریـان تـێ بەردەدا و بە ڕووت و ڕەجـاڵی دەیهێڵێـتەوە.ئەو ئـاورەی کە چاکەکـانی ســووتاندوون ئەوە مــنەت و خۆهەڵکێشان و خۆبادانی خێرکەرانی ڕێگای فیز و پیز و شاییبەخۆییە نە ئی ڕێگـای خـودایە.
(صحیح بخاری، کتاب تفسیر، باب ٤٧، قول أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ. طبری)

ئینسان بە تەئکید دەبێ لە ئـایەتی ٢٦٥ دەرس وەرگـرێ و فێـر بـین کە ئیشـاڕە وەلای دوو شتان دەکا:

١. دەبێ لە هەرچی کاروبارە لە سەر ئەساسی بەنـدەگی داوای ڕەزایەتـی و سـەرکەوتن لە خودا بکرێ لە ژێر دروشمی (ان شاء الله)

٢. دەبێ دەروونی لە هەوا و هەوەس و سەرەڕۆیی و خودخاهی غـروور و خۆهەڵکێشـان پاک کرێتەوە.

بە کورتی و بە کوردی: بە سێ مەرج خودا بەخشینی ماڵ بە خێر لە بەندە وەردەگرێ:

١. حەڵاڵ بێ و بۆ خوداش ببەخشـرێ بەو کەسەی شایانی پێ بەخشینە.

٢. بەبێ ڕیایی بەبێ منەت بەبێ خۆ پێ هەڵکێشان لە دڵەوەڕا بێ

٣. بە چاوی کابرادا نەدرێتەوە.

تا ئێرە لە بابەت ئینفاق باسی دوو مەرجی کرا: یەک بـۆ خـودا، دوو بـێ ڕیـایی و ئـازار و منەت. ڕەنگە دە ئـایەتی ٢٦٧دا بتوانـدرێ مەرجـی سـێش وەدۆزرێ، جـا کەوایە دەبـێ بچیـنە خزمەت ئایەتی ٢٦٧

﴿٢٦٧﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّـا أَخْرَجْنَـا لَكُـم مِّـنَ الأَرْضِ وَلاَ تَيَمَّمُواْ الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِآخِذِيهِ إِلاَّ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ

**ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان هێناوە، بەخشش بکەن لەو ماڵ و سامانەی وا پاک و خاوێن کە لە ڕێگای حەڵاڵدا بە دەستو هێناوە، هەروەها لەو ناز و نیعمەتە خاوێنەی کە وا من لە زەویدا بۆم ڕواندوون، شتی خراپ لە ماڵتاندا نیاز مەکەن واتە لە بەر چاوی مەگرن بـۆ بەخشـین، کە هەر بۆ خۆشتان وەرناگرن، مەگەر چـاوی بـۆ وێکنـێن، جـا بشـزانن خـودا بێنیـازە و بێنیـازێکی شایانە.**

## داوای شتی خراپ مەکەن

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٦٧:

هەروەک زانـدراوە و دەزانـین دە ئایەتەکـانی پێشـدا واتە ئایەتەکـانی ٢٦٤ و ٢٦٥ و ٢٦٦ دەعوەت و بانگێشتنی ئینسان کرا بۆ بەخشینی ماڵ و دارایی بە چاک و پاکی دوور لە ڕیاکـاری و خۆهەڵکێشان و منەت و ئازار. ئەمـما دەو ئـایەتە ٢٦٧دا بەیـانی ئەوەی دەکـرێ کە چ جـۆرە ماڵێک دەبێ بکرێتە ئینفاق واتە بدرێتە بێنەوا و خاوەن نیازان و دەشـبێ وریـا و ئاگـاداری کـام خەتەرە بی نەیەتە سەر ڕێگای بەخشینەکەت.

هەچەن ئەو ئایەتە دابەزینەکەی گۆیا تایبەتی ماڵی زەکاتە، ئەمـما بە پێـی هەڵسـەنگاندن و بەراوەردێکی کە دەگەڵی کراوە بۆ هەموو چەشنە سەدەقەیەک دەبێ. (طبری، ج٣، ل٨٣)

وەک دەڵێن لە سەرەتای ئایینی ئیسلامدا ئەوە باو و عادەت بوو کە خاوەنی باغ و باغات و میوەجـات میـوە و خورمایـان دەهێنـا لە دەرگـای مزگەوتـی پێغەمـبەری لە نزیکـی سـەفەی کەشونیەکە، هەڵداوە سی تاک و فەقیر و فوقەراتی شایانی ئیستیفادە و بەهرەی لێ بکەن. گۆیـا ڕۆژێکی پێغەمـبەرﷺ بەوێـدا ڕادەبـرێ و بە وردی تەماشـایان دەکـا و دەبینـێ نیوەنیـوە دەگەڵ هێشووە جوان و خاوێنەکان هێشووی ڕزیو و پیسی دەپاڵ خراوە. کـاتێ پێغەمـبەرﷺ ئەوەی بە چاوی خۆی بینی فەرمووی، خودا بەشی خۆی ئی ڕزیو و ویشک و خرابووی ناوێ. هەروەک

بۆ ماڵ و منداڵەکان و ئی خاوێن و جوان دەگێڕنەوە لە ماڵێ و ئی وا خاوێن و جوانیش بۆ خودا بنێرنە مزگەوت. جا گۆیا ئەو ئایەتە دەوەیدا دابەزی بۆ پێغەمبەرﷺ.

لە بارەی ماڵی خاوێن و پاک کە لەفزی (طیب) دە بەر خۆی گرتووە دەبێ خاوەنی ٤ سیفەت بێ:

١. حەڵاڵ و بێ شوبهە

٢. دڵگر و بەئەرزش

٣. گومانی مافی خەڵکی لێ نەکرێ

٤. بدرێ بە موستەحەقان

ئایەتی ﴿وَلاَ تَيَمَّمُواْ الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ﴾ دەگەڵ ئەو جێگایەتی خاوەن میوەکان ئی ڕزیو و ویشکبوویان ڕەگەڵ خاوێنەکە دەخست و دەیانبردە دەرگای مزگەوت. دیارە ئینسانی خاوەن نیازیش بە زۆری دەڕوانێتە ڕەفعی نیازی، کەم وا هەیە ئاوڕ داتەوە پاک و ناپاک و لایق و شایانی میوەکە و شتەکە. جا ئەدێرەدایە ئایەتی ٩٢ی ئالیعیمران دەمانـدوێنێ و ئاگادارمان دەکاتەوە: ﴿لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فَإِنَّ اللّهَ بِهِ عَلِيمٌ﴾ ناگەن بە **چاکەی تەواو (ئەی خاوەن ئیمانەکان) تاکوو لەو ماڵ و دارایییەی کەوا خۆشتان دەوێ بەخششی لێ نەکەن، و هەرچی بیشیبەخشن خودا ئاگای لێییەتی و دەزانێ.**

ئەو ئایەتە پیرۆزە ئەوەمان پێ دەڵێ: چۆنی بپێوی بۆ عالەم، خودای عالەم ئاوات بۆ دەپێوێ و چۆن لە عالەم بڕوانی، خودای عالەم ئاوات لێ دەڕوانێ و چۆن لە ئایین و دینت بڕوانی، خودای خاوەنی ئایین ئاوات لێ دەڕوانێ و ئاوات دەبینێ.

دەناو دەروونی ئایەتی ٢٦٧ قورئانزانەکان و خاوەن هەستەکان ئەو هەستەیان لێ کردووە: ئینفاق دە ڕێگەی خودادا بە بەندەگانی فەقیری خودا دەبێ خاڵی لە تەوهین و سووکایەتی بێ. واتە شتی نالایق و نالەبار و بێئەرزش بدرێ بە فەقیران بە عینوانی زەکات یا سەدەقات یا ئیحسان. دەیارە ئەو فەقیرە لە بەر تەنگەتاوی خۆی وێ ناپەرژێ بڵێ ئەوەم ناوێ چونکە ئەو دەیهەوێ. نیازەکەی بەرتەرەف بێ، بەڵام ئەوەی ئەو خێرەی داناوە و دەزانێ و هەڵیسەنگاندوە کە ئەو فەقیرە هەچی بیدەیەی دەیهەوێ ئەمما خێرکەر دیارە نازانێ خودا تەنگەتاو نییە و نیازیشی نییە شتی پیسی تۆی ناوێ. و یا چۆن لە عەبدە فەقیرە دەڕوانی بە چاوی کەم، هەر ئاواش لە خودا دەڕوانی؟ جا خۆت هەڵگرە بۆ ڕۆژی حیسابی، بێگومان چۆنت لە خودا و

بەندەی فەقیری خودا ڕوانیبێت، هەر ئاوات لێ دەڕواندرێ.

ئەوە بێ‌گومانە کاتێ کە هەژارێک و داماوێک چ ئینسان بێ چ حەیوان بێ، چاو دەکرێ هەستی بەزە هەڵدەستێ دەڕوانێ بۆ وەی بزانێ دەتوانێ چاری ئەو بێچارەیە بکا؟ دەو کاتە ناسک و هەستیارەدا دوودەنگ بانگی دەکەن یەکیان دەڵێ: هەستە ڕۆژی هیممەت و غیرەت و ئازایەتییە، ئەو ڕۆژە هەموو ڕۆژی بۆت بێتە پێش و ڕووت تێکا. جا دێت و هەستێ و بڕوا بە هاوارەوە دە ڕێیەدا دەنگەکەی دیکە پێشی پێ دەگرێ و دەڵێ: ئەوە بۆچی وا بە گورج‌وگۆڵی دەڕۆی؟ خەیاڵی چت دە دڵدایە؟ ئەویش دەڵێ دەمهەوێ بگەم بە هاوار و هیمدادی ئەو لێقەوماوە و داماوە. بەڵکەم بتوانم لانی‌کەم کەمێکی چارەی دەردی کەم. ئەو دەنگەش ڕاست دەڵێ ڕاست دەکەی کارەکەشت زۆر بەرز و مرۆڤانەیە. ئەمما کاری گەورەتر لەوەت دە پێشدایە، ئەویش ئەوەیە وا نەکەی ماڵەکەت لێرە و لەوێ خەرج کەی، پاشەڕۆژ کە تۆ مردی منداڵەکانی تۆش ئاوایان لێ بەسەر بێ. ئەدێرەدا باسی منداڵەکان ئەسەر دادەنێتە سەر دڵی و پەشیمان دەبێتەوە لە بە هاوار وەچوونەکە.

دیارە دەنگی هەوەڵ دەنگی خودایە هەڵت‌دەستێنێ بەڵام دەنگی دووهەم دەنگی شەیتانە پێشت پێ دەگرێ و پەشیمانت دەکاتەوە. ئەوەش هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو جێگەیە کە دڵی بە ئیمان و باوەڕ تونـدوتۆڵ نەکرێ زوو لە دەستت دەچێ و دەدۆڕێ لە هەموو کار و دەرگیری دنیادا ئەمما دڵی پڕ لە هیوا و ئومید و باوەڕی نە شەیتان توانایی ئەوەی هەیە پێشی پێ بگرێ نە دەشدۆڕێ. بۆ ڕاستی ئەو بابەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٦٨ی بەقەرە:

﴿٢٦٨﴾ **الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاء وَاللّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلاً وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ**

**شەیتان دەتانترسێنێ بە هەژاری، و هەروا فەرمانی خراپە کردنتان پێ دەدات بەڵام خودا لە لایەن خۆیەوە موژدەی لێبوردن و پاداشی گەورەو پێ دەدات خوداش خاوەنی بەخششی زۆر و بەرفراوانە و زۆریش زانایە.**

## وەعدەی شەیتان فەقیرییە

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٦٨:**

لاوازی باوەڕ و ئیمان دەبێتە خەیاڵاتێکی بێ ورە و بێ هێز بە ناوی شەیتان دەت‌ترسێنێ لە

پاشەڕۆژێکی نادیار، پێت دەڵێ: ئەو ماڵ و دارایيەی هەتە بێر و بەوێدا بە ناوی خێر و ئیحسان مەیبەخشە، چونکە نەدار دەبی و وردەوردەش بەرەو پیری و لاوازی دەچی، ئەودەم کەس نابێ وەتگرێ و بەخێوت کا، خەیاڵاتی شەیتانی وای بە سەر دێنێ خودای لە بیر دەباتەوە کە ڕازقە و لە بیریشی دەباتەوە کە مردنی لە ناکاو دێ و دە فریای هیچ ناکەوێت. ئەوە لەو لایەوە لە بابەت خێر و حەسەنات خەیاڵاتی شەیتانی ئاوا دەڵێ بە ئینسانی، و لەو لایەشەوە بۆ وەسەر پەڕینی کاری ناڕەوا و خراپ و نالایق پێی دەڵێ: خۆشی دنیا ئەوەیە بێ دڵی خۆت و ئارەزووی نەفس و هەوات نەکەی، هەچی ئیشتیات لێ بوو بیکە، پاشەڕۆژ خودا نیازی بەسووتان و عەزابی تۆ نییە، ئەوانەی لە دنیادا بە گوێت دەگا هەر هەڕەشەیە و دێ و دەڕوا. ئەوەی لە بیر دەباتەوە خودا بێ باکە و حەقی بزنی کۆڵە و بێشاخ لە بزنی شاخدار دەستێنێتەوە. بە پێی عەداڵەتی نابێ کەس لە مافی بکرێ و مافی بخورێ، بە کوردی ئینسانی لاواز و شلک و کاڵی ئیمان خەڵفی شلک و ساوا و دەستی هەوا و هەوەسی شەیتانییە چۆنی بادا و خواری کا وا دێت و دەچێ. دەبێتە گۆچانیش دەبێتە وەکازیش و دەکرێتە دەسکەپاچیش و دەسکە تەشوێش. شەیتان واتە ئارەزووی هەوا چۆنی بوێ وای لێ دەکا.

دەربارەی ئەو شەیتانەی قورئان ناوی دەبا زانایانی قورئان ڕا و نەزەری جۆراوجۆریان زۆر داوە، مەسەلەن هەندێک کوتوویانە ئەو شەیتانە ئیبلیسە، هەندێک کوتوویانە شەیتانێکە جیا لە ئیبلیس. هەندێکیش کوتوویانە شەیاتینی ئینسان و پەرین، سەرەنجام پاش مشتومڕێکی زۆر هاتوونە سەر ئەو بڕوایە: ئەو شەیتانەی کە ئینسان دەترسێنێ و ئینسان هان دەدا بۆ کاری خراپ نەفسی ئەممارەیە، واتە ئەو نەفس و هەوای دەستوورت پێ دەدا بۆ لای کاری ناڕەوا و خراپ.

## مەعناکانی لۆغەتی (وعد)

لۆغەتی (وعد) بۆ خێریش و بۆ شەڕیش بە کار دەبرێ وەک دە قورئانێدا هەر دوو لای هاتووە، بۆ شەڕێ وەک دە ئایەتی ٧٢ی حەجدا چاو دەکرێ: ﴿النَّارُ وَعَدَهَا اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ ئاگرێک کە وا خودا بەڵێنی داوە بۆ بێباوەڕان.

(وعد) بۆ خێر وەک ئایەتی ٢٠ فەتح: ﴿وَعَدَكُمُ اللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا﴾ خودا بەڵێنی دەسکەوتێکی زۆریشی دانێ کە وەریدەگرن.

وهەروا (وعد) دە مەقامی ئیهانەشدا دە کار کراوە وەک دە ئایەتی ٢١ی ئالیعیمراندا چاو دەکرێ: ﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ مزگێنییان پێ بدەن بە عەزابی تیژ و ئێشدار.

ئایەتی ﴿وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاء﴾ چەن نەزەر لە سەر لۆغەتی (فحشاء) هەیە و دەربڕاوە، هەندێک دەڵێن: بەخیلییە، هەندێک دەڵێن واتە ئینفاق مەکە و مەدە. گۆیا پێغەمبەر فەرموویەتی: (إنَّ المَلَكَ یُنادي كلَّ لیلةٍ: اللهُمَّ أعطِ كُلَّ مُنفِقٍ خَلَفاً و كلَّ مُمسِكٍ تَلَفاً) واتە فرشتەی خودا هەموو ڕۆژێ جاڕ دەدەن و دەڵێن: خودایا پاداشی دەوە بەوانەی ئینفاق دەکەن واتە بەخشش دەدەن و بە فیڕۆ بدە و بەرە ماڵی ئەوانەی داگیریان کردووە و بەشی کەسی لێ نادەن.

ئەو ئایەتی ٢٦٨ ڕازێکی نەخشینی دە ژێرەوەیدا ترووسکە دەدا و دەڵێ: شەیتان وەعدەی هەژاری ڕۆژی نەهاتووت دەداتێ، خوداش وەعدەی لێبوردنی ڕۆژی داهاتووت دەداتێ. جا ئەی ئینسانی خاوەن هەست بە کامیان بەقا دەکەی؟ و کامیان لە خودا و لە شەیتان ڕاستترن دە وەعدە و بەڵێنیدا؟ جا ئەتۆ کامیان هەڵدەگری؟ و ئەتۆ پێتوایە کامیان هەڵگری بە قازانجتە؟

با ئەمن پێش ئەوەی ساغ بینەوە بۆ هەڵگرتنی لایەک، با پێت بڵێم و ڕێنومایییەکت بکەم:

١. هاتنی سبحەینەی کە شەیتان کوتوویەتی تێدا هەژار دەبی، لەوانەیە نەیە.

٢. ئەمما هاتنی ئەو ڕۆژەی کە خودا وەعدەی داوە تاوانەکەت تێدا دەبەخشێ یەقینە دێ.

٣. ئەو ماڵەی کە بە قسەی شەیتان لە ترسی فەقیری سبحەینێ نایبەخشی ئیمکانی ئەوەی هەیە وەمێنێ و ئیمکانیشی هەیە نەمێنێ و ئیمکانی ئەوەش هەیە لێی بخۆی و یا لێی نەخۆی.

٤. ئەو ڕۆژەی خودا وەعدەی پێ داوی یەقینە دێ و لێخۆشبوونت یەقینە.

٥. ماڵی دنیا و لەززەتی دنیا بێ گومانە بەڵای فەوتانی وا هەیە بە سەردا بێ یا نەیە.

٦. ئەمما دەسمایە و سەرمایەی قیامەت بەڵا و ئافەتی فەوتانی نییە و نابێ.

هەرکەس سرنج داتێ و ورد ورد بچێتە پێشێ لە هەڵسەنگاندن و بەراوردی ئەو جەریاناتە، بێگومان بەو نەتیجە و بەرهەمە دەگا پاڵدانەوە بە پاڵوپشتی خودا چاتر و قایموقۆڵترە لە پاڵدانەوە بە شەیتان.

دەشبێ بڵێین مەبەستی خودا لە (مغفرة منه) داپۆشینی گوناهانە لە ڕۆژی ئاخرەتا بە دەلیلی ئایەتی ١٠٣ی تەوبە: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِيهِم بِهَا﴾ لە ماڵ و سامانیان سەدەقە و خێر وەرگرە تاکوو بە هۆی ئەوەوە پاک و خاوێنیان بکەیتەوە. دیارە بە دابی عیلمی نەحو، لەفزی (مغفرة) چونکە نەکەرەیە، واتە دیاری نەکراوە، لێخۆشبوونەکە چەندەیە هەموو لێخۆشبوونێکە و هەروا لەفزی (منه) ئاماژەیە وەلای لێخۆشبوونی کامڵ.

پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (لَوْ لا أنَّ الشیاطینَ یُوحُونَ الی قُلوبِ بَنيآدمَ لَنَظَروا الی

مَلَكوتِ السَّماواتِ) واتە ئەگەر شەیتان وەسوەسەی دانەچاندبایە دڵی ئەولادانـی ئـادەم، بەرەی ئادەم دەچوونە ئاسمان و لەوییان دەڕوانی.

دیارە دە ئایەتی ٢٦٨دا ئاماژە وەلای فەزڵی خودا کرا چونکە وەعدەی شـەیتان بە هەژاری و نەداری بوو، وەعدەی خوداش بە لێخۆشبوون و فەزڵی خودا بـوو، ئینجـا دڵ دەیـهەوێ بزانـێ فەزڵی خودا چییە؟ جا بۆ لێحاڵیبوون لە فەزڵی خودا دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٢٦٩:

﴿٢٦٩﴾ يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاء وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُواْ الأَلْبَابِ

**کـارجوانی و کـاربەجێیی دەبەخشـێ و دەدا بەو کەسـەی کە خـۆی وازی لـێ بـێ، دیـارە هەر کەسێکیش کارزان و کاربەجێیی پێ درابێ ئەوە خێروبێری زۆری پێ دراوە جـگە لە خـاوەنی هەست و بیر کەس پەند وەرناگرێ (چونکە نایزانێ و حاڵی نییە)**

## دەعوەتی حەکیمانە

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٦٩:

پێش هەموو شتێک پێویستە بزاندرێ (حكمة) مانای چییە و چییە دەدرێ بە ئینسـان چـاتر بێ لە ئەقڵ؟ نەقڵ کراوە لە یەکێک لە قورئانزانەکـان بە نێـوی (مقاتـل) کە مانـای (حكمـة) دە قورئاندا بە چوار جۆر تەعبیر کراوە:

١. حیکمەت واتە ئاگاداری و ئیرشاد (وەعز) بە دەلیلی ئـایەتی ٢٣١ی بەقەرە: ﴿وَمَا أَنزَلَ عَلَيْكُمْ مِّنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِ﴾ **ئەوەش کە ناردوویەتە خوارەوە بۆتان (وەک قورئـان بـێ) کە بە مانە ئامۆژگاریتان بۆ دەکات.** واتە مەوعیزەی قورئانو بۆ دەکا.

هەروەها دە ئایەتی ١١٣ نیسائدا حیکمەت بە مانای وەعز و ئیرشـادە: ﴿وَأَنزَلَ اللّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ **خودا قورئان و کاربەجێیی پێ بەخشیوی.**

دووبارە هەروا دە سوورەی ئالیعیمرانیشدا ئایەتی ٤٨ حیکمەت هاتووە بە مانـای وەعـز و ئیرشاد: ﴿وَيُعَلِّمُهُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ﴾ **فێـری کتێـب و کـاربەجێیی و تەورات و ئینجلی دەکات.**

٢. دووهەم جۆر لەو چوار جۆرانەی کە لە لەفـزی حـیکمەت تەعبیـر دراوەتەوە ئەوەیە کە حیکمەت بە مانای (فەهم و زانست) هاتووە، وەک دە ئایەتی ١٢ی سوورەی مەریەمدا ئیشارەی

وەلا کراوە: ﴿يَا يَحْيَى خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيًّا﴾ ئەی یەحیا! ئەئەو کتێبە بەوپەڕی توندی و گرنگییەوە بگرە، هەر لە کاتی منداڵیشدا کارامەیی و تێگەیشتن و کاربەجێیمان پێ بەخشی.

و هەروا دە ئایەتی ١٢ لوقمانیشدا لەفزی حیکمەت بە مانای (عیلم و زانست) هاتووە: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا لُقْمَانَ الْحِكْمَةَ أَنِ اشْكُرْ لِلَّهِ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ بەڕاستی کارزانییمان دایە لوقمان کە شوکرانەبژێری خودا بە، هەرکەسیش شوکرانەبژێر بێ، ئەوە بۆ خۆیەتی، هەرکەسیش سپڵە و ناشکور بێ، خودا بێ‌نیاز و سپاس‌کراوە.

و هەروا دە ئایەتی ٨٩ی سووڕەی ئەنعامدا دووبارە لەفزی حیکمەت بە مانای عیلم و فەهم هاتووە: ﴿أُولَـٰئِكَ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ﴾ ئائەوانە ئەو کەسانەن کە کتێب و کارجوانی و کاربەجێی و پێغەمبەرایەتیمان خەڵات کردن.

٣. سێهەمین جێ لەو چوار جێگایانەی کە تەعبیر لە لەفزی حیکمەت دراوەتەوە ئەدێرەدا ئەوجار حیکمەت بە مانای (نبوەت) تەعبیر کراوەتەوە وەک دە ئایەتی ٥٤ی نیساءدا: ﴿فَقَدْ آتَيْنَا آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكًا عَظِيمًا﴾ بێ‌گومان ئێمە کتێب و پێغەمبەرایەتی و دەستەڵاتێکی گەورەمان بە تۆرەمەی ئیبراهیم بەخشی.

و هەروا دە ئایەتی ٢٠ی سووڕەی (ص) حیکمەت بە مانای نبوەت تەعبیر کراوە: ﴿وَشَدَدْنَا مُلْكَهُ وَآتَيْنَاهُ الْحِكْمَةَ وَفَصْلَ الْخِطَابِ﴾ فەرمانڕەوایەکەشمان بۆ قایم‌وقۆڵ کرد، و کارجوانی و جێ‌بەجێیی و قسە ڕەوانی و چارەکردنی کێشەمان پێ بەخشی.

و هەروا دووبارە لەفزی حیکمەت دە ئایەتی ٢٥١ی بەقەرەدا بە مانای نبوەت هاتووە: ﴿وَقَتَلَ دَاوُدُ جَالُوتَ وَآتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ﴾ داوود دەوێدا جالووتی کوشت خوداش پاشایەتی و کاربەجێیی پێ دا.

٤. چوارەمین جێ لەو چوار جۆرانەی کە بۆ تەعبیر دانەوە لە لەفزی حیکمەت ئەوەیە کە تەعبیر لە لەفزی حیکمەت بە قورئان دراوەتەوە بەو هۆیە کە قورئان چاوەی ڕاز و ڕەمز و ئەسرارە وەک دە ئایەتی ١٢٥ی نەحل‌دا هاتووە: ﴿ادْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ﴾ بانگەشە بکە بۆ ڕێبازی خودات بە لێزانی و کاربەجێیی و پەند و ئامۆژگاری جوان.

سەراپای ئەو مانا و تەعبیراتانەی کە لە لەفزی حیکمەت درانەوە و ڕاستیش بوون دەگەڕێتەوە بۆ لای زانست و تێگەیشتن بە شەرتێ زانست دەکار کرێ، کەوابێ دەبێ بکوترێ: ئەی بێ دەستڵات لە زانیاریدا! چۆناوچۆن داوای دەستەڵاتداری دنیا دەکەی؟ و چۆناوچۆن

داوای خەلافەت و سەرداری عالەم دەکەی؟ دە بڕوانە ورد و هەستیارانە لە ئایەتی ٨٥ی سوورەی ئیسراء جا پاشان وەرە سەیری یاغیگەری ئینسانی بەو کەمە زانستەشی داوای خودایەتیش دەکا پێغەمبەرایەتی و خەلافەتەشی تێپەڕاندووە: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ لە ڕوح پرسیارت لێ دەکەن، بڵێ: ڕوح لە نهێنییەکانی خودایە (واتە لە جوغزی زانستی بە دەرە) چونکە خودا زانست و زانیارییەکی کەم نەبێ نەیداوەتە ئێوە (واتە ئێوەی ئینسان)

بۆ وەی دەبێ ئەقڵ واق بمێنێ کە دنیا بە هەرچی تێدایە و ئاسمانیش بە هەرچی دە ناویدایە ئاخری پێ دێ دەگەنە ئاخرین قۆناغیان کە فەنایە، ئەمما عیلم و زانستی بێ سەر و بن کە هەرگیز دوایی پێ نایە عیلمی و زانستی خودایە. وێستا ئینسان بەو کەمە زانستەی غروورانە سەر دەپێچێ و لایدەدا لە فەرمانی ئەو خاوەن عیلمە بێ سەر و بنە.

باسی ڕوح هاتە گۆڕێ و خوداش فەرمووی لە ڕاست ڕوح مەیەن و مەدوێن، چونکە بەو تۆزە زانستەی دراوتانەتێ ناتوانن و ناگەن بەوەی لە ڕوح بدوێن، ئەمما ئەمن بە دڵی بزۆزم نەوێستام و نەوێرام بە گازەگازێکەوە بە دەورەی ڕوحدا خولی دا و هەڵسووڕا تا بە شل‌وکوتی کەوت بە لادا و ئیقراری کرد کە بەڵێ تێی‌ناگەم. ئەوەش زەمزەمەی ڕوح و ئەوەش ئێوە:

## زەمزەمەی ڕۆح

ڕۆژ و شەو فکر و خەیاڵ و ئەقڵی هاڵۆزم دەڵێ
ڕاز و ڕەمزی هات و چوونم بۆ دەبێ کەس پێم نەڵێ
پێم دەڵێن هاتووی لە کوێڕا ڕووت دەوێیە یەکسەرە
سەر دەمێنێ سوور لە سەیری ڕازی ئەو بێنە و بەرە
خۆ دەزانم ڕوح لە دنیای عالەمی خاکی نییە
لێم تەلەسمە بۆ دەما دەو لاشەیی خاکینییە
زەمزەمەی ڕوحە و دەناڵێ وەک مەلی ژووری قەفەس
تاکوو دێ دەفڕێتەوە کۆگەی هەوەڵ کۆگەی نەفەس
سەیرە بۆ لای تاڵە ئەو ڕۆژەی بەرەو خۆی دێتەوە
نابەڵەد نازانێ لەو بادانەوە هۆی دێتەوە
زۆر لە زانایان لە ڕاوی ئەو مەلە کەوتوو ڕاو
تێگەیشتوون تێگەیشتن دوورە بۆ مەی خاو و لاو

ئەی عەجەب لەو ڕاز و ڕەمـــزی ئەقـــڵ و عـــیلم و بیـــربەزێن
چـــوونە میـــوانی خـــودا چەن ســـەختە گیـــان و دڵتەزێـــن
کـــێ لە میـــوانی کەریـــمان بـــێ کەڕەم دەکێشـــتەوە؟
دڵ لە خـــۆراکی بەهەشـــتی بێـــز دەکـــا و دەکشـــێتەوە؟
هەســتی کەم بەخشــی بە ئینســان خــوا لە ســەر وەی شــاهیدە
لەو دەراوە دوورە زانـــا بـــازی ناگـــا بـــازی دا؟!
پـــێم دەڵـــێن ڕازی فڕینـــی ئەو مەلـــی مـــاهیر و ژیـــر
بـــۆ لەشـــی خـــاکی ڕەشـــی تاریـــک و بـــۆگەن چەشـــنی قیـــر
ئاشـــــنا و ناســـــینی زاتـــــی بێنیـــــازی پێـــــوەیە
بـــــێ نیـــــازە ئەو لە هەرچێکـــــی نیـــــازی لێـــــوەیە
لـــــێم یەقیـــــنە بـــــێ نیـــــازە ئەو نیـــــازی کەس نیـــــیە
چـــــی نیـــــازە بەو نیـــــازە بـــــێ نیـــــازی لەو نیـــــیە
زۆر عەجەب ناســـینی ئەو لەو ســـەنگەرەیڕا ســـەر گـــرێ؟
ســەنگەرێکی خــاک و خــۆڵ بــێ، شــەمعی وی لــێ هەڵکــرێ
ڕوح لە خــۆتە ڕەببەنــا، خــۆ خــۆ نەناســێ چــۆن دەبــێ؟
ڕوحـــی ئەقـــڵە تـــۆ دەناســـێ، وا نەبـــێ جـــا چـــۆن دەبـــێ؟
ئەقـــــڵە ســـــەرگەردانە نـــــازانێ لە کـــــێ داوا دەکەی؟
تـــــاکوو بتناســـــێ و بزانـــــێ چـــــی لەوی داوا دەکەی؟
گەر لە ڕوحە، ڕوح لە خـــۆتە، خـــۆت لە خـــۆت داوا دەکەی؟
گەر لە خــاکی بــێ، شــعوور و هەســتە چــی لەوی داوا دەکەی؟
وێـــــدەچێ داوا لە ئەقڵـــــی بـــــێ، لە نەزمـــــێ لانەدا
نـــــووری ئەقـــــڵە گەر شـــــەبەق دا دڵ لە بەزمـــــێ لادەدا
ئەقـــــڵە دەتناســـــێتەوە ڕۆژی ئەزەل پەیمانـــــی بەســـــت
تۆی موڕەببی و ڕوونـکەری بـۆ تیشـکی ئەقـڵ و نـووری هەسـت
چــاوی چــاوەی نــووری ئەقڵــی ئەی تررووســکەی چــاوەکەم
ئەقـــڵ و نـــوور بـــارانی کە ئەقڵـــم ببیـــنم چـــاوەکەم
پـــڕ لە ئەســـرار و ســـوڕە ئەو ڕاز و ڕەمـــزە ئەی عـــومەر
گێـــژە لەو گێـــژاوەیە گێـــژان دەدا ســـەد بـــاهونەر

**حیکمەت**

بەڵێ حـیکمەت واتە کـاری دروسـت و جـوان و شـایان دە جێـی خۆیـدا و بە ئەنـدازەی توانایی. بۆ پشت ڕاست کردنەوەی ئەو قسەیە کە حیکمەت بە واتەی (تَخَلُّق بە ئەخلاقی خودا) واتە ڕەوشت بە ڕەوشتی خودا، دەڕوانینە ئەو فەرموودەی پێغەمبەر: (تَخَلَّق بِأخلاقِ اللهِ تعـالی) واتە دە بەرخورد و ڕەفتار و هەڵس‌وکەوت دەگەڵ جامعە وەک خودا بن: عەفو، بەزە، بەخشین، سەخاوەت، سەبر ...

لە سەر ئەو ئەساسە کەماڵی ئینسان دەکەوێتە دوو شت واتە لە دوو شت پێک دێ:

١. خوداناسی بەڕاستی واتە ئیتاعە بە تەواوی و بەڕاستی، نە بە درۆ

٢. عەمەل بە دروستی

جا دەتوانم بڵێم ئەدێرەدایە هـۆی ئەوەی کە حەزرەتـی ئیبراهـیم فەرمـووی: ﴿رَبِّ هَـبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾ (شعراء: ٨٣) **ئەی پەروەردگـارم! فێـری کـاربەجێیی و کـارزانینم کە، بمـبەرە ڕیزی چاکەکارانەوە.**

پاش ئەوەی کە لە چوار ماناکانی حیکمەت حاڵی کراین کە بەرهەمی هەر چواریان عیلم و زانست دەگـرێتەوە، کەوایە بە پێویسـت دەزانـدرێ سـووکەئاوڕێک وەلای عـیلم واتە زانسـت وەدرێ:

عیلم: خاوەنی تەفسیری کەششاف فەرموویەتی مانای ئەو ئـایەتە ﴿وَمَـن يُـؤْتَ الْحِكمَـةَ﴾ واتە هەرکەس خودا عیلم و زانستی دایە. دیارە دەبێ ئەو زانستە زەروور بێ، و ئەو زانستەش بۆ غەیرە ئینسانیش دەس دەدا. وەکوو حەیوانات و دێوانە و منداڵ و ... دەشـبێ بچیـنە سـەر ئەو باوەڕەش کە کردەی ئینسان واتە فیعل، بەندە مەخلووقی خودایە، واتە لە لایەن خوداوەیە.

## جورجانی و عیلم و زانست

جورجانی فەرموویەتی عیلم و زانست دوو جۆرە، واتە دوو بەشە: قەدیم و پەیدا بـوو واتە (حادث). عیلمی قەدیم بریتییە لە عیلمێک ڕاوەسـتاو بە زاتـی پـاکی خـودای بێهاوتـا، دیـارە زانستی خودا وەک بەندەکانی خودا ناچێ پەیدا بـوو لە نەبـووڕا، زانسـتی خـودا دەگەڵ زاتـی خودایە، بێ هەوەڵە و بێ دواییە، ئەمما زانستی پەیدابوو، خاوەنی هەوەڵ و ئـاخرە، وەک سـێ بەش بێ وایە: بەدیهی، زەرووری، ئیستدلالی.

١. عیلمی بەدیهی: زانستی بەدیهی زانستێکە ئینسان بۆ دەکار کردنی نیـازی بە بەرکـوت و

پێشواز هەیە، وەک ئینسان زانستی بەسەر نەفسی خۆیدا بێ. واتە ئاشکرایە و دەلیلی ناوێ ئینسانی بۆ ناسینی خۆی، وەیا وەک زانست لە سەر ئەوەی: یەک چکۆڵەترە لە دوو و سێ و چوار ... ئەو چەشنە زانستە پێی دەکوترێ عیلمی بەدیهی: زانستی ئاشکرا.

٢. عیلمی زەرووری: زانستی زەروریش زانستێکە کە هیچ نیازی بە پێشواز نییە، وەک ئەو زانستانەی کە بەو پێنج دەزگا سرشتیانەی لەش دێنە دی و سابت دەبێ. پێنج دەزگاکان: چاو، گوێ، زمان، لووت، پێستی لەش. دیتن، بیستن، شیرنی و تاڵی بوون، زبر و نەرم. زانست بە سەر ئەوانەدا بەو پێنج دەزگایە هیچ نیازێک ناخوازرێ بۆ زانستەکە، زمان بێ وەی تەعلیم بدرێ شەکر و خوێ لێک دەکاتەوە.

٣. زانستی ئیستدلالی: زانستێکە نیازی هەیە بە پێشواز، وەک ئەوەی بتەوێ بزانی ئەو کائیناتە بێ ڕانەر و بێ دانەر نەهاتۆتە دی، بەو نەزمە ڕێکوپێکە جوانە. یا بتەوێ بزانی و سابتی کەی کە هەچی هاتووە و پەیدا بووە، دەشبێ بڕوا و نەمێنێ.



تا ئێرە بە هۆی ئایەتەکانی بابەتی نەفەقە باسی دارایی بەخت کردن بە تەواوی حاڵی بووین، و ئەوەشمان زانی بەخت کردنی ماڵ و سامان چ دە ڕێگای خودادا بێ چ دە ڕێگای شەیتاندا بێ، بێ پاداش و تۆڵە نابن، چاک و پاک بە چاک و پاک، ناچاک و ناپاک بە ناچاک و ناپاک. واتە مست بە مست وڵامی دەدرێتەوە، ئەمما ماچ بە حەوسەت ماچیش پاداش دەدرێتەوە و ئەو وەعدەش درایە خاوەن باوەڕان، پاداشی ڕۆژی ئاخرەتیان بێگومان لە لایەن خوداوە دەدرێتەوە. بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٧٠ی بەقەرە:

﴿٢٧٠﴾ وَمَا أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ

هەر ماڵێکتان بەخشییێت یا خود هەر نەزرێکتان کردبێت هیچ گومانی تێدا نییە کە خودا دەیزانێت، ستەمکارانیش هیچ یارمەتیدەرێکیان نییە.

## بێ چەرمەسەرە زاڵم قوتاری نابێ

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٧٠:

دیارە خودا دەماندوێنێ و تێماندەگەیێنێ لە بارەی ئەو ماڵانەی دەیانبەخشین بە خێر بە عالەمێ. دەفەرموێ: ئەو سامانەی خەرجی دەکەن یا دە چاکەدا یا دە خراپەدا، بە ئاشکرایی یا بە نهێنی، بە چاک و پاکی یا بە خراپی و بە ناپاکی، منەت و ئازاری لەسەر بکرێ یا نەکرێ، و یا

ئەو نەزرانەی لە خۆی دەگرن، خـودا بە هەموویـان ئاگـادارە و دەزانـێ، پاداشیشـیان دەداتەوە. چاک بە چاک، ناچاک بە ناچاک.

دێرەدا لە بابەت نەزرەوە دوو جۆرە نەزەر دێـتە ڕوو: یەکیـان دەبـێ بچێـتە سـەر و ئەنجـام بدرێ، وەک ئەوە کە بڵێی: خودا لەو بەڵایەم بپارێزێ ئەوەندەی بدەمە هەژاران، ئەوە دەبێ کاتێ ڕزگار بووی، دەبێ نەزرەکە بدەی، دەنا قەرزدار دەبی. ئەوی دی ئەگەر بکوترێ: ئەگەر هـاتوو دەگەڵ فڵان کەس ئاشت بوومەوە و دواندم نەزر بێ لە سەرم ئەو خێرە بکەم. ئەوە دەبێ ئاشت بیەوە واتە بیشکێنە قسەکەت و ئاشت بەوە. لە بات خێرە نەزرەکەی لە خـۆت گرتـووە خێـرەکە بکە.

دێرەدا کە خودا ئیشارە وەلای ئەوەی دەکا دەفەرموێ چاک وایە خێر و حەسەنات و ئینفاق لە چاترین و پاکترین شتدا بێ، دێینەوە یـادی ئەوەی کە فەرمـووی: ﴿وَلاَ تَيَمَّمُواْ الْخَبِيثَ﴾ و هەروا کە فەرمـووی: ﴿الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ﴾ و هەروا کە دەکەویـنە بیـری زۆر لەو شـتانەی بەرەنگارن دەبـن دەو ڕێگـایەدا بـۆ پـووچەڵکردنەوەی چاکەکانمـان وەکـوو مـنەت و ئـازار و خۆهەڵکێشان و ڕیاکاری.

ئایەتی ﴿فَإِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُهُ﴾ واتە خودا ئاگـاداری نەفەقە و نەزرەکانتـان هەیە و دەزانـێ. ئەدەو ئاگـاداریەی خـودادا مزگێنـی زۆر گەورەی تێـدایە بـۆ وانەی نەفەقە و نەزرەکەیـان بە چـاک و ئیخلاسەوە دەکەن دوور لە منەت و ئەزیەت و هەڕەشەی گەورەشـی لـێ هەسـت دەکـرێ بـۆ وانەی نەفەقە و نەزریان بە منەت و ئازارەوە دەکەن. بەو دەلیلانەڕا ئەو مزگێنی و ئەو هەڕەشـانە هەسـت پـێ دەکـرێن: خـودا ئاگـادارە بە سـەر دەروون و نیەتـی خێرکەرانـی نەزر و نەفەقە لە ئیخلاس و عەبدایەتیەکان ئاگادارە، جا لە ڕووی نیەت و ئیخلاسیان پاداشیان دەداتەوە. بڕوانە و سەیری ئەو دوو ئایەتە پیرۆزانە بکە:

مائدە ﴿٢٧﴾ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ. **خـودا فەرمـووی تەنیـا هەر لە خوداترسـان ئەعـال وەردەگرێ.**

زلزلە ﴿٧﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٨﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ. **هەرکەس مسقاڵە زەڕڕەیەکی خێر کردبێ پاداشی دەبینێ، هەرکەس مسقاڵە زەڕڕەیەکی شەڕ هەبێ سزاکەی دەبینێ.**

ئەو دوو ئایەتە پیرۆزانە ئەوەمان پێ دەڵێن نابێ بە هیوای دەوا و دەرمـانی تەبیبـان دەس دە کونی مار و دووپشکان ڕاکەی و یا ژەهرێ وەخـۆی و دەبـێ بـاش بزانـی چـت چانـدبێ ئەوە

دەدروویەوە، نۆکت چاندبێ کزن نادروویەوە. نەچن خۆ فریو دەن بە ئێر و ئەوێ، تەنیا ئەوەی دەتوانێ دە هاوارت بێ و دەردت چارەکا، عەمەلە، عەمەل، عەمەل بە ئیخلاسەوە.

ئایەتی ﴿وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾ واتە خاوەن زوڵم هیچ یارمەتیدەرێکی نییە. ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ: کەوش و پێڵاوت لە لاقی عالەم داماڵیوە و بە پێی خواسیت وەناو دڕووان خستووە و یا لێت دزیوە، چاوەڕوانی ئەوەی مەبە بە سەر فەڕشی مەخمەرتدا بەرن ڕۆژی خۆی بە وەسیلەی شافعێک، بێ گومان ئەتۆ بە زاڵم و تەجاوەزکار ناوت سەبت کراوە دە دەفتەری لەوحدا. هەر بە ستەمکاریشت بانگ دەکەن هەر بە تەجاوەزکاریشت دادگایی دەکەن. زوڵمیش دوو بەشە یا لە ئەقڵ و ویژدانی خۆتی دەکەی، یا لە غەیری خۆتی دەکەی. زوڵم لە خۆت خەیانەت بە ئەمانەتی خودایە، دەبێ سزایان بچێژی، زوڵم لە غەیر خەیانت بە خودا و بە غەیری خودا و بە خۆتە، ئەگەر خودا ئی خۆیشی ببەخشێ، ئی غەیری خۆی بێ چەرمەسەرە نابەخشێ.

دە تەجاوەزکار و ماف‌خۆری عالەمێ! وەڵام دەوە!

تا ئێرە بە وەسیلەی ئایەتەکانی مەڕبووت بە خێر و چاکەکاری حاڵی بووین لەوەی کە خودای تەعالا ئەو خێرانە چۆن بکەین بە هەر نیەتێک بە هەر کەسێک دەزانێ و ئاگادارە بە دڵ و دەروون و نیەت.

ئەوجار دڵ خوازیاری ئەوەیە بزانێ ئەو خێرانە یا هەر خێر و چاکەیەک کە ئینسان بیهەوێ بیکا بە ئاشکرایی بیکا و خەڵک پێ بزانێ یا بە نهێنی بیکا و هەر خودا پێ بزانێ!؟ پێشەکی ئینسان دەبێ ئەوە بزانێ پاداشی چاکەکاری و سزای خراپەکاری هەر بە خودا دەدرێتەوە و هەر ئەویش ئەو ڕۆژە دێنێتە ڕوو کە ئەو حیساباتانەی تێدا بەجێ دێندرێت، کەوایە هەر ئەو بوو بە مەبەست و مەتڵەب دە خێر و شەڕاندا، کەوایە پێ‌زانینی خەڵک بە خێر کردن چ بەهرەیەکی لێ وەردەگیرێ؟

جا بۆ ئەو مەتڵەبە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٧١ی بەقەرە دەوێدا حاڵی دەبین:

﴿٢٧١﴾ **إِن تُبْدُواْ الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاء فَهُوَ خَيْرٌ لُّكُمْ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّئَاتِكُمْ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ**

**ئەگەر بەخششەکانتان ئاشکرا کەن ئەوە کارێکی چاک و پاکە، ئەگەر بیشیشارنەوە (واتە بە نهێنی بیدەنە فەقیر و هەژاران) ئەوا چاترە بۆتان و هەندێ لە تاوانەکانو دەشواتەوە. خوداش**

ئاگادارە لەوەی دەیکەن.

## سەدەقەی بە ئاشکرا و بە نهێنی

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٧١:

لە سەر ئەساسی نەزەری زانایانی ئایینی و حەدیس‌زانان، سەدەقە ئاوا ناسێندراوە بە عالەمی ئیسلام: گۆیا لە حەزرەتی ڕەسووڵﷺ پرسیار کراوە کە سەدەقە بە ئاشکرایی خێری زیاترە یا بە نهێنی؟ حەزرەتی ڕەسوولﷺ بۆ وڵامەکەی چاوەڕوانی ئەمر و فەرمانی خودا بووە لەو بارەوە، خوداش ئەو ئایەتی ٢٧١ی بۆ ڕەوانە کردووە. ئەوجار دەبێ ئەوە بزانین سەدەقە عامە، بۆ فەرزیش دەبێ و بۆ سوننەتیش دەبێ. خودای تەعالا کە دە ئایەتی ١٠٣ی تەوبەدا دەفەرموێ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾ واتە ئەی پێغەمبەر لە ماڵ و دارایی وان سەدەقە و خێر وەرگرە تاکوو بە هۆی ئەوەوە پاک و خاوێنیان بکەیەوە. و هەروا دووبارە خودای تەعالا بۆوەی ڕوون بێتەوە بۆ موسوڵمانان سەدەقە بدەنە کێ و لێیان تێک‌نەچێ دە ئایەتی ٦٠ی سوورەی تەوبەدا فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ واتە: بێ‌گومان سەدەقات تەنیا بۆ ١. هەژاران و ٢. نەداران و ٣. کۆکەرەوەی زەکات و ٤. دڵنەوایی‌کراوان و «تازە موسوڵمان»، ٥. بۆ کڕینەوەی دیل و ٦. بۆ قەرزدارەکان و ٧. بۆ ئەو ڕێگا و جێگایانەش کە کاری خودایان تێدا بەڕێوە دەچێ، ٨. بۆ ئەو ڕێبوارانەش پارەیان لێ بڕاوە واجب و پێویستێکە لە لایەن خوداوە، خوداش زانا و کاربەجێیە.

دیاری کردن و دەس‌نیشان کردنی ئەو هەشت نەوعانە بۆیەیە لە لایەن خوداوە کە ئینسان بەهانەی ئەوەی نەمێنێ و بڵێ جا خۆ نازانم ئاوڕ وەسەر کێ وەدەم بۆ خێر و حەسەنات و سەدەقات و زەکات پێدان. واتە دانەدانەی ئەوانەی کە خودا دیاری کردوون لە نزیکی ئەم و خاوەن ماڵ و سامانێک خودا هەڵیاندەخات. تا دووبارە ئینسان نەڵێ جا خۆ پێیان نازانم لە کوێ هەن ئەوانە.

ئایەتی ﴿فَهُوَ خَيْرٌ لُّكُمْ﴾ ئەوە کە بە شێوەی نهێنی بێ بۆ خۆتان چاترە، مەبەستی خودا دەبێ چ بێ دەوەیدا؟ جارێ با بزانین پێغەمبەرﷺ چی فەرمووە لەو بارەوە؟ دەفەرموێ: (السِّرُّ أفضَلُ مِنَ العَلانيةِ) واتە باری نهێنیەکەی بەرزترە لە باری ئاشکراکردنی. دەبێ دەلیلی نهێنیەکەی کە چاترە چۆن وەدۆزرێ؟

دەبێ بڵێین:

١. نهێنیەکەی دوورترە لە ڕیاکاری و خۆ نواندن و ناوداری و خۆهەڵکێشان.

٢. دوور خستنەوەی خێروەرگرەکە لە هەست کردنی فەقیری و منەت کێشان لەو کەسەی دەیداتێ، هەر بۆیە کوتراوە پیاوانی خودا دە شەوی تاریکدا ماڵ و سامان دەخەنە ناو دەستی موستەحەققان تاکوو نەناسرێن لە بەر ئەوانەی کوتران.

٣. تاکوو شەخسیەت و کەڕامەتی فەقیر بە خۆدا نەشکێتەوە. زۆر شتی دیش هەیە ئەگەر لە عەبدی زار بە هاوار و لە عەبدی بەحەیا بڕواندرێ.

بە کوردی و بە کورتی: قازانجی خێری بە نهێنی پێنجن: سێ بۆ دینی، دووش دنیایی.

سێ دینیەکان:

١. دووری لە ڕیا و خۆهەڵکێشان

٢. دووری لە شۆرەت و خۆنواندن بە سەر هەژاراندا

٣. دووری لە کیبر و هەوا چونکە سرشتی نەفس خۆڕانانە

دنیاییەکان ئەو دووانەن:

١. ئەوەی زەکات و حەسەنات وەردەگرێ هەستی نزمی دە کەسایەتیدا دەکا.

٢. خێری نهێنی بەرگری دەکا لە ماڵدزان و دەسدرێژکەران بۆ ماڵی عالەم، چونکە دز و حیز دەگەڕێن لە کوێ ماڵ هەیە ڕێگەی بۆ وەدۆزن بۆ دزینی.

کێ چاتری بۆ دەچێ سپاسی هەستی دەکەم.



دڵ و ویژدان دەڵێن بەو هۆیەی کە خودای تەعالا ڕاستەوخۆ بۆخۆی بۆ بێنەوا و نەدار و هەژاران داوای یارمەتی و کۆمەگیان بۆ دەکا و پاداشی ئەوانەی کە بە دەنگی خوداوە دێن لەو بارەوە چەن بارتەقا دەداتەوە، ئەو کارە بۆ لەسەر ڕامان دەبێ و بۆ هەڵسەنگاندن دەبێ، چۆن خودا بۆخۆی زۆردارترە و بەخشندەترە و بەبەزەترە بۆ خۆی ڕاستەوخۆ نایانداتێ کە بۆ دڵی ئەو هەژارانە و کەسایەتییان زۆر بێ منەتانەترە و ئاسوودە و ڕاحەتترە؟ دەچێ بە عەبدەکانێ دەڵێ ئەوانیش هەی بیدەن، هەی نەیدەن! جێی ئێرە دەبێ بە کێ بکوترێ بۆ وایە؟

ئەقڵ و شعوور ڕادەچەنن بۆ وڵامەکەی و واش ناکەن خۆ تووشی بێئەدەبیش بکەن، دەڵێن نیزامی یاسای خودا لە مەڕ حاوانەوە و دابین کردنی ئینسانی پێکەوە ئاوا دەکەوێ: بۆ وەحدەت و هاودەنگی نیازیان بە یەکتر بێ هەر یەکەی لە بارێکەوە. دارا بە ماڵ و سامان ئاوڕ

داتەوە سەر هەژار و هەژار بە دوعا و ئیتاعە و خزمەتگوزاری ئاوڕ داتەوە سەر دارا. لەو ئاوڕ وە سەر یەک دانەوەیان یەکەتی و یەکدڵی لە نێوانیاندا دێتە دی. تۆفان و هێرشی ڕۆژگار زەفەری پێ ناشکێن بێر و بەوێدا ڕامالٚیان دا و لێکیان هەڵبڕێ. خوداش دە سۆنگەی هاوکاری کردنیان و یەکدڵییان هەم لە دنیادا پاداشیان دەداتەوە هەم لە قیامەتدا. جا ئەدێرەدایە ڕەحم و میهرەبانی خودا دەگەڵ ئینسان شەبەق دەدا بە هەموو وڵاتی خەزمەتی هەموو ئینسانی هەر بە خۆیەتی و بۆ خۆیەتی. هیچی بۆ خودا نییە چونکە خودا بێنیازە لە خزمەتی هەموو کەس. ئەدێرەدایە ویژدان دەڵێ: کەسێک سەژدە بۆ ئەو خودای بەپەرۆش نەبا و نەیناسێ و ئیتاعەی نەکا، بۆ ئاوڕ وەسەر دانەوە نابێ لە هیچ بارێکەوە. ئەمما لەوانەیە ئاینی ئیسلام ئەو نیەت و قەستەی ویژدانی بە دوور بگرێ لە ویژدانی خۆی.

بۆ ئەو قەزاوەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٧٢ی بەقەرە کە قەزاوەتی ڕەواتر و دروستترە:

**﴿٢٧٢﴾ لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَـكِنَّ اللّهَ يَهْدِي مَن يَشَاء وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ فَلأنفُسِكُمْ وَمَا تُنفِقُونَ إِلاَّ ابْتِغَاء وَجْهِ اللّهِ وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ**

**موسوڵمان کردنی خەڵکی لە سەرت پێویست نەکراوە بەڵکوو خودا کەیفی لە هەر کەسێکبێت هیدایەتی دەدا و موسوڵمانی دەکا، ئەوەی دەیدەن لە چاکە و خێر، بۆ خۆتانە؛ چونکە تەنیا بە خاتری خودا ماڵ و دارایی خۆتان بەخشیوە، هەر ماڵ و سامانێک دەدەن بە تێروتەسەلی دەتاندەنەوە، ستەمیشتان لێ ناکرێ.**

## چیرۆکی ئەسما کچی حەزرەتی ئەبووبەکر و پێغەمبەر و ڕووداوێک

لە سەر دابەزینی ئەو ئایەتە پیرۆزە چەن نەزەر هەیە بەو شێوەیە:

١. گۆیا «فەیلە» دایکی «ئەسما» کچە گەورەی حەزرەتی ئەبووبەکر کە ئەسما لە زگی ئەو فەیلەیە هاتۆتە دنیاوە، ئەو فەیلەیە کچی سەعد کە لە کوڕی عامری کوڕی لوئی دەبێ، ئەو فەیلەیە ژنی حەزرەتی ئەبووبەکر دەبێ، ئەسما و عەبدوڵلای لێ دەبن. ئەوە پێش موسوڵمان بوونی حەزرەتی ئەبووبەکر دەبێ. کاتێ حەزرەتی ئەبووبەکر موسوڵمان دەبێ دێتە ئەو ڕۆژەی کە لە خزمەت حەزرەتی ڕەسوولﷺدا کۆچ بکا بۆ مەدینەی مبارەک، ئەسما کچی ئەبووبەکر دەڵێ: بابم دە کاتی کۆچ کردن بۆ مەدینە ئەو فەیلە و دایکی کە دەبێتە نەنکم هەردووکان لە مەککە بەجێ دێڵێ چونکە کافر بوون نەدەکرا دەگەڵ خۆیانی بەرێ، ئەو دووانە واتە دایکم و نەنکم دە زەمانی بابمدا تێروتەسەل و ڕاحەت بوون، ئەمما لە پاش هیجرەتی بابم بۆ مەدینە، ئەو

دوو دایکەم فەقیر دەبن، لە ئەسەری فەقیرییان دێنە مەدینە ماڵە من چونکە کچیان بووم، نزیکەی بیست شەوێک میوانی من بوون و تا توانیم خزمەتم کردن. تا ئەو ڕۆژەی هاتنی خۆیان باس کرد کە لە بەر ئەو مەبەستە هاتووین ئەتۆ دەبێ بە بابت بڵێی خەرجێکی بدا بە ئێمە تا ئێمە لە مەککە بە چاولەدەستی لە ناو قوڕەیشیاندا نەمێنینەوە چونکە لەوانەیە ئەگەر هەر ئاوا بەبێ خەرجی وەمێنین لەوانەیە ئەگەر ناحەزیش بێ پەنا بۆ قوڕەیشیان بەرین لە برسان. دە وەڵامدا ئەسما کچی حەزرەتی ئەبووبەکر دە موقابیل داوای ئەو دوو دایکانەیدا کوتی: مۆڵەتێکم لێ بگرن جواب‌و دەدەمەوە. ئەوانیش کوتیان ئەو مۆڵەتە تا کەنگێ و چەند ڕۆژ دەخایەنێ؟ ئەسماش کوتی تا دەچمە خزمەت بابم و پێغەمبەرﷺ، چونکە سەرچاوەی دینمان قورئان و پێغەمبەرە. ئەوانیش کوتیان دەی باشە، زوو بچۆ لایان و جوابەکەن بۆ بێنەوە. ئەوجا ئەسمائە هەستا دە پێشدا چۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ و جەریانەکەی بێ کەم و زیاد بۆ گێڕاوە. پێغەمبەر ڕاوەستا لە ڕێوە جوابی نەداوە، ئەسمائە دەڵێ دەو ساتەدا دیتم ڕوخساری پێغەمبەری گۆڕا و ڕەنگی سوور و سپی هەڵگەڕا هەستم بەوەی کرد وەحی بۆ نازڵ بووە، ئەمنیش هەروا بە داماوی دامابووم. پێغەمبەرﷺ سەری هەڵێنا و ئایەتی ٢٧٢ی بەقەرەی خوێندەوە. بە منی فەرموو خودا ئیجازەی پێ دای بڕۆ بە ئینفاق بیاندەیە هەچی لە تواناتدایە، ئەمنیش بە دڵێکی پڕ لە خۆشی هەستام هاتمە خزمەت بابم و بۆ ویشم سەر لە بن ئی ئەو دوو دایکەم و ئی پێغەمبەریش هەموو بۆ بەیان کرد. بابم هەستم کرد کە زرۆی بەوەی پێ خۆش بوو ئایەت لەو بارەوە دابەزیوە لە سۆنگەی ئەو جەریانەی دوو دایک و کچ.

٢. نەزەری دووهەم:

هەروا لە سەر دابەزینی ئەو ئایەتە ئەو ڕیوایەتەش هەیە: گۆیا چەند نەفەر لە ئەنسار کە دەگەڵ یەهوودیەکانی «بنی‌قریظه» و «بنی‌نضیر» خزمایەتی ژنانیان دەبێ، بەڵام یەهوودییەکان لە بەر ئەوەی کە لە زەوی و باغ و باغات بێ‌بەش بوون دە کاتی میوەچنیندا دەهاتنە لای خزمەکانیان لە مەدینەی هەم میوەیان دەگەڵ دەچنین هەم بەشی ماڵ و منداڵەکانیان دەگەڵ خۆ دەهێناوە. ئەمما کاتێ ئەنسارییەکان هاتن ئیسلامیان قبووڵ کرد ئەو هاموشۆ و تێکەڵاویە لە ناو چوو. یەهوودییەکان لە بەشە میوەجاتە کە بۆ منداڵان و بۆ خۆیان بێ‌بەش هاتنە دەرێ و مانەوە. تا خودای تەعالا ئەو ئایەتەی (٢٧٢)ی نازڵ فەرموو. (تفسیر کبیر، ج٧، ل ٧٣)

٣. نەزەری سێهەم:

ئەو ڕیوایەتەشی لە سەرە: لە هەوەڵی ئیسلامەوە پێغەمبەرﷺ دەستووری دابوو کە بە کافرو موشریک سەدەقە نەدەن، ئەوانیش زۆر بە داماوی و برسیایەتی مانەوە دەیانکوت ماڵتانە خودا دوژمنایەتیشی دەکەین ڕزقن دەداتیّ. پێغەمبەرﷺ دەڵیّ مەیاندەنیّ. جا لە جێگایەکدا خودا بەو هەموو عەزەمەتەی خۆی لێمان توورە نەبیّ و ژیانمان داتیّ بۆ دەبیّ پێغەمبەر کە لە لایەن ئەوڕا کراوەتە پێغەمبەر بە قەولی خۆی، ڕزقمان لیّ ببڕیّ؟

ئەمما دروستترین ڕیوایەتیان ڕیوایەتی ئەسمائە کچی حەزرەتی ئەبووبەکرە.

با ئەوەش نەخرێتە پاش گویّ، دەعوەتی ئەو ئایەتە لە سەر نەفەقە و حەسەنات دان بە کافرە، بۆ ئەو کافرانەیە کە دە شەڕی ئیسلامدا نەبن و ئەو دەعوەتەش زەربەیەکی گورچووبڕ بوو لە کافر درا، چونکە زۆرێک لە کافران بەو هیممەتە گەورەی ئیسلام لەمەڕ ڕزق و ژیانی ئینسان مەیلیان بەرەو ئیسلام دەجووڵاوە و دەهاتن. بۆ باوەڕی و ڕاستی ئەو جەریانە سەیری ئایەتی ٨ی سوورەی «ممتحنه» بکە:

﴿لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ **خودا ڕێتان لیّ ناگریّ سەبارەت بەو کەسانەی کە لە سەر دین شەڕیان دەگەڵتان نەکردووە، و لە وڵات و زێدی خۆتان دەریاننەکردوون، چاکەیان دەگەڵ بکەن و دادگەرییان دەگەڵ بنوێنن، بیّگومان خودا دادگەرەکانی خۆش دەویّ.**

پاش دابەزینی ئەو ئایەتە پیرۆزە (٨ی ممتحنه) پێغەمبەرﷺ جاڕی دا و فەرمووی هەرکەس خزمی فەقیری بیّ و موشریکیش بیّ بەو مەرجەی دە شەڕی ئیسلامدا نەبیّ و عەلەیهی ئیسلام ئاژاوە و فیتنە نەچێنیّ، سەدەقەی بدەنیّ، ئەمما زەکات نا؛ ئەوە لەوەیڕا عالەمی کافر و موشریک لە بەرەنگار بوونەوەیان دەگەڵ لەشکری ئیسلام، پاشەکشەیان زۆر نواند و هەروا بەرەو ئیسلامیش دەهاتن. ئەو ئایەتە بەهرەی زۆری بەخشی بە ئیسلام.

ئایەتی ﴿وَمَا تُنفِقُونَ إِلاَّ ابْتِغَاء وَجْهِ اللّـهِ﴾ **ئینفاق مەکەن جگە بۆ ڕەزایەتی خودا.** دیارە ئەو جوملە ئایەتە ئەوەمان پیّ دەڵیّ: خودا پێی خۆشە هەچی برسی بیّ بە هاواریەوە بچن.

ئایەتی ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَـكِنَّ اللّهَ يَهْدِي مَن يَشَاء﴾ یانی **هیدایەتی خەڵکی پێویست نەکراوە لە سەر تۆ، بەڵکە خودا دەتوانیّ کیّ وازی لیّ بیّ، هیدایەتی دا.** ئەو ئایەتە ئەوەمان پیّ دەڵیّ هیدایەت تەنیا دە ئیرادە و وازی خودادایە، ئینسان دەوەیدا و تەنانەت پێغەمبەرەکانیش ڕێگایان لەو بوارە نییە وەپەڕن واتە ئەوانیش ناتوانن خەڵک هیدایەت دەن.

دڵ دێرەدا ئەو هەستە دەکا کە ئەو ئایەتە (٢٧٢) دەگەڵ ئایەتی ٥٢ی سوورەی شوورا دژایەتی هەیە، بەو دەلیلە: دە ئایەتی ٢٧٢ی بەقەرەدا نەهی هیدایەت لە پێغەمبەر کراوە و دیارە حاشا هەڵناگرێ. و دە ئایەتی ٥٢ی شوورادا هیدایەت دراوەتە پێغەمبەر حاشا هەڵناگرێ. ئایەتەکە ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ واتە بێ گومان ئەتۆ شارەزا و هیدایەت دەکەی بۆ ڕێگای ڕاست.

ئەوە دێرەدا هیدایەت ئیسبات کرا بۆ پێغەمبەر، دە ئایەتی ٢٧٢دا نەفی هیدایەت کرا؛ ئەوە بوو بە دژایەتی دوو ئایەت دە هیدایەتدا. خۆ ئەوەش دەزانین خودا چاتر دەزانێ لە مە و چاتریش دەڵێ. کەوابێ ئێمە چۆن بڵێین لە بابەت هیدایەتەوە تاکوو ناکۆکی نێوان ئەو دوو ئایەتە لابەرین! دەبێ ئاوا بۆ هیدایەت بچین: هیدایەتی ئایەتی ٥٢ی شوورا بە مانای شارەزایی بێ، نەک بە مانای بەستنەوە لە سەر ڕێگای ڕاست؛ بەڵام هیدایەتی ئایەتی ٢٧٢ی بەقەرە بە مانای دابەستنی ئینسان لەسەر ڕێگای ڕاستە.

بە کوردی و بە کوتی: کافر و ئینفاق

١. کافری حەربی واتە شەڕکەر: نایدرێتێ

٢. پشتیوانی کافری شەڕکەر: نایدرێتێ

٣. کافری بێلایەن و بێئاژاوەچی: دەیدرێتێ.



تا ئێرە ئەوەمان زانی کە حەسەنات و سەدەقات و ئینفاق دەبێ بدرێ بە هەژاران و نەداران و بێسەرپەرستان و داماوان. ئەمما دڵی بزۆز دەیهەوێ ئەوەش بزانێ لە نێوان ئەو خاوەن نیازانەدا کێهەیان لە پێشەوەیە بۆ پێدانی ماڵ و سامان چونکە وا هەڵدەکەوێ ئینسان بەشێکی کەمی دە دەسدایە و کە بەشی هەندێکیان دەکا، دەیهەوێ بزانێ کێ لە هەموویان شایانترە بیداتێ. جا بۆ ئەو مەبەستە ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٧٣:

﴿٢٧٣﴾ لِلْفُقَرَاء الَّذِينَ أُحصِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ لاَ يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِي الأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاء مِنَ التَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ لاَ يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللّهَ بِهِ عَلِيمٌ

خێر و چاکە و دەسگرۆییتان با بۆ ئەو هەژارانە بێ کە لە بەر هەوڵ و تێکۆشان لە ڕێی خودادا بەسراونەتەوە و ناتوانن بە زەویدا بگەڕێن و بازرگانی و مامەڵە بکەن، ئەوانەی وا نایانناسن لە بەر حەیابەخۆیان، وا دەزانن دەوڵەمەندن و هەیانە، بەڵام ئەتۆ بە ڕواڵەت دەیانناسی، ئەمانە

**بە هیچ داوا و پاڕانەوەیەک داوا لە خەڵک ناکەن، ئەو ماڵو سامانە چاک و بەنرخانەی کە دەیبەخشن هیچ گومانی تێدا نییە، خودا بە هەموویان دەزانێت.**

## یارانی (صفّە) کێن؟

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٧٣:**

بە پێی نەزەر و ڕای هەندێک لە قورئانزانان ئەو ئایەتە دەرحەق بە یارانی (صفە) دابەزیوە، ئەفرادانی سەففە هەژار و هەڵقەندراو و دەرکراو بوون بێر و بەوێدا، ئەمما دەو ئاوارەیی و دەربەدەریەشدا بە تەواوی توانا و شەوق و زەوقەوە خەریکی پەرە پێدانی ئەو دنیە ئیسلامە بوون، هەندێک دەڵێن: ئەو یارانی سەففە لە بەر ئەوەی دە شاری مەدینەدا خانوویان نەبووە هاتوون لە دەوروبەری مزگەوتی کەپەریان دروست کردووە و تێیدا ژیانیان بردۆتە سەرێ وخۆیان لە ترسی گەرما و سەرما و با و باران دەوێدا حاشار داوە.

ئەسحابی سەففە بە تەواوی نیەتی پاکیان دەگەڵ دین و پێغەمبەریان ڕاست بوون دەگەڵ ئەوەی سەختی و تەنگانەی باری ژیان خۆیان هاویشتبوونە کۆڵیان، بەڵام کۆڵوباری ئیمان و خۆشەویستی پێغەمبەریان دانەدەنا. بە زۆری ڕۆژانە بە ڕۆژوو دەبوون و شەوانەش خەریکی قورئان دەبوون و بۆ باری ژیانیش دەچوونە کێوەکانی دەوروبەری مەدینە دار و باریان دێنا بە ئەنساریەکانیان دەفرۆشتن. جەمعیەتیان سێسەت چوارسەت نەفەر دەبوون. بە پێی ڕیوایەتی ئیبنیعەبباس ئەوانە بێ ماڵ و سامان بوون بەو هۆیە بەشی زۆری کاریان هەر قورئان حیفز کردن و بە خەڵک کوتنی قورئان بوو و هەروا تەفتیش و باس لە جیهاد و حەدیس و ئایاتی قورئانی بووە و دە شەڕ و جیهاد و غەزاوەتدا زۆری ئەندامیان لە دەس دابوو وەک چاو و دەست و لاق. ئەبوهورەیرە زۆر لە حەدیسەکانی پێغەمبەرﷺ لە سەر وان نەقڵ دەکا، سەختی و ناڕەحەتی زۆریان لێ بەیان دەکا. (تەفسیری کەبیر، ج٧، ل ٨٤)

گۆیا ڕۆژێکی پێغەمبەرﷺ کە خەبەری ئەسحابی سەففە دەبیستێ کە گۆیا زۆر بێ نان و بەرگن، دەچێتە ناویان و وەکی بیستبووی ئاوایان چاو کردن بەڵام هیممەت و شەجاعەت و تەوەکول و قەناعەتیان لێ دەباری لە سیمای زاهیریان مزگێنی دانێ بە چاکی و پاکی فەرمووی پێیان هەرکەس لە ئۆمەتی من بتوانێ نیوێک لە سەختی ئێوە وەخۆ گرێ و ئاواش قەناعەتی بێ ئەو مزگێنیەی بۆ ئێوەم دا بۆ وانیش هەیە. (علامە زمخشری، کشاف، ج١، ل ٣١٣)

## پێنج سیفەتی یارانی (صفّە)

ئەگەر بە وردی و هەستیارانە سەیری ئایەتی ٢٧٣ی بەقەرە بکرێ تەواو ئەو پێنج سیفەتەی خودا لێیان بەیان دەفەرموێ لەوەی ئێمە ڕامانگەیاند لە بارەی وان زۆر زیاتر دێتە بەرچاو، جا با تەماشا و سەیری ئەو پێنج سیفەتانە کەین کە خودای تەعالا دە ئایەتەکەدا دەستنیشانی کردوون:

١. ئایەتی ﴿الَّذِينَ أُحصِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ واتە لە بەر هەوڵ وتێکۆشان لە ڕێی خودادا بەسراونەتەوە. سەیر کە کەسێک خودا شاهیدی لە سەر بدا ئاوا چی دەمێنێ بۆ وەی باوەڕی پێ بکەی کە ئەوانە ڕاستن دە فیداکاریدا.

٢. ئایەتی ﴿لاَ يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِي الأَرْضِ﴾ واتە ئەوانە ناتوانن بێر و بەوێی زەویدا وەسووڕێن بۆ مامەڵە و بازرگانی، تا بتوانن ژیان پێک بێنن. شاهیدی لەوە گەورەتر هەیە لە سەر فیداکاری و چاکی؟

٣. ئایەتی ﴿يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاء مِنَ التَّعَفُّفِ﴾ واتە ئەوانەی وا نایانناسن لە بەر حەیابەخۆییان، وا دەزانن دەوڵەمەندن. بەڵگە لە شاهیدی خودا چاتر و قایمتر دەبێ ببێ؟ نا نا نا

٤. ئایەتی ﴿تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ﴾ واتە بەڵام ئەتۆ بە ڕواڵەتدا دەیانناسیت. لەوە ڕوونتر بەڵگە هەیە لە سەر چاکی و پاکی ئەسحابی سەففە.

٥. ئایەتی ﴿لاَ يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا﴾ واتە (ئەسحابی سەففە) بە هیچ جۆرە پاڕانەوە و لاڵانەوەیەک داوا لە خەڵک ناکەن بۆ باری ژیان. (الحاف واتە بە خواهیش یا بە زۆر).

ئیبنیمەسعوود دەڵێ: خودای مەزن فەقیر و نەداری بە حەیا و شەرمی لە لا عەزیز و خۆشەویستترە لە فەقیری بێشەرم بێ و ملی خوار کاتەوە لە لای عالەم بۆ نان و ژیان. چونکە ئەو بێشەرمە هەرکەس شتی داتێ پێی هەڵدەڵێ هەرکەس نەیداتێ زەمی دەکا.



دە ئایەتی ٢٧٣دا خودا ئەوەی پێ ڕاگەیاندین لە ناو پۆلی هەژار و نەداراندا کێ شایانترە بۆ ئاوڕ وەسەر دان و چاوەدێری! ئەوجار دڵی بزۆز دەیهەوێ بزانێ لە ڕوانگەی ئایینەوە شێوەی ماڵ بەخت کردن دەبێ چۆن بێ؟ دە ڕۆژدا بێ بە ئاشکرایی لە بەر چاوی عالەم، یا دە شەودا بێ بە نهێنی؟ پێویستە بۆ حاڵیبوون لەو مەبەستە بچینە خزمەت ئایەتی ٢٧٤ دەوێدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە هەر چۆنێ هەبێ:

**﴿٢٧٤﴾ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ سِرًّا وَعَلاَنِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ**

**ئەوانەی کە هیچ کاتێک لە بەخشین و یارمەتی‌دان کۆتایی ناکەن و بە شەو و بە ڕۆژ بە نهێنی و بە ئاشکرایی هەر خەریکی بەخشینن، پاداشتی ئەوانە لە لای خودای خۆیان مسۆگەرە و لە ڕۆژی دواییشدا هیچ ترس و خەفەتێک ڕوویان تێناکات و بۆ هەمیشە هەر لە ئاسوودەییدا دەبن.**

## بەخشینەوەی ماڵ بە ئاشکرا و نهێنی

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٧٤:

دیارە بە پێی فەرموودەی ئایەتەکە ئەو کەسانەی دارای خۆیان بە دزی و بە ئاشکرایی بێ منەت کردن و خۆهەڵکێشان دە ڕێگای خودادا بەخت دەکەن لە لای خودا پاداشی ئەو کەسانە هەیە و ئامادەیە و هیچ ترسێکیان نییە لەوەی پاداشیان نەدرێتەوە و یا تۆفانی تەجاوەزکاران ڕێبواران داتە بەرەخۆ و هیچ خەفەتی ئەوەش نایەتە سەریان، دەیانبێ یا نایانبێ و یا دەمرن یا دەژین.

وێدەچێ ئەوە ئاخرین ئایەت بێ لە بابەت ئینفاق و سەدەقە پاش بەیانی بەشێک لەو بابەتانەی کە سەر وە خێر و حەسەنات بوون بەبێ چاوەڕوانی کات و زەمان و ڕاگرتنی ئینفاق و سەدەقە بۆ ڕۆژەکانی وەک جێژنی ڕەمەزان و قوربان و کاتەکانی دی. بەڵکە خودا بە هۆی ئەو ئایەتە بەندەکانی بانگ دەکا و شەوقیان وەبەر دەنێ بۆ وەی دە هەر کات و سات و زەماندا بن لە خێر و بەخششی ماڵ بۆ خاوەن نیازان ڕاستەوخۆ بچنە پێشێ و ڕامەوەستن.

لە سەر هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە ڕا و بۆچوون و نەزەری زۆرن ئەمما ئایەتەکانی دەبێ ئەوە بزانین بێ مناسەبە و عیللەت نەهاتوون بەڵکە هەر ئایەتەی هۆیەکی بووە، ئەمما دە پاڵ ئەو هۆیەدا هەموو دەور و دەورانی نەبواردووە و لە خۆی گرتووە مەگەر بە هەڵکەوت ئایەتێک تایبەتی کاتی تایبەتی بووبێ وەک مەسەلەی دیل، جاریە و ... کە ئەوانەی دە کاتی خۆیدا بوون و ئێستێ ئەو حاڵەتە نەماوە. بە هەر حاڵ دە جێگای خۆیدا بە تەواوی لە سەر ئەو دیل و جاریە دەدوێین.

ئێستێ دەچینە خزمەت هۆیەکانی دابەزینی ئایەتی ٢٧٤، بە پێنج نەزەر ئیکتیفا دەکەین:

١. خاوەنی کەششاف کوتوویەتی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە حەزرەتی ئەبووبەکری

سدیق بووە. کە کاتێ لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە گۆیا دارایی خۆی هەمـوو وێـڵ کـرد و بەجێی هێشت تەنیا نەختێکی بۆ ژیانی دەگەڵ خۆ برد تا دامەزرێ.

٢. ئیبنیعەبباس دەڵێ: دە شەئنی حەزرەتی عەلیدا دابەزیوە چونکە عەلی دارا نەبووە بەڵام کاتێ ئەیاتی ئنیفاق دابەزیوە گۆیا چوار دیرهەمی کە بـووە سـەبارەت بە فەزیلەتـی ئینفـاق ئەو چوار درهەمەی داوەتە نەداران.

٣. ئەبوو دەرداء، ئەبوو ئیمامە و ئیبنیعەبباس، ئەوزاعیو ڕەباح ئیبنی یەزید: ئەوانە نەزەریان ئاوا داوە کە گۆیا عیددەیەک لە فیداکارانی ئیسلام دارایی خۆیان خەرجی ئەو ئەسبانە دەکرد کە بۆ ڕۆژی هەرا و غەزا و شەڕ و دەرگیری توند و چالاک و بەبدەو و بەڕاپەڕ بوون

٤. هەندێکیش نەزەریان وایە کە دابەزینی ئەو ئـایەتە سـەبارەت بە عەبـدولڕەحمان کـوڕی عەوف و حەزرەتی عەلی هاتووە دە کاتێـدا کە بەشـی زۆری دارایـی خۆیـان داوەتە ئەسـحابی سەففە، و تەنانەت دە شەوانی تاریکدا بە کۆڵی خۆیان خورمایان بۆ بردوون.

٥. قەتادەش فەرموویەتی: ئەو ئایەتە هۆی دابەزینی ئەو کەسـانە بـوون کە بە پێـی نیـاز دە ئینفاقی ماڵ و دارایی خۆیاندا خەریک بوون بۆ گشت خاوەن نیازان بێ لەبەر چاو گرتنی کات و زەمان.

پاش ئەوەی کە بە هۆی ئایەتەکانی ٢٧٠ تا ٢٧٤ لە بـابەت خەرج کـردن و بەخـت کـردن و دەست گرتنەوە و ئاوڕدانەوە بۆ سەر خاوەن نیـازانی وەک هەژار و نەدار و پیـر و لەکـارکەوتوو دواین، ئەوجار دڵی بزۆز و بەپرسـیار دەیـهەوێ بزانـێ ئەدی ئەو کەسـانەی بە پـێچەوانەی ئەو دەستووره عەمەل بـکەن، واتە هەژاری وەچەوسـێنێ، نەداری دە خـۆڵ وەگەوزێنـێ و دامـاوی بڕەتێنێ و بێدەستەڵاتی دەربەدەر کا و لە خاک و نیشتمانی دەرپەڕێنێ و ئاوارەی وڵاتانی کا، یا ماڵ و دارایی بداتێ ئەمما زیادی لێ وەستێنێ، دەبێ حاڵی ئەوانە دە کاتی خۆیـدا چـۆن بـن و پاداشیان چ بێ؟

دەبێ بۆ وڵامی ئەو پرسیارانە بچینە خزمەت ئایەتی ٢٧٥:

﴿٢٧٥﴾ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا فَمَن جَاءهُ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِ فَانتَهَىَ فَلَهُ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُ إِلَى اللّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ

ڕبا سوودە، وەکوو ئەوەی کەسێک هەزار دینار بداتە کەسێک بـۆ مـاوەی سـێ مانـگ بەو

مەرجەی دوایی هەزار و سێسەد دیناری لێ بگێڕێتەوە، واتە سێسەد دینـار زیـاتر لەو پـارەی کە پێی داوە بە قەرز. خودا ئەو جۆرە مامەڵەی بە توندی حەرام کردووە و دەفەرموێت:

**ئەوانەی سوود دەخۆن (واتە سوود وەردەگرن) حاڵیان وەکـوو حـاڵی کەسـێکی فێـدار وایە کە شەیتان دەستی لێ وەشاندبێ کە لە هەستان و دانیشتندا ناتوانێت ڕێگـای ڕاسـت بگـرێتە بەر، بەڵکوو هەر بەولاولادا دەکەوێت.**

مەبەست لەو دەست لێوەشاندنی شەیتانە ڕێ لێ‌تێک‌چوونە، ئێمە بە کەسێک کە نەزانێـت چۆن هەستێ و چۆن دانیشێ و کاروبـاری خـۆی بەڕێـوە بەرێ دەڵێـین: شـەیتان دەسـتی لـێ وەشاندووە و سەری لێ شێواندووە. بەشی زۆری تەفسیرنووسەکان دەڵـێن ئەوە بـاس و حـاڵی سوودخۆرانە دە کاتی زیندووبوونەوەیاندا یان لە ڕۆژی دواییدا. هەندێکی دی دەڵێن: مەبەست دەرخستن و ڕوونکردنەوەی سەرلێشێواوی و شپرزەیی حاڵ و قسەی ئەو کەسانەیە کە دە دنیادا سوود دەخۆن چونکە ئەوانە دەیانەوێت وا پێشان بدەن سوودخواردن وەکوو لە کڕین و فرۆشتن حەڵاڵترە،

**دەڵێن: سوودخواردن و کڕین و فرۆشتن هەردوو حەڵاڵـن و وەکـوو یەک وان. هەر خـودی ئەو قسـەیەیان بەڵـگەیە لەسـەر ڕێ لـێ تێکچوونیـان و سەرلێشـێواوییان. مەسـەلەکە خـۆی پـێچەوانەیە و خـودا کـڕین و فرۆشـتنی حەڵاڵ کـردووە بەڵام سـوودخواردنی حەرام کـردووە. ئەوەی ئاگادار بێ و باسـی حەرامبـوونی سـوودی پـێ گەیبـێ و لێـی دوور کەوێ، سـەبارەت بەوانەی دە پێشدا خواردوونی ئەوە با ئەو بێت و دەکەوێتە لای خودا، بەڵام ئەگەر بگەڕێـتەوە بۆ لای سوودخواردن و سەرلەنوێ ئەو ستەمە بکات ئەوە دەبێتە هاوڕێی ئاگری دۆزەخ و هەتـا هەتایە دەوێدایە.**

## ڕبا (سوود)

عەرەبی جاهیلیەت واتە نەزان و بێ‌خەبەر لە ئایینی ئیسـلام، حـاڵ و عـادەت و باوەڕیـان مامەڵە بووە، تەنانەت پاش دابەزینی ئایینی ئیسلام لە هەوەڵەوە واتە ئیسلام خـۆی تونـدوتۆڵ و قایم نەکردبوو ئەو مـامەڵە و سـوودارەیان هەر دەکـرد. دە مەکە و دەوروبەریـدا و بەتـایبەت دە شاری مەککەدا بە ئەنـدازەیەک بـازاڕی سـوود (ڕبـا) گەرم بـوو سـوود وەرگـرتن وەک پـایە و ئەساسێکی مامەڵە دەهاتە ژمار. زۆربەی تاجران و سەوداگەران پاش موسوڵمان بوونیشیان ئەو سەودا خاوەن سوودانەیان هەر دەکرد، خودای تەعالا بە دابەزانـدنی ئـایەتی حـورمەتی سـوود

کەمێکی موسوڵمان پرینگاندنەوە، ئەسحاب بەو هۆیە کە هێزی ئیمان و باوەڕیـان بە توانـا بـوو هەر لە ڕێوە ئیتاعەیان لە ئایەتی حەرامبوونی سوود کرد و پرینگـانەوە، تەنـانەت ئەسـحابەی وا بوو بەشی زۆری داراییەکەی کەوتبووە نـاو مـامەڵەی سـوود، بە مەحـزی دابەزینـی ئەو ئـایەتە چاویان لێ پۆشی لەو ماڵ و داراییەش. (تفسیر منار، ج٣، ل ٧٦)

ئەوە بە یەقین گەیشتبوو لە کاتی دابەزینی ئەو ئایەتەی کە سوودی حەرام کردبوو سـەریان بۆ نەوی نەکرد بەشێک لە خەڵک هۆیەکەش ئەوە بوو خۆشەویستی ماڵی دنیا و سەرنەویکردن دە پێناو داوخواززەکانی هەوا و ئارەزوو و نەفسی سەرکەش، سەری پێ لە فەرمانی خـودا لادان و ئەوەی ئایەتەکە بە حەرامی دانابوو ئەوان بە حەڵاڵیان دەزانی ماڵی خەڵکیان بـێ زەحـمەت و بێ بارتەقا دەخوارد. ئەو خەتایە یەکـێکە لە ئەسـەرەکانی خۆشەویسـتی دنیـا کە سـەرت پـێ لە فەرمانی خودا لادەدا.

## قۆناغەکانی حەرام کردنی سوود (ڕبا)

خودای تەعالا حەرامی سـوود (ڕبـا) وەک حەرامـی عـارەق، شـەڕاب دە چـوار جێگـای قورئاندا ناو بردووە واتە حەرامی سوود وەک عارەقی دە چوار قۆناغـدا بەجـێ گەیانـدووە. ئەو چوار قۆناغەی حورمەتی سوود کە دە قورئاندان ئەوانەن:

ئایەتی هەوەڵیان لە مەککە دابەزی وەک ئایەتی ٣٩ی سوورەی ڕۆم بـێ، بـاقی ئایەتەکـانی دی لە مەدینە هاتوونە خوارەوە.

ئایەتی دووهەمی حەرامی سوود کە لە مەدینە دابەزیوە وەک ئایەتی ١٦١ی سوورەی نیساء بێ.

ئایەتی سێهەمی حەرامی سود کە لە مەدینە دابەزیوە وەک ئایەتی ١٣٠ ئالیعیمران بێ.

ئایەتی چوارەمی حەرامی سوود کە لە مەدینە دابەزیوە وەک ئایەتی ١٣٠ ئالیعمیران بێ.

پوختەی ئەو مەبەستە:

خودای تەعالا حورمەتی سوود (ڕبا)ی هەروەک حورمەتی عارەق (خمر) دە چوار جێگای قورئاندا نیشان داوە، واتە حورمەتی ڕبـای دە چـوار قۆناغـدا ڕایگەیانـد. هەر جـارەی پـلەیەک دەهاتە پێشێ تاکوو بە یەکجاری و بە توندی بەیانی حورمەتی ڕبای ڕاگەیانـد. ئەو مەیدانەشـی کە دا بە سوودخۆران هـۆیەکەی دەگەڕێـتەوە بـۆ لای ئەوەی کە دوورخسـتنەوە و پچـڕینەوەی ئینسان لە شتێک کە عـادەت و خـووی پـێ گرتبـێ بە یەک کەڕەت، زۆر بە سـەختی و گرانـی

دەکرێ و تەواو دەبێ، جا بۆ وەی بە ئاسانی بتواندرێ لە عادەت و باوی خوو پێگیراوی ئینسان وەدوور خرێ و بپچڕێتەوە دەبێ قۆناغ بە قۆناغ چوونە پێشی بۆ بکرێ. تاکوو ئەو عادەتەی لە دەستی دەردێ.

کەڕەتی هەوەڵی حەرام کردنی سوود لە مەککە ڕاگەیێندرا. سێ کەڕەتەکەی دیکەش لە مەدینە. سەیر کە بە تەرتیب چوار قۆناغەکەی حورمەتی ڕبا دەگەڵ حورمەتی عارەق بەیان دەکەین:

١. قۆناغی یەک لەو چوار قۆناغانەی کە حورمەتی ڕبا و حورمەتی عارەقی تێدا ڕاگەیێندرا لە شاری مەککە بە وەسیلەی ئایەتی ٣٩ی سوورەی ڕۆم بوو، ئەوەش ئایەتەکە: ﴿وَمَآ آتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَ فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلَا يَرْبُو عِندَ اللَّهِ﴾ **ئەوەی بە ناوی سوود دەیدەن بۆ ئەوەی بێ زێدە بکەوێتە ماڵی خەڵک لە لای خودا زیاد ناکا.**

دیارە ئەو ئایەتە (٣٩ی ڕۆم) دە بەرابەر ئایەتی ٦٧ی نەحلدایە کە لە بابەت حەرامی عارق دابەزیوە: ﴿وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا﴾ **لە بەرهەمی خورما و ترێ شەربەتی سەرخۆشکەر و ڕزق و ڕۆژی خاوێنی لێ دروست دەکەن.**

ئەو دوو ئایەتە (٣٩ ڕۆم و ٦٧ نەحل) هەردووکیان پایەداڕێژەرن بۆ حەرام کردنی ڕبا و عارەق.

٢. قۆناغی دوو لەو چوار قۆناغانەی کە حەرامی سوود (ربا)ی تێدا ڕاگەیێندراوە ئایەتی ١٦١ی نیسائە کە بە وەسیلەی ئەو ئایەتە لە شاری مەدینە حەرامی سوود بەیان دەکرێ: ﴿وَأَخْذِهِمُ الرِّبَا وَقَدْ نُهُواْ عَنْهُ﴾ **هەروەهاش بە هۆی سوود وەرگرتنەوە کە بێگومان لێیان قەدەغە کرابوو.**

ئەو ئایەتەش دە بەرابەر ئایەتی ٢١٩ی بەقەرەدایە کە لە بابەت حەرامی عارەق دابەزیوە: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا﴾ **سەبارەت بە ئارەق و قومار پرسیارت لێ دەکەن، بڵێ: لەو دووانەدا تاوانێکی گەورە هەیە، چەندین قازانجیشی تێدایە بۆ خەڵکی، بەڵام گوناح و تاوانیان گەورەترە لە قازانجیان.**

ئەو دوو ئایەتانەی ١٦١ی نیساء و ٢١٩ی بەقەرە هەردووکیان هۆشدارن لە سەر حەرامی ڕبا و ئارەق و سزادانی بەڕێوەبەریان.

٣. قۆناغی سێهەم لەو چوار قۆناغانەی بۆ حەرام کردنی سوود دامەزراون لە قورئاندا،

وەک ئایەتی ١٣٠ی ئالی‌عمران بێ کە بە وەسیلەی ئەو حەرامی سوود ڕادەگەیێندرێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ الرِّبَا أَضْعَافًا مُّضَاعَفَةً وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ ئەی ئەوانەی بڕوا و **ئیمانتان هێناوە! چەند بەرابەر سوود مەخۆن، لە خودا بترسن بەو هیوایە ڕزگار بن.**

ئەو ئایەتە شەباهەتی هەیە بە ئایەتی ٤٣ی نیساء: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى حَتَّىَ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ﴾ **ئەی ئەوانەی (بە هۆی ئارەق خواردن) کە بڕوا و ئیمانتان هێناوە کاتێ مەست و سەرخۆشن، توخنی نوێژ خوێندن مەکەون، تاکوو بزانن چی دەڵێن.**

ئەو دوو ئایەتانەی ١٣٠ی ئالی‌عمران و ٤٣ی نیساء تا ئەندازەیەک مەنع دەکا لەو عەمەلانە، ئەمما دە مەنع و قەدەغەکەیاندا فەرق چاو دەکرێ، واتە دە مەنعی خواردنی سوودا سەراحەتێکی جوزئی هەست پێ دەکرێ کە دەفەرموێ سوود چەند بەرابەر مەخۆن تا کوو ڕزگار بن. دیارە ئەو شێوە مەنعە بە تەوری تەواو قەدەغە ناداتە بەر خۆ. چونکە ئەوەی لێ فەهم دەکرێ: لە سوودخواردنی چەن بەرابەر وەکشێن، ئەمما ئی ئارەق، ئەویش مەنعێکی جوزئی لە خۆ مەست کردن دە کاتی نوێژ کردندا، کەوایە دەتواندرێ بکوترێ ئەو قۆناغە سێیەش قەدەغەیەکی قاتیعانە نییە و نابیندرێ.

جا بۆ مەرحەلەی چواریش ئەوە بەرەوپیری دەچین بۆ وەی بزانین دەوێدا بۆ لە مەمک کردنەوەی سوودخۆر و ئارەق‌خۆران خودا چ هەڵوێستێک دەگرێ؟ هەروا بە نەرمی دەدوێ دەگەڵیان یا توندی دەکا لە سەریان کە بۆ لای نەچن و توخنی نەبن، ئەگەر حەیوانی سەرەڕۆ لە لمبۆزی نەدرێ، کشانەوەی بەدەگمەنە.

٤. قۆناغی چوارەمین لەو چوار قۆناغانەی کە بۆ مەنع کردنی سوود خواردن و ئارەق خواردن دامەزراون و داندراون لە لایەن خوداوە بە وەسیلەی ئایەتی قورئان ئەوەیە کە دە ئایەتی ٢٧٨ی بەقەرەدا ئیشارەی وەلا کراوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ **ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان هێناوە! لە خودا بترسن ئەو پاشماوە سوودە ماوە تەواو دەستی لێ هەڵگرن، ئەگەر بەڕاستی خاوەن ئیمانن.**

شێوەی ئەو ئایەتە کە دەربارەی حەرامی ڕبا هاتووە ئایەتی ٩٠ی مائیدەیە دەربارەی خۆپارازتن لە ئارەق خواردنەوەدا نازڵ بووە. ئەوەش ئایەتەکە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ ئەی ئەوانەی **بڕوا و ئیمانتان هێناوە! هیچ گومانی تێدا نییە مەی و قومار و ئەو بتانەی بۆ پەرستن دانراون و ئەو**

**تیرانەی کە بۆ چارەنووس و تاقی کردنەوەی بەخت بە کاری دێنن، پیسن ولە کـارو کردەوەکـانی شـەیتانن. کەواتە خۆتانی لێ بپارێزن تاکوو بڵێین بەڵکوو ڕزگار بن.**

ئەوە بوو پوختەی حەرام کردنــی ســوود و ئـارەق دە چـوار قۆناغـدا کە خـوای تەعـالا بە وەسیلەی ئایەتەکانی تایبەتی خۆیان ڕایگەیاندن. ئەو چوار مەرحەلەش دە بابەت قەدەغە کردنی یەک عادەتی ناحەز، بۆیە بوو تاکوو ئەوە بزانین خودا حەکیمە هەموو کارەکانی پێ‌بەپێ دەخاتە سەر شانی ئینسان وهەروا پێ‌بەپێش لایاندەبا، تاکوو ئێمەی بەشـەر لەوەوە فێـر بـین قۆنـاغ بە قۆناغ و مەنزڵ بە مەنزڵ کارە ناحەزەکان وەلابەرین و کارە جوان و ڕەواکانیان لە جێ دابنێین.

لە پیادە کردنی یاسـای قەدەغەی سـوود (ڕبـا) بەو دوو شـێوەیە: واتە ڕبـای جـاهلیەت و (وێمدە وێتدەم بە زیادەوە) و یا ڕبای قەرز، پێنج بابەت چاو دەکرێ:

١. ئازادی و مەباحی ئەنواعی مەعامەلە کە لۆمە و قەدەغەی شەرعی تێدا نەبێ

٢. حەرامی ڕبا و هێرشی بە توندی بۆ سەر ڕباخۆران

٣. مۆڵەت دان بە نەداران

٤. پاداشی چاکان و پاکان

٥. ئەمر و فەرمان بە لەخودا ترسان یادئاوەری فەنای دنیا و بەقای ئاخرەت.

ئایەتی ﴿وَأَحَـلَّ اللَّهُ الْبَيْـعَ وَحَـرَّمَ الرِّبَـا﴾ واتە سـوودخۆرەکان کوتیـان بێ‌گومـان کـڕین و فرۆشتنیش هەروەک سوود وایە، خوداش بۆ وەی قسەکەیان بە بەتاڵ دەرکا فەرمـووی ﴿وَأَحَـلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾ کڕین و فرۆشتن حەلاڵە ئەمما کردەوەی سـوود حەرامە. واتە تمەنێـک بە دوو تمەن حەرامە، نانێک بە نان و لەتێک حەرامە دە مامەڵەدا چ بە نەغد چ بە قەرز. هەچەن لە لابەلاوە دەنگێک دێ و دەڵێ سوود دە قەرزدایە و دە نەغددا نییە.

دیارە دەبێ ئەوە قبووڵ کەین دە هەموو ئەو جێگایانەی کە بە پـێچەوانەی ئەمـری خـودا بە عەمدەن کار دەکرێ دەبێ بڵێـین شـەڕە دەگەڵ خـودا. ئەمـما بە سـەڕاحەت ئەوە چـاو کـرا دە مەسەلەی ڕبا خواردن: سوودخۆر شەڕی دەگەڵ خودا و ڕەسـووڵی خـودایە بێ‌گومـان هـۆی ئەوەش دەبێ هەر ئەوەبێ پشتی جامعە و کۆمەڵ سوودخۆران دەیشکێنن.

## جۆرەکانی ڕبا

ڕبا دوو جۆرە: قەرز و نەغد.

سوودی قەرز تمەنێک بە دوو تەمەن، پاش ماوەیەکی سوودی نەغد

ڕبای قەرز: ئەندازەیەکی مەعلووم سەد تمەن دەدەی بە یەکێکی بۆ ماوەی ساڵێک یا زیاتر ئەگەر دەو ماوەیەدا ئەو سەد تمەنە درایەوە ئەوە هیچی نەیەتە سەرێ، ئەگەر نەدراوە ئەودەم سوودی بێتە سەرێ، ئەوە پێی دەکوترێ وامی بە قەرزی سووددار. ئەوە دە دەورانی جاهلیەتدا باو و عادەت بوو، دەناو هۆزی عەرەباندا.

ئەو شێوە وامە سوودارانە ئەوڕۆ وەک یاسایەکی بەڕێوە دەچێ دە بانکەکانی وڵاتی ئیسلامیدا. قورئانی کەریم حەملە و هوجوومی بۆ سەر ئەو وامە سوودارەیە.

## زەرەرەکانی ڕبا

حورمەتی سوود لە لایەن خوداوە لە بەر ئەو زەرەرانەن:

١. ئینسان ماڵی عالەم کۆ دەکاتەوە بێ کار و کاسپی بەخۆڕایی

٢. بێ هیچ عیوەزێک ماڵ دەستێندرێ لە عالەم

٣. بوغز و کینە چاندنە لە ناو دەروونی هەژاران دە بەرابەر خاوەنانی ماڵ

٤. خۆشەویستی و سەفا دە دەروونی خەڵکدا دەفەوتێنێ

٥. بێ ئەرزش کردنی ئینسانی دەخاتە ڕوو

**تیوتیوەیەکی ئایەتی ٢٧٥:**

١. جوملەی ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا﴾ واتە (یعاملون)

٢. ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾ واتە مامەڵە حەڵاڵە، قەرزی مایەی سوود حەرامە.

٣. جوملەی ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾ ئیشکالێک دێنیە ڕوو، وەک ئەوە: ئەو ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ﴾ ئەوەی لێ فەهم دەکرێ کە هەچی مامەڵەیە حەڵاڵ بێ و جوملەی ﴿وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾ هەموو زیادەیەک دە مامەڵەدا حەرام بێ. جا خۆ ئەوەش بێگومانە و حاشار نادرێ هەچی مامەڵەیە بۆ زیادییە، جا کەوایە دەبێ چۆن تەعبیر کرێ ئەو ئایەتە؟ دەبێ ئاوا: دە مامەڵەدا تمەنێک بە دوو تمەن ڕبایە و حەرامە، دەنا باڵتەیەک دەکرێ بە دە تمەن و دەیفرۆشێتەوە بە زیاتر لە دە تمەن، ئەوە حەرام نییە.

ئەگەر زۆر وەدوا کەوتنت دەوێ لەو بارەوە بڕوانە لە کتێبە شەرعەکان یا تەفسیری کەبیر.



تا ئەندازەیەک لە بابەت خێر و حەسەنات و دەستگرۆیی حاڵی کراین پێش باس لە ڕبا و سوود، و تا ئەندازەیەکیش دە مامەڵەی بە قازانجەوە و سوودی زیادی بێ عەوەزیش گەیشتین.

ئەوجار چونکە هەموو کەس بە تەواوی ناتوانێ لە مامەڵە و سوود بگا و حاڵی بێ، چاوەڕوانی ئەوەی دەکرێ نیشانە و داوەڵ و ئاسارێکی بنوێندرێ کە هەموو کەس بتوانێ بڵێ دەزانم (ڕبا) چییە و مامەڵە چییە و سەدەقە چییە؟ جا بۆ ئەو چاوەڕوانییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٧٦ی بەقەرە:

﴿٢٧٦﴾ يَمْحَقُ اللَّهُ الْرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ وَاللَّهُ لاَ يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ

**خودا پیت و بەرەکەت لە سوود دەرداوێت و هەڵدەگرێ بەڵام خێر و بێر و بەرەکەت دەخاتە ناو ئەو ماڵ و سامانانە کە خێر و چاکەی تێدا دەدرێ و دەکرێت، خوداش سپڵە و ناسپاس و تاوانبارێکی خۆش ناوێ.**

## لەنێوچوونی ڕبا؛ مانەوەی سەدەقە

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٧٦:

سوودخۆر چونکە وەک زەروو خوێنی لەشی هەژاران دەمژێ، خۆشی لە خۆ نابینێ و دڵ حەساوە نابێ و خێر وپیت و بەرەکەتیشی دە ماڵەکەیدا نامێنێ، هەژار و بێنەوا دە کەمینی هەلدایە بۆ گیانی ئەو سوودخۆرانەی کە تەمایان دە سەر و ماڵ و بەرهەمی شانی هەژاران کردوە، ماڵی خێر لێدراو هەچەن کەمیش بێ لە بەرچاوان، بەڵام زۆرە دە ناو دڵدا، چون قەناعەت و شوکر و سپاسی لەسەرە.

لە سەر ئەوەی کە سوودخۆران ناپرینگێنەوە لە سوودخواردن دەگەڵ ئەوەی کە هاوار و بانگاوازی ئایەتەکان گوێی دنیایان پڕ کردووە وەک شێت و ماخولیا و هار و شێتان دەچن کە ناترسن، جا ئەدێرەدا دەکەومە سەر ئەو خەیاڵ و بیرە کە ڕاستە شێت بوون بە دەستی پەری هەیە، واتە خودای تەعالا بە جنۆکە و شەیاتینی توانا و هێزی ئەوەی داوەتێ کە بتوانێ ئینسانی لە هەر دوو بوارەکانی دەروونی و لەشی داگیر کا و بە وازی خۆیان هەڵیانسووڕێنن. یانی هەروەک زۆر کەس ئاوا کراوە و بووە کە شێت بووە و حەواسی لە دەس داوە و هەست و ئەقڵ و شعووری شێتانە، واتە شەیتانانە عەمەلیان کردووە، سوودخۆریش هەر ئاوا کەوتوونە ژێر دەستەڵات و حەوزەی جنۆکە و شەیاتینیان دەنا دەبایە بەو هەموو هاوارەی خودا و پێغەمبەرﷺ دەیانکەن ئاوڕیان داباوە و گەڕابانەوە.

هەندێکیش لە سەر ئەو باوەڕەن جنۆکە دەستەڵاتی بە سەر دەروونڕدا نییە ئەمما دەتوانێ

وەسوەسە و خەیاڵات داچێنێتە ناو ژووری دەروونەوە و پەرێشانی کا. (روح‌المعانی، ج٣، ل ٦٧)

ئایەتی ﴿يَمْحَقُ اللَّهُ الْرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ﴾ واتە خودا سامانی سوودخۆری وردەوردە لاواز و نابوود دەکا، سەدەقە و خێرات زیاد و بەهرەوەر دەکا.

ئایا ئەو کردەوە و عەمەلە جوان و ڕەوایەی خودا چۆناوچۆن وەرگرین و چۆنی چاو کەین دە سوودخۆراندا و دە خێرکەراندا؟ دە دنیایەدا ئەو واقعە دێتە ڕوو و چاو دەکرێ و یا دە ئاخرەتدا؟ دەبێ چۆنی تەعبیر و بەراوەرد کەین؟

بە پێی هەڵسەنگاندنی حاڵی ڕباخۆران و ئەوزاعی سەدەقەکەران ئاوای بۆ دەچین و بەراوەرد دەکەین: بە زۆری ڕباخۆرەکان ئاوا چاو کراون دە دنیادا: ئەگەرچی بە زاهیری سامانیان زۆرە، بەڵام چونکە دڵیان کوێرە بێ ماڵ و نابوودن و سەرەنجام بە هەژاری و دڵکوێری سەر دەنێنەوە. وەک پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (و انْ كَثُرَ فألى قَلَّ) یانی سوودخۆر هەچەند ئەگەر زۆریشی بێ سەرەنجام ڕوو بە نابوودی و کەمی دەچێ. یا دەڵێین با لە دنیادا زۆریش بێ، دە ئاخرەتدا بێ دەسمایە و بێ‌سەرمایەیە. چونکە هەچەندی خێر و حەسەنات و قوربان و حەج و مزگەوت و تەکیە و بارەگای دینی پێ ڕازاندبنەوە بێ‌بەهرەن، چونکە کارەکەی لە سەر ئەساس و بناخەی پووچ و باتڵەوە بووە.

جا ئەوجار (ڕباء صدقات) واتە بەرەکەت و بەهرەی سەدەقەکەران دە دنیادا ئەوە بێ‌گومانە و حاشا هەڵگر نییە: کێ بۆ خودا بێ خوداش بۆ وی دەبێ، هەروەک لەو گوفتە زێڕینەشدا ئەو مزگێنییە خۆشە دەبیسرێ و چاو دەکرێ گۆیا فرشتەکانی خودا هەموو ڕۆژێ ئەو هاوارە دکەن: (اللهُمَّ أعطِ كُلَّ مُنفِقٍ خَلَفاً و كلَّ مُمسِكٍ تَلَفاً) یانی خودایە هەچی نەفەقەدەرە پاداشی دەوە، هەچی لەچەر و نەفەقەنەدەرە نابوودی کە.

جگە لەوانەش خێرکەران دڵانی وێران ئاوەدان دەکەنەوە بە سەدەقە و خێرەکانیان، خۆ پێغەمبەری ئەمین و ڕاستیش فەرموویەتی: کێ دە تەنگانە و سەختیدا بە هاواری لێقەوماوان بچێ و دڵیان ئاوەدان کاتەوە خوداش دە ڕۆژی سەختیدا دە هاواری دێ،لە ڕۆژی قیامەتیش سەختتر نییە.

دیارە ئەبوو هوڕەیڕەش ئەوەی لە پێغەمبەر نەقڵ فەرمووە: (إنَّ اللهَ تعالى يَقْبَلُ الصدقةَ و يأخُذُها بِيَمينِهِ فيُربّيها لأحدكم كما يُرَبِّي احدُكُم مُهرَهُ حَتّى ان اللُّقمةَ لَتَصيرَ مثلَ اُحُدٍ) واتە خودای تەعالا سەدەقە وەردەگرێ بە دەستی خۆی تەنانەت خودا ئەو سەدەقەیە ڕادەگرێ بۆ

یەکێ لە ئێوە هەروەک یەکێ لە ئێوە بێچووی خۆی ئاگـاداری دەکـا، حەتـا پاداشـەکەی وا بـۆ دەپێوێ تیکە پاروویەکی کە داویەتە بێنەوایان، بە وەزن کێوی ئوحود پاداشی دەداتەوە.

بۆ ئیتمینانی دڵ برۆ سەیری ئایەتی ١٠٤ و ٢٧٦ی بەقەرە کە تەئیدی ئەو حەدیسە دەکا: ﴿أَلَمْ يَعْلَمُواْ أَنَّ اللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَأْخُذُ الصَّدَقَاتِ﴾ ﴿يَمْحَقُ اللَّهُ الْرِّبَا وَيُـرْبِي الصَّـدَقَاتِ﴾

**واتە ئەوانە نازانن کە خودا تۆبە قەبووڵ دەکا لەو بەندانەی تۆبە دەکەن و سەدەقە وەردەگرێ و نـابوودیش دەکا سوود و زیادیش دە سەدەقەدا.**

ئایەتی ﴿وَاللَّهُ لاَ يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ﴾ واتە خودا هیچ کافری سپڵە و ناسپاسی خۆش ناوێ.

کەففار واتە زۆر کافر، واتە زۆر ئاژاوەگێڕ. یانی هەر بە بێباوەڕیەکەی ڕاناوەستێ ئاژاوەش دەخاتە ناو گەلی ئیسلامەوە.

دەبێ ئەوە بزانین کە بە زۆری یاسای خودا ئاوایە کە پاش هەڕەشە لە سەر تاوان دێـتە سـەر مزگێنی بۆ چاکەکاران. سـەیر کە دە ئایەتەکـانی پێشـدا هەڕەشـە کـرا لە سـەر سـوودخۆران بە توندی، ئەوجار مزگێنی دەدا لە سەر چاکەکاران. واتە بەشێکی زۆر لە ژیانیان تەرخان دەکەن بۆ خزمەتی ئینسان کە لە کۆیلەیی و ژێردەستیدا نەمێنێ، و بەشێکیشی بۆ ئەنجامدانی ئەمانەتەکانی ئیلاهی وەک نوێژ و ڕۆژوو و زەکات دەکار دەکەن. جا بۆ ئیسباتی ئەو مەتڵەبە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٧٧ی بەقەرە کە ڕوونی کردۆتەوە ئیمان و باوەڕی چییە؟

> **(٢٧٧) إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِـمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ**
>
> **بێ گومان ئەو کەسانەی کە ئیمانیان هێناوە و کردەوە چاکەکان دەکەن و نـوێژان بەجـێ دێـنن و زەکاتی ماڵیان دەبەخشن، پاداشتی ئەوانە لای خودای پەروەردگاریانەوە لە ڕۆژی قیامەتیشـدا هیچ جۆرە ترس و خەمێکیان ڕوو تێ ناکات.**

## چاکەکاران و نوێژخوێنان و زەکاتدەرەکان بێترسن!

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٧٧:

خـودای تەعـالا دێـرەدا وا هەسـت پـێ دەکـرێ کە هەڕەشـە دەکـا لە سـوودخۆران بـۆیە دەفەرموێ ﴿وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُمْ مُّؤْمِنِينَ﴾ واتە دەس هەڵگرن لەو سوودەی کە ماوتـانە لە لای عالەما، لێیان مەستێنن، ئەگەر ڕاست دەکەن خـاوەن بـاوەڕن و بە پێـی فەرمـانی بـاری دەجووڵێنەوە. ئەگەر دەستیش هەڵناگرن و دەسبەردار نەبن لە سوودخواردن، چاک بزانن وەرنە

دەرێ و ئامادە بن بۆ شەڕ دەگەڵ خودا و پێغەمبەر. ئەو ئایەتە (٢٧٨) ئیعلانی شەڕە خـودا لێـی دەدا دەگەڵ سوودخۆرەکان.

لە ئـایەتی ٢٧٧ کە کەوتـۆتە نێـوان (ڕبـا) ئەوە دەردەکەوێ، ئەگەرچـی ڕاسـتەوخۆ ڕووی وەرگێڕاوە لە مەسەلەی سووخواردن، ئەوە دەکرێ بڵێین بە شێوەی وەعـز و ئیرشـاد هەر دەگەڵ سووخۆرانە چونکە ئەو ئایەتە (٢٧٧) مەبەستی ڕاستی ئەوەیە کەسـانێک ئـاوڕ بـدەنەوە وەسـەر دەستووراتی باری واتە لە سەر ئەساسی ئیمان و باوەڕیانەوە عەمەلی ساڵح بکەن و نوێژ بـکەن و زەکات بدەن و بپرینگێنەوە لە ڕبا خواردن، ئەودەم بێ‌گومان لە سۆنگەی ئەو هەڵوێستە چاک و پاکانەتـان دەبـنە خـاوەنی ئەجـر و پاداشـی گەورە لە کـن خـودای تەعـالا و هـیچ تـرس و دڵەڕاوکەش‌و نابێ لەوە کە لە ئەجر و پاداشدا کەم‌و بدرێتێ. و هەروا خەم و خەفەتـیش‌و نـابێ لەوەی ڕۆژی ئاخرەت تووشی عەزاب و ڕەنج بن.

بە کوردی ئەو ئایەتە (٢٧٧) هاوار و بانگاوازە لە سـوودخۆران وەلای ئەو مەبەسـتە: ئەگەر ئێوە خاوەن ئیمانن و ڕاست دەکەن، ئەو عەمەلانە ئەنجام دەن: کاری چاک و پاک بکەن، نـوێژ بکەن، زەکاتیش بدەن، دەسبەرداری سوودخواردنیش بن، ئەودەم هەم ئەجـر و پـاداش‌و لە کـن خودا دەدرێتەوە هەم ترسی ئەوەش داتانناگرێ کە لە ئاخرەتدا تووشی عەزاب ببن.

ئایەتی ٢٧٨ تەئکیـدی ئـایەتی ٢٧٧ دەکـا، بـۆیە دەچیـنە خـزمەت ئـایەتی ٢٧٨ کە دەوێـدا هەڕەشەی خودا چاو دەکەین لە بابەت سـوودخواردن، و حەتـا ئیعلانـی شـەڕ دەگەڵ خـودا و پێغەمبەری خودا:

﴿٢٧٨﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُمْ مُّؤْمِنِينَ

**ئەی خاوەن ئیمان و باوەڕان! پارێزگار بن و خۆتان لە غەزەبی خـودا بپـارێزن، و ئەو سـوودانەی کە لە سەر خەڵک ماوتانەتەوە و هێشتا لێتان وەرنەگرتوون، ئەگەر بەڕاستی خـاوەن ئـیمانن و باوەڕتان هەیە (بە خودا و بە پێغەمبەر و ڕۆژی ئاخرەت) دەسـتیان لـێ هەڵگـرن و وازیـان لـێ بێنن.**

## دەست لەو سوودانە هەڵگرن کە لە سەر خەڵک ماوتانە

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٧٨:

دەبێ لە پێش هەموو شتێکدا ئەوە بزاندرێ کە خودای وەعدە ڕاست و دروسـت وەعـدەی

داوە بەو کەسانەی کە دەسبەرداری سوودخواردن دەبن هەم ئەجر و پاداشی تەواویـان پـێ دەدا هەم ڕێگای خەفەت نادا سواری شانوملیان بێ. ئەدێرەدایە کە خودا پێیـان دەفەرمـوێ: (اتَّقُـواْ اللَّه) واتە بترسن لە خودا و خۆ لە قەرەی ئەو شتانە مەدەن کە خودا ڕێی پێ نەداون.

دە ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللَّه﴾ دەگەڵ ئایەتی﴿إِن كُنْتُمْ مُّؤْمِنِينَ﴾ شـتێک هەسـت پێ دەکرێ کە زەین نایقۆزێتەوە بە ڕەوانی، شتەکەش ئەوەیە: هەرکات کوترا ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ واتە ئەی خاوەن ئیمانان! ئەوە دەیسەلمێنێ کە ئیمانی هەیە ئەو کەسەی خودا هەرای لێ دەکـا، کەوابــێ جــوملەی ﴿إِن كُنْــتُمْ مُّــؤْمِنِينَ﴾ واتە ئەگەر ئـیمانو هەیە. ئەئەو شـێوە مانــایە دڵ دەهارووژێنێ دەوەیدا کە خودا دەبێ مەبەستی چ بێ؟ دڵ دەڵێ: دەبێ ئەو دوو جوملە ئایەتـانە ئاوا بەراوەرد بکرێ و تەعبیر کرێتەوە:

١. واتە ئەی ئەو کەسەی کە خاوەن ئیمانی، بۆ ئیسباتی ئیمانت وەگەڕێ لە خـراپە، ئەگەر دەڵێی ئیمانم هەیە.

٢. واتە ئەی ئەو کەسەی پێش ئەو کارە ناڕەوایەت ئیمانت هێناوە، جا ئەگەر ڕاست دەکەی ئیمانت هەیە و هێناوتە، لەو کارە خراپە دەس هەڵگرە.

٣. ئەی ئەو کەسەی خـاوەنی ئیمانـی، ئەگەر ڕاسـت دەکەی ئیمانـت هەیە و دەشـتهەوێ وەمێنێ ئەو ئیمانەت وەکەوە لەو سوودخواردنەت.

۴. ئەی ئەو کەسەی خاوەنی ئیمانی بە زمان، ئەگەر دەشڵێی ئیمانی من هەر بە زمـان نیـیە بەڵکە بە دڵیشە، وەگەڕێ لەو سوودخواردنە.

لە ئیبنیعەباسەوە نەقڵ کراوە گۆیـا هـۆی دابەزینـی ئـایەتی ٢٧٨ ئەوە بـووە: هەنـدێک لە «بنــیثقیفە»کــان و هەنــدێکیش لەوانە کە ئەهلــی مەکــکە بــوون دە دەورانــی جاهلیەتیانــدا سەروکاریان زۆر دەگەڵ مامەڵەی ڕبادا بووە، بەڵام کاتێ کە فەتحی مەککە کرا، پێغەمـبەرﷺ لە نـاو ئەهلــی مەکـکەدا ئیعلانــی دا و خــوتبەی دەرکـرد و خوێنـدیەوە کە لەوە بەدوا ئەو یاسـایە جاهلییانە واتە مامەڵەی سوود دەبێ نەکرێ و نەمێنــێ، و هەرچــی لەوە پێشـیش کـراوە مـایەکە بدرێتەوە بە خاوەنی سـوودەکە نەدرێـتەوە دەبــێ دەسـتی لــێ هەڵگـرن. هەوەڵـین کەسـێک کە ئیستیقبالی لەو ئەمرە کرد عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب بوو چونکە ئەو لە تـاجرە گەورەکـانی مەککە بوو، دە ڕباشدا دەستی باڵای هەبوو، کە دەو کاتەشدا حیسابی زۆری سـوودی لە سـەر عالەمی بوو، دەستی لە هەمووی هەڵگرت. و هەروا لە ئەهلــی مەکـکە لەوانــی کـافر سـوودی

عالەمیان لە سەر بوو توانای دانەوەشیان نەبوو بە هۆی ئەو یاسایەی ئیسلام هاتن ئیمانیان هێنا چونکە پێیان خزمەتێکی گەورە بوو بە نەدار و هەژاران.

ئەمما ئەو دوو هۆزەی «بنی مخزم» و «بنی ثقیفه» دەستیان لە سوودەکە نەدەتوانی هەڵگرن، چونکە سوودەکەیان هەم زۆر بوو هەم بە زەرەرێکی گەورەیان دەزانی ئەگەر وازیان لێ هێنابا. لەولایەشەوە ئەمری پێغەمبەری لەسەر بوو نەشیاندەتوانی دەستی لێ هەڵنەگرن، بەتایبەتی کە تازە پێغەمبەرﷺ مەککەی گرتبوو خەڵک شەرمی دەکرد لە قودرەتی و لەولایەشەوە ئەوانەی پێیان قەرزدار بوون پشت‌ئەستوور بوون لە سەر نەدانەوە چونکە دەستووری لە سەر درابوو لە لایەن دەستەڵاتی ئیسلامەوە. ئەو دوو قەبیلەیە (بنی مخزوم و بنی ثقیفه) ناچار بوون جەریانەکەیان بردە لای حاکمی مەککە، ئەوزەمانیش والی مەککە عەتاب کوڕی ئەسەد بوو. والی نەیتوانی هیچ ڕێگەیەکیان بۆ دیاری کا واتە نە دەست هەڵگرن لە وەرگرتنی، نە دەست بکەن بە وەرگرتنی. ئەو جەریانەی بە پێغەمبەری ڕاگەیاند، پێغەمبەریش بۆ وڵامەکەی هەڵوێستەیەکی گرت و پاشان ئەو ئایەتە ٢٧٨ی بۆ نازڵ کرا هەر بە دووی ئەویشدا ئایەتی ٢٧٩شی بۆ نازڵ بوو، واتە ئەو دوو ئایەتە پشتە سەری یەک دابەزین، بۆ خاتری ئەوە ئەولاولا و بەهانە نەنوێنن. جا بنی‌ثقیف و بنی‌مخزوم ئاوایان دی و تێگەیشتن ملیان بە لاوە نا و تەسلیمی دەسبەردار بوونی سوودەکە بوون چون دەیانزانی ناتوانن بەرەنگاری ئیسلام بن دەو کاتەدا بە ناچاری کوتیان جا ئەگەر وایە سوودەکە هیچ، با بڕوا؛ ئەسڵی ماڵەکەی خۆمان دەنەوە. ناچار ئەو بەنی‌سەقیفانەی کە ماڵی بەنی‌سەقیف و بەنی‌مەخزوومیان لە لابوو پاڕانەوە تاکوو میوەجاتیان دێتە حاسڵ و دێتە کاتی چنین و بەرهەم لێیان ڕاوەستن، ئەوانیش لە حەیفی جەریان دەیانکوت ڕاناوەستین. دووبارە خودای تەعالا بۆ حەلی ئەو گرێیەش ئایەتی ٢٨٠ی نازڵ کردە سەر پێغەمبەرﷺ. (تفسیر کبیر، ج٧، ل ١٠۶)

جا بۆوەی لە سەر و بنی جەریانەکە حاڵی بین دەچینە خزمەت ئایەتەکانی ٢٧٩ و ٢٨٠ بە تەرتیب سەیریان کە:

**﴿٢٧٩﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ**

**ئەگەر دەست‌بەردار نەبن و دەس لە سوودخواردن هەڵنەگرن دڵنیا بن و بزانن ئەوە شەڕتان دەگەڵ خودا و پێغەمبەرەکەیدا بەرپا کردووە بەڵام ئەگەر تۆبەتان کرد، سەرمایەکە هەر ئی**

**خۆتانە، بەو شێوەیە: نە زوڵمێ لە کەس دەکەن و نە زوڵمیشیان لێ دەکرێت.**

﴿٢٨٠﴾ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ
**ئەوانەی کە قەرزدارتانن ئەگەر نەدار و دەستەنگن لێیان بوەستن تا ئەو کاتەی دەیانبێ و دەروویەکیان بۆ دەکرێتەوە، ئەگەر بشیانبەخشن ئەوە خێرترە بۆ ئێوە ئەگەر بزانن.**

## شەڕ دەگەڵ خودا و پێغەمبەر

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٧٩ و ٢٨٠:

لە سەر ئەو ئەساسەی کە خودای تەعالا تەپڵی شەڕێی لێدا دەگەڵ سوودخۆران ئەگەر دەس‌بەردار نەبن، دەردەکەوێ کە ئەو هەڕەشە گەورەیە هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەو عەمەلە ناڕەوایە (سوودخواردن) گەورەترین تاوان بێ دەناو کۆمەڵگادا. چونکە نێرگە و بارودۆخی ژیانی کۆمەڵ بەستراوەتەوە بە ئیقتساد. سوودخواردنیش زەربە لە حەیاتی ئیقتساد دەدا و نابوودی دەکا. ئەودەم کە ئیقتسادیش نەما شەڕ و هەرای دەوڵەتان هەڵدایسێ و دادەگیرسێ و عالەمیش لەناو دەچێ و وڵاتیش وێران دەبێ. بێ‌گومان هۆی دواکەوتنی قەدەغەی سوودیش لە قەدەغە کردنی خەتا و گوناهەکانی دیکە دێرەدا. هەر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە سوودخواردن تاوانێکی زۆر گەورەی کۆمەڵایەتییە و هەروا ئەوەش کە ئایەتی قەدەغە کردنی سوود لە پێش کۆچی پێغەمبەرﷺ بە چەند ڕۆژێک دابەزی نیشانەی گوناهێکی گەورەی کۆمەڵایەتییە.

ئەوە کە خودای تەعالا دەفەرموێ دەسمایەکەیان دەبێ بدرێتەوە بە سوودخۆرەکان، بە مەرجێ کە دەستیان لە سوودەکە هەڵگرت، نیشانەی ئەوەیە لە مەمک دابڕانی یەکدەفعە نەخۆشی دێنێ، واتە ئەگەر پێغەمبەرﷺ دەستووری دابا کە بەرەی سوودخۆرەکان بە سەرمایە و سوودەکانیشیانەوە دەبێ دەس هەڵگرن یەک کەڕەت لەوانەبوو بێ‌نەزمی و نەختە زوڵمێک هاتبا ڕوو بە نیسبەتی خاوەن سوودەکان. جا بۆیە سەرمایە گەڕانەوەکەیان بۆ لایان کرایە مەرجی دەسهەڵگرتنیان لە سوودەکە. تاکوو زۆریان عەزابی ڕۆحی بۆ نەیەتە پێش و ئاژاوە بخوڵقێنن.

و هەروا لەولایەشەوە کە خودا فەرمووی: ئەوانەی قەرزداری ئەسڵی مایەکەن، دەبێ ئەگەر بێ ماڵ و سامان بوون دەو کاتەدا بۆیان نەدرێتەوە، مۆڵەتیان لێ بگیردرێ تاکوو هەلێکیان بۆ هەڵدەکەوێ و دەیدەنەوە. ئەو دەستوورە جوانە هۆیەکەی دەگەڕێتەوە وەلای ئەوەی ئەگەر ناچار کرابان ئەوانەش، نێزیک بوون لەوەی ئاژاوە بخوڵقێنن لە بەر نەداری و ڕووت و ڕەجاڵی

خۆیان و خەڵکیشیان ڕەگەڵ بکەوتایە. جا ئەگەر بە وردی سـرنج بدرێتە ئەو یاسا جوانە ئەوەت بۆ دەردەکەوێ کە ئایینی ئیسلام دەگەڵ ئاژاوە و ناکۆکی و بێ‌نەزمی نیە، ئەوەی دەگەڵ ئەوانەیە باری ئایینی لاوازە و نایزانێ.

دە ئایەتی ﴿فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ﴾ چەن پرسیار دێتە ڕوو پێوست بە وڵامدانەوەن:

١. ئایا ڕووی ئەو هەڕەشانە دەگەڵ موسوڵمانانێکە کە دەس‌بەرداری سوود نین؟ یـا دەگەڵ کافرەکانە؟ دیارە دێرەدا بە پێی ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنـتُمْ مُّؤْمِنِينَ﴾ ڕووی هەڕەشەکەی دە موسوڵمانانە.

جا ئەوجار چۆن خودا ئیعلانی شەڕ لێدەدا دەگەڵ موسوڵمانان؟

وەڵام: شەڕی خودا دەگەڵ کەسانێکە کە بە درۆ خۆیان بە ئایینی ئیسلامەوە هەڵاوەسـیوە، بۆیان ئیسلام کردۆتە پەناگا تا لەوێرا تیریان لە سینەی عالەمی بێ‌دەستەڵات بـدەن، دەنـا خـودا شەڕی دەگەڵ موسوڵمانان نییە، چونکە خـودا (وليّ الَّذِيـنَ آمَنُـواْ) واتە خـودا دۆسـتی خـاوەن ئیمانانە.

ئەوجار پێغەمبەریش فەرموویەتی (مَن لَم يَدْعُ المخابَرَةَ فَلْيَأْذَنْ بِحَرْبٍ مـن اللـه و رسـولِهِ) ئەوجار ئایەتی ۳۳ی مائیدە: ﴿إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ﴾ ئەوە سابت دەکـا کە خـودا ئیجازەی شەڕی دەگەڵ خائینانی موسوڵمانانی بەدرۆ داوە.

هەموو ئەو دەلیل و بەڵگە ئایەتانە هاواری ئەوەی دەکەن سوودخۆر شـەڕی دەگەڵ ئـایینی خودایە، خوازیاری نابوود کردنی جامعەیە و ئاغایەتی خۆی لە سەریان دامەزرێنێ.

مێژوونووسەکان و ئیبنی‌عەباس کوتوویانە: ئەو ئایەتانەی کە دە بابەت ڕبادا نازڵ بوون بـۆ پێغەمبەرﷺ، پاش نازڵ بوونی وان پێغەمبەرﷺ ۳۱ ڕۆژ ژیاوە، حەتـا هەنـدێک دەڵـێن: نـۆ ڕۆژ پێش وەفاتی پێغەمبەرﷺ نازڵ بوون. (روح المعانی، ج۳، ل ۷۴؛ تفسیر کبیر، ج۷، ل۱۱۱)

ئەوجار هاتین گەیشتینە داکوژاندنی باسی ڕبا واتە سوودخواردن و بۆ ئاخرین ئامۆژگـاری ئایەتی ۲۸۱ دەکەین سەرقەپاغ. ئەگەر تین و گەرمـایی ئـیمان و بـاوەڕی هەبـێ لە نـاو تـاس و کاسەی دڵ و لەشـەوە زۆر بە ئاسـانی دەکـرێ دەس لە هەچـی خەیـانەتە بە حەیـات و مـافی ئینسانی هەڵگرێ. ئەگینا ئەوەی دەکا کە ئەوەڕۆ لە بەرچـاوە، حـاکمان دەڵـێن ئـێمە خەلـیفەی خوداین و سەرپەرستی موسوڵمانانین کێ بخنکێنین و تەجاوەز بە مـافی کـێ بکەیـن، ئەمـری خودان پێیە. پەنا بە خودا لەو بوختان و درۆیە!

﴿٢٨١﴾ **وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ**
**بترسن لە ڕۆژێ کە وا دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا، پاشان هەموو کەس پاداشی کردەوەی خۆی بە تەواوی پێ دەدرێت و ستەمیشیان لێ ناکرێت.**

## تەرازووی حیساب

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٨١:

دەبێ ئەوە بزانـدرێ کە ئەو ئـایەتە ٢٨١ لە بـارەی ئەو بازرگـانە گەرانەی کە دە مـامەڵەی سوودیدا سەرگەرم بوون دابەزیوە. کە ئەو بازرگانانە ببوونە خاوەنی سەروەت و سامانێکی زۆر کە بە هۆی ئەو سـامان و دارایـیەی لافـی سـەروەری و ئاغایەتییـان بە سـەر خەڵکـی هەژار و دەستکورتدا لێ دەدا. واتە گەیشتبوونە ئەو ڕادەیە ئەگەر خودا هەسی نەدابانەوە و لێی قەدەغە نەکردبان لەوانەبوو ئیدیعای خودایەتییان بکردایە بە سەر عالەمدا.

لە ئیبنیعەباسەوە: ئەو ئایەتە (٢٨١) لە دواترین ئایەتە وەحی کراوە بۆ پێغەمبەرﷺ، چـونکە پێغەمبەر کاتێ حەجی ویداعی کـرد ئـایەتی کەلالەی بـۆ نـازڵ بـوو واتە ﴿يَسْـتَفْتُونَكَ قُـلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ﴾ (نساء: ١٧٦) ئەوکاتەی کە حەزرەت لە عەرەفە وێستابوو ئایەتی ٣ی سوورەی مائیدەی بۆ هات جا پاشان ئەو ئایەتە (٢٨١)ی بەقەرەی بـۆ دابەزی. گۆیـا حەزرەتـی جبرەئیـل فەرمووی: ئەی محەمەدﷺ! ئەو ئایەتە ٢٨١ە لە سەر ئایەتی ٢٨٠ی بەقەرە دانێ. گۆیا پـاش ئەوە پێغەمبەر ٨١ ڕۆژ ژیاوە، هەندێکیش دەڵێن ٢١ ڕۆژ، هەشـن دەڵـێن ٧ ڕۆژ، هەشـن دەڵـێن سـێ کاتژمێر ژیاوە. (زمخشری، کشاف، ج١، ل٣٢٣)

### دابەزینی چەند ئایەت بە دووی یەکدا بۆ پێغەمبەر

ئاوڕێک وەسەر ئەو ئایەتانەی دەو کاتانەدا دابەزیون بۆ پێغەمبەرﷺ لەپڕتـاو پشـتی سـەری یەک:

١. ئایەتی کەلالە:

﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَـا نِصْـفُ مَـا تَرَكَ﴾ **سـەبارەت بە کەلالە داوات لـێ دەکەن ڕا دەربـڕی، بڵـێ: خـودا سـەبارەت بە کەلالە ڕا دەردەبـڕێ، ئەگەر پیاوێک مرد و هیچ منداڵی نەبوو، بەڵام خوشکێکی بـوو، لە میراتـی ئەو پیـاوە خوشـکەکە نیـوەی هەیە.**

٢. ئایەتی ٣ی مائیدە کە دەو کاتەی لە عەرەفە وێستابوو وەحی کرا:

﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا﴾ ئەورۆ ئایینەکەتانم بۆ تەواو کردن و ناز و نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن و ئیسلامیشم بۆ هەڵبژاردوون بە ئایین.

جا لە پاش ئەوانەوە ئایەتی ﴿وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾ ﴿٢٨١﴾ بەقەرە دابەزی.

مەبەست لە (ترجعون)دا ئەوە نییە شوێنێک هەبێ و خودا لەوێ بێ و عالەمیش بچێتە لای، بەڵکە ئینسان لە عالەمی تەکلیفەوە دەچێتە عالەمی بەرهەمی ژیانی و ئاگاداری بە سەر کردەوەکانی لە ژێر چاوەدێری عیلمی باری.

سەیری ئایەتی ٧ی موجادەلە بکە تاکوو لەوبارەوە باش تێبگەی: ﴿أَيْنَ مَا كَانُوا ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ لە هەر کوێیەکدا بن هەر خودایان دەگەڵە، پاشان ڕۆژی پەسڵان هەواڵی ئەو شتانەیان دەداتێ کردوویانە. بێ گومان خودا لە هەموو شت ئاگادارە.

ئینسان بە مەرجێ بفامێ سەیری دەزگای زانستی ئەورۆ بکا کە بە یەک دوگمە و ژمارەی پێناست تەواوی ئاکارەکانت دێنێتە ڕو، فەورەن و بێڕامان و دامان باوەڕ دەکا بەوەی خودا ڕۆژی خۆی بە ئاسانی کردەوەکانی ئینسان نیشانی ئینسانی دەدا.

ئایەتی ﴿ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ﴾ بێ گومان ئەوە چونکە بە پێی وەعدەی خودا دەبێ هەموو کەس بە پاداشی عەمەلی خۆی بگا، هەروەک دە ئایەتی ٧ و ٨ی سوورەی زلزلەدا دیاری کراوە: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴿٨﴾﴾ جا هەرکەس تۆزە چاکەیەکی کردبێ، دەیبینێتەوە، و هەرکەس تۆزە خراپەیەکی کردبێ دەیبینێتەوە.

یا دەڵێین بە دەلیلی ئایەتەکانی ١٦ی لوقمان و ٤٧ی ئەنبیاء دەبێ کوللی ئینسانێک کردەوەکانی بە ڕوودا بدرێتەوە و بە پاداش و بە جزایان بگا. سەیر کە:

لقمان ﴿١٦﴾ يَا بُنَيَّ إِنَّهَا إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ

ئەی ڕۆڵەکەم ئەگەر چاکەیەک یا خراپەیەک بەقەدەر وەزنی دانە خاشخاشکێک بێ هەتبێ، یا خۆ لە ناو بەردێکدا بێت یا لە ناو ئاسمانەکاندا بێت یا خۆ لە سەر زەویدا بێت، خودا دەیهێنێت، بەڕاستی خودا زۆر وردبین و ئاگادارە.

انبياء ﴿٤٧﴾ وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ

خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ

**دادنێین تەرازووی دادگەری لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەوسا هیچ کەس هیچ زوڵمێکی لێ ناکرێت، ئەگەر ئەوەندەی دانە خاشخاشکێکیش بێ دەیهێنین، خۆشمان بەسین بۆ حیساب و کیتاب کردن.**

دابەزینی ئەو ئایەتانە هاوارن لە ئینسانی کە بەرەو ئەو ڕۆژە دە ڕێیەدای چت چاندبێ دەیدروویەوە.

یەکێک دێ دەڵێ خودا جا چۆن بەو هەموو ڕەحم و بەخشش و کەرەمەی هەیەتی، بەندەیەکی ژێردەستی بێ دەستەڵات دەسووتێنێ، بۆخۆشی دروستی کردبێ؟

وەڵام: ئەمەش دەڵێین ئەو بەندەیە بۆخۆی خۆی دەسووتێنێ بە هۆی زوڵمێکی لە خۆی کردووە لە دنیادا، دەنا خودا کەس ناسووتێنێ و زوڵمێ لە کەس ناکا.

## پوختەیەک لە سەر زەرەری ڕبا

دەبێ ئەوانەی خاوەن ئیمان و باوەڕن ئەوە قبووڵ کەن کە خوڵا ئینسانی خۆش‌دەوێ و ناخۆشی ناوێ و کاری واش ناکا و بە ڕەوای نادێرێ کە زەرەری بۆ باری ژیانی کۆمەڵایەتی ببێ و هەرچی حەڵاڵی کا بۆ ئینسان بێ‌گومان بە قازانجی ئینسانە و هەچی حەرامی کا لە ئینسانی، بێ‌گومان زەرەری بۆ ئینسان دەبێ و هەیەتی بۆیە حەرامە. جا وا هەیە ئینسان دەرکی ئەو زەرەر و قازانجەی ناکا و دەبێ ئینسان ئەوەش بزانێ کە خودا ئایینی ئیسلامی بۆ ئینسان هەڵبژاردووە سەراپای بە قازانجی ئیسلامە، چونکە ئیسلام ئایینێکی پێکەوە ژیانە و پێکەوە ژیانی دەوێ. ئایینی سوڵح و سەفا و گوزەشتە، ئایینێکی ڕەقەبەری نییە و ئیحتیڕامی بۆ ماف و موقەدەساتی هەموو کەس داناوە. کەوابێ ئەو ڕبایە واتە ئەو سوودخۆریەی بۆیە قەدەغە کردووە لە ئینسانی چونکە سەراپای زەرەی ئینسانی تێدایە .

ئەگەر ئاقڵانە و بە ئینسافانە مەسئەلەی ڕبا هەڵسەنگێنین شتانی زۆر زەرەری تێدا دەدۆزینەوە، ئیشارە بە هێندێک لەو زەرەرانە دەکەین:

١. ڕبا سامان و ماڵێکی زۆر کۆ دەکاتەوە سوودخۆر بێ بەها و زەحمەت و دەردی‌سەری

٢. ڕبا کینە و حەسادەت دەچێنێ و دەخاتە ناو جامعە بەتایبەت هەژاران دە بەرابەر خاوەن سامانان

٣. ڕبا ڕیشەی سەفا و ڕەحم و خۆشەویستی دەفەوتێنێ دەناو جامعەدا

٤. ڕبا ئەرزش و کەسایەتی ئینسانی لە ناو دەبا

٥. کۆمەڵگایەکی نیزامی سوودخۆری تێدا بێ، ئیسلامی بە مانای واقعی تێدا نابیندرێ

٦. ڕبا کەسێک پابەندی نیزامی ئایینی ئیسلام بێ دەبێ ئەوەی لێـی قەدەغە کـراوە بـۆ لای نەچێ

کەوایە دەبێ دە جوابی ئەو کەسانەی کە دەڵێن دۆخ و چەرخەی باری ئیقتسادی ئەوڕۆ بێ تجارەتی سووداری ناچەرخێ کەوابێ زەروورییە ڕبا ببێ، ئاوا بدرێتەوە دیـدگایەکی غەڵەت و بێ‌ئەساسە ئەو فکر و خەیاڵە، ئەوە تەبلیغاتی سەرمایەدارانی تاغووت سـیفەتانە چـونکە خـودا زاناتر و بەبەزەتره بۆ ئینسانی، ئەگەر زانیبای کەشتی ژیانی عالەم بێ ڕبـا غەرق دەبـێ قەدەغەی نەدەکرد.

شەهید سەید قوتـب پـایەی ئیقتسـادی چ ئەوڕۆیـی و لەوە بەدواش بڵێـین ئەگەر لە سـەر ئەساسـی سـوود و ڕبـا نەبـێ دەوام نـاهێنێ ژیـانی عـالەم هەڵناسـووڕێ خەیـاڵێکی درۆ و بێ‌ئەساسە. بەڵکە ئێمەی موسوڵمان و خاوەن باوەڕ بە دەسـتووراتی ئیسـلامی دەو یەقیـنەداین نیزامی ڕبا و سوودخۆری ڕۆژی ئیتقسادی دنیا تووشی لە بەر یەک هەڵوەشان دەکا.

ئەو نەزەر و دیدگای درێژ و قووڵی قورئانییە.

## ڕبا دە قورئانی حەکیمدا

خودای خاوەن حـیکمەت و حەکـیم دە چـوار سـوورەی قورئانـدا دە ١٠ ئـایەتی پیـرۆزدا حەرامی ڕبای ڕاگەیاندووە و ئینسانی لە حەرامی و لە زەرەرەکان خەبەردار کـردۆتەوە، حەتـا بە ئینسانی ڕاگەیاندووە بە توندی کەسێک دەسبەرداری سوودخۆری نەبێ، دەکەوێتە شـەڕ دەگەڵ من و ڕەسوولی من.

لە ئایەتی ٢٧٥ی بەقەرەدا تا ئەیەتەکانی ٢٧٦، ٢٧٨، ٢٧٩ و ٢٨٠ حەرامی ڕبا ڕاگەیێندرا وەک دەزانن دانە بە دانە مانا کران و تەفتیش کران بە تەواوی پێویست ناکا دووبارە وەردیان دەینەوە کە بە شیددەترین هەڕەشەیان تێدا دە هیچ گوناهێک نەبینراوە و نەبیسـراوە.

ئایەتێکیان دە سوورەی ئالی‌عیمراندا ئایەتی ١٣٠: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ الرِّبَا أَضْعَافًا مُّضَاعَفَةً وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتـان هێنـاوە چەن بەرابەر سـوود مەخـۆن، خوداش لێبوردەیە و دڵۆڤانە.

لەو دە ئایەتانەدا دوو ئایەتیان واتە ئایەتەکانی ١٦٠ و ١٦١ی سوورەی نیساء لەسـەر قەدەغە کردنی ڕبا نازڵ بوون: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن

سَبِيلِ اللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ الرِّبَا وَقَدْ نُهُواْ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦١﴾﴾ **کەواتە بە هۆی ستەمێکەوە کە لە لایەن یەهوودیەکانەوە کرا ئەو شتە پاک و خاوێنانەی کە بۆیان حەڵاڵ کرابوو لێیان حەرام و یاساغ کردن بە هۆی زۆر کۆسپ دروست کردنیش لە سەر ڕێبازی خودادا ﴿١٦٠﴾ هەروەهاش بە هۆی سوود وەرگرتنەوە کە بێگومان لێیان قەدەغە کرابوو و خواردنی ماڵی خەڵکیش هەروا بە ناهەق، ئێمەش سزایەکی بەژانمان ئامادە کرد، بۆ ئەوانەیان کە بێ بڕوان. ﴿١٦١﴾**

ئایەتێکی دیکەش لەو دە ئایەتانەی کە لە سەرحەرامی سوود هاتووە ئایەتی ٣٩ی سوورەی ڕۆمە: ﴿وَمَا آتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَ فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلَا يَرْبُو عِندَ اللَّهِ وَمَا آتَيْتُم مِّن زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ﴾ **ئەوەی بە ناوی سوود دەیدەن بۆ ئەوەی پیت و زێد بکەوێتە ماڵی خەڵک لە لای خودا زیاد ناکات و پیت و فەڕی تێناکەوێ بەڵام ئەو زەکاتەی کە لە بەر خودا دەیدەن کەواتە ئائەوانەن خاوەنی پاداشی چەن بەرابەر.**

بە کوردی و بە کورتی: ئەو چەن ئایەتانە دراون بە بنانگوێ بازیگەرانی سوودخۆر، ئەمما ئەوان کە دەسبەرداری نابن وەک ئەوڕۆ کە هیچ بانکێک بێ ئەو حاڵەتە، ناگەڕێ و حەتا بۆتە یاسایەکی زەرووری، دوو تەعبیر لە دەروونی ئەو کەسانەی کە دەسبەردار نابن دەدرێتەوە:

١. ماڵ و سامانی دنیایان پێ لە هەچی شتە پێ لە پێشترە و موقەدەسترە و حەتا پێیان وایە هەدەف لە خەڵقی ئینسان ژیانی دنیایە، ئەولا هەر هەوایە.

٢. باوەڕیان بە ئایین و مەکتەب و وەحی نییە، ئارەزوو و خەیاڵاتی دەروونی خۆیان ڕێبەریان دەکا، هەروەک دە ئایەتی ٤٣ی فورقاندا ئیشارەی وەلا کراوە: ﴿أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا﴾ **ئایا ئەی محەممەدﷺ ئەتۆ ئەو کەسەت دیوە کە هەوا و هەوەسی خۆی کردووە بە خودای خۆی (پەیڕەوی لێ دەکا و شوێنی دەکەوێ) ئایا تۆ دەبیتە پاسەوان لە سەری؟**

هەروەک دەزانین خودای بانیسەر بە هۆی ئایەتەکانی ٢٧٥ تا ٢٨٠ی بەقەرە لە سوودی بە قەرزی حاڵی کردین بە تێروتەسەلی، ئەوجار پاش بەجێگەیاندنی ڕوون کردنەوەی ڕبا ئەوجار خودا دەیهەوێ لە مامەڵەی بێ ڕبای شەرعمان حاڵی کا چونکە کۆمەڵی ئینسان بەشێک لە ژیانی وابەستە بە مامەڵە و تیجارەتە، نیازی تەواوی پێیەتی جا بۆیە خودا دەیهەوێ کە ئینسان لە هەموو بوارەکانی مامەڵە دە پێشدا باری شەرع و حەڵاڵی شتەکە لە بەر چاو بگرێ و لە هەموو دەر و دەروازە و کون و کەلێنی مامەڵەکە ڕێگەی ڕبای لێ ببەستێ و مامەڵەکەشی لە سەر ئەساسی سەنەد و شاهید و نووسراوە بێ. جا بۆ ئەو مەبەستە و لێحاڵیبوونیش دەچینە

خزمەت ئایەتی ٢٨٢ی بەقەرە:

﴿٢٨٢﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ وَلاَ يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللّهُ فَلْيَكْتُبْ وَلْيُمْلِلِ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ وَلْيَتَّقِ اللّهَ رَبَّهُ وَلاَ يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئًا فَإن كَانَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لاَ يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ بِالْعَدْلِ وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى وَلاَ يَأْبَ الشُّهَدَاء إِذَا مَا دُعُواْ وَلاَ تَسْأَمُوْاْ أَن تَكْتُبُوْهُ صَغِيرًا أَو كَبِيرًا إِلَى أَجَلِهِ ذَلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ اللّهِ وَأَقْومُ لِلشَّهَادَةِ وَأَدْنَى أَلاَّ تَرْتَابُواْ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلاَّ تَكْتُبُوهَا وَأَشْهِدُوْاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ وَلاَ يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلاَ شَهِيدٌ وَإِن تَفْعَلُواْ فَإِنَّهُ فُسُوقٌ بِكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللّهُ وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ

ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان هێناوە! کاتێ قەرزو دەگەڵ یەکتر کرد بۆ کاتێکی دیاری‌کراو تۆماری کەن، با نووسەرێک لە نێوانتاندا بە دادگەری بینووسێ، با هیچ نووسەرێک سەرپێچی لەو نووسینە نەکا کە خودا فێری کردووە، دەبا بینووسێت با ئەو کەسەی قەرزەکەی دە ئەستۆدایە، دەقی نووسینەکەی بڵێت. با لە خودای خۆی بترسێ و هیچی لێ کەم نەکاتەوە گەر ئەو کەسەی قەرزەکەی لە ئەستۆدایە گێل یا منداڵ یا پیری پەک‌کەوتە بوو یان نەیدەتوانی دەقەکە بۆ نووسەر بڵێ بە باشی با سەرپەرشتەکەی دەقەکەی بۆ دادگەر بڵێت دوو پیاو لە ناو خۆتاندا بە شایەت بگرن ئینجا ئەگەر دوو پیاو نەبوو با پیاوێک و دوو ژن بن بۆ شاهیدی، لەوانەی وا بە دڵتانن بۆ شاهیدی، تاکوو ئەگەر یەکێکیان لە بیری چۆوە ئەوەی دیکەیان وەبیری خاتەوە، ئەو شاهیدانە هەرکاتێ بۆ شاهیدی بانگ دەکرێن با سەرپێچی نەکەن، شاهیدی حەق و ڕاست بدەن. ماندوو مەبن لە نووسینی قەرزەکانتان با زۆریش بێ، تا گەیشتنی ماوەی قەرزەکە کەم یا زۆر بێت ئەو نووسینەتان لای خودا زۆرتر دادگەری تێدایە و پاڵپشتێکی پتەوترە بۆ شاهیدی و زۆر نزیکە نەکەونە گومانەوە، مەگەر کاتێک مامەڵە و بازرگانیەکەو نەخت بێ و لە ناو خۆتاندا دەست وە دەست وێکی دەن، لەو کاتەدا ئەگەر نەشی‌نووسن گوناحتان ناگاتێ. شاهید بگرن هەرکاتێ مامەڵەتان کرد، نابێ زەرەر بە نووسەر و شاهید بگەیێندرێ. ئەگەر زەرەرتان بە نووسەر و شاهید گەیاند ئەوە بەڵگەی خراپە و لە ڕێ لادانتانە، ترسی خودتان دە دڵدا بێ خوداش ئەوەی قازانجتانە فێرتان دەکات، خوداش ئاگاداری بە سەر هەموو شتدا هەیە.

## سەبارەت بە قەرز وەرگرتن

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٨٢:

ئەو ئــایەتە درێژتــرین ئــایەی قورئــانە، واش پێــی دەکــوترێ ئــایەتی (مــداینە) هەروەک ئایەتەلکورسی درێژە ئەو ئایەتەش درێژە، هۆی درێژی ئەو ئــایەتە دەبــێ ئەوە بــێ کە بە درێــژایە بوونی ئینسانی لە سەر زەوی لە مامەڵە و تیجارەت بێ نیاز نابێ ئینسان، کەوایە دەتوانین بڵێـین باڵای ئایەتی ٢٨٢ بە ئەندازەی باڵای ئینسانە لە سەر زەوی.

ئینجا بەو پێیە کە دەناو مامەڵەدا دوو شت ئەساسین و بنچینەی مامەڵەن کە دەبــێ ئەو دوو شتانە بزانین بە تەواوی و مانا و فەرق و جیاوازییان بەبێ زانینــی وان نــاکرێ لەنــگەری مــامەڵە ڕاگیرێ و سەر بگرێ، دوو شتەکەش ئەوەن: دەین ـ قەرز؛ کە ئەو دوو لەفزانەش لێک جیاوازن مانایــان، جــا بــۆیە لازم و زەروورییــە کە دەبــێ پــێش ئەوەی بکەویــنە مەیــدانی لێکــۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی مانای ئایەتەکە، مانای ئەو دوو وشەیە (دەین ـ قەرز) بزانین.

**دەین** بە وامێکی دەکوترێ کە کڕیار دە بەرابەر جنسێکدا هێنابیەتە ســەر ئەســتۆی خــۆی بە ڕەزایەتی فرۆشندە تا ماوەیەکی دیاری کراو. بۆ نموونە کــابرایەک دەڵــێ: ئێســتێ حــاڵی حــازر پارەم نیە بدەمێ با لە سەرم بێ دە فڵان کاتیدا پارەکەت دەدەمــێ. ئە بەوە دەکــوترێ دەیــن. واتە کڕیار قیمەتی ئەو پووڵە مەڕەی وە ئەستۆی خۆی گرتــووە کە دە کــاتی خۆیــدا بیــدا بە خــاوەن پووڵەکە مەڕەکە. بە کورتی دەین دە مقابل کالادا دەبێ.

**قەرز** بەدەلی ناوێ واتە دە بەرابەر شتدا نایەتە سەر شان. چــونکە قەرز دە ئــادابی شــەرعدا بە پارەیەک دەکوترێ کە قەرزدار بە پێی نیازی لە کەسێکی وەردەگرێ مەســەلەن کــابرایەک دێ سێ ملیۆن کە بارتەقای نیازیەتی لە منی وەردەگرێ تا کاتێ دەیبێ و دەمداتەوە. ئەو سێ ملیۆنە دە بەرابەر هیچ شتێکدا نییە، دە ئادابی شەرعدا بەو سێ ملیۆنەی کە کابرا وەریگرتووە دەکوترێ قەرز و پێی ناکوترێ دەین.

ئەدێــرەدا جیــاوازی لە نێــوان دەیــن و قەرزدا بە ڕوونــی دەردەکەوێ: دەیــن واتە دە بەرابەر کالایەکدا بێ، قەرز واتە دە بەرابەر هیچ شتێکدا نەبێ.

ئێستێ لە زۆر شوێناندا هەیە بە زۆری عالەم فەرقیان نازانێ بە قەرز و دەیــن، دەڵــێن «وام» چونکە فەرقیان نازانن.

## پوختەی مەبەست و لە نەزمدانی مانای ئایەتەکانی لە سەر ئەساسی نەزمی ئایەتەکان

١. ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ﴾ واتە ئەی خاوەن باوەڕ و ئیمان! کاتێ شتێکو کڕی کە بەهاکەو هاویشتە سەرە خۆ و شەرایتی ئەدا کردن و دانەوە و چەندەکەی بنووسن تاکوو بەرگری بکەن لە هەرای دوایە.

٢. ئایەتی ﴿وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ﴾ واتە با نووسەرێک لە نێوانتاندا بە عەداڵەت بینووسێ. دەو ئایەتەدا ئەدەب و ئینساف و دادگەری نووسەر دەڵێ دز و ئارەقخۆر و فاسد بۆ نووسەر نابێ.

٣. ئایەتی ﴿وَلاَ يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللّهُ﴾ واتە با نووسەر سەرپێچی لە نووسینی نەکا، خودا ئەو نووسەریەی داوەتێ. ئەو جوملەیە ئەوە دەڵێ کێ فەزڵ و هونەری دە خزمەتی گەلی بخا، خودا داویەتێ.

٤. ئایەتی ﴿فَلْيَكْتُبْ وَلْيُمْلِلِ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ﴾ واتە با ئەو کەسەی قەرزەکەی لە سەرە دەقی نووسراوەکە بڵێ. ئەو جوملە ئایەتە دەڵێ: ئینسان چەدەلبازە نووسراوە پێش بە ئینکاریەکەی دەگرێ.

٥. ئایەتی ﴿وَلْيَتَّقِ اللّهَ رَبَّهُ وَلاَ يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئًا﴾ واتە با لە خودای خۆی بترسێ هیچی لێ کەم نەکاتەوە. ئەوە دەڵێ ئەو ئایەتە: ئینسان بۆی هەڵکەوێ خۆ لە خودا دەکا بە هۆی فێڵ و فووت.

٦. ئایەتی ﴿فَإن كَانَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا﴾ واتە ئەگەر هاتوو خاوەن قەرزدارەکە گێل و دێوانە بوو و توانایی کارەکەی نەبوو با چاوسوورەکەی دەقەکەی بڵێت بۆ دادگەری. ئەو جوملە ئایەتە ئەوە دەڵێ: شێت و سەفی و دێوانە و منداڵ سەودایان دروست نییە.

٧. ئایەتی ﴿أَوْ لاَ يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ بِالْعَدْلِ﴾ واتە ئەگەر خڕیدار و قەرزدار نەیتوانی بەباشی دادوەر تێگەیێنێ با وەلی و چاوسووری سەرپەرشتی بکا. ئەوە ئەوەمان پێ دەڵێ پیری لەکارکەوتووش سەودای باش نییە.

٨. ئایەتی ﴿وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ﴾ واتە دوو شاهید لە ناو خۆتاندا بە شاهید بگرن. ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ: ئینسان سەری لە سەرپێچی لە حەق دەخورێ و دەیکا. بۆ هەسدانەوەی با شاهید ببن.

٩. ئایەتی ﴿مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء﴾ واتە لەو شاهیدانەی بۆ شاهیدی بە دڵتانن و دەبن. ئەو ئایەتە ئەوە دەڵێ: خەیانەتکار و نابار و بوختانچی و ئارەقخۆر و خاوەنی نەسەب و خزم نابێ.

١٠. ئایەتی ﴿وَلاَ يَأْبَ الشُّهَدَاء إِذَا مَا دُعُواْ﴾ واتە ئەو شاهیدانە کاتێ بۆ شاهیدی بانگ دەکرێن. ئەو ئایەتە دەڵێ: شاهید دەبێ ئامادە بێ بۆ شاهیدی.

١١. ئایەتی ﴿وَلاَ تَسْأَمُوْاْ أَن تَكْتُبُوْهُ صَغِيرًا أَو كَبِيرًا﴾ واتە ماندوو مەبن لە نووسینی قەرزەکانتان کەم یا زۆر. ئەوە ئەوەمان پێ دەڵێ ڕاستەوڕاست بن، خوارە وپێچەکە مەکەن.

١٢. ئایەتی ﴿ذَلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ اللّهِ وَأَقْومُ لِلشَّهَادَةِ﴾ واتە ئەو نووسینەتان لای خودا زۆرتر دادگەری تێدایە و پاڵپشتێکی پتەوترە بۆ شاهیدی. ئەو جوملەیە ئەوە دەڵێ شاهید و بەڵگە پشتیوانی واقیعەتن.

١٣. ئایەتی ﴿إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ﴾ واتە مەگەر کاتێ مامەڵەکە و بازرگانیەکە نەغد بێ و لە ئانێکدا دەستاودەست بێ. ئەو جوملە ئەوە دەڵێ ئەوەی بە چاو ببیندرێ حاشا هەڵناگرێ.

١٤. ئایەتی ﴿وَأَشْهِدُوْاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ﴾ واتە شاهید بگرن کاتێ مامەڵەتان کرد. ئەو جوملە ئەوەمان پێ دەڵێ: لە بەر لاساری ئینسان حەتا توندوتۆڵتر خۆ ئامادە کەی و خۆڕاگری هەر کەمە.

١٥. ئایەتی ﴿وَلاَ يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلاَ شَهِيدٌ﴾ واتە نابێ مامەڵەکە زەرەر بە نووسەر و شاهید بگەیێنێ. ئەو جوملە ئەوە دەڵێ ئینسان بە ماڵی دنیا فریو دەخوا و بە زوڵم و زۆر لە حەق تلاسا دەکرێ.

١٦. ئایەتی ﴿وَإِن تَفْعَلُواْ فَإِنَّهُ فُسُوقٌ بِكُمْ﴾ واتە ئەگەر بە نووسەر و شاهید زیانتان گەیاند ئەوە نشانەی خراپەکاریتانە. ئەو جوملە ئایەتە چمان پێ دەڵێ؟ دەڵێ لە خودا نەترس هەچی وازی لێ بێ دەیکا و لێی ئەمین مەبن و خۆی پێ مەسپێرن وەگ گۆشت بە پشیلە سپاردن وایە.

١٧. ئایەتی ﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ﴾ واتە ترسی خوداتان لە ناو دڵدا بێ. ئەو جوملە چمان پێ دەڵێ؟ دەڵێ پێمان: پشیلە ئەگەر لە ناو ماڵ نەبوو، مشک تلی‌لیلییانە واتە شاییانە.

کەسێکیش ترسی خودای دە ناو دڵدا نەبێ، پشیلەکانی شەیتانی لە ناو دڵیدا تلی‌لی‌لییانە.

١٨. ئایەتی ﴿وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ واتە خوداش ئاگادارە بە سەر هەمـوو شتدا. ئەو جوملە ئایەتە دەڵێ چی بە ئینسانی؟ دەڵێ دزی و خۆ دێر و دەوێ گرتن نە دەکرێ لە ڕاست خودا نە دەبێ قوتار بوون نییە لە دەستی خودا.

ئەگەر بتهەوێ و دەتهەوێ: کەسایەتی خۆت بە کەسایەتی قورئان بزانە چ زانینێک عەمەل؟ وەک ئەوانە نا کە نوختە بە نوختە و پیت بە پیت و لەفز بە لەفز و جوملە بە جوملە دەیـزانن هەر دەڵێی بۆخۆیان هۆندوویانەتەوە. ئەمما هەر ئەوەندەیە زانستەکەیان پێیدا بێن و بچن دەنـا هـیچ بەهرە و مێژۆکێکی لێ ناکەن.

نوور و تیشکی قورئان ل ەهەر دڵێکدا بێ گومان بێ گومان بێ گومان ئەو دڵە بۆگەن نابێ و بۆگەن نابێ و تاریک نابێ و تاریک نابێ. ئەوەی وا نازانێ گۆمی دڵی لێڵە و بنـی چـاو ناکـا تاکوو جەواهێراتی ناو دڵ چاو کا.

**تیوتیوە**

بەو هۆیەی کە مامەڵە پایە و ئەساس و بنچینەی نەشـە و نومـا و جـووڵانەوەی ئیقتسـاد و سـەرمایەی گەل و وڵاتە، پێویسـتە دار و لەلە و دەسـتووراتێکی زۆر تونـدوتۆڵ و تـۆکمەی دە پێناودا داڕژێ و دیاری کرێ تاکوو هەموو کەس بتوانێ تێبگا و بەهرەی لێ وەرگرێ. جـا بـۆیە دووبارە بە پێویستم زانی ئەو تیوتیوەیە:

١. هەر مامەڵەیەک یا قەرزێک کە ببێ و بکرێ دەبێ قەراردادی لە سەر بێ
٢. بۆ بەرگری لە کێشە و هەڵلا لە نێوان کڕیار و فرۆشندە دەبێ نووسەر سێهەم کەس بێ
٣. نووسەر دەبێ بە وەزیفە و ئەرکی ڕابکا کە ڕاست و عەداڵەتە لە نووسیندا
٤. کێ نووسەری مامەڵەکەیە بە پێی شوکرانە لەو زانستەی، دەبێ شانی خاڵی نەکا لەو کارە
٥. ئەو کەسەی قەرزەکەی دێتە ئەستۆی دەبێ قەراردادەکە بنووسێ و مۆری کا
٦. دەکاتی نووسینەکەدا دەبێ خودای یاد کا و کەم و زۆری نەکا دە قەراردادەکەدا
٧. ئەگەر قەرزدار بە هۆیەک لە هۆیان نەیتوانی قەراردادەکە بەجێ بێنێ چاوسووری دەبـێ بینووسێ
٨. چاو یا بڵێین وەلی دەبێ عەداڵەت و ئینساف لە بەر چاو بگرێ دەو قەرارداده نووسینەدا
٩. بێ لە نووسەر دەبێ دوو شاهید ببن دە کاتی نووسینی قەراردادەکاندا
١٠. ئەو دوو شاهیدانەی کە لە سەر قەرارداد دەبێ ببن، باڵغ بن و موسوڵمان بن

١١. لە باتی ئەو دوو شاهیدە پیاوانە دەکرێ پیاوێک و دوو ژن بن
١٢. شاهیدەکان دەبێ جێی باوەڕ و ئیتمینان بن
١٣. شاهیدەکان ئەگەر دوو پیاو بوون دەکرێ دانە دانە شاهیدی بدەن دەنا ئەگەر پیاوێک و دوو ژن بون دەبێ دوو ژنەکان وێکڕا پێکەوە شاهیدیەکە بدەن
١٤. قەرزەکە کەم بێ یا زۆر دەبێ بنووسرێ
١٥. ئەگەر مامەڵەکە نەغداونەغد بێ نووسین و قەراردادی ناوێ
١٦. ئەگەرچی دە مامەڵەی نەغداونەغدیدا سەنەدی ناوێ بەڵام شاهید دەبێ ببێ.
١٧. نابێ شاهید و نووسەر لە لایەن قەرزگر و قەرزدەر و غەیریش ئازار و ترسی بدرێن.
ئەوە بوو تیوتیوەی باری مامەڵە و قەرز.

ئەوجار ئەدێرەدا دڵی بزۆز و بەپرسیار و ئەقڵی زیت و چالاک تێبین دەڵێن: ئەدی ئەگەر لەو شوێنەدا و لەو کاتەدا نووسەر نەبوو و دەس نەکەوت دەبێ چبکەن قەرزدار و قەرزدەر؟

وەڵام: هەروەک باوەڕ کراوە خودایە چارەسازی ئینسان و حەیوان دە هەموو دەوراندا گیر و گرفتێکی دێتە پێش. بە وەسیلەی ئایەتی ٢٨٣ی بەقەرە جوابی داوەتەوە: چاری کاری کردووە و دڵی بزۆزیش ئەقڵی چالاکیش پێ قانیع کردوون. ئەوەش ئایەتی ٢٨٣ و ئەوەش ئەتۆی ئینسان:

**﴿٢٨٣﴾ وَإِن كُنتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُواْ كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ وَلاَ تَكْتُمُواْ الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ**

**ئەگەر هات و ڕێبوار بوون و نووسەرێکتان دەس نەدەکەوت بارمتەیەک لە بری قەرزەکە وەربگرن. ئەگەر هەندێکتان متمانەی بە هەندێکتان هەبوو با ئەو کەسەی کە متمانەی پێ کراوە لە خودای خۆی بترسێ و قەرزەکەی بداتەوە دە کاتی خۆیدا. شاهیدی قەت حاشار مەدەن ئەو شاهیدی حاشار دا و وەیشارێ. دڵی بەڕاستی تاوانبارە. خوداش بە سەر هەموو کردەوەکانتان ئاگادارە.**

## قەرز وەرگرتن لە سەفەردا؛ شایەدیدان

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٨٣:

ئەگەر بە وردی و هەستیارانە سەیری ئەو ئایەتە بکرێ ئەوە دێتە بەر چاو و هەست پێ

دەکرێ کە ئایەتی ٢٨٣ تەواوکەری ئایەتی ٢٨٢یە لە بابەت مامەڵەی سەفەرەوە واتە دە حاڵەتێکدا کە وەسائیل و ئیمکاناتی نووسین و شەهادەتی کتێبی دەس نەکەوێ. جا بۆیە خودا دەفەرموێ: ئەگەر دە سەفەردا بوون و نووسەری واتان دەس نەکەوت کە لە سەنەد نووسیندا شارەزایی بایە، یا خێر و کاغەز نەبوو یا خامە و جەوهەر نەبوو، ئەوە ئەودەم بارمتەیەک لە جیاتی قەرزەکە و بە ئەندازەی نرخی قەرزەکە و کەمتر نەبێ وەرگرن. تاکوو ئەو قەرزدارەی کە بە ئەمین زانراوە و قەرزەکەی دراوەتێ قەرزەکە دەداتەوە. و هەروا ئەو خاوەن قەرزەی کە بە ئەمین زانراوە و بارمتەکەی لە لا دانراوە بارمتەکە دەداتەوە و دەشبێ هیچ لایەکیان ناپاکی و خواری لە ڕاست یەک نیشان نەدەن بە پێی ترسانێکی کە لە خودایان هەیە. و ئەگەر بێتوو شاهیدی شاهیدی قووت دەن و حاشاری دەن، بێگومان تاوان و گوناهی دەکەوێتە ئەستۆ، بێگومان خوداش ئاگاداری هەموو کردەوەیەکە چ بە زاهیر چ بە نهێنی.

ئەگەر لە بیرمان بێ لە سەرەتای سووڕەتی بەقەرەدا ڕامانگەیاند کە سووڕەی بەقەرە دە ناو خۆیدا کۆکەرەوەی بەشی زۆری مەسائیلەکانی ئەحکام و بەرنامەکانی فیقهی و عەقیدەتی و ئەخلاقی وەخۆ گرتووە لەوەڕا دەردەکەوێ ئەو ڕاستییە کە زیاد لە هەموو سووڕەکانی قورئان ئایەتی (مداینە) واتە ئایەتی قەرز کە پڕبەرترین ئایەتی سووڕەی بەقەرەیە، دە ناو ئەودا دابەزیوە. گۆیا زانایانی شەرعی هەشتا نەوەد مەسەلەی شەرعییان تێدا دۆزیوەتەوە و فتوایان پێ داون. جا دێرەدا ئێمە چەن نموونەیەکیان ئیشارە وەلا دەکەین کە دە ناو ئایەتەکاندا دەرک کراون.

١. دە پێش ئایینی ئیسلامدا بە درێژایی مێژوو مامەڵە و نووسینی سەنەد و شاهید لە سەر مامەڵە نەبووە، عالەم لە سەر ئەساسی لێک ڕازی بوون حەواڵە بە بیر و لەبیرمانیان دادەبەست بابەتی سەودا و مامەڵە، واتە تا پێش زاهیر بوونی ئایینی ئسلام لە ناو هۆزی عەرەبی جاهیلی مامەڵە تەنیا بە زمان بووە. ئایەتی مامەڵە وقەرز هەوەڵین دەستووری نووسین و قەرزداری شاهید و دارودەستەی مامەڵەی تیجارەتی و مامەڵەی قەرزی وەڕوو هێنا و دایمەزراند جا لەوەیڕا هاتن دنیا بە پەیڕەوی لەو کارە جوانەی ئیسلامی پەیڕەوی کرد و شوێنی ئەو یاسایەی گرت و کردیانە بەرنامەی بازاڕی مامەڵەیان.

٢. ڕاگەیاندنی سوننەت و مەباح و مەکرووهات بە عینوانی بەشێک لە ئەحکامەکانی ئاینی ئەرکە لە سەر شانی زانایانی ئیسلام واتە مەلاکان

٣. فێربوونی سەودای نووسین و خوێندنەوە لە سەر پیاو و ژن ئەرکە و فەرزە

٤. کرێی نووسین و پڕ کردنەوەی سەنەدی مامەڵە بۆ نووسەر ڕەوایە و دروستە.

٥. سەنەند و قەبز و قەباڵەی خاک و زەوی و قەرز و مامەڵە دەبێ ئاگاداری بکرێ و ڕاگیرێ.

٦. دە بابەتی مامەڵە و قەرز ماوە و کاتی تەواو بوونی دەبێ دیاری بکرێن بە ڕوونی

٧. نووسەری سەنەدی مامەڵە نابێ لە نووسینەکەی حاشایی بکا و بڵێ: نایکەم، کرێی نووسینەکەی بە واجبی دەبێ تەڕەفەین ئەدای کەین.

٨. نووسینی سەنەد لە سەر شانی کڕیارە چونکە ئەوە قەرزەکە وەردەگرێ، فرۆشەندە بە هۆی قبووڵی ئەو قەرزە منەتیش دادەنێ لە سەر کڕیار.

٩. نووسینی سەنەدی مامەڵە و قەرز لە دیدگای شەرعەوە ئەوەمان پێ دەڵێ کە ئینسان بە هۆی خۆشەویستی ماڵی دنیا لەوانەیە لە حەق لادا، ئەو سەنەدە ڕێی لێ دەگرێ کە ئەو لادانە بە خۆوە نەگرێ.

١٠. نووسەر بۆی نییە و نابێ هەڵکێش و داکێش دە قەرزەکەدا بکا دە کاتی نووسیندا.

١١. ئەگەر هات و مامەڵەچییەکە ڕێوڕەسمی سەنەدی نەدەزانی و شارەزایی نەبوو دەبێ یەکێک لە کەسانی چاوسووری خۆی دانێ لە جێی خۆی.

١٢. وەکالەت و سەرپەرستی دە مامەڵەدا دروستە و ڕەوایە

١٣. دە بابەتی شاهید دەبێ دوو نەفەر پیاو بن یا پیاوێک و دوو ژن

١٤. شەهادەتی ژن هەچەندی زۆریش بن دە بابەتی جێبەجێ کردنی کێشە و هاڵۆزی تەڕەفەین دە مامەڵەدا پەسند نەکراوە و دروست وەرناگیرێ، لەفزی (رجالکم) دە ناو ئایەتەکەدا ئەوەمان پێ دەڵێ: دە شەرعدا دە هەندێ کاروباری تایبەتیدا شاهیدی ژن وەرگیراوە بەو مەرجەی پیاوان دەو کارە تایبەتەدا ئاگاداری نییە و نایزانێ، بۆ نموونە شاهیدی لە سەر باڵقبوون بدا بەڵام ژن دەتوانێ چونکە کچۆڵەکە لە کن ژنان ئەو شتە دەڵێ.

١٥. شاهیدی بێ باوەڕان و فاسقان و کافران بۆ موسوڵمانان دروست نییە.

١٦. شاهید نابێ فاسق بێ، بەو دەلیلە ئەو فتوایە دراوە (رجالکم) ناو ئایەتەکە واتە پیاوانێ لە خۆتان لە سەر ئیعتیقاد و باوەڕی خۆتان، جا دیارە کافر لە سەر باوەڕ و ئایینی ئیسلام نییە کەوایە شاهیدیەکەشی جێگەی باوەڕ نییە.

١٧. بۆ پۆست و مەقامی ئیمامەت و قەزاوەت و داوەری، عەداڵەت مەرجە. شاریعەکان

دەڵێن: شەهادەت و ئیمامەت و قەزاوەت دە یەک پلەدان، واتە کەسێ سەداقەت و عەداڵەت و یەکدڵی نەبێ دەگەڵ گەل، بۆ هیچ لایەکیان نابێ و نابێ شوێنی و دواکەوتنی بگیردرێتە بەر.

١٨. دەبێ کەسایەتی خۆت و دروستکاری خۆت بە هۆی ئەوان لە لای ساڵحان و پاکان ڕانێی.

١٩. کوێر و نابینا شاهیدی وەرنەگیردراوە. ئەبوحەنیفە و ئیمام محەمەد ئیبنی حەسەن و زۆری دیش لە ئایەتی قورئاندا هەستی ئەوەیان کردووە کە نابینا بە شاهید نابێ.

٢٠. شاهیدی دان واجبە ئەگەر فیتنەی لێ ڕانەبێ

٢١. ڕەهن ڕەوایە بەڵام بەهرە لێ وەرگرتن لە ڕەهنکراو بۆ ڕەهنکەر نادروستە.

٢٢. سەلەم دروستە، سەلەم ئەوەیە کڕیار پارەکەی نەغد دەدا بە شتێک ئەو شتە ئێستێ قابیلی وەرگرتن نییە بەڵام فرۆشندە دە موقابیلدا ئامادەیە دە کاتی خۆیدا تەسلیمی کڕیاری بکا. هەندێک لە موفەسرانی قورئان فەرموویانە بە پاڵەوپشتی قەولی ئیبنیعەباس کە فەرموویەتی (لمّا حَرَّمَ اللهُ الرِّبا اباحَ السَّلَفَ) ئەوە بەوە بە دابەزین ئایەت دەزانێ دە بابەتی سەلەمدا. جگە لەوەش دەڵێن مەرجەکانی سەلەم دەگەڵ مەرجەکانی قەرز یەکسانن چونکە دە هەردووکیاندا ئەندازە و کاتی تەحویل گرتنیان یەکە. (تفسیر کبیر، ج۷، ل ۱۱۶)

## پوختەکارییەک لە ئایەتی ۲۸۳دا

شەرعزانەکان کۆکن لە سەر ئەوە کە ڕەهن دە سەفەریشدا و دە حازریشدا دە بابەت بوونی نووسەردا یەکسانە بەڵام موجاهید دەڵێ ڕەهن دە سەفەردا نەبێ نابێ، دەلیلیش ئەو ئایەتەیە: ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ﴾ واتە ئەگەر هەندێکتان متمانەی بە هەندێکی ترتان هەبوو با ئەو کەسەی کە متمانەی پێ کراوە لە خودا بترسێ.

شاریعان دەڵێن ئەوە بەشی سێهەمی مامەڵەیە لە مامەڵات کە خودا دەسنیشانی کردووە دە قورئاندا، ئەوە پێی دەکوترێ (بیع الامانات) واتە مامەڵەیەک ڕووت لە سەنەد و شاهید.

ئایەتی ﴿وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ﴾ واتە شاهیدی حاشار مەدەن. موفەسران کوتوویانە: تەعبیری ئەو ئایەتە ئاوایە: ئینکاری ئەو حەقیقەتە مەکەن، شاردنەوەی شاهیدی گوناهە.

ئایەتی ﴿وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ﴾ واتە کێ شاهیدی وەشارێ دڵ بە تاوانە.

حەزرەتی عومەر فەرموویەتی: لە باتی (آثم) (فاجر) بە عەرەبێکی کە دە ئایەتی ۴۴ی

سوورەی دوخاندا هاتووە (طعام الاثیم) عەرەبە دەیکوت (طعام الیتیم) عومەر فەرمووی: نا نـا، بەڵکە (طعام الفاجر) واتە (اثم) بە مانا (فجور)ە.

ئایەتی ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ واتە خوداش بە سەر کردەوەکانتاندا ئاگادارە.

ئەو ئایەتە ترس وەبەرنانە بۆ ئەو کەسانە شەهادەت دەشارنەوە.

ئەرکێکی سەخت و قورسی ئەقڵ و هەسـت و شـعوور و زانسـتە کە دە ئـاخرین قۆنـاغی سوورەیەکدا قەراری گرتووە (بەقەرە) بۆ بە خۆدا چـوونەوە و ڕۆچـوون دە قـووڵاییە زانسـت و هەست و شعووردا خۆ چاو کا، تاکوو بتوانێ ئەو مناسەبە و تێکەڵاوییەی کە ئایەتەکانی ئاخری سوورەکە هەیانە وەک ئایەتەکانی ٢٨٤ و ٢٨٥ و ٢٨٦ دەگەڵ سەراپای ئایاتی سـوورەکە وەدۆزێ و شوێنەونیان نەکا.

دەزاندرێ و ئاشکرایە کە سوورەی بەقەرە درێژترین سوورەی قورئانە و درێژتـرین ئایـاتیش دە ئامێزی گرتووە وەک ئایەتەکانی ٢٨٢ (مداینە) واتە مامەڵە و ٢٥٥ ئایەتەلکورسی.

سوورەی بەقەرە کە سەرەتای بە سیفاتی موتتەقین داگیرساوە و ئاخرەکەشی هەر بە سیفات و حاڵاتی موتتەقیەکاندا دادەکوژێ وەک دوو ئایەتی ٢٨٥ و ٢٨٦، جا دیارە بە پێـی ئەو ئەساسـە هەوەڵ و ئاخری سوورەکە واتە سەر و بنی دە بنە یەک.

## ناوەرۆکەکانی سوورەی بەقەرە

سوورەی بەقەرە دەتواندرێ بکوترێ بەبـێ ترسـان هەڵگـری زۆربەی ئەحکـام و چیـرۆکە بەرزەکان و مەسئەلە بەرچاوەکانی دینە، بگرە لە (علم الاصول)دا تا (علم الفروع) بـۆ نمـوونە: تەنیایی خودا، پێغەمەبەرایەتی، زیندووبوونەوەی پاش مەرگ، وەعز و ئیرشاد، تەکلیـف، نـوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج، تۆڵە (قصاص)، حەیز، نیکاح، تەڵاق، مارەیی، خەلع، سـوێند (ایـلاء)، شیر (رضاع)، مامەڵە، بەیع، سوود (ڕبا)، قەرز (مداینە).

چیرۆکەکانی نەمروود، تـالووت، جـالووت، داوود، عـوزێری پێغەمـبەر، بەسـەرهاتەکانی یەهوودییەکـان و لاسـاری جوولەکەکـان و غەرق بـوونی فیـرعەون و لەشـکرەکەی، منـافق، خەلافەتی ئینسان و ئیبراهیم پێغەمـبەر و بتەکـان. هەروا چەن شـتانی دیـکە لە بـابەتی دیـن و ئایینەوە.

ئەوەشمان دە ئاخرەکەیدا دەخاتە ناو دڵ و بە بنان‌گوێمانـدا دەدا و دەسـرەوێنێ کە هێـز و تێز و پێزی خودای تەعالا هەر ئەوەندە نیە لە بەرچاوانە، بەڵکە ڕاهێنەر و داهێـنەری ئاسـمان و

زەویشە بەوانەی وا دە ناویشیاندان.

و هەروا ئیرتباتی ئایەکان دەگەڵ ئایەتی (مداینە) واتە مامەڵە لە سێ ڕێگاوە چاو دەکرێ:

١. دە ئایەتی قەرزدا دەبێ نووسینی سەنەد و ئامادە کردنی مەدارک و شاهید بۆ حیفزی ماڵ و ماف بە توندی لە بەرچاو بگیردرێ

٢. دە ئایەتی قەرزدا (مداینە) بە شیددەت لە حاشاردانی شەهادەت قەدەغە پێکهاتووە واتە بە تەوری واجب شەهادەت بدرێ و قووت نەدرێ، دەنا عەزابی بەشە.

٣. دیارە دە ئاخری ئایەتی مامەڵە و قەرزدا خودا دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾

دە ئاخری ئایەتی ٢٨٢دا دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾، دە ئایەتی ٢٨٣دا دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ هۆی ئەوەی دەو ئاڵوگۆڕەدا واتە جارێک بە لەفزی (بما تعملون) و جارێکی تر بە لەفزی (کلّ شیء) ئەوەیە: شاردنەوەی شەهادەت لە گوناهە گەورەکانە بۆیە خودای تەعالا لە سەر ئەساسی ترس وەبەر نان دەفەرموێ: شەهادەت نەشارنەوە چونکە بەو شاردنەوە و ئاگادارم عەزابتان دەدەم.

ئەوجار خودای تەعالا کە دە ئاخری ئایەتی ٢٨٢دا دەفەرموێ ﴿وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ ئەوە ئاماژەیە وەلای ئەوەی خودا وەک ئاسمان و زەوی و ئەوەی دە ناویشیاندایە ملکی خۆی هەن و بۆخۆی دروستی کردوون ئاگاداریانە بە زاهیر و باتینیان. ئاواش ئینسان ملکی خودایە بە زاهیر و بە نهێنییەکانیشیان ئاگادارە و دەزانێ. جا ئەدێرەدایە خودا هۆشداری دەدا بە ئینسان و دەفەرموێ: ئەی ئینسان! ئەوە ئاشکرایە و ئەوەی دەشی‌شارنەوە دە ناو کون و کەلێن و قوژبنی دڵتاندا پێیان ئاگادار و زانام بەو پێیە حیسابو دەگەڵ دەکەم. کەوایە شایانە بۆ جێی ئاوا کە خودا فەرموویەتی ﴿وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾

بۆ تەئیدی ئەو ڕاستییانە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٨٤ی بەقەرە:

**﴿٢٨٤﴾ لِّلَّهِ ما فِي السَّمَاواتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاء وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ**

**ئەوەی دە ئاسمانەکان و زەویدایە، ملکی خودایە، ئەوەی دە ناو دەروونتاندایە دەری‌بڕن و یا بیشارنەوە فەرق ناکا، خودا پێیان دەزانێ و لە سەر ویشتان دادگایی دەکا، پاشان ئەوەی کەیفی لێ بێ لێی دەبوورێ، هەرکەسێکیش بیهەوێ سزای دەدات خوداش بەسەر هەموو شتدا بەدەستەڵات و بەتوانایە.**

دە ناو دەروون و سیمای ئایەتی ٢٨٤دا چەن ڕاز و ڕەمز هەست پێ دەکرێن، بازدان بە سەریاندا بە زەرەر و بە ناڕەوا دەژمێردرێ، جا بۆوەی لە زەرەر و ناڕەوایان بە دوور بم، بەیانی ڕاز و ڕمووزاتەکان لە خۆ دەگرم ئەوەندەی لە توانامدا بێ:

١. نەزم و سیمای ئایەتەکە ئاوا نیشان دراوە: کە سوورەی بەقەرە بەشی هەرە زۆری بابەتەکانی علم الاصلو (دین) دە خۆیدا کۆ کردۆتەوە وەک یەکتایی خودا و پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران، و هەروا شتانێکی زۆریش لە بابەتەکانی شەرع و تەکلیفاتی شەرعی لە خۆ هاڵاندووە. هەر ئەوەشە کە خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم سوورەکەی بە ئایەتێ داکوژاندنەوە کە بۆنی هەڕەشەی لێ بکرێ وەک ئایەتی ٢٨٤ بێ.

دووبارە سیفەتی عیلم کە دە ئاخری ئایەتەکانی ٢٨٢ و ٢٨٣دا چاو دەکرێن و هەروا سیفەتی قەدیر کە دە ئاخری ئایەتی ٢٨٤دا چاو دەکرێ ئەو ڕازە نیشان دەدەن کە دە عیلمی کەلامدا «دین» ئەو سیفاتانەی کە پێیان دەکوترێ سیفاتی کەماڵ، کاملترینیان دوو سیفەتی عیلم و قودرەتن. واتە (علیم و قدیر). جا بۆیە خودای بێهاوتا بۆ نیشاندانی کەماڵی قودرەتی هات ئایەتی ﴿لِّلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ی دابەزاند دە ئاخری سوورەکەدا. هەروا بۆ نیشاندانی کەماڵی عیلمی بە هەموو بوونەوەر بە ورد و درشتەوە ئایەتی ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ﴾ نیشان دا.

بەو پێیە دەورەدانی عیلم و قودرەتی باریتەعالا بە ئاسمان و ئەرز و ئەوانەی دە ناویاندان لە بابەتی هێنانە دییان ئیدارە کردنیان ئەوە نیهایەتی وەعدەیە بۆ پاکان و خاسان و نیهایەتی هەڕەشەیە بۆ بێباوەڕان و تاوانکاران. یانی خودا دەتوانێ بە ئاسانی هەم ئەوەی مزگێنی پێ داوە بیباتە سەر، و هەم ئەوەی هەڕەشەی لێ کردووە بیباتە سەر. کەوایە دەبێ بکوترێ هۆی داکوژانی سوورەی بەقەرە بەو ئایەتانە هۆیەکەی ئەوانە بوون.

و هەروا خودای حەکیم کە دە بابەت مامەڵە و قەرزدا ئەمر و دەستووری دا کە دەبێ سەنەد و شاهید بۆ پارازتن و حیفزی ماڵ و دارایی ببێ ئەوەش ئەو ڕازە نیشان دەدا کە خودا پارێزەری ماڵ و سامانی ئینسانە و نەفعی ئینسانی دەوێ، نە بە خاتری نەفعی خۆی چونکە ئەو بێنیازە.

ئەوە کە خودای تەعالا قەدەغەی دانا لە سەر حاشاردانی شاهیدی هەڕەشەی لە سەر شاردنەوەی نواند، ئەو ڕازە دەردەخا کە مالیکیەتی ئاسمان و زەوی شایانی خودایە، بۆیە لە سەر لاساران سزای داناوە.

هەندێک لە قورئانزانان نەزەریان وایە خودا ئایەتی ﴿لِّلَّهِ ما فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ کە دابەزاندووە ڕازەکەی ئەوەیە کە کرداری بەندەی خەڵقی خودایە، بەو دەلیلەی ئەوەی دە ئەرد و ئاسماندان ملکی خودان، دیارە بەندەش بە کرداریانەوە دە ئەرز و ئاسماناندان.

## وەک جوولەکە مەڵێ؛ بەڵکە ئاوا بڵێ

لە ئیبنیعەباسەوە نەقڵ کراوە کە فەرموویەتی: کاتێ ئایەتی ٢٨٤ دابەزی تەم و غەمێک یارانی پێغەمبەریان داگرت و هاڵۆزیان کردن وەک حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەر و عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف و مەعاز و ... بە دەنگۆی ئەو ئایەتەوە کە کەوتبوونە نارەحەتیەوە دێنە خزمەت پێغەمبەرﷺ و پرسیاری لێ دەکەن. دەڵێن یا ڕەسوولەڵا! ئەو ئایەتە حوکمێکی وای لە سەر داناوین کە دەتوانای هیچ کامێکماندا نییە و نایەتە جێ. چونکە شتانێکی وامان دێتە ناو دڵ و هەڵدەقوڵێ لە ناو دەروونماندا پێن چارە ناکرێن. پێشمان ناخۆشە و هەر دەرۆستیشیان نایەین.

پێغەمبەرﷺ فەرمووی پێیان: ڕەنگە ئەوەی بەنیئیسرائیلی دەیانکوت ئێوەش هەر ئەوە بڵێن کە دەیانکوت (سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا) نا نا، ئێوە ئەوە بڵێن (سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا) چونکە مانای کوتەی بەنیئیسرائیل (بیستمان و نافەرمانیمان کرد)، مانای ئەوەی ئەمنیش پێو دەڵێم (بیستمان و ئیتاعەتمان کرد).

جا ئەدێرەدا خودای خاوەن زانست و ڕەحم و بەزە بۆ ڕەواندنی مژ و تەم و غەمی دڵی بەندەکانی موخلیس و فەرمانبەری ئایەتی ٢٨٦ی دابەزاند ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ واتە خودا ئەرک ناخاتە سەر هیچ کەسێک مەگەر بە پێی توانا نەبێ.

پێغەمبەریش فەرمووی: (إنَّ الله تجاوَزَ عن اُمّتي ما حَدَثوا بِهِ انفسهم ما لَم يَعْلَموا اَو يتَكلَّمُوا بِهِ) واتە خودا لە ئۆمەتم خۆش بووە ئەوەی کە دە ناو ماڵی دڵیدا هەڵدەقوڵێ وەک ئارەزوو و ئاوات و خەیاڵات تا ئەو کاتەی دەکاریان نەکا ــ چ بە زمان چ بە ئاکار.

ئایەتی ٨٩ی مائیدەش هەر ئەو موژدە دەدا شتێک دە کار نەکرێ بە تاوان نانووسرێ: ﴿لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَـكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ﴾ = (بما كسبت قلوبكم) واتە هەچی بە دڵ نەیکەن سزای نییە، ئەوی دەیکەن سەرزارەکییە.

ئایەتی ﴿فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ﴾ ئەوەی خودا بیهەوێ دەیبووری، ئەوەی

وازیشی لێ بێ سزای دەدا. بە ڕاوێژی ئایەتی ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ﴾ ئەوە هەست دەکرێ: ئارەزوو و هەوایەک هەڵدەقوڵێ دە ناو چاوەی دڵدا خراپ کە بڕستت لێ دەبڕێ و بۆت دەرناکرێ، کەوایە دەکەویە بەر سێبەری (تکلیف مالا یطاق) خودا لە سەر ئەو شتە هەڵقوڵاوەی تاقەتت پێ ناشکێ، تاوانبارت ناکا و حیسابت دەگەڵ ناکا. ئەمما ئەتۆی ئینسانیش ئیرادە و نیەتی ئەوەت نییە کە ئەو شتە خراپە هەڵقوڵاوە بە کار بەری، گشتی ئەوانە عەفون و بوردراون.

ئەوجار دەلیل و بەڵگە لە سەر ئەوەی کە ئەو شتە نەویست و نەخوازراوانە عەفون ئەوەیە خودا ئایەتەکە ئاوا دەڵێ: ﴿يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ﴾ نافەرموێ (يُؤاخذكم بِهِ اللّٰه) خۆ دیارە مانای موحاسەبە دەگەڵ موئاخەزە جییان لێک واتە ئاوەت بۆ دێنێتە حیسابەوە ئەو نەخوازراوە، کە ئەتۆ خوازریای ئەو شتە نەبووی و قەستی دەکار کردنت نەبووە، کەوایە عەفون.

بە کورتی و بە کوردی: ئەوەی دە حەوزەی توانایيتدا نەبێ بە تاوان ناخرێتە ئەستۆت، دەلیلی ئایەتی ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ واتە خودا لە توانا بەولاوە ئەرک ناخاتە سەر کەس.

ئایەتی ﴿فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاء وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء﴾ واتە خاوەن باوەڕی موئمینی سابت و قاتیع دە بن سێبەری (فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاء) دایە، بێباوەڕی سابتی قاتیع دە بن ڕەهێڵەی (وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء)دایە.

خودای خاوەن زانست و توانا تەواو دە ئایەتی ٢٨٤دا کەماڵی قودرەت و کەماڵی عیلمی دانە پاڵ خۆ واتە بەغەیرەز خودا نیە خاوەنی پاشایەتی ئاسمان و ئەرز و مافیها. جا کەوایە دەبێ ئیقرار بکرێ بەوەی کە ئەو خاوەنی کەماڵە شایانی پەرستنە، شایانی سەژدە بۆ بردنە، شایانی بەندەگی بۆ کردنە، کە ئەوەش ناوی دەبرێ بە کەماڵی عبوودیەت واتە بەندەگی.

بە کوردی کاتێ خودا ئاگاداری بە زاهیرز و نهێنی تایبەتی خۆی کرد، مەدح و سەناشی هەر دەبێ تایبەتی ئەو بێ، بۆ ئەو هۆیە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٢٨٥ کە دەناو ئەودا سەنا و مەدحی ئەو بەندەیە دەکرێ کە باوەڕی بەو زاتە خاوەن کەماڵە غەیبەیە.

لە سەر ئەو نەزم و ئەساسە بەربەرینەی باسمان کرد ئەرکە لە سەر خاوەن باوەڕان ئیقرار بکەن و بڵێن:

﴿٢٨٥﴾ آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ

پێغەمبەر بەو بەرنامەیەی کە لە لایەن خودا بۆی نێردراوە ئیمان وبڕوای هێناوە، موسوڵمانانیش هەروەها، بە تێکڕایی بڕوایان بە فریشتەکانی خودا و کتێبەکان و پێغەمبەرەکانی خودا هێنا. ئێمە هیچ فەرق و جیاوازییەک ناخەینە نێوان پێغەمبەرەکانی خودا، موسوڵمانان کوتیشیان: وا ئەوە بیستمان و گوێڕایەڵ بووین، داوای لێخۆش‌بوون دەکەین لە تۆ ئەی پەروەردگاری ئێمە! سەرەنجام گەڕانەوەش هەر بۆ لای تۆیە.

## ئیمان هێنان بە خودا و فرشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەران

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٨٥:

ئەگەر هەستیارانە سەیری ئەو ئایەتە بکەین کەماڵی عبوودیەتی ئینسان واتە بەندەگی ئینسان لەو ئیمان و باوەڕ هێنانەی بە خودا و فرشتە و کتێبەکانی ئاسمانی و بە پێغەمبەرەکان و فەرق نەکردنیان، بە ڕوونی دەردەکەوێ و چاو دەکرێ. ئینجا لەوەڕا دەتوانین بڵێین: ئەو ئایەتە ٢٨٥ دەگەڵ ئایەتەکانی ﴿لِّلَّهِ ما فِي السَّمَاواتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ﴾ ئیرتیبات و مناسەبەیان لە دوو جیهەتەوە هەیە، بەو شێوەیە: سێ سیفەتی کەماڵی خودا واتە کەماڵی دەستەڵات و مڵک، کەماڵی عیلم، کەماڵی قودرەت دەو ئایەتەدا نیشان دران و ڕاگەیێندران، بەو جۆرە دە ﴿لِّلَّهِ ما فِي السَّمَاواتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾دا کەماڵی مڵک و مالکیەت. دە ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ﴾دا کەماڵی عیلم، کەماڵی قودرەت دە ﴿يُحَاسِبْكُم بِهِ﴾دا نیشان دران.

دیارە ئەو سێ سیفاتە کەماڵانەی دابێ شایانیانە: بەندە سەژدە و کڕنۆشیان بۆ با و ئیتاعەیان بکا، واتە کەسێک خاوەنی ئەو سێ سیفەتە بێ دەبێ عەبدایەتی بکرێ. چونکە هەر ئەو شایانی ئەوەیە بپەرسترێ، بە کوردی و بە کورتی: لە دووی کەماڵی باری دەبێ بێت کەماڵی ئینسانی.

ڕووناکتر: خودای تەعالا لە هەوەڵی سووڕەی بەقەرەدا سەنای لە خودا ترسانی بەوەی نیشان دا کە باوەڕیان بە غەیبە و نوێژان دەکەن و لە ماڵی خۆشیان ئینفاق دەکەن و دەدەن، دە ئاخری سووڕەکەشدا سەنای موسوڵمانان بەوە دەکا کە باوەڕیان بە خودا و فرشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەرەکان هەیە، یانی دەبێ بڵێین یەکی دیکە لەو ئیمتیازانەی کە دراوە بە سووڕەی بەقەرە ئەوەیە کە سەر و بنی بە مەدح و سەنای خاوەن باوەڕان ڕازاوەتەوە. ئاوا: ئایەتی

۳ و ۴ و ۵ لە هەوەڵی سوورەکە و هەروا ئایەتی ۲۸۵ لە ئاخردا، ئەو لەخوداترسانەن کە باوەڕیان بە خودا و بە ڕۆژی ئاخرەت و بە فرشتە و بە وەحیەکانی ئاسمانی و بە پێغەمبەران هەیە، دەگەڵ ئەوەش لەو ڕزق و ڕۆزییەی خودا پێی داون بەشی هەژار و بێنەوایانی لێ دەدەن.

ئایەتی ۲۸۵ ئەو تایبەتمەندییەی هەیە کە چوار پایە ئەساسییەکانی ئیمان دەناسێنێ، ئەوانەن چوار کڵەکانی: ئیمان بە خودا، ئیمان بە فرشتە، ئیمان بە وەحی، ئیمان بە پێغەمبەران.

ئەو چوار پایە ئیمان وباوەڕیەش وا لە تەرازوو دراون یەکیان کەم بێ ئیمان ناتەواو دەبێ. و هەروا دەشبێ چۆن لە سان دراون، ئیمان و باوەڕیەکەش ئاوا لە سان درێن دەنا ئیمان نایەتە جێ مەسەلەن تا خودا ناسین نەکرێتە کڵی دڵ باوەڕ بە فرشتە نایەتە جێ و تا باوەڕ بە فرشتە نەیێتە جێ، باوەڕ بە وەحی نایێتە جێ و تا باوەڕ بە وەحی نەیێتە جێ باوەڕ بە پێغەمبەران نایەتە جێ کە وایە دەبێ ئەو نەزمە بپارێزرێ.

## پایەکانی ئیمان

ئەوجار دەبێ بزاندرێ ئیمان بەو چوار پایە ئەساسیانە بە چ شێوەیەک بێ:

**۱. ئیمان بەخودا** کە بریتییە لە بە یەکزانینی خودا و ناسینی ئەحکاماتی بەو شێوەیە کە نابێ بکوترێ ئەو حوکمەی بۆ وایە و دەلیلی چییە؟ دەبێ بشزانێ تەواوی ئەحکاماتی خودا بۆ خزمەت قازانج گەیاندنە بە ئینسانی، و دەشبێ بزاندرێ هیچکام لە چاکە و خراپەی عەبدی لە سەر خودا واجب نییە.

**۲. ئیمان بە فرشتە:** دەبێ بزاندرێ کە هەن ڕووحانین، دەبێ باوەڕ وابێ کە پاکن و بێگوناە. تەنیا ئەوەیان لە دەس دێ کە خودا پێیان دەڵێ و ئەوان وەسیلەی ڕاگەیاندنی فەرمانی خودان بە ئینسان (پێغەمبەران).

**۳. ئیمان بە کتێبەکانی ئاسمانی:** دەبێ وا بزانین ئەوانە وەحی خودان هاتوون بۆ سەر ئینسان دوورن لە سیحر و جادوو گوفتاری شەیتانی. خودا ڕێگای نەداوە و نادا نە دەستی ئینسانی نە دەستی جنۆکە و شەیاتینی بگاتە ئەو کتێبانە و بیانگۆڕن. ئەحکامەکانیشی دوو بەشن: (محکمات) و (متشابهات) واتە ئەساسین شایانی وێنە و ئاڵوگۆڕ و بەرداشتی دی نین، واش هەیە وێنە هەڵدەگرێ.

**۴. ئیمان بە پێغەمبەران:** دەبێ باوەڕمان وابێ پێیان ئەوەی دەڵێن ئی خودایە و بێگوناهن، و دەبێ باوەڕمان وابێ ئەوانە گەورەترن لەو کەسانەی پێغەمبەر نین وەک ئینسان و جنۆکە و

فرشتە، و دەبێ باوەڕیشمان وا بێ لەو بارەوە کە پێغەمبەران لە یەکتر گەورەتر نین، بەڵام لە هەندێک بابەت و موعجیزەدا هەندێکیان خاوەنی ئیمتیازاتن، کێش حەزی لە وردەکاری و زێدەزانینە، بڕوانێ لە کتێبە تەفسیرەکان.

ئایەتی ﴿سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ واتە لە ڕاست ئەنجامدانی ئەمری باری سستی و ئیشکالتراشی بە خەرج نادەن بۆ چی و بۆچی ناڵێن. بەڵکە زوو دەڵێن (سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا) لە پاش ئەو ئیقرارانە دەڵێن: خودایە لە گوناهانمان ببوورە، گەڕانەوەش هەر بۆ لای تۆیە.

دە جوملەی (وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ)دا ئەو ڕازە هەست دەکرێ: باوەڕی بە ڕۆژی جەزا دیارە گەڕانەوە بۆ لای خودا گەڕانەوەیە بۆ سەر حیساب.

ئەوجار خودای خاوەن ڕەحم و بەزە دەیهەوێ دڵخۆشی دانەوەیەک بنوێنێ بۆ ئینسان کە بە هەموو تاوانێک تووشی سزا ناکرێن، هەر ئەوەی لە تواناتدایە دەژمێردرێ لە سەرت، لەوە بەولاوە لە سەرت نایەتە حیساب. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٨٦ی بەقەرە:

﴿٢٨٦﴾ لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ

**خوا ئەرکی لە توانا بەدەر، بە سەر کەسدا ناسەپێنێ؛ چاکەی بکا بۆ خۆیەتی و خراپەشی دژی خۆیە. ئەی پەروەردەی هەمووومان! ئەگەر شتێکمان لە بیر چوو، یان تیا بە هەڵە چووین، لێمان مەگرە. ئەی پەروەردەی هەمووومان! ئەرکی ئەوەندە گرانمان مەخە سەرشان وەک ئەوانەی بەر لە ئێمە لە سەریان بوو. ئەی خودای هەمووو لامان! ئەرکی وامان پێ مەسپێرە کە لە توانامان بە دەربێ. تۆ هەر خۆت لێمان ببوورە و بەر بەزەیی خۆتمان بخە و بمانبەخشە. هەمووو کاروبارێکی ئێمە بە دەس تۆیە و سەریشمانخەی لە سەر ئەوانەی ناتناسن.**

## لە تاقەت بەولاوە تەکلیف ناکرێ

ئەی ئینسان باوەڕت بێ خودا هیچ ئەرکێک ناخاتە سەر ئەستۆی کەس کە لە توانایدا نەبێ، و ئەو ئەحکاماتەی کە حەواڵەی سەر شانی موسوڵمانان و غەیری کردووە بێ لە قەدەر توانایی وانە، لە تاقەتیان بەولاوەتر نییە. هۆی ئەوەش ئەوەیە خودای تەعالا بناغەی ئایینی ئیسلام و باقی ئایینەکانی دیکەی ئاسمانی لە سەر ئەساسی توانایی ئینسان سەهلەنگاری داناوە. و لە

ڕۆژی ئاخرەتیشـدا هەمـوو کەس کـردەوەی خـۆی دێـتەوە ڕێـگەی خـۆی. ئەگەر چـاک بـێ کردەوەکەی بەهرەکەی هەر بۆخۆیەتی. ئەگەر خراپیش بێ سزاکەی هەر لە سەر خۆیەتی. هیچ هێز و یاریدەدەرێک نییە بتوانێ ئاوڕ وەسەر غەیر وەدا. دە ئاینی خودادا نابێ هیچ کەس باوەڕی وا بێ ڕۆژی حیسابێ کەس دەتوانێ تاوانی کەس وەئەستۆی خۆ بگرێ و یا لایبەرێ، تکاکار و بەرتیل نییە وقەدەغەیە، ئەوە کە خودای حەکیم فێرمان دەکا کە ئـاوای لە بەر وەپـاڕێین و داوای لێ بکەین و بڵێین: ئەی پەروەرندەن ئەگەر هاتو لە بەجێهێنانی فەرمانەکانتـدا کەمتەرخەمـین نیشان دا تۆمان لە بیر کرد و یا وەک دەبایە ئەنجامی فەرمانەکانتمان دابان ئاوامان ئەنجـام نەدان گیرۆدەمان مەکە و تووشی عەزابمان مەکە هـۆیەکەی ئەوەیە: داوا و پەنـا و پـاڕانەوە و لالانەوە حەتا لە بەر پێغەمبەرانیش ڕەوا نییە و قەبووڵ نییە، دەنا خودا لە (ربّنا) دەیفەرمو: بڵێن (رسـولنا، شفیعنا، ولینا، غوثنا و...) ئەوە نیشانەی ئەوەیە هاوار و داد و پاڕانەوە لە غەیری خودا ئیهـانە بە مەقامی خودایە و کوفرە. ئەوەش کە خودا فێری ئینسان دەکا بڵێ (لاَ تُؤَاخِذْنَا) و (وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَـا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ) ئەوە بۆوەیە کە ئینسان بۆ هەموو لایەک هەر لە بەر خودا وەپـاڕێ و هـاوار لەوی بکا دەنا خودا نە باری قورسی لە سەر ئینسان دادەنێ و نە لە سەر هەڵە و ئیشـتبا و لەبیرچـوون کەس دەکێشێتە پای حیساب و مەحکەمە.

ئەگەر سەر لە ئەقڵ نەشێوێندرێ ئەقڵ ئەوە دەزانێ کەسێک نیـازی خـۆی پـێ جێبەجـێ نەکرێ و کەسێک دەنگی هاوارکەر نەبیسێ و کەسێک زانا بە غەیب نەبێ و کەسێک دەستەڵاتی بە سەر بوون و نەبووندا نەبێ، چۆن دەتوانێ چارەی بێچاران بکا ئەو بێچارەیە؟ جێی خـۆیەتی ئەقڵ واق و وڕ دامێنێ و بتاسێ.

چەن ڕازێک دە ناو ئەو ئایەتەدا هەست پـێ دەکـرێ ویسـتم تـا ئەو جێگـایەی لازم بـێ و بتوانم باز نەدەم بە سەریاندا.

١. ئایەتی ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ ئەو مزگێنییە یا لە خـوداوەیە یـا لە دڵـی پـڕ لە سەفا و هیوا و ئومیدی پـێغەمبەر و موسـوڵمانانەوەیە، دەکـوترێ لە سـەر ئەساسـی ئیقـرار بە ﴿وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾وەیە واتە ئەوانـن دەڵـێن ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ بۆ تەئیدی ئەو داوایەش ئایەتی ﴿رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا﴾یە کە خـودا موسـوڵمانەکان فێر دەکا بیڵێن.

٢. ئایەتی ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ﴾ هەست بەوە دەکرێ جیاوازی هەبێ لە نێوان

(کسب اکتساب)دا. ئەهلی لوغەت کوتوویانە فەرقیان نییە، بە دەلیلی ئایەتی ٣٨ی (مدثر): ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾ واتە هەموو کەس بارمتەی کردەوەی خۆیەتی. یانی لۆغەتی (کسب و کسبت) دەتوانیٚ لە جێی یەک دابندرێن.

هەندێکیش کوتوویانە (اکتساب) لە (کسب) خاسترە، چونکە (کسب) بۆ خۆشت دەبیٚ بۆ غەیریش دەبیٚ، نموونە: دەکوتریٚ (فلانٌ كاسبٌ لأهلِه) بەڵام ناکوتریٚ (مُكْتَسَبٌ لأهلِه)

خاوەنی کەششاف: (کسب) بۆ خەیر دەکوتریٚ، (اکتسب) بۆ شەڕ دەکوتریٚ.

٣. ئایەتی ﴿رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ئەگەر دێرەدا هەنگاوان ورد باوێین ئەوە چاو دەکەین کە خودای تەعالا بەندەی خۆی فێر دەکا چوار جاران بڵیٚ: (ربنا)، سێیان بە ئاشـکرایی و یەکیان بە نهێنی. بڕوانە و سـەیری کە: ﴿رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا﴾ ﴿رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْـرًا﴾ ﴿رَبَّنَـا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ﴾، لە سەر ﴿وَاعْفُ عَنَّا﴾ش (ربّنا) هەیە و لابراوە.

بە کوردی و بە کورتی: خودا بەندەی خۆی فێر دەکا بەو شێوە هاوار لە خودا بکـا بـۆ وەی لە هەچی هەڵە و خەتا و کەترەخەمییە بیبەخشیٚ. ئەدێرەدا ئەو ڕازە ڕازاوەتەوە کە پڕ لە موژدەیە و مۆنجان دەدا لە ڕەحم و بەزە و بەخشینی خودا بە ڕوونی چاو دەکـریٚ، ڕازەکەش ئەوەیە: ئەگەر خودا نەیهەویٚ لە بەندەی خۆی خۆش بیٚ چۆن پێی دەڵیٚ و فێری دەکا ئاوا بڵیٚ و بەو لەفزە پـڕ لە هیوایانە لە بەری وەپاڕیٚ. وەک حەزرەتی ئادەم و حەوای فێر کردن کاتیٚ کە بە خەتـا چـوون فەرمووی ئاوا بڵێن با لێو خۆش بم: ﴿قَالاَ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكونَنَّ مِـنَ الْخَاسِرِينَ﴾ (اعراف: ٢٣) **واتە کوتیان پەروەردگـاری ئـێمە! ئـێمە زوڵمـان لە خۆمـان کـرد ئەگەر لـێمان نەبووری و نەمانبەخشی دەچینە ڕیزی زیانکاران.**

## گازەگاز و نووزەنووز

ئاخر داوام خودایە، حەمد و شوکر و سەنایە، کە پێت داوم هیدایە، تەفسیری کەم کەلامت، بۆ نەزانان شیفایە، چاوەڕوانی بەزەی تۆم، نیازی بەزە و وزەی تۆم، بێ لوتفی تۆ سەرەڕۆم.

یاریدەم دەی بزانم، چی چاکە بۆ ئیمانم، ڕاستەڕێ بێ ژیانم، ڕازی بی لە بەیانم، ئەگەر هاتوو هەڵەم کرد، نەزانانە پەلەم کرد، سا خۆم تووشی حەلەم کرد، عەمد نییە و سەهویە، سەهوش دیارە عەفویە، وایە تەمام خودایە، ئەوەم قەست و هیوایە، زانای بەوەی کەوایە، ئاگای چی لە دڵایە، تەفسیری کەم کەلامت، بەیانی کەم پەیامت، ئیتاعەی کەم مەڕامت، لە سەر ئیزنت خودایە، دەڕۆم ڕوو بەو هیوایە، بێ تۆش دوورە هیدایە، گەر هاتوو پێی گەیشتم، پڕاوپڕم جەزایە، گەر ڕێت نەدام بگەم پێی، ئەوجار لە تۆم دەوێ حەی، لێم کەم نەکەی بەهرەکەی، پێم کەرەم کەی هەموەکەی، بە پێی قەست و خەیاڵم، بێ تۆ وێرانە ماڵم، هەر تۆی حاڵی لە حاڵم، عەزابم دەی بەندەتم، خەلاتم کەی بەندەتم، بەڵام لەو ڕۆژە سەختە، چاوەڕوانی هیممەتم، تەفسیری قورئانەکەت، تێشووی ئاخرەتم بێ، لەو ڕۆژی نەفسینەفسی، شاباڵی غیرەتم بێ، ئەو تەفسیر و بەیانە، چارەی ئاقیبەتم بێ، دەزانم کە دەزانی، زانای هەستی جیهانی، بە ئاشکرا و نیهانی، ئاگای ناخی دڵانی، چم لێ دەوێی عەلیمی، شافی دڵی ئەلیمی، چارەسازی حەکیمی، لێم دەوێی وەمحەسێنی، دامپۆشی بە بەزەی خۆت، بە ڕەحمەت وەملاوێنی، ئینسانم هەڵە باشم، داتاشراوی بەڵاشم، ڕوو دە بەزم و هەراشم، تووڕە نەبی، نەمدوێنی، بە قەهری خۆت وەمتوێنی، عەبدم دەسکری خۆتم، ڕیس و ڕایەڵ و پۆتم، چ خاو چ کرژ ئی خۆتم، ئاخر داوام خودایە، حەمد و شوکر و سەنایە، چۆنی ئەمرت لە سەر بێ، ڕازیم ئەمرت ڕەوایە.

لە نێوانی خودا و دڵا پەردەیەک هەیە کە مانعی ملاقاتی دڵ و خودایە، دڵ هەست دەکا کە خودای لێ نزیکە و دەگەڵی دەدوێ و نیازەکانی لێ دەخوازێ بەڵام چونکە ئەو ڕێیە بەستراوە کە وڵامت داتەوە، نازانی جوابت چییە؟ جا بۆیە هەر دەبێ لە پشت دەرک و دەروازەی باری لە زەنگی دەی، تاکوو ڕۆژێ دەرگات لێ هەڵدەگرێ (مەرگ).

مەلا عومەر مودەڕسی

١٣٩٥/١/٧ی هەتاوی (١٤٣٧ی ق)

مزگەوتی بداقسلطان ـ مهاباد

**بەرهەمەکانی دانەر:**

١. غەوغای دنیا و قیامەت ـ چاپکراو

٢. عالەمی غەیب و شەهادەت ـ چاپکراو

٣. ئەقڵکاری دە تەرازووی نەقڵکاری ـ چاپکراو

٤. ئینسان و چارەنووس ـ چاپکراو

٥. سۆزی دەروون ـ چاپکراو

٦. قورئان بە هۆنراوەی کوردی ـ چاپنەکراو

٧. عیرفان و نەتەوایەتی ـ چاپنەکراو

٨. فەرایز بە هۆنراوەی کوردی ـ چاپنەکراو

٩. سوورەی حەمد و کەهف ـ چاپنەکراو